# ئینسکلۆپیدیای
# هەولێر



- میژووی کۆن
- میژووی ئیسلام
- میژووی نوێ

لەسەر ئەرکی کۆسرەت رەسول عەلی
جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان چاپکراوە

# ئینسکلۆپیدیای هەولێر

# (ئەربیل)

چاپی یەکەم ٢٠٠٩

- ناوی کتێب: ئینسکلۆپیدیای هەولێر «ئەربیل»
- ئامادەکردنی: لیژنەی باڵای ئامادەکار:
د. عەبدوڵلا عەلیاوەیی، د. مەولود ئیبراهیم حەسەن، فەرید ئەسەسەرد،
د.ئومێد جۆزەلی، حەمید ئەبوبەکر بەدرخان.
- سەرپەرشتیاریی هونەریی و خۆشنووسی: محەمەد زادە.
- دەرهێنانی هونەری: عوسمان پیرداود.
- جێبەجێکردنی هونەری: عصام موحسین نادر، رزگار موحسین نادر.
- نەخشەکان:سەردار محەمەد - وشیار حەمەدەمین
- هەڵەبڕی و پێداچوونەوە: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، عەبدولڕەحمان مەعرووف، ڕەحیمی سورخی.
- هەڵەبڕی کۆمپیوتەر: مەسعود ئیبراهیم، ئەیوب یوسف.
- سکەنەری وێنەکان و ڕێکخستن: بەدرخان یوسف.
- سەرپەرشتیاری گشتیی چاپ: حەمید ئەبوبەکر بەدرخان.
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٩ لوبنان
- چاپخانە: گرین گالۆری- لوبنان
- تیراژ: ٢٥٠٠ دانە.
- ڕۆژی دەستپێکردن: ٢٠٠٥/١٢/٢٦ - ڕۆژی تەواو بوون ٢٠٠٩/٩/٢٥
- لە کتێبخانەی گشتی ژمارە «١٨٣٢» ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ.

- نرخ: (١٥٠٠٠٠) دیناری عیراقی

**لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان**

# ڕەچەڵەکی کوردان

دکتۆر فێردیناند هێنەبیشلەر



سەرچاوەی وشەی کورد لە سۆمەری هاتووە و مانای میللەتی چیا دەگەیەنی و لەوەتەی هەزارەی چوارەمی پێش زایین لە نووسینەکاندا نیشانەیە بۆ کلتوورەکانی دانیشتوانی کۆن و نەوەکانیان و کۆچبەرانی ناوچە چیاییەکانی باشووری ڕۆژهەلاتی ئەناتۆلیاو باکووری میزۆپۆتامیا و باکووری ڕۆژئاوای ئێران.

بەم شێوەیە کوردەکان دانیشتووی ڕەسەنی کۆنە میللەتانی ئەم ناوچانەن و پاشتر کەوتوونەتە ژێر کاریگەری هەریەک لە میللەتانی وەکو هورییەکان، سکیسەکان، میدی یان پارتەکان کە لە سەرەتاکانی گەشەسەندنی کورد ڕۆڵی خۆیان هەبووە. لەڕووی مێژووییەوە کوردستان لە تەنیا یەک میللەت سەرچاوەیان نەگرتووە، وەک هورییەکان، سکیسەکان یان میدییەکان.

زمانی کوردی لە کۆنترین شێوەکانی (کرمانجی باکوور) پەیوەندی هەیە بە زمانە لەنێوچووەکان وەک هوری یان ئۆرارتو هەروەها زمانە بنچینەییەکانی پێش ئیندۆ ئەوروپییەکان.

لە هەندێک تێڕوانین کۆنترین زمانی کوردی ئاسەوار و دیاردەی کۆنترین زمانی پێش ئیندۆئەوروپییەکانی ئەوروپا کە تاکو ئێستا زیندووە (زمانی باسکی) پێوە دیارە.

زمانی کوردی لەوەتەی ناوەڕاستی هەزارەی یەکەمی پێش زایین بە چەند قۆناغێک بە ئێرانی کراوە و ئێستا زمانێکی نوێی باکووری ڕۆژئاوای ئێرانییە.

لە بنەڕەتدا زمانی کوردی زمانێکی ئێرانی نەبووە، بەڵکو ڕەگە خۆماڵییەکانی دەگەڕێتەوە بۆ زمانە بنچینەییەکانی پێش ئیندۆ ئەوروپییەکان.

# هەولێر لە کۆنەوارە سیاسییەکاندا*

سەبارەت بەناوی پارێزگای هەولێر (اربیل)(*) و شاری هەولێر کە لەناو دانیشتوانی کوردستان و نووسراوە فەرمییەکانی زمانی کوردی بەکاردەهێنرێت، بیروڕای جیاواز لەبارەی چۆنێتی پەیدابوونییەوە هەیە، هەندێک پێیان وایە ئەم ناوە لەبنەڕەتدا لە (اربیلا) هاتووە، پاشان گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووە بە(هەولێر) بەم شێوەیە (اۆبیلا، اۆبیل، اروێل، اۆرێل، هۆبیل، هەولێر)، بەڵام هەندێکی تر پێیان وایە ناوی هەولێر لە وشەی ئەربیلەوە هاتووە بەم شێوەیە (اربیل، اروێل، اۆلیر، هەولێر)،( سەبارەت بەناوی (اربیل) کە لە نووسراوە فەرمییەکانی زمانی عەرەبیدا بەکاردەهێنرێت، بۆیەکەم جار ئەم ناوە لە تێکستەکانی پاشای سۆمەری شولگی (۲۰۰۰پ.ز) دا هاتووە، بەشێوەی (اربیلم) پاشان لە سەردەمە جیاجیاکانی ئاشووری و فارسی و یۆنانی و عەرەبی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەم شێوەیە (اربیلم، اربا- ایلۆ، اربیرا، اربیلا، اربل، اربیل) کە بەمانای چوار خواکە دێت، (اربع ایل) کە ئێستا و لە کۆن بە یەکێک لە شارە کۆنەکانی جیهان دەژمێردرێت و هەرێمی کوردستان وعێراق، کە مرۆڤ تێیدا ژیاوە و ئاوەدانی تێدا دروست کردووە لەبەر گونجاوی ستراتیژی ناوچەکە و بوونی سوپای یۆنانییەکان لەسەردەمی ئەسکەندەری مقدۆنی و بوونی ستراتیژی خاک و ئاووهەواکەی[1]، ئەوەی ئەو راستییەش پشتڕاست دەکاتەوە دۆزینەوەی چەندین شوێنەوارە لە ئەشکەوتەکانی (شانەدەر، ناوچە شوێنەوارییەکانی دۆڵی خۆشناوەتی، ناوچە شوێنەوارییەکانی شەقڵاوە و پیرمام..........هتد)[2].

پەرەسەندن و پێشکەوتنی دانیشتوان لە هەموو سەردەمەکانی سومەری و ئاشووری و ئەکەدی و کاسی و هتد بووە هۆیەک بۆ دەرکەوتنی چەندین شار (شارە دێ)[3]لەم رووەشەوە نشینگەی قالینج ئاغا (گردی قالینج ئاغا) کە مێژووەکەی بۆ هەزارەی شەشەمی پێش زاین دەگەڕێتەوە، نموونەیەکی زیندووی دروستبوونی نیشینگەی شارنشینییە دوای داکشانی مرۆڤ بۆ ناوچە دەشتاییەکان، لایەنی کەم لەناوچەی لێکۆڵینەوەدا[4]، گرنگی پارێزگای هەولێر بۆ سەردەمی ئاشوورییەکان دەگەڕێتەوە، کاتێک بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی ئەو رێگایەی کە لە باکوورەوە لە ناوچەی بەستۆرەی ئێستاو بەرەو ناوەڕاست واتە موسڵ و باشوور دەڕۆیشت، دەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرت[5]. پاشان ناوچەکانی پارێزگاکە بەردەوام بەشێک بووە لەو ئیمپراتۆر و دەوڵەتانەی هاتوون و ناوچەکەیان داگیرکردووە، وەکو (گۆتی، کاشی) دواتریش سەردەمی ئاشوورییەکان دێت، کە زێڕینترین سەردەمی کۆنی شاری هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری بووە، بەتایبەتی کاتێک شاری هەولێر دەکەنە مەڵبەندی ئاینی خۆیان، بۆ ئەم مەبەستەش پەرە بەقەڵاکەی دەدەن[1]. سەبارەت بە قەڵای هەولێر (یاقوتی حەمەوی) بەم شێوەیە باسی دەکات:" ئەربل قەڵایەکی بەهێز و شارێکی گەورەیە لە ناو دەشتێکی فراوان و تەختانە، لەم قەڵایەدا بازاڕ و خانووی نیشتەجێبوون بۆ هاوڵاتییان

هەیە[٢]". دوای ئاشوورییەکان ئەخمینێکان(هەخامنشییەکان) و فرسییەکان(پارتەکان/ ئەشکانییەکان) دێن و حوکمی شاری هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری دەکەن تاکو هاتنی ساسانییەکان بۆ ناوچەکە[٣]دوای ئەوان سەردەمی ئیسلام دەست پێ دەکات، لەم سەردەمەدا ماوەی فەرمانڕەوایەتی میرنشینی ئەتابەکی بەگرنکترین ماوە دەژمێردرێت لە مێژووی شارنشینی هەولێردا چونکە لەو سەردەمەدا هەولێر بووژانەویەکی زۆر بە خۆوە دەبینێت لە سەرجەم بوارەکانی بیناسازی و زانستی و ئاینیدا، بەتایبەتی کاتێک بەشی خوارەوەی قەڵاکە ئاوەدان کرایەوە و پەرەی سەند، لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی سوڵتان موزەفەرەدینی کۆکبری منارەی موزەفەری (منارەی چۆلی)و نەخۆشخانە وچەندین خانەقا و پەناگە بۆ نەخۆش و بێ نەوایان و ڕێبواران دروست کرا[٤].

پاشان هەریەکە لە مەغۆلی و جەلائری و ئیلخی مەڕەسپی و مەڕەڕەش و سەفەوی دێن بەجیا فەرمانڕەوایەتی دەڤەری هەولێر دەکەن[٥]. تاکو دەگاتە سەردەمی داگیرکەری عوسمانی (١٥١٤-١٩١٨) کە تەواوی ناوچەکانی پارێزگای هەولێر کەوتنە ژێر دەسەڵاتیان، میرنشینی سۆران کە لەو سەردەمەدا نیمچە سەربەخۆییەکی هەبوو لە ناوچەکە، دەسەڵاتی تەواوی بە سەر ناوچەی لێکۆڵینەوەدا هەبووە، پتر لە پایتەختێکی بۆ خۆی هەڵبژاردووە لەوانە (خەلیفان، هەریر، هەولێر، دوین، ڕەواندوز)، لە سەردەمی میرنشینی سۆراندا ناوچەی لێکۆڵینەوە بەتایبەتی شاری ڕەواندوز هەندێ بووژانەوەی بەخۆوە بینیوە لە بوارەکانی بیناسازی و بازرگانی....هتد.، کە ئەمە بۆخۆی هۆکارێکی تری گەشەی شارنشینیە لەپارێزگای هەولێردا. لەم باسەدا بەو دەرئەنجامە دەگەین کە ناوچەی لێکۆڵینەوە هەزاران ساڵە خاوەن شار و ژیانی شارنیشنی بووە، لەگەڵ ئەو داگیرکاری و وێرانکارییەی بەسەریدا هاتووە، کەچی نەبۆتە هۆی لەناوچوون و نەمانی نیشینگەی شارنشینی تێیدا، لەگەڵ ئەوەشدا سەنتەرەکانی شارنشینی ساڵ دوای ساڵ لە پەرەسەندندا بوون، هەموو ئەمانەش بنەمای گرنگ و بەهێزی گەشەی شارنشینین لە پارێزگای هەولێردا.

**پەراوێزەکان:**

* هەولێر لە کۆنەوارە سیاسیەکاندا: بریتییە لە ڕووداوە سیاسییەکانی کە بەدرێژایی کاتەکانیدا کە هەولێر وەکو شوێنگەیەکی سیاسیی پێیدا ڕۆیشتووە.

(*) عبدالرزاق الحسني، العراق قديما وحديثا، ط ٣، مطبعة دار الكتب، بيروت، ١٩٧٣، ص. ١٣٦(جمال بابان، اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، مطبعة الاجيال، بغداد، ١٩٨٩، ص١٧). و (زوبير بلال اسماعيل، اربيل في ادوارها التاريخية، مطبعة النعمان، النجف الاشرف، ١٩٧١، ص ٦١-٦٢).
(١). عەبدوڵا غەفوور، جوگرافیای کوردستان، چ٤، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ٢٢٩.
(٢) طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، ط٢، دار شؤون الثقافية العامة للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٨٦، ص١٨٠-١٨٤.
(٣) عبدالرزاق عباس حسين، نشاة المدن العراقية وتطورها، ط٢، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٧٧، ص٨.
(٤) اسماعيل حجارة، التنقيب في قارنجة (اربيل) الموسم الرابع ١٩٧٠، مجلة سومر، المجلد٢٩، ج١-٢، مديرية الاثار العامة، بغداد، ١٩٧٣، ص١٢-٣٤.
(٥) طه باقر واخرون، تاريخ العراق القديم، ج١، مطبعة جامعة صلاح الدين/ اربيل،١٩٨٧، ص١٤٩.
**(6) Rafid Abdulla Abdulsamad. "Erbil in cuneiform source historical revision of historical ages" Special issueon the first International Scientific confrance for Renovation of Hawler (Erbil) citadel. (may2003) p 18-20.**
(٢) شهاب الدين ابي عبدالله ياقوت بن عبدالله الحموي الرومي البغدادي، معجم البلدان، المجلد الاول، ط٢، دار الصادر للطباعة و النشر، بيروت، ١٩٩٥، ص١٣٨.
(٣) طه باقر و فؤاد سفر، المرشد الي مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الرابعة، بغداد، ١٩٦٥، ص٣-٤.
(٤) محسن محمد حسين، اربيل في العهد الاتابكي، مطبعة الاسعد، بغداد، ١٩٧٦، ص٢٢١.
(٥) مەولود قادر بێخالی، هەولێرم وادیوەو...بیستووە، بەرگی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر،١٩٩٧، ل٢٩٧-٣١.

*

# هەولێر شاری خوداوەندی مەزن بیل و شاووشکا

دکتۆر جەمال رەشید ئەحمەد

**ئوربیللوم هەولێر**
**ئوربیللو ئەولێر**
**ئوربیل ئەوریل**

ئەربێلا - ئەربیل - ئەرویل

بە پێی وتەی مێژووزانی یۆنانی بەناوبانگ هیرۆدۆتس (Herodotus ٥٢،v) ... ئەو رێگا شاهانە کە لە ساردیسەوە دەچووە وڵاتی پارس لە هێڵی ماتیێنی Matiene (کوردستان)ەوە بەرەو بەداری - بەکسای (بەدرە و لورستان) لە وڵاتی ئەرەپخاوە Arrapha (کەرکووک)ەوە تێپەڕ دەبوو.

لەم هێڵەدا ٣٤ پنتی پشوودان (Stations) هەبووە و درێژایی رێگاکە ١٣٧ پەیەنگ بووە، کە لە نیوەی سەدەی چوارەمی پێش زاییندا ئەسکەندەری مەکەدۆنی بەکاری هێناوە. (بڕوانە کتێبی Plutarch) مەکەدۆنییەکان بە رێگای شاهانە گەیشتنە بابل و پیرسە پۆلیس، بەڵام بە نێوبانگترین کارەساتی مێژوویی، کە لەم هێڵەدا رووی دا شەڕی گەوگەمێلا Gaugamela (خان هوشتر) نێزیک هەرێمی ئەربیلا بووە. جوگرافیناسی یۆنانی سترابۆ دەڵێت : «شاری نەینەوا کەوتۆتە دەشتی ئاتوریا Aturia » (بڕوانە Sstrabo XVI، ١،f٣).

هەروەها دەڵێت : «پاش ئاتوریا هەرێمی ئەربێلا Arbela دێت، کە رووباری Lykos (زێی گەورە) کەوتۆتە نێوانیان. دوای ئەربێلا رووباری Kykos (زێی بچووک) دێت» (بڕوانە Strabo XVI، ١،٣).

هەرچەندە ناوچەکانی باکووری رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە لە چەرخی هیللینیدا بە وڵاتی ئاتوریا و ئەربێلا Arbela و Aturia نێوبانگییان دەرکردبوو، بەڵام ئەو هەرێمەی کە کەوتبووە نێوان دوو زێی (گەورەو بچووک) دوا بە دوای ئەم چەرخە بە وڵاتی دیەب Adiabene نێودار بوو، ئەربێلاش بوو بە جێنشینی شاهانی سەکەس لەم وڵاتەدا.

بە پێی وتەکانی پلوتارخوس «ئەسکەندەری مەکەدۆنی کاتێک هەرێمی ئەربێلای بەجێهێشت رووی کردە وڵاتی ئەرپاخی Arpakhi (ئەرە پخای کۆن)» کە بە قسەی ئەم مێژوونوسە ... مەکەدۆنییەکان چاویان بەکانی نەوت و گڵپی ئاگری بن ئەرد کەوت، کە بە Korkoura (واتە گوڕگوڕ) نێوبانگی دەرکردبوو .... پاشان پلوتارخوس دەڵێت، کەوا ... ئەربێلا و ئەرپاخی (هەولێر و کەرکووک) بە پێی دابەشکردنی ئیداری سەردەمی هەخامەنشیان بەشێک بوون لە ساتراپی (شاتراپ = هەرێم) ی میدیا و پەرستگای خوداوەندی ئەڤینی ئەناهیتا (شاووشکا) لە کورکورادا لە لایەن مەکەدۆنییەکان بەرچاو کەوتووە ... . (بڕوانە Plutarch، Alex. ٣٥ )

لە سەرەتای چەرخی ئیسلامیدا مرۆڤ لە رێگای شاهانەدا دەیتوانی نزیک شاری سەفی Sapha بەسەر رووباری دیجلەدا بپەڕێتەوە گەوگەمیلاو ئەوجا دەکەوتە هەرێمی ئەربل (ئەربێلا) و لەوێشەوە بەرەو کەرخینی (کەرکووک) و کوفری و مەندەلی و دێر شۆڕ دەبووەوە. نێوی هەولێر، دارشتنێکی کوردی نوێیە بۆ نێوێکی کۆن کە لە تابلێتە مێخییە کۆنەکانی سومەری و ئەکەدیدا بەشێوەی ئوربیللوم Urbillum بەرچاو دەکەوێت. ئوربیللوم لە سێ برگە پێک دەهات. یەکەمیان ئور (Ur) (واتە، باژێر یان جێنشین) و بیل (Bil) کە نێوی مەزنترین خوداوەندی ناوچەکە بووە و سێهەم برگەی وم(Um) وەکو پاشگرێک دەکەوتە کۆتایی نێوی وڵاتان و شاران وەک ئیلامتوم و کوتیوم و سوبارتوم، کە لە لایەن ئەکەدی و بابلی و ئاشوورییەکان کورت کراونەتەوە و بوونەتە ئوربیللو، ئیلامتو هەروەها سوبارتو، ئەمڕۆ ئەم پاشگرە لە زمانی عەرەبیدا وەک خۆی لە جۆرە نێوێک وەک القرية (قەریەتو) و المدينة (مەدینەتو) بە دیار دەکەوێت. بەم جۆرە نێوی ئوربیللووم - Ur – Bil Bil- واتای (شاری بیل) دەگەیەنێت.

بیل Bil ، هەر لە گەڵ داهاتنی چەرخی مێژووییدا مەزنترین ئەندامی

کۆمەڵگای خوداوەندان (Pantheon)ی بیری دانشتوانی ناوچەی هەولێر بووە. ئەم خوداوەندە دوارۆژی ئەستێرەکانی ئاسمانی چارەنووس دەکرد و لە سەر تابلۆ و پەیکەرەکاندا لە پاڵ هەتاوو مانگدا دەستنیشان دەکرا. بابلییەکان پایەیەکی بڵندیان بەم خوداوەندە بەخشیوەو لە چیرۆکی داهێنانی ژیاندا (ئینومائیلش) دا نێوی بیل تێکەڵ بە نێوی مەردوخ بووە و بە شێوەی Bilmaduk تۆمار کراوەو لە شاری تەدمور (تدمر) دا جارێک بیل وەکو خوداوەندی رۆژ Bil - Malik نێودار بووە، و لەم رووەوە میشرا / میترا ، کە لە چەرخی میتانیدا جێی گرتەوەو لە لای ئێرانییەکان بە میهرا نێودار بووە، رۆمانەکان کردیان بە Sancitissimus Sol واتە (هاماوی هەتاوی پیرۆز). بیل هەتاکو چەرخی سەلوکی (سەدەی ٣- ١ پ. ز) لەباشووری کوردستاندا بۆ هەمان مەبەست و لە چوارچێوەی بیرێکی میتالۆژیدا دەپەرسترا، کە گرنگترین دیاردەکەی مردنی ساڵانەی ئەم خوداوەندە بووە و ٢٥ لە سەر ٢٦ ی دیسەمبەر(کانوونی یەکەم) شەوی لە دایکبوونی بووە کە لە پاش بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت لە زۆربەی ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا بوو بە رۆژی لە دایکبوونی عیسای یەشوع.

کۆنترین نیشانەی مێخی سەبارەت بەم خوداوەندە دەگەڕێتەوە هەزارەی سێی پێش زایین و لە تێکستەکانی ساری (فارا) ی سومەری بە شێوەی (دینگر، ئیم) تۆمار کراوە، کەچی لە بابلی کۆندا وەک ئین - بیل - ولو ناسراوە و لێپرسراوی هەورو باران و بروسکە و رێکخەری کاروباری ئاوەدانی و شوانکارەیی بووە و لە لای خورییەکاندا نێونراوە بە (تیشوپ Teshup) و پەرستگاکەی لە شاری کومێی (کومیا) بووە، کە کوتبووە ناوچەی زاخۆ.

لە داستانەکانی هیتییەکاندا تیشوپ پادشای خوداوەندان بووە، هەروەک چۆن لە سوریادا بە (مەلیک بیل Bil - Malik ) ناسرابوو. هاوسەری تیشوپ شاووشکا لای خوری و هیتییەکاندا هەبات (حەوات) بووە، کە لە لای عیبرییەکاندا هەروەکو خۆی (حوات) و لای عەرەبەکان بە شێوەی (حواء) ماوەتەوە.

بەم جۆرە لە بیری دانیشتوانی ئوربیللومدا شاووشکا هاسەری (بیل) بووە، کە لە لای سامییەکان بە (عشتار، عەشتەرووت و عەشیرە) نێودار بووە و پەرستگاکانی بە هەرێمی ئەربیللوم و ئەرەپخا بڵاوبووبوەوە. لە سەردەمی میتانییەکاندا ئەم خوداوەندە هەروەکو نیشانەی دایک و خۆشەویستی بە هەمان شێوە مایەوە. پادشای میاتییەکان توشراتتا نێوی نابوو بە (خانمی ئاسمان). بە پێی بۆچوونی سومەری و ئەکەدی و ئاشوری و خوری و هیتییەکان ( شاووشکا) خوشکی خوداوەند ( بوری) بووە، کە بەرزترین پلەی خوداوەندی لە کۆمەڵگای خوداوەندانی کوردستان هەبووە. لە شاری نوزیدا (٢٥ کیلۆمەتر خوار کەرکووک) دوو پەرستگای تیشوپ و شاووشکا پێکەوە دۆزراوەتەوە. پەرستگای هەمان خوداوەندان لە تیللی و هیلمان لە رۆژهەڵاتی گەورەی شاووشکا و تیشوپ هەبووە.

لە تێکستەکانی ئوگاریت (رأس الشمرا) دا زۆر رێز لەم دوو خوداوەندە نراوە و بە هەردووکیان وەکو لێپرسراوی کۆمەڵگای خوداوەندان ناسراون.

هەواڵی شاووشکا لە تێکستە پیرۆزەکانی پەرستگاکانی یازلی قەیا (لە ئەنادۆڵ) و کیزواتنا (لە نزیک ئەدەنە) و لە ئوگاریت (رأس الشمرا) لە سوریادا بەدیار دەکەون. لە داستانەکانی وڵاتی هیتی، هەرچەندە شاووشکا خوداوەندی خۆشەویستی و گینس بووە، بەڵام هەندێ جار وەک مێ و هەندی جاریش وەک نێر ناسراوە، لە هەردوو حاڵەتیشدا لێپرسراوی مۆسیقاش بووە، کە لە پاڵ خوداوەندانێک وەک شینتال - وری و شینتال - ئیرتی و شینان - تاتوکارنی دەستەڵاتدارێتی خۆی بەکارهێناوە.

بە پێی ئەو هەواڵە مێژووییانە، کە بە بیری میتۆلۆژی دانیشتوانی کۆنی کوردستان پێویستە، بیل وەک خوداوەندی باران و هەورو تریشکە و رووبار ئاوەدانی و شاووشکاش وەک خوداوەندی دایک و خۆشەویستی دەبێت لە گەڵ داهاتنی چەرخی کشتوکاڵی پێش داهاتنی نووسیندا خوداوەندانێکی باوەڕپێکراو بووبن و قەڵاتی هەولێریش هەر لە هەزارەی چوارەمی پێش زایینندا مەڵبەندی پەرستنیان بووە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر - ژمارە ٩ ی زستانی ساڵی ٢٠٠١ وەرگیراوە.

# مێژووی کۆنی سیاسیی هەولێر

دکتۆر ئەحلام سەعدوڵلا تالیبی
کۆلیژی ئاداب- زانکۆی موسڵ

**ناوی هەولێر لەزمان و زاراوەدا**

ناوی هەولێر (ئەربیل) لەزمانی ئەکەدیدا بە ئەربیلا Arbeles و لەزمانی سۆمەری بە Limmu2- Dinglr[1] هاتووە. لای سۆمەرییەکان لە دەوروبەری (٢٥٠٠پ.ز) بەناوی ئوربیل Urbil ناسرا بوو، پاشان لای ئاشوورییەکان بوو بەئەربائیلۆ: واتە شاری چوار خوا، پێشتر بنکەی پەرستنی خواوەند "عەشتار" (خوای جەنگ و سەرکەوتن) بوو[2]. کۆنترین سەرچاوە کە لەسەر هەولێر گەیشتبێتە ئێمە، ئەو ئاماژەدەرانەن، کە لە دۆسییەی شایەکانی بنەماڵەی ئوری سێیەم هاتووە، کە نووسیویانە ئور-بیلوم Ur-bilum. هەروەها بەهەمان ناو لەساڵنامەی دەقی رووداوەکانی مێژوونووس هاتووە، کە بۆ ساڵی چل و سێیەمی دەسەڵاتی شاشولکی (٢٠٩٥-٢٠٤٨ پ.ز) دەگەڕێتەوە. ساڵی دووەم بۆ دەسەڵاتی شا ئامارسن (٢٠٤٧-٢٠٣٩ پ.ز) دەگەڕێتەوە[3].

هەروەها ئەو ناوە لەیەکێ لەدەقەکان هاتووە، کە پەیوەندی بەدانیشتوانی ناوچە کراوەکانەوە هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شای ئاشووری ئەسەرحەدون (٦٨٠-٦٦٩ پ.ز) دەقەکە دەڵێت: (... ولاتی ئاشوور تا سنوور پڕ لەخەڵک بوو وەکو کەنانە... بەڵام ئەوانی تر وەکو مەڕو مالاّت و بزن لەنێو کۆشکەکانم و دەوروبەری کۆشکەکەم دابەش کران، پیاوانی نەینەوا و کەلخو (واتە نەمرود)، کە کزواو ئەربیلا...)[4].

لەکتێبەکەی کریەری توێژەر بەناوی سۆمەرییەکان هاتووە، هەڵمەتەکانی شا سەرجۆنی ئەکەدی (٢٣٧١-٢٣١٦ پ.ز) گەیشتە ئەربیلا، سەرەڕای ئەوەی کۆنترۆڵی رێگای داهاتە بازرگانییەکانی لەباکوورو ناوەڕاست و باشووری عێراقی کردبوو[5]. ئاماژەی بەوەش داوە ئور-بیلم (ئەربیل) دەڤەرێک بوو سەربە سوبارتۆ Subaretu ناسرا بوو[6]، لێرە حەز دەکەین ئاماژە بە وشەی سوبارتۆ بدەین،

کەزۆر پرسیاری لای توێژەرەکان وروژاندووە، کێ ئەو زاراوانەی داناوە؟ و رەچەڵەکی سوبارتییەکان چییە؟ ئایا هەولێر سوبارتۆیە وەکو هەندێک وا مەزندە دەکەن؟... هەڵبەت شتێکی سروشتییە ئەو جۆرە پرسیارانە بێنە پێشەوە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە توێژەرەکان زانیاری تەواویان لەسەر ئەم بابەتە نییە، بەتایبەت ئەو دەقە بزمارییانەی پەیوەندییان بەخودی ئەو بابەتەوە هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دەتوانین ئەو زاراوەیە لە رێگای نووسراوی مامۆستا تەها باقر و هی تر روون بکەینەوە. بۆ نموونە زۆر لەدەقەکانی بابلی بەکارهاتوون، کە هاوواتای ولاتی ئاشوورن و ئاشوورییەکان دەگەڕێننەوە بۆ دوا چاخەکانی مێژوو، بۆ نموونە کاریگەریی بابلییەکان بە ناسراوە مردوک- ئەبلا- ئەدینا- (٧٢١-٧١١ پ.ز)، باس لەناحەزەکەی شای ئاشووری سەرجۆن دەکا (٧٢١-٧٠٥ پ.ز) بەوەی کە شای ولاتی سوبارتۆ بووە، نەک ولاتی ئاشوور.

بەڵام ئاشوورییەکان وشەی سوبارتۆیان پەراوێزکرد بوو، چونکە بەولاتەکەیان دەوترا جگە لەهەندێ دەق نەبێ کەتایبەت بوون بەفالچی و بەختگر، هۆکارەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەو وشەیان بەکەمایەتی دەزانی، چونکە ئەوسا هەمان وشە بۆ بەندەش بەکار دەهات[٧].

بەڵام سەبارەت بەنەژادی سوبارییەکان و زمانەکەیان هیچ شتێ نەزانراوە و هەرچی دەربارەی زمانەکەیان گوترابێ لەزمانەکانی هیندو- ئەورووپی نەبووە. بەلکو ئەوانە نەتەوەی ناوچە شاخاوییەکان بوون و لەباکووری نێوان دوو زێیان (هەردوو رووبارەکە)، لەناوچەی دوورگەی گەورە و رۆژهەڵاتی دیجلە نیشتەجێ بوون، کە نیشانە و سیمای خۆیان هەبوو لە ناوچەکانی باکووری عێراقدا کە بەولاتی ئاشوور ناسراوە[٨]. شارە سەرەکییەکانی: نەینەوا، ئاشوور، هەولێر، ئارابخا (نوزی- کەرکووکی ئێستا)[٩] بوو. کاتێ ئاشوورییەکان لە بەشی باکووری میزۆپۆتامیا نیشتەجێ بوون، بەشێکی زۆر لەسۆبارییەکان بەرەو ناوچە شاخاوییەکانی رۆژهەڵاتی دیجلە چوون[١٠]. باس کرا زاراوەی سوباری زاراوەیەکی شاراوەیە و چەند واتایەکی جیا جیا دەگەیەنێت و لەچەند ماوەیەکی جیا جیادا بەکارهاتووە. بەڵام یەکێ لەتوخمە جێگرەکانی، هەمیشە بەواتای گەلی باکوور هاتووە. ئەو جۆرە بەکارهێنانە وا لەزاراوەی ولاتی سوبارییەکان دەکات کە ئەوسا ئاماژەدەر بوو بۆ شوێنێک لەباکووری موسڵ[١١]، واتە بەتایبەت شاری هەولێر نا. بەڵام ناوەکەی لەنێو دانیشتوانی هەولێری ئەمڕۆدا وەک خۆی نەماوە چونکە هەر جارێ بەشێوەیەک هاتووە، جارێک (ئۆربیل) جارێکی دیکە (ئۆلێرا- هەولێرا). لای ولاتە عەرەبییەکانیش بە (ئەربیل) ناسرا[١٢].

## پێگەو نیشتەجێ

هەولێر کەوتۆتە ناوجەرگەی هەرێمی حەدیاب (ئەدیابێن)، لای پەرسییەکان و میدییەکان بەوە ناسرابوو کە لەسەر شێوەی نیوە دیارکراوێک بوو، لایەکی دیجلە بوو لایەکەی دووەم و سێیەمی هەردوو زێی گەورەو بچووک و زنجیرە چیاکانی زاگرۆس بوو. لایەنی چوارەمیش دەشت و گردۆلکە بوو، کە نزیک بوو لە خاکی ئاشووری کۆن، هەروەها نزیک بووە لە (هەر چوار پایتەختەکانی ئاشووری کۆن). هەرێمەکە بە بەرهەمهێنانی باشترین جۆری دانەوێڵە لەعێراق ناوبانگی دەرکرد بەتایبەت گەنم و جۆ، شایانی باسە تا ئەمڕۆش ئەو ناوچەیەی دەشتی هەولێر، ئەو ناوبانگەی هەر ماوە[١٣]. لەساڵی (١٨٢٠ز) شوێنەوارناس (کلۆدیوس ریچ) گەشتێکی دەست پێکرد بۆ دۆزینەوە و دەرخستنی شوێنەواری ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان. لەشاری هەولێر، ریچ جەختی کردەوە، ئەو قەڵا کۆنەی بەسەر شارە نوێیەکەیدا زاڵە، زۆر لە باڵەخانەکانی خشت بەندن، ئەمەش زیاتر بەفارسەکان بەستراوەتەوە نەک ئاشوورییەکان[١٤]. هەروەها شوێنەوارناسەکان پاشماوەی پەرستگایەکیان دۆزییەوە لەسەر گردێک کەناسراوە بە (قالینج ئاغا)، نزیکەی یەک کیلۆمەتر لە قەڵای هەولێر دوورە و باس لەرۆڵی وەرکای چوارەم دەکات[١٥]. ئەو گردەی کەئەمڕۆ پێی دەڵێن (هەولێری کۆن) واتە قەڵا، خانووی ماڵنشینیان لەریز یەک دروست کردووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دانیشتوانی کوردستانی کۆن، پشتیان بەچاککردنەوەی کەلاوەکان داوە و لەهەمان کاتدا پاشماوەکەشیان بۆ بناغە بۆ باڵەخانە تازەکانیان بەکارهێناوە، کاتێ ئاستی خانووە ماڵنشینییەکان لەئاست یەک دەڕۆیشت. بۆیە شارەکان بەرز و بەرزیان دەروانی بەسەر دەشتاییەکەی دەورەبەریدا. لەو نیشتەجێیانەی هەرگیز چۆڵ نەکران و بە بەردەوام ژیانی تێدا گوزەرا تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت هەردوو قەڵای هەولێرو کەرکووکن[١٦]. قەڵای هەولێر هەر وەکو خۆی مایەوە و بەدرێژایی سەدان ساڵ دوور بووە لەهۆکارەکانی رووخان و تێکچوون و کاول بوون[١٧]. شایانی ئاماژە پێکردنە ئەستەمە بتوانرێ لێکۆڵینەوە لەسەرووی

قەڵاوە بکرێ تاچینەکانی هەرە ژێرەوەی قەڵاکە[١٨]. ئەوەی تێبینی دەکرێت نەپشکندرێ، نەینەواو *هەولێر لەسەردەمی پێش شەمس* ئەددی یەکەم (١٨١٤-١٧٨٢ پ.ز) بەشێک نەبوون لەشانشینەکەی، کە بارەگاکەی ئاشوور بووە بە بەڵگەی ئەوەی شاری گاسر Gasur ناوی کۆنی شاری نوزییە کەنزیک بووە لە کەرکووک، بەشێک نەبووە لە شانشینی ئاشوور، بەڵکو لە دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێکهاتبوو، هەروەکو لەم دەقەدا هاتووە (اني الحاكم بن انن- لأب كرسي هذا الى الالهة أنن من غنائم جاسر)[١٩]. گومان لەوەدا نییە بەهاتنی شمس ئەدد، ئەو شارە کەوتە ژێر یەک دەسەڵات و شا دەستیکرد بەدووبارە نۆژەنکردنەوەی پەرستگا لە بۆ نەینەواو هەر شارێکی و لە هەولێر بەخشینێکی تۆمارکرد، هەروەها دەسەڵاتیشی رۆیشت بەسەر ئارابخا (واتە کەرکووکی ئێستاکە) بۆیە سەرجەم وڵاتی ئاشوور بەمانا بەرفراوانەکەی لەسەردەمی ئەودا بەیەک شانشین دادەنرێت[٢٠]. لەلایەکی تر ئاهەنگ گێڕانی ئەکیتۆ (سەری ساڵ) لەوڵاتی ئاشووردا مەرج نەبوو لەسەرەتای ساڵدا لەمانگی نیسان سازبدرێت، بە بەڵگەی ئەوەی ئەو ئاهەنگانە لەنزیک شاری هەولێر یان لەمانگی ئاب یاخود ئەیلول ساز دەدرا[٢١]. ئەوەش سەبارەت بە هەولێر کارێکی گرینگ بوو، بە پیرۆز دادەندرا، چونکە پێگەیەکی سەرەکی بوو، *بۆ پەرستنی خواوەندی ئەشتار وەک لەپێشەوە* باس کرا. لەبایەخێکی تردا، سوپای ئاشوور چالاکییە سەربازییەکانی لەو شارەدا بەئەنجام دەگەیاند. ئەویش لەشاری کالیزی (خالیزی Kalizi) کە کەوتبووە باشووری رۆژئاوای هەولێر و بەدووری سی میل لەرۆژهەڵاتی کلخود (نەمرود)ەوە[٢٢]. هەروەها پێمان باشە ئاماژە بەشای ئاشوور پانیپال (٦٦٨-٦٢٦ پ.ز) بدەین کاتێ بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی بەسەر وڵاتی ئیلام لەساڵی (٦٣٩ پ.ز) ئاهەنگی دەگێڕا[٢٣].

## رەوشی گشتی سیاسی شارەکە

هەڵبەتە هەرێمی حەدیاب و بنکەکەی کە هەولێرە، ژمارەیەک حوکمڕانی بەخۆیەوە بینی (ئاشوورییەکان- میدییەکان- ئەغریقییەکان- پەرسییەکان- رۆمەکان- ئەرمەنەکان- جارێکی تر رۆمەکان، پاشان فارسەکان، دواتر عارەب)[٢٤]. سەرەڕای ئەوەی ئەو ناوچەیە شوێنێکی پیرۆز بوو، لەهەمان کاتدا گۆڕەپانی چالاکییەکانی سەربازیش بووە، بەو بەڵگەیەی ساڵنامە باس لەجەنگی ئاشووری- بابلی دەکات کە بەدووری بیست میل لەشوێنێک لە باشووری رۆژئاوای هەولێر روویداوە[٢٥].

هەولێر لەسەردەمی ئاشوورییەکاندا وەکو شاری نەینەوا رێزی خۆی هەبوو، بەڵام دوا *نوشووست هێنانی لەساڵی (٦١٢* پ.ز) *لەسەر دەستی میدییەکان* بەهاوکاری لەگەڵ بابلییەکان، بووە هۆی ئەوەی شارەکانی دیکەی ئاشووریش تێک بچن و دەستیان بەسەردا بگیرێت، یەکێک لەوانە هەولێر بووە، بەڵام پیرۆزی شارەکەی لە کاولکاری پاراست. پاشان هەولێر کەوتە ژێر دەسەڵاتی فارسە ئەخمینییەکان. ئەوە بوو لەکۆتایی حوکمڕانی ئەواندا شەڕی بەناوبانگی کوکەمیلە[٢٦] روویدا. تاوای لێهات ناوی هەولێری بەخۆوە بینی، تەنانەت هەندێ کەس ناوی شەڕەکەیان بەجەنگی (هەولێر) ناوبردووە[٢٧]. شایانی ئاماژە پێکردنە ئەوە بووە بازنەیەکی چەکداری لەنێوان سوپای فارس و سوپای مەکدۆنی روویدا. ئەم ململانێ و جەنگە لەنێوان ئەو دوو سوپایەدا گەورە بوو، تا وای لێ هات بڕیاری لەسەر چارەنووسی ئاسیاو رۆژهەڵات بۆ ماوەیەکی درێژخایەن دا. ئەمە و ئامانجی ئەسکەندەر لەو هەڵمەتەدا ئەوە بوو بگاتە شاری بابل و بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. هەر چەندە لە توانایدا هەبوو وڵاتی فارس هەر هەمووی بخاتە ژێر رکێفی خۆی، کۆتایی بەقەوارەکەشی بهێنێت.

فارسەکان شوێنێکی شیاویان بۆ جەنگ هەڵبژارد و، وا مەزەندەیان کرد کە لەو شوێنەدا دەتوانن بەشێوەیەکی چالاکانە و

باش گالیسکەکانیان بەکاربهێنن. کاتێ ئەسکەندەر ویستی لەو شوێنە پێیان بگات کەهەڵیان بژارد و سەربازەکانی تێدا کۆکردەوە. دەشتێک بوو لەنزیک گوندی گۆگەمیلە کە سی میل لەرۆژئاوای شاری هەولێر دوورە[٢٨]. ئەسکەندەر، بەحەوت هەزار سەربازی سوارچاک و سی هەزار پیادە بەرەو ڕووباری فورات لای پێگەیەک، کە پێی دەوترا ساسباکوس (کەوتبووە سەر ڕووباری فورات، باشووری رۆژئاوای حەلەب) بەرەو پێش چوو. پاشان ئامادە بوو بۆ پەڕینەوە بەرەو میزۆپۆتامیا و دوو پردی بەمەبەستی بە ئاسانی پەڕینەوە ئامادە کرد. وادیارە ڕێگاکەیان لەگەڵ ڕێڕەوی ڕووبار دەهات تا دەگەیشتە بابل. لەسەر بنەمای ئەو پێشبینی کردنە، دارای سێیەم سوپاکەی لەسەرووی ڕووباری دیجلە چرکردەوە، تا بتوانی بەئازادی بجوولێ و ئەو ڕێگاوبانانەش بپچڕێنێت کە کۆمەکی ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆ دەکرێت. هەڵبەتە ئەو نەخشە و پلان دارشتنە نوشووستی گەورەی وەدەست هێنا و دارای سێیەمی ناچارکرد هەڵێ و لەجەنگەکە دۆڕا. پاشان ئەسکەندەر لە کوکەمیلە دەستی پێکرد بەلای باشووردا بۆ هەولێر. لەڕێی بچووک پەڕییەوە بەلای دیالادا ڕۆیشت بەرەو بابل، ئەوە بوو لەساڵی (٣٣١ پ.ز) چووە ناو بابل[٢٩].

لەپاش نەمانی دەسەڵاتی ئەسکەندەر هەرێمی حەدیاب و هەولێر وەکو هەرێمەکانی دیکەی عێراق، کەوتە ژێر دەسەڵاتی سلوکییەکان (٣١١-١٢٦ پ.ز) و دەسەڵاتی فرسەکان لەساڵی (١٢٦-٢٢٧ پ.ز)[٣٠]. لەساڵی (٨٣- پ.ز) ئەرمەنییەکان دەستیان بەسەر شانشینی حەدیاب و هەولێردا گرت[٣١]. دەسەڵاتەکەیان بەرفراوان بوو بەتایبەت لەسەردەمی شا ئیزات دا (٣٦- ٦٠ پ.ز) کە نزیکترین کەس بوو لەشای فارسییەکان ئیرتبانی سێیەم (١٢-٣٨ پ.ز). یارمەتی ئیزاتی دا تا عرسەی لەتیسفون گەڕاندەوە، پاشان ئیرتبان بەشێکی لە ئەرمینیا پێبەخشی. لەهەموو لایەنێکەوە دەستی بەسەر حەدیاب و نەسیبەین و شەنگالدا ڕۆیشت. لەوانەیە (حەزەر)یش سەر بەئەو بووبێ، چونکە پەیکەرێکی لەمەڕمەڕ کە، هی شای حەدیاب ناوی (ئەسلو) بوو تێیدا دۆزراوەتەوە، کە مەزارگەی پەرستگای سێیەم بوو، تایبەت بوو بەپەرستگای خواوەند (بەعل و شمین)[٣٢]. پاش ئەوەی دەسەڵاتی تراجانی ڕاگیرکرد، ڕۆمای جێهێشت و بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشت تا لە ساڵی (١١٤ ز) گەیشتە ئەنتالیا. ئینجا دەستی کرد بە هەڵمەتەکانی بەرەو ئەرمینیا تا ئەویشی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی. لەساڵی (١١٥ ز) ڕووی لەنەسیبییەکان و ماردین کرد و دەستی بەسەر ئەوانیش

داگرت کە ئەوسا سەر بە شانشینی حەدیاب بوون. پێدەچێ دانیشتوانی شاری(حەزەر) لە ریزی سوپای حەدیاب یان وەک هاوپەیمان بەرگریان لێ کردبێ[٣٣]. سەرچاوە لاتینییەکان دەگێڕنەوە تراجان لە ساڵی (١١٦ ز) لەڕووباری دیجلە پەڕییەوە و شانشینی حەدیابی خستە ژێر دەستی خۆی، بەتایبەت پاش ئەوەی شاو بنەماڵەکەی هەڵاتن.[٣٤] لەساڵی (١١٧ ز) پاش مردنی تراجان (سبتموس سفیروس) کورسی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی گرتە دەست و بڕیاری دا، شایانەی تۆڵە لە ڕۆژهەڵات بکاتەوە، کەیارمەتی دوژمنەکەیان دابوو و دژی وەستابوون. لەوانە شای دەوڵەتی حەزەر، شای شانشینی حەدیاب و ئەودیا (ئەلرەها). لەساڵی ١٩٧ز ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بەرەو بابل و سلوکییەو تیسفون کەوتە ڕێ و لەئەنجامدا دەستی بەسەرداگرتن. دواتر بەرەو باکوور چوو، تادەست بەسەر حەزەرو حەدیابیشدا بگرێت[٣٥]. لە دوماهیدا توانی هەموویان بخاتە سەر ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی و نازناوی (ئەدیابنیسوس)ی وەرگرت، واتە (خاوەنی حەدیاب)[٣٦]. لەسەردەمی حوکمرانی ڕۆمانییەکان حەدیاب و هەولێر لە سەر دەستی (ڕاکلس: کرکالا) لە ڕووی دوژمنایەتییەوە تاڵییەکی زۆریان چەشت و شوێنە پیرۆزەکان پیس کران. ڕاکلس لەدوای سڤیروس

جڵەوی حوکمڕانی گرتە دەست و پیرۆزی گۆڕستانی فارسەکانیان لە هەولێر پێشێل کرد و تەرمەکانیان دەرهێنان و لەدوور فڕێیان دان، بۆیە فارسەکان هەر چەندە لاواز بوون، بەڵام دەستیان کرد بەکوشتنیان[37] لەسەردەمی ساسانییەکان لەهەرێمی حەدیاب ژمارەیەک دەوڵەتی بچووک دامەزران، بەڵام هەرێمەکە کە بنکەکەی هەولێر بوو، هەر لەژێر دەسەڵاتی ساسانییەکان مایەوە تا عەرەبە موسڵمانەکان لەساڵی (٦٣٧ز) وڵاتەکەیان فەتح کرد[38].

**سەرچاوە و پەراوێزەکان:**

١- رينيه لابات، قاموس العلامات المسمارية، منشورات المجمع العلمي، ٢٠٠٤، ترجمة، الاستاذ خالد سالم اسماعيل و (اخرون) مراجعة واشراف: أ. د.عامر سليمان، ص٢٩٧.

٢- ادوارد كبيرا، كتبوا علي الطيف، شيكاغو، ١٩٣٣، ترجمة: محمود الامين، ١٩٦٤، ص٤٩.
وكانت الالهه عشتار تعرف بعشتار الاربيلية، وقد شيد الاشوريين لها في اربيل مجموعة مصادر، ينظر: قحطان رشيد صالح، الكشاف الاثري في العراق، بغداد، ١٩٨٧، ص٨١.

٣- طه باقر، من تراثنا اللغوي، بغداد، ١٩٨٠، ص١٥٧.

٤- صباح حميد يونس، نينوي خلال عصر السلاله السرجونية (٧٢١-٦١٢ ق.م) رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة الموصل، ٢٠٠٣، ص١٧.

٥- صموئيل نوح كريمر، السومريون، شيكاغو، ١٩٦٤، ترجمة: فيصل الوائلي، كويت، ١٩٧٣، ص٧٤.

٦- فؤاد جميل، حدياب، اربيلا، وعشتار اربيلا، سومر، ٢٥ (١٩٦٩)، ص٢٢٣.

٧- طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، بغداد، ط٣، ١٩٧٣، ص٧٩-٨٠.

٨- طه باقر، المصدر نفسة، ص٧٩.

٩- هاري ساكز، قوة اشور، لندن. ١٩٨٤، ترجمة: الاستاذ الدكتور عامر سليمان، بغداد، ١٩٩٩، ص١٥.

١٠- طه باقر، سەرچاوەی پێشوو، ص٧٩.

١١- هاري ساكز، قوه اشور المصدر السابق، ص١٥.

١٢- فؤاد جميل، المصدر السابق، ص٢٢.

١٣- فؤاد جميل، المصدر نفسة، ص٢١٩.

١٤- هاري ساكز، قوه اشور المصدر السابق، ص٤١٨.

١٥- طه باقر، المقدمة، المصدر السابق، ص٤١٨.

١٦- فؤاد جميل، المصدر السابق، ص٢٢١.

١٧- ادوارد كبيرا، المصدر السابق، ص٤٩.

١٨- هاري ساكز، المصدر السابق، ص٢٧.

١٩- هاري ساكز، المصدر نفسه، ص٤٩.

٢٠- هاري ساكز، المصدر نفسه، ص٦١.

٢١- هاري ساكز، المصدر نفسه، ص٢٩٧.

٢٢- هاري ساكز، المصدر نفسه، ص٣٥٦.

23- Gadd. G. j, Persain, 800-1550-BC- CADC The Assyrrian Dictionory, Vol. 11 (1974)

٢٤- فؤاد جميل المصدر السابق، ص٢٢٩.

٢٥- هاري ساكز، المصدر السابق، ص٧٣.

٢٦- ليس من السهل لقيين كوكميلة، فالبعض من الباحثين يرجع انها قرية كرميلي الحالية ومنهم من يري انها في سهل الكومل قريبة من نينوي وكانت على بعد ١٤٤ كم تقريبا من مدينة اربيلا (اربيل الحالية) في ذلك منظر: جاسم عباس محسن، احوال العراق ابان الاحتلال السلوقي، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة الموصل، ٢٠٠٥، ص٦١٦.

٢٧- فؤاد جميل، المصدر السابق، ص٢٢٩.

٢٨- الحفصي، محمد الابعد، الغزو اليوناني لبلاد الرافدين، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة الموصل، ٢٠٠٣، ص٤٥-٤٩.

٢٩- جاسم عباس محسن، المصدر السابق، ص٧.

٣٠- بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: جاسم عباس، المصدر السابق، ص٢٠٦.

٣١- فؤاد جميل، المصدر السابق، ص٣١.

٣٢- فؤاد سفر، الحضر مدينة الشمس بغداد، ١٩٧٤، ص٢٦.

٣٣- فؤاد سفر، المصدر نفسة، ص٢٩.

٣٤- شاكر محمود اسماعيل العبيدي، حضارة دولة الحضر العربية في شوء التثابات القديمة، اطروحه دكتوراه غير منشورة، جامعة الموسل، بغداد، ٢٠٠٥، ص١٣٤. وللمزيد من التفصيل عن مدينة الحضر ينظر كذلك.

**A1-Talidi- Ahlam/ Hatra- une vill an passprestigieux. Memoire de D.E.A. France 1987.**

٣٥- جابر خليل ابراهيم، صمود الحضر، مجلة بيت النهرين، ٧٥-٧٦ (١٩٩٢)، ص٣٦.

٣٦- فؤاد جميل، المصدر السابق، ص٢٣٢.

٣٧- فؤاد جميل، المصدر نفسة، ص٢٣٢، كذلك ينظر، ماجد عبدالله الشمس، الحضر، بغداد، ١٩٦٨، ص١٢.

٣٨- فؤاد جميل، المصدر السابق، ص. ٢٣٢

# هەولێر پایتەختی ئاینیی ئاشوورییەکان

دکتۆر ئیبتهال عادل تائی
کۆلیجی پەروەردە - زانکۆی موسڵ

**دەروازە:**

خوایەکانی ئەشتار لەلایەن دانیشتوانی دۆڵی رافیدەین بایەخێکی تایبەتی پێدەدرا. هەڵبەتە ئەو بایەخدانەش وای کرد لەدەقە بزمارییەکان بەچەندین کەسایەتی جیاواز دەربکەوێت، بەوەی کە بۆ توێژەران ئەستەم دەبێت ناسنامەی ئەو خوایانە بناسرێتەوە یان لە یەکتر جیا بکرێنەوە. ئەستەم بوونەکەی لە دەستپێکدا ناوەکەیەتی. چونکە لای سۆمەرییەکان بە Inanna هاتووە، دواتر بەم شێوەیە گۆڕاوە Nin.An.Na کە بەمانای رۆشنایی خاتوونی ئاسمان دێت[1] هەروەها مزگەوتی شار کە لوول پێچە بە کۆنترین نیشانەی بزماری دێت، کە لە سەردەمی وەرکا دەلالەت لەسەر ئەو خوایانە بکات و بە زاراوەی ئەکەدی بە ئەشتار Istar ناسراوە واتە، خودا بەشێوەیەکی گشتی، بۆ خودای کەسیش دێت، کە تاک وەری بگرێت وەک ئامرازێک بۆ شەفاعەت و ملکەچ بوون لای خوا گەورەکەی بەکاری بهێنێت[2].

شیاوی ئاماژە پێکردنە ناوی ئەنانا لای سۆمەرییەکان و ئەشتار لای ئەکەدییەکان، ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە بەزاراوەی دیکەی جیا جیای ناوخۆ بەکارهاتووە. بۆ نموونە ئەنانا لەشاری زبالوم. ئەشتار لەهەر یەک لە کیش و نەینەوا و هەولێر و نوزی (کەرکوک) بەکارهاتوون[3].

بەهەرحاڵ خوای ئەشتار جیاوازی هەبووە لەگەڵ خواکانی تر، بەوەی کە خوای خۆشەویستی و جوانیء سێکس و جەنگ بووە. هەروەها بەشێوەیەکی گشتی سەبارەت بە رەچەڵەکی ئەو خوایە تەمومژی هەیە و دەقەکانی بەوردی ئاشکرای ناکەن، بەڵکو شتی جۆراوجۆر دەدەنە پاڵ نەژادەکەی لە لیستی هەندێ نەژادی خوایەکان هاتووە کە کچی خوا "سین"ی خواوەند بووە خوای مانگ[4] فسگالی خواوەند دایکی بووە، بەڵام براکەی خواوەند خۆر بووە لە کاتێکدا کە ژمارەیەک خوا، خوا ئیدش- کیکال شاجوانی جیهانی خوارو و خوشکی بووە. هەندێ سەرچاوەی تر نەژادەکەی دەبەنەوە سەر ئەوەی کە کچی ئەنلیلی خواوەند بووە. لەهەندێ دەقی دیکەدا هاتووە کچی خوا ئەنکی بووە. هەروا لەهەندێ دەقی دیکەدا ئاماژە بەوە دەدات کە بە ناوبانگترین هاوسەری خوا دموزی (تەموز) بووە، کە پەیوەندییە تێهەڵکێشەکەیان لەزۆر ئەفسانەکان هاتووە کە کۆتاییەکەی لەسەر دەستی ئەو بووە. ژمارەیەک دەقیش ئاماژە بەوە دەدەن کە هەردوو خواوەند شاراو لۆلا کوری ئەو خوایە بوون. سەرەڕای ئەوانە هەر هەمووی لەهەندێ دەقدا وێنەی لەسەر شێوەی کچە گەنجێک هاتووە زێتر لەوەی کە بەلای ژندا بچێ یان دایک[5].

دەقە ئەدەبییەکانیش بۆمان روون دەکەنەوە کە کۆنەکان لەجەستەی ئەستێرەی زوهرەیان هەڵکشاندووە، کە بەرەها

جوانترین هەسارەی ئاسمانە. لە راستیدا ئەمەش پرسیارێک دەوروژێنێ کە چۆن دانیشتوانی دۆڵی رافیدەین دوو سیفەتی جیا لێک لەخوای ئەنانا- ئەشتار کۆبکەنەوە جارێک خوای خۆشەویستی و جارێکی تر خوای جەنگ. بەهەر حاڵ ئەفسانەکانی سۆمەری و ئەکەدی وردەکاری ئەو مەسەلەیان پاراستووە لەچیرۆک و بەسەرهاتی خوای خۆشەویستی ئەنانا- ئەشتار، خوای تەمووز کە لەدوماهیدا جووتیارێکی خواوەند هەڵبژاردو شووی پێکرد، هەروەک زانیاری تەواو بەدەست گەیشتووە لەبارەی ئەو ناخۆشیانەی تەموز. کە بەهۆی خۆشەویست و هاوسەرەکەی ئەنانا- ئەشتار بەسەری هاتووە. لایەکی تر چۆن تەسلیم بە شەیتانەکانی جیهانی خواروو کرا، کە ببێتە جێگری ئەو لە بەرامبەر دەرچوونی ئەودا لەو شوێنە، وردەکاری ئەو بەسەرهاتەش لە دانراوێکی ئەدەبی سۆمەرییەکان هاتووە، کە بەچیرۆک و بەسەرهاتی دابەزینی ئەنانا- ئەشتار بۆ جیهانی خواروو ناسراوە[٦]. بەو گوزارشتەی کە خوای جەنگە و بە زۆریش لەسەر مۆرە لوولەییەکان و هەڵکەنراوەکان دەردەکەوێت لەسەر چەکەکانیان کە هەڵیان دەگرت و پێکهاتبوو لە شمشێر و تیرو جوعبەی چەک کە لە شانیان توندەدەکردن[٧]. ئەمەش لەسەر بەردێک دۆزراوەتەوە کە ئێستا لەمۆزەخانەی لۆڤەر لەپاریس پارێزراوەو هێمای خوا ئەشتاری لەسەر دیارە لەشاری بورسیباربرس نەمروود دۆزراوەتەوە، کە نزیکەی (١٠کم) لەباشووری بابل دوورە. مێژووەکەی بۆ سەدەی هەشتەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە. لەسەر رووی بەردەکە وێنەیەکی هەڵکەنراوی خوا ئەشتاری (هەولێر) دەردەکەوێت. (بڕوانە وێنە ١) کە چەکدارە و لەسەر پشتی شێرێکە و بەرەو پێش هەنگاو دەنێ. خواکە دەستی لە بازنەیەک گرتووە کە لەملی شێرەکە کراوە و دەستی راستی تا ئاستی دەموچاوی بەرزکردۆتەوە. وەک ئەوە دیارە کە فەرمان بە رۆیشتن بکات. هەروەها لەسەر سەری خواکەش هەشت ئەستێرە دیارە[٨].

خواوەند/ ئەنانا ئەشتار هەر لەماوە زووەکان لای بیروباوەڕی سۆمەرییەکان شوێن و پێگەیەکی تەواوی خۆی لەدڵ و دەروونیان کردبۆوە. لەپاش هاتنی قەومەکانی دوورگەکان بۆ دۆڵی رافیدەین کەسایەتییەکی سەربەخۆی وەرگرت و لەخوایەکانی تر جیا بۆوە، بەتایبەت خواوەندی مێینە[٩]. لەسەردەمی ئەکەدییەکان (٢٣٧١-٢٢٣١ پ.ز) وەک خوای جەنگ بایەخێکی تایبەتی پێدرا، لەوانەیە ئەوە بۆ ئەوە بووبێ، کە لەگەڵ سروشتی دوورگەییەکان رابێ. سەرەڕای ئەوەی ئەو ئاوێتەییەی لەنێوان سۆمەرییەکان و ئەکەدییەکان هەبوو، دەرەنجامی نزیک بوونەوەی بیرۆکەکان هاتە پێشەوە و دواتر سیفەتی جەنگیان درایە پاڵ خواوەند ئەشتار. ئەنانا لەسەر سیفەتەکانی تر، وەک خوای خۆشەویستی و جوانی. ئەو خوایە لە سەردەمی ئەیسن/ لارسا پلەو پایەی بەرز بۆوە[١٠]. لای ئاشوورییەکانیش لەبەر ئەوەی خواوەندی جەنگ بوو پایەکەی زیاتر بوو تا وای لێهات بوو بەخوای دەوڵەت و هەردوو شاری هەولێر و موسڵ بوون بەبنکەی سەرەکی پەرستنی و ئەوەندە لێک نزیکبوونەوە تا ئەو دوو شارە ناوی هەمان خوایان پێ لکێنرا، بەتایبەت لە سەردەمی ئاشووری نوێداو هەروەک لەدەقە بزمارییەکاندا ناسراوە بە (ئەشتار نەینەوا)و (ئەشتار ئەربیل)[١١]، بەڵکو لەوەش زیاتر شای ئاشووری شا ناسر پالی دووەم (٨٨٣-٨٥٩ پ.ز) بەپێی دەقە مێژووییەکان بەم شارەی وتووە (شارەکەم) لەبەر خۆشەویستی خواکان. ئەمەش بەدرێژایی حوکمی ئاشوورییەکان مایەوە. لەوانەیە ئەو هۆکاردش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە لەو سەردەمەدا زۆر جەنگ روویاندا و زیاتر پاڵپشتیان لە سیفەتی جەنگی دەکرد، تا ئەوەی سیفەتی خۆشەویستی و جوانی بدەنە پاڵ[١٢].

پشت بەستن بەو پایە پیرۆزەی لای دانیشتوانی دۆڵی رافیدەین، بڕوایەکی وایان لا وروژا، کە

ئەمە شوێن کەوتنی ئایینە و بەبنەما سەرەکییەکانی ژیانی شارستانی گوزارشت دەکرێت. ئەمەو یەکێ لەو بەخشینانەی خوا ئەنانا- ئەشتار لەخوا ئەنکا وەدەستی هێناوە[١٣] بۆ ئادەمیزاد شایەکان پایەیەکی پیرۆزیان هەیە و خوا هەڵیبژاردوون[١٤] بەتایبەت خوا ئەشتار، بۆیە زۆربەی پادشاکان بوونە رۆڵەی خواکان بە تێروانینی بۆ ماوەی عەرش کە بەیەکێک لە کاروبارە گرنگ و پیرۆزەکان دادەندرێت، بۆیە پێویستە شای تازە لەپشتی بنەماڵەی شایەکانی دەسەڵاتدار بێ. چونکە کاتێ عەرش تووڕە دەبێ داوا لەخوا یان لە خوای کەس دەکات، خۆشی ویستووە و هەڵیبژاردووە بۆ ئەوەی ببێتە شا، ئەوە شای ئاشووری سەنحاریبە (٧٢١-٧٠٥ پ.ز)، هەولێ ئەوەمان پێڕادەگەیەنێ کە (خوا خۆشی ویستووە هەڵیبژاردووە کاتێ لەناو سکی دایکی بووە و هاتۆتە سەر دنیا)[١٥] ئەوەش شای ئاشووری ئەسەرحەدونە (٦٨٠-٦٦٩ پ.ز) ئاماژە بە رۆڵی خوا دەدا لەوانە خوا ئەشتاری هەولێری لە هەڵبژاردن و جێنشینی بەگوتەی:" برا بچووکیان بووم، بەڵام کاتێ باوکم منی هێنایە بوون، لە میانەی دانیشتنی براکانمدا رێزی لێ گرتم فەرمانی بەخوا: ئاشوور شەمش- مردۆک- نیو- ئەشتار نەینەوا- ئەشتار هەولێر کرد بەوەی کە ئەوە جێنشینمە"[١٦]. بەڵام شای ئاشووری ئاشوور بانیپال (٦٦٩-٦٢٦ پ.ز) لە دەقێکدا لەبارەی ئەو دەڵێت:"ئەز دایک و باوکی خۆم ناناسم.. خوای من منی دروست کرد" لە دەقەکانی تردا ناوی ئاشوور بانیپال هاتووە"نینلیلە **Ninlil** دایکیتی، جارێکی تر بەبیلییت نەینەوا هاتووە" واتە خاتوونی نەینەوا)، جارێکی دیکە بە (ئەشتار ئەربیل) هاتووە[١٧]. لەدەقەکانی بزماریشدا کە لەیەکێ لەدێڕەکان ئاماژەی پێدراوەو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٦٣٩ پ.ز) "لەرۆژانی داهاتوودا لەنێوان پاشاکان، ئەوانە دێنەوە سەر من، ئەوانە ناویان دیار دەکرێت لەلایەن ئاشوورو ئەشتار بۆ ئەوەی جڵەوی دەسەڵات لە دۆڵی رافیدەین بگرنە ئەستۆ.... ئەوەی دەقەکان تێکداو بشێوێنێ کە ناوی من و باوکم و باپیرمی هەڵگرتووە، بەگۆڕین، یان ناوی خۆی لەبەرامبەر ناوم دانێت، داوا لەئاشوور سین و شەمش و ئودد و بەعل و نەبوو ئەشتار نەینەواو شازادە کدموری و ئەشتار ئەربیل و ئەنورتاو نرکال و نسکو دەکەین کە کەمی بکەنەوە وەک رێزێک بۆ ناوم)[١٨].

شا ئاشوور کە کاهینی گەورەیە ئەرکەکانی ئایینی خستە ئەستۆی خۆی بەو گوزارشتەی بەناوی خواکان قسە دەکات و نوێنەری ئەوانە لەسەر زەوی و کەرۆڵی گەیاندنە لەنێوان خواکان و خەڵکدا، کە بۆ خزمەتی دروستی کردوون[١٩] یەکێ لەکارەکانی شا بەرامبەر خوا، راڤەکردنی ویستەکانی خوایە، کە شا رایدەگەیەنێت جا چ لەرێگای خەونەوە بێت، یان لەرێگای بینین، یان لەرێگای کاهینەکان بەشێوەی بەختگرەوە، بەوەی کە سرزشی خوا بە باوەڕی ئەوان تەنگژەکان لا دەدا، کە داواکار داوای کۆمەکی لە خودا دەکات بۆی چارەسەر بکات. ئەو کۆمەکییەش بەنموونەی پرسیار بوو کە داوای گیرابوونی دەکرا بە نیشانە کە لەسەر جەرگی ئەو ئاژەڵە دەرکەوێ کە بۆی کرابووە قوربانی[٢٠]. لە داواکەی شا سەنحاریب بۆ ئەشتاری ئەربیل بۆمان روون دەبێتەوە کاتێ داوای لەخوا کرد تاجەند سەرکەوتن بەدی دەهێنێت لە هەڵمەتە سەربازییەکەی بۆ سەر بابلییەکان و لە هەمان کاتدا داوای کۆمەکی لێ کرد[٢١] پێش ئەویش شای ئاشوور ناسر بانیپالی دووەم بەهەمان شێوە داوای لە خوا ئەشتاری ئەربیل کرد، کاتێ هێرشی کردە سەر ئێلامییەکان. بەڵام شا ئەسەرحەدون ئەویش رووی کردە هەولێر و لەوێش پەنای برد بۆ پەرستگای ئەشتار تا پرسیاری لێ بکاو داوای کۆمەکی لێ بکات لە شەڕەکەی، کە دژی براکانی ئەنجامی دەدا. لەو دەقە مێژووییەی ئەو رووداوانە دیار دەکات بڕیارەکەی دیار دەکات، کە لەسەری رۆیشت بۆ زاڵبوون بەسەر

بکوژەکەی باوکی. هەروەها جۆری هێز و خێراییەکەی باس دەکات لەپێناو گەیشتن بە گۆڕەپانی شەڕو بەدیهێنانە کتوپڕییەکەی، کە هەوڵە پووچەڵکراوەکەی کۆتایی پێ هات، شا توانی دەستبەجێ و بەبێ وەستان بەرەو ئاشوور بەڕێ بکەوێت، تەنانەت بگرە بەبێ نمایشکردنی سوپا و ڕێکخستنی باری ئابووری. بەڵام لەگەڵ ئەوەش ناچار بوو دوابکەوێت، ئەویش تەنیا لەبەر ئەوەی داوای کۆمەکی و پشتگیری خوای ئەشتاری ئەربیل کرد[٢٢]. لەیەکێ لەدەقە بزمارییەکاندا هاتووە: "ئەی ئەسەرحەدون نەترسی، وڵاتەکەت لەچاودێری ئێمەیە، وادەکەم نەخش و پیلانی دوژمنەکەت بەهەوادا بڕوات. خوێنیان دەڕێژین بەپێی قسەکانت، لەسەر خەڵک لەهەموو زمانێک، شوێنکەوتووی سەرکردەکەیان بن، لەمەو دواش دەبن بە شای هەر هەموویان:"[٢٣]، بەڵام شای ئاشووربانیپال پێش ئەوەی هەڵمەتەکانی بکاتە سەر ئێلامییەکان سەردانی هەولێری کرد، سەرنجی بەختگرەوەکانی دا سەرنجی خۆرگیران و مانگ گیرانی دا، لەمانگی تەمووز ئەمەیان خاڵێکی باش بوو. ئەم هەواڵە وای دەگەیاند، کە لەدوماهیدا حاکمی ئێلام شکست دێنێ، هەروەکو بەختگرەوەکان ئاماژەیان پێدا کە چاودێرییەکەی دابەزاندووە بۆ سەر تیومان (٦٦٤-٦٥٣

پ.ز) حاکمی ئێلامی و ئاگاداری کردۆتەوە کە خۆی دوور کاتەوە لەئازاردانی. بەڵام ئەو لەمانگی ئابدا سوپاکەی کۆکردەوە، لە کاتێکدا شای ئاشوور بانیپال لەپەرستگای ئەشتار لەهەولێر بەندایەتی دەکرد، لە دەقە گرنگەکان، کە ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٦٤٨ پ.ز، قسەکانی خواوەند ئەشتار لەخۆ دەگرێت، کە بۆ شا کردوویەتی. لەدەقەکەدا دیارە مەبەستی پاشا پەرستگای ئەشتار بووە، لە هەولێر، کە بەندایەتی بکات و داوای لێ بکات بەسەر دوژمنەکەی ئەللدود حاکمی ئێلام، زاڵ بێ. شایانی باسە، قسەکانی خوا لەسەر شێوەی خەونی کاهینی پەرستگای خواوەند ئەشتار هاتووەو، کاهینیش ڕۆژی دوایی بۆ شا دەیگێڕێتەوە[٢٤]. کە تێیدا هاتووە:

"کاتێ خواوەند ئەشتار بیستی، سەرم سوڕماوە، پێی وتم: نەترسی دڵم پڕبوو لەمتمانە، پاشان (گوتی): بەرێزەی ئەوەی دەستەکانت بۆ نزا بەرز کردۆتەوە، پێشوازیت لێدەکەم، چاوەکانت پڕکە لەفرمێسک. لەو شەوەیدا کە لەبەردەم ئەشتار وەستای بەختگرەوە نووست، خەونێکی بینی، کاتێ وەخەبەر هات زانی، کە ئەشتار بەشەو هاتۆتە خەونی، ئەوەی بینی بۆی گێڕایەوە و گوتی: ئەشتار کە لە هەولێر دادەنیشێت هات، کاهینی لای ڕاست و

باکووری کرنۆشی بردبوو. کەوانەکەی بەدەست هەڵگرتبوو، شیرەکەی لەشەڕ بریسکەی دەدا، لەبەردەمی وەستا بووم، قسەم لەگەڵ کردی هەروەکو دایکت، کە تۆی هێنایە بوون، لە نێو خواوەندەکاندا گوتی ئەشتاری گەورە، ئەم ڕاسپاردانەم پێدای "فەرمانەکانم جێبەجێ دەکەیت، ئەز پێشکەشت دەکەم چۆنی ڕووت تێ کردم، تۆ وتت ئەی خاتوونی ئاسمان لێم گەڕێ با لەگەڵت بڕۆم بۆ هەر کوێیەک دەچی، دواتر گوتی: تۆ لێرە ئەمێنیتەوە کە شوێنی"خواوەند"نەبووە، خواوەندی خواردن و خواردنەوە و چێژ وەرگرتن لەمۆسیقا، ستایشی خواوەندتییەکەمی کرد لە کاتێکدا ئەز دەڕۆیشتم و ئەو کارەم وەدەست دەهێنا، لەپێناو پڕکردنی دڵت کە دەیخوازی، لێرە هیچ بیانوویێک نییە بۆ گرژی ڕووت، ماندووبوونی پێیەکانت، بێ هیوای هێزت لەگۆڕەپانی جەنگدا. (پاشان) لەباوەشم گرتی- سینگە خۆشەویستەکەت، جوانی لەش و لارەکەت. (بینیم) لەبەردەمیدا ئاگر دەسووتێ، بەرەو لای تۆ دێت لە ڕقی دوژمنەکانت، تۆش بەرەو ڕووی دژەکەت تیومانی حاکمی ئێلام ڕۆیشتی، کە ڕق و کینەت لێی هەڵگرتووە"[٢٥].

لەدەقێکی دیکەدا هاتووە ئەشتاری خواوەند لەتەنیشت شای ئاشوور پانیپال وەستاوەو هانی دەدات و دەڵێت:

"ئەی ئاشوور پانیپال نەترسی شەست خواوەند لەتەنیشتم وەستاون بۆ كۆمەكیكردن و پاراستنت. (سین) لای راستت دەبێ (شەمش) لای چەپت دەبێ، شەست گەورە خواوەندی دیكە لە دەوروبەرت دەبن، لەئامادە باشیدان بۆ شەڕكردن، خۆت بەدەستی خەڵكەوە نەدەیت. چاوەكانت بسوورێنە لای من، هەمیشە تەماشای من بكە ئەز ئەشتار- ئەربیلم"(٢٦).

ئەو پیرۆزییەی خواوەند ئەشتاری ئەربیل هەیبووە، شای ئاشوورییەكانی پاڵناوە سوێندی پێ بخۆن. لەپەیمانی شای ئاشوور- تیراری پێنجەم (٧٥-٧٤٥ پ.ز)، لەگەڵ ماتع ئیلۆ حاكمی شاری ئەرفاهی سوریا، كە مێژووەكەی بۆ ساڵی (٧٥٤پ.ز) دەگەڕێتەوە، لەدەقەكەدا هاتووە پێویستە وەفادار بی بۆ شای ئاشووری. هەروەها سوێند خواردنیشی بەخوا تێدا هاتووە، لەوانە خواوەند ئەشتاری ئەربیل)(٢٧).

لەستوونی شەشەمیشدا هاتووە:

"سوێند دەخوات بەئەشتار خوای نەینەواو، سوێند بەئەشتار خوای ئەربیل "(٢٨).

هەروەها سوێند لەپەیمانی ئابووریشدا هاتووە، كە ئەسەرحەدون لەگەڵ "بەعل" حاكمی شاری سوری فینیقییەكان بەستی، كە مێژووەكەی بۆ پێش( ٦٧٦ پ.ز) دەگەڕێتەوە(٢٩).

لە ستوونی چواردەمیدا هاتووە:

"دەخوازین نەنیل كە لەنەینەوا نیشتەجێیە و خەنجەرێكی رابردووە بەتۆ دەبەسترێتەوە، دەخوازین كە ئەشتار (كە لە ئەربیل نیشتەجێیە بەزەیی و لێخۆشبوونت پێ نەبەخشێ"(٣٠).

بەڵام لەو پەیمانانەی كە ئەسەرحەدون لەگەڵ"ئەماتا Aamataya حاكمی شاری ئەركازابانۆ surakazbanu میدییەكان كە لەمانگی ئایاری ساڵی (٦٧٢ پ.ز) بەستی، كە ئامانج دۆزینەوەی چارەسەرێك بوو بۆ كێشەی كورسی (عەرش) لەنێوان كوڕەكانی ئاشوور پانیپاڵ، شەمش و شم و ئۆكن لەپاش مردنی. كۆتاییەكەی بەسوێند خواردنی خواوەندی شار هات، كە پیرۆزییەكی تایبەتی خۆی هەبوو. تەماشا دەكەین سێ شار هاتووە، ئاشوور دووجار دووبارە بۆتەوە، خوای ئاشوور- خواوەندی شار، پاشان هەولێر خواوەند ئەشتارو خوای شار، نەینەوا و خوا ئەشتارو خوای شار. بەڵام بابل و بورسیپاو نیبور یەك سوێندیان خواردووە(٣١).

دەقێكی بزماری تایبەت بەپەیمانەكە هاتووە:

"لەو پەیمانانەی گرێدرا، پەیمانم لەگەڵ كردن

(لەبەردەم) ئەشتار نەینەواو ئەشتار ئەربیل

سوێندم دان بەئەشتار نەینەوا ئەشتار ئەربیل

سوێندم دان بەهەموو خواكانی ئەربیل

دەخوازم ئەشتار، كە لەهەولێر نیشتەجێیە بەزەیی و لێخۆشبوونتان پێ نەبەخشێ"(٣٢).

سەرەڕای ئەوە سوێند بەخواوەند ئەشتار ئەربیل لە دەقی نامەكاندا هاتووە. ئەمەو نامەیەكی نووسەری ئاشووری بە ناوی وردگولا لە بەردەستە كە بۆ پاشا ئاشوور پانیپال ناردوویەتی و مێژووەكەی بۆ ساڵی( ٦٦٧ پ.ز) دەگەڕێتەوە و لەچەند دێڕێكدا هاتووە:

"١- لە خزمەتكارت ورد-گولا بۆ گەورەم پاشا.

٢- لەش ساغی و تەندروستی بۆ گەورەم پاشا دەخوازم، بەباسی مردۆخ و سربانیتم.

٣- نەبوو تشمیتم، ئەشتار نەینەوا، ئەشتار ئەربیل، نەنورتاو كەلا"(٣٣).

جا لەبەر پیرۆزی شاری هەولێر و پەرستگاكەی تەرمی شای ئاشووری تێدا نمایش كرا. هەروا تەرمی شا سەنحاریب بۆ ماوەی سێ رۆژ لە نەینەواو یەك رۆژ لە هەولێر پێش بەخاك سپاردنی نمایش كرا. ئەو نمایشكردنەش یان

لە ژوورەوە یان لەیەکێ لە دەرگاکانی شار بووە و ماوەیان بەخەڵک داوە بۆ دواجار سەیری بکەن. بەخاک سپاردنەکەش لە کۆشک لە نەینەوای پایتەخت یان ئاشوور بووە. شایانی ئاماژە پێکردنە ژمارەیەک لە شایەکانی ئاشوور لە هەولێر نێژراون[٣٤].

بەڵام سەبارەت بە پەرستگای تایبەت بەخوا ئەشتار لە هەولێر. زۆرینەی شارەکانی عێراق بە هەولێریشەوە شاری پەرستگاکانن. لە هەمان کاتدا هەموو شارێک گەورە و مام ناوەندی و بچووک پەرستگایەکی تایبەتی لێ بووە. زۆرینەی پەرستگاکانیش بەسترابوونەوە بەژمارەی خواکان و شێوەکانیان و ناو و سیفەتەکانیان و پەیوەندی هەندێکیان بەهەندێکیانەوە و هەروەها بە ئادەمیزادیش[٣٥]. پەرستگای شاری هەولێر بە پۆلینی پەرستگای خوای ناوخۆ دەژمێردرێت و خود ئاکاری تاک بووە لەناوچەیەکدا یان هاوبەش بووە بۆ ژمارەیەک ناوچەو بەناوی جیا جیا. جاری واش هەبووە بەهەمان ناوو نازناوەوە بووە، جاریش هەبووە بەپێی جیا جیای نازناوەکان رۆیشتووە و هەروەکو دەوترێت: ئەشتاری ئاشووری یان ئەشتاری ئەکەدی یاخود ئەشتاری ئەربیل. بەڵام ئەو خوایانە لەشارە بچووکەکان تاک بوون. بەڵام لە شارە سەرەکییەکان لەوانەیە چێوەیەک هاتبێتە سەر خوای شارە گەورەکە[٣٦]. بەڵگەیەکی شوێنەوارمان بەدەستەوە نییە لەسەر پەرستگای خوا ئەشتار لە هەولێر[٣٧] بەڵام بەهەرحاڵ جیاوازییەکی زۆری نییە لەگەڵ خوا ئەشتار لەوەرکارو- ئوروکی سۆمەری. کەواتە لەوانەیە ئاشوورییەکان لەدامەزراندنی ئەو پەرستگا ئەشتارە کۆنە دەرنەچووبن، کە شای ئاشوور سەرجۆنی دووەم (٧٢١-٧٠٥ پ.ز) سەر لەنوێ نۆژەنی کردەوە. هەروا هەر یەک لە نەبو خوز نەسر (٦٠٤-٥٦٢ پ.ز)[٣٨] و "نەبو نائیر" بەشداربیان کردووە لە نوێکردنەوەی چەند بەشێکیدا[٣٩]. ئەمە وامان لێدەکات لە پەرستگای ئەشتار بکەین لە ئوروکی سۆمەری، کە پێی دەوترا پەرستگای (ئەی- ئەنا):

پەرستگاکە لە ژوورێکی مام ناوەندی درێژ و فراوانی سەر دانەپۆشراو پێکهاتووە، لەچوار دەوری ژووری بچووک و کۆگایەکی گەورە و شوێنێک بۆ پێشکەشکردنی قوربانی بۆ خواکان دروست کراوە. لە دەوری پەرستگاکە دیوارێک دروست کراوە پێشەوەی پەرستگاکە بەمەرمەڕ رازێندراوەتەوە، کە لە بزماری دیزەی رەنگاو رەنگ لەخۆ دەگرێت. هێلکاری پەرستگا لە سەردەمی ئەکەدییەکان و سەردەمی بنەماڵەی ئوری سێیەم (٢١١٣-٢٠٠٦ پ.ز) وەکو خۆی مایەوە. دواتر ئەو پەرستگایە سەر لەنوێ هەر هەمووی نۆژەن کرایەوەو ژمارەیەک شتی تریشی بۆ زێدە کرا، لەوانە قولله (زەقورە)، کە لەژمارەیەک سەکۆ پێکهاتووەو ژمارەیان حەوتە و هەر سەکۆیەکیش لەوەی لەسەری وەستاوە بچووکترە، بەو ئاستەی ئەوەی لەسەرووی هەموویانەوەیە لەهەموو سەکۆیەکان بچووکترە. دوا سەکۆ بەرزە و پەرستگایەکی بچووکی خوا هەیە و بە پەرستگای بەرز ناسرابوو. بەسێ پەیژە بەسەر زەقوورەیەک دەکەوتن، ناوەڕاستەکەی لەوانە شوێنێک لە ناوەڕاستی لای زەقورە و دووی تر لەلایەکەی تر و هەر سێ پەیژەکەش لە سەرووی سەکۆیەکە بەیەک دەگەن. لە هەردوو لای پەیژەی ناوەڕاست پەرستگا یان دوو پەرستگای بچووک ناسراون بە پەرستگای خواروو. لەدەوری زەقورەش گۆڕەپانێکی فراوانە و لە چێوەکەیدا زۆر ژوور هەن بۆ نزاکردن و هەندێکی دیکەشیان وەک کۆگا بە کارهاتوون. ئەوەی جێی سەرنجە شێوەی پەرستگا ماوەی ١٥٠٠ ساڵ هەر لە سەردەمی ئور- غور بنەماڵەی ئوری سێیەم تا سەردەمی کۆرشی ئەخمینی (٥٥٩-٥٣١ پ.ز) هەر نەگۆڕاوە، سەرەڕای ئەو نوێخوازییەی لە نۆژەنکردنەوە و چاککردنەوەی کراوە. ئەوەی روونە

پیرۆزییەکەی وای لە پەرستراوەکان کردووە هۆی پاراستنی ئەو شێوە کۆنە بن. ئەمەش وامان لێ دەکات بگەڕێینەوە بۆ ئەو پەرستگایەی ئاشوورییەکان کە بۆ ئەشتار ئەربیل دروستیان کردبوو جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ پەرستگا کۆنەکەی لە ئوروک. لەراستیدا ئاشوورییەکان زۆریان لە شارستانیەتی سۆمەرییەکان وەرگرتبوو، لەوانە دامەزراندنی پەرستگا. شیاوی باسە لەهەر پایتەختێکی ئاشووری (پەرستگایەک) یان (دەرگایەک) هەبوو، نەمری ناوی خوا ئەشتار بوو، لەپەرستگای ئاشوورییەکان خوای سۆمەرییەکان دادەندرا، لەوانە ئەشتار هۆکارەکەش ناوی خواکان بوو لەسەر دەرگایەکانی شارەکانی ئاشووری. ئەمەش بەڵگەیەکە کە شارستانیەتی ئاشوورییەکان کاریگەر بووە بەشارستانیەتی دانیشتوانی عێراقی کۆن، لەوانە سۆمەرییەکان[٤٠]. بەڵگەیەکی دیکەش پێشکەش دەکەین لەسەر بەردەوامبوونی نەریتی عێراقییەکان لەسەر جۆری دامەزراندنی پەرستگاو بەردەوامبوونی لەهەموو سەردەمەکاندا. پەرستگای خواوەند ئەشتار لە هەولێر تایبەتمەندییەکی هەبوو، ئەویش لە جەنگەکان و کاتی تەنگانەدا سەرچاوەی سەرکەوتن بوو. بەڵام پەرستگای خوا ئەشتار/ نەینەوا بەخۆشەویستی و جوانی و سێکس و گۆرانی و خۆشی تایبەت کرابوو[٤١].

لە قووڵایی پەرستگاکە، وەک پەرستگاکانی دیکە سفرەیەک لەزێڕ هەیە لە لایەکی سەرێکی گەورەی ساف زێڕ بۆ خوا ئەشتار دانراوە. دیارە چاوە گەورەکانی لە شا بڕیوە، کە بەندایەتی دەکات. لێوەکانی بە زەردەخەنەیەکی شاراوە لێک کراونەتەوە، سەرنج دەدەین لەنێوانیاندا زمان بزاوت دەکات لەکاتی قسەکردن- لەرێگای یەکێ لەکاهینەکان. جا گەر شا قسەی لەگەڵ بکردبایە ئەوا دەنگێک لەتاریکاییەوە دەهات: "ئایا ئەشتار تەندروستی و گەورەیی بۆت وەدی هێنا! تۆ وا لەویستی ئەشتار دەکەیت بەلێوەکانی قسە بکات. ئەشتار... بە دەمت قسە بکەو بە زمانیشت بەزەیی!"[٤٢].

ئەو پیرۆزییە و شوێن ئاینییەی بوو بە بەختی هەولێر، لەگەڵ رێزگرتن لەپەرستگاکەی بوون بەهۆکار بۆ پاراستنی ئەو شارە لەداگیرکردن و کاولکردن. کاتێ نەینەوا لەساڵی (٦١٢ پ.ز) شکستی خوارد و میدییەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست. هەروەها تەواوی شارەکانی ئاشووری بەدەستی میدییەکان شکستیان هێناو ئەوەی بەسەر نەینەوا داهات، بەسەر شارەکانی دیکەش داهات[٤٣].

**پەراوێزەکان (الهوامش):**

1- Gelb, I.J,"The Nam of Godds Innin", Journal of Near Eastern Studies vol . Iq ,Chicago-Iq 60 p.72.

٢- الهيتي، قصي منصور عبدالكريم: عبادة الأله سين في حضارة بلاد الرافدين، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد- ١٩٩٥، ص١٦.

٣- الهيتي، قصي: المصدر نفسه.

٤- الهيتي، قصي: المصدر نفسه.

٥- الشاكر، فاتن فاضل علي: رموز أهم الألهة في العراق دراسة تأريخية دلالية، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة الموصل- ٢٠٠٢، ص٩٣.

٦- علي، فاضل عبدالواحد: "المعتقدات الدينية" في موسوعة الموصل الحضارية، ط١، موصل= ١٩٩٠، ص٣٠٨.

٧- كونتينو، جورج: الحياة اليومية في بلاد بابل وآشور، ترجمة سليم طه الكريتي، وبرهان عبد التكريتي، بغداد، ١٩٧٩، ص٦٢١.

٨- بروانە وێنەی ژمارە -١- بۆ زانیاری زیاتر، سەبارەت بە رەمزەکانی عەشتاری خواوەند، بروانە: ينظر الشاكر، فائن: المصدر السابق، ص٩٩-١٠٨.

٩- ساكز، هاري: عظمة بابل، ترجمة عامر سليمان، موصل- ١٩٧٨، ص٣٨٨.

١٠- عصر أيسن الارسا: أطلق علي القسم الأول من العصر البابلي القديم (٢٠٠٠- ١٧٦٠ق.م) نسبة الى أهم سلالتين حكمتا في بلاد بابل ينظر سليمان، عامر: العراق في التأريخ القديم، موصل، ١٩٩٢، ج١، ص١٨٠.

١١- علي، فاضل عبدالواحد: عشتار ومأساة تموز، بغداد- ١٩٧٩، ص٤٨، الراوي، شيبان ثابت: اشور ناصربال الثاني (٨٨٣-٨٥٩ ق.م) سيرته

وأعماله، رسالة ماجستير غير منشورة، بغداد- ١٩٨٦، ص١٧.
Luckenbill , D.D, Ancient Records of Assyrian and Barbylania (ARAB), vol. 2, p. 190.
١٢- الشاكر، فائن: المصدر السابق، ص٩٦-١٠٤.
١٣- الاله أنكي/ هو اله الماء والطقوس المرتبطة به من سحر وفأل ولقب بالأب و ملك الالهة وأسمه أنكي يعني سيد الأرض وهو خالق العالم وسيد القدر ينظر الأحمد، سامي سعيد: المعتقدات الدينية في العراق القديم، ط١، بغداد- ١٩٨٨، ص٢٣-٢٤.
١٤- ساكز، هاري: المصدر السابق، ص٤١٣.
١٥- كونتينو، جورج: المصدر السابق، ص٢١٠، الزيباري، محمد صادق طيب، النظام الملكي في العراق القديم دراسة مقارنة مع النظام الملكي المصري، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة الموصل ١٩٨٩، ص٣٢.
١٦- باقر، طه: مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة، ط١، بغداد- ١٩٥٥، ح١، ص٣٩٥.
١٧- كونينو، جورج: المصدر السابق، ص٢١٢-٢١٣.
Frank Fort, H., Kingship and The Gods, Chicago - 1458, p. 300
١٨- الطعان، عبدالرضا: الفكر السياسي في العراق القديم، بغداد- ١٩٨١، ص٤٧٧، ARAB: vol. 2 , p.332
١٩- فؤاد، جميل: "حدياب أربيلا وعشتار أربيلا" مجلة سومر، بغداد، ١٩٦٩ رقم ٢٥، ص٢٢٠.
٢٠- الاحمد، سامي سعيد: "الحضارة العراقية في الأديان والمعتقدات الأصالة والتأثير" في العراق في موكب الحضارة، بغداد، ١٩٨٨، ح١، ص١٧٤، جدير بالاشارة هنا أن هذا العلم عرف بعلم الأكباد أو ايباتوسكوبيا حيث وجدت نماذج من الطين كانت تستخدم لعرافي الطالع الذين كانت وظيفتهم قراءة خطوط أكباد والحيوانات المضحي بها حيث كانت تدل المتشوهات في الكبد علي أن هناك حدثا كبيرا وهاما بالنسبة لسكان تلك البلاد ينظر روثن، مارغريت: علوم البابليين، ترجمة يوسف حبي، بغداد، ١٩٨٠، ص٦٠، كونتينو، جورج: المصدر السابق، ص٤٨١-٤٨٢.
٢١- عطا، صلاح رشيد: السوق العسكري للدولة الآشورية ٧٢٢-٦٢٦ ق.م، أطروحة دكتوراة غير منشورة، مع التاريخ العربي، بغداد- ١٩٩٨، ص٣٥، فؤاد، جميل: المصدر السابق، ص٢٢٠.
٢٢- عطا، صلاح رشيد: المصدر السابق، ص٣٢.
Prit Chard, JB, Anciet Near Easter Texstsre lating With The Old Testament, New- Jersey-1969, p.289
٢٣- جبرا، ابراهيم جبرا: "تأملات في الهة قديمة"، آفاق عربية، بغداد، ١٩٨١ ع٢، ص١١٠ نقلا عن Plessis, Etudes Sur Le Textes Concernant Is tar- Astarts, p.87
٢٤- الدوري، رياض عبدالرحمن أمين: أشور بانيبال سيرته ومنجزاته ٦٦٩-٦٢٧ ق.م ط١، بغداد- ٢٠٠١، ص١٠١-١٠٢.
25- ANET, p. 450 - 451
26- ARAB: vol .2, p. 332
٢٧- صالح، وليد محمد: العلاقات السياسية للدولة الاشورية، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، ١٩٧٦، ص١٤١، ص١٤٥.
٢٨- جبرا، ابراهيم جبرا: المصدر السابق، ص١١٠.
٢٩- صالح، وليد محمد: المصدر السابق، ص١٤٥، ص١٤٧.
30- ANET: p. 533
٣١- علي، فاضل، عبدالواحد: سومر أسطورة وملحمة، ط٢، بغداد- ٢٠٠٠، ص١٨١-١٨٢.
٣٢- صالح، وليد محمد: المصدر السابق، ص١٤٨.
33- ANET: p. 534- 535
٣٤- الأحمد، سامي سعيد: المعتقدات الدينية في العراق القديم، ط١، بغداد، ١٩٨٨، ص٨٤، كونتينو، جورج: المصدر السابق، ص٤٩٣.
٣٥- سعيد، مؤيد: "المدن الدينية والمعابد" في موسوعة المدنية والحياة المدنية، بغداد- ١٩٨٨، ح١، ص١٢٧.
٣٦- المصدر نفسه، ص١٣٠-١٣١.
٣٧- تجدر الأشارة هنا أن التنقيبات الاثارية التي جرت في أربيل، قد أستظهرت عدد من الأبنية من جملتها أحد أبنية المعابد في المنطقة الشرقية للمزيد من التفاصيل ينظر أبو الصوف، بهنام: "التنقيب في تل قالينجأغا بلواء أربيل"، مجلة سومر، بغداد، ١٩٦٩، م٢٢٥، ص١٠.
٣٨- للأستزادة في المعلومات عن مجمل نشاطات الملك نبوخذ نصر العراقية، ينظر محمد، حياة ابراهيم: نبوخذ نصر الثاني (٦٠٤-٥٦٢ ق.م)، بغداد- ١٩٨٣، ص٥٩.
٣٩- عن أهتمامات هذا الملك بالاثار والأعمال العراقية ينظر غزالة، هديب حياوي: الدولة البابلية الحديثة والدور التاريخي للملك نبونائيد في قيادتها، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد- ١٩٨٩، ص١٦٦ ومابعدها.
٤٠- فؤاد، جميل: المصدر السابق، ص٢٤٤-٢٤٥.
٤١- المصدر السابق، ص٢٣٥.
٤٢- جبرا، ابراهيم جبرا: المصدر السابق، ص١١٠.
٤٣- فؤاد، جميل: المصدر السابق، ص٢٢٠.

# هەولێر لە سەردەمی ئاشوورییەكاندا

دكتۆر عەونی عەبدولڕەحمان سەبعاوی
كۆلیژی ئاداب- زانكۆی موسڵ

## دەروازە

شاری هەولێر بەیەكێ لە گرنگترین شارە كۆنەكان لە مێژوو دادەنرێت، كە بەدرێژایی چاخەكان رۆڵی مێژوویی و شارستانییەتی هەبووە. ئەم شارە بەمەزەندە، نزیكەی چوار هەزار ساڵ دەبێ دروست كراوەو بەیەكێكیش لەو شارە دەگمەن و كۆنانە دەژمێردرێت، كە تائێستاش سروشتی خۆی پاراستووە، وێڕای ئەوەی چەندین نەوەو چاخی بینیوەو پێیدا رۆیشتووەو بۆ چەندین جار شەڕو جەنگی گەورەی تێدا روویداوە.

هەولێر لە سەردەمی ئاشوورییەكاندا كە بابەتی لێكۆڵینەوەكەمانە بە پایە، شارستانییەتەكەیەوە لەنێو هەرسێ شارەكانی ئاشووری (نەینەوا- ئاشوور- بابل) بەپێگە جوگرافی و شوێنە ئاینییەكەیەوە جیا دەكرێتەوە.

جا بە مەبەستی تیشك خستنەسەر ئەو ئاكارە وا پێویست دەكات، كە باس لەپێگە جوگرافییەكەی بكەین بەر لە شوێنە مێژوویی و شارستانییەتییەكەی.

## ناوەكەی

كۆنترین شت كە شوێنەوارناسەكان دەربارەی ناوی هەولێر پێی گەیشتوون ئەو ئاماژەدەرانە كە لەدۆسییەی شایەكانی بنەماڵەی ئوری سێیەم (٢١١٢-٢٠٠٤ پ.ز) بەناوی (ئور-بیلم Urbilum) هاتووە. بەڵام دەستەواژەی ئاشوورییەكان لە (ئەربا-ئیلۆ Araba-Ilu) پێكهاتووە واتە (چوار خوا)[١].

ناوی هەولێر لەنووسراوە مێژووییەكاندا بە وشەی جۆراو جۆر هاتووە. بۆ نموونە لە سەردەمی شای سۆمەری (شوكی ٢٠٣٣ پ.ز) ناوی (ئوربیلم Urbilum) هاتووە. بەڵام لەنووسراوە بابلی و ئاشوورییەكاندا بەدەستەواژەی (ئوربا- ئیلۆ) و (ئەربا- ئیلۆ) هاتووە كە بەمانای (چوار خوا) دێت. لای وڵاتە عەرەبییەكانیش ناوی (ئەربیل) هاتووە. دانیشتووانی ئەو سەردەمەش پێی دەڵێن (ئەربیل- ئوربل- ئوربیل- یان هەولێر)[٢]. هەندێكیان دەڵێن دواناو خراوەتە پاڵی (مەنسوب كراوە) بۆ خۆر (هیلیو Helio)، پاشان پیتەكە گۆڕاوەو بۆتە (هەولیر)_(خولیر)-(هولێر) لەسەر زاری خەڵكەكە. واتا ماناكەی شاری خۆرو پەرستگاكەی دەگەیەنێت[٣]. شایانی باسە هەر سێ ناوەكەی دوایی لەنێو خەڵكی كوردستاندا باوە.

## پێگە جوگرافییەكەی

شاری هەولێر كەوتۆتە سەر بانێكی پان نزیكەی ٤١٥م لەسەر ئاستی دەریا، لە بڵندایی نێوان هەردوو زێی گەورە و بچووك. قەڵات لەسەر شێوەی بازنەیی دامەزراوەو نزیكەی (٢٥م) بەرزە. رووبەرەكەی نزیكەی (١١٠٠٠٠) مەتر چوارگۆشە دەبێت. لایەكانی وردە وردە لار دەبێتەوە و كەوتۆتە ناوەڕاستی شار. مێژووی ئەو قەڵاتە

کە تۆمار کراوە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٢٠٠٠) ساڵ پ.ز[٤].

ئەو گردەی هەولێر لەسەری بنیات نراوە ئەمڕۆ بەخانووی ماڵنشینی یەک لەدوای یەک دەبینرێ. مێژوونووس (جۆرج رو) دەڵێت: "دانیشتووانی عێراقی کۆن پشتیان بەچاککردنی کاولەکان دەبەست و پاشماوەکانیان بۆ دروستکردنی باڵەخانە تازەکانیان بەکاردەهێنا. ئەو کردارە بەشێوەیەکی چەند جار بەدرێژایی ساڵە یەک بەدوا یەکەکان دووبارە بۆتەوە. لەبەر ئەوەی ئاستی دانیشتووان زۆر بوو شارەکە گەورە بوو بەرەو دەشتەکەی دەوروبەری کشاوە. یەکێ لەو نیشنگانەی کە چۆڵ نەکراوە بەدرێژایی چاخ و سەدەو ساڵەکان ژیانی تێیدا گوزەرکراوە، شاری (هەولێر)ە"[٥].

بەڵام دەشتی هەولێر لەسەر شێوەی حەوزێکی گەورەی بەرفراوان و قووڵایییەکەی پڕە لەنیشتن و قوڕ و چەو و قوم. رووی ئەو دەشتە پێچاو پێچە هەندێ دۆڵ لەخۆ دەگرێت، ئاوەکەی دەڕژێتە هەردوو زێی گەورەو بچووک دەچێت. بەرزترین بەشی بەشەکانی رۆژهەڵاتییەتی، کە بەرزییەکەی دەگاتە نێوان (٤٨٠-٥٥٠) مەتر، لەکاتێکدا کە لای رۆژئاوای بەرزییەکەی دەگاتە نزیکەی (٣٠٠) مەتر[٦].

### گرنگی ستراتیژی و ئایینی شاری هەولێر لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا

شاری هەولێر لەمێژووی کۆندا هەر لە سەردەمی (ئوری سێیەم ٢١١١-٢٠٠٣ پ.ز) تا ماوەی دەسەڵاتی شا ئاشوور بانیبال (٦٦٩-٦٢٧پ.ز)، زیاتر گرنگییە ستراتیژییەکەی بەرجەستە بوو[١٢]. بەوەی کە بەو رێگایانە داهات کە باشوور و ناوەڕاستەکەی دەگەیشتە باشووری کوردستان،ئەمەش بەیەکێ لەهۆکارە سەرەکییەکانی بووژاندنەوەی شاری هەولێرو گرنگییە ستراتیژییەکەی دادەنرێت، کەوای لە دەسەڵاتدارە عێراقییە کۆنەکان کردبوو، کە هەڵمەت بەرن بۆ دەسبەسەرداگرتنی و زامنکردنی شارەکە لە وێرانبوون. لەم بارەیەوە مێژوونووس، (وولی) لە کتێبەکەیدا (سۆمەرییەکان) باسی دەکات و دەڵێت: وڵاتگیرییەکانی شا سەرجۆنی ئەکەدی (٢٣٤٠-٢٢٤٨پ.ز) گەیشتە شاری هەولێر،چونکە ئەم شارە، رێگای داهاتەکان لەباکوور بۆ ناوەڕاستی عێراق و باشوورەکەی بوو. لەبەشی پێنجەمی هەمان کتێب لەبارەی دەسەڵاتی (بنەماڵەی ئوری سێیەم)دا هاتووە کە (باتیی لاکاش) لەنەوەی سەرجۆنی ئەکەدی شا (نرام سن) (٢٢٦٠-٢٢٢٣پ.ز)[١٣] بە فەرمانڕەوای هەولێر دانرا. هەروەها دەقێکی نووسینی بزماریش هەیە، ئاماژە بەوە دەدا، کە شاری هەولێر پێشتر لەژێر دەسەڵاتداریێتی

(ئور)ەکان بوو. هەروەها ئەو راستییە لەهەندێ بەڵگەنامەی ئابووری، کە لەو ساڵەی شاری هەولێر کراوەتەوە لەسەردەمی یەکێ لەفەرمانڕەواکان لەسنووری ساڵی (٢٠٤٠پ.ز) جەخت کراوەتەوە. لەکاتێکدا لەدەقێکی دیکەی سۆمەرییەکان کە لەهەمان ماوەدا دەرچووە، ناوی ئەو فەرمانڕەوا سەربازییەی، کە لەلایەن شا (ئور) لە شاری هەولێر دامەزراوە، ئاماژەی پێدراوە[١٤].

ئاشوورییەکان هەر لە زووەوە هەستیان بەگرنگی و پڕ بایەخی هەولێر کرد، بۆیە لەسەردەمی شای ئاشووری (ئیزاری ئەدی دووەم ٩٩١-٨٩٠پ.ز) هێنایانە ژێر دەسەڵاتی خۆیان[١٥] و بەیەکێ لەشارە سەرەکییەکانی خۆیان دادەنا، (هەولێر- ئاشوور- نەینەوا). لەکاتێکدا هەندێکیان شاری هەولێریان لەرووی گرنگی مێژووییەکەیەوە، لەپاش ئاشووردا بەپلە دوو دادەنا[١٦]. ئەو شارە کەوتۆتە ناو جەرگەی هەرێمەکە بۆیە ئیمپراتۆریی ئاشووری تێیدا دامەزرا، سەبارەت بەوەی نزیک بووە لەچوار پایتەختەکانی کۆنی ئاشووری (ئاشوور- نەینەوا- نەمروود- خرسباد)، لەباکووری عێراق، لای یەکەمی دیجلەیەو لایەکەی دووەم و سێیەمی هەردوو زێی گەورەو بچووکن و لای چوارەمیش زنجیرە چیاکانی زاگرۆسە. ئەو هەرێمە بە ناوەندی بەرهەمهێنانی باشترین دانەوێڵە، بەتایبەتی گەنم دادەنرێ.

هەروەها بۆ ئاشوورییەکان بایەخێکی دیکەشی هەبوو، چونکە کەوتۆتە سەر ڕێگای کاروانی نێوان موسڵ (نەینەوا) و کەرکووک[١٧]. هەروەها لە بەر کەمی بابەتە بەڵگەنامەییەکان، ئەستەمە بتوانین لەرووی سیاسییەوە باس لەگرنگی شاری هەولێر بکەین،[١٨]. لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین بایەخی مێژوویی هەولێر لای ئاشوورییەکان، لەبەر پیرۆزی ئایینی بووە، چونکە پایتەختی ئایینی ئاشوورییەکان بووە، بۆیە بۆتە جێی بایەخ پێدانی شایەکانیان و وروژاندنیان کە پەرستگای ئەشتاریان دروست کرد. هەروەها بەجوانترین پەرستگا دادەنرێت، کە لەسەر خاکی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری دروست کراوە[١٩]، لەبەر ئەوەی خواکانی ئاشووری تێدابوو، پێگەیەکی زۆر بەرزو پیرۆزی لە نێو کۆمەڵی خواوەندەکانی ئاشووری داگیرکردبوو. شایانی ئاماژە پێکردنە لەدوای خوا ئاشوور بەپلە دوو دێت[٢٠]. شای ئاشووری (کاهینی گەورە) بووە، بۆیە شایەکانی ئاشوور خوای ئەشتاریان بەگەورە زانیوە. لەو شایانە (ئاشوور ناسربال ٨٣٣-٨٥٩پ.ز)، لەبەر خۆشەویستییەکەی بۆ شارەکە، ناوی لەشاری هەولێر نا "شارەکەم"[٢١]. لەیەکێ لە دەقەکان کە بۆ شا ئاشوور ناسربال دەگەڕێتەوە، نەسەر پەیکەرێکی شێر لەدەرگای پەرستگاکە، کە تایبەتە بەخوای ئەشتار، لەکاتی قسەکردن لەگەڵ خواوەندەکەی نووسراوە، کە نزای کردووە و دەڵێت: "خاتوونی زەوی.. خاتوونی گەورەی یەکەمی ئاسمان و زەمین. شازادەی بەهێزی نێوان خواوەندەکان... ئەشتاری ڕەونەقدار.. ژیان بەخش.. خواوەندی بەزەیی.. خاتوونەکەم ئاشوور ناسربال نزاکەی کرد"[٢٢].

جاران سەرجەم شاکانی ئاشووری، بەر لەوەی بەمەبەستی زیارەتکردن هەڵمەتی سەربازی بەرن، دەهاتن بۆ هەولێر. لەوانە شای ئاشووری سەنحاریب (٧٠٥-٦٨١پ.ز) سەردانی هەولێری کرد و لەپەرستگا زیارەتی ئەشتاری کرد و پاڕایەوە کە لەجەنگی بەرامبەر بابلییەکاندا سەرکەوتن وەدەست بێنێ. هەروەها شای ئاشووری (ئەسەرحەدون ٦٨١-٦٦٩پ.ز) کاتێ باوکیان کوشت سەردانی هەولێر و پەرستگای ئەشتاری کرد، بەمەبەستی سەرکەوتن. هەروەها شای ئاشووری (ئاشور ناسربال ٨٨٣-٨٥٩پ.ز) هەمان کاری ئەنجام دا کاتێ هەڵمەتی سەربازی و هێرشی کردە سەر ئیلامییەکان لەباشووری ڕۆژئاوای ئێران[٢٣]. شا سەنحاریب نازناوی لەپایتەختەکەی شاری نەینەوا نا (قەڵاتی باش). ئەو شارەی، کە خواوەند ئەشتار لە هەولێر خۆشی دەوێت[٢٤]. بەر لەوەی شای ئاشووری ئاشور بانیبال (٦٦٩-٦٢٩پ.ز) هەڵمەت بەرێ بۆ سەر ئیلامییەکان، لەساڵی (٦٥٣-پ.ز) سەردانی خواوەند ئەشتاری کرد لەهەولێر. لە نووسینە گرنگەکانی ئەو لەسەردەمی شا ئاشوربانیبال دەقێک هەیە کە مێژووەکەی بۆ ساڵی ٦٤٨پ ز. دەگەڕێتەوە و قسەکانی خواوەندی ئەشتاری تێدایە بۆ ئاشوربانیبال. لەدەقە ئاشوورییەکەدا وادیارە شا بە مەبەست هاتۆتە پەرستگای خواوەند لە هەولێر بۆ بەندایەتی کردن و داوای یارمەتیکردن لێی، کە بەسەر شای وڵاتی ئیلام (ئومانال داسی Ummanal dasi)دا زاڵ بێ[٢٥]. هەروەها ژمارەیەک دەقی گرنگی دیکەش لەم بوارەدا دۆزراونەتەوە کە باس لەسەرجەم هەڵمەتە سەربازییەکان دەکەن، کە خۆی لە نۆزدە هەڵمەتی سەربازی دەدات. لەوانە پێنج هەڵمەت بۆ سەر ئیلامییەکان بووە، دوو هەڵمەتیش بۆ سەر میسرو هەڵمەتێکیش بۆ سەر (کریت) و (سور) و (ئەروارد) و (تابال) و (هیلاکر). چەند هەڵمەتێکی تریش بۆ سەر شانشینی (لیدیا) و (وڵاتی مەئناوی) و (ئورارتو) و هۆزنشینی (کەمبولو) و تەواوی هۆزنشینەکانی دیکەی عەرەبی و، بۆ سەر شانشینی (یەهوزا)ش[٢٦].

#### پرۆژەی ئاوەڕۆی هەولێر

شای ئاشووری سەنحاریب بەوە ناسراوە، کە بایەخێکی گەورەی بەپرۆژە ئاوەڕۆییەکانی شارەکانی ئاشووری دەدا و ژمارەیەکی زۆر لەو

پرۆژانەی ئەنجام دا، بە تایبەتی ئاوەڕۆی هەردوو شاری نەینەواو هەولێر. ئەوەی تایبەتە بەشاری هەولێر، خەڵکی هەولێر زۆر پێویستی بە ئاوی شیرین و سازگار هەبووە، چونکە ئەو ئاوەی هەبوو بەشیانی نەدەکرد، بۆیە شا سەنحاریب بیری لەوە کردەوە، کە پرۆژەیەکی ئاوەڕۆی بۆ دابمەزرێنێت. ئەوە بوو ئاوی (بەستۆرە)ی هەڵبژارد، کە جۆگەیەکە لە رووباری زێی گەورە. جا لەبەر ئەوەی ئەو زەوییەی کەوتۆتە نێوان ئاوی بەستۆرەو هەولێر، بەرز و نەوی زۆر بوو، سەنحاریب پێی وابوو کە ئەستەمە بتوانێ ئاوی رووبارەکە لە رێگای جۆگەلەی ئاو بگەیەنێتە شاری هەولێر. هەروەها لەرووی کرداریشەوە ناکرێ لەشوێنی نزم ئاو بگوازرێتەوە، بۆیە هیچ رێگایەک لەبەردەمی نەما تەنیا ئەوە نەبێت، کە ئاو بۆ شاری هەولێر لەرێگای نۆکەند لەژێر زەوی بهێنێت. جا لەپێناو بەدیهێنانی ئەو پرۆژەیە بیری زۆر لە ناوچەیەکی پەنگخواردوو لەنێوان رووباری بەستۆرەو شاری هەولێر بەشێوەی زنجیرە کە هەر بیرێک بەنزیکەی ٤٢ مەتر لەبیرەکەی تر دوور بێ و بەهۆی تۆنێلی ژێر زەوی بیرەکانی پێک بەستەوە و، هاوکات بەو هۆیەوە بوو بەنۆکەندو ئاو گەیشتە شاری هەولێر. ئەو تۆنێلانەی کە بە یەکترەوە بەستراون پێیان وترا (کارێز)[٢٧]. پرۆژەکە[٢٨] لەنزیک گوندێک بەناوی (قەڵامورتکە) قەڵامورتکیان کە کەوتۆتە باشووری (دۆڵی بەستۆرە)و بە نزیکەی ٢٠ کیلۆمەتر لە باکووری شاری هەولێر دوورە کرایەوە. بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری عێراق، شوێنەواری ئەو نۆکەندەی لەساڵی ١٩٤٧ دۆزییەوە. لەلایەک زارگەکەی دیوارێک کە لە بەرد دروست کراوە رووخاو بوو، لەسەر یەکێ لەو بەردانە ئەو نووسینە نووسرابوو[٢٩]. (ئەز سەنحاریبم شای جیهانی ئاشوور، سێ رووبارم[٣٠] لەچیای (خانی)[٣١] هەڵکەند لەسەرووی شاری هەولێر. نیشتمانی خاتوونی گەورە خوای ئەشتار). سەنحاریب ئاوی ئەو رووبارانەی بەڕاستی هێنا، پاشان قۆناغێکی دیکە بوو بەپاشگری ئەویش ئاوی کانیاوەکان کە کەوتۆتە نزیک گوندەکان (خۆران- هاتان- دنجیزاوە). پاشان نۆکەندەکە هەڵکەنراو درێژ بۆوە تا گەیشتە ناوەڕاستی شار[٣٢]. بەمەوە دەسکەوتێکی زانستی گەورە لەبواری ئاوەڕۆ بەشێوازێکی سادە بەدی هات و، بوو بە بەڵگەیەکی سەلمێنراویش لەسەر گەورەیی شارستانییەتی کۆنی هەرێمەکە و رەسەنایەتییەکەی و پێش شارستانییەتەکانی دیکەش کەوتووە.

شایانی باسە دەبێ ئاماژە بەوە بدەین کە نەینەوا پایتەختی دەوڵەتی ئاشووری لەسەر دەستی بابل و ئیلامییەکان لەساڵی ٦١٢پ.ز هەروەکو پێشتر باسمان کرد نشووستی هێنا. دوای ئەو شاری هەولێر هەر لەسەر دەستی ئەوان نشووستی هێنا، بەڵام پیرۆزی شاری هەولێرو رێزگرتن لەپەرستگا گەورەکە، پەرستگای ئەشتار بوو بەیەکێ لەهۆکارە سەرەکییەکان، کە ئەو شارە لە داگیرکردن و کاولکاری بپارێزێ، کە بەسەر شاری نەینەوا داهات دادەنرێت[٣٣]. هەروەها بەڵگەیەکیشە لەسەر گەورەیی شاری هەولێر هەر لەدێر زەمانەوە، نەک هەر لەلای رۆڵەکانی و خۆشەویستانی بگرە لای ناحەزانیشی.

بەمەوە دەشێ ئەوە بڵێین مێژووی شاری هەولێر پەیوەندی بەمێژووی کۆنی دوو رووبارەوە هەیە بەپێی ئەو قۆناغە شارستانییە دوورو درێژەی بەهەزاران ساڵ تێپەڕ بووە. ئەو شارە وێستگەی تێپەڕوانین و بایەخدانی هەموو دەوڵەت و ئیمپراتۆرییەتە کۆنەکان بووە، کە لەسەر خاکی رافیدەین یەک لەدوای یەکەوە هاتوون. ئەمەش خۆی لەخۆیدا راڤە بەمانەوەی ژیان دەدات لەو شارە کە لەهەموو زەمەن و سەردەمێکدا، شارستانییەتی بەخۆوە دیوە.

### سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١- طه باقر: من تراثنا اللغوي، (بغداد، ١٩٨٠)، ل ١٥٧-١٥٨.
٢- حسين النجفي: معجم المصطلحات والاعلام في العراق القديم، (بغداد، ١٩٨١)، ل٢١٧.
٣- فؤاد جميل: "حدياب... اربيلا...

وعشتار- اربيلا" مجلة سومر، م٢٥ (بغداد، ١٩٦٩)لا٢١

٤- قحطان رشيد صالح (اعداد): الكشالف الأثري في العراق، (جامعة الموصل، ١٩٨٧)، لا٨٣.

**George Roux, Ancient Iragep. 33**

نقلا عن جميلن المصدر السابق لا٢٢١.

٦- صلاح الجنابي: "جغرافية منطقة الموصل" في موسوعة الموصل الحضارية ج٧ (جامعة الموصل، ١٩٩١) لا ١٠.

٧- فؤاد سفر: "اشور (بغداد، مطبعة الحكومة، ١٩٦٠) لا ٣.

٨- عامر سليمان: "منطقة الموصل في الآلفا لثالث قبل الميلاد" في موسوعة الموصل الحضارية ج/١ سەرچاوەی پێشوو لا٦١، علي مهدي، اشوريون الاههم وموطنهم وحضارتهم وتاريخهم (بغداد، ١٩٦٩)لا١٧.

٩- طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارة القديمة، ج/١، (بغداد، المطبعة الحوادث، ١٩٧٢) لا٧٩.

١٠- طالب منعم حبيب: سنحاريب، سيرته ومنجزاته ٧٠٤-٦٨١ث.م، رسالة ماجستير (غير منشورة) كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٦، لا لا٦-٧.

١١- رياض عبدالرحمن امين الدوري: اشور بانيبال، سيرته ومنجزاته (بغداد، ٢٠٠١) لا١٨٦.

(*) تعارف الباحثون على تقسيم التاريخ الاشوري الى ثلاثة عصور ئيسة، بدء من العصر الاشوري القديم الذي ينتهي بحدود ١٥٠٠ ق.م، والعصر الاشوري الوسيط الذي ينحصر بين عامي ١٥٠٠-٩١١ق.م، ثم العصر الاشوري الحديث أو الأخير، وينتهي بنهاية الاشوريين السياسية وسقوط عاصمتهم نينوى على يد البابليين والعيلاميين في عام ٦١٢ ق.م، انظر: عامر سليمان: العراق في التاريخ القديم (جامعة الموصل (١٩٩٢) لا١٩٣، فرج بصمهچي، كنوز المتحف العراقي (وزارة الاعلام، ١٩٧٢) لا٤٨-٥١.

١٢- ليوا او بنهايم: بلاد مابين النهرين، ترجمة، سعدي فيضي عبدالرزاق، ط٢/، ١٩٨٦. لا٤٧٨.

١٣- جميل سەرچاوەی پێشوو لا٢٢٣.

١٤- سليمان، منطقة الموصل في الألف الثالث قبل الميلاد، لا٦٥.

**15- Olmstead, A.T. History of Assyria .(London. 1960) P. 81.**

١٦- اوبنهايم، سەرچاوەی پێشوو لا٤٧٨.

١٧- جميل، سەرچاوەی پێشوو لا ٢٢٠.

١٨- اوبنهايم، سەرچاوەی پێشوو لا٤٧٨.

١٩- جميل، سەرچاوەی پێشوو لا ٢٢٠.

٢٠- ديلابورت: بلاد مابين النهرين، ترجمة، محرم كمال، (القاهرة، د.ت) لا٣٨٢.

٢١- جميل، سەرچاوەی پێشوو لا ٢٢٠.

٢٢- شيبان ثابت الراوي: اشور ناصربال الثاني ٨٨٣-٨٥٩ ق.م، سيرته واعمال. رسالة ماجستير (غير منشورة)، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٨٦، لا٣٢.

٢٣- جميل، سەرچاوەی پێشوو لا ٢٢٠.

٢٤- المصدر نفسه، لا٢٢٢.

٢٥- دوری، سەرچاوەی پێشوو لا١٠١.

٢٦- بۆزانیاری زیاتر بروانە سەرچاوەی پێشوو نفسه، لا ٩٧-١٣٤.

٢٧- فوزي رشيد: "العصور التاريخية في العراق القديم"، في: تاريخ العراق قديمه وحديثه، (بغداد، شركة الوفاق للطباعة الفنية المحدودة، ١٩٩٨)، لا٥٢.

٢٨- كانت زارك القناة مربعة الشكل تقريبا، تبلغ ابعادما ١٢٠×١١٢ م، واستخدمت الحجارة في تشييدها ورصفت اراضيها بالحجر ويبلغ عرضها ٦ متر، وتأخذ بالتوسع حتي تصل الى نحو ٢٧٠ متر. اما رصف جوانب القناة بالحجر فقد اقتصر على ارتفاع واطي لايتجاوز اكثر من ٥٠سم، كما انه عمل على حفر فوهة القناة بمستوى عقيق نهر (باستوره) الذي يقرب من ٢٠ متر عمقا. بروانە سەرچاوەی پێشوو نفسه، لا٥٢.

٢٩- بروانە ئەم سەرچاوەی لێکۆڵینەوەیە النفيس للأستاذ فؤاد سفر (سومر ج/١، المجلد الثالث.

**Sennacheribs project Supplging Er il With Water. PP.23-25**

٣٠- ان الأنهار الثلاث التي ورد ذكرها في هذا النص من المحتمل انها كانت تمثل الأنهار التي تنبع من منطقة (سوسة) التي تقع بين جبال (بنەباوە) وجبال (سفين) على الجهة الميني من نهر (باستوره). انظر: حبيب، سەرچاوەی پێشوو لا ١٦٢-١٦٣، فوزي رشيد: "نظم الارواء في العراق القديم" مجلة (افاق عربية)، العدد الاول السنة العاشرة، (بغداد، ١٩٨٥)، لا٩٢.

٣١- المراد من جبال (خاني) الجبال المشرفة على (وادي باستورة) والتي تضل اليوم بين مايسمي سلسلة (خان زاد) و (صلاح الدين)، وقد تكون (خانة زاد) اثارا من جبال (خاني) او أن هذه من ؟؟. انظر: سفر، **Sennacheribs project Erdil With Water, Supplging P.24**

٣٢- حبيب، سەرچاوەی پێشوو لا١٦٣.

٣٣- جميل، سەرچاوەی پێشوو لا٢٢٠.

*

# هەولێر لە سەرچاوە سریانییەکان لە پاش زایینەوە

نوری بوتروس

هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری رووبەرێکی گرنگیان لە سەرچاوە سریانییەکانی کۆن و نوێ گرتبووەوە، ناوی هەولێر لە زۆر لەو سەرچاوانە هاتووە، ئەگەرچی ئەو ناوچەیە لەو لێکۆڵینەوانەدا شتێکی نوێ نییە، بەڵکو پێشتر لە سەرچاوە بابلی و ئاشوورییەکان بەجۆرێک ناوی هاتووە لێی توێژراوەتەوە، کە یەکێکە لە کۆنترین ئەو ناوچانەی مرۆڤی کۆنی تێدا ژیاوە و تاکو ئێستاش ژیانی تێدا بەردەوامە. بۆیە لە ژیارە هەرە کۆنەکانی جیهانی کۆن دەژمێردرێت، سەرەڕای بەسەریەکدی رۆیشتنی رۆژگار و چەرخەکان هەر لە پەرەسەندن و گەشە کردندا بەردەوام بووە.

ئاشوورییەکان ناویان بە (ئەربائیلۆ) هێناوە بەمانا شاری چوار خواکە، کەچی لە سەرچاوە سریانییەکان ناوی بە (حدیاب) یان (حزە) هاتووە، کە ئەویش ئەو ناوچەیەی نێوان زێی گەورە و بچووک بووە.

لەو لێکۆڵینەوەیەدا هەندێ لەو سەرچاوانە وەردەگرین و لە توانای هیچ توژەرێکیشدا نییە بتوانێ هەموو بابەتە پێویستەکان کۆبکاتەوە، ئەوەش لەبەر دژواری دەسکەوتنی ئەو توێژینەوە و لێکۆڵینەوانەی بە جۆرەها زمانن و هەروەها زەحمەت دەسکەوتنی سەرچاوەکانی مێژووی کەنیسەی رۆژهەلاتیش، لەو سەرچاوە گرنگانەش (تاریخ الرهاوی المجهول)ە، کە پەتریارک ئەفرامی دووەم ساڵی(١٨٩٩) توانی دەقی دەستنووسە سریانییەکەی لە ئەستەنبوڵ دەست بکەوێ، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چواردەمی زایینی و لە ساڵی(١٩٠٠ی) زایینییەوە دەستی کرد بە بلاوکردنەوەی دەقەکە و لە ساڵی ١٩٠٤ی زایینی لە لوبنان بەشی یەکەمی بەرچاو کەوت و زانا (فرنسیس نو)ش چەند برگەیەکی لە گۆڤاری (الشرق المسیحی) بە زمانی فەرەنسی و لە ماوەی (١٩٠٧ - ١٩٠٨) بلاو کردەوە، پاشان پەتریارک ئەفرامی دووەم بەشی دووەمی ئەو دەستنووسەی لە ساڵی(١٩١١) بلاوکردەوە و لە ساڵی(١٩١٤)ش زانای فەرەنسایی (الاب شابو) ئەو شوێنکارە نایابەی بلاو کردەوە، ئەوەش بە هاریکاری لەگەڵ (الاب ئەفرام برصوم) لە بەلجیکا و لە ساڵی(١٩١٦)، هەروەها (الاب شابو) توانی بەشی یەکەمی وەرگێڕدراوە لاتینییەکەی لە ساڵی(١٩٣٧)دا بلاو بکاتەوە، (جیب Gibb)یش لە ساڵی ١٩٣٣ چەند بەشێکی وەرگێڕایە سەر ئینگلیزی و لە ساڵی(١٩٣٢ش) رۆکر دەقەکەی وەرگێڕایە سەر زمانی ئەلمانی، بەلام دەربارەی دانەری کتێبی (الرهاوی المجهول) بۆچوونی جۆراوجۆر هەیە، هی وا هەنە دەڵێن لە سەرەتای ساڵی ١١٨٧ لە قودس بووە، لەوکاتەی، کە سەرکردەی کورد (سەلاحەدینی ئەیوبی) چووەتە ناو ئەو شارە، زۆربەی ئەو رووداوانەی لەو ناوچەیەی ببووە مایەی دووبەرەکی لە نێوان موسلمانەکان و خاچپەرستەکان لە ماوەی شەڕی خاچپەرستەکان گرانایی خۆیان خستبووە سەر رووداوەکانی قودس و ناوچەکانی دەوروبەری.

بەلام (مەلیک ئەشرەف) دەڵێ: کتێبی (الرهاوی المجهول) لە ساڵی(١٢٣٧ی) زایینی نووسراوە، کەچی رووداوە مێژوویەکانی لەو

سەرچاوەی ناوبراو ناویان هاتووە پێیان لەسەر ساڵی ١٢٤٠ و ساڵە نزیکەکانی ئەو ساڵ دەچەقێن.

چونکە دانەری نادیار هاوچەرخی ئەو رووداوانە بووە، کە لە نێوان ماوەی (١١٨٧ - ١٢٣٧ی) زایینی روویان داوە و بەچاوی خۆی دیویەتی بە دەستپاکی نووسیویەتییەوە، بەڵام سەرچاوەکانی مێژووی رەهاوی زۆرن و گرنگترینی ئەو سەرچاوانەش، بروانامەکانی رەسمی (پەتریارک میخائیل)ن و توانی لە کتێبخانەی (دیر برصوما) بیاندۆزێتەوە و هەندێکیشان لە مێژووی خۆی بڵاوکردەوە، وەک دەقی نامەکەی میخائیل بۆ تیودورس، بەڵام سەرچاوەکانی دی کە مێژووی رەهاوی پشتی پێبەستوون، هەرە گرنگەکەیان (مێژووی رەهای ونبوو)ە، کە باسیلوس کوڕی شوفە نووسیویەتی، هەروەها مێژوونووس پشتی بە چەند سەرچاوەیەکی دی، عەرەبی و ئیسلامی، بەستووە، سەرەڕای بوونی چەند سەرچاوەیەکی ئەرمەنی، کە دانەری نادیار ئاماژەی بۆ کردوون، چونکە ئەرمەنییەکان و سریانییەکان لە ناوچەی رەها و ناوچەکانی دی دەوروبەری و نزیکی (دیر برصوما) پێکەوە ژیاون، چەند کەسایەتییەکی ئەرمەنیش ناوی لە مێژووی رەهاوی هاتووە، لەوانەش (ئەکون ئەرسەلان).

هەندێ لە مێژوونووسە ئەرمەنییەکان وایان دەرخستووە، کە لەوانەیە (مێژووی مەتی رەهاوی ئەرمەنی - تاریخ متی الرهاوی الارمنی) یەکێک لە سەرچاوەکانی (مێژووی رەهای نادیار) بێت، کە دەربارەی لێکۆڵینەوەی مێژووی کەنیسەیە لە ساڵی(١٢٠٧ی) زایینی تاکو ساڵی(١٢٣٤ی) زایینی، ئەو ماوەیەش ماوەیەکی پڕ رووداوی مێژوویییە و پێگەیەکی گرنگی هەیە لە مێژووی ئەو ناوچەیە و هەروەها لەو لێکۆڵینەوە مێژوویی و ئەکادیمییانەی، کە لێکۆڵەرەوە مێژوونووسەکان هاوشان پشتیان پێبەستوون، بەتایبەتیش ئەو رووداوانەی تیشک دەخەنە سەر هەرێمی هەولێر و ئەو ناوچانەی دەوروبەری، کە لەوکاتی کەوتبوونە ژێر رکێفی، لەوانەشە ناوی ئەو رووداوانەمان لە سەرچاوە مێژووییەکانی دی پەیوەندار بە لێکۆڵینەوەی گەلانی رۆژهەڵات بەرچاو نەکەوێ، کە گەلی کورد تێیدا بەشێکی بنەڕەتییە، چونکە توخمێکی کاریگەر بووە لە پەرەسەندنی ئەو رووداوانە چ لەلایەن کەسەکانییەوە و چ لەلایەن پاڵەوانەکانییەوە.

مێژووی رەهاوی نادیار بە راستی بە بروانامەیەکی مێژوویی گرنگ دەژمێردرێ و توێژەر ناتوانێ بەلاوەی بنێ، هەروەها ئەو رووداوانە بەشێوەیەکی گشتی سوود دەگەیەنن بە خوێنەر و بەدواداچوون و فێرخواز بەتایبەتیش ماوەی - بابەتی توێژینەوەکە - لە بابەتی گەمارۆدانی رەها ناوی هەندێ رووداو دیارکراوە، کە لە هەولێر روویانداوە، لە بواری گێڕانەوەی رووداوەکانی نورەدین زەنکی ناویان هاتووە، کە سەرۆکی تورکەکانە لە وڵاتانی رۆژهەڵات، کەچی سەلاحەدین سەرۆکی هەرە گەورە و راوێژکار و پەندیار و سەرکردەی بەرزی تەواوی هێزەکانی زەنکی بوو.

سەربازگەکەی لەلای رۆژئاوای شار و بەرامبەر دەرگای چاوگەکان و لەسەر بەرزایی گۆڕستانەکە، کە گۆڕی (مار ئەفرام)ی لێبوو، دامەزراند، هەروەها لەسەر شوێنی سەلاحەدین و بەرامبەر سەری دۆڵی سلێمان، زەینەدین عەلی کوچک، فەرمانڕەوای هەولێر و شارەزوور، لەلای ئەو سنوورەی پێی دەگوترا سنووری برصوما شوێنی خۆی گرت و لەلای رۆژهەڵاتی دەرگای (کساس)یش میرێکی گەورە نیشتەجێ بوو، کە پێیان دەگوت (دبیس) و فەرمانڕەوای هەرێمەکانی خواروو بوو، کە بەرامبەر ناوچەی بابل و لەلای دەرگای خواروو بەرامبەر حەران، کۆمەڵە گەلێکی زۆری کوردان هەروەها گەلانی دیش لە عەرەب و خەڵکی حەلەب، شوێنی خۆیان گرت، شەڕ دەستی پێکرد و (زەنکی)یش هەردەم خۆی بە ئاشتیخواز نیشان دەدا، بەڵام حەزیشی لێبوو بە رێگای ئاشتی دەست بەسەر شارەکەدا بگرێ و دەیگوت (ئەی یاخیبووەکان ئێوە دەبینن، کە خۆشی ژیانتان لە دەست چووە، بۆچی سەیر دەکەن و چاوەڕوان دەکەن، بەزەییتان بەخۆتان و بە کوڕەکان و کچەکان و ژنەکانتان و بەماڵەکانتان و بەشارەکەتان بێتەوە با لە دانیشتوانی وێران و چۆڵ نەکرێ، کەچی سەربازەکانی زەنکی ئاگریان بەردایە دیوارەکە دوای ئەوەی

نەوت و پیو و کبریت و داریان تێدا دانا و بە ئاسانی دیوارەکەیان تێکدا و سەربازەکان چوونە ناوی و شەش هەزار کەسیان لە دانیشتوانەکەی کوشت.

کەچی دوای ئەو رووداوە زەنکیی داوای لە (المطرا خولیط) کرد، کە پەیمانەکەی لەگەڵ موسلمانەکان بپارێزێ، پاشان ماڵ و گا و گەنمێکی زۆری دایە خەڵکی رەها و میرێکی لە شارەکە دانا، کە زەینەدین عەلی کوچک سەرداری هەولێر و شارەزوور بوو، هەروەها حەوت میری دی و سەربازێکی زۆری بۆ پاسەوانی شارەکە دانا و دوای چوار رۆژ پاش داگیرکردنی شارەکە، زەنگی بەرێکەوت و شاری حەرانی بڕی و رۆیشت بەرەو (قالونیقس)ی سەر زێی فورات.

هەروەها لە رووداوی کوشتنی نەسرەدین لە موسڵ وا دیار دەکا، کە لەکاتێکدا زەنگی چوار دەوری (بیدتا)ی دابوو و دلێرانە شەڕی لەگەڵ دەکرد، سوار وشترێکی خێرەمەندی وەک گەردەلوولە تیژڕەو بەشەو پێدەگا و پێی دەڵێ: نەسرەدینی جێگرت لە موسڵ کوژراوە و لە ئاشووریش پەشێوییەکی زۆر هەیە. کە کاتێ زەنکی ئەوەی بیست، راچڵەکی و ئازاری خوارد، یەکسەر زەینەدین فەرمانڕەوای هەولێری بانگ کرد، کە لە رەهای دامەزراندبوو، بە پەلە بۆ موسڵی نارد تاکو جێگای نەسرەدین بگرێتەوە، خۆشی (زەنکی)، هەر بەو شەوە بۆ حەڵەب رۆیشت، پاشان ترسێکی گەورە کەوتە ناو شاری رەها و ئەو هێزە کوردانەی لە موسڵ بوون هاتنە ناو شارەکە و کوڕی سوڵتانیان گرت، بەڵام زەینەدین دوای دە رۆژ هاتەوە و فەرمانی بەسەردا دەرکردن، هەروەها لە بابەتی رووداوەکانی حەڵەبدا هاتووە، کە لەساڵی (١٤٧٥ی) زایینی نورەدین هێزەکانی خۆی کۆکردەوە و براکەی قوتبەدینی فەرمانڕەوای (ئاثور) و (موسڵ) و زەینەدینی فەرمانڕەوای هەولێر و شەنگار و فەخرەدینی فەرمانڕەوای (حصن کیفا) و حیسامەدینی فەرمانڕەوای ماردینی بانگ کرد، کاتێ کە ئەو لەشکرە زۆر و زەبەندانە کۆبوونەوە و هاتن دەوری (حصن حارم)ی نزیک حەلەبیان گرت، کە ئەو قەلابەندە لەژێر رکێفی (فەرەنگی)یەک بەناوی (ئەروغاد) بوو، پیاوێکی بە سام و گەورە بوو، قارەمانانە دژی تورکەکان خۆی راگرت، ژمارەی سوپاکەی ٦٠٠ سوارە بەرامبەر ٦٠ هەزار سوارەی لایەنەکەی دی بوو، شەڕ دەستی پێکرد و موسڵمانەکان تیایدا سەرکەوتن و (کوتن توروس) هەڵات، هەروەها فەرمانڕەوای (رۆم)یان گرت و گشت پیادەکانیشیان قڕتێخستن، دیسان لە رووداوەکانی دەرچوونی سەلاحەدین لە میسر بۆ سوریادا هاتووە، کە لە ساڵی (١٢٩٠ی) زایینی سەلاحەدین دەرچوو بەرەو دیمەشق و لەوێش بۆ بەعلەبەگ، چونکە فەرمانڕەواکەی لێی هەڵگەڕابووەوە، لەو کاتەشدا سەیفەدینی ئەتابەگی موسڵ مرد و دوای ئەو براکەی عیزەدین بووە فەرمانڕەوا لەسەر (ئاثور) و (موسڵ) و (نسیبین)، عیمادەدینی برای ئەتابەگی موسڵیش فەرمانڕەوای ژەنگار و سنوورەکەی بوو، بەڵام جزیرە و وڵاتی نێوان دوو زێیان لە ژێر فەرمانڕەوایەتی کوڕی (سەیفەدین)ی دابوو، عەلی کوچکی فەرمانڕەوای هەولێر، کوڕی زەینەدین، فەرمانڕەوا بوو لەسەر هەولێر و دەوروبەری و هەروەها شارەزوور و ئەو شوێنانەی سەر بەوێ بوون، دوای دەست بەسەرداگرتنی سەلاحەدین بەسەر رەها، بەجێی هێشت بەرەو خابوور و دای بە فەخرەدین، پاشان بەرەو ژەنگار رۆیشت و دواتریش گەڕایەوە موسڵ.

لەبارەی دیارکردنی کۆچی سەلاحەدین، دانەری مێژووی رەهاوی، دەری خستووە، کە سەرکردەی کورد سەلاحەدینی ئەیوبی ئاشتنامەیەکی لەگەڵ فەرەنجەکان بەست، دوای ئەو فەرمانڕەوای رەها هەرێمی هەولێر و هەندێ ناوچەی شارەزووری وەرگرت، پاشان درایە تەقیەدینی کوڕی برای سەلاحەدین و ژەنگاریش درایە عیمادەدین، کەچی پاشای دادپەروەر بۆ نسیبین رۆیشت.

دوای پەلامارە سەربازییەکەی مەلیکی دادپەروەر بۆ رۆژهەڵات، فەرمانڕەوای هەولێر و فەرمانڕەوای موسڵ یارمەتی ژەنگاریان دا، پاشان مەلیکی دادپەروەر چووە نەسیبین و خاپوور و پاشانیش بەرەو حەران رۆیشت.

بەڵام هەندێ رووداوی گرنگ لە هەولێر دوای کۆچی دوایی موزەفەرەدینی فەرمانڕەوای شاری هەلێر و ئەو مەرگەساتەی

دانیشتوانی هەولێر دووچاری بوون روویان دا. دانەری مێژووی رەهاوی دەڵێ: لە ساڵی (١٢٤٥ی) زایینی موزەفەرەددینی خاوەنی هەولێر کۆچی دوایی کرد، کە تەمەنی گەیشتبووە نزیکەی سەد ساڵ و هیچ کوڕێکیشی نەبوو، کە جارێک دەسەڵاتەکەی بۆ لای بەغدا و جارێک بەرەو پاشای دادپەروەر ئاراستە دەکرد، چونکە ئەو ولاتانە لەیەکدی نزیک بوون، کاتێ کە گیانی لە دەست دا دووبەرەکی لە نێوان هێزەکانی موزەفەردین رووی دا و خەلیفەش لە بەغدا هێزەکانی خۆی نارد بۆ ئەوەی هەولێر بخاتە ژێر رکێفی خۆی، بەشێک لە دانیشتووانی هەولێر چونکە لایەنگیری مەلیکی دادپەروەربیان دەکرد، دەرگای شارەکەیان پێوەدا و سەرکەوتنە سەر دیوار و دەستیان کرد بە شەڕ کردن دژی لەشکری خەلیفە و هاواریان دەکرد: (هیچ مەلیکێکمان نییە تەنها مەلیک ئەشرەف نەبێ)، کە هێزەکانی خەلیفە رەفتاری خراپ و رق ئەستووری رۆڵەکانی هەولێریان بینی، شەڕیان لەسەر شارەکە توندکرد و داگیریان کرد و دواتریش ملی خەڵکەکەیان بەشیر پەلدا و زۆریان لە رۆڵەکانی کوشت، پاشان ئاگریان بەردایە شارەکە، لەبەر ئەوەی کوڕەکانی مەلیکی دادپەروەر لە شارەکە دوور بوون، بۆیە نەیانتوانی یارمەتی خەڵکی هەولێر بدەن، بەو جۆرە ماڵەکانیان خاپوور کرا و زۆریشیان لێ کوژرا.

بەڵام سەرچاوەی دووەمی لێکۆڵینەوە سریانییەکان لەبارەی هەولێر، کتێبی (ذخیرە الأذهان فی تواریخ المشارقە والمغاربە السریان)ە، دانەرەکەی قەشە (بطرس نصری الکلدانی) بوو، ئەو کتێبە بەدوو بەش لە موسڵ چاپ کرا، کە لە بڵاوکراوەکانی (دێری باوکانی دۆمنیکان)ی ساڵی ١٩٠٥ بوو، گەلێ رووداوی دەربارەی هەولێر و دەوروبەری تێدا دیارکراوە، هەر لەو بوارەدا دانەر ناوی هەولێری بە (حدیاب) هێناوە، کە هەردوو زێی گەورە و بچووک دەوریان دابوو، هەروەها پیاوانی ئایینی کۆن ناوی هەولێریان بە (عین رحوت) هێناوە، کە ناوەکەی لە "سفر التکوین" (١٠: ١١)دا هاتووە، ئەربل دەوڵەتێکی بچووک بووە، مەلیکێک فەرمانڕەوایی کردووە، ناوی (عزلت) بووە و ئەربل شارێکی بەناوبانگ بووە و خەڵکێکی زۆری تێدا ژیاوە و لە نزیکی ئەودا داریۆشی مەلیکی فارسی لە بەرامبەر ئەسکەندەری (ذی القرنین) شکستی خواردووە، موسڵیش وەک گفتێک سەر بەوی بووە، دوای ئەوەی ئەربل بەهۆی شالاو و جەنگەکانی ساڵی ١٤٠١ وێران کرا و لە دانیشتوانێکی کەمی، فەلە و موسڵمان و جوولەکەی زیاتر تێدا نەما، شانشینی حدیاب لەو سەردەمەدا دامەزرا، کە دەوڵەتی رەهای تێدا دروست بوو، لەوکاتەی برسیەتی لە ئۆرشەلیم لە ساڵی ٤٦ی زایینی تەنگی بە خەڵک هەڵچنیبوو، مەلیکی فەرمانڕەوا لە هەولێر گەنمێکی زۆری وەک یارمەتی بۆ ناردن، هەروەها لە سەردەمی شاپووری دووەمی مەلیکی فارسەکان خەڵکێکی زۆری دانیشتوانی هەولێر کوژران و ژمارەی کوژراوان لە (کرخ سلوخ) و (ئاشوور) و (ئەربل) و (ولاتی جەزیرە) گەیشتبووە ٣٠.٠٠٠ کەس، قەرەداغی مزربانی ئەربل، کە شاپوور بە فەرمانڕەوا لەسەر ئەربلی دانا بوو، چونکە یەکێک بوو لە هەرێمەکانی سەر بە ئیمپراتۆریەتی فارسی، قەڵاتێکی لەسەر گردێک دروست کرد پێیان دەگوت (ملقی) کە کاتێکیش پەیوەندیەکانی نێوان ئەربل و فارس تێکچوو، لە ساڵی ٢٥٩ی زایینی شاپوور فەرمانی دەرکرد بە کوشتنی قەرەداغی فەرمانڕەوای ئەربل، دوای ئەوەش حدیاب بووە پایتەختی ولاتی نێوان دوو زێیان.

بەڵام بەشی دووەمی سەرچاوەی ناوبراو لە ساڵی ١٩١٣ چاپ کرا، کە لەلاپەڕەکانی یەکەمی کتێبەکەدا هاتووە و دەڵێ، کوشتارێکی گەورە لە ساڵی (١٢٦٦ی) زایینی رووی دا بەهۆی رووداوەکانی ئاژاوە و ژاوەژاو و نائارامی بارە سیاسییەکان و نەمانی ئاسایش و سەروەری یاسا، دوای داگیرکردنی ئەربلیش لەلایەن مەغۆلەکانەوە و زاڵبوونیان بەسەریدا، خەڵکانێکی زۆری ئەربل و شارەکانی دی عێراق رایانکرد و پەنایان بردە بەر چیاکان، لەسەردەمی (خدبندا)ی مەلیکی مەغۆلەکان کوشتارێکی دی لە ئەربل لە ساڵی ١٢٠٥ی زایینی رووی دا و دوای ئەوەش بارەکانی سیاسی و ئابووری لەو ولاتانە تێکچوون، لە زانا هەرە بەناوبانگەکانی ئەربل لە ماوەی داگیر کردنی مەغۆلەکان (خامیس کوڕی قرداحی) بوو، کە خەڵکی

هەولێر و مێژوونووس و شاعیریش بوو، دیوانێکی لە پەندیاری و وەرگێرانێکی زۆر و زیاتر لە سی هەڵبەستی لە کاروبارەکانی ئایین و ڕێ و شوێنی دەروونندا هەیە، (ابن العبری)یش زیاتر لە جارێک ناوی هێناوە، هەروەها دانەر ئەوەش دەردەخا، کە دوای ئەوەی موسڵ دەکەوێتە دەست مەغۆلەکان خەڵکەکەی بەرەو هەولێر ڕادەکەن، لە سەردەمی دەوڵەتی (ئاق قۆینلو)ی تورکی کاروباری هەولێر جارێکی دی تێکچوو، لە ساڵی(١٢٧١ی) زایینیش کۆمەڵە دزێک روویان لە قەڵاتی هەولێر کردبوو، کە ئەوکات میر محەمەدی کوڕی یەحیا فەرمانڕەوایی دەکرد و توانیشی قڕیان بکات.

دیسان لە ساڵی (١٢٧٥ی) زایینی ئەربل خاپوور کرا و دووچاری وێرانبوون بووەوە، پاشانیش دۆزەکانی سەردەمە یەک لە دوای یەک بەسەریدا هاتن، ئەربل دووچاری پەلامارەکانی نادرشا یان گولی خان (طهماسب)ی شای عەجەمەکان بووەوە لەو کاتەی چەند پەلامارێکی سەربازی کردە سەر موسڵ و کەرکووک و ئەربل، کە سەر بە فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانی بوو، ئەوەی چووە ناو ئەربل زۆری لە دانیشتوانەکەی کوشت و ئەوانی دیش رایان کرد، یەکێک لەوانەی لە پەلامارەکانی نادر شا رزگاری بوو، یوسف عەنکاوەیی بوو، توانی بگاتە وڵاتی هیندی ملیباری بۆ گەڕان بەدوای کاروباری خەڵکەکەی، کە یەکێک بوو لە رەبەنە بەناوبانگەکان و ساڵانێکی دوورودرێژ لە هیند مایەوە، یوسف عەنکاوەیی لە رواندوز لە دایک بووە و لەگەڵ ئیبراهیمی باوکی هاتوون و لە عەنکاوە نیشتەجێ بوونە و لە ساڵی ١٧٩٠ بووەتە قەشە لە دێری (مار طهمز جرد) کە لە کەرکووک (سلوخی کۆن) نزیک بووە و چەندین هۆنراوەی بە تورکی و لاواندنەوەی لەسەر ماریۆنانی شەهید هەیە، هەروەها فەرهەنگێکی بەزمانی ئارامی و کتێبی (یاقوت الکهنة) و (میزان الزمان) و کتێبی (التأملات في عذاب جهنم) و زۆر نامەی دی لە بابەتی جۆراوجۆری داوە. و دوای گەڕانەوەی لە هیند بە بەڕێوەبەری موسڵ دادەمەزرێ و پاشان دەبێتە بەڕێوەبەری بەغدا و دوای ئەو قەشە ئەندریای بەغدایی لە دەوروبەری ساڵی (١٨٣٠ی) زایینی جێی دەگرێتەوە.

شەمعون باسیدی کاروباری نەستووریەکانی گرتە ئەستۆ، کە خەڵکی باسیدا بوو، باسیداش یەکێک بوو لە گوندەکانی(ئاثوری) نزیک ئەربل، پاشان پەرستگای گەورەی هەولێر ساڵی (١٢٧٥ی) زایینی دووچاری وێرانبوون بوو.

لە سەرچاوە سریانییەکانی دی کە لە مێژووی هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری دەکۆڵێتەوە، کتێبی مێژووی (قەشەکانی هەولێرە، دانەرەکەی (مشیما زخا)یە لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەم ژیاوە و مێژووی لە چاپدانیشی ساڵی (١٩٠٧)ە لە لایبزک لە چاپدراوە، دەربارەی دەنگوباسی ئەو وڵاتانە و ئەو کتێبەش کە گرنگییەکی گەورەی تایبەتی هەیە، بەتایبەتی لە بابەتی بڵاوبوونەوەی ئایینەکان لەو هەرێمە و ئەو چەوساندنەوانەی دووچاری هەرێمەکە بوون، هەروەها دەنگوباسی دەوڵەتی (فرثیەکان) و ساسانییەکان و شاکانیان تێدا دیار کراوە، بەڵام دەربارەی مێژووی کاروباری کەنیسەی هەولێر، وا دەردەکەوێ لە سەدەی دووەمی زایین لەسەر دەستی دامەزرێنەری کەنیسەکەیان (ادی الرسول) و دوای ئەویش (مار ماری الرسول) دەستی پێکردبێ، کە هەردووکیان لە حدیاب (ئەربل) و کشکر و ئەهواز و مەدائین و وڵاتانی دی مژدەیان رادەگەیاند، لە دەوروبەری ساڵی(١٠٤ی) زایینی (بقیدا) بووە قەشەی ئەربل، کە یەکێک بوو لە قوتابییەکانی (ادی الرسول) و لە خێزانێکی هەژار بوو و دووچاری چەوسانەوە بوو و ناچار بوو بەرەو چیاکانی حدیاب رابکا، لە ساڵی(١١٤ی) زایینی کۆچی دوایی کرد و کورسی هەولێر ماوەی شەش ساڵ بە بەتاڵی مایەوە، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ هەڵگیرسانی شەڕی نێوان فرثیەکان و رۆمانەکان، کاتێ کە دۆخەکان ئاسوودە بوون و ئاشتی باڵی بەسەر رۆژهەڵاتدا کێشا، لە ساڵی (١٢٠ی) زایینی (عزرا) بەرەو هەولێر رۆیشت و دەستی بەسەر (شمشون الشماس) داگرت و بووە قەشە و دوای ئەویش (الحق) لەسەر تەخت ئەربل دانیشت و فەرمانڕەوای هەولێر، کە ناوی (رقبخت) بوو، یەکێک بوو لە

قوتابییەکانی و لە ترسی (ئولغاشی دووەم) بە نهێنی چووبووە سەر ئایینەکەی و بەهۆی (رقبخت)یش ئایینی فەلەیی لە دەوروبەری هەولێر بڵاوبووەوە و توانیشی کەنیسەیەکی شکۆدار لە هەولێر دروست بکات، کە تاکو نەوەی شەشەم هەر مابوو، دوای ئەویش ئیبراهیمی کوڕی شلیمۆن هات، کە پێشتر لە چیاکان موژدەی دەدا و پاشان بارودۆخەکان وایان لێکرد، کە بۆ هەولێر بێتە خوارەوە و بەرهەڵستی ئەو چەوسانەوەیە بکات، کە فارسەکان وروژاندبوویان، دوای ئەبراهامیش نوح لەسەر کورسی هەولێر دانیشت، کە باوکی خەڵکی (کشکر) بوو، چووە (ئۆرشەلیم) و لەوێ بووە فەلە و لە گەڕانەوەیدا لە حدیاب نیشتەجێ بوو، لە کارەکەیدا لەسەر دەستی مەجووسەکان دووچاری گەلێ تەنگ و چەڵەمەی بەتین بوو تا کار گەیشتە ئەوەی بەندی بکەن، بۆیە هەولێری بەجێهێشت و رووی لە گوندەکان کرد، پاشانیش بۆ ئاشوور دواتریش لە ساڵی(١٨١ی) زایینی گەڕایەوە بۆ هەولێر و ماوەی ١٦ ساڵ لەسەر تەخت مایەوە.

دوای کۆچی دوایی (نوح)، کەنیسەی هەولێر، بە هۆی کارە چەوسێنەرەکانی فارسەکان، بە بێوەژنی مایەوە، لە ساڵی (١٨٥ی) زایینی لە خواترسەکانی کۆبوونەوە و (هابیل)یان هەڵبژارد، ئەویش رووی کردە هەولێر و لەو سەردەمیشدا شەڕێکی زۆر رووی دا، چونکە (ترسای)، مەلیکی حەدیاب، ملی کەچ نەکرد بۆ (ئۆلغاشی چوارەم) مەلیکی (فرثیەکان) و رازی نەبوو لەسەر چەوساندنەوەی فەلەکان، بۆیە (ئولغاش) پەلامارێکی کردە سەر (ترسای) و کوشتی و (حەدیاب)یشی تاڵان کرد دوای ئەو کارەساتە هابیل نەژیا و لە ساڵی (١٩١)ی زایینی و لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی مەلیک ئۆلغاشی چوارەم، کۆچی دوایی کرد.

دوای ئەو (عبد مشیما) هات، کە لە بنەڕەتدا هەولێری بوو و ماوەیەکی زۆر لە (ئەنتاکیە)و (دیمەشق) نیشتەجێ بوو و دوایش گەڕابۆوە بۆ هەولێر، لەو سەردەمەیدا دێر و کەنیسەکان لە باری لەنگەر و هێمنی دابوون و دانەری کتێبەکەش دەڵێ: ئەو پیاوە وەک بەڕێوەبەری کەنیسەکە سی و پێنج ساڵ ژیاوە، دوای ئەویش (شەلحوثا) جێی گرتۆتەوە، دوای کۆچی دوایی مەلیک ئەردەشێر، ساڵی (٢٤١ی) زایینی، شاپوری کوڕی شوێنی گرتەوە و لەگەڵ مادەکان و خوارزمیەکان بەشەڕهات، (شەلحوثا)ش چووە مەدائین و پاشان گەڕایەوە هەولێر و دواتریش چووە (شار کورد) (شهر کورد) و قەشەیەکی بۆ دانا، (شەلحوثا) ١٥ ساڵ تەختی هەولێری بەڕێوەبرد و دوای ئەو (احاد ابوی) لەسەر تەختی هەولێر دانیشت، کە پێشتر بەهۆی شەڕی نێوان رۆمان و فارسەکانی ساڵی ٢٣٣ی زایین چوو بووە (طیسفون)، پاشان گەڕایەوە هەولێر و لەو سەردەمی (کوثراشنسب)ی فەرمانڕەوای حەدیاب گوێڕایەڵی خۆی بۆ شای فارسەکان ئورهانی سێیەم (٢٧٦ - ٢٩٣) دەرخست و قەڵایەکی سەختی لە چیا بۆ خۆی دروست کرد و ١٨ ساڵ تەختی هەولێری بەڕێوەبرد و تیاشدا مرد و کۆچی دواییەکەش لە سەرەتای نەوەی چوارەم بوو چونکە دەڵێن لەو سەردەمی (قوستەنتینی گەورە - ٣١٢) ببووە فەلە.

لەو سەرچاوە سریانییە گرنگانەی بایەخیان بە مێژووی حدیاب داوە ئەوەیە، کە مەتران (ئەدی شیر) لە کتێبەکەی (کلدو ئاثور) نووسیویەتی ئەو کتێبەش لە بەیروت و لە ساڵی ١٩١٣ بە دوو بەش بڵاوکردەوە و لە بەشی دووەمی ئەو کتێبە ئاماژەیەک بۆ جوگرافیای کەنیسەی کلدانی هەیە و (حدیاب)یش یان (حزە) یەکێک لە هەرە گرنگەکانی ئەبرەشییەکانی میترووپولیگی بووە و لە نێوان هەردوو زێ و هەر لە دیجلەوە تاکو ئازەربایجان درێژبووەتەوە و چەند ناوچەیەکی فراوانی گرتۆتەوە و سنوورەکەی لە زێی بچووک تاکو خابوورە و لە ویلایەتی (وان)ی ئێستا تاکو ئورمێ و دیجلە و بنکەکەشی شاری هەولێر بووە و (١٩) کورسی قەشایەتی لە ژێر دەسەڵاتدا بووە کە ئەمانەن:

١- (حیتون) لە چیاو لەسەر زێی گەورە. ٢- (بیت بغاش) لە ژووررووی رۆژئاوای رواندز لەسەر کەناری زێی گەورە. ٣- برحس. ٤- درینجان. ٥- دبرینوس. ٦- راموتین. ٧- بیت مهقرت. ٨- نەینەوا یان نەبی یونس. ٩- حدثا یان حەمامی عەلیل. ١٠- تیمنا کە لە چۆڵ (بادیە) بوو. ١١- بیث نوهدرا ئەوەش دهۆک و زاخۆ بوو. ١٢- مملثا ئەوەش گوندێکی بچووکی

دهۆک بوو. ١٣- (حانیشا). ١٤- داسان ئەوەش لە چیای گارەی خواروی ئامێدی بوو. ١٥- مرطا ئەوەش ئاکرێ و زێبار بوو. ١٦- سالاخ ئەوەش لە ژووروی مرطا بوو. ١٧- پشدەر ئەوەش لە نێوان رواندز و کۆیە بوو. ١٨- عین سفنی ئەوەش گوندێکی ژووروی موسڵ بوو. ١٩- لەو ئەسقەفیانەی سەر بە حدیاب بوون.

ئەسقەفیەی ئازەربایجان بوو کە زمانەکەی کلدانی بوو، بەڵگەش لەسەر ئەو قسەیە ئەوەیە کە فەلەی رواندوز و دەوروبەری هەروەها هی ئورمێ و خواسراوا ئێستا بەو زمانە قسە دەکەن و لە بەناوبانگترین شارەکان شاری ئورمێیە و رواندز و مەراغایە، کاتێکیش کە موسڵ گرنگییەکی گەورەی پەیداکرد، ئەبرەشیەی حدیاب بۆ دوو بەش دابەشکرا، کە ئەوانیش ئەبرەشییەی موسڵ بوون و دوای ئەوەی ئەبرەشییەی حدیاب بە ئەبرەشیەی حدیاب و ئاثور ناودەبرا. دەربارەی دەرخستنی ئەو چەوساندنەوانەی هەولێر دووچاری بووە، هەندێ لە سەرچاوە سریانییەکان زۆر لەو رووداوانەیان دیار کردووە.

لەوانە کتێبی مێژووی کەنیسەی رۆژهەڵات لە بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی تاکو هاتنی ئیسلام لە دانانی (الاب البیر ابونا)یە، کە دەڵێ چەوساندنەوە لە ساڵی (٣٤٣)ەوە بەردەوام بووە لە ناوچەکانی سەرووی شانشینی فارسی، بە تایبەتیش لە بیت گرمای (کەرکوک)و لە حدیاب (هەولێر) ئەوەش لەبەر بوونی هێزەکانی فارسەکان لەسەر هێڵەکانی رووبەرووبوونەوە لەگەڵ هێزەکانی رۆمانییەکان.

لەبارەی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە هەولێر، (الاب البیر ابونا) لە بەشی یەکەمی دانراوەکەی (شەهیدانی رۆژهەڵات) دەری خستووە، کە مار ماری هاتۆتە هەولێر و یارمەتی خەڵکێکی زۆری داوە، کاتێ مەلیکی هەولێر دووچاری نەخۆشی بەڵەک بووە و مار ماریش هاتۆتە هەولێر، مەلیک بە دوایدا ناردووە و داوای لێ کردووە چاکی بکاتەوە، دوای چاکبوونەوەشی فەرمانی دەرکردووە بە وردوخاشکردنی ئەو بتانەی دیانپەرستێ و فرێدانی پارچەکانی بۆ ناو زێی گەورە، پاشان نێردراو ماری دەچێتە گوندێکی دی سەر بە هەولێر، کە پێی دەگوترا (الزوابی)، بەڵام دەربارەی مێژووی ژیانی ئەو پیاوە ئایینیە پیرۆزانەی لە حدیاب و هەرێمەکانی دەوروبەری ژیاون، لە کتێبی (سەرکردەکان) ناویان هاتووە، کە دانەرەکەی (توما المرجی)یە و یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی سریانی لە مێژووی ئەو هەرێمە، بە تایبەتیش حدیاب و"بیث عابی" (زنجیرە چیای ئاکرێ و زێی گەورە و خازر) ئەوەش زۆربەی هەرێمەکانی کوردستان ئێستا دەگرێتەوە، هەروەها لەو کتێبەدا ناوی زۆر لەو رووداوانە هاتووە، کە لەسەر دەستی باوکە کاهینەکان لە کوردستان روویانداوە، هەروەها ئەو رووداوە مێژووییانەی تێیدا روویانداوە.

یەکەم چاپ لە کتێبی ناوبراو، شێخ (یوسف ئەلسەمعانی) لە ساڵی ١٧٦٨ چاپی کردووە، کە بە زمانی لاتینی و لە رۆما و لە دانراوەکانی کتێبخانەی رۆژهەڵات بووە، رۆژهەڵاتناسەکان بە مێژوویەکی تەواویان، دەربارەی ژیانی رەبەنەکان داناوە، لە ساڵی ١٨٩٣ رۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی (والیس بدج) بە زمانی کلدانی بڵاوی کردۆتەوە پاشان وەری گێراوە بۆ زمانی ئینگلیزی، هەروەها (الاب پولس بیجان)ی کلدانیش دەقی کلدانییەکەی لە پاریس و لە ساڵی ١٩٠١ بڵاوکردۆتەوە، ئەوەش یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی لێکۆڵینەوەی ناوچەی حدیاب (هەولێر) و ناوچەکانی سەر بەوێ.

دەربارەی لێکۆڵینەوەی مێژووی سەرکردەکانی بیت عابی و حدیاب، ئەویش سیفەتەکانی مێژوونووسێکی راستگۆی وەرگرتووە لە گواستنەوەی ئەو دەنگوباسە راستەقینانەی، کە رووداوەکانی لە کوردستان روویان داوە.


سەرچاوەکان

١- تاريخ الرهاوي المجهول: ترجمة الاب البير ابونا بغداد ١٩٨٦.

٢- ذخيرة الأذهان: بطرس نصري موصل، ١٩٠٥.

٣- تاريخ اساقفة اربيل: مشيحا زحا ١٩٠٧ بة كلداني.

٤- كلدو و اثور: ادي شير المطرن، الجزء الثاني، بيروت ١٩١٣.

٥- تاريخ الكنيسة الشرقية: الاب البير ابونا، بغداد ١٩٨٥.

٦- (الرؤساء): توحا المرجي، البير ابونا، بغداد ١٩٩٠.


* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٣) هاوینی (١٩٩٩) بڵاوبۆتەوە.

# شۆڕشی زکرتییەکان و نیشتەجێبوونیان لە ئەربیل (هەولێر)

زوبێر بیلال ئیسماعیل

ئێرانییەکان دانیشتووی بەرزاییەکانی ئێرانن، ناویان بۆ یەکەم جار لە دەقەکانی مەلیکی ئاشووری (سلمانسەری سێیەم - ٨٥٨ - ٨٢٤پ.ز) هاتووە، ئەویش کاتێک ڕێیان لە هەڵمەتی ئاشوورییەکان گرتووە، کە لە ساڵی (٨٤٤پ.ز) بەرەو ناوچەکانی چیای زاگرۆس ئاراستە کرابوو، لەو هەڵمەتەدا ناوی ئێرانییەکان هاتووە، کە بۆ پایتەختەکەیان (پرسوا - Persua) یان (فەرسوا)یان گەڕاندەوە، هەروەها ناوی (میدیا) لە هەڵمەتێکی ئاشووری هاتووە، کە لە ساڵی (٨٣٦پ.ز) بەرەو وڵاتی (میدیا) ئاراستە کرابوو، ئاشوورییەکان بە ناوی (مادای - Madai) ناوی میدییەکانیان هێناوە.

ئاشوورییەکان، شوێنی جوگرافی ئێرانییەکان دیار دەکەن و دەڵێن: وڵاتیان دەکەوێتە ڕۆژئاوا و باشووری دەریاچەی (ئوورمییە / ورمێ)، بەڵام وڵاتی میدییەکان دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەو ناوچەیە، واتە لەو ناوچانەی کە دەکەوێتە دەوروبەری شاری (هەمەدان) ی ئێستا، هۆزەکانی ئێرانی لە سەدەی (٩) ی پ. ز لەو ناوچانە نیشتەجێ بوون، کە پێشتر لە ڕۆژهەڵاتی دەریای (قەزوێن)ەوە هاتبوون، کە شوێنێکی دوور بووە.

شەپۆلێکی تری ئێرانییەکان هەیە، کە زۆر گرنگە، ئەو هۆزانانەن کە بە ناوی (زکرتو -Zikertu) ناسراو بوون، لە ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی (ئوورمییە) نیشتەجێ ببوون و هەتا (تەبریز) و مەملەکەتی (ئورارتو - Urartu) بڵاوبوونەوە، لە دوایش (بارثییەکان) ئەوانیش لە باشووری دەریای (قەزوین) دا نیشتەجێ بوون.

(هرتسفیلد) لەم بارەیەوە دەڵێ: هۆزە ئێرانییەکان لە سەردەمی (سلمانسەری سێیەم) دا، لە شوێنێکی دیاریکراودا جێگیر و نیشتەجێ نەبوون، بەڵام هەموویان لە لای دەریای (قەزوین) و (راجا - Raga) وە هاتبوون، ساسانییەکانیش لە نێوان هەموو هۆزەکانی ئێرانی زیاتر کۆچبەری بوون و لە بەرزاییەکانی (هەمەدان)ەوە هاتنە خوارەوە و بەرەو ناوچە نزمەکان چوون، کە دەکەونە دەوروبەری (کرماشان) و هەر لەوێش هێرشیان دەکردە سەر (ئاشوور) و (بابل).

لە کاتی کۆچکردنی هەردوو هۆزەکە، هەمان ڕێگای شاخاوی سەرەکییان گرت، لە (راجا) وە تا (ڕۆژئاوا).

### (زکرتو) یان (ساغاریتان)

بەشی سێیەمی هۆزە ئێرانییەکان کە پێیان دەگوترێ (زکرتو، یان زاکرتا - Asagirta) لە کاتی کۆچکردنیان، ڕێگا شاخاوییەکەی (راجا - قەزوین) یان گرت و بەرەو (تەورێز) ڕۆیشتن و ئەو شارەیان بە جێ هێشت، بەڵام (لاوراتییەکان) چیتر نەیانهێشت کۆچەکانیان بەرەو پێشتر بچێت.

هەروەها لەبارەی ئەو مەسەلەیەش، دکتۆر (جورج روو)

دەڵێ: لە نزیکەی هەزارەی یەکەمی پێش زایین، کۆچی نەتەوەیی دەستی پێ کرد، لە شوێنێکی دەوروبەری دەریای (قەزوین) دا، هەندێ لەو نەتەوانەی، کە بە زمانی (هیندۆ - ئەوروپی) قسەیان دەکرد و بە (ئێرانی) ناوزەد دەکران، کە لە باکووری ئێرانەوە بەرەو ژوورەوە ڕێگایان گرتە بەر، پێشتر کۆچبەرانی (هیندو ئارییەکان) بەو ڕێگایە ڕۆیشتبوون.

- بارسییەکان - (بارسافا - فرثییەکان) هەر لە سەر سنووری (تورکستان) و (ئەفغانستان) مانەوە و نیشتەجێ بوون، بەڵام لە لایەکی دیکە (میدییەکان - مادای) و فارسەکان (بارسو) و زکیریتون (زکیرتو)، هاتنە پێشەوە، بەرەو ڕۆژئاوا و ئەو بەرزاییانەی، کە دەکەوێتە نێوان دەریاچەی (ئورومییە / ورمێ) و ناوچەی (ئەسفەهان) یان داگیر کرد و دەسەڵاتی خۆیان لە سەر دانیشتوانی ئەسڵیدا، کە ژمارەیان زۆر کەم بووە فەرز کرد لە ساڵی (٩٠٠ پ. ز).

دەوری (میدییەکان) و (فارسەکان) لەوبەری چیای زاگرۆسدا، چەسپاو و کاریگەرتر بوو، هەرچەندە ئەوان بۆ ئەم ڕۆڵە مێژووییە ئامادە نەکرابوون.

## مەملەکەتی (مانییەکان) یان (دانیشتوانی ئەسڵی)

مەملەکەتی (مانییەکان) کە یەکێک بووە لە دەوڵەتانی ئێرانی کۆن، دەسەڵاتی خۆیان فراوان کرد تا گەیشتە ئەو ناوچانەی کە دەکەونە دەوروبەری دەریاچەی (ئورومییە) کە وڵاتیان لە باشووری دەریاچەی (ئورومییە) بوو، لە نێوان وڵاتی (ئاشوور) و ناوچەکانی (میدیای) مەزن، کە ناویان لە (تەورات)، بە ناوی (مەنی) هاتووە، کە سەر بە ئاشوورییەکان بوون.

(ئاشوورییەکان) تووشی بەرگرییەکی توند بوون لە لایەن دانیشتوانی ئەسڵی ئەو ناوچەیە، کە بە (مانییەکان) ناسراون، ئەو بەرگرییەش، تەنها لە لایەن دانیشتوانە ئەسڵییەکانەوە نەبوو، بەڵکو لە لایان ئەوانەی کە دیانویست ئیستیغلالی بەروبوومی ئەو ناوچەیە بکەن، کە زۆر بە پیت بوو، لە بەر ئەوەی لە دەریاچەی (ئورومییە) نزیک بوو، ئەو میللەتانە نەیان دەویست (ئاشوورییەکان) بەشدارییان بکەن لە بەروبووم و سامانی ناوچەکەیان، یان بە بێ هیچ حەقێک ئیستیغلالی ئەو ناوچانە بکەن، بەتایبەتی: (مەملەکەتی - ئورارتو - یان خلدیا بوو، کە بە وڵاتی (ئەرمینیا) دەناسرا، دانیشتوانی ئەو وڵاتە بەمیللەتێکی ئازاو سەرسەخت دادەنران لە لایەن شەڕکەرانی و سوپای ئاشووری، بۆیە ئاشوورییەکان حیسابێکی تایبەتیان بۆیان دەکرد، ڕکابەری دووەم: کە نەتەوەییێکی نوێیە، پێیان دەگوترا (زکرتو) لە سەردەمی (سەرجۆن)دا، مەلیکەکانی ئاشووری کۆن، هەڵمەتێکی فراوانیان کردە سەر ئەو وڵاتەی کە دەکەوێتە ئەو دیوی چیای زاگروسەوە، ئەو هەواڵانەی کە لە میانەی ئەو هەڵمەتانەدا دەهات و بڵاودەبوونەوە، پڕ بوون لە قین و کینە و بێ ڕەحمی دژ بەو وڵاتانەی کە تووشی هەڵمەتەکە هاتبوون، هەروەها پڕ بوون لە حاڵەتی تاڵان و دزینی مەڕو ماڵاتی خەڵکی ئەو وڵاتانە و بە کارهێنانی توند و تیژی و جەنگ و قوربانییەکی زۆر لە خەڵکی بێ تاوان.

کاتێک (سەرجۆنی دووەمی - ئاشووری) لە ساڵی (٧٢٢ پ. ز) دەسەڵاتی وەرگرت، لەو سەردەمەدا، چەند حاکمێکی ناوچەی چیای زاگرۆس، هاوسەردەمی (سەرجۆن) بوون، لەوانە (ئورسا) خاوەن وڵاتی (ئورارتو) و (متاتی) و خاوەن وڵاتی (زکرتو) لە دوایی خاوەن وڵاتی (مەنائییەکان)، کە نازناوی (ئاباترو) بووە، کە مانایەکەی (مەلیکە)، لە ڕاستیدا یەکێک لە هاووڵاتییانی ئاشوور بوو.

## هاوپەیمانی لە نێوان (ئورسا) و (متاتی) یەکان

(ئورسا)یەکان و (متاتی)یەکان، هاوپەیمانییەکیان بەست دژی وڵاتی (مەنائییەکان) کە سەر بە پادشای ئاشوورییەکان، هێرشیان کرد و دەستیان بە سەر زەوییەکی فراوان لە زەوی وزارو مومتەلەکاتدا گرت و شتێکی زۆریان لەگەڵ خۆیان بردەوە. (ئایانزو) هاواری بۆ مەلیک (سەرجۆن) برد و داوای ڕزگارکردنی لێ کرد.

(هاری ساکز) دەڵێ: گرفتی سەرەکی مەلیک (سەرجۆن)، ئەویش فەرزکردنی پاڵەپەستۆی لە لای باکووری (ئورارتو)، کە یەکێک بوو

لە هێزە گەورەکان لە ڕۆژهەڵاتی کۆن، خۆشی کەوتبووە ژێر پاڵە پەستۆی هۆزە ئێرانییە کۆچبەرەکان کە بەرەو باشوور و ڕۆژئاوا دەجوولانەوە، لە دەشتاییەکانی ڕووسیا کە کۆمەڵێک بوون لە کۆچەران و لە سەردەمی (سەرجۆن) جێگیربوون، مەملەکەتەکی گرنگیان پێکهێنا، بە ناوی (زیکرتو - Zikirta) لە ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی (ئورومییە)، میدییەکان هەتا ئەو کاتەش ڕێکوپێک بوون، لە سەر بنەمای سیستەمی عەشایەری، لە ژێر دەسەڵاتی ژمارەیەک لە شێخی نیمچە سەربەخۆ، بەشی سەرەکی هۆزە ئێرانییەکانیان پێک دەهێنا.

لە ساڵی (٧١٨ پ. ز) مەلیک (سەرجۆن) وەڵامی هاواری (ئایانزو)ی دایەوە و بۆئەنجامدانی هەڵمەتێکی گەورە بەڕێ کەوت، ئەویش بۆ (تۆبە) پێکردنی شۆڕشگێڕان و هێرشبەران و داگیرکەرانی نوێ و هێنانەوەی ئەو ناوچانەی، کە داگیر کرابوون لە لایەن (ئورسا) یەکان و (متاتی) یەکان و گێڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆی، توانی شکستێکی گەورەیان پێ بگەیێنێ، کاتێک (ئایانزو) مرد و کۆچی دوایی کرد، مەلیک (سەرجۆن) یەکێکی تری لە جێگای دەستنیشان کرد، لەشکری ئاشوورییەکان بەردەوام بوو لە هێرشەکەی و شارەکانی (ئوراتی) داگیر کرد هەتا لە پایتەختەکەی (تشبا - شاری (وان) ی ئێستا نزیک بووە، (ئورسا) بەرەو ناوچە شاخاوییەکان رایکرد و لە دوایش خۆی کوشت، بەڵام (سەرجۆن) نەچووە ناو شاری (وان).

(ساکز) ئیشارەتی بەوە داوە و دەڵێ: لە هاوینی ساڵی (٧١٤ پ. ز) مەلیک سەرجۆن، خۆپیشاندانێکی سەردکی دژی "ئورارتو"سازدا، نەخشەی هەڵمەتەکە و ڕووداوەکانی بە شێوەیەکی ورد لە لامان ناسراوە و دەیزانین، ئەویش لە ڕێگای (ڕاپۆرتێکی ناسراو) لەبارەی ئەو بابەتە، لە سەر شێوەی نامەیەک بۆ (خوداوەند ئاشوور)، مەلیک سەرجۆن، سوپاکەی بەرەو ناوچەی (زاموا - Zamwa) برد و بەرەو باکوور ڕۆیی، دژی (زکرتو - Zikirta) و (ئورارتو)، لە دوایش سوپاکەی بەرەو ڕۆژهەڵات برد، بۆ لای سنوورەکانی (زکرتو) ڕۆیی و شارە سەرەکییەکانی (کاول کرد)، بە بێ هیچ بەرگری و شەڕکردن، (متاتی) حاکمی (زکرتو) هەڵات و پەیوەندی بە سوپای (ئورارتی) کرد، بۆ بەرگریکردن لە ڕێگاکان، ئەوەی زانراوە لەبارەی هەڵمەتی مەلیک سەرجۆن ساڵی (٧١٤ پ. ز)، مەملەکەتی (ئورارتو)ی بە شێوەیەکی تەواو کۆتایی کاول نەکرا.

### دامەزراندنی یەکەم مەملەکەتی میدییەکان

(خەشاتریتا - Khashatrita) کوڕی (دیوکو ئالمیدی)، کە (هیرودوت) بە (فراو ئورتیس) ناوی دەهێنا، سەرکەوتوو بوو لە ئەرکی پێکهێنان و یەکگرتنی هۆزە ئێرانییەکان، ئەویش لە سەردەمی (سەنحاریب) ساڵی (٧٠٥ - ٦٨١ ز) کە کوڕی مەلیک سەرجۆنە، کە بە جەنگ و شەڕی (بابل و عیلام / ئیلام و مەملەکەتی یەهودا و میسر) خەریک بوو، ئێرانییەکان (میدییەکان، فارسەکان، زکرتییەکان) ئەو دەرفەتەیان قۆزتەوە و لە دەوروپشتی ماڵی (دیوکو) کۆبوونەوە، (خەشاتریتا) یان کردە سەرۆکی خۆیان و توانی هۆزە ئێرانییەکان لە ژێر یەک سەرکردایەتی یەکگرتوو کۆبکاتەوە، لە بەر ئەوەش: (ئەسەرحەدون (٦٨١ - ٦٨٨ پ. ز) کە جێگری (سەنحاریب) بوو، ناچار بووە وەفدێک بۆ ئەو بنێرێ، ئەویش بۆ ڕازیکردنی، لە میانەی خوێندنەوەی دەقەکانی ئەو پەیماننامەی لە نێوان (ئەسەرحەدون) و (میدییەکان) گرێدراوە، لاوازی دەوڵەتی ئاشووری بە دیار دەکەوێ، ئەو پەیماننامەیە لە سەر نووسراوێکی (قوڕی): (قەبارەکەی ١٢ گرێ × ١٨ گرێ) تۆمار کرابوو، لە (نەمرود) دۆزرایەوە، ئەویش لە کاتی پشکنین و گەڕانی شاندی زانستی بەریتانی لە ساڵی ١٩٥٥ بە سەرۆکایەتی پرۆفیسور (ملوان) و لە گۆڤاری عیراق - Iraq بڵاو کرایەوە و لە لایەن پرۆفیسور (ملوان)، ئەویش لە (لەندەن) دەردەکرا.

لە ڕاستیدا، (خەشاتریتا) هەر بە کۆ کردنەوەی (میدییەکان) ڕانەوەستا، بەڵکو هەموو ئێرانییەکانی کۆ کردەوە، لە (میدییەکان و فارسەکان و زکرتییەکان و منائییەکان و کەمرییەکان) کە لەگەڵ (ئەسکیشییەکان) دابەزین لە سەر

شێوەی شەپۆلی مرۆیی، لە بەرزاییەکانی (قەفقاس) بۆ دەشتاییەکانی ئێرانی، لەو کاتەدا دەستیان بە دژایەتی و بەرەنگاربوونەوەی (ئاشوورییەکان) و (ئورارتییەکانیان) کرد.

کۆبوونەوەی (ئەسکیشییەکان) لە (ئازەربێجان) و لە دەوروپشتی دەریاچەی (ئوورومیە)، بە بێ دامەزراندنی دەوڵەتی میدییەکان نەدەکرا، (خەشاتریتا)یەکان توانییان دەوڵەتێک دروست بکەن، کە هەر لە (هەمەدان)ەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی (نەهاوەند) و باشووری ئێران فراوان ببووەوە، توانی پەیمانێک لە گەڵ (کەمەرییەکان) و (مەنائییەکان) ببەستێ، هەروەها (بەڵێنێک) وەرگرێ لە (ئەسکیشکییەکان) کە هێرش نەکەن و بەرەنگاریان نەبنەوە، هەروەها دەستی بە سەر هەموو وڵاتی (فارس)دا گرت.

## خیانەتی ئەسکیشییەکان

ناوی (کەمەرییەکان) و (ئەسکیشییەکان) لە دەقەکانی ئاشوورییەکان هاتووە، هەروەها، ناویان لە (تەورات) هاتووە، (هیرودۆت) یش باسیان دەکا، کاروکاسبیان (دزی و تالآنکردن) بووە، سەرچاوەی ترسێکی گەورە بووە لە سەر هێزی عەسکەری ئاشوورییەکان، هەروەها سەرچاوەی ترس بوون لە (ئورارتییەکان) و (میدییەکانیش)، هێرشیان دەکردە سەر (ئاسیای بچووک) و (سوریا) و (فەلەستین)، لە (نیمچە کەنداوی قرم) هاتبوون، لە ڕێگای وڵاتی (قەفقاس)، هەر دوو گەل، لە یەک ڕەگەزن و زمانی قسەکردنیان لە یەک نزیکن و بە یەک دەچن، هەروەها، شێوازی ژیانیان لە یەک دەچن، ئەویش هێرشکردن و دزی و تالآنە.

(کەمەرییەکان) لە سەردەمی (سەرجۆنی ئاشووری) هێرشیان کردە سەر (ئورارتو) و بە تەواوی کاولیان کرد، گەیشتە ئەو ئاستەی کە (ئورسا) مەلیکی (ئورارتو)، خۆی کوشت و ئینتیحاری کرد، لە دوایش بوونە دوو بەش: بەشێک چووە لای (میدییەکان) و بوونە هاوپەیمانیان لە زەمەنی (خەشاتریتا) یەکان، بەشی تریان لە دەوروپشتی دەریاچەی (ئوورومیە) نیشتەجێ بوون، لە دوایش بلآوبوونەوە هەتا کەنارەکانی (دەریای ڕەش)، توانییان مەملەکەتی (فریجیا) لە ناو ببەن و شکستی پێ بێنن، ئەو مەملەکەتە لە ڕۆژئاوای (ئاسیای بچووک) بوو، وەزعیان گەیشتە ئەو ڕادەی کە پاشاکەیان خۆی بکوژێ، هەروەها مەملەکەتی (لیدیا)یان کاول کرد، کە دەکەوتە هەمان جێگا لە ڕۆژئاوای (ئاسیای بچووک) و پاشاکەیان کوشت، کە ناوی (کایکس) بوو، هەر بەو شێوە مانەوە، هێرشکردن و کوشتن و بڕین لەو ناوچانە، هەتا ئەو ڕۆژەی (ئاشوور بانیپال - ٦٨٨ - ٦٢٧ پ. ز) توانی لە ناویان ببات و شکستیان پێ بێنێ، (ئاشوور بانیپال) توانی هێزەکەیان لە ڕێگای (کلیکیا) گەمارۆ بدات و لە ناویان ببات.

(ئەسکیشییەکان) کە هاوکاربوون لەگەڵ (کەمەرییەکان) لە کاری دزی و تالآنکردن، بەڵام ئەوان بە تواناتر بوون بە بەراورد لە گەڵ (کەمەرییەکان)، کە لە دەوروپشتی دەریاچەی (ئوورومییە) نیشتەجێ ببوون، لەو جێگایەیان لا بردن و چوونە باشووری ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی (ئوورومییە) لە وڵاتی (مەنائییەکان) کە تازە لە دەسەڵاتی ئاشوورییەکان هاتبوونە دەرەوە، لە زەمەنی پاشا (بارتگوا - Partitua)، (ئەسکیشییەکان) توانییان دەوڵەتێک بۆ خۆیان دابمەزرێنن، ئەو دەوڵەتە ناوچەی تری گرتووە، لەوانە (وڵاتی ئازەربێجان)، لە دوایش ناچار بوون سیاسەتێکی نەرم و لەسەرخۆ لەگەڵ (ئاشوورییەکان) بە کار بێنن، کاتێک (خەشاتریتا)یەکان توانییان (میدییەکان) یەک بخەن، لە بەر ئەوەی (میدییەکان) توانییان پەیمانێکیان پێکهێنا لەگەڵ (کەمەرییەکان) و (مەنائییەکان) و بەڵێنێکیش لە (ئەسکیشییەکان) وەرگرن، کە بە هیچ شێوەیەک هێرش نەکەن، لە دوایش بڕیاری دا هێرش بکاتە سەر (نەینەوا)، بەڵام ئەوە بووە هۆی (کاولکاری و تێکدان) بۆ ئەوان، (ئەسکیشییەکان) بەڵێنی خۆیان شکاند و هەڵوەشاندەوە، لە دوایش هێرشیان کردە سەر پشتەوەی هێزەکەیان، بە سەرکردایەتی پاشا (بارتگوا کوڕی مادیس) هاوپەیمانی (ئاشوورییەکان)، (خەشاتریتا) خۆی کوشت و لە سالی (٦٥٣ پ. ز)، ئەسکیشییەکان) توانییان دەست بە سەر وڵاتی (میدیا)دا بگرن و هەتا سالی (٦٢٥ پ. ز) حوکمیان کرد.

**هەستانەوەی میدییەکان**

(هیرۆدۆت) دەڵێ: ئەو ساڵانەی کە (کی ئەخسار ئیبن خەشاتریتا) لە ژێر حوکمی (ئەسکیشییەکان) بەسەری برد و دانی بە حوکمیان هێنا، ئەو مەسەلەیە لە بەرژەوەندی (میدییەکان) بوو، کە یارمەتی دان لە پێکهێنانی هێزی عەسکەرییان، (کی ئەخسار) سوپایەکەی رێکخست و چەکداری کرد بە هێزەکەیان لە (پیادە) و (چەکدار) شێوازی جەنگیان خستە ناو سوپایەکە، کە لە (ئەسکیشییەکان) فێر ببوون، بە تایبەتی (سوارچاکی)، هەروەها توانی هەندێ لەو ناوچانەی دەوروپشتی دەریاچەی ئوورمییە بخاتە سەر وڵاتی خۆی، بەڵام دەرئەنجامەکەی ئەوە بوو، کە (کی ئەخسار) شەڕێکی یەکلاکەرەوەی دژی (ئەسکیشییەکان) ئەنجامدا، توانی شکست بە پاشاکەیان (مادیس) بێنێ و ناچاری کرد دەست لە وڵاتی (مانی) و حوکمی هەڵبگرێ، هەروەها ئەو وڵاتەی دەوروپشتی دەریاچەی ئوورمییە، بەوەش وڵاتی (مانی) و وڵاتی (فارس) چووە ژێر حوکمی (کی ئەخسار) و بووە (ئەکباتانا - هەمەدانی ئێستا - پایتەختی (وڵاتێکی یەکگرتووی نوێ)، لە دوایش بەرەو جەنگ و شەڕکردن لەگەڵ (دەوڵەتی ئاشووری)، دەوڵەتی میدیای یەکگرتوو، هەموو هۆزەکانی ئێرانی گرتەوە لە بەرزایەکانی ئێرانی، هەروەها لە وڵاتی فارس (لە باشووری) و دەوڵەتی میدی بووە دەوڵەتێکی بە هێز.

**(سەردەمی - ئەخمینییەکان)**

دەوڵەتی میدییەکان، کە (کی ئەخسار)، لە ساڵی (٦٢٥ پ. ز) دایمەزراندبوو هەتا ساڵی (٥٣٠ پ. ز) بەردەوام بوو، لە دوایش پادشای فارسی (کۆرشی دووەم کوڕی کەمبیزی یەکەم ٥٥٩ - ٥٣٠ پ.ز) توانی کۆتایی بە حوکمی میدییەکان بێنێ، بە سەرکەوتنیان بە سەر پاشای میدییەکان، هەتا رێی خالص (قزل ایرمق) هەروەها لە باکووری سوریا، لە دوایش گواستنەوەی دەسەڵات بۆ فارسەکان، ئەوە مانای ئەوە بوو، کە میدییەکان دەسەڵاتیان لە دەست دا و روودانی ژمارەیەک لە ڕاپەڕینەکان لە میدیا، لە سەردەمی پاشاکانی فارس، هەروەکو لە سەردەمی (دارا) رووی دا، ئەلێرە دەبوایە ئەوە روو بدات، کە کۆمەڵێکی نوێ لە میدییەکان، کۆچیان کردبێ بەرەو رۆژئاوا، ئەوەش بە هۆی شکستهێنانی ڕاپەڕینەکەیان.

هۆزەکانی ئەساغاریتا (زاکروتی) کە لە ناوچەی ئەربیل نیشتەجێ ببوون، ئەوانە لە رۆژهەڵاتی دەریاچەی (ئوورمییە) کۆچیان کردبوو بۆ ئەربیل، بە تایبەتی لەو ناوچەی کە دەکەوێتە نێوان (تەوریز) و (زنجان)، ئەو هۆزانە لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکە تێکەڵ ببوون، بە تایبەتی دانیشتوانی بەرزاییەکانی باکووری وڵاتی (میزۆپۆتامیا)، کە ببووە بەشێکی دەوڵەتی (میدیا) دوای دامەزراندنی لە کۆتایەکانی سەدەی (٧)ی پ. ز، لە بەر ئەوەی یەک زمانن و بە یەک زمان قسە دەکەن لە لایەنی زمانەوانی.

لە کتێبی (المنازل الفرئیە) کە خاوەنی (لاسیدروسی کەرخی)یە هاتووە و دەڵێ: سجیستان (بەمانای - سیستان) وڵاتی یەکەمی (زکرتییەکانە) - وڵاتی سجس - ئەو شارانەی تێدایە: شاری (بردە) و شاری (مەن - من) و شاری (سجال) و (فلقتی)، ئەو شارەی دواییش، بارەگای پاشاکانی (قرم)ی تێدایە، کە بە ناوی (سجس) ناسراوە، (سجس)یش یەکێکە لەو هۆزانەی، کە ناچار بوون وڵاتی خۆیان بە جێ بێڵن، کە لە ناوەندی ئاسیا بووە، ئەوانە لە دەوروپشتی دەریاچەی (زرە) نیشتەجێ بوون، زەوییەکانی کشتوکاڵی (سجستان) لە زێی (زرە) ئاویان بۆ دەهات، کە ئێستا بە دەریاچەی (هلمند) ناسراوە، وشەی (فلقتی)، وشەیەکی فارسییە، و مانای (شاخاویە) کە پایتەختی پاشای (سجسە)، بەڵام شاری (بردە) کە پێشتر ئیشارەتی پێدراوە، پایتەختی (زکرتییەکان) بووە، لە وانەشە لە لای عەرەبەکان بە ناوی (بردعە) ناسراوبێت.

(زکرتییەکان) ناویان لە زنجیرە چیاکانی (زاگرۆس) بە زیندوویەتی مایەوە، کە چیایەکانی (ئارارات) فراوان دەبێ هەتا ناوچەکانی (کەنداوی فارسی)، پەیوەندییەکەشی روونە لە نێوان وشەی (زکرتو) یان (زکروتی) و (زاگروس).

**و. نەجات خۆشناو**

# ناوبردنی شاری هەولێر لەچەند نامەیەكی هەڵبژاردەی سەردەمی ئاشووریی نوێدا

ئیبتهال عادل تائی
كۆلیجی پەروەردە - زانكۆی موسڵ

دەقەكانی نووسینی مێخی بەگرنگترین دۆزراوەكانی ئاسەواری عێراقی كۆن دادەنرێت، ئەم دەقانە دەبێتە بەردی بناغەو سەرچاوەی زانیاریمان دەربارەی مێژووی عێراقی كۆن. هەزارەی یەكەمی پێش زایینی بەتایبەتی چەرخی ئاشووری نوێ(٩١١- ٦١٤ پ.ز) بەدەوڵەمەندترین سەردەمی مێژوویی و شارستانی دادەنرێت لەڕووی بەڵگەنامەی مێژوویی، ئەگەر سەرنج بدەین نووسینەكانی مێخی و نووسینی پادشاكان كە هەندێ لەنووسەری شارەزاو تایبەتمەند و پسپۆری كۆشك سەرپەرشتییان دەكردو زۆر بەوردەكاری دەنووسران لەگەڵ ئەوەش پیشانی خودی پادشا دەدرا بۆ پێداچوونەوە بەر لەناردن یان هەڵگرتنییان[١]. دەقی مێخی زۆرو جۆراو جۆرن لەناوەڕۆك و بابەتەكانی ژمارەیەكی زۆر لەم دەقانە، كە بە چەندین هەزار دەخەملێنرێت گرنگییان لەوەدایە شێوازێكی مێژووییان هەیە، كە باسی هەواڵ و شەڕو جەنگ لەگەڵ دوژمن دەكەن. هەروەها مێژووی نەهامەتی و ئیش و كارە داهێنەرەكانیان بەپێی شوێن و دەسەڵاتی ئاشوورییەكان باسیان لێ دەكرێ[٢]. ماوەی فەرمانڕەوایی پادشاكان سەرچاوەی زانیاریمانە لەمێژووی ئاشووری لە هەزارەی یەكەم پ.ز. تەنها بەئاماژەپێكردنی پچڕ پچڕو كەم لەشێوەی كارگێڕی لەناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی ئاشووری و ڕووداوەكانی ئابووری و كۆمەڵایەتین. بەڵام دەتوانین زانیاری زۆرمان لەهێماكانی نێو نێردراوی پادشاكان بۆ فەرمانڕەوای ناوچەكان دەستكەوێ[٣]. نكۆڵی ناكرێت لەو گرنگییە زۆرەی زانیارییە مێژووییە كە لەنامەكاندا هاتووە، كە تێیدا ڕەوشی سیاسی گشتی و شێوەی دەزگای دەوڵەتی لەوڵاتی ئاشووری ئەو كاتدا كەچۆن بەرپرسان لەگوێڕایەڵی پادشای ئاشوورین[٤]. ئەم نامانە شایستەی ئەوەن بەتۆماری شاهانە ناویان لێ بنرێت، كە لەپایتەختی نەینەوا (تل قوینجق)دا هێنراوە. زیاترن لەدوو هەزار نامەش دۆزراوەتەوە لەئەنجامی گەڕان و هەڵكۆڵین لەپایتەختی (نینوی) كۆن، كلخ (نمرود) و لەكوزانا (تل حلف) لەسەر زێی خاپوور و زیاتر لەدووسەد لەم نامانە لەكلخ دۆزراوەتەوە و زۆربەشییان بۆ ماوەی دەسەڵاتی سەرجۆنییەكان (٧٢٢-٦١٢ پ.ز) دەگەڕێتەوە، زۆر لەم نامانە ئاراستەی پادشا كراوە، نەك پاشا ئاراستەی كردبن، كەچی نامەشی تێدایە ناردراوە بۆ پادشا سەرجۆنی ئاشووری.

(٧٢١-٧٠٥ پ.ز) و پادشا ئەسەرحەدون (٦٨٠-٦٦٩ پ.ز)

نێردراوە. هیچ نامەیەکی تێدانییە بۆ پادشا سەنحاریب (٧٠٥-٦٨٠) پ.ز بگەڕێتەوە، زۆربەی ئەم نامانە لەلایەن پادشا ئاشوور بانیپال (٦٦٩-٦٢٨ پ.ز) نووسراوە یان بۆی ڕەوانە کراوە[٥]. ئەم نامانەش دوو جۆرن جۆری یەکەم بریتین لەنامەی پسپۆرانی پادشا لە بارەی جادووگەری و فالچیەتی، جۆری دووەم پێکهاتووە لەو بەشە زۆرەی نامەکانی دەوڵەت، کە تێیدا ئاراستەی پادشا کراون لەلایەن فەرمانبەرانی کارگێڕی و فەرمانڕەوایانی ناوچەکان و فەرماندەکانی بەرگری[٦]. بەڵام ئەو نامانەی کە لەلایەن پادشای ئاشوورییەکان نووسراون لەوانە پادشا شلنەسری چوارەم (٧٨٢- ٧٧٢ پ.ز) و سەرجۆنی ئاشووری و ئەسەرحەدون و ئاشوور بانیپال، ناردراون بۆ خواوەندکانی ئاشوور و هەموو خواوەندکانی شار، هەروەها بۆ هەموو دانیشتوانی شاریشیان ناردووە[٧]. بەپشت بەستن بەبیروڕای عێراقییە کۆنەکان، کە دەڵێن خواوەندکانی ئاشوور هەموو شتێک دەربارەی ڕووداوەکان و کاروبارەکان دەزانن نابێت بەهیچ شێوەیەک درۆیان لەگەڵ بکرێت، بۆیە پادشاکان هەموو ڕووداوەکان بەراستی دەنووسن[٨].

نامەکانی بۆ پیاوانی ئایینیش کە تایبەتن بەخوداکان و هەروەها بۆ هاوولاتیانیش خوێندراوەتەوە[٩] ئەم نامانەی کە لەبەر دەستن هەڵگیراون نێردراون بۆ پادشاکانی تر[١٠]. نامەکانیش زیاتر باس لەفەرمانەکان و هەندێ فەرمانی کارگێڕی ناو شار کردووە بەڵام ئەوەی بەربەست بوو لەلێکۆڵینەوەی نامەکان شێوەی زمانەکە بوو[١١]. کە لەلایەن فەرمانبەرەکان نووسراون یان نێردراون بۆ پادشا. لەپایەکاندا جۆرە جیاوازییەک بەدی دەکرێ لەشێوازی نارەزایی دەربارەی هەندێ کاروباری دیاریکراوەو لێبووردنی لەهەندێ بڕیاری جێبەجێکردن و ڕاپۆرتی هەواڵگری سەربازی و دیلی جەنگ و ناکۆکی نێوان فەرمانبەران...هتد[١٢].

شێوەی دارشتنی پێشەکی نامەکانی سەردەمی ئاشووری نوێ، کە پێی دەناسرا بەم جۆرەیە "بۆ پادشا، خزمەتکارت.... دەڵێ" پاشان دەستیان دەکرد بەپاڕانەوە لەخوداکان بۆ پاراستنی ژیانی پادشا لەدوایی دەهاتنە سەر ئەوەی مەبەستیەتی. بەڵام ئەو نامانەی کە بۆ دەسەلاتدارانی هەرێمەکان بەشێوەی فەرمان نێردراون وەک: "پادشا فەرمان دەکا، بۆ فلانە خزمەتکارم..."[١٣]. زۆربەی لەنامەکان ناوی نێردراوەکەی یاخود نووسەری نامەکەی تێدا نەنووسراوە، بەڵام هەندێک لەنامەکان ناوی نێردراوەکەی تێدانییە و هەندێکیشیان ناوی فەرمانڕەوای هەرێمەکانی تێدایە. بەمەش توێژەران توانییان دەستنیشانی ماوەو کاتی نامەکان بکەن[١٤]. ئەوانەی کاری پۆستەیان دەکرد کارمەند بوون لەپۆستەخانەی ئاشووری و هەندێکیشیان لەڕیزی سوپادا بوون، بەتایبەتی ئەوانەی لەهەواڵگری سەربازی کاریان دەکرد، کە یارمەتیدەر بوون بۆ ئاسایش و هێمنی شارەکان و بەربەرچدانەوەی هەموو پلانێک، کە لەدژی ئاشوورییەکان دەکرا[١٥]. هەروەها وێستگەی حەوانەوەی تایبەت هەبوو بۆ ئەو کەسانەی، کە کاری پۆستەیان دەکرد و بۆ گۆڕینی ولاغەکانیان بەتایبەتیش بۆ شوێنە دوورەکان بەمەبەستی گەیاندنی هەواڵ و دەنگوباسی پادشا بە پەلە. کەوا سیستەمی پۆستەی ئاشووری لێهاتوویەکی بەرزیان هەبوو، کە دەبووە هۆی ئاسانکاری کاروباری هەرێم ناوچە دوورو نزیکەکان[١٦].

بەو نامانە دەست پێ دەکەین، کە لەبواری ئابووری گرنگییان هەبوو، بۆ ئەمەش سێ جۆر نامە هەیە، کە زۆربەیان پەیوەندییان بەکاری درەوێنەکردن هەیە کە گرنگییەکی زۆری هەبوو لەدارایی ئاشوورییەکان، بۆیە کشتوکاڵیان دەکرد. لەبەرئەوەی باران سنووردار بوو، تەنانەت هەندێ جار دەبووە هۆی لافاو، بەڵام پێشبینی چاکی لێ دەکرا بەمەش هەواڵەکەیان بەخێرایی بەپادشا دەگەیاند تاوەکو کارەکانی ڕێک بخات[١٧]. لەم نامەیەدا هاتووە:

"....لەشەوی (٢٧) تاوەکو بەیانی و لەڕۆژی (٢٧) بەتەواوی، لەشەوی (٢٨)یش، بەتەواوی

بارانێکی زۆر باری و لافاوەکەی بەهێز بوو، پێشبینیی داهاتی چاکیش دەکرێ.

دامقۆ **Damqu** گەڕایەوە... بەرپرسیتی گرتە دەست. ئەو کاتەی خۆم لەهەولێر **arba il (al)** بووم لەخزمەت پادشای بەڕێز، بەرپرسیتی گرتە دەست دووبارە ئەو بەرپرسیتییەی گرتەوە ئەستۆی خۆی.

ئاشوور- ناسر **Nasir - Assur** و **Massarat -ilane** و **Am...-I**، دەسەڵاتدارن کە هەرسێکیان لەلایەن پادشاوە نێردراون بەم زووانە دەگەنە **Bel- apla-addin**.... دێرەکانی دیکە تەواو نین)[18].

بەڵام نامەی دووەم تایبەتە بەکۆکردنەوەی داهاتووی جۆ، کە بەشێکی تایبەت دەکرا بۆ ناو کۆشک و هەولێر یەکێک بوو لەو شارانەی کە جۆی تێدا کۆدەکرایەوە، لەنامەکە هاتووە"بۆ پادشا، گەورەم، خزمەتکارت تی- رابی- ئیسر **Issar-riba-Ta** تەندروستی باش بۆ پادشای گەورەم. لەتەنیشت رێگای پادشا دانیشتبووم بەرامبەر باخچە، بەڵام پادشا بێ ئاگابوو لەمن، قسەی لەگەڵ **Rasappai** دەکرد. دەچم بۆ شاری ئادیینی و قسە لەگەڵ فەرمانبەر ئاب موگی **rab-Mugi** دەکەم، بەڵام کەس نەهات بۆ چاوپێکەوتنی من، بۆیە خەم دایگرتم. ئێستا دەچم بۆ کۆکردنەوەی ٥٠٠ هومرس (١٠٠٠٠٠ کە یەک لیتری دەکاتە کێشی یەک کیلۆگرام ئاو) لەجۆ لەشاری کالیزا دەهێنێرمەوە.

ئەگەر پادشا فەرمان دەربکا بۆ کۆکردنەوەی جۆ بۆ سێ کۆشک، ئەوا دەچم بۆ شاری ئادیینی و هەولێر[19].

وەنامەی سێیەم، کە تایبەتە بەدابەشکردنی جۆ لەلایەن پادشاوە لەنامەکەدا هاتووە :"....سەرەتاکەی لەناو چووە، لە (١٢) و (١٣) مانگ جۆ دەنێرم بۆ فەرمان ڕەوا (......) لەشاری ئەتتی، و لە (١٤) و (١٥) و (١٦) بۆ فەرمان ڕەوای هەولێر بۆ (......)- ئەداد و لە (١٧) و (١٨) جۆ دەنێرم بۆ کۆشکی هیرلد لەشاری (......) ئەپی لە ( ) شوێنەکە لەتەنیشت شاری بەقرا، لە (١٩) و (٢٠) دەنێرم بۆ فەرمانڕەوای ئارزخلنی (.....) پێنج ڕیز فەوتاوە... دەنێرم بۆ (.....) فەرمانڕەوای هەولێر **uru. Arbail**[20]. وە لەڕووی سەربازییەوە گرنگی هەبوو، چونکە بنکەی دەستپێکردنی سەربازی بوو بۆ ناوچەو هەرێمە چیاییەکان بەتایبەتی لەلای ڕۆژهەڵات و خوارووی ڕۆژهەڵات، کە پێگەی کۆکردنەوەی سەربازو چەکە. لەگەڵ ئەوەشدا یەکەیەکی سەربازی هەیە، کە یەکەی فەلەستینییەکانە (مرتزقە) کە بنکەیان لەهەولێر[21] بووە. دوو نامەش هەیە ئەمە ڕوون دەکاتەوە:

لەنامەی یەکەمدا باس لەجوولانەوەی یەکەکانی سەربازی دەکات، کە ڕووباریان بڕیوەو چوونەتە سەربازگە لە هەولێر، کە تێیداهاتووە:

"بۆ پادشا، گەورەم، خزمەتکارت تاب-شار- ئاشوور، **Tab-Sar-Assur** تەندروستی باش بۆ پادشای گەورەم ئەوەی دەربارەی نامەکە بۆ کۆشک نووسیومە، لێیان گەڕێن (...) ڕووبارەکان، هەمووان کۆیکەنەوە بابپەڕنەوە..... سەربازگە.... هەولێر **arba-il (a-a)** پیاوی سێیەم ئەمڕۆ هاتە لام، ڕاپۆرتێکی لەلایە "دەریاکە هەڵدەستێ" نەمتوانی دەربپڕم (.....) بۆ لای (لایەکی تر) هەر لەبەر ئەمەش بۆ کۆشک نووسیومە، لێیان گەڕێن بابپەڕنەوە بۆ شوێنێکی باشتر لەدەرەوەی سەربازگە) لێرە.... (کاتێک) دێن (.....) نیوە لە (.....)... لێرەدا بەیارمەتی گالیسکە دەچم و، تەماشا دەکەم، کە زۆر باشە، و هەولێر **arba-ila-a** ئاماژە بەوەدەکا کە شوێنێکی فراوانی بۆ سەربازگە هەیە، بەیانی، بەپێی بڕیاری پادشا دەبێ پردەکە دروست بکرێ و سەربازگە بگوازرێتەوە لایەکەی تر، لەوانەیە پردەکە تەواو بکرێ تا ئەو کاتەی لەوێ دەبن، بۆ ئەوەی پادشا بتوانێ لەسەر پردەکە بپەڕێتەوە[22].

بەڵام نامەی دووەم ئاماژە بەبوونی بارەگای یەکەیەکی فەلەستینی لەشاری لاقیشو دەکات، کە تێیدا هاتووە:

"بۆ پادشا، گەورەم، خزمەتکارت نرگال- بلاتو- **Nergal-ballit**. تەندروستی باش بۆ پادشای گەورەم. فەلەستینییەکان لەو دەستە لەشکرانەن، کە پادشا دایناون و

بەمن بەخشی، بەڵام ڕەتیان کردەوە لەگەڵ من بن.... ئەوان..... (......) لەگوندی لوگیش Lugase[٢٣] (نزیک) هەولێر URUarba-il..... دانیشتووم ئێستا..... لەپشت.... ئەو نامەیە دەخوێنینەوە کە باس لەو پیاوە دەکات بانگ کراوە گالیسکەیەکی لێ دەخوری "بۆ پادشای گەورەم، خزمەتکارت شولمو- بیل... تەندروستی باش بۆ پادشای گەورەم، دەربارەی (NN) پیاوی سێیەم لە (NN) کوڕی (NN) کە پادشای گەورەم بۆی نووسیوم لەگەڵ خۆم بیهێنم (......) ناتەواوە. پێیان ڕاگەیاندووم، کە خاوەن گالیسکەکە لەگەڵی دەچێ، چاوی پێ دەکەوێ، چووە بۆ ئەربیل URU-araba-il[٢٤].

لەنامەیەکی دیکەدا نزیکە لەناوەڕۆکی نامەکەی دیکە، کە باس لەداواکردنی گالیسکەی دیکە دەکات: "بۆ پادشا، گەورەم، خزمەتکارت ئاشوور- ئالیکی- پینی Assur-alik-pani تەندروستی باش بۆ پادشای گەورەم ئەم وشانە پادشا سیدی بۆی نووسیوم دەربارەی پیهام Pihame جێگری فەرمانڕەوا لەبارەی (بەرگری کاری) و ڕاپۆرتەکان و هەڵسان بەئیش و کاری پادشا سیدی. ئەوەی لەتوانایدا هەبووە کردوویەتی دەربارەی ئیتیو Itu (هۆزی ئارامین)، کە پادشا دەربارەی ئەوان بۆ منی نووسیوە، کە دایاندەمەزرێنم لە (بەرگری کاری)دا لە پشکێنەری گوندەکان و شارەکان و قەڵاکان. پادشا سیدی دەربارەی قەڵاکان خۆشحاڵ دەبێ. خزمەتکاری پادشا لێرەن. ئێستا بۆی نووسیوم پیاوانی کۆشک رادەهێنم لەسەر گالیسکەکان و ئەسپ سواریدا. بۆیە لەکاتی سەردانی پادشادا ئامادە دەبم لە هەولێر URUaraba-il لەگەڵ پیاوانی و سەربازەکانیدا. لەگەڵ خۆم ئەو نووسراوانە دەهێنم، کە پادشا نووسیویەتی دەربارەی کاروبارەکان، بۆ پادشا دەیخوێنمەوە. ئایا پادشام ئەم کارانە دەکا دەربارەی خزمەتکارانی، گالیسکەکانی پێشوو کە باش نەبوون. کە گالیسکەی نوێ هەیە، بەڵام ئامادە نەکراوە. ئایا بۆ پادشا سیدی هەیە کە بنووسێ بۆ ئادد- ئابنی-ڕیشی- کە گالیسکەی نوێم بۆ بنێرن، کە ڕازابێتەوە بەئاوریشم و پێستە تەنها لەم جۆرە گالیسکەیەم پێویستە.... ئەوانی تر لەناو چوون[٢٥].

لەنامەیەکی تر کە ناونیشانەکەی دیار نییە، بەڵام بەگوێرەی ناوەڕۆکەکەی دەربارەی لێبوردنە لە باج و شوفێری یەکێک لەگالیسکەکان تێیدا هاتووە:

"بۆ پادشای گەورەم، خزمەتکارت کی- ئاسر- ئاشوور Ki-Sir-Assur تەندروستی باش بۆ پادشای گەورەم، دەربارەی ئەوەی کە پادشا بۆی نووسیوم (......) (لە....) من. لێ خۆش دەبم (......) دامەزراندبوو لەژێر (......) دووبارە (......) لێ خۆش دەبم لە (.....) کە شوفێری گالیسکەکەیە (....) ناتەواوە (.....) نەینەوا (.....) لە شاری ئەناییر، Inner (.....) ئەوان.... (لە.....) ئەربیل (.....) (.....) ئەوانی دیکە لەناوچوون[٢٦].

نامەیەک هەیە تایبەتە بەکەسێک ناوی ئارزانا، بەپادشا ڕادەگەیەنێ، ئەو ڕۆژانەی کە لەلای پادشا دەبن لەوانەش لەشاری هەولێر، بەپادشا ڕادەگەیەنێ دەربارەی ئەو دیارییانەی کە بۆ شار ڕەوانی کردبوون، پێویستە ئاگاداری بکەنەوە لەفەرمانی دیکە. پێ دەچێ ئەو کەسە نێردراوی پادشا بێت. لەنامەکەیدا هاتووە:

"بۆ پادشای گەورەم، خزمەتکارت شولمو-بیل Su Lmu-beli تەندروستی باش بۆ پادشای گەورەم، ئارزانا نیشتەجێ لەئالئامو Alamm لە (١٠) و لە (١١) لەهیبتۆنا دەبم Hiptuna و لە (١٢) لەموش musi لەڕۆژی (١٣) لە ئاسییتی Issete و لە (١٤) لە ئەربیل URU-araba-il.

(٥٦) ئەسپمان ناردووە (I×) لە (مانگا) (١٢٠٠) هەزار مەڕومالات، ١٠٠ (....) دیارییە بۆ هاووڵاتیان و پادشا فەرمان دەربکاو بۆم بنووسێ"[٢٧].

لەنامەیەکی دیکەدا هاتووە دەربارەی ئێستگەی پۆستە. پادشا نووسیویەتی، کاتێک لە هەولێر بووە دەربارەی داواکارییەکانی ئێستگەوان هەندێ گیروگرفتی تاوانباران و ئاژاوەگێران، "بۆ پادشای گەورەم، خزمەتکارت شاماس- بیلو- ئوسور- Samas-belu-asur. پادشا بۆی

نووسیوم لەکاتێ کە لەهەولێر بووم URU.arabaeil، ئایا کەسێک هەیە بۆ دەربڕینی هەستی خزمەتچیەتی کاتێک کە هات لەگەڵ پاسەوانە تایبەتەکەی ئوبرو- حەردان Ubru-Harran. پێش هاتنی ئەوانیش دوو (غل)یان هێنا لە (ئەرزە حلونی) Arzuhina بۆ بەکارهێنانیان لەلایەن ئوبرو- مەران بردوویانی بۆ (عەرەفە) کەرکوک وە دوو (غل)ی دیکە، کە لەهەولێر بەکارهاتوون پاشان چوو بۆ مازاموا mazamua. با پادشا بپرسێ بۆچی ئێستگەیەک بۆ تیپێک لە (بغال) دروست بکرێ لەدور تالیتی Dur-Ataliti. و ئێستگەیەکی دیکەش لەتاگالیگی Tagalagil. کاتێک رۆیشتوون لەئەرز حلونی دوو (بغل) هەبوون، بەکاردەهاتن، لەئێستگەی پۆستەی خێرا بۆ ئێستگەیەکی دیکە کە دوورە لەئاراکدی Arrakdi کاتێک کە چوو بۆ لای پادشا ئەویش ناردی بۆ ئەوەی دوو (بغل)دکە بەکاربهێنێت لەئەرزحلونی بۆ ئاراکدی، کە پادشا خۆی دەیزانی کە ئەرزەحلونی دەکەوێتە کۆتایی ڕێگا. پادشا سیدی دەبێ فەرمان دەربکا کە ئێستگەی پۆستەی (بغال) ڕادەوەستێ لە دور ئەتانیتی Dur-Atanate کە دەتوانین خۆمان بەهێز بکەین بەرامبەر تاوانباران، پادشا نووسیویەتی دەکەونە بەر دەستی پیاوانی خزمەتکار لەبابتیی (×) روون کرایەوە، بەڵام گوێمان لەهیچ نەبوو.

پادشا بۆی نووسیوم. بۆچی تاوانباران ناگرن. دڵنیابە کە تۆ باجەکەی دەدەی.... تاوانباران لەعەرەفە (ئەرابخا) لەناوچەی کۆشک کە هەڵدستان بەدەرچوون و سوورانەوە، بەڵام سەربازی تایبەت بەچاودێری کردنیان دانراون، ئەگەر بیانگرن ئەوکات دەیانهێنن بۆ پادشا، بۆ پادشا دەنێرم دزی ماڵان لەناوچەی (سارتیۆ) Sartinnu کە لەنزیک ئەرزەحلونی گیراون[٢٨].

سێ نامەی دیکەشمان هەیە دەربارەی فەرمانڕەوایی هەولێر، کە تێیدا باس لەچۆنیەتی گەڕانەوەی پیاوانی پادشا دەکا.

"بۆ پادشای گەورەم خزمەتکارت ئاشوور- شرو- ئیبنی- Assur-Sarru- ibni تەندروستی باش بۆ پادشای گەورەم، فەرمان ڕەوای هەولێر (١٢٠) لەپیاوانی پادشای هەیە کە نایانەوێ بچن بۆ سەربازگە. ڕازی نابێ بۆ پێدانی ئەو پیاوانە بەو. من دەترسم، پادشا، گەورەم، نایان با دەیان گەڕێنێتەوە (بەبێ ڕازی بوونی ئەو) (٣٠) پیاو لەنلیللی Titte، (٦٠) لەشاری هامود Hamudu لەفەرمانڕەوای شاری کلخ، ٣٠ لەشاری (....)بی بۆ مەرامی گەڕانەوەو ئیشکردنیان نییە[٢٩].

نامەکەی دیکە دەربارەی دابەشکردنی عێراقە لەیەکێک لەماڵەکان لەلایەن فەرمانڕەوای هەولێر "بۆ پادشا، گەورەم، خزمەتکارت ئام ار- یبلی AmAr-ili تەندروستی باش بۆ پادشای گەورەم! دەربارەی ماڵی Mardu ماردۆ کە پادشای گەورەم پێی ڕاگەیاندووم "تۆ لەگەڵ فەرمانڕەوای هەولێر URU-arba-il. ماڵەکە بەسەر مندالەکانی ماردو دابەش بکە هەریەکەو بەشی خۆی وەربگرێت. ئێمە زۆر تابلۆی نووسراومان لەماڵەکە دۆزیوەتەوە من کریومەتەوە و لەناو (....) دام ناون ئێستا بۆ پادشا دەینێرم، گەورەم[٣٠].

بەڵام نامەی سێیەم دەربارەی ئەو برە لە دەستچووەی جێگری پادشا لە هەولێر

"بۆ پادشای گەورەم، خزمەتکارتان، تەندروستی باش بۆ پادشای گەورەم. پادشای گەورە دەزانێ من و ئەو.... ئەوان (پادشا) گەورەی گەلن، ئەوان.... جێبەجێ بکەن ئیش و کارەکان بەدەستیان هێناوە لە.... لەناو چوون هەموویان.... لەناوچووە.... پادشای گەورەم (هارگو) Hargu نێردراوی جێگری کۆشک و فەرمانبەریەتی، کە داوا لەهەموو خەڵک دەکا لەپێشوازیدا بن لەناوەندی هەولێر URU Arba-il ئێستا جارێکی تر دەڵێن ٣٦٠٠ کەس مردوون ئەویش هەموو ماڵەکانی بەگەل دەفرۆشێت. ئەم کەسانە پیاوانی کۆشک نین.... من (کیوگوی) ku guka، ئەوان جێگری کۆشکیان کوشتووە دەڵێ ئەوان هاوولاتی منن و پیلان دادەنێ بۆ

دەست بەسەر داگرتنی زەوی فەرمانڕەوای هەولێر، هات و خەڵکیشی لەگەڵدا بوو دەڵێ ئێوە بێ دەنگ مەبن، ئێستا من (هار کیان)ی فەرمانڕەوا دەنێرم بۆ پادشای گەوردم، لێ بگەڕێ با پادشا بپرسێ کە جێگری کۆشک چی بردووەو چی بڕیار دەدا، بۆچی شارەکەم دەچەوسێننەوەو وێران دەکەن، بەجۆرێک دەبینرێ نەتوانن دەسەڵات پێشکەش بکەن و ئیدی بەدڵنیایی گەڕایەوە لامان و گوتی: ئێمە ئاشنایەتیمان لەگەڵ بازرگانەکان هەیەو کەل و پەلەکانمان دەفرۆشرێت، من بەهۆی کینی بەنامەیەک دەیانێرم و ئیدی با پادشا خۆی لێپێچینەوەیان لەگەڵ بکات.

**پەراوێزەکان:**

١- الجبوري، علي ياسين: "التوراة مصدرا للتاريخ الاشوري" توێژینەوەیەکی بلاونەکراوە، ل٣.

٢- دولا بورت، ل: بلاد مابين النهرين حضارة بابل واشور، ترجمة مارون الخوري، بيروت- ١٩٧١، ل٣٥، سليمان، عامر، الكتاب المسمارية والحرف العربي، موصل، ١٩٨٢، ص٥٢.

٣- ساكز، هاري، عظمة بابل، ترجمة عامر سليمان، الموصل ١٩٧٩، ل٢٨٤.

٤- الأحمد، سامي سعيد: كتابة التأريخ عند الأشوريين في العصر السرجوني ٧٤٧-٦١٢ ق.م" مجلة سومر، بغداد، ١٩٦٩، م٢٥، ل٤٦-٤٧.

٥- أوينهايم، ليوا. بلاد مابين النهرين، ترجمة سعدي فيضي عبدالرزاق، بغداد، ١٩٨٦، ل٣٦٢.

٦- ساكز، هاري، قوة اشور، ترجمة عامر سليمان، بغداد ٢٠٠٠، ص٣٩٠-٣٩١.

٧- اوينهايم، ليوا: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦٢.

٨- الاحمد، سامی سعید، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦.

٩- أوينهايم، ليوا: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦٢.

١٠- سازكر، هاري: قوه اشور، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩.

١١- زۆر وشە هەبوو بەگرانی بەدی دەکرا، دەقی مێژوویی ناتوانرێ بەشێوەیەکی راست و دروست بگوازرێتەوە، تەنانەت نامەکان هەندێ نامرازیان تێدایە باس لەرووداوی تایبەت دەکا لەنێوان نێردراو و نێردراودکە. بڕوانە الأحمد، سامی سعید، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧.

١٢- وينهايم، ليوا: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢، ساكز، هاري: قوة اشور، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٣٩٦.

١٣- سلمان، حسين أحمد، كتابة التأريخ في وادي الرافدين في ضوء النصوص المسمارية، أطروحة دكتوراه بلاونەکراوەتەوە، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٦، ل٢١٨-٢١٩.

١٤- الاحمد، سامی سعید: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧، فیش، ت "رسائل من جبهات القتال في العراق القديم"، ترجمة عبدالوهاب الوكيل، مجلة الثقافة الاجنبية، بغداد، ١٩٨٥، ج٣، لا ١٢٢-١٢٥

-paorpola: Ibid,p.64.r. 8.r.p1985, 3.p124-125.

Royal L., man, Water Correspondence of the Assyrian Empire, Michigan- 1930, P.67, pefeifer, R., State letters of Assyrian, New- Yaurk- 1935, P. 13.

١٥- جاسم، زهير ضياء: نظام الأتصالات في بلاد اشور، نامەی ماجستێر بلاونەکراوەتەوە، زانکۆی موصل- ٢٠٠٠، ل٨١.

١٦- فیش: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣١.

17- Saggs, H,W.f, "The Nimrud leters 1952. partv". Iraq, Vol. 21, 1959p.178.

18- Saggs: op. cit, p.168- 1676 parpola, S., the Corres Pondence of Sargon II finland. 1987 vol. (1), Part (2) P, 40. r. 10.

19- Parpola: Ibid, b. 126 r. 13.

20-paorpola: Ibid, p. 129-130. r.4 6 r. 6.

٢١- عطا، صلاح رشد: السوق العسكري للدولة الاشورية ٧٢٢-٦٢٢ ث.ز، نامەی دکتورا پێشکەش بە (معهد التأريخ العربي) کراوە، بەغداد ١٩٩٨، ل٤٠.

22- paorpola: Ibid, p. 64.r. 8. r.9..

23- paorpola: Ibid, p. 123,r.. 10

24-Lanfranchi, G. B, Parpola S,, the Correspond ence of sargon II, vol. 5, part (2), finland- 1990, p. 107-108, r.5.

25- Lanfran Chi Ibid, p.115- 116, r. 27.

26- paorpola: Ibid, p. 102, r.3.

27- Lanfranchi: Ibid, p. 105-106, r.,.

28- Lanfranchi: Ibid, p. 164-165, r.5.

29- paorpola: Ibid, p. 120, r.

30- paorpola: Ibid, p. 111, r.7.

31- Lanfranch: Ibid, p. 112-113, r. 15.

# هەولێر لەماوەی داگیرکردنی ئەخمینی و سلوقییەکاندا

دکتۆر سوهەیلە مەجید ئەحمەد
کۆلێژی ئاداب- زانکۆی موسڵ

دۆڵی رافیدەین هەر لەچاخە کۆنەکانی مێژووەوە لەداهێنانی نووسین تا ئەو کاتەی عێراق کەوتە ژێر دەستەڵاتی فارسە ئەخمینییەکان بەرووخانی بابل ٥٣٩ پ.ز بەژمارەیەک حوکمڕانی و زنجیرەیەک دەسەڵاتدار تێپەڕی، کە دەوڵەت و میرنشینی سەربەخۆی تایبەتییان دامەزراندو لەباکوور تا باشوور بەهەولێریشەوە حوکمڕانییان دەکرد، بەڵام بگرە لەو کاتانەی کە عێراق کەوتە ژێر کۆنترۆڵی بیانی بەزوویی مەسەلەی ئازادکردن هاتە پێشەوە جا چ لەباکوور یان لەباشووردا. بەرووخانی بابل دوا لاپەڕە هەڵدرایەوە، لەلاپەڕەکانی حوکمڕانی نیشتمانی لەعێراقی کۆندا و لاپەڕەیەکی تازە لەمێژووی عێراق و ناوچەکە دەستی پێکرد، واتە کاتێ عێراق کەوتە ژێر کۆنترۆڵی بیانی، کە زێتر لەسیانزە سەدە درێژەی کێشاو بەردەوام بوو. ئیدارییەکەو حوکمڕانییەکەی لەلایەن گەلانی بیانی پێشکەش دەکراو هەڵدەسووڕێندرا. بەڵام بانەکانی ئێران و بەشی رۆژئاوا لەنێوە دوورگەی بەلقان و کەناری دەریای رۆم و خاکی عێراق بووە گۆڕەپانی ململانێی نێودەوڵەتی و لەئاکامدا ئاسەوارێکی خراپی لەسەر وڵات و خەڵکەکەی جێهێشت.

ئەو کات هەولێر پایتەختی هەرێمی حەدیاب بوو، ناوجەرگەکەی یەکێ بوو لەشارەکانی عێراق کە وەکو ئەوان دووچاری نەهامەتی بووە لەحوکمڕانییە یەک لەدوا یەکەکاندا وەک حوکمڕانی مێدییەکان و ئەخمینی و ئەعزیقی و فەرسییەکان پاشان رۆمانییەکان دواتر ساسانییەکان.

لێرە باس لە سەردەمێک لە سەردەمەکانی کۆنترۆڵی بیانی بکەین، بەتایبەت هەردوو ماوەی داگیرکردنی ئەخمینی و سلوقییەکان.

**ناوی شار**

ئەربیل ناوێکی کۆنەو لەدەقە مێخی و لەنووسینە مێژووییەکان لەچاخە جۆراو جۆرەکاندا هاتووە، تاکە شارە لەنێو شارە کۆنەکان و ئاشووری، کە بە بەردەوامی تا ئەمڕۆی لەگەڵدا بێت خەڵکی تیایدا نیشتەجێ بووبێ و بەئاوەدانی مابێتەوەو ناوە کۆنەکەی خۆی پاراستبێ. ئەربیل لەچاخی دووی پ.ز بوو بەبنکەی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی و بەناوی حەدیاب ناسرا (لەسەرچاوە کلاسیکییەکانی کۆندا ئەدیابینە)یە (دوو زێیان) واتە هەرێمی دوو رووبارەکە[1].

کۆنترین شت لەسەر ئەربیل، کە گەیشتبێتە ئێمە ئەو ئاماژە پێدراوانەن، کە لەدۆسێیەی شایەکان و بنەماڵەی ئوری سێیەم (٢١١٣-٢٠٠٤پ.ز) هاتووەو ناوی شارەکە ئور- بیلم- **Urbilum** بووە. هەروەها بەهەمان ناو لەساڵنامەی تایبەت

بەدەقی ڕووداوەکانی مێژوونووس هاتووە، کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی چل و سێیەمین لەدەسەڵاتی شا شولکی و ساڵی دووەم لەدەسەڵاتی شا ئەمار-سین (٢٠٤٦-٢٠٣٨پ.ز). ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ئەربیل و ناوچەکانی دەوروبەری و سەرجەم وڵاتی ئاشوور چووەتە ژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی ئوری سێیەم.

بەڵام هاتنی ناوی ئەربیل لەدەقەکانی مێخی ئاشووریدا بە وشەی ئەربائیلۆ (Arba-ilu) هاتووەو ناوێکەو مانای (چوار خوا) دەگەیەنێت[٢].

ئەمەو ئەربیل لەچاخی ئاشووری تازەدا بەبنکەی پەرستنی خوایەکانی عێراقی کۆن ناوی دەرکرد، کە بەناوبانگترینیان ئەشتار بوو و ناونرا بە ئەشتاری ئەربائیلۆ، واتە ئەشتاری هەولێر تا لەئەشتاری نەینەوا جیابێتەوە. پەرستگای ئەشتار لەهەولێر لەدەقە مێخییەکاندا بەناوی (ئی- کشان- کەلاما E-Gashan-Kalmma) هاتووەو ناسراوە، بەزمانی سۆمەری واتە (ماڵی خانمی وڵات) و ناوبانگیشی دەرکرد، بەوەی کە بەناوبانگترین بنکەی لێزانانە[٣].

لە سەردەمی فارسە ئەخمینییەکاندا ئەو شارە بە (ئەربیرا Arbira)[٤]. ناسراوە، بۆ ئەمەش سوود لەبەڵگەنامەیەک وەرگیراوە، کە بەزمانی ئارامی نووسراوەو دەگەڕێتەوە بۆ پێش کۆتایی هاتنی چاخی پێنجەم پ.ز، کە ئاماژە بەئەرشام مرزبانی میسری دەدات، کە سامانەکەی لەنێوان میسرو ئیلام و هەولێر دابەش کرابوو، کە بۆ بەرپرسی کەرتەکانی کەوتۆتە نێوان بابل و دیمەشق نووسیبووی یارمەتی نوێنەرەکەی بدەن، کە لە بابلەوە بەرەو میسر دەچێت. لەپەیامی ناوی شارەکانی پێشوودا هاتووە، کە بنکەی ناسراویان لێ بووە لەسەردەمی ئاشووری تازەدا (٩١١-٦١٢ پ.ز) لەوانە (لاخیرۆ- ئەرزخینا- ئەربیل- ئۆباشۆ). شایانی باسە ئەو شارانە ئەوسا هەموویان کەوتبوونە سەر ئەو ڕێگایەی لەبابلەوە بۆ ئەربیل دەهات[٥].

**پێگەی شار**

شاری هەولێر دەکەوێتە دەشتاییەکی بەرفراوانی بەپیت لەباکووری زێی گەورەو لەباشوور زێی بچووک و لەڕۆژئاوا ڕووباری دیجلە بوو[٦]. ئەمڕۆ ئەم شارە لەسەر قەڵاتێکی شوێنەوارەو خانووی ماڵنشینی لەسەر دروست کراوە. هەندێ لە مێژوونووسەکان دەڵێن دانیشتوانی دۆڵی رافیدەین هەژار بوونە لەوەی، کە بتوانن خانوو و باڵەخانەکانیان بپارێزن، بۆیە پەنایان بۆ شوێنی بەرز بردووە جا ئەم پرۆژەیە بۆ چەند جارێک لەماوەی ساڵەکاندا دووبارە بۆتەوە لەکاتی بەرزبوونەوەی ئاستی دانیشتوان هەندێ بەسەر هەندێکدا، واتە شارەکان بەرزتر بوونە بەسەر دەشتاییەکەی دەوروبەریاندا[٧]. لەو شوێنە نیشتەجێیانەش کە هەرگیز خەڵکەکە جێی نەهێشتووەو تا ئەمڕۆ خەڵک تیایدا نیشتەجێیە هەردوو قەڵاتی هەولێر و کەرکووکن[٨].

دەشتی هەولێر باشترین جۆری گەنم وەبەرهەم دەهێنێت، ئەم سروشتە جوگرافییەش وای لە شاری هەولێر کردووە، کە جیا بکرێتەوە بەباران بارینی زۆرو پەرەپێدان بەو دانەوێڵانەی پشت بەئاوی باران و چاندن دەبەستن بەدرێژایی زۆربەی ساڵەکاندا[٩] و ناوبانگییەکەشی تائێستا هەر ماوە. سەرەڕای ئەوەی پێگەکەشی زۆر باشە، کە کەوتۆتە سەر ڕێگەی نێوان کەرکووک و موسڵ (ئەرابخا)[١٠].

بەڵام گرفتی شارەکە هەر لەکۆنەوە کەمی ئاو بووە، چونکە لە سەرچاوە ئاوییەکان یان کانیاوەکان دوور بووە، ئەمەو ئەو گرفتەش بە بەردەوام لەگەڵ زۆری دانیشتوانی شارەکە گەورەتر بووە. بۆیە ئەندازیارێکی ئاشووری پشتی بەهەڵکەندنی کارێزێک لەژێر زەوی بەستووە بۆ گواستنەوەی ئاو بەهەروایی بەبێ ئەوەی ئامێر بۆ بەرزکردنەوەی ئاو بۆ سەرەوە بەکاربهێندرێت، ئەمەش بەهۆی نزمی ئاستی ڕووی ئاوی ڕۆیشتوو لەسەر ئاستی ڕووی زەویدا، بۆیە ئەندازیارەکان بیری ستوونیان لەئاستی ڕووی زەوی هەڵکەند تاگەیشتۆتە ئاوو ماوەی نێوان بیرێک لەگەڵ بیرێکی دیکە لە ٤٢

مەتر کەمتر نەبوودو هاوکات بەو جۆرە بیرانەشیان گوتووە کارێز[11].

## ماوەی داگیرکردنی ئەخمینییەکان ٥٣٩-٣٣١ پ.ز

لەپاش رووخانی نەینەوا لەساڵی ٦١٢ پ.ز کەوتە ژێر کۆنترۆڵی میدییەکان، هەولێریش رووخاو کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەوان، بەڵام بەحوکمی پیرۆزی شارەکەو پایتەختی ئایینی ئاشوورییەکان و رێزنان لە ەرستگاکەی (پەرستگای خواوندی ئەشتاری ئەربیل) یەکێک لەو هۆکارانەی، کە دووچاری کاولکاری نەبێتەوە[12]. ئەو هەرێمە بەو شێوەیە کەوتە ژێر کۆنترۆڵی میدییەکان لەسەردەمی کەی ئەخساردا (٦٣٣-٥٨٤ پ.ز) تا شانشینی میدییەکان نوشووستی هێناو دەوڵەتی ئەخمینی زاڵ بوو بەسەر رەوشی ناوچەکە، بەم شێوەیە هەرێمەکەو هەولێری پایتەخت کەوتە ژێر دەسەڵاتی فارسە ئەخمینییەکان[13].

دەوڵەتی ئەخمینی دەگەرێتەوە بۆ دامەزرێنەرەکەی ئەخمینس (Achaemenes)، کە لەنێوان دەستپێکی سەردەمی حەوتەم تا چارەکی دوایی سەدەی هەشتەم پ.ز حوکمڕانی کرد. بارەگای حوکمڕانییەکەی کەوتبووە دەشتاییەکانی چیای بەختیاری. ئەمەو پاش ماوەیەکی کەم لەسەرەتای دامەزراندنییەوە دەسەڵاتەکەی بەرفراوان بوو لەوڵاتی ئیلام. لەپاش مردنی دامەزرێنەرەکەش حەبشیش Cispis حوکمڕانی گرتە دەست و توانی هەرێمی فارس Farsa داگیر بکات. دوای حەبشیش کوڕەکەی (کوڕشی یەکەم) بوو بەجێنشینی، دواتر قەمبیز جێی گرتەوە، کە توانی وڵاتی ئێران لەژێر یەک سەرکردایەتی یەک بخاتەوە. لەپاش مردنی ئەویش کوڕەکەی کوڕشی دووەم ناسراو بەکوڕشی گەورە (٥٥٩-٥٣١ پ.ز) جێی گرتەوە[14]. ئەمەو لەو سەردەمەدا شانشینەکەی بەرفراوان کرد، میدیا لەباکووری ئێران و لیدیا لەرۆژهەڵاتی ئەنازۆلی گرتە خۆ. هاوکات پاش ئەو سەرکەوتنەی لەسەر شا لیدی قارون وەدەستی هێنا بەرەو یۆنان چوو تا شارەکانی ئەو وڵاتە بگرێت، کە کەوتۆتە ئاسیای بچووک و نزیکە لەلیدیا. کوڕش لەنێوان ساڵی ٥٤٥-٥٣٩ پ.ز دەسەڵاتەکەی بەرفراوان کرد بۆ دەرەوەی رووبارو ئەفغانستان. سنووری دەوڵەتەکەی گەیشتە سنووری باکووری وڵاتی هیند. لەساڵی ٥٣٩پ.ز بەرەو بابل بەرێکەوت[15]. شایانی باسە هەرچەندە لێکۆڵەرەوەکان رشت نین لەسەر ئەو رێگایەی کوڕش گرتبوویە بەر، بەڵام هیرودتس ئاماژە بەوە دەدات، کوڕش لەرووباری دیالا پەڕیوەتەوە بەبێ ئەوەی ئاماژە بەلایەن یان ئەو شوێنەی بزاوتی تیادا کردووە بدات. جا گەربێت و کوڕش لەئیلامەوە بزاوتی کردبێ، ئەوا ئەو رێگایەی ئەو گرتوتیە بەر لەدەشتی سوسیان لەوڵاتی ئاشوور پەڕیوەتەوە. بەڵام ئەگەر سوپاکەی لەئەکباتیا (هەمەدان)، کە پایتەختیان بووە هاتبێ، ئەوا ئەگەری ئەوە لەئارادا دەبێ، کە لەدەروازەکانی چیای زاگرۆس پاشان لەوڵاتی ئاشوور لەرێگەی کەرکووک- دۆڵی رووباری دیجلەوە پەری بووبنەوە. بە بۆچوونی زۆری لێکۆڵەرەوەکان کوڕش لەرێگەی هەمەدان- کرمانشا- هەولێر کە بەرێگایەکی مێژوویی دادەنرێت بۆ حەران بەرەو وڵاتی ئاشوور چووبێ. مەزەندەی زۆریش لەئارادایە، کە کوڕش گەیشتبێتە هەولێر پاشان بەرەو وڵاتی بابل شۆڕ بووبێتەوەو لەرێگادا بەرزاییەکانی حەمرینی گرتبێتە بەرو سوپاکەی لەشاری ئوبیس لەرووباری دیجلە پەریبووبێتەوە[16]، کە لەو شوێنەدا یەکەم شەڕ رووی دا لەنێوان کلدانییەکان و سوپای کوڕشی داگیرکەر. جا پاش ئەوەی پێی نایە وڵاتی بابل شێوازی کەرت کەرتی کردنی بەکارهێناو بۆ هەر کەرتێک فەرمانڕەوایەکی داناو ناوی نا ستراب (مرزبان)، کە بەستراببوونەتەوە بەحکومەتی ناوەند[17].

کاتێ دارا بوو بە شاو لەکورسی پادشایەتی دانیشت یەکەم جار شۆرشە هەرێمییەکان دژ بەداگیرکردنی ئەحمینییەکانی کپ کردەوە، لەوانە بابل و میسرو شام[18]. پاشان شا چاوی خشاندەوە بەکاروباری ئیدارەی ئیمپراتۆرییەت.

ئەمەو بەپێی سیاسەتی نیشتەجێی کە شایەکانی ئەخمینی هانیان دا لەولاتی بابل نیشتەجێ بوو. ئەوسا سەرکردە ئەخمینییەکان بوون بەخاوەنی زەوی و زار لەبابل و هەولێردا. شایەکانی ئەخمینی باجێکی زۆریان سەپاندە سەر جوتیارەکان و وەبەرهەم هێنەرانی زەویوزار لەوانە باجی کرێی هاتوچۆ، کە بریتی بوو لەسێیەکی داهات. جوتیارەکان زیویان بەباج دەدا لەبری زەوییە کشتوکاڵییەکانیان. بێگومان ئەوەش وای لە خاوەن زەویوزارە بەرهەم هێنەرەکان کرد کۆچ بکەن، چونکە داهاتەکەیان نەدەگەیشتە بەرامبەر ئەو باجەی لێیان وەردەگیرا. لەدەرەنجامدا لەبەشێکی زۆری کەرتەکاندا کشتوکاڵ وەستا. لەلایەکی ترو لەهەمان کاتدا چالاکی بانکەکان هاتە پێشەوە، کە بەسوودێکی بەرز پارەی بەقەرز دەدایە نیشتەجێکان. هەڵبەتە ئەمەش هۆکارێکی دیکە بوو، کە وای لەجوتیارەکان کرد زەوی و زارەکانیان جێ بهێڵن و روو لەشارەکان بکەن لەپێناو گەڕان بەدوای کاردا بۆ گوزەری خاوخێزانەکانیان[19].

### هەولێر لەژێر دەسەلاتی ئەسکەندەری مەکدۆنیدا

لەکۆتایی سەدەی پێنجەمی پ.ز کاتێ دەسەلات لاواز بوو، بووە هۆی ئەوەی دەوڵەتی فارس هەڵبوەشێتەوە، مەکدۆنییەکان دەستیان بەوە کرد کە خۆیان لەپاشکۆیەتی ولاتی فارس جیا بکەنەوەو هەوڵ و تەقەلای خۆیان خستە گەڕ بۆ هێنانەکایەی قەوارەیەکی سەربەخۆ بۆ خودی خۆیان ئەمەش لەو کاتەیدا بوو، کە شای مەکدۆنی ئەرخیلاوس (٤١٣-٣٩٩ پ.ز) لەحوکمڕاندا بوو. ئەمەو لەم ماوەیەدا گرژی سەربازی لەنێوان فارسەکان و دەوڵەتەکانی یۆنانی لەئارادا بوو، کە پاشان هێرشی سەربازی دەریایی و زەمینی بەدوادا هات[20]. ئەخمینییەکان لەدژی یۆنانییەکان سەرکردایەتی ئەو هێرشانەیان دەکرد، یۆنانییەکان دەرگایان لەبەردەم ئەغریقییەکان کردەوە لەپێناو جێکردنەوەی پێیەکی خۆیان لەئەفریقیاو ئاسیادا بەپلەیەک بەئامانجی ئابووری، پاشان رزگاربوونیان لەدەست دەسەلاتی ئەخمینییەکاندا کە زاڵ بوون بەسەر دەریای (رەش و ناوەڕاست و سوورو ئۆقیانووسی هیندی). کەنار دەریاکانی یۆنان و بەشەکانی باکوور لەبەندەرەکانیان کە لەژێر دەسەلاتی دارا بوو. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەسیناو ئیسپارتا یەک بگرن و بەرپەرچی هێرشەکانی فارسە ئەخمینییەکان بدەنەوە[21].

پاش ئەوەی ئەخمینییەکان هێڵەکانی ئازووقەیان لەبەردەم ولاتی یۆنان پچڕاند، بەتایبەتی دانەوێڵە، کە میسر بۆی دەناردن مەترسییەک هاتە پێشەوەو هەڕەشەی لەتەواوی ئەغریقییەکان کرد، هەڵبەتە ئەمە وای کرد ریزەکانیان رێک بخەن و لەگەڵ ولاتی فارسدا شەڕ بکەن، فیلیب باوکی ئەسکەندەر توانی شارەکانی یۆنان لەژێر سەرکردایەتی خۆی یەک بخاو پاشان کوڕەکەی خۆی ئەسکەندەری هەڵبژارد (٣٥٦-٣٢٣ پ.ز)، کە سەرکردایەتی ئەغریقییەکانی بکات لەجەنگی دژ بەفارسەکاندا[22]. بەدیارکەوتنی کەسایەتی ئەسکەندەری مەکدۆنی کاریگەرییەکی باشی هەبوو لەجیاکردنەوەی ئەو دوو ماوەیەدا، لەسەردەمی ئەودا ولاتگیری بەرفراوانتر بوو تا وای لێهات شارستانی هلنسییەکان تێکەڵ بەشارستانیەتی رۆژهەلاتی کۆن بوو، لەوانە فارس. کاتێ ئەسکەندەر تەمەنی گەیشتە ٢٠ ساڵ شوێنی باوکی گرتەوە، واتە لەساڵی (٣٣٦ پ.ز) لەسەر کورسی پادشایەتی مەکدۆنیا دانیشت، واتە هەمان ئەو ساڵەیە، کە پاشای فارس دارای دووەم دەسەلاتی گرتە دەست. ئەسکەندەر مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی پلانی باوکی جێبەجێ بکات، کە ئەویش داگیرکردنی ولاتی فارس بوو[23]. جەنگی جیابوونەوە (ئەیسوش ساڵی ٣٣٤ پ.ز) ئەسکەندەر دەسەلاتی بەسەر ئاسیای بچووکدا هێنا، هەر چەندە ئەسکەندەر بەدواداچوونی سوپای دارای نەدەکرد، کە شکستی هێنابوو، بەڵکو ماوەی پێدابوون تا بە ئازادی تەواو پاشەکشە بکەن لەکاتی بەرەو روو چوونیان بەسوپاکەی بەرەو

كەنارەكانی سووریاو فەلەستین و میسر، بۆ ئەوەی كەنارەكانی دەریای سپی ناوەڕاست بەتەواوی بكەوێتە ژێر كۆنترۆڵی ئەغریقییەكان. لەهەمان كاتدا ڕێگەكەشی لەفارسەكان پچڕاندو ئازووقەشی بۆ سوپای یۆنانی نارد، كە بریتی بوو لەدانەوێڵە، كە لەمیسرەوە[٢٤] دەهات.

سەربازەكانی دارای ئەخمینی لەدەشتی هەولێر بوو، لێرەدا پلانی بۆ ئەوە دادەڕشت، كە سوپای ئەسكەندەری مەكدۆنی ڕابگرێ چیتر بەرەو پێشەوە نەیێت، لەكاتێكدا ئەسكەندەر لەبەهاری ٣٣١ پ.ز میری جێهێشت و گەیشتە شاری سابساكوس لەسەر ڕووباری فورات، كە ئێستا پێی دەوترێت (ڕقە). لەهاوینی ٣٣١ پ.ز دوو پردی دروست كرد، كە لەڕووباری فورات بەرەو بابل لەسەریانی پەڕییەوەو ڕێگەی باكووری دۆڵی ڕافیدەینی گرتە بەر پاشان بەرەو باشوور بەرەو ڕووباری دیجلە هات بەو لایەنەی، كە نزیكەو، هاوكات جوولەكەكان، كە لەو ناوچە نیشتەجێ بوون كۆمەكیان كرد بەخوازیاری ئەوەی یارمەتییان بدا بەرەو فەلەستین بگەڕێنەوە. ئەسكەندەر حەزی نەكرد هەمان ڕێگە بگرێتە بەر، كە میر كوڕەش لەمیانەی هەڵمەتەكەیدا گرتبوویە بەر[٢٥]، بەڵكو بەرەو باكوور هات بەرەو بەرزاییەكانی دۆڵی ڕافیدەین پاشان بەرەو باشوور بەرەو كەناری دیجلەی ڕۆژهەڵات. كە زانی دارای سێیەم و سوپاكەی سەربازگەیان لەڕووەكەی دیكەی ڕووبار دامەزراندووە، ئەسكەندەر بڕیاری دا لەنەینەوا، كە پایتەختی ئاشوورییەكان بوونەپەڕێتەوە، بەڵكو لەشاری بیزایدی پەڕییەوە، كە ئەمە چەند ڕۆژێكی برد بەرەو باشوور، جا كاتێ زانی داراو سەربازگەو سوپاكەی لەشوێنێكی نزیكن لەدەشتی هەولێر، ئەسكەندەر بەشەو بزاوتی كرد بۆ ئەوەی دەست بەسەر بەرزاییەكاندا بگرێت، كە درێژ دەبوونەوە بەدەوری دەشتەكەدا[٢٦].

ئەسكەندەر بەخودی خۆی چاودێری ناوچەكەی دەكرد، لەو كاتەدا داوای سەركردەكانی سوپاكەی كرد بۆ بەستنی كۆنگرەیەك بەمەبەستی دانانی پلانێكی جەنگی بۆ شەڕكردن. بڕیاریان دا چەند ڕیزێك ببەستن، كە خۆی لەشانزە ڕیز بدات و چەكی تیرو ڕمیان پێ بێ، پشوویەكی دا بەسەربازەكان، چونكە ڕەتی كردەوە جەنگەكە بەشەو بێت[٢٧].

شەڕەكە لەئەیلولی ساڵی ٣٣١ پ.ز لەكۆكامیلا (دەشتی هەولێر) ڕوویدا[٢٨] هەندێ بۆچوونیش هەیە دەڵێن، كە شەڕەكە لەتشرینی یەكەمی ٣٣١ پ.ز ڕوویداوە[٢٩]. سوپای دارا ژمارەكەی دەگەیشتە یەك ملیۆن كەس و ١٠٠ گالیسكەشیان پێ بووەو ژمارەی سوارچاكەكانی لەسوپای ئەسكەندەر زیاتر بووە. كەچی سوپای ئەسكەندەر لە (٤٠) هەزار سەربازی پیادەو ٧٠٠٠ سوارچاك پێكهاتبوو.

مەكدۆنییەكان مەترسی ئەوەیان هەبوو لەپشتەوە یان لەدواوەی سوپاكەیان هێرشیان بكرێتە سەر، بۆیە ئەسكەندەر پلانێكی تۆكمەی داڕشت، كە كاریگەری گەورەی هەبێ لەسەر ڕێكخستنی سوپاكەی لە بەرەبەیاندا. سوارچاكەكانی لەلای چەپ دانا ڕیزەكانی لەناوەڕاست دانا، پیادە چەكدارەكانی، كە بەچەكی قورس چەكی كردبوون لەلای ڕاستی دانان. سەربازی دانابوو بەشێوەی لاری تاوەكو بتوانن ئاوڕ لەدوژمن بدەنەوەو وریای خۆیان بن. شەڕ دەستی پێكرد سوپای ئەسكەندەر لەلای چەپی سوپای دوژمن دەستی بەبزاوت كرد. ئەسكەندەر بەلاری بەرەو ڕاستدا ڕۆیشت و بەردەوامیش بوو لەگواستنەوەی كەتیبەو پۆلە قورسەكان بەهەمان لا. دارا فرمانی دا هێرش بكەنە سەر باڵێكی سوپای ئەسكەندەر، وەك بەرپەچدانەوە، بەڵام گەورەكانی ئەسكەندەر سوارچاكەكانی دارایان تێك شكاندو گالیسكەكانی بەردا بەلای چەپی باڵێكی سوپای فارسەكاندا، بەمەوە ئەسكەندەر كە سەرۆكایەتی سوارچاكەكانی دەكرد ئازایانە سوپای فارسەكانی كردە دوو بەش و ڕیزەكانی سوپاكەی تێكوپێك شكان، كە بەتوندی هێرشی كردە سەر سوپای دارا، بەمەوە شای فارس ڕێگەی خۆی ون كردو گالیسكەكەی سووڕاندەوەو هەڵات[٣٠].

وادیارە دارا بەو كارە تێكچووەو هەولێ دا بەهۆی چەند مەرجێك كێشەكە لەنێوان خۆی و ئەسكەندەر یەكلایی بكاتەوەو كۆتایی بەجەنگی نێوانیان بێت، بەوەی كێشی (٣٠٠٠٠) لەزێو پێشكەشی بكات و كچەكەی خۆشی بداتە ئەسكەندەر. كوڕەكەشی بەبارمتە لای ئەسكەندەر بمێنێتەوە لەبەرامبەر ئازادكردنی دایك و كچەكەی، كە ئەسكەندەر دەستگیری كردبوون هاوسەرەكەی دارا، كە بەدیل گیرابوو مرد. دەسەڵات و فەرمانڕەواش دابەش بكەن، بەو گوزارشتەی كە ئەسكەندەر زاوایەتی. بەڵام ئەسكەندەر مەرجەكانی دارای رەت كردەوە بە جۆرێك تازە سەركەوتن وەدەست هات، كەسی سەركەوتووش بێ مەرج سەركەوتن دەخوازێ. پاش ئەوەی ئەسكەندەر ماوەیەك لەهەولێر مایەوە بەرەو بابل شۆڕبۆوە، بۆ ئەوەی عێراق و شوێنی تری وڵات داگیر بكات[٣١] دەرەنجامی شەڕی كۆگامیلا لەسەر ئاستی عێراق و ناوچەی رۆژهەڵاتی ناڤین بەگشتی رەهەندی گرنگی لێ كەوتەوە، بەمەوە ئەسكەندەری مەكدۆنی رێگەی بازرگانیء سەربازی بۆ هیند كردەوە. گۆگامیلا كەوتۆتە رۆژئاوای رووباری خازرو بەنزیكەی ٢٠ میل كەوتۆتە باكووری رۆژئاوای شاری هەولێر. لێرەدا هەندێ لەمێژوونووسەكان جەنگەكە بەناوی جەنگی هەولێر ناو دەبەن، چونكە ئەسكەندەر پاش ئەوەی دارای سێیەمی رووخاند دەسكەوتێكی زۆری هێنایە شارەكە، چونكە سەركەوتنی ئەو دەست بەسەرداگرتنی شاری هەولێر بوو، كە مەترسییەكی گەورەی هەبوو لەهەرێمەكە[٣٢].

كاتێ ئەسكەندەر گەیشتە شاری بابل شارەكە دەرگاكانی خستە سەرپشت و كاهینەكان بەمەبەستی پێشوازیكردن چوونە دەرەوەو ئەسكەندەر ویستی پێیان نیشان بدا، كە نیاز پاكە لەگەڵیان، رێزی لەهەستی ئایینی و دابونەریتی كۆنیانی گرت و پابەند بوو بەوەی بایەخ بەپەرستگاكانیان بدا، بەتایبەت پەرستگای (خواوەند مەردۆخ)یان بۆ چاك بكاتەوە بەمەبەستی كۆكردنەوەی خۆشەویستی كاهینەكان و حوكمڕانەكانی ئەم شارە، وەك پاشای ئەم شارە رێوڕەسمی دابونەریتی خۆیان پێشكەشكرد، وەك ئەو رێوڕەسمەی شا ئەخمینییەكان مكوڕ بوون لەسەر بەئەنجام گەیاندنی. بەڵام شۆڕشەكان، كە لە هەرێمەكان روویان دا، لەوانە بابل، سازكردنی ئەو جۆرە رێوڕەسمانە بوونیان نەما. وێڕای ئەوە لەرووی دارایی و دابینكردنی ئەمن و ئاسایش بایەخی بەشارەكەدا. پاشان ماوەی دا بەسەربازكردنی هاووڵاتیان لەرۆڵەكانی ویلایەتەكەیان بۆ پێكهێنانی هێزێك بۆ پاراستنی ئاسایش و دەسەڵات لەژێر سەركردایەتی ئەفسەرە مەكدۆنییەكاندا[٣٣]. شایانی باسە ئەوەی لەشارەكانی دیكەی عێراق وەك بابل و ئاشوور رووی دا بەهەمان شێوە ئەو گۆڕانكارییە لەشاری هەولێریش رووی دا.

هەولێر ملكەچ بوو بۆ سەروەری ئەسكەندەر. لەپاش مردنی ئەسكەندەری مەكدۆنی سەروەت و سامانی دەوڵەتەكەی لەنێوان سێ سەركردەدا دابەش كرا، ئەوەبوو هەرێمی حەدیاب، كە پایتەختەكەی هەولێر بوو كەوتە ژێر دەسەڵاتی سلوقییەكان (٣١٢-٣٥ پ.ز) بووە بەشی سەركردە سلۆقس. هاوكات لەژێر دەسەڵاتی سلوقییەكان مایەوە تا كەوتە ژێر دەسەڵاتی فرثییەكان[٣٤].

مردنی ئەسكەندەری مەكدۆنی بۆشاییەكی گەورەی سیاسی جێهێشت، كە ئیمپڕاتۆرییەكی وا گەورە، كە ماوەی نزیكەی چل ساڵی خایاند پەكی كەوت. پاشان ئەو ئیمپڕاتۆریەتە گەورەیە بوو بەمیرنشینی بچووك و سێ سەركردە مەكدۆنییەكەی بۆیان جێ ما حوكمڕانیان كرد، ئەوانیش بۆ منداڵەكانیان جێهێشت، كە بەمیرنشینە هلنسییەكان ناسران. رەوشەكە وای خواست، كە ئەوانە تەماحگیری لەسەروەت و سامانی ئەسكەندەر بكەن. نزیكترین مانگر لەوەرەسەكان لەماڵی مەكدۆنی بوو، كە براكەی فیلیب ئەرهید ئیوس بوو، كە لەباوكی بوو. بەڵام تووشی فێ بوو لەتوانایدا نەبوو كۆنترۆڵی خۆی بكات. لەهەمان كاتیشدا هیچ لەژنەكانی كە فارس بوون تەنیا رۆكسانا نەبێت، كە لەساڵی (٣٢٧

پ.ز) هێنابووی سکیان پڕ نەبوو. سەرکردەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی بەشدارییان لەزۆر جەنگدا کرد، کە بەجەنگی بۆماوە ناسرا (٣٥) پاشان بەم شێوەیە کۆتایی هات، میسر بوو بەبەشی بەتلیمۆس و شانشینەکەی بەشانشینی بەتالیسا ناسرا. بەڵام ئەنتیخۆس ئاسیای بچووکی بەرکەوت. سلوقەس-یش عێراق و وڵاتی شامی بەرکەوت، شانشینەکەی بەشانشینی سلوقییەکان ناسرا [٣٦].

بەم شێوەیە هەولێر بۆ سەروەری ئەسکەندەر ملکەچ بوو و، دوای مردنیشی بوو بەبەشی سەرکردە سلوقس. واتە عێراق کە هەرێمی حەدیابی لەخۆ دەگرت و پایتەختەکەی هەولێر بوو، وەکو هەرێمەکانی دیکەی دۆڵی رافیدەین لەژێر کۆنترۆڵی سلوقییەکان بوو پاشان کەوتە ژێر کۆنترۆڵی فرثییەکان.

سەرچاوەکان:

١- باقر: طه، من تراثنا اللغوي القديم، بغداد- ١٩٨٠، لا:١٥٧.
٢- هەمان سەرچاوە، لا: ١٥٧.
٣- هەمان سەرچاوە، لا: ١٥٨.
٤- هەمان سەرچاوە، لا: ١٥٧.
5-Oater. D., Studies in the Ancient History of Northern -Iraq- London- 1968, p. 1980
٦- باقر، سەرچاوەی پێشوو ،لا: ١٥٨.
٧- يعد سهل أربيل من افضل المناطق الزراعية إنتاجا للحنطة والتي كان اعتماد الدولة الاشورية عليها كبير جدا عن هذا الموضوع ينظر الجنابي: صلاح، جغرافية الموصل، موسوعة الموصل الحضارية، موصل ١٩٩١، ج:١، لا: ١٦.
٨- رو: جورج، العراق القديم، ترجمة وتعليق حسين علوان التكريتي، بغداد، ١٩٨٦، لا: ٣٣.
9-http://www.nirgalgate.com/asp
١٠- جميل: فؤاد، حدياب.. اربيل وعشتار، مجله سومر/ ١٩٦٤، م:٢٥، لا: ٢١٩-٢٢٠ وانظر كذلك. جميل: فؤاد، اريان بدون أيام الاسكندر الكبير في العراق مجلة سومر ٩٦٧، م:٢١، لا: ٢٦٧.
١١- جميل، هەمان سەرچاوە، لا: ٢٦٧.
١٢- جميل فؤاد، اريان، سەرچاوەی پێشوو،لا: ٢٢٠.
١٣- باقر: طة، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ط:١، بغداد- ١٩٥٥، ج١، لا: ٤٤٥.
14- Ghirshman, R. Iran, England-1954, pp.118. ff.
15- Ibid, p. 128.
١٦- إبراهيم: جابر خليل، منطقة الموصل في فترة الاحتلال الاخميني والسلوقي والفرثي موسوعة الموصل الحضارية، جامعة الموصل- ١٩٩١، ج:١، لا: ١٢٩.
17-Grayson. A.K, Assyrian and Babylonian chronicles, New-York, 1975, p. 109.
١٨- للمزيد من التفاصيل عن ثورات مدن الأقاليم ضد السيطرة الاخمينية ينظر: الطائي: ابتهال عادل، ثورات الأقاليم العربية ضد السيطرة الاخمينية، مجلة التربية والعلم، م:٣، موصل ٢٠٠٦.
١٩- جماعة من علماء السوفيت، العراق القديم، دراسة تحليلية لأحواله الاقتصادية والجتماعية، ترجمة سليم طه التكريتي، بغداد- ١٩٧٦، لا: ٤٦٢.
٢٠- المولي: جاسم عباس محسن، أحوال العراق إبان الاحتلال السلوقي رسالة ماجستير غير مشنورة، موسل- ٢٠٠٥، لا: ٤.
٢١- إبراهيم، جابر خليل، منطقة الموصل في فترة الاحتلال الأجنبي، موسوعة الموصل الحضارية، جامعة الموصل ١٩٩١، ج: ١، لا: ١٣٣.
٢٢- إبراهيم، منطقة الموصل في فترة الاحتلال الأجنبي، سەرچاوەی پێشوو، لا: ١٣٣.
٢٣- باقر: طه... واخرون، تاريخ إيران القديم، بغداد- ١٩٨٠، لا: ٧٦.
٢٤- إبراهيم، منطقة الموصل في فترة الاحتلال الأجنبي، لا: ١٣٤.
٢٥- رينفون: حملة عشرة الاف فارس، ترجمة يعقوب افرام منصور، بغداد- ١٩٨٥.
٢٦- الناصري: سيد احمد علي، تاريخ وحضارة مصر والشرق الأدني في العصر الهلينسيني القاهرة ١٩٩٢، لا: ٧٨-٧٩.
٢٧- إبراهيم، منطقة الموصل في فترة الاحتلال الأجنبي، لا: ١٣٤.
٢٨- إبراهيم: جابر خليل، تكريت في خلال المصادر الأثرية، المذرخ العربي، العدد ٣٤، لسنة ١٩٨٨، لا: ٢٩٨.
٢٩- باقر، طه، المقدمة، ج: ٢، ص: ٤٤٥ واريان، لا: ٢٦٩.
٣٠- باقر، المقدمة، ج:٢، لا: ٤٤٥.
٣١- جميل فؤاد، لا: ٢٣٠-٢٣١.
٣٢- باقر، المقدمة، لا: ٤٤٥.
٣٣- الناصری، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٠.
٣٤- جميل: فؤاد، سەرچاوەی پێشوو، لا: ٢٣١.
٣٥- أهم معركتين التي حسمت مشاحنات هؤلاء الورثة معركة السيوس في إقليم فريجيا في آسيا الصغرى عام ٣٠١ ق.م ومعركة كوروبيديوم (أي معركة سهل قورش) في صيف عام ٢٨١ ق.م. ينظر الناصري، سەرچاوەی پێشوو، لا:٩٨-١٠٢.
٣٦- هەمان سەرچاوە، لا: ٩٥-٩٦.

# هەولێر لە نووسراوەکانی یۆنانی و رۆمانیدا

نوری بوتروس

گریک و رۆمانەکان هەر لە کۆنەوە چاویان بڕیبووە وڵاتانی رۆژهەڵات بە گشتی و وڵاتی نێوان هەردوو زێ بەتایبەتی. کوردستانیش یەکێک بووە لەو ناوچانەی کەوتبووە ناو چوارچێوەی ئەو چاوتێبڕینانە، بەتایبەتیش هەندێ ناوچەی کوردستان بایەخی ستراتیژییان لەو چاوتێبڕینە هەبوو. ساڵی (٣٣١) ی پێش زایینیش سەرەتای دەستپێکردنی ئەو چاوتێبڕینانە بوو کاتێ، کە ئەسکەندەری گەورە لە دەشتی هەولێر لە گەڵ ئێرانییەکاندا لەشەڕی (گۆکامیلا)بەرەنگاری یەکدی بوونەوە. هەروەها هەولێر لە بەر ئەوەی کەوتبووە سەرە رێی داگیرکارەکانی نێوان موسڵ و کەرکووک لە لایەک و نێوان ناوچە شاخاوییەکان لە لایەکی دیکە ئەو بایەخەی پێدرابوو.

لە نووسراوە کۆنەکانی یۆنانیشدا، بەتایبەتیش نووسراوەکانی زەینەفۆن، ناوی زێی گەورە بە (زاباتس)هاتووە، کەچی بەتلیمۆس ناوی لێناوە (زاب) یان (دیاب) یان (ژئب). بەڵام هیرۆدۆت دەڵێ: حدیاب (ئەربیل) ناوچەیەکی دیارو ناسراو بووە و پێیان گوتووە (کردوکی) یان (کوردنیی) کە باپیرانی کوردی ئێستانە، کە هەر ئەم ناوەش لە لایەن مێژوونووسانی رۆمان و یۆنانەوە بەسەر کوردە نیشتەجێبووەکانی ئەم ناوچەیە چەسپا، هەروەها شالاوی دە هەزارەی، کە زەینەفۆن لە چیاکانی کوردستان پێشڕەوی کرد چەند ناوێکی تێدا هاتووە و بە بەڵگە سەلمێندراوە ئەو ناوانە لە هەرێمی هەولێردا هەنە، هەروەک باسی ئەوە دەکات کاتێ، کە زەینەفۆن لە زێی گەورە (لە لای گوێڕ) پەڕیوەتەوە، سوپای یۆنانی بە هێواشی لەم ناوچەیەدا بەرەو نەینەوا دەڕۆیشت و دوای چەندین شەڕو پێکدادانی جیا جیا ئەو سوپایە بۆ ئەو چیایانە کشانەوە، کە لەو شالاوەدا ناویان بە (چیاکانی کردوکی) دەبا.

(ستـرابۆن)یش لە ساڵی (٦٦ -٢٤ پێش ز) لە چەند بەشێکی کتێبەکەی خۆی (جوگرافیا) باسی چەند بەشێکی هەرێمی کوردستان دەکات و لەو کتێبەدا ناوی چەندین شوێنی وەک (ستالا)و (بیناک)و (لاریسا) هاتووە، کە

پەیوەندییان بە ناوچەی هەولێرەوە هەیە، بەڵام شوێنی ئەو ناوچە کوردییانە بە تەواوی دیار نەکردووە، بەڵام شوێنی زێی گەورەی بەو جۆرە دیاری کردووە، کە دەکەوێتە نێوان ئاشوور و ئەربیل و ناویشی ناوە (لیکۆس)، هەروەها ناوی (گوکامیلا)یش بەو جۆرە هاتووە، کە دەکەوێتە نێوان ئەربیل و نەینەوا، لە هەمان کاتیشدا باسی ئەوە دەکات (دیمترۆس) دەکەوێتە باشووری ئەربیل و مێژوونووسەکانیش لەو بڕوایەدان، کە ئەمە (ئاڵتون کۆپری) ئێستایە و لەسەردەمی پاش وەچەی ئووری سێیەم ناوی (شیعروم) بووە.

هەروەها (سترابۆن) بەزێی بچووکی (خوارووی) گوتووە (کاپرۆس) وناوی (بارتاسین)یشی لەو ناوچەیە ناوە کە ئەو زێیەی پێدا دەڕوا.

مێژوونووسی یۆنانی (ئاریان)، کە شاڵاوەکانی ئەسکەندەری تۆمار کردووە و بە یەکێک لە سەرچاوە گرنگەکانی نووسینی مێژووی کۆنی مەمالییەکان لە رۆژهەڵات دادەنرێ، ئەو زانیارییانەی لە سەدەی یەکەمی زایینی نووسیوە و باسی ئەو شەڕە دەکات، کە لە نێوان ئەسکەندەر و دارا لە هەولێر رووی داو لەم بارەیەوە دەڵێ: ئەسکەندەر لە نزیک دەشتی هەولێر سەربازگەی خۆی دامەزراند، کەچی دارا لە گردەکانی دەوروبەری هەولێر (٣٠) میل لە دوژمن دوور بوو.

بە درێژایی شەو هێرشەهێنان بەردەوام بوو تاکو فارسەکان بەرەو هەولێر کشانەوە، کەچی ئەسکەندەر دەیویست بچێتە ناو هەولێر و بە تەواوی دارا لە ناو ببات، بەڵام دارا بەرەو چیاکانی (مادای) کشایەوە و شوێنەواری نەما.. ئەم شاڵاوەی، کە لە ساڵی (٣٣١)ی پێش زایین رووی دا یەکێکە لە شەڕە یەکلاکەرەوەکانی مێژووی کۆن، کە دوای هەولێر ئەسکەندەر بەرەو بابل رۆیشت، هەروەها هێزەکانی ئەسکەندەر لە (ساردس)ی پایتەختی (لیدیا) پەڕینەوە و پاشان چوونە ئەنادۆڵ و ئەنتاکیە و حەلەب و هەتا گەیشتنە (خابوور) و لە پاشان لە شوورەی مادی (السور المادي) بەرەو زێی گەورە پەڕینەوە.

لە نووسراوەکانی مێژوونووسی یۆنانی (هیرۆدۆت)یش باسی چەندین شوێنی جوگرافی کراوە و ئەو مێژوونووسە دەڵێ: (ئەدیابا)، واتە مەبەستی هەولێرە، دەکەوێتە نێوان زێی بچووک و زێی گەورە، کە لە هەندێ سەرچاوەی دیکە ناوی بە (ئەدیابین) هاتووە. بەڵام سەردەرای هێرشە یەک لە دوای یەکەکانی کرانە سەر هەولێر، ئەم شارە بە درێژایی ئەو ماوە مێژووییانە هەر دانیشتوانی تێدا نیشتەجێ بووە و بەشێک بووە لە ئیمپراتۆریەتی (ماد)، هەروەک ئاریان لە نووسینەکانی خۆی دەڵێ: (میدیا) لە رۆژهەڵاتی کۆندا - دوای میسری فیرعەونی و بابلی کلدانی لیدیا - چوارەمین ئیمپراتۆریەتی گەورە بووە و (کەی ئەخسار)یش گەورەترین پاشای ئەم ئیمپراتۆریەتە بووە.

هەروەها (هیرۆدۆت) دەڵێ، شەڕی ئەربیل رێگای لە بەردەم ئەسکەندەر واڵا کرد بۆ ئەوەی بەرەو هیندو پاشان بەرەو وڵاتانی رۆژهەڵات بڕوات.

سەرچاوە کۆنەکانی رۆمانیش باسی ئەوە دەکەن، کە هەرێمی ئەدیابین - دوای ئەسکەندەر - لە ساڵی (٣١٢ تا کو ١٣٥)ی پێش زایین کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی (سلوقی)و پاشانیش کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی (فورسییەکانی ئەرشاق). لەساڵی (٨٣)ی زایینیش کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی پاشای ئەرمینیا (تیکرانی یەکەم) هەروەها سەرچاوە رۆمانییەکان باسی ئەوە دەکەن کە ئیمپراتۆری رۆمانی (تراجان) توانی چەند بەلەمێک لە (ئەنتاکیە) بۆ

(نەسیبین)و لە وێشەوە بۆ (دوورگەی ئیبن عومەر) بهێنێ و لە دیجلە بپەڕێتەوە و بە ڕێگای نەینەوا بەرەو حدیاب بڕوات.

لێرەدا دەتوانین بڵێین کە هۆکارە جوگرافییەکان شانبەشانی واقیعی سیاسی و نەتەوەیی لەوانەیە ڕۆڵی خۆیان لە ناونانی شوێن و شارەکاندا بگێڕن، چونکە ئەو مێژوو نووسانەی (وەک - کیرسیلۆس و میدیس) لەگەڵ شالاوەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی بوون ناوی (حدیاب)و (ئامەد)و (نەینەوا)و (ئەربیلا)یان هێناوە.

ئەو سەرچاوانە باسی ئەوە دەکەن، کە هۆزە میدییەکان هەر لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینەوە چوونەتە ناو ئەربیل، بۆیە هەولێر و قەڵاکەی بە ناوچەیەکی میدیایی دانراوە، چونکە هۆزەکانی زاگرۆس ئەو کاتە لێی نیشتەجێ بوونە، کە لە دەریاچەی ورمێ و زنجانەوە بۆ ئەو ناوچەیە باریان کردووە.. دکتۆر (جەمال ڕەشید)یش لەم بارەوە دەڵێ مێژوونووسانی یۆنان ناوی (کوردینی)یان لەو ناوچانە ناوە، کە بە زاری کرمانجی باکوور دواون و ئەمەش بە ڕوونی لە زاری باشووری تایبەت بە ناوچەی هەولێر بەدیار دەکەوێ.

ئەربیل (حدیاب) هەروەک سەرچاوە یۆنانییەکان دەڵێن شوێنێکی جوگرافی گرنگی هەیە، بەتایبەتیش ئەو ڕێگایەی ناوی (ڕێگای پاشایە)و شاری هەولێر بە ڕەواندزەوە دەبەستێتەوە، واتە ئەو ڕێگایەی داریۆس پێدا بەرەو ئێران رایکرد، کە (هیرۆدۆت) باسی دەکات و دەڵێ، لە کۆتایی هەر چوار فەرسەخێکی ئەم ڕێگایەدا وێستگەیەکی کاروان سەرا پاشایی و چەندین خانی فراوان هەبوو، هەروەها ئەم ڕێگایە بە چەندین ناوچەی پڕ دانیشتواندا تێدەپەڕێ.. (ڕێگای پاشا)ش دەبووە سێ لق، لقی یەکەمیان بە کەرکووک و تەیسەفونی پایتەختدا بەرەو باشوور دەڕۆیشت، لقی دووەمیش بە (نەسیبین)و (ڕەها)و بەرەو ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی دەڕۆیشت، کەچی لقی سێیەم بەرەو (مەخموور) و (حەزەر) و (جەزیرە) دەڕۆیشت، (ئەربل)یش لەو سەردەمەدا شوێنی بە یەکگەیشتنی ڕێگا بازرگانییەکان بووە و چەندین وێستگەی بازرگانی هەبووە.

(ئوسابیۆس)ی قەیسەریش، کە مێژوونووسێکی ڕۆمانی بوو، دەڵێ بازرگانی نێوان (ئەربل)و (ڕەها)و (ئەنتیکیە) لە سەدەی یەکەمی زایینیدا لە پلەیەکی بەرزدا بوو، بۆیە حدیاب (ئەربل) چەقی بە یەکگەیشتنی شارستانییە جیاجیاکان بوو، دوای ئەوەی ڕێگای سوسە - ئەربیل - ساردس کرایەوە.

(هیرۆدۆت)یش یەکێک بوو لە سەرووی ئەو نووسەرە کلاسیکییانەی، کە لە نووسینەکانیاندا بایەخیان بە کاروباری ڕۆژهەڵات و گەلانی ڕۆژهەڵات و داب و نەریت و ئایینەکانیان داوە. هەروەها نووسینەکانی (زەینەفۆن)یش دەربارەی باسکردنی ناوچە جوگرافی و ناوی شارەکان و دابونەریتی گەلانی ڕۆژهەڵات گرنگن و بە تایبەتیش لە نووسینەکانی ئەم نووسەرە ئاماژە بە کوردو کوردستان کراوە و بەشێکی تایبەت لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە کوردستان و شەڕی نێوان فورس و یۆنان تەرخان کراوە، کە لە سەر خاکی کوردستان ڕووی داوە. سەبارەت بە نووسەرانی ڕۆمانیش، دیارترین مێژوونووسیان (ئەمیانوس)ە، کە لە شەڕی ڕۆمانەکان دژی (شاپوور)ی پاشای فارسەکان بەشداری کردووە و باسی ئەو شەڕە دەکات و زۆر بە وردی یەکە یەکەی پلانەکانی ئەو جەنگانە دەداتە دەست خوێنەر.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (هەولێر) ژمارە ١٦ ی پایزی ٢٠٠٢ وەرگیراوە.

# شانشینی حەدیاب

## زوبێر بیلال ئیسماعیل

شارەوانی هەولێر کە دەکەوێتە نێوان ئەو دوو رووبارەی بەزاب دەناسرێن، هەر لەکۆنەوە مەڵبەندی ئەو هەرێمە بووە، کە ئەو دوو رووبارەی دەکەونە سنووری باکوور و باشووریەوە، دێر زەمانیش ئەم هەرێمە بە پایتەخت ناسرابوو و پێیان دەگوت (ئاریلیتس)یا بە ناوی هەردوو زابەوە پێیان دەگوت (ئادیابێن) یا حەدیاب، کە خەڵکی شامێ وایان پێ دەگوت.

لەوانەیە وشەی ئادیابێن (حەدیاب) لە وشەی (زابەین) (هەردوو زابەکان- وەرگێڕ) هاتبێ، چونکە لە زمانی ئارامیدا زاب بەشێوەی (ذب) دەبێژرێ، بەم جۆرە مانای حەدیاب و ئادیابێن دەکاتە هەرێمی هەردوو زابەکان. هەرێمی حەدیابیش لەرووی جوگرافییەوە زۆری نامێنێ بەشی زۆر وڵاتی کۆنی ئاشووری بگرێتەوە، تەنانەت هەندێ جار ناوی (ئاشووریا)، واتە وڵاتی ئاشووری لێنراوە.

نووسراوەکانی لاتینیش (حەدیاب)یان لەگەڵ ناوی ئاشووری کۆن پێلۆز کردووە، وەکو وتیشمان حەدیاب وشەیەکی ئارامییە لەناوی هەردوو زابەوە هاتووە، کە لە سەرەتای دامەزرانییەوە هەردوو سنووری باکوور و باشووری گرتبوو. (هێرۆدۆس)یش باسی ئادیابێن= حەدیابی لە سەردەمی پێنجەمی پێش زایینەوە کردووە و وتوویەتی: ئەم ناوچەیە بەرفراوانییەکی چاک بەلای باشوور دەخاتە سەر ئەرمێنیا، بەم چەشنە رووبەرێکی فراوان، کە بەشێکی ئاشوور مادە (میدیا)یە دەداتە پاڵ خۆی. ئەم ناوچەیە چوار ئاودرۆی یەکدی بری تێدایە کە دەبێ بەهۆی قایخانەوە لێی بپەڕنەوە: یەکەمیان دیجلەیە و دووەم و سێیەمیشیان یەک ناویان هەیە لەگەڵ ئەوەی دوو رووباری جیاوازیشن و لەیەک سەرچاوەیشەوە هەڵناقوڵێن، چونکە یەکەمیان لە ئەرمینیاوە هەڵدەقوڵێ، کەچی دووەمیان لە وڵاتی ماتین (المادین)ەوە هەڵدەقوڵێ.. چوارەمیشیان پێی دەگوترێ (جندیر).

گومانیشی تێدا نییە، کە مەبەست لە هەردوو رووبارەکەی یەک ناویان هەیە و جیاوازن و لەیەک جێگاوە نایێن، هەردوو زابەکانە: زابی سەروو و زابی خواروو، بەڵام رووباری چوارەم (جندیر) ئەویش رووباری دیالەیە، ئەمەو شایانی باسیشە کە هەردوو زابەکە لە نووسراوە ئاشووریيەکانیشدا هاتووە هەر ئەو ناوە هاوبەشەیان هەبووە، (زەینەفوون)یش سەدەی چوارەمی پ.ز رووباری زاب (زاباتس) و دیابای پێ گوتووە، کە (زاب) و (دیاب)یش پێک دەچن.

وڵاتناسەکانی عەرەب و سەرچاوە عەرەبییەکانیش بە (حەدیاب) یان گوتووە. (حەزە) وا دیارە ئەو ناوەیش لە کورتکردنەوەی حەدیابەوە هاتووە.

یاقووتی حەمەوی (کە لە ٦٢٦ی کۆچی مردووە)، باسی (حەزەی) کردووە، گوتوویەتی: (شارۆچکەیەکە لە نزیک ئەربل لەخاکی موسڵدا.. کە پێشان مەڵبەندی کوردەی ئیربل بووە). تا ئێستاش یەکێک لە گوندەکانی دەشتی هەولێر ناوی حەزەی پێوەماوە، ئەویش گوندێ دەناسراو پێی دەگوترا کراسی حەزیە، رەنگە ناوی (حەزیە)ش، کە خەڵکی هەولێر بە دشداشەی دەڵێن پەیوەندی بەو کراسانەوە هەبێ، هەولێریش، کە بنکەی حەدیابە، تاکە شاری ئاشوور بوو، کە جێی نیشتەنێکی ئاوەدان

بوو تا ئەمڕۆش هەر بەو ناوە دەناسرێتەوە، ناوی هەولێریش لە نووسراوە بزمارییەکاندا لە سەردەمە جیا جیاکانی (سۆمەری و بابلی و ئاشووری) و هەروەها نەخشراوی فارسییەکانیش، کە بەخەتی بزماری نووسراون هاتووە...، ئەوە بێجگە لە سەرچاوە دێرینەکانی گریکی.

شانشینی حەدیاب: ئاشووری و میدی و کیانی و گریک و حوکمی حەدیاب و پایتەختەکەیان (هەولێر) کردووە. ئەو هەرێمە و هەولێری پایتەختی لە وەختی ئاشوورییەکاندا تەواو بووژابووەوە، بەلام رووخانی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری سالی (٦١٢پ.ز) بوو بەهۆی ئەوەی میدییەکان دەست بە سەر حەدیاب و پایتەختە ئایینەکەی (هەولێر)دا بگرن و حوکمی فارسانیش، کە بەدوای حوکمی میدییەوە هات لە ئەنجامی داگیرکردنی هەولێر لەلایەن ئەسکەندەرەوە سالی ٣٣١ پ.ز کۆتایی پێ هێنرا، هەر لێرەوەیش گریکەکان هاتنە رۆژهەلات و حەدیابیشیان خستە ژێر دەستی خۆیانەوە، حوکمی گریکەکان دوای مردنی ئەسکەندەر سالی ٣٢٣ پ.ز نزیکەی دوو سەدەی خایاند، پاشانیش فرسییەکان دەستیان بەسەر ئەو هەرێمەدا گرت.

فرییەکانیش ئارین، خەلکی هەرێمی پارسا یان فرسیان، کە دەکەوێتە باکووری ئێران (تا رادەیەک هەرێمی خوراسان دەگرێتەوە)، ئەوانە بە هێرشبردن دەولەتێکی یەکگرتوویان لە دەوروبەری (٢٤٨ پ.ز) دامەزراند.

فرثییەکان دامغانیان (هیکاتۆملیوس) لە پارسیا ماوەی دوو سەدە کرد بە پایتەخت، ئەمەیش بەرلەوەی تیسەفۆن لەسەر کەنارەکانی دیجلەدا بکەن بە پایتەخت، فرسیش لە هۆزەکانی هیندۆ- ئەورووپی بوون و دگەنەوە ئەسکیشییەکان ئەو ناوچەیەش مەیدانی کێشەیەکی دوور و بەر دێژ بووە لە نێوان سلوقییەکانی جێنشینی ئەسکەندەر و فرسییەکان، تا وای لێ هات فرسییەکان بە تەنیا حوکمی عێراقییان کەوتە دەست سالی ١٣٩ پ.ز لە وەختی شایەکەیان مترادسی یەکەم.

ئیمپراتۆریەتی فرسیش لە چەند هەرێم و میرنشینێکی نیمچە سەربەخۆ پێکهاتبوو، کە سەر بە تیسفۆنی پایتەخت و شای فرسی بوون و پەیوەندییان پێوەی هەبوو.

شانشینی حەدیاب، لەو شانشینە گرنگانە بوو، کە تا رادەیەکی زۆر سەربەخۆ بوو، شایانی باسە ئیمپراتۆریەتی فرسی لە چەند شانشینێکی نیمچە سەربەخۆ پێکهاتبوو، بە واتا سەربەخۆ حوکمیان دەکرد. ئەگەرچی سەر بەشای فرسیش بوو لە پایتەختەکەیدا (طیسفون) دەگونجێ هەر بەو هۆیەوە مێژوونووسانی عارەب سەردەمی فرسیان بە سەردەمی (ملوک الطوائف) ناوبردبێ، لێرەدا جێی باسە، کە چەند تێکستێکی فرسی لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا لە ناوچەی هەورامان نزیک هەلەبجە (کە ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانی پارێزراوە) دۆزراونەتەوە (بڕوانە طه باقر، جولات تاريخية بين مواطن الاثار في شمال العراق، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەشی یەکەم ٩٧٥ ل ٦٤٥).

شانشینی حەدیاب لە ناوچەی ئاشووری کۆن دامەزراو، لە سەدەی یەکەمی زایینییەوە بووژایەوە.. ئەم میرنش دوو زێیانینە لەنێوەی دووەمی سەدەی دووەمی (پ.ز)ەوە دەرکەوت، لە سەرەتاشدا لەنێوان هەردوو زابەکانەوە (گەورە و بچووک) دەرنەدەچوو پاشان لە نەشونماو گەشەسەندندا بەردەوام بوو تاکو گەیشتە ئەوپەڕی فراوانی سەربەخۆیی تەواو لە سەدەی یەکەمی زایینیدا، ئیتر دەسەلاتی فراوانتر بوو و بەسەر گشت ناوچەی (نەسیبین و حەران و ماردین و بەشێک لە ولاتی ئەرمینیای گرتووە)، تەنانەت هەندێ لە توێژەرەکان لایان وایە دەسەلاتی بەسەر شاری (حضر)ی عەرەبیشدا شکابێ پایتەختی میرنشینەکەیش شاری هەولێر بوو..

شانشینی حەدیاب لەو شانشینە گرنگانە بوو، کە سەربەخۆییەکی چاکی هەبوو لە حوکمکردندا، بە تایبەتی لە وەختی شای فرسییەکان ئیفراهاتی سێهەم (فرائس) ٧٠-٧٥پ.ز و شایەکانی بنەچەکەی فرسی خۆیان لە لایەک و شەڕ و شۆڕیشیان لەگەل رۆمان و شایەکانی ئەرمینیا لە لایەکی ترەوە، رێی بۆ

ئەو هەرێمانەی سەر بە ئیمپراتۆرییەکە بوون خۆش کرد، کە دەسەڵات و سەربەخۆییەک پەیدا بکەن، بەم جۆرە شانشینی حەدیاب لە سەدەی یەکەمی زایینی سەربەخۆییەکی تا رادەیەک تەواوی لە سەردەمی شائیزاتی سێیەمدا دابین کرد.

**پادشایەکی حەدیاب:**

**١- (ئیزات)ی یەکەم و دووەم:**

ئێمە هیچ دەربارەی ئەو دوو پادشایە نازانین جگە لەوەی ئیزاتی سێیەم ئەوە دەسەلمێنێ، کە پێش ئیزاتی سێیەم شا هەبوون، لەو شایانەش دووانییان ناویان ئیزات بووە.

**٢- مۆنابازوسی یەکەم:**

ئەمەیش لەو شایانەیە کە بۆ یەکەم جار حوکمی حەدیابیان کردووە، ئەو شایە (هێلانە)ی خوشکی هێناوە، وا دیارە لای بتپەرستەکان حەڵاڵ بووە کەسێ خوشکی خۆی بێنێ، ئەو شایە پێش ئەوەی (هێلانە)ی خوشکی بێنێ، منداڵی لە ژنێکی دی هەبووە، پاشان کوڕێکیشی لە هێلانە دەبێ و ناوی لێدەنێ ئیزات. جا بۆ مسۆگەرکردنی سەلامەتی ئەو کوڕە و لە ترسی ئەوەی نەبادا زڕ براکانی غەدرێکی لێ بکەن، لە دوای ئەوەی دەبێ بە میراتگر و جێنشینی شانشینەکە نێردرایە شاری (کاراکس- باسینۆ)، لەوێ لەسەر دەستی بازرگانێک بووە

بە جوولەکە، داکیشی هەر بەو جۆرە لەسەر دەستی بازرگانێکی دی بوو بە جوولەکە، کە ئیزاتیش هاتە سەر تەختی شانشینی ئەدیاب ساڵی ٣٦ی دوای زاین، برایەکانی بە بارمتە ناردیانە رۆما و فرسیا، ئا ئەم ئیزاتەیە، کە بە ئیزاتی سێیەم ناسراوە، ئەم بنەماڵە لەدین وەرگەڕاوە لەنێوان ساڵانی ٣٦، ١١٥ی زایینی حوکمیان لە حەدیابدا گێڕاوە تا ئەوەی بە دەستی (تراجان) کۆر بوونەتەوە.

**ئیزاتی سێیەم: (٣٦- ٦٠ز)**

لەنێو شایەکانی حەدیابدا سێ شا هەبوو، کە بە ئیزات ناسرابوون سێیەم (ئارتابانۆس) ١١- ٣٨ز هاوچەرخ بوو.

لە هەموو شاکانیش بەناوبانگتر بوو، لەشای فرسییەکانەوە نزیک بوو. بەختێکی چاکی لای ئەو شایە هەبوو، چونکە لە وەختێ یارمەتی دابوو بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر تەختی خۆی، کە لەبەر دەستی میرە فرسییە بەرهەڵستکارەکاندا بوو، لەباتی ئەوەش ناوچەی نەسیبین بەشێک لە شانشینی ئەرمینیای پێ بەخشی و رێگای پێدا، کە تاجی بەرزی بە تەنتەنە بپۆشێ و لەسەر پێخەفێکی زێڕینیش بنوێ، ئەم دوو بەخشینەش تەنیا تایبەت بە شایی شایەکانی فرسی بوو.

وا رێککەوت دوای هاتنەسەر حوکمی ئیزات و فەرمانگێڕانی لە شانشینی حەدیابدا بە نزیکەی ساڵێک، واتە (لە ساڵی (٣٧ی.ز)

هەندێ لە شۆڕشگێڕەکان توانییان شای فرسیا (ئەرتەبانی سێیەم) لەسەر تەختی پادشایەتی فرسیدا بگرن و میرێکی دیکەی لەباتی دابنێن، کە پێیان دەگوت (سینامۆس).

بەم جۆرە ئەرتەبان پەنای بۆ شانشینی حەدیاب برد، ئیزاتیش رێزێکی زۆری لێنا میوانداریەکی چاکی کردو هەموو یارمەتییەکیشی دا، کە داوای کردبوو، پاشان ئەرتەبان توانی دەسەڵاتی فرسیا بگێڕێتەوە دەست، ئیدی پاداشتی ئیزاتی دایەوە، بەوەی ناوچەی نەسیبین و بەشێکی لە ئەرمینیای خستەپاڵ شانشینەکەی، شوێن و پایەکی بەرز و رێزیشی لە دەوڵەتی (فرسی)دا پێدا.

ئینجا دوای ئەم رووداوە وا رێککەوت کێشەیەکی دیکە لەسەر حوکم لە فرسیادا لەنێوان (متردیات)، کە دوای ئەرتەبانی سێیەم هاتبوو، هەروەها (وردان ڤاردانیس) روویدا، ڤاردانیسیش دژی (متردیات) داوای یارمەتی لە ئیزات کرد، بەڵام ئیزات لەوە دەترسا شکەستی بێنێ، داواکەی رەت کردەوە و ئەوەش پاڵی بە (وردان)ەوە نا، کە بە سوپاکەی میرنیشینی حەدیاب داگیر بکا، بەڵام هێرشی جۆنازری برای (گۆنازریسی دووەم ٣٨-٥١ز) دژی وردان بوو بەکۆسپ لەرێی داگیرکردنی حەدیاب.

کێشەی نێوان هەردوو براش (وردان و جۆناس چەند ساڵێک

بەردەوام بوو تا مردنی (وردان)، نزیکەی ساڵی (٤٧ یان ٤٨) پاشان کێشەیەکی تر لەسەر تەختی پادشایەتی لەنێوان (متردیات و جۆناس) پەیدا بوو، ئەویش چەند ساڵێکی خایاند تا لەساڵی (٥٠ی زایینی) کۆتایی پێهات، بەوەی جۆناس بێ ئەوەی کەسی لەبەر راوەستێ هاتە سەر حوکم، بەڵام ساڵی پاشی مردو دوای ئەویش ئۆلگاسی یەکەم (ڤۆلۆگاسیس) ٥١-٧٨ی.ز. هاتە سەرحوکم، سۆن پەنجەی بۆ کێشەی نێوان مهردات و برایەکەی راکێشاوە، گوتوویەتی: مهردات کە میرێکی (فرسییە) ساڵی (٤٩)ی زایینی ئاوارەی رۆمایە لەسەر فەرمانڕەوایەتی لەگەڵ شای فرسی دەکەوێتە ململانێ و لەنزیک هەولێریش پێی دەگات، بەڵام لەبەرئەوەی ئیزات پەیمانی خۆی بە یارمەتیدانی، دەشکێنی تووشی شکەستی دەبێ).

ئۆلگاسی یەکەم، هێرشێکی بردەسەر ئەرمینیا، کە هەڕەشەی پێ لە شانشینی حەدیاب بکات، بەڵام هێرشەکەی تووشی هێرشێکی رۆمانی بوو ئەوانیش رووبەڕوو لەدژی ئەرمینیا بە پێشەوایەتی کۆربۆلۆ ساڵی ٥٧-٥٨ی زایینی.

رۆمانییەکان توانییان ساڵی ٦٠ی زایینی ئەرمینیا داگیر بکەن، بە تیغ تیخەدانی رۆمانیش تێکران (دێکران)ی پێنجەم کە رۆمانییەکان کردبوویانە پادشای ئەرمینیا، هێرشێکی هێنایە سەر میرنشینی حەدیاب، لەو ماوەیەدا ئیزاتی شای حەدیاب مرد و مونابازۆسی دووەم جێگای گرتەوە.

**٤- مۆنابازۆسی دووەم:**

مۆنابازۆسی دووەم هاواری بۆ ئۆلگاسی یەکەم برد، کە ئەویش بە پەلە هاتە حەدیاب بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی تێکران، لەپاش شەڕێکی بێ ئەنجامدا هەردوولا بڕیاریان لەسەر پەیمانێک داو کۆربۆلۆش رێککەوتنێکی لەگەڵ فرسییەکان و حەدیابییەکانی هاوپەیمانیان بەست ساڵی ٦٣ی ز، شایانی باسە هێرشی تکرانی پێنجەم (کە نیرۆن ئیمپراتۆری رۆمانی کردبوویە شای ئەرمینیا) حەدیابی لە ساڵی ٦٢ی.ز داگیرکرد، بەوەی (کە ئۆلگاسی یەکەم شای فرسییەکان لەوێ نەبوو) تا رادەیەکی زۆر تەنگی بە دانیشتوانەکە هەڵچنی بەم جۆرە دانیشتوانی حەدیاب بۆ ئۆلگاس (ڤۆلکاسیس)یان نووسیبوو دەردی خۆیان پێ راگەیاندبوو هەڕەشەی ئەوەشیان لێ کردبوو، کە ئەگەر لە دەست ئەو رزگاریان نەکات دەچنە پاڵ رۆمانەکان، ڤۆلکاسیش یەکسەر داواکەی قبوڵ کردن و تەپڵی شەڕی لەگەڵ ئەرمینیا و رۆمان لێدا و ماتۆباز (مۆنابازۆس)ی پادشای ئادیابین (حەدیاب)یشی کردە پێشەواو، بەم جۆرە تکرانی دەرکرد و وڵاتەکەشی (ئەرمینیا)ی داگیر کرد.

**٥- شوهرات و ترسای:**

لە مێژووی هەولێردا (ئەمەش کتێبێکە بەزمانی سریانی نووسراوە باسی مێژووی هەولێر دەکات لەڕووی ئاینییەوە)، کە دانەرەکەی (مشیخازخا)یە، ناوی هەندێکی دیکەی لە شایەکانی حەدیابی بردووە، لەوانەیش (شوهرات و ترسای) ئەو ترسایە لە سەرەتای سەدەی سێیەمی زایینی حوکمی کردووە هەر لە کاتی فەرمانڕەوایی ئەویشدا شەڕێک لەنێوان ئۆلگاس (ڤۆلگاسیس)ی چوارەم (١٩١-٢٠٨ی.ز) پادشای فرثییەکان تێکشکان، تاڵاوی نوشوستییان دەرخوارد درا، دوای ئەوانیش فارس هاتن پاشان ئۆلگاسی چوارەم هێزی خۆی کۆکردەوە، هێرشێکی هێنایەوە سەر دوژمنەکانی تا گوڵی قەزوینێ سەرادوی نان و خەڵکێکی زۆریشی لێ کوشتن، لەو شەڕەدا ترسای لەقسەی فرسییەکان چووبووە دەرێ، بەمەش لێی لەرک راچووبوون، بۆیە کە بەسەرکەوت، دوای گەڕانەوە هێرشیان بردەسەر حەدیاب و شارەکانیان وێران کرد و بەتاڵانیان بردن ترسایشیان هاوێشتە رووباری زابی گەورە و خنکا.

**٦- ئاسلۆ**

پەیکەرێکی مەرمەڕیان لە پادشاکانی حەدیابەوە لە شاری (حەزەر)دا دۆزیوەتەوە، کە لە پەرستگای سێیەم ئەوەی تایبەت بوو بە پەرستنی (بعل شمین) سەیدی

سـەمـاوات: خـوداوەندی سـەرەکی دانیشـتـوانی (حەزەر) دانرابوو. ئەو نووسینە ئارامییەی لەسەر پێی ئەو پەیکەرە نەخشێنراوە، ئەوە نیشـان دەدا، کـە پادشـای یەکـێـک لە مـەڵبـەندەکـانی حـەدیاب بووە، کـە مـیـرنشـینی حـەدیاب لایەنگـیـری حوکمی فرسییەکان بوو، هەر بۆیە پادشـاکـانی حـەدیابیش پشـتـیـان دەگرتن.

ئەو شـانشـینەش رۆڵێکی دیاری لە پەیوەندییە سیاسی و عەسکەرییەکانی رۆژهەڵاتی نزیکدا هەبووە تاوای لێهات لە شەڕەکانیدا یاریدەی فرسییەکانیان دەدا دژ بە رۆمانەکان. بایەخی هەرێمی حەدیابیش لە شوێنی ستراتیژی و بەپیتی ناوچەکەوە هاتبوو. جگە لەوەی کە لای فرسییەکانیش بە رادەیەک پیرۆز بوو، زۆربەی شایەکانیان لە هەولێر دەناشتن.

وەک دەزانین لە ئەنجامی داگیرکردنی (هەولێر)یش لەلایەن ئەسکەندەرەوە ساڵی ٣٣١پ.ز گریکەکان هاتن و رۆژهەڵاتی حەدیابیان کەوتە ژێر دەسەڵات، لەپاش مردنی ئەسکەندەریش ٣٢٣ پ.ز نزیکەی دوو سەدە حوکمیان گێڕا لەدوای ئەوانیش فرسییەکان دەستیان بەسەر ئەو هەرێمە داگرت.

لە ساڵی ٨٣ پ.ز یشدا شای ئەرمینیا (تکرانی دووەم (هەندێ دەڵێن هی یەکەم، ٩٤- ٥٦پ.ز) سوریا و باکووری فەلەستین و حەدیابی سەر بە فرسییەکانیش دووبارە داگیر کردەوە، بەڵام پاشان لە ساڵی ٦٩ پ.ز لەژێر فشاری رۆمانەکان لە سوریا و فەلەستین کشایەوە. دوای حەدیابیش لە ساڵی ٦٤پ.ز. لەکاتی حوکمڕانی پادشای فرسی ئیفراهاتی سێیەم = فرئل ئتس = فەرهاد (٧٠-٥٧ پ.ز) بەجێ هێشت، بەم جۆرە حەدیاب هاتەوە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی فرسی.

ئێمە پەنجەمان بۆ هێرشی تکرانی پێنجەم بۆ سەر حەدیابدا. ساڵی ٦٢ز راکێشا، چونکە رۆمانەکان زیاد لە پێویست تەماح گرتبوونی.

بۆیە شانشین ئەمێنیایان هان دەدا بەوەی لە حەدیاب نزیک بوو، کە ئاژاوەی تێدا بنێنەوە، داگیری بکەن، کاتێ بەم هۆیەوەش سەرنەکەوتن خۆیان هاتنەپێش و لەساڵی ١١٥ز تراجان پاش بەرەنگارییەکی توند، کە لە رێگادا بۆ تەیسفوون دەچوو حەدیابی داگیر کرد و تەخت و تاجی زێرینی لە پایتەختی فرسییەکان کەوتە دەست.

بەڵام فرسییەکان دوای مردنی تراجان ساڵی ١١٧ی.ز حەدیابیان هێنایەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، بەوەی جێنشین تراجان کە ناوی (هدریان) بوو وازی لە حوکمی هەرێمەکە هێنا.

بەڵام رۆمانەکان هەر چاویان تێ بڕیبوو هیوایان دانەنابوو، کە لە دەوڵەتی فرسی بکەنەوە، بۆیە (سفیرۆس) لە ساڵی ١٩٦ هێرشی بۆ هێنا، بەڵام ئۆلگاسی چوارەم توانی بەربەرچی بداتەوە و بیگەڕێنێتەوە، کەچی ئەوە رێی سفیروسی (ئیمپراتۆری رۆمانی) نەگرت، کە هەوڵێکی تر بداتەوە.

بۆیە هێرشێکی دیکەی لە ساڵی پاشیدا کردەوە سەری، ئەمجارە توانی دەستی بەسەردا بگرێ و بیخاتە پاڵ ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی و نازناوی ئادیابینووسی وەرگرت، کە بە مانای (خاوەنی حەدیاب) دێت.

وا دیارە حەدیاب جارێکی دیکە لەژێر دەستی رۆمانەکان هاتەوە دەرەوە. بەڵام ئەوانیش هەر وازیان نەهێنا.

ئەوە لەکاتی کراکالا (٢١١-٢١٧ز)دا رۆمانەکان هاتنەوە سەر حەدیاب هەر بە پێشەوایەتی خۆشی دوای ئەوەی لە هێرشی تەیسفوون ساڵی ٢١٦ز گەڕایەوە کراکالا، هات گۆڕی پادشایە فرسییەکانی لە هەولێر هەڵدانەوە هەتکی کردن، کە ئەوەش ئیهانەیەکی گەورە بوو بۆ فرسییەکان، کەوا چاوەڕێی هەلێک بوون بۆ تۆڵەسەندنەوە. ناخۆشی نێوان فرسی و رۆمانەکانیش بەسەر دانەواندنی مەکرینوسی جێنشینی کراکالا دوایی پێ هات (مەکرینۆس) ماڵێکی زۆری لەبریتی هەتککردنی گۆڕی شایە فرسییەکان دا.

١٠ ساڵ پاش ئەم رووداوە بنەچەکەی فارسی ساسانی لەسەر دەستی ئەردەشێردا دامەزرا، ساڵی (٢٢٦)ی زایینی رۆمانەکانی لە هەرێمی هەولێر دەرکرد، حوکمی فرسییەکان لە وەختی دوا شایان (ئەرتەبانی پێنجەم) (٢٠٨-٢٢٦)ی زایینی، کە سولحی لەگەڵ

ئیمپراتۆری رۆمانی (مەکرینوس) کردبوو، کە مەکرینۆسیش جێنشینی کراکالای ئیمپراتۆر بوو (تەها باقر گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ژمارە (١) ساڵی ١٠٧٥ لاپەڕە ٦٥٢) بەم جۆرە حەدیاب مەڵبەندی، کە هەولێر بوو مەیدانی گەلێک شەڕ و شۆڕ بوو لەنێوان رۆمان و فرسییەکان پاشانیش لەنێوان رۆمان و ساسانییەکان لەکاتی ئەوانیشدا گەشەی سەند و وەکو ئەوەی لەسەردەمی عەرەبی ئیسلامیشدا گەشەی سەند.

لەم بارەیەوە مێژوونووس و ولاتناسە عەرەبەکان وەسفی گەشەسەندنی بازرگانی و قەلا دێرینە بەناوبانگەکەی و مزگەوتەکانی هەولێریان کردووە.

**حەدیاب لەکاتی ساسانییەکاندا (٢٣٦- ٦٣٧ زایینی)**

کاتێ ساسانییەکان لە هەرێمی حەدیاب چەند دەوڵەتۆکەی بتپەرستی تیا دامەزرا، لە حوکمی بارامی دووەم (٢٧٦- ٢٩٣ز) فەرمانڕەوای حەدیاب، کە ناوی (کۆپەر ئاشنەسەب) بوو، فەرمانی شای شکاند و لیی یاخی بوو، قەلا و قونگرێکی قایمی لە شاخدا دروست کرد (٥٦٠) پیاویشی لەدوو بوون، کە کاروانیان رووت دەکردنەوە رێیان دەگرتن و گەلێک گوندیان وێران کردن، بارامیش سەربازی خۆی ناردن لە کۆڵیان بکەنەوە، بەلام گەڕانەوە هیچیان بە هیچ نەکرد، پاشان شا سەربازی دیکەی بە پێشەوایەتی (ژێر ئەسپ) ناردن، بەلام ئەم پێشەوایە بەهۆی ئەوەی فێڵی لە فەرمانڕەوا کرد، گیراو برایە مەدائین و کەوڵیان کرد.

لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا هاتووە، کە دوای ساسانییەکان چەند فەرمانڕەوایەک حوکمیان کردووە و توانیویانە ناوە ناوە سەربەخۆبن، لەوانە (قەردەغ)، کە قەلای مەلقای نزیکی ئۆبلسی کردبووە بارەگا و ساڵی (٣٥٨ی.ز) لەکاتی حوکمی سابووری دووەم. سەبارەت بەوەی ئەوە ببووە فەلە شەهید کرا.

(ئادی شیریش) وتوویەتی کە فردک (قەردەغ) کرا بەحاکمی حەدیاب دەستی بەسەردا دەشکا لە رووباری دیالاوە بگرە تا دەگاتە شاری نەسیبیندا.

هەموو پەرستگا ئاگرییەکانی لە حەدیابدا تێکدا و کلیسەی لەجێ دروست کردن و ئەوەشی بە شاپووری دووەم (٣٠٩- ٣٧٩) راگەیاند، شاپووریشی بۆ (کۆشنازداد) و (دنیکوشناسب)، کە هەردووکیان فەرمانڕەوای ئەو ولاتە بوون کە لەژێر دەسەلاتی (فردک) دابوو نووسی، کە ئایینی ئاگرپەرستی بگەڕێنێتەوە.

فردکیش تەواو خۆی قایم کرد و (بوورزمهیریش) هێرشێکی بۆ هێناو گەمارۆی دا، بەلام بێ هوودە بوو.

تا دواجار (قردل) هەر لە خۆڕا رۆیی و ساڵی ٣٥٩ی.ز بە رەجمکردن بە بەرد کوژرا.

ئەمەش وا دەگەیەنێ کە فەرمانڕەواکانی حەدیاب لەکاتی ساسانییەکاندا سەربەخۆیی خۆیان پاراستووە و هەوڵی ئەوەشیان داوە، کە لە ئیمپراتۆریەتی ساسانی بینەوە. هەندێ گوتوویانە (فردێک) کە یەکێک بووە لە پادشاکانی حەدیاب هەوڵی سەربەخۆیی داوە و ویستوویەتی لەژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ساسانی نەمێنێ، بەلام سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە ساڵی (٣٥٩ی.ز) لەو شەڕەدا کوژراوە، کە بەرگری لە کۆشکەکەی دەکرد.

**فەلایەتی لە حەدیابدا:**

ئەوەی ئێمە بیزانین دەربارەی سەرهەلدانی مەسیحییەت لە دەوڵەتی فرسی شتێکی یەکجار کەمە. لە سەدەی یەکەمی زایینیدا ئاینی مەسیحی لەرێگای شام و ئاسیای بچووکدا بلاوبۆتەوە و لە ساڵی (١٠٠)ی زایینی گرد و گۆیەکی مەسیحی بە گەشەسەندنی دەسەلاتی کلێسەی مەسیحییەکان رۆلێکی گرنگی گێڕا، بە تایبەتیش لەنێو ئەو جوولەکانەی لە (.............) ئاشوورییەکان لە ناوچەکەدا، کە ببوون بە نەستوری.

وا دیارە کراخابیت سلوخ (کەرکووک)یش لەپاش هەولێر لە قەلایە بە هێزەکانی مەسیحیایەتی رۆژهەلات بووە، نەسرانییەکانیش لەکاتی فرسییەکاندا دەورێکی سیاسییان نەبوو، بەلام ئایینی

مەسیحی لە سەردەمی ساسانییەکاندا لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە پادشایەکانی کە دەورێکی چاکیان لە سیاسەتی دەوڵەتدا هەبووە، بەفیتی پیاوەکانی ئایینی مەجوس دوژمنداری ئەو مەسیحیانەیان دەکرد گەشەی سەند.

کۆمەڵێک نووسەری نەسرانیش لە هەولێردا دەژیان، لەوانە یەکێکیان مێژوویەکی هەیە و ناوی (میسحازف) بووە، کە بەمێژووی هەولێر دەناسرێ و بۆ نێوەڕاستی سەدەی شەشەم دەگەڕێتەوە، ئەو کتێبەشی باسی مێژووی ئایینی ویلایەتی (ئەربل) دەکا لە سەرەتای سەدەی دووهەمەوە تاکو نزیکەی ساڵی ٥٥٠ی زایینی، ئەو نووسراوە باسی (مەتران بقیدا) دەکا لە ساڵی ١٠٤- ١١٤ زایینی بوو.

**مترۆپۆلیتی هەولێر:**

نووسەر ناوی گشت قەشەکان و ماوەی مانەوەیان لەسەر تەختی مەترانییەتیدا تۆمار کردووە.

ئەوانەیش ئەمانەن: بەقیدا (شمشون) (ئیسحاق) (ئەبراهام) (نوح) (هابیل) (................) سحلوبا،

بەقیدایش لە قوتابیانی مار (ئادی) بوو لە هەولێر، نووسەری مێژووی هەولێر، پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە، کە مارئادی قوتابی خودیەسیح خۆی بووە، ئینجیلی لە هەولێر و دەوروبەری هەولێر بڵاو کردۆتەوە.

نەسرانییەکان لە سێ سەدەی بەرایەییدا گەلێک کلێسەیان لە حەدیاب و کەرخ سلوخ و میسان دروست کرد و چەند قوتابخانەیەکیشیان لە پاڵدا دامەزراندن.

لە ساڵی ٣٠٠ی زایینیدا جاپلید فافا (پاپای) هەولێر گەیشتە پلەی مەترانی.. ئەو وەختە موسڵ (ئەسقەفییەتێکی) سەر بەوێ بوو ئەو جاثلیقەش (واتە فافای هکاوی) قەشەی سنوقیا (المدائن) کۆمەڵەیەکی مەسیحی لایان برد.

دوای ئەوەی شای ڕۆمانیش قوستەنتین بوو بە مەسیحی و ئەو ئایینەی کردە ئایینی ڕەسمی دەوڵەت لەکاتی شاپووری دووەمدا.

چەوسانەوە تەواوی وڵاتی فارسی گرتەوە. لەبەر ئەوەی دوژمنایەتییەکی کۆن لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا هەبوو ساسانییەکان مەسیحییەکانیان لە وڵاتی فارسدا بە جاسوسی و لایەنگیری ڕۆمانەکان دەزانی، گەلێک زوڵم و زۆریش کرا، کە هەندێکیان بە دەستی فەرمانڕەوایی حەدیاب ئەردەشێرا بوو، بەشی زۆری ئەو ماوەیەش بەدەستی ئەو کوژران، لەوانە هەشت ڕاهیبە و سەد و یانزە کاهینی بەجارێک کوشت، دوای ئەوەی خستینیە بیرێکی تاریکەوە، ژنێکی هەولێر کە ناوی (یەزدانـدوخت) بووهەوڵی دا یارمەتییان بدا، بەڵام بێ سوود بوو، ڕۆژی مردنیشیان هەوڵی دا بیانبینێژێ، لەدواییدا ئەو ئەردەشێرە

بەناوی ئەردەشێری دووەم (٣٧٩-٣٨٣ز) هاتە سەر تەختی ساسانییەکان، بەڵام ئەو پادشایانەی لەدوای ئەودا هاتن سیاسەتی نزیکبوونەوەیان لە پەیوەندیدا لەگەڵ ڕۆمانەکان گرتەبەر، ئەمەش بوو بەهۆی بووژانەوەی مەسیحیایەتی.

هەولێریش بوو بە مەڵبەندی مەتران نشینەکی سەر بە ئەو سلوقیەیەی قەشەی گەورەی تێدا دائەنیشت، مەترانییەتی حەدیابیش دوای هەرەسهێنانی ڕەها (ئودیسا مەڵبەندی سەرەکی کلێسەی ڕۆژهەڵات) گەیشتە ئەوپەڕی، چونکە ئەوکاتە ئازربایجان و خاکی نەینەوا لەزابی بچووکەوە بگرە تا دەگاتە خاپوور و لەسنووری وڵاتی وانێ و دەوروبەری ئەرمینیا و تا دیجلەی دەگرتەوە، بنکەکەشی شاری هەولێر بوو، نۆزدە تەختی قەشایەتی لەژێر دەست دابوو، پاش ماوەیەکیش واتە (لەسەدەی شەشەمی ز) کۆمەڵێک زانای نەسرانی لە حەدیابدا پێگەیشت. لە ئاخر و ئۆخری سەردەمی ساسانییەکانیشدا هێرشەکانی ئیمپراتۆری ڕۆمانی (هرقل) لەخاکی ئێراندا شڵەژانێک دووچاری نەسرانییەکان بوو، زوڵمێکی زۆریان لێ کراو تەنانەت هەندێک پیاویان، کە زۆریش نزیک بوون لە کیسرا کوژران و هەرچی هەیانبوو داگیر کرا.

زۆربەی دانیشتوانی حەدیاب نەسرانی بوون خەڵکی وڵاتەکەش زۆریان لە نەژاددا بتپەرست بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا ئارامییەکانیش بەشێکی بەرچاویان لەدانیشتوانی حەدیاب پێکدەهێنا، زمانی ئارامیش لە بەشی زۆری ئاسیا و وڵاتی شام و جزیرە و ئێراق، زمانێکی باو بوو، تەنانەت نووسینی ئارامی لەو بروانامە نووسراوانەشدا بەکاردەهێنرا کە بە زمانی فارسی بوو.

پیتی ئەلف و بێش لەگەڵ بڵاوبوونەوەی زمانی ئارامیدا بڵاوبووەوە و وای لێهات جێگای خەتی بزماری زەحمەتی گرتەوە و زۆر نەتەوەش زۆر خەتی خۆیان لە خەتی ئارامییەوە وەرگرت.

زمانی عەرەبی هەر لە سەدەی حەفتەمی زایینییەوە زمانی ئارامی نەهێشت تا لەدوایی‌یدا لە سەدەی پانزەی زایینیدا کوێری کردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زمانە هەر لەناو نەچوو، ئێستاش تا ئەمڕۆش لەلای هەندێ کۆمەڵی نەسرانی نێو کوردستان و سووریا و ئێران و ئەرمینیادا هەر ماوە، دیسان ئەوەی گرنگی هەولێرە وەک مەڵبەندێکی ئایینی پێشان دەدا، جاسلیقی نەستووری ساڵی (١٢٦٨ی زایینی) بارەگای خۆی لە بەغداوە هێنایە هەولێر (ئینسکلوپیدیای ئیسلامیدا لاپەڕە ٥٧٣).

هەرێمی حەدیاب و پایتەختەکەی (هەولێر) تا لەناوچوونی دەوڵەتەکەیان و هاتنی ئیسلام لەژێر حوکمی فرسە ساسانییەکاندا مایەوە دوای هاتنی ئیسلامیش خەڵکی حەدیاب بوون بە ئیسلام.

**ئەو شوێنەوارانەی لە سەردەمی حەدیابدا ماونەتەوە:**

میرنشینی حەدیاب کۆمەڵێک شوێنەواری بەجێ هێشتووە، کە ئێستاش لە گۆشە و قوژبنی ئەو شوێنانەدا ماونەتەوە، کە دەسەڵاتی سیاسی ئەو میرنشینەی پێ دەگەیشت، بەڵکو لە دەوروەی ئەو شوێنانەش، وا ئێستاش ژمارەیەک لەو شوێنەوارانە دەخەینە بەرچاو..

**١- داتاشراوی شاخی هەریر:**

ئەو داتاشراوە لەشاخی هەریر (باتاس)، دۆزراوەتەوە باوەڕیش وایە، کە هی شای حەدیاب (ئیزاتی سێیەم) بێ و بۆ یادگاری هەندێ لە سەرکەوتنەکانی ئەو ناوچەیە داتاشرابێ، ئەو داتاشراوە لەرێگای نێوان شەقڵاوە و هەریر (باتاس) بەلای دەستە راست دەبینرێ. داتاشراوێکە بەسەر رووی شاخێکەوەیە، بەرزایی (٥٠) مەتر هەڵکۆڵدراوە درێژی نزیکەی (١/٢م) دەبێت و لەنێو دوو چارچێوەی لاکێشەش گیراوە، کە بریتییە لەوێنەی پیاوێک بەجلکی پادشایەتی، کە شەپقەیەکی قووچی لەسەرە و شەرواڵێکی درێژی لەبەردایە و رمێکی درێژیشی لە تەنیشتە و دەستی راستیشی بۆ پێشەوە درێژ کردووە.

**٢- پەیکەری ئاسلۆی پاشا:**

لە شاری حەزەریش پەیکەری شایەکی حەدیاب دۆزراوەتەوە، کە ناوی ئاسلۆیە، ئەو پەیکەرە لە پەرستگای سێیەمدا بووە، ئەوەی تایبەت بوو بە پەرستنی (بەعل شمین= خوای ئاسمان، خوداوەندی سەرەکی دانیشتوانی حەزەردا)، بوونی ئەو پەیکەرە لە حەزەردا لەو جێگایەشدا ئەوەمان پێ دەڵێ، کە پەرستنی باو باپیران لەلای حەزەرییەکاندا باو بووە، ئەوان رێزی ئەو یادگارانەیان دەگرت، کە سەردەمێ پەیوەندییان بە حەدیابەوە بوو.

ئەو نووسینە ئارامییەی، کە لەسەر پێی پەیکەرەکەدا هەڵکەندراوە ئەوە دەڵێ، کە (ئاسلۆ) پادشای شار یان پاشانشینی (نتۆن- ئاشوری) بووە، کە بە تەواوی شوێنەکەی نازانرێ، بەڵام یەکێک بووە لە مەڵبەندەکانی پاشانشینی حەدیاب، لەوانەیە ئەو شوێنە لەلای ئاڵتوون کۆپرییەوە بووە. (طه باقر- گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ژ/ ١ ل/ ٦٥٠).

**٣- گۆڕی هێلانە:**

بنەماڵەی پادشایەتی لە حەدیابدا ژمارەیەک بینایان لە قودس دروست کرد، لەوانە بارەگایەکی مەزن، شاژنی جوولەکەش هێلانە پادشای حەدیاب سەری لەشاری قودس دا، پێش مردنیشی وەسیەتی کرد گۆڕێکی لە بەردا، بۆ هەڵکەنن، چەند گۆڕێکی لە دەورویشتدا هەڵکەند، لەو شوێنەی کە ئێستا پێی دەگوترێ (گۆڕی سوڵتان) لە بەرامبەر خوێندنگای مەتران لە

قودس، ئێستا نووسراوێک لەسەر گۆڕی هێلانە پادشای حەدیاب لەو گۆڕستانەدا ماوەتەوە، کە بۆ (٥٠-٦٠) زایینی دەگەڕێتەوە لێرەدا پێویستە ئەوەش روون بکەینەوە، کە فەرمانڕەواکانی حەدیاب ئەو پادشانشینەی لەنیوەی دووەمی سەدەی دووەمی پێش زایینی بەدەرکەوت بتپەرست بوون و (میرمۆنا بازۆسیش) هەر بتپەرست بوو، پاشان کوڕەکەی ئیزات و ژنەکەی هێلانە بوون بە جوولەکە، هەموشیان هەر خەڵکی ئەو وڵاتە بوون.


سەرچاوە و پەراوێز:

١- طه باقر و فؤاد سفر: المرشد الى مواطن الاثار- الرحلة الخامسة- بغداد ١٩٦٦- لاپەڕە (٤).

٢- احمد سوسة: ملامح من التاريخ القديم ليهود العراق- بغداد ١٩٧٨ لاپەڕە ٤٥-٤٦ هەروەها سەیری (مسيرة العشرة الاف) بكە وەرگێڕانی ئەندازیار صلاح سعدالله، بەغدا، ١٩٧٣ لاپەڕە ٢٦،٢٤.

٣- طه باقر: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤).

٥- فؤاد سفر و محمد علي مصطفى: الحضر بغداد ١٩٧٤ لاپەڕە (٢٧).

٦- كاراكس سباسینو: پاشان بەكەرخە و كەرخ میسانەوە ناسرا، کە دەڵێن محەمەرەی ئێستا دەگرێتەوە، کە ئەسکەندەر لە سەر یەکاوی رووباری کاروندا دروستی کرد لە (شەتوول عەرەب). پاشان ئانتخۆسی چوارەم (١٧٥-١٦٣ پ.ز) جارێکی تر دروستی کردەوە و هەر بەناوی ئەویش کرا. کە دیسانیش وێران بووە و سباسینس پاشا، کە حوکمی بابل و سلوقییەی کردووە (ساڵی ١٢٧ پ.ز) ئاوەدانی کردەوە و بەناوی خۆشی کرد. بروانە جواد علي، المفصل في تاريخ العرب (٢/١٢-١٣) هەروەها ياقوت- معجم البلدان (٤/٢٥٧).

٧- كریتنسن: هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٥- سليمان الصائغ: تاريخ الموصل- قاهيره ١٩٢٣ (١/١٨).

٨- احمد سوسە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٤٣-٤٤ دەربارەی پادشاكانی فرسیاتی بڕوانە: ليو ئوینهايم بلاد ما بين النهرين وەرگێڕانی: سعدی فیضی بەغدا ١٩٨١ لاپەڕە ٤٥٤- ٤٥٥.

٩- سون: رحله تنكر، وەرگێڕانی فوئاد جەمیل- بەغدا ١٩٧٠ لا ١٤٨.

١٠- علي سيدو گوراني: من عمان الى العماديه، قاهيره لاپەڕە ١١٩ هەروەها (رحله تنكر) لاپەڕە ١٤٨.

١١- سليمان الصائغ: تاريخ الموصل (١/ ٢٠) نقلا عن حضارة و تاريخ اكد واشور ادي شير، بيروت- ١٩١٣ لاپەڕە ١٦٨.

١٢- احمد سوسە: هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٤٧- ٤٨.

١٣- كريستنسن: ايران لاپەڕە (١٥) هەروەها والمرشد الى المواطن الاثار لاپەڕە (٤).

١٤- زبير بلال اسماعيل/ اربيل في ادوارها التاريخية/ النجف ١٩٧٠ ل ١٠٠.

١٥- احمد سوسە: هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٤٩.

١٦- طه باقر: المرشد.. لاپەڕە (٤) هەروەها كلۆدیۆس ريج الى العراق سنه ١٨٢٠. ترجمه بهاء الدين نوری- بەغدا ١٩٥١ لا ٢٤٤ هەروەها رحلة متنكر لاپەڕە ١٤٩.

١٧- ادي شير: كلد و اشور- بيروت ١٩١٣ (٢/١٣).

١٨- دائرة المعارف الاسلامية، جلد الاول، مادة اربل، لاپەڕە- ٥٧١.

١٩- ادر: هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ٨٧-٨٨.

٢٠- احمد سوسە: هەمان سەرچاوە- لا ٤٨.

٢١- كریستنسن: هەمان سەرچاوە لا ٢٥.

٢٢- احمد سوسە: هەمان سەرچاوە- لاپەڕە (٥٠-٨٥).

٢٣- كریستنسن: هەمان سەرچاوە لا ٦٨. مامۆستا منجانا لە لیبزگەوە ساڵی ١٩٠٨ بڵاوی کردۆتەوە.

٢٤- الاشوريون في التاريخ- بيروت ١٩٦٤- لا (٧٠) هەروەها رفائيل بابو اسحاق- تاريخ نصارى العراق- بەغدا ١٩٤٨ لاپەڕە (١١٤).

٢٥- تاريخ نصارى العراق- لاپەڕە ١١٥.

٢٦- كریستن: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥٣).

٢٧- الاشوريون- لا ١١٠.

٢٨- الاشوريون لاپەڕە ٩٧-٩٨.

٢٩- ايران- لاپەڕە ٢٧٣- ٢٧٤.

٣٠- دکتور منجانا دەڵێت: (زۆربەی دانیشتوانی حەدیاب فەلە بوون و گەلێکیشیان لە نەژادا فارس بوون، نەک ئارامی) الاشوريون لاپەڕە ١٠٤.

٣١- طه باقر سفر: مقدمة في تاريخ الحضارات- بەشی دووەم.

٣٢- فؤاد جميل: حدياب اربيلا- مجلة سومر (٢٥) ١٩٦٩ لاپەڕە ٢١٩-٢٥٦.

٣٣- طه باقر: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد جلدی ٣ ژمارە (١) ١٩٧٥ لاپەڕە ٦٤٩.

٣٤- فؤاد سفر: الحضر لاپەڕە (٢٠٨-٢٠٩).

٣٥- احمد سوسە: لا ٤٥، نقلا عن مخطوطات البحر الميت. ل- بيلربرۆز، وەرگێڕانی مەحمود العابدی. عمان لاپەڕە ٢١٢.


و: نەژاد عەزیز سورمێ

# گرنگی ئابووری و سەربازیی شاری هەولێر (سەردەمی ئاشووری نوێ ٩١٢-٦١٢ پ.ز)

دکتۆر نەهلە شەهاب ئەحمەد
کۆلیژی پەروەردە - زانکۆی موسڵ

شاری هەولێر بەیەکێ لەشارە هەرە گرنگە کۆنەکانی عێراق دادەنرێت. کە رەگ و ریشەی بۆ دوورترین چاخی مێژوو و تەنانەت بۆ چاخەکانی پێش مێژوو دەگەرێتەوە. لەلێکۆڵینەوە شوێنەوارییەکان دەرکەوتووە کە ئەو ناوچەیە تایبەتمەندییەکی پێشینەی بەخۆوەیە لەبواری دۆزینەوەی کشتوکاڵ و سەرهەڵدانی سەرەتایی نیشتەجێبوون. لەپاڵ ئەوەش لە بوارە جیا جیاکانی دیکەی ژیان گەشەسەندنی شارستانی بەخۆوە دیوە[1].

ئاشوورییەکان هەر لە زووەوە گرنگیی هەولێریان زانیوە، کە لەسەردەمی شای ئاشووری (ئەدد- یەنراری دووەم ٩٩١-٨٩٠-پ.ز)[2] لەژێر دەسەڵاتی سولتانەکەیان بووە، یەکێ لە سێ شارە سەرەکییەکانیش بووە لەپاڵ نەینەواو ئاشووردا. لەکاتێکدا هەندێکیان لەرووی گرنگی مێژووییەوە بەپلە دووی دادەنێن لەپاش شاری ئاشوور[3] کەوتۆتە ناوچەرگەی هەرێم کە شانشینی ئاشووری تێدا دامەزرا. نزیک بووە لەچوار پایتەختە کۆنەکانی ئاشووری (ئاشوور- نەینەوا- نەمرود- خرساباد). بۆیە بووە جێی بایەخدانی ئاشوورییەکان بەتایبەت لەسەردەمی شا (ئاشوور ناسر بالی دووەم دا ٨٨٣-٨٥٩ پ.ز).کە لەم تۆژینەوەدا تیشک دەخەینە سەر گرنگیی ئابووری و سەربازی.

## بایەخی ئابووری:

پێگەو سروشتی جوگرافیای شاری هەولێر رۆڵێکی گەورەی هەیە لەپێگەی ئابووریدا، بەتایبەت لەبواری کشتوکاڵ و بازرگانیدا. کەوتۆتە سەربانێکی یەک ئاست، ئاستی بەرزی لەسەر رووی دەریا (٤١٥) مەترە، لەنێوان هەردوو زێی گەورەو بچووکدا[4]. کەوتۆتە ناوجەرگەی هەرێمی (حەدیاب) کە شانشینی ئاشووری لەسەر دامەزرا، لەکۆندا بەناوی (ئەربلیتس) ناسراو بوو، یان بەناوی (دوو زێ)، چونکە کەوتۆتە نێوان هەردوو زێیەکە. (پێیان وتووە ئەدیابین. لای خەڵکی شام حەدیب بووە، هەمان ئەو هەرێمەیە کە جوگرافیناسانی عەرەب پێیان وتووە خاکی هەولێر[5] کە بریتییە لەشێوەیەکی نیوە دیارکراو، لای یەکەمی رووباری دیجلەیە، لای دووەم و سێیەمی هەردوو زێی گەورەو بچووکە، لای چوارەمیش زنجیرە چیاکانی زاگرۆسە[6] کە هاو تەریبی زێی دجلەیەیە.

ئەو هەرێمە بەحوکمی ئەوەی بە ناوچەیەکی کشتوکاڵی ناوبانگی دەرکرد، دەشتەکەی پشت بە کشتوکاڵی دێمی دەبەستێت و کشتوکاڵی لێ دەکرێت، وەک گەنم و جۆو گەنمەشامی، بەرهەمێکی زۆریشی دەست دەکەوێت، بەتایبەتی داهاتی گەنم لەدەشتی موسڵ و دەشتی هەولێردا[7]. بەشێوەیەکی چەماوەیی بەرفراوان لەسەر شێوەی حەوز دەردەکەوێت. بەقووڵاییەکی زۆر قوڕو چەو و بەرد نیشتووە، بانەکەشی پێچا وپێچەو دۆڵێ لێ هەڵکەوتووە. ئاوەکەی دەرژێتە هەردوو زێی گەورەو بچووک و بەشەکانی رۆژهەڵات. بەرزاییەکەی دەگاتە نێوان (٤٨٠-٥٥٠) مەتر. لەکاتێکدا لای رۆژئاوای بەرزاییەکەی دەگاتە نزیکەی (٣٠٠) مەتر. ئاوێکی زۆری ژێر زەویشی هەیەو لەسەر شێوەی کانی و بیر دەردەکەوێت، چونکە بەردی کلس لەزنجیرە چیاکانی دەوروبەردا دەردەکەوێت، وەک: بیرام و سەفینکە بۆ دەشتاییەکی پان و بەرین

دادەبەزێ. لای باشووری رۆژئاواش لەچیای قەرەچوغ دەردەکەوێت. ئاوی باران لە کەلێنەکانی ئەو بەردانە دەچێتە خوارێ و لەژێر زەوی کۆ دەبێتەوە[٨].

وێرای ئەوە دەشتی هەولێر بەباشترین ناوچەی ئاشوورییەکان دادەندرێت، کە بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ و مەڕو ماڵات لەوەرزی بەهاردا بەهۆی شین بوونی گژو گیا[٩] بەکار هێنرابێ.

بەڵام لەرووی بازرگانییەوە، هەرێمی (حەدیاب) پێگەیەکی زۆر باشی هەیەو لەسەر رێگای کاروانە بازرگانییەکانە[١٠]. (رێگای سوڵتانی) پێیدا تێپەڕ دەبوو، کە پۆستەی دەگوازتەوە. ئەمەش هیرۆدتسی (لە سەدەی پێنجەم پ.ز) سەرسام کردبوو. رێگایەک بوو لە (ساردس)ەوە دەچوو بۆ (سوسە)، کەبە درێژایی رۆژهەڵاتی دیجلە لە عێراقی ئەمڕۆ تێپەڕ دەبوو. پاش ئەوە سەرنج دەدەین نیوەی رێگاکە لەنێوان کەرکووک و هەولێرە. گەر ئەمڕۆ یەکێ پێیدا تێپەڕبێ زنجیرەیەک گرد دەبینێت کە وێنەی شارو گوندی کۆنن، کە ئاسا کەوتوونەتە سەر خاڵی رێگای سوڵتانی، کە پیارۆی ئاویان دۆڵێک دەبڕێت[١١].

ئەو رێگەیانەی لەناوەڕاست و باشووری عێراق دەگەنە باکوور بایەخێکی بازرگانی گرنگی بەشاری هەولێر دایەو هاوکات وای لەدەسەڵاتدارانی کۆنی عێراق کردووە شاری هەولێر لەهەڵمەتە سەربازییەکان و دەست بەسەرداگرتنی بپارێزن. ئەمەش مێژوونووسی ئینگلیزی (ولی) لە کتێبەکەیدا (سۆمەرییەکان) ئاماژەی پێداوە، کە وڵاتگیری شا سەرجۆنی ئەکەدی (٢٣٤٠-٢٢٨٤ پ.ز) بوو تا گەیشتە هەولێر، بۆ بەسەر داهاتەکانی باکوورو ناوەڕاستی و باشووری عێراق زاڵ بوو. لەبەشی پێنجەمی هەمان کتێبدا هاتووە، کە باس لە (بنەماڵەی ئوری سێیەم ٢١١٣-٢٠٠٦ پ.ز)ی دەکات، بەوەی (باتیسی لاکاش) لەسەردەمی نەوەی سەرجۆنی ئەکەدی، شا (نرام سین ٢٢٥٤-٢٢١٨ پ.ز)[١٢] حاکمی تازە بۆ هەولێر دامەزراند.

دەقێکی بزماریش (٢٢٧١-٢٢٣٠ پ.ز) هەیە ئاماژە بەوە دەدات کە شاری هەولێر پێشتر لەژێر دەسەڵاتی ئوورەکان بووە. هەندێ لەبەڵگەنامە ئابوورییەکان کە لەو ساڵەی شاری هەولێر لەلایەن یەکێ لەدەسەڵاتداران لەسنووری ساڵی (٢٠٤٠ پ.ز) کرایەوە، ئەو راستییە جەخت دەکاتەوە، لەکاتێکدا دەقێکی دیکەی سۆمەری هی هەمان ماوە ناوی ئەو حاکمە سەربازییەی دیار کردووە، کە لەلایەن شا ئوور بۆ شاری هەولێر دامەزرا[١٣].

ئاشوورییەکان رۆڵی بازرگانی هەولێریان زانیوە لە بەر ئەوەی کەوتۆتە سەر رێگایەکی بازرگانی کە وڵاتی ئاشوور بەلایەنی رۆژهەڵات دەبەستێتەوە، کانزای گرنگی لێیە، بە تایبەتی مس و تەنەکە[١٤] سەرەڕای ئەوەی دارو بەردیشی لێیە کە بۆ دروستکردنی خانووبەرە بەکاردەهێندرێ[١٥].

**بایەخی سەربازی**

ئاشوورییەکان درکیان بەوە کردبوو کە مەترسی و هەڕەشە لای راستەقینەی رووبە روویان دەبۆوە، بۆیە زانی بوویان، کە هیچ رێگایەک نییە جگە لەپاراستنی وڵاتەکەیان و دەسکەوتە شارستانییەکەیان نەبێت، ئەویش بەبوونی هێزێکی گورز وەشێن کە بەرگری لە نیشتمانەکەیان بکات لەدەستی نەیاران و شەڕخوازان، گەشەسەندنەکەی بپارێزێ کە ئەمەش ویستی پاشای ئاشوورییەکان بووە، نەخاسمە شا ئاشوور ناسر بالی دووەم، دەیویست کە پێگە جوگرافییەکەی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری بەرفراوان بکات هەڵبەتە ئەو کارەش پێویستی بەسوپایەکی بەهێزو رێکخراو دەبێت، کە بایەخی پێبدرێ، لەوانە بنکەیەکی سەربازی بۆی تەرخان بکرێ کە دوو جۆرە:

**یەکەم: بنکەی بزاوتکار:**

ئەو بنکانەن کە سوپا لەماوەی هەڵمەتی سەربازی بەکاریان دێنن، لەکاتی هەڵمەتە دوور لەبنکە جێگرەکان بەمەبەستی ئامادەکردن و ئەو بنکانەش (Karsu) یان پێدەگوتن. بەزۆری بەمەبەستی پشوودانی سوپاو ناردنی ئازووقە بەکاردەهێنرا[١٦] ئەو بنکانە بۆ هەڵمەتبردن و گەڕانەوەیان لەکاتی شەڕدا بەکار دەهێندران. شا ئاشوور ناسر بالی دووەم لەهەڵمەتەکانی بۆ سەر هەرێمی زاموا (سلێمانی) پێمان رادەگەیەنێت: (دەستم بەسەر ئەو شارەدا گرت، کە کەوتۆتە چیای نەسیرو دانیشتوانەکەم هەمووی کوشتن، دەستم بەسەر سەروەت و سامانییان گرت و بوو بەدەسکەوتی جەنگ.. گەڕامەوە سەربازگەکەم و شەوم بەسەربرد، (لوماهیدا) لە سەربازگەکەم بزاوتم کردو کشام....)[١٧].

**دووەم: بنکەی جێگر:**

ئیکال میشارتی (-Ekal

Misarti) ئەم بنکانە واتای ئۆردوگای سەربازی دەگەیەنێت. بەزۆری ئەو بنکانە کۆگان و ئامێری گوێزانەوەی سەربازی و پێداویستییەکانی جەنگ و یەدەگەکانی سوپای لێ دادەکرێت[١٨]. لەسەردەمی شا تەجەللا تبلاسەری سێیەم (٧٤٥-٧٢٧ پ.ز) جاش سەربازی لەخۆ دەگرت، کاتێ تیپێکی لێ پێکهێنان لەسوپا هەمیشەییەکەی کە بە (کسر شاروتی) ناسرا بوو[١٩]. یەکێ لەو جاشانە یەکەیەکی سەربازانی فەلەستین بوو، کە بارەگاکەیان لەهەولێر بوو. لە نامەیەکدا لە Nergal- Balli بۆ شاژنی ئاشووری، دەڵێت: (تەندروستی باش بۆ پاشای گەورەمان دەخوازین. فەلەستینییەکان لەو کەتیبە بوون کە شای گەورەمان پێکی هێنابوو، ماوەی پێدام، رەتیان کردەوە لەگەڵ من بمێننەوە.. ئەوان.. لە گوندی (Luguse کە نزیک لە هەولێر) بوون[٢٠]. مەرج نەبوو ئەو بنکانە لە ناو پایتەخت بن. لەسەردەمی شا ئاشوور ناسر بالی دووەم ئەو شارەی ئەو بنکانەی لێ بوو شاری (کالیزی)یە، کە سەربە هەولێرەو کەوتۆتە باشووری رۆژئاوای شارەکە و، بنکەیەک بووە بۆ هەڵمەتبردنی سەربازی بەرەو رۆژهەڵات و باکووری رۆژهەڵات[٢١]. ئەمەش لەبەر پاراستنی ئارامی بووە بەهۆی ولاتگیری ئاشوورییەکانەوە. لەبارەی جوگرافی و بازاریش ئەو ناوچە شاخاوییە سنوورێکی سروشتی لەلای رۆژهەڵات بۆ ولاتی ئاشوور پێکدەهێنا. هەروەها گرێدانی بە یەک گەیاندنەکان بووە، ولات و هەرێم و کەرتەکانی باکووری، کە زۆر سەرچاوەی مس و ئاسن و تەنەکەو داری لێیە جگە لە کەرستەی پێویستی دیکە، کە بۆ پیشەسازی و بەرهەمهێنانی جەنگی بەکاردەهێندرێت، دەبەستێتەوە[٢٢].

ئەوە بوو شای ئاشووری ئاشوور ناسر بالی دووەم هەڵمەتە سەربازییەکانی لەبنکەکەی لە (کالیزی) بەرەو رۆژهەڵات دەست پێکرد. بەتایبەت بەرەو هەرێمی زموا (سلێمانی)[٢٣] کە بە بنکەی هۆزنشینە شاخاوییەکان دادەنرێت، کە کۆمەڵەی گەلانی رۆژهەڵات ئینتیمایان بۆ هەیەو، گۆتییەکان و کاشییەکان بەشێکیان پێکدەهێنا. بەشێکی بارەگاکەشیان زنجیرە چیاکانی زاگرۆسە، کە سنوورەکەی لەرۆژهەڵات ولاتی ئیلامە، هۆزی (لولوجو)، لقێکی دیکەن لەو گەلانەی لەو ناوچەیەدا جێگیر بوون. مێژووی ئەو هۆزەش بۆ سەردەمی شای ئەکەدی (نرام سین) دەگەرێتەوە[٢٤]. ئەو هۆزە بەسەرکردایەتی یەکێ لەئارامییەکان بەناوی (نور- ئەدد شێخ) لەکەرتی (دەگارا Dagara) کە کەوتۆتە رۆژهەڵاتی رێرەوێک بە ناوی بابێتی (بازیانی ئێستا)[٢٥] و بەهاندانی ژمارەیەک هۆزی دیکەی ناوچە شاخاوییەکە لە کەرتی زاموا بۆ ئەوەی لەدەسەڵاتدارێتی دەوڵەتی ئاشووری یاخی بن، دەربەندی بازیانیان داخست. لەبەرامبەر ئەو کارە شا ئاشوور ناسر بالی دووەم بەسەرۆکایەتی سوپاکەی رووی لەو دەربەندە کرد، گورزێکی توندی لەیاخیبووەکان و سەرکردەکەیان وەشاند. گوندو شارو قەڵاتەکانی دەست بەسەر داگرت. ئەمەش لەسەر زاری شا ئاشوور ناسر بالی دووەم ئاماژەی بۆ کراوە، کە دەڵێت: (شەرم لەگەڵ کردن، شکستم پێ هێنان تێکوپێکم شکاندن... شارەکان و... (بیرتۆو لکلاکا) ملکەچ بوون، لێیانم بەدیل گرتن، مەرو مالات و گایەکانمان هێنان. بەلام (نور ئەدد) بەرەو شاخ هەلات، بۆ ئەوەی ژیانی خۆی لەمردن رزگار بکات[٢٦]. پاشان شا ئاشوور ناسر بالی دووەم بەردەوام بوو لەبەرەو پێشچوونی شەرەکە بەرەو شاری (بارا Bara)، کە کەوتۆتە دەروازەی باکووری رۆژئاوا لەدۆڵی سلێمانی و نزیکی (تاسلوجە)ی ئێستاکە[٢٧]. توانی کۆنترۆڵی بکاو بیخاتە ژێر رکێفی خۆی[٢٨]. دواتر گەرایەوە بنکەکەی خۆی لەکالیزی نزیک شاری هەولێر بەبێ ئەوەی لە کاروانەکەی بەرەو زاموا بەردەوام بێ. وا دیارە هۆکارەکەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە شارەزایی ناوچەکە نەبووە لەرووی سروشتی ناوچەکە، جا گەراوە بۆ ئەوەی زانیاری زیاتر لە سەر سروشتی دەڤەرەکە و رێگاوبان و خاڵە لاواز و بەهێزەکانی کۆ بکاتەوە.[٢٩] شا ئاشوور ناسر بالی دووەم لەهەڵمەتبردنی دووەمیدا لەبنکە سەربازییەکەی لەکالیزی بزاوتی کرد، ئەم دەقەش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە دەڵێت: (لەشاری کالیزی بزاوتم کردو داخیلی رێرەوی باتینی بووم، کە بەرەو چیای نەسیر دەروات، کە پیاوانی لولو پێیان دەگوت (چیای کینیا)....[٣٠] کە ئێستا بەچیای (پیرە مەگروون) ناسراوە. شارو گوندەکانی کەوتوونەتە قەد پاڵی چیاکە دەستی بەسەردا گرتن و نشووستی بە بەرهەڵستکارانی هێنا، ئەودشی باس کردووە، کە دەڵێت: (پیاوەکان بەرەو لووتکەی چیاکە هەڵاتن، سەربازانمان وەک باڵندە دوایان کەوتن،

لاشەکانیان لەچیای نەسیر کۆکردنەوە. ولاغەکانمان بردن، دەستم بەسەر قەلاتەکانیان داگرت، دەستکەوتەکانی جەنگم هێنا، وەک: سەروەت و سامان و مەڕو مالاتیان، پاشان گەڕامەوە سەربازگەکە و شەوم بەسەربرد)[٣١].

شا ئاشوور ناسر بالی دووەم بۆ ماوەی دوو رۆژی یەک لەدوای یەک لەهێرشبردن بۆ سەر شارو گوندەکانی کەوتوونەتە لای چیای نەسیر، بەئامانجی پاراستنی هێڵەکانی دواوەی سوپاکەی لەکاتی هەنگاونانی بۆ بەشەکانی باشوور لەدەشتی شارەزوور لەکەرتی زامووادا بەردەوام بوو. لەسەر زاری خۆی ئاماژەی بەوە داوەو دەڵێت: (شاکانی شوێنە جیا جیاکانی خاکی زاموا شکێنراون و بە چوونی من رازی بوون، ئەسپ و زێڕو زیوم لێ وەرگرتن. وام کرد خاکەکە لەژێر یەک فەرمانڕەوا بێت، باج وەرگرتن و بێگاریم کارکردنی بەردەوامم بەسەردا سەپاندن)[٣٢].

شا ئاشوور ناسر بالی دووەم کۆتایی بەهەڵمەتەکانی هێنا دوای ئەوەی دەستی بە سەر شاری (توکولتی- ئاشوورییان) داگرت،کە بە(ئەراکەی) ناسرابوو ئینجا لەباشووردا بلاوەی کردو چیای (نشبی) و (ئورمان داغ)ی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی. بەمەبەستی گەڕان بەدوای نور ئەدد شێخ دا کە خۆی لەیەکێ لە قەلاتەکانی چیایەکە شاردبووەوە[٣٣].

وێڕای ئەوەی ئەو سەرکەوتنەی شا ئاشوور ناسر بالی دووەم لە هەڵمەتەکانی وەدەستی هێنا، وادیارە هەڵمەتەکان بۆ شاردزا بوون بووە. ئامانج لەوە خۆ ئامادەکردن بووە بۆ وەشاندنی گورزێکی یەکلاکەرەوە. لە سالی دواتر (٨٨٠ پ.ز) هۆزەکانی لولوبو جاریان دا کە لەدەوڵەتی ئاشوورییەکان هەڵگەڕاونەتەوەو باجیان نەدا[٣٤] کە شا ئاشوور ناسر بالی دووەم بەسەریدا سەپاندبوون. بۆیە شا بڕیاری دا هەڵمەتێکی دیکەی تازە بەرەو زاموا ئەنجام بدات[٣٥]. لەبنکە سەربازییەکەی لە کالیزی بزاوتی کرد و بەخێرایی هەنگاوی بەرەو زاموا نا، زێی بچووکی بڕی و[٣٦] پێی نایە دەربەندی بابیتی، پاشان بەسوپاکەیەوە لەدەریای دانو (عوزێم) پەڕییەوە تاگەیشتە لای چیای سیماکی (ئەزمەڕی ئێستاکە)[٣٧]. لەڕووباری قورانت و[٣٨] رووباری (دیالای تازە[٣٩]. پەڕییەوە. حاکم ئارشاتو لە پایتەختەکەی ئامالی لەدەشتی شارەزوور رووبەڕووی بووەوەو پێکدادان لەگەڵیان رووی داو ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی کوژران، ژمارەیەکیشیان لێ بەدیل گرتن، تالانێکی زۆریشی دەستکەوت، حاکم ئارشاتو هەڵات و شاردکانی مانەوە شکستیان خوارد[٤٠].

لەبەردەم شا ئاشوور ناسر بالی دووەم هیچ نەمایەوە تەنیا کەرتی حاکم ئامیکا نەبێت، کە لەشاری (توکولتی ئاشوور- ئاسیات (بنگرد تازە) جێگیر بوو. ئەو رێگایانەی، کە بەتەواوی هەرێمەکە بە یەکدی دەبەستێتەوە. لەرێگای ئەو رێڕەوەی چیای لاراو بیدرجەها لێک جیادەکاتەوە[٤١] ئەوە بوو حاکم ئامیکا بەرەو ناوچە شاخاوییەکانی بەری باکووری زامری هەلات، سوپای ئاشووری لەرێگای رووباری ئەدێر (رووباری قزلجە) کە لقێکە لەڕووباری زێی بچووک، کەوا ناوچەی چوارتای ئێستاکە دەکات بەدواوەیەوە بوو. لەدوماهیدا ئەو ئاپۆرە داریەی زامری مایەوە کەوتە ژێر چەپۆکی سوپای ئاشووری[٤٢].

بەم شێوەیە ناوچەکەو شارەکانی سەر بەکەرتی زامری، لەوانە شاری بارسندو **Barsindu** کە بارزانی ئێستاکە دەکات لەبەردەم شا ئاشوور ناسر بالی دووەم والابوو، تابۆ ئەوەی سوپای ئاشوور دلنیا بێت کۆنترۆلی تەواوی بەسەر هەرێمی زاموادا هەیە ئینجا هەڵسا بەداگیرکردنی چیاکانی بەری رۆژهەلات، لەوانە چیای لارا (کەرون). یەکەکانی ئەندازەی سەربازی لەسوپای ئاشووری رێگەوبانەکانیان بۆ ئایندەش دارشت تاکو بەئاسانی بتوانن گالیسکەو ئامێرەکانی دیکەی سەربازی هاتوچۆ بکەن. ، تابتوانێ بەئاسانی چالاکییە سەربازییەکانی سوپاکەی ئەنجام بدات، نەکا بۆ جاری دیکە یاخیبوون لەدژی ئیدارەی دەوڵەتی ئاشووری سەر هەڵداتەوە[٤٣].

بەم شێوەیە ئاشوور ناسر بالی دووەم کارە سەربازییەکانی لەکەرتی زاموا بەکۆتا هێناو نیشانەکانی لەسەر رێگاوبانەکان دیارکرد بۆ ئەو دەسەلاتەی لەدوای خۆی جێ شوێنی دەبێت. شانازی بەو سەرکەوتنانەوە دەکرد، کە لەهەڵمەتە سەربازییەکانی وەدەستی هێنابوون. لەسەر تابلۆو بەردەکان داستانەکانی تۆمار کردبوو. کە رووداوی گرنگ، هاتنی بۆ هەرێمی کروری (دەشتی حەریری ئێستا) کە لەهەولێر بەرەو باکووری رۆژهەلاتی گرتە خۆ، دواتر هەرێمی خابخۆی لە خۆ گرتبوو، لەوانە **Habhu** کە کەوتۆتە رۆژئاوای دەریای ئورمێ گرتە خۆو دەستی بەسەر شارەکان و پایتەختەکەی (نشتون)

داگـرت. پاشـان گـەڕایەوە هەولێـر بەخـۆی و تالانێکی زۆری دیلەکـان، یەکێک لەوانە حاکمی نشتۆن (بوبو ئیین بۆیا) بوو کە بە زیندوویی کەوڵی کردو پێستەکەی بەدیوارەکانی شاری هەولێری هەڵواسی[٤٤].

**سەرچاوەو پەراوێزەکان:**


١- تقي الدباغ، "الزراعة في عصور ماقبل التاريخ"، موسوعة الموصل الحضارية (الموصل دار الكتب للطباعة والنشر، ١٩٩١) ١/ ١٦٠.

2- Olmas tsd, A.T. History of Assyria, (London, 1960), p.81

٣- لوا او بنهايم، بلاد مابين النهرين، ترجمة: سعدي فيضي عبدالرزاق (ط٢، د.م،١٩٨٦)، ص٤٧٨.

٤- قحطان رشيد صالح (اعداد)، الكشاف الأثري في العراق القديم (بغداد، ١٩٨١)، ص٢١.

٥- دائرة المعارف الأسلامية، دار الشعب، المجلد الثاني، مادة أربل، ص٥١٦-٥١٧.

٦- فؤاد جميل، "حدياب ...أربيلا... وعشتار ..أربيلا"، مجلة سومر (بغداد، ١٩٦٦، مجلد، ٢٥، ص٢٢٠.

7-Saggs, H.W.F, The Might that Was Assyria, (London, 1984), p.22.

٨- كاظم موسي محمد ،حوض الزاب في العراق (دراسة هايدرولوجية)، رسالة ماجستير (غير مشنورة)، بغداد، كلية الاداب- جامعة بغداد، ١٩٨١، ص٣٣.

9- Saggs, H.W.F, op. cit, p .22

١٠- سالم أحمد محل، "منطقة الموصل تحت الأحتلال الساساني"، موسوعة الموصل الحضارية، (الموصل، دار الكتب للطباعة والنشر ١٩٩١) ١/١٤٩.

11- Setton Loyd, Twin Rivers Abrife History oar irag From the early times to the present Day, mbrd, ed, oxford, 1961 p.74

١٢- جميل، المصدر السابق، ص٢٢٢-٢٢٣.

١٣- عامر سليمان، منطقة الموصل في الألف الثالث قبل الميلاد" موسوعة الموصل الحضارية .(الموصل دار الكتب للطباعة والنشر، ١٩٩١) ١/ ٦٥.

١٤- موكتز لارسن، "القصدير والنحاس في نصوص اشور"، مجلة سومر (الموصل، ١٩٨٦) مجلد ٤١، ٨١، ص٧١-٧٢.

15- Saggs, H.W.F, op. cit, p. 246-247.

16- i bid.p.252.

17- i bid.p.252.

18-Spiesser.HE.A., Mesopotamian origins, (London, 1930),P.194

١٩- صلاح رشيد عطا، السوق العسكري للدولة الأشورية ٧٢٢-٦٢٦ ق.م، اطروحة دكتوراه (غير منشورة)، (بغداد، معهد التاريخ العربي، ١٩٩٨)، ص٣٨.

20- Parpola, s. "The Corres pondence of sargon II" (finland 1987) Vo. 1, p. 183-20.

Assy rian Royal inscri Ptions, w. (Germany. 1976) vol. 2. p. 129.

Grayson, A.K, (2)-21.

٢٣- محمود الأمين، "ملتا طويزاوه وكيلة شين"، مجلة سومر (بغداد، ١٩٥٢) مجلد، ٨، ٥٣-٥٤.

23- spiesser, E.A, op.cit, p.194

٢٤- طه باقر، المقدمة (بغداد، ١٩٧٣)، ص٣٦٩.

25 -Spiessr, E.A, "Southern Ukrdistann the annals of ashur-nasir- pal and to day", (Aa sor.1926 27), p..19

26- Grayson, A.K., op. cit, p. 128

27-Spiesser, E.A. AAsor,27 ,1926 , p. 19.

28 -Grayson, A.K., op. cit p. 120

٢٩- شيبان ثابت الراوي، اشور ناصربال الثاني ٨٨٣-٨٥٩ ق.م، رسالة ماجستير (غير منشورة)، جامعة بغداد، كلية الاداب، ١٩٨٦، ص٩٦.

30- Grayson, A.K., op. cit, p.120

31-Ibid, p.120 .

32- Ibid, p.130 .

33- Spiesser, E.A. AAsor, 27,1962 , p.25.

34-Olmasted, A.T. op. cit. p. 89

35- Grayson, A.K., op. cit, p.130.

٣٦- طه باقر، المصدر السابق، ص٥٥.

37 - Spiesser, E.A. AAsor,1926 , p.25 .

38 - Grayson, A.K., op. cit, p. 130

٣٩- طه باقر، المصدر السابق، ص٥٥a.

40- Olmasted, A.T. op. cit. p. 89.

41- Spiesser, E.A. AAsor,1926 , p.21.

42- G r ayson, A.K., op. cit, p.131

43- Ibid, p. 132

شيبان ثابت الراوي، المصدر السابق، ص١٠٢.

٤٤ -أي، رويستن تايك، قصة الآثار الاشورية، ترجمة، يوسف داود عبدالقادر، مراجعة، لطيف الخوري، (بغداد، مطبعة أسعد، د.ت)، ص٧٠.

G rayson, A.K., op. cit, p.122

# شەڕی گواگەمێلا [١]

دڵگەش ئیبراهیم حەمە شیرین

گواگەمێلا بەپێی لێکدانەوەی لویس دیلمان ئەو دەشتەیە دەکەوێتە باکوری چیای مەقلوب، نزیک گوندی (تەل گومەل)ی ئێستا، لە سەر ڕۆخی چۆمی گومەل،[٣] دەکەوێتە ڕۆژئاوای ڕووباری خازر.[٤] گوندی گواگەمێلا شوێنێکە بەدووری (٣٠)میل لە ڕۆژئاوای شاری هەولێر.[٥]

لە تشرینی یەکەمی ساڵی (٣٣١)ی پ.ز دا، لەو دەشتە شەڕێکی یەکلاکەرەوە ڕوویدا لە نێوان سوپای هەخامنش و سوپای مەکدۆنی، دەتوانین بڵێین ئەم شەڕە چارەنووسی خۆرهەڵات و ئاسیای بۆ ماوەیەکی دوور دیاری کرد.[٦] ئەم شەڕە لە ئەربێلا نەبوو، وەک هەندی لە سەرچاوەکان ناوی دەبەن،بەڵکو لە (گواگەمێلا) بوو.[٧] بەڵام لە بەر ئەوەی شوێنی ڕووداوی شەڕەکەلە ئەربێلا نزیک بووە،سوپای ئەسکەندەر تا شاری ئەربێلا دوای پاشماوەی سوپای دارای کەوت، بۆیە وا ناوی دەبەن. بۆئەوەی بزانیین گرینگی ئەم شەرە چی یە،بۆئەم مەبەستە تیشک دەخەینە سەر ئامادەباشی سوپای هەردوولا.

دارا دوای شکستەکانی لە ئاسیای بچووک و سوریاومیسر، کەوتە ڕێکخستنی سوپاکەی، گۆڕانکاری لە جۆری چەکەکانی کرد، لە جیاتی رم حەربەی بەکارهێنا، ئەمەش کاریگەری خۆی لە گۆڕانی شەرەکە هەبوو، هەرچەندە قەبارەکەی بچووکە بەڵام بەخێرایی بەکاردێت لە گۆرەپانی جەنگدا.[٨] سوپای دارا زۆر گەورەترو زۆرتر بوو بە بەراورد لەگەڵ سوپای پێشتر کەلەشەڕی ئیسۆس بەشداریان کردبوو، هەروەها ڕێکخراوتر بوو، ژمارەیان نزیکەی دەگەیشتە یەک ملیۆن.[٩] سوپای دارا لە هەموو ئەو نەتەوانە پێک هاتبوون کەلە ژێرفەرمانرەوایەتیەکەی دابوون لەوانەش، بابلی، ئەرمەنی، سوری، کەبدۆکی، تورکمان، ئەفغان، هـ........ [١٠] (کورتیس) دەڵێت : ((٢٠٠ هەزار پیادە، ٤٥ هەزار سوار، ٢٠٠ گالیسکە)). بەڵام دیودور دەڵێت : ((٨٠٠ هەزار پیادە، ٢٠٠ هەزرا سوار، ٢٠٠ گالیسکە)). جوستن دەڵێت ((٤٠٠ هەزار پیادە، ١٠٠ هەزار سوار)) بەڵام بلو تارک دەڵێت ((سوپای هەخامنش ژمارەیان نزیکەی یەک ملیۆن کەس بوو)).[١١] لەڕاستیدا ئەم ژمارانە زیادەڕۆییەکی زۆری تێدا کراوە، نزیکەی یەک ملیۆن، ئەم ژمارەیە ژمارەیەکی خەیاڵییەو بەپێی هەموو سەرچاوەکان ڕاستە هێزێکی زۆر بووە، بەڵام پێمان وایە ئەو ژمارەی (کۆریتس) ئاماژەی پێداوە تارادەیەک نزیکە لە ڕاستی، جگە لەوەش خۆی نزیکترین کەس بووە لە ڕووداوەکە.

سەبارەت بە سوپای مەکدۆنی، سوپایەکی تێکەڵ بوو لە زۆر نەتەوە پێکهاتبوو، بەهەمان شێوەی سوپای هەخامنش. بەپێی ڕاپۆرتەکانی هەردوو سەرکردەی ئەسکەندەر، (ئەرستۆ پۆلس و بەتلیمۆس).[١٢] سوپاکە بریتی بوو لە (٤٠) هەزار پیادە، (٧) هەزار سوارە.[١٣] سوپای مەکدۆنییەکان لە ئامادەباشی دابوون، پڕ چەک بوون، ئەسکەندەر بە باشترین شێوە ڕێکیخستبوون، ئەمەش ڕێڕەوی شەڕەکەی گۆری.[١٤] تاکتیکی ئەسکەندەر ئەوە بوو کە هەموو هێزەکەی بە شێوەیەکی ڕێکخراو مەشق پێکردبوو، هەندی جار (٢٠) هەزار سەربازی ئامادە کراو بەرمێکی درێژ، درێژیەکەی (٢٠) پی بوو. هەموو سەربازەکانی شیریان پێ بوو، بە (١٦) ڕیز لەدوای یەک ڕاوەستابوون، ئەسکەندەر سەرکردەکانی ئاگادار کردبۆوە بەسەربازەکان بڵێن بەیەک دەنگ هاواربکەن بۆئەوەی ووردی هەخامنشەکان دابەزێنن.[١٥]

ئەسکەندەر هەموو ناوچەکەی پشکنیبوو، بۆ ئەوەی هەر پیلانێکی

هەخامنش لەئارادابێت لە ناوی بیات، نەخشەی كێشا كە چۆن هێرش بكەن،هێزی سوارەو پیادەی نارد بۆ شوێنی شەڕەكە. ئینجا كۆبوونەوەی بە هەموو سەركردەكان كرد، پێی ڕاگەیاندن پێویست ناكات هانتان بدەم، خۆتان ئازان شەڕتان زۆر كردووە، ئازایەتی خۆتان لە سەروی هەموو شتێكەوەیە.[16] دارا ناوچەیەكی فراوانی دەست نیشان كرد بۆ هێزەكەی خۆیان، ئەو شوێنەی پێی باش بوو گالیسكەكان بە ئاسانی مانۆڕی تیا بكەن.[17] بەم شێوەیە سەربازگەیان لە دەشتی گواگەمێلا دانا.[18]

**ڕووداوی شەڕەكە:**

ئەسكەندەر هەمان پلانی شەڕی ئیسۆس و گرانیكوس ی بەكارهێنا.[19] سوپای ئەسكەندەر لە پیادە و سوارە پێكهاتبوو، سوارەكان و پاسەوانان لە باڵی ڕاست بوون، (كلیتس بیداس) سەركردایەتیان دەكرد. سەركردەی پاسەوانانیان (فیلوتاس) كوڕی پارمینیۆ بوو. بەڵام سوپای پیادەی مەكدۆنی نزیك پاسەوانان بوون هەڵگری (تروس) بوون، كەوەك مەنجەنیقە، لە ژێر سەركردایەتی (نیقاتور) ی كوڕی پارمینیۆ. باڵی چەپی سوپاكە بەدەستی پارمینیۆ بوو.[20] باڵی ڕاست و ناوەڕاستی سوپاكە بەسەركردایەتی ئەسكەندەر بوو.[21] ئەسكەندەر بەسواری ئەسپەكەی (بوسیفال)ەوە لەگەڵ یەكە سواری چەكی قورس كەوتەڕی.[22] سوپای هەخامنش بە سەركردایەتی (پوریاس) بوو، كاریەكانیان لەگەڵ بوو، لەگەڵ ئەرمەن و سوریەكان كەنیشتەجی ی وولاتی میزۆبۆتامیا بوون، ئەوانە هەمووی لە ژێر سەركردایەتی (مازیۆس) بوون.[23]

ئسكەندەر هێلی دووەمی دانا ،كەلە بەكرێگیراوان پێك هاتبوون بۆ ئەوەی پارێزگاری لە سوپاكەی ئەسكەندەر بكەن. هەخامنشییەكان وایان دەزانی، سەركەوتن بەدەست دەهێنن، لە هەردوو باڵی ڕاست و چەپ هێزەكەیان ڕێكخست، دەیان ویست بەشێوەیەكی كتوپڕ ڕووبەڕووی ئەسكەندەر ببنەوە لە پێش ئەوەی هێزەكانی پیادەی ئەسكەندەر بچنە ناو ڕیزەكانیانەوە، لە هەمان كات دا ویستی جووڵەی هەخامنش تێكبشكێنرێت.[24]

(ئەرستۆ پۆلس) دەڵێت باڵی چەپی سوپای هەخامنش هەمووی بەختیاری بوون، تا ناوەڕاستی سوپاكە بەڵام باڵی ڕاستی مادەكان و فارسەكان هەركانی و ئەلبانی بوون، دارا لە ناوەڕاستی سوپاكە بوو.[25] ئەو بەشەی تیرو كەوانیان پێ بوو بەرامبەر هێزەكەی ئەسكەندەر ڕاوەستابوون.[26] سوارە هەخامنشیەكان هێرشیان كردە سەر ئەسپەكانی مەكدۆنیا بۆیە ئەسپەكانیان توانای بەرگریان نەما، هەخامنشەكان هێرشیان كردە ناو جەرگەی سوپای مەكدۆنی.

ئەسكەندەر هێرشی پیادەی دایە دەست پارمینیۆ. یەكەم جار گالیسكەكان و سوارەكان زۆر بەهێز هێرشیان برد ئەوانەی بەرەوڕوویان دەهاتن، تێكیان دەشكاندن.[27] بەڵام پارمینیۆ هێرشی كردە لای چەپ، ئەسكەندەر دەستی كرد بە هێرش، بەشی پێشەوەی سوپاكە ئەوانە بوون رمیان پێ بوو، هەردوو سوپاكە زۆر بە توندی لێكیان دا.[28]

ئەسكەندەر بەرەوڕووی ڕاستی سوپای هەخامنش هەنگاوی نا، لە هەمان كاتدا هەخامنشەكان دەیان ویست گەمارۆی ئەسكەندەر بدەن، سوارەكانی (سكیپ) لەگەڵ سوپای مەكدۆنی ڕووبەڕووی یەكتر بوونەوە. سوپای مەكدۆنییەكان بەرەو پێشەوەچوون، دارا دەترسا لەوەی كە تایەی گالیسكەكان بشكێن، چونكە مەكدۆنییەكان شارەزایی یان لە شێوازی هێرش كردنەسەر گالیسكەكانی هەخامنش هەبوو.[29]

سوپای هەخامنش بە پلانێكی شەڕكەرانەی بەربڵاو هێرشیان كرد، بۆ ئەوەی سوپای مەكدۆنی گەمارۆ بدەن، بەڵام ئەسكەندەر توانی كەلێنێك لەناو بەشی سوارەی سوپاكەی هەخامنش بكاتەوەو لێكیان دابڕی. ئەمەش بووە هۆی تێكچونی باردۆخی سوپاكەو سەر لێشێوانی سوارەكان، كەنەیانتوانی دەست بەسەر باردۆخەكە دابگرن، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی نەتوانن بەرگری بكەن، دواتر هەرەسیان هێنا.[30]

دارا دوای ئەوەی كە زانی سوپاكەی تێك شكا، بەناچاری گۆڕەپانی شەرەكەی بەجێهێشت.ئەسكەندەر دوای كەوت، تۆز وخۆڵێكی زۆر بەرز بۆوە، بۆیە سەربازە مەكدۆنییەكان نەیان توانی

ئەو ڕێگایە دەستنیشان بکەن کە دارا پێیدا هەڵاتووە.[31] ئەمەش نەبووە هۆی ئەوەی سوپای هەخامنشەکان بەیەکجاری شکست بێنن. بەڵکو بەهۆی سوارە کەبدۆکیەکان وپارسەکان، بەشێک چونە ناو جەرگەی باڵی چەپی سوپای مەکدۆنیەوە، ریزەکانی پێشەوەی سوپاکەیان کردە دوو بەش، تەنانەت (مازیوس) ی سەرکردەیان وای هەست کرد کە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. بەڵام پارسەنگی هێز بەلای سوپای ئەسکەندەربوو، کە بدۆکیو پارسەکان لێک دابڕان دوایئەوەی (پارمنیۆ) توانی زیرەکانە سوپای هەخامنش لێک هەڵبوەشێنێ، ئیتر بی سەروبەری کەوتە ناو سوپاکە و نەیان توانی خۆیان ڕێک بخەنەوە.

ئەسکەندەر بەردەوام لە ڕاونانی سوپای هەخامنشەکان بوو، بەبی ئەوەی هیچ ماوەیەکیان بداتی بۆ خۆرێکخستنەوەی سوپاکەیان.[32]

لەم شەڕەدا ئەسکەندەر لەگەڵ ژمارەیەک لە سەربازانی بریندداربوون و ژمارەیەکیش لە پاسەوانانی کوژران.[33] دواتر لەوی سەربازەکان سەربازگەیان دانا، بەمەبەستی پشوودان بۆ ماوەیەکی کورت، بەڵام پارمنیۆ توانی دەست بەسەر سەربازگەی هەخامنش دابگرێت، لەگەڵ ژمارەیەک لە ووشترو فیل و هەموو کەل وپەلەکانیان، ئینجا بەرەو ئەربێلا رۆیشت.[3] ئەسکەندەر توانی لە بڵندایی قەڵای ئەربێلاوە بەهۆی تەپ و تۆزی کاروانە ڕێیەکان ببینێت کەبەشێک لە هێزەکانی داریوش بەرەو باشوور و بەشێکی بەرەو باکوور کەوتنە ڕێ.[34] کاتێک هێزەکانی مەکدۆنی گەیشتنە ئەربێلا لە لایەن خەڵکی شارەکە پێشوازیان لێکرا، ئەسکەندەر ماوەی چەند ڕۆژێک لەوی مایەوە، خەزێنەکەی دارا لە ئەربێلا بەجێمابوو، ئەسکەندەر دەستی بەسەر داگرت.[35] سەردانی پەرستگای شارەکەی کردو قوربانی پێشکەش بە خواوەندەکان کرد، خۆی بە پاشای ئاسیا دانا. وەک پاداشتێک بۆ سەرکەوتنەکانی پارەیەکی زۆری بەسەر سەربازەکانی دابەش کرد.[36] ئەسکەندەر ئەم شەڕەی بردەوە کە بەشەڕێکی گرینگ لە مێژوو دادەنرێت.

١- گواگەمێلا واتە (مناخ الجمل) شوێنی وشتر، ئەمەش بەهۆی ڕووداوێک لە کۆن رووی داوە، لەو شوێنە دەڵێن یەکێک لەپاشاکانی فارس لە سەر پشتی وشترێکی خێرا رزگاری بووە، لە دەست نەیارەکانی واتە ئەو شوێنەی وشتر لێی دادەنیشێت: بروانە:بلوتارك: م. س. ص١٢٨٤.
٢- عبدالله امین اغا: معركة اربیلا- (گواگەمیلا)، ص ص ٦،٧.
٣- اریان: م.س.ص ٢٢٩: فواد جمیل: حدیاب اربیلا-عشتار اربیلا، سومر، ٤- ع ١، ٢، مج ٢٦، ص٢٢٩.
٥- جورج رو: العراق القدیم، ص٥٥٢: ولیم الانجز: م. س، ص ص ٥، ٦: ا.بتري: م. س، ص٥٧.
٦- محمد الاسعدبن ابوبكر الحفصي:م. س. ص٤٦.
٧- بلوتارك: م.س،ص١٢٨٤.
٨- محمد الاسعد بن بوبكر الحفصي: م.س،ص٤٦.
٩- فؤاد جمیل: اریان یدون ایام الاسكندر الكبیر في العراق، م. س، ص٦٢، هامش ٢٣.
١٠- هەردووک سەرکردەی سەربازی ئەسکەندەر بوون، ڕاپۆرتی خۆیان دەربارەی شەڕەکانی ئەسکەندەر نووسیوە: بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:اندرو روبرت برن:م. س، ص٤٤٩: یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی: ل٢٤.
١١- عبدالله غفور: التآخي، ع ٢٤٩، ص٣.
١٢- حمد الاسعد بن بوبكر الحفصي: م. س، ص٤٦.
١٣- اریان: یدون ایام الاسكندر الكبیر في العراق، ت: فؤاد جمیل، سومر، ع٢١، ب. م ١٩٦٥، ص، ص٢٧١، ٢٧٢.
١٤- م. ن: ص ص٢٧١، ٢٧٢.
١٥- م. ن: ص٢٧٤.
١٦- ا. بتري:م. س، ص٥٧.
١٧- اریان: م. س، ص٢٤٧.
١٨- هیر مر كندر- فیرنرهیلغمن: اطلس dtv، تأریخ العالم، ص٦٧.
١٩- هادي رشید جاوشلي: م. س، ص٥٩.
٢٠- هارولد لمب: س. پ، ل ٥٩.
٢١- اریان: م. س، ص٢٧٠.
٢٢- محمد الاسعد بن بوبكر الحفصي:م. س، ص٤٨.
٢٣- اریان: م. س، ص٢٧٣.
٢٤- محمد الاسعد بن بوبكر الحفصي: م. س، ص٤٨.
٢٥- اریان: م. س، ص٢٧٣.
٢٦- م. ن: ص٢٧٥.
٢٧- هارفي بورتر: م. س، ص٢٩٥.
٢٨- جون جنتر: م. س، ص.
٢٩- اریان: م. س، ص٢٧.
٣٠- فؤاد جمیل: حدیاب اربیلا - عشتار اربیلا،سومر، ع١،ح، مج٢٠، ص٢٣٥: محمد الاسعد بن بوبكر الحفصي: م. س، ص٤٨: هادي رشید جاوشلي: م. س، ص٥٩.
٣١- فؤاد جمیل: اریان، ص٢٧٧، هامش ٤٨.
٣٢-٣٣-٣٤-٣٥-٣٦ نفس المصدر السابق.

# شەڕی ئەربێلا
# لە (گەشتنامەکەی ئۆلیڤیێ)دا
# ١٧٩٤ - ١٧٩٦ز

فەیسەڵ نورەددین دەباغ

ئەم بابەتەی کە لێرەدا بڵاوی دەکەینەوە، یەکێکە لەو بابەتە مێژووییانەی کە پەیوەندی بە کوردەوە هەیە، ئەم پەیوەندییەش یار بێ یا نەیار، جیاوازییەکی چەندان ناکا، گرنگ هەوڵدانێکە بۆ ناساندنی کۆمەڵگا و دیاردەکانی ژیانی ئەو سەردەمەی ئێمەی کورد لە موسڵ و هەولێر و کەرکووک و تاووق و دوزخورماتوو و قەرەتەپەدا.

ئەم گەشتنامەیەی (ئۆلیڤیێ) وەنەبێ یەکەم گەشتنامە بێ لەم بوارەدا، بەڵکو بەر لە (ئۆلیڤیێ)ش چەند گەشتوەرێکی بیانی گەشتەکانیان سا بۆ ئیشوکاری تایبەتی خۆیان بووبێ، یا بۆ پشکنینی زانستانە بووبێ، یا بۆ گەشتوگوزار بووبێ، یا بۆ ئیشوکاری نهێنی و سیاسەتی دەوڵەتەکانیان بووبێ، راپۆرت و نووسین و نامیلکە و کتێبیان بلاوکردۆتەوە، وەک جوهان بەرگەر لە ساڵی ١٤٧٣، ئەولیا چەلەبی لە ساڵی ١٦٣٠دا و نەیبور لە ساڵی ١٧٦٦دا و فیدیلیس لە ساڵی ١٧٩٤دا.

راستە ئەوانە هەموویان ناوی کورد و شارۆچکەکانی کوردیان لە گەشتنامەکانیاندا هێناوە، بەڵام گەشتنامەکەی (ئۆلیڤیێ) لەم رووەوە هەروەکو خۆی دەڵێ:

"گەشتێکی مێژووییە نەک رۆمان" یانیش هەروەکو بلاوکەرەوەکەی (ئاکاس) دەڵێ: ...تایبەتمەندییەکی هەیە چونکە ئۆلیڤیێ هیچ شتێکی گرنگی بەبێ باسکردن بەجێ نەهێشتووە".

(ئۆلیڤیێ)ی نووسەر و گەشتودر ئەم گەشتەی خۆی لە ساڵی ١٧٩٤دا نووسیویەتی و لە دواییدا بە چوار بەرگ بڵاوی کردۆتەوە لە ژێر ناونیشانی:

**Voyage dans 1"Empire Ottoman, 1"Egypte et La perse. Fait Par Order du Gouvererrnment, Pendant Les Six Premieres annees de La Republique; par G. A. OLIVIER**

واتە (گەشتێک بۆ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، میسر، ئێران، کە بە فەرمانی حکومەت لە شەش ساڵی یەکەمی تەمەنی کۆماردا لەلایەن ج. أ. ئۆلیڤیێ ئەنجام دراوە).

(ئۆلیڤیێ، olivier گەشتوەرێکی فەرەنسییە، ساڵی ١٧٥٦ لە (ئاغک - Arcs) لە دایک بووە و لە ساڵی ١٨١٤دا لە (لیۆن - Lyon) کۆچی دوایی کردووە، لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٧٩٢دا لەلایەن ئەنجوومەنی راپەڕاندنی کاتیی شۆڕشی فەرەنسییەوە راسپێردراوە بۆ ئەوەی خۆی و (برۆکییر)ی یاریدەدەری گەشتێکی درێژ خایەن بۆ چەند هەرێمێکی دەوڵەتی عوسمانی و ئێران بکات، ئەویش لە ساڵی ١٧٩٣دا دەستی بە گەشتەکەی کردووە و تا ساڵی ١٧٩٧ درێژەی کێشاوە، دووجار سەردانی عیراقی کردووە، یەکەمیان لە تورکیا و سوریاوە بۆی هاتووە و دووەمیشیان لە کاتی گەڕانەوەیدا لە ئێرانەوە بۆ فەرەنسا، واتە لە ماوەی ١٧٩٤ - ١٧٩٦دا، ئەمەیش بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی دانەری کتێبی (چوار سەدە لە مێژووی عیراقی نوێ) (لۆنگریک)ە، کە دەڵێ: گەشتەکەی لە ساڵی ١٧٩١دا بووە.

لە بەرگی یەکەم و دووەمی ئەم

گەشتنامەیەدا، کە یەکەمیان ٤٣٣ لاپەڕەیە و لە ساڵی ١٨٠١ لە پاریس چاپ کراوە و دووەمیشیان ٤٦٧ لاپەڕەیە و لە ساڵی ١٨٠٤ چاپ کراوە، گەشتوەر وەسفێکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیمان بۆ دەکات، بە تایبەتی هەرێمی قوستەنتینیە و دوورگەکانی ئەرخەبیل و کریت، هەروەها وەسفی وڵاتی میسر و سوریا و عیراقیش دەکات، کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا بایەخێکی ئێجگار زۆریان پێدرابوو.

لە بەرگی سێیەمیش کە ٥٦٧ لاپەڕەیە و لە ساڵی ١٨٠٧ چاپی کردووە، گەشتوەر، لەبارەی وڵاتی فارس و ئاسیای بچووک دەدوێ، وەک لەبارەی مێژووی ناوچەکە لە سەردەمی (شا حوسێن)ەوە، ١٦٩٤ز تا سەردەمی فەتحعەلی شا (١٧٩٨ز).

ئەمما بەرگی چوارەمی کە ئەتڵەسە، (٥٠) شێوە و نەخشەی بەخۆوە گرتووە و گەشتوەریش لە سێ بەشی جیادا بڵاوی کردۆتەوە و پێوانەکەشی (٣٢×٢٤.٥سم)ە، ئامانجی ئەم گەشتە هەروەک (ئۆلیڤیێ) لە بەرگی یەکەمی گەشتنامەکەیدا دەڵێ: زیاتر سیاسییە و لە بارودۆخێکی زۆر هەستیار لە مێژووی پەیوەندی فەرەنسا بە ڕۆژهەڵاتەوە نووسراوە.

جێی وەبیر هێنانەوەیە ئەم گەشتنامەیەی ئۆلیڤیێ لە ساڵی ١٩٨٨دا لەلایەن (د. یوسف حبی)یەوە کراوەتە عەرەبی و لەژێر ناونیشانی (رحلة اوليڤيه إلى العراق ١٧٩٤ - ١٧٩٦م)، چاپ و بڵاوکراوەتەوە. هەرچۆنێک بێ ئۆلیڤیێ گەشتوەر لە فەسڵی یازدەهەمی بەرگی دووەمی گەشتنامەکەیدا بە کورتی بیرەوەرییەکانی خۆی لەمەڕ (کەلەک و عەنکاوە) و شوێنی ڕوودانی (شەڕی ئەربێلا) و (قەڵای هەولێر) و (قوشتەپە) و (پردێ) تۆمار کردووە، کە لە ١٥ی نیسانی ١٧٩٤ دەستی پێکردووە و لە ٢٨ی هەمان مانگ و ساڵدا کۆتایی پێهێناوە. (ئۆلیڤیێ)ی گەشتوەر پاش گەیشتنی بۆ موسڵ و وەسفکردنی شارەکە، لەبارەی دانیشتووانی دەنووسێ و دەڵێ: ...لە موسڵ حەوت یان هەشت هەزار دیان (یەعاقبە و نەساتیرە) هەیە، هەروەها (١٠٠٠) جوو و (٢٥) هەزار عەرەب و (١٥ - ١٦) هەزار کورد و (١٥ - ١٦) هەزار تورکی تێدایە، بەڵام لەناو شاردا ئێزدی نییە، چونکە ئەوانە بەهۆی دوورکەوتنەوەی خەڵک لێیان مەودا نەدانیان تا بە ئازادی پەیڕەوی ئایینەکەیان بکەن، حەز دەکەن لە چیاکانی خۆیان لە شنگار و هەندێ گوندی ڕۆژهەڵاتی دیجلە کە تێیدا جۆرە سەربەخۆییەکیان هەیە، بژینەوە."

لە ٢٥ی جرمنال (١٤ی نیسان) ئۆلیڤیێ شاری موسڵ بەجێ دێڵێ و بەرەو کەلەک (کەلەکی یاسین ئاغا) بەڕێ دەکەوێ و لە ٢٦ی جرمنال (١٥ی نیسان) دەنووسێ و دەڵێ: (لە ڕۆژی ٢٦ی جرمنال و پاش سێ سەعاتە ڕێ لە زێیەک پەڕینەوە کە ناوی (خازر) بوو.

ئەو زێیە لەلای مێژوونووسە کۆنەکان بە (بومادوس) یان (بۆمیللوس) بەناوبانگە، پاش دوو سەعات گەیشتینە زاب یان (زرب) یانیش زێی بەهێز، کە فارسە کۆنەکان پێی دەڵێن (زاباتس)، یۆنانییەکان (لیکس).

## کەلەک و عەنکاوە

پاش ئەوەی لە زاب پەڕینەوە، گەیشتینە دێیەکی فراوان کە لە نەخشەکەی (بوشامب)ی گەشتوەر بە (کەلەک) ناوی هاتووە و بێجگە لە ئێزدییەکان کەسی تری لێ نییە. بەپێی زانیاری خەڵکی ناوچەکە چەند گوندێکی ئێزدییان لە هەردوو بەری زێیەکەدا هەبوو، هەریەکێکیان ئاغایەکی لێ بوو، بەپێی پایەیان هەندێکیان سەر بە پاشای موسڵ و هەندێکی تریشیان سەر بەپاشای بەغدا بوون. ئەم ئێزدییانە هەمان داب و نەریتی ئێزدییەکانی شنگاریان هەیە، بەڵام ئەمانە وەکو ئەوان توندڕەو نین و سەرۆکەکانیشیان بەشێوەیەکی ئاسایی (جزیە) دەدەنە پاشا و هەر هەمووشیان گوندنشین و خەریکی کشتوکاڵ کردنن و خاوەن مێگەلە حەیوانێکی زۆریشن. زۆربەیان سەرەڕای کشتوکاڵ کردن کەلەکیان هەیە و خەڵک لەمبەری زێوە بۆ ئەوبەری دەگوازنەوە، بە تایبەتی ئەوانەی لە ئامێدی و جزیر و موسڵەوە دەچنە هەولێر و کەرکوک و شارەزوور و بەغدا، یانیش بەپێچەوانەوە. پاش چوار سەعات و سێ چارەگە سەعاتێک گەیشتینە

(عەنکاوە - Ancona) کە دانیشتووانی کورد و سریانی کاتولیکن و سەر بە ئاغایەکی کوردن*[٢]، ئەو دەشتاییەی کە دەکەوێتە نێوان زابی گەورە و ئەم گوندە زۆر بە پیتە و هەر هەمووشی شیناییە، بۆیە بە جوانترین دەشتایی لەو ناوچەیە دەژمێردرێ.

### دیاریکردنی شوێنی شەڕی ئەسکەندەر و داریۆش

ئێمە کەمتر لە یەک فەرسەخ[٣] لە هەولێر دوورین، ئەو شارەی کە ناوی خۆی داوەتە ئەو شوێنەی کە تێیدا ئەسکەندەر بەسەر داریۆشدا زاڵ بوو، بەمەیش ئیمپراتۆریەتی فارس کۆتایی پێهات.

بەڵام ئەو شەڕە لە دەشتی هەولێر رووی نەداوە، بەڵکو نزیکی گوندێک کە بە (گۆگامیلا) ناسراوە، کە لەوانەیە بکەوێتە دەستە راستی زابەوە.

ئەسکەندەر لە (گەلی کرانیک) بەسەر فارسەکاندا زاڵ بوو، هەروەها لە گەلی قیلیقیەشدا، بەمەیش دەستی بەسەر سەردەشت و میلیت و هاکیارناس و گشت ئاسیای بچووکدا گرت و شاری (صور)یشی تێکدا و سوریا و فینیقیە و میسریشی خستە ژێر فەرمانڕەوایی خۆی و دوو شاری دەریایشی دروست کرد، کە هەردووکیان ئێستا بەناوی ئەم زاتە ناونراون، یەکەمیان لە باکووری سوریا و ئەویتریان لە باکووری میسردایە.

ئەسکەندەر بیری لە سەرکەوتنێکی تر دەکردەوە، بۆیە خۆی بۆ چەند شەڕێکی تازە تەیار کرد، سوریا و میسریش زۆر خەریکیان نەکرد، بەڵکو ئیدارەی ئەم ناوچە دەوڵەمەندانەی چاک کرد و گەڕایەوە و دوایش بەرەو (فورات) کەوتە رێ و لە ناوچەی (تابساکوس) توانی بەهۆی کەلەکەوە لەو رووبارە بپەڕێتەوە، کە داریۆس بیری بۆ نەچووبوو بیانسوتێنێ یان لایان ببات، بەمەیش توانی بەبێ هیچ بەرگرییەک بێتە ناو وڵاتی نێوان دوو زێ (دوو زێیان) و لە (دیجلە)ش بەهۆی کەلەکەوە بپەڕێتەوە.

(داریۆس)یش لە باتی ئەوەی هەموو هێزەکانی خۆی لە نێوان دەشتاییەکانی نێوان دوو زێ کۆبکاتەوە، کە دەیتوانی هەر لەوێدا دوژمنەکەی خۆی لە کاتی پەڕینەوەیدا لە فورات تێکبشکێنێ، دەبینین بە پێچەوانەوە دوور دەکەوێتەوە و بابل بەجێدێڵێ و لە دیجلە دەپەڕێتەوە بەرەو هەولێر دەکەوێتە رێ و پردێک لەسەر (لیکس - زاب) دروست دەکات و هەشتا (غلوە) بە پێش دەکەوێ و لە کەناری زابدا شوێنی خۆی دەستنیشان دەکات.

کاتێک کە ئەسکەندەر هێرشی بردە سەر داریۆس، دجلە لە دەستە راستی بوو و چیای (قردوو)ش لە دەستە چەپی، جەنگاوەرەکانی خۆی بە پێی هەواڵی بەدیارکەوتنی دوژمنەکەی ئاراستە دەکرد و بە خۆیشی ١٥٠ غلوە واتە ١٥ میل لێیان دووربوو.

کەس باسی ئەوە ناکات کە ئەسکەندەر لە زاب پەڕیبێتەوە تا نزیکی مەیدانی شەڕەکە، بەڵکو کۆنتینیۆس پێچەوانەی ئەمە دەڵێ و دەنووسێ: "داریۆس جەنگاوەرانی خۆی لە کەناری زێیەکە کۆ کردبووەوە، دوایی ١٠ غلوە بەپێش کەوت تا بحەوێتەوە و خۆی بۆ شەڕەکە ئامادە بکات" جا لەبەر ئەوەی ئەو پارچە زەوییەی کە کەوتۆتە نێوان دوو زێ دەگاتە حەوت یان هەشت میل، بۆمان ساغ دەبێتەوە، کە داریۆس لە زابەکە پەڕیوەتەوە و شەڕەکەش لە دەستە راستی زێیەکە رووی داوە.

ئەسکەندەریش کاتێ بەرەو شەڕەکە هات دیجلە دەکەوتە لای دەستە راستی و چیای قودوش لە چەپی، بەرەو باشووری رۆژهەڵات.

ئەوەی زیاتر عەقڵی پێدەچێ ئەوەیە، کە لەو شوێنە پەڕیبێتەوە، کە ئێستا شاری موسڵی لێیە. پاش تێکشکانی داریۆسیش ناوی زاب نایێ، چونکە ئێمە لە کۆتایی هاوینین و بەر لە بارانی پاییزین، کە لەم ناوچانەدا دوادەکەوێ.

ئەوەی زانراوە شەڕەکە لە ٢ی تشرینی یەکەم روویداوە، لەم مانگەشدا ئاوی زێیەکە کەم دەبێتەوە یان هەر ئاوی تیا نابێ، دەڵێن کاتێ کە داریۆس تێکشکا دووبارە لە کۆتایی رۆژدا لە زاب پەڕییەوە و نیوە شەو گەیشتە هەولێر، بۆیە دەکرێ بڵێین شەڕەکە لە بەیانییەوە دەستی پێکرد تا چواری ئێوارە درێژەی کێشا، داریۆسیش دوو سەعات بە پێیان رۆیشت تا گەیشتە زاب و پێنج یان شەش سەعاتیش تا گەیشتە هەولێر، ئەمەیش لەگەڵ ئەو مەسافەیەی کە رۆیشتبووین کۆکە،

چونکە ئێمە دوو سەعاتە ڕێ لە زێی (خازر)ەوە گەیشتینە زاب و پێنج سەعاتیش لە زابەوە بۆ هەولێر.

**قەڵای هەولێر**

لە ٢٧ی جرمنال (١٦ی نیسان) عەنکاوەمان بەجێهێشت، پاش نیو سەعاتە ڕێ گەیشتینە باشووری هەولێر، هەولێریش شارێکە لەسەر تەپۆڵکەیەکی دەستکردی بڵند دروست کراوە، ئەمڕۆ هەمان شوێنی قەڵاکەی گرتووە و بە شوورەیەکی کۆن دەورە دراوە، ئەم تەپۆڵکەیە لە تەپۆڵکەی حەلەب و گشت تەپۆڵکەکانی وڵاتی نێوان دوو زێ زۆر بەرزترە و زۆر زەحمەتیشە قەناعەت بەوە بێنی، کە ئەم تەپۆڵکەیە دەستکردی مرۆڤ بێ، ئەگەر لەم ناوچەیەی ئاسیادا چەند تەپۆڵکەیەکی هاوشێوە نەبن.

ژمارەی دانیشتوانی هەولێر ٢٠٠٠ کەس دەبێ، تەقریبەن هەر هەموویان لە کورد و کلدانن، ئەم شارە لە رابردوودا پانتاییەکەی لە دەشتدا زۆرتر بووە، کە ئێستا هەندێ کەلاوەی تێدایە.

هەروەها دوور لە شار منارەیەک هەیە، کە هی سەردەمی خەلیفەکانە، نەیبور دەڵێ سوڵتانێک لە کەرپووچ و گەچ دروستی کردووە ناوی (مسافر)*[5] بووە و بەهۆی دوو قالدرمەشەوە، کە بەرامبەر یەکن بەسەردەکەوی.

هەولێر سەر بە پاشایانی بەغدایە و سنجەقێکی لێیە، هەروەها سەربازگەیەکی بەهێزی یەنکشەری، کە سەربازەکانی لە قوستەنتینییەوە دێن.

**قوشتەپە - پردێ**

بە درێژایی ڕۆژ باران دەباری و بایەکەشی ڕۆژئاوایی بوو، هەشت سەعات و نیو ڕۆیشتین و لەکاتی ڕۆیشتنیشماندا گوندێکی بێ کەڵکمان بینی کە ناوی قوشتەپە بوو، کە گەیشتینە پردێ میوانی ئاغا بووین و نانی ئێوارەمان هەر لەوێ لەگەڵ کوڕەکانی ئاغا خوارد، کە بریتی بوو لە پلاو و گۆشت و بەرخ و دۆلکەک شیری مەڕ و قاپێکی گەورەی ماست، قاپی بچووکمان نەبوو، بەڵکو هەموومان لە سینییە گەورەکەمان دەخوارد، داوای ملاکمان لێ کردن بۆیان هێنایین، کە لە دار دروست کرابوون، ئەمەیش باوە لە وڵاتی عوسمانی و فارسدا.

کوڕانی ئاغاش بەدەست خواردنەکەیان دەخوارد، برنج و گۆشت یان برنج و ماستیان تێکەڵ یەکتر دەکرد و دەیانخوارد و شیرەکەشیان بە نۆبەت دەخواردەوە، پاش ئەوە تووتن و قاوەیان بۆ هێنایین.

پاش چارەگە سەعاتێک لە نان خواردن یەکێک هات و گوتی: ئاغا شەو دێتە لاتان، بەڵام ئێمە داوای لێبووردنمان لێ کرد، چونکە پێویستیمان بە حەسانەوە هەبوو، ئەویش عەفوی کردین و کوڕەکانیشی یەک لە دوای یەک خۆیان لە ئێمە کێشایەوە و هیوای سەفەرێکی خۆشیان بۆ ڕۆژی دادێ کرد.

پردێ یان (ئاڵتون کۆپری) لەملاوئەولای زێیەک دروست کراوە، کە پێی دەڵێن زابی گچکە یان بەپێی ناوە کۆنەکەی (کابروس). بەهۆی پردێکەوە دەچییە ناو گوند و بە پردێکی تری گەورەتر و بە کەوانە لێی دەردەچی.

**پەراوێزەکان**

١- بوشامب: گەشتوەرێکی فەرەنسییە ساڵی ١٧٨٣ گەشتێکی بۆ عیراق کردووە، لە گەشتنامەکەیدا کە بەناونیشانی (تێروانینەکانم لە ئاسیادا) بەوردی باسی بەغدا دەکات.

٢- ناوە کۆنەکەی عەنکاوا (نەک عەنکاوە) - عەمکا - بووە و دیانەکانیشی پاشماوەی ئاشوورییەکانن، وشەکانی سریان و نەساتیرە و کاتولیک و کلدانیش بەپێی باوەڕی ئایینی مەزهەبی و بە درێژایی مێژوو دروست کراون، چونکە ئەم میللەتە پاش ڕووخانی دەوڵەتەکەی (واتە دەوڵەتی ئاشوور) بۆ چەند مەبەستێکی تائیفی ناوی گۆڕاوە.

گەشتوەر کە دەڵێ دیانەکانی عەنکاوا سریانی کاتولیکن ڕاست ناکات، چونکە کاپولییەت لە ساڵی ١٧٧٨دا هاتۆتە عەنکاوا و لە ساڵی ١٧٩٣شدا هەر بەخۆیان (واتە خەڵکی عەنکاوا دژی ڕاوەستان و گەشتەکەی (ئۆلیڤیێ)ش پاش پاش ئەو ساڵە بووە واتە لە ساڵی ١٧٩٤ی ز.

٣- فەرسەخ: مەسافەیەکە بەپێی سەردەم گۆڕاوە، واتە لە نێوان ٤.٥ - ٥.٥ کیلۆمەتر بووە.

٤- هەندێ لە شوێنەوارناسان دەڵێن (گۆگامێلا)یە هەمان گوندی (کرملیس)ی نزیک حەمدانییەی موسڵە بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە بێ بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونە.

٥- (مسافر) نییە، بەڵکو (موزەفەرەدین)ە، ناوەکەی لە ئەسڵە فەرەنسییەکەدا بەم شێوە نووسراوە: (Musafer).

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٢) ساڵی (١٩٩٩) بڵاوبۆتەوە.

# زانایانی حەدیاب

دکتۆر هاشم یاسین حەمەدەمین حەداد
کۆلێژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین

تێبینی: حەدیاب ناوێکە ماوەیەکی دیاریکراو بە هەولێر و دەوروبەری گوتراوە، بۆیە (حەدیاب) ماودیەکی زەمەنی دیاریکراو لە مێژووی هەولێر، نەک هەموو مێژووی هەولێر، هەندێک لەم ناو و رووداوانەی نووسەر باسی کردوون ناکەونە نێو ئەو زەمەنە.

شاری هەولێر، دەکەوێتە دووریەکی یەکسانی نێوان هەردوو زێی گەورە و بچووک، (حەد) هەندێ جاریش پێیان دەگوترێن زێی سەروو خواروو، پایتەختی هەرێمی (حەدیاب) بووە. وشەی (حەدیاب) یش لە زاراوەی (زابین - دوو رووبار، یان دووزێ) وە داتاشراوە و (زاب) یش لە زمانی ئارامیدا واتای (داب) دەگەیەنێت، کەلە رووی جوگرافییەوە بەشی هەرە زۆری وڵاتی ئاشووریی کۆن دەگرێتەوە و هەر لە سەدەی پێنجەمی پێش زاینیشەوە، ناوی لە سەر زاری (هیرۆدۆتس)دا هاتووە. عەرەبەکانیش ناوی (حزە) یان لە (حەدیاب) نابوو - یاقوت الحموی - ش لە نووسینەکانیدا البلدانیون العرب باسی (حەدیاب) دەکات و دەڵێت: شارۆچکەیەکی بچووکە و لە خاکی موسڵدا کەوتۆتە نزیک (اربل)، کە لە پێشدا بە (کورە اربل) ناسراوبوو، تاکو ئێستاش شوێنی (حزە) دیارە.

هەولێریش تاکە بنکەی حەدیابی نوێیە، کە هەر لە سەردەمی سۆمەری و بابلی و ئاشوورییەکانەوە بگرە تاوەکو ئێستاش خەڵکی تێدا دەژین و ئاوەدانە و ناونیشانی لە نەخش و نیگارە فارسییەکاندا هاتووە، کە بە (بزماری) نووسراونەتەوە.

ئاشووری و ماوی و ئەغریقی و فورسی و ئەرمەن و ساسانییەکان یەک لە دوای یەک حوکمرانی (حەدیاب) یان لە هەولێری پایتەختدا کردووە، پاش رووخانی دەوڵەتی ئاشووریش لە ساڵی (٦١٢ پ. ز) کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی مادەکان[١]. پاش ئەوانیش، فەرمانڕەوایی کەوتۆتە دەست موسڵمانەکان.

لە ساڵی (٣١٠) ی زایینیدا هەرێمی حەدیاب نۆزدە ناوچەی بەخۆوە گرتبوو، کە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١- زێی خواروو ٢- رەواندز٣- شەقڵاوە٤- زێی سەروو٥- خاپوور ٦- جزیرە ٧- موسڵ ٨- شنگار ٩- شەرگات ١٠- دهۆک ١١- زاخۆ ١٢- ئامێدی١٣- گارە ١٤- ئاکرێ و زێبار ١٥- پشدەر ١٦- رەواندز و ناوچەکانی رۆژهەڵاتی کۆیە ١٧- عین سفنی و شێخان ١٨- ورمێ و مەراغە ١٩- هەرێمی دەوارنشینەکانی نێوان: ژەنگار و شەرگات [٢].

حەدیاب لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی فورسییەکاندا سەربەخۆ بوو و لە سەدەی یەکەمی زایندا لەوپەڕی پێشکەوتندا بوو و دەسەڵاتی گەیشتبووە نەسیبەین و حەڕان و ماردین و بەشێکی ئەرمینیا، لە ساڵانی (٧٠- ٧٥ پ. ز) ئەفراهاتی سێیەم سەربەخۆیی فەرمانڕەوایی کارگێڕییەکی لامەرکەزی بەناوچەکە بەخشیبوو. ناودارترین پاشای حەدیابیش ئیزاتی یەکەمی بوو، کە پاش ئەو مۆنا بازۆسی یەکەم (٣٦- ٦٠ ز) و ئینجا ئیزابی سێیەم تاکو (١١٥ ز) فەرمانڕەواییان کردووە، لە کتێبی (تاریخ اربل السریانی) یشدا ناوی چەندین پادشای حەدیاب هاتووە، لەوانەش (شهراط) و (پرسای)، کە ئەوەی دووایییان تا سەدەی سێیەمی زاینی فەرمانڕەوا بووە، نزیکەی دووسەدە لە ژێر دەسەڵاتی ئەغریقەکاندا بووە. لە (١١٥ ز) تراجانی رۆمانی لە کاتی داگیرکردنی (تیسفون) شانشینی حەدیابی لە سەر رێگای خۆیدا داگیرکردووە.

لە سەردەمی کرا کالا (٢١١ - ٢١٧)، رۆمانەکان جارێکی دی دەستیان بە سەر حەدیابدا گرتەوە و لەگەڵ سەرهەڵدانی رەچەڵەکی ساسانییەکاندا ئەردەشێر ساڵی

(٢٢٦ ز) لە هەولێری دەرکرد. بەم شێوەیە حەدیاب و هەولێر ببوونە گۆڕەپانی رووداوە مێژووییەکان. لە سەردەمی ساسانییەکان (قرداغ الامیر الاربلی) بووە فەرمانڕەوایی و فەرمانڕەوایەتی بۆ شاپووری دووەم بە جێهێشت تاوەکو لە ساڵی (٣٥٨) ی زاینیدا شەهید کرا. دەسەڵاتیشی لە رووباری دیالەوە درێژبووەوە تاکو دەگەیشتە نەسیبەین و هەوڵی سەربەخۆییان لە ئیمپراتۆریەتی ساسانیدا دەدا[٣]. لە پاش رووخانی شانشینی (رەها)شدا حەدیاب جارێکی دی پایە شارستانێتییەکەی خۆی دەستگیر بۆوە، چونکە رەها ببووە هۆی ململانێ و کێشە بەرەی نێوان رۆمەکان و ساسانیەکان.

لە رووی رۆشنبیرییەوە حەدیاب هەر لە سەدەکانی زاینی بەراییدا ناوبانگی بە پێشکەوتوویی و ئاست بەرزیی بواری رۆشنبیری دەرکردبوو و چەندین زانا و ئەدیب و شاعیرو سیاسەتمەدار و کارمەندی تێدا، ژیاوە. لەوانەش زانا موسڵمان و سریانەکان، کە لە زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکاندا ناویان هاتووە. (شاری ئۆدیس) یەکێک بووە لەوان و لە چەندین سەرچاوە سریانییەکاندا ناوبراوە[٤]. (گورگیس الاربلی) لە پیاوانی سیاسەت بووە و فەرمانڕەوایی حەدیابی کردووە. لە سەدەی هەشتەمی زاینیشدا (بابا الجبلتی) هات و تەنها لە حەدیابدا شەست قوتابخانەی کردەوە. و (توما المرجی) ناوی هێندێ لەو قوتابخانانەی لە کتێبی (الرؤساء)دا هێناوە[٥]، کە گرنگترینیان قوتابخانەی (کفر عوزێر) بوو لە عەزەی نزیک دێی (سربس عەزیز) و کەوتبووە باشووری رۆژئاوای هەولێر و تەنها شانزە کیلۆمەتری لێوە دووربوو. یاقوتی حەمەویش لە فەرهەنگەکەیدا ناوی هێناوە، جگە لەمەش ناوی چەندین مامۆستای وەکو (پۆلس) و (سەرجیۆس) ی مامۆستایانی (حزە) لە سەرچاوە سریانییەکاندا هاتووە پاشان پاپا چۆتە مەرگا، کە ئەویش ئاکرێ و ناوچەکانی دەوروبەری دەگرێتەوە و هەرسەر بە هەرێمی حەدیاب بووە، لەوێش بیست و چوار قوتابخانەی دروست کردو ناودارترین زانای ئەو کاتی حەدیاب (گگیانس الحدیاب) ە کە بایەخێکی زۆری بە ئەدەبیاتی رۆژهەڵات و ئارامی و یۆنانییەکان داوە و لە ساڵی (١٨٠) ی زایین کۆچی دوایی کردووە[٦].

لە سەدەی شەشەمی زایندا (ابراهیم النشغری) یش چەندین قوتابخانەی لە حەدیاب دامەزراندووە. لە ئەدیبە ناودارەکانی سەدەی دوانزەشدا (شەمعونی شەقلاودیی) بوو، کە لە شەقلاوەی سەر بە هەرێمی کوردستان دەژیا و کتێبێکی لە سەر ئەدەب و مێژوو داناوە. هەروەها کتێبی (قصائد فی الشعر السریانی) یشی نووسیوە و هۆمخانی رۆژهەڵاتناس لە پاریسدا بڵاوی کردۆتەوە.[٧] و سەمعانی سەمعانیش لە کتێبخانەی رۆژئاوایی لە رۆمادا ناوی بردووە. هەرچی (حنا یشوع الحدیابی)شە لە هەولێر لە دایک بووە و خوێندنی لە نەسیبەین تەواو کردووە و پاشان چۆتە قودس و لەوێشەوە چۆتە میسرو پاشان دووبارە گەڕاوەتەوە هەولێر و چەندین کتێبی نووسیوەتەوە و بە چاپی گەیاندوون، کە لە هەموویان گرنگتر کتێبی (القوانین)، کە بێجان لە ساڵی (١٨٧٩) لە پاریسدا چاپی کردوون. جگە لەم سەرچاوانەش سەرچاوەی دیکە هەن کە گوزارشت لە مێژووی زانست و زانایانی حەدیاب دەکەن و هێندێکیان هێشتا دەستنووسن و هێندێکیشیان لە (دیر السیدە) لە قوشدا پارێزراون.

رۆستەمیش کە لە سەدەی حەوتەمی زایندا لە (تەلەرخێم) لەدایکبووە، کە تەنها حەڤدە کیلۆمەتر لە باشووری رۆژهەڵاتی هەولێرەوە دوورە، یەکێک بووە لە زانا ناودارەکانی ئەوسای هەرێمەکە و لە بواری ئەدەب و مێژوودا گەلێ بەهرەمەند بووە و جگە لە چەندین نووسینی دیکەی مێژوویی کتێبێکی لە (شرح المعانی) دا نووسیوەتەوە. لە مێژووی زانستی و رۆشنبیری حەدیابدا ناوی ئەدیبێکی دی تۆمارکراوە بە ناوی (طیمثاوس الاول) کە ئەویش هەر لە هەولێر لە دێی بنەسڵاوە لە دایک بووە. کە ئەوسا لە سەرچاوە سریانییەکاندا پێیان دەگوت (بیت صیادی) و فەرمانڕەوایی هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری کردووە و هاوچەرخی هەر پێنج خەلیفە عەباسییەکان بوو (الامین، المامون، المهدی، هارون الرشید، الهادی). لە کارە گرنگەکانیشی بەستنی کۆنگرەیەکی گشتی بوو، کە تێیدا (٩٨) یاسای لە (فرائض) و (احکام) داناوە لە گەڵ کتێبێکی زانستی لەبارەی ئەستێرە و هەسارەکان و بۆشایی گەردوون و کتێبێکی دیش بە ناوی

(رسائل في الفلسفة و العلوم)[٨].

(دادایشوع) كە ئەویش زانستەكانی لە نەسیبەین وەرگرتووە و پاشان لە ساڵی (٥٢٩) ی زایینی هاتۆتە هەولێر و نزیكەی حەوت ساڵان لە چیاكانی حەدیابدا ماوەتەوە، هەروەها (یعقوب المعلم) یش لە قوتابخانەیەك كە كەوتبووە سەر زێی خواروو (زابی گچكە) دەرسی دەوتەوە.

كلتووری رۆشنبیری حەدیاب گەنجینەیەكی دەوڵەمەندی لە چاپەمەنی و دەستنووس و نامە زانستییەكانی لە پاش بەجێماوە. و زۆربەی زۆریان سەبارەت بە سەقامگیرنەبوونی دۆخی سیاسی و ئاسایش و ئارامی ناوچەكە و یەك بەدوا یەكدا هاتنی فەرمانڕەواكان و شەڕو شۆڕە بەردەوامەكانی دەوڵەت و هۆزەكانە و بزر بوون و لە ناوچوونە. لە گەڵ ئەوەشدا هێشتا هێندێكیان لە كتێبخانە جیهانییەكاندا پارێزراون و هێندێكیان لە لایەن توێژەران و رۆژهەڵاتناسان بە زمانە بیانییەكان و هێندێكی دییان بە زمانی سریانی بڵاوكراونەتەوە، كۆچی هێندێكی دییان بە شێوەی گوتارو لێكۆڵینەوە لە زانكۆكانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا دا بڵاوكراونەتەوە. (ابن العبدی) یش لە مێژووەكەیدا ئاماژەی بۆ ئەم راستییە كردووە[٩]. سەمعانیش لە كتێبخانەی رۆژهەڵات لە پاریس و لە نووسینەكانی (شابۆ) بە زمانی فەرەنسی (الپاترولوجیا الفرنسییە) و موسا یۆنان لە كتێبەكەی (حركە الشرمیە فی العصر العباسی) بڵاوكراونەتەوە. سەرچاوەیەكی كۆنی سریانیش هەیە بەناوی (تاریخ اربل) (التونس منكنا) لە ساڵی ١٩٠٧ لە موسڵدا بڵاوكراوەتەوە و پەترۆس عەزیز وەری گێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و لە گۆڤاری ((النجم الموصلیة)) لە ساڵانی ١٩٢٩، ١٩٣٠، ١٩٣١ بڵاوكراوەتەوە.

سەرچاوەیەكی گرنگی مێژووی هەولێر و ئەدیبانێتی لە سەدە بەراییەكانی زایندا. كتێبەكەی (توما المرجی) یش كە ناوی (الرؤساء) بڵاوكراوەتەوە سەرچاوەیەكی مێژوویی مێژووی حەدیاب و ناوچەكانی دەوروبەرێتی و ناوی چەندین شوێنی ناوچەكانی حەدیاب و كوردستانی وەكو (ئاكرێ، دهۆك، زاخۆ، ئامێدی، رەواندز، شەقڵاوە، كۆیە) ی تێدا تۆمار كراوە، مامۆستا (زوبێر بیلال ئیسماعیل) یش ئاماژەی بۆ پلەو پایەی زانست و رۆشنبیری لە حەدیابی سەدەكانی پێشوودا كردووە.

چاپكراوو دەستنووسەكانی (ئەدی شیر) یش، كە لە ساڵی (١٨٦٧) دا لە شەقڵاوە لە دایك بووە، لە مێژووی حەدیابدا دیارو ئاشكران و كتێبی (كلدو ئاثور)ی، كە سەرچاوەیەكی بە پێزی مێژووی حەدیاب و ناوچە كوردنشینەكانی دیكەیە، لە ساڵی (١٩١٣) دا لە بەیروت چاپ كراوە. (تاریخ سعرد) یشی لە ساڵی ١٩١٨ و مێژووی شەهیدانی كەركووك لە ساڵی ١٩٠٦ بڵاوكراوەتەوە. سەرباری چەندین توێژینەوە و لێكۆڵینەوە دەربارەی مێژووی كوردستان و لە گۆڤاری ئاسیای بەرگی (١٥) لە ساڵی (١٩١٠) لە رۆمادا بڵاوبوونەتەوە و (تاریخ كركوك) یشی لە توركییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و تاوەكو ئێستاش لە (دار المطرانیة) ی كەركوكدا پارێزراوە. كتێبێكی دیشی بەناوی (تاریخ مدرسە نصیبین) لە ساڵی ١٩٠٥ لە بەیروتدا بڵاوكردۆتەوە. لیستەیەكی ناوی كتێبەكانی كتێبخانەی (سعرد) و دەستنووسە سریانییەكانی كتێبخانەی دیاربەكری بە زمانی فەرەنسی لە بەرگی (١٠) ی ساڵی (١٩٠٦) ی هەمان گۆڤاری ئاسیایی و دەستنووسەكانی كتێبخانەی ماردینی كلدانیشی لە گۆڤاری (الكاتب السریانی) بەرگی هەژدەی ساڵی (١٩٠٨) بە زمانی فەرەنسی بڵاوكردۆتەوە. (١٣٦) دەستنووسیش لە سەر (دیاربەكری توركیا) هەیە، كە (١٢٣) دانەیان بە زمانی سریانی نووسراونەتەوە و مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستەكانی سەدەی نۆزدە، پێش مردنیشی چەندین دەستنووسی لە شارە كوردنشینەكانی دهۆك و ئاكرێ و ئامێدی و هەولێردا كۆكردووە. وێڕای دەستنووسەكانی ئەدیبە سریانییەكانی رۆژهەڵاتناسەكەش ئاماژەی بۆ فەرامۆشی و كاری تێكدەرانەی دژ بەم كتێبخانەیە كردووە و ناوی هێندێ لە ئەدیبانی هەولێری هێناوە، لەوانە: (ابراهیم الاربیلی)، كە لە (نشغر) ی سەر بە ناحیەی گوێر لە دایك بووە (نشغر) یش كەوتۆتە سەر رێی سەروو و واتاكەی (قیر) یان (ئەسفەلت)ە، ئەم ئەدیبە زانا و فەیلەسوفێكی گەورەی سەرەتای سەدەی حەوتەمی زایین بوو و لە دێهات و چیاكانی كوردستاندا گەڕاوە تا گەیشتۆتە ئازەربێجان و، سەمعانیش لە

کتێبخانەی رۆژهەڵات و گۆڤارە ئاسیاییەکە ناوی بردووە و شابۆی رۆژهەڵاتناس لە نووسینەکانی پاریسدا بە زمانی فەرەنسی ناوی هێناوە. مەلا جەرجیسی هەولێریش، کە لە ساڵی ١٧٢٣ لە هەولێردا لە دایک بووە، ئەدیبێکی دیکەی حەدیاب بووە و زانایەکی پایەبەرزی زانستە عەقلییەکان بووە و چۆتە ماوەران و وانەکانی لە سەر دەستی شێخ ئیبراهیمی حەیدەری وەرگرتووە و پاش چوونە حەجێ گەڕاوەتەوە هەولێر قوتابییان لە هەموو لایەکەوە روویان لەم زانایە کردووە. ئینجا چۆتە بەغدا و ڕێبازی نەقشبەندی هەڵگرتووە و جارێکی دی گەڕاوەتەوە هەولێر و دواجاریش رووی کردۆتە ئاکرێ. جگە لەمانە چەندین بنەماڵەی زانست پەروەر و زانایانی تێدا هەڵکەوتووە و لەوانە بنەماڵەی ئەبوبەکری هەولێری و حەیدەری و بنەماڵەی جەلیزادە و ئیبن ئادەمی باڵەکی و مەلا رەسولوڵلای گراوی و مستەفای زیارەتی و مەلا محەممەدی بێتواتە[١١].

لە سەردەمی بنەماڵەی ئەتا بەگییەکاندا هەولێر بووژانەوەیەکی رۆشنبیری بەخۆوە بینیوە، (مزەفەرەدین گۆکبری)، کە دیارترین فەرمانڕەوای ئەوسای ناوچەکە بوو لە دروستکردن و دامەزراندنی قوتابخانەکان و لە کاتی فەرمانڕەوایی ئەودا چەندین ناوەندی زانستی و رۆشنبیری و ئایینی سەری هەڵدا، جگە لە ئەڵقەکانی خوێندنی ناو مزگەوت و قوتابخانەکان.

(جعفر بن هبة الله الكفر عزي الاربلي)یش وتار خوێنی مزگەوتەکە بوو لە سەردەمی (مزەفەرەدین گۆکبری) و رەنگە یەکەمین قوتابخانە لە هەولێری سەردەمی ئەتابەگییەکان قوتابخانەی (العقيلية)بێ، کە بە ناوی (الفقيه ابی عباس الخضر ابن نصر بن عقيل العقيلي) کراوە، کە لە ساڵی ١٠٨٥ لە هەولێردا لە دایک بووە، (ئەبو مەنسور سرفتكين)ی جێگری موزەفەرەدین لە ساڵی ١١٣٨ قوتابخانەیەکی لە قەڵاکەی هەولێر دامەزراندووە، ئیبن خەلەکان دەڵێ: (ابن الفضيه ابا القاسم عزالدين) بۆتە مامۆستای قوتابخانەکە و وانەی تێدا گوتۆتەوە. (مجاهد الدين قايماز) ی جێگری دووەمی میر (زين الدين علي كچك ((کوچک) یش لە ماوەی دوانزە ساڵی فەرمانڕەوایدا (١١٦٤ - ١١٧٥) چەندین دامەزراوی لە هەولێر دروست کرد، قوتابخانەی موزەفەرییەش گرنگترین ئەو قوتابخانەیە بوو، کە موزەفەرەدین گۆکبری دروستی کردبێ و هەر خۆشی وانەکانی لە سەر مەزهەبی شافعی و حەنەفی تێدا گوتۆتەوە (صاحب اربل)یش سەرپەرشتیاری کاروباری قوتابخانەکە بوو. (ئیبن خەلەکان) ی مێژوو نووسیش لە ساڵی (١٢١١) دا لەوێ لە دایک بووە.

(دار الحديث) یش هەر لە لایەن موزەفەرەدینەوە دامەزراوە و هەتاکو (١٢٣٧) لە کاتی بەتاڵانبردنی شارەکە لە لایەن مەغۆلەکانەوە لە چالاکییەکانی خۆی بەردەوام بووە[١٢].

(عەبدولڕەزاق الحصان)یش دەڵێ: هەولێر بووە ناوەندێکی تیشکدانەوەی رۆشنبیری و زانست و فەرهەنگ و قوتابییان لە رۆژهەڵات و رۆژئاواوە روویان تێدەکرد[١٣].

گەلێ زانا و ئەدیب و شاعیریش سەردانی هەولێریان کردووە، لەوانە لە ئەندەلووسەوە (ابا الخطاب عمر الحسين البلنسي) لە ساڵی ١٢٢٧ و لە ساڵی (١٢٢٩) شاعیر (يحيى ابن شاۆول) لە شاری (طليطلة) ی ئەندەلووسی و (ابو المظفر جما الدين) لە (واسط) دوە لە ساڵی (١٢٢٦) دا سەری لە قوتابخانەی موزەفەرییە داوە، جگە لەمانە ژمارەیەکی زۆری ئەدیبانیش سەریان لە هەولێر داوە و ماوەیەکی زۆری تێدا ماونەتەوە، نموونەیان (ابو البركات)ە، کە بە (ابن الشعار الموصلي)ناسرابوو و خاوەن کتێبی (عقود الجمال في شعراء االزمان) ە لە ساڵی ١٢٢٨. هەروەها مێژوو نووسی ناودار (ئیبن ئەسیر) ی خاوەن کتێبی (الكامل في التاريخ)، ساڵی (١٢٢٤) و (ابو الثناء بن الحسن النحوي) نابینای ناسراو بە (ابن الارمله) و قورئانی تێدا لە بەر کرد و ئەدەبیاتی لەوێ خوێندووە و لە ساڵی (١٢٠٩)دا هەر لە هەولێر مردووە. لە گەورە دادوەرانی ئەوساش، کە لە هەولێردا ماونەتەوە (شێخ عبداللطيف بن عبدالله محمد السهروردي) ی ئامۆزای شێخ (عمر السهروردي) یە، کە لە پاشان بەرەو شام چووە و خۆی گەیاندۆتە ریزی هێزەکانی سەرکردەی کورد (سەلاحەدینی ئەیوبی). ئەمجا گەڕاوەتەوە هەولێر لە ساڵی (١٢١٣) هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

(ابو عبدالله زكي الدين)ی

گەڕیدەو زانای (نحو) و (ابا حفص بن مـهـران)و (ابو الحسن التـركي البغدادي) یش سەردانی هەولێریان كردووە. بنەماڵە زانست پەروەرەكانی ئەو سـەردەمـەی هەولێـریش ئیبن خەلەكان و ئیبنولمستەوفی، كە ئەوەی یەكەمیـان لە سـاڵی (١١٦٢) لە هەولێر لە دایک بووە و خاوەن كتێبی (وفیات الاعیان)ە لە قوتابخانەی نیـزامـیـیەی خـوێندووە و سـەری لە مـیـسـرو شـام و حـیـجـاز داوە و بەرەزامەندی موزەفەرەدین گۆگبری چۆتە حـەلەب و لەوێ بە یەكجـاری جێگیر بووە.

هەرچی (ئیـبنولمسـتـەوفی)یە مـێـژوونووس و ئەدیبێـكی هەولێـری بووە و لە ساڵی (١١٦٩) لە قەڵای هەولێردا لە بنەماڵەیەكی ڕۆشنبیر لە دایک بووە و هەر لە قوتابخانەكانی ئەوێشدا خوێندوویەتی و (ابو الحسن صفي الدين علي المبارك) ی مـامی كـتـێبی (تضحـیـة الملوك) ی (امام ابي حامد الغزالي) ی لە فارسییەوە وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی عەرەبی و خـۆشی كـتـێـبـێكی لە چوار بەرگدا وەرگرتووە، جا پاش موزەفەرەدین، كە لە سـاڵی (١٢٣٣) دا كـۆچی دوایی كردووە، لە كاتی هێرشی مەغۆلەكان لە ساڵی (١٢٣٧)، ئیبنولمستەوفی لە قـەڵادا مـاوەتەوە و لە گـەڵ ئارامـبـوونەوەی بارودۆخـەكـەدا (بدرالدين لؤلؤ) فەرمانڕەوای موسل گـرتـۆتـیـە خـۆیەوە و بە گـەرمـی پێـشـوازی لێ كـردووە و زۆری ڕێز لێناوە، هەر لەلای ئەودا مـاودتەوە تاكو ساڵی (١٢٣٩) كۆچی دوایی كردووە.

بنەمـاڵەی (ابن منعـە) ش لە بنەمـاڵە ناسراوەكـانی ئەو سـەردەمـە بوون و دەسـتـێكی باڵا و دیاریان لە وانە گـوتـنەوە و زانست و (فـقـە) دا هەبووە[١٤].

لە سـەدەی سـیـانزەی زایینـیـشـدا (گـورگـیس وردە الاربلی) ی ئەدیب، لە حـەدیابدا ژیاوە و شـیـعـرو هۆنراوەكـانـیـشی لە لایەن ڕۆژهەڵاتناسـەكـانەوە لە سـاڵی (١٩٠٢) لە ئەڵمـانـیـادا بڵاوكـراوەتەوە، (خـامـیس قـرداخی) یش، كـە لە هەولێـردا لە دایكبـووە (٦٥) هۆنراوەی بە زمـانی سـریـانی هۆنیـوەتەوە و تا كـو ئێـسـتـاش دەسـتنووسـەكـانی مـاون، هەروەها (طیمثاوس) لە ساڵی (٧٢٧) دا لە (عەزە) لە دایكبووە و لە قوتابخانەی (باشوش)، كە دەكەوێتە نێوان زێی گـەورە و خـاپووڕەوە خـوێندوویەتی. (ابراهیم بردشـداد)، كـە لە زانا ناودارەكانی هەولێر بووە، فەلسەفەی ئەرسـتـۆو فـەلسـەفـەی سـریانیی خوێندووە و تەنها (٥٩) نامەی ماون و (هارون الرشیـد) داوای لێ كردووە كتێبە شیعرییەكەی ئەرستۆ وەرگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی[١٥].

هەروەكو لە پێشدا باسمان كرد، شـەڕو شـۆڕو هەڵمـەتی داگـیـركـردنە یەک لە دوایەكـەكـانی مـەغـۆل و تەیموری لەنگ سـاڵی (١٧٣٢) و هێـرشـەكـەی نادرشـا كـاولكردن و وێرانی شـارەكـەیان بەدواداهات و مۆمی درەوشاوەی زانست و ئەدیبانی بەرە بەرە كـز كـردو لە پاش سـەدەی سـێـزدەمی زاییندا مـێـژووی ڕەشی وڵاتـیـان تۆمـار كـرد، پاش ئەوەی چـەنـدیـن ڕۆڵـەی زانـاو ئـەدیـب و ڕۆشنبـیـری تێـدا لەدایک بوو و لە باوەشی زانـست و فـەرهـەنگدا پەروەردە كران.

## پەراوێز و سەرچاوەكان


١- زبیر بلال اسماعیل: (مملكة حدیاب) مجلة بين النهرين ژمارە ٦٥/ ٦٦ ی ساڵی ١٩٨٩.
٢- اسطیفان بابكە: حدياب في التاريخ مجلة بين النهرين ژمارە ٣١ی ساڵی ١٩٨٠، هـەروەهـا تـاريـخ اربيـل السرياني - مشيحا زخا.
٣- زبیـر بلال اسـمـاعـیـل: مـجلة (بين النهرين) سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦.
٤- ادي شیـر: كلدو و اثور بەرگی دووەم، بەیروت ١٩١٣ ل ٥٠.
٥- توما المرجي: الرؤساء ل ٤٧.
٦- روفـائیل اسحاق بـابو: تاریخ نصاری العراق ل ٩.
٧- دوڤـان: تاريخ الادب السـرياني: وەرگێڕانی بۆ عەرەبی لويس القصاب. ل ٣٥.
٨- گـورگـیس عـواد: التـراث السـرياني مجلة المجمع السـرياني بەرگی چوارەم ساڵی ١٩٧٨.
٩- ابن الصبري: تاريخ مـختـصـر الدول بیروت ١٩٨٣ ل ٩٠.
١٠- ادي شـیـر وبقـایا مكتـبـة سـعـرد: گـورگـیس عـواد، مـجلة المجـمع السرياني، بەرگی یەكەم ل ١٩٧٥.
١١- زبیـر بلال اسـمـاعـیـل: علمـاء و مـدارس في اربیـل، مـوسـل ١٩٨٤ ل ١٠.
١٢- زبیـر بلال اسـمـاعـیـل: سـەرچاوەی پێشوو ل ٢٥١.
١٣- عبدالرزاق الحصان: نظرة عابرة في شمال العراق ل ٥٨.
١٤- مـحسن مـحـمـد حسـین: اربیل في العهد الاتابكي، مطبعة اسعد، بغداد ١٩٧٦ ل ٢٦٨.
١٥- بطرس نصـري: ذخـیـرة الاذهان، موسڵ ١٩٠٥ ل ٤٥.


* ئەم بابەتە لە گـۆڤـاری هەولێـر - ژمـارە ٨ی پایزی سـاڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.

# یەزدان دۆخت ... شەریفەی ئەربیلی

نوری پەتروس

ولاتانی رۆژهەلات، لەوانەش (ولاتی نێوان دووزێیەکە - بلاد ما بین النهرین)، کەوتنە ژێر کۆنترۆل و دەسەلاتی (شا ئێرانییەکان) لە سیلالەی (ئیرشافییەکان)، کاریگەرییەکانی گەیشتە ولاتی بابلییەکانی باشوور، لە سالی (٢٢٦ ز) حوکمی ئیرشافییەکان رووخا و نەما، (ئەردەشیری یەکەم) بنەمالەی یەکەمی ساسانییەکانی دامەزراند (٢٢٦ - ٢٤١ ز)، ئایینی مەزدەکی لە هەرێمەکانی ئێران بلاو ببۆوە، لە دوای خۆی (شا شاپووری یەکەم - ٢٤١ - ٢٧١ ز) حوکمی وەرگرت، گەورەترین شا بوو لە دەولەتی ساسانی لە سەدەی سێیەمی زایینی، هەر لە سەردەمی ئەو شایە، ئایینی زەردەشتی بلاو بۆوە.

لە سەدەی چوارەمی زایینیدا، رووداوی گەورە و ترسناک لەو دەولەتە رووی دا، تیایدا ساسانییەکان پایتەختێکیان بۆ خۆیان دامەزراند لە ولاتی (میزۆپۆتامیا)، ئەویش (طاق کسری) بووە، کە لە دوایی بووە (مەدائن)، پایەی یەکەمی هەبوو لە دەولەتی ساسانی، لە دوایش بووە پایتەختی مەسیحییەکان لە رۆژهەلاتدا و ناوەندی فیکری مەسیحی، نەک هەر لەو ولاتانەدا، بەلکو لە هەموو ناوچەکانی نزیک و دووردا. بەلام بارودۆخ گۆرا دوای ئەوەی (شاپووری دووەم) حوکم و دەسەلاتی وەرگرت (٣١٩ - ٣٧٩ ز)، داوای گەرانەوەی ئەو (٥) ناوچانەی کرد، کە لە لای رۆمانییەکان داگیر کرابوون و لە مەملەکەتی ساسانی جیا کرابووە، ئەویش لە سەردەمی پادشای (گالیروس)، کە هەر زوو ئەو ناکۆکییانە شێوەیەکی ئایینی وەرگرت لە نێوان ئیمپراتۆریەتی ساسانی و ئیمپراتۆریەتی رۆمانی، ئەوەش بووە هۆی سەرهەلدانی شەر و پێکدادان لە هەرێمەکانی ساسانی، (شاپووری دووەم) هەلمەتێکی گەورەی دژی مەسیحییەکان لە هەموو ناوچەکانی مەملەکەتی ساسانی رێکخست. ئەویش بە دەرکردنی فەرمانێکی مەلەکی رەسمی: لە بەر ئەوەش (شاپوور) باج و سەرانەی فەرزکردە سەر مەسیحییەکان. بەوەش هەزارانیان لێ بووە قوربانی ئەو سیاسەتە لە وەتەی سالی (٣٤٣ ز)، ئەو زولم و زۆرداریی بەردەوام بوو لە ناوچەکانی باکووری مەملەکەتی ئەربیل (هەولێر)، ئەویش لە رێگەی بوونی هێزەکانی ساسانی لەوێداو تایبەتی لە سەر هێلەکانی رووبەروو بوونەوە لەگەل رۆمانەکان، ستەم و زۆلم چەند شێوازێکی درندانەو خوێناوی وەرگرت، لەوانەش ئەوەی پێی دەگوترێ: (الاضطهاد الاربعيني) کە (٤٠) سالی خایاند، هەر لە سالی (٣٣٩ ز) هەتا سالی (٣٣٩ ز)، واتە سالی مردن و نەمانی شا (شاپووری دووەم)، (مار شەمعون برصباعی) و هاورێیانی بوونە قوربانی ئەو سیاسەتە. هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە مەسیحییەکان کوژران و شەهیدکران لە ناوچەکانی (بيت لافات و هرمز و

فرات میشان و كرخ میشان و سالیف و تیسفون و شهدارِ كرخ سلوخ). ئەوەی شیاوی باسە لێرە" هۆی نزیكبوونەوەی (مار شەمعون برصباعی) لە دیوانی مەلەكی ساسانی، لەبەرئەوەی ناوبانگییان هەرلە كۆنەوە لە بۆیاغ كردنی جلە حەریرییەكان، كە شاكانی فارس لە بەریان دەكرد دەركردبوو، دوای مردنی (قسطنطین) پادشای رۆم، شاپوور، دژی مەسیحییەكان دەجوولایەوە. بارودۆخەكە لەو ناوچانەی كە لە ژێر حوكمی ئەو بوون تێكچوو، لەو كەسانەی كە كوژران: (كوشتازاد) سەرۆكی ئەمینداریەتی مەلیک بوو. لەو ناوچەیە ژمارەیەكی زۆر لە لایەنگرانی كوژران، بەتایبەتی لە ناوچەكانی (ئەهواز و كەرخ لیدان) ئەو ناوچەیەی كە مەلیك شاپوور دایمەزراندبوو و دروستی كرد بوو و زۆرینەی دیل وگیراوەكانی لە شارو ولاتانانی كە لە ژێر حوكمی خۆی بوون گواستەوە بۆ ئەو ناوچەیە، لە سالّی پێنجی (چەوسانەوەی چلییەكە) لەو كاتەی كە مەلیك شاپوور لە شاری (سالیف) بوو (١٢٠) كەس لە (كهنە و رهبان) دەستگیر كران و خرانە ناو بەندیخانەكان.

ئافرەتێكی مەردانە و زیرەك هەبوو بە ناوی (یەزدان دۆخت) بە واتای (كچی خوا) و خەلّكی ناوچەی (حدیاب - ئەربیل، هەولێر) بوو. ئەو ئافرەتە رۆلّێكی گەورەی لە ناندان و تێركردنی ئەو هەژارانەی كە حوكمی مردنیان بە سەردا سەپابوو لە لایەن (شاپوور)ەوە. بە درێژایی مانەوەیان لە بەندیخانەدا، ئەو ئافرەتە هەر لە مالّ و پارەی تایبەتی خۆی خەرجی دەكێشان. لە ناو بەندیخانە راوەستابوو، لە كاتی بردنیان بۆ مردن و كوشتنیان هانی دەدان لە سەر خۆراگرییان و بروایان بە خودا. لەو شەوانەی كە دەكوژران و سەریان دەبرا، (شەریفە یەزدان) چەندین كرێكاری لە بازار هێنابوو، دوو پیاوی دانا بوو بۆ هەر تەرمێك لەو كوژراوانە و جلی بۆ ئامادە دەكردن،، بۆ دەرەوەی شارەكە هەلّیان دەگرتن و زۆر بە پەلە چالّیان بۆ هەلّدەكەندن، هەر پێنج (٥) تەرم لە چالّێكدا، ئەویش لە ترسی پیاوانی دەسەلات، ئەوانە لە (٦)ی نیسانی سالّی ٣٤٦ز شەهید كران، كە ژمارەیان ١١١ كەس بوون و لە نێوانیان (٩) ئافرەت هەبوو.

ئەو چیرۆكەی كە ئێمە باسی دەكەین، لە چیرۆكە مێژووییەكانە، كە وای لە (حدیاب - ئەربیل) كرد ببێتە پێگەی دەركەوتنی ئەو رووداوانە، ئەو ناوچەیە بەشێک بوو لە ئیمپراتۆریەتی ساسانی، هەرچی مەسەلە خەیالّییەكەش بوو، چۆنیەتی بەستنەوەی بەشەكانی رووداوەكە كە مەتران (سلێمان الصائغ) بە ناونیشانی (یەزدان دۆخت، الشریفە الاربیلیە) لە سالّی ١٩٣٤ ز نووسیبووی، بۆ یەكەم جار لە چاپخانەی (النجم الكلدانیة) لە موسل چاپ كراوە. بە دوو بەش. لە دوایش لە سالّی ١٩٥٣ لە یەک بەرگی (٥١٢) لاپەڕەیی، جارێكی تر چاپ كراوە، لە هەمان چاپخانەی پێشوو. ئەو رۆمانە لە پێشەنگی رۆمانە مێژووییەكانە لە عێراق، ئەو رۆمانەی كە باسی كچێكی مەردانە و شەریفەی خەلّكی ئەربیل (هەولێر) دەكات، كە لە بنەمالّەیەكی خانەدان و دێرینەكانی ئەو شارە بووە. باوكی لە لای (ئەردەشیر) دامەزرێنەری دەولّەتی ساسانی كاری دەكرد، لە دواییش (باعوث) لە دوای مردنی باوكی و هەلاتنی دایكی پەروەردە كردنی لە ئەستۆ گرت، كە لە دەست چەوساندنەوەی ساسانییەكان بۆ لای شاری (نصیبین) هەلاتبوون، كە بە یەكێک لە قەلاكانی رۆمانی دەژمێردرا: لەو شارە بارودۆخ خراپ بوو بە هۆی خراپی پەیوەندییەكانی رۆمانی - ساسانی، كە زۆر نزیک بوو لە سنوورەكانی هەردوو دەولّەتی شەڕكەر، سەركردەی ساسانی (ساسان) كەوتبووە خۆشەویستی ئەو كچە شەریفە (یەزدان دۆخت)، زۆر بە گەرمی و قوولّی خۆشی دەویست و لە یەكێک لە هەلّمەتەكانی عەسكەری بۆ سەر (نصیبین)، (ساسان) دەكەوێتە داوی خۆشەویستەكەی، هەر وەكو رۆمانەكە باسی دەكا، وا رێک دەكەوێ (ساسان) و دایكی یەزدان دۆخت بە یەک گەیشتن، كە ناوی (جانا) یە، بەلام لەگەلّ ئەوەش بەردەوام دەبێ لە گەڕان بە دوای خۆشەویستەكەی، هەتا دەگاتە كۆتایی چیرۆكەكە،

ساسان توانی لە نصیبین (افرام الحلفان) بناسێ، هەر لە سەر دەستی ئەویش بووە مەسیحی، ئەم ڕۆمانە ڕۆشنایی خستە سەر زۆر لە ڕووداوە مێژووەکان، هەروەها مێژووی کلێسەی مەشرق و شەڕەکان دژی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، بەڵام زۆرینەی ئەو ڕووداوانە لە ئەربیل (هەولێر) ڕوویان داوە، ئەم ڕۆمانە باسی دامەزراندنی دەوڵەتی (المناذرة) و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێرانییەکان، هەروەها باسی مەلیکەی (أمرؤ القیس) ناسراو بە (ملک العرب و ذی تاج) دەکات و ڕۆڵی لە (حیرە و ئەنبار) و دروستکردنی کلێسە و دێرو و خانووەکانی عیبادەت، هەروەها هەڵوێستی سەرکردەی گشتی سوپای ئێرانی (ئەبکرهان)، بکات کە یەکێک بوو لەو هاوڕێیان لە زۆرینەی هەڵمەتەکانی عەسکەری و بابل بکات. تا وای کرد واز لە بتپەرستی بێنێ و باوەڕ بە خودا بێنێ. ئەوەش لەسەر زەمانی سەرۆکی (دیر السکون) کە لە شاری حیرە هاتووە، قسەکانی خۆی ئاراستەی سەرکردەی ئێرانی کرد، وەکو هەوڵێک بۆ گێڕانەوەی پەیوەندییەکانی سروشتی لە نێوان ئێرانییەکان و (مناذر)ەکان. کاتێک گوتبووی (خوێن ڕشتن ڕاگرن ئەی گەورەکانی زەوی و ڕەحمێک بە خەڵکەکە بکەن و جەخت لە سەر ئاشتی بکەن، کە خوا بەو دنیایەی داوە و وێنەی خودا بەو خوێنە پیس مەکەن).

دەوڵەتی ساسانی ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە عێراق، بەتایبەتی لەبەرئەوەی پایتەختەکەیان (مدائن) لە باشووری بەغدا بووە. کە موسڵمانەکان ئازادیان کرد، جێگای گرنگی لە ڕۆژهەڵاتدا هەبووە، هەروەها (نصیبین) لە بەر ئەوە لە سەر سنووری هەردوو ئیمپراتۆریەت بوو قەڵایەکی گرنگ بوو، بەڵام (ئەربیل - هەولێر) کە یەکێک بوو لە ناوچەکانی ئێرانی، کە میرێکی ساسانی حوکمی دەکرد، ئەویش (ازورشنشب) بوو، چەند پەرستگایەکی ئاگری زەردەشتی و هەیکەلێکی ئایینی (مزدەکی) ی دروست کرد، (ئەردەشێر) فەرمانڕەوای هەموو ناوچەی (ئەربیل) بوو، بە ڕەچەڵەک بۆ سیلالەی (شاپووری دووەم) دەگەڕێتەوە، گەلی ساسانی بۆ چوار چین دابەش کرابوون ئەویش:

١- پیاوانی ئایین
٢- عەسکەرەکان
٣- پیاوانی دەوڵەت
٤- جووتیاران و خاوەن پیشەو ئەوانەی کەرستەکان دروست دەکەن

(شاپووری مەلیک) هەروەکو ئەو ڕۆمانە باسی دەکات، پیاوێکی جەستە گەورە بووە و سینگی پان بووە، دەم و چاوێکی ڕێکی هەبوو، ڕەنگی بۆ لای ئەسمەری دەچوو و ئارەزووی خوێن ڕشتنی هەبوو، بۆ ماوەی (٧٠) ساڵ حوکمی کرد.

بەڵام (یەزدان دۆخت) ئەو کچە لە خێزانێکی مەردانە بوو، زۆر بە بەزەیی بوو و ڕەوشتێکی بەرزی بووە و هەستێکی ناسکی هەبووە، ماوەیەک لە پایتەخت ژیانی بە سەر برد، (بەنی قصرا) باپیرەی بوو، بەڵام کاتێک ژیانی تووشی ناخۆشی هات، بڕیاری دا پایتەختی ساسانییەکان بە جێ بێڵێ و لەگەڵ بە خێوکەرەکەی (باعوث) بەرەو (ئەربل) بڕوات. بەو شێوە وەسفی ئەربل دەکەن (شارێکی بەناوبانگ بووە و جێگەی شەڕی هەردوو پاڵەوانی مێژوو (داریوشی ئێران) و (ئەسکەندەری یۆنانی) بووە، هەروەها ئەو ناوچەیە، ناوچەیەکی بە پیت و کشتوکاڵی بووە. بە تایبەتی لە کاتی وەرزی بەهاردا و پڕبوو لە کێڵگەکانی پەمۆ و جۆرەکانی دیکە، جێگەی لە نێوان دوو زێیان بووە و بوونی دەشتاییەکی فراوان گرنگییەکی زۆری بەو شارە دا. بەشێک لە بیناکانی ئەربیل لە سەر بەرزاییەکی هێلکەیی بووە، بەرزاییەکەی (٢٠) مەتر بووە، قەڵایەکی بەهێز و بەرز هەبووە، لەگەڵ دەشتاییەکی فراوان، خەڵکی ئەو شارەش، پاشماوەی ئاشوورییەکان بوون، پارێزگارییان لە ئایین و زمانی خۆیان کردووە، هەروەها ناوبانگییان دەرکردبوو لە ئازایی، ترسێکیان هەبووە لە (قەرەداغ) مرزبان ئەربل یان پارێزگاری سنوورەکە، لە سەرەتادا (قەرەداغ) پەرستگاکانی ئاگری زەردەشتی لە ئەربلدا دروست کرد، لە ترسی حاکمی ناوچەی ئەردەشێر،

هەروەها (قەرەداغ) کۆشک و تەلارێکی گەورە و بە هێزی بۆ خۆی لە ئەربل دروست کرد، ئەویش لە سەر بەرزاییەک بە ناوی (ملقی) هەروەها هەیکەلێکی ئاگری زەردەشتی لە ناو ئەو قەسرەدا دروست کرد. دوای گەیشتنی (یەزدان دۆخت) بۆ ئەربل، سەردانی بەندیخانەی کرد. بۆ سەردانی (٩) کەس لە دەولەمەندانی ئەربل، کە لە بەر چوونیان بۆ ناو ئایینی مەسیحی بەندکرابوون. کاتێک (ساسان) گوێی لە هەواڵی سەفەر کردنی (یەزدان دۆخت) بۆ ئەربل بوو، زۆر توورە بوو بۆ بینینی خۆشەویستەکەی و خۆی بۆ سەفەری ئەربل ئامادە کرد،، (شاپووری دووەم) نازناوی بۆ (ساسان) دانا بوو. کە (هزار مرد) بوو، مانایەکەشی (هەزار پیاو) بووە، لە دوایش لە لایەن مەلیک شاپوور تەکلیف کرا، بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر (نصیبین) و داگیرکردن و دەرکردنی ڕۆمانەکان لەو ناوچەیە، بەڵام لەو هەڵمەتەدا بە دیل گیرا، دوای مانەوەی (یەزدان دۆخت) لە ئەربل بۆ ماوەیەکی کورت، لە دوایی گەڕایەوە بۆ پایتەختی ساسانییەکان. (ساسان) بە هۆی دیلبوون و دوورکەوتنەوەی خۆشەویستەکەی زۆر غەمگین بوو، بەڵام توانی لە زیندان دەربچێ و ئازاد بوو و دەستی کرد بە قۆناغێکی تر لە هەوڵدان و گەڕان. لەو کاتەش، (شاپووری دووەم) حوکمی ناوچەکانی (دۆڵی دجلە و فورات و شوشان و ئەهواز و جورجال و سنووری ئەرمینیا و قەوقاز و دیلم و جیلان و خوراسان و بەشێک لە دوورگەی عەرەبی دەکرد. ئایینی بەشێکی زۆری ئەو ناوچانە، ئایینی (مەزدەکی) بوو، کە عەرەب و ئاشووری و کلدان بوون. هەروەها عیبادەتی ئەستێرە و داروبەردیان دەکرد، ئایینی یەهودی لە بابل بڵاو ببۆوە، کلێسەی (کوخی) کۆنترین کلێسەکانی مەسیحی بوو لە وڵاتی نێوان دوو زێیەکە (بلاد ما بین النهرین)، لەو کاتە کە هەواڵەکانی هەڵگەڕانەوە و یاخیبوونی (قەرەداغ) لە ئەربل گەیشتە پایتەخت و لە ئایینی زەردشتی دەرچوو و بووە مەسیحی، ئەویش دوای ڕووداوێک لە (بیت بغاش) لە باکووری ئەربل ڕووی دا، لەو کاتەی لە ڕاو کردن بوو لە دووری دوو ڕۆژ ڕێگا لە ئەربل، ئەو ناوچەیە بە زنجیرەی چیای (قردو) بەسترا بوو، دۆڵێکی تێدا بوو. زێی زابی گەورە بە ناو دۆڵێکی گەورە تێدەپەڕێ بەرەو ناوچەی رواندز. هەر لەو کاتەدا (یەزدان دۆخت) گەڕایەوە بۆ ئەربل. دوای هەڵاتنی لە دەست حوکمی شاپوور و چوونی ئایینی مەسیحیەت بۆ ناو دڵی. (ساسان) یش بە دوایدا دەگەڕا. بەڵام نەیتوانی و نەگەیشتە سۆراغی دروست، لە دواییش (یەزدان) چووە کۆشکی (قەرەداغی مرزبان) لەگەڵ بە خێوکەرەکەی (باعوث)، کە ئەویش بووە مەسیحی، لەبەر ئەوەش حوکمی کوشتنی بۆ دەرچوو، باسی چیرۆکی خۆی کرد بۆ (یەزدان دۆخت) و پێی گوتبوو: (باپیرەم (رقبخت) حاکمی ئەربل بووە و سامانێکی زۆری هەبووە و کەسایەتییەکی ناسراویش بوو، توانی چەند کلێسە و دێرێک دروست بکات، ئێرانییەکان لە دەسەڵات و ناوبانگی دەترسان، دوای گوشار و پاڵەپەستۆیەکی زۆر نەیتوانی لە ئەربل بمێنێتەوە و ناچار بوو ئەو ناوچەیە بە جێ بێڵێ و وەکیلێک بۆ سەر مولکەکانی خۆی دابنێ ئەنجا چووە (کرخ سلوخ - کەرکووک)، لەوێ کۆشکێکی گەورەی دروست کرد و تیا دانیشت، هەروەها ئەو ئافرەتە دەڵێ: (من بە بەردەوامی دەچوومە ئەربل، بۆ ئەوەی چەند ڕۆژێک لە ماڵی باپیرم بمێنمەوە، هەر لەوێش دایکە بەڕێزەکەتان (جانا) م ناسی. لە لایەکی دیکە، (ساسان) بەردەوام بوو لە گەڕان بە دوای خۆشەویستەکەی (یەزدان دۆخت)، زۆر جێگاو ناوچەی کرد، لە بیابانەکان و ڕێگا دوورەکان، دوای گەڕانی لە ئەربیل و نصیبین، لە کۆتایی دا گەڕایەوە بۆ ئەربل، لە گەڵ هاووڵاتی و لە پێش کۆشکی (قەرەداغ) ڕاوەستا، لەو کاتەی، کە (شاپووری مەلیک) فەرمانی بۆ سەربازەکانی ئەربل دەرکردبوو، بۆ ئەوەی (قەرەداغ) بگرن و لە پێش کۆشکەکەی بیکوژن، ئەویش بە (بەردبارانکردنی)، بە هۆی تێکدانی هەیکەلەکانی ئاگری زەردەشتی، لە جێگاشی پەرستگایەکی

یەکتاپەرستی دروست کردبوو. بەڵام ئەو ڕووبەڕووی سەربازەکانی بۆوە و بۆ چەند ڕۆژێک لە گەڵیان شەڕی کرد، لە ڕێگای (دەرگایەکی نهێنی قەڵایەکە یتوانیان بگەنە لای ساسان، لە قەڵاکە شەهید کرا، لە دوایش(یەزدان دۆخت) گەڕایەوە بۆ (کرخ سلوخ) بۆ ئەوەی سەردانی گۆڕی بەخێوکەرەکەی (باعوث) بکات، کە بە فەرمانی (مەلیک شاپوور) کوژرا بوو و لەوێ شاردرایەوە، لە دوای (یەزدان) بەرەو پایتەخت ڕۆیی، بەڵام پاشان گەڕایەوە بۆ ئەربیل، لە بەر ئەوەی (مەلیک) فەرمانی کوشتنی هەموو مەسیحییەکانی دەرکردبوو، لەگەڵ تێکدانی کلێسەکان و خانووەکانی خواپەرستی و کۆشکی مامی خۆی (ئاذورشاغ) لە ئەربیل، (ئەردەشیر) بەرەو (کرخ سلوخ) ڕۆیی، بە فەرمانی (مەلیکی ملوک: شاپوور)، (یەزدان دۆخت) هەموو شتە بە نرخەکانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت. دوای ئەوەی هیچ هیوایەکی نەما بۆ ئەوەی بگاتە (ساسان) و ببینێ. لە دواییدا کۆشکەکەی لە ئەربیل، بووە کلێسە و مەزارگەیەکی گرنگ، باوەڕداران سەردانیان دەکرد، لە کۆتاییەکانی فەرمانڕەوایەتی و ژیانی، تەندروستی (شاپووری دووەم) تێکچوو، لە بەر ئەوەش، ئێش و ئازارێکی زۆری دیت، بەتایبەتی پێش مردنی بە ماوەیەکی کەم و ئاستی دڕندەیی و وەحشیگەری و خوێن ڕشتن زیادی کرد، لە کۆتایی بە شێوەیەکی زۆر خراپ و بە ئازارێکی سەختەوە مرد، بەڵام (یەزدان دۆخت) لە دوای هێوربوونەوەی بارودۆخەکە و مردنی، توانی کاروباری (دێرەکەی) ڕێک بخا، کە لە ناو کۆشکی باپیرەی لە ئەربیل دروستی کردبوو، هەندێ لە مێژوونووسان وای دەبینن، کە ئەو (دێرە) دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای ئەربیل، ئەمڕۆ بە (ست مامی - ستی ئیمامی) ناسراوە.

بەوەش، ئەو ڕۆمانە مێژووییە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ، کە کۆمەڵێک ڕووداوی گرنگی تێدایە، لەوانە وێنە ئەخلاقی و باوەڕداری و هەڵوێستی بێ وێنە و مرۆڤایەتی و پڕ لە قوربانی بە درێژایی مێژوو شوێنەواری جێماوە، هەروەها ڕۆشنایی دەخاتە سەر کێشەیەکی مێژوویی گرنگ، ئەویش هاتنی مەسیحیەت بۆ وڵاتی نێوان دوو زێیەکەیە، هەروەها پەیوەندییەکانی نێوان ڕۆژهەڵاتی ساسانی و ڕۆژئاوایی ڕۆمانی و ڕۆڵی (نصیبین و تیسفون و سالیف و ئەربیل)، کە پایتەختێکی ئابووری بووە لەو کاتەدا و بەرهەمی کشتوکاڵی بۆ وڵاتی ڕۆمانی دەنارد.

زۆر لە لێکۆڵەران و مێژوونووسان لەبارەی ئەو ڕۆمانەیان نووسیوە، (ماسینوون)ی ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی دەڵێ: "چیرۆکێکی مێژووییە و پڕە لە زەوقی ڕۆمانووسی هەستیار"، (جیراردینی) کە بەرپرسێکی (پاییە). دەڵێ: "ئەو کارانەی کە ئەمیرەی ئەربیلی ئەنجامی دابوو، ئاکامەکەی چاکەو کاری زۆر گرنگی تێدابوو"، هەروەها مێژوونووسی کورد (زوبێر بلال ئیسماعیل) لەو بارەیەوە دەڵێ: گۆڕی (یەزدان دۆخت) هەیە، کە لە سەدەی چوارەمی زایینی ژیاوە و دەکەوێتە ناو وێستگەی شەمەندەفەری هەولێری کۆن. (تاریخ اربیل لاپەرەی ٣٢.)

سەرچاوەکان:

١- ایران في العهد الساسانيين / ارثركريستنس، ترجمة يحيى الخشاب، قاهرة / ١٩٥٧.
٢- تأريخ كنيسة الشرق: البير ابونا، جزء الاول، بغداد، ١٩٨٥.
٣- شهداء المشرق، البير ابونا، جزء الاول، بغداد ١٩٨٥.
٤- مجلة (نجم المشرق): (رواية يزدان دوخت) فضل عفاس، عدد ١٠، سنة. ١٩٩٧.
٥- (تاريخ اربل): زبير بلال اسماعيل، مطبعة اربيل، ١٩٩٨.
٦- يزدان دوخت (الشريفة الاربيلية)، رواية تأريخية، القس سليمان الصائغ، مطبعة (النجم الكلدانية) موصل ١٩٣٤.

و: نەجات خۆشناو

تێبینی: لەم نووسینەدا، لە هەر شوێنێکدا ساسانییەکان وەکو فارس ناویان هاتووە، ئەمە ڕای نووسەرە و ئێمە لە گەڵیدا نین و ساسانییەکان بە قسەی مێژوو نووسەکان بنەماڵەیەکی ناوداری کوردن.

لیژنەی باڵای ئینسکلۆپیدیا

# ڕێگای دورودرێژی ئاوریشم لە (چین)ەوە بۆ (ڕۆما)

حەنا عەبدولئەحەد ڕەفۆ

**پێشەکی**

ڕۆژهەلات ناوەندی شارستانیی کۆنە و شوێنی هاتنەخوارەوەی پێغەمبەردکانە، یەکەم شارستانێتی و ئیمپراتۆریەت هەر لەو شوێنە دامەزراوە، بە هۆی بوونی پێداویستیی جێگیر بوونی مرۆڤ، لە سەردەمە کۆنەکانەوە، کە دەگاتە چەند هەزار ساڵ. یەکێک لەو ناوچانەی کە زۆر ناسراون لە ڕۆژهەلاتدا (وادی الرافیدین - عێراقی کۆن) و هیندستان و ئێران و جێگای دیکەش لە نیشتەجێیەکانی شارستانی، لەبەرئەوەش دەبینین چاو و تەماحکاریەکانی ڕۆژئاوا بەرەو خێرو خێراتی زۆری ئەو ناوچەیە ڕۆیی، بەتایبەتی ئەو کەلوپەلانەی لە ئەوروپا نییە یان کەمە، گرنگترینیان (بەهارات و حەریر)، دیاردەی تەماحکاری پێش سەرەتای (سەدەکانی ناوەند - القرون الوسطی) سەری هەڵدا، لە ژێر چەتری (گەڕیدە و مۆژدەدەران و دۆزینەوەی جوگرافی) بۆ ئاگادار بوون لە شارستانێتی و سامان و خێراتی ئەو دەوڵەتە کۆنانە، مێژووش شاهیدێکی ڕوونە لەبارەی داگیرکردنی کەنداو لە لایەن (پورتوگالییەکان) و شەڕەکانی خاچپەرست و کونترۆڵکردنی ڕێگای هیند لە لایەن بەریتانییەکان و شێوازی دیکەش، کە ئامانجەکەشی: کونترۆڵکردن و جێبەجێکردنی مەسەلەی تەماحکاری ئابووری و سیاسی بوو لەو ولاتانەدا.

کە باسی (حەریر) دەکەین، دەبێ ناوی ئەو ولاتەمان لە بیر نەچێ، کە بە یەکەم بەرهەمهێنی (حەریر) دادەندرێ، کە نەک هەر بە گەوهەری چین داندراوە، بەڵکو گەوهەری ڕۆژهەلاتیش بووە. لە چیرۆکەکانی چینی کۆندا هاتووە، حەریر بە شێوەیەکی فەرمی لە ساڵی (٢٦٤٠ پ.ز) دۆزراوەتەوە، لە لایەن ئافرەتێک کە ئیمپراتۆر بووە، بە ناوی (لینگ شیە - جین) ئەو کاتەی لە ناو کێڵگەکانی درەختی توو، کە ژمارەیان زۆرە لە چین، سەردانی مەلیکی کرد. دانیشتوانی چین، حەریر لە گەڵا زۆرەکان دەردەکەن، کە خواردنی (کرمی قزە - دودە القز) کرمی الحریر - کە دەیکاتە حریر، لەو ئافرەتانەی کە شەیدا و پەرۆشی مادەی (حەریر) ن، بە تایبەتی لەو کاتەی دەچێتە لای خۆشەویستەکەی - (مارکس نتونیوس) - بە جل وبەرگە حەریرییەکانی کە لە چین دروست کراون و لە (میسر)یش نەخش کراون، هەروەها ئیمپراتۆرە -

پیودورا - ی بیزەنتی، کە جلی حەریری لە بەر دەکرد، کە لە ناسکترین نەسیجی (عەنکەبوت)ی رەنگاورەنگ، وەکو مێرگێک پڕ بێت لە گوڵی رەنگاورەنگ، هەروەها (ئەلیزابیس - ی یەکەم)، مەلیکی بەریتانیا کە لە سیلالەی (پیودور) بووە. ئەو مەلیکە (٢٠٠٠) هەزار کراسی حەریری کڕیبوو (سندوقێکی) تایبەتی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت بۆ حەریر لە کاتی سەفەر کردنی بەڕادەیەک لە کۆشکی سپی لە واشنتۆن بە کاری بێنێ، بەو شێوە وەسفی حەریری دەکرد و دەیگوت: حەریر باشترین قوماشە و زۆر سەرنجڕاکێشە و شەپۆڵدەرە، وەکو ئاو، بە تایبەتی پیاوان حەزیان بۆ ئافرەتان دەچێ کاتێک لە بەری دەکەن، یەکێک لەو ئافرەتانەی، کە لە گۆرەپانی هونەر کاری دەکرد وتی: من حەز لە تروسکدانەوەی حەریر دەکەم، بە تایبەتی کاتێک لەبەری دەکەم و پێوەی دەڕۆم. لەبەرئەوە، حەریر لە دێرزەمانەوە، مادەیەکی سەرنجڕاکێش بووە، دەوڵەمەندان و پیاوانی پەرستگاکان بەکاریان دەهێنا، بە تایبەتی بۆ رازاندنەوەی پەرستگاکانیان بە حەریر، لە ساڵی (٢٧٠ پ. ز) مادەی حەریر چووە ناو رۆما بەو بڕەی کە هەموو ئافرەتانی دەوڵەمەند و بە توانا، بتوانن هەریەک لە وانە دەستە جلێک یان کراسێک بۆ خۆی بدوورێ، ئیمپراتۆری رۆمانی (ئورلیان) یاسایەکی دەرکرد، تێیدا ئەو قوماشە نەرمەی، بە قوماشێکی تێکچوو و زۆر خراپ وەسف کرد، لەبەرکردنی حەریری لە لایەن ئافرەتانەوە حەرام کرد و بە شتێکی حەرامی دانا، بە ژنەکەی گوت: من زێڕی ئیمپراتۆری بە قوماشی عەنکەبوتی نادەم، لە بەر ئەوەش، ئافرەتانی رۆمانی یەکەم پێشاندانی ئافرەتانیان سازدا لە مێژوودا، لە سەر بەردەوام بوون لە بەردەم ئەنجوومەنی پیران، هەتا ئەو کاتەی ئەو یاسایەیان نەهێشت، لە ساڵی (١٥٧٠ ز) بچووکترین مەلیکەکانی فەرەنسا - هنری سێیەم - لە کاتی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی ژن هێنانی، بە هۆی جیاوازییەک کە لە ساتەکانی دوایی رووی دا، ئەویش لەبارەی (تەوقی کڵاوەکەی)، بەڵام لەگەڵ ئەوەش گەیشتە ئەو مەوعیدەی کە بۆی داندرابوو، بە مەبەستی کوشتنی لە سەر دەستی (راهیبێک)، کە بڕیاری دابوو وڵاتەکەی و گەلەکەی لە دەستی ئەو گەندەڵە رزگار بکات، ئەویش بە هۆی ئەوەی بڕێکی زۆر لە حەریری لە ناو کۆشکی شاهانەدا هەبوو.

هەتا لە سەدەی نۆزدەمدا، چینییەکان، خەڵکی (ئەوروپا) یان بە (مرۆڤی بەربەری و دڕندە دادەنا)، بڕوایان وابوو، کە باڵیۆزەکانی (بەریتانییەکان) دەبێ سەریان شۆڕکەنەوە لە بەردەم ئیمپراتۆری (چینی)، هەروەها دەبێ سەریان وەکو رێزگرتن لە زەوی بدەن، لە ساڵی (١٧٩٨) و دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێکی کەم بە سەر بووژانەوەی پەیوەندییەکانی ئابووری لە نێوان (چین) و (ئەمریکا)، کە ئەوەش وای کرد کە بڕێکی زۆر لە قوماشی حەریر بچێتە ناو ئەمریکا، مامۆستایەکی زانستی کۆمەڵایەتی لە زانکۆی نیویۆرک، بابەتێکی لە سەر تێکچوونی بەهای رەوشتی نووسی، تێیدا دەڵێ سەردەمی شەرمی کۆمەڵایەتی و کەم روویی نەما، ئێمە ئێستا لە زەمەنێک دەژین، کە تێیدا بە دوای خۆشی دەگەڕێین، جلی پەمۆ و ئەستوور کە لەگەڵ بۆنەی خۆپیشاندان و مانگرتن دەگونجێ، بەڵام حەریر، چنراوێکە گوزارشت لە چینی یەکەم دەکات، ئەویش لە گۆرەپانی (سەما) و (مۆسیقا). ئەڵێرە دەتوانین بڵێین: حەریر مادەیەکی سەرنجڕاکێشە و ئەو ئافرەتەی قوماشی حەریر لە بەر دەکا، بە تایبەتی (شەفاف) و (شەپۆڵدەر) دەبێتە جێگای فریودانی پیاوان و سەرنجیان ڕاکێشێ.

لە هەندێ گۆڕستانی چینی کۆن، کە بۆ (٤٠٠ پ. ز) دەگەڕێتەوە، لە ناو ئەو گۆڕانە، هەندێ تۆز و خۆڵیان دۆزییەوە، بەڵام (جل و بەرگەکانی حەریری) هەروەکو خۆی مایەوە و هیچی لێ نەهاتبوو، بەتایبەتی تروسکەکەیان و شەپۆلدارییەکەی، هەندێ لە مۆزەخانەکان، قوماشی حەریری نیشان دەدەن، کە بۆ پێش هەزاران ساڵ دەگەڕێتەوە، لە (ڤاتیکان)، لە رۆما و کەنیسەی (القدیس پتروس)، هەندێ جلی حەریری دەبیندرێ، کە (شارلی

گەورە) لەبەری کردبوو، بە تایبەتی لەکاتی دانانی وەکو پاشا لە ساڵی (٨٠٠ پ. ز). ئەو قوماشە هەتا ئێستاش پارێزگاری لە سەر تریسکانەوە و رەنگی خۆی کردووە.

### رێگای ئاوریشم و کوردستان؟

سەرەتای رێگای حەریر بۆ سەردەمی خێزانی (هان)ی چینی دەگەڕێتەوە، لە سەدەی دووەمی زاییینیدا کە جڵەوی حوکمیان لە دەست بوو. خێزانی (شین)، لە یەکگرتنەوەی وڵاتی چین سەرکەوتوو بوون، چینییەکان لە لای خۆیان، خێزانی (هان)یان خۆش دەویست، یەکەم کەس کە پێشنیازی بەکارهێنانی ئەو رێگایەی کرد، ئەویش هەناردەیەکی چینی بوو، بە ناوی (شانغ - شیان)، کە ئیمپراتۆری چینی (تی) - ٤٠ - ٤٧ پ. ز)، کە بو (باکتیریا)ی ناردبوو: لەو ناوچەیەی کە موسڵمانە فاتیحەکان ناویان لێ نابوو: (ناوچەی ئەو دیوی زێ) بە مانای (زێ جیمون)، کە وەکو بەربەست راوەستا بوو لە نێوان گەلانی تورکی لە پشتەوە و لە رۆژهەڵاتەوە، گەلانی ئێرانیش لە رۆژئاواوە، کاتێک هەناردەکە گەیشتە ئەوێ، زۆر واق وڕی بوون، بە هۆی پێشکەوتنی ئابووری لەوێ، بەڵام ئەوەی زۆر سەرنجڕاکێش بوو لە لای ئەو، کڕیارێکی زۆر هەبوو بۆ کڕینی قوماشی چینی، لە پێش هەمووشیان، قوماشی (حەریر). لە گەڵ ئەوەی کە هەناردەی ئیمپراتۆری چینی سەرکەوتوو نەبوو لە ئەرکە دیبلوماسییەکەی لە ناوچەی (ئەو دیوی زێ)، لە جیاتی ئەو سەرنەکەوتنە، توانی زانیارییەکی باش کۆ بکاتەوە لەبارەی بزووتنەوەی بازرگانی، کە بۆ وڵاتەکەی هێنایەوە، هێشتا (٢٠) ساڵ تێنەپەڕی بوو بە سەر گەڕانەوەی هەناردەی ئیمپراتۆر لەو گەشتەی خۆی، رێگای کاروانەکان کرایەوە، کە بە (رێگای حەریر) ناسرا بوو، ئەویش لە نێوان (چین) و ئیمپراتۆریەتی رۆمانی، کە لەو سەردەمانەدا، زۆرینەی ناوچەکانی ئەوروپای حوکم دەکرد، لەگەڵ بەشێک لە (ئاسیا). ئەوەی شیاوی باسە، زۆرینەی ئەو حەریرەی، کە لە چین بەرهەم دەهێندرا، لە رێگای وشکانی و زەمینی بار دەکرا، لەبەرئەوەی لە رێگای (دەریا و دەریاوانی) زۆر زەحمەت بووە، بەڵکو هۆیەکی تر هەبوو بۆ بار کردن لە رێگای وشکایی و زەمینی، ئەویش گەلانی ئەو ناوچانە کە کاروانەکە و بارەکەی پێدا تێدەپەڕێ، دەسکەوت و قازانجیان دەبوو، ئینجا چ راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ، هەروەها کڕین و فرۆشتن دەکرا و ئەو کاروانانە و بازرگانییەکە پێویستی بە پاسەوانی و یارمەتی و ماندووبوونی سەدان کەس بوو، هەروەها لە بازرگانەکان لە ناوچە جۆراوجۆرەکان بەشدارییان دەکرد لە کڕین و فرۆشتن. یەکێک لەو گەلانەی زۆر لەو بازرگانییە سوودیان وەرگرتووە و بوونە یەکێک لە گەلە دەوڵەمەندەکان، بە تایبەتی بازرگانی کردن بە (حەریر)، ئەویش (گەلانی ئێرانی)، لە ژێر دەوڵەتی (الفرثیە/ئەشکانی)، ئەو دەوڵەتەی کە ساسانییەکان رووخاندیان لە سەرەتای سەدەی سێیەمی زاییینی، ئیمپراتۆرەکانی چین، زۆر بێزار ببوون لە ئیستیغلال کردنی (فرثییەکان) بۆ کەل و پەلەکانیان، کە ئەوەش وایکرد یەکێک لە سەرکردە سەربازییەکانی چین، هەڵمەتێکی سەربازی ئامادە کرد بۆ هێرشکردن بۆ سەر (فرثییەکان)، بەڵام ئەو هەڵمەتە سەری نەگرت و شکستی هێنا و (فرثییەکان) هەر مانەوە و بەشدارییان لە بازرگانیکردن لەو ناوچە گرنگەدا کرد.

گەشت و سەفەری ئەو کاروانە بازرگانییانە، دوور نەبوو لە ترس و بەربەستەکان، بە تایبەتی ئەو کاروانانە پڕ بوون لە کەل و پەلی نرخدار و زۆر گرنگ و لە وڵاغ و وشتر بار دەکران، لەو سەردەمانەدا، دەزگا و ئامێری گەیاندنی نوێ نەبوو، لە بەر ئەوەش کاروانەکانی ئەو سەردەمەی کۆن، تووشی دز و رێگرەکان یان سوپایەکانی ئەو میرنشینانەی کە ململانێ هەیە لە نێوانیان دەبوون.

هەروەها (ئەتاواتی) زۆر دەکرایە سەر بازرگانەکان، بە تایبەتی ئەگەر نیازی بەردەوام بوونیان لە سەفەر کردن و رزگارکردنی کەل و پەلەکانیان

لە دزی و هێرشکردن هەبا، سەفەرکردنی لەو ناوچە شاخاوییانە، بە تایبەتی لە ناو ئاسیا، ڕێبواران و گەشتیاران تووشی چەندین نەخۆشی دەبوون، هەندێ جار چاکبوونەوە زۆر زەحمەت بوو، بەڵام لە گەڵ ئەوەش ئەو مەسەلەیە زۆر گرنگ نەبوو، ئەوەی گرنگ بوو لە لایەنی، دەستکەوت و قازانجەکان و بینینی شارو ناوچە شاخاوییەکان و شوێنەوارە کۆنەکان بوو، لە وانە: بینینی (شوورەی چینی مەزن) و (ئەهرامەکانی میسر) و شاری (سەمەر قەند)، کە لەو سەردەمانەدا (بەهەشتێک بووە لە بەهەشتەکانی دنیا، ئەوەی شیاوی باسە لێرە، کە (ئەسکەندەری مەکدۆنی) ئەو شارەی کردە پایتەخت و چەقی هەڵمەتەکانی، دەکرێ هەندێ خەت و نووسینی بازرگانانی ئەو سەردەمە کۆنانە، لە سەر پەیکەری (بودا) ببیندرێ، ناوی بازرگانانی ئەو سەردەمە نووسراوە، بەوەش تۆمارێکی مێژوویی و بەڵگەیی تۆمار کرا، بەوەش مەسەلەی مێژووی کۆنی ئەو ڕێگایە دەسەلمێنێ، مێژووی پێش زایینی، موسڵمانانی عەرەب ناوەڕاستی ئاسیایان فەتح کرد و سوپایان گەیشتە دوورترین ناوچەو خاڵ، ئەویش شاری (کشغر) لە سەر سنووری (چین)، لە سەرەتای سەدەی هەشتی پێش زایینی، ئەو شارە شوێنی پێکگەیشتنی ڕێگای کاروانە گەورەکان بوو، هەر لەو شارەش کاروانەکان دەردەچن بەرەو ڕێگای (حەریری مەزن) تێپەربوون لە (ئاسیای ناوەڕاست) بۆ ڕۆژئاوا، کە لە کەنارەکانی (زێی زەرد - النهر الاصفر) دەستی پێ دەکرد، کە لە چینە، دوای ئەوەی لە وڵاتەکان تێدەپەڕێ، دوای بڕینی هەزاران کیلۆمەتر دەگەیشتە ڕۆما و شارانی تر، کە دەکەونە میانی سنووری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، دوای تێپەڕین لە ئێران بۆ ناوەڕاستی ئاسیا، لە دواییش (چین)، ڕێگای (حەریری مەزن) پێشکەوتنێکی گەورەی بە خۆیەوە بینی، بە تایبەتی دوای سەدەی هەشتی زایینی و فەتحەکانی عەرەبی ئیسلامی، ئەو فەتحانە، هەردوو باڵی: جیهانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بە یەکەوە بەست، لە (کشغر) لە ڕۆژهەڵات بۆ شاخەکانی ئێران لە ڕۆژئاوادا، لە بەر ئەوەی عێراق دەکەوێتە پێکگەیشتنی هەرسێ کیشوەرەکە: (ئاسیا و ئەوروپا و ئەفریقیا) وەکو پردێک، ڕێگای بازرگانییەکان بەسەریدا تێدەپەڕێ، هەروەها دەکەوێتە سەر ڕێگای (کورت) کە ئەوروپا بە هیند دەبەستێتەوە، لە ڕێگای دەریا، کە دەکەوێتە لایەنی سەرووی کەنداو، هەر لە بەر ئەوەش و لە دێر زەمانەوە، ڕێگا سەرەکییەکانی کە لە ڕۆژئاوا دێن و تێدەپەڕن بەرەو (تورکیا) و (سوریا) لە ڕێگای کوردستانی عێراق، لەو ڕێگایانەش:

١- ئەو ڕێگایەی لە تورکیا تێدەپەڕێ بۆ زاخۆ و دهۆک و ئاکرێ، لە دواییش (زێی گەورە) و هەولێر، هەرلەو شارەش دوو لقی ڕێگا هەبوو، بۆ هەردوو شاری (موسل) و (کەرکووک)، لە دوایی بۆ (مەدائن)، بەو ڕێگایە دەڵێن: (ڕێگای سوڵتانی- شاهانە).

٢- ڕێگای دووەم، لە تورکیا بۆ دهۆک و موسڵ و ئاکرێ و حەریر و ڕواندوز، لەوێش بۆ سنووری کوردستانی ئێرانی - عێراقی، لە دوایی بۆ (مەراغە) لە ڕێگای ئێران بۆ ناوەڕاستی ئاسیا.

٣- ڕێگای سێیەم: کوردستان- تورکیا بۆ موسڵ و هەولێر و کەرکووک و شاری سلێمانی، هەر لەوێش بۆ ئێران و ئەو ڕێگایانە لە سوریا و موسڵ دەهاتن، لە دوای بۆ ئەو ڕێگایانە کە پێشتر باس کراون.

ئەوانەی لە ڕۆژئاوا دێن، لە ڕێگای تورکیاوە بۆ عێراق، بە یەکێک لەو ڕێگانە تێدەپەڕین، ئەویش ڕێگای دووەمە، لە بەر ئەوەی نزیکترین ڕێگایە، بەوەش دەگەینە دەرەنجامێک، کە ڕەوەندی ئیتالی (مارکۆ پۆلۆ) بەو ڕێگایانە تێپەڕی و لە ڕێگای کوردستان، بە تایبەتی لە گەشتەکەی بۆ گەیشتن بۆ چین، ئەو ڕێگایەش پێی دەڵێن (ڕێگای حەریر)، لە ڕێگای ناوەڕاستی ئاسیا، لەوێش بۆ (دیواری چین)، (مارکۆپۆلۆ) لە ڕێگای سوریا هاتە عێراق، دوای ئەوەی لە کوردستانی عێراق تێپەڕی، لەوێش بۆ بەغدا و (دەربەندی هورمز) بۆ ئێران و ناوەڕاستی ئاسیا و گەیشتن بۆ

(دیواری چین) و (کامبولاک - پەکین)، هەروەکو لە سەر نەخشەکان دیارە، بەڵگەیە لە سەر ئەوەی، کە لە سەر کوردەکانی ناوچەکەی نووسیوە، بەڵام (مارکۆپۆلۆ) لە رێگای (سومەترە) گەڕایەوە.

**(گەشتەکەی مارکۆپۆلۆ)**

هەردوو بازرگانی ئیتالی (مافیو) و (نیقولو بولو / نیکولوپولو) کە بازرگانی شاری (فینیسیا)ن لە ئیتالیا، هەردووکیان لە ساڵی (١٢٦٠ ز) شاری (القسطنطنیە - ئەستانبول)ی ئێستایان بە جێهێشت، بۆ ئەوەی گەشتێک بکەن بۆ (ئاسیای ناوەڕاست)، لە گەڵ ئەوەی هەردووکیان کۆگاو و ئەمباری گەورەیان هەبوو و پڕبوو لە کەل و پەلی نرخدار و گران، ئەوانەیان بە جێ دەهێشت، بۆ گەڕان بە دوای ئەو شتانەی حەزیان دەکرد بە دەستیان کەوێ، لەوانە (التوابل - بەهاراتیەکان و کەل و پەلی تری نرخدار، دوای ئەوەی لە (ئاسیای ناوەڕاست) پەڕینەوە، کە لە ژێر حوکمی سولتانی (تەتار) بوو لەو کاتەدا، گەیشتنە وڵاتی (قوبلای خان) سەرکردەی (گەلە تەتاری) لە (کامبولاک)، ئەوەش ناوی کۆنی (پەکین)ە، لە ساڵی (١٢٦٤ ز)، کە هەردووکیان بە یەکەم ئەورووپی دادەندرێن، بۆ ئەوەی ئەو ناوچانە ببینن، بە گەرمی پێشوازییان لێ کرا لە لایەن (قوبلای خان) و لە بارەی ئەورووپا هەواڵی لێوەردەگرتن و پرسیاری دەکرد لە بارەی داب و نەریتی خەڵکەکەی و ئایینیان، دوای (٣) ساڵ، ئەو دوو بازرگانە خۆیان بۆ گەڕانەوەی وڵاتەکانیان ئامادە کرد، بۆ (پاپا) نامەیەکیان هەڵگرتبوو، تێیدا (قوبلای خان) داوای لە (پاپا) کرد بوو وەفدێک لە (رەهبانەکان) بنێرێ بۆ گەلەکەی بۆ (تەبشیر کردن) و گواستنەوەیان بۆ ئایینی (مەسیحی)، (قوبلای خان) کارتێکی زێڕینی دایە هەردوو بازرگانەکە، فەرمانێکی خۆی تێدابوو، فەرمانی دەدا لە هەموو شوێنەکان لە کاتی گەڕانەوەیان پارێزگاری و چاودێرییان بکرێن، لەگەڵ ئەوەی گەشتی گەڕانەوەیان (٣) ساڵی خایاند، بەڵام دوای دوو ساڵ لە گەڕانەوەیان بۆ وڵاتەکانیان، جارێکی تر و بۆ جاری دووەم گەڕانەوە بۆ رۆژهەڵات، ئەم جارەیان نامەیەکی (پاپا) یان هەڵگرتبوو و دوو (رەهبان) و (مارکۆ) کە کوڕە بچووکی (نیکولا)یە و تەمەنی لە (١٧) ساڵ رەتی نەدابوو، توانی رووبەڕووی زەحمەتییەکانی ئەو گەشتە ببێتەوە، لە هەردوو (رەهبان)ە کەش بە هێزتر بوو، هەردوو رەهبانەکە گەڕانەوە وڵاتی خۆیان، بەڵام هەر سێ ئەندامەکەی (پۆلۆ) لە گەشتەکەیان بەردەوام بوون و لە کۆتایی گەیشتنە لای (بیلادی - قوبلای تەتاری سەرلەنوێ، لەگەڵ پێشوازییەکی گەرم، هەرزوو بە کەسایەتی (مارکۆ پۆلۆی بچووک) بەستراوە، وەکو راوێژکاری خۆی دەستنیشان کرا، لە دواییش وەکو والییەک بە سەر یەکێک لە هەرێمەکانی مەملەکەتەکەی، بەڵام لە کۆتایی گەڕانەوە بۆ (ڤێنیسیا)، لە ساڵی (١٢٩٥) گەیشتنەوە وڵاتەکەیان، دوای (٢٤) ساڵ لە بزربوون، (مارکۆپۆلۆ) زیارەتی زۆر شوێن و ناوچەی گرنگی کردەوە و تێبینییەکانی نووسی بوو، ئەوەش هەندێکیانە:

ئەرمینیای بچووک - خەڵکی ئەو ناوچەیە، مەشرووبێکی زۆر دەخۆنەوە، شاری (ئەیاس) بە جوانی دیارە لە کەناری دەریایەکە و ناوەندێکی گەورەیە بۆ بازرگانی، بازرگانەکانی هەموو دنیا رووی تێ دەکەن.

ئەرمینیای گەورە - لەو هەرێمەدا و لە لووتکەی شاخێکی بەرز، کە بە ناوی ئارارات هەتا ئێستاش کەشتییە گەورەکە: کەشتی (نوح)، لە سەر (شاخی جوودییە).

موسڵ: ئەو شارە دەکەوێتە مەملەکەتێک، چەند کۆمەڵێکی مرۆڤی جیاوازی تێدایە و زۆرینەی خەڵکەکەی ئایینیان ئیسلامە.

بەغدا: شارێکی گەورەیە و بارەگای خەلیفەی هەموو موسڵمانانی تێدایە، هەروەها بارەگای (پاپا)، کە مەسیحییەکانی ئەورووپا پەیرەوی دەکەن وەکو ئایین.

تەوریز: جوانترین شارەکانی عێراقە (عێراقی عەجەم)، هەر لێرەش، قوماش لە حەریر و زێڕ

دروست دەكرێ، هەروەها بازرگانانی هەموو دنیا، هەتا لە (هیند) ڕوو لەو شارە دەكەن.

ئێران: شاری (سافە) بۆ ئەو مەملەكەتە دەگەڕێتەوە، كە لەو شارەش هەر سێ حەكیمەكان دەرچوون بۆ گەڕان بە دوای (مەسیح)، ئارامگای كۆتاییان لەو زەوییە بووە، لە ناو گۆڕستانێك كە زۆر جوان بووە.

كەمادین: ئەو زەوییانە لە دەوربەری شاری كەمادینن، زۆر بە پیتە و (خورما و فستق و سێو)ی لێ بەرهەم دێت.

هورماز: لەو زەوییەدا، مرۆڤ باڵندەی (دەراج) و (بیقادات) و باڵندەی دیكە دەبینی، جیاوازی زۆری هەیە لە گەڵ ئەوەی لە وڵاتی خۆمان دەیبینین.

بەلخ: ئەو شارەی كە گوزارشت لە سنووری تەتەری دەكەن لە (ڕۆژهەڵاتی دوور)، ئەوەی بە وڵاغ سەفەر بكات بۆ ئەو ناوچەیە، (١٢) دوانزە ڕۆژی پێدەچێ، بێ ئەوەی كائینێكی ئینسانی ببینێ، بۆیە دەبێ خواردەمەنی و ئاو لە گەڵ خۆی بۆ خۆی و بۆ وڵاغەكەی هەڵگرێ.

پلاشان: ئەو هەرێمە، بەرانی دڕەندەی تێدایە، كە قۆچی گەورەی هەیە، (كەش و هەواش) ی زۆر ساردە، هەتا ئەو ڕادەی هیچ تەیرو بوونەوەرێك ناتوانێ بژیت.

تانجان: ئەو ناوچەیە بەناوبانگە بە مادەی (الراوند) و ناردنیان بۆ هەموو بەشەكانی جیهان.

كاپای: لەو هەرێمە، هەروەكو حاڵی زۆرینەی زەوییەكانی تەتار، خەڵكەكە جۆرێك لە پارە بە كار دێنن، كە لە كاغەز دروست كراوە، و مۆری (خانی گەورە)ی لە سەرە و لە جیاتی پارەی ئاسن بە كاری دێنن، وەكو پارچەیەك حەریری چوار گۆشەیە.

سومەترە: (ماركۆپۆلۆ) بۆ ماوەی (٥) پێنج مانگ لەو دوورگەیە مایەوە، بەڵام نەیتوانی لە ناو خەڵكەكە بجوولێتەوە، لە بەر ئەوەی خەڵكەكە زۆر توند و خراپ بوون، ئەوانە شەرابیان نەدەخواردەوە، لە جیاتی ئەوە شەربەتێكی سەرخۆشیان دەخواردەوە، كە لە دارێكی تایبەتی (دارخورمای شەراب) دروست دەكرا، (مەنجەڵێكی) گەورەیان لە بن دارەكە دادەنا، دڵۆپەكانی ئەو ئاوە دەكەوتە ناو ئەو مەنجەڵە - لە سەر زەوی ئەو دوورگەیە، هەندێك گرووپیان لەو دوورگەیە دەژیان، هەریەك لەوانە ناوی (مرۆڤی دارستان) بووە، كە (ماركۆپۆلۆ) بە خۆی ئەوانە بە مرۆڤی كلك دار دادەنا، كە كلكیان هەبوو و بە كلكی (مەیموونەكان) دەچوو.

سیلان: لەو دوورگەیە، بەردی نرخدار هەیە و مەلیكەكەی گەورەترین (یاقوت) ی هەیە لە جیهاندا، كە درێژایی، بە درێژایی ناولەپی دەستە.

لار: زەوی (بەراهیمە) ئەوانە باشترین چین و توێژی بازرگانانن لە جیهاندا، گۆشت و شەراب ناخۆن و هیچ ئاژەڵێك ناكوژن، هەتا (زیندەوەر)یش، لەوانەش دەستەی ئایینی، خواردنی سەوزەوات و تەڕەی تازە حەرام كرا، لە بەر ئەوەی لەوانەیە بۆ ژیان زیانی هەبێ.

كینسای: مانای ئەو ناوە بە زمانی چینی، ئەوەیە: (شاری ئاسمانە)، ئەم شارە (١٢) هەزار قەنتەرەی هەیە، كە بە بەرد دروست كراون، هەروەكو (ڤێنیسیا)ی ئیتالی لە سەر ئاو دروست كراوە، كەشتییەكان دەتوانن بەژێری تێپەڕن، پاسەوانانی شەو یان ڕۆژ دەتوانن پاسەوانی هەموو شەقامەكانی ناو شارەكە بكەن، (ماركۆپۆلۆ) سەبارەت بە كوردەكانیش دەڵێ: ئەوانە نەتەوەیەكی زۆر دڕن.

## سەرچاوە و پەراوێز

١- گۆڤاری المعرفة
٢- گۆڤاری الجیل
٣- تۆما اسقف المرج - تاریخ الرؤساء.
٤- طه باقر - مقدمة في تاریخ الحضارات (القدیمة).
٥- ماركۆپۆلۆ (١٢٥٤ - ١٣٢٠) لە شاری (ڤێنیسیا) لە ئیتالیا لە دایك بووە، گەریدەیەكی ناسراو بووە، گەشتی كردووە بۆ وڵاتی مەگۆلەكان لە ناوەڕاستی ئاسیا.
٦- (شوورەی چین) ئیمپراتۆر شیە هوانگ ئەو شوورەی بنیاد ناوە یان دروستی كردووە، لە ساڵی ٢٢١ دەست بە دروستكردنی كراوە، درێژییەكەی ٢٧١٠ كم و بڵندییەكەی ٥ / ١٦ مەترە و پانییەكەی ١٠ مەترە.

و: نەجات خۆشناو

# هەولێر لە مێژوودا

زوبێر بلال ئیسماعیل

هەولێر ٨٠ کیلۆمەتر لە باشووری رۆژهەڵاتی شاری موسڵەوە دوورە، دەکەوێتە ٥٠ کیلۆمەتریی لە باکووری شاری (ئاڵتون کۆپری)، دەشکەوێتە چوارچێوەی هێڵی ٣٦.١١ی باکوور، هێڵی پانی ٤٢.٢ لە خۆرهەڵاتەوە.

هەولێر کەوتۆتە ناوچەیەکەوە هەردوو رووباری زاب بە دوورییەکی یەکسان کەوتوونەتە ئەملاو ئەولایەوە و هەر لە کۆنەوە شارۆچکەیەکی ئەم هەرێمە بووە، کە لە باکوور و باشوورەوە ئەم دوو رووبارە دەوریان داوە، هەولێر کەوتۆتە ناوەراستی هەرێمێکی دەوڵەمەندی بە پیتەوە بە چاو وا دەردەکەوێت بانێکی رێک و پانە، لە دێر زەمانەوە مرۆڤ لە هەندێک جێگەی ئەم هەرێمەدا ژیاوە، لە ئەشکەوتی شانەدەردا جێی نیشتەجێبوون دۆزراوەتەوە، کە کۆنترینیان بۆ نزیکەی ٥٠ - ٧٠ هەزار ساڵ لەمەوبەر دەگەرێتەوە و تیایدا ژمارەیەک ئێسک و پروسکی مرۆڤی نیاندرتاڵ دۆزراوەتەوە.

ناوچەی (زاروی چەمی) کە کەوتۆتە لێواردکانی لای چەپی زابی گەورە، بە کۆنترین گوندی جووتیاران دادەنرێت و بۆ ئەو سەردەمە دەگەرێتەوە کە مرۆڤ تیایدا تازە فێری کشتوکاڵ و مەر و ماڵات بەخێوکردن ببوو، ئەوەش سەردەمانێک بوو مرۆڤ لە قۆناغی لە ئەشکەوت نشینییەوە بۆ قۆناغی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و کێڵگە و لەوەرگا دەگوازرایەوە، هەرچی شوێنی (گردەچاڵ)ە کە کەوتۆتە لای چەپی زابی گەورەوە، دیسان یەکێکە لە کۆنترین گوندی کشتوکاڵی و بۆ ئەوکاتەش دەگەرێتەوە کە مرۆڤ لە دەشتە کشتوکاڵییەکانی کوردستاندا فێری نیشتەجێبوون بووە، مێژووەکەشی بۆ ٨ - ١٠ هەزار ساڵ بەر لە زایین دەگەرێتەوە، گردی قالیج ئاغاش کە کەوتۆتە ناوەراستی شاری هەولێرەوە لە نزیکەی چوار تا پێنج هەزار ساڵ بەر لە زایین ئاوەدان بووە و دواتر بۆ هەمیشەیی لە سێ هەزار بەر لە زایین چۆڵ کراوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت مێژووی گردەکە بۆ سەردەمی (بەر لە کوپلەکان و کوپلەکان و وەرکا) دەگەرێتەوە، دەربارەی شارەکە کۆنترین نیشانەمان لە رێگای تۆماری پادشاکانی نەوەی ئووری سێیەمەوە (٢٢١٤ - ٢٠٠٤پ. ز)یەوە بەدەست گەیشتووە، مەبەست نەوەکانی ئووری سێیەمی وەکو شولکی و ئامارسین، ئەوکات شارەکە بەدەستەی (ئۆربیلیم) یان (ئەربیلیم) باس کراوە و لە دەقە ئاشوورییەکانیشدا کە بە دەسخەتی بزماری نووسراوە، شارەکە ناوی دەستەی (ئاربا - ئیلۆ) باس کراوە، ناوەکەش وا شرۆڤە کراوە، کەوا بەمانای چوار خواوەند دێت، وا دەردەکەوێ نووسەرە ئاشوورییەکان ناوە سۆمەرییە کۆنەکەی (ئاوربیلوم)یان وا لێکدابێتەوە، کە مەبەست لێی چوار خواوەندە، هەربۆیە ناوە کۆنەکەیان کردووە بە (ئاربائیلۆ)[1].

لە دەقە فارسییە کۆنەکانیشدا کە بە رێنووسی بزماری نووسراون، ناوی شارەکە بە (ئاربیرا) براوە، لە سەرچاوە یۆنانی و رۆمانییەکانیشدا بە ئاربێلا یان ئەربەلا ناوی براوە، لە سەردەمی ئیسلامیشدا شاری هەولێر ناوەکەی خۆی پاراستووە و هەر بە ئەربل ماوەتەوە، دواتر کوردەکان ناویان لێنا (هەولێر)، دەڵێن ناوی هەولێر بەم شێوەیە وەرگیراوە: (ئەربێلا - اربیل - ئەرویل - ئەوریل - هوربیل - هەولێر)، هەولێر یەکێکە لە شارە گرنگەکانی مێژوو، چونکە هەر لە سەردەمە

دێرینەکانەوە یەکەمین جار کە مرۆڤ فێری نیشتەجێبوون بوو لەو شارە و ناوچەکانیدا نیشتەجێ بوون دروست بووە، یەکەمجار بەشێوەی گوندی کشتوکاڵی لە نزیکەی شەش هەزار ساڵی بەر لە زایین واتە لەو کاتەوەی مرۆڤ گوندی کشتوکاڵی و ژیانی کۆمەڵایەتی ساکاری پێکەوەناوە[٢]. هەر لە سەردەمی سۆمەرییەکانەوە و لە نزیکەی (٢٥٠٠پ. ز)یەوە هەولێر هەبووە، فراوانخوازییەکانی سەرجوونی ئەکەدی (٢٣٧١ - ٢٣١٦پ. ز) بە هەولێریش گەیشتووە، ئەمەش بە مەبەستی دەست بەسەراگرتنی ئەو رێگاوبانانەی لە باکوورەوە بۆ ناوەڕاست و باشوور دەچوون و دەرامەتیان پێدا تێدەپەڕێ[٣]، لە سەردەمی بنەماڵەی ئووری سێیەمدا هەڵمەتەکە گەیشتە ناوچەکانی (ئۆربیلۆم)، دوای ئەوەش ناوچەکە سەرەڕای ئەوەی چەندین قۆناغ و سەردەمی جۆراوجۆر و یەک لەدوای یەکی بەخۆوە دی، بەڵام هەر مایەوە و ئاوەدان بوو، قەڵاکەش شارێکی گرنگی ئاشوورییەکانە و لەسەر گردێکی دێرین دروست کراوە، کە لە شارەکە کۆنترە[٤]، واتە قەڵاتەکە دەورانی سۆمەریی و بابلی و فارسی و یۆنانی و فرثی و ساسانی و سەردەمانی ئیسلامیشی دیوە، ئەو قەڵایە نیشانەی ئەوەیە لە هەموو ئەو قۆناغ و سەردەمانەدا جێگای نیشتەجێبوون و ئاوەدانی بووە، هەولێر لە شوێنێکی گرنگدا هەڵکەوتووە جگە لە پێت و بەرەکەتەکەی، شوێنی هەڵکەوتنەکەی وای لێ کردووە ببێتە سەنتەری هاتوچۆی کاروانەکان، چونکە دەکەوێتە سەر رێگا مێژووییە دێرینەکەی سەردەمی بابلی و ئاشوورییەکان لە قۆناغە سەرەکییەکاندا. ئەو رێگایە سەرەتا لە نەینەوا و دواتر بۆ ئەربائیلۆ و ئەوجا بۆ ئارابخا (کەرکووک) و لەوێوە دەگەیشتە وڵاتی بابلەکان.

هەرێمی هەولێر بەشێکی گەورەی وڵاتە مێژووییەکەی ئاشوورییەکانی پێکهێناوە، لەبەر ئەوەش شارەکە لە ناوەڕاستی دەشتێکی بەپیت و خێر و بێر بووە، شارەکە لە سەردەمە دێرینەکاندا شارێکی سەرەکی بووە، لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا گرنگییەکی تایبەتی هەبووە، چونکە ئەوکات یەکێک بووە لە شارە ئاوەدانە سەرەکییەکانی (ئاشور - نەینەوا - کالح) ئەوە ئەوکاتە بوو، کە بە سەردەمی کۆنی ئاشووری (٢٠٠٠ - ١٤٠٠پ. ز)[٥] ناسراوە، شارەکە جگە لەوەی گەشەسەندنێکی شارستانی و ئاوەدانکردنەوەی بە خۆوە دیبوو سەربازگایەکی سەربازی ئاشوورییەکانیش بوو، لێیەوە شاڵاوە سەربازییەکانیان بۆ سەر ناوچە خۆرهەڵاتییەکان ساز دەدا، بێ لەوانەش هەولێر سەنتەرێکی گرنگی پەرستنی خواوەندی (عەشتار)یش بووە و پەرستگاکەی سەنتەری هەولێر ئاوی ژێر زەوی و کارێز و کانیاوی زۆری هەبووە، بەوانەشەوە بەناوبانگ بووە (مەبەست لە کارێز چەند لقە ئاوێکی ژێر زەوییە یان چەند بیرێکی ژێر زەوین کە لەنێوانیاندا تونێل هەیە)، هەر بۆیە شارەکە بە ئاوەدانی ماوەتەوە، بە جۆرێک داگیرکەرانی هەولێر هەرگیز نەیانتوانیوە کارێزەکانی خاپوور بکەن، هەروەکو چۆن پێیان کرابوو کەناڵ و تونێلەکانی ئاودێری وڵاتی بابل و تەواوی شارەکانی باشوور وێران بکەن[٦]، سەنحاریب (٧٠٤ - ٦٨١پ. ز) لەو ئاوەی لە دۆڵی بەستۆڕەدا کۆببووەوە ئاوی بۆ شارەکە گواستۆتەوە. (دۆڵی بەستۆڕەش) کەوتۆتە باکووری هەولێرەوە و ١٨ کیلۆمەتر لێی دوورە، پوختەی قسەش ئەوەیە: هەولێر هەر لە کۆنەوە وەکو شارێکی دێرین ناسراوە و تا ئەمڕۆش ناوە کۆنەکەی خۆی پاراستووە، ئەوەش بەهۆی ئەو تایبەتمەندییانەی، کە هەیبووە (بە پێتی خاکەکەی و شوێنە هەڵکەوتووەکەی، کە لە رووی بازرگانی و ئایینی و سەربازییەوە زۆر گرنگ بووە، ئەوە جگە لە سامانی ئاوی سروشتی و ئاوی ژێر زەوی) هەر بۆیە دەکرێت بڵێین هەولێر کۆنترین شاری زیندووی جیهانە.

**گەشەسەندنی مێژوویانەی هەولێر**

**أ- سەردەمی بەر لە دەرکەوتنی ئیسلام:**

١- سەردەمی سۆمەرییەکان: شولگی (٢٠٩٥ - ٢٠٤٨پ. ز) کە دووەمین پادشای بنەماڵەی سێیەمی ئوور بوو لە ساڵی چل و هەشتەمینی دەسەڵاتیدا شاڵاوێکی بۆ

سەر هەولێر هێنا، کاتێکیش ئامارسی (٢٠٤٧ - ٢٠٣٩پ. ز) جێگای ئەوی گرتەوە لە ساڵی دووەمی دەسەڵاتیدا دیسان پەلاماری هەولێری دایەوە، سۆمەرییەکان یەکێکی خۆیان بەسەر شارەکەوە کردە دەسەڵاتدار، بەڵام نەیانتوانی بە تەواوی دەست بەسەر شار و ناوچەکەدا بکێشن، چونکە هەولێر زۆر لە شانشینی سۆمەرییەکانەوە دوور بوو، کە لە باشووردا دەسەڵاتدار بووە[٧].

٢- سەردەمی ئاشوورییەکان: هەر لە سەردەمی کۆنی ئاشوورییەکانەوە هەولێر بووە شارێکی سەرەکی ئاوەدانی ئاشوورییەکان، باسی گرنگی و بایەخی شارەکەمان لە رووی سەربازی و ئایینییەوە کرد و خودی ئاشوورییەکانیش بایەخێکی زۆریان پێدەدا و بەر لەوەی هێرش و پەلامارە سەربازییەکانیان ئەنجام بدەن (حەج)یشیان بۆ شارەکە دەکرد، لەناو قەڵاکەیدا شوێنەواری ئەو سەردەمە دۆزراوەتەوە، کە بریتییە لە: (کۆتەڵێکی برۆنزی) و بەنووسین و رێنووسی بزماری ناوی خاوەنەکەی لەسەر نووسراوە، کە ناوی (شمش بیل) بووە کە لەبەر خاتری سەردارەکەی ئاشووردانی سێیەم (٧٧٢ - ٧٥٤پ. ز) کۆتەڵێکی عەشتار ئەربێلاشی لێ نزیک کردۆتەوە، دیسان لەوحێکیش دۆزراوەتەوە کە بۆ ئاشوور پانیپاڵ نووسراوە[٩]. بێگومان هەولێر کە سەردەمە یەک لە دوایەکانە شارستانی دیوە و هەر بە ئاوەدانی ماوەتەوە، دیارە شوێنەواری زۆر دەوڵەمەندی تێدایە، کە چیرۆکی ئەو شارستانییەتە یەک لەدوا یەکانەمان بۆ دەگێڕێتەوە.

٣- سەردەمی کۆنی فارسی: پاش ئەوەی لە ساڵی (٦١٢پ. ز) دەوڵەتی ئاشووری لەناوبردرا، هەولێر کەوتە ژێر دەستی میدییەکانەوە، جگە لە شوێنە پیرۆزە ئایینییەکانی شارەکە لە خاپوورکردن رزگاری نەبوو[١٠]. بەو شێوەیە هەولێر و تەواوی ناوچەکانی وڵاتی ئاشوورییەکان بوونە دەسکەوتی بابلییە هاوپەیمانەکانیان کە لە هیچ جێگایەکی ئەو وڵاتەدا هێزی سەربازی ئاشوورییەکان نەهێڵدرابوو.

ساڵی ٥٥٠پ. زاینیش دەوڵەتی فارسی دامەزرا و تەواوی ناوچەکانی کۆنترۆڵ کرد، هەولێر گەورەترین شاری ناوچەکە بوو، گۆڕەپانی ئەو شەڕە مێژووییە گرنگەش بوو، کە لە نێوان ئەسکەندەری مەکدۆنی و دارای سێیەمی دواهەمین پادشای فورسەکاندا لە ساڵی٣٣١پ.ز روویدا، هەر لەبەر ئەوەش ناو لە شەڕەکە نرا "ئەربێلا".

١- سەردەمی (فرثی ١٣٩پ. ز - ٢٢٦ز)/ کە بەناوی، "ئەشکانی یان پارتی"یش ناوبراوە : ئەم سەردەمە لەدوای سەردەمی سلوکی یۆنانییەوە دێت، لەم سەردەمەدا هەولێر زۆر گەشەی کرد و بووە پایتەختی شانشینێک کە بە حەدیاب ناسراو بووە، کە زۆرجار دەستەڵاتەکەی لە خۆرئاواوە بە فورات گەیشتووە و لە باکووریشەوە بە (نصیبین) گەیشتووە و قەڵەمڕەوی بە حەران و ماردین و بەشێکی ئەرمینیادا رۆیشتووە، زۆر پێدەچێت دەسەڵاتەکەی شاری (ئەلحضر)یشی گرتبێتەوە[١١].

حەدیاب ناوێکی ئارامییە و لەناو سەرچاوە کلاسیکییەکاندا لە بەرامبەریدا ناوی ئادیابین دێت، لەوانەیە لە وشەی (زابین)ەوە وەرگیرابێت و بەم شێوەیە مانای حەدیاب و ئەدیابین، بە هەرێمی ئەلزابەین دێت، جوگرافیاناسەکانی عەرەب حەدیابیان بە (حزە) ناوهێناوە، کە رەنگبێ کورتکراوەی وشەی حەدیاب بێت[١٢].

سێ پادشای حەدیاب بە (ئیزاگ) ناسراون، لە ساڵی (٨٣پ. ز)دا تکرانی دووەم یاخود یەکەم داگیری کرد، بەڵام لە ساڵی (٦٤ پ. ز) لێی کشایەوە و دواتر لە ساڵی (٦٢ز) تکرانی پێنجەم دیسان داگیری کردووە، بەڵام (مونابازوس)ی پاشای حەدیاب بە یارمەتی فرثییەکان توانی تکران دەربکات و وڵاتی ئەرمینیاش داگیر بکات[١٣].

لە سەردەمی تراجان و سفیروس و کراکلادا هێرشکارییەکانی رۆمان بۆ سەر حەدیاب درێژەی هەبوو، تا لە ساڵی (٢١٦ز) "کراکلا" پاش گەڕانەوەی لە شاڵاوی سەر (طیسفون) حەدیابیشی داگیر کرد، هەر لە هەولێریشدا گۆڕی پادشای

فرثییەکان ماوەتەوە[١٤].

لە شاری هەریری نزیک هەولێر وێنەیەکی "شا حەدیاب ئیزاتی سێیەم" هەڵکەنراوە و وا دەردەکەوێت، بە مەبەستی نەمرکردنی سەرکەوتنە سەربازییەکانی لەو ناوچانەدا نەخش کراوە[١٥]. لە شاری (الحضر)یش کۆتەڵێکی لە گەچ دروستکراوی (ئۆپلو)ی پادشای حەدیاب دۆزراوەتەوە، کە لە پەرستگای (بعل شمین) جێگیر کراوە[١٦].

٤- سەردەمی ساسانییەکان (٢٢٦ زایینی - ٦٣٧ز): ساڵی ٢٢٦ی زایینی دەسەڵاتی بنەماڵەی ساسانی فارسی (ساسانییەکان کوردی شوانکارەن، فارس نین) لە سەر دەستی ئەردەشێر دامەزرێنرا و رۆمانەکانی لە هەرێمی حەدیاب وەدەرنا و هەر لەوکاتەوە ئەو هەرێمە بووە مەیدانی شەڕ و شۆڕی نێوان رۆمان و ساسانییەکان، لەم سەردەمەدا بوو لە حەدیاب دەوڵەتۆکەی بت پەرستی جۆراوجۆر پێکهێنران، کە کۆمەڵێک فەرمانڕەوا بەڕێوەیان دەبردن و توانیبوویان لە قۆناغی جیاجیادا جۆرە سەربەخۆییەک بۆ خۆیان بەدەست بهێنن، لەوانە قەرەداغ کە لە نزیک هەولێرە و قەڵای ملقای کردبووە بنکەی خۆی و ساڵی (٣٥٨ی ز)[١٧] و لە کاتی فەرمانڕەوایی سابووری دووەمدا و پاش ئەوەی چۆتە سەر ئایینی مەسیحی بە شەهیدی مردووە، لە نزیکەی ساڵی ٥٠٠ زایینیشدا هەرێمی حەدیاب ئەسقەفیەتێکی گرنگ بووە و شاری موسڵ و شارۆچکەکانی دەوروبەریشی خراوەتە سەر، ئەو دەمە هەولێر یەکێک لە مەڵبەندە گرنگەکانی نەسرانییەت بووە و لەناو خۆیدا لە هەندێک جێگایدا پیاوی ئایینی مەسیحی وای تێدا هەڵکەوتووە، کە زۆر کتێبی ئایینی و زانستی بەهاداریان بۆ جێهێشتووین.

## ب- هەولێر لە سەردەمی ئیسلامدا:

ساڵی ٢٢ی کۆچی و لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (ر)، موسڵمانەکان هەولێر و دەوروبەریان رزگار کرد، هەڵمەتی رزگارکردنەکەش (عەتەبەی کوڕی فیرقەد)[١٨] سەرکردایەتی دەکرد و لەوکاتەوە هەولێر بووە بەشێکی دەوڵەتی ئیسلامی، یەکێک لەو رووداوە گرنگە مێژووییانەی ئەم ناوچەیە بەخۆیەوە دیوە، ئەو جەنگە بوو کە لە بەشی لای چەپی زێی گەورەوە لە نێوان دوایەمین خەلیفەی ئەمەوییەکان مەروانی کوڕی محەمەد و سوپای عەباسییەکان عەبدوڵڵای کوڕی عەلی ئەلعەباسی سەرکردایەتییان دەکردن، ئەو شەڕە نۆ رۆژ درێژەی هەبوو تا لە رۆژی ١١ی جەمادی ئاخیرەی ساڵی ١٣٢ کۆچی ئەمەوییەکان تێدا دۆڕان[١٩].

جگە لە دوادواییەکانی سەردەمی دەوڵەتی عەباسی، لە سەردەمی ئیسلامدا هەولێر رۆڵێکی بەرچاوی نەگێڕا، تەنانەت لە کتێبە مێژووییەکەی خۆیدا ئەلتەبەری باسی هەولێر ناکات، لە جوگرافیاناسەکانیشدا لە سەدەی نۆیەمی زایینیدا "ئیبنولخوردادبە" و لە سەدەی دەیەمی زایینیشدا "ئیبنولقودامە" باسیان لێوە کردووە، ئەوانیش لە باسکردنی دابەشکردنی عیراقدا بەو حیسابەی تەوجێکی هەرێمی حەلوان بووە، لە پاش ئەوەوە هەولێر بووە بەشێکی ولاتی ئەلجەزیرە و لە چوارچێوەی هەرێمی موسڵ دادەنرێت[٢٠].

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کورد و مەسیحییەکان زۆرترین بەشی دانیشتوانی شارەکە بوون، هەر لە سەدەی یانزەی زایینیشەوە کوردە هەزبانی و حەکمییەکان بەشێوەیەکی تایبەت لە هەولێر و دەوروپشتیدا نیشتەجێ بوون، زۆر جارانیش سەرکردەکانی ئەم دوو خێڵە لەسەر شاری هەولێر ململانێ و کێشەکێشیان کردووە، هەردوولاشیان لە هەرێمی هەولێردا ژمارەیەک قەڵایان هەبووە، ئەو ناکۆکی و ململانێیانە کە نزیکەی لە ناوەڕاستی سەدەی دەیەمدا روویان داوە، لەلایەن "ئیبن خەلدون" و "بەدرەدین ئەلعەینیی"دوە باسیان لێوە کراوە[٢١].

## میرنشینی هەزبانییەکان

هەزبانییەکان میرنشینێکیان دامەزراند و قەڵای هەولێریان کردە پایتەخت، کاتێکیش سەلجوقییەکان

لە عێراق دەركەوتن، ئەمانە دایانە پاڵیان. عیسای كوڕی موسا و سالاری كوڕی موسای براشی دوو میری هەزبانییەكان بوون كە لە ڕووداوەكانی ساڵی ٤٣٦ی كۆچیدا و لە مێژووەكەی (ئیبن موسك و ئەبو عەلی ئیبن موسك)دا و ڕووداوەكانی ساڵی ٤٤٠ی كۆچیدا) باسیان كراوە.

(حوسێنی كوڕی حەسەنی كوڕی موسا) كە بە ئەبولهیجائی هەزبانی ناسراوە یەكێكە لەوانەی ئیبن ئەسیر باسی لە چالاكی و هاوپەیمانێتییەكانی و ڕۆڵی لە ناكۆكییەكاندا كردووە، مەبەستیش لەو ناكۆكییانەیە كە لە نێوان ساڵانی ٥٠٠ - ٥٢٠ كۆچیدا لە نێوان خەلیفەكانی عەباسی و سوڵتانەكانی سەلجوقیدا ڕوویانداوە. لەدوای ٥٢٠ كۆچیشەوە ئیدی هەواڵەكانی بزر بووە و واشدەردەكەوێت لە هەمان ساڵدا میرنشینەكەی كەوتۆتە ژێر ركێفی عیمادەدینی زەنگییەوە، كە لە مانگی ڕەمەزانی ئەو ساڵەدا هەولێری ڕزگار كردووە.

**میرنشینی هەولێر**

پاش گرتنە دەستی هەولێر، زەنگی یەكێك لە سەركردەكانی سوپاكەی هەڵبژارد و شارەكەی پێ بەخشی، ئەو سەركردەش "زەینەدینی عەلی كوچك"ی كوڕی "بەكتەكین" بوو، ئەویش بەناوی بەكتەكینەوە میرنشینێكی تێدا دامەزراند، زەینەدین لە هەولێر نوێنەری دەسەڵاتدارانی ئەتابەكی بوو، كە لە موسڵەوە حوكمیان دەكرد، ساڵی ٥٣٩ی كۆچی نوێنەری عیمادەدین بوو، دواتر بووە نوێنەری سەیفەدینی غازی كوڕی عیمادەدین، كە لە ساڵی ٥٤٤ی كۆچی مردووە، دواجاریش نوێنەری قوتبەدینی مەودوود بووە، ئەوكاتەشی لە قەڵای موسڵەوە دەسەڵاتی پیادە دەكرد، یەكێك بوو لەو دەوڵەتانەی زۆرترین قەڵای هەبوو، چونكە قەڵاكانی هەكاری و ئامێدی و هەولێر و ئاكرێ و شوش و سنجار و حەران....یشی بەدەستەوە بووە[٢٢].

زەینەدینیش نوێنەری خۆی بۆ هەولێر دەنارد، یەكێك لە نوێنەرەكانی ئابا مەنسوری سەرفكین بووە كە لە تەواوی مەملەكەتەكەیدا زۆر پشتی پێ بەستبوو، پاش مردنی سەرفتەكینیش لە ساڵی ٥٥٩ی كۆچیدا موجاهیدەدینی قایمازی كردە نوێنەری خۆی لە هەولێر، ساڵی ٥٦٣ی كۆچی زەینەدینی نوێنەری دەستبەرداری قوتبەدین بوو، بە خزم و ماڵ و منداڵ و سامانەكەیەوە بەرەو هەولێر كۆچی كرد، دووچاری كەڕی و كوێریش ببوو، ئەوكاتەش بەرەو هەولێر كەوتەڕێ جگە لە هەولێر هەرچییەكی هەبوو دایە دەستی قوتبەدین، بەڵام لە هەمان ساڵدا كۆچی دوایی كرد و تەرمەكەی لەناو خاكی هەولێردا سپێردرا[٢٣].

پاش مردنی زەینەدین، جێگەكەیان دایە دەستی موزەفەرەدینی كوڕە گەورەی، بەڵام زۆری نەبرد موزەفەریان لەسەر حوكم لابرد و زەینەدینی یوسفی برا بچووكیان لە جێگەكەی دانا. ئەو زەینەدینەی كاتێك سەلاحەدینی ئەیوبی ڕووبەڕووی خاچپەرستەكان بووەوە، بووە هاریكاری ئەیوبی، لە ١٨ی ڕەمەزانی ٥٨٦ی كۆچی واتە لە ١١٩٠ی زایینی. زەینەدین لە شاری ئەلناسرە مرد و هەر لەوێ بەخاك سپێردرا. لە هەمان ساڵدا و لەسەر ڕەزامەندی سەلاحەدینی ئەیوبی، ئەبو سەعیدی گوگبری برای زەینەدین كە بە مەلیك موعەزەم موزەفەرەدین ناسرابوو كرا بە دەسەڵاتداری میرنشینی هەولێر. گوگبری زاوای سەلاحەدین بوو بۆ پاڵپشتی سەلاحەدین لە شەڕی خاچپەرستەكاندا بەشداری كردبوو، لە شەڕی (حەتینی) بەناوبانگدا زۆر دلێر و دیار بووە.

بە درێژایی سەدەكانی ناوەڕاست هیچ كاتێك هەولێر وەكو سەردەمی موزەفەرەدین لە پێشكەوتن و خۆشیدا نەبووە، موزەفەرەدین ئەم دەوڵەتۆكەیەی كە لە براكەیەوە بۆی مابووەوە، فراوانتری كرد و میرنشینەكانی دەوروبەری خستە ژێر دەستی خۆیەوە، هەرێمی شارەزووری بە كەركووكیشەوە كردە بەشێك لە میرنشینەكەی خۆی. لەو دەمەدا بوو ژمارەیەكی زۆری بیانی لە هەولێردا نیشتەجێ بوون و شارەكەی كردە یەكێك لە شارە گرنگەكانی هەموو ناوچەكە[٢٤].

**گەشەکردنی میرنشینەکە لە سەردەمی موزەفەرەدین (٥٨٦ - ٦٣٠ کۆچی/ ١١٩٠- ١٢٣٢ زایینی)**

میرنشینی هەولێر لە رووی ئاوەدانکردنەوە و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەوە، گەشەکردنێکی باشی بەخۆوە بینی. گوگبری قوتابخانە و مزگەوت و نەخۆشخانەی زۆری تێدا دروست کرد و خانەیەکی بۆ هەریەک لە بێ دایک و باوک و کوێر و پەککەوتەکان کردەوە، هەر ئەویش بوو بەشی خوارەوەی هەولێری ئاوەدان کردەوە (ئەو بەشەی دەکەوێتە خوار قەڵای هەولێر) هەموو دەزگا و پێویستییەکی بۆ دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێویست بوو موزەفەرەدین بۆ میرنشینەکەی دابینی کرد، تەنانەت سکەی پارەشی لێدا. زۆر جاران ئاهەنگ و جەژنی فراوان و بە باق و بریقی وای ساز دەکرد، لە هەموو لایەکەوە خەڵکێکی زۆری بۆ هەولێر رادەکێشا، یەکێک لەو جەژنە پڕ شکۆیانە جەژنی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د. خ) بوو، کە لە چوارچێوەی ئاهەنگێکی فراواندا لە گەرمەی بازارێکی بازرگانی گرنگدا بەرێوە دەچوو[٢٥].

یەکێک لە ئاسەوارەکانی ئەو سەردەمە گەشایەوە گومەز و منارەی موزەفەریەیە، کە کاتی خۆی مزگەوتێکیشی لەگەڵدا بوو، کە لە گەچ و چیمەنتۆ دروست کراوە و بناغەیەکی بە نرخیشی هەبووە بە زەخرەفە رازێنراوەتەوە، لەناو چێوەکەشیدا دوو قاڵدرمەی لولەیی تێدایە، کە پێکەوە پەیوەست نین، دوو دەرگاشی تێدایە هەردووکیان بەرەو قاڵدرمەکانن، پاشماوەی منارەکە ٣٧ مەترە، دانانی قاڵدرمەکان بەم شێوەیە تایبەتمەندییەکی (بیناسازی) کەم وێنە بووە، پاشماوە و ئاسەوارێکی دیکەی ئەو سەردەمە گومەزی (زەینول دینی عەلی کوچک) و چەندین گۆڕی پیاوانی زانست و تەسەوفە، ناوی خاوەنی زۆربەی گۆڕەکان بزرە، چونکە لەسەر زۆربەیان ناونیشان نەنووسراون.

لەو سەردەمەدا هەولێر ژمارەیەک زانا و ئەدیب و نووسەر و چەندین کتێب و دانراوەی خوڵقاند و بە نەمری مانەوە، هەر ئەوانیشن باشترین بەڵگەن بۆ ئاستی گەشانەوەی هەولێری ئەو سەردەم، کە لە راستیدا ئەوکات هەولێر یەکێک بوو لە مەڵبەندە زانستییە گرنگەکانی ئیسلام.

**مردنی موزەفەرەدین**

کاتێک لە ساڵی (٦٣٠ کۆچیدا/ ١٢٣٢ زایینی)دا موزەفەرەدین مرد و کەسی بۆ جێگاکەی خۆی دانەنا، دەوڵەتەکەی کەوتە ژێر دەستی خەلیفە (موستەنسیر)ی عەباسی، بەو هۆیەشەوە کە خەڵکی شاری هەولێر ملیان بۆ دەسەڵاتی خەلافەتی عەباسی نەدەدا و دانیان پێدانەدەنا، هەر بۆیە خەلیفەش لە سەرەتا و بۆ ملکەچ پێکردنی شارەکە هانای بۆ شمشێر و هێز برد و پاش گەمارۆدانی شارەکە لە کۆتاییدا (ئیقبالی شەرابی) هەولێری داگیر کرد[٢٦].

پاش ماوەیەک شاڵاوی مەغۆلەکان لە هەولێر نزیک بووەوە و ساڵی ٦٢٨ کۆچی و ١٣٢٠ زایینی شاڵاوەکە گەیشتە ناوچەکانی هەولێر و لە ساڵی ٦٣٣ی کۆچی و ١٢٣٥ زایینی لەناو کۆڵان و شەقامەکانی شارەکەدا بێ سەروبەرییەکی زۆریان بڵاوکردبووەوە، ساڵی ٦٣٤یش سەر لەنوێ دەرکەوتنەوە و بەشی خوارەوەی شارەکەیان سووتاند، دیسان قەڵاکەیان گەمارۆدایەوە، کە هێشتا بەرگرییەکی توند و بێ وێنەیان درێژەپێدەدا، پاش تێپەڕ بوونی ٤٥ رۆژ مەغۆلەکان بەرامبەر بە (جزیە)یەکی زۆر لەو شوێنە کشانەوە[٢٧].

کاتێک هۆلاکۆ بەرەو بەغدا بەرێکەوت، سەرکردەیەکی سوپاکەی بۆ پەلاماردانی هەولێر رەوانە کرد، زیاتر لە ساڵێک کوردەکانی دانیشتوانی قەڵاکە بەرگرییان کرد و قەڵاکەیان نەدا بەدەستەوە، بە هاوکاری (بەدرەدین لوئلوء)ی فەرمانڕەوای موسڵ نەبێت، مەغۆلەکان نەیاندەتوانی قەڵاکە بگرن[٢٨].

**هەولێر لە سەردەمی فەرمانڕەوای مەغۆلەکاندا**

پاش ئەوەی هەولێر لەلایەن مەغۆلەکانەوە داگیر کرا، سەردەمێکی پڕ لە دواکەوتوویی و سستی و نەگبەتی لە مێژووی شارەکە

دەستی پێکرد و زانست و بونیاتنان و بیناسازی لە شارەکە برا و بەدردەدین لوئلوء لە بەرامبەر حەفتا هەزار دیناردا لە جیاتی مەغۆلەکان حوکمڕانی هەولێری دەکرد، پاش ئەویش مەسیحییەکان حوکمیان کرد کە (موختەس یەکێک بوو لەوانە).

لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەمینی کۆچیدا (واتە لە سەردەمی جەلائرییەکاندا کە پاش مەغۆلەکان خەڵکانی دیکە حوکمی عیراقیان کردووە، دەسەڵاتدار و میرەکانی خێڵی مازنجانی کوردی هەولێریان بەڕێوە بردووە.

یەکەم میریان: (موبارزەدینی کاک) بووە، دواتریش عیزەدینی کوڕی و دوای ئەویش میر نەجمەدینی خەقر و دوای ئەویش کوڕەکەی حوکمی هەولێری کرد، کە ناوی میر شوجاعەدین بووە، لەو سەردەمەدا عەقرە (ئاکرێ) و (شوش)یشیان لە ژێر دەستدا بووە، لە سەردەمی مەغۆلەکاندا هەولێر مەڵبەندێکی پارە گۆڕینەوە بوو[٢٩].

پاش بنەماڵەی موبارەزەدینی کاک، بنەماڵەیەکی کوردی دیکە حوکمی هەولێری کردووە، کە ناوی (ددلقەندی) بووە و ئەمانەش ناوی ژمارەیەک لە میرەکانیانە:

شەریف عەلائەدینی عەلی، یەحیا و دواتریش عەلی کوڕی یەحیا جێگەی ئەویان گرتۆتەوە، میرەکانی ئەم دوو بنەماڵەیە لەگەڵ مەمالیکەکانی میسردا نامە و نامە گۆڕینەوەیان هەبووە.

پاش ئەم سەردەمە هەولێر لە ساڵی ٧٩٦ی کۆچی و ١٣٩٣ی زایینی دوچاری پەلامار و داگیرکارییەکانی (تەیموری لەنگ) بۆتەوە.

**سەردەمی تورکمانی و سەفەوی**

دواتر هەولێر ملکەچی دەسەڵاتی دەوڵەتی قەرەقۆینلو (١٤١٠ - ١٤٧٠) زایینی بۆتەوە و دواتریش کەوتۆتە ژێر دەستی دەوڵەتی (ئاق قۆینلو)، ١٤٧٠ - ١٥٠٨ ساڵی ١٥٠٨یش کەوتۆتە ژێر دەستی سەفەوییەکان، ساڵ ١٥١٤ زایینیش لە نزیک تەورێزدا و لە شەڕی چاڵدێرانی بەناوبانگدا سوڵتان سەلیمی عوسمانلی بەسەر شا ئیسماعیلی سەفەویدا سەرکەوت، پاش ئەوەی عوسمانییەکان کوردستانی ناوەڕاست و کوردستانی عیراقیان خستە ژێر دەستی خۆیانەوە، ئیدی دەسەڵاتی سەفەوییەکان لەم ناوچانەدا نەمان، لە هەمان ساڵدا سوڵتانی عوسمانلی دانی بە بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان دانا کە بەناوبانگترینیان میرنشینی بادینان لە ئامێدی و میرنشینی سۆران لە هاودیان و دواتر لە هەریر و بۆ دواجاریش لە ڕواندز بوو[٣١].

محەمەد پاشا بەناوبانگترین میرانی سۆران بوو لە سەردەمی ئەویشدا بوو میرنشینەکە زۆر فراوان بوو، بەڵام عوسمانییەکان کاتێک هەستیان بە مەترسی دەسەڵاتی بنەماڵەکەی کرد، خێرا لە ساڵی ١٨٣٨ی زایینیدا دەسەڵاتی میرنشینەکەیان کۆتایی پێهێنا.

لە ساڵانی ١٧٣٢ و لە ساڵی ١٧٤٣یشدا هەولێر دوچاری داگیرکارییەکانی نادر شا بووەوە. ساڵی ١٧٤٣ پاش گەمارۆیەکی ٦٠ ڕۆژی توانی هەولێر داگیر بکات، ئەو سەردەمەش چەرمەسەرترین و دژوارترین سەردەمی مێژووی ناوچەکە بوو.

ساڵانێکی زۆری سەدەی نۆزدەیەم هەولێر وەکو بەشێکی ویلایەتی بەغدا مایەوە و سەربازگەیەکی (ئینکیشار)ی بەهێزیشی تێدا جێگیر کرابوو، چونکە بە یەکێک لە مەڵبەندە گرنگەکانی ویلایەتەکە دادەنرا، کاتێکیش لە ساڵی ١٨٧٩ ویلایەتی موسڵ لە ویلایەتی بەغدا جیا کرایەوە، هەولێر خرایە سەر ویلایەتی موسڵ، بەگوێرەی دواهەمین هەڵسەنگاندنی بەڕێوەبەرایەتی، کە تورکەکان ئەنجامیان داوە هەولێر قەزایەکی سنجەقی شارەزوور بووە.

لە تشرینی دووەمی ١٩١٨ دا ئینگلیزەکان هەولێریان داگیر کرد و لە حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩شدا مستەر (های)یان وەکو یەکەمین یاریدەدەری حاکمی سیاسی لە هەولێردا دەستنیشان کرد. لە یەکەمین ڕۆژی مانگی تشرینی دووەمی ١٩١٩شدا لیوای هەولێر پێکهێنرا و هەردوو قەزای کۆیە و ڕواندزیشی خرایەسەر. پاش پێکهێنانی دەوڵەتی عیراقیش (ئەحمەد ئەفەندی عوسمان) کراوەتە یەکەمین موتەسەریفی هەولێر.

## شۆڕشی هەولێرییەکان لە دژی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا

لە نێوان دوا دواییەکانی ساڵی ١٩١٩ تا دەستپێکی ساڵی ١٩٢٣دا خێڵە کوردەکانی ناوچەی هەولێر ڕاپەڕین و ڕاپەڕینەکەشیان هۆکاری ئایینی و سیاسی هەبوو، ئەمە جگە لەوەی کارگێڕایەتی بەریتانیا گەندەڵییەکی زۆریان بڵاوکردبووەوە و دووبەرەکی و ناکۆکییان خستبووە ناو سەرکردە و سەرۆک خێڵەکان، کەسایەتییە خۆماڵییەکانی ناوچەکەیان دابوو بەگژیەکدا، هەریر و ڕواندز و شەقڵاوە و کۆیە مەڵبەندی شۆڕشی خێڵەکان بوون لە دژی بەریتانییەکان، شۆڕشگێڕەکان شاری هەولێریان گەمارۆدا بۆ ئەوەی لە دەستی ئینگلیزەکان دەری بێنن، تەواوی خێڵەکانی سورچی و خێڵەکانی ڕواندز و خۆشناو و گەردی و ئاکۆیان و زراری لەو شۆڕشەدا بەشدار بوون، تا ئەودەمەی ئینگلیزەکان لە ٢٢ی نیسانی ١٩٢٣دا نەچوونە شاری ڕواندزەوە شۆڕشەکە دانەمرکایەوە، هەتا گەیشتیشە شارەکە لە ڕێگادا زیانێکی ماڵی و گیانی زۆریان لێکەوت و کەلوپەلی فڕۆکەیان لەدەست دا.

## بایەخی هەولێر لە کەلەپووری ئیسلامیدا

١- قوتابخانەکان: گەلی کورد لە ناخی دڵییەوە باوەڕی بە ئیسلام هێنا، لەناو شاخ و دۆڵ و هەموو جێگایەکدا مزگەوت و قوتابخانەی بنیات ناوە، ئەم بایەخدانەی کورد بە جۆرێک بووە گوندێک نەبووە قوتابخانە و مزگەوتی تێدا نەبێت، هەر بۆیە ژمارەیان زۆر و زەوەند بووە، لە ڕووی گەشەپێدانی شارستانی ئیسلامدا مێژووی ڕۆڵی کورد لەبەرچاوە، لە هەموو سەردەم و قۆناغەکانی مێژووی شارستانی ئیسلامی و ڕۆشنبیری عەرەبیدا، خزمەتی مەزن و قوربانی گەورەی پێشکەش کردووە، لەناو کورد ئیمامی وا سەریان هەڵداوە لە بواری (تەفسیر) کردنی (حەدیس) واتە شرۆڤە کردنی فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (د. خ) و (اصول) و مێژوو و ئەدەب و زماندا دەستێکی باڵایان هەبووە... هەرکەسێک لە مێژووی ئیسلامی بڕوانێ، بەتایبەتی کتێبە وەرگێڕاوەکان زۆر بەڵگەی بەرچاو دەکەوێت کە سەلمێنەری ئەوەن هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامەوە زانایان و پیاوانی کورد لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و بزاقە سیاسی و زانستییەکاندا لە هەموو سەردەمێکدا ڕۆڵی دیار و گرنگیان هەبووە.

هەرچەندە ئاستی باڵادەستێتی کورد لە زانستە ئیسلامییەکاندا هاوتای ئاستی باڵادەستییان نەبووە لە بواری ئاوەدانکردنەوە و بنیاتناندا، لەگەڵ ئەوەشدا وڵاتەکەیان بە قوتابی و قوتابخانە پڕ بووە و تیایاندا قوتابیان باشترین و بەکەڵکترین زانستیان خوێندووە و ئەو خوێندن و زانستە ئیسلامییانەی لەو قوتابخانانەدا دەوترانەوە هیچی کەمتر نەبوو لەو زانست و وانانەی لە زانکۆ گەورەکانی مەڵبەندە گرنگەکانی ئەوکاتی جیهانی ئیسلامی دەوترانەوە، دانراوە و کتێبە زانستییەکانیان لە بواری هونەر و زانستدا باشترین بەڵگەی ئەو قسەیەن.

هەرچەندە زاناکانی کورد ئەو وزە زانستەیان هەبووە، بەڵام وەرگێڕان و ناو و باس و زانستەکانیان بزربوون، تەنیا کەمێکیان، نەبێت ئەوانەی لە سەردەمی پێشکەوتنی ڕێگاوبان و گەیاندندا ژیاون و کۆچ و کاروانی زانستییان بە وڵاتاندا کردووە، یاخود ئەوانەیان نەبێت کە خۆیان بە مەڵبەندە گەورەکان گەیاندووە و چوونەتە ژێر باڵی میرە بەناوبانگەکانەوە، لەوێشدا پێگە و ئاستی بەرزیان مسۆگەر کردووە و ناوبانگی باشیان بەدەست هێناوە، ئەوکاتەش پەیوەندی و گەیاندنی نێوان وڵاتە ئیسلامییەکان نەمان و کۆچی زانستی و سەفەر کردنی خەڵک بۆ خوێندن و زانست فێربوون کەم بۆتەوە، ئیدی مێژووی کتێبەکانی کوردیش کەوتوونەتە ژێرەوە، ئەمەش بەهۆی تەوازع و گۆشەگیری خۆیانەوە، چونکە هیچیان لە مێژوو وەرگێڕاوەکان نەنووسیوە، لەلایەکی دیکەشەوە زۆری هێرش و تەسکبوونەوەی باری بیناکردن و ئاوەدانکردنەوە، وای کردووە چالاکییەکان کەمتر ببنەوە و سست

بن.

ئەمانەش ناوی ژمارەیەک فەقێ و زانای بەناوبانگن لە هەولێر کە کتێبە تەرجەمە کراوەکانیان ناوی ئەوانی بە نەمری هێشتۆتەوە و ناوبانگیان سنووری شارەکەی خۆیانی بەزاندووە.

ئەبو ئەحمەد ئەلقاسمی کوڕی موزەفەری کوڕی عەلی کوڕی قاسمی شارەزووری، کە باوکی قازی ئەلخافقین، ئەبی بەکر محەمەد و مورتەزای ئەبی محەمەدی عەبدوڵڵا و ئەبی مەنسووری موزەفەرە، ئیبنوخەلەکان دەڵێ: "ئەو باپیرە گەورەی شارەزوورییەکانە لە شام و موسڵ و جەزیرە و هەموویان نەوەی ئەون و ماوەیەک حاکمی شاری هەولێر بووە و ماوەیەکی دیکە حاکمی شنگار بووە، کوڕەکانی و نەوەکانیشی زانای بەناوبانگی باش و بەرزیان بەدەست هێناوە، بەتایبەتی قازی کەمالەدین محەمەد کە نەوەی ئەو بووە، ئەو قاسمەی باسمان کرد ساڵی ٤٨٩ کۆچی / ١٠٩٥ زایینی لە موسڵ مردووە"[٣٢].

محەمەدی کوڕی عەلی کوڕی جامع، یەکێک لە مامۆستا و فەقێ شارەزاکانی هەولێر بووە و لە پیاوانی سەدەی شەشەمی کۆچی بووە، باپیری (بەنو موحتەسەب) بووە، کە لە هەولێر لە سەردەمی ئەبی هیجائی کوڕی ئەبی عەلی خاوەنی هەولێر (خەتیب) بووە [٣٣]، بەر لە ئەو محەمەدی کوڕی عەلی لەسەر ئەو کارە بووە، خضری کوڕی نەسر کە ئیبن خەلەکان بە یەکەمین مامۆستای شاری هەولێری داناوە (خضر ساڵی ٤٧٨ لە دایک بووە و ساڵی ٥٦٧ کۆچی دوایی کردووە)، یەکەمین قوتابخانە لە شاری بەغدادا، قوتابخانەی (نیزامیە) بووە کە ساڵی (٤٥٩ک / ١٠٦٦ز) دروست کراوە، ئەوە لە سەردەمی هەزبانییەکاندا بووە، بەڵام لە سەردەمی ئەتابەکییەکاندا زەینەدین عەلی کوچکی دامەزرێنەری میرنشینی ئەتابەکی لە هەولێر نوێنەری خۆی بۆ هەرێمەکانی فەرمانڕەوایەتییەکەی دەنارد، یەکەمین نوێنەری لە هەولێر (سەرفتکین) بووە کە ساڵی ٥٥٩ی کۆچی مردووە، ئەم کابرایە لە شاری هەولێر و گوندەکانیدا مزگەوت و قوتابخانەی زۆری دروست کردووە و قەڵاشی بنیات ناوە[٣٤].

"ئەبو مەنسووری قایماز"ی کوڕی عەبدوڵڵا، جێی گرتۆتەوە، کە لە هەولێر قوتابخانە و خانەقای دروست کردووە، هەر بۆیە شارەکە گەشە کردنێکی دیاری بەخۆوە بینی، کاتێکیش ئەبو سەعیدی گوگبری ساڵی ٥٨٦ی کۆچی دەسەڵاتی میرنشینەکەی گرتە دەست، لە ماوەی ٤٤ ساڵی دەسەڵاتیدا گوگبری هەموو هەوڵێکی خۆی بۆ گەشەپێدانی وڵاتەکەی خستەگەڕ، هەر لە سەردەمی ئەودا بوو هەولێر گەشەسەندنێکی ئاوەدانی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی گەورەی بەخۆوە بینی، گوگبری لە هەولێردا قوتابخانەی موزەفەرییە و هەندێک دەزگای کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری دامەزراند، لە سەردەمی ئەودا هەولێر تەواوی دیوانەکانی هەبوو وەکو دیوانی (وەزارەت و حجابە و دیوانی ئینشا و دیوانی وەقف و ئیستیفاء، دیوانی مەزاڵم و دیوانی ئیرتیفاع و دیوانی ئیهرائوتەسەروف و خانەی غورب و نووسین و خەزێنە و سیلاح...)[٣٥].

موزەفەرەدین دەیویست شارەکە بکاتە قیبلەی هەموو کەسێک و جێ نزرگەی رێبواران، هەر ئەو بوو لەدایکبوونی پێغەمبەر (د. خ)ی کردە جەژنێکی وا کە دوانزە رۆژی دەخایاند، ئەو ئاهەنگگێڕانە لەلای ئیبن خەلەکان زۆر بە گرنگی و شکۆدارییەوە باسی لێوە کراوە[٣٦].

ئەو هەوڵانە ئاستی رۆشنبیری خەڵکی هەولێریان بەرزکردەوە، زۆر زانا و ئەدیب لە زۆربەی وڵاتانەوە روویان تێدەکرد، تا ساڵی ٦٣٠ی کۆچی لە هەولێر ژیا و تەمەنی لە سەد ساڵ تێپەڕاند، لەو ماوەیەدا توانی لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەوە ئاراستە و رێنیشاندەر بێت، لە نێوان زۆر لە وڵاتە ئیسلامییەکانیشدا پەیوەستی و پەیوەندی دروست کرد، بەرهەمی هەولێر لە زانست و ئەدەب زۆر بوو، هەر بۆیە جێگە و ئاستێکی باشی بەدەست هێنا[٣٧]. لێرە شوێنی ئامارێکی دەرچووەکان (المتخرجین) نابێتەوە، تەنها ئەوەندەیە ناسراوەکان ژمارەیان زۆرە، کە کارتێکردن و ئاسەواریان بەسەر دەرەوەی هەولێری

گەورەدا هەبووە.

هەولێر ژمارەیەکی زۆر زانا و ئەدیب و مێژوونووس و شاعیری بەخۆیەوە گرتووە و دانراوی بە پێز و زۆر باشیشیان لە هەموو بوارێکی زانستدا هەبووە.

لە هەولێردا موزەفەرەدین خانەیەکی بۆ (حەدیس) دانا کە لەگەڵ خانەی حەدیسی موزەفەرییە لە موسڵ، بە کۆنترین خانەی (حەدیس) دادەنرێت لە جیهانی ئیسلامیدا[٣٨].

ئەم خانەیە لەگەڵ دەزگا رۆشنبیرییەکانی دیکەدا بەشداری گەشەپێدان و پێشکەوتنی بزاڤی رۆشنبیری لە هەولێر کردووە و چەندین رۆڵەی رۆشنفکریان لە بواری رۆشنبیری جۆراوجۆردا سەریان هەڵداوە، جگە لە بنەماڵەی شارەزووری کە باسمان کرد، ئاماژە بە عوسمانی کوڕی عەبدولرەحمانی کوردی دەدەین، کە بە کوڕی سەلاح شەرخانی ناسراوە کە دیارترین تەفسیرکەرانی سەردەمی خۆی بووە، شەرخانی ساڵی ٥٧٧ی کۆچی / ١١٨١زایینی لە دایک بووە(٣٩) و لە ساڵی ٦٤٣ی کۆچی/ ١٢٤٥زایینیدا مردووە، (علوم الحدیث) یەکێک لە کتێبە دیارەکانیەتی، کە بە موقەدیەی (ابن الصلاح) ناوبانگی دەرکردووە (تەبەقاتی شافعی).

ئیبنولمستەوفی (موبارەک بن ئەحمەد)ی مێژوونووس و ئەدیب، ساڵی ٥٦٤ کۆچی/ ١١٦٨ زایینی لە هەولێر لە دایک بووە و ساڵی ٦٣٧کۆچی/ ١٢٣٩زایینی لە موسڵ کۆچی دوایی کردووە، ئیبنولمستەوفی خاوەنی کتێبی مێژووی هەولێرە. ئیبنوخەلەکان (ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی ئیبراهیم)ی مێژوونووس ساڵی ٦٠٨ کۆچی/ ١٢١١ زایینی لە دایک بووە و لە ساڵی ٦٨١ کۆچی/ ١٢٨١ زایینی کۆچی دوایی کردووە و خاوەنی (وفیات الاعیان)ە.

حاجری شاعیر (عیسای کوڕی سنجر)ە، ساڵی ٦٣٢ کۆچی/ ١٢٣٤ زایینی کۆچی دوایی کردووە. ئەسعەدی کوڕی ئیبراهیم شابی شاعیر بووە، ساڵی ٥٨٢ کۆچی/ ١١٨٦ زایینی لە هەولێر لە دایک بووە و ساڵی ٦٥٧ کۆچی/ ١٢٥٨ زایینی مردووە، نووسەری ئینشای (موزەفەرەدین) بووە. ئیبنولفەخر ئەلئەربیلی ساڵی ٦٩٢ کۆچی مردووە و خاوەنی کۆمەڵێک کتێبی بەنرخە، لەوانە: (نامەی تارمایی، رسالة الطیف، کشف الغمة في معرفة الأئمة) چاپکراون... چەندین دانراوی دیکە..

پاش کۆچی دوایی موزەفەرەدین لە هەولێر بزاڤی زانستی بەردەوام بووە تا ئەوکاتەی مەغۆلەکان ولاتەکەیان داگیر کردووە، ساڵانی دواتریش چالاکی زانستی لاواز بووە و زاناکان شارەکەیان جێهێشتووە و ئاوەدانکردنەوە کەم بۆتەوە و قوتابخانە سەربەخۆکان نەماون، لەگەڵ ئەوانەشدا زۆر چالاکی زانستی جۆراوجۆر و لێکداپچڕاو هەبوون و مۆرکی تاکە کەسیان پێوە دیار بووە و ژمارەیەک خەڵکی دیاریان دروست کردووە، لەوانە: محەمەد کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حوسێنی ئەلزرزاری، کە لە نێوان ساڵانی ١٢٦٣ - ١٣٣٧ زایینی ژیاوە و بە پلەی (قاضی القضاە)ی شام گەیشتووە، هەروەها زەینەدین عەبدولرەحیمی کوڕی حوسێنی کوڕی ئەلرازنانی کە حەدیس خوێنێکی دیار بووە و هەروەها ئەلمەعەری ئەلعیراقی باوکی وەلیەدینی ئەبی زەرعە ئەحمەد کە حەدیس خوێنی میسر بووە، عەبدولرەحیم ساڵی ١٣٢٤ لە میسر لە دایک بووە و لە ساڵی ١٤٠٣ زایینیدا مردووە.

نزیکەی دوو سەدە تێپەڕی هیچ بزاڤێکی زانستی دەرنەکەوت لە سەرەتای سەدەی شانزەمینی زایینییەوە، دەسپێکی بزاڤێکی زانستی چالاک وەدەرکەوت، ئەمەش بەهۆی هەندێ بنەماڵەی زانست پەروەرەوە، هەروەکو بنەماڵەی ئەبی بەکر ئەربیلی و بنەماڵەی حەیدەری و بنەماڵەی جەلی زادە و ئیبنولئادەمی باڵەکی و شێخ وەتمان و زیارەتی و بنەماڵەی هەرشەمی و رەنگەرێژانی و گراوی و...هتد، هەروەک جاران مزگەوتەکان گوڕو تینیان تێ کەوتەوە وەکو سەرەتا دیسان بوونەوە بە سەرچاوەی زانست و رۆشنبیری هەرچەندە توانایەکی ماددی کەمیان هەبوو، کەسان و خەڵکانی زانای ئەو بنەماڵە و خێزانانە زانست و رۆشنبیرییەکی باشیان هەبوو،

خەڵکێکی زۆریان فێر کرد و بەشیان دان.

مزگەوت و قوتابخانە ئاینییەکان بەخششێکی زۆریان پێشکەش کرد و ببوونە تاکە دەزگای بڵاوکردنەوەی زانست، هەر بەو شێوەیەش مانەوە تا دوا دواییەکانی سەردەمی عوسمانی کاتێک لە دەوروبەری ساڵی ١٨٧٠دا[٤٠] یەکەمین قوتابخانە لە شاری هەولێردا کرایەوە، لە هەولێر و هیچ گوندێکی هەولێریش نەبوو مزگەوت و قوتابخانەی خۆی تێدا نەبێ، هەرچەندە بینای قوتابخانەکان شتێکی ئەوتۆ نەبوون، بەڵام ئەو وانە و زانستەی تیایدا دەوترایەوە ئاستێکی بەرزی هەبووە، هەر لەو گوندانەوە زۆر زانای دیار و بەناوبانگ دەرکەوتوون خزمەتی زانست و ئاینی ئیسلامیان کردووە و زۆر خەڵکی ناوچە و شارەکانی دیکەشیان فێری زانست و خوێندەواری و رۆشنبیریش کردووە، جێی خۆیەتی باسی گوندی ماوەرانی حەیدەری بکەین، کە بە گوندی زانست بەناوبانگ بووە، قوتابخانەکانی ئەوکات درێژبووەوەی قوتابخانە ئاینی و ئەوانە بوون، کە سەر بە مزگەوتەکان بوون، لە پێناوی پاراستنی کەلەپووری ئیسلامی و زمانی عەرەبیدا ئەو قوتابخانانە رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە و پێداویستی کۆمەڵگاکەشیان دەستەبەر کردووە، هەر لەو قوتابخانەدا بووە زانستە ئیسلامییەکانی وەکو: (فقه) و (اصول) و (تەفسیر) و (ماتماتیک) خوێنراون.

٢- رۆڵی هەولێر لە رووبەڕوو بوونەوەی پەلاماری خاچپەرست و مەغۆلەکاندا: لە ساڵی ١٨٧ زایینیدا پەلامار و داگیرکاری خاچپەرستەکان زۆر توند و تیژ بووە، سەلاحەدینی ئەیوبی بۆ هەموو وڵاتەکانی نووسی و داوای لە خەڵک کرد هەموویان بێن بۆ جیهاد بۆ هەولێر و موسڵ و ئەلجەزیرە، لەو رۆژانەدا بوو شاری (کەرک)ی گەمارۆدابوو (شارێکی بەناوبانگە لە دەوروبەری وڵاتی شامدایە لە رووکاری حیجازەوە و شارێکە بێستانی زۆری هەیە - بلدان/ یاقوت) لەو رۆژانەدا بوو، کە هەر لەو ساڵە موزەفەرەدینی فەرمانڕەوای رەهای حۆران بەرەو شاری عەکا بەرێکەوت، لە دواییدا لەو شارەدا موسڵمانەکان بەسەر ئەفرەنجییەکاندا سەرکەوتن[٤١].

موزەفەرەدین یەکێک بوو لەو کەسانەی کە لە جەنگی (حەتین)دا خۆی سەلماندبوو، ساڵی ٥٨٣یش کاتێک ئەفرەنجەکان گەمارۆی شاری عەکایان دابوو ناوبراو بەرگرییەکی قارەمانانەی لەو شارە کرد.

ساڵی ٥٨٦ی کۆچیش سەربازەکانی شاری هەولێر بە سەرۆکایەتی میر زەینەدینی یوسف لە شەڕەکانی (ئەحراج و ئەبراج و ئەسگوڵ)دا بەشدارییان کرد شان بەشانی عیمادەدینی فەرمانڕەوای سنجار و دیار ئەلجەزیرە و عەلائەدینی ئیبن عیزەدینی مەسعود، لە هەموو ئەو شەڕانەشدا بەشدار بوون، کە لە نێوان موسڵمان و خاچ پەرستەکاندا لەسەر شار عەکا[٤٢] روویانداوە، لە ١٨ی رەمەزانی ٥٨٦ی کۆچی زەینەدین لە ناسیرە لە فەلەستین کۆچی دوایی کرد. ئەوکات ناسیرە گوندێکی بچووکی شاری عەکا بوو.

هەر لە سەردەمی موزەفەرەدین و دوای مردنیشی هەولێر رووبەڕووی شاڵاوی پەلاماری مەغۆلەکان بۆتەوە، ساڵی ٦٥٦ی کۆچی/ ١٢٥٨ی زایینیش ئەوکاتەی مەغۆلەکان بە سەرکردایەتی هۆلاکۆ بەرەو داگیرکردنی عیراق هاتن، هۆلاکۆ سوپایەکی زۆری بە سەرکردایەتی (ئارقیۆنویان) ناردە سەر هەولێر، بەڵام قەڵاکە خۆی نەدا بەدەستەوە، ئەو سەرکردە مەغۆلییە گەمارۆی شارەکەی دا و دانیشتووە کوردەکانی قەڵاکە پاڵەوانانە بەرپەرچی مەغۆلەکانیان دایەوە، خەڵکی قەڵاکە سەریان بۆ (تاجەدینی کوڕی صەلایا)ش کەچ نەکرد کە داوای لە خەڵکی قەڵاکە دەکرد مل بۆ داگیرکاران کەچ بکەن (ئەوکات تاجەدین والی شارەکە بوو، ناوبراو ناچار بوو بچێت بۆلای ئارقیۆ و ئەویش بۆلای هۆلاکۆی نارد، هۆلاکۆش دەسبەجێ لەناوی برد)[٤٣].

ماوەی شەش مانگ مەغۆلەکان قەڵاکەیان گەمارۆدا، دانیشتوانی قەڵاکە لەو ماوەیەدا بەرگرییەکی چاونەترسانەیان نیشاندا و زۆربەی جار فێڵیان لە مەغۆلەکان دەکرد و

زیانی گەورەیان لێدەدان، ئەوکاتەش مەغۆڵەکان لە بەرگری ئازایانەی کوردەکان وەڕس بوون، شار و قەلاکەیان دایە دەستی بەدرەدین لوئلوئە و ئەویش شوراکانی قەلاکەی رووخاند و دەستی بەسەردا گرت[45].

### سەرچاوە و پەراوێزەکان

١- طه باقر: جولات تاريخية بين مواطن الآثار في شمالي العراق، گۆڤاری (المجمع العلمي الكردي)، (٣ - ١)، ١٩٧٥، ل٦٣٥.
٢- طارق عبدالوهاب مظلوم: التقرير الأول لهيئة مسح قلعة أربيل، ل١.
٣- دورثي مكاي: مدن العراق القديمة، وەرگێڕانی يوسف مسكوني، بغداد، ١٩٥٢، ل١٤٩.
٤- ناجي الأصيل: گۆڤاری سومر، ١٩٤٩/٥، ل٣٢١.
٥- سون: رحلة متنكرة، ترجمة فؤاد جميل، بغداد، ١٩٧٠ ا، الجزء الأول، ل١٤٦.
٦- عبدالرزاق الحسني: العراق قديما - ١٩٥٦، ل٢٣٨ - ٢٣٩.
٧- دورثي مكاي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٩.
٨- سۆن: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٦ و ئیدوار كبير: كتبوا علي طين، ترجمة د. محمود الأمين، بغداد، ١٩٦٢، ل٥٠، پەراوێز.
٩- طه باقر: هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٠- سۆن: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٧.
١١- فؤاد سفر و محمد علي مصطفي، الحضر، بغداد، ١٩٧٤، ل٢٧.
١٢- طه باقر: المرشد إلى موطن الآثار، الرحلة الخامسة، بغداد، ١٩٦٦، ل١٤٨.
١٣- سون: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٨.
١٤- طه باقر: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤، ريض: رحلة إلى العراق، سالی ١٨٢٠، وەرگێڕانی بەهائەدین نوری، بغداد، ١٩٥١، ل٢٤٤: هەر دەربارەی میرنشینی حەدیاب سەیری ئەحمەد سوسە: ملامح من تأريخ القديم ليهود العراق بغداد، ١٩٧٨، ل٤٣ - ٤٩.
١٥- طه باقر: جولات تاريخية، ل٦٤٩.
١٦- فؤاد سفر: الحضر، ل٢٠٨ - ٢٠٩.
١٧- دائرة المعارف الاسلامية: ج١، مادة اربل، ل٥٧١.
١٨- محمود شيت خطاب: قادة فتح العراق والجزيرة، مصر، ١٩٦٤، ل٤٢٢.
١٩- إبن الأثير: (الكامل) حوادث سنة ١٣٢هـ و كارل پروكلمان: تأريخ الشعوب الاسلامية، ترجمة منير بعلبكي، ط٤، بيروت ١٩٦٥، ل١٦٩.
٢٠- دائرة المعارف الاسلامية، ج١، مادة اربل، ل٥٧٠ - ٥٧١.
٢١- سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧٤.
٢٢- ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، بيروت، م٥، ل٥٤٤ - ٥٥٤.
٢٣- ابن خلكان (وفيات الأعيان) مطبعة السعادة/ القاهرة، ١٩٤٨، (٣)، ل٢٧٠.
٢٤- دائرة المعارف الاسلامية، مادة اربل، ل٧١.
٢٥- سەرچاوەی پێشوو، سەبارەت بە شارو شوراکەی بازاڕەکانی، سەیری: ياقوت (البلدان) بكە، ج١.
٢٦- ابن الطقطقي: الفخري في الاداب السلطانية، ل٣٧ - ٣٨٣.
٢٧-
٢٨- سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠٦، ٤٧٢.
٢٩- عباس العزاوي: تاريخ النقود العراقية.
٣٠- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: التاريخ، بەدواداچوونی طارق نافع الحمداني، بغداد، ١٩٧٥.
٣١- لونگريك: أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث، ترجمة جعفر خياط، ج١، بغداد، ١٩٦٤ و عبدالعزيز سليمان: تاريخ العراق الحديث، القاهرة، ١٩٦٨.
٣٢- ابن خلكان: الوفيات (٦٨/٤ - ٧٠).
٣٣- ابن المستوفي: تاريخ اربل، تحقيق سامي الصفار، بغداد، ١٩٨٠، ل٣٧٠ - ٣٧١.
٣٤- ابن خلكان: الوفيات (٢٣٧/٢ - ٢٣٩).
٣٥- ابن خلكان: الوفيات، طبعة دار الثقافة، ج٧، ل١٣ - ١٥، من مقدمة المحقق.
٣٦- ابن خلكان: الوفيات الطبعة المصرية (١١٤/٤ - ١١٥).
٣٧- عباس العزاوي: آل بكتكين، مجلة المجمع العلمي العربي دمشق، م٢١، ج٩ - ١٠، ١٩٤٦، ل٤٠٤ - ٤٠٥.
٣٨- ابن المستوفي: تاريخ اربل، ١٣٢/٢.
٣٩- شرخان، كانت قرية من أعمال أربيل.
٤٠- زبير بلال اسماعيل: علماء ومدارس في أربيل، الموصل، ١٩٨٤، ل١٩.
٤١- ابن الأثير: (الكامل) حوادث سنة ٥٨٣هـ.
٤٢- سەرچاوەی پێشوو، حوادث سنة ٥٨٦هـ.
٤٣- عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين (٢١٣/١ - ٢١٤).
٤٤- رشيد الدين: جامع التواريخ، م٢، ج١، ل٢٩٨.
٤٥- عباس العزاوي: سەرچاوەی پێشوو، تاريخ ابن خلدون (٧٩١/٥).

# کۆنترین ئایین
# لە کۆنترین شار (هەولێر)

**دکتۆر مەولود ئیبراهیم حەسەن**
**کۆلیژی زمان- زانکۆی سەلاحەددین**

دەرکەوت کۆنترین ئایین لە هەموو جیهاندا کە لە بەڵگە مێژوویی شوێنەوار ناسییەکانەوە بەدەست بکەوێ و زاناکان بیسەلمێنن، ئەوا ئەو ئایینە لە شاری (هەولێر- ئەربیل) و لە (٦٥ تا ٧٠ هەزار ساڵ پ.ز) لە (ئەشکەوتی شانەدەر) لەم (کوردستان)ە، بووە.

**- مێژووی ئایینی کورد:**

کورد وەکو میللەتێک، وەک هەر شتێکی تری خۆی مێژووی ئایینی خۆیشی هەیە، بەڵام ئەم ئایینە کامەیە و لە چ سەردەمێکدایە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە چاک وایە سەرەتا بپرسین! لە کەیەوە مرۆڤ لە کوردستاندا دەژی؟ زاناکان زنجیرە چیاکانی زاگرۆس بە نێوەندێکی گرنگی پێگەیشتنی میللەتی کورد دەزانن!

ئەوەی زانراوە بە شێوەی لێکۆڵینەوەی زانستی بەر لە (٦٠٠,٠٠٠ ساڵ) پێش زایین جۆرێک لە مرۆڤ لە زنجیرە چیاکانی کوردستان ژیاوە و لەوەش بەدواوە بەردەوام مرۆڤ بە شێوەی جیا جیا قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ هەر هەبووە و هیچ قۆناغێک نییە مێژوو باسی بکات لەوە بەدواوە. واتە پاش شەش سەد هەزار ساڵ پێش زایین کوردستان یان زنجیرە چیاکانی (زاگرۆس) بێ مرۆڤ بووبێت، بەرهەمی ئەو بەردەوامییەش دواجار پێگەیشتن و دەرکەوتنی میللەتی کوردە، لەنێو ئەم ماوە دوور و درێژەدا زۆر شوێن هەن لە کوردستان لەنێو زنجیرە چیاکانی زاگرۆس خاڵی گەشی ئاوەدانی بوون، لەوانە ئەشکەوتی ناوداری (شانەدەر) کە لێکۆڵینەوەکان دەڵێن: بەر لە ١٢٠٠٠٠ ساڵ پێش زایین مرۆڤ لەو ئەشکەوتە ژیاوە و تیایدا حەوت ئێسکبەندی مرۆڤ دۆزراوەتەوە، کە تەمەنی ئەم ئێسکبەندانە بۆ ٦٠ تا ٦٥ هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە، لە وردەی لێکۆڵینەوە لەم دەستە ئێسکبەندە زۆر شتی گرنگ دەرکەوتووە، هەر بۆیە ئەلکساندەر ئەلفربدۆ ڤیچ دەڵێ: (ئەشکەوتە بەناوبانگەکەی ""شانەدەر"" لە شاخەکانی کوردستان وەک ئەرشیفێکی نایابی پاراستنی شوێنەواری شارستانی مێژووی مرۆڤایەتییە بە درێژایی ١٠٠,٠٠٠ هەزار ساڵ). "شانەدەر" کە نەک هەر بۆ کوردستان بۆ مرۆڤایەتیش زۆر گرنگە و تەمەنەکەشی بۆ پاراستنی ئەرشیفی نایابی شارستانی مرۆڤایەتی لە (٦٥ هەزار ساڵ) تەمەنی ئێسکبەندەکانیش کۆنترە، ئەو ئەرشیفە کۆن و گرنگەی مرۆڤایەتی و کوردستان، جگە لە بەڵگە گرنگەکانی تر بەڵگەی بوونی (ئایین)شی بە شێوە سەرەتاییەکەی تێیدا دەستکەوتووە، ئەمەش کۆنترین مێژووە لە جیهان (ئەوەندەی من بزانم) کە لەو مێژووە بەڵگە و ڕەگەزی بوونی ئایین هەبێ و زاناکان بە لێکۆڵینەوە بیسەلمێنن: ئەو سەلماندنەش لە لێکۆڵینەوەی ورد و

باریکی هەمــوو لایەنەکــانی ئەم ئێسکبەندانە لەلایەن پسپۆڕانەوە ساغ بووەتەوە، عەبدولڕەقیب یوسف دەڵێ: (بیــری ئایینی لەشــوورەی کــەوانەیی و لەگــۆڕی مــردووانی ئەشکەوتی "شــانەدەر"، ئەوانەی کــە گــوڵ لەســەر جەســتەیان دانرابوو، هەروەها لە چەرمــــوو پەیکەری (خوداوەندی دایک) کە لە قوڕ بوو، بەم شــێوەیە یەکــەم پەرســتــراو لە کوردستان لە چەرمووو بوو). هەر ئەو ئێسکانەی ئەشکەوتی "شــانەدەر" (ئەوانەی گــوڵ لەســەر جەســتەیان دانرابوو) زانــاکـــــان بەوردی خــوێندوویانەتەوە و لە ئەنجــامــدا گــەیشــتـــوونەتە ئەو باوەڕەی کــە ئەشکەوت نشــینەکــانی (شــانەدەر) پێش ٦٥ هەزار ساڵ جۆرە باوەڕێکی ئایینی سەرەتاییــان هەبووە، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانە:

یەکــەم: مــردووەکــان بەکــۆمــەڵ نێــژراون و ئەوەشــیــان بەو مــانایە لێکداوەتەوە، ئەوان بڕوایان بەزیندوو بوونەوە هەبووە، بۆیە پێکەوەیان ناشتوون تا پێکەوەش زیندوو ببنەوە.

دووەم: جــۆری ناشــتنەکــەی هەر یەکــێک لە مــردووەکــان، بەشــێــوەی منداڵ لەنێــو زگی دایکی، ئەمــەش واتا مــردووەکە کــە دەمــرێ دەچێــتــەوە نێو زگی خاک، زگی دایکی.

ئەم دوو خــاڵەش هەردووکــیــان بەبیری ئایینی دەچن، چونکە یەک لە نیــشــانەکــانی (بیــرۆکــەی) ئایینی هەڵسوکەوتە لەگەڵ مردوو، هەربۆیە هیچ ئایینێک نیــیــە ڕێوڕەســمی تایبــەتی خــۆی نەبێ بۆ شــاردنەوەی مردووەکانی، ئەم جۆرە ناشتنەش، کە "شانەدەر"ییەکان مردووی خۆیان پێ شــاردووەتەوە، کــۆنترین و ڕێکتــرین ناشتنی مردووە لە مێژوودا، کە مرۆڤ مــردووی خــۆی ناشــتــبێ، هەروەها کۆنترین ناشتنە کە لەسەر ڕێوڕەسمی جـــــۆرە (ئــایــین)ێک مـــــردوو شاردرابێتەوە، با ئەو ئایینەش هێشتا تەواو پتــەوو ســیــســتــەماوی نەبووبێ (چونکە ئایینەکــانی پێش مــێــژوو کێشــەی پێنەگەیشتن و دەرنەکەوتنی ڕەنگ و ڕووی تایبـــــەت و قـــــایم نەبوونی تان و پۆیان هەبوو).

جا ئەم جۆرە بیرۆکە ئایینییە لەکن "شانەدەر" نشینەکان (بەپێی لۆجیکی ژیان) دەبێ پێــشکەوتن و گــۆڕانی بەســـــــەردا هاتــبێ، ئــەوەش ئــەوە دەسەلمێنێ کە بەر لە ٦٥ هەزار ساڵ پێش ئێــســتــا بیــیــرۆکــەی ئایین لە (شــانەدەر هەولێــر – کــوردســتـــان) ســەری هەڵداوە، پاش ئەو مــێــژووە، ئەو پەیکەرەیە کە پەیکەری دایکە بۆ (٣٠ هەزار ســـاڵ) پێش ئێـــســـتـــا دەگــەڕێتــەوە: (پەیکەرێکی بچووکی بەشــێــوەی ڕوو و لا کــەڵەکــە، بۆ خــــوداوەندی دایک، لەســــەردەمی ئۆرگنیــــشــیــــــەوە، پێش نزیکەی (٣٠٠٠٠ ســاڵ) بەوردی ســەیری سەر سنگ و زگی و نێکی بکە، کە ئــەوە دەردەخــــات گـــــرنگی بــە ئەندامەکانی منداڵبوون دراوە).

کە ئەم پەیکەرە بچووکەی (دایکە خـــــــوداوەند) دەبــێ بــۆ پــەرســتن دروســتکرابێ و ســەردەمــەکــەشی ٣٠ هەزار ساڵ پێش ئێستایە، هەروەها لە دەوروبەری گــوندی (نەمــرکێ)ی نزیــک شــــاری (دهۆک) لێکۆڵەر (ستیڤان کۆزفسکلا) و دەستەکەی لە ساڵی ١٩٨٥، لە ئەنجامی پشکنین زۆر شتیان بۆ ڕوون دەبێتەوە، یەکێ لەوانە لەو گــونـدە، واتە گــونـدی نەمــرکێ (چەند پەیکەرێکی جــۆراو جـــۆر دۆزراوەتەوە، ئــەگـــــەر دروستکردنی پەیکەرەکان نیشانەی پێگەیشتنی هونەر بێ، ئەوا مانای پەیکەرەکــان، مــانایەکی ئایینی و ئەفسانەییە) ئەو گوندەش تەمەنی بۆ (١٠ هەزار ســاڵ) پێش ئێــســتــا دەگەڕێتەوە، ئەمانەش ئەوە دەردەخەن کە لە کــوردســتــان بیــری ئایینی هەر زوو واتە (٣٠ هەزار ســـاڵ) پێش ئێستا (خوداوەند)ی خۆی لە شێوەی (مرۆڤ) وێناکردووە، ئەم مرۆڤەش مــرۆڤی (دایک)ە، کــە (ژن) بووە. دواتر سۆمەرییەکــان پەرە بە بیری خــوداوەند لەشــێــوەی مــرۆڤ دەدەن (وێنەی بەرچاوی خـــــوداوەندی ســۆمــەرییــەکــان، لە ســروشــتــەوە ســەرچاوە دەگرێ، سۆمــەرییــەکــان سروشتیان بەشێوەی مرۆڤ خستە بەرچاو لە باشــووری عــیــراق، ئەو مـــــیــــراتی خــــوداوەندی دایک پەرســتنەشــیــان، کــە خــوداوەندی سروشتە لە باکووری (کوردستان)ی عــــێــــراق وەرگــــرتووە)، چونکە دەرکــەوتووە، ســۆمــەرییــەکــان کــە چوونەتە خوارەوە، وەک هەر شتێکی تر لە شارستانیەتەکەیان، ئاینیشیان لەگــــەڵ خــــۆیان بردووە، ئاینیش پێــشــینەیەکی دوور و درێژی هەبووە، هەروەها وەکــو زانراوە، ئەوا ئایینی خۆیان لە سروشتەوە وەرگرتووە، هەر بۆیە دەبینین (دایکە خــوداوەند لای سۆمەرییەکان کە ماناکەی پڕ بە وشە دەکــات "شــاژنی چیــا".. گــومــانی

تێدانییە ئەو ناوەی خوداوەندی دایک لەپێش چوونە خوارەوەیان، بەم ناوە ناساندووە، لە وشەی (چیا)ش راستەوخۆ مەبەستیان چیاکانی کوردستان بووە.

ئەوەش یەکێکە لە (ئایینی سۆمەرییەکان) ئەو ئایینەی کە خەزعەلی ئەلماجدی دەنووسێ: (ئایینی سۆمەرییەکان، ئەو (تۆ)یە بوو کە درەختی ئایینەکانی هەموو جیهانی لێ دەرکەوت) (١٩٠، ٩). ئەگەر ئایینی سۆمەرییەکان لەسەر قسەی خەزعەلی ئەلماجدی تۆی درەختی هەموو ئایینەکانی جیهانی بێ، ئەوا ئەو (تۆ)یە لە ("شانەدەر")ەوە هاتووە، هەر خۆشی پێشتر نووسی (خوداوەندی سۆمەری لە خوارووی عێراق، پاشماوەی خوداوەندی باکووری (عێراق-کوردستان)د-م. ئەم خوداوەندی دایکە بە بەلگەی زۆرەوە لە کوردستانەوە چووەتە خوارەوە (پەیکەری ئەو دایکە خوداوەندی کە ساواکەی شیردەدات و لەسەر هەردوو شانی شتێکی وەکو گوڵە تۆ دیارە، لە خوارووی عێراق دۆزرایەوە و بۆ نزیکەی (٦٠٠٠ هەزار ساڵ) دەگەڕێتەوە). کە دوور نییە ئەو خوداوەندە وەک پەیکەر لە کوردستان سۆمەرییەکان لەگەڵ خۆیان بردبیانەتە خوارەوە، چونکە وەکو پێشتر بینیمان، سۆمەرییەکان لە کوردستان ئایینیان هەبووە، هەڵبەت کە چوونەتە خوارەوە، ئەو ئایین و خوداوەندەیان لەگەڵ خۆیان بردووە، وەک کە زۆر شتی تریشیان لەگەڵ خۆیان برد، بەتایبەت ئەم خوداوەندە لەوە دەچێ خوداوەندێک بێ پەیوەندی بە سروشتی چاندنەوە هەبێ، ئەی ئەمانخوێندنەوە کە سەرشانی خوداوەندەکە گوڵە تۆی لەسەر بوو، ئەوەش دەرکەوت کە کشتوکاڵی دێمی کوردستان، سۆمەرییەکان لە خواروو کردوویانەتە کشتوکاڵی ئاودێری، چۆن لە هەموو رووەکانەوە سۆمەرییەکان لەخوارووی عێراق گۆڕانێکی زۆریان بەسەرداهات و پێشکەوتن، هەر ئاواش (باوەڕی ئایینی سۆمەرییەکان پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی، هەر لە هەزارەی چوارەمی پێش زایینەوە، تا ئەوەی لەکۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زایین گەیشتە شێوەی پتەوی خۆی).هەر لەو سەردەمەدا (واتە هەزارەی چوارەمی پێش زایین) }شێوەی پەیکەری خوداوەندی دایکی تەپەگەورە دەبینین کە هی سەردەمی عەبیدە). ئەو گۆڕان و پێشکەوتنەی ئایین لە کوردستان و سۆمەر، کە هەردووکیان تەواوکەری یەکترن و بەتایبەت سۆمەرییەکان، جگە لەوەی لە کوردستانەوە چوونەتە خوارەوە، لە رەگەزیش لەهەموو نەتەوەیەک زیاتر لە کورد نزیکن، یەکێ لە لێکۆڵەرەوەکان دەنووسێ: (نابێ بڵێین کورد، سۆمەرین، بەڵکە دەبێ بڵێین سۆمەرییەکان کوردن)[٢] ئەو سۆمەرییانەی کە شارستانەتێکیان دامەزراندووە کە لە هەموو پێکهاتەی ئەو شارستانییەتەدا داهێنەر بوون (لەگەڵ دەرکەوتنی شارستانییەتی سۆمەرییەکان و داهێنانی نووسین و لەسۆمەر نزیکەی لە (٣٢٠٠ پ.ز) سیستەمی ئایینی و زانستی و کۆمەڵایەتی و سیاسی نوێ پێکهات).

زاناکان زۆریان لەسەر ئەوە نووسیوە کە (ئایین و ئەفسانە) پێکەوە سەریان هەڵداوە، یان ئەوەتە ئایین و ئەفسانە لە سەرەتادا هەردووکیان یەک شت بوون. (ئەوەی کە لە سەرەتای زووی ئایینەوە پێی دەگەین، یان کۆنترین شێوە لە شێوەکانی ئایین، ئەوە ئەفسانەیە) (٢٢١، ٢٦٩). ئەو ئایین و ئەفسانەیەش لەکن سۆمەرییەکان کۆن و هێندە بەرچاو و دەوڵەمەند و تێکەڵە/ کە لە جیهاندا بێ هاوتایە، هەر بۆیە کە لێکۆڵینەوە لەسەر ئایینی کۆنی سۆمەرییەکان دەکرێ، لە هەمان کاتدا ئەو لێکۆڵینەوەدیە، لێکۆڵینەوەدیە لەسەر ئەفسانەی سۆمەرییەکان.

### ٣-١ ئایینی کوردان[٣]

کەواتە دواجار دەرکەوت کە کۆنترین ئایین لە "شانەدەر"ی کوردستان هەبووە و ئەو ئایینە بەردەوام بووە و بە کوردستاندا بڵاوبووەتەوە و گەیشتووەتە سۆمەرییەکان و ئەوانیش لەگەڵ خۆیان بردوویانەتە خوارەوە و پەرەیان پێداوە و بەدەوروبەردا بڵاویان کردووتەوە تا گەیشتووتە ئەوەی لە لوڕستان (گلگامشیی) پاشاو پاڵەوانی سۆمەری وەک خوداوەندێک بپەرستێ (گلگامش یەکێکە لەو خوداوەندانەی کە لە لوڕستان و لەکن خەڵکەکەی پێشانی لای کاسییەکان، گەیشتووەتە پلەی خوداوەندی). ئەگەر سۆمەرییەکان ئایینیان بە

دەوروبەری خۆیاندا بلاو کردووەتەوە، ئەوا نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ، کە لە کوردستان هاتوونەتە خوارەوە، کوردستان پاش کۆچی ئەوان بێ دانیشتوان و بێ ئایین نەبووە، هەروەها پەیوەندیشیان لەگەڵ خەڵکی کوردستان نەبراوە، چ بە شەڕ و چ بە ئاشتی، ئەوەش دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە کوردستان، ئەگەر جێگای سەرهەڵدانی کۆنترین ئایینە، پاش ئەو سەرهەڵدانەش هیچ رۆژگارێک بێ ئایین نەبووە، هەردەم زیاتر لە ئایینێکی تێدا بلاوبووە، کەواتە (ئایینی کوردستان) و (ئایینی کوردان) ئەگەر بگوترێ و بنووسرێ، شتێک نییە بێ بنەما، هەر ئەوەشە وای کردووە لە مێژوودا (ئایینی کورد- دین کورد)باس بکرێ، محەمەد عەلی سەجادی دەنووسێ (لەناو خوداوەند و کەسایەتییە ئیلامییەکان، ئەوەی کە زانراوە (ناوی نازی- NAZI، ناوی کوردی KURDI، ئەوەی ناوی (کورد)مان بیردەخاتەوە).

ئەوەی ئێرە نەک هەر باسی (ئایینی کورد)مان بۆ دەکات، بەڵکە ناوی خوداوەندێکمان بۆ دێنێ، کە پێی گوتراوە (کورد) خوداوەندی کورد. هەروەها باوەسەرهەنگی داودانی لە (٣٢٤ک= ٩٣٥ز) لە شیعرێکدا ئاوا باسی ئایینی کوردان دەکات:

**{سەرهەنگ دەودان سەرهەنگ دەودان ئەز کەنامن سەرهەنگ دەودان چەنی ئیرمانان مەگێلم نەهەردان مەکۆشم پەری ئایینی کوردان}.**

ئەو ئایینە کۆن و لەمێژینەی کورد لە سەردەمی زەردەشتییەتدا چاکتر روون دەبێتەوە و پتر باس دەکرێ.

لەمێژووی تەمەنی ئایین لەکوردستان بۆمان دەرکەوت کە پەیکەری (خوداوەندی دایک) بۆ زیاتر لە (٣٠ هەزار ساڵ) لەوەو پێش دەگەڕێتەوە، هەر ئەو پەیکەرەشە لە بەردەوامی پەرستندا دواجار دەبێ بە (بت) و ئەوەی بۆ خوداوەندی دایک دەکرا، لە پەیکەر و رێورەسمی پەرستن بۆ خوداوەندەکانی تریش دەکراو (مرۆڤیش بەردەوام بڕوای بەخودا هەبووە). بەڵام خودا لە ئایینێکەوە بۆ ئایینێکی تر جیابووە، لەگەڵ ئەو جیاییەشدا (ئایینەکان هەموویان یەکن) ئایینەکان هەموویان یەکن بەو مانایەی هەموویان باوەڕی ئایینییان هەیە و رێورەسمی پەرستنیان هەیە و شوێنی پەرستنی خۆیان هەیە و کات و رۆژ و ساڵ و مانگی پیرۆزی تایبەت بەخۆیان هەیە و کەسایەتی پێغەمبەر و پیاو چاکی خۆیان هەیە و دەقی لەبەرکراو، یان نووسراوی خۆیان هەیە و دواجار خودا و خوداوەندی تایبەت بەخۆیان هەیە، ئەگەرچی هەندێ ئایین بێ پەیامبەر و خودان، ئەو ئایینانە لەکوردستان بلاونەبوونەتەوە، جا ئەو خوداوەندە لەسەر زەویدا مرۆڤ بەرجەستەی کردبێ، لە (بت- پەیکەر)ێک یا ئەوەتە لە کەسایەتییەک، یان لە ئاسمان بەدوایدا گەڕابێ و لە ئەستێرە و مانگ و رۆژدا وێنای کردبێ، یان پێی وابووبێ لە سەرەوەی ئەم بەرچاوانەیە و بەچاوی سەر نابینرێ، یان دواجار هاتبێتە سەر ئەو باوەڕەی (خودا) ئەوەتا لەنێو دڵی مرۆڤدا، جا بەگوێرەی ئەقڵ و ئایینی مرۆڤ، خودا لەهەر جێگایەک لەو جێگایانە بووبێ، هەر خۆشی ویستووە و پەرستوویەتی و لێی ترساوە و داوای یارمەتی لێ کردووە، ئەمانەش هەمووی هۆیەکی سەرەکین بۆ ئایین گۆڕین و زۆر ئایینی، کە ئەم رەوشتە ئێستاش مرۆڤایەتی لێ رزگار نەبووە.

ئایین لە کوردستاندا خاوەنی تەمەنێکی درێژ و هەمەجۆری ئایینییە، ئەستەمە بتوانرێ، ئەم هەموو ئایینە لە لێکۆڵینەوەیەکی ئاوا بەسەر بکرێتەوە، بۆیە لێرە بەسەر زۆربەی زەمەن و ئایینەکاندا بازدەدەین و خۆمان دەگەیەنینە سەردەمی ئایینی میترایی (میهر پەرستی) و لەوێوە هەڵوەستەیەکی کورت دەکەین و بەپەلە خۆ دەگەیەنینە سەردەمی ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا. (لە یەکێک لەو ئایینانە ئایینی (میهر میترا)یە، کە بەکۆنترین ئایینی گشتگیری جیهان دەژمێردرێت، سەرچاوەی ئەم ئایینە ئەو میللەتانە بوونە کە لەسەرخاکی کوردستانی ئێمڕۆدا دەژیان و خەڵکی ئەم وڵاتە بەگشتی، بەر لەهاتنی ئایینی زەردەشت زۆربەیان لەسەر باوەڕی ئایینی میترایی بوون).

دیارە لە ئایینی میهرپەرستی [٤] میترادا، رۆژ، رووناکی، ئاگر پیرۆز بووە و گەیشتووەتە رادەی پەرستن، (بە پیرۆز زانینی خۆر لای میترائیەکان ئەوەندە گەورەیە رۆژانە دووجار کڕنۆشی بۆ دەبەن و سوپاسگوزاری خۆیان بۆ میترا دەردەبڕن).

دیارە ئەو ڕۆژ بە پیرۆز زانین و بەخوداوەند زانینە ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خوداوەندی هەتاو (ئۆتۆ)ی سۆمەری، کە یەکێک بووە لە خوداوەندە زۆرەکانی سروشت، بەڵام لای میترایییەکان بووە بە یەکانە هێز و خوداوەند، هەر ئەو پیرۆزییەشە دەچێتە ناو ئایینی (زەردەشت) و ئەویش شوێنێکی بەرز و پیرۆز بۆ ڕۆژ و ڕووناکی و ئاگر دادەنێ، بەڵام ناگاتە ئاستی خوداوەند و پەرستن دواجار ئەو فکرەیە، فکرەی پیرۆز ڕاگرتنی ڕۆژ و ڕووناکی و ئاگر دەچێتە ناو زۆربەی ئایینەکانی دواتر و بەشێوەی جیا جیا خۆی نمایش دەکات. (داگیرسانی (مۆم، چرا) لەسەر ڕێگاکان و شوێنە پیرۆزەکان و گۆڕستانەکان بەتایبەت لەناو مەزارگەی پیاوە پیرۆزەکاندا (داگیرساندنی مۆم لەناو کڵێساکانی مەسیحییەکاندا) سەرچاوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ میترا ئیزم). هەروەها داگیرساندنی مۆم و فتیل و چرا لە (لالش) لای ئێزیدییەکان، ئەویش هەر پەیوەستە بەو ریشەوە، هەرچەندە ڕای وا هەیە، کە ئیزەدی ریشەی کۆنە و بۆ سەردەمی سۆمەرییەکان دەگەڕێتەوە، بەڵام هەر چۆنێ بێ (ڕووناکی)یەو پەیوەستن بە یەکەوە، لەبارەی کۆنی ئایینەکانەوە بۆ زەردەشتیش ڕای وا هەیە، کە زۆر کۆنە و ئەو مێژووە ناسراوەی سەدەی حەوتەم و شەشەمی پێش زایین مێژوویەکی یەکانە نییە (گەلێ سەرچاوەش هەن کە (ژیانی زەردەشت) دەبەنەوە بۆ ٦٠٠٠ و ٥٠٠٠ و ٤٠٠٠ ساڵ پێش زایین).

هەروەها هەن کە باوەڕیان وایە مێژوو زیاتر لە زەردەشتێکی بەخۆیەوە دیوە، ئەگەر زۆری ئەو (زەردەشت)ە، شتێکی گوماناوی بێت، ئەوا زۆری ئایین لە کوردستان شتێکی بەرچاوە (دینی خەڵکی کورد، خەڵکی کورد و خەڵکێکی دین باوەڕن، لەپێش ئیسلام، ئەو خەڵکە میهر پەرست بوون و پاشان بوونە زەردەشتی و لە سەردەمی ساسانییەکان سەرەڕای ئایینی زەردەشتی، ئایینی مەسیحی و مانەوی و مەزدەکیش لەنێو کوردان هەبوو، هەریەک لەوانە خەڵکی خۆی هەبووە).

ئەگەر پێش ئیسلام کوردستان ئەو هەموو ئایینەی هەبووە، ئەوا بە ئیسلامبوونی زۆربەی کورد، نەیتوانی ئایین و ئاینزاکانی تری کوردستان بسڕێتەوە، دیسان چیرۆکی ئیسلامبوونی کورد، چیرۆکێکی زانراوە و سەرچاوەی زۆر و گرنگی هەیە.

### کۆنترین ئایین... کۆنترین شار

لەم پێشەکییە کورتەی کە باس لەمێژووی ئایینی کورد کرا، بینیمان کۆنترین ئایین (یان ڕاستتر فیکرەی ئایین) زاناکان لە ئەنجامی خوێندنەوەی وردی ئێسکبەندەکانی ئەشکەوتی ناوداری کوردستان و سەر بەپارێزگای هەولێر ئەشکەوتی ""شانەدەر""د، کە دەکەوێتە ناوچەی برادۆست، لە خوێندنەوەی ئەو ئێسکبەندانەوە بوو کە لە ئەشکەوتی ("شانەدەر") دۆزراوەتەوە. وەکو بینیمان، زاناکان بەڵگەیان لە بەدەستهێنانی فیکرەی ئایین لەم ئێسکبەندانە دوو خاڵە:

خاڵی یەکەم: ناشتنی بەکۆمەڵە.

خاڵی دووەم: جۆری ناشتنەکەیە بەشێوەی گرمۆڵە بوونی منداڵ لەنێو سکی دایکیدا.

ئەم دوو خاڵەش زۆر لێکدانەوە هەڵدەگرن: لەوەی کە لەخاڵی یەکەمدا لە بەکۆمەڵ ناشتنەکە بەدەست دێت، ئەوەیە کە وا دیارە وەک زاناکان دەڵێن: ئەو "شانەدەر"ییانە بڕوایان بەزیندوو بوونەوە هەبووە، بۆیە بەکۆمەڵیان ناشتوون تا دواجار پێکەوەش زیندوو ببنەوە. خاڵی دووەم: شێوەی ناشتنەکەیە کە بەشێوەی منداڵی نێوسکی دایکی شاردراونەتەوە، لەمەش مەبەستیان ئەوەیە بڵێن: مرۆڤ کە دەمرێ دەگەڕێتەوە نێو سکی دایکی- نێو خاک- هەموو لایەکیش ئەوە دەزانن، کە زۆر لە زانایان (دایکە خوداوەند) بە یەکەمین خوداوەندی پەرستراوی مرۆڤ دەزانن، چ لەوەی کە مرۆڤ (پەرستراو) خوداوەندێکی پەرستووە، چ لەوەی دایکی پەرستووە. ئەمەش ئەگەر کۆنترین و سەرەتاییترین فیکرەی (ئایین) بێت، ئەوا ئەو فیکرەیە لای "شانەدەر"ییەکان بووە، کە "شانەدەر"ییەکانیش سەر بە شاری (هەولێر- ئەربیل)ن، دیارە ئەگەر ناشتنی ئێسکبەندەکان بۆ (٦٥) هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە،

ئەوا سەرەتای سەرهەڵدانی فیکرە ئاینییەکە زۆر بۆ پێش ئەو مێژووە، واتە پێش (٦٥) هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە، چونکە دەبێ ئەوە قبووڵ بکەین کە سەرهەڵدانی فیکرەی ئایین لە سەرەتا بەپێی حاڵ و باری مرۆڤ لەو رۆژگارەدا، سەرەتا زۆر سادە بووە و زۆر بەسادەیی و لەسەر خۆیش گۆڕاوە و پێشکەوتووە، چونکە ناشتنی مردووەکان، بەشێکی کەمی تەواوی فیکرە ئاینییەکە نیشاندەدات، بەڵام، بەشێکی پێگەیشتووە، بەشێوەیەک ئەمڕۆکەش، پاش ئەم هەموو گۆڕانەی کە بەسەر مرۆڤ و ئایینەکانی داهاتووە بڕوابوون بە زیندوو بوونەوە و مردوو ناشتن، لەزۆر لە ئایینەکان، بەتایبەت (ئایینە ئاسمانییەکان)، هەر هەمان بڕوا و ناشتنە. کە "شانەدەر"ییەکان مردوویان دەناشت، ئەگەر گوڵی سەر جەستەی "شانەدەر"ییەکانیش لەگەڵ کفنی ئێستای مردووی ئایینی ئیسلام بەراورد بکەین، ئەوا تای تەرازوو بەلای گوڵە رەنگاو رەنگ و بۆن خۆشە کێوییەکانی چیاکانی زاگرۆس و کوردستان و "شانەدەر"ە.

ئەو کەمە سەرەتایەی کە لەناشتنی "شانەدەر"ییەکان وەکو فیکرەی ئایین دێتە دەست، زۆر گرنگە، ئایینێک بەم شێوەیە مردووی خۆی بنێژێ، کە پاش هەفتا هەزار ساڵ، تازەترین ئایین و تەواوترین ئایین، هەر بەم شێوەیە مردوو بنێژن، ئەوا ئەم ئایینە نابێ بێ (خاوەن- خوداوەند) بووبێ، واتە ئەو فیکرە ئایینییە خاوەنێکی هەبووە، بەدووری نازانم، کە ئەو خاوەنە (دایک) یان (زەوی) بووبێ، دیارە دایک و زەویش هێزیان لە (ئەفراندن) و (ژیاندن) واتە رۆزیدانی مرۆڤدایە، کە ئەمە ئێستاش هەمان توانای خودایە کە (مرۆڤ)ی دروست کردووە و هەتا لە ژیانیشدا بێ (رزقی) دەدات. لای کەم بە دیدە ئیسلامییە گشتییەکە.

ئەگەرچی ئێمە لێرە بەدوای مێژووی کۆنی فیکرەی (ئایین)دا دەگەڕێین لە (هەولێر) و کوردستاندا، ئەوا گرنگی ئەو ئایینە سەرەتاییەشمان بۆ روون دەبێتەوە، کە چەند لەگەڵ فیکرەی ئایینەکانی دەسەڵاتدار و بەربڵاوی ئەم سەردەمە وەک یەکن، ئەمەش چەند لەگەڵ رای لێکۆڵەر (فراس سواح) یەک دێتەوە کە دەڵێ: (گەیشتمە ئەو ئاکامەی ئایینەکان هەموو یەکسانن و یەک پلەی رەوایەتییان هەیە، ئایینی راستەقینە و ئایینی درۆینە نییە. هەروەها ئایینی سەرەتایی و ئایینی پێشکەوتووش بوونیان نییە) ئەوەتا هەمان رێورەسمی ناشتنی مردوو، لە کۆنترین ئایین کە بۆ (٧٠) هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە، هەر ئەو رێورەسمی مردوو ناشتنەیە ئێستا تازەترین و پێشکەوتووترین ئایین دەیکات، بەڵام بەشێوە ناشتنی تاک تاک و راست.

ئەگەرچی ئێرە جێگای ئەوە نییە کە ورد و باریکی ناوەرۆک و فەلسەفەی ئایینەکان بەراورد بکەین، بەڵام بەڵگەی ئەوەمان دەست دەکەوێ کە کۆنترین فیکرەی ئایین لە هەموو جیهاندا، ئەوەتا لە ئەشکەوتی ""شانەدەر"" و شاری "هەولێر" و وڵاتی "کوردستان" سەری هەڵداوە.

ئەوەش دەمانخاتە بەردەم ئەو مێژووە دوور و درێژ و هەمە جۆرەی ئایین لەشاری هەولێر و وڵاتی کوردستان، ئەم ئەرکەش ئێستا ئێرە جێگای نییە، بەڵام زەنگی ئەوەمان بۆ لێدەدات کە ئەو سەرەتایە مانای ئەوەیە کە ئایین بەردەوام و بەشێوەی جۆراو جۆر و بەگەرمی ودەوڵەمەندی لەم ناوچەیە (هەولێر) و (دەوروبەری) وەک هەموو (کوردستان) و هەموو (جیهان) لە کۆمەڵگا دانەبڕاوە و بەشێک بووە لە پێکهاتەی فیکری و رووحی هەر کۆمەڵگایەک.

هەولێر بەو مێژوودەی کە لە "شانەدەر"ەوە هەیەتی بۆ ئایین، ئەو هەرخۆشی وەک شار مێژووەکەی بە ئایینەوە دەست پێدەکات، چونکە زۆربەی شارەزایانی مێژوو دروستکردنی شاری هەولێر، دروستکردنەکەی هەر لە سەرەتاوە بۆ دروستکردنێکی ئایینی دەگێڕنەوە، واتە لە سەرەتاوە وەک نێوەندێکی ئایینی دروست کراوە، ئەوەش بۆ زیاتر لە شەش هەزار ساڵ هەندێک بۆ هەشت هەزار ساڵ پێش زایینی دەگەڕێننەوە، کە بەزۆرترین بەڵگەش، شاری هەولێر شارێکی دروستکراوی سۆمەرییەکانە پێش ئەوەی بچنە خوارەوەی عێراق، هەتا ناوەکەشی هەر لە سەرەتاوە وەک ناوێکی ئایینی مانا لێکدەدرێتەوە، ئوربل-

ئور= شار، پەرستگا. بل= خوداوەندی زەمین. واتە شاری خوداوەندی زەمین. پەرستگای خوداوەندی زەمین، ئەوە کە بەزۆر ئەگەر ناوەکە سۆمەرییە، هەن ناوەکەی بۆ زمانی خوری دەگێڕنەوە، هەتا ئەگەر ئەمەش راست بێ، ئەوا دیسان ناوە خورییەکەش مانایەکی ئایینی هەیە (بگەڕێوە بۆ هەولێر- ئەربیل... ناو و مێژوو). لە مێژوودا ئەوەش سەلمێندراوە کە (هەولێر- ئەربیل) لە هەموو سەردەمەکان بەتایبەت پێش زایین هەتا هاتنی ئایینی ئیسلام بەردەوام نێوەندێکی گرنگی ئایینە یەک بەدوای یەکەکان بووە. لەدوای هاتنی ئیسلامیش دەستی لەم رۆڵە بەرنەداوە و شاری ئاوەدان و پێکەوە ژیانی ئایینە جیا جیاکان و ئایینزایە جیا جیایەکان بووە و تا ئەمڕۆکەش ئەم هەمەرەنگییەی ئایینی پێوە دیارە.

دروستکردنی شاری هەولێر بە پشتیوانی زۆربەی بەڵگەکان بۆ سۆمەرییەکان دەگەڕێتەوە، پێش ئەوە بچنە خوارەوە، هەر لە سەردتاش وەک شارێکی ئایینی واتە وەک پەرستگایەکی گەورە و سەردکی ئەو ئایین و خوداوەندانەی کە سۆمەرییەکان بڕوایان پێیان هەبووە و پەرستوویانن، چونکە ئەوە ئاشکرایە سۆمەرییەکان (خوداوەند) گەلێکی زۆریان هەبووە و هەر خوداوەندەش خوداوەندی کارێکی تایبەت بووە. ئەگەر هەولێر ئەربیلیش بەناوی شاری خوداوەندی -بل- ناونراوە، ئەوا دیارە لەو کاتەدا ئەو خوداوەندە لەوانی تر مەزنتر بووە بە دیدی ئەوکاتەی سۆمەرییەکان. بۆیە نابێ ئەوە بەدوور بزانین کە هەر لەو کاتەی کە خوداوەندی (بل) لە هەولێر وەک خوداوەندێکی مەزن پەرستراوە، ئەوا هەر لەم کات و شوێنەش لەتەک (بل)ی خوداوەندی، خوداوەندی تر بووبن و پەرسترابن.

عەشتار خوداوەندی کۆن و ناوداری سۆمەری کە لەداستانی (دەمووزو عەشتار) سۆمەریدا پاڵەوانی دیار و بەرچاوی داستانەکەن، ئەگەرچی زۆرترین هەواڵی ئەم خوداوەندە لە سەردەمی ئاشوورییەکانەوە بەدەست گەیشتووە، بەڵام مێژووی کۆنییەکەی بۆ سەردەمی سۆمەرییەکان و بە ئیحتمالێکی زۆریش بۆ سۆمەرییەکانی پێش چوونە خواردەوەی عێراق دەگەڕێتەوە، چونکە ئەگەر سەیری (جوگرافیا)ی رووداوەکانی داستانی (دەمووز و عەشتار) بکەین، ئەوا بە ئاشکرا ئەو جوگرافیایە شاخاوییە و کوردستانە، چونکە چوونە خواردەوەی سۆمەرییەکان لە کوردستانەوەیە و ئەمەش لە هەموو لایەکەوە پشتڕاست کراوەتەوە. ئەگەر سەرنج بدەین هەولێر - ئەربیل- شاری (عەشتار) بوو، لەتەک شاری (بابل) و (عەشتار بابل) لێرە زەن بۆ ئەوە دەچێ کە (ئەربیل) پێش دەسەڵاتی ئاشوورییەکان هەر شاری خوداوەندی عەشتار بووە، وەک ئەوەی کە ئاشوورییەکان زۆر شتیان لە سۆمەرییەکانەوە وەرگرتووە، ئەم ئایین و پەرستگایەش واتە (هەولێری عەشتار)یان هەر لەوانەوە بۆ بە میرات ماوەتەوە، جگە لەوەش ئەگەر سەرنجی مێژوو دەدەین، ئەو ناوبانگەی کە عەشتار لە هەولێر و بابل واتە باکوور (کوردستان) هەیەتی لە خوارووی سۆمەری نییەتی. ئەگەر عەشتار ناوی بە (هەولێر- ئەربیل)ەوە نووساوە، ئەمە رێ لەوە ناگرێ کە هەولێر وەک شارێکی ئایینی پەرستگای خوداوەندی تریش بووبێ، لەتەک خوداوەندی عەشتار، چونکە ئەگەر عەشتار خوداوەندی خۆشەویستی و جەنگ بووە، ئەوا خوداوەنددکانی تریش پێویست بوون، وەک سەرنج دەدەین لە سەردەمی سەنحاریب و بەتایبەت لەکاتی راکێشانی ئاو بۆ ئەو قەڵایە، واتە قەڵای هەولێر، لە بەردەنووسی پرۆژەکە (سەنحاریب) ناوی چوار خوداوەندی هێناوە. واتە زیاتر لە خوداوەندێک لەم شارەو لەو سەردەمدا پەرستراون. هەر ئەم چوار خوداوەندەش وێکچوونێکی لەفزی لەنێوان ئەربیل (ئەربائیلۆ)دا دروستکردووە، کە ئەم زۆر خوداوەندیەش بۆ زەمەنەکانی تریش هەر راستە! سەیر دەکەین (مەردۆخ)ی خوداوەند، دەسەڵاتی پەنجا خوداوەند بۆ خۆی بەردەست دەکات و هێز و تواناکان لەو پەنجا خوداوەندە دەستێنێتەوە و ناوەکانیشیان هەر بۆ خۆی بەکاردێنێ و بۆیە ئەو خوداوەندە زیاتر لە پەنجا ناوی هەبوو. مێژووی شاری هەولێر یارمەتیدەری ئەو رایەیە کە بەردەوام شار و پەرستگای زۆر خوداوەند

بووە، وەک ئێستاش شاری زۆر ئایین و ئاینزایە. ئەویش ڕێگا لەوە ناگرێ کە لەو سەردەمە جیا جیایانەدا خوداوەندی دەسەلاتدار و ئایینی گەورەتر هەبووبن وەک ئەوەی کە ئێستا زۆرینەی خەلکەکە موسلمانن.

ئەگەر شاری هەولێر لە سەرەتاوە وەک شار و پەرستگایەکی ئایینی دروست کرا، ئەوا بەردەوامیش نێوەندێکی دەسەلاتدار و پیرۆزی ئایینە جۆر بەجۆرەکان بووە.

هەر لە ناوچەکانی شاری هەولێر، واتە لە ئەشکەوتی ""شانەدەر"" و ناوچەی "برادۆست" هەوالی سەرەتای ئایین و قۆناغێکی کۆن و گرنگی ئایین لەناوچەکەمان پەیدەگات، کە هەوالەکە بۆ (٦٥-٧٠) هەزار سال پێش زایین دەگەڕێتەوە، ئەگەر ئەو قۆناغی ئایین ناو لێ بنێین، قۆناغی (ئایینی ئەشکەوت) ئەوا دەبێ، بڕوا بەوەش بێنین کە پێش ئەم قۆناغە، قۆناغی ئایینی (ڕاو) هەبووە، بۆیە ئێمە پێمان باشە قۆناغەکان بەم شێوەیەی خوارەوە ڕیزبەند بکەین:

یەکەم: قۆناغی ئایینی ڕاو. (دارستانەکانی کوردستان) لە سەرەتاوە تا ئەوکاتەی مرۆڤ پەنا دەباتە بەر ئەشکەوت واتە تا دەوروبەری ١٠٠ هەزار سال پ.ز.

دووەم: قۆناغی ئایینی ئەشکەوت، (ئەشکەوتی "شانەدەر") واتە لە ١٠٠ هەزار سال پ.ز، تا دروستبوونی گوند دەوری ١٢ هەزار سال پ.ز.

سێیەم: قۆناغی ئایینی گوند (زەویا چەمێ). ئەم قۆناغەش سەرەتای قۆناغی دوو بەشە:

بەشی یەکەم: ئایینی مەرداری یان شوانکارەیی، کە ڕیشەکەی بۆ سەردەمی ئایینی ڕاو دەگەڕێتەوە.

بەشی دووەم: ئایینی کشتوکال، کە ڕیشەکەی بۆ سەردەمی دەرەنگی قۆناغی ئەشکەوت ١٢هەزار سال پ.ز، دەست پێدەکات تا دروستکردنی شار نێوان ٨و ٩ هەزار سال پێش زایینە.

چوارەم: قۆناغی ئایینی شارە شاری هەولێر -ئەربیل- ئەم قۆناغەش لە نێوان ٨ و ٦ هەزار سال پ.ز)ەوە تا ئەمڕۆ.

ئەگەر بە وردی سەرنجی ئەم دابەشکردنە بدەین دەبینین ئەم دابەشکردنە بۆ هەموو جیهان دەگونجێ، بەلام لێرە لەسەر جوگرافیای (کوردستان- شاری هەولێر) جێبەجێ کراوە. لەم دابەشکردنە دەردەکەوێ، کە لە هەر قۆناغێک(مرۆڤ) بەپێی تێگەیشتن و پێویستییەکانی خۆی کە زۆرتر لە (ترس و پێویستی- خواردن)دا خۆی دەنوێنێ، بۆیە لەهەر قۆناغێک بەدوای ئەو خوداوەندەدا گەڕاوە کە پێویستی پێی بووە، هەتا ژیانیش پێش کەوتووە و گۆڕاوە و پێویستییەکانی مرۆڤ زۆرتر بووین، ژمارەی خوداوەندەکانیش زیادی کردووە، بۆیە ئەو ژمارە خوداوەندەی لە سەردەمی شار دەستمان دەکەوێ، نابێ لە سەردەمی ڕاوکردندا بەدوای ئەو ژمارە زۆرە لە خوداوەندەدا بگەڕێین. دیارە کە ژمارەی خوداوەندەکانیش زۆر دەبن، دەسەلاتی خوداوەندەکانیش بەپێی پێویستییان لەنێو کۆمەلدا دەگۆڕێ و دواجار خوداوەندی گەورە و بچووک پەیدا دەبن و لە ئەنجامدا باوەڕی ئایینی جیا جیا پەیدا دەبن و دەکەونە ململانێ و دەسەلات تێکەل ئایین دەبێ و (خوداوەند و پاشا) دەبن بەیەک و لەیەک جیا دەبنەوە و تێکەل ئایدۆلۆژیا دەبن، هەتا دواجار لە ئایینە ئاسمانییەکان ناسینی خودای تاک و تەنیا و کۆبوونەوەی هەموو هێزەکان لەم تەنیا یەک خودایەدا بەرجەستە دەبێ.

فەلسەفەی ئایینەکان و سرووت و خوداوەندەکانیان چ لەشاری هەولێر و چ لە کوردستان کارێکی زۆری دەوێ و ئێرە جێگای ئەم باس و لێکۆلینەوە نییە! ئەوەی بۆ ئێمە و بۆ ئێرە گرنگە هەولێر بەردەوام نێوەندێکی پیرۆز دەسەلاتداری ئایینە جیا جیاکان بووە و هەر هێزێک و هەر هۆزێک هەر میللەتێک حوکمی شاری هەولێری کردبێ، ئایینی خۆشی لەم شارە برەو پێداوە، جا چ ئەو دەسەلاتە ئایینەکەی پێشە خۆی قبوول کردبێ و خوداوەندەکانی پەرستبێ، چ ئایینی خۆی لەگەل خۆی هێنابێ. سەیر دەکەین (سۆمەر)ییەکان و (گوتی) و (خوری) و (ئاشووری) و (میدی) و (هەخامەنشی و (ساسانی)یەکان هەتا هاتنی ئایینی ئیسلام، هەموویان بە شێوەیەکی گشتی کە دەسەلاتیان لەشاری هەولێر بەدەست بووە، ئایینی خۆشیان لەم شارە برەو پێداوە، بۆیە دەبینین لەم شارەدا لە

سەردەمی (سۆمەر)ییەکان خوداوەندە جۆراو جۆرەکان پەرستراون، لە سەردەمی خورییەکان میهرپەرستی - رۆژپەرستن باو بووە، لە سەردەمی میدی و هەخامەنشینەکان ئاینی زەردەشتی و لەسەردەمی ساسانی لە هەولێر بەزۆری ئایینی (مەسیحی) و هەروەها جوو زەردەشتیش هەبووە. لەدوای هاتنی ئایینی ئیسلام، موسڵمانەتی لەم شارە باڵادەست بووە، بەبێ ئەوەی ئایینەکانی تر بەتایبەت (جوو) و (مەسیحیەت) لەم شارە لەنێو بچن. ئەم رەوشە زۆر ئایینە تا ئێستاش بەردەوامە، ئەگەر رۆژگاری پەرستگای خوداوەندی جۆراوجۆر لەشاری هەولێر، بەتایبەت لەنێو قەڵاکەی دراوسێی یەکتر بوون، ئەوا دواتر پەرستگائایینە ئاسمانییەکانیش، ئەوانیش لەم شارە دراوسێ و روو لەیەک بوون، بۆیە ئەم بارە ئایینییە رێگا خۆشکەر بووە، بۆ ئەوەی هاووڵاتی شاری هەولێر. ئەگەر لەسەر هەر ئایینێک بێ و بچێتە هەر پەرستگایەک، ئەوا پەیڕەوانی ئایینەکانی تر ببینێ کە وەکو ئەو ئەوانیش دەچنە پەرستگای خۆیان، هەر ئەم زۆر ئایینی و ئایین گۆڕییەیە کە وای کردووە، لەشاری هەولێر، پەرستگا ببێتە کەنیسە و کەنیسە ببێتە مزگەوت. ئەگەر کەنیسە و مزگەوت و پەرستگاکان تێکەڵ یەکتر بووبن، ئەوا کەسایەتییە ئایینیەکانیشی لەنێوان ئایینە جیا جیاکاندا تێکەڵ دەبن و هەر ئایینە بە هی خۆی دەزانێ، بۆ نموونە:

(یەزداندۆخت) پاکیزەی مەسیحییەکان، کە خۆی هەر لە ناوەکەیدا رەگێکی زەردەشتی پێوە دیارە لەشاری هەولێر، مەسیحییەکانی هەولێر بە مەسیحی دەزانن و وەک مەزارێکی پیرۆزی خۆیان سەردانی دەکەن، مێژووەکە دەگەڕێتەوە سەردەمی ساسانییەکان، کەچی موسڵمانەکان وەک گۆڕی (ستی ئیمام) ناوی لێ دەنێن و دەچنە سەرگۆڕی و مرازی لێ دەخوازن، ئەویش دیارە کە زەمەنەکەی پاش هاتنی ئیسلامە، نموونەیەکی تر، مەزارگەی شێخ وسو رەحمان- رەبەن بۆیا ) لەشاری شەقڵاوە، ئەم مەزارە بۆ خۆی لە ئەشکەوتێکی بناری سەفینە و لای پەیڕەوانی هەردوو ئایین. واتە موسڵمان و مەسیحییەکان پیرۆزە و زیارەتی دەکەن و مرازی لێ دەخوازن و هەریەکەش بە پیاوێکی باوەڕداری ئایینەکەی خۆی دەزانێ، مەسیحییەکان بە (قەشە رەبەن بۆیا) ناوی دەبەن و مێژووەکەی بۆ رۆژگاری سەدەی پێنجەمی زایینی دەگێڕنەوە بەقسەی زانای کورد (تۆفیق وەهبی) هەرچی (شێخ وسو رەحمان)ە، زەمەنەکەی دەگێڕنەوە بۆ سەردەتای دەسەڵاتی عوسمانلییەکان لە کوردستان.

ئێستای شاری هەولێر لەرووی ئایینییەوە، واقیعێکی دەوڵەمەندە بە ئایین و ئایینزا، ئەگەر زۆرینەی خەڵکی پارێزگای هەولێر موسڵمانن، ئەوا زۆرینەی ئەو موسڵمانانەش سونی مەزهەبن و کەمێکی کەمی شیعە مەزهەبیشی تێدایە، ئەگەر سونی مەزهەبەکان زۆرینەن، ئەوا لەنێو ئەوانیشدا رێبازی سۆفیگەری (قادری) و (نەقشەبەندی)یش هەیە، جگە لەوردە ئایینزای تر کە خۆیان بەخاوەنی ئایینزای تایبەت دەزانن. هەروەها مەسیحییەکانیش خاوەنی ئایینزای جیاجیان کە بریتین لە پەیڕەوانی کەنیسەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و چەند ئایینزایەکی تێدایە وەکو (کاسۆلیک و ئەرثەدۆکسی و پرۆتستان)ن.

دیسان کەمینەیەکی جوو بنەجووی تێدایە و سەرەڕای هەندێک لە پەیڕەوانی ئایینی ئێزدی و کاکەیی کە هەموو ئەمانە، بە ئازادی و بە تەبایی خەریکی ژیان و خوداپەرستی خۆیانن.

مێژووی ئایین و جۆری ئایینەکان لەشاری هەولێر بەمەندە کۆتایی نایێ، پێویستی بە لێکۆڵینەوە و گەڕانی زۆر هەیە، بۆ ئەوەی هەموو باوەڕ و ئایینەکانی هەموو سەردەمەکان بەسەر بکەینەوە، ئەمەی نووسراوە کورتەیەکی کەمی مێژوویەکی دوور و درێژ و زۆر و هەمەجۆری ئایینەکانە لەم شارە دێرینەدا، هێندە هەیە کە دەرکەوت کۆنترین ئایین لە هەموو جیهاندا کە لە بەڵگە مێژوویی و شوێنەوارناسییەکانەوە بەدەست بکەوێ و زاناکان بیسەلمێنن، ئەوا ئەو ئایینە لە شاری هەولێر- ئەربیل- و لە ٦٥ تا ٧٠ هەزار ساڵ پێش زایین لە ئەشکەوتی "شانەدەر" لەم کوردستانە بووە.

# هەولێر لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامیدا

پ.ی.د. ئەحمەد میرزا میرزا
كۆلێژی ئاداب - زانكۆی سەلاحەددین

هەولێر شارێكی كۆن و گرنگە بە درێژایی هەزاران ساڵ ژیانی تیادا نەوەستاوە. لەگەڵ ئەوەشدا سەردەمێكی گرنگ هەیە لە مێژووی ئەم شارە كە كەمتر سەرچاوە كۆن و نوێیەكان ئاماژەیان بۆ كردووە، ئەویش ئەو ماوەیە كە فتوحاتی ئیسلامی تیایدا روویداوە، هەر ئەوەش هۆكاری هەڵبژاردنمە بۆ ئەم ماوەیە بەمەبەستی ئەوەی كە تیشك بخەمەسەر ئەو راستییە گرنگە كە روخساری ئەم شارەی گۆڕی و سروشتەكەی لەو كاتەوە بۆ سەر سروشتی خۆی گۆڕیوە تاوەكو ئێستا.

لەگەڵ ئەوەی كە نووسین لەسەر ئەم ماوەیەدا ئاسان نییە بە هۆی كەمی زانیارییەكان دەربارەی و جیاجیایی ئەو زانیارییانە گەر هەبێت لە نێو لاپەڕەكانی پەرتووكە جیاوازەكان بە زمانی جیاجیا. بەڵام ئەم تەگەرەیەمان بەسەر چواندو توانیمان زانیاری بە سوودمان دەست بكەوێت لەم سەرچاوە جیاجیایانە.

لێكۆڵەر تیشكی خستۆتە سەر نەخشەی سیاسی ناوچەكە پێش فتوحاتی ئیسلامی و لە دوایدا. دواتر رێڕەوی فتوحاتكردنەكەو ئەوەی دواتر روویدا.

سەبارەت بە ماوەی پێشی فتوحات پشتم بەسەرچاوەو كۆبەندی سەردكی بیانی بەستووە بۆ ماوەی فتوحات و دواتریش پشتم بە سەرچاوە ئیسلامییەكان بەستووە. لەوانە "فتوح البلدان- بلازەری ٢٧٩ك ٨٩٢ز" و "تأريخ الطبری ٣١٠ك ٩٢٢ز" و "تأريخ الموصل للازدی ٣٣٤ك ٩٤٥ز" و هیتر.. لە كۆتاییدا بە هیوام سەركەوتوو بووبم لە پێش چاو خستنی گێڕانەوەیەكی مێژوویی بەسوود پەیوەست بەم شارە دێرینە.

هەولێر كەوتۆتە ئەو دەشتەی كە لە نێوان زێی گەورە لە باكوور و زێی بچووك لە باشوورە. ئەم دەڤەرەش لەو ناوچانەیە كە بارانێكی پێویستی بۆ كشتوكاڵ بەردەكەوێت بێ ئەوەی كە پێویستی بە ئاودێری هەبێت.

زەوی كراوە و بەپیت و شیاو بۆ كشتوكاڵ و دۆخی شێدار یارمەتی ئەوەی داوە كە ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر بەردەوام بێت لە دەشتەكەیدا هەر لەسەرەتای مێژوودوە. سەرەتا لە چەرخی بەردینی كۆن و ناوەڕاست لە سەرو بەندی "٦٥٠٠٠ساڵ" تاوەكو رۆژگاری ئێستامان و بێ پسانەوە[١]

هەولێر بە پێی پێگە جوگرافییەكەی تەنیا رێڕەو و خاڵی یەكگرتنەوەی شارستانییەتەكان نەبووە بەڵكو هاوكاری و بەشدارییەكی كارای هەبووە لە گەشاندنەوەی شارستانییە مرۆڤایەتییەكان لە بواری جیاجیا و بە درێژایی چەرخ و سەردەمەكان.

لە دەوروبەری ساڵی "٢٠٠٠پ.ز" یەكەم ناوهێنانی هەولێر بووە لە نووسینە سۆمەرییەكان. دواتر لە سەردەمی بابلییەكان و ئاشوورییەكان بە ناوی "ئاربا- ئیلۆ". ئینجا لای مێژوونووسە كلاسیكییەكان بە ناوی ئەربیلا "Arbila"[٣] هاتووە. بەناوبانگ بووە بەوەی یەك لە مەڵبەندە گرنگەكانی پەرستنی خوای عەشتار بوود.[٤] هەروەها ناوی ئەم شارە لەلایەن مێژوونووسە رۆمانەكان بەستراوەتەوە بە پێگەی مێژوویی نێوان دوا پاشای ئەخمینییەكان "دارای سێیەم"و ئەسكەندەری مەقدۆنی ساڵی "٣٣١پ.ز" سترابۆ باس لەوە دەكات كە مەقدۆنییەكان دوای سەركەوتنیان بەسەر لەشكرەكانی دارای سێیەم لە گۆگامیلا هەڵسان بە ناوهێنانی جەنگەكە بە جەنگی ئەربێلا بەو پێیەی كە نزیك بوود لەم شارە و گوندی، گۆگامیلا، گوندێكی گرنگی ئەوتۆ نەبوود.[٥]،[٦] كە فتوحات لەسەردەمی خەلیفە عومەری كوڕی خەتتاب رووی لە فراوانی كرد. دەوڵەتی ئیسلامی لە رووی كارگێڕییەوە دابەش كرا بەسەر چەند هەرێمێكدا. یەك لەم هەرێمانە "ئەلجەزیرە" بوو.[٧]: ئەم شوێنەی دەیگرێتەوە نێوان دیجلەو فورات بوو دواتر فراوان بۆوە تاوەكو ئەو شارانەی گرتەوە كە كەوتبووە رۆژهەڵاتی دیجلەو رۆژئاوای فورات.[٨] بەم جۆرە سنووری ئەلجەزیرە لە باكووردوە ئەرمینیاو وڵاتی ئەلرۆم و لە باشووردوە خاكی "سواد" لە رۆژهەڵاتەوە ئازرباجان و لە رۆژئاواوە وڵاتی شام. ئەم هەرێمە چەندین شاری گەورەی گرتۆتەوە یەك لەم شارانە شاری موسڵە[١٠]، یەك لە شارە هەرە گرنگەكانە[١١] چونكە قەڵەمڕەوی گەیشتبوو بە سنووری ئازربایجان[١٢]. شاری هەولێر بەشێك بوو لەم قەڵەمڕەوییە[١٣]. لەو شارانەی سەر بە شاری هەولێر بوون (حزە) بوو. لە هەمووان گرنگتر بوو. دەناسرا بەوەی كە (شارۆچكەیەكی بچووك نزیك هەولێرو لە خاكی موسڵە)[١٤]. و "كفر عەزا" سەربە شارۆچكەی (حزە)[١٥] و (رەزان) كە كەوتۆتە سەرووی زێی باكوور.[١٦] وە لە شوێنەكانی

دیکەی موسڵ، (باجرمی)[17] و شارەزوور[18]و عەقر (شاری ئاکرێ)[19].

لێکۆڵینەوە لە مێژووی هەولێر لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامیی دا رووبەرووی کێشەی راستی دەبێتەوە بە هۆی پشتگوێ خستنی لەلایەن مێژوونووسە موسوڵمانەکان[20].

بە تایبەتی مێژوونوسانی فتوحاتی سەردەمی ئیسلامەتی، ئەو کەسانەی کە دەستێکی باڵایان هەبوو لە نووسینەوەی مێژووی ئەو سەردەمە[21]. وا دیارە ئەم هۆکارەی دوایی پاڵی بە بەشێک لە لێکۆڵەران ناوە کەوا سەیری ئەم شارە بکەن کە رۆڵێکی ئەوتۆی نەبووە لەم ماوەیەدا. بۆی هەیە هۆکارەکەی بۆ ئەوە بگەرێتەوە کە لە لێکۆڵینەوە مێژوویییەکەدا پشتیان بە نووسراوەکانی فتوحاتی ئیسلامی بەستبێت بێ ئەوەی بۆ مێژووی ئەم شارە بگەرێنەوە لەسەردەمەکانی پێشی ئەم فەتحکردنە.

لەگەڵ ئەوەی لەکاتی بڵاوبوونەوەی ئیسلام و گەیشتنی بەم شارە. پێگەکەی رووی لە کزی کردبوو. بەڵام نابێت ئەمە پاڵ بە لێکۆڵەر بنێت کە ئەم شارە هیچ کاریگەرییەکی نەمابوو. لە کاتێکدا ناوی هەندێک لە شارو تەنانەت گوندی زۆر لەم شارە کە رۆڵیان کزتر بووە هاتووە بێ ئەوەی کە هیچ هۆکارێک هەبوبێت. هەر ئەوەش بوو کە لێکۆڵەری هاندا کە بەداویدا بگەرێت.

لەگەڵ ئەوەی باسکردن لەم کاتەدا تارادەیەک لە باسکردن لە مێژووی ئەم شارەمان دوور دەخاتەوە کە سەردەمی سەرهەڵدانی ئیسلام بووە تیایدا. بەڵام بێ گەرانەوە بۆ ئەوکات ناتوانین بە ئەنجامی بروا هێنەر بگەین.

شایانی ئەوەیە بوترێت کە ئەوەی لەسەر ئەم هەرێمە نووسراوە پێش ئیسلام زۆر زێدەرۆیی لێکراوەو بە وردی کاری لەسەر نەکراوە. ئەگەر پێوەی هەڵنەبەسترابێت. لەگەڵ ئەو نارۆشنییەی کە پێوەی دیارە. بەڵام ئەوەش گرنگی نەدان پێوەی ناگەیەنێت بەڵکو گرنگییەکی تایبەتی خۆی هەیە. گرنگی شارەکە لە رووی ئاینییەوەو بە تایبەتی لەم سەردەمەی کە دەمانەوێ باسی لێوە بکەین لێرەدا کورتەیەکی لێ تۆمار دەکەین بە مەبەستی روونکردنەوەی.

شاری هەولێر بوو بە پایتەختی مەملەکەتی حەدیاب، کە سەردەمی نێوان سەردەمی یەکەمی پ.ز و سەدەی دووەمی زایین لە گەشانەوەدا بووە. سەرەنجام کەوتۆتە بەر ئارەزووی داگیرکاری هەریەک لە ئیمپراتۆریەتی فرثی و رۆمانی. دواتریش ساسانی و بیزەنتی. لەسەر خاکەکەی چەندین جەنگی چارەنووساز ئەنجامدراوە. تاوەکو لە کۆتاییدا هەولێر بەر دەسەڵاتی ساسانییەکان کەوتووە.

ئاینی (دیان)ی مەسیحی لە حەدیاب بڵاو بۆوە هەر لە سەردەمی یەکەمی زایینی لەسەر دەستی (راهیب) مارئەدی.

یەکەم کەس بوو بە ئەسقەف (بقیزا) بوو[25]. کە ئەویش خوێندکاری (مار ئەدی) بوو لە ساڵی ٤ ۱۰ی زایینی[26].

لەوێوە، واتە لە هەولێرەوە، ئایینی (دیان)ی مەسیحی بۆ بەشەکانی دیکەی عێراق بڵاوبۆوە[27]. ئیتر گرنگییەکەی رووی لە زیادبوون کرد. تاوەکو بە یەکەم پێگەی نەسرانی واتە دیانی لە رۆژهەڵات ناسرا[28]. سەرەنجامی ئەم گرنگییە جاسلیق (فاقا) لە ساڵی ۳۱۰ز بۆ یەکەمین جار (حەدیاب)ی بەرزکردەوە بۆ پێگەی (مەتران)، ئەوسا موسڵ ئەسقەفیەک بوو، سەر بەم شارە بوو، لە سایەیدا نۆزدە کورسی ئەسقەفی بەرێوە دەچوو لەم شارەی هەولێر.

دوای ئەم بریارەی کە کۆری سالیق بەستی لە ساڵی (۴۱۰ز)[29]. پێگە ئاینیەکەی ئەم شارەی هەولێر پلەی شەشەمی لە نێوان کورسییەکانی کەنیسەی رۆژهەڵات وەرگرت. لە ساڵی (۵۲۲ز) هەولێر بە یەک لە چوار ئەبرشە مەزنەکان لە رۆژهەڵات دەژمێردرا.

کورسی و پێگە ئاینییە باڵاکەی پاراست مافی بەژداریکردن لە هەڵبژاردنی بەتریارکی رۆژهەڵات تەنیا لەسەر پێنج مەتران راوەستابوو کە هەولێر یەک لەم پێنجە بوو لەو نامەیەی کە (مار ئەبا ئەلجاثلیق) لە ساڵی ٥٤٤ز لە مەدائینی بۆ ئەبریشەکانی رۆژهەڵاتی ئاراستە کردووە داوای هەڵبژاردنی (ئەلجاثلیق)ی کردووە بە پێی رێکەوتن ئەوسا (مەتران)ی هەولێر یەک لەم پێنج مەترانە داواکراوانە بووە بۆ ئەم شوێنە.[30] (ادی شیر) دەگێرێتەوە لە کاتی بەستنی کۆری کلدانی دەیەم ساڵی (۵۸۵ز) مەترانی هەولێر (حنانا)[31] لەم کۆرەی دوایی بەشداری نەکردووە و لە جیاتی خۆی (ئابای کاهن)[32] ی ناردووە. بەو واتایەی کە هەولێر مەترانی خۆی هەبووە تاوەکو ساڵی (۵۸۵ز). لە کاتێکدا (مار سبریشوع) لە هەولێر خوێندوویەتی و لە ساڵی (٦٠٤ز) مردووە[33]. هەرێمەکە بە گشتی کاریگەری ململانێی لە کۆتایی سەدەی شەشەم و سەرەتایی سەدەی حەوتەمی زایینی[34]. ناوی هەولێر لە ماوەی ململانێی نێوانیان لە ساڵی (۵۹۱ز) هاتووە لەلایەن مێژوونووسی بیزەنتی ثیوفلاکت. لەو کاتەی هێرشەکەی ساسانی- بیزەنتی بە مەبەستی گێرانەوەی (کیسرا پەروێز) بۆ سەر کورسی دەسەڵات بەرپابوو بە ناوی ئەسکەندەریە[35]. کە راولنسون جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە هەولێر لەو بروایەدابوون کە قەڵاکەو گردەکە لە دروستکراوی ئەسکەندەری مەقدۆنین. هەولێر بە پێگە ئاینییەکەیەوە بە ناوبانگ بوو[36]. تاوەکو سەدەی شەشەمی زایینی ئەم ناو و ناوبانگەی لە دەست نەدابوو، بەڵام ئەم قۆناغەی دوایی ململانێی ساسانی- بیزەنتی سەرەنجامی ترسناکی بەسەر هەرێمەکە بەگشتی و هەولێر بە

تایبەتی بەجێهێشت. بەڵام هەموو گرنگییەکەی لە دەست نەدا.
لە ساڵی (٦٠٩ز) هەولێر مەڵبەندی یەک لە سێ ئەبریشەکانی رۆژهەڵات بوو.
مەتران فولیت زیی کە ناسراوبوو بە یۆناداب حدیابی لەم شارە دادەنیشت.[٣٧]
لە ساڵی ٦١٠ز یۆناداب نامەیەکی لە پاشا ساسانی دەستکەوت سەبارەت بەو دەسەڵاتەی کە لە ناوچە چیاییەکان پێی بەخشراوە.[٣٨-٣٩]
لە ساڵی ٦١٢ز (یۆناداب مترا فولیت حدیاب) یەک لەو پێنج کەسە بوون کە بەشدارییان لەو گفتوگۆیە کرد لە نێوان رێبازە مەسیحییەکان لە پایتەختی ساسانییەکان و لە ژێر چاودێری دەوڵەت بەسترا[٤٠].
لە کاتی هەوڵدان بۆ سازدانی ئاشتەوایی کۆتایی لە نێوان (بوران)ی ژنە پاشاو (هەرقەل)ی ئیمپراتۆر ساڵی (٦٣٠ز) شاندێک نێردرا لە رۆژهەڵاتەوە کە دوو ئەندامی لە حەدیاب تیا بەشدار بوو. لە رۆژهەڵاتەوە ئەوانیش (مەتران)ی هەولێر (پۆلیس) و (ئیشۆعاب)ی حەدیابی، ئەگەر ئەرکی ئەم شاندە بزانین و رادەی سەرکەوتنیان. ئەوا پایەی حەدیاب لە لایەن هەردوولای ساسانی و بیزەنتییەمان دەزانی. ئەرکەکەش مەترسیدار بووەو گرنگی خۆی هەبوو. هەوڵی بەستنی پەیمانێک بووە لەلایەک و نەخشاندنی سنوور بووە لە نێوانیان لەلایەکی دیکەوە. تۆمای ئەڵمەرجی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات: (ئەم کەسانە پێگەی شیاویان لە لایەن رۆمەکانەوە بەخۆ دیت و ئەوە بوو کە بە خۆوەو بە داواکارییەکانەوە وەرگیران).[٤١]
هەروەها پێگەیەکی دیکەی گەورەی شاری هەولێرەوە بەدەردەکەوێت کە (ئیشۆعاب)ی حەدیابی. نوێنەری ناردووە، نوێنەرانی نەساتیرە بۆ چین[٤٢]، [٤٣] بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئایینی (دیان)ی مەسیحی لەم ماوەیەدا.
لە سفری کوفی نەسرانییەت لە ئاسیادا بەکورتی هاتووە: لە رۆژانی سەرهەڵدانی ئیسلامی کەنیسەی نەستوری چەندین لق و پۆپی هەبوو لە وڵاتی نێوان دوو زێ بۆ سەر چەند هەرێم دابەش بوو یەکێکیان هەرێمی حەدیاب (ئەبریشەی هەولێر) بوو[٤٤].
بە پێی دەقەکانی پێشوو دەتوانین بڵێین کە هەولێر ئاوەدان بووە. ئەگەر چی پێشی هاتنی ئیسلام زۆر لە گرنگییەکەی لە دەست دابوو. بەڵام پرسیار ئەوەیە بۆچی ناوی نەهاتووە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە راستتر هۆیەکانی بۆ چەند خاڵێک دەگەڕێتەوە دیارترینیان بریتین لە:
یەکەم:- هەولێر زۆر لە پێگەکانی خۆی لە دەست دا سەرەنجامی دۆخی سەربازی و سیاسی کە بەسەر ناوچەکەدا تێپەڕی سەرەنجام یەک لە ئەنجامەکانی بەردەو دواوەی گەڕانەوەی پێگە ئایینییەکەی بوو کە پێشتر ناوبانگی هەڵکردبوو بۆ بەرژەوەندی کەنیسە مار مەتی کە (الیعاقیبە) دەست رۆیشتوو بوون لە سایەیدا. ئەوە بوو کە هاتنە ژووری رۆمەکان بۆ ناو دەوڵەتی ساسانییەکان دڵ و دەروونی مەسیحییەکانی کردەوە. (الیعاقیبە) بەشێوەیەکی تایبەتی سوودیان لە ئامادەبوونی لەشکرە رۆژئاواییەکان وەرگرت بۆ هەرێمەکانی رۆژهەڵات. ئەوەی ئەم راستییە دەسەلمێنێت ئەوەیە کە یعاقیبەکان شاندێکیان بۆ وڵاتی رۆم نارد کە لە نێوانیاندا مەترانی حەدیاب ئامادەیی تیا نەبوو. ئەویش بەمەبەستی گۆڕینی ئەسقەفەکانی دەڤەری رۆژهەڵات بۆ بەرژەوەندی یعاقیبەکان سەرەڕای ئەوەی کە ئەم داواکارییە ردت کرایەوە بەڵام توانییان پێگەی مەترافولیتە لە رۆژهەڵات بگۆڕن هەر بەوە نەوەستان بۆ دێر مار مەتی بیگوازنەوە، بەڵکو بۆ تکریت گوازتیانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا مەتران مار مەتی ناونیشانی مەترافولیەکەی بۆ مایەوە[٤٥]. وا دیاردەکەوێت ئەم کارە رەنگدانەوەی ئەو دۆخە نوێیە بوو، کە لەناوچەکە هاتەکایەوە. یعاقیبەکان (هەڵگرانی ئەو بیرو باوەڕەی کە دەوڵەت کاری لەسەر دەکرد) هانی ئەوەیان دەدا کە لە ناوەندی دەسەڵاتی ساسانی نزیک ببنەوە. بۆی هەیە بیریان لەوە کردبێتەوە کە رۆژێک لە رۆژان دەست بەسەر ئەم مەڵبەندەدا بگرن. دوای ئەوەی کە لەشکرەکانی هەرقەڵ دەستیان بەسەر پایتەختی ساسانییەکاندا گرت و دواتر کشانەوە.
رۆمەکان جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە لە باکووری دەوڵەتی ساسانی بمێننەوەو ئەم ناوچەیە لە ژێر قەڵەمرەوی ئەواندا بێت بەراستەوخۆیی. فەرمانڕەواکەی خۆیان لە تکریت داناو کردیان بە مەڵبەندێک بۆ هەڵسووڕانی کارەکانیان و سەرەنجام شاری تکریت گرنگییەکی گەورەی بەدەست هێناو مەڵبەندە شارستانییەکە، وەرگەڕا بۆ مەڵبەندێکی ئایینی و هەستیارو دەسەڵاتدارەکەی ئەم شارە ناونیشانی جاسلیق یان مەترا فۆلیتی پێدرا[٤٦].
بەڵام ئەم گۆڕانکارییانە کە لە ئاستێکی زۆر باڵادا بوو بەسەر ئەم شارەدا هات لەسەر کەمبوونەوەی پێگەی ئایینی شارەکانی دیکە بوو، کە یەک لەم شارانە شاری هەولێر بوو.
دووەم:- هێرشەکەی بێزنتییەکان بۆ سەر دەوڵەتی ساسانی بەهێزێکی ئەوتۆ بوو کە توانی بەهێزترین کیسرای ئەم دەوڵەتە تێک بشکێنێ، کە ئەویش کیسرا ئەپرویزە کە ئەویشی بە بەکوشتدا بە دەستی سەرکردەکانی.
بەهۆی بێزارییان لە سیاسەتە هەڵەکانی بەتایبەتی سیاسەتی دەرەوەی و هێنانە پێشی (شێرۆی)ی کوڕی. کە لە یەکەم رۆژی دەستبەکاربوونی هەڵسان بە کوشتنی هەموو براکانی. کە بوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی گێرەشێوێنی لە

سەرانسەری دەوڵەتی ساسانی.
دوای مردنی بە چەند مانگێک چەند پاشایەکی بێ هێز دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرت کە ماوەیان زۆر نەبوو. تاوەکو ڕێککەوتن لەسەر دانانی یەزد کوردی سێیەم (٦٣٢-٦٥١ز) کە هەوڵێکی زۆری دا دۆخەکە بۆ بارێکی دروست بگەڕێنێتەوە.
ئەم ڕووداوانە هاوکات بوون لەگەڵ سەرهەڵدانی ئیسلام لە نیمچە دوورگەی عەرەبی کە دەوڵەتی ساسانی زۆر بێزار کرد. بە پلەیەک کە دوژمنە ئاساییەکانی لە بیربردنەوە.
بڕیاری جەنگیان دا لەگەڵ موسڵمانەکان و سەرەنجام جەنگی قادسیە (١٦ک/٦٣٧ز)ی لێکەوتەوە. ئەنجامەکەشی کارەسات بوو سەبارەت بە ساسانییەکان. هێزەکانیان تێکشکاو پایتەختەکەشیان ڕووخا، هاوسەنگی و توانایان لە دەست دا. داوای هاوکاری و یارمەتییان لە سەرانسەری دەوڵەتی ساسانی کردو خۆیان کۆکردەوە بۆ ئامادەبوون لە جەنگی جەلەولای یەکلاکەرەوە. لە کۆتاییدا توانایان کزو لاواز بوو. هەرێمەکان و تەنانەت شارە بچووکەکانیش بە سەربەخۆیی کاروباری خۆیانیان هەڵدەسووڕاند.
ئەگەر شاری هەولێر وەرگرین. ئەو دۆخ و کەشەی بەسەر دەوروبەریدا هات کاریگەری لەسەر هەولێریش هەبوو هەروەکو تەواوی شارەکانی دیکە. بەڵام بڕوا بەوە دەکرێت کە کاریگەرییەکەی لەسەر هەولێر بەپێی پێگە جوگرافییەکەی جیاوازبێت و هەروەها بەپێی پێگە مێژووییەکەی و ئایینییەکەی. بۆی هەبووە هێزێکی سەربازی ئەوتۆی تیا نەبووبێت. بەڵام ئەوەش ناگەیەنێت کە لە ژێر دەسەڵاتی ساسانییەکان دەرچووبێت.
بەڵکو ئەگەری ئەوە هەیە دەستەیەکی کارگێڕی کاروباری شارەکەیان هەڵسووڕاندبێت.
بۆی هەیە دەسەڵاتی پیاوانی ئایینی زەردەشتی کزو لاواز بووبێت لەم شارە چونکە ئەوان بەستراوبوونەوە. کە هەمیشە بە هێزە سەربازییەکەوە پەیوەست بوون.
سێیەم:- مێژوونووسە موسڵمانەکان توانای تێگەیشتنیان لە قورسایی ئەم شارە نەبوو. بە هۆی سەرەتای پەیوەندیان بە ناوچەکەوە. لە قووڵایی مێژووەکەی نەگەیشتبوون ئەو قووڵاییەی لە هزری مێژوونووسە ڕۆژئاواییەکان ئامادەیی هەبوو، وەک سترابۆ، سیوفلاکت، کە هەولێری بە ئەسکەندەریە ناوبرد. لەگەڵ ئەوەی کە دەقەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هەولێر بەردەوام ئاوەدان بووە ئەو کاتە ساڵی (٥٩١ز). بەڕوونی ئەوە ئاشکرا دەکات کە هەولێر ئاوەدان بووە لەم مێژووەدا. بە پێچەوانەی مێژوونووسە موسڵمانەکان مێژوویی ئەم شارە دێرینەیان زانیوە هەولێر ئەگەر چی زۆر لە گرنگی پێگە ئایینییە (دیان) مەسیحییەکەی (هەر وەکو ئاماژەمان بۆکرد) لە دەست دا لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆڵی پێشەنگی خۆی هەبوو لە نێوان ئایینەکانی ناوچەکە. زۆربەی مێژوونووسە مەسیحییەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە مەسیحییەکان بێلایەن لە نێوان موسڵمان و ساسانییەکان وەستاون. ئەگەر چی لە ناخیاندا سەرکەوتنی موسڵمانەکانیان لا پەسەندتر بووە.
ئەمە شیاوە چونکە سەرەڕای ئەو ئازارەی لە دەست ساسانییەکانیان چێشتبوو. موسڵمانەکانیان لا نزیکتر بوو لە ڕووی باوەڕەوە. تەنانەت (جاسلیق ئایشوعاب) هەموو تواناکانی تەرخان کرد بە مەبەستی ئەوەی گوێڕایەڵی خۆی بۆ هێزە نوێیەکە نیشان بدات .
ئیبن ئەلعبری دەڵێت: (مارۆسا مەترافولیتی ڕۆژهەڵات. کە لە سەروبەندی فەتحکردنی ئیسلامی بۆ شاری تکریت ئەو لەم شارە بووە. دەرگای قەڵای شارەکەی بۆ موسڵمانەکان کردۆتەوە.
حززە (ئەگەر مەبەست هەولێر نەبووبێت) مەڵبەندی چالاکی ئایینی مەسیحییەکان بووە. ئەوان بۆی هەیە دانوسانیان لەگەڵ ئەم هێزە نوێیە کردووە. هۆیەکەش ئەوەیە کە باسی پێشڕەوییەکانی ئیسلامی کراوە ناوی ئەوان هاتووەو ناوی هەولێر نەهاتووە.
بە مەبەستی مێژووی گەیشتنی موسڵمانەکان بە(حزە) شاری هەولێر. زۆر بەکورتی ئاماژە بە بانگەشەی موسڵمانەکان دەکەین. سەرەتا ژمارەیەک لە خەڵکی مەککە موسڵمان بوون.
پێغەمبەر(د.خ) سیانزە ساڵ لەشاری(مەککە) لەگەڵ هاوەڵە نزیکەکانی مایەوە[47]. ئاینەکەی دەگەیاند بە هۆزو دەستەکانی کە بە مەبەستی حەجکردن ڕوویان لە مەککە دەکرد. لە ساڵی یانزەهەم بانگهێشتەکەی چاوی بە دەستەیەک لە نێردراوانی (یەسرب) کەوت، باوەڕیان پێهێنا، گەڕانەوە بۆ شارەکەی خۆیان. دەستیان بە بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام کرد. تاوەکو بۆ ساڵی ئایندە هاتنەوە بۆ شاری مەککە.
دوایی ڕێکەوتن لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کە کۆچ بکەن بۆ (یەسرب)(شاری مەدینە)[48]. لەم شارە پێشوازییان لە موسڵمانەکان کرد[49]. دواتر ژمارەیەکی دیکە لە موسڵمانان لە مەککەوە ڕوویان لە (مەدینە)کرد[50]. ئیتر کەش و هەوا لەبار بوو بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام. ئیتر کۆمەڵگای ئیسلامی هاتە دروستبوون. ململانێ لەگەڵ کافرەکانی مەککە دەستی پێکرد.
پێغەمبەر و موسڵمانەکان ناچار بوون بکەونە جەنگەوە لەگەڵ مشریکەکانی مەککە و هاوپەیمانەکانیان لە هۆزە عەرەبییەکان. تاوەکو سەرکەوتن [51]. لە کۆتاییدا (مەککە) کەوتە دەست موسڵمانەکان. لەساڵی هەشتەمی کۆچی شاری مەککەی فەتح کرد زۆربەی خەڵکی موسڵمان بوون. ئیتر پەیامبەرانیان بۆ هۆزە عەرەبەکان نارد. پەیتا پەیتا لە

سەرانسەری دوورگەی عەرەبی دەهاتن و موسڵمانبوونی خۆیان ئاشکرا دەکرد.[٥٢]

تاودکو ئاییینی ئیسلام سەرانسەری دوورگەی عەرەبی گرتەوە پێغەمبەر (د.خ) لەسەر بانگەوازەکەی بەردەوام بوو، نووسراوی بۆ کیسرای ساسانییەکان و قەیسەری رۆم نووسی. بۆ مقەوقەسی حاکمی میسرو نەجاشی لە حەبەشە و هەندێ لەو میرانەی عەرەب کە لەژێر فەرمانڕەوایی رۆم و ساسانییەکان بوون. هەندێکیان وەڵامی شیاو و هەندێکیان وەڵامی نەشیاویان دایەوە. خۆیان ئامادەکرد بۆ لەناوبردنی موسڵمانەکان. پێغەمبەر(د.خ) ناچار بوو بە مەبەستی رزگارکردنی گەلانی ژێر دەستیان رووبەڕوویان ببێتەوە. جەنگی مۆتە (٨ک ٦٢٩ز) روویدا. کە ئەویشی تۆڵە بوو لە پێغەمبەردوە(د.خ) دژ بە رۆم و هاوکارانیان لەو هۆزە عەرەبانەی سەر بە رۆمەکان بوون و نێردراوەکانی پێغەمبەریان کوشتبوو[٥٣] دواتر جەنگی تەبووک (٩ک ٦٣٠ز) بۆ بەرەنگار بوونەوەی رۆمەکان کە دەیانویست پەلاماری موسڵمانەکان بدەن. بەبێ بیانوو لە ساڵی١١ک (٦٣١ز.) لەشکرێک لە موسڵمانان رێکخرا بە سەرۆکایەتی ئوسامەی کوڕی زەیدو لەگەڵیان گەورە یاوەرەکانی پێغەمبەر(د.خ) و روویان لە شام کرد. بە مەبەستی تۆقاندنی رۆمەکان و گەڕانەوەی باوەڕ بۆ موسڵمانەکان. بەڵام پێش ئەوەی لەشکرەکە بجووڵێتەوە پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد[٥٤].

ئەبوبەکری سدیق لە ساڵی (١١ک/٦٣٢ز) بوو بە یەکەم خەلیفەی موسڵمانان هەندێ لە هۆزە عەرەبەکان هەڵگەڕانەوەو هەندێکیان ئامادەی بەخشینی زەکات نەبوون، بارو دۆخەکە زۆر قورس بوو. بەڵام دەبوایە ئەبوبەکر لەشکرەکە جوولە پێبکات کە بە رابەرایەتی ئوسامە بوو، بەرەو شام بجوولێنەوە. بە مەبەستی راستەڕێکردنی رۆمەکان. ئەوە بوو کە ئەبوبەکر لەشکرەکەی ئاراستە کردو ناردی و گەڕایەوە بەسەرکەوتوویی و ئەمجارە ئەبوبەکر رووی لە هۆزە هەڵگەڕاوەکان کردو بەسەریاندا زاڵ بوو[٥٥] ئینجا لەشکرێکی بۆ عێراق نارد و لەشکرێکی دیکەی بۆ وڵاتی شام نارد. بە مەبەستی تەواو کردنی ئەو هەنگاوەی پێغەمبەر (د.خ) دەستی پێکردو رووبەڕووبوونەوەی پیلانەکانی ساسانییەکان و بیزەنتییەکان کە هۆزە عەرەبەکانیان بەسەر موسڵمانەکاندا هاندابوو. خۆیان بۆ هەڵکوتانە سەر موسڵمانەکان ئامادە کردبوو و خەڵکیان قەدەغە دەکرد لە چوونە ریز ئاییینی ئیسلام[٥٦]. ئیتر سەرکەوتنەکان بەردەوام بوون و لە ساڵی (١٣ک/٦٣٤ز) ئەبوبەکر کۆچی دوایی کرد.

دوای ئەو عومەری کوڕی خەتاب شوێنی ئەوی گرتەوە. لەسەر پلانەکەی ئەبوبەکر بەردەوام بوو. سەرەنجام شام و عێراق و هەندێ بەشی لە دەوڵەتی ساسانی فەتح کرا[٥٧] لەگەڵ لەشکرەکەدا بانگەوازکارانی ئیسلام ئەم ئایینەیان بڵاو دەکردەوە و ژمارەی موسڵمانەکان پتر دەبوون دوای سەرکەوتنی بە هێزی موسڵمانەکان لە (قادسیە) ساڵی (١٦ک/٦٣٧ز)[٥٨] چوونە ناو پایتەختی ساسانییەکان تەیسەفون "ئەلمەدائن"[٥٩]. دواتر ساسانییەکان هەموو هێزەکانی خۆیان کۆکردەوە لە (جەلەولا) لە هەمان ساڵدا. بەڵام هەوڵدانەکەیان هەرەسی هێنا.

ئیتر موسڵمانەکان لە پێشرەوی خۆیان بەردەوام بوون بەرەو ناوچە کوردنشینەکان. کە لە هەندێ هەرێمی دەوڵەتی ئیسلامی بڵاوبیوونەوە. هەرێمی جەزیرە یەک لەو هەرێمە گەورانەیە کە فەتح کرا ئەوەی کە لێرە بە لامانەوە گرنگە فەتحکردنی شاری (موسڵ)و، ئەوەی دەوروبەریەتی. چونکە (هەولێر) یەک لە شارەکانی دەوروبەریەتی لێرەدا لێکۆڵەر دووچاری رێگری دەبێت لە دەست نیشانکردنی ساڵی گرتنی شاری (هەولێر). ئەو سەرچاوانەی لەبەر دەستماندایە لە سریانییەکان، ئەرمەنییەکان یان ئیسلامییەکان ئاماژە بۆ شاری هەولێر ناکات لە کاتی فەتحکردنی موسڵمانەکان بۆ زانینی ساڵی فەتحکردنی شاری هەولێر دەستنیشانی ناوچەکانی دەوروبەری کرا، کە بەشێک بووە لە موسڵ کە ئەویش مەڵبەندی هەرێمی جەزیرە بوو[٦٠]. ئەوەی کە روویدا لە فەتحکردنی شاری موسڵ بەسەر هەولێریش داهاتووە.

رای جیاواز هەیە سەبارەت بە ساڵی فەتحکردنی ئەم ناوچانە. ئاماژەیان بۆ دەکەین و لە دواییدا هەرە شیاوەکەیان هەڵدەبژێرین. ئیتر کات و سەرکردەی هێرش بردنەکە دەستنیشان دەکەین.

یەکەم: گرتنی موسڵ. لە ساڵی (١٦ک/٦٣٧ز) دوای گرتنی شاری تکریت دێت[٦١]. کە هێزەکانی (رەبعی کوڕی ئەل ئەفکەلی ئەلعەنزی) گەیشت[٦٢] بە هەرێمەکەو رابەرایەتی جەنگەکەی کرد لەم ناوچەیە[٦٣] .

دووەم: هەندێ سەرچاوەی دیکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە موسڵ و دەوروبەری لە ساڵی١٨ک/٩٣٩ز گیراوە لەسەر دەستی (عەیازی کوڕی غەنم)[٦٤]

سێیەم: هیتر وا دەبینن کە ئەبا عوبەیدە عەیازی ئاراستە کردبێت بەرەو جەزیرە[٦٥] بە پێی ئەم بۆچوونە هەموو شارەکانی جەزیرەو هەولێریش یەک لەم شارانە لە سەردەمی (ئەبی عوبەیدە عامر بن ئەلجەراح) گیراوە. کە لە ساڵی ١٨ک/٦٣٩ز مردووە. بەڵام ئەمە لەگەڵ رای زۆربەی مێژوونووسەکان کۆک نییە.

چوارەم: سەرچاوەکانی دیکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن. گرتنی موسڵ ساڵی (٢٠ک/٦٤٠ز) بووە[٦٦]. (عەتبە ئیبن فەرقەد ئەلسەلمی)و بەرەی رۆژهەڵاتی موسڵی گرت دوای شەڕێکی

سەخت لەگەڵ دانیشتوانەکەی. دواتر لە رووباری دیجلە پەڕیەوە بەرەو رۆژ ئاوای شارەکە و لەگەڵ خەڵکەکەی بە مەرجی (جزیە) پێکهات و رێگای بەو کەسانە دا کە شارەکە جێ بهێڵێ[٦٧]. دواتر عەتبە رووی لە باکوور کردووەو بەرەو رۆژهەڵاتی موسڵ کە شوێن پێگەی کوردان بووە[٦٨] لەگەڵ خاکی (حزە). بە رای ئەلعومەری ئەوەیە کە عەیازی کوڕی غەنەم ئەبو موسای ئەشعەری لەگەڵ لەشکرێکی گەورە ناردووە بە مەبەستی گرتنی شورەکانی هەکاری و ئامێدی و ئاکرێ[٦٩].

پتر بڕوا بەوە دەکرێت کە خەلیفە عومەر ساڵی ٢٠ی کۆچی ٦٤٠ی زایینی عوتەیبەی کوڕی فەرقەدی سەلەمی بۆ موسڵ ناردووە بۆ فەتحکردنی، دواتر رووی لە باکوور و رۆژهەڵات کردووە، کە ناوچەیەکی کورد نشین بوو پێیان دەگوت:(معاقل الاكراد) ناوچەکانیان فەتح کرد، یەک لەو ناوچانە لە خاکی حزە (ارض حزة) لێرەدا کە ئەم دەقە بەراورد دەکەین بەگوێرەی ئەم ناوانەی کە لە سەرچاوەکاندا هاتوون رێگای بەرێوەچوونی فتوحات لەناوچەکەدا بەدەر دەکەوێت کە مەبەست لە (ارض حزة)یە، ئەو شوێنەیە کە سەرچاوەکان بە(حەدیاب) ناوی دەبەن، کە مەرکەزی شاری (اربل)، کەواتە مەبەست لە حزە لەسەردەمی فتوحات ناوچە بووە، هەرچەندە ئەگەر ناوی حزە بە شاریش هاتبێ ناوی شارۆچکەی(كفر عزى)هاتووە.

یاقوت ئاماژەی پێدەکات و دەڵێت: (هەولێر قەلایەکی سەختەو شارێکی گەورەیە قەلاکەی بە شوورەیەک دەورە دراوە[٧٠]. بلازەریش کە ئاماژە بۆ کارەکانی (عەتبە) دەکات دەڵێت سەختن. دیارە مەبەستی هەولێرو قەلاکەیەتی. ئەگەری ئەوە هەیە ناوی (حزە) بەسەر ناوی هەولێر کەوتبێت. لە ئەنجامی بارودۆخی سیاسی- ئایینی کە بەسەر ناوچەکەدا هاتووە کە ئایینی مەسیحی (دیان) ئاینی فەرمی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی بووە لەسەدەی چوارەمی زایینی[٧١] هەڵوێستی دەوڵەتی ساسانی بە پلەیەکی بەرز گۆڕا بەرامبەر بە مەسیحییەکانی رۆژهەڵات. چونکە لەو باوەڕەبوون کە ئەوان پشتگیریان دەکەن. بە تایبەتی لە مەڵبەندی شارەکان. شاری هەولێریش یەک لەم شارانە بوو. دەوڵەتی ساسانی هەموو هەوڵی لەوەدابوو کە هەولێر لە ژێر کۆنترۆڵی ئایینی و سیاسی ئەو دابێت.

بۆیە چالاکی مەسیحییەکان پتر لە شارۆچکەیەک بوو بە ناوی (حزە) (كفر عزى) لە نزیک هەولێر. ئەوەی شایەنی باسە کە حزە رۆڵی خۆی هەبووە لە ناوچەکەدا، بەڵام ناوی زیاتر بەسترابوو بە ئایینی مەسیحی، دەگێڕنەوە کە(مار آدی)هەر لە زووەوە ئایینی مەسیحی لە حزەو موسڵ بلاوکردوونەتەوە[٧٢]. حزە ئاوەدان بوو. کارگێڕی و مەڵبەندێکی بازرگانی و شوێنی پەرستگای زەردەشتی و مەسیحی تێدابوو. ژن و پیاوانی مەسیحییان دەهێناو لە حزە دادگایی دەکران لەلایەن دەسەلاتدارانی ساسانییەوە[٧٣]. حزە لە پەرەپێدانی بەردەوام دابوو. لە ساڵی ٦٠٦ز یەکێک بە ناوی کارگێر کە دەسەڵاتی فراوانی هەبوو بەرێوەی دەبرد[٧٤]. گوندی (كفرعەزە)[٧٥] کە بەناوی (كفر عوزيل)یش بانگ دەکرا.

بە هۆی گرنگی بە گوندی ئازادو خانەدانەکان بانگ دەکران[٧٦].

گرنگی حزەی ئایینی لەوەدەهات کە ناوەکەی لەگەڵ ناوی هەولێر وەک مەڵبەندی ئەبریشە دەهات[٧٧] مار داد و گریگۆری کەسکەری و سبریشوع لەم شوێنە دەرچوون. ئەوانە لە شوێنی گرنگی وەک نوسیبەین و مەدائن و موسڵ و کەسکەر هاتوون بۆی.

ئیبن حەوقەل ئاماژە بەوە دەکات کە خەڵکێکی تێدا دەژی لە (شەهاریجە) و شارێکی پڕ بازارە[٧٨]. بە هۆی لێکنزیکی هەولێر و حزە مێژوونووسەکان تێکەڵیان کردوون[٧٩]. ئەوە ئەگەر خودی حزە هەولێر نەبێ کە دەسەڵاتی ساسانی رووی لە لاوازی کرد. شاری هەولێریش گرتەوە. لەبەرامبەر چالاکی مەسیحییەکانی نەگرتەوە. ئیتر رۆڵی پێشەنگیان بینی لە ناوچەکە. کە پێشتر لێیان قەدەغە بوو. ئەو بڕوایە هەیە کە دانووستاندن لە نێوان مەسیحی و موسڵمانە نوێیەکان هەبووە. کە هاتوون بۆ فەتحکردنی. بۆ یە ناوی حزە کە ئەم چالاکییانەی لێکراوە هاتووەو ناوی هەولێر نەهاتووە. ئەم دۆخە (پێشوازیکردن لە موسڵمانەکان لەلایەن موسڵمانەکان) لە رەها (ئۆرفە)و تکریت و دیمەشق و... دووبارە بوو[٨٠].

ئەوەی جێی ئاماژەیە وا باوبوو کە مێژوو نووسە موسڵمانەکان، چۆنیەتی بەرێوەچوونی فتوحات دەکرا لە نووسینەکانیاندا تەنها جەختیان لەسەر ئەو شوێن و جێگایانە دەکرد کە کاریگەرییان لەسەر رێرەوی بەرێوەچوونی فتوحات هەبوو، بە سلبی یا بە ئیجابی، ئەوان زۆر ئاوڕیان لە لایەنەکانی تر نەداوەتەوە، کە گرنگ نەبوون لەو کاتەدا یا دوای ئەوە حزە (عتبە) گردی شەهارجە هاتووە کە کەوتۆتە رۆژئاوایی شاری باجرمی (کەرکوکی ئێستا) (بلاذری) دەڵێ دواتر بۆ باجرمی رۆیشتم و دواتر گەیشتم بە شارەزوور. ورمێ لە بەشێکی (موسڵ)ە. مێژوونووسەکان دەڵێن عەتبە بۆ عومەری نووسیوە کە بە ئازەربایجان گەیشتووم. ئەویش ئەوی کردووە بە والی ئەوێ و والی موسڵ[٨١] بڕوا بەوە دەکرێ ئەوەی هەولێری گرتووە (عەتبە)یە.

ئەم ناوچانەی موسڵ و هەرێمەکانی کوردان وحزە و باجرمی و شارەزوور و ورمێ و ئازربایجان کە فەتحکەران و ساڵی مردنی عومەر (٢٣ک/٦٤٣ز) یەک دەگرنەوە. واتە ساڵی گرتنی هەولێر (٢٠ک/٦٤٠ز= ٢٣ک/٦٤٣ز) یەک لە

لێکۆڵەرەوەکان دەڵێت: هەموو ناوچەکانی رۆژهەڵاتی دیجلە لە ساڵی ٢٠ک/٦٤٠ز لەسەر دەستی عەتبەی کوڕی فەرقەدی سەلما فەتح کراوە(٨٢).

لەگەڵ ئەوەی، کە سەرچاوەکان ئاماژەیان بە چۆنیەتی گرتنی ئەم هەرێمە نەکردووە. بەشەڕ بووە یان بە ئاشتی. بەڵام گرنگترینیان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گرتنی ئەم هەرێمە لە هەمووان ئاسانتر بووە. هەر هەمووی لەسەر دەمی عومەر فەتح کراوە. ئاماژە بەشەرێکی یەکلاکەرەوە نەکراوە. یان کوژرانی سەرکردەیەکی ناسراو لە هەر لە دوو لایەنەکە. لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەیان بە حزە داوە کە دەشتاییە و توانای بەرگری نییە. بێ ئەوەی ئاماژە بە هەولێر بدرێ کە قەڵاو شوورەی هەبووە.

ئەگەر بەراوی رۆڵی پیاوانی ئایینی مەسیحی بکەین لە تکریت و دیمەشق و روها بۆ نموونە، کە دانووستانیان لەگەڵ موسڵمانەکان کردووە، دوایی پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ بەستووەو دەتوانین بگەینە ئەم ئەنجامە کە پیاوانی ئایینی لەناوچەی (حزە) ئەو رۆڵەیان بینیوە. دەتوانین بڵێین پاش ئەوکاتە باسی هیچ رووداوێک نەکراوە کە خەڵکی لە ئایینی ئیسلام هەڵنەگەڕاونەتەوە لەو ساوە. ئەو رایە پەسند دەکات کە ناوچەکە بە شەڕ نەگیراوە و تا ئێستا خەڵکی هەولێر بە پەیام و کرداری ئەم موسڵمانانە بەستراونەتەوە. لەگەڵ ئەوەی کە هەر لە کۆنەوە چەندین شارستانی و هزرو ئاین و خەڵک و داگیرکەرانی بەسەر داهاتووە. کە هەندێکیان چەندین سەدە تیایدا ماونەتەوە لە رۆژهەڵاتی و رۆژئاواییەکان بەڵام نەیانتوانیوە کاریگەرییان هەبێ بەسەریەوە. لەگەڵ ئەوەی کە فاتحە موسڵمانەکان تیایدا نەماونەتەوە چونکە دوای فەتحکردنی شارەکە روویان لەناوچەی شەهارجەو باجرمی و شارەزوور و ئازربایجان کردووە. ئەوەی شایەنی باسە سەبارەت بە گرتنی کوردستان لە نێویاندا هەولێر هەندێ هۆنینەوە هاتووە لە راستی دوورە. کتێبێک بڵاوبۆتەوە لەوانە کە لە فارسییەوە مەلا جەمیلی رۆژ بەیانی وەریگێڕاوە بۆ سەر زمانی کوردی بە ناوی (وڵاتگیری ردشە خاکی عێراق) (فتوح سواد العراق) هەرچی راستی زانستی هەیە لایداوە و پێچەوانەی سەرچاوە ئیسلامییەکانە(٨٣).

ئەو گۆڕانکاریانەی دوای هاتنی ئیسلام بەسەر هەولێر داهات قوڵ و گشتگیر بوون.

بۆیە پێمان وایە بۆ زانینی مێژووی هەرێمەکە، ئەو گۆڕانکارییانەی کە روویداوە لەو سەردەمەدا، پێویستە لەهۆی ئەم گۆڕانکارییانەو چۆنییەتی ئاشنابین، بۆیە وا باشە بەکورتی بگەڕێینەوە سەر بیروبۆچوونی ئەو فاتحانە بە پشت بەستن بەوەی کە لە سەروچاوە ردسەنەکاندا هاتووە، چونکە بەبێ ئەوە لێکدانەوەمان بۆ مێژووی ناوچەکە کەم و کورتی دەبێ، ئەوەی شایانی باسیشە، کە یەک لە هۆکارە هەرە گرنگە لێکدانەوەی مێژوو بە هەڵە ئەوەیە، کە ئێمە بەچاوی ئێستا تەماشای رابردوو دەکەین.

موسڵمانەکان لەسەردەمی فتوحات پێیان وابوو، کە تێروانینێکی ورد، بۆ ئەو بوونەوەرە گەورەیەو ئەوەی تێدا بەدەستمان دەگرێت بۆ ناسینی خوای گەورەو، باوەڕی بە بوونی و تاکو تەنیا، دانانان بەوەی کە ئەو دەسەڵاتدارو، رێنیشاندەرە، هەروەها بە ناوە جوانەکانی خوای گەورە ئاشناکردنە.

بەپێی ئەو گەورەبوون و ناوە رەوشەنانەی کە خوای گەورە هەیەتی لێی ناوەشێنەوە کە مرۆڤ دروستی بکات، توانای چاکەو خراپەی هەبێت، بەبێ ئەوەی، چاکترین رێگای بۆ دیاری دەکات، تاکو دوودڵ نەبێت لە پەیڕەوکردنی، ئەگەر بیەوێت بەخۆشی بژێت. ئەو پێغەمبەرانەش کە هەڵدەبژێردرێن لەلای خوای گەورەو لە هەمان رەگەزی مرۆڤەکانە، بەڵام لە لوتکەی بەرزی رەوشتداران، رێگای راست پەیڕەو دەکەن خەڵکیش بانگهێشت دەکەن بۆ ئەم رێگایە، بۆئەوەی مرۆڤ لەو دنیادا بە کەڵک بێت و شادبێت، لەرۆژی دواییدا سەرفراز بێت، کە ئەو مەبەست و ئامانجە، کە دەبێ مرۆڤ رەنج بکێشێ بۆ بەدەستهێنانی، چونکە مرۆڤ پاش زانینی ئەم پەیامە بەرپرسە لە جێبەجێکردنی، یان خوای گەورە نەبووە [رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزاً حَكِيماً(١١٥)].

ئایینی هەموو پێغەمبەران(د.خ)یەکە، خوای گەورە دەفەرموێ [شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبراهيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلاَ تَتَفَرَّقُوا فِيهِ(١١٦)] ئەویش ئیسلامە، چونکە مانای ئیسلام ئەوەیە، کە مرۆڤ دەبێ تەسلیمی خوای گەورە ببێت، فەرمانەکانی جێبەجێ بکات لە ژیانیدا.

کەواتە فاتیحەکان پێیان وابوو: ئیسلام ئەو ئایینەیە کە جێبەجێ بۆ پێغەمبەران هاتووە، تا تەواو بووە بە دواترین پێغەمبەر محەمەد (صلى الله عليه وسلم)[الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً(١١٧)].

بەڵام پێیان وابوو، چونکە دواترین پێغەمبەر دەبێ بۆ هەموو مرۆڤایەتی بێت، خوای گەورە فەرموویەتی [قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً(١١٨)]. هەروەها فەرموویەتی [مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً(١١٩)]. پێغەمبەریش فەرموویەتی(كُلّ شَيء بُعث الى قومه خاصة وبعثت الى الناس عامة) بەپێی ئەمانە، ئیسلام ئایینی هەموانە، ئایینی ئەوانی سەردەمی پێغەمبەر(د.خ) ئایینی ئەوانیش کە لەدوایی ئەواندا دێت.

پێغەمبەریش(د.خ) بانگەوازی خەڵکی کرد بە فەرمانی

خوای گەورە، کە فەرموویەتی[يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ(١٢١)]. بۆ تاک و کۆمەڵ، تەنها رازی نەبوو بەوەی کە بانگەوازی خەڵکی شاری مەککەو مەدینە و نیمچە دوورگەی عەرەب بکات، بەڵکو نامەو نوێنەری نارد بۆ دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە، لەگەڵ گەلەکانیان بۆئەوەی موسڵمانبن.

لەبەرئەوەش پێغەمبەر دواترین پێغەمبەرە، پاش ئەو(وحی) بۆ کەس نابێت، ناکرێ خەڵک بەبێ بانگەواز گەر بەجێ بمێنێت کەسێک نەبێت راسپێردرابێت بۆئەوەی دوایی پێغەمبەر(د.خ)بانگەوازییەکەی جێبەجێ بکات.

بەڵێ ئەگەر (وحی) برا بە کۆچی پێغەمبەر (صل الله علیه وسلم) بەلام گەورەترین شت کە(وحی)هێنا بۆ ماوەتەوە، ئەویش قورئانی پیرۆزە، کە خوای گەورە بەڵێنی پاراستنی فەرموەوە [إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ(١٢٢)].

فەرمانی خوای گەورە، بۆ پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم)، کە بانگەوازی خەڵک بکات، فەرمانە بۆ شوێن کەوتووەکانی، کە بانگەوازی خەڵک بکەن، بەلام بە چاکترین شێوەو بە زانین، خوای گەورە فەرموویەتی [قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ(١٢٤)].

ئەو راستییانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە بە زەقی ئاشکرایە، کە هەر فەرمانێک بۆ پێغەمبەری فەرمانە بۆ شوێنکەوتووەکانی، دوایی ئەرکی بانگەوازی بۆ ئیسلام خرایە پاڵ یارانی، ئەوانی دوای ئەوانیش دێن تا رۆژی دوایی بە قسەو بە کردار [لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا(١٢٥)].

خلفای راشدی: ابوبکر و عمر و عثمان و علی(ر.خ) کەسانیان دەنارد بۆ هەرێمەکان، بۆئەوەی خەڵک بانگ بکەن بۆ ئیسلام، سەرەڕای بەرپاکردنی دادوەری لەنێو خەڵکدا.

خەلیفە عومەر کە فتوحات لەسەردەمی زۆر بلاوبووەوە، بەو کەسانەی دەگوت کە دەنێردران بۆ فتوحات (ئەمن نێوەم رەوانە نەکردووە، کە ئازاری خەڵک بدەن، بەڵکو لەبەر ئەوەمە کە راستییەکانی ئیسلام فێری خەڵک بکەن، پاشان با ئازاد بن، ببن بە موسڵمان، یان، نا.خوای گەورە دەفەرموێ [وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ(١٢٧)].

لەو کاتەی کە ئیسلام هاتۆتە ناو وڵاتی کوردان و یەک لەم شارانە (هەولێر) لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژووی هەرێمەکە هاتە ئاراوە. لە رووی شارستانییەوە پێشکەوتووە. کە شوێنەوارەکانی دیارە لە گەشەکردنی بەردەوامدایە(٩٢).

**وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:**
**قاسم محەمەد مستەفا**

**سەرچاوەکان:**

١- د. رافدة عبدالله عبدالحمید- کۆنگرەی یەکەمی نێو دەوڵەتی بۆ ئاوەدانکردنەوەی هەولێر ل٨٩
٢- طه باقر وفؤاد سفر- المرشد الى مواطن الاثار والحضارة. المرحلة الخامسة- (بغداد- ١٩٦٦) ص٣. فؤاد جميل- سومر- عدد ٢٥ (١٩٦٩- بغداد) ص٢٢- طه باقر- مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة - (بغداد- ١٩٧٣) ج١- ص٢١٤.
٣- Strabo: The geography-vo/ vp1970
٤- طه باقر، مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة- ج١- ص٥٠٥-٥١٨، مظفر علي الجابري، المؤتمر العلمي الأول لأعمار قلعة أربيل- ص١٠٣
٥- Stab:The geography-vo/vp.1970
٦- طه باقر- مقدمة في حضارات وادي الرافدين بغداد (١٩٥٦) ج٢- ص٤٤٤، فؤاد جميل، مجلة سومر، عدد ٢١ . ص٢٦٩
٧- البلاذري: فتوح. ص١٧٢-١٨١
٨- ابن قتيبة الدينوري- عيون الأخبار، ج١- ص٢١٥- القزويني، آثار البلاد واخبار منها (الأصطخري المسالك والممالك، ص٥٣)
٨- محمد جاسم حمادي، الجزيرة الفراتية والموصل- ص٤٥- فائزة محمد عزة: الكورد في اقليم الجزيرة وشهرزور. ص٢٢.
١٠ ابن قتيبة الدينوري: عيون الأخبار- ج١- ص٢١٤. القزويني: آثار البلاد واخبار العباد. ص ٣٥-
١١- ابن شداد- الاعلاق الخطيرة، ق١- ج٣. ص٤
١٢- الأزدي: تأريخ الموصل- ج٢- ص٣٢-٣٣
١٣- ياقوت: معجم البلدان: ج١ ص١٣٨- الأنصاري- نخبة الدهر- ص١٩٠
١٤- معجم ج٢- ص٢٥٦- ابن عبدالحق، مراصد الاطلاع- ج١- ص٤٠٠
١٥- گوندێکە لە گوندەکانی هەولێر لە نێوان هەولێر و زێی گچکە. ياقوت: معجم: ج٣-ص٥٣٤، ابن حوقل: صورة الارض: ص١٦٩- ص٣١٧. عبدالماجد احمد. السلمان. الموصل- ص١٢٠.
١٦- البلاذري: فتوح. ص٣٢٨، ياقوت: معجم: ج٢. ص٢٧٧. لێکۆڵەر فرسەت مەرعی لەو بڕوایەدایە ئەم ناوە بەسەر گوندی (ریزان)دا دەچەسپێت. کە کەوتۆتە سەر زێی گەورە لە بناری چیای شیرین. خوارووی رۆژهەڵاتی دێی بارزان. ل١٣١.
١٧- ابن خرداذبة: المسالك والممالك ص٩٤ الأزدي: تأريخ الموصل. ج٢ ص٣٣.
١٨- شارەزوور: ناوچەیەکی فراوانە لە کۆمەڵێک چیا پێکهاتووە لە نێوان هەولێر و هەمەدان دانیشتوانەکەی هەموو کوردن.

یاقوت: معجم ج٣- ص٣٧٣
١٩- العمري: منهل الأولياء ج١ ص٥٧.
٢٠- أمثال البلاذري (٢٧٩) الطبري (٣١٠).
٢١- أمثال البلاذري (٢٧٩) الطبري (٣١٠).
٢٢- (د. محسن محمد حسين، د. حكيم احمد مام بكر.م. شوان).
٢٣- باقر: مقدمة. ج٢ ص٤٤٤. فؤاد جميل مجلة سومر. عدد٢١. ص٢٦٩
٢٤- macelliuns.Cit.pp.144-148
٢٥- أدي شير: تأريخ- ج١. ص٣٠
٢٦- بۆ پتر زانیاری لەسەر بڵاوبوونەوەی ئایینی (دیان) نەسرانی لە هەولێر بڕوانە تۆما المرجي- كتاب الرؤساء (الموصل)١٩٦٦ ص٢١- ٢٥٤- مشیخازیا: كرنولوجيا أربيل (اربيل-٢٠٠١) ص١١٩-١٩٤- أدي شير: تأريخ كلدو واشور. ص٢٣-٢٤٠ و هیتر.
٢٧- رشيد خيون: الاديان والمذاهب (لندن- ٢٠٠٥) ص٩.
٢٨- بۆ پتر ئاشنابوون سەیری: كريتنسن: ايران في عهد ساسانين ص ٢٥. دەكرێت.
٢٩- البير: تأريخ ج١. ص٥٠.
٣٠- ادي شير: تأريخ كلدو. مج٢. ص١٩٩-٢٠٤
٣١- سەرۆكی ئەسقەفەكان كە لە شارە گەورەكان دادەنیشت. اغنا طيوس برصوم : اللؤلؤ المنثور. ص٥٠٢.
٣٢- تأريخ كلدو مج٢- ص ٢٠٣
٣٣- ادي شير: تأريخ كلدو/مج٢. ص٢٢٣
٣٤- هەردوو ئیمپراتۆریەتی ساسانی و بیزنتی كەوتبوونە ململانێیەكی دوورو درێژو تاڵ هەر لەسەرەتای دامەزراندنیاندا و تاوەكو نیوەی سەدەی حەوتەمی زاینی. ئەوەی لای ئێمە گرنگە دەیەی كۆتایی سەدەی شەشەم تاوەكو كۆتایی دەیی دووەمی سەدەی حەوتەم (٥٨٩- ٦٣٠ز). دەوڵەتی ساسانی دووچاری شۆڕشێك بۆوە لەسەر دەستی یەک لە سەركردەكانی (بەهرام چۆبین) لە ساڵی (٥٨٩ز). ئەوەی دوایی توانی پاشای ساسانی (كیسرا پەرویز) (٥٩٠-٦٢٨ز) لەسەر كار لاببات كە سەرەنجام ئەوەی دوایی پەنای بۆ ئیمپراتۆری بیزنتی موریس (٥٨٢- ٦٠٢ز) برد. ئەویش لەشكرێكی بەگەر دا و بە هۆی ئەم لەشكرەوە (كیسرا) توانی دەسەڵاتەكەی بگەڕێنێتەوە. پەیوەندی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەت كەش و هەوایەكی باشی بە خۆوە دیت. تاوەكو كوژرانی ئیمپراتۆر موریسی لە ساڵی (٦٠٢ز) بە خۆوە دیت. تاوەكو بە خێرایی پەردە بەسەر ئەم پەیوەندییە باشە دابخات و دەست بە گرنگترین و دوا قۆناغی لە قۆناغەكانی ململانێ لە نێوانیان بكات. ئەوە بوو (كیسرا پەرویز) توانی ئەو هەرێمانەی كە بۆ ئیمپراتۆر (مۆریس)ی واز لێهێنابوو لە ساڵی (٥٩١ز) بیگەڕێنێتەوە هەر لێرەوە نەوەستا بەڵكو لە هەڵكشانەكەی بەردەوام بوو تاوەكو بە لەشكرەكەی گەیشت بە (لیبیا). دوای ئەوەی دەسەڵاتی بەسەر زۆربەی وڵاتی شام و میسر داشكا.

هەروەها توانی گەمارۆی پایتەختی بیزنتی (قستەنتەنییە) بدات.

شكستی ئەم گەمارۆیەی دوایی وای لە ئیمپراتۆری بیزنتی (هەرقەڵ) (٦١٠- ٦٤١ز) كرد هەڵسێت بە هێرشێكی كتوپڕو خێرا. لە سایەیدا توانی بگات بە پایتەختی ساسانی تەیسەفون (مەدائن) كە پێشتر دەسەڵاتی شكا بەسەر كۆشكی (دەستكرد) شوێنی حەوانەوەی پاشای ساسانی. ئەم هێرشەی دوایی شوێن پەنجەی قووڵ و گەورەی لەسەر مێژووی ناوچەكە بەجێهێشت، لەكاتێكدابوو پێشی هێرشەكانی ئیسلامی بوو، لەو شوێنەوارانە لە هەمووی دیار و گرنگتر ئایینی بوو.

ئەویش ڕێبازی نەستوری كە فەرمی و باو بوو لە نێوان نەسرانییەكان لە دەوڵەتی ساسانی. بەڵام یەعقوبی لە دەوروبەری بیزنتی لەسەر سنووری نێوان هەر روو بەرەو فراوانی بكات لە دەوڵەتی ساسانی ئەویش بە هۆی نەمانی ڕێگریییەكان لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی ساسانی و بیزنتی و دواتر بڵاوبوونەوەی یەعقوبی لە دەوڵەتی ساسانی بە خۆوە دیت.

سەرەڕای ئەوەی كە پاشای ساسانی كەوتە ژێر كاریگەری ژنەكەی (شیرین) كە ئەو ڕێبازی یەعقوبی هەڵبژارد بوو.

هەروەها كەوتە ژێر كاریگەری پزیشكەكەی (جوبرائیلی ژەنگاری) كە ئەوەی دوایی توانی ڕێ بگرێت لە دانانی (جاسلیقی نەستۆری) دوای مردنی جاسلیقەكەی دیكە ساڵی (٦٠٩ز). ئەوەو سەرەڕای باڵادەست بوونی (هەرقەل) لەسەر ئەم ناوچانەی دەوروبەر دوای ساڵی (٦٢٨ز) ئەوەش پتر ڕێگای خۆش كرد كە ڕێبازی یەعقوبی لە هەرێمەكەدا تەشەنە بكات. ئەوە بوو كە یەكەم شاندی یەعقوبی لە ئەنتاكیەوە گەیشت بە كنیسەی مارمەتی ساڵی (٦٢٨ز) بە مەبەستی یەكگرتنەوەی ڕێبازە ئایینییەكان بە مەبەستی پتر شارەزا بوون سەیری: بۆتان تۆفیق: الصراع الساساني البيزنطي.
٣٥- سەیری لێكۆڵینەوەكە بكە.
٣٦- سەیری لێكۆڵینەوەكە بكە.
٣٧- لە سەرۆكە بەناوبانگەكان بوو كە بەرگری لە ڕێبازی نەستوری دەكرد و لە پێشی ساڵی (٦٣٠ز) مردووە. دوای ئەوەی بۆ ماوەیەكی زۆر لەسەر كورسی دانیشت: المطران فوليتليه. المرجي: الرؤساء ص٥٠
٣٨- البير: م.ن.ج١- ص١٣٤
٣٩- البير تاريخ.م.ن- ج١- ١٣٢
٤٠- البير.م. ن. تأريخ. ج١- ص١٣٢
٤١- ئەلمرجی دەڵێت پاشاكە (شيرويه) بووە. الرؤساء. ص٥٠ بەڵام ئەردەشێر جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە پاشاكە بوران بووە.

تأريخ السعرتي .ج١. ص
٤٢- سەرەڕای ئەوەی ئەم هەواڵە پێویستی بە سەرچاوەی دیکە هەیە (لێکۆڵەر)
٤٣-البيربون: تأريخ ج١- ص١٤٢-١٤٣
٤٤- وەرگیراوە لە: (رفائيل بابو نيسحاق: مدارس العراق قبل الاسلام ص٥٤-٥٥.)
٤٥- البير: تأريخ ص١٤٣-١٤٤
٤٦- البير: تأريخ ص١٤٤.
٤٧- بە مەبەستی شارەزا بوونی پتر: ابن هشام: السيرة النبوية: ج١- ص٢٢٤-٢٩٧
٤٨- ابن هشام: السيرة النبوية ج٢- ص٥٦-٧٢
٤٩- ابن هشام: السيرة النبوية ج٢- ص٨٠-٨٦
٥٠- ابن هشام: السيرة النبوية ج٢- ص١٠٠-١٠١
٥١- ابن هشام: السيرة النبوية ج٢-ص ١٧٠
٥٢- ابن هشام: السيرة النبوية ج٢- ص٣٦
٥٣- ابن هشام: السيرة النبوية ج٢- ص٢٧٣-٢٧٤
٥٤- ابن هشام: السيرة النبوية ج٤- ص١٩١-١٩٥. ج٤- ص٢٢٥
٥٥- الطبري: تأريخ ج٣- ص٢٤١- ٢٥٣
٥٦- الطبري: تأريخ ج٣- ص٤٢٨
٥٧- الطبري: تأريخ ج٢- ص٤٨٠-٥٧٩
٥٨- البلاذري: فتوح ص٢٥٢. الطبري: تأريخ: ج٢- ص٤٨٠-٥٧٩
٥٩- الطبري: ج٤- ص ١٦- ٢٠
٦٠- بۆ زانینی پتر لەم بابەتە بۆ لێکۆڵینەوەکە بگەڕێوە.
٦١- الطبري- تأريخ. ج٢. ص١٨١. أبن اثير: البداية ج٧- ص٧٢
٦٢- هاوەڵێکی پێغەمبەر (د.خ) بووە. لە شەڕەکانی هەڵگەڕاوەکان و قادسیە و گرتنی مەدائن بەشدار بووە. لە گرتنی شاری تکریت ناوبانگی دەرکردووە بۆ یەکەم جار و هەروەها لە گرتنی شاری موسڵ. سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:. الطبری ج٤. ص٣٧، ابن جوزي: تأريخ ج٢- ص٥٢٤، ابن كثير: البدايه. ج٧. ص٧٤، ابن حجر: الأصابة: ج٢. ص٩٤.
٦٣- ابن الكثير: الكامل في التأريخ. ج٢ . ص٥٤.
ابن الكثير: البداية. ج٧- ص٧٢، فائزة. ص١٠٣، فرست: ص١٢٥.
٦٤- (عەیاز کوڕی غەنەم). یەک لە یاوەرەکانی پێغەمبەر، پێشی حدیبیە موسڵمان، لە داگیرکردنی شام، عێراق بەشدار بووە. لە گرتنی دمشق و حەمس و حەلەب ڕۆڵی هەبووە. لە شام لەساڵی (٢٦ک) مردووە. البلاذري- فتوح البلدان.
٦٥- خليفة بن خياط: كتاب الفتوح. ص١٣٩.
اليعقوبي: تأريخ ج٢- ص١٥٠، فائزة . ص١٦٠.
٦٦- البلاذري: فتوح: ج٢-ص٤٧= ابن الفقيه: مختصر: ص١٣١، ابن الكثير: الكامل: ج٢- ص٥٢٤
٦٧- البلاذري مفتوح: ج٢-ص٤٧. ابن فقيه: مختصر. ص١٣٠- ١٣١
٦٨- البلاذري مفتوح: ج٢-ص٤٧. ابن فقيه: مختصر. ص١٣١
٦٩- منهل الاولياء. ج١. ص٥٧. بەم جۆرە ئیسلام لە ناوچە کوردنشینەکان بڵاو بۆتەوە. کە ئێمڕۆکە ئاکرێ و زێبارو شێخان و ئامێدی و هەولێر دەگرێتەوە. (فائزه: اقليم الجزيره: ص١٠٢-١٠٦)
٧٠- معجم: ج١. ص١٣٨
٧١- محمود سعيد- معالم تأريخ اوروبا في العصور الوسطى بيروت- ١٩٨٦- ص٣٨- ٤٢
٧٢- محمود سعيد- معالم تأريخ اوروبا في العصور الوسطى. ص٣٨-٤٢
٧٣- ماري بن سليمان المجدل: اخبار بطرياك كرسي المشرق في كتاب المجدل (بغداد).
٧٤- بۆ پتر شارەزابوون اردى شير: تأريخ ص١٠٧-١٠٨
٧٥- گوندێکە لە گوندەکانی هەولێر. کەوتۆتە نێوانی هەولێرو زێی بچووک: ياقوت: معجم: ج٤ ص٥٣٤
٧٦- المرجي: الرؤساء: ص١٢٦
٧٧- المرجي: الرؤساء ص٤٧- پەراوێزی(١)
٧٨- ابن حوقل : صورة الارض .ج١ ص٢١٦
٧٩- اردشير: تأريخ ج٢- ص٢٦٦- روفائيل: مدارس العراق ص١٤٧
فؤاد: مجله سومر العدد/٢٣ ص٢١٩.
٨٠- بلازری باسی کردووە. کە دوای حەزە رووی لە (گەردی شەهارجە) کردووەو بۆ باجرمی و دواتر شارەزوور. بەڵام لێکۆڵەر فرسەت مەرعی دەڵێت کەوتۆتە ناوچەی هەولێر. ئیبن حەوقەل دەڵێ شەهارجە نەسرانی بوون. لە كفر حەزە بوون. صورة ارض ج١. ص٢١٦.
٨١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٨٢- سامر بن خماس الصقار: اماره اربل في العصر العباسي و مؤرخها ابن المستوفي. ص٣١..لە فرست مرعى اسماعيل گواستراوەتەوە: الكرد پەراوێزی لاپەڕە ١٤٠.
٨٣- نووسەر لەم کتێبە ئەوە رادەگەیەنێت کە (ئەبا عوبەیدەی جەراح) دوای داگیرکردنی وڵاتی شام. مشتومڕی لەگەڵ هاوەڵەکانی کردووە سەبارەت بەو شوێنەی رووی تێبکەن. پێشنیازی ئەوەیان کردووە راوێژی عومەری کوڕی خەتاب بکەن. لە وەڵامدا عومەر وتوویەتی با ڕوو لە ڕۆژهەڵات بکەن کە وڵاتی کوردانە و بەسەرۆکایەتی خالیدی کوڕی وەلید. بە رابەرایەتی چوار هەزار جەنگاوەر لە نێوانیاندا چەندین لە یاوەرانی پێغەمبەر (د.خ) کە دیان و ئامانجیان شارو گوندەکانی چیاکان

بێت. ئیتر لەشکر لە نەینەوا دوای داگیرکردنی روویان لە هەولێر کرد. ساڵی ٢٥ک. گەمارۆیاندا. حاکمی هەولێر ئەوسا مەسیحی (جاتلیس) ناوێک بوو دانوستاندن سەری نەگرت شەڕێکی خوێناوی روویدا. چەند رۆژێکی خایاند. تیایدا (جاتلیس) کوژرا. هەزار کەسی لەبەرگریکاران لە شاری هەولێر لەشەڕەکەدا لەگەڵ موسڵمانە هێرشبەرەکاندا کوژرا. دواتر شاندێک لە خەڵکی هەولێر لەگەڵ خالد بن ودلید هاتە ناوشاری هەولێرو تاڵانی کردو کەلوپەلەکانی بەسەر ئەسحابەکان دابەش کرد. ئەم باسە بە درێژی لە کتێبەکەی جەمیل رۆژبەیانی (ولاّتگیری رەشەخاکی عێراق) ل٣٠-٣٢ بخوێنەوە. هەروەها مەلا سەلیم رەئوف حەویزی- کوردستان و ئایینی ئیسلام ل١٢+٨٢+٨٤ حەسەن مەحموود حەمە کەریم. کوردستان لەبەردەم فتوحات ل٢١١-٢٥٤

٨٤- النساء: ١٦٥

٨٥- الشورى: ١٣

٨٦- المائدة: ٣

٨٧- الاعراف: ١٥٨

٨٨- الاحزاب: ٢١

٨٩- المائدة : ٦٧

٩٠- الا حزاب: ٢١

٩١- بۆ زیاتر شارەزابوون لە فتوحاتی ئیسلامی لە کوردستان و هۆیەکانی بلاوبوونەوەی لەناو کورددا، بروانە: احمد میرزا میرزا: انتشار الأسلام في كوردستان، دراسة تحليلية، مجلة آداب الرافدين، جامعة الموصل، العدد ٤١/١ "الموصل"، ٢٠٠٥، ص ٣١٩-٣٤٦.

٩٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(روفائيل: مدارس ص١٤٧-١٤٩)

"ألتاريخ الكنسي: ج٢-ص١٢٥).

(البير: تاريخ: ج١-ل١٤٦).

(ماري: ل٦٢، صليبا ل٥٤-٥٥).

(المرج: الرؤساء: ل ١٤٢-١٤٣)

**قائمة المصادر:**

١. القرآن الكريم.

٢. الازدي: الشيخ ابي زكريا يزيد بن محمد (ت ٣٣٤هـ / ٩٤٥م)، تاريخ الموصل، تحقيق الدكتور احمد عبدالله محمد، دار الكتب العلمية، بيروت، ٢٠٠٦.

٣. الانصاري: شمس الدين ابو عبدالله المعروف بشيخ الربوة (ت ٧٢٧هـ/١٣٢٦م)، نخبة الدهر في عجائب البر والبحر، لايبزك، ١٩٢٣، اعاد طبعه مكتبة المثنى، بغداد.

٤. ابن الاثير: عزالدين ابي الحسن علي ابن ابي الكرم الشيباني (ت ٦٣٠هـ/١٢٣٢م)، الكامل في التاريخ، دار الصادر، بيروت ١٩٦٧.

٥. اسد الغابة في معرفة الصحابة، دار الشعب القاهرة ١٩٧٠.

٦. البلاذري: فتوح البلدان، احمد بن يحيى بن جابر (ت ٢٧٩هـ/٨٩٢م).

٧. ابن حجر: شهاب الدين ابي الفضل احمد ابن علي بن حجر العسقلاني (٨٥٢هـ/ ) الاصابة في تميز الصحابة، حقق اصوله و ضبط اعلامه و وضع فهارسه: خليل مأمون شيحة، دار المعرفة، بيروت ٢٠٠٤.

٨. الحنبلي: ابي الفلاح عبدالحي ابن العماد، شذرات الذهب في اخبار من ذهب، (ت ١٠٨٩هـ/١٦٧٨م)، دار احياء التراث العربي، بيروت، د، ت.

٩. ابن خرداذبة: ابي القاسم عبيدالله بن عبيدالله (حدود ٣٠٠هـ/٩١٢م)، المسالك و الممالك، وضع مقدمته وحواشيه و فهارسه: محمد مغزوم، دار احياء التراث العربي، بيروت، ١٩٩٨م.

١٠. خليفة بن خياط (٢٤٠هـ/٨٥٤م)، تاريخ خليفة بن خياط، منشورات وزارة الثقافة و السياحة و الارشاد القومي، دمشق، ١٩٦٨.

١١. الذهبي: شمس الدين محمد بن احمد بن عثمان (ت ٧٤٨هـ/١٣٤٧م)، العبر في خبر من غبر، تحقيق: الدكتور صلاح الدين المنجد، دار المطبوعات و النشر، الكويت، ١٩٦٠.

١٢. ابن سعد: ابو عبدالله محمد ابن سعد (ت ٢٣٠هـ/ ٨٤٥م)، طبقات ابن سعد، دار صادر، بيروت، د، ت.

١٣. ابن شداد: عزالدين محمد بن علي بن ابراهيم (ت ٦٨٤هـ/ ١٢٨٥م)، الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام و الجزيرة - قسم الجزيرة- تحقيق يحيى عمارة منشورات وزارة الثقافة و السياحة و الارشاد القومي، دمشق ١٩٧٨.

١٤. الطبري: ابو جعفر محمد ابن جرير (ت ٣١٠هـ/ ٩٢٢م) تحقيق: محمد ابو الفضل ابراهيم، ط٤، دار المعارف، القاهرة، ١٩٧٩م.

١٥. ابن عبدالحق البغدادي: صفي الدين عبدالمؤمن (ت ٧٣٩هـ/ ١٣٣٨م) مراصد الاطلاع على اسماء الامكنة و البقاع، تحقيق: محمد علي البجاوي، دار احياء الكتب العربية، القاهرة، ١٩٥٥م.

١٦. العمري: محمد امين بن خيرالله الخطيب، منهل الاولياء و مشرف الاصفياء من سادات الموصل الحدباء، نشر و تحقيق سعيد الديوجي، مطبعة الجمهورية، الموصل، ١٩٦٧م.

١٧. ابي عبيد: قاسم بن سلام (ت ٢٢٤هـ/٨٣٨م)، الاموال، مؤسسة ناصر للثقافة، بيروت، ١٩٨١م.

١٨. ابن الفقيه: ابو بكر احمد بن ابراهيم الهمذاني، (ت ٢٩٠هـ/ ٩٠٢م) مختصر كتاب البلدان، مطبعة بريل، ليدن ١٨٨٥م.

١٩. القزويني: زكريا بن محمد محمود (ت ٦٢٨هـ/ ١٢٨٣م)، آثار البلاد و اخبار العباد، دار صادر، بيروت، د.ت.
٢٠. ابن كثير: ابي الفداء الحافظ (ت٧٧٤هـ/١٣٧٢م)، البداية و النهاية، دار الفكر، دط، د، ت.
٢١. المرجي: توما، كتاب الرؤساء، عربه و وضع حواشيه: الاب البير ابونا، المطبعة العصرية، الموصل، ١٩٦٦م.
٢٢. ابو يوسف: يعقوب ابن ابراهيم (ت١٩٢هـ/٨٠٨م)، كتاب الخراج، حقق اصوله و وثق نصوصه: عبدالرؤف سعد و سعد حسن محمد، المكتبة الازهرية للتراث، القاهرة، ١٩٩٩م.
٢٣. اليعقوبي: احمد بن ابي يعقوب واضح (ت ٢٨٤هـ/ ٨٩٥م)، تاريخ اليعقوبي، دار صادر، بيروت، ١٩٦٠م.
٢٤. ابن هشام: ابي محمد عبدالملك (ت٢١٣هـ/٨٢٤م) السيرة النبوية: قدم له وعلق عليه و ضبطها: طه عبدالرؤف سعيد، دار الجيل، بيروت، ١٩٧٥م.
٢٥. ياقوت: شهاب الدين ابي عبدالله الحموي (ت٦٢٦هـ/ ١٢٢٨م)، تحقيق: فريد عبدالعزيز الجندي، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٠م.

**قائمه المراجع:**

١. ادي شير: تاريخ كلدو اشور، مكتب بلند للخدمات الطباعية، اربيل، ٢٠٠٧م.
٢. حمادي: محمد جاسم، الجزيرة الفراتية و الموصل، (١٢٧-٢١٨هـ/٨٢٣-٧٤٤م)، دار الرسالة للطباعة، بغداد، ١٩٧٧م.
٣. حسن محمود حمه كريم، (كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا)، چاپی چوارەم، کۆمپانیای چاپ و پەخشی نوسەر، سلێمانی، ٢٠٠٧م.
٤. خۆشناو: حكيم احمد، الكورد و بلادهم عند البلدانيين و الرحالة المسلمين (٢٣٢-٦٢٦هـ/٨٤٦-١٢٢٩م) دار الزمان للطباعة و النشر و التوزيع، دمشق، ٢٠٠٩م.
٥. الخيون: رشيد، الاديان و المذاهب بالعراق منشورات لسان الصدق، لندن، ٢٠٠٥م.
٦. رافدة عبدالله عبدالصمد: اربيل في المصادر المسمارية، استعراض تاريخي للادوار التاريخية، (بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی رۆشنبیری هەولێر، ٢٠٠٤م).
٧. رافايل بابو اسحاق: مدارس العراق قبل الاسلام، دار الوراق للنشر المحدودة، لندن، ٢٠٠٦م.
٨. طه باقر و فؤاد سفر: المرشد الى مواطن الآثار و الحضارة، المرحلة الخامسة، بغداد، مديرية الفنون و الثقافة الشعبية في وزارة الثقافة و الارشاد، بغداد، ١٩٦٦م.
٩. طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، بغداد، ١٩٥٦م.
١٠. طه باقر: مقدمة في حضارة وادي الرافدين، بغداد، ١٩٥٦م.
١١. عبدالرقيب يوسف، حضارة الدولة الدوستكية، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٨٥م.
١٢. فؤاد جميل: مجلة سومر العدد (٢٥) بغداد، ١٩٦٩م.
١٣. كريستنسن: آرثر، ايران في عهد الساسانين، ترجمة: يحيى الخشاب، القاهرة، ١٩٥٧م.
١٤. مظفر علي الجابري: قلعة اربيل اهمية تاريخية و جمال عمراني، (بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی رۆشنبیری)، هەولێر، ٢٠٠٤م.
١٥. محسن محمد حسين: الدكتور، اربيل في العهد الاتابكي ٥٢٢-٦٣٠هـ/١٢٣٨-١٢٣٣م، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٧٦م.
١٦. مشيخا زخا: كرونولوجيا اربيل، ترجمة و تعليق: عزيز عبدالاحد نباتي، دار اراس للطباعة و النشر، اربيل ٢٠٠١م.
١٧. محمود سعيد عمران: معالم تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨٦م.
١٨. ماري بن سليمان المجدل: اخبار بطاركة كرسي المشرق، بيروت، ١٩٨٦م.
١٩ . مەلاجەمیلی رۆژبەیانی: وڵات گیری رەشە خاکی عیراق (فتوح سواد العراق) چاپی دووەم، بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی روشنبیری هەولێر، ٢٠٠٥م.
٢٠. مەلا رەؤوف سەلیم حەویزی: کوردستان و ئاینی ئیسلام، چاپخانەی جامعە، بغداد، ١٩٧٠م.

**الرسائل والاطاريح الجامعيه:**

١. بوتان توفيق مغديد: الصراع الساساني البيزنطي واثره على بلاد الكورد خلال الحقبة ٥٩٠-٦٣٠م دراسة سياسية حضارية، رسالة ماجستير، كلية الاداب جامعة صلاح الدين ٢٠٠٩م.
٢. فائزة محمد عزة: الكورد في اقليم الجزيرة و شهرزور في صدر الاسلام من (١٦-١٣٢هـ/٦٣٧-٧٤٩م)، دراسة في التاريخ السياسي، رسالة ماجستير، كلية الاداب جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٩١م.
٣. فرست مرعي اسماعيل: الكورد مصادر و معالم تاريخهم في صدر الاسلام، مرحلة الفتوحات ( ١٦-٢١-هـ/٦٣٧-٦٤٢م)، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة الخرطوم، الخرطوم، ١٩٩٧م.

# ئەربیل (هەولێر) لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا

زوبێر بیلال ئیسماعیل

ئەربیل (هەولێر) شارێکی گرنگی مێژووییە، هەر لە کۆنەوە خەڵک لێی نیشتەجێ بووە، لە سەر شێوەی گوندی کشتوکاڵی و ژیانی کۆمەڵایەتی سادە بووە.

لە ناو سەنتەری هەولێر، شوێنەواری هەندێ شوێنی نیشتەجێی کۆن و بەرزایی کۆن هەیە و دەبیندرێ، بۆ نموونە بەرزایی (قالیج ئاغا)، کە دەکەوێتە دووری یەک کیلۆمەتر لە باشووری قەڵای هەولێر، ئەوانە هەمووی بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئەو شارە، هەر لە کۆنەوە خەڵکی لێ نیشتەجێ بووە و شوێنی نیشتەجێی مرۆڤی کۆنە، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (الحجري الحديث -بەردینی نوێ) هەر لەبەر ئەوەش ژیان لە شاری هەولێر بەردەوام بووە، شارێکی تەواو بووە لە سەردەمی سۆمەرییەکان، لە ساڵانی (٢٥٠٠)ی پێش زایینی، فتوحاتی (سەرجونی ئەکەدی -٢٣٧١ -٢٣١٦ پ.ز) گەیشتە ئەو شارە، بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕێگاکانی گەیاندنی کەرستەکان و زخیرە و چەک، کە لە ڕێگای باکوور دەگەیشتە ناوچەکانی باشوور و ناوەڕاست.

لە سەردەمی بنەماڵەی (ئوور)ی سێیەمدا (٢١١٢ - ٢٠٠٤ پ.ز)، چەند هەڵمەتێکی عەسکەری ئامادە و ئاراستە کران، بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەی (ئوربیلوم)، ئەو شارە چەند قۆناغێکی مێژوویی دیوە، کە یەک لە دوای یەک بووە، بەردەوامیش شوێنی نیشتەجێی مرۆڤ و ئاوەدانی بووە.

**گرنگی ئەربیل لە لایانی مێژوویی لەو خاڵانە بەدیاردەکەوێ:**

١- ئەو شارە دەکەوێتە ناوچەیەکی بەپیت و زەوی کشتوکاڵی.

٢- شوێن و جێگای نایابی ئەو شارە، وای کرد بیێتە چەقی ڕێگای کاروانەکان و ویستگەیەکی گرنگ بۆ بازرگانەکان، ئەم شارە دەکەوێتە سەر ڕێگای مێژوویی لە سەردەمی (بابلییەکان) و (نەینەوا)، کە بەرەو (ئارابخا - کەرکوک) لە دواییش بۆ وڵاتی (بابل) دەڕۆیی.

٣-هەرێمی ئەربیل، کە بەشێکی زۆری وڵاتی ئاشووری پێکدەینا، پاشان، شوێن و جێگای ئەو شارە، کە دەکەوێتە ناوەندی دەشتاییەکی بە پیت و زەوی کشتوکاڵی گرنگ و سەرەکی، وای کرد بیێتە یەکێک لەشارە سەرەکییەکان، لە سەردەمە کۆنەکاندا، کە گرنگییەکی تایبەتی وەرگرت لە سەردەمی ئاشوورییەکان، تا گەیشتە ئاستی شارە سەرەکییەکان: (ئاشوور، نەینەوا، کالح)، بەتایبەتی سەردەمی ئاشوورییەکان (٢٠٠٠-١٤٠٠ پ.ز).

٤- لە گەڵ پێشکەوتنی شارستانی و ئاوەدانی ئەو شارە، ئەربیل (هەولێر) یەکێک بووە لە بنکەکانی عەسکەری، بەتایبەتی بۆ بەڕێکردنی هەڵمەتە عەسکەرییەکان بەرەو ناوچەکانی ڕۆژهەڵات (چیاکانی زاگرۆس).

٥- هەولێر ناوەندێکی گرنگ بووە بۆ عیبادەت کردنی (خواوەندی عەشتار) هەروەها مەعبەدەکەی کە بە ناوی (بيت سيدة للاقليم) بووە، ناوەندێک بووە، بۆ گەشبینی (فاڵ) وەکو (دلنوس)ی یۆنانی، هەروەها، مەعبەدی خواوەندی ئاشووری تێدابووە، لە دواییش ئەو شارە پایتەختێکی ئایینی بووە بۆ ئاشوورییەکان.

٦- لە بەر ئەوەی ناوچەی ئەربیل دەوڵەمەندە بە ناوی ژێرزەوی و کاریزەکانی، کە ژمارەیان زۆرە، ئەویش شتێکی باش بوو بۆ بەردەوامبوونی ژیان لەو شارەدا، داگیرکەرانی ئەو شارە نەیانتوانی ئەو (کاریزانە) تێک بدەن، هەروەکو کەناڵەکانی ئاودان لە بابل و شارەکانی دیکەی باشووریان تێکدا.

شاری ئەربیل، جێگایەکی گرنگی هەبووە لە مێژووی کۆندا، یەکێک بووە لە ناوەندەکانی سەرەکی (گوتییەکان) لە کوردستان، دوای نەمانی دەوڵەتەکەیان لە باشوور، چەند دەوڵەتێکی شارییان پێکهێنا، ئەربیل (دەوڵەتی شار) بووە لە سەردەمی بنەماڵەی (ئووری سێیەم)دا، لەگەڵ ئەوەی (شولکی) کە یەکێک بووە لە پاشاکانی ئەو بنەماڵەیە، (ئەربیل)ی داگیر کرد، بەڵام بە تەواوی سەری نەنواند بۆ سۆمەرییەکان، لە بەر ئەوەی زۆر زەحمەت بووە، لەگەڵ ئەو هەموو هەڵمەتە یەک لە دوای یەکەی بۆ سەر ئەو شارە.

لە سەردەمی هەموو پاشاکانی ئاشووریدا، ئەربیل کرابووە پایتەختی مەلیکەکانی دەسەڵاتدار و بە بەردەوامی پایتەختی ئایینی بووە، کورسی دووەمی (خوداوەند عەشتار) کە بە: عەشتار ئەربیلا) ناسراو بووە، سەرچاوەی سەرکەوتن بووە لە

شەرو جەنگەکان، پاڵپشتی هەموو جەنگاوەران بووە، پاشاکانی ئاشووری وەکو (حەج و حەجاج) دەچوونە ئەو مەعبەدانە، بەتایبەتی لە کاتی ئەنجامدانی هەڵمەتێک لە هەڵمەتەکانی عەسکەری، ئەربیل، بە بەردەوامی جێگای بایەخدان و چاودێری پاشاکانی ئاشووری بووە لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا.

سەنحاریب (٧٠٥ -٦٨١ )، کەناڵێکی دروست کرد بۆ ئاودانی شارەکە، درێژییەکەی (٢٠) کم بووە، لە دوڵی (بەستۆرە) ئاوی بۆ هێنا، ئەو کەناڵە کونێکی هەیە لە لای گوندی (قەلا مورتکە)، دیواربەندێک وەکو چوارچێوەی بەردی، بە نووسینی مێخی نەخش کرابوو، بەلام بەداخەوە، پێش چەند ساڵێک، لە لای چەند دزێکی شوێنەواری لە کوردستان، لە میانی هەڵمەتێکی نائەخلاقی و نامرۆڤایەتی، ئەو پارچە بەردە نەخشەدارە دزرا، ئەو دزانە چەند پارچە شوێنەوارێکی کوردستانیان دزی، کە نرخیان بە هیچ شێوەیەک تەقدیر ناکرێ، لە وانە (مەسەلەی کێلە شین) کە لە لای دەربەندێک لە ناوچەی برادۆست داندرابوو، ئەربیل لە کاتی داگیر کردنی بە دەستی (میدییەکان) بە سەلامەتی مایەوە و کاول نەکرا، لێرەدا نابێ ئەوە لە بیر بکەین، کە پیرۆزی ئەوشارە، پاڵپشت و بەربەستێک بووە لە کاتی هەڵمەتەکانی داگیرکردن و تێکدان، ئەربیل لە سەردەمی (فرثی -الاشکانی ١٢٦-پ.ز -٢٢٦ ز) بووە پایتەختی مەملەکەتی (حدیاب)، بە مانای مەملەکەتی نێوان دوو زێیەکە، هەندێ جار دەسەڵاتیان فراوان دەبوو، هەتا دەگەیشتە (فورات) لە رۆژئاوا و (نصیبین) لە باکوور دا، پاشای (حدیاب) لە پاشا ناسراوەکانی مەملەکەتی (فرثی) بووە.

لەو سەردەمەدا، ئەربیل تووشی هێرشی (ئەرمەن) و (رۆمانەکان) بووە، بەلام لە سەردەمی (ساسانییەکان) ٢٢٦-٦٣٧.ز)، ئەربیل پارێزگاری لە گرنگی سیاسی خۆی کردووە، وەکو پایتەختی (ئایالە حدیاب)، (مرزبان) حوکمی دەکرد، کە نازناوی (مەلیکی) هەبوو، (ئەردەشیر) حاکمی (حدیاب) بووە، پێش ئەوەی بچێتە سەر عەرشی (ئێران)، ئەویش لە سەردەمی برایەکەی (شاپووری دووەم) ٣٠٩-٣٧٩ ز)، (شاپوور) (مەسیحییەکان) لە وڵاتەکەی، دەچەوساندەوە ئەو چەوساندنەوە، بە شێوەیەکی گشتی بوو و هەموو لایەنگرانی مەسیحییەکانی گرتەوە و لە ساڵی (٣٣٩) دەستی پێ کرد هەتا ساڵی ٣٧٩ ز)، هەر لەو ساڵەش کۆچی دوایی کرد، کە بۆ ماوەی (٤٠) ساڵ بەردەوام بوو، لە ساڵی (٣٤٣) چەوساندنەوەی لە ولایەتی (کرمای -کەرکوک) و (حدیاب) دەستی پێ کرد، وا پێدەچێ هەبوونی (شاپوور) لێرە بۆ شەڕ کردن و دژایەتی (رۆمەکان) بووە، (ئەردەشیر) برای (شاپوور)، کە مەلیکی حدیاب بووە، سەرپەرشتی هەموو سەربازەکانی ناوچەکەی دەکرد، ژمارەیەکی زۆری لە (مەسیحییەکان)ی ئەو دوو ویلایەتە کوشت، ئەو رووداوانەش، ئەوە تەئکید دەکاتەوە، کە (ئەردەشیری دووەم) حاکمی حدیاب، (مەسیحییەکانی) خۆش نەدەویست و رقی لێ دەبوونەوە. لە ساڵی (٢٥٩ ز)، (قەرداخ) بووە حاکمی حدیاب و دەسەڵاتی فراوان بووە، هەر لە زێی (دیالا) هەتا شاری (نصیبین)، وازی لە ئایینی (مەجووسی) هێنا و بووە (مەسیحی -نصرانی)، بەلام (ساسانییەکان) لە هەمان ساڵ کوشتیان.

(ئەربیل) یەکێکە لە لانەکانی (مەسیحییەکانی رۆژهەڵات)، مەتران (بقیدا متروبولید) بەرپرسیارێتی ئایینی لە ئەربیل ساڵی (٩٦ -١١٤ ز) وەرگرت، لە ساڵی (٢٠٠) - جاثلیق فانا (پاپا) ی ئەربیل، بۆ پایەی (مەترانی) بەرز کرایەوە، (موسڵ) یش لەو کاتەدا (ئەسقوفیەک)ی سەر بە ئەربیل بووە، لە کۆتاییەکانی سەردەمی ساسانییەکان، ململانێی نێوان (فارسەکان-ئێرانییەکان) و (رۆمانەکان) نوێ بووەوە، (فارسەکان) هێرشیان کردە سەر (ئاسیای بچووک) و (دیمشق) و(قدس) و (ئەسکەندەرییە) لە میسر، لەو ساڵەدا (٦١٥ ز) هێزی (کیسرا) گەیشتە (لووتکە)، بەلام (هرقل) مەلیکی (رۆمەکان)، هێرش و پێشڕەوی ئێرانی راگرت و (ئاسیای بچووک)ی گەڕاندەوە و بە دوای سوپای (کیسرا) کەوت لە (ئەرمینیا) و (ئازەربێجان)، هەروەها (ئەربیل و کەرکووک)ی لە ساڵانی (٦٢٣ -٦٢٤ ز) داگیرکرد

لە ساڵی (٦٢٥ ز) حوکمی رۆمانی (بیزانتی) توندو جێگیر بوو لەو جێگایانەدا، بەلام (فارسەکان) بەو داگیرکردنە رازی نەبوون، بۆیە و لەبەر بەردەوامبوونی شەڕی خوێناوی، ناوچەکە تووشی کاولکاری و تێکدان بوو، لە دواییش شەڕی ناوخۆیی لە سەر دەسەڵات لە دەوڵەتی ساسانی روویدا، (شارەزوور) یش هەر لە ژێر حوکمی رۆمانییەکان مایەوە، لە بەر ئەوەی (هرقل)، کە بە دوای (ئەبروز) کەوتبوو لە رێگای ئەو هەرێمە، لە بەر ئەوەش، ئەربیل بە هۆی بەردەوامبوونی ئەو شەڕە خوێناوییانە تووشی ناخۆشی و کاولکاری و تێکدان بوو، لەو کاتەش، موسڵمانان دەهاتنە پێش لە هەڵمەتی فەتحی (عێراق)، دوای سەرکەوتنیان بەسەر (فارسەکان) لە شەڕی (قادسیە)، لە دوای فەتحی (المدائن -تیسفون)، لە دواییش سەرکەوتنەکانی موسڵمانان بەردەوام بوو و دەوڵەتی (ساسان)یان نەهێشت و دەوڵەتی (رۆمان) یەکانیان هەتا حەدێکی زۆر لاواز کرد، ئەربیل جێگا و پایەیەکی دیکەی لە ژێر حوکمی ئیسلام هەبوو.

**فەتحی ئیسلامی لە ئەربیل**

لەگەڵ ئەوەی ئەربیل کەوتبووە رێگای بازرگانی (کانزاکان و دار)، کە لە باکوورەوە دەهات بۆ باشوور، هەروەها وێستگەیەکی ئابووری لەوەتەی سەردەمی ئەکەدی، لەوانەشە

پێش ئەو سەردەمەش، هەروەها (دەوڵەتی شار) لە هەزارەی دووی پێش زایینی و پایتەختی ئایینی ئاشوورییەکان و پایتەختی مەملەکەتی حدیاب لە سەردەمی (فرسییەکان) و ناوەندی ناوچە یان ولایە لە سەردەمی ساسانییەکان، بەڵام ناوی لە فەتحی ئیسلامیدا نەهاتووە، لەوانەیە هۆیەکەی بۆ کاولبوونی ئاوەدانی و شارستانی و سیاسی، دوای جەنگی بەردەوامی (فارسی -رۆمانی) تێکدەر، ناوی (شارەزوور) بەدیار کەوت، وەکو، ولایەت لەو کاتەدا، شارەزوور (کورە - مقاطعة) یەکی فراوان بووە لە ناوچە شاخاوییەکانی نێوان ئەربیل و هەمەدان، شارەزوور ناوی شارێکی بچووکە و خەڵکەکەی کوردن، (ابن حوقل) بەو شێوە باسی دەکات: (شاری خۆش گوزەرانییە و زۆر بە پیتە)، شارەزووری ئەمڕۆ، شاری (خورماڵە) بە زۆری، (یاقوت الحموی) دەڵێ: (شارەزوور، شارێکی گەورەیە و پێی دەڵێن (نیم راە)، مانای ئەو وشەیە بە فارسی (نیوەی رێگا)، ئەوە تەئکیدە لە سەر ئەوەی دەکەوێتە ناوەراستی رێگای نێوان (تیسفون) و سەنتەری عیبادەتی ئاگر لە (شینز) کە دەکەوێتە (ئازەربێجانی ئێرانی)، لەو جێگایەی کە پێی دەڵێن (تحل عنبر) لەوانەیە تەحریف کردنی وشەی (خورماڵ)ە، ناوی شارەزوور لە مێژووەکانی کەنیسەی (النسطوري) هاتووە، بەتایبەتی هەواڵەکانی ساڵی (٥٥٤) و ساڵی (٦٠٥)، هەروەها ئیمپراتۆری بیزنتی (هرقل) لە لای شاری شارەزوور تێپەڕیوە، ئەویش لە کاتی هەڵمەتی سێیەم بۆ سەر وڵاتی (فارس) لە ساڵی (٦٢٨)، کە تیایدا هەموو شارو شارۆچکەکانی تێکدا و سووتاندی.

ناوی ئەربیل لە سەردەمی ئیسلامیدا نەهاتووە، مەگەر لە کۆتاییەکانی دەوڵەتی عەباسی نەبێ، (الطبری) لە مێژووە گەورەکەی: (تاریخ الرسل و الملوک)دا، ناوی ئەربیلی نەهێناوە، هەروەها (البلاذری) لە (فتوح البلدان) ناوی نەهێناوە، بەڵام باسی فەتحی (شارەزوور) و شارەکانی دیکەی کردووە، بەتایبەتی ئەو شارانەی نزیکی شارەزوور بوون، وا پێدەچی (ئەربیل) دوای تێکدانی و کاولکردنی لە سەردەمی (فارسی -رۆمانی) جێگا و پایەی کەم بووە و تووشی لاوازی و کەمبوونەوەی ئاستی ئاوەدانی و شارستانی بووبێ، هەروەها باسی ئەربیل لە لای زانایانی جوگرافیای ئیسلامیش نەکراوە، مەگەر (خردازبە)، نەبێ لە سەدەی سێیەمی کۆچی دا و (ابن قدامە)ش، ئەو دووانە ناویان هێناوە، لە کاتی باسکردنی دابەشکردنی عێراق (السواد)، بەوەی (طسوج استان - (ناحیە) اقلیم حلوان یان کورە حلوان فی السواد، کورە حلوان خستبوویانە سەر (اعمال العراق) لە دوایش خرایە سەر (اعمال الجبل)، ئەربیل کەوتبووە میانی ناوچەی -الجبال - (کوردستان)، لە دوایی بووە تابعی -(هەرێمی جەزیرە - (موسل) لە لایەنی ئیداریدا، هەروەها (شارەزوور و سامغان و دراباذ، هەتا ئەو کاتەی کە لە یەک جیا کرانەوە لە کۆتاییەکانی خەلافەتی (الرشید) لە (اعمال الموصل) جیا بوونەوە. لە سەر دەمی (مەئموون)دا، ئەربیل خرایە میانی (هەرێمی جەزیرە)، (بلدانیەی عەرەبەکان) بە (حدیاب)، یان دەگوت (حزە)، ئەربیل قەسەبەی ئەو هەرێمە بووە. وشەی حدیاب لە وشەی (ئەدیابین) تەحریف کرابوو، (ابن الحوقل) ئاماژە بە کەوتنی هەولێر دەکات لە میانی (هەرێمی جەزیرە) یان (موسل)، (ابن حوقل) دەڵێ: (موسل ناوچەیەکی فراوانە و چەند (رساتیق) و تاکەکەی (رستاقە) بە مانای ناوچە دێت، رستاق بە (کورە) دەچێت، (کورە) چەند گوند و خەڵکی زۆری تێدایە، (ئەمەنەوا) ش لە میانی ئەو رستاقەیە، هەروەها لە تەنیشت ئەو رستاقەش (رستاق المرج) و (ارض حزة) هەیە، کە ئەوەش هەرێمە و شاری (کفر عزی) تێدایە، قەومی (الشهارجە نصاری) تێدا دەژیا، لەو کتێبەی (ابن حوقل) وادیارە کە شارەکانی (الراجە) و (حبتون) و (کفری) و (ئەربل) لەو شارانە بوون، کە دەکەوتنە نێوان دوو زێیەکە، (ابن حوقل) بەو شێوە وەسفی ناوچەکەی کرد: (لە نێوان دوو زێیەکە (لەوەڕگا) و زەوی کشتوکاڵی زۆر هەیە و دانیشتوانی ئەو ناوچانە چاکن و لە کاتی وەرزی زستانیش، کوردەکانی هەزبانی تیایدا دەژین، هەروەها، هاوینەهەواری (بەنی شیبان) بووە.

وا پێدەچێ لەو قسانە، کە ئەربیل و هەرێمەکەی، تووشی هەژاندنی سیاسی و شەڕی خوێناوی بوون، لەو کاتانەی نێوان کۆتاییەکانی سەردەمی ساسانی و فەتحی ئیسلامی، لەوانەش، ئەوەی (هرقل)ی مەلیکی رۆم سەرکردایەتی دەکرد دژی ساسانییەکان و چووە ناو وڵاتیان، شارەکانی (ئەربیل و کەرکووک و شارەزوور) شانۆ و جێگای هەندێ لەو شەڕانە بوون.

ئەربیل هەر ئەوها مایەوە و زۆر بەکەمی ناوی دەهات، هەتا سەردتایەکانی (سەدەی پێنجەمی کۆچی)، لە دوایش بە دیارترین و گرنگترین شار بەدیارکەوت لە هەرێمی: نێوان دوو زێی گەورە و بچووک، هەروەها بنکەو چەقێک بۆ میرنشینی هەزبانی کوردی، کە لە نێوان ساڵانی (٥٢٢ ک / ١١٢٨ز) فەرمانڕەوابییان دەکرد، دوای ماوەیەک و لە هەردوو سەدەی (٧) و (٦) دا بووە بنکەی وڵاتی شارەزوور، هەروەها بووە یەکێک لە شارە گرنگەکانی ئیسلامی لە لایەنی (رۆشنبیری) و (ئاوەدان) کردنەوە، هەروەها کرایە پایتەختی میرنشینی (ال بکتکین) یان (ئەتا بیکییەکانی ئەربیل)، ئەوەی شیاوی باسە: (عیمادەدینی زەنگی) فەتحی ئەربیلی لە رەمەزانی ساڵی (٥٢٢ک) کرد و یەکێک لە میرەکانی دەوڵەتەکەی کە (زەینەدین عەلی کوچک بن بەکتکین بن محەمەد) دامەزرێنەری میرنشینی ئەربیلی ئەتابیکی، بووە میری ئەو میرنشینە، لە

سەردەمی کوڕەکەی (ئەبوو سەعید گۆگبری)، کە بە (الملک المعظم مظفر الدین -٥٨٦ - ٦٣٠ ک) ناسراو بوو، لەو سەردەمەدا، ئەربیل ناوبانگێکی زۆری هەبوو و پێشکەوتنی لە لایەنی رۆشنبیری و ئاوەدانکردنەوە بە خۆیەوە بینی.

**فەتحی ئەربیل**

(بلاذري) دەڵێ: (غزرة ابن قیس) هەوڵی فەتحکردنی شارەزووری دا، کە والی (حلوان) یش بووە لە کاتی خەلافەتی (عومەر)دا، بەڵام (عتبە بن فرقد السلمي) هێرشی کردە سەر ئەو شارە و فەتحی کرد، دوای ساڵێک، سوڵحی حلوانی گرتدا، بەوەی وازیان لێ بێنێ و ماڵ و سەریان بە ئەمانی بمێنێتەوە، دەڵێن لەو کاتانەدا، هەندێ (دووپشک) پەیدا بوون، هەر لەگەڵ پێوەدانی مرۆڤێک، ئەوە یەکسەر دەمرد، لەبارەی (سوڵحی حلوان -(ناوچەی -زەهاو) دەڵێن: موسڵمانان (جزیە)یان فەرز کردە سەر ئەو هەرێمە، ئەویش دوای ردتکردنەوەی داوای چوونە ناو ئایینی ئیسلام، کاتێک (عتبة بن فرقد) میرنشینی موسڵی وەرگرت، یەکسەر دەستی بە فەتحکردنی ئەو ناوچانە کرد، کە نزیکی ئەو ناوچانە بوون، لەوانە: (شارەزوور و صامغان و دراباز)، (عوتبە) لە ساڵی (٢٢ک) شەڕی لەگەڵ کوردەکان کرد و خەڵکێکی زۆری لێ کوشتن، دوای تەواوکردنی ئەو (فەتحە) نووسراوێکی نووسی بۆ (عومەری کوڕی خەتاب) و دەڵێ: (من لە فەتحەکاندا، گەیشتمە ئازەربێجان)، هەر لەبەرئەوەش کردییە والی ئەو ناوچەیە و (هدثمە کوڕی عرفجە) ش بووە والی (موسڵ)، شارەزوور یەکێک بووە لە ناوچەکانی (موسڵ) هەتا ئەو رۆژەی لێ جیاواز بۆوە، ئەویش لە کۆتایی خەلافەتی (رەشید)، ئەوەی شیاوی باسە: (عوتبە) سوڵحی لەگەڵ خەڵکی (الصامغان) کرد و (دراباز) بەرامبەر بە دانی (باج و سەرانە)، بەرامبەر ئەوەش (کەس نەیان کوژێ و خوێنیان نەڕژێنێ و کەس ڕێگایان لێ نەگرێ، (عوتبەی کوڕی فەرقەد) لەو کاتەی بووە (والی موسڵ) توانی فەتحی هەموو ناوچەکانی باکووری عێراق بکات، هەتا سنووری (عێراق -تورکی -ئێرانی)، لەوانەش: (زاخۆ و ئامێدی و دهۆک و ئاکرێ) هەروەها هەردوو شاری (ئەربیل و سلێمانی)، هەروەها زۆرینەی ناوچەکانی (ئازەربێجانی) فەتح کرد، کە دەکەوێتە ناو ئێران و نزیکی سنووری عێراقی -ئێرانی -تورکیا.

بەوەش ناوچەی ئەربیل و ئەو ناوچانەی دەکەونە دەوروپشتی، کە لە ناوچەکانی (کوردستانی عێراقن) دوای ماوەیێکی درەنگتر کەوتنە ژێر حوکمی ئیسلامی، لە بەر ئەوەی (هرقل) مەلیکی رۆم لە ساڵی (٢٥ ک)، بەرەو وڵاتی فارس کشاو شارەکانی (ئەربیل و کەرکوک و شارەزوور)ی داگیر کرد، ئەو ناوچانە، هەر لە ژێر دەستی رۆمەکان مانەوە، هەتا ئەو کاتەی رووبەڕووی رۆمەکان بوونەوە، لەو شەڕەدا (عەبدوڵڵای کوڕی وعتەم) و (رەبعی کوڕی ئەفل) و (عرفجة بن هدثمة) سەرکردایەتی موسڵمانانیان دەکرد.

وا پێدەچێ، کە هەواڵەکانی فەتحی کوردستان، هەروەها (یەهود) و (نصاری) کە (باج و سەرانە)یان لە سەر فەرز کرا، لەبەرئەوەی سوپای فەتحی ئیسلامی و دوای شەڕێکی توند، (باج و سەرانە)یان فەرز کردە سەر پەیڕەوکەرانی ئایینەکانی دیکە، لە وانەش: (مەجوس) و (زەردەشتییەکان)، بەتایبەتی ئەوانەی نەچوونە ناو ئایینی ئیسلام و مامەڵەی (اهل الکتاب)یان لە گەڵیان کرد، چیرۆکێکی ئیسلامی هەیە لەبارەی وتەیەکی (عومەری کوڕی خەتاب)، کە تیایدا ئەمر دەکاتە سەر سەرکردەکانی ئیسلامی بۆ ئەوەی مامەڵەی (اهل الکتاب)یان لە گەڵ بکەن و گوتی: (سنوا بهم سنة اهل الکتاب)، لەو شەڕانەی فەتحی کوردستان، ژمارەیەکی زۆری سوپای ئیسلام کوژران، بۆ نموونە لە ئەربیل، چەند گۆڕێک هەیە لە لای (کارێزی میری باکوور)، کە لەوانەیە بۆ یەکێک لەو هاوەڵانەی ئیسلامی بگەڕێتەوە، بەڵام ناوچەی (کۆیە) گۆڕێکی زۆری تێدایە، کە بۆ هاوەڵەکان دەگەڕێتەوە، ئەو دیاردەیە لە زۆری ناوچەکانی کوردستان هەیە، بەڵام ئەوانەی چوونە ناو ئیسلام، هەر وەکو زۆرینەی خەڵکی کوردستان ئیسلامی خۆیان ڕاگەیاند، لە بەر ئەوەش (وڵاتی کورد) بووە یەکێک لە قەڵاکانی ئیسلام و بەشداریان کرد لە دەوڵەمەندکردنی رۆشنبیری عەرەبی ئیسلامی و زانستە ئیسلامییەکان، لەبەرئەوەش زۆر غەریب نییە، کە قوتابخانەی ئایینی ئیسلامی لە کوردستان ببیندرێ.

**تێبینی:** زۆر مێژوونووس تا ئێستاش وشەی (فارس) بۆ (ساسانی)یەکان و (وڵاتی فارس) بۆ (ئێران) و (مەجوس) بۆ ئایینی زەردەشت بەکاردێنن، لەڕاستیدا ناکرێ بە ساسانییەکان بگوترێ فارس! چونکە ساسانییەکان بنەماڵەیەکی کوردن و هەر لە زووەوە ئەوە سەلمێندراوە، هەروەها (وڵاتی ئێران) ڕاستترە لەوڵاتی فارس ئەگەر مەبەست هەموو ئێران بێت، چونکە (وڵاتی فارس) بەشێکی بچووکی هەموو ئێران بووە، دیسان وشەی (مەجوس) بۆ ئایینی زەردەشت ڕاست نییە، ئەگەر لە مەجوس مەبەست (ئاگر پەرست بێ!) چونکە زەردەشتییەکان ئاگریان لا پیرۆز بووە، وەک ئەوەی هەر ئایینێک پیرۆزی خۆی هەیە، چۆن (بەردەڕەش) لای موسڵمانان پیرۆزە. جا زەردەشتییەکانیش ئاگریان لا پیرۆزە، نەک دەیپەرستن.

**لیژنەی باڵای ئینسکلۆپیدیا**

**و. نەجات خۆشناو**

# هاتنی ئیسلام بۆ هەولێر

## تاهیر ئەحمەد حەوێزی

دەستەیەک عەرەبی موسڵمان لە قوڵی (موسل)ەوە بەسەر هەولێرێدا دێنە وڵاتی کۆیە و هەندێ گوندی[1] ئەم ناوەی تاڵان دەکەن، دانیشتوانی ئەم ناوە لێیان دەردەپەڕن و دەبێتە شەڕ، عەرەبەکان لە دەوروبەری ساڵی (٢١ک) وردە وردە دێنە پێش، (میگای کوڕی صنعا)ش، کە گەورەی شاری (هەرمۆتە)[2]ی دەبێ، بەرامبەر بە موسڵمانەکان دەستوەکەرییەکی باش دەکا، بەڵام لە ئەنجامدا دەکوژرێ و (هەرمۆتە)ش دەگرن، کە شارێکی بێ شوورە و پڕ لە کۆشک و باڵەخانە و پەنجەرەی شووشەداری هەبووە، شارەکەی لەگەڵ خاک یەکسان دەکەن، ئەوجا بە شەڕە شیر شاری (کۆهسار)یش دەگرن، دووریش نییە (کۆیە)ی ئێستا (کۆهسار)ی ئەو سەردەمی بووبێ، ئەوجا لەپاش گرتنی (کۆهسار) هەندێکیان بەرێگای (هەیبەت سوڵتان) روودەکەنە (میرزا رۆستەم) لەوێوە دەچنە وڵاتی (مەرگە و پشدەر)، هەندێکیشیان بەرێگای (فەقێیان و باواجی) روودەکەنە (ئیسماعیل قولی، دۆڵی سماقولی) وڵاتی (خۆشناو)، لە (دۆڵی ئەسحابان)یش لە موسڵمانەکان و خۆجێییەکان زۆر دەکوژرێن[3]. (نابێ وا تێبگەین کە ناوی - فەقێیان و ئیسماعیل قولی و دۆڵی ئەسحابان پێش هاتنی عەرەبە موسڵمانەکانەبوون، ئەو ناوانە لەگەڵ هاتن و دوایی هاتنی ئەوان پەیدا بوونە)، وەک وڵاتەکانی تر (کۆیە)ش کەوتە دەست (خەلیفەی راشدین) لە پاشان (دەوڵەتی ئومەوی لە شام) لە پاشان کەوتۆتە دەست (عەباسی)یەکان. رۆستەم دەڵێ: کۆیە و هەرمۆتە لە کاتی شەڕی (ئەسحابان)، سەر بە پاشای (سەروچاوە) بووین، جارجار بە خەڵقی (سماقولی) دەڵێن: (ئەسحابەکوژ).

لە ساڵی (١١٢ک - ٧٣٠ز) وڵاتی کوردستان لەلایەن (خزەر)ەکانەوە تووشی وێرانی بووە. لە دەوری خەلافەتی (أبو العباس عبدالله السفاح)ئەبوو جەعفەر مەنسوور والی بووە لەسەر (جزیرە و کوردستان و ئازەربایجان). خەلیفە (مەهدی) لەپاش غەزای وڵاتی رۆم و (بێزەنتییە)کان لە ساڵی ١٦٣ک - ٧٧٩ز (هارون الرشید)ی کوڕی کردە والی بەسەر کوردستان و ئازەربایجان، لە زەمانی خەلیفە هارونە رەشید (خەزر)ەکان دیسان پەلاماری (کوردستان)یان دا و زوڵم و کوشتارێکی زۆریان تێدا کرد. بەڵام خەلیفە لە (١٨٣ک - ٧٧٩ز) لە وڵات دەریکردن. لە ساڵی (٤٦٣ک - ١٠٧١ز)، کە لەشکری (ئارمانوس)ی چارەمی ئیمپراتۆری رۆم لە دەشتی (مەلازگرد) شکا و بەدیل گیرا، هەموو وڵاتی ئارمینیا و کوردستان وردە وردە کەوتنە دەست (ئەلب ارسلان)ی سەلجووقی.

فەرعێکی حکومەتی (زەنگی) لە هەولێر دادەمەزرێ لە ساڵی (٥٣٩ک - ١١٤٤ز) و دەوڵەتی (ئەیوبی) لە ساڵی (٦٢٠ک - ١٢٥٣ز) فەوتاندیان. بەشی زۆری لەشکری سوڵتان (یوسف سەلاحەدین ئەیوبی) لە عەشایری کورد و سەرکردەکانی کورد پێکهاتبوو، لەبەینی ئەمانەش کوردی (سۆران)یشی تێدابووە[4]، لەپێش سەلجوقییەکان وڵاتی کۆیە هەندێ جار لەژێردەشتی (حەمدانییەکان) و هەندێ جاریش لەژێردەستی (بوەیهییەکان) بووە[5]. لێرەش هیچ ناوی کۆیە نەهاتووە، بەڵام ویستم بە شێوەیەکی گشتی پێشانی بدەم، کە چۆن ئەم ناوە هەردەمە بەدەست یەکێکەوە بووە. هەر چییەکیش کرابێ لەناو چوارچێوەی خەلافەتی عەباسی بووە.

مێژووی وڵاتی کۆیە لەپێش ئیسلامدا و لەدوای ئیسلامدا تا پەیدابوونی (دەوڵەتی عوسمانی و

دەوڵەتی سەفەوی) بەلای منەوە زۆر تاریکە، هەر ئەمەش بووە، لە چاپکردنی ئەم کتێبە دوای خستم.

رای (قازی محیدین)یش ئەمەیە: ئەسڵی ئەیوبییەکان لە (دوین) و ئەم (دوین)ە بە (بدوین) یاخود (بتوین - بیتوێن) دادەنێ، کە ئەم (بتوێن)ەش هەڵکەوتووە لە ناوچەی (کۆیسنجق)[6] بەم مناسەبەتەوە گۆڕێکی درێژ هەیە کەوتیتە لای رۆژهەلاتی کۆیە لەبن رێزە چیایەک، بەو مەرقەدە دەڵێن (هەیبەت سوڵتان)، هەندێکیش دەڵێن (ئەیوب سوڵتان) و رێزە چیایەکەش لەو ئاقارەی بەو ناوەیەوە ناونراوە (چیای هەیبەت سوڵتان)، بەهاران گەلەک لە دانیشتوانی کۆیە بەتایبەتی ژن دەچنە زیارەتی، وەختی خۆشی ئاوەدانی لێ هەبووە، هەندێک دەڵێن: ئەسحابە بووە، هەندێکیش دەڵێن لە نەوەی (شێخ عەبدولقادری گەیلانی)یە، لە سەرێکی دیکەشەوە بۆمان ساغ نەبۆتەوە یان دەبێ چ عیلاقەی ئەو ناوە لەگەڵ (سوڵتانی ئەیوبی)یەکان هەبووبێ؟.

لە ساڵی ٦٢٢ک - ١٢٢٥ز (جەلالەدین کوڕی سوڵتان محەمەدی خوارزمی)، بە لەشکرە پەراگەندەکەی - کە لە دەست تەتەرەکان هەڵاتبوو - رووی کردە دەوروبەری عێراق، گەلێ جێگاشی وێران کرد، لە پاشان رووی کردە هەولێر، بەڵام حاکمی هەولێر (موزەفەرەدین گۆکبری) بە سیاسەتێکی باش و تەدبیرێکی گەورە و بەبێ خوێن رشتن بەرەو دوای گەڕاندەوە.

لە ساڵی ٦٢٨ک - ١٢٣١ز هەولێر و دەوروپشتی لەلایەن (تەتەر)ەکانەوە وێران کرا و گەلەک کەسیان کوشت[7].

لە ساڵی (٥٨٦ک) سوڵتان (سەلاحەدین ئەیوبی) (هەولێر و شەهرەزووری) دا بە (الملك المعظم) موزەفەرەدین گۆکبری، لەپاش مردنی موزەفەرەدین ئیمام (موستەنسیر) خەلیفەی عەباسی لە ناوەڕاستی شەوالی ساڵی (٦٣٠ک) هەولێری خستە دەست خۆی، (تەتەر)ەکان لە (١٧ی شەوالی ساڵی ٦٣٤ک) شاری هەولێریان داگیرکرد، ئەوکارەی بەسەر شار و ئەهلەکەی داهات بەناوبانگە[8]، بێگومان ئەوەی بەسەر (هەولێـر)ێ هاتووە، کۆیە و دەوروپشتەکەشی گرتۆتەوە.

لە تاریخی (جهانگشا) وادەردەکەوێ، کە ولایەتەکانی (کوردستان) لە زەمانی (مەغۆل)ەکان ئەمیر (ئەرغۆن ئاغا)ی بابی میر (نەورۆز)ی مەشهور حوکمی کردوون[9].

لە (٦٥١ک تا ٧٤٠ک) ئەم ناوە لەبەردەستی (ئیلخانی)یەکان بووە، ئەوجا دەکەوتە ژێردەستی (جەلائیری)یەکان، لە ساڵی (٧٩٦ک - ١٤٠١ز) ئەم ناوە کەوتە دەست (تەیووری لەنگ) لەدوای مردنی (تەیووری لەنگ) بە چەند ساڵێک ئەم ناوە کەوتە دەست (قەرە قۆینلی)یەکان، لە پاشان (ئاق قۆینلی)یەکانیش پەیدابوون، ئەمانە تورکمان بوون[10].

لەم وڵاتە قسەیەک هەیە دەڵێن: (ترکە، توخوا) ئەمجا مەبەستیان یا لەبۆ پاڕانەوە یا لەباتی قیرسیایە.

*

## پەراوێزەکان

١- کە لە هەولێرەوە بە ئۆتۆمبێل بۆ کۆیە بچیت لەمبەر و ئەوبەری رێگادا زۆر کەڵەکە بەرد دەبینی، کە وەختی خۆی نیشانەی ئاوەدانی بوون.

٢- هەرموتە ئێستا گوندێکە (٧٠) ماڵ دەبێ و کەوتۆتە باشووری کۆیە (٥) کیلۆمەتر لێی دوورە، دانیشتووەکانی دیانن، بە کشتوکاڵ و مەڕ و ماڵات بەخێوکردن خەریکن.

٣- ئەم چەند قسەیەم لە کتێبێک وەرگرتووە، کە (الفتوحات الأسلامية)ی پێدەڵێن و لەلای (مەلا سەمەدی مەرگەیی) هەیە.

٤- خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، جلدی یەکەم، وەرگێرانی، محەمەد عەلی عەونی، لاپەڕە (١٣٤، ١٣٦، ١٣٧، ١٤٨، ١٤٩، ١٥٢).

٥- بەپێی خەریتەیەک، کە (محەمەد ئەمین بەگ واسف) دایناوە.

٦- حاشیەی (شەرەفنامە) وەرگێرانی مەلا جەمیل بەندی رۆژبەیانی بە عەرەبی لاپەڕە ٢٧.

٧- خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان بەرگی یەکەم وەرگێرانی محەمەد عەلی عەونی لاپەڕە ١٦٠، ١٦٢.

٨- وفيات الأعيان... تاریخی (ئیبن خەلەکان) ج ٣ لاپەڕە ٢٧٢، ٢٩٧.

٩- خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان بەرگی یەکەم وەرگێرانی محەمەد عەلی عەونی لاپەڕە ١٦٥.

١٠- بۆ ئەم چەند قسەیە تەماشای (اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث)ی (لۆنگریک) وەرگێرانی (جەعفەر خەیات) و (تاریخی عمومی و عثمانی اطلسی) دانانی (محەمەد ئەشرەف) مکتب حربيه مطبعەسی ١٣٢٩کراوە.

* ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەوێزی، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ٢٠٠٧ وەرگیراوە.

# «ئەربل»
# ئەربیل لە سەردەمی سەلجووقییەکان

دکتۆر نیشتمان بەشیر محەمەد
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

پێش ئەوەی باس لە بارودۆخی سیاسی شاری (آربیل- هەولێر)ی مێژوویی لە سەردەمی سەلجوقییەکاندا بکەین، دەبێ زانیارییەکی کورت دەربارەی سەلجووقییەکان پێشکەش بکەین، وەکو (بنەچەیان، نیشتمانیان، چۆنیەتی دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان). بەدیارکەوتنی سەلجووقییەکان لەماوەی سەدەی پێنجی کۆچی/ یازدەی زاینی لەسەر شانۆی رووداوەکان دەگەڕێتەوە بۆ هەرێمەکانی دەوڵەتی عەباسی، کە بووە هۆی رووداني گۆڕانکاری گەورە لە نەخشەی سیاسی ناوچەکەدا، ئەوەش هەبوو لەسەر هەموو لایەنەکانی ژیاندا، بەتایبەتی کاریگەری لەسەر میرنشینەکانی کوردی، کە لەسەر چەند هەرێمێک بلاوببوونەوە، لەنێو ئەو میرنشینانەش میرنشینی (هەزبانییەکان) بوون، ئەربیل کەوتبووە میانی سنووری حوکمیان.

هەروەها بەپێویستی دەزانین جێ و شوێنی جوگرافی شاری ئەربیل بەکوردی پێناسە بکەین، لەبەر گرنگی ئەو مەسەلەیە بۆ روونکردنەوەی پەیوەندییەکان لەنێوان دەسەڵاتی سەلجووقییەکان و میرە کوردە هەزبانییەکان لە ئەربیلدا، گرنگی ئەو لێکۆڵینەوە لەوەدایە کە قۆناغێکی گرنگی مێژووی کوردی ئیسلامی ئاشکرا دەکات، هەروەها رۆشنایییەک دەخاتە سەر کاروباری سیاسی لە (ئەربل) لە ماوەی سەردەمی سەلجووقییەکاندا.

### «هاتنی سەلجووقییەکان لەرۆژهەڵاتی ئیسلامی و گەیشتنیان بۆ وڵاتی کوردەکان»

هەروەکو زانیومانە (تورکەکان) لە نەتەوە کۆنەکانن، کە لە ناوەندی ئاسیا ژیانیان بەسەر بردووە. رۆڵی گرنگیان هەبوو لەقۆناغی مێژوویی جیاوازدا، بەتایبەتی لە سەردەمی مێژووی ئیسلامی، واپێدەچێ هۆزەکانی تورکی بە بەردەوام بەدوای لەوەڕگاو مەرداری، لە گەڕان و گواستنەوەدا بوون دوای چوونیان بۆ ناو ئاینی ئیسلامی، بەرەو هەرێمە رۆژهەڵاتەکانی ئیسلامی رۆیشتن، هەرێمی خۆراسان لەپێشەوەی هەرێمەکانی ئیسلامی بوو، کە تووشی هێرش و کۆچی ئەو هۆزانە بوو.

هۆزی (الغز) یەکەم هۆزی تورکی بوو کە گەیشتە جیهانی ئیسلامی، وڵاتی (کورد)یش یەکێک بوو لەو وڵاتانەی کە تووشی هێرشەکان بوو. هەروەها هەرێمەکانی (ئازەربێجان، هەرێمی شاخاوی، هەرێمی کەنداوی فوراتی)، چوونیان بۆ ناو وڵاتی هەرێمەکانی کوردی یەکێک بوو لە رووداوە گرنگ و دیارەکان لەبەر ئەو رۆڵە گەورەی لە مەسەلەی گۆڕانکارییەکانی واقیعی سیاسی

ناوچەکە، بەتایبەتی ئەو هێرشانە بوونە هۆی کاولکاری و تێکدانی گەورە. هەروەها بەدیارکەوتنیان لە وڵاتی کورد (کوردستان) یەکەم دیدەنی و چاوپێکەوتن لەنێوان کوردو سەلجووقییەکان بوو. سەلجووقییەکان لە دەستپێکی سەدەی پێنجەمی کۆچی، یازدەی زاینی لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی بەدیارکەوتن. ئەوەی مێژوو نووسەکان و لێکۆڵەرەوەکان لەسەری ڕێککەوتن و کۆکن، ئەوەیە کە سەلجووقییەکان لقێک لە لقەکانی هۆزەکانی (الغز)ی تورکین، ئەو نازناوەش بۆ باپیرە گەورەیان (سەلجووقی کوڕی دەقاق) دەگەڕێتەوە کە یەکێک بوو لەسەرۆک هۆزەکانی تورک.، ئەندامانی ئەو هۆزە هەر لە سەرەتای ژیانیان لە هەرێمی تورکستان دەستی پێ کرد، لە دوایش بەرەو جیهانی ئیسلامی ڕۆیشتن.

لەبارەی کۆچکردنیان بۆ جیهانی ئیسلامی، (الراوندی) یەکێک لە مێژوونووسانی سەلجووقییەکان دەڵێ:

(ئەوانە لەوڵاتی خۆیان کە هەرێمی (تورکستانە) کۆچیان کردو ڕۆیشتن بەرەو ڕۆژهەڵات، بەرەو پشتەوەی ڕووبارەکە، بەهۆی زۆری دانیشتوانی و قەڵەباڵغی ناوچەکەیان و کەمی و تەسکی لەوەڕگاکەیان، لەبارەی (ئاینیان) پێش ئەوەی بچنە ناو ئاینی ئیسلام، ڕایەکان جیاوازن لەبارەی ئەو مەسەلەیە، بەڵام دەتوانین بڵێین: ئاینی زۆرینەیان، ئاینی ئاسمانی (سماوی) نەبوو.

سەلجووقییەکان لە وڵاتی پشت ڕووبارەکە جێگیر بوون، دوای ئەوەی لە تورکستان کۆچیان کرد، سەرۆکیان لەبەر بەهێزی و پایەبەرزیی کەسێتییەکەی و بۆ ئەوەی هۆزەکەی ببێتە قەوارەیەکی بەهێز، ئەویش لەڕێگەی چالاکیی و هەوڵێکی زۆر توانی خۆی نزیک بکاتەوە لە موسڵمانان، چوونە ناو ئاینی ئیسلام و سەر مەزهەبی (سونە)، ئەوەش بووە هۆی کردنەوەی دەرگاکانی وڵاتانی ئیسلامی لەبەردەمیان، سەلجووق توانی ئەو بارودۆخە سیاسییە خراپە لەناوچەکەدا هەبووە بۆ خۆی بیقۆزێتەوەو لەدەسەڵاتدارانی موسڵمانان نزیک بۆوەو کارێکی زۆری کرد لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام لەنێوان تورکە (بت پەرستەکان)دا.

چوونی سەلجووقییەکان بۆ ناو جیهانی ئیسلامی وای لێکردن بەشداری لەڕووداوە سیاسییەکان بکەن، هەروەها پابەند بن بەڕێبازو بیروباوەڕەکەی و بەشداربن لەشەڕەکان لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام. سەلجووقییەکان دوای جێگیربوونیان لەوڵاتی دوای ڕووبار، کاریان کرد لەپێناو دامەزراندنی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆی خۆیان، (طغرل بگ) یەکێکە لەکوڕەکانی سەلجووق، ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لەدامەزراندنی ئەو قەوارە سەربەخۆیە. جیاوازییەک هەیە لە ڕای لێکۆڵەرەوان و پسپۆرانی مێژوو لەمەسەلەی دەستنیشان و دیارکردنی ئەو ساڵەی تیایدا دەوڵەتی سەلجووق دامەزراوە، هەندێکیان دەڵێن: ساڵی (٤٢٩ کۆچی/ ١٠٣٧ ز) مێژووی ڕەسمی دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجووقییەکانە، بەتایبەتی خوتبەکانیان بەناویان دەخوێندرایەوە لەشارەکانی دوای ڕووبار. هەندێکی تر دەڵێن: "سەرکەوتنیان بەسەر (غەزنەوییەکان)ە لەشوێنی (دەندانقان) وەکو بانگەوازێک و ئاگادارییەک بوو بۆ جێگیرکردنی سەلجووقییەکان لەو وڵاتەدا. سوڵتان (طغرل بک) سەرۆکی سەلجووقییەکان و دوای دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان، کارێکی زۆری کرد لەپێناو فراوانکردنی دەسەڵات و هێزی بەسەر ناوچەکانی تر، توانی کۆنتڕۆڵی هەرێمەکانی (گرگان وتەبەرستان و خوارزم) بکات، ناوی (طغرل بک) دەنگ و سەدایەکی زۆری هەبوو لەنێو هەرێمەکانی تر، بەتایبەتی دوای چوونیان بەرەو ڕۆژئاوا، دوای ئەوەی هەستیان بەجێگیربوون کرد، ئامادەکارییان کرد لەپێناو فراوانترکردنی زۆرتر، توانییان لەماوەی چەند ساڵێکی کەمدا، دەسەڵاتیان توندتر بکەن، بەتایبەتی بەسەر هەندێ پارچەی گرنگی جیهانی ئیسلامیدا، - هەرێمە کوردییەکان یەکێک بوو لەو هەرێمانە - زاڵ بوون بەسەریاندا.

## گەیشتنی سەلجووقییەکان بۆ هەرێمە کوردییەکان

سەلجووقییەکان بەرەو هەرێمە کوردییەکان ڕۆیشتن، لەو کاتەدا دەسەڵات لەدەست میرنشینەکانی کوردی بوو، بۆ نموونە لەڕۆژئاوای هەرێمە شاخاوییەکان، دەسەڵاتی

سیاسی لەدەست میرەکانی (بەنی عەنازی شازنجانی) بوو، بەڵام لەئازەربێجاندا لەدەست میرنشینەکانی (روادیە)ی کوردی بوو. ئەو میرنشینە دەسەلاتێکی بەهێزی هەبوو، میرەکانی سەرکەوتوو بوون لە مەسەلەی فراوانکردنی سنووری میرنشینەکە، وەزعی سیاسی جێگیر بوو. لەبەرئەوەش میرەکانی کاریان کرد لەپێناو گرنگیدان بەکاروباری ناوخۆ و دەرەوە، بەڵام لەدواییدا تووشی پاڵەپەستۆی گەورەی سەلجووقییەکان بوو، دەستیان کرد بەدەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی میرنشینەکەو تێکدانی ئەو جێگیرییەی لەوێ هەبوو.

بەڵام لە هەرێمی (ئاران) میرنشینەکانی (شەدادی) لەوێ حوکمیان دەکرد، سەرۆکی بنەماڵەی شەدادی کوردی، کە لەبنەماڵەی هەزبانییەکانن، توانیان لە ئاران بڵاوببنەوەو لەساڵی (٣٤٠ک/ ٩٥١ز)، بەردی بناغەی میرنشینی شەدادی دانێن و سنووری میرنشینەکە فراوانتر بکەن، دوای ئەوەی هەموو ناوچەکانی هەرێمی (ئاران)یان گرتەوە، دوای چەند ساڵێک لە سنوورەکە تێپەڕین، تا چەند بەشێکی (ئەرمینیا) و (ئازەربێجان)یان گرتەوە.

لەدووورگەی فورات (دیاربەکر) تیایدا دەسەلاتی میرنشینی مەڕوانی بەردەوام بووە. میر (باز کوردی) توانی میرنشینی کوردی دابمەزرێنێ، کە بە (الدوستكية) یان (المروانية) ناسرا بوون. دەتوانین بڵێین هەبوونی میرنشینی مەروانییەکان لەو پێگەو جوگرافییە گرنگەدا، گرنگییەکی زیاتری پێدابوو، لەبەر ئەوەش میرەکانی کاریان کرد بۆ فراوانکردنی سنووریان، بەرەو ئەو شارانەی نزیکن لەگەڵ سنووری (بیزنتینییەکان)بە پلەی یەک. لەقەوارە کوردییەکانی تر (میرنشینی هەزبانییەکان) بوون، تاکەکانی ئەو هۆزە کوردییە توانییان میرنشینێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن. شاری (ئەربل)یان وەکو مەڵبەندێکی سەرەکی هەزبانییەکان دەستنیشان کرد و لەو شارە جێگیر بوون. هەر لەسەرەتای سەدەی (١٥)ی کۆچی/ ١١ ز، بۆ ماوەی زیاتر لەسەدەیەک قەلاکەو ئەو ناوچانەی دەوروبەری بۆ خۆیان تەملیک کرد، ئەو زانیارییانەی لەسەرچاوەکان هاتوون دەربارەی میرنشینی هەزبانییەکان زۆر کەمە، حالیان وەکو حالی میرنشینەکانی تری کوردی بوو. لێکۆڵەرەوەکانی مێژووی ئەو میرنشینانە، زەحمەتێکی زۆر دەبینن بەهۆی کەمی زانیاری و هەواڵی ئەو میرنشینانە بەدرێژایی مێژوو.

هەموو میرنشینەکانی کوردی، بەمانای (شەدادییەکان و روادییەکان و مەڕوانییەکان و عەنازییەکان و هەزبانییەکان) کە لەسنووری وڵاتی کورد بڵاو ببوونەوە، دەکرێ بەقەوارەی سیاسی سەربەخۆ دابندرێن، حوکمیان لەسەر بناغەیەکی توندو بەهێز بوو لەناو ناوچەکانیاندا، هێزێکی سیاسی بەدەنگ و سەدایان پێکهێنا لەکاتی بەدیارکەوتنی سەلجووقییەکاندا، هاوسەردەمی سەلجووقییەکان بوون و پەیوەندییەکی جۆراوجۆریان هەبوو لەگەڵیاندا.

سوڵتان (طغرل بک)ی سەلجووقی توانی دەوڵەتێکی گەورە پێکبهێنێ و دەسەلاتی حوکمی خۆی فراوان کرد، هەرێمە کوردییەکانیش بەهۆی ئەو پێگە جوگرافی و ستراتیژییەی هەیەتی لە ناوچەکەدا لەمیانی ئەو پلانە بوون،، تا وای لێهات بووە سەرنجڕاکێشی زۆرینەی هێزە سیاسییەکان لەناوچەکەدا، هەرێمی شاخاوییەکان (اقليم الجبال) پێش هەموو هەرێمەکان کۆنترۆڵ کرا، کە لە لایەن میرەکانی میرنشینی عەنازییەکان (شاذنجانیە)کان حوکم دەکرا، ئەوەی زۆر سەرنجڕاکێش بوو لێرە، کە سەلجووقییەکان هەموو شارە کوردییەکانیان کاول و وێران کرد، دانیشتوانی ئەو شارانەیان کوشت و خێرو خێراتیان دزی و تالان کرد.

لەدوایش سەلجووقییەکان بەرەو هەرێمی (ئازەربێجان) و (ئاران) رۆیشتن، توانییان بەتوندی کۆنترۆڵیان بکەن، هەر لەو کاتەدا میر (نصر الدولة المرواني) گوێڕایەڵی خۆی (الطاعة)ی بۆ سوڵتان (طغرل بک) نیشاندا، بەو هەنگاوەی خۆی ویستی خەڵکی میرنشینەکەی خۆی لەشەڕو پێکدادان دوور بکاتەوە، لەو جۆرە سیاسەتەش سەرکەوتوو بوو و توانی خۆی بگونجێنێ لەگەڵ سەلجووقییەکان و پارێزگاری لە میرنشینەکەی بکات، ئەوەش بەهۆی حیکمەت و عاقڵی خۆی.

دەربارەی وەزعی شاری (ئەربیل) لەماوەی سەردەمی سەلجووقییەکاندا (هەر وەکو وتمان پێشتر) شاری

(ئەربل) مەڵبەندی حوکمی میرنشینی هەزبانییەکانی کوردی بوو، پێش ئەوەی بچینە سەر وەزعی ئەو شارە، دەبێ زانیارییەکی کورت دەربارەی پێگەی جوگرافی شاری ئەربل پێشکەش بکەین.

## پێگەی جوگرافی شاری ئەربل

شاری (ئەربیل، هەولێر) لە شارە کوردییەکانە، مێژوویەکی کۆنی هەیە، کۆنترین مەڵبەندی جێنشینی مرۆڤایەتییە تا ئێستاش. ئەو شارە لە سەرچاوە کۆنەکاندا، بەناوی (ئەربل) ناسراوە، لەگەڵ زۆری رایەکان، ناوی (ئەربیل) زیاتر بەکارهاتووە لە سەرچاوەکان و لێکۆڵینەوە مێژووەکاندا، بەڵام ئەو ناوەی کە دانیشتوانی شارەکە بەکاری دێنن، ئەویش (هەولێرە).

(ئەربیل، هەولێر) دەکەوێتە (باشووری کوردستان)، لەماوەی قۆناغە مێژووییەکاندا، پێش بەدەرکەوتنی ئیسلام، ئەو شارە رۆڵێکی گەورەی هەبوو بەهۆی پێگە جوگرافییەکەی، بەڵام لەماوەی مێژووی ئیسلامدا، پێناچێ ئەو شارە پێگەو رۆڵێکی بەرزی هەبێ لەهەر (٣) سێ سەدەکەی کۆچیدا، لەوانەشە هۆیەکەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەو شارە سەر بەکوردی (حلوان) بووە، لەبەر ئەوەش ناوی لەلای بلدانییەکان و مێژوونووسان نەهاتووە، لەگەڵ ئەمەش مێژوویەکەی و ناوە کۆنەکەی هەر ماوە وەکو خۆی و لەدەستی نەداوە. یەکێک لە لێکۆڵەرەوەکان ئیشارەت بەپێگە جوگرافییەکەی دەدات، کە زۆر ستراتیژییە، بەتایبەتی ئەو شارە دەکەوێتە سەر شوێنی پێگەیشتنی رێیەکان، لەبەر ئەوەش بووە ناوەندێکی ئابووری بۆ رێیەکانی کاروانچییان بۆ کاتێکی زۆر درێژ.

شاری (ئەربیل، هەولێر) لەو کاتە بەدیارکەوت کە کاتێک بووە مەڵبەندێکی سەرەکی بۆ میرنشینی هەزبانییەکانی کوردی، کە حوکمیان هەتا سالی ٥٢٠ک/ ١١٢٦ز. بەردەوام بووە، حوکمی میرەکانی هەزبانی، یەک لەدوای یەک هات، لەو میرنشینانەی کە لە هەمووان دیارتر بووە، میر (ئەبو ئەلهەجای هەزبانی) بووە.

## ئەربل (ئەربیل) لە سەردەمی سەلجووقییەکان

لەگەڵ کەمی زانیارییەکان دەربارەی میرنشینی هەزبانییەکان، بەڵام هەندێ لە لێکۆڵەرەوەکانی مێژووی ئەو میرنشینانەیان وەرگرت بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی، بەپشت بەستن بەهەندێ نووسینی سادەو کەم، کە لە سەرچاوەکان هاتووە.

دەربارەی وشەی (هەزبانی یان هەزبانییەکان) رایەکان جیاوازن دەربارەی بنەچەی ناوەکە، ئەو ناوە بەچەند شێوازێک هاتووە، لەوانە (الهذبانیة، الهدایانیة، الهذباني، الهدباني) ئەوەش بەڵگەیەکە کە ئەو وشەیە جێگیر نەبووە لەلای مێژوونووسان و بلدانییەکان.

هۆزی هەزبانی کوردی توانی میرنشینێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن، شاری (ئەربل) یان کردووە بە مەڵبەندێک بۆ خۆیان، هەزبانییەکان لەو شارە جێگیر بوون، قەڵایان بۆ خۆیان تەملیک کردبوو، هەر لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی ک/ ١١ زایینی مێژووی سەرکردایەتی هەزبانییەکان دیار نییە، هەتا سالی ٤٢٠ک/ ١٠٢٩ز، لەماوەی ئەو ساڵە میریان لە (ئەربل)، کە میر (ئەبو ئەلهەیجای هەزبانی) بووە، سەرچاوەکان ئیشارەت بەسەرەتای حوکمی نادەن، تەنها ئیشارەت بەمیر (عیسی ئیبن موسا ئەلهەزبانی) دەدەن، کە جێگری ئەو بووە لە حوکمکردنی میرنشینەکە، لەوانەشە ناوی (ئەبا ئەلهەیجا) نازناوی بێت، کەواتە میر موسا باوکی میر عیسا بوودو ئەبالهەیجا یەک کەس بێت، دوای مردنی کوری خۆی عیسا دەسەڵاتی وەرگرت لەجێگای ئەو.

میرنشینی هەزبانییەکان لە ئەربل هاو سەردەم بوون لەگەڵ سەلجووقییەکان، وەکو هێزێکی نوێ بەدیارکەوت لەسەر گۆڕەپانی سیاسی لە جیهانی ئیسلامیدا، دەکرێ هەزبانییەکان وەکو هێزێکی سیاسی دیارو گەورە دابندرێ لەکاتی بەدیارکەوتنی سەلجووقییەکان، هاوسەردەمی یەک بوون و پەیوەندییەکی هەمە جۆرەیان هەبووبێ دەربارەی وەزعی شاری (ئەربل) لەماوەی سەردەمی سەلجووقییەکان، ئەوەی سەرنجراکێشە لەلای لێکۆڵەرەوەکاندا، ئەویش ناڕوونی و لێڵی مێژووی میرەکانی و ریزبەندییان لەکاتی حوکمیان، لە سالی ٤٣٧ک/ ١٠٤٦ز، ئەوەی حوکمی میرنشینەکەی دەکرد (عیسا کوری موسا هەزبانی) بوو، واپێ

دەچێ میرنشینەکە تووشی ململانێی ناوخۆیی دەبوو لەنێوان بنەماڵەی دەسەڵاتدار لەسەر حوکم و دەسەڵات، ئەوەش وای کرد هەندێ لە هێزە سیاسییەکان دەستیان بخەنە نێو کاروباری دەسەڵاتەکەیان وەک (العقیلیین) لە شاری موسڵدا.

ئەو دەستتێوەردانەی (العقیلیین) رۆڵێکی گەورەی هەبوو لەزیادکردنی ناکۆکییەکان لەنێوان میرەکانی هەزبانی، لەبەر ئەوەش وەزعیان جێگیر نەبووە، بەپێچەوانەی میرنشینەکانی تر، بەتایبەتی لەکاتی بەدیارکەوتنی سەلجووقییەکاندا، پێش بەدیارکەوتنی ئەو هێزەش، میرنشینەکە تووشی وەزعی خراپ و خەتەرناک بووە، لەوانە: پەنابردن و رۆیشتنی میر موسا، کە پێی دەڵێن (سلار) بۆ لای (العقیلیین)، بە قسەی سەرچاوەکان بەدیار دەکەوێ کە (عیسا) بەدەست کوڕە برای خۆی ساڵی ٤٣٧ک/ ١٠٤٦ز کوژرا، کاتێ (سلار) بەم هەواڵەی زانی، بەپەلە لەگەڵ (قرواش العقیلی) بەرەو (ئەربل) رۆیشت لەوێ، دەسلاتی بەدەستەوە گرت، لەجیاتی برا کوژراوەکەی.

میر (ئەبو ئەلحەسەن کوڕی موسک ئەلهەزبانی) لەساڵی ٤٤٠ک/ ١٠٤٩ حاکمی میرنشینی (ئەربل) بووە، کە ناکۆکی کەوتە نێوان خۆی و برایەکەی (ئەبو عەلی ئیبن موسک الهزبانی) کەوای کرد لەدەسەڵات دوور بخرێتەوەو (ئەبو عەلی) ببێتە حاکمی (ئەربل)، کە هاوسەردەمی قۆناغی بەدیارکەوتنی سەلجووقییەکان و کۆنترۆڵکردنی هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی بووە، ئەو میرە لەحوکم مایەوەو کەوتە گوێڕایەڵی (طاعة)ی سەلجووقییەکان، بەوەش دەسەڵاتی سیاسی لە شاری (ئەربل) هەر لەدەست هەزبانییەکان مایەوە لەبەر ئەوە، گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە سەلجووقییەکان بەهێزن و لەلووتکەی بەهێزی خۆیان بوون لەو قۆناغە مێژووییەدا، لەبەر ئەوەش زۆر پێویستی دەکرد گوێڕایەڵی (طاعة)ی خۆیان رابگەیەن، بەڵام راگەیاندنی گوێڕایەڵی لەلایەن کوردەکانەوە، جۆرو شێوازی پەیوەندییەکانی سیاسی لەنێوان هەردوو لادا دیارکرد.

ئەوەی جێگای سەرنجە لەسیاسەتی سەلجووقییەکاندا، هەر لەسەرەتای حوکمیان، ئەوان سیاسەتی مەرکەزیان بەکار نەهێنا، هەولیان نەدا قەوارەکانی کوردی سەربەخۆ لادەن و تێکبدەن، لە واقیعدا سەلجووقییەکان سیستەمی نامەرکەزییان بەکارهێنا لەسەرەتای حوکمیان، ئەوەش وایکرد حوکم و ئیدارە لە هەرێمە کوردییەکاندا هەر لەدەستی میرە سەربەخۆیەکان بمێنێ، لەوانەش میرنشینی هەزبانییەکان، کە حوکمی (ئەربل) هەر لەدەستی میرەکانیان مایەوە، ئەوەش دوای راگەیاندنی گوێڕایەڵییان بۆ سوڵتان (طغرل بک)ی سەلجووقی.

لەگەڵ مانەوەی دەسەڵاتی سیاسی کوردی لە میرنشینەکانیدا، بەڵام سەلجووقییەکان سیاسەتێکی زۆر زیرەکانەیان بەکارهێنا، دوای ئەوەی برِیاریان دا هێزو جێگرەکانیان و فەرمانبەرەکانیان بهێڵنەوە لە هەرێمە کوردییەکان، لە هەمان کاتدا ئیستغلالی ئەو خێروخێراتانە بکەن، کە لەو ناوچانە هەیە.

دیاردەی پەیوەندییەکانی سیاسی لەنێوان کوردو سەلجووقییەکان لەو کاتەدا بەدیارکەوت، کە هەردوولا دانیان بەیەک نا، ئەو شێوازە لەپەیوەندییەکان بەردەوام بوو لەسەردەمی هەر دوو سوڵتان (طغرل بک) و (ئەلب ئەرسەلان) بەڵام سیاسەتی سەلجووقییەکان لەسەردەمی سوڵتان (مەلەک شاه) گۆڕا، کە لەساڵی ٤٦٥ک/ ١٠٧٢ز جڵەوی حوکمی وەرگرت، بیرۆکەی حوکمی (المرکزیة) لەلای ئەو سوڵتانە هەبوو، هەروەها بیرۆکەی لادانی میرنشینەکانی کوردی سەربەخۆ لەسەر حوکم لەبیر و عەقڵی (مەلەک شاه)دا هەبوو، هەر لەگەڵ وەرگرتنی حوکم، سوڵتان (مەلەک شاه) توانی چەند قەوارەیەکی کوردی سەربەخۆ لەناوببات، لەوانەش میرنشینی (الروادیە، الشدادیە، المروانیە، العنازیە)، دەربارەی هەزبانییەکان کە حوکمی (ئەربل)یان دەکرد، ئەوەی جێگای سەرنجە، ئەو زانیاریانەی هەیە لەچەند ئیشارەتێک تێناپەڕێ، ئەویش لەلایەن (ابن الاثیر) و (ابن المستوفي) خاوەنی (تاریخ ئەربل) بوو، کە ئیشارەت بەوە دەدات، کە ئەوان هەر مابوون و حوکمیش هەر لەدەستیان بوو لەماوەی سەردەمی سوڵتان (مەلەک شاه)دا، لەگەڵ سیاسەتی (المرکزیة)ی ئەو سوڵتانە، واپێدەچێ سەلجووقییەکان هەوڵیان

نەدابێ ئەو میرنشینانە لادەن، لەبەر ئەوەی سەرچاوەی ترس و خەتەرناک نەبوون بۆ سەر پێگەو دەسەڵاتی سەلجووقییەکان لەناوچەکەدا، بەتایبەتی لەبەر هەبوونی ململانێ و نەبوونی جێگری ململانێ لەنێوان میرەکانی هەردوو هۆزی (الهذباني) و (الحكمية) لەسەر دەسەڵات، لەبەر ئەوەش مانەوەی وەزعی میرنشینەکە بەو شێوەیە نەدەبووە سەرچاوەی ترس و خەتەرناک لەسەر حوکمی سەلجووقییەکان، هەر لەبەر ئەوەش سوڵتان (مەلەک شاە) لەپێناو نەهێشتنی ئەو میرنشینەیە کاری نەکرد.

لەکاروانی رووداوەکان بۆمان دەردەکەوێ کە هەزبانییەکان لەو کاتەی کە میری (ئەربل) بوون، گوێڕایەڵی سەلجووقییەکان بوون، هەروەها لایەنگیری خۆیان بۆ ئەوان راگەیاند، لەبەرامبەردا سەلجووقییەکان بەمەبەستی هێرش بۆ سەر (ئەربل) لەشکرکێشییان نەکرد و بە شتێکی پێویستیان نەزانی، هەر وەکو ئەوەی کردیان لەگەڵ میرنشینە کوردییەکانی تر، زیاتر لەوەش، سوپای هەزبانییەکان چووە پاڵ سوپای سەلجووقییەکان و خزمەتی پێشکەش کرد، میر (فضل بن ئەبی الهیجاء الهذباني) یەکێک بووە لەیاوەرو هاوەڵانی سوڵتان (مەلەک شاە) لە کاروانەکەی بۆ وڵاتی شام، سوڵتان (مەلەک شاە) هەڵس (فضل بن ئەبی الهیجاء) دەستنیشان کرد وەکو (هەناردەی خۆی) بۆ میر (ئیبن مەروان) خاوەن و حاکمی (دیاربەکر) داوای (٣٠/٠٠٠) دیناری کرد بەرامبەر مانەوەی حاکمی (دیاربەکر) وەکو خۆی سەربەخۆ لەناو میرنشینەکەی بەبێ دەستتێوەردان لەکاروباری حوکمیان.

بەردەوامبوونی حوکمی هەزبانییەکان لە (ئەربل) وای کرد ئەو میرنشینە بەشداری لە رووداوەکان بکات، کە لەناوچەکە رووی دا، لەسالی ٤٨٩ک/١٠٩٥ز، میر (ئەبو ئەلهەیجای هەزباني) خاوەنی (ئەربل)، خۆی تووشی ململانێی ناوخۆیی کرد، کە لەنێوان میرەکانی (العقيلية) رووی دەدا، کە حاکمی موسڵ بوون زۆر جار میرەکانی ئەو میرنشینانەی کوردی خۆیان دەخستە ناو ئەو گێروگرفتانەی هەبوو لەنێوان "عوقەیلییەکان" و خۆیان دەکردە لایەنێک، لەگەڵ ئەوەی مەسەلەکە هیچ پەیوەندییەکی نەبوو بەمیرنشینەکانیان.

هەروەها میرەکانی میرنشینەکە رۆڵیان هەبوو لەو ململانێیەی، کە رووی دەدا لەنێوان سەرکردە سەلجووقییەکان، سالی ٥٠٠ک/١١٠٦ز، میر (ئەبو ئەلهەیجا) رۆڵێکی گرنگی هەبوو لەو ململانێیەی نێوان دوو لە سەرکردەکانی سەلجووقییەکان کە رکابەری هەبوو لەنێوانیان لەسەر شاری (موسڵ) ئەویش (جكرمش) و (جاولي سقاوو) بوون، لەکاتی ململانێیەکەی، میری کورد بەشێوەیەکی جدیانە هەوڵی دەدا ئەو مەترسییانەو گێروگرفتانە لە وڵاتەکەی دووربخاتەوە، بۆ ئەوەی نەکەوێتە ژێر دەستیان و کۆنترۆڵی بکەن.

سەلجووقییەکان زانیارییەکی باشیان هەبوو دەربارەی ئەوەی کە هەزبانییەکان سەروەری و دەسەڵات و هێزیان هەیە لەئەربل، لەبەر ئەوە پێیان باش بوو میرنشینەکان بمێننەوەو دانی پێدانێن، هەروەها رێیان پێبدەن بۆ ئەوەی حوکم و ئیدارەی خۆیان بەرێوەببەن لەناوچەکەدا، سەلجووقییەکان بەگوێڕایەڵی ئەو میرنشینانەو لایەنگیریيان رازی بوون و پێیان بەس بوو، بەڵام ئەو سەربەخۆبەی، کە شاری (ئەربل) هەیبوو، کاتێکی زۆری نەبرد و بەردەوام نەبوو، هەر زوو نەما، ئەویش بەهۆی بەدیارکەوتنی ئەتابک (عمادالدين زنگی) کە رۆڵێکی زۆری هەبوو لە کەوتن و نەمانی ئەو میرنشینە، (عمادالدين) ناسراو بوو بەتەماحکاری و فراوانکردنی دەسەڵاتی، بەوەش (ئەربل) کەوتە نێو موڵکەکانی خۆی لەسالی ٥٢٦ک/ ١١٣١ز.

سەرچاوەکان:

- زكريا كتابچي، الترك في مؤلفات الجاحظ، بيروت، ١٩٧٢، ص١٩.
بارتولد، تركستان، ترجمة صلاح الدين عثمان هاشم، الكويت، ١٩٨٠/ ص ص١١٤-٢٣٨.
- ابن حسول، كتاب تفضيل الاتراك علي سائد الأجناد، بغداد، ١٩٤٠.

* (قامبری) وای دەبینێ کە رێزمانی زمانی تورکی رێ وێنەکردنی هەر وشەیە بکەن بەم شێوەیە: (سیلجوقی

یان سالجوق، تأریخ بخاری، ترجمة احمد محمود الساداتي، قاهیرة ١٩٦٥ ص١٢٧، دەقاق یان تفاق، ماناشی بەتورکی (کەوانی ئاسنی)، ابن الأثیر، الكامل في التاریخ، بیروت، ١٩٧٨ز، ج٢٩، ص٤٧٣.

- زۆرینەی لێکۆڵەرەوەکان مێژووی سەلجووقییەکان وەرگرت، لەوانە: (تامارا رایس، السلاجقة: تأریخهم وحضارتهم، ترجمة لطفي الخوري، ابراهيم الداقوقي، بغداد، حسين أمين، تاريخ العراق في عصر السلاجقة، بغداد ١٩٦٥.
- الحسيني، اخبار الدولة السلجوقية، تحقيق محمد نورالدين، بيروت ١٩٨٦، ص-٢٣-. ٢٤

Ehcyof Islam, vot IV, P 2008

- راحة الصدور واية السرور، القاهرة ١٩٦٠، ص١٤٥.
- عن التفاصيل الخاصة الديانة السلاجقة قبل دخولهم الاسلام يراجع نيشتمان بشير محمد، الكورد والسلاجقة، اطروحة ودكتوراه جامعة صلاح الدين، ٢٠٠١، ص٧٠-٧١.
- الحسيني، اخبار الدولة السلجوقية، ص٢٤، هارت، دائرة المعارف الاسلامية، مادة السلاجقة، ج١٢، ص٤٥.
- الطرديزي، زين الاخبار، تهران، ١٩٨٤، ص٤٢٥-٤١٦، ابن الأثير، الكامل، ج٩، ص٤٧٤.
- طغرل بك: ناوێکی تورکییە لەدوو بەش پێکدێت: گەغرل: لەسەر ناوی باڵندەیەک هاتووە، کە لەلای ئەوان هەیە، بک: بەمانای (میر) دێت، ابن خلكان، و فيات الاعيان، تحقيق احسان عباس، بيروت، ١٩٦٨، مج٥، ص٦٨.
- ستانلي لين ثول، الدول الاسلامية، ترجمة محمد صبحي فرزات، دمشق ١٩٧٣، ق١، ص٣١٩.
- عباس اقبال، الوزارة في عهد السلاجقة، ترجمة احمد كمال الدين، الكويت، ١٩٨٤، ص٣٢.
- عن موقع جرجان وطبرستان وخوارزم ينظر: ياقوت الحموي، معجم البلدان، بيروت، د.ت.
- عبدالنعيم محمد حسنين، سلاجقة ايران والعراق، القاهرة ١٩٧٠، ص٢١.
- للمزيد من المعلومات عن الامارة العنازية ينظر: حسام الدين النقشبندي الكورد في الدينورو شهرزور خلال القرنين الرابع والخامس الهجرين، رسالة ماجستير، جامعة بغداد ١٩٧٥.
- عن هذه الامارة يراجع حسام الدين النقشبندي، اذربيجان دراسة سياسية حضارية، اطروحة دكتوراه، جامعة بغداد ١٩٨٤.
- اسماعيل شكر رسول، الشداديون في بلاد اران، رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٤.
- راجع: الفارقي، تاريخ امد وميافارقين (تاريخ ميافارقين) تحقيق بدوي عبداللطيف عوض، القاهرة، ١٩٥٩.
- احمد عبدالعزيز محمود، الهذبانيون في اذربيجان وأربل، رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين ١٩٩٠، يذكر ابن الأثير ضمن حوادث ٤٤٠هـ، الخلاف بين احد الامراء العقليين مع الاكراد الحميدية والهذبانية يشير بيان للحميدية عدة حصون تجاور الموصل منها العقر، والهذبانية قلعة اربيل واعمالها، الكامل في التاريخ ٥٤٩/٩.
- عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية في كوردستان الوسطي، بغداد، ١٩٧٥، ٢٢٠/١.

* ناوی هەولێر لە نووسینەکانی مێژوویی لەماوەی سەردەمەکان زۆر هاتووە، کۆنترین ئیشارەت لە نووسینەکانی مەلیکی سومەری شولکی پێش ٢٠٠٠ ق.م بصيغة (أوربيلون) أو (أوربليوم) هەروەها بەشێوەی (Arbila). بۆ زیاتر لەناوەکانی تایبەت بەناوی آربیل، سەیری: ئیسماعیل شوکری رەسول، هەولێر لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لەرۆڵی فیکری و سیاسی، نامەی دکتۆراه، جامعة صلاح الدين ١٩٩٩، ص ص٩-١١.

- اسماعيل شكر رسول، أربيل دراسة تاريخية ص١٠.
- احمد عبدالعزيز محمود، الامارة الهذبانية ص٣٤.
- محمود، الامارة الهذبانية، ص٣٤، دائرة المعارف الاسلامية، مادة أربل، ٥١٧.
- ينظر، الامارة الهذبانية في أربل ص٤١-٤٢.
- ابن الأثير، الكامل في التاريخ ٥٣١/٩، ابو الغداء، القاهرة د.ت ١٦٨/٢.
- الكامل، ٤٣١/٩.

* حكمت العقيلية في الموصل من (٣٨٠-٤٨٩ك/ ٩٩٠-١٠٩٦ز.

- الكامل، ٥٤٩/٩.
- ابن الجوزي، المنتظم، حيدر اباد، ١٣٥٧، ٢٧٩/٨ البنداري، تاريخ دولة ال سلجوق، ص٤٨.
- الكامل، ٦٣٥/١٠، ابن المستوفي، تاريخ اربل، تحقيق سامي بن السيد خماس الصفار، بغداد، ١٩٨٠، ٤٦٢/٢.
- اسامة بن منقذ، كتاب الاعتبار ص٨٧.
- الكامل، ٢٥٨/١٠-٢٥٩.
- ن.م.س، ارسن موسا رشيد، الهذبانيون ودورهم سياسي والعسكري في القرن الخامس الهجري، بحث مقدم الي كلية الأداب، جامعة صلاح الدين، ١٩٨٥، ص٩.
- محمود، الهذبانيون ص١٠٥.
- سبط بن الجوزي، مرآة الزمان، ص١٨٩، أبو شامة، الروضتين، ج١، ق١، ص٧٧، ابن واصل، مفرج الكروب، ٩٨/١، للمذيد ينظر: محمود، الهذبانيون، ص ص٥٨-٦٢.

# بولدانییەکان
# (هەولێر لای وڵاتناس و گەڕیدە موسڵمانەکان لە سەدەی سێ تا هەشتی کۆچی ١٤٠٩ز)

دکتۆر حەکیم ئەحمەد خۆشناو
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەدین

لێکۆڵینەوەی بولدانییەکان بایەخێکی تایبەتی خۆی هەیە، لەنێو بەشە زانستییەکانی دیکەدا، زانستی وڵاتان راستەوخۆ پەیوەندی بەزانستی مێژووەوە هەیە، بەوەی کە دوو جمکەن و لەیەک جیانابنەوە، هەر یەکەو لەخزمەت ئەوی دیکە دایە، هەروەک دەرکەوتنیشیان هاوکاتی یەک بووە، تەنانەت بگرە ژمارەیەک لەمێژوونووسان هاوکاتی بولدانیش بوونە.

ئەنجامدانی کاری هەر مێژوونووسێک یان بولدانییەک یەکێکیان تەواوکەری ئەوی دیکەیە. هەڵبەتە ئەوەندە بەس نییە، کە یەکێک شێوەیەکی روونی جیهان بەجۆرەها رەهەند دەربارەی کۆمەڵگایەک پێشکەش بکات بەبێ ئەوی دیکە.

ئاشکرایە مێژوو و نووسینەوەی مێژوو جەخت لەسەر گۆڕانکارییە سیاسی و سەربازییەکانی نەتەوەو کۆمەڵگاکان و رێکخراوەکان لە چاخە جیا جیاکاندا دەکاتەوە، زۆر بە کەمی نەبێ ئاوڕ لەکاروباری ژیانی گشتی نادەنەوە، وەک: بارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و بیناسازی..تاد. بولدانییەکان لەمیانەی نووسینەکانیان و گەشتەکانیاندا هەر ئەوانە چارەسەر دەکەن، کە گۆشەنیگایەکی دیاریکراویان بەجێهێشتووە و لەکتێبەکان و پەیامە تایبەتییەکانیاندا نووسیوە.

ئەمەش وادەکات لێکۆڵینەوەی بولیدانییەکان و مێژووی شارەکان، بایەخێکی گەورەی مێژوویی پێ بدرێت.

بولدانییەکان (سەدەی سێی کۆچی/ نۆی زایینی) ناوی شاری هەولێریان نەبردووە، جگە لە ئیبن خرداذبە نەبێت[1]. کە کتێبەکەی (أرض السواد) -دل ایرانشهر- بۆ دوانزە (کورە)ی[2] دابەش کردووە، بە واتا یەکەیەکی ئیدارییە و لەئیدارەی هەرێمێک بچووکترە. لەوانە کورەی ئەستان شاذ فەیرۆز، کە پێنج (تەساسیج)[3] لەخۆ دەگرێت، هەولێریش یەکێک بووە لەو تەساسیجانە. هەروەها بولدانییەکان لە سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایینی، "تەنیا قودامە بن جەعفەر" نەبێ[4]، کە ئەوەی خرداذبە، باسی کردووە ئەویش دووپاتی کردۆتەوە.

بێگومان پشت گوێخستنی

شاری هەولێر بەدرێژایی چاخەکانی یەکەمی مێژووی ئیسلامی لەلایەن هەموو مێژوونووسان و بولدانییە موسڵمانەکان، دەگەڕێتەوە بۆ بێ هێزی کاروبارەکانی لەو ماوەیەدا.

وێڕای ئەوەی گێرانەوەی مێژووی وا هەیە، کە ئەو شارە لەنیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەمی کۆچی ڕۆڵی سیاسی بینیوە، کاتێ هەزبانییەکان[٥] هەتا دەیەی سێیەم لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا کردبوویان بە بنکەی میرنشینی خۆیان، بەڵام شارەکە ڕۆڵێکی وا ئاشکراو بەرچاو و کاریگەری نەبوو تا دەگاتە سەردەمی ئەتابەگییەکان (٥٢٢-٦٣٠ک/ ١١٢٨-١٢٣٣ز) کە گەورەییەکی بێ وێنەو بەرفراوانی بەخۆوە بینی[٦] تا وای لێهات قەڵات نەیتوانی ئەو دانیشتوانە زۆرە لەخۆ بگرێت، بۆیە ناچار بوون زەوی و زارێکی زۆر لەناوچە دەشتاییەکانی کەوتۆتە باشوورو باشووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای قەڵات بەکارهێنا[٧].

یاقوت ئەلحەمەوی[٨] کە لە سەردەمی ئەتابەکی شاری هەولێر ژیاوە، وردکارییەکی زۆری دەربارەی لایەنەکانی جوگرافی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی باس کردووە. ئەمەو شارەکەی پێناسە کردووە بەوەی، کە بریتییە لە قەڵاتێکی قایم و شارێکی گەورە، کە زەوی و زاری دەشتێکی بەرفراوانی دابڕیوە، لەلایەکی قەڵات خەندەکێکی قووڵ و دیوارێکی شارەکە هەیە لەنیوەی دەپچڕێت. هەروەها وەسفی دەکات و دەڵێت: شارەکە لەسەر گردێکی بەرزو سەروو فراوان دروست کراوە. کەوتۆتە نێوان هەردوو زێی گەورەو بچووک. سەرەڕای ئەوە دەڵێت: شارێکی گەورە و بەرفراوان و دوورو درێژە، موزەفەرەدین گوگبری بن زەینەدین ئاوەدانی کردۆتەوە و شوورەیێکی بۆ دروست کردووە، لەماوەی(٥٨٩-٦٣٠ک/ ١١٩٠-١٢٣٣ز) حوکمڕانی شارەکەی بەدەستەوە بووە[٩].

لەلایەکی دیکە گەر سەرنج بدەین بازارێک و خانەی چاودێری و مزگەوتێکی نوێژکردن لەناو قەڵات هەبووە. هەروەها جۆرێک لەیەکچوون لەنێوان هەردوو قەڵاتی هەولێرو حەلەبیش هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوە هی هەولێر گەورەترو بەرفراوانترو بەرزتر بووە[١٠].

یاقوت سەرنجی شارەکەی بەوە داوە، کە سیمای گوندێکی هەبووە، کە دەڵێت: "لەگەڵ بەرفراوانی ئەو شارە لەرووی دامەزراندن و گۆشەنیگاکەیەوە گوندێکەو لە شار دەکا". هەروەها ژمارەیەک قەڵاتی دیکە سەر بەشارەکە بوون، بەڵام یاقوت بەناو ناویان نابات. هەروەها دەڵێت: هیچ باخچەیەک لە دەوری شارەکە نییە و رووبارێکیش پێیدا تێپەڕ نابێ، بەڵکو پشت بەئاوی شیرینی بیرەکان دەبەستن[١١].

بەڵام سەبارەت بەدانیشتوانی هەولێرو دەوروبەرەکەی یاقوت جەخت دەکاتەوەو دەڵێت: "زۆرینەی خەڵکەکەی کوردن، تەواوی جووتیارەکان و پاککەرەوەکان کوردن"[١٢]. بەبێ ئەوەی ئاماژە بە نەتەوەیەکی دیکەی غەیرە کورد بدات.

یاقوت دەڵێت: کاتێ چۆتە ناو شاری هەولێر ناودار و گەورەیەکی نەبینی، جگە لە ئەبی بەرەکات موبارەک کوڕی ئەحمەد کوڕی موبارەک کوڕی مەوهوب کوڕی غەنیمە کوڕی غالب ناسراو بەئیبن مستەوفی، کە وەسفی دەکات بەوەی (شارەزا بووە لە ئەدەب- خۆشەویستی کەس و کارەکەی بووە- لەسەریان گەورە بووە - ئاینپەروەر بووە- پەیوەندی بەسوڵتانەوە هەبووە پێگەشی بەوەزارەتێک دەچوو)، هەروەها دەڵێت: ئیبن مستەوفی گوێی لە فەرموودەیەکی زۆری پێغەمبەر "د.خ" لەو زانایانەی، کە تەشریفیان بۆ هەولێر هێنا بوو گرتووە، ژمارەیەک کتێبی داناوە، شاعیریش بووە. هەندێ لە شیعرەکانی بۆ یاقوت ناردووە و نموونە بەهەندێ دێڕ دێنێتەوە:

**تذكرينك الريح مرت عليلة**
**على الروض مطلولا وقد وضح الفجر**
**وما بعدت دار ولاشط منزل**
**اذا نحن ادنتنا الأماني والذكر**[١٣]

هەروەها یاقوت ئاماژەی بە ژمارەیەک لە زانایان و فەرموودە زانەکان داوە، کە خەڵکی هەولێرن، لەوانە: قاسم بن موزدفەر شارەزووری شەیبانی و هی دیکەش..[١٤].

لەکۆتایی باسەکەیدا لەسەر شاری هەولێر چەند دێرە شیعرێکی جنێودانی شاعیر، نۆشێروان بەغدادی ناسراو بەشەیتانی عێراق هێناوەتەوە. شێوازەکەی لەشیعری کۆمێدی و پێکەنیناوی بووە. تێیدا باس لە (زاراوەی بەغدادی و کوردەکان) دەکات، پاشان پاشگەز بۆتەوەو خودی خۆی بەدرۆ دەخاتەوە، بەدانانی تێکستێکی دیکەی شیعری، کە تیایدا ستایشی هەولێرو خەڵکەکەی دەکات، لەهەمان کاتدا پۆزش بۆ خۆی دێنێتەوە لەو جنێوانەی بە هەولێری داوە.

لە تێکستی یەکەمدا کە جنێوە بەشارەکەو خەڵکەکەی دەدات:

**تبا لشيطاني وما سولا**
**لأنه انزلني اربلا**
**نزلتها في يوم نحسي فما**
**شكلت أني نازل كربلا**
**وقلت ما أخطأ الذي مذلا**
**باربل اذ قال بيت الخلا**
**هذا وفي البازار قوم اذا**
**عاينتهم عاينت اهل البلا**
**من كل كردي حمار ومن**
**كل عراقي نفاه الغلا**
**اما العراقيون الفاظهم**
**جب لي جفاني جفاني جف جال الجلا**
**جمالك اي جعجع جبة تبحي**
**تجب جماله قبل ان ترجلا**
**هيا مخا عيطي الكشجلي مثني**
**كف المكفني اللنك أي ابو العلا**
**والكرد لاتسمع الا جيا**
**أو تجيا أو نتوي زنكلا**
**كلا ويوبو علكوا خشتري**
**خيلوا وميلوا موسكا منكلا**
**قحوا ومقوا ممكي ثم آن**
**قالوا بو يركي تبحي قلت لا**
**ربع خلا من كل خير بلي**
**من كل عيب ليس فيه ملا**
**فلعنة الله علي شاعر**
**يقصد ربعا ليس فيه كلا**
**أخطأت والمخطيء في مذهبي**
**يصفح في قعة بالدلا**

ئەو تێکستەی وەک پۆزش لەجنێودانەکەی هەولێر هێناویەتییەوە هاتووە:

**قد تاب شيطاني وقد قال لي**
**لا عدت أهجو بعدها اربلا**
**واقصد الى اربل واربع بها**
**ولاتقل ربعا قليل الكلا**
**وقل انا أخطات فی ذمها**
**وحط فی رأسک خلع الدلا**
**يا اربليين اسمعوا كلمه**
**قد قال شيطاني واسترسلا**
**فالآن عنكم قد هجا نفسه**
**بكل قول يخرس المقولا**
**هيج ذلك الهجو عن ربعكم**
**كل أخير ينقض الأولا[١٥]**

لەلایەکی دیکە یاقوت لە کتێبەکەیدا باس لە ژمارەیەک شارو گوند دەکات، کە سەر بەهەولێر بوونە یاخود نزیکبوونە لێی، لەوانە:

* شەقلاباد: گوندێکی گەورە بووە لە کەنار چیایەک، کە لەهەولێر درێژ دەبێتەوە، خەڵکەکەی بەرێز بوونەو باخچەیەکی زۆریشی لێیە[١٦].

* گوندی باکلبا: فەقیە ئەبو عەبدوڵڵا حوسێن بن شروین بن ئەبی بەشر جەلالی باکلبی خەڵکی ئەو گوندەیەو هاورێی یاقوتیش بووە[١٧].

* گوندی تەل خوسا: کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری هەولێرو موسڵ، لە زێ نزیکە [١٨].

* گوندی بێت نار: یەکێکە لە گوندە گەورەکانی سەر بەشاری هەولێر، بە (٨) میل لە شارەکە دوورە[١٩].

یاقوت ناوی ئەو گوندەی ئیستیغلال کردووە بەوەی، کە خەڵکەکەی رۆژێ لەرۆژان لەسەر ئایینی زەردەشت بوون، لە یەکێ لە شاعیرەکان، کە ناوی عەبدولرەحمان کوری موستەخەف بووە ئەو چەند دێرە شیعرەی لێ گواستۆتەوە، کە جنێو بەشاری هەولێر دەدات:

**اربل دار الفسق حقا فلا**
**يعتمد العاقل تغريزها**
**لو لم تكن دار فسوق لما**
**اصبح بيت النار دهليزها[٢٠]**

* گوندی مەمدوح ئاباد: گوندێکی گەورەیە لەنزیک زێی

گەورە، کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری هەولێرو موسڵ[21].

بەڵام بولدانی ناسی مەغریبی ئیبن سەعید ئەلمەغریبی[22] تەنیا باسی لەوە کردووە، کە شاری هەولێر بنکەیەک بووە[23] لە وڵاتی شارەزوور.

هەروەها قەزوینی[24]، گەڕیدە بەم شێوەیە باسی شاری هەولێر دەکات و دەڵێت: "شارێکە کەوتۆتە نێوان دوو زێ، قەڵاتێکی قایمی هەیەو تەتەرەکان نەیانتوانی زەفەری پێ ببەن، مزگەوتێکی تێدایە بەناوی مزگەوتی کەف، بەردی تیایە شوێنەواری دەستی مرۆڤی بەسەرەوە دیارە، لای خەڵکی هەولێر لەم بارەوە قسەو باسی زۆر هەیە، گومان لەوەدا نییە، کە شتێکی سەرسورهێنەرە)[25].

هەروەها ئەوەشی خستۆتە سەر، کە شا موزەفەرەدین گۆگبری بن زەینەدین عەلی کوچک خەڵکی ئەو شارەیەو لەهەمان کاتدا وەسفی دەکات بەوەی، کە (پاشایەکی ئازاو سوارچاکێکی لێهاتوو بووە)، سۆفی بووە، بۆ سۆفیگەران خانەیەکی دروست کردووەو تیایدا بە بەردەوامی. دووسەد سۆفی لەوێ ژیاون و نانیان هەر لەوێ خواردووە، هەموو شەوانی هەینی بەسەماو زیکر زیندوویان کردۆتەوە. چاکەی لەگەڵ هەموو ئەوانە کردووە، کە سۆفی بوون یاخود ئەو کارەیان ئەنجامداوە،

کاتێکیش ویستوویانە گەشت بکەن دینارێکی پێداون. هەروەها بۆ زانایان و خێرخوازان و چاکسازیخوازانیش بەقەدەر پلەو پایەکەیان هاوکاری کردوون[26].

زۆر بەتەنگ گیانی موسڵمانە دیلەکانەوە بووە، تەنانەت بگرە پارەو پوولێکی زۆری بۆ خاچپەرستەکان ناردووە لەبەر خاتری دیلەکان[27].

هەروا نەریتی وابووە ساڵانە پێشوازی لە مانگی لەدایکبوونی پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) کردووەو ئامادەباشی خۆی وەرگرتووە بۆ ئاهەنگێران لەو رۆژەدا. هەر لەدەیەی مانگی رەبیعی یەکەم سفرەی نانخواردنی بەجوانترین شێوە بەخواردنی گرانبەها دەرازاندەوە. لەهەموو لایەکەوە دانیشتوانی دەوروبەر روویان تێ دەکرد. لە دوانزەی هەمان مانگدا داوەتێکی گەورەی ئامادە دەکردو سەرجەم ئامادەبووان کۆدەبوونەوە هەریەکە بە حوشترێکەوە دەگەڕایەوە، بەپێی ئەوەی قەزوینی باسی دەکات[28].

هەر یەک لەیاقووت[29] و قەزوینی[30] باس لە (دێر) دەکەن بەناوی (دێری بیر/ دير الجب)، کە کەوتۆتە نێوان موسڵ و هەولێر. خەڵکەکە بەمەبەستی ئەوەی (فێ)یان لەسەر لابچێت کە فێدار بوون بەو باوەڕە چوونەتە سەری، زۆر کەسیش بەو هۆیەوە چاک بوونەتەوەو شیفایان بۆ هاتووە.

قەزوینی ئاماژەی بەهاتنی شێخ شەهابەدین عومەر سەهرەوەردی کردووە، کە بۆ هەولێر هاتووەو لە خانەی سۆفیگەران دابەزیوە و لەلایەن خەڵکی هەولێرەوە بەگەرمی پێشوازی لێ کراوە.[31]

لەلایەکی دیکە ئاماژەی بەفەرمانڕەوای هەولێر داوە، کە باوەڕیان بە شێخ ئەبی حامید ئەحمەد کرمانی بە نازناوی ئەوحەدەدین" هەبووە، باسی دەکات و دەڵێت: "شێخێکی پیرۆزو خاوەن کەرامات بووە، قوتابی هەبووە، خلوەی کێشاوەو شیعری بەفارسی هەبووە". پاشان هەولێری جێهێشتووەو لە فەرمانڕەوای هەولێر جیا بۆتەوە، چونکە ئازاری دابوو. ئەمەشی لە تێکستێکی شیعری فارسیدا هۆنیوەتەوەو تیایدا هاتووە:

**با دل گفتم خدمت شاهي كم گير**
**چون سر نهاده كلاهي كم گير**
**دل گفت مرا ازين سخن كمترگو**
**كـردي و دهي وخـانقـاهي كم گير**[32].

ئەمە بە کورتی ئەو باس و نووسینانەی بولدانییەکان و گەڕیدە موسڵمانەکان بوو، لە سەردەمی سێیەمی کۆچی تا کۆتایی سەدەی حەوتەمی کۆچی، کە سەبارەت بە جوگرافیا و زانیاری جۆراو جۆر لە رامیاری و زانست و کۆمەڵایەتی و ئایینی، ئەمە سەرەڕای تێڕوانینی خۆیان.

**پەراوێزەکان:**

١- ابن خرداذبه (ت/ حوالی ٣٠٠هـ/ ٩٣٢م) ئەبو قاسم عوبەیدوڵلای کوری ئەحمەد، لە سەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچی لەدایکبووە، کاری (صاحب البرید والخبر) لە هەرێمی (جبال) پێ سپێردراوە، چەندین کتێبی لە بوارە جیا جیاکان هەیە، کتێبی (الکسالک والممالک) تاکە کتێبی ئەوە، کە دۆزراوێتەوە، یەکەم کتێبی ئیسلامیشە کە بە زمانی عەرەبی وتاری سەبارەت بە جوگرافیا بەخۆوە گرتبێ. بۆ زیاتر بڕوانە: ابن القدیم، الفهرست، (بیروت: د.ت)، ص١٤٩، عباس العزاوي، تاریخ الجغرافیة أو کتب البلدان، مخطوطة موجودة في دار صدام للمخطوطات تحت رقم ٣٢، ورقة ١٤.، نیقولا زیادة، الجغرافیة والعلات عند العرب، (بیروت: ١٩٦٢)، ص١٨، احمد رمضان احمد، الرحلة والرحالة المسلمون، (القاهرة: د.ت)، ص٥٥، دائرة المعارف الاسلامیة ج١، مادة ابن خرداذبة، ص٢٦٨.

٢- الکورة: بچووکترین یەکەی کارگێڕییە لە هەرێم، کە چەند شار و ڕەساتیقێک دەگرێتەوە و بە فارسی مانای ددانەکان دەبەخشێت. ئەم ڕووبەرەش لەزەوی چەندان گوندی دەوروبەری شار دەگەیەنێ. بڕوانە: لسان العرب، ج١٠، ص١١٦، یاقوت، معجم البلدان، ج١، ص٣٩.

٣- گساسیج: کۆی (طسوج)ە، کە یەکەیەکی کارگێڕی بچووکترە لە (کورە) ورەساتیق و ئەستان، وەک ئەوەی بەشێک بێت لە بە شەکانی (کورە) یاقوت، المصدر السابق، ج١، ص٤٠.

٤- قدامة بن جعفر: (ت ٣١٠هـ/ ٩٢٢م): مەسیحی بوو، لەسەر دەستی خەلیفە (موکتەفی) (٢٨٩-٢٩٥هـ/ ٩٠٢-٩٠٨م) موسڵمان بووە، لە گەورە نووسەرانە و کاروباری کارگێڕی بەدەستەوە گرتووە، نووسینەکانی جۆراو جۆرن، لەوانە: کتێبی (الخراج وصنعة الکتابة) کە لە هەشت بەشی کتێبەکەی تەنیا چوار بەشی بە دەستمان گەیشتووە. ابن الندیم، المصدر السابق، ص١٣٠، کراتشکوفسکي، تاریخ الادب الجغرافي العربي، ترجمة: صلاح الدین عثمان هاشم، (القاهرة: ١٩٥٧)، ق١، ص١٦٥.

٥- بۆ زیاتر بڕوانە: احمد عبدالعزیز محمود الهذبانیون في اذربیجان واربل والجزیرة الفراتیو، ٢٣٩-٦٥٦ه/ ٩٠٥-١٢٥٨م)، رسالة ماجستیر، کلیة الاداب- کامعة صلاح الدین ١٩٩٠.

٦- بڕوانە: محسن محمد حسین، اربل في العهد الاتابکي (٥٢٢-٦٣٠ه/ ١١٢٨-١٢٣٣م).

٧- صلاح الدین الجنابي، الترکیب الداخلي لمدینة اربیل، مجلة الجمعیة الجغرافیة العراقیة، بغداد، (کانون اول: ١٩٨٠)، مج١١، ص٣١٢-٣١٣.

٨- یاقوت الحموي: ئەبو عەبدوڵلا یاقوتی کوری عەبدوڵلا شەهاب بەغدادی لە ساڵی (٥٧٥ک/ ١١٧٩ز) لە وڵاتی رۆم ٥٧٥هـ/ ١١٧٩م في بلاد الروم ثم اسر وهو صغیر السن من بلده فقبل له الرومي دارتاشێکی بەغدادی دەیکڕێ و دواتر بازرگانێکی بەغدادی بەناوی عسکر اي نصر الحموي) دەیکڕێ، فنسب الیه او الي مدینة حماه، لە معاجم ومؤلفات متنوعة. توفي سنة ٦٢٦ه/ ١٢٢٩م، ابن خلکان، وفیات الاعیان، تحقیق: احسان عباس، (بیروت: د.ت) ج٥، ص١٠٤.

٩- یاقوت، معجم البلدان، ج١، ص١١٦، محسن محمد حسین، المرجع السابق.

١٠- هەمان سەرچاوە، ج١، لا ١١٧.

١١- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

١٢- هەمان سەرچاوە. لا ١١٦.

١٣- هەمان سەرچاوە. لا ١١٨.

١٤- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

١٥- هەمان سەرچاوە. لا ١١٧-١١٨.

١٦- هەمان سەرچاوە، ج٣، لا ١٥٠.

١٧- هەمان سەرچاوە، ج٢، لا ٢٦٢.

١٨- هەمان سەرچاوە، ج٢، لا ٤٥٢.

١٩- هەمان سەرچاوە. ج٢، لا ٤١١.

٢٠- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٢١- هەمان سەرچاوە. ج٨، لا ٣١٩.

٢٢- ئەبو حەسەن عەلی کوری سەعید کوری موسا کوری عەبدولمەلیکی مەغریبی لە ساڵی (٦١٠ک/ ١٢١٤ز) لە (غەرناتە) لەدایک بووە. هەردوو بەهرەی شیعر و عەقڵانی تێدابوو، ژمارەیەک کتێبی داناوە، لەوانە کتێبی جوگرافیا، لە ساڵی ٦٧٣ک/ ١٢٧٤ز) بڕوانە: ابن سعید المغربي، کتاب الجغرافیا، تحقیق: اسماعیل العربي، مقدمة المحقق، ص ص ٥-١٥.

٢٣- هەمان سەرچاوە. لا ١٥٨.

٢٤- قەزوینی: ئەبو عەبدوڵلا زەکەریا کوری محەمەد لە ساڵی (٦٢٢ک/ ١٢٨٣ز) کۆچی دوایی کردووە، لە بەرهەمەکانی: اثار البلاد واخبار العباد وعجائب المخلوقات وغرائب الموجودات.

٢٥- القزویني، اثار البلاد، (بیروت: ١٩٦٠)، لا ٢٩٠.

٢٦- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٢٧- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٢٨- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٢٩- یاقوت، هەمان سەرچاوە، ج٤، لا ٣٣٧.

٣٠- هەمان سەرچاوە، لا ٣٦٩.

٣١- هەمان سەرچاوە، لا ٤٣٩.

٣٢- هەمان سەرچاوە، لا ٢٤٨.

# هەزبانییەكان لە هەولێر رۆڵی سیاسی و سەربازییان لە سەدەی پێنجی كۆچیدا

دكتۆر ئارسن موسا رەشید
كۆلیژی ئاداب - زانكۆی سەلاحەددین

**دەستپێک**

مێژووی هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگی كە لای خەڵک ناسراوە مێژوونووسانیش لە نووسینەكانیاندا باسیان لەم سەردەمە كردووە، مێژوونووسە هاوچەرخەكانیان ئەوانەی كە پاش ئەو بەكەمێک ژیاون وەک ئیبن ئەسیرو ئیبن خەلەكان و ئیبن مستەوفی و هی دیكە.

لەسەردەمی ئەتابەگی شێوەیەک لە تەمومژی بەهۆی پشتگوێ خستنی مێژوونووسان بەخۆوە دیوە، بۆیە سەختە توێژەر باس لەو قۆناغە بە تایبەتی فەرمانڕەواكانی هەولێر لە هەزبانییەكان بكات.

تەنانەت رووداوە باس لێكراوەكان بەپێی ئەو زەمەنە دوورو درێژە زۆر كەمن. بۆیە زۆر زەحمەتە كاتێ بتەوێت كە لەسەر ئەم سەردەمە بنووسیت، ئەمەش لەبەر كەمی سەرچاوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هەوڵ دەدەین پەردە لەسەر هەندێ لەو شاراوانە لابدەین لەمیانەی ناوهێنانی حوكمڕان و بنەچەكەیان و ئەو شوێنەی لێیەوە هاتوون و ماوەی حوكمڕانییەكەیان و ئەو كارەیان بۆ شاری هەولێریان كردووە. تاچەند بەشدارییان كردووە لە رووداوەكانی ناوچەكەو هەڵوێستیان لەبەرامبەر سولجوقییە توركەكان و چۆنیەتی دەست بەسەرداگرتنی هەولێر لەلایەن عیمادەدین زەنكی و خستنە سەر میرنشینەكەی كە لەموسڵ بوو.

**وشەی هەزبانی مانای چییە؟**

بەر لەوەی دەست بەلێكۆڵینەوە بكەین... پێویستە بزانین وشەی هەزبانی مانای چییەو چی دەگەیەنێت و بۆچی ئەو هۆزە بەو ناوە ناوبراوە. جەمیل رۆژبەیانی وای دەبینێت، كە هەزبانییە لەهیزانی یان خێزانی كوردییەوە هاتووە، كە لە سەرتاسەری هەولێر- ئازربێجان نیشتەجێ بوون[1]. بەڵام دكتۆر حوسامەدین نەقشبەندی لە دەرەنجامەكەیدا لەگەڵ رۆژبەیانی یەک ناگرێتەوەو دەڵێت: (ئێمە لەگەڵ رۆژبەیانی نین، لەبەرئەوەی هۆزێک بەناوی هیزانی یان خیزانی لەهیچ سەرچاوەیەک نەهاتووە. بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە هەزبانی لەهزینی وەرگیرابێ (ئەزینی تائیتاش لەگەڵدابێت بەناوچەیەكی بادینانی كوردنشین دەگوترێت شوێنی هەزبانییەكان كە بەواتای سەید دێت، بۆیە ئەو ناوەشی لێنراوە، چونكە لەمیانەی قسەكردنیاندا ئەو وشەیەیان زۆر بەكارهێناوە[2].

گوتەی دكتۆر حوسامەدین قسەی شەرەف خانی بەدلیسی رەت دەكاتەوە، كە لەكتێبی شەرەفخان هاتووە هۆزێكی كوردی هەیە بەناوی خیزان[3]. ئەم هۆزە واتە (خیزان) ئەو

هۆزە نییە، کە ئێمە باسی لێوە دەکەین، واتە (هەزبانییە)، چونکە بەدلیسی دەڵێت: خەڵک هەر لەدێر زەمانەوە پێیان گوتوون سەحەر خێزان[٤]. بەڵام هەزابی، بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان لەناوچەی بادینان کۆچیان کردووە بۆ ئازربێجان، جا لەسەر ئەو بنەمایەوە ئەگەری ئەوە هەیە کە دەرەنجامی دکتۆر حوسامەدین دروست و راست بێ کە هەزبانییە لە هەزینی واتە (سەید) وەرگیراوە.

## هەزبانییەکان کێن و نیشتەجێی رەسەنیان

کاتێ بمانەوێ باس لە هەزبانییەکان بکەین پێویستە بگەڕێینەوە بۆ سەر رەسەن و شوێنی نیشتەجێبوونیان پێش حوکمڕانی کردنیان لە هەولێرو ئازربێجان. سەرچاوەکان باس لەناوی هۆزنیشنە کوردییەکان دەکەن، کە لەناوچەی شارەزوورو دەوروبەری شاری موسڵ و ئازربێجان نیشتەجێ بوون، بەوەی کە هەزبانییەکان هۆزێکی گەورەی کوردین و یەکێکە لە هۆزە کوردییەکان.

مەسعودی ناوی شانزە هۆزنشینی کوردی[٥] باس کردووە، وەک بازنجان و شوهجان و شازنجان و نشاورو بوزیکان و لوری و جوزقان و گاوانی و باریسان و جەلالیەو گەلالیەو موستەکان و جابارقەو جوفان و کیکان و ماجردان و هەزبانییە.

هەروەها مەسعودی شوێنی نیشتەجێبوونیشیان دەخاتە سەر ناوەکانیان و دەڵێت: فارس و کرمان و سجستان و خوراسان و ئەسبەهان و خاکی چیا و شارەکان شاری کوفەو[٦] شاری بەسرە[٧] شاری سبزان و ئیگارین هەردووکیان بورج و کەرج ئەبی دلف. هەمەزان و شارەزوورو زەراباد و سامگان و ئازربێجان و ئەرمیەو شاران و بیلقان و دەرگاو دەرگاکان لەدوورگەو شام و کەلەبەردا[٨] ئەمەو بەپێی قسەی مەسعودی کورد لە شانزە هۆزنیشنی گەورە پێکهاتووەو لەناوچە جیا جیاکانی ئیراق و فارس و ئازربێجان و زۆر ناوچەی دیکە کە باس کراوە نیشتەجێن.

بەڵام مەقریزی ناوی بیست و یەک هۆزی[٩] هێناوە، (گۆران- بنوکوران- هەزبانی- بشنەوی- شاهنجانس- سرلەحی- بزولی- مهرانی- زەرزاری- کیکانی- جاک- لەو- دەنبەلیە- روادیە، دیسنیە- هەکاری- حەمیدی- ورکیجی- حروانی- جەلالی یان کەلالی- شنبەکی- جودی). ئیبن خەلەکان دەڵێت: روادی هۆز نییە بەڵکو لە هەزبانییەکانەو سەرکردەی بلیمەتی کورد سەلاحەدین ئەیوبی سەربەو هۆزەیە[١٠]. لەو ناوانە بۆمان روون و ئاشکرا دەبێت، کە هەزبانییەکان هۆزێکی گەورەی کوردن و بەدەوڵەت ناوبانگیان دەرکردبوو، چەندین زاناو سەرکردەی بلیمەت، کە خزمەتیان بەئایینی ئیسلام کرد بەشێوەیەکی بەرفراوان لەسەرجەم بوارەکاندا لێی هەڵکەوتوون کرد، کە ئەمەش پلە و پایە و هێزو تواناو ژیری ئەو هۆزە دەردەخات.

بەڵام ئەوەی پەیوەندداره بەجیاوازی ناوە هۆزنشینەکان لەنێوان مەسعودی و مەقریزیدا، مەسعودی ناوی دوو گەورە هۆزنشینی کوردی نەهێناوە، کە رۆڵی گەورەیان هەبووە لە مێژووی کوردیدا ئەویش هەردوو هۆزی حەمیدی و هەکارین.

سەبارەت بەنیشتەجێی رەسەنەکانیان بەپێی سەرچاوەکان، لەناوچە شاخاوییەکانی رۆژهەڵاتی موسڵ نیشتەجێ بوون. ئیبن ئەسیریش باس لە هێرشی هەزبانییەکان دەکات بۆ سەر موسڵ لە رووداوی ساڵی ٢٩٣ک لە کتێبەکەی (الكامل في التاريخ) پاش ئەوە چوونەتە ئازربێجان و هەولێر، لەوێ میرنشینیان پێکهێناوە.

## هەزبانییەکان پێش کۆچکردنیان بۆ ئازربێجان

لەسەرچاوەکاندا هاتووە یەکەم شت، کە لەسەر هەزبانییەکان باس کرابێ رووداوی ساڵی ٢٩٣ک کاتێ هێرشیانکردە سەر هەردوو شاری نەینەواو موسڵ. ئیبن ئەسیر دەڵێت: خەلیفەی عەباسی موکتەفی بیللا[١١]، ئەباهیجا عەبدوڵلا کوری حەمدانی[١٢] لەشاری موسڵ دامەزراندو، ئەباهیجا لە یەکی مانگی موحەرەمی هەمان ساڵدا پێی نایە ناو موسڵ، کە ئەوسا رەوشی وڵات شڵەژاو بوو، عەرەب و کورد هێرشیان دەکردە سەر لایەنی یەکتر. ئەوە بوو ئەباهیجا داوای پاڵپشتی

لەسوپا کرد، بۆ ئەوەی بتوانێ لەدژی ئەو رەوشە شڵەژاوییە بوەستێ و موسڵ و خەڵکی نەینەوا خۆی رێکخست بۆ هێرشبردن، چونکە کوردە هەزبانییەکان کە میرەکەیان محەمەد کوڕی بیلال بوو هێرشی کردبووە سەر وڵاتەکەیان و تاڵانێکی زۆری دەستکەوتبوو. جا ئەوە بوو ئەباهیجا پەلاماری هەزبانییەکانی داو لەپردی موسڵ پەڕییەوەو بەلای رۆژهەڵاتدا گەیشتە هەزبانییەکان و لەگوندی مەعروبە، کە کەوتۆتە سەر رووباری خازر رووبەرووی یەکتر بوونەوەو شەڕو کوشتارێکی توند روویداو یەکێ لەیاوەرە دڵسۆزەکانی کوژرا، بۆیە ئەباهیجای حەمدانی گەڕایەوە بۆ موسڵ[١٣] واپێدەچێ هەزبانییەکان ئەوکات زۆر بەهێز بووبن تا ئەو ئاستەی ئەباهیجا نەیتوانی دەریان بکاو بەسەریاندا سەرکەوتن وەدەست بێنێت. هەر بۆیە ئەباهیجا بەناچاری داوای فریاکەوتنی لەخەلیفە موکتەفی بیللا کرد، بەڵام خەلیفە فریای نەکەوت، هەروەکو ئیبن ئەسیر دەڵێت: پاش چەند مانگێکی زۆر ئەوجا خەلیفە فریای ئەباهیجا کەوت.[١٤] بۆیە ئەباهیجا نەیتوانی جەنگ لەگەڵ هەزبانییەکان بکات. ئەمەش وایکرد تاساڵی ٢٩٤ک چاوەڕوان بکات، واتە پاش ساڵێک تێپەڕبوون بەسەر هێرشی هەزبانییەکان بۆ سەر نەینەوا، لەمانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی ٢٩٤ک ئەباهیجا لەگەڵ ئەوانەی لەهەزبانییەکان لەگەڵیدا بوون لەگەڵ (٥) هەزار کەس کۆبوونەوەی گرتدا. جا هەزبانییەکان کاتێ زانییان ئەباهیجا هێرشی بۆ هێناون و هێزێکی گەورەی لەگەڵدایەو گەیشتوونەتە چیای سلق، کە گەرووەکە لەچیایەک لەزنجیرە چیاکانی رۆژهەڵاتی شارەزوور، لەدژی حەمدانییە خۆیان سازدا پاڵپشتی خۆیان بەهێزکرد، ئەوەبوو ئەباهیجا گەمارۆی دان و گەرووەکەی لەسەریان تەسکتر کرد. سەرۆکی هەزبانییەکان گەیشتە ئەو رایە، کە لەتوانایدا نابێ رووبەرووی حەمدانییەکان بێتەوە، بۆیە ویستی ئەبو هیجا لەخشتە بەرێ بەداواکەیان خۆی ئامادە بکاو شوێنەکەیان بۆجێ بهێڵێ، بەوەی کە بەخودی خۆی منداڵەکانی لای ئەبو هیجا ئامادە بن و منداڵەکانیشی بەبارمتە لای ئەو جێ بهێڵێ، ئەبو هیجا ئەم داوایەی قەبوڵ کرد. جا کاتێ محەمەد کوڕی بیلال زانی ئەبو هیجا داواکەی قەبوڵ کرد هانی هەزبانییەکانی دا لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیدان بەرەو ئازربێجان برۆن. کاتێ محەمەدی کوڕی بیلال لەبەجێگەیاندنی بەڵێنەکەی سستی کرد ئەبو هیجا دەرکی بەوەکرد، کە ئەو فێڵە کۆمەڵێکی لەخۆ دوور خستەوە لەوانەی کەمتمانەی پێبوون وەک براکەی سلێمان و داودو سەعید، ئەوسا فەرمانی بە هێزی فریاکەوتن کرد، کە لەلایەن خەلیفەوە هاتبوو لەگەڵی بڕوات. بەڵام ئەو سوپایە نەختێ دواکەوت، ئەبو هیجا لەگەڵ ئەو هەزبانییانەی لەگەڵیدا بوون پێ شوێنیان هەڵگرت تا زانییان بەسەر چیای قەندیل کەوتوون، کۆمەڵێکیان لێ کوشتن و کۆمەڵێکی دیکەشیان بەسەر چیاکە کەوتن و وازی لەوان هێنا بەدوای هەزبانییەکانی دیکە کەوت تا ئازربێجان. پاشان ئەبو هیجا ئاگادار کرایەوە کە تائێستاش لەگەڵدا بێت محەمەدی کوڕی بیلال سەرکردەی هەزبانییەکان لەسەر چیای سلقە ئەبو هیجا گەڕایەوە موسڵ و دارودەستەی خۆی کۆکردەوەو بۆ جاری دووەم هێرشی بردە سەر چیای سلق و، گەمارۆی دان و ئازووقەی لێ قەدەغەکردن، زستان هات و بەفری لێکەوت. محەمەدی کوڕی بیلال کە زانی ئەبوهیجا جێی خۆی گرتووە ژیانی کەوتە مەترسییەوە، پەنای بۆ ئاشتبوونەوە برد و ملکەچی خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون خستییە بەردەمی و ئەویش قەبوڵی کرد. محەمەدی کوڕی بیلال و هەزبانییەکان گەڕانەوە شارۆچکەی (حەزە) پاشان محەممەدی کوڕی بیلال داوای کرد لەشاری موسڵ نیشتەجێ بێ ئەبوهیجاش ماوەی پێدا[١٥]. لەمیانەی ئەو رووداوەدا دەردەکەوێت هەزبانییەکان پارچە پارچە بوون، هەندێکیان بەفەرمانی میرەکەیان محەمەدی کوڕی بیلال چوونە ئازربێجان. ئەوانەی لەگەڵ میریش مانەوە لەچیای سلق بوون خۆیان دایەوە دەست ئەبوهیجاو لەشارۆچکەی حەزە نیشتەجێ بوون، هەروەکو یاقوتی حەمەوی دەڵێت: (لەشارۆچکەیەکی نزیک هەولێر نیشتەجێ بوون)[١٦]. لێرەدا وادەردەکەوێت ئەو هەزبانییانەی لەو

شارۆچکەیە نیشتەجێ بوون ئەوان دەستیان بەسەر هەولێردا گرتبێ و حوکمڕانییان گرتبێتە دەست تا عیمادەدین زەنکی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

### هەزبانییەکان لە هەولێر

کاتێ هەزبانییەکان شوێنی جێکەوتەو نیشتەجێی خۆیان بەجێهێشت و بوون بەدوو بەش. بەشێکیان چوونە ئازربێجان و لەسلماس[17] و موراغە[18] و شوێنی تر لەرۆژئاوای دەریاچەی ورمێ[19] نیشتەجێ بوون.

بەڵام سەبارەت ئەوانەی لەنزیک هەولێر نیشتەجێ بوون وادەردەکەوێت ئەوانە ملکەچی حەمدانییەکان بووینەو لەناوچەی نێوان هەردوو رووباردا کردووتیانە پیادەی خۆیان هەروەکو ئیبن حەوقەل دەڵێت: (ئەم ناوچەیە لەوەرزی زستاندا پیادەی کوردە هەزبانییەکان بوو)[20].

بەڵام مێژوونووسەکان دیاریان نەکردووە چۆن؟ و کەی؟ هەزبانییەکان میرنشینەکەیان لەهەولێر پێکهێناوە، بۆیە مێژووی سەرەتای حوکمی هەزبانییەکان لەهەولێر دیار نییە. لەگەڵ ئەوەش دەتوانین لەئیبن ئەسیر ئەو دەرەنجامە وەدەست بهێنین، کە هەزبانییەکان پێش ساڵی ٤٣٧ کۆچی میرنشینەکەیان پێکهێناوەو حوکمیان لەشاری هەولێر کردووە. چونکە بەپێی ئەوەی ئیبن ئەسیر باسی کردووە میری هەزبانییەکان عیسا کوڕی موسای هەزبانی لەساڵی ٤٣٧ک کوژراوە. ئەم رووداوە لەساڵی (٢٣٧ک) بووە. واتە عیسای کوڕی موسای هەزبانی میری هەولێر کاتێ بۆ راوکردن چووە برازاکانی کوشتوویانە[21]. لەم رووداوەدا ئەوە دەردەکەوێت میری هەزبانییەکان عیسای کوڕی موسا لەهەولێر حوکمی کردووە. لەهەمان کاتدا ئەوەش دەردەکەوێت کە لەمیانەی حوکمڕانییەکەیدا ناحەزیشی هەبوونە.

### پەیوەندی هەزبانییەکانی هەولێر بەعەقیلییەکانی موسڵ

هەروەکو پێشتر باسمان کرد هەزبانییەکان لەدەستپێکی سەدەی پێنجی کۆچیدا حوکمڕانی هەولێریان دەکرد، دیارە لەژێر دەسەڵاتی حەمدانییەکان هاتوونەتە دەرێ و میرنشینێکی سەربەخۆیان پێکهێناوە، چونکە حەمدانییەکان بەدەستی عەقیلییەکان لەساڵی ٣٨٠ک نشووستی هێنا. لەلایەکی تر پێدەچێ هەزبانییەکان ئەو لاوازییەی حەمدانییەکانیان قۆستبێتەوەو خۆیان لەژێر رکێفی ئەوان دەرباز کردبێ. یەکێ لەو باسانەی مێژوونووسەکان باسی لێوە دەکەن پێدەچێ هەزبانییەکان پەیوەندییەکانیان باش بووبێ لەگەڵ دەسەڵاتی تازە کە عەقیلییەکان بوون. ئیبن ئەسیر کوژرانی عیسای کوڕی موسا دەگێڕێتەوەو دەڵێت: عیسا برایەکی هەبوو ناوی سالاری کوڕی موسا لای قرواشی کوڕی موقەللەد[22] بوو، کە میری موسڵ بوو بەهۆی ناکۆکی نێوان خۆی و براکەیەوە، جا کاتێ عیسا کوژراو قرواش لەگەڵ سالار هاتنە هەولێر دەسەڵاتی گرتەدەست و جڵەوی دەسەڵاتی دایە دەست سالار قرواشیش گەڕایەوە موسڵ[23]. لەم رووداوەدا ئەوە دەردەکەوێت، کە سالار لەموسڵ ژیانی دەگوزەراندو کاتێ گوێی لەهەواڵی کوشتنی براکەی بوو هانای بۆ قرواش برد دژی برازاکانی و حوکمڕانی هەولێری خستە ژێر رکێفی خۆی. لەلایەکی تر واش دەردەکەوێ قرواش ویستوویەتی جڵەوی دەسەڵات بداتە دەست سالار تا هەولێر هەر بەدۆستی موسڵ بمێنێتەوە. رووداوێکی دیکەش هەیە ئەوە دەسەلمێنێت تاچەند عەقیلییەکان دەستیان لەکاروباری هەزبانییەکان وەرداوەو چۆن پاڵپشتی هەزبانییەکان بوون لەهەر دەستتێوەردانێکی ناوخۆو دەرەکیدا. لەساڵی ٤٤٠ک ناکۆکییەکی توند کەوتە نێوان قرواش و کوردەکانەوە، بەهۆی ئەو ناکۆکییەی کەوتە نێوان کوردەکان و حەمیدی. خاوەنی قەڵاتی (عەقر) کە ئێستا ئاکرێی پێ دەوترێ و میرەکەیان ئەبو حەسەن کوڕی عیسکان حەمیدی بووی[24]، هەزبانییەکانیش لەهەولێر، کە میرەکەیان ئەبو حەسەن کوڕی موسک هەزبانی بوو، برایەکی هەبوو ناوی ئەبو عەلی، میر حەمیدی هاریکاری کرد تا دەسەڵاتی هەولێر بگرێتە دەست، کاتێ دەسەڵاتەکەی گرتە دەست ئەبو حەسەنی براکەی زیندانی کرد. ئەوسا قرواشی میری عەقیلییەکان سەرقاڵ بوو بەعێراق.

کاتێ گەڕایەوە موسڵ و بینی میری هەولێر ئەبو حەسەن زیندانی کراوەو براکەی جڵەوی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست سەرسام بوو، بەڵام دەری نەخست، چونکە لەگەڵ میرێکی دیکەی کورد نەسردەولە کوڕی مەروان ساحێبی میافارقین و دیاربەکر لەجەنگدا بوو، بۆیە قرواش داوای لەمیری حەمیدی و میری هەزبانییەکان کرد فریای بکەون، بەڵام ئەبو عەلی هەزبانی[٢٥] لەجیاتی خۆی براکەی نارد. واپێدەچێ لەخۆی دڵنیا نەبووبێ، چونکە خراپەی بەسەر براکەی ئەبو حەسەن هەزبانی هێنابوو. لەم سات و کاتەدا قرواش لەگەڵ نەسردەولەی کوڕی مەروان ئاشت بۆوە بەبێ جەنگ. بەڵام میر حەمیدی دەستگیر کردو داوای لێ کرد میر ئەبو حەسەن کوڕی موسک میری هەولێری لادراو ئازاد بکات و لەشوێنی براکەی، کە بەزۆر دەسەڵاتی گۆتۆتە دەست بیکاتەوە بەمیری هەولێر. میر حەمیدی داواکەی قرواشی قەبوڵ کرد. بەڵام لەپاش راوێژییەک لەنێوان میری هەولێرو حەمیدی و قرواش نەگەیشتنە هیچ دەرەنجامێک زوڵمیان لەئەبو حەسەن کرد. بەمەوە قرواش پەیوەندییەکانی لەگەڵ میر حەمیدی و ئەبو عەلی میری هەزبانییەکان پچڕاند [٢٦] لێرەدا دەرکەوت کە ئەو پەیوەندییە دوو قۆڵییەی لەنێوان هەزبانییەکانی هەولێرو عەقیلییەکانی موسڵ هەبوو نەما، بۆیە هەر دوولا کەوتنە پیلان گێڕان دژ بەیەکتر. سلێمان سائغ دەڵێت قرواش بەسەر کوردە هەزبانییەکان سەرکەوت بە کەسبکردنی متمانەیان و خۆ بەهێزکردن بەوان لەسەر نەسردەولەی کوڕی مەروان[٢٧]. هەرچەند ئیبن ئەسیرە دەڵێت: قرواش بەسەر هەزبانییەکان سەرنەکەوت. بەڵکو یارمەتیدانی ئەبو حەسەن هەزبانی بوو دژی براکەی ئەبو عەلی کە دەسەڵاتی هەولێری گرتە دەست، چونکە ئەبو حەسەن پەیوەندی لەگەڵ قرواش زۆر پتەو بوو. جا کاتێ میر حەمیدی و میر ئەبو عەلی میری هەولێر زوڵمیان لەئەبو حەسەن کرد بەتەواوی پەیوەندی لەگەڵ هەزبانییەکان پچڕی و هەریەکەو کەوتە پیلانگێڕان دژ بەیەکتر. هەروەها خاشع مەعازیدی وای دەبینێت ناوچەی کوردە حەمیدییەکان و کوردە هەزبانییەکان بەشێک بووە لەدەوڵەتی عەقیلی[٢٨]. بەڵام لەمیانەی ئەو رووداوانەی خستمانە روو وا دەردەکەوێت، کە میرەکانی عەقیلی حوکمڕانی ئەو ناوچانەیان نەکردووە بەتایبەتی هەولێر. هەزبانییەکان ئەوسا حوکمڕانی ناوچەکەیان دەکرد سەربەخۆ بوون. گەر هاتبوایە سەر بەعەقیلییەکان بووایە، ئەوا دەبوو قرواش فەرمانی خۆی بەسەر ئەبو عەلی میری هەولێر سەپاندبایە، کاتێ حوکمڕانییەکەی لەبراکەی ئەبو حەسەن بەزۆر سەندو ئەبو حەسەنی میری هەولێری لادراو گەڕاندبوایەوە شوێنی خۆی. بەبێ ئەوەی پەنا بۆ میری حەمیدی ببا یان داوا لەئەبو عەلی بکات رازی بێ، کە ئەبو حەسەن بگەڕێتەوە بۆ حوکمڕانیەت، هۆکارێکی دیکەش هەیە بۆ ئەوەمان دەبات بڵێین: هەزبانییەکان لەهەولێرو حەمیدییەکان لەعەقر سەر بەعەقیلییەکان نەبوونە، چونکە دژی قرواش وەستاون و یارمەتی براکەیان دا ئەبو کامل بەرکە کوڕی موقەللەد لەدوا هێرش بۆ سەر قرواش، کە بووە هۆی بەرپابوونی جەنگ لەنێوانیاندا، لەئەنجامدا قرواش بەدەستی کوردەکانی حەمیدی و سوپای نەسردەولە میری دیاربەکر بەدیل گیرا[٢٩]. لەلایەکی دیکە وامان بۆ دەردەکەوێت، کە میری هەولێر گوێڕایەڵی عەقیلییەکان بووە بەپێی ئەوەی ئیبن ئەسیر لەرووداوەکانی ٤٥٠ک باس دەکات، کە قورەیش کوڕی بەدرانی عەقیلی گەمارۆی قەڵاتی موسڵیان دا، ئەوسا سەربازەکانی ئیبراهیم کوڕی یەنالی سەلجوقی تێدابوو، گەمارۆکە زۆر درێژەی کێشا تاوای لێهات ناچار بوون رەشە وڵاغەکانیان بخۆن. لێرە کوڕی موسەک میری هەولێر لەگەڵ قورەیشی کوڕی بەدران گفتوگۆی کردووەو دڵنیای کردۆتەوە، کە ئابلۆقە لەسەر قەڵاتی موسڵ هەڵبگرێ، قورەیش رازی بوو[٣٠]. ئەم رووداوە بۆمان دەردەخات کە گەر هاتبوا کوڕی موسەکی هەزبانی سەر بەکوڕی بەدران بوایە دانیشتنی لەگەڵ ساز ناداو گەمارۆی لەسەر قەڵاتی موسڵ هەڵنەدەگرت و، بەهۆی ئەودوە سەربازە سەلجوقییەکانی دڵنیا نەدەکردەوە.

**پەیوەندی سەلجووقییەکانی هەولێر بەسەلجووقییەکان**

سەلجووقییەکان هەر لەدەستپێکا بەهێزو بەتوانا دەرکەوتن و توانییان لەساڵی ٤٤٧ک بەسەر بوەیهییەکاندا زاڵ بن، پاشان دەست بەسەر میرنشینەکان یەک لەدوای یەکدا بگرن. دیارە هەزبانییەکانی هەولێر بێ لایەن وەستاون کاتێ ئیبراهیم یەناک کە برازای تغرل بەگە هێرشی هێنا بۆ موسڵ، تا قورەیش کوڕی بەدرانی عەقیلی دەسەڵاتی موسڵی گرتە دەست و گەمارۆی قەڵاتی موسڵی دا. ئیبن موسەک داوای لەقورەیش کرد کە گەمارۆی سەر قەڵات هەڵبگرێ[٣١] ئەمەش بەڵگەیە کە هەزبانییەکان قسەیان ڕۆیشتووە لای عەقیلییەکان، هەروەها پەیوەندیشیان بەسەربازەکانی سەلجوقی هەبووە، ئەگینا داوایان لەقورەیش نەدەکرد گەمارۆ لەسەر قەڵاتی سەلجوقییەکان هەڵبگیرێ.

**میری گەورە ئەبوهەیجای هەزبانی**

ئەبو هەیجای هەزبانی لەو کات و ساتدا گەورەترین میری هەزبانی و کوردەکان بوو.. هەندێ لەسەرچاوەکان دەڵێن ئەبو هەیجا لەپاش ئەبو عەلی کوڕی موسەک هەزبانی هاتووە. ئەوەتا ئیبن ئەسیر دەڵێت: ئەبو عەلی لەساڵی ٤٥٠ک[٣٢] حوکمڕانی هەولێری کردووە، پێدەچێ ئەبو هەیجا لەپاش ئەبو عەلی حوکمڕانی هەولێری کردبێ. بۆیە ئێمە لێرەدا ئەوە بە بەڵگە دێنینەوە لەئوسامە کوڕی مونقز لەکتێبەکەیدا (الاعتبار) باس دەکات. میر فەزل کوڕی ئەبی هەیجا میری هەولێر بۆی گێڕایتەوە کە سوڵتان مەلیک شا ئەبو هیجای بەنوێنەر ناردووە بۆ لای کوڕی مەروان میری دیاربەکر تا سی هەزار دینار بۆ سوڵتانی سەلجوقی مەلیک شاه بێنێت. لەم ڕووداوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە یەکەم: ئەبو هیجا میری هەولێر لەسەردەمی مەلیک شا حوکمڕانی کردووە. دوا حوکمڕانیش لەساڵی ٤٦٥ک تا ٤٨٥ک بووە[٣٣]. دووەم: ملکەچبوونی هەزبانییەکان بۆ فەرمانی سەلجوقییەکان و هەڵوێست وەرنەگرتنیان لە بەرامبەریانداو، مانەوەی سەلجوقییەکانە لەگەڵ میرەکان لەمیرنشینە سەربەخۆکەیان لەژێر فەرمانەکانیاندا. سێیەم: میری دیاربەکر پارەی دایە سەلجوقییەکان بۆ ئەوەی خۆی دوور بگرێت و دەست بەسەر میرنشینەکەی دانەگرن. میری دیاربەکر، کە کوڕی مەروان[٣٤] بوو کورد بوو، بۆیە مەلیک شا ئەبو هەیجای میری هەولێری بەنوێنەری خۆی نارد، چونکە ئەویش کورد بوو.

**ئەو جەنگانەی ئەبو هیجای هەزبانی میری هەولێر بەشداری تیایدا کرد**

١- هەڵمەتی جاولی سەقاو بۆ سەر موسڵ:

ئەبو هیجا لەچەند جەنگێکدا بەشداری کردووە، بەتایبەتی لەگەڵ میری سەلجوقییەکان. ئیبن ئەسیر بۆمان باس دەکات و دەڵێت: سوڵتان محەمەدی سەلجوقی لەساڵی ٥٠٠ک موسڵی دایە دەست جاولی سەقاو، کە پێشتر بەدەست میرێکی دیکەی سەلجوقی بوو بەناوی جگرمش چونکە پارەو پولی نەئەدا، ئەمەش وای لەسوڵتان محەمەد سەلجوقی کرد، کە جاولی سەقاو لەشوێنی جگرمش دابنێ. جا کاتێ جاولی لەگەڵ سوپاکەی هاتە موسڵ شاری (بەوازیج)ی وەرگرت[٣٥] و کاتێ هەواڵی جاولی گەیشتە جگرمش نووسراوێکی بۆ هەموو سەربازەکان نارد، نووسراوێکیشی گەیشتە ئەبو هیجا کوڕی موسەک هەزبانی تیایدا هاتووە: جاولی دەسەڵاتی بەوازیجی گرتۆتە دەست و (پێی دەڵێت گەر پەلە نەکەن بۆ کۆبوونەوە یەک لەسەر ڕێ پێگرتنی، ئەوا ناچار دەبێ ڕازی بێ و چاردنووسی لەگەڵ ئەو بێ، جگرمش سەربازەکانی کۆکردەوەو ئەبو هیجاش سەربازەکانی لەگەڵ منداڵەکانی خۆی هەنارد لەنزیک گوندی کەلبا کۆبوونەوە، جا کاتێ هەردوو سوپا لەجەنگ ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە سوپای جگرمش شکاو، جگرمش لەگەڵ منداڵەکانی ئەبو هیجا بەدەستی جاولی سەقاو دیل کران. ئەبو هیجا بەگۆڕینەوەی کەسێکی موسڵاوی کەسەر بەجگرمش بوو پەنای بۆ هەولێر هێنابوو گۆڕییەوەو منداڵەکانی لەدیلی پێ ئازاد کردن[٣٧]. لەم ڕووداوە دەردەکەوێت کە جەنگی ئەبو هیجاو جاولی تەنیا دژ بەکەسایەتی یەکتر بووە لەدژی سوڵتانی سەلجوقی نەبووە. چونکە ئەگەر وابوایە، ئەوا ئەگەری ئەوە هەبوو کە سوڵتان

محەمەد فەرمانی بەجاولی سەقاو دەکرد کەهەولێریش بگرێ و جلەوی دەسەڵات لەئەبو هیجا وەربگرێت. بەڵام وادیارە ئەبو هیجا رقی لەخودی جاولی سەقاو بۆتەوە، چونکە رەفتاری باش نەبووە لەنێو خەڵکدا، بۆیە وای بەباش زانیوە لای جگرمش بگرێ پاش ئەوەی جاولی دەسەڵاتی موسڵی گرتە دەست. شایانی باسە جاولی نەیتوانی هیچ کارێک بەرامبەر بەهەولێر یان میرەکەی ئەبو هیجا بکات، تەنانەت بەپێچەوانەوە منداڵەکانی ئەبو هیجای ئازاد کرد، کە لەجەنگەکەدا بەدیل گیرابوون.

٢- ئەبو هیجا لەهەڵمەتەکانی سەر موسڵ لەدژی جاولی سەقاودا بەشداری کرد

لەساڵی ٥٠٢ک سولتانی سەلجوقی لە جاولی سەقاو توورە بوو، بۆیە نوێنەری نارد بۆ میرە سەلجوقییەکان لەوانە میر مەودود و سکمان قوتبی، هەروەها ئەبو هەیجای هەزبانی میری هەولێرو نەسر کوڕی موهەلهەل کوڕی ئەبو شەوک کوردی کە بەرەو موسڵ بچن دەسەڵات لەجاولی وەربگرنەوە، کاتێ سوپا گەیشت، موسڵ لەلایەن جاولییەوە قایم کرابوو، بەڵام هەر چۆنێ بوو سوپای سولتانی سەلجوقی توانی بەهاریکاری خەڵکەکەی، شاری موسڵ کۆنترۆڵ بکات[٣٨]. لێرەش وادیارە ئەبو هەیجا لەفەرمانی سولتانی سەلجوقی دەرنەچووە، کاتێ فەرمانی پێکرد بەخۆی و سوپاکەی لەگەڵ سوپای سولتان موسڵ بگرنەوە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکی ترە، کە ئەبو هیجا ملکەچی سولتان بووە.

٣- ئەبو هیجا لەهەڵمەتەکان بۆ سەر خاچپەرستەکان بەشداری کردووە.

ئیبن ئەسیر دەڵێت: لە رووداوەکانی ساڵی ٥٠٠ک سەربازەکانی سولتان، کە شەڕو کوشتاریان لەگەڵ خاچپەرستەکان کرد، لەمیرەکان مەودود میری موسڵ و سکمان قوتبی میری تەبرێزو ژمارەیەک میری دیکەی سەلجوقییەکان، لەگەڵ میر ئەحمەدیل کوردی میری موراغەو میر ئەبو هیجا میری هەولێرو میر ئیلغازی میری ماردین و زۆری تر پێک هاتبوون، کە هەندێکیان میری میرنشینە سەربەخۆکان بوون، بەشدارییان کرد لەهەڵمەتێکی گەورەی بەرفروان بۆ سەر خاچپەرستەکان، جا کاتێ سوپا دەستی کرد بەگرتنی شارو قەڵاتەکان گەمارۆی رەهایان دا، بەڵام نەیان گرت، چونکە پێداویستی جەنگی دەگەیشتە خاچپەرستەکان، بۆیە سوپای موسڵمانەکان ناچار بوو بگەرێتەوە بەبێ ئەوەی قەڵاتی رەها کۆنترۆڵ بکەن[٣٩].

### دەرچوونی هەولێر لەحوکمرانی ئەبو هیجاو گەرانەوەی حوکمرانی بۆی

ئەبو هیجای هەزبانی کۆمەکی سولتان مەسعودی کرد کاتێ ویستی لەساڵی ٥١٢ک جەنگ لەگەڵ دبیس کوری سدقە میری حیللە بکات و وەگەڵ سوپای سولتان مەسعود کەوت[٤٠]. پێشتر کە باس کرا دەرکەوت ئەبو هیجا سەرقاڵ بووە لەگەڵ سەلجوقییەکان و زۆر سوپاکەی ئامادە کردووەو هاوکاری سەلجوقییەکانی کردووە لەجەنگەکاندا، بۆیە ناچار بوو هەولێر بەجێ بهێڵێ و بۆ ماوەی چەند مانگێک لەدەرەوەی میرنشینەکەی بمێنێتەوە. بۆیە میرێک لەمیرە کوردەکانی حەکمی بەناوی بابەکر کوری میکایل لەگەڵ برازاکەی لەساڵی ٥١٧ک حوکمرانی هەولێریان گرتە دەست، برازاکەی بابەکر لەم ماوەیەدا حوکمرانی هەولێری گرتە دەست[٤١]. دیارە ئەبو هیجا هەردوو کورەکەی میر فەزل و ئەبو عەلی بەوەکالەت فەرمانرەوایی هەولێریان دەکرد، بابەکر کوری میکایل و برازاکانی ئەو دەرفەتەیان قۆزتەوەو دەسەڵاتی هەولێریان گرتە دەست[٤٢].

پێدەچێ ئەقسنقەر برسقی کەمیری سەلجوقییەکان بوو لەموسڵ، رازی بووبێ بەوەی بابەکر دەسەڵاتی هەولێر بگرێتە دەست، بەڵام لەساڵی ٥٢٠ک برسقی کۆچی دوایی کرد کورەکەی غیزەدین مەسعود جێگری حوکمی موسڵی گرتەوەو دۆست و هاورێی ئەبو هیجا بوو، بۆیە میر بابەکری دەستگیرکردو داوای لێ کرد قەڵاتی هەولێر لەبرازاکەی وەربگرێتەوەو تەسلیم بەکورەکانی ئەبو هیجای بکاتەوە، کە میر فەزل و ئەبو عەلی بوون. بابەکر بەم داوایەی غیزەدین رازی بوو، حوکمرانی هەولێرو قەڵاتەکەی بۆ جارێکی تر گەراندەوە بۆ هەزبانییەکان[٤٣].

### پەیوەندی ئەبو هیجا میری هەولێر لەگەڵ خەلیفەی عەباسییەكان

رووداوی ساڵی ٥٢١ك ئیبن ئەسیر بۆمان دەگێڕێتەوە، كە ناكۆكی لەنێوان موستەرشید بیللای خەلیفەی عەباسی و سولتان مەحمودی سەلجوقی لەئارادا بوو. سولتانی سەلجوقی بەغدای گەمارۆدا، ئەو كات میر ئەبو هیجا لەبەغدا بوو. پشتی خەلیفەی گرت و دژی سولتانی سەلجوقی وەستا، لەكاتێكدا سوپاكەش لەگەڵیدا بوو. واپێدەچێ كۆدێتای لەسەر خەلیفە كردبێ هەروەكو ئیبن ئەسیر باسی لێوە دەكات (میر ئەبو هیجای كوڕی میری هەولێر وەكو ئەوەی بۆ شەڕ بچێت لەبەغدا هاتە دەرەوەو خۆی و سەربازەكانی پەیوەندییان بەسولتانەوە كرد[٤٤]. بەڵام ئیبن ئەسیر هۆكاری هاتنە دەرەوەی ئەبو هیجا روون ناكاتەوە، تەنیا ئەوە نەبێت پێدەچێ لەبەرامبەر ئەوەی خەلیفە جێ بهێڵێ كارێكی بۆ بكات. ئەمەش پێشتر باسكرا، كە ئەبوهیجا لەمیرایەتی لادراو لەساڵی ٥٢١ك لەسەر دەستی میری سەلجوقییەكان عیزەدین گەڕایەوەو بۆ جاری تر حوكمڕانی هەولێری گرتەوە دەست. ئەگەری ئەوە هەیە سولتان بەڵێنی بە ئەبوهیجا دابێ لەبەغدا خەلیفە بەجێ بهێڵێ لەبەرامبەر ئەوە حوكمڕانی هەولێری بۆ بگەڕێنێتەوە. لەراستیدا ئەمەش بەكردەكی لەهەمان ساڵ، روویدا. لەلایەكی تر ئەگەری ئەوە لەئارادایە بەهێزو توانای سەلجوقییەكانی دیبێت، كە بەسەركردایەتی عیمادەدین زەنكی گەیشت، وای لێكردبێ ئەبوهیجا خەلیفە جێ بهێڵێ.

### دست بەسەرداگرتنی عیمادەدین زەنكی بەسەر هەولێرداو رووخانی میرنشینی هەزبانییەكان

سەبارەت جیاوازی ساڵەكان كەی عیمادەدین زەنكی دەستی بەسەر هەولێردا گرت.. ئەبو شامە دەڵێت: هەولێر لەساڵی ٥٢٢ك لەمانگی رەمەزان كۆنترۆڵ كرا[٤٥].

بەڵام ئیبن واثل بۆمان روون دەكاتەوە دەڵێت: (هەولێر بەتەواوەتی لەژێر دەسەڵاتی ئەبوهیجای كوردی هەزبانیء وارسەكانی بوو لەپاش ئەودا، بەڵام دەوڵەتی توركە سەلجوقییەكان هەڵوێستەكەیان بەسەر هەولێرو وڵاتانی تر گۆڕا. سولتان مەسعود كوڕی محەممەد كوڕی مەلیك شا كە ئەو كات میری موراغە بوو، رازی بوو بەدەسەڵاتداریتی ئەوانەوە، میر عیمادەدین لەساڵی ٥٢٦ك لەدەسەڵات لایداو هێرشی كردە سەر شارەكە، قەڵات بەرهەڵستكاری كرد ئەویش گەمارۆی دا. سولتان مەسعود لەموراغە بووە لای ئەو، عیمادەدین زەنكی جێیهێشت و هاتە سەر زێ لەوێ نوێنەریان دەگۆڕییەوە تا كارەكە جێگیر بوو. عیمادەدین لەخزمەت سولتاندابوو. لەدانیشتنێكدا خەلیفە موستەرشید بیللا داوای لێ كرد لەبەغدا وتارێك پێشكەش بكات و هەولێری تەسلیم بكات، ئەوە بوو پەیماننامەیەكیان بەست و میر عیمادەدین وەری گرت و پاشان تەسلیم بە (زینەدین عەلی كوچك)ی كرد[٤٦]. لەو گێڕانەوەیدا ئیبن واسل ئەو دەرەنجامانە وەدەست دەهێنین:

١- هەولێر هی هەزبانییەكان بوو میرەكەیان ئەبوهیجا بوو، بەڵام سەلجوقییەكان لێیان وەرگرتن بەبێ ئەوەی ئاماژە بەساڵی وەرگرتنەكە بدات. پێشتریش باسمان كرد، كە لەساڵی ٥٢٠ك حوكمڕانی هەولێر گەڕایەوە بۆ ئەبوهیجا. بۆیە دەشێ بڵێین توركە سەلجوقییەكان لەپاش ساڵی ٥٢٠ك حوكمڕانی هەولێریان وەرگرتووەو بۆوەتە موڵكی سولتان مەسعودی سەلجوقی. هەروەها دەشێ ئەوەش بڵێین منداڵەكانی ئەبوهیجا بەنوێنەرایەتی سولتانی سەلجوقی حوكمڕانی هەولێریان كردووە.

٢- هەولێر بەرهەڵستكاری عیمادەدین زەنكی كردو نەیتوانی لەرووی سەربازی بیهێنێتە ژێر كۆنترۆڵی خۆی، چونكە قەڵاتی هەولێر زۆر قایم بوو، هەروەها سولتان مەسعودیش لەگەڵ سوپاكەی هات یارمەتی هەولێر بدات، بۆیە عیمادەدین پاشگەز بۆوە لەوەی كە هەولێر بەهێز وەربگرێت.

٣- عیمادەدین هەولێری وەرگرت پاش ئەوەی بەڵێنی دا كۆمەكی سولتان مەسعود بكات، مەسعود لەبەردەم خەلیفە موستەرشید بیللا لەبەغدا وتارێك بدا، بۆیە بەبێ جەنگ هەولێری تەسلیم بەمەسعود كرد. واتە دەست بەسەرداگرتنی عیمادەدین بەسەر هەولێردا لەچوارچێوەی ئەو ئاڵوگۆڕییەدا بووە.

پاش ئەو دەرەنجامانە دەشێ بڵێین

حوكمڕانی هەولێر لەدەست هەزبانییەكان دەرچوو پێش ئەوەی عیمادەدین زەنكی دەستی بەسەردا بگرێت. عیمادەدین زەنكی هەولێری لە سەلجوقییە توركەكان وەرگرت. دكتۆر موحسین محەمەد وحسێن دەڵێت هەولێر بەكردەكی پێش ساڵی ٥٣١ك دەستی بەسەرداگیراوە، چونكە ئەستەم بووە بۆ عیمادەدین زەنكی داقوق لەپێش هەولێر بگرێت، چونكە ئەو شارە گرنگیء بابەخێكی ستراتیژی بۆ دەسەڵاتدارانی موسڵ هەبووە، لەبەر ئەوەی كەوتۆتە رێگای نێوان موسڵ و داقوق[٤٧]. بەپێی ئەوەی مێژوونووسان باسیان كردووە، ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچوونەی سەرەوە كۆكین، كە هەولێر پێش ساڵی ٥٣١ك فەتح كراوە. دەشێ بۆچوونی ئیبن واسڵ دروستترین بۆچوون بێ، لەبەر ئەوەی لەهەڵكەوتەكە نزیكە. ئیبن ئەسیریش دەڵێت: عیمادەدین لەساڵی ٥٢٨ك سەرەتا دەستی گیرت بەسەر قەڵاتەكانی كوردی حەمیدیدا[٤٨] ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، كە عیمادەدین هەولێری نەگرتووە، بەڵكو قەڵاتەكانی حەمێدی گرتووە، كەئەوان پەیوەندییەكی بەتینیان بەهەزبانییەكانیەوە هەبووە، شتێكی تریش هەیە سوڵتان مەحمود لەساڵی ٥٢٥ك مردووەو داوای لەمنداڵەكانی و براكانی مەسعودو سەلجوق كردووە شایەتی سەڵتەنەت بگرنە دەست.

لەوانەیە مەسعود بۆیە هەولێری دابێتە دەست عیمادەدین زەنگی هەروەكو ئیبن واسل باسی دەكات تا هاوكاری بكات لەوەرگرتنی سەلتەنەتداو خەلیفە كوڕی سوڵتان دانی پێبشنێت. ئەمە بە گرنگترین هۆكار دادەنرێت كە وای لێ كرد بێ هەولێر لەلایەن عیمادەدین زەنكی داگیر بكرێ: هەروەها جێگری عیمادەدین زەنكی كە نەسیرەدین جەقرە لەپاش داگیركردنی هەولێر دەستی بەسەر تەواوی قەڵاتی هەزبانییەكاندا گرت لەوانە قەڵاتی شەعیانیء قەرح و عەواشی و زەعفەرانی و.... هی تر[٤٩]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە میرنشینی هەزبانییەكان بەتەواوی رووخاون.

## هەزبانییەكان پاش رووخانی میرنشینەكەیان لە هەولێر

دیارە هەزبانییەكان لەپاش رووخانی میرنشینەكەیان لەهەولێر بەتەواوی ملكەچی عیمادەدین زەنكی بوونە، بۆ نموونە میر فەزل كوڕی میر ئەبو هیجای هەزبانی بوو بەمیری ئەتابەگی زەنكییەكان و بوو بەدۆستی میرێكی تر بەناوی ئوسامەی كوڕی مونقەز میری (ساحیب) قەڵاتی شیزر[٥٠] هەروەها ئیبن خەلەكان دەڵێت: قوتبەدین كوڕی خەسرەو كوڕی تەلیل برازای ئەبو هیجای هەزبانی میری (ساحیب) هەولێر یەكێك بوو لەگەورە میرەكانی نورەدین مەحمود لە میسر، پاڵێوراویش بوو بۆ وەرگرتنی پۆستێكی وەزاری لەمیسر لەپاش مردنی ئەسەدەدین شێركۆ، بەڵام دەستبەرداری ئەو پۆستە بوو بۆ سەلاحەدین پاش ئەوەی قایلیان كرد[٥١]. هەروەها ژمارەیەكی زۆر لەهەزبانییەكان بوون بەفوقەهاو زانای بەناوبانگ و لە هەولێر ژیان. ئیبن مستەوفی ناوی ژمارەیەک لەو فوقەهاو زانایانەی هێناوە، لەوانە: هسوزان پاش ساڵی ٥٣٠ك مردووە، ئیبن مستەوفی لای خوێندووەو زانستی لێ فێربووە[٥٢].

هەروەها ئەبو عەبدوڵلا محەمەد كوڕی ئەبی تاهیر هەزبانی و ئەبو عەباس ئەحمەد كوڕی محەمەد كوڕی خەلیل هەزبانی هەولێری كە یەكێكە لەشێخە بەناوبانگەكانی و لەهەولێر مردووە، ئیبن مستەوفی سەردانی كردووەو گوێی لێ راگرتووە[٥٣].

هەروەها قازی قوزات سەدرەدین كوڕی درباس هەزبانی، كە سەلاحەدین كردییە (قضاء قضاة الشافعية) لەمیسر[٥٤].

لێرە دەردەكەوێت هەر چەندە هەزبانییەكان لەمیرنشینەكەیان نشووستیان هێنا، بەڵام لەهەر دوو بواری ئایین و رامیاریدا چالاكییان هەبووەو رۆڵی گرینگیان بینیوە لەهەولێرو دەوڵەتی ئەتابەكەی زەنكی و دەوڵەتی سەلاحەدیندا.

## دوماهی

حوكمڕانی هەزبانییەكان سەدەیەك یان نزیكی سەدەیەك لەهەولێر بەردەوام بوو، ئەو هۆزە كوردییە رۆڵی گرنگیان لەمێژووی هەولێرو ناوچەكانی دەوروبەری بینی، سوپایەكیان هەبوو هەمیشە لەئامادەباشیدا بوو بۆ بەشداریكردن لەجەنگەكان، هەروەكو پێشتر باسمان

کرد، میرە بەناوبانگەکەیان (ئەبو هیجائی هەزبانی) لەزۆر جەنگدا لەگەڵ سەلجوقییەکان و جەنگەکانی خاچپەرستان بەشداری کردووە، بۆیە دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن ئەو میرنشینەی بەمیرنشینی سەربازی ناوزەد کردووە[55]. دەشێ بڵێین ئەو میرنشینە گەر سەربازی بووبێ میرنشینی دیکەی سەربازیش هەبوون. ئەمەش بەهۆی ئەوە بووە ئەو سەردەمەی ئەو میرنشینە تیایدا ژیاوە رەوشەکەی زۆر شڵەژاو بووە لەمێژووی ئیسلامداو بەهێز بەسەر بێ هێزدا زاڵ بووە. گەر هەر میرنشینێک سوپایەکی بەهێزی نەبوایە، ئەوا میرنشینەکەی تر کە لەو بەهێزتر بوو دەستی بەسەردا دەگرت. لەگەڵ ئەوەش ئەو میرنشینە ئیدارەو وەزارەتی هەبوو، ئەوەی لەو سەردەمەدا پۆستی وەزارەتی وەرگرتووە تەفرائی بووە، کە شاعیرێکی بەناوبانگە[56] بۆیە دەتوانین بڵێین ئەو میرنشینە یەکێکە لەمیرنشینە گرنگەکان، کە حوکمڕانی هەولێری کردبێ. بەڵام مێژوونووسەکان پێدەچێ کەمتەرخەمییان کردبێ لەناوهێنانی میر هەیجای هەزبانی، کە گەورەترین میری هەزبانی بووەو نزیکەی نیو سەدە حوکمڕانی هەولێری کردووە. هەروەها دەکرێ بڵێین: ئەو میرە کە نزیکەی نیو سەدە حوکمڕانی کردووە رۆڵی گرنگی لەهەولێر بینیوە.

ناوی ئەوانەی حوکمڕانییان کردووە لە هەولێر لە هەزبانییەکان هەروەکو ئیبن ئەسیر بۆمانی باس کردووە.

١- عیسا کوڕی موسا هەزبانی لەساڵی ٤٣٧ک کوژرا.

٢- سالار کوڕی موسا (برای عیسا) ساڵی ٤٣٧ک.

٣- ئیبن ئەسیر دەڵێ: ئەبو حەسەن کوڕی موسەک هەزبانی لەساڵی ٤٤٠ک حوکمڕانی هەولێری کردووە، دەشێ ئەوە سالاری کوڕی موسا بێ کە پێشتر خستمانە روو.

٤- ئەبو عەلی رەجا پاش براکەی ئەبو حەسەن لەساڵی ٤٤٠ک تا پاش ساڵی ٤٥٠ک.

٥- ئەبوهیجا کوڕی موسەک هەزبانی مێژووی دەستپێکی حوکمڕانییەکەی نەزانراوە، بەڵام پێدەچێ لەپاش ئەبو عەلی کوڕی موسەک دەسەڵاتی گرتبێتە دەست. چونکە ئیبن ئەسیر ناوی کەسی نەهێناوە کە حوکمڕانی هەولێری کردبێ، ناوی ئەبو هیجا دێت پاش ساڵی ٤٥٠ک[57]. بەڵام بەپێی ئەوەی ئوسامە کوڕی مونقەز باسی دەکات هیجا میری (ساحیب) هەولێر بووە پێش ئەو ماوەیە[58] لەسەردەمی حوکمڕانی سوڵتانی سەلجوقی مەلیک شا، کە لەهەمان ساڵدا مردووە.

٦- دەرچوونی هەولێر لەدەست هەزبانییەکان ساڵی ٥١٧ک و گەڕانەوەی بۆیان لەساڵی ٥٢٠ک و هەر دوو میر فەزل و عەلی کوڕانی ئەبو هیجای هەزبانی لەشوێن باوکیان حوکمڕانیان دەکرد.

٧- رووخانی هەولێر بەدەستی عیمادەدین زەنکی ساڵی ٥٢٦ک[60].

**پەراوێزەکان:**

١- شرف خان البدليسي: الشرفنامة. ترجمة جميل الروژبياني: مطبعة النجاح- بغداد ١٩٥٣ح ص.٧٨٠.

٢- د.حسام الدين النقشبندي: اذربيجان ٤٢٠- ٦٥٤هـ: ١٠٢٩-١٢٥٦م دراسة في احوالها السياسية والحضارية. رسالة دكتوراه قدمت الي كلية الاداب/ جامعة بغداد ١٩٨٤ مطبوعة علي الالة الكتابة ص١٠٩.

٣- شرف خان البدليسي: الشرفنامة: ترجمه الي العربية محمد علي عوني مطبعة دار احياء الكتب العربية: القاهرة: بدون تأريخ ج١ ص٢٠٤.

٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥-المسعودي: التنبيه والاشراف: بيروت- ١٩٨١ ص٩٤.

٦-ماه يعني قصبة البلد ومنة قبل ماه البصرة وماه الكوفة ويقال لنهاوند وهمدان وحم ماه بصرة ياقوت الحموي: معجم البلدان: بيروت ١٩٧٧ ج٥ ص٤٨.

٧-المسعودي: تنبية والاشراف ص٩٤.

٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٩-المقريزي: السلوك لمعرفة الدول والملوك، القاهرة ١٩٣٤ ج١ ق١ ص٣.

١٠-ابن خلكان: وفيات الاعيات: تحقيق د.احسان عباس ج٤ بيروت ١٩٧٧ ج٧ ص١٣٩.

١١-ابن الاثير: الكامل في التأريخ: بيروت ١٩٧٨ ج٦ ص١١١.

١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو وابن خلدون. تأريخ ابن خلدون: بيروت ١٩٧٩ ج٤ ص٢٢٩. وسعيد ديوه جي: تأريخ الموصل ١٩٨٢ ج١ ص٩١-٩٢.

١٤-ابن الاثیر: الكامل: ج٦ ص١١١ وسلیمان الصایغ تأریخ الموصل: القاهرة ١٩٢٣ ١٩٢٣ ج١ ص٩٦.
١٥- ابن الاثیر: الكامل: ج٦ ص١١٢. وابن خلدون تأریخ ابن خلدون ج٤ ص٢٢٩.
١٦- یاقوت الحمري: معجم البلدان ج٢ ص٢٥٦.
١٧- سلماس: مدینة في اذربیجان ومصر من امصار جلیل والمتاجز بها ومنها الي اورمیة ١٦ فرسخا ابو الفداء: تقویم البلدان: صممه ریزد وباورن ماك كوكین دي سیلان-ثاریس ١٨٤٠ ص٣٩٦.
١٨- مراغة من قواعد اذربیجان وهي قصبة كثیرة البساتین غربي تبریز علي مسافة ١٧ فرسخا.
١٩- د.حسان الدین النقشبندي: سەرچاوەی پێشوو ص١١٠-١١٢.
٢٠- ابن حوقل صورة الارض بیروت ١٩٧٩ ص٢٠٥.
٢١-ابن الاثیر الكامل ج٨ ص٤٨.
٢٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو ص٤٢.
٢٣-..............
٢٤- ویمیە ابن خلدون (عیشكاني) ابن خلدون تأریخ ابن خلدون ج٢ ص٢٦٣.
٢٥- د.خاشع المعاضیدی لە ناوی میری هەزبانی كە سوپای (قەرواشی) ناردووە دەبان، ناوی ئەوەی سوپای لەگەڵ (ابو الحسن الهذباني) ناردووە، راستییەكەی ئەبو عەلییە، (ئەبو حەسەن بن موسەك) لەو كاتەدا لە زیندان بووە. د.خاشع المعاضیدي دولة بني عقیل في الموصل سنة ٣٨٠-٤٨٩هـ بغداد ١٩٦٨ ص١٣٥-١٣٦.
٢٦- ابن الاثیر الكامل ج٨ ص٤٩ وسلمان الصایغ، تأریخ الموصل ج١ ص١٤٢.
٢٧- سلیمان الصائغ تاریخ الموصل ج ص١ ص١٤٢.
٢٨- خاشع المعاضیدي دولة بني عقیل في الموصل ص١٣٥.
٢٩- ابن الاثیر الكامل ج٨ ص٥٠ وخاشع المعاضیدي دولة بني عقبل ص١٣٦.
٣٠-ابن الاثیر الكامل ج٨ ص٨٢.
٣١- هەمان سەرچاوەی پێشوو ج٨ ص٨٢.
٣٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو د.محسن محمد حسین اربیل في العهد الاتابكي ٥٢٢-٦٣٠هـ / ١١٢٨-١٢٣٣م بغداد ١٩٧٦ ص٣٦.
٣٣- ابن تغري البردي النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة القاهرة، بدون تاریخ ج٥ ص٩٣، ص١٣٤.
٣٤- (اسامە بن منقذ) ئەوەمان پێ ناڵێت: (ابن مروان لان نصر الدوله بن حروان) كێیە؟. ساڵی ٤٥٣ك، كە لە پێش حوكمرانی مەلیک شاه بە نزیكەی (١٢) ساڵ كۆچی دوایی كردووە، دەشێ ئەوە ئەبو هەیجا بۆ (ابن نصر الدوله) كە حوكمرانی دەوڵەتی مەروانی لەنێوان ساڵانی ٤٤٣-٤٧٢ك) دەكرد ناردبێت.
الفارقي، تاریخ الفارقي حققه وقد تم له د.بدوي عبدالطیف عرض بیروت ١٩٧٤ ص١٨٧ ص٢٠١.
٣٥- بلدة قرب تكریت علي فم الزاب الاسفل حیث یصب في دجلة وهي الان من جبال الموصل. یاقوت الحموي معجم البلدان ج١ ص٥٠٣.
٣٦- ابن الاثیر الكامل ج٨ ص٢٢٩.
٣٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو ج٨ ص٢٢٩.
٣٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو ج٨ ص٢٢٩.
٣٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو ج٨ ص٢٦٢-٢٦٣.
دائرة المعارف الاسلامیة نقلها الي العربیة احمد الشناوي وغیرهم القاهرة ١٩٢٣ ص٤٢٠ ودائرة المعارف بادارة فذاد افرام البستاني بیروت ١٩٦٤ ج٥ ص٢٠٤.
٤٠- ابن الاثیر الكامل ج٨ ص٢٨٢.
٤١- هەمان سەرچاوەی پێشوو ج٨ ص٣٢١.
٤٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو ج٨ ص٣٢١.
٤٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو ج٨ ص٣٢١.
٤٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو ج٨ ص٣٢٢. وابن الاثیر، الباهر في الدولة الاتابكیة (الموصل) تحقیق عبدالقادر احمد طلیمات القاهرة (بدون تاریخ) ص٣٠.
٤٥- ابو شامة المقدس الروضتین بیروت (بدون تاریخ) ج١ ص٣٠.
٤٦- ابن واصل، مفرج الكروب في اخبار ملوك بني ایوب تحقیق جمال الدین الشیال القاهرة ١٩٥٣ ج١ ص٤١.
٤٨- ابن الاثیر الباهر ص٤٨.
٤٩- ابن واصل، مفرج الكروب ج١ ص٥٦.
٥٠- اسامة بن منقذ كتاب الاعتبار ص١١٣.
٥١- ابن خلكان وفیات الاعیان تحقیق د.احسان عباس بیروت (بدون تاریخ) ج٧ ص١٥٣.
٥٢-ابن المستوفي تاریخ اربل تحقیق سامي بن السید خماس الصقار بغداد ١٩٨٠ ص٣٣٢.
٥٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو ٣٧٣-٣٧٤.
٥٤- ابن الفرات، تاریخ ابن الفرات حرره د.حسن محمد الشماع بصره ١٩٦٧.
٥٥- د.محسن محمد حسین، اربیل في العهد الاتابكي ص٣٧.
٥٦- ابن خلكان، وفیات الاعیان ج٢ ص١٨٩ محمد الكتبي، عیون التواریخ ج١٢ ص٩٣.
٥٧- ابن الاثیر الكامل ج٩ ص٤٩ ص١١٣.
٥٨- اسامة بن منقذ، كتاب الاعتبار ص١١٣.
٥٩- ابن الاثیر ج٨ ص٣٢١.
٦٠- ابن واصل، مفرج الكروب، ج١، ص ٩٧

# هەولێر... فەرمانڕەوایی کوردە هەزبانییەکان (٣٧٥-٥٢٦کۆچی/ ٩٨٥-١١٣٢زایینی)

دکتۆر زرار سدیق تۆفیق
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی دهۆک

ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە کە (ئەربل/ ئەربیل/هەولێر) هەتا بڵێی باژێرێکی کۆن و دێرینە و ڕەگ و ڕیشەی بەقوولایی دیرۆکدا ڕۆچووە. سەربوردەو بەسەرهاتەکانی بەشێکی بەرچاو لە مێژووی مرۆڤایەتی ڕۆژهەڵاتی کۆندا پێکدەهێنێت، ئەگەرچی لە سەدەکانی پێش زایین و سەردەمی زایینیدا پتر وەک ناوەندێکی ئایینی دەناسرا، وەلێ لە ئاستەکانی مێژووی سیاسی و شارستانیشدا ڕۆڵ و کاریگەریی کەم نەبوو.

بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنج و تێرامانەو مایەی لێ وردبوونەوە و ڕاوەستانە لە ئاستیدا، ئەوەیە ئەم باژێرە لەگەڵ هەموو ئەم دێرینی و بەناوبانگییەی لە ٤٠٠ ساڵەی یەکەمی سەردەمی ئیسلامیدا بەتەواوەتی گومناوە و هەواڵ و پێزانینێکی ئەوتۆی لەسەر نییە، کە شایەنی ئەو پێشینە مێژووییەی بێت و ناو و دەنگوباسی لە ژێدەر و سەرچاوەکاندا بزرە، تەنها ئەوەندەی لەبارەوە دەزانرێت کە حسێبی گوندی بۆ کرابوو و لەڕووی ڕێڤەبەرییەوە خرابووە سەر ئوستانی شاد فیر، واتە حلوان (خانەقین- سەرپول زەهاو). (ابن خردا ذبە، المسالك والممالك، ص١٨).

زیندووبوونەوەو بووژانەوەی هەولێر (أربل) لە سەدەکانی ناوەڕاستدا گرێدراوە بەدەرکەوتن و پایەداربوونی هۆزی مەزن و ناوداری هەزبانییەوە، شکۆمەندی و پایە بەرزی هەولێر لەهەموو بوارەکاندا تارادەیەکی دیار پەیوەستە بەکارو داهێنانەکانی میران و زانایان و خوێندەوارانی زەرزاری و هەزبانییەوە. هەزبانی - هۆزدبانی- هۆزەڤانی (الهذبانية)، یەکێکە لە گەورەترین و ناسراوترین و بەربڵاوترین هۆزی کورد، کە لەچەند خێڵ و تیرەو بنەماڵە پێکدەهات، هەندێکیان ڕەوەندو کۆچەری و هەندێکی تریان نیشتەجێ بوون.

زستانان ڕەوەندەکانی هەزبانی لە پێدەشتی هەولێر و ناوچە گەرمەسێرەکانی نێوان هەردوو زێی سەروو و خواروو هەواریان هەڵدەدا و بارگە و بنەیان دەخست و وەرزی سەرما و سۆڵەیان دەگوزەراند. بەهارانیش لەگەڵ بەرزبوونەوەی پلەی گەرما و توانەوەی بەفرو بەستەڵەکی سەر چیاکان بەرەو زۆزان هەڵدەکشان و هەر ماڵە و لەزۆمە و کوێستانی خۆی دەگیرسایەوە، ئیبن حەوقەل (م٣٦٧ك/ ٩٧٧ز) دەڵێت دەڤەرەکانی نێوان هەردوو زێ، زستانە هەواری کوردە هەزبانییەکان و هاوینەهەواری هۆزی عەرەبی شەیبانییە (صورة الارض، ص٢٠٥).

بەتێپەڕبوونی کات و لەئاکامی گۆڕانکارییە ئابووری و جڤاکییەکان ڕێژەیەک لەهۆزی هەزبانی دەستبەرداری ژیانی کۆچەری و ڕایەڵەی گەرمیان و کوێستان بوون و بەرە بەرە لەتەک هۆزەکانی زەرزاری،

حەکەمی، حەمیدی لە قەڵای هەولێرو گوندو شارەدێیەکانی دەوروبەری نیشتەجێ بوون و گیانی ئاوەدانییان خستەوە بەر شارە دێرینەکە و پاش چەند ساڵێک هەولێر لەقەڵایەکی سست و خامۆش و نەناسراوەوە بوو بەشارێکی ئاپۆرە و پڕ بزووت و جموجۆڵ.

هەروەها لە ساڵی (٢٩٣ک/٩٠٦ز) دوای لەناوبردنی برازای محەمەدی کوڕی بیلالی هەزبانی و پەرتەوازەکردنی هەزبانییەکان لەلایەن حەمدانییەکان و خیلافەی عەباسییەوە، هەزبانییە بەشداربووەکانی برازاکە لەگوندی (حەزە)ی نزیک هەولێر بەزۆرەملێ ئاکەنجی کران (ابن الآثیر، الکامل، ٧/ ١١١-١١٢).

لە سەردەمی بوەیهییەکان (٣٣٤-٤٤٧ک/ ٩٤٦-١٠٥٥ز) لەسەر پاکی کوردستان ژمارەیەک میرنشین و دەسەڵاتداریتی ناوخۆیی دەرکەوتن و کاروباری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان گرتە دەست، هەندێکیان گەورەو بەدەسەڵات و خاوەن دامودەزگای فەرمانڕەوایی و بەڕێوەبردن و هەندێ تریان بچووک و کەم دەسەڵات، دامەزرێنەرو میرانی ئەم میرنشینانە زیاتر سەردارو سەرۆک هۆزە کوردەکان بوون.

سەردارانی هۆزی هەزبانیش لەم بوارەدا لەدەستەی پێشەنگ بوون، وێڕای هەردوو میرنشینی شەدادی و ڕەوادی، لەقەڵای هەولێرو ناوچەکانی دەوروبەری میرنشینێکی تریان دامەزراند، کە لەمێژوودا بەمیرنشینی هەزبانی ناسراوە.

ساڵ و چۆنێتی دامەزراندن و ناسنامەی میری دامەزرێنەر تائێستاش روون نییەو بەڵێنی و شاراوەیی ماوەتەوە و بەدروستی نازانرێت. هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی بویهی و خەلیفەی عەباسی بەرانبەر ئەم میرنشینە چۆن بووە. ئەوەی ئاشکرایەو هیچ گومانی لەسەر نییە میر موسەکی کوڕی چەکۆ (ابو الهیجاء موسك بن ضكویة الهذباني) یەکەم میری هەزبانییەکانی هەولێرە، کە ناو و هەواڵی لە سەرچاوەکاندا یاداشت کرابێت و دوور نییە هەر خۆشی میری دامەزرێنەر بێت و بەمەزەندە لەماوەی (٣٧٥-٤٢٠ک/ ٩٨٥-١٠٢٩ز) فەرمانڕەوای هەولێر بووە، لەساڵی (٣٨٧ک/ ٩٩٧ز) میرێکی بەتوانا و دەسەڵاتدار بووە و سەرکردەیەکی فارس بەناوی جوبرائیل کوڕی محەمەد، پەنای بردۆتە بەر و داخوازی هاریکاری و پشتیوانی لێ کردووە، بەهەردووکیان توانیویانە شاری داقوقا- داقوق لەژێر دەستی لایەنگرانی (صمصام الدولة البویهي) دەربهێنن (الکامل، ٧/ ١٨٧-١٨٨)، دوای مردنی کوڕو کوڕەزاو نەوەکانی درێژەیان بەدەسەڵات دا تا ساڵی (٥٢٦ک/ ١١٣٢ز) کاتێک عیمادەدین زەنگی ئەتابەکی موسڵ و هەولێری داگیرکردو دەسەڵاتی بنەماڵەی موسەکی هەزبانیی لەناوبرد:

**ڕیزبەندی میرانی بنەماڵەی موسەکی هەزبانی:**

١- موسەکی کوڕی چەکو (ابو الهیجاء الأول) (٣٧٥-٤٢٠ک/ ٩٩٥-١٠٢٩ز).

٢- عیسای کوڕی موسەک (٤٢٠-٤٣٧ک/ ١٠٢٩-١٠٤٥ز).

٣- سالار (ابو الحسن سالار کوڕی موسەک) (٤٣٧-٤٤٠ک/ ١٠٤٥-١٠٤٨ز).

٤- حەسەن کوڕی موسەک (ابو علی) (٤٤٠-٤٦٥ک/ ١٠٤٨-١٠٧٢ز).

٥- حوسێن کوڕی ئەبو عەلی حەسەن کوڕی موسەک (ابو الهیجاء الثاني عزالدین محمد الدولة الحسین بن الحسن بن موسي (موسك) بن جکو الهذباني) (٤٦٥-٥٢٦ک / ١٠٧٢-١١٣٢ز) ناسراو بەخودانی هەولێر (صاحب أربل).

٦- فەزڵ کوڕی (ابو الهیجاء) حوسێن.

٧- ئەبو عەلی (دووەم) کوڕی (ابو الهیجاء) حوسێن.

٨- تەلیل کوڕی ئەبو عەلی حەسەن، برای (ابو الهیجاء).

٩- قوتبەدین خەسرەو کوڕی تەلیل برازای (ابو الهیجاء) و یەکێک لە مەزنە سەرکردەکانی سوپای ئەیوبی و بنیاتنەری قوتابخانەی قوتبیە (المدرسة القطبیة) لەشاری قاهیرە لەساڵی (٥٧٠ک/ ١١٧٤ز).

هەزبانییەکانی هەولێر لەسەرەتاوەو تا ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەهەمی زایینی، هێزو دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان نەبوو و میرنشینەکەیان بچووک و سنووردارو کەم بایەخ بوو، سەر بەعوقەیلییەکانی موسڵ (الامارة العقلیة) بوون، نەشیان سەرفرازی خۆیان مسۆگەر بکەن. هەر بۆیە بەدەگمەن ناوو دەنگوباسیان لە

سەرچاوەكاندا بەرچاو دەكەویت.
لە سـالّی ٤٥٦ك/ ١٠٦٤ز، مـیـر ئەبو عـەلی حـەسـەنی كـوڕی مـوسـەک هاوڕێ لەگـەڵ مـیـر ئەبو حەسەنی كوڕی عیسكانی حەمیدی مـیـری ئاكرێ و شوش رویان كـردە بەغـداو بەبانگهـێشـتی خـەلیـفـە لەدیوانی خـیلافەی عەباسی ئامادە بوون و لەلایەن خـەلیـفـە (القـائم بـأمــــــرالـلـه) (٤٢٢- ٤٦٧هـ/ ١٠٣١- ١٠٧٤م)ەوە خەلات كران و پۆشاكی زێڕبەندیان پێ بەخشـرا "خلع علیـهـمـا الفـرجـیـات المذهبـات والعمـائم" (سبط بن الجـوزي، مرآة الزمان، ص١١٠).

لێـرە بەدواوە هەزبانیـیـەكـانی هەولێـر بەشێـوەیەكی شـەرعی كـرانە فـەرمـانڕەوای هەولێــرو لەلایەن بـەرزتـریـن دەســـــەلاتی روحی ئیـسـلامـیـیـەوە دانیـان پێـدانراو شـەرعیـەتی میرایەتییـان سەلمێنرا، بەلام هاوكـات لەگـەڵ ئەم دان پێنانە، ولاتی هەولێـرو سـەرپاكی خـاكی هەرێمـە كـوردنشـینەكـان دووچاری هێرش و پەلامارە فراوانخوازییەكانی توركە سەلجوقەكان بوونەوەو میرنشین و دەسـەلاتدارییـە ناوخـۆییـەكـانی كــوردســـتـــان بوونە ئامـــانجی لەشكركـێـشی توركـەكـان، كـە راستەوخۆ هەردوو سولتانی سەلجوقی ئەلب ئەرسـەلان (٤٥٥-٤٦٥ك/ ١٠٦٣-١٠٧٢ز) و مـەلیكشـاه (٤٦٥-٤٨٥ك/ ١٠٧٢-١٠٩١ز) سـەرپەرشـتی و سـەركـردایەتی هێرشـەكـانیـان دەكـردو لەئەنجـامـدا زۆربەی قـەوارە سـیـاسـیـیـەكـانی كوردستان لاوازو پەراوێز خران و یان بەیەكجاری لەناو چوون، میرنشینی

هەزبانی هەولێـــریش لەم دیاردەیە بەدەر نەبوو، هەولێـر كـەوتە ژێر كۆنترۆلی دەوڵەتی سەلجوقییەوە.
دوای مـردنی مـیـر ئەبو عـەلی حەسەن، میر (ابو الهیجاء) حوسینی كوڕی جێگەی گرتەوەو بووە سەرداری هەزبانیـیـەكـان و پەیوەندی كـرد بەسولتان مەلیكشـای سەلجوقییەوەو لەڕیزی سوپای سەلجوقیدا خزمـەتی دەكـرد. بەیەكـێـک لەمـیـــرە پایە بەرزەكانی دەرباری سەلجوقی دادەنرا، و مەلیكشا رایدەسپارد بەئەنجامدانی هەندێ كـاری گـرنگ (اسـامـة بن منقذ، الاعتبار، ص٨٩-٩٠).
دوای مـردنی مـەلیكشـاە سـالّی (٤٨٥ك/ ١٠٩١ز)، هەڤـــڕكی و ناكۆكی كـەوتە نێوان كوڕەكانییەوەو بنەمـالّەی سـەلجـوقی لێک ترازاو دەوڵەتەكــەیان تـووشی لاوازی و لەتبـوون هات و ئەو وزەو توانایەی جـارانی نەمـا، مـیـران و سـەردارانی كــورد ئەم هەلەیان قــۆســتـــەوەو دەسـتـیـانكرد بەخـۆ رێكخـسـتنەوەو دامـەزراندنەوەی مـیرنشـینەكـانیـان و وەرگـرتنەوەی دەسـەلات، مـیـر (ابو الهـیـجـاء)ی هەزبانیش یەكـێک بوو لەمانە.
لە مـــاوەی ســـالانی (٥٠٠-٥٢٥ك/ ١١٠٦- ١١٣١ز)، مـیـر (ابو الهـیـجـاء) لەڕیزی فـەرمـانڕەواو میـرە گەورەو ناودارەكـانی كوردسـتان دەژمێـردراو بەردەوام هەوالّی بزاڤ و چالاكـیـیـە سـەربازییـەكـانی لە ســــەرچاوەكـــاندا دەبـینـرێت. مـێـژوونووسـان بەخـودانی هەولێـر (صــــــاحب أربـل) نـاوی دەبـەن (الكـامل، ٨/ ٢٢٩، ٢٥٢، ٢٦٢، ٢٨٢، ابن خلكان، وفـیـات الاعـیـان، ٧/ ١٥٣، ابن كـفري بردي، النجوم الزاهرة، ٦/ ١٦، ابن المسـتــوفي، تاریخ اربل، ١/ ٣٧١).
عـیـمـادەدین زەنگی ئەتابەكی مــوسلّ (٥٢١-٥٤١ك/ ١١٢٧-١١٤٦ز) پاش ئەوەی پێی خۆی قایم كـرد و دەسـەلاتی لەشـاری مـوسلّ چەسپاند، دەستی كرد بەزنجیرەیەک هێـرشی سـەربازی بۆ ناوچە كـورد نشینەكانی دەوروبەری موسلّ، قەلاّی هەولێر و میرنشینی هەزبانیش خرانە نێو بازنەی ئامانجەكانی زەنگییەوە. مێژوونووسان لەسەر مێژووی گرتنی هەولێـر لەلایەن زەنگیـیـەوەو هەر یەكــەو ســالێكی بۆ ئەم رووداوە داناوە، كە ناكۆكە لەگەڵ بۆچوون و ئاخـافـتنی ئەوانی تر، بەلام پتـر مـەزەندە بۆ ئەوە دەچێت، كە هەولێر لەسالّی (٥٢٦ك/ ١١٣٨ز) دەستی بەسـەرا گـیــرابێت و دەســەلاتی هەزبانیـیــەكــانیش لەناوبرابێت، لەلایەكی تردوە گومانی تێدا نییە كە مـیـر (ابو الهـیـجـاء) تا سـالّی (٥٢٥ك/ ١١٣١ز) هەر سـاغ و زیندوو بووەو مـیـری هەولێـر بووە (تاریخ اربل، ١/ ٢٠٦، مـحـسن مـحـمـد حسین أربـیـل في العـهـد الاتابكي، ص٣٦-٤١).
هەر چەند زانیـــاری و دەقی مێژوویی تەواومان لەبەر دەست نییە سـەبارەت بەدامـودەزگـا حكومی و كارگێڕییەكانی میرنشینی هەزبانی و وردەكـارییـەكـانی سـیـسـتـەمی بەڕێوەبردنی هەولێـرو دەوروبەری نازانرێت و ناوی ئەو كەسایەتییـانە ئاشكرا نییـە كـە پۆسـتـەكـانی بەڕێوەبردنیان وەرگرتووە، وەلێ لەبەر رۆشنایی چەند ئامـاژەیەكی كـورتداو

لەپەراوێزی ئاخافتنی مێژوونووس (ابن المستوفی)دا بۆمان روون دەبێتەوە، کە میرنشینی هەزبانی وەک میرنشیەکانی هاودەمی خاوەن دامودەزگای دارایی و قەزائی و وەزارەت بووە، ئەوەش دەزانرێت کە شاعیرو نووسەر (فخر الكتاب مذيد الدين الحسين بن علي بن محمد الاصفهاني (م ٥١٥ك/ ١١٢١ز) ناسراو بەتوغرائی (الطغرائي) ماوەیەک وەزیری هەولێر بووە (وفيات الاعيان، ٢/ ١٨٩)، هەروەها ئاماژەش هەیە لەهەولێری رۆژگاری هەزبانیەکان پۆستی (الحسبة) و پۆستی دارایی- باجگری (الاستيفاء) لەئارادا بووە، محەمەد کوری عەلی کوری حاج (ابن جامع) لەسەردەمی میر (ابو الهيجاء) بەرپرسیاریتی حوسبە (محتس)ی پێ راسپێردراوە، دوای مردنی کورو نەوەکانی ئەم پۆستەیان وەرگرتووەو (ابن المستوفي، تاريخ اربل، ١/ ٣٧٠- ٣٧١). لەهەمان کاتدا باپیری (ابن المستوفي) هاتۆتە هەولێرو تیایدا جێگیر بووە کاروباری دارایی و باجگری لەئەستۆ گرتووەو کراوە بەباجگر (مستوفی) هەولێرو بنەماڵەکەی هەر بەو پۆستەوە ناسراوە، چونکە زۆربەی ئەندامانی لە (الاستيفاء) کاریان کردووە (أربيل، ص٣٢١) لەلایەکی ترەوە، ئەوەی گرنگەو جێگەی بایەخە، ئەوەیە لەو سەردەمەدا هەولێر بێدەنگی و خامۆشی جارانی نەماو بووە شارێکی قەڵەباڵغ و ئاوەدان و گەشەکردن و فراوانبوونێکی بەرچاوی بەخۆوە دیت و لەئاستی رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا تەماشا دەکرا، بزاڤی زانست و رۆشنبیری لەشارەکە سەری هەڵداو خوێندن و خوێندەواری برەوی سەند، لەچەند جێگەیەکی شار لەچەشنی نیوە قوتابخانەیەک زانستەکانی قورئان و حەدیس و فیقهی ئیسلامی دەخوێنران و کتێب و نامیلکە دەدزران و روونووسی دەکران (بروانە، تاريخ اربل، ١/ ٧٠-٧٢، ٣٧٠- ٣٧١)، ئەم بزاڤە رۆشنبیرییە وای کرد بەسەدان شاگرد و میرزا و فێرخواز و خوێندەوار لەشارۆچکە و دێهاتەکانی دەوروبەرەوە بەنیازی فێربوون و خۆ پێگەیاندن رووبکەنە ناوەندی شار و لەئاکامدا دەیان شێخ و فەقیە و زانای حەدیس (محدث) و شاعیر و نووسەرو ئەدیبی هەولێری (الأربلی) دەرکەوتن، کە پتر لەهەردوو هۆزی زەرزاری و هەزبانی بوون، لەلایەکی ترەوە ژمارەیەک کە لەزاناو فەقیەو شاعیر و واعیزی جیهانی ئیسلامی دەهاتنە هەولێرو بۆ ماوەیەک تیایدا دەمانەوە، مێژوونووسی هەولێری (ابن المستوفی) زۆربەی کتێبەکەی (تاريخ اربل) تەرخان کردووە بۆ ناساندنی ئەو کەسایەتییە زانستییانەی سەردانی هەولێریان کردووە، کە ژمارەیەکیان لە سەردەمی هەزبانییەکان دابووە.

دەکرێت بڵێین بووژانەوە و ناو دەرکردنی هەولێر کە لەسەدەی شەش و حەفتی کۆچی/ دوازدەهەم و سێزدەهەمی زایینی گەیشتە لووتکە، لەراستیدا لەسەردەمی میرانی هەزبانی دەستی پێکردو ئەوان دەستپێشخەر بوون.

دوای لەناوچوونی دەسەڵاتی هەزبانییەکان لەوڵاتی هەولێر، هەندێک لەئەندامانی بنەماڵەی فەرمانڕەوا هەولێریان جێ هێشت و روویان کردە وڵاتی شام و میسر پەیوەندییان کرد بەئەسەدەدین شێرکۆ (اسدالدين شيركو) و سوڵتان سەلاحەدینی برازایەوە و درێژەیان بەکاری سیاسی دا و، دیارترینیان میر قوتبەدین (قطب الدين) خەسرەوی کوری تەلیلە، تەلیلیش برای میر (أبو الهيجاء) حوسێنە، کە میرێکی پایە بەرزو ناوداری سوپای ئەیوبی بوو، لەساڵی ٥٧٠ک/ ١١٧٤ز لەشاری قاهیرە قوتابخانەی قوتبیە (المدرسة القطبية)ی بنیاتناوە، کەیەکێک بوو لەقوتابخانە بەناوبانگەکانی قاهیرە (المقريزي- الخطط المقريزية، ٤/ ٢٠٤).

سەرچاوەکان:

١- ابن الاثير، الكامل في التأريخ، دار الفكر (بيروت ١٩٧٨).
٢- اسامة بن منقذ، الاعتبار، مطبعة جامعة برنستون (امريكا ١٩٣٠).
٣- ابن تغري بردي- النجوم الزاهرة، دار الكتب المصرية (القاهرة ١٩٧٠).
٤- ابن خرداذبه، المسالك والممالك، دار أحياء التراث العربي (بيروت ١٩٨٨).
٥- ابن خلكان، وفيات الاعيان، دار صادر (بيروت ١٩٧٧).
٦- ابن حوقل، صورة الارض.
٧- سبط ابن الجوزي، مراة الزمان (انقرة ١٩٦٨).
٨- ابن المستوفي، تاريخ اربل، دار الرشيد للنشر (بغداد ١٩٨٠).
٩- المقريزي، الخطط المقديزية دار الكتب العلمية (بيروت ١٩٩٧).
١٠- محسن محمد حسين، أربيل في العهد الاتابكي، مطبعة اسعد (بغداد ١٩٧٦).

# میرنشینی هەولێر لە سەردەمی موزەفەرەدین گۆگبری ٥٨٦ك - ٦٣٠ك / ١١٩٠ز - ١٢٣٣ز

دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن

دوای ئەوەی موزەفەرددین گۆگبری دووبارە گەڕایەوە هەولێر و جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست و جێگیر بوو پێشبینی چەند گۆڕانکارییەک دەکرا، کە لەگەڵ سیاسەتی ئایندەیدا بێتەوەو ناحەزانی لەناو ببات، لە کاتێکدا دەیزانی کە ئەوان حەز ناکەن جارێکی تر دەسەڵات بۆ ئەو بگەڕێتەوە[1]. جا ئەگەر ئەوە بیرکردنەوەی ئەو بووبێ پێش ئەوەی بگەڕێتەوە هەولێر و، خۆزگەخواز بووبێ، کە یەکێک لەو دەستگیرکراوانە سارمەدین بەلداجی میری قەڵاتی خەفتیان بێ و موزەفەرددین گۆگبری پەنای بۆ ئەو بەرنامەیە بردبێ بۆ لەناوبردنی بەرهەڵستکارەکانی پێش ئەوەی بگەڕێتەوە، هەڵبەتە دوای ئەوەی لە هەولێر جێگیر دەبێت بەردەوام دەبێت لەسەر جێبەجێ کردنی بەرنامەکەی، ئەمە وێڕای ئەوەی زانیاری ئەوەی لا هەبوو، کە ژمارەیەک لە لاگیرانی موسڵ نامەیەکیان بۆ نەیاری پێشووی موجاهیددین قایماز ناردبوو، تیایدا داوایان لێ کردبوو، کە بگەڕێتەوە هەولێر و بۆ جارێکی تر دەسەڵات بگرێتەوە دەست، بۆیە دەیویست بەسەر ئەو لاگیرانەدا زاڵ بێت.

شیاوی ئاماژە پێکردنە هیچ لە سەرچاوەکان ئاماژە بەو کار راپەڕاندنانە نادەن، کە میری گەڕاوە ئەنجامی دابێ پاش ئەوەی بۆ جارێکی تر دەسەڵاتی هەولێری گرتەوە دەست، بەڵام ئاماژە بەوە دەدەن بە ئاشکرا حەزی بە دەستگیرکردنی کەسانی دیکە کردووە و تا بەکۆتاهاتنی

دەسەڵاتەکەشی لەسەر ئەو ویستەی بەردەوام بووە. لە لایەکی دیکە پێشبینی ئەوە دەکرێت ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر هەولێردا هات و بە خۆیەوە بینی، کارراپەڕاندنی سلبی نەبووبن. چونکە ئەوە بەس بوو ناحەزو دوژمنانی لە دەسەڵات دوور بخاتەوە، یان لە بەڕێوەبردنی کاروباری میرنشین دوور بخرێتەوە. پاشان لاگیرانی لە شوێن خۆی دانیان. واتە گۆڕانکارییەکان سنووردار بووە و سروشتی دەسەڵاتی گۆڕیوە. هەروەها کارو پلەو پایەی تازەی هێنایە کایەوە، کە بگونجێ لەگەڵ رەوش و ئەو قۆناغە تازەیەی ناوچەکە بە گشتی و میرنشینی هەولێر بەتایبەتی پێیدا تێپەڕ دەبێت. بەتایبەت موزەفەرەدین گۆگبری نەگەڕایەوە بۆ ئەوەی حوکمڕانی میرنشینێکی سەقامگیر و رێکوپێک بکات. بەڵکو پاش ئەوەی زانی، کە بارەکە وا پێویست دەکات بە دواداچوونی راستەقینەو بەردەوامی هەبێت، یەکسەر دەستی بەو بەدواداچوونە کرد، کە بینی تەختی میرنشینەکەی بە هێزی دوژمن دەورە دراوە، یان بەهەرحاڵ هێزەکان دۆست نین، بۆیە لەسەری پێویستە دووبارە کاروبارو هەڵسووڕاندنی میرنشینەکەی رێک بخاتەوە، بەتایبەت کاروباری سەربازی، بۆ ئەوەی هێزێکی هەبێت و لەتوانایدابێ پشتی پێ ببەستێت. کەواتە بەبێ هێزی قەڵغان لە توانایدا نابێت لە رووی ئەتابیگەی موسڵ بوەستێ، چونکە بەهێزترین میرنشین بووە لەناوچەکەو هەمیشە لە دەرفەت دەگەڕا بەسەر میرنشینی هەولێردا زاڵبێ. جا پاش ئەوەی میرنشینی هەولێر بوو بە بەشێک لە موسڵ، دەسەڵاتدارانی موسڵ بە هەلیان دەزانی گەر ماوە بدرێت هێزێک لە دەوروبەریان دروستبێ، چونکە بە سەرچاوەی هەڕەشە بۆ سەر وڵاتەکەیان لێکیان دەدایەوە. بەڵام لەتوانای فەرمانڕەوای موسڵدا نەبوو، بتوانێ هیچ شتێک بەرامبەر ئەو میرنشینە بکات، لەبەر ئەوەی بە هێزو پشتیوانی سەلاحەدینی ئەیوبی دەپارێزرا.

کاتێ ئەتابیگەی عیزەدین مەسعوود لەسەرەتای ساڵی ٥٨٠ ک نیسانی ١١٨٤ ز پاڵپشت بە قزل ئەرسەلان عوسمان کوڕی ئیلدز فەرمانڕەوای ئازەربایجان هەوڵی دا بەسەر دەسەڵاتی میر زەینەدین یوسف زاڵ بێت. ئەو میرە توانی داگیرکەران تێک بشکێنێت، کە موجاهیدودین قایماز جێگری ئەتابیگەی موسڵ سەرکردایەتی دەکردن. پاشان ئەتابیگەی موسڵ درێژەیان بە دەست درێژییەکەیان دا و شەڕیان بە میرنشینی هەولێر فرۆشت، کە سەر بە سەلاحەدین ئەیوبی بوو، هەر ئەمەش پاڵی بە سەلاحەدین نا سەر لە نوێ جاڕدانی هەڵایسانی جەنگ بدا و تا ئەتابیکەکانی ناچار کرد پەنا بۆ پەیمانی ئاشتبوونەوە لەگەڵیدا ببەن. ئەو هاوپەیمانییەتییەشی بووە هۆی ئەوەی موسڵ ببێت بە بەشێک لە دەوڵەتی ئەیوبی[٣].

سەرچاوە:

١- الفتح القسي ٢٩٨ ط ليدن. الروضتين ٢/١٦٤

٢- (خەفتیان): دوو قەڵاتی گەورەن و لە کارەکانی هەولێرن و، یەکێکیان دەکەوێتە سەر رێگەی مەراغە و هەروەک پێی دەڵێن خەفتانی زرزاری لەسەر لوتکەی چیایەکەو لە ژێرەوەی رووبارێک دەڕوات و بازارێک و دۆڵێکی گەورەی لێیە - ئەوی تر پێی دەوترێت خەفتیانی سەرخاب بن بەدر لە رێگەی شارەزوورە لە هەولێر. ئەوەیان لەوەی تر گەورەتر و قەبەترە. یاقوت، معجم البلدان ٢/ ٣٨٠. وفيات الاعيان، ط القاهرة ٣/ ١٧٢. بەڵام محەمەدئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا (خلاصة تاريخ الكرد و كردستان) ل ٣٦٤ لە پەراوێزەکەیدا دەڵێت: خەفتیان - لەوانەیە مەبەست لە یەکەمەکەی - هەفتیانی ئێستا بێت، کە کەوتۆتە نزیک ردواندز.

٣- الكامل ١١/ ٥١٧ - المقريزي، السلوك ٩٨/١ - ٩٠.

# ژیاننامەی موزەفەرەدین گۆگبری

دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن

ئەبو سەعید[1] موزەفەرەدین گۆگبری[2] کوڕی میر زەینەدین ئەبی حەسەن عەلی کوچک کوڕی بەکتکیف لە ۲۷ ی مانگی موحەرەمی ساڵی ٥٤٩ک بەرامبەر ۱۳ ی نیسانی ۱۱٥٤ ز لە قەڵاتی موسڵ لە دایک بووە[3]. پاش ماوەیەک باوکی ناردی بۆ هەولێر بۆ ئەوەی لە پاڵ پەروەردیارەکەی موجاهیدودین قایماز، کە ئەتابیگە و لە جیاتی زەینەدین عەلی کوچک فەرمانڕەوایی ئەو شارەی هەڵدەسووڕاند ژیان بگوزەرێنێ، کە بنەماڵەکەی ئەو و سەروەت و سامانەکەی پێ سپاردبوو. بەمەش موجاهیدودین قایمازی ئەتابیک دەبێتە باوکی پەروەردیاری موزەفەرەدین گۆگبری[5] و براکانی.

موزەفەرەدین گۆگبری بە ژمارەیەک نازناو ناسراوە، لەوانە هەندێک لە مێژوونووسەکان وەک پیاهەڵدان و ستایشکردن ناویان بردووە، هەندێکی تریش بە گەورەیی نازناویان بردووە. یاخود لەسەر دراوی میرنشینەکەی تۆمارکراوە و لە دوای ئەو بەجێماوە. سەرنج دەدەین مێژوونووسی سەردەم (عیماد) نووسەری ئەسفەهانی، کە لە زۆربەی پێگەکانی خاچپەرستەکان ئامادەبووە و لەگەڵ موزەفەرەدین گۆگبری بەشداری کردووە، بە (شێری شێر)[6] ناوی دەبات. هەر وەک ئیبن شەداد[7] مونزری[8] بە (میری داهاتووی گەورە) ناوی دەبات. ئیبن خەلەکان و ئیبن سەعیدیش بە (سوڵتان)[9] ناوی دەبەن. لە کاتێکدا ئیبن ئەسیر[10] و ئیبن خەلەکان[11] و ئەوانی دیکە[12] بە (پاشای شکۆدار) نازناوی دێنن و، ئەو بەو نازناوەیەوە ناوبرا. بەڵام لەسەر دراوەکەی کە لە هەولێر لێدەدرا (پاشای پاشایان مزەفەری دنیا و دین گۆگبری عەلی)[13] لەسەری دەرکەوت. بەڵام لەسەر ئەو بەردەی کە لای شوێنەوارەکە بوو[14] کە لای مەککە داندرابوو، ئەم نازناوەی (میری بێگەردی)[15] گەورە... شمشێری ئەمیری موئمنین[16] لەسەری نووسرابوو. هەروەها ناوی لەسەر کارگە بە (کانی) ئاو نووسرابوو، کە لە ساڵی ٥٩٤ ک /۱۱۹۸ ز لە عەرەفات دایمەزراند. بەم شێوەیە (موزەفەرەدین گۆگبری کوڕی فەرمانڕەوای هەولێر شمشێری ئەمیری موئمنینە)[17].

### خووڕەوشتی

موزەفەرەدین گۆگبری بە ڕەفتار بەرزی و ئاوەدانکردنەوە و کاری خێرخوازی لەناو میرنشینەکەی دەنگی دابۆوە. لەم بارەوە ئیبن خەلەکان دەڵێت: ئەم میرە کاری خێرخوازی وای ئەنجام دەدا، کە کەس لە پێش ئەو کاری وای ئەنجام نەدابوو. لە دنیا لە هەموو شتێک لای ئەو خۆشەویستتر فێرکردن بوو. بڕێکی زۆری لە نان بۆ هەژارو دەست کورتەکان تەرخان کردبوو و بەیانی هەموو ڕۆژێک لە چەند جێگایەک لە شاری هەولێر دابەش دەکرا[18] وێڕای ئەوە لە هەردوو وەرزی زستان و هاوینەدا جلوبەرگی پێویستی پێدەبەخشین. هەروەها هەر کەسێک سەفەری بکردایە بەپێی ڕێگاکە خەرجی دەدایە، واتە بە پێی ئەو وڵاتەی کە بۆی دەڕۆیشت[19].

یەكێك بووە لە گەورە سەروەران و پاشا شەردفمەندەكان[20] بەوەی هەر یەكێ داخوازییەكی لێ بكردایە هەر بۆی جێبەجێ دەكرد، بەتایبەت فەقیهەكان و فەرمووده ناسەكان، تەنانەت شاعیرەكانیش كە هەر چەند زۆر كەیفی پێ نەدەهاتن تەنیا سەر و بەندێكی كەمی لەگەڵیان هەبوو.[21] بێگومان خوو رەوشتی وای هەبووە، كە هەرگیز لە كەسانی ئاوها كۆنەدەبوونەوە.[22]

یەكێك لە كارە خێرخوازەكانی لە هەر ساڵێك دووجار نێردراوی خۆی بە سامانێكی زۆر بۆ (شام) دەنارد[23] بۆ ئەوەی دیلە موسڵمانەكان لە دەستی خاچپەرستەكان ئازاد بكات. هەندێك لەوانە هەولێریان هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی وەك هاوشار لە هەولێر بژین پاش ئەوەی لە دیلایەتی ئازاد دەكران و دەنێردرانە گوندی(بێت نار)[24] بۆ ئەوەی پێداویستییەكانیان بۆ دابین بكرێ و پۆشاكی شیاویان لەبەربكرێ و پاشان داخیلی هەولێرین[25]. بەڵام ئەوانەی دەیانویست بگەرێنەوە بۆ وڵاتەكانیان، ئەوا ئەوەی پێویستیان پێبوو وەك دەرماڵە پێیان دەبەخشرا[26].

ئەوەی ئیبن جەوزی كە لەو سەردەمە ژیاوە و سەردانی هەولێری كردووە[27] دەڵێت: سەروەت و سامانی ئەم میرنشینە لە خێرو خێرات سوودی لێ وەردەگیرا. تەنانەت بگرە موزەفەرەدین گۆگبری ناچار دەبوو گەوهەر و زێر و زیوی زۆر بۆ دیمەشق بنێرێت، بۆ ئەوەی بیفرۆشێت و لە بری ئەوە دیلە موسڵمانەكان بەو پارەیە ئازاد بكات[28]. ژمارەی ئەو دیلانەی ئازادكراون ئاماركراون و رێژەكەی گەیشتۆتە ٦٠ هەزار دیل بە ژن و پیاوەوە[29]. بەڵام تێكڕایی ئەو بودجەیەی ساڵانە بۆ ئەو مەبەستەی تەرخان دەكرا دەگەیشتە سەد هەزار دینار[30]. هەر وەك ئەو مێژوونووسە دەڵێت. لە كاتێكدا ئیبن شەهیە دەڵێت ئەو بودجەیە ساڵانە گەیشتۆتە ٢٠٠ هەزار دینار[31].

هەروەها ساڵانە سەفەری حەجی دەكرد، تەواوی پێداویستییەكانی حاجیان، كە لەو رێگەیە پێویستییان پێدەبوو بۆیانی ئامادە دەكرد. ئیبن خەلەكان ئەو خەرجییەی كە بۆ سەفەری حەجی هەر ساڵێك تەرخان دەكرد دەگەیشتە نێوان ٥٠٠٠ تا ٦٠٠٠ دینار[32]. لە كاتێكدا ئیبن جەوزی بە (١٠٠٠٠) دینار دەیخەملێنێت[33]. بەڵام ئەوەی لە حەرەمەینی خەرج دەكرد بڕەكەی دەگەیشتە (٣٠٠٠٠) دینار[34].

بەڵام سەبارەت بەو پڕۆژە خێرخوازیانەی، كە موزەفەرەدین گۆگبری لە دەرەوەی هەولێر ئەنجامی دەدات، بریتی بوون لە دامەزراندنی پرۆژەی گەیاندنی ئاو بۆ چیای عەرەفات و سەرچاوەكەی ئاویشی نۆژەن كردەوە[35]. وێڕای ئەوە ژمارەیەك بیری بۆ دەستەبەر كردنی ئاوی پێویست هەڵكەند، لەوانە هەردوو بیری (زبادیەی گەورە) و(زبادیەی بچووك). بیری سێیەم پێی دەوترا (شەمەر دەقیە)[36]. بیرێكیشی لە سەرووی مەككە نۆژەن كردەوە، كە دەگەڕایەوە بۆ مەیمونی كوڕی حەزرەمی بۆ خێرات و بە خێراتی ئافرەت ناسرا[37]، ئەمەش لە ساڵی ٦٠٤ ك[38]-١٢٠٧ ز. هەروەها ژمارەیەك بیری دیكەی هەڵكەند و نۆژەن كردەوە، كە پاشان ئاویان تیایدا نەما[39].

هەر لە ئاسەوارە باشەكانی سێ بەیداخی لە سەر خاكی عەرەفەی دامەزراند[40]. مێژوونووس قاسی مەكی دەڵێت: دووان لەوانەی بینیوە و سێیەمەكەشی بەلای مەغمەس بووە[41]. ئەو مێژوونووسە لەسەر پردەكەی ئەو دەستەواژەیەی خوێندۆتەوە. (میری شكۆمەند موزەفەرەدین گۆگبری كوڕی زەینەدین فەرمانڕەوای هەولێر)، شمشێری ئەمیری موئمنین فەرمانی دا لە نێوان كۆتایی خاكی عەرەفەو دۆڵی عەرەفە ئەو سێ بەیداخە دابمەزرێنێت. هەروەها مێژووی دامەزراندنەكەشی لە سەر تۆماركراوە، لە شەعبانی ساڵی ٦٠٥ ك/١٢٠٨ ز یە[42]. هەروەها دوو بەیداخی تریشی كە بەلای مەككە لە سنووری حەرەم نۆژەن كردەوە و مێژووی نۆژەنكردنەوەكەشی بۆ ساڵی٦١٦ك/ ١٢١٩ ز دەگەڕێتەوە[43].

محەمەد گرد عەلی مەكانەتی موزەفەرەدین گۆگبری لە نێو دەسەڵاتدارانی موسڵمانان بە ئەنجامدانی كارو پرۆژە خزمەتگوزارییەكانیانی جیا دەكاتەوە و دەڵێت: موزەفەرەدین گۆگبری یەكێكە لەو میرە موسڵمانە خێرخوازانەی، كە بە تۆكمەیی كارو

پرۆژەی خزمەتگوزاری ئەنجامداوە، بە ئاستێک کە ئەو کارانەی ئەنجامی داون زێتر لە کارەکانی ئەمڕۆی رۆژئاوا دەچێت[٤٤].

موزەفەرەدین گۆگبری لە شاری حەلەب خانەقایەکی بە ناوی (زەینیە) دروست کرد لە کۆلانێک، کە ناسراوە بە (درب سید الحمزة)[٤٥]. پێدەچێت هەمان ئەو خانەیە بێت، کە ئیبن شەحنە باسی لێوە دەکات[٤٦]. لە دیمەشق مزگەوتێکی بۆ حەنابیلەکان لە ساڵی ٥٩٨ ک / ١٢٠٢ ز دروست کرد[٤٧]. لە موسڵیش خانەیەکی بۆ فەرموودە دروست کرد و بە خانەی فەرموودەی مزەفەرییە ناسرا[٤٨].

موزەفەرەدین خاوەنی خووڕەوشتێکی زۆر بەرز بوو، هیچ فیزی نەبوو، هەمیشە ئاراستە و بایەخدانەکەی بە لای کاری خێرخوازیدا دەڕۆیشت. (٤) خانەقای لە هەولێر دروست کردو پێداویستییەکانی بۆ دابین کرد بۆ ئەو کەسانەی پەککەوتەو نابینان. سەرجەم پێداویستییەکی لە خواردنەوە و خواردن بۆ دابین کردن. لە هەفتەیەکدا دووجار لە رۆژانی دووشەممە و پێنجشەممە بەسەری دەکردنەوە. هەروەها سەردانی ئەو نەخۆشخانانەی دەکرد، کە لە هەولێر دامەزرا بوون و لە هەواڵی تەندروستی نەخۆشخانەکانی دەپرسی. بایەخی بە پیاوانی ئاینی هەژار و دەستکورتەکان دەدا.

هەروەها لە رووی پۆشینی جل و بەرگ هەرگیز پۆشاکی وای لەبەر نەدەکرد، کە میرەکان دەیانپۆشی. بەڵکو جلی دڕی لەبەردەکرد، کە نرخەکەی لە (٥) درهەم تێپەڕ نەدەکرد. هەرچەندە رۆژانە رەبیعە خاتوونی خێزانی بۆ ئەو مەسەلەیە پەلپی پێدەگرت و هەمیشە داوای لێ دەکرد پۆشاکی نەرم لەبەر بکات تاوەکو جەستەی ئەزیەتی پێ نەخوات، چونکە بەجلە دڕەکان ئەزیەتی دەخوارد. ئەویش هەمیشە بەم شێوەیە وەڵامی دەدایەوە ئاخۆ کامەیان باشترە و پاداشتی زیاترە، ئەوەی پۆشاکی بە (٥) درهەم بپۆشێ یان بە (١٠) درهەم. هەڵبەتە بە (٥) درهەمەکە دەپۆشم و (٥) درهەمەکەی تریش بەسەر هەژار و کەم دەرامەتان دەبەخشمەوە[٤٩]. بەم شێوەیە خۆی لە یەزدان نزیک دەکردەوە.

سەبارەت بە ئاینپەروەری و دینداریەکەشی، ژیانێکی زۆر سادە و ساکاری لەگەڵ زاهیدان و سۆفیگەران گوزەر کردووە، بەشداری هەڵقەی خواپەرستی ئەوانی کردووە[٥٠]. چونکە زۆر باوەڕی پێیان هەبوود، لەوانە شێخ ئەبوو حامید ئەحمەد کرمانی ناسراو بە ئەوحەدەدین، کە لەگەڵ کۆمەڵێ عەجەم سەردانی هەولێری کردووە و میوانداری کراوە، پاشان ناردوویەتی بۆ حەجی ماڵی خوا[٥١]. هەندێ لە مێژوونووسەکان بە فەرموودەناس ناوی دەبەن، چونکە لە ئەبو عەلی حەنبەل کوڕی عەبدوڵا رەسافی و کەسانی دیکە گوێبیست بوونە[٥٢].

ئەوەندە ئاینپەروەر بووە تەنانەت نەیهێشتووە کاری خراپ و ناپەسەند بێتە وڵاتەکەی[٥٣]. لەم بارەیەوە غەسانی دەڵێت: ماوەی بەکەس نەداوە مەی بێنێتە ناو شار و حەدی لەو کەسەی دەردەکرد، کە دەیخواردەوە[٥٤]. بێگومان ئەوەندە چاکەخواز بووە، چاکە خوازییەکەی گەیشتۆتە دەرەوەی هەولێریش.

دەربارەی ئازایەتییەکەشی، ئەوا هەڵوێستی جوامێرانەی لە پێگە جیاجیاکان رەنگی داوەتەوە. جا چ لە سوپای ئەتابیگەی موسڵ یان لە ریزەکانی سوپای سەلاحەدینی ئەیوبی، یاخود ئەو کاتانەی سەرکردایەتی سوپای وڵاتەکەی کردووە. ئیبن خەلەکان باس لەو هەڵوێستەی دەکات لە جەنگی (حتین) دا و دەڵێت: موزەفەرەدین گۆگبری جوامێری وای سەلماند، کە پێشتر کەس ئەو جوامێرییەی نەنواندووە. گەر ئەو هەڵوێستانەی نەبوایە ئەوا شێوازی کۆتایی جەنگەکە دەگۆڕا، کاتێ لەگەڵ تەقیەدین عومەر کوڕی برای سەلاحەدینی وەستا و تەواوی سەربازەکانیان شکابوون، پاشان گوێبیستی بەرخودانی هەردوو سەرکردە موزەفەرەدین و تەقیەدین عومەر بوون گەڕانەوەو دەستیان بە شەڕو کوشتار کردەوە و توانیان بەسەر خاچپەرستەکاندا سەربکەون[٥٥]. قەزوینی دەڵێت: موزەفەرەدین گۆگبری پاشایەکی ئازاو سوار چاکێکی جوامێر بووە[٥٦]. بەڵام مونزیری دەڵێت: موزەفەرەدین لە شەڕ و کوشتاری کەناری (شافیعی)، هەڵوێستەکەی زۆر دیارە[٥٧]. هەروەها ئیبن فوتی باس لە ئازایەتییەکەی دەکات و دەڵێت:

جوامێر و خۆڕاگر بووە، ئەنجامدەرێكی باش بووە لە وڵات گرتندا[58].

جا مادامەكی باس لە كەسایەتی موزەفەرەدین گۆگبری دەكەین، ئەوا پێویستە لەسەر رۆشنبیریەكەشی قسە بكەین. ئارەزووی زۆر لە زانستی فەرموودە و مێژوو بووە. كتێبی (المسند) دەربارەی فەرموودەی[59] لە لایەن ئەبو عەلی حەنبەل كوڕی عەبدوڵلا رەسافی و كەسانی تر گوێبیست بووە. بەڵكو بە دوایدا دەگەڕا[60]. بەڵام دەربارەی ئارەزوو بوونی لە مێژوو ئەمەیان ئیبن خەلەكان جەختی لە سەر دەكاتەوە و دەڵێت: موزەفەرەدین گۆگبری شتێكی دەربارەی بە بیردا دەهات و دەیزانی[61]. بەڵام هەرگیز كەیفی بە شاعیران نەهاتووە، ناوی نەبردوون و پێی نەبەخشیون تەنیا ئەوانە نەبێت كە مەبەستی بووبن[62].

لەگەڵ ئەو هەموو رەوشت بەرزی و چاكەخوازییە و جوامێرییەی ژمارەیەك لە مێژوونووسەكان رەخنەی توندیان ئاراستە كردووە. بۆ نموونە سەرنج دەدەین یاقوت ئەلحەمەوی، كە لەو سەردەمە ژیاوە و دووجار سەردانی هەولێری كردووە[63] ئاماژەی بە كارەكانی و ئازایەتییەكەی داوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دەڵێت: (گۆشەنیگای ئەو میرە جیاوازە و هاودژە زۆر ستەمی لە میللەتەكەی كردووە، ئارەزووی لە كۆكردنەوەی پارە و پوول كردووە)[64]. پاشان جارێكی تر باسی دەكات و دەڵێت: وێڕای ئەوە موزەفەرەدین گۆگبری پیاوەتییەكی زۆری بەسەر هەژارەكاندا هەیە و، خێرو خێراتێكی زۆری بەسەر لێقەوماواندا دابەش كردووە، ئەو پارەو پوولەی كۆی كردۆتەوە لە ئازاد كردنی دیلەكان بۆ دەستی بێباوەڕان خەرجی كردووە. هەروەها دەڵێت: فەرمانڕەوای هەولێر هەڵوێستەكانی هاودژو پێچەوانەی یەك بوونە، لە لایەك هەوڵی داوە كاری خێرخوازی و چاكە بكات، لە لایەكی دیكە ئەو پارەیەی بە شێوازی ناشەرعی كۆكردۆتەوە. ئیبن واسڵیش هاوڕایە لەگەڵ حەمەویدا و دەڵێت: موزەفەرەدین پاشایەكی باش و ئازا و خاوەن هەڵوێست بووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەش ستەمی كردووە و بە زۆر پارەو پوولی كۆكردۆتەوە، لەگەڵ ئەوە خێرو خێراتی كردووە و چاكەكانی زۆرە[65]. ئەبو فیداش لەگەڵ ئەم دووانە هاوڕایە و دەڵێت: موزەفەرەدین پاشایەكی ئازا بوو بە زۆر پارەی كۆدەكردەوە[66] ئیبن وەردیش هەمان رای ئەبو فیدا دێنێتەوە و لەگەڵ رای ئەوانی دیكەش هاوڕایە[67]. هەڵبەتە ئەو لە بێژنگدانەیە و لكاندنی تۆمەتی ستەم بە میللەتەكەی و ئارەزوو بوونی فەرمانڕەوای هەولێر بۆ كۆكردنەوەی پارەو پول هەروا كوێرانە نەبووە. زانراویشە سزای كەسایەتییە میرنشینەكەی نەداوە لەوانەی، كە پلەو پایەی بەرزیان هەبووە تەنیا بە دەگمەن نەبێت. ئەوانەی كە دەستی بەسەر سەروەت و سامانەكەیاندا گرتبێ و هەر لەوانەشی هەندێكی زیندانی كردوون. بۆ نموونە وەزیر وەلیەدین ئەبو سەنا مەحموود كوڕی محەمەد بەحرانی[68] و وەزیر عەلی كوڕی شەماس[69] وەزیر ئیبراهیم كوڕی عەلی كوڕی ئەبی حەربی موسڵی و منداڵەكانی[70] زیندانی كردوون.

هەروەها حاجب ئەحمەد كوڕی عەبد سەید كوڕی شەعبان هەولێری پاش ئەوەی گەڕایەوە هەولێر و ئازاد كرا زیندانی كرا[71]. هاوكات ئەسعەد كوڕی ئیبراهیم نەشابی سەركاری دیوانی دامەزراند[72]. محەمەد كوڕی وەزیر وەلیەدین مەحموود حەرانی سەركاری دیوانی ستەم لێكراوان[73] و ئیسحاقی كوڕی مەعالی كوڕی شەماس، كە دەكاتە كوڕی برای وەزیر عەلی كوڕی شەماس، كە لە ساڵی ٦١٧ ك / ١٢٢٠ ز[74] لە زیندان مرد، زیندانی كردن. تەنانەت بگرە مستەوفی هەولێر كە ناسراوە بە موبارەك ئیبن موستەوفی تەنیا بە دەستگیركردنی رازی نەبوو، بەڵكو فەرمانی دا كۆت و زنجیر بكرێ، پاشان داوای لێ كرد لە بەرامبەر ئازادكردنی بڕی حەوت هەزار دینار بدات. ئیبن مستەوفیش بەشێكی لەو بڕە پارەیەی دا و ئەوەی مایەوەش لە بەرامبەردا دەست بەسەر سەروەت و سامانیدا گیرا[75]. هەروەها شاعیری هەولێری ناسراو بە ئەلحاجری زیندانی كراوە[76]. لە هەمان كاتدا لە هەندێ لە فوقەهایەكانیش تووڕە بووە. لەوانە لە فەقیە عیزەدین ئەبو قاسم نەسر كوڕی عەقیل كوڕی نەسر، كە دەكاتە كوڕی برای فەقیە ئەبول عەباس خدری هەولێری، كە هەڵسووڕێنەری قوتابخانەی عەقیلی قوتابخانەی قەڵات بوو لە پاش مردنی مامی

ناوبراو، لێی تووڕە بوو لە هەولێر دەری کردو ئەو فەقیهە چووە موسڵ و هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد[٧٧].

شایەنی ئاماژە بۆ کردنە بەمەش زیاتر کەسایەتی ئەو میرەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە هەر لە سیفەتەکانی تووڕە بوون و زیندانیکردنی کەسان و دەستبەسەرداگرتنی سەروەت و سامانیان بووە. بەڵام لێرەدا پرسیار لەو هۆکارە دەکەین، کە موزەفەرەددین گۆکبری پاڵناوە ئەم کارانە ئەنجام بدات، لە کاتێکدا کە بە شکۆداری و خێر خواز و خواپەرست ناسراوە؟ یاخود بپرسین چ جۆرە کەسانێکی دەستگیر کردووە و دەستی بەسەر سەروەت و سامانەکەی داگرتووە؟...

لەوانەی ئەوانەی دەستگیری کردوون ئەو کەسانە بوون، کە یارییان بە قووتی خەڵک کردووە. یان دەستی بەسەر سەروەت و سامانی ئەو کەسە داگرتبێ، کە پلە و پایەکەیان بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان بەکار هێنابێ. یان ئەوەتا بەرتیلیان لە هاووڵاتیان وەرگرتبێ. چونکە یۆنینی لەسەر شێوەی تێکستی شیعری لەسەر زوبانی ئەسعەدی کوڕی ئیبراهیم کوڕی حەسەن (ئەبو مەجدی هەولێری)، کە هۆنیویەتییەوە گوزارشت لە گەورە بەرپرسان دەکات، کە پلەو پایەکەیان بە خراپی بەکار هێناوە و باس لە دیاردەی بەرتیل دەکات و ئەبو مەجد[٧٨]دەڵێت:

قد قسمنا الديوان خمسة اقسام
عليها لكل قول دليل
رب حق فلا يطاع ومنسوب الى
القلم قولة مقبول
ثم شخص كانه الحرف في النخو
فلا فاعل ولا مفعول
ومصر علي التحيف والظلم بعيد
عن الصواب جهول
واخو حاجة يمشي احوالا لديه ان
جاءه البرتيل
أتراهم لم يعلموا ان كلا منهم عن
فعالة مسؤول [٧٩]

هەروەها چەند دێرێکی دیکەی هۆنیوەتەوە بە بۆنەی ئەوەی وەزیر ژمارەیەک لە کارمەندانی دیوانی ژمێریاری هەولێر، کە بە خراپی مامەڵە و ستەمیان کردبوو، دەڵێت:

جماعة الديوان في ليلة شحط
مظلمة
وقد غدت أيدي الوزير منهم
منتقمة
لا رحم الله الذي يرحم قوما
ظلمه[٨٠]

بۆیە دەڵێت گەر خراپی ژمارەیەک لە کارمەندانی دیوانی هەولێر و ئیستیغلالکردنی پلەو پایەکانیان هۆکارێک بووبێ بۆ گەیاندنیان بە بەندیخانە چونکە خیانەتیان کردووە بە پێی ئەوەی، کە نەوەی کوڕی ئیبن جەوزی باسی لێوە دەکات، ئەو هۆکارەش لە بێژینگ دەدرێت و ناکرێ لەسەر تەواوی قوربانیانی فەرمانڕەوای هەولێر ساغ بێتەوە. بەهەرحاڵ فەرمانڕەوای هەولێر بە ئاشکرا تووڕە بووە و ستەمی کردووە.

**ئاهەنگ گێرانی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) لە هەولێر**

هەروەک ئاشکرایە موزەفەرەددین گۆکبری لەبەر ئەوەی زۆر پابەند بووە بە ئایین و بە خۆشەویستییەکی بێ وێنە بۆ پێغەمبەری مەزن (د.خ) هەبووە، گەیشتە ئەو ئاستەی ساڵانە بە بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەری پێشەوا محەممەد (د.خ) ئاهەنگێکی گەورە لە شاری هەولێر ساز بکات، ئاساییە ئەو بۆنەیەش پیرۆزییەکی لە دڵی موسڵمانانندا هەیە و دواتر تەواوی پاشا ئیسلامییەکان ئەو بۆنەیەیان زیندووەکردەوە و ئاهەنگی گەورەیان بۆ سازدەدا.

لەم بارەیەوە ئیبن شەعار دەڵێت: کەسێک پێش موزەفەرەددین گۆکبری نەکەوتووە نە لە شایەکانی ئەو سەردەم یان خەلیفەکانی پێشتر، کە یادی لە دایکبوونی پێغەمبەر بە بەرزی رابگرن[٨١]. دواتر دەڵێت: هەر لە کۆن و نوێ نەبیستراوە، کە پاشایەک یان سوڵتانەکان ئەم کارەیان ئەنجامدابێت، جگە لە سوڵتان موزەفەرەددین نەبێت[٨٢]. بەدوور لە نەسرانییەکانی ناوخۆ، کە جەژنی لە دایکبوون یاخود جەژنی قیامەیان لە هەولێر بە ئاهەنگێران سازدەکرد[٨٣].

بە بۆنەی لە یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر محەممەد (د.خ) پێش دوو مانگ زێتر خۆ ئامادەباشی بۆ دەکرا و موزەفەرەددین گۆکبری لە پێشەوەی کرێکاران بوو بۆ دانانی گومەزەی دار، کە لە چەند چینێک پێکهاتبوو، کە خۆی لە بیست گومەزە دەدا. وێڕای ئەوەی لە مەیدان ژمارەیەک خێوەتیشیان هەڵدەدا[٨٤] کە نزیک بوو لە قەڵات، بۆ ئەوەی ئەو میوانانەی داوەت کرابوون و لە وڵاتە نزیکەکان دەهاتنە هەولێر لەوێ دابنیشن.وەک بەغدا و موسڵ و وڵاتی فارس و شنگال و نەسیبین و

جەزیرەی ئیبن عومەر،..... هتد. ئەم شاندانەش لە فەقیهەکان و سۆفیگەر و رابەر و خوێندەوار و سروودبێژ و شاعیرەکان پێکهاتبوو[85].

هەر لەگەڵ دەستپێکی مانگی سەفەر تیپەکانی مۆسیقا کە لە گومەزەکان دانرابوون دەستیان دەکرد بە مۆسیقا ژەنی و گۆرانی وتن.کۆمەڵێ لە خەیاڵ مەندەکان[86] خاوەنی تیاترۆخانەکانی بێ تاوان چالاکییەکانیان دەنواند. خەڵکیش لە چواردەوریان کۆدەبوونەوە و بە خۆشییان گوزەر دەکرد. خەڵکەکە بە درێژایی رۆژانی ئاهەنگگێڕان لە کارەکانیان دوور دەکەوتنەوە و حەزیان دەکرد بەشداری لەم ئاهەنگانەدا بکەن و کاتی خۆشی لە گەڵی بەسەر بەرن[87].

بەڵام موزەفەرەددین گۆگبری لە دوای نوێژی عەسر رۆژانە لە قەڵات دادەبەزی و سەیری یارییەکانی دەکرد و گوێی لە گۆرانی تیپەکانی مۆسیقا دەگرت. بە شەویش دەچووە خانەقا و بەشداری لە گوێگرتنی رەفتاری جوانی پێغەمبەر (د.خ) دەکرد. کە لە خانەقا بەرێوە دەچوو. بەرە بەیانییەکەی رۆژی دواتر پاش نوێژی بەیانیان دەچووە راو، دواتر پێش کاتی نوێژی نیوەرۆ دەگەرایەوە قەڵات. بە درێژایی مانگی سەفەر و سەرەتای مانگی رەبیعی یەکەم لەسەر ئەم شێوازە بەردەوام بوو تا شەوی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) دادەهات و ئاهەنگەکان گەرم دەبوون. موزەفەرەددین گۆگبری نوێژی شەوانی لە قەڵات دەکرد و پاشان بە کەژاوەیەکی جیا دەهاتە خانەقا و دوو یان چوار مۆمی گەورە بە هەڵگیرساوی هەڵدەگیرا[88]. کە هەر یەکێکیان لەسەر پشتی هێسترێک پیاوێک هەڵیگرتبوو. لە بەرە بەیانی رۆژی لە دایک بوون مەراسیمەکە دەستی پێدەکرد و لە قەڵات بەرەو خانەقا دادەبەزین و سۆفییەکان یەک لە دوای یەک دەرۆیشتن تا دەگەیشتنە خانەقا و لەوێ سەرۆک و پیاوماقوولانی شار کۆدەبوونەوە، کورسییەک بۆ رابەر دادەنرا. تاودرێک کە چەند پەنجەرەیەکی تێدا بوو موزەفەرەددین گۆگبری لە ناویدا دادەنیشت و لەوێ سەیری هەموو لایەکانی دەکرد و سەرپەرشتی نمایشە سەربازییەکەی دەکرد، کە بەم بۆنەیەوە بە درێژایی رۆژی ئاهەنگگێڕان رێکدەخرا[89]. لە پاش تەواوبوونی مەراسیمەکە ئامادە بووان دەرۆیشتن بۆ نان خواردن، دواتر بینینی بە درێژایی شەو تا بەرە بەیانی رۆژی دواتر بەردەوام دەبوو[90]. ئەو دیتنە ئاسا بە ژیاننامەی پێغەمبەر (د.خ) و بەسەرهاتی شەو و رۆژی پێغەمبەر دەست پێدەکرا[91]. لەمبارەیەوە ئەبو خەتتاب عومەر کوڕی حەسەن ناسراو بە ئیبن دەحیەی بلنسی لەو ماوەیەی، کە لە هەولێر بوو لە ساڵی ٦٠٤ ک / ١٢٠٧ ز کتێبێکی داناو ناوی نا (کتاب التنویر فی مولد السراج المنیر) و دانەیەکی پێشکەش بە موزەفەرەددین گۆگبری کرد، کاتێ بینی ئاوا سوورە لەسەر سازکردنی ئاهەنگ بەم بۆنەیەوە[92] ئیبن دەحیە بە خودی خۆی کتێبەکەی بە ئامادەبوونی فەرمانڕەوای هەولێر خوێندەوە. لە بەرامبەر ئەوە فەرمانڕەوای هەولێر هەزار دیناری پێشکەش کرد[93].

هەروەها مێژوونووسەکان باس لەو جۆرە خواردنانە دەکەن، کە بەم بۆنەیەوە ئامادە دەکران و زۆر لە ئاژەڵان وەک مەڕ و چێڵ و وشتر سەر دەبڕان، تەنانەت بگرە خواردنەکان وەسف نەدەکران[94]. لەم رۆژەدا هەروەک ئیبن خەلەکان دەڵێت دوو سفرەی گەورە رێک دەخران، یەکێک لە مەیدان بۆ تەواوی خەڵک و هەژارەکان، کە هەموو جۆرە خواردنێکی لەسەر بووە، بە ئاستێک کە بە وەسف نایەت[95] سفرەی دووەم لە خانەقا رێک دەخرا بۆ ئەو کەسانەی تیایدا کۆ بووبوونەوە[96]. ئاهەنگەکە بە دابەشکردنی دیاری و خەڵات بەسەر بەشداربووان لە فەقیهەکان و رابەرەکان و شاعیران، بە تایبەتی ئەوانەی لە وڵاتانی دیکە هاتبوون دابەش دەکرا[96]. هەڵبەتە ئەو جۆرە ئاهەنگگێرانە لە گەنجینەی دەوڵەت خەرجییەکی زۆری بۆ دابین دەکرا. مێژوونووسەکان دەڵێن خەرجییەکەی گەیشتۆتە (٣٠٠) هەزار دینار[97].

### کۆچی دوایی موزەفەرەددین گۆگبری و بە خاکسپاردنی

فەرمانڕەوای هەولێر لەناو ماڵەکەی خۆی کە پێشتر هی میر شەهابەدین قرتای کوڕی عەبدوڵا[98] بوو، لە رۆژی ١٨ رەمەزانی ساڵی ٦٣٠ ک بەرامبەر بە حوزەیرانی ١٢٣٣ز کۆچی دوایی کرد. پاشان تەرمەکەی گوازرایەوە بۆ قەڵات و بە شێوەیەکی کاتی لەوێ نێژرا. بۆ ئەوەی لە کاتی مەوسمی حەج بۆ

مەككە، چونكە خۆی رایسپاردبوو لەو شوێنە بنێژرێت، كە خودی خۆی لە چیای عەرەفە دەستنیشانی كردبوو[99]. كاتێ لە ساڵی دواتر ٦٣١ك / ١٢٣٤ز حەجاج بەرەو حیجاز رۆیشتن و تەرمەكەیان لەگەڵ خۆیان برد، بەڵام لە رێگاو لەو سەفەرەیاندا زۆر ئازاریان چەشت، ئەویش لەبەر ئەوەی ئاویان دەست نەدەكەوت.بۆیە بیانووی ئەوەیان لا دروست بوو، كە فەریزەی حەجی ئەم ساڵ ئەنجام نەدەن. لە لای شاری (لینە)[100] گەڕانەوە و تەرمەكەشیان هەر لابوو. ناچار بوون لە پشتی كوفە لە(نەجەف) لە نزیك مەزارگەی عەلی كوڕی ئەبی تالیب(ع) بینێژن[101]. بەڵام ئیبن عبیری دەڵێت موزەفەرەدین گۆگبری لە مەككە نێژراوە[102]. كەچی غەسانی دەڵێت یەكەم جار لە كوفە نێژرا، دواتر تەرمەكەیان گواستەوە بۆ مەككە و دووبارە لەوێ نێژرایەوە[103]. هەڵبەتە دوای ئەوەی ئەو گێڕانەوەیە لە بێژینگ درا نادروستن. بەڵام گێرانەوەی تر هەیە، كە مێژوونووسانی دیكە لەسەری كۆكن[104].

## كۆتایی ئەتابیگەی هەولێر و چوونە پاڵ شانشینی خەلیفەی عەباسی- ١٧ شەوال ٦٣٠ك / ٢٦ تەموز ١٢٣٣ز

هەولێر بەو رێگەیە تەسلیم بە خەلیفە نەكرا، كە فەرمانڕەوای هەولێر كلیلەكانی لەگەڵ خۆی بردبوو، لە كاتێكدا كە لە سەردانێكی زیرەكانەی سۆزداری چوو بۆ بەغدا. یاخود هەر وەك فەرمانڕەوای هەولێر بە نوێنەرانی خەلیفەی راگەیاندبوو، كە لە دوای سەردانەكەی یاوەریيان كردبوو بۆ هەولێر. بە دووریش نازانرێ فەرمانڕەوای هەولێر لەو بڕیارەی پێشووی پاشگەز بووبێتەوە، كە میرنشینەكەی تەسلیم بە بەغدا بكات.

سەرنج دەدەین پەیوەندی لەگەڵ سەربازانی خەلیفە زۆر ئاڵۆز بووە كاتێ لە ساڵی ٦٢٩ك / ١٢٣٢ز لە كەرخینی مایەوە بۆ ئەوەی بەرپەرچی مەغۆلەكان بدەنەوە[105]. ئەو ئاڵۆزییە وایكرد پێكدادان لە نێوان هەر دوو لا رووبدات و خوێن بڕژێت. هەروەها ئەگەری ئەوەش لە ئارادایە كە ئەو رووداوە لە هزری فەرمانڕەوای هەولێر مابێتەوە، بۆیە نێردراوانی جەمالەدین قشتەمر سەركردەی سەربازانی خەلیفەی، وەك شەرەفەدین عەلی (كوڕی قشتەمر) و سەعدەدین حەسەن كوڕی حاجب عەلی) بە رێگەیەك لە هەولێر وە دەرنا، كە وەك ئەوەی وابوو دەری كردن. ئەمەش پەیوەندی بە هەڵوێستە تازەكەی هەبوو بەرامبەر بە بەغدا و، لەو بڕیارەی پێشووی پاشگەز بۆوە، كە میرنشینەكەی بچێتە پاڵ خەلیفەی عەباسی.

موزەفەرەدین گۆگبری مەجدەدین ئەسعەد كوڕی ئیبراهیم كوڕی حەسەن شەیبانی هەولێری دەستگیر كرد، كە جەخت لەسەر ئاڵۆزی پەیوەندییەكانی نێوان هەر دوو لا دەكاتەوە. شتێكی ئاشكرایە مەجدەدین ئەسعەد هەر لە ساڵی ٦١٥ك / ١٢١٨ز[106] نووسەری فەرمانڕەوای هەولێر بووە. بەمەوەش پلەو پایەی لە میرنشینەكەی بەرزتر بۆوە و تا گەیشتە ئەو ئاستەی گەورە پیاوانی دیوەخان یاوەری موزەفەرەدین گۆگبری بكەن لە میانەی سەردانەكەیدا بۆ بەغدا. دوای ساڵێك پاش ئەو سەردانە موزەفەرەدین گۆگبری هەڵسا مەجدەدین ئەسعەدی لە قەڵاتی كەرخینی زیندانی كرد و هەر لەو زیندانە مایەوە تا لە ساڵی ٦٣٠ك / ١٢٣٣ز موزەفەرەدین گۆگبری كۆچی دوایی كرد و میرنشینەكەی چووە پاڵ شانشینی خەلیفە. ئەوسا سەربازان مەجدەدین ئەسعەدیان ئازاد كرد و بە سەربەرزی گەڕایەوە بەغدا، بۆ ئەوەی لەوێ سەقامگیربێ و هاوكات ژمارەیەك بەرپرسیارێتیشی پێ سپێردرا[107]. لەوانەیە ئەو بارەی دەستگیركردنی لەو رەوشەدا و پاش ئازاد بوونی لە دوای مردنی گۆگبری و گەڕانەوەی بۆ بەغدا و پێسپاردنی ژمارەیەك پلەو پایە پەیوەندی بە هەڵوێستی تازەی بەغدا هەبووبێ بەرامبەر بە هەولێر. لەم بارەیەوە دكتۆر مستەفا جەواد لە هەر یەك لە ئیبن عەدیم و ئیبن كوتبی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: مەجدەدین ئەسعەد كاروباری تازەی دەخستە بەردەم دیوانی خەلیفەو كاتێ موزەفەرەدین گۆگبری بەمەی زانی فەرمانی دا بەند بكرێ[108]. جا گەر ئەوە راست بێت، ئەوە جەخت لەسەر ئەو پەشۆكاوییە دەكاتەوە كە پێشتر باسمان لێوە كرد، كە كەوتبووە نێوان هەولێر و بەغدا و هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی لەپاش مردنی فەرمانڕەواكەی هەولێر بە

ئاسانی تەسلیم بە بەغدا نەکرێت. بەڵکو دانیشتوانەکە خۆیان ڕێکخستەوە و لە ڕێگای بەرهەڵستکاریکردن دژایەتی هێزەکانی خەلیفەیان کرد و خوێنێکی زۆر ڕژا تا لە کۆتاییدا وڵاتگیر کرا.

لە پاش مردنی گۆکبری لە ١٨ رەمەزانی ٦٣٠ک/ حوزەیرانی ١٢٣٣ز[١٠٩] هێزەکانی خەلیفە بەرەو هەولێر بزاوتیان کرد[١١٠]. خەلیفە ژمارەیەک لە گەورە سەرکردەکانی و میرەکانی سوپاکەی بەسەرکردایەتی ئەو سوپایە دانا، لەوانە میر ئەرگەش ناسری رۆحی و عەلائەدین دکز ناسری چونکە وەک ئەوە وابوو خەلیفە زانیاری بەوە هەبێ، کە هێزەکانی رووبەڕووی بەرهەڵستکارانی هەولێر بنەوە.

لە قەڵاتی هەولێر دوو پاشای گۆکبری هەبوو (برنەقش و خالیس) نامەیەکیان بۆ هەریەک لە خەلیفەو عیمادەدین زەنگی فەرمانڕەوای شارەزوور[١١١] زاوای موزەفەرەدین گۆکبری نارد، هەروەها بۆ شایەکانی بەنی ئەیوبیشیان نارد و بەوانەیان ڕاگەیاند، میرنشینی هەولێر دەبێتە سەر بەو لایەنە کێ بە زووترین کات بگاتە ئەو میرنشینە[١١٢]. بۆیە خەلیفە پەلەی کرد لە ناردنی هێزەکانی. بەڵام کاتێ ئەو شایانەی موزەفەرەدین هەواڵی گەیشتنی هێزەکانیان پێگەیشت دەستیان کرد بە ڕێکخستنەوەی بەرهەڵستکاری دژایەتی کردنی ئەو هێزانەو، لە هەمان کاتدا ناردیان بە دوای عیمادەدین زەنگی و هانیان دا، کە بچێت بۆ لایان تا وڵاتەکەیان تەسلیم بکەن[١١٣]. هەروەها بە هەمان شێوەش بۆ شا ساڵح ئەیوب کوڕی شا کامیل فەرمانڕەوای حەران[١١٤] یان نارد و ئەوکات هەر دووکیان لە ئامەد[١١٥] دابەزیبوون. بەپێی ئەوەی نەوەی ئیبن جەوزی باسی لێوە دەکات[١١٦]. ئەوە بوو هەردوو شای ئەیوبی نەگەیشتنە ئامانجەکانیان و نوشوستییان هێنا. بەڵام عیمادەدین زەنگی دیارنییە ئاخۆ داواکەی قەبوڵ کردووە یان نا، یاخود وای بۆ چووە کە لە توانایدا نییە بزاوت بکات و رووبەرووی هێزەکانی خەلیفە بێتەوە و رۆژی تەواو بوو و مرد بەر لەوەی هیچ کارێک ئەنجام بدات[١١٧].

هەر چۆنێ بوو سەربازانی خەلیفە گەیشتنە ناوچەکە و لەگەڵ بەرهەڵستکاران رووبەڕووی یەکتر بوونەوە و پەکیان کەوت لەوەی بتوانن بەرهەڵستکاران بشکێنن[١١٨]. بۆیە ناچار بوون داوای هێزی زیاتر لە بەغدا بکەن. ئینجا خەلیفە هێزێکی تازەی بەسەرکردایەتی ئەبو فەزائیل شەرەفەدین ئیقبال شەرابی سەرکردەی سوارچاکی بەغدای رەوانە کرد. لە ١٣ی شەوالی ٦٣٠ک/ ١٢٣٣ز گەیشتە هەولێر[١١٩]. ئەویش نەیتوانی بەرهەڵستکارەکان لە ناو ببات، چونکە دەرگاکانی شارەکەیان بە پوختی داخستبوو. لەم کاتەدا دیسان داوای هێزێکی دیکەی تازەیان کرد.

هێزی سێیەمیش بەسەرکردایەتی جەمالەدین قشتەمر هات. ئەمەیان هەستا پلانێکی تازەی دارشت بۆ گرتنی هەولێر، هێزەکانی بەسەر دەرگاکانی شارەکە دابەش کرد، خێوەتگاکەشی لە بەرامبەر دەرگای عەنکاوە هەڵدا[١٢٠]. کە بەگەورەترین دەرگا دەژمێردرا. ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی لەوێ دانا. پاشان گەمارۆیەکی توندی دانا و ئامادە بوو بۆ هێرشکردن. بەڵام وای بە چاک زانی نامە بۆ هەولێرییەکان بنێرێت و دەستی کرد بە هەرەشە و تۆقاندن و سزادانی ئەو کەسانەی سەرپێچی دەکەن. کاتێ شایەکان داواکەیان لە جەمالەدین پێگەیشت، ئەوانیش داوایان کرد ماوەیان پێدا بۆ ئەوەی لەگەڵ گەورە پیاوانی میرنشینەکان ڕاوێژ بکەن، لەوانەیە مەبەستیان ئەوە بووبێ کات وەدەست بێنن، بەڵکو یەکێ لە شایەکانی ئەیوبی دەگاتە ناوچەکە، کە پێشتر نامەیان بۆ ناردبوون. بەڵام کە هۆشدارییەکە تەواو بوو جەمالەدین قشتەمری هۆشدارییەکی توندتری پێدان و ئاگاداری کردنەوە لەوەی کە نەکەن هیچ سەرپێچییەک بکەن، بەڵام هۆشدارییەکە بە هەوادا چوو[١٢١].

لەم کاتەدا سەرکردە فەرمانی خۆی گۆڕی فەرمانی دا هێرشێکی چڕ بکەنە سەر شارەکە و لەسەر شوورەکاندا ئاگر بارانیان بکەن، ئەم شەڕە دوو رۆژ بەردەوام بوو، لەم ماوەیەدا کوژراو و برینداری زۆر کەوتەوە. لە رۆژی سێیەم ١٧ شەوال ٦٣٠ک/ حوزەیرانی ١٢٣٣ز هێرشەکە توندتر بوو، جەمالەدین قشتەمر خودی خۆی سەرپەرشتی کار ڕاپەڕاندنی شەڕەکەی دەکرد و فەرمانی دا دەرگای عەنکاوە بسووتێنن[١٢٢]. دوای ئەوە ڕۆیشت تا لەسەر خەندەکەکەی دەوروبەری

شوورەکە بوەستێت. ئینجا هانی چەکدارەکانی دەدا، بە هەمان شێوەش شەرابیش وای کردو لەسەر بەرزاییەک وەستاو سەربازەکانی پالنا بۆ کوشتار، دواتر گەڕایەوە شوێنی خۆی بۆ ئەوەی لەگەڵ جەمالەدین راوێژ بکات، ئەوە بوو بەیەک نەگەیشتن تا هەواڵی دەست بەسەرا گرتنی قەلاتیان پێگەیشت، بەوەی کە تەسلیم بە هێزەکانیان بوو[123].

سەربازەکان پێیان نایە ناو شارو هەندێکیان دەستیان کرد بە تالانکردنی خەڵکەکە[124]. ئیقبال شەرابی لەسەر باڵی باڵندەیەکی نووسی، کە بەرەو بەغدا دەڕۆیشت بۆ ئەوەی مـوژدە بە خەلیفە بدات، کە شاری هەولێر تەسلیم بوو. بەغداش پێشوازی لەو هەواڵە دڵخۆشکەرە کردو تەپڵی خۆشی لێدا و تەواوی زیندانییەکانیان ئازاد کردن، وەزیر بۆ پێشوازیکردن دانیشت[125]. شاعیرەکان لە دیوان ئامادە بوون و تێکستی شیعریان دەهۆنییەوە و باسیان لەو موژدەیە دەکرد.

لە راستیدا ئەو پێشوازییە گەرمەی لە دەست بەسەرداگرتنی هەولێر کرا گرنگی و بایەخی ئەو شارە نیشان دەدا لە رووی بایەخدانی سەربازییەوە، بەتایبەتی لای خەلیفە[126]. وێڕای ئەوە هەولێر پێگەیەکی ولاتی شارەزوور بوو[127]، دەروازەی خاکی عێراقیش بوو بەرەو ناوچە شاخاوییەکان.

دوای ئەوەی هەولێر کەوتە ژێر دەسەلاتیان خەلیفە موستەنسر بیللا داوای ئەبو موزەفەر شەمسەدین باتکین[128] کوری عەبدولا رۆحی میری بەسرەی کردو فەرمانی پێکرد بەرەو هەولێر بڕوات، بۆ ئەوەی دەسەلاتی ئەو شارە بگرێتە دەست. باتکین لە ١٩ ی زیلقەعیدەی ساڵی ٦٣٠ک/ ئابی ١٢٣٣ گەیشتە هەولێر، رۆیشت بۆ ئەوەی چاوی بە شەرەفەدین ئیقبال شەرابی بکەوێت، کە لە دەرەوەی شوورەی هەولێر لەناو خێوەتگایەک دادەنیشت. دەستی لە شمشێر و ئەسپ و زەوییەکەی هەڵگرت پاشان بە یاوەری میرەکانی سوپا چوونە مزگەوت و زەهیرەدین حەسەن کوری عەبدوڵلا لە پێشەوەیان دەڕۆیشت و نووسراوی خەلیفەی بۆ ئامادەبووانی خەڵکی شارەکەی خوێندەوە، کە تیایدا هاتووە میر شەمسەدین باتکین لە جیاتی ئەو دەبێتە حاکمی هەولێر. پاشان بەسەر قەلات کەوتن و میر لە کۆشکی میرنشین دابەزی، کە شوێنی نیشتەجێی موزەفەرەدین گۆکبری بوو. دواتر ئیقبال شەرابی پۆستە سەرەکییەکانی بەسەر گەورە کەسایەتییەکان دابەش کرد، کە بۆ ویلایەتی هەولێری تازە دامەزرێندرابوون. عەلی زەهیرەدین حەسەن کوری عەبدولا وەک وەزیر بۆ میر باکتین دامەزرا. هەروەها عەلی زەهیرەدین کوری موستەنەع بوو بە سەرپەرشتیار لە سەر کارەکانی وەزیر. جەمالەدین ئیبن عەسکەری ئەنباریش بە سەرپەرشتیاری کارەکان دامەزرا، کە بۆی دیاری کرابوون[130].

**شارستانیەتی هەولێر**

**یەکەم: پلانی شاری هەولێر**

لە هەردوو سەدەی شەشەم و حەفتەمی کۆچی شاری هەولێر بەر فراوان بوون و گەشەسەندن و پێشکەوتنێکی بەرچاوی بە خۆوە بینی، بە تایبەتی قەلات کە بریتی بوو لە شارێکی تەواو و پڕ دانیشتوان. هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بەشی خوارەوەی شار گەشەسەندن و ئاوەدانی بەخۆوە بینی، بە تایبەتی لە سەردەمی موزەفەرەدین گۆکبریدا[131] و ببێ بە شارێکی گەورە و بەر فراوان، پەلهاوێشتوو[132].

وادیارە ئەو پێشکەوتنە پێش بوونی میرنشینی ئەتابیگەی سەربەخۆ و پێش مردنی دامەزرێنەری ئەو میرنشینە بێت، کە زەینەدین عەلی کوچک بوو، ساڵی ٥٦٣ک. ئیبن خەلەکان کە رۆڵەیەکی ئەو شارەیە لە باسی مردنی ئەتابیگی ناوبراودا دەڵێت: تەرمەکەی لە نزیک مزگەوتی عەتیق لەو شارە نێژرا[133]. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ئەوسا مزگەوتی عەتیق لە بەشی خوارەوە هەبووە، واتا لە پێش ماوەی مێژووی ئەتابیگەکان.

بەشی خوارەوە لە هەموو لایەک دەوری قەلاتی نەدابوو، بەڵکو قەلات کەوتبووە لایەکی[134]، نەک ناوەڕاستەکەی. شوورەی شاریش لە نیوەی قەلات دەپچڕا[135]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەو بەرفراوانییە هەموو لایەکی نەگرتۆتەوە. یاقوتی حەمەوی، کە دووجار سەردانی ئەو شارەی کردووە دیار ناکات لە کامە لایەوە بەر فراوانی بە خۆوە بینیوە، بۆیە ئەستەمە بتوانرێ ئەو لایەنە دیاری بکرێت.

ئەستەمەکەش لەوە دایە گۆڕانکاری بەسەر شێوەی شار داهات، ئەویش لەبەر پووکانەوەی زۆری باڵەخانەکان بوو لەو ماوەیەدا. هۆکاری پووکانەوەی ئەو باڵەخانانەش دەگەڕایەوە بۆ سروشتی ئەو کەرستانەی لە دروستکردنیان بەکار دەهێنرا، نەخوازەڵا قوڕ. لە کاتێکدا گەر هاتبووایە کەرەستەی باش لەو باڵەخانانە بەکاربهێندرابایە، کە بەرهەڵستی هۆکارەکانی پووکانەوە و رووخانی بکردایە، ئەوا لەوانەبوو تا ئێستاش هەر بمێنێتەوە. لە کاتێکدا سەرنج دەدەین منارەی مزەفەریە لەگەڵ ئەو هەموو رەوشە سروشتییانە هەر مایەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی بە گەچ و خشت دروست کراوە. بەڵام بینایەکانی تر، لەوانەش مزگەوت کە ئەو منارەیە بەسەریدا دەڕوانی بە تەواوی رووخاون[١٣٦].

هۆکاری دیکەی ئەستەمیش هەیە، ئەویش ئەوەیە سەرچاوەکان ئاماژە بە شوێنی دامودەزگاکان ناکەن، کە ئەوسا لەو شارە دروست کراون وەک قوتابخانەکان، خانەقاکان، خانەی فەرمووده و مزگەوتەکان، خانەی میرنشین.....هتد. لێرە دەشێ ئەوە بڵێین گەر قەڵات نەبووایە، ئەوا شارەکە زۆر گۆڕانکاری بەسەردا دەهات، نەک تەنیا لەوانە بوو شارەکە لە شوێنێکەوە گوازرابایەوە بۆ شوێنێکی تر. چونکە نەکەوتۆتە سەر رووبارێک، هەروەها بۆ نموونە چیایەکیش لە دەوری نییە تا ببێتە بەربەستێک بۆی. بەڵکو شارەکە ــ پاشان قەڵاتـــ کەوتوونەتە ناوەڕاستی دەشتێکی پان و بەرین، بۆیە دەشێ بڵێین قەڵات پارێزگاری لە مانەوەی ئەو شارە کردووە، کە لەو شوێنەی خۆیدا بمێنێتەوە و ژیانی بە بەردەوامی تیایدا گوزەربێ و، لە هەمان کاتدا شارەکەش پارێزگاری لەناوە کۆنەکەی بکاو هەر بەو ناوەیە بمێنێتەوە، ئەمە لەلایەک. لە لایەکی دیکە گەر بڵێین: ئەگەر بوونی هەندێ لە شوێنەوارەکان ببنە هۆی لایەنی دیاریکردنی بەرفراوان بوونی شار بە نیسبەت قەڵات، ئەوا ئەو دیاریکردنە نابێتە رێ نیشاندەرێک بۆ زانینی پێگەی دامودەزگاکانی دیکە، کە تێیدا دامەزراون. وێڕای ئەو زانیارییانەی لەسەر نەخشەی هەولێر لەبەر دەستماندایە لە سەردەمی ئەتابیکە هەروا بە کەموکورتی و شاراوەیی دەمێنێتەوە.

بەڵام گەر پشت بە لایەنی بەر فراوانکردنی خوارەوە بدەین بە دیاریکردنی شوێنەوارەکان بەو گوزارشتەی پاشماوەی شوێنەوارەکانی ئەو سەردەمەن، ئەوا دوو شوێنەواری گەورە ئێستا لە هەولێر دەبینرێت، یەکێک بە دەستپێکی شوورە دادەنرێ و ئەویتر بەکۆتایی هاتنی شوورەکە. یەکەمیان ئەو مەزارگەیە، کە خەڵکەکە بە هەڵە تێی گەیشتوون، کە مەزاری موزەفەرەدین گۆکبرییە[١٣٧] کە کەوتۆتە رۆژئاوای شار. بەڵکو پێدەچێت ئەو مەزارە هی زەینەدین عەلی کوچک بێ، کە لەمەوبەر باسمان لە مردنی شوێنی ناشتنی کرد[١٣٨] کە پێشتر وەک مزگەوت وابووە. ئیبن خەلەکانیش جەخت لەسەر ئەو مزگەوتە دەکاتەوە، کە لەناو هەولێر بووە[١٣٩]، واتە لەناو شوورە نەک لە دەرەوەی.

بەڵام دووەم شوێنەوار، مزگەوتی(کەف)ە[١٤٠]، کە قەزوێنی باسی لێوە دەکات و دەڵێت: (بەردێکی تێدایەو، ئاسەواری دەستی مرۆڤی لەسەرە، لای خەڵکی هەولێر لەسەر ئەو مەسەلەیە قسەو باس زۆرە. گومانیش لەوەدا نییە کە شتێکی سەرسوڕهێنەرە[١٤١] تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئاسەواری ئەو دەستە هەر دەبینرێ و تا ئێستاش قسەوباسی بەردەوام لەسەرە.

یەکێک لەو گێڕانەوانە دەڵێت: ئیمامی عەلی(ر) سەرپەرشتی ناشتنی شێخ عەبدولقادر رافیدی کردووە لەو شوێنە، پاشان بەردێکی لەسەر مەزارگەی داناوەو دواتر بە دەستی راست دەستی داوەتە ئەو بەردەو لەپاش ئەوە ئاسەواری دەستەکەی بەجێماوە[١٤٢].

جا وێڕای ئەو گێڕانەوەیە، کە قالبێکی ئەفسووناوی بە خۆوە دەگرێت، لە راستیدا هەرگیز ئیمامی عەلی (ر) نەگەیشتۆتە هەولێر. جا بە پێی ئەوە ئەو ئاسەوارە شاراوەیەک بە خۆوە دەبینێ، لەوانەیە مێژووەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمی، کە باسی لێوە دەکەین یاخود پێشتر. جگە لەوە کەسانی تریش لەو مزگەوتە نێژراون، وەک عەبدولقادر ئەبو محەممەد کوڕی قوتبەدین ئەمیری کوڕی بەختیار کوڕی خەل کوڕی محەممەد کوڕی داود ئەشنەهی[١٤٣]، کە لە بنەڕەتدا هەولێرییە و لەساڵی

٦٢١ک مردووە[١٤٤] هەروەها ئیبن شەعار لە رۆژهەڵاتی هەولێر لە گۆڕستانی مەشهەد ئەلکەف نێژراوە[١٤٥] لەلای رۆژهەڵاتی شاریش[١٤٦] گۆڕستانی ئەحمەد زراری هەیە، کە لە ٥٩١ک کۆچی دوایی کردووە و[١٤٧]، تیایدا فەقیهی شافیعی ئەبو فەزل ئەلیاس کوڕی جامع هەولێری، کە لە ٦٠١ک کۆچی دوایی کردووە[١٤٨]، نێژراوە. وا دیارە ئەو گۆڕستانە دەکەوێتە دەرەوەی شوورەی هەولێر، هەر وەک ئیبن دەبیسی باسی لێوە دەکات[١٤٩]. بەلای باشووری قەڵاتیش منارەیەک هەیە و ناسراوە بە منارەی مزەفەرییە، کەوتۆتە باشووری رۆژئاوای شار[١٥٠]. بەڵام قوتابخانەی عەقیلی، کە فەقیە ئەبو عەباس خدر کوڕی نەسر کوڕی عەقیل لەساڵی ٥٦٧ ک لە گومەزەیەکدا نێژراوە[١٥١]. بەڵام دەربارەی شوێنەکەی هیچ شتێ نازانرێ و هیچ ئاماژەیەکیش لەبەردەستدا نییە بۆ زانینی شوێنەکە[١٥٢]. بە هەمان شێوە دەربارەی شوێنەکانی قوتابخانەی موجاهیدییەو مزەفەرییەو و خانەی مزەفەرییە بۆ فەرمووده، لەگەڵ شوێنی چەند دامودەزگای دیکە، کە مزەفەرەدین دروستی کردوون.

پاشماوەی گۆڕستانی خانەقا لەوانەیە هەندێکی بەلایەنی کەم مێژووەکەی بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەتابەگی، ئەمەش کەوتۆتە بەشی باشووری قەڵات و هەروەها گۆڕستان و مەزاری ئیمام ئەحمەد[١٥٣]ی لێیە کە کەوتە نێوان منارەی مزەفەرییە لە لایەک و مەزاری نەبی عوزێر لە لایەکی دیکە[١٥٤]. بەڵام خانەقا کەوتۆتە لای چەپی دەرگای سەرەکی قەڵات (باشوور).

بەڵام کۆشکی سوڵتان ئەویش شوێنەوارێکی دیکەیە لە خوارووی قەڵات، ئیبن خەلەکان باسی لێوە دەکات و دەڵێت: موزەفەرەدین گۆگبری لە کۆشکی خۆی مرد و دواتر گواستیانەوە بۆ قەڵات و لەوێ بەشێوەیەکی کاتی نێژرا[١٥٥]. ئەبو فیداش دەربارەی کارێزەکانی ناوچەی هەولێر دەڵێت: یەکێ لەو کارێزانە لە کۆشکی سوڵتان داخیلی ناو شار دەبوو[١٥٦].

سەرەڕای ئەوە بازاڕی کۆنیش کە پێی دەوترێت: (قەیسەرییە)، کەوتۆتە بەرامبەر دەرگای سەرەکی قەڵات (باشوور). ئەو قەیسەرییەش خودی موزەفەرەدین گۆگبری دایمەزراندووە هەروەک یاقووت حەمەوی باسی لێوە دەکات[١٥٧]. لە لایەکی دیکە مێژوونووسی هەولێری ئیبن خەلەکان باس لەو بەستەش دەکات، کە کەوتۆتە ناوەڕاستی هەولێر و لە هەردوو وەرزی زستان و بەهاردا ئاوی پێدا دەڕۆیشت و وردە بەردی هەبووە(١٥٨).

### قەڵاتی هەولێر

قەڵاتی هەولێر شارێکی گەورە بوو، بازاڕ و ماڵنشین و مزگەوتی نوێژکردنی تێدا بوو[١٥٩]. قوتابخانەی هەبووە، کە میر سەرفتێکین زەینی جێگیری زەینەدین عەلی کوچک بۆ فەقێ خدر ئەبی عەباس کوڕی نەسر کوڕی عەقیل هەولێری دروستی کرد و ناونرا قوتابخانەی قەڵات. قەڵات بارەگای سەرەکی میرنشین بوو، دامودەزگاکانی رەسمی[١٦٠] و بەندیخانەی تێدا بوو[١٦١]. قەڵات دوو دەرگای هەبوو تاڕادەیەک بەرامبەر یەک بوون. یەکێکیان دەرگای باشوور بوو کە بەسەر مەیدانی دەروانی و قەڵاتی لە قەیسەری جیادەکردەوە، کە موزەفەرەدین گۆگبری دروستی کردبوون. بەڵام دەرگای دووەم بەلای عەنکاوەیدا دەڕوانی و پێی دەوترا دەرگای عەنکاوە[١٦٢].

قەڵات زۆر قایم بوو، ئەستەم بوو بتوانرێ دەستی بەسەردابگیرێ، لە دەوری خەندەکێکی قووڵ هەڵکەندرابوو[١٦٣]. کە ئەمەش جەخت دەکاتەوە لەسەر قایمی هەولێر و ملکەچ نەبوونی بۆ خۆبەدەستەوەدان. نموونەش بۆ ئەمە، ئەو بەرخودانە بوو کاتێ ئەتابیگەی موسڵ لە ساڵی ٥٢٦ ک گەمارۆی هەولێریان دا، ویستیان ئەو شارە بخەنە سەر میرنشینەکەی خۆیان، هەر وەک ئیبن واسل دەگوازنەوە[١٦٤]. قەزوینیش باس لە قایمی ئەو قەڵاتە دەکات، کە مەغۆلەکانیش پەکیان کەوت لەوەی بتوانن دەستی بەسەردا بگرن[١٦٥]. هەروەها قەڵاتی هەولێر ئەوەندە بەرگریکار و ئاستەم بوو هەتا لە لایەن سەربازەکانی بەغداش نەتوانراوە دەستی بەسەردا بگیرێت، کاتێ خەلیفە موستەنسیر ویستی لە پاش مردنی موزەفەرەدین گۆگبری لە ساڵی ٦٣٠ ک/ ١٢٣٣ز بیخاتە پاڵ میرنشینەکەی و بە توندی بەرهەڵستکارییان کرد، تا وای

لێهات بۆ جاری دووەم و سێیەم داوای هێزی زیاتر کرا تا توانرا دەستی بەسەردا بگیرێت و بخرێتە سەر شانشینی بەغدا[١٦٦].

سەبارەت بە گەورەیی و قەبارەی قەلات یاقوت حەمەوی دەڵێت: کەوتۆتە سەر گردێکی پان و بەرین و شێوەکەی لە قەلاتی حەلەب دەکات. پاشان دەڵێت: قەلاتی هەولێر گەورەتر و بەر فراوانترە لە قەلاتی حەلەب[١٦٧]. حەمەدوڵڵا مستەوفی قەزوینی دەڵێت: قەلاتێکی زۆر گەورەیە[١٦٨].

### میرنشینی هەولێرو سەرچاوەکانی ژیانی ئابووری

هەر لە کۆنەوە ئەو ناوچەیە بە بەروبوومی کشتوکاڵی ناسراوە، بە تایبەتی جۆرەکانی دانەوێڵە[١٦٩]، کە پشت بە ئاوی باران دەبەستێت، بەهۆی ئەوەی ناوچەکە هیچ رووبارێکی پێدا تێپەڕ نابێت[١٧٠]. ئەو ناوچەیە بۆ ماوەی چەند ساڵێک لەبەر نەبوونی باران تووشی وشکە ساڵی بووە. هەر ئەمەش وای کردووە باخچەو باخاتی لێ نەبێت. بەڵام خەڵکی شارەکە کارێزیان لێداوە[١٧١]، بۆ ئەوەی سوود لە ئاوەکەی وەربگرن. یاقوت حەمەوی باس لە ئاوی شیرینی هەولێر دەکات و لە رووی سووکی و شیرینی بە ئاوی رووباری دیجلەی شوبهاندووە[١٧٢]. زۆر کارێزی هەبووە، لەوانە دووانیان داخیلی ناو شاری هەولێر بوون، یەکێکیان دەهاتە ناو مزگەوتەکە، دووەمیان دەهاتە ناو کۆشکی سوڵتان(١٧٣).

بەڵام گرنگترین داهاتی کشتوکاڵ کە لە هەولێر بەرهەم دەهێنرا سەردرای دانەوێڵە پەمۆش بوو. لەم رووەوە جوگرافیناسی فارسی ناسراو بە حەمەدوڵڵا مستەوفی باس لەو پەمۆیە دەکات و دەڵێت: داهاتی پەمۆی هەولێر ساڵانە دەگەیشتە (٢٢) هەزار دینار[١٧٤].

بەڵام داهاتی هەولێر لە رووی میوەوە، هەر چەندە ناوچەکە باخچەو بێستانی لێ نەبووە، بەڵام زۆر دەوڵەمەند بووە لە میوە، ئەویش لە ناوچەکانی دەوروبەری بۆی دەهات، بەتایبەت لە ناوچە شاخاوییەکان. یەکێک لە شوێنە بە ناوبانگەکانی، کە بە داهاتی میوە ناسراوە بە تایبەتی ترێ گوندی (شەقلاوە)[١٧٥] بووە، کە بە درێژایی رۆژانی ساڵ بە برێکی باش ترێیەکەی دەگەیشتە هەولێر.

کەچی مێژوونووسان ئاماژەیان بە داهاتی ئاژەڵ نەداوە لە هەولێر. هەر چەند ئاووهەوا و بە پێی خاکەکەی یارمەتیدەر بووە بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵ، وەک شوانکاری بەخێوکردنی ئاژەڵان بە تایبەتی مەڕ.

لە رووی بزاوتی بازرگانیش ئەو میرنشینە سەرچاوەیەکی باش بووە بۆ گەشەسەندن و پێشکەوتن بەهۆی گەورەیی ناوچەکەی و سەقامگیری باری سیاسی لەو ماوە مێژووییەیدا، بەتایبەت لە سەردەمی موزەفەرەدین گۆکبری بەتایبەتی کاتێ چالاکییەکانی بازرگانی بۆ هەموو لایەک پەلی هاویشت، تا گەیشتە ئەو ئاستەی هەولێر بارزگانی لەگەڵ وڵاتە دوورەکانیش دەکرد کاڵا و شمەکی ئەوانیشی پێدەگەیشت. سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەدەن، کە باوکی شاعیری هەولێری موەفەقەدین کوڕی یوسف یەکێک لە بازرگانەکانی نێوان هەولێر و بەحرەین بووە[١٧٦]. یۆنینیش دەڵێت: قاسم کوڕی ئەبوبەکر کوڕی قاسم بازرگانێک بووە بە ئەمینداری دین وەسف کراوە و، فەرموودەناسی هەولێری ناسراو بە (موقریک) باوکی یەکێک بووە لە بازرگانەکان، کە لە نێوان هەولێر و میسر و وڵاتی عەجەم بازرگانی کردووە[١٧٧]. یاقوت حەمەویش ئاماژە بە کاروانی بازرگانەکان دەدات، کە لە هەولێرەوە بەرەو ئازربایجان دەڕۆیشتن. خاوەن کاروانەکانیش لە شاری تەل هەفتون[١٧٨] کە سەر بە میرنشینی هەولێرە دادەبەزین بۆ ئەوەی پشوو بدەن. پاشان دەستیان دەکردەوە بە گەشتەکەیان. وا دیارە تەل هەفتون شارێکی بازرگانی ئاوەدان بووە، یاقوت حەمەوی ئاماژە بەوەش دەدات، کە بۆ چەند جارێک سەردانی بازاڕەکەی کردووە[١٧٩]. (ستەرک) یش ئاماژە بەوە دەدات زیندووکردنەوەی یادی پێغەمبەری مەزن (د.خ) بەو شێوازە گەورەیەی لە هەولێر لە لایەن موزەفەرەدین گۆکبری، خۆی لە خۆیدا وای کردبوو ببێتە بازاڕێکی بازرگانی گرنگ لە ناوچەکەدا[١٨٠].

بەڵام لە رووی پیشەسازییەوە هیچ ئاماژەدەرێک بە دەستەوە نییە، کە ئاماژە بە پیشەسازی ئەو شارە بدات، تەنیا ئەوەندە نەبێت یاقوت حەمەوی ئاماژە بە جل و بەرگی

دروستكراو لە پەمۆ [182] دەدات، كە لە ناوخۆی هەولێر بە بەرهەم دەهات و هەولێری پێ ناسرا.

لە لایەكی دیكە هەر وەك پێشتر باسمان لەو نۆژەنكردنەوەیە كرد، كە ئەو میرنشینە بە خۆیەوەی بینی وای كرد، كە كەرەستەی بیناسازی وەك گەچ و كەریووچ بەرهەم بهێنێت، كە ئەم كەرەستانەش لە منارەی مزەفەرییە بەكار هێنراون[183].

سەرچاوە:

١- هەریەك لە: ابن شعار، في مخطوط (عقود الجمان)- المنذري، التكملة بالروينو، ١٤٤٧/٧ - ابن خلكان، ٣/ ٢٧٠ ناویان بردووە.

٢- گۆكبری، پێكهاتەی دوو وشەیە (گۆك) واتە (شین)،(بری) واتە (گورگ) بە زمانی توركی كۆن. ناوەكە بە واتای (گورگی شین) دێت، بڕوانە ابن خلكان ٣/ ٢٧٧- اسماعیل غالب، مسكوكات تركمانية قتالوغي، ص١٤٢.

٣- سەرجەم سەرچاوەكان جگە لە زەهەبی نەبێت، دەڵێت لە قەڵای هەولێر لە دایك بووە، بڕوانە مخطوط (تاريخ الاسلام) ورقة ١٨٣.

٤- الكامل ٣٣١/١١ - ابن بري، تاريخ مختصر الدول ص٢١٢

٥- وفيات الاعيان ٢٧١/٣ - مخطوط تاريخ الاسلام ورقة ١٨١ - العقد الثمين ١٠١/٧

٦- الفتح القسي ط ١٨٨٧ی ١٨٩

٧- الموارد السلطانية ١٠٥

٨- التكملة ط- بالرونيو، مجلد ٧ ص١٤٤٧

٩- ابن خلكان ٨٧/٦ -الغصون اليانعة ص٧٩.

١٠- الباهر ١٨٥، ١٩٧، ٢٠٥

١١- وفيات الاعيان٣/ ٢٧٠.

١٢- بڕوانە ابن الفوطي تلخيص الاداب ج ٥، ط لاهور ص٥٨٩ الدواداري الدرة المضيئة في أخبار الدولة الفاطمية، ط ١٩٦١ ی ٥٣٦- الذهبي مخطوط تاريخ الاسلام، ق٢ ورقة ١٨٠- - الفاس المكي، العقد الثمين في التاريخ البلد الامين ج-ن ی ١٠٠ - ابن ابي عزيبة، مخطوط انسان العيون ص٢٩٢- محب الدين ابو الفضل محمد ابن الشحنة الحلبي، الدر المنتخب في التاريخ مملكة حلب ص١٠٦.

١٣- اسماعيل غالب مسكوكات تركمانية قنا لوغي ص. ١٣٩

١٤- العلم: واتە شوێنەوار - ابن المنظور، لسان العرب، دار صادر ١٩٥٦، مجلة ١٢ ص٤١٩.

١٥- پاشای شكۆدار، بڕوانە موضوع (ديوان و خزانة السلاح لشرح معناها).

١٦- الفاسي المكي، العقد الثمين، ١٠٠/٧.

١٧- د. حسن الباشا، الفنون الاسلامية والوظائف على الاثار العربية، القاهرة ١٩٦٦، ٦٦٢/٢.

١٨- وفيات الاعيان ٢٧٢/٣. بڕوانە الذهبي، مخطوط تاريخ الاسلام ورقة ١٨١ الفاسي المكي، العقد الثمين ١٠٣/٧. ابن عذيبة، انسان العيون ٢٩٧- ابن العماد الحنيلي، شذرات البلاد الذهب ١٣٨/٥.

١٩- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەكان، القزويني، اثار البلاد ص٢٩٠.

٢٠- ابن الكثير، البداية والنهاية ١٣/ ١٣٦.

٢١- وفيات الاعيان ٢٧٦/٣. اثار البلاد ن، ص، العقد الثمين ١٠٦/٧ انسان العيون ص٣٠٢.

٢٢- الغساني، المسجد المسبوك ص٣٣٠.

٢٣- القزويني، اثار البلاد ٢٩٠.

٢٤- بيت النار... گوندێكی گەورەیە بەلای موسڵ، ياقوت. معجم البلدان ١/ ٥٢٢.

٢٥- سبط ابن الجوزي، مرأة الزمان ج٨ ص٦٨٢.

٢٦- وفيات الاعيان ٢٧٣/٣، العقد الثمين ١٠٥/٧، انسان العيون ص٢٩٥،

THE ENCYCL. OF ISLAMIC,
NEW EDITION. V.I, P. 161

٢٧- مرآة الزمان ج٨ ص٦٨٣.

٢٨- ن.م.ص القزويني، اثار البلاد ،ص٢٩٠.

٢٩- مرآة الزمان ج٨ / ٦٨٢- ابن كثير، البداية والنهاية: ١٣٧/١٣.

٣٠- مرآة الزمان ن، ص.

٣١- هەر وەك ابن العماد الحنبلى لە شذات الذهب ٥/ ١٤٠ گوازتبێتییەوە.

٣٢- وفيات الاعيان ٢٧٣/٣- هەروەها بڕوانە الذهبي، مخطوط تاريخ الاسلام، ورقة ١٨٢-ابن ابي عذيبة، انسان العيون، ص٢٩٧.

٣٣- مرآة الزمان ٦٨٢/٨.

٣٤- ن.م.ص٦٨٣- ابن كثير، البداية والنهاية ١٣٧/١٣ - ابن العمار الحنبلي، شذرات الذهب ٥/ ١٤٠ تقلا عن ابن شهبة في تاريخ الاسلام.

٣٥- مرأة الزمان ٦٨٢/٨ وفيات الاعيان ٢٧٣/٣- الفاسي المكي، العقد الثمين ٧/ ١٠٠ -حسن الباشا- الفنون الاسلامية و الوظائف علي الاثار العربية ٢/ ٦٦١-٦٦٢.

٣٦- الفاسي المكي، شفاء الغرام ٣٤٥/١.

٣٧- مەبەست لەو ئافرەتە خوشكی شا ناسر حەسەن فەرمانڕەوای میسرە، بڕوانە پەراوێزی ل ١٠١ لە العقد الثمين.

٣٨- العقد الثمين ١٠١/٧.

٣٩- شقاء القرام ١٤٥/١.

٤٠- بڕوانە ل ١٨٨، پەراوێزی (٨) لەو

بابەتە

٤١- (مەغمەسەن) شوێنێکە لەلای حەرەم، کە ئەبرەها لەو ڕێگەیەوە هات و فیلەکە چۆکی دادا. ئەو شوێنە بە قەبری (ئەبی ریغال) کە خیانەتی لە قەومەکەی کرد و ڕەی نیشانی ئەبرەهە دا بۆ ئەوەی کەعبە تێک بدات، ناسراوە. بڕوانە الازرقي، اخبار مكة جـ١ ل ١٤٣.

٤٢- الفاسي المكي، شفاء الغرام ج-١ص٣٠٢.

٤٣- العقد الثمين ٧/ ١٠٠.

٤٤- محەمەد کرد علي، الاسلام والحضارة، جـ١ ص٣٢٧.

٤٥- بڕوانە كامل بن حسين بن محمد الباقي من كتابة (نهر الذهب في تاريخ حلب) جـ٢ ص٢٧١.

٤٦- ئیبن شحنە دەڵێت: موزەفەرەدین گۆکبری خانەقای لە ناوچەیەکی دەشتایی دروست کرد و کەوتۆتە نزیک مزگەوتی گەورە. بڕوانە ابن الشحنة، الدر المنتخب، ص١٠٦.

٤٧- عزالدين ابو عبدالله محمد بن علي ابراهيم ابن شداد، الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة (تاريخ دمشق)ص٨٦. دکتۆر حسن باشا دەڵێت: ئەو پرۆژەیەی کە موزەفەرەدین گۆکبری دروستی کرد بەپێی ئەوەی لە هەندێ کتێبی شوێنەوار هاتووە مێژووەکەی بۆ ساڵی ٥٩٩ دەگەڕێتەوە. بڕوانە کتێبەکەی (الفنون الاسلامية) ٢/ ٦٦١.

٤٨- ابو شامة، ذيل الروضتين، ص٩٠ - الذهبي، العبر، ٥/ ٨٩-٩٠- شذرات الذهب ٥/ ١٠٠.

٤٩- مرآة الزمان، جـص٨٦٨٢-٦٨٣- ابن كثير (البداية و النهاية) ١٣/ ١٣٧. دکتۆر ئەلیمات وەسفی فەرمانڕەوای هەولێر دەکات و دەڵێت پیاوێکی (سۆشیالیست) خواز بوو بەپێی ئەوەی وشەکەمان هەڵدەگرێت. کۆمەڵگایەکەی سوودێکی زۆریان لەو سۆشیالیستەی ئەو بینی - بڕوانە کتێبەکەی (موزەفەرەدین گۆکبری میری هەولێر) ل ٢٠١.

٥٠- مرآة الزمان ٨/ ٦٨١ - وفيات الاعيان ٣/ ٢٧٣.

٥١- ابن الشعار، مخطوط عقود الجمان، ج-ب، ترجمة محمد بن ابي الفخر بن احمد ابو حامد الكرماني الصوفي.

٥٢- المنذري، التكملة ٧/ ١٤٤٨ بالرنيو.

٥٣- وفيات الاعيان ٣/ ٢٧٣. الذهبي، مخطوط تاريخ الاسلام، ورقة ١٨١. ابن ابي عذيبة، انسان العيون ٢٩٧- الفاسي المكي، العقد الثمين ٧/ ١٠٤.

٥٤- الغساني، المسجد المسبوك ص٣٣٠.

٥٥- وفيات الاعيان ٣/ ٢٧١.

٥٦- القزويني، اثار البلاد ص٢٩٠.

٥٧- المنذري، التكملة ب ١٤٤٧ بالرونيو.

٥٨- ابن الفوطي، تلخيص مجمع الاداب جـ٥ص٥٨٠.

٥٩- بڕوانە سبط ابن الجوزي. مرآة الزمان، ٨/ ٥٣٧.

٦٠- المنذري، التكملة،بالرونيو ٧/ ١٤٤٨.

٦١- وفيات الاعيان ٣/ ٢٧٦.

٦٢- ن، م، ص.

٦٣- لەهەردوو ساڵی ٦١٣-٦١٧ بڕوانە وفيات الاعيان، ١٧٨-١٧٩.

٦٤- ياقوت الحموي، معجم البلدان ١/ ١٣٨.

٦٥- انظر ص٩ من مقدمة الجزء الرابع من مخرج الكروب في اخبار بني ايوب، ط ١٩٧٢.

٦٦- ابو الغداء، المختصر في التاريخ البشر ٣/ ١٥٣.

٦٧- تاريخ ابن الوردي (ذيل المختصر) ٢/ ٢٢٨- هەروەها بڕوانە ياسين العمري الموصلي (غاية المرام من تاريخ محاسن بغداد دار السلام ص: ٨٠-٨١). محمد امين العمري- منهل الاولياء ٢/ ٣٣.

٦٨- ابن الشعار، مخطوط عقود الجمان، ٦/ ١٨٧.

٦٩- ن، م- ترجمة ولدة محمد بن علي بن شماس جـ٧.

٧٠- ن، م/٤-١.

٧١- ابن خلكان ١/ ١٨٤ ط بيروت.

٧٢- ابن الشعار، ج-١ سيرة اسعد بن ابراهيم.

٧٣- ابن الشعار، جـ٦ ورقة ١٨٧.

٧٤- ابن الشعار، جـ١ ورقة ٢٣٨.

٧٥- ابن الشعار، جـ٦ ترجمة المبارك ابن المستوفي.

٧٦- ابن الشعار ج٥- ابن خلكان ٣/ ١٧٠ ط ١٩٤٨.

٧٧- وفيات الاعيان ٢/ ١١.

٧٨- عقود الجمان جـ١ ترجم اسعد بن ابراهيم.

٧٩- اليونيني، زيل المراة الزمان ١/ ١١٦.

٨٠- ن، م، ص.

٨١- ابن الشعار، مخطوط(عقود الجمان) ٥/ ١٥٦.

٨٢- ن. م. ص١٥٧. انظر مقال (د.قوش) H.Fuchs في the engel of Islam att mawlid, v1936 v.111, 420 ادم متر، الحضارة الاسلامية من القرن الرابع الهجري جـ٢ ص٢١٨- ٢١٩-العمري، منهل الاولياء و مشرب الاوحياء من سادات الموصل الحدباء ج٢ ص٣٢.

٨٣- بڕوانە نووسینەکەی کلود کاهین کە لەسەر بەکتکین نووسیویەتی The encYcl. New edition, 1960, v.I, 1161 کە دەڵێت: لەوانەیە ئەو ئاهەنگێڕانەی کوردەکان سازیان دەدا، ئەو ئاهەنگێڕانە بووبێت، کە بە بۆنە مەسیحییەکان ساز دەدرا و مەسیحییەکانی هەولێر پاراستبوویان.

٨٤- مەیدان کەوتۆتە ناوەڕاستی نێوان قەیسەری و خانەقا و دەرگای

سەرەکی قەلآت هەروەک لە قسەکانی ئیبن خەلەکان دەردەکەویت و دەلێت: گومەزەکان لە دەرگای قەلآتەوە تا دەرگای خانەقا چەسپێندرابوون، کە نزیک بوو لە مەیدان (وفیات الاعیان) ٣/ ٢٧٥. بروانە مخطوط (عقود الجمان ٥/١٥٦).

٨٥- ابن خلكان ٣/٢٧٣.

٨٦- ئیبراهیم حەمامە دەربارەی هونەری ئەندێشە لە میسر دەلێت: سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کۆنترین ئاماژە بۆ هونەر کە لە دەرەوە هاتبنە میسر، لە موزەفەرەدین گۆگبری فەرمانڕەوای هەولێر هاتووە، کە سالآنە خۆی سازدەدا بۆ زیندووکردنەوەی یادی لە دایکبوونی پێغەمبەر د.خ. بروانە کتێبەکەی (خيال الظل وتمثيليات ابن دانيال) ص. ٤٠

٨٧- ابن خلكان ٣/ ٢٧٤.

٨٩- ن. م. ص٢٧٥- ابن ابي عزيبة، انسان العيون ٣٠١.

٩٠- ابن خلكان ٣/ ٢٧٥- سبط ابن الجوزي، مراة الزمان ٨/ ٦٨١.

H. H. Howorth, History of the Mongols, v.111, p. 133.

٩١- ادام متز، الحضارة الاسلامية ٢/ ٢١٩.

٩٢- ابن خلكان ٣/ ١٧٢ - ١٧٣ابن الشعار، عقود الجمان ٥/ ١٥٦.

٩٣- ابن خلكان ٣/ ١٢٢- ١٧٥ هەروەها بروانە ابن كثير، البدايه والنهايه ١٣/ ١٣٧- ١٣٧- الفاسي المكي ٧/ ١٠٥ و مادة المولد

The ENCYCL of Islam 1936, v.111, p.420

٩٤- ابن خلكان ٣/ ٢٧٥

٩٥- ابن خلكان ٣/ ٢٧٥.

٩٦- ن، م،ص.

٩٧- سبط ابن الجوزي ٨/ ٦٨٣- الذهبي، تاريخ الاسلام، ن.و - دول الاسلام، ٢/ ١٠٣.

٩٨- دەربارەی ئەو میسر بروانە بابەتی (ديوان و خزان السلاح)

٩٩- ابن خلكان ٣/ ٢٧٦، الفاسي المكي، العقد الثمين ٧/ ١٠٦. ابن العماد الحنبلي، شزرات الذهب ٥/ ١٤٠.

١٠٠- لينة- شوێنێکە لە رێگەی حیجاز بەلای عێراقەوە، ابن خلكان ٣/ ٢٧٧.

١٠١- سبط ابن الجوزي، مراة الزمان ٨/ ٦٨٣، ابن خلكان ٣/ ٢٧٦، الذهبي مخطوط، تاريخ الاسلام، ق٢، الجزء الاخير ورقة ١٨٣- ١٨٤- ابن الفوطي تلخيص مجمع الاداب، ط لاهور ٥/ ٥٩٠ - ابن كثير، البداية والنهاية ١٣/ ١٣٧- ابن ابي عذيبة، انسان العيون ٣٠٤، ابن العماد، شذرات الذهب ٥/ ١٤٠ - محمد امين العمري، منهل الاولياء ٢/ ١٠٤.

١٠٢- ابن العبري، تاريخ المختصر الدول ٢٤٩.

١٠٣- الغساني المسجد المسبوك، بالرونيو ٣٣٠.

١٠٤- وێڕای ئەوەی لەو دوو گێڕانەوەیە جیاوازی هەیە لەگەڵ تەواوی مێژوونووسەکان، بەلآم لەگەڵ هەموویان کۆکن، کە موزەفەرەدین گۆگبری لە هەولێر نێژراوە، هەر چەندە لە هەولێریش کۆچی دوایی کردووە. بروانە ابن اثير، الباهر ١٣٥- الكامل ١١/ ٣٣١- ابن خلكان ٣/ ٢٧٠- ابو شامة، الروخصتين ١/ ١٥٢، ابن الفرات، مجلد ٤ ج١ص١٤ -ابن ابي عذيبة، انسان العيون ٢٩٢.

١٠٥- بروانە ص١٦٥.

١٠٦- اليونيني، ذيل مرآة الزمان / ١١١.

١٠٧- ن،م.

١٠٨-بروانە پەراوێزی کتێبی ابن الفوطي (تلخيص مجمع الاداب) ج-٤ ق ١ ص٥٦١.

١٠٩- ابن خلكان ٣/ ٢٧٦.

١١٠- الحوادث الجامعة ٤٤. الغساني، المسجد المسبوك ٣٣١.

١١١- سوادی رووپشدی لە کتێبەکەیدا (امارة الموصل في العهد بدرالدين لؤلؤ) ل ١٥٠دا دەلێت: (پالپشت بە قسەی زەهەبی عیمادەدین زەنگی لەساڵی ٦٣٠ک هەر دوو قەلآتی (عەقرە و شوشی) پاراستبوو، لەکاتێکدا ئەو مێژوونووسە وا نالێت بەلکو دەلێت: (برنەقش و خالیس) نووسەری عیمادەدین زەنگی هانیان دەدات بۆ ئەوەی بێت ولآتەکەی تەسلیم بکەن- مخطوط تاريخ الاسلام ورقە ١٨٠. بەلکو ئەو دوو قەلآتە بۆ ماوەی زیاتر لە ١٢ ساڵ لە ژێر دەسەلآتی عیمادەدین زەنگی نەمابوو، بەلکو میرنشینی شارەزوور بە نوێنەرایەتی ئەو دوو قەلآتەی هەلدەسووراند، هەر وەک ابن خلكان ٤/ ٢٩٦ دەلێت).

١١٢- الحوادث الجامعة ٤٥.

١١٣- الذهبي، مخطوط تاريخ الاسلام ورقة ١٨٠.

١١٤- ابن شداد، مخطوط (الاخلاق الخطيرة) ورقة ١٩٠.

١١٥- سبط ابن الجوزي، مراة الزمان، ٨/ ٦٨٣.

١١٦- ن، م، ص.

١١٧- سەرنج دەدەین ئیبن خەلەکان ئاماژەی بەو مانگە نەداوە، کە عیمادەدین زەنگی کۆچی دوایی کردووە- تەنانەت ساڵی مردنیشی، بەلکو بە گومانەوە باسی لێوە دەکات و دەلێت: لە دەوروبەری ساڵی ٦٣٠ک کۆچی دوایی کردووە. بروانە وفيات الاعيان ٤/ ٢٩٦.

١١٨- ابن العبري، تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، مجلد ٤٩

لسنة ١٩٥٥ ص٧٣٩.
١١٩- الحوادث الجامعة ٤٦.
١٢٠- عەنكاوە - مەبەست لەوە ئەو دەرگایەیە كە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەر ماوەو بەسەر ئەو گوندەدا دەڕوانێ و ماوەی چەند ساڵێكە بۆتە بنكەی ناحیە و نزیكەی سێ كیلۆمەتر لە شاری هەولێر دوورە، الحوادث الجامعە بباب (عنكاوە) ص٤٦.
١٢١- الحوادث الجامعة ٤٦
١٢٢- ابن العبري ن،م،ص.
١٢٣- الحوادث الجامعة٤٧.
١٢٤- ابن العبري، ن، ص. الحوادث الجامعة: ن. ص الذهبي، مخطوط تاريخ الاسلام ورقة ١٨٠- مێژوونووسی سەردەم سبط ئیبن جەوزی دەڵێت سەربازانی خەلیفە بە هێز دەستیان بەسەر هەولێردا گرت و بە تالانیان برد مرآة الزمان ٦٨٣/٨. بڕوانە الحمودي (التاريخ المنصوري) ص٤٥٣.
١٢٥- الحوادث الجامعة ن، ص. بڕوانە ابن الطقطي، القمري في الاداب السلطانية ٣٢. الغساني، المسجد المسبوك، بالبرنيو ص٣٣١.
١٢٦- الشبيبي في امور العراق ابن الفوطي ١١١/٢٢ الهامش.
١٢٧- ابو الفداء، تقويم البلدان ص٤١٣- القلقشندي، صبح الاعشي ١٦٦/٤.
١٢٨- في الكامل ٤٢٦/١٢ (ملتكين) وفي (مرآة الزمان) ٦٩٩/٨ (بادكين) وفي النجوم الزاهرة ٢٩/٦ (ايدكين)، وفي المصادر الاخري (باتكين).
١٢٩- كوسات وانظر شرحها في هامش ٣ ص١١٥.
١٣٠- الحوادث الجامعة ص٤٩، الغساني، المسجد المسبوك٣٣٢.
١٣١- ستريك دەڵێت: موزەفەرەدین گۆگبری بەشی خوارەوەی هەولێری دروست كرد. بڕوانە دائرة المعارف الاسلامية ط ١٩٣٣، ٥٧١/١.
١٣٢- ياقود الحموي، معجم البلدان ١٣٨/١، انظر ابن خلكان، وفيات الاعيان ١٦٩/١- ابو الغداء، تقويم البلدان ص٤١٣، القلقشندي، صبح الاعشي ٣٦٦/٤.
١٣٣- وفيات الاعيان ٢٧٠/٣.
١٣٤- ياقوت ن،م،ص
١٣٥- ن، م، ص
١٣٦- نیبور... گەشتی نیبور بۆ عێراق لە سەدەی هەژدەهەم ١٧٦٦ ل ٩٠ - وداود قزاز، مقار (المنارة المظفرية في اربيل)، مجلة سومر ١٦ ج ١، ٢ لسنة ١٩٦٥، ی ١٢٧.
١٣٧- بڕوانە بابەتی (وفاة ودفن مظفرالدين گـذگبري) ی ٢٠٨ الهامش.
١٣٨- ابن خلكان ٢٧٠/٣.
١٣٩- ن،م،ی.
١٤٠- ئەو شوێنەوارە كەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی قەڵات بەرامبەر مزگەوتی شێخ ئەبو بەكر نەقشبەندی. لەو مزگەوتە هیچ نەماوە تەنیا گۆڕێكی كۆن نەبێت و دەڵێن ئەوە گۆڕی شێخ عەبدولقەهارە ئێستا بە كوردی پێی دەڵێن (پەنجە عەلی).
١٤١- القروبني، اثار البلاد ی ٢٩٠ هەروەها بڕوانە الباكوي، تلخيص الاثار و عجائب الملك القهار ص٣٥، بلدان الخلافة الشرقية/لا ١٢٠.
١٤٢- هەر وەك (خەلیفە تۆفیق مەولود عەلی) تەمەن ٧٠ ساڵ كە بۆی گێرامەوە.
١٤٣- الاشفهي دەگێرێتەوە بۆ (ئاشنە) شارۆچكەیەكە لە ڕێی ئازربایجان بەلای هەولێردا. لە نێوان ئاشنەو ورمێ دوو ڕۆژە ڕێیە. كەوتۆتە نێوان ورمێ و هەولێر- معجم البلدان ٢٠١/١.
١٤٤- ابن الشعار، مخطوط، عقود الجمان، ١٩/٤.
١٤٥- ن، م، ی ئەوەی كاروباری مەزارەكە بەڕێوە دەبات دەڵێت ئەوە گۆڕی خودی عەبدولقەهار كوڕی قوتبەدین هەولێرییە.
١٤٦- ابن البريشي، مخطوط التاريخ الاربيل، مجلة ٢ ورقة ١٢٧- ابن الشعار، مخطوط عقود الجمان، ج١ ترجمة الياس بن جامع.
١٤٧- لە شوێنێكی تر باس لە ژیاننامەی ئەو زاهیدە دەكرێت.
١٤٨- لە شوێنێكی تر باس لە ژیاننامەی ئەو فەقیهە دەكرێت.
١٤٩- ابن البريشي، ن، و- ابن الشعار ن، م، و.
١٥٠- دواتر بە وردی باس لەو منارەیە دەكرێت.
١٥١- ابن خلكان ١١/٢ ط.
* سەرچاوە لە ١٥٢ تا ١٧٥ دیار نییە
١٧٦- ابن خلكان ١٠٣/٤. السيوطي، بغية الوعاة ٢٨٦/١-٢٨٧ نقلا عن ابن المستوفي.
١٧٧- القزويني، ذيل مرآة الزمان، ١٢١/٤.
١٧٨- تل هەفتون یەكێكە لە ناحیەكانی هەولێر و كەوتۆتە ناوەڕاستی چیاكان و ئاوی پێدا تێپەڕ دەبێت. ئەو كاروانانەی مەبەستیان ئازربایجان بوایە لێی دادەبەزین و پشوویان دەدا. معجم البلدان ٤٥/٢.
١٧٩- معجم البلدان ٤٥/٢.
١٨٠- م. لونگريك، دائرة المعارف الاسلامية ٥٧١/١.
١٨١- تا ئێستاشی لە گەڵدا بێت ئەو قەیسەرییە لە ناوەڕاست و ناوجەرگەی هەولێر ماوەتەوە، بریتییە لە كۆمەڵە دوكانێكی زۆر.
١٨٢- معجم البلدان ٢٥٦/٢.
١٨٣- نوزاد القزاز، سومر، مجلد ١٢٧/١٦- طه باقر، المرشد ٦/٥.

# پەیوەندییەکانی دەرەوەی میرنشینی هەولێر لە سەردەمی موزەفەرەدین گۆگبری

دکتۆر موحسین محەمەد حوسین

**١- پەیوەندی لەگەڵ ئەتابیکەی موسڵ**

**أ- لە سەردەمی عیزەدین مەسعووددا**

لە سەردەمی عیزەدین مەسعوود، ئەتابیکەی موسڵ رەتیان کردەوە داوای هەندێ لە خەڵکی هەولێر قبوڵ بکەن، کە داوایان کردبوو لەپاش مردنی میرەکەیان زەینەدین یوسف (٥٨٦ک / ١١٩٠ز) موجاهیدودین قایماز جێگری ئەتابیکەکەیان حکومڕانی هەولێر بگرێتە دەست. هۆکاری ئەو رەتکردنەوەیەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە، ئەتابیکەکان لە سەلاحەدینی ئەیوبی دەترسان، چونکە هەولێر سەر بە سەلاحەدین بوو. دەرئەنجام وایان لێکدایەوە گەر موزەفەرەدین گۆگبری گەڕاباوە هەولێر، ئەوا بە خێرایی رەوشەکە دەگۆڕا و گەرووی ئەتابیکەکان دەگیراو ئەوسا لەتوانایاندا نەدەما هەولێر قووت بدەن[١].

لەپاش مردنی سەلاحەدین ئەیوبی (٥٨٩ک / ١١٩٣ز) ئەتابیکەکانی عیزەدین مەسعوود کاتێ بینییان دەرگا لەبەردەمیان والآیە، کەوتنە گەڕ، نەک تەنیا بۆ ئەوەی هەولێر وەربگرنەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی پارچەکانی دیکەی وڵاتانی جەزیرەش وەربگرنەوە، کە موسڵ لە دەستی داون، لەوانە شاری (جەزیرەی ئیبن عومەر و شەنگال و نەسیبی). بەڵام شا عادل ئەبو بەکری ئەیوبی نەیهێشت ئەم کارە بکەن و بەسەر وڵاتدا زاڵبن، چونکە بووە بە بەشێک لە دەوڵەتی براکەی سەلاحەدینی ئەیوبی. ئەمە وای کرد ئەتابیکەکان لە لەو کارە خاو ببنەوە تاوەکو راوێژی بە پیاوە پەراوێزکراوەکان بکەن دەربارەی ئەم کارە مەترسیدارە. ئەوە بوو ئەتابیکەکان بیرمەندو پیاوانی وڵاتەکەیان کۆکردەوە، لەوانە موجاهیدودین قایماز جێگری ئەتابیک و ئەبو سعادات مەجدەدین موبارەک ئیبن ئەسیر[٢] و پرسیاری ئەوەیان ئاراستە کردن چی باشە بیکەن بۆ ئەوەی ئەو شوێنانەی موسڵ لە دەستی داون دووبارە بگەڕێندرێتەوە. مەجدەدین ئیبن ئەسیر جاری دا باشترین شت ئەوەیە بزاوتی سەربازی بکەین، پاشان دەست بکەین بە ناردنی نامە بۆ لایەنەکان و داوایان لێ بکەین بە نەسیبییەکان بگەیەنن[٣] ئەوسا دەگەینە مەرام، ئەوەی ئارەزوو بکا و داواکەی ئەتابیک قبوڵ بکا، ئەوا بە لاگیری دادەنێین، ئەوەی داواکەش رەت بکاتەوە، ئەوا بە لادان لە قەڵەمی دەدەین و ئەوسا ئەتابیکە مامەڵەی دوژمنی لەگەڵدا دەکات[٤].

بەڵام موجاهیدودین قایماز وای بە چاک زانی بە ژیرانە مامەڵە لەگەڵ ئەو مەسەلەیە بکرێت و رایگەیاند: بەرژەوەندییەکە وا دەخوازێت نامە بۆ میری لایەنەکان بنێرین، لەوانەش میری هەولێر، بۆ ئەوەی رایان وەربگرین دەربارەی بزاوتی سەربازیکردن و هەوڵی تاوکردنیان بدەین بە لای خۆماندا. مەجدەدین

ئیبن ئەسیر رەتی دایەوەو گوتی: گەر میری لایەنەکان مکوڕبوون لەسەر ئەوەی داواکە رەت بکەنەوە، ئەوا لەسەر ئەتابیک پێویستە ئەو کارەی پێویستی پێکرد ئەنجامی بدات(٥).

لە نێوان ئامادەبووان وتوویژ بەردەوام بوو تا وای لێهات لەسەر بۆچوونی موجاهیدودین قایماز رێککەوتن. ئەتابیکەکان دەستیان کرد بە ناردنی نامە بۆ میرە دیاریکراوەکان، بەڵام ئەوان وەڵامی نامەکەیان نەدایەوە تەنیا عیمادەدین زەنگی (دووەم) فەرمانڕەوای شەنگال نەبێت(٦).

موزەفەرەدین گۆگبری یەکێک بوو لەو میرانەی ناوچەکە داوەتنامەی ئەتابیگەکانی رەت کردەوە. وا دیارە زۆر متمانەی بە توانا سەربازییە میرنشینەکەی هەبووە، کە بتوانێ رووبەرووی فەرمانڕەوای موسڵ ببێتەوە و بەرخودان بێت. بێگومان هیچ دڵ خۆشییەکی نەبینی نە بەگەڕاندنەوەی هەولێر نە بە گەڕاندنەوەی میرنشینەکانی دیکە، چونکە بەر لەوەی لەم بارەوە هیچ کارێک ئەنجام بدات، کۆچی دوایی کرد(٧).

**ب- پەیوەندی نێوان هەولێر و ئەتابیگەی موسڵ لەسەردەمی نورەدین ئەرسەلان (٥٨٩-٦٠٧ک) (١١٩٣- ١٢١١ز) و کورەکەی عیزەدین مەسعوود (٦٠٧-٦١٥ک)- (١٢١١-١١٢٨ز)**

پەیوەندییەکان بە نێگەتیڤی لە نێوان هەردوو میرنشینی هەولێر و موسل لەسەردەمی نورەدین ئەرسەلان شا مایەوە و فەرمانڕەوای هەولێر هەر بە چاوی گومان و هۆشداری لە موسڵی دەڕوانی. چونکە ترسی ئەوەیان لێ نیشتبوو نەوەک ئەتابیگەی موسڵ بەکاری دوژمنکارانە بە هەولێر هەڵبستێ. بۆیە موزەفەرەدین گۆگبری وای پێ باش بوو، کە هەولەکانی بخاتە گەڕ یان موسڵ لاواز بکات یاخود دایببڕێنێت. هەتا هاوکاری ئەو لایەنانەی کرد، کە ئەتابیگە چاوی تێ بڕیبوون. وەک چارەسەرێک بۆ ئەوەی دەسەڵاتی موسڵ بەرفراوانی بەخۆیەوە نەبینێت. لە هاوینی ساڵی (٦٠٠ک-١٢٠٤ز)(٨) موزەفەرەدین گۆگبری هەڵسا بە هەڵمەتبردنێک بۆ سەر نەینەوا، تالانی کرد و سووتاندنی. مەبەستی لە ئەنجامدانی ئەو کارە لاوازکردنی نورەدین ئەرسەلان شا فەرمانڕەوای موسڵ بوو. کە گەمارۆی نەسیبییەکانی دابوو لە شەنگال، کە ئەوسا قوتبەدین محەمەد کوڕی عیمادەدین زەنگی (دووەم) فەرمانڕەوای شەنگال بوو. پێشتر لەگەڵ شا عادل ئەبوبەکر ئەیوبی (فەرمانڕەوای میسر و شام) کەوتبوونە رێککەوتنێک و بەپێی ئەم رێککەوتنە قوتبەدین محەمەد بوو بە یەکێک لە لاگیرانی شای ئەیوبی. ئەو کارە، فەرمانڕەوای موسڵ پێی رازی نەبوو، کە هەردوو لا ئامانجیان لاوازکردنی موسڵە و دەیانەوێ ستەمی لێ بکەن(٩). هەر ئەمەش بوو پاڵی نا جاڕدانی جەنگ لەسەر کوڕە مامەکەی کە فەرمانڕەوای شەنگال بوو بدا. لە موسڵ بزاوتی کرد، گەیشتە نەسیبین و هەمووی سەر بە ئەو بوو، تەنیا قەڵاتەکەی نەبێت، جا گەر بزاوتی موزەفەرەدین گۆگبری(١٠) نەبوایە، کە لەلای نەینەوا بۆی هات، ئەوا قەڵاتەکە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوای موسڵ. واتە پلانی نورەدین ئەرسەلان شا نوشستی هێنا، چونکە ناچاری کرد گەمارۆ لەسەر قەڵاتەکە لابەرێت و لەهەمان کاتدا بشگەڕێتەوە موسڵ. لەکاتی گەڕانەوەیدا و پەڕینەوەی لە رووباری دیجلە پابەند بوو بەوەی، کە بەرەو هەولێر بێت و تالانی بکات وەک رەتدانەوەیەک بەرامبەر ئەوەی موزەفەرەدین گۆگبری بەرامبەر بە نەینەوا کردی. بەڵام کاتێ گۆگبری هەواڵەکەی پێگەیشت، کە ئەتابیکە بەرەو شارەکەی دەچێت(١١). دەستی لە نەینەوا هەڵگرت و بەرەو شارەکەی گەڕایەوە. ئەوسا نورەدین ئەرسەلان شا نەیتوانی ئەم کارە بکات، کە دایینابوو دژ بە هەولێر ئەنجامی بدات. لە راستیدا گرینگییەکەی لەوەدا بوو پلانی فەرمانڕەوای هەولێر لە بەرگریکردن لە شەنگال سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەویش بە دووڕکەوتنەوەی مەترسییەکانی نورەدین ئەرسەلان شا لەسەری.

پەیوەندییە نەیارییەکان لەنێوان هەولێر و موسڵ بەم شێوەیە بەردەوام بوو، بە ماوەیەکی کورت لە پێش مردنی نورەدین ئەرسەلان شا، ئەوسا پەیوەندییەکی دۆستانە هاتە کایەوە و بەردەوام بوو تا کۆتایی دەسەڵاتی ئەتابیگ شا قاهیر عیزەدین مەسعوودی (دووەم) کوڕی نورەدین ئەرسەلان شا، کە لە نێوان ساڵانی(٦٠٧- ٦١٥ک) - (١٢١١-١٢١٨ز) فەرمانڕەوای موسڵی کرد. ئەو پەیوەندییە تازەیە وای لە فەرمانڕەوای هەولێر کرد تێڕوانینی خۆی لەسەر موسڵ

دەربارەی وڵاتەکەی بگۆڕێت. هەروەها ئەتابیگەکان وایان بینی پێویستە و واباشترە دۆستایەتی موزەفەرەدین بکەن و سوود لە دەسەڵات و تواناکەی وەربگرن لە کاتی تەنگانەدا، بەتایبەت گەر هاتوو بەرژەوەندییەکانی هەردوولا کەوتە مەترسی، ئەوا پێویستە بە هاوبەشی هاوکاری یەکتر بکەن.

لەپاش رووداوی ساڵی ٦٠٠ک / ١٢٠٤ز کە پێشتر باس کرا لێک نزیکبوونەوەیەک لە نێوان شا عادل و ئەتابیگەی نورەدین ئەرسەلان شا پەیدا بوو. ئەو لێک نزیکبوونەوەیە گەیشتە ئەو ئاستەی خزمایەتی یەکتر قبوڵ بکەن، شا عادل لە ساڵی (٦٠٥ک -١٢٠٨ز) کچی ئەتابیکە بخوازێت[١٢]. هەردوو لا رێککەوتن وڵاتانی دوورگە لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن. ئەتابیگەی موسڵ لە رێگەی ئەو رێککەوتنەوە ویستی بەسەر دەسەڵاتی ئامۆزاکەی قوتبەدین محەمەد فەرمانڕەوای شەنگال و نەسیبین زاڵبێ بەهۆی ئەو دوژمنکارییەی کەوتۆتە نێوان هەردوو لا[١٣].

لەساڵی ٦٠٦ک-١٢٠٩ز شا عادل لە دیمەشق بەرێکەوت بەرەو وڵاتانی جەزیرە، مەبەست لێرە خابوور و نەسیبینە، کە لە کارەکانی ئەتابیگەی شەنگالە داگیری کرد. پاشان دابەزی بۆ شاری شەنگال و گەمارۆی داو[١٤] ویستی ئەویش داگیر بکات بەوەی دەست لە جەنگ هەڵبگرێت و کێشەی نێوانیان یەکلایی بکەنەوە، بەپێی ئەوە قوتبەدین دەست لە میرنشینەکەی هەڵبگرێت لە بەرامبەر ئەوە شا عادل قەرەبووی بکاتەوە، بەڵام لە یەکێ لە سەرکردەکانی شەنگال هانی قوتبەدین محەمەدی دا، کە خۆڕاگر و بەرخودان بێت. ئەویش پارێزگاری لە شارەکەی کرد[١٥].

ئەتابیگەی شەنگال کاتێ ئابلوقەکە لەسەریان توند بوو هانایان بۆ خەلیفە ناسر لدینیلا و پاشای لایەنەکان بە تایبەتی موزەفەرەدین گۆکبری برد[١٦]. چونکە ئەوانە سەر بە شا عادل بوون و پەیوەندی خزمایەتی پێکەوەی بەستبوونەوە[١٧]. هەروەها لەبەر ئەوەی موزەفەرەدین گۆکبری خزمەتی جوانی ئەو پاشایەی کردبوو بە پاراستنی سەروەت و سامانەکەی[١٨]، بۆیە قوتبەدین محەمەدی کوڕەکەی نارده هەولێر، بۆ ئەوەی لای شا عادل بەرگری لێ بکاو لێی بگەڕێ لە شەنگال بێنێتەوە[١٩]. ئەوە بوو موزەفەرەدین گۆکبری داواکەی قبول کرد، کە ئەو کارە بکات و لای شا بەرگری لێ بکاو دەست لە شەنگال هەڵبگرێ، گومانی وا برد گەر لە نیوەی سەروەت و سامانی خۆش بێت ئەوا شاعادل لێی خۆش دەبێت[٢٠]. بەڵام شا عادل لە گومانەکەی بێ هیوا کردو داواکەی رەت کردەوە. واتە (شاعادل) پاش ئەوەی لەگەڵ نوردەدین ئەرسەلان شا رێکەوت قسەکانی فەرمانڕەوای هەولێری ئەوەندە بەلاوە گرینگ نەما[٢١]. ئەوە بوو ئەو رەتکردنەوە ناپێشبینی بۆ کراوە پاڵی بە موزەفەرەدین گۆکبری نا کە نامەیەک بۆ نەیاری پێشوو فەرمانڕەوای موسڵ بنێرێت و داوای یەک هەڵوێستی لێ بکات لە دژی چاو برینەکانی ئەو شایەدا کە گۆڕاوە. لە لایەکی دیکە داروودەستەی موسڵ مقۆمقۆی ئەوەیان لاپەیدا بوو و ئەو پرسەیان لا دروست بوو گەر شا عادل لە پرۆسە سەربازییەکەی سەربکەوێت، ئەوا دەرئەنجامی زۆری لێ دەکەوێتەوە[٢٢]، بە دوور نازانرێ لەدوای شەنگال بیر لە شاری موسڵیش بکاتەوە، هەر چەندە ئەتابیگەی موسڵ پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ ئەو شایەدا هەبووە. خزمایەتی لێک نزیک کردبوونەوە، تا گەیشتبووە ئەو ئاستەی ئەتابیگەی موسڵ دەستی کردبوو بە ئامادەکردنی سوپایەک بە سەرکردایەتی کوڕەکەی شا قاهیر عیزەدین مەسعوود بۆ ئەوەی بەرەو شەنگال بچێت و کۆمەکیدەری هاوپەیمانەکەی بێت[٢٣].

قاسیدی فەرمانڕەوای هەولێر بە شەو گەیشتە موسڵ و پرۆژەیەکی هاوکاری نێوان هەر دوو لای پێیە، ئەویش کۆمەکیکردنی قوتبەدین محەمەدە. ئەو هەڵوێستە تازەیەی فەرمانڕەوای هەولێر ئەتابیگەی موسڵی سەرسام کردو[٢٤] پێشوازییان لە بیرۆکەی ئەو پرۆژەیە کرد. لەسەر ئەو بنەمایە موزەفەرەدین گۆکبری خودی خۆی گەیشتە سەربازگەکانی هەولێر و شارەزوور، لەگەڵ نورەدین ئەرسەلان شا کۆبۆوە. دەشێ ئەوە بڵێین ئەو دیدارە بووە هۆی ئەوەی لاپەڕەیەکی تازە لە پتەوکردنی پەیوەندییەکانی نێوانیان هەڵبدەنەوە و پاش ئەوەی تا ماوەیەک دژایەتی یەکتریان کرد، هاوکاری بکەن.

ئەو کۆبوونەوەی لەنێوان هەر دوولا (گۆکبری و ئەرسەلان شا) گرێدرا رێکەوتن لەسەر ئەوەی هەرچی ناکۆکی و گومان لە نێوانیاندا

هەیە بە لاوەی بنێن، هەر یەک لە هەردوو لا متمانەی تەواو بە لایەنەکەی تر بکات. بەپێی ئەوەی مێژوونووس ئیبن ئەثیر دەڵێت متمانەی فەرمانڕەوای موسڵ گەیشتە ئەو ئاستەی خۆی لەسەربازگە بێنێتەوە و میوانەکەشی موزەفەرەدین گۆکبری لە قەڵای شار بێت[٢٥].

ئینجا هەردوو میر پشتگیری میری ناوچەکانی دیکەیان کۆکردەوە، بۆ ئەوەی شانبەشانیان لە دژی شا عادل بوەستن. وێڕای ئەوە هەردوولا قاسیدێکیان بۆ لای خەلیفە ناسر لیدنیلا نارد و داوایان لێ کرد جەماوەری خۆی، کە لای شا عادلە بەکاربهێنێ و دەست بخاتە نێو بارەکە، بۆ ئەوەی دەست لە شەنگال هەڵبگرێت. خەلیفەش چەند لە گەورە پیاوانی دیوەخانەکەی نارد بۆ ئەوەی کێشەکە یەکلایی بکرێتەوە[٢٦]. ئەوە بوو پاش هەوڵ و تەقەلایەکی بێوچان شا عادل رازی بوو هاوپەیمانەتییەک لەگەڵ فەرمانڕەوای شنگال ببەستێت لەبەرامبەر ئەوە ئەو ناوچانەی خۆی دەپارێزێت، کە ولاتگیری کردوون. بەلام سەبارەت بەشاری شنگال بۆ خاوەنەکەی جێ دەهێڵێت[٢٧].

شیاوی ئاماژە پێکردنە ئەوەی گرینگ بوو لەو پەیوەندییە تازەیەی نێوان هەولێر و موسڵ پەیوەندی خزمایەتی بوو لە نێوان هەردوو بنەماڵەی فەرمانڕەوادا. دوو کچی موزەفەرەدین گۆکبری بۆ دوو کوڕی نورەدین ئەرسەلان شا[٢٨] بەناوی شا قاهیر عیزەدین مەسعوود و عیمادەدین زەنگی گوازرانەوە.

نورەدین ئەرسەلان شا پێش مردنی، وڵاتی موسڵی بەسەر هەردوو کورەکانی دابەش کرد و کوڕە گەورەکەی عیزەدین مەسعوود لەسەر کورسی پاشایەتی دانا، کوڕە بچووکەکەشی عیمادەدین زەنگی دەسەلاتی هەر دوو قەلاتی عەقری حەمیدی[٢٩] و شوشی[٣٠] پێ سپارد[٣١]. بەلام بەدرەدین لوئلوئەی راسپارد کاروباری هەر دوو لا هەڵبسووڕێنێ، لەبەر ئەوەی (جێگری ئەتابیگ) ی منداڵەکانی بەتەمەن بچووک بوون[٣٢]. هەروەها لەبەر ئەوەی چونکە وای لە جێگرەکەی دەبینی، کە سیاسەتمەدارێکی باشەو کارەکان باش هەڵدەسووڕێنێ[٣٣] شارەزاییەکی تەواوی هەیە لە هەڵسووڕاندنی کاروباری دەوڵەت. بەلام سەبارەت بە پەیوەندی ئەتابیگ بە میرنشینی هەولێر، هەرچەندە سەرچاوەکان ئاماژەیان پێ نەداوە، بەلام وادیارە پەیوەندییەکان لەنێوان هەر دوو لا باش بووە.

**ج- پەیوەندی نێوان موزەفەرەدین گۆکبری و موسڵ لە سەردەمی بەدرەدین لوئلوئە (٦١٥-٦٣٠ک)-(١٢١٨-١٢٣٣ز)**

ئەتابیکە شای لاویان قاهیر عیزەدین مەسعوودی کوڕی نورەدین ئەرسەلان شای (دووەم) یان راسپارد لەسەر کورسی پادشایەتی دابنیشێت، هەر چەندە تەمەنی بچووک بوو، تەمەنی لە ٢٠ ساڵی تێپەڕ نەدەکرد[٣٤]. وا پێدەچێت ئەو دامەزراندنە بەکاریگەری بەدرەدین لوئلوئە بوبێت، کە راسپێردرابوو جڵەوی دەسەلاتی کورسی پادشایەتی موسڵ بگرێتە دەست، بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی ئەو کورسییە بکات.

لە کەشێکی گوماناویدا[٣٥] لە ساڵی ٦١٥ک- ١٢١٨ز شا قاهیر مرد. بەدرەدین لوئلوئە نامەیەکی بۆ خەلیفە ناسر لدینیلا ناردو داوای لێ کرد لاسایی نورەدین ئەرسەلان شا بکاتەوە، واتە (بەدرەدین لوئلوئە) چاو بەکاری موسڵدا بخشێنێتەوە، خەلیفە گوێڕایەڵی داواکەی بوو[٣٦].

بەمەوە بەدرەدین لوئلوئە توانی پشتگیری شایەکانی دەوروبەر کۆبکاتەوە و ڕەزامەندییان وەربگرێت، لەوانە یەکێکیان فەرمانڕەوای هەولێر بوو، کە بێ دەنگی نواند لەوەی کە بەدەردین لوئلوئە ئەنجامی دا.

بەلام دوای موزەفەرەدین گۆکبری هەڵوێستی خۆی گۆڕی و پشتگیری زاواکەی عیمادەدین زەنگی کرد، کە داوای کورسی پاشایەتی موسڵی دەکرد. عیمادەدین پاڵپشت بوو بە داواکەی بەوەی، کە هەقی ئەوە ئەو کورسییە بەو بسپێردرێت، چونکە کوڕی گەورەی بنەماڵەی فەرمانڕەوایی ئەتابیگییە. وێڕای ئەوە فەرمانڕەوای ناوچە شاخاویەکانیشە لە میرنشینی موسڵ. بەلام لەبەر ئەوەی بەتەمەن بچووکە کورسی پاشایەتی نادرێتە دەست و بەشیاو دانانرێت. واتە بە کردەکی دەسەلات بەدەست بەدرەدین لوئلوئەدا دەبێت، کە ئەو راسپاردە بە تواناکەیە، بێگومان ئەمەش وای کرد جارێکی تر فەرمانڕەوای هەولێر نیگەران بکات، چونکە گەر عیمادەدین زەنگی کوڕی، پاشایەتی وەرگرتبایە ئەوا موزەفەرەدین گۆکبری دەیتوانی موسڵ بە پاڵپشتێک بۆ خۆی دابنێت.

کاتێ بەدرەدین لوئلوئە جارێکی

تر کردی بە دوو میرنشین لەباری ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازیدا وەکو پێشتر بەر لەوەی هەردوولا ڕێکبکەون و پەیوەندی خزمایەتی لە نێوانیاندا لە ساڵی ٦٠٦ک/ ١٢٠٩ز دروست بێ.

پاش ئەوەی داوای عیمادەدین زەنگی بەرەوا لە قەڵەم درابوو، بە بیانوویەک بۆ ئەوەی جاڕدانی جەنگ بکرێ لە دژی داگیرکەری کورسی پاشایەتیدا، ئەوسا هەولێر موسڵی دەورووژاند و بۆ عیمادەدین زەنگی جەخت دەکردەوە، کە بەدرەدین لوئلوئە دەیەوێ بنەماڵەی زەنگییەکان لاواز بکات و پاشان دەست بەسەر کورسی پاشایەتیدا بگرێت[٣٧]. ئەممەش وای لە عیمادەدین کرد تەنیا بەرگری لە بنەماڵەکەیان بکات بە پاڵپشتی فەرمانڕەوای هەولێر.

پاش ئەوەی بەدرەدین لوئلوئە لەموسڵ دەری کرد[٣٨]، عیمادەدین زەنگی لەناوچە شاخاوییەکان شەڕی پێدەفرۆشت، تا وای لێهات بەدرەدین لوئلوئە خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ئەو هەڵوێستە ببێتەوە و دەستبەجێ هێزێکی بۆ ئامێدی نارد بۆئەوەی بەسەر بزاوتی عیمادەدین زەنگی زاڵبێت. بەڵام خراپی کەش و هەواو کەوتنی بەفرێکی زۆر وای کرد هێزەکە هیچ ئامانجێک نەپێکێت، سەرەڕای ئەوە موزەفەرەدین گۆگبری کۆمەکی و پشتگیری زاواکەی دەکرد.

بەدرەدین لوئلوئە هەڵسا پەیامی بۆ فەرمانڕەوای هەولێر ناردو داوای لێ کرد کۆمەکی و هاوکارییەکەی، کە بۆ عیمادەدین زەنگی دەنێرێت ڕابگرێت و پەیمان و بەڵێنەکانی بەبیر هێنانەوە کە لە نێوانیاندا هەیەو لە دەقەکەدا[٣٩] هاتووە. پەڵپ بە کارەکانی موسڵ نەگیرێت لەوانە هەکاری[٤٠] و زۆزان[٤١]. بەڵام فەرمانڕەوای هەولێر گوێی بە داواکەی بەدرەدین لوئلوئە نەدا، ئەو شوێنانەش هەر لە دەست عیمادەدین زەنگی مانەوە[٤٢]. بۆیە بەدرەدین لوئلوئە ناچار بوو داوای هاوکاری و پشتگیری لە دەرەوە بکات، بۆیە پەیوەندی بە خەلیفە ناسر لیدینلا(٥٧٥-٦٢٢ک) /(١١٨٠-١٢٢٥ز) کرد و بەدرەدین توانی پشتگیری وەربگرێت بە دامەزراندنی میری بچووک[٤٣]، دەستی کرد بە هاندانی لەسەر موزەفەرەدین گۆگبری. زیائەدین ئیبن ئەسیر لەسەر زاری بەدرەدین لوئلوئە نووسی، کە موزەفەرەدین گۆگبری شوێن پێی خۆی کردۆتەوە و سەربازێکی زۆری هەیە و لەژێر قەڵاتەکەی خۆی ناسراو بە(عەقر)[٤٤] دابەزیوە و مەترسیدارە. جا بەدرەدین لوئلوئە هەرچەندە لەو بارە سەرکەوتوو بوو، بەڵام زانی کە خەلیفە لە توانایدا نابێ هاوکاری کارەکانی بکات، بۆیە ئەو زانینە پاڵی نا، کە بە دوای هاوپەیمانێکی تازەدا بگەڕێ. ئەوە بوو لە کۆتاییدا شا ئەشرەف موسا کوڕی شا عادل ئەیوبی فەرمانڕەوای دیارنشینی جەزیرەی[٤٤] دۆزیەوە و هاوپەیمانیەتی لەگەڵدا بەست بۆ ئەوەی مەترسی موزەفەرەدین گۆگبری و زاواکەی عیمادەدین زەنگی لە خۆی دوور بکاتەوە. دەر حاڵ شا ئەشرەف ئاگاداری فەرمانڕەوای هەولێری کردەوە و هەڕەشەی داگیرکردنی وڵاتەکەی لێ کرد، گەر بێت و واز لە یارمەتیدانی عیمادەدین زەنگی نەهێنێت و لە ئاگادارییەکەدا دەڵێت: گەر بەداواکەم رازی نەبی و مکوڕبی لەسەر یارمەتیدانی زەنگی، ئەوا وڵاتەکەت داگیر دەکەم[٤٦]. لەهەمان کاتدا داواشی لێ کرد هاوکاری بکات بۆمیر بۆ ئەوەی لە فەرمانگەکان پاکی بکاتەوە.

موزەفەرەدین گۆگبری گوێی بە هەڕەشەکانی شا ئەیوبی نەدا، بەڵکو کاری دیبلۆماسی ئەنجام دا بۆ ئەوەی لاگیران پەیدا بکات، پەیوەندی بە شایەکانی دەوروبەر کرد و داوای لێ کردن هاوپەیمانەتییەکی گشتگیری ببەستن بۆ بەرهەڵستکاریکردنی شا ئەشرەف، نامەی نارد بۆ شامەپور ناسردین ئەرتەق تمرتاش کوڕی ئیلغازی کوڕی ئەرتەق[٤٧] فەرمانڕەوای ماردین[٤٨]، شا ناسردین مەحموود کوڕی محەمەد کوڕی قەرە ئەرسەلان کوڕی سقمان کوڕی ئەرتەق[٤٩] فەرمانڕەوای ئامەد[٥٠] و قەڵاتی کیفا[٥١]. وەڵامیان دایەوە[٥٢]، چونکە لەگەڵ ئەیوبییەکان یەک نەبوون بەهۆی ئەوەی بەسەر دەسەڵاتی ئەرتەقییەکان[٥٣] زاڵ بووبوون. هەموویان ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی لەدژی شا ئەشرەف و هاوپەیمانەکەی بەدرەدین لوئلوئە بجەنگن. عیمادەدین زەنگی بەرەو عەقر ڕۆیشت، کە سەر بە دەوڵەتەکەی بوو، سەربازی تیادانا، بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی کارەکانی موسڵ بکات. موزەفەرەدین گۆگبری ژمارەیەک سەربازی بۆ نارد. کاتێ بەدرەدین لوئلوئە گوێبیستی هەواڵی ئەو بزاوتە بوو، ژمارەیەک لە سەربازانی بۆ دەوروبەری شاری موسڵ نارد بەمەبەستی پاراستنی لە

ئەگەری هەر هێرشێک[٥٤] زستانی سالی ٦١٦ک / ١٢١٩ز تەواو نەبێوو بڕیار بوو ئەو سەربازانە بە شەو هێرش بەرنە سەر عیمادەدین زەنگی لەشاری عەقر، هەردوو لا شەڕو کوشتاری باشیان کرد، لە ئەنجامدا سەربازانی بەدرەدین سەرکەوتن و فەرمانڕەوای عەقرو شوش شکان و هەلاتن بۆ هەولێر. سەرکەوتووەکانیش گەڕانەوە موسڵ. پاشان نێردراوی خەلیفە ناسر لیدینیلا نێردراوی شا ئەشرەف دەستیان لە کارەکە وەردا، بۆ ئەوەی دوایی بە قەیرانەکە بێنن. هاوپەیمانەتییەکی ئاشتی لە نێوان هەردوولادا مۆرکرا[٥٥].

بەڵام مردنی ئەتابیگی تازە نورەدین ئەرسەلان شا (دووەم) پاش چەند مانگێکی کەم وای کرد پاش چەند مانگێکی دیکە ئەو هاوپەیمانەتییە ئاشتییە هەڵبوەشێنێتەوە. ئەوە بوو موزەفەرەدین گۆکبری و عیمادەدین زەنگی وای بۆچوون، کە ئێستا چارەنوسی بنەماڵەی ئەتابیگەی زەنگی کەوتە دەست فێلبازەکان. جا گەر بەپەلە هەڵوێستی تەواو لە بەرامبەر ئەو کارەی بەدرەدین لوئلوئە وەرنەگرن، کە بەڕۆڵەی گەورەکانیان کرا، ئەوا بۆ جاری دووەم لە ڕیساو بنەماکانی بۆماوەیی لادەدا. بەڵام ئەمجارە زێتر لەجاری پێشوو هەڕەشەی کرد کاتێ منداڵێک، کە تەمەنی لە سێ ساڵ[٥٦] تێپەڕی نەدەکرد لەسەر کورسی پاشایەتییان دامەزراند، ئەویش ناسرەدین مەحموود کوڕی دووەمی شا قاهیر عیزەدین مەسعوود بوو.

لەپاش دامەزراندنی ئەو منداڵە عیزەدین مەسعود، عیمادەدین زەنگی دەستی بەداواکەی کردەوە بۆ گەڕانەوەی موسڵ و فەرمانڕەوای هەولێر پشتی دەگرت، سوپایەکی ڕێکخست و بەرەو موسڵی نارد و ئەو دەرفەتەی قۆستەوە، کە بەشێکی بۆ شەڕی خاچپەرستەکان ناردبوو لەسەر داوای شا ئەشرەف. وادیارە بەدرەدین لوئلوئە پێشبینی ئەوەی دەکرد، کە لەلای هەولێرەوە هێرش بکرێت بۆیە هێزێکی لە نەسیبییەکان بۆ ئەو لایەنە نارد، کە هاوپەیمانی شا ئەشرەف بوو لەژێر دەسەلاتی ئەو دایابوو. ئەو هێزە عیزەدین ئیبیک سەرکردایەتی دەکرد، هات و لەپایزی ساڵی ٦١٦ک-١٢١٩ز کە گەیشتە ناوچەکە، ئەو سەرکردەیە ویستی لە ڕووباری دیجلە بپەڕێتەوە و مەبەستیشی هەولێر بوو. بەدرەدین لوئلوئە مۆڵەتێکی دایەو داوای لێکرد شێنەیی بکەن تاوەکو سەربازەکان کەمێک پشوو بدەن.

لەپاش چەند ڕۆژێک لە ڕووبار پەڕینەوەو لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە دابەزین بەدووری فەرسەخێک[٥٧] لە موسڵ[٥٨] بەدرەدین لوئلوئە سوپاکەی کۆکردەوە و ئیبیکی لەپێشەوە داناو کەسانی بەتواناو چاونەترس لە سەربازانی لەگەڵ دانا.

بەڵام موزەفەرەدین گۆکبری لەزێی گەورە پەڕییەوە و بەرەو پێش چوو بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی سوپای موسڵ ببنەوە. جا کاتێ ڕووبەڕووی یەک بوونەوە وردە شەڕ لەنێوانیاندا ڕووی دا، پاشان شەڕەکە گەرم بوو، سوپای هەولێر توانی هێزەکانی بەدرەدین لوئلوئە و عیزەدین ئیبیک بشکێنن، هەرچەندە سوپای هەولێر لەسەرەتای پێکدادانەکەدا شکا، کە عیمادەدین زەنگی سەرکردایەتی دەکرد.

بەهۆی سەرکەوتنی هەولێر بووە هۆی ئەوەی، بەدرەدین لوئلوئە پاڵنرا کە بەرەو موسڵ بچێت، لە دیجلە پەڕییەوە و لە قەڵاتی موسڵ دابەزی. بەرامبەرەکەشی فەرمانڕەوای لەلای ڕۆژهەڵاتی دیجلە دابەزی و لە پشت قەڵاتی نەینەوا بەرامبەر شاری موسڵ لەگەڵ یاوەرەکانیان خێوەتەکانیان دامەزراند[٥٩]. بەڵام پاشان ترسی ئەوەیان هەبوو، نەوەک لە پڕێکا سوپای لوئلوئە لێیان پەیدا ببێت، دوای ئەوەی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە نەینەوایان جێهێشت، گەڕانەوە هەولێر. لەو ماوەیەی کە موزەفەرەدین گۆکبری پاش ئەوەی لە زێی گەورە پەڕینەوە و دابەزیبوو، موسڵ نێردراوێکی ناردبووە لای پرۆژەیەکی خستبووە ڕوو، کە هەردوو لا ڕێک بکەون، ئەوە بوو جارێکی تر هەر دوو لا ئاشت بوونەوە[٦٠]. بەڵام ئەو ڕێکەوتنە نەبووە هۆی ئەوەی کە فەرمانڕەوای هەولێر کۆمەکی پێشکەش بە عیمادەدین زەنگی نەکات، کە دیسان دەستی کردەوە بە شەڕ فرۆشتنی بەدرەدین لوئلوئە کاتێ بینی دەرفەت بۆی هاتۆتە پێشەوە، خەڵکی قەڵاتەکانی لە دژی بەدرەدین هان دا. ئەمجارە لەمە سەرکەوتوو بوو، خەڵکی قەڵاتی کواشی[٦١] ئارەزوومەندی خۆیان ڕاگەیاند، کە دەیانەوێ لە موسڵ جیاببنەوە. بچنە پاڵ عیمادەدین زەنگی. لەم کاتەدا عیمادەدین زەنگی پەلەی لەم کارە کردو قەڵاکەی گرتە دەست[٦٢]. بەدرەدین لوئلوئە سەرزەنشتی

کارەکانی عیمادەدین زەنگی کردو لە لای فەرمانڕەوای هەولێر نارەزایی دەربڕی و ئەو هاوپەیمان و بەڵێنەی بیر هێنایەوە، کە لەم نزیکانە لە نێوانیان هەبوو. هەروەها داوای لێکرد هەوڵەکانی بخاتە گەڕ لە پێناو گەڕاندنەوەی قەڵاتی کواش بۆ موسڵ، کە ئێستا کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی زاواکەی. نارەزایی و داواکەی بە هەوادا رۆیی، بۆیە جارێکی تر پەنای بۆ شا ئەشرەف ئەیوبی بردەوە. بەڵام شا ئەمجارە لەتوانایدا نەبوو هاوکاری هاوپەیمانەکەی بکات، لەبەر ئەوەی لەبارێکی نائاساییدا بوو، سەرقاڵ بوو بە شەڕو کوشتاری لایەنەکان، هەرچەندە حەلەبی جێهێشت و لە فورات پەڕییەوە و گەیشتە حەرران[٦٣]. موزەفەرەدین گۆگبری دەرکی ئەوەی کرد، کە گرتنەبەری سیاسەتی شەڕو هێرشبردنی خێراو دەست بەسەردا گرتنی قەڵاتەکان هیچ سوودێک ناگەیەنێت بەوەی کە بەدرەدین لوئلوئە پێی لاواز بکات، تەنیا کەمێک نەبێت، بۆیە هەمیشە گۆگبری ناچار دەبوو، لەکۆتاییدا بە ئاشتەوایی لەگەڵ لوئلوئەدا رازی ببێت. بۆیە بەچاکی زانی بگەڕێتەوە بۆ گرتنەبەری سیاسەتی هاوپەیمانیەتی و دۆستایەتیکردن و پشتگیری، بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا پشتی پێ ببەستێت. جا چ لەرێگەی کاریگەری هەندێ لەکۆمەڵەکان بێت وەک کەسبکردنی ئەو لایەنانەی لاگیری بەدرەدین لوئلوئەن لە وڵاتی موسڵ، وەک نەسرانییەکان- تایەفەی عەدەوی- کۆمەڵگاکانی لاگیری عیمادەدین زەنگی، کە پشتگیری لە دەسەڵاتی بنەماڵەی زەنگییەکان دەکەن، یاخود لە رێگەی دامەزراندنی پەیوەندییەکان، یان هاوپەیمانیەتی تازە لەگەڵ لایەنەکاندا.

موزەفەرەدین گۆگبری هەڵوێستی سلبی حاکمی موسڵی لەگەڵ نەسرانییەکان ئیستیغلال کرد، چونکە تەنگی بە سەرکردەکان و پیاوانی ئایینی و سەرۆکی کڵێساکان و دێرەکانیان هەڵچنیبوو، بەوەی داوای لێ دەکردن پارەو پوولی داواکراو بۆی کۆبکەنەوە. ئەمە پاڵی بە نەسرانییەکانەوە نا بەنهێنی بەنامە پەیوەندی بە فەرمانڕەوای هەولێر بکەن و دژ بە بەدرەدین لوئلوئە رێک بکەون[٦٤]. یەکێک لەو نامانە کەوتە بەر دەستی بەدرەدین لوئلوئە کە مەقرەیان[٦٥]، شەمعون بەرتللەیی سەرۆکی گوندی (بەرتللە)[٦٦]، کە یەکێکە لەسەرکردە نەسرانییەکان بۆ موزەفەرەدینی ناردبوو. بەدرەدین ئەو مەقرەیانەی گرت و لە خاچی دا[٦٧]. پێدەچێ ئەوە تاکە نامە نەبووبێ لە نێوان هەولێر و سەرکردە نەسرانییەکان ئاڵوگۆڕ کرابێ. هەروەها پێدەچێ بە هەمان شێوە موزەفەرەدین گۆگبری لەگەڵ رۆڵەی تایەفەی عەدەوی کە سەر بە شێخ عودەی کوری موسافیر کوری ئیسماعیل کوری موسا کوری مەروان هەکاری بوون نامەی نهێنی ئاڵوگۆڕ کردبێ لە (٥٥٧ک-١١٦١ز) کۆچی دوایی کردووە[٦٨]. زانراوە کە فەرمانڕەوای هەولێر چاکەکانی ئەو شێخە باس دەکات. لە بچووکییەوە کاتێ لەموسڵ بووە بە دیداری گەیشتوە[٦٩]، کە ئەوسا لەگەڵ زەینەدین عەلی کوچکی باوکی بووە.

بەڵام لەرووی پەیوەندییەکانی دەرەوە، موزەفەرەدین گۆگبری کەسبی ژمارەیەک میری دەوروبەر بۆ لای خۆی کرد. مەبەست لەوە زیاتر دابڕاندنی بەدرەدین لوئلوئە و هاوپەیمانەکەی شا ئەشرەف بووە. بە کردەکی توانی پشتگیری هەریەک لە عیزەدین کیکاوس کوری کەیخوسرەو کوری قلیغ ئەرسەلان فەرمانڕەوای وڵاتی رۆم و، ناسرەدین ئەرتەق ئەرسەلان فەرمانڕەوای ماردین مەحموود کوری نوورەدین محەمەد کوری قەرە ئەرسەلان ئەرتەقی فەرمانڕەوای ئامەد (دیاربەکر) و قەڵاتی کیف، بۆ لای خۆی کۆبکاتەوە. هەموویان رێکەوتن کە ملکەچی عیزەدین کیکاوس فەرمانڕەوای وڵاتی رۆم بن[٧٠].

بەڵام ئەو هاوپەیمانیەتییە بە پێی مەرام نەبووە، چونکە عیزەدین کیکاوس کۆچی دوایی کردو دوای ئەو عەلائەدین کەیقوباد جڵەوی دەسەڵاتی رۆمی گرتە دەست. ئەو پێچەوانەی ئەو هاوپەیمانییە بوو، نێردراوێکی بۆ لای شا ئەشرەف ناردو ملکەچ بوو بۆ ئەو. هەروەها ناسرەدین مەحموود لە بەڵێنەکە پەشیمان بۆوە و وازی لە موزەفەرەدین هێناو چووە نێو ریزەکانی شا ئەشرەف. پاش ئەو ئاشتبوونەوەی نێوانیان هاوپەیمانەتییەکە پچڕاو[٧١] بەدرەدین لوئلوئە لەو مەترسییە رزگاری بوو.

گەر موزەفەرەدین گۆگبری نشوستی هێنا لەو هاوپەیمانەتییەی لەگەڵ میری لایەنەکانی بەست، سەرکەوتوو بوو لە کەسبکردنی

ژمارەیەک گەورە میری شا ئەشرەف بۆ لای خۆی، لەوانە ئەبو عەباس عیمادەدین ئەحمەد کوڕی میر سەیفەدین ئەبی حەسەن عەلی کوڕی ئەبی هیجا کوردی ناسراو بە ئیبن مەشتوب هەکاری، یەکێک بوو لە میرەکانی سەلاحەدین ئەیوبی[72]. هەروەها میر عیزەدین محەمەد کوڕی بەدری حەمیدی[73] بۆ لای خۆی راکێشا. لەگەڵ ژمارەیەک میری دیکە ڕێکەوتن، کە لە شا ئەشرەف جودا ببنەوە و بەرەکەی لاواز بکەن. ئەوەی تایبەتە بە میری یەکەم ئیبن مەشتوب پاش ئەوەی لە شا ئەشرەف جودا بۆوە لەگەڵ یاوەرەکانی بەرەو هەولێر هات. لە نەسیبین پەڕییەوە و ڕووبەڕووی سەربازانی شا ئەشرەف بۆوە، شەڕێکی توند لە نێوانیان ڕووی دا، میری جوداخواز نشوستی هێنا، ژمارەیەک لە یاوەرانی وازیان لێ هێنا. بەڵام هەر خۆی بەدەستەوە نەدا، بەڵکو بەرەو شەنگال ڕۆیشت، کە فروخ شا کوڕی زەنگی کوڕی قوتبەدین مەودود حکومڕانی دەکرد. ئەویش یەکێک بوو لەلاگیرانی شا ئەشرەف و ئیبن مەشتوبی دەستگیرکرد. بەڵام بۆ دواجار توانی کاری لێ بکات و بۆ لای خۆی رایبکێشێت و وای لێ کرد لە گوێڕایەڵی شا ئەشرەف دەربچێت[74]. لەدەرئەنجامی ئەو هەمووەدا ئەو سیاسەتەی موزەفەرەدین گۆکبری لەگەڵ لایەنەکان و هێزی ناوخۆی موسڵ گرتبوویە بەر جارێکی تر نوشستی هێنا، بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەو هاوپەیمانەتییەی لەگەڵ میرەکان بەستبووی. هەروەها بەهۆی ئاگاهاتنەوەی بەدرەدین لوئلوئە کە نەیهێشت بوار بڕەخسێ لە نێوان نەسرانییەکان و فەرمانڕەوای هەولێر، تا ڕۆڵ لەو مەسەلەیە ببینن، بە تایبەت پاش ئەوەی پەیوەندی مەقرەیان شەمعون بەرتللی ئاشکرابوو. وێڕای ئەو زەرەرەی بە موزەفەرەدین کەوت بەهۆی ئیبن مەشتوبەوە، چونکە لەتوانایدا هەبوو هەڵوێست وەربگرێت لە بەرامبەر دوژمنانی هەولێردا.

بەڵام میری دووەم عیزەدین محەمەد حمیدی گەیشتە هەولێرو بە کاربەدەست لە قەڵاتی (سارو) دامەزراند[75].

فەرمانڕەوای هەولێر جارێکی تر هەڵوێستی خۆی بەرامبەر موسڵ و هاوپەیمانانی گۆڕی و هاتنی شای بۆ شاری موسڵ بە دەرفەت زانی و لە هاوینی ساڵی ٦١٥ک/١٢١٨ز نامەیەکی بۆ شا ناردو پرۆژەی ئاشتبوونەوەیەکی تازەی نێوانیانی خستە بەردەم. شا ئەشرەف ئەمەی قبوڵ کرد. بە مەرجێ موزەفەرەدین گۆکبری هەڵبەستێ بە قایلکردنی زاواکەی عیمادەدین زەنگی قایل بکات دەستبەرداری ئەو قەڵاتانە بێت، کە دەستی بەسەردا گرتوون و بیانگەڕێنێتەوە بۆ بەدرەدین لوئلوئە تەنیا قەڵاتی ئامێدی نەبێت، کە بە دەست عیمادەدینەوە دەبێت[76].

سەرەتا ڕێکەوتنەکە وەها نەبوو، گفتوگۆی نێوانیان دوو مانگی خایاند. وادیاربوو شا ئەشرەف چاوی بڕیبووە خودی هەولێر، تەماشا دەکەین سەربازەکانی بەرەو هەولێر نارد تا گەیشتە سەلامیە(٧٦) کە نزیکە لەزێی گەورە. هەواڵی بزاوتی شا ئەشرەف گەیشتە هەولێر. موزەفەرەدین گۆکبری بەخۆی و هێزەکەی بەرەو موسڵ کەوتەڕێ، لەسەر زێ دابەزین بە بێ ئەوەی بپەڕنەوە. ئامادە باشی خۆی لە ئەگەری هەر ڕووداوێکی نائاسایی وەرگرت.

کاتێ هەردوو لا گەیشتنە یەک هیچ پێکدادانێک لە نێوانیاندا ڕووی نەدا. دووبارە فەرمانڕەوای هەولێر شاندێکی بۆ لای شا ئەشرەف نارد و پێشنیازەکانی خستەوە بەردەم کە هێشتا ڕەزامەندی لەسەر دەرنەبڕیبوو. جا پاش ئەوەی ورتەورت کەوتە نێو ریزی سوپاکەی بەهۆی ئەوەی ماوەیەکی دوور و درێژ چاوەڕوانیان کرد، لە لایەکی دیکە زانی کە ناسرەدین مەحموود کوڕی نوورەدین محەمەد کوڕی قەرە ئەرسەلان ئەرتەقی فەرمانڕەوای ئامەد دووبارە پشتگیری لە هەولێر دەکات، هەر دوو لا لەسەر ئاشتبوونەوە ڕێککەوتن. کاتێکیان دیاری کرد بۆ ئەوەی عیمادەدین زەنگی قەڵاتەکان تەسلیم بکاتەوە. بەڵام شا ئەشرەف لە نیازی موزەفەرەدین بە گومان بوو، بۆیە داوای لێ کرد زاواکەی تەسلیم بکات و وەک بارمتە لای بێنێتەوە تا وەکو قەڵاتەکان تەسلیم بە بەدرەدین لوئلوئە دەکاتەوە، کە لە ژێر دەسەڵاتی عیمادەدین بوون[78].

کاتێ ئەو قەڵاتانە تەسلیم بە نوێنەرانی شا ئەشرەف وەک دەستپێک بەتەسلیمکردنەوەی بە فەرمانڕەوای موسڵ، خەڵکی قەڵاتەکان هەڵگەڕانەوە و ڕازی نەبوون جارێکی تر بگەڕێنەوە ژێر دەسەڵاتی بەدرەدین لوئلوئە تەنیا قەڵاتی جەبەل جورا نەبێت[79]، کە لە

کارەکانی هەکارییە[٨٠] رازی ببوون بەگەڕاندنەوەیان بۆ ژێر دەسەڵاتی بەدرەدین.

لە ژێر کاریگەری ئەم رووداوانەوە پەیوەندییەکانی نێوان هەولێر و موسڵ بۆ ماوەی شەش ساڵی داهاتوو (٦١٥-٦٢١ک)/ (١٢١٨-١٢٢٤ز) تێکچوو. بەڵام وادیارە فەرمانڕەوای هەولێر ئەو بایەخە گەورەی جارانی بە عیمادەدین زەنگی نەدا پاش ئەوەی بەهۆی پەیڕەوکردنی هەڵەی سیاسی لەگەڵ یاوەرەکانی قەڵاتەکانی لەدەست دا، تەنانەت بگرە دوا قەڵاتیش، کە لە دەستی مابوو قەڵاتی شوش بوو. ئەمەش لەکاتێکدا روویدا کە عیمادەدین زەنگی لە ساڵی ٦١٩ک-١٢٢٢ز قەڵاتی جێهێشت و بەرەو ئازربایجان رۆیشت و ماوەیەکی زۆر لای موزەفەرەدین ئۆزبەگ کوڕی پەهلەوان مایەوە[٨١].

موزەفەرەدین گۆگبری هیچ بزاوتێکی نەکرد بەرامبەر بەوکارەی بەدرەدین لوئلوئە و سەربازانی بە قەڵاتی شوشیان کرد، لەوانەیە ئەو هەڵوێستەی لەبەر کەمتەرخەمی زاواکەی وەرگرتبێت لەبەرامبەر کاروبارو هەڵسووڕاندنی قەڵاتەکانداو، رۆشتنی بۆ ئازربایجان و مانەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر لەوێ. عیمادەدین زەنگی هەستا داوای کۆمەکی لە ئۆزبەگ کوڕی پەهلەوان کرد و تیشکی خستە سەر سروشتی پەیوەندییەکانی نێوان خۆی و پارێزراوەکانی و جەختی کردەوە، کە پەیوەندییەکان بەرەو خراپی دەچن، پاش ئەوەی موزەفەرەدین گۆگبری هەڵوێستی لەگەڵ گۆڕا. چونکە موزەفەرەدین زانی زاواکەی بەکەڵک ئەوە نایەت ئامانجی چاو تێبڕینەکەی لە موسڵ بۆ بپێکێ. ئەوە بوو کاتێ عیمادەدین لە ئازربایجان گەڕایەوە دەستگیری کرد و تەسلیم بە شا ئەشرەفی کرد[٨٢]. ئەویش ئازادی کرد و دواتر بەسەرشۆڕی گەڕایەوە هەولێر، ئینجا موزەفەرەدین گۆگبری شارەزووری دایە دەست لەبری ئەو زیانەی لە قەڵاتەکان پێی کەوتبوو، کە لە باوکی نورەدین ئەرسەلان شا بۆی بەجێ مابوو. پێش ساڵی ٦٢٢ک-١٢٢٥ز عیمادەدین زەنگی گوازرایەوە بۆ شارەزوور[٨٣]. لەوێ مایەوە تا لەساڵی ٦٣٠ک (١٢٣٢-١٢٣٣ز) کۆچی دوایی کرد[٨٤].

لێرە تەماشا دەکەین موزەفەرەدین گۆگبری بەردەوام بووە لە گرتنەبەری سیاسەتی هێورکردنەوە لەگەڵ موسڵدا. بەتایبەت پاش ئەوەی ناوچەکە کەوتە بەر هێرشی مەغۆلەکان و زۆر لە ناوچە ئیسلامییەکانیان داگیرکرد. بۆیە موزەفەرەدین بڕیاری دا لەسەر گرتنەبەری ئەو جۆرە سیاسەتە بمێنێتەوە لەگەڵ موسڵ چونکە لەبەرژەوەندی خۆیدایە. چونکە وای لێ هات ئەو پێویستی بە موسڵ بێت لەرووی بەرگریکردن لە مەترسییەکانی مەغۆل، چونکە مەغۆلەکان دەستیان کردبوو بەوەی لەدەرگای میرنشینەکان بدەن. لەساڵی ٦١٧ک-١٢٢٠ز پاش ئەوەی دەستیان بەسەر مەراغەدا[٨٥] گرت بەرەو هەولێر هاتن. ترس و تۆقاندنیان لە دەوروبەری بڵاوکردەوە. فەرمانڕەوای هەولێر هانای بۆ بەدرەدین لوئلوئە برد. ئەویش بە هێزێکی زۆری سەربازی موسڵ فریای کەوت[٨٦].

### د- سەرهەڵدانەوەی ململانێ لەنێوان هەردوو میرنشینی هەولێر و موسڵ لە ساڵی ٦٢١ک-١٢٢٤زدا.

ئەو رەوشە ئاشتییەی لە نێوان هەولێر و موسڵ لە ئارادا بوو، بەردەوام نەبوو. ململانێی نێوانیان سەری هەڵدایەوە. ئەم جارە بەدرەدین لوئلوئە دەستپێشخەر بوو کاتێ سنووری بۆ دەسەڵاتی بنەماڵەی ئەتابیگەی زەنگی داناو بەسەر دەسەڵاتی دوا ئەتابیگە ناسرەدین مەحموود کوڕی کچی موزەفەرەدین گۆگبری زاڵ بوو، لەساڵی ٦٢١ک-١٢٢٤ز جڵەوی دەسەڵاتی موسڵی گرتە دەست. بێگومان ئەمەش وایکرد بۆ جارێکی تر چەک لەنێوان هەردوو میرنشینەکان بڵاوبێتەوە.جا بەر لەوەی بچینە بنج و بناوانی ئەو پەیوەندییە واباشترە تیشک بخەینە سەر رێکەوتی کوژرانی دوا ئەتابیگەی ناوبراو، چونکە جیاوازی لە نێوان قسەی مێژوونووسەکان هەیە. دەسەڵاتی بەدرەدین لوئلوئە لەپاش مردنی دوا گەورەی ئەتابیگەی موسڵ نورەدین ئەرسەلان (شا) لەساڵی ٦٠٧ک-١٢١١ز.

سەرنج دەدەین ئەو دەقانەی دەستمان کەوتوون بەدرەدین لوئلوئە لەساڵی ٦٣١ک/١٢٣٣-١٢٣٤ز جاردانی ئەوەی کرد، کەشای موسڵە[٨٧]. لەسەر ئەو دراوانەی لە موسڵ لێدەدران ناوی بەدرەدین لوئلوئە لەسەر بووە. ئەوەی لێرەدا دەمێنێت و ئاماژەی پێبدرێت مەسەلەی دیاریکردنی مردن یان

(کوژرانی) ئەتابیگ ناسرەدین مەحموودە کە ئەویش نادیارە، نادیارییەکەش بەهۆی جیاوازی سەرچاوەکانە، کە لەگەڵ یەکتر یەک ناگرێتەوە.

بۆ نموونە مێژوونووس ئیبن عیبری لەگێڕانەوەی رووداوەکانی موسڵدا جەخت دەکاتەوە، کە مردنی ناسرەدین مەحموود لە ساڵی ٦٣١ک روویداوە. واتە لەهەمان ئەو ساڵەی بەدرەدین لوئلوئە دەسەڵاتی موسڵی گرتە دەست[٨٨]. زەهەبی لەگەڵ ئیبن عیبری هەمان بۆچوونی هەیە، کە لەو ساڵەدا مردنی ئەتابیگ روویداوە[٨٩]. بەڵام ئەبو شامە مەسەلەکە ئاڵۆزتر دەکات و دەڵێت: هەواڵی شا ناسرەدین مەحموود نەما هەر لەگەڵ گرتنەدەستی جڵەوی دەسەڵاتی موسڵ لەلایەن بەدرەدین لوئلوئەوە لەپاش مردنی باپیرەی ئەو شایە باوکی دایکی، کە دەکاتە موزەفەرەدین گۆکبری لە ساڵی (٦٣٠ک/١٢٣٠ز)[٩٠]ن لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت: لە ساڵی ٦٢١ک/١٢٢٤ز کاتێ بەدرەدین لوئلوئە دەسەڵاتی موسڵی گرتە دەست دەرکەوت، کە ناسرەدین مەحموود مردووە و فەرماندراوە بە خنکاندنی[٩١]. نامۆیەکە لەوەدایە مێژوونووسی هاوچەرخ نەوەی ئیبن جەوزی رووداوی خنکاندنی ئەو شایەو نەمانی ئەتابیگە بەیەکەوە بە ساڵی ٦٢١ک/ ١٢٢٤ز دەبەستێتەوە[٩٢]. وادیارە مێژوونووسەکانی تریش هەمان گێڕانەوەیان گواستۆتەوە، لەوانە مێژوونووسان ئەبو شامە[٩٣] زەهەبی[٩٤] ئیبن تەغری بەردی[٩٥] ئیبن عیماد[٩٦]. لەکاتێکدا دەبینین ئەبو فیدا[٩٧] و ئیبن وەردی[٩٨] دەڵێن: رووداوی مردنی ئەو شایە و نەمانی بنەماڵەی ئەتابیگی لە ساڵی ٦٩١ک/١٢٢٢ز روویداوە. لەوانەیە ئەو مێژوونووسانە گێڕانەوەکەیان لە ئیبن واسڵ گواستبێتەوە، کە باس لەمردنی ناسرەدین مەحموود دەکات لە رووداوەکانی ساڵی ٦١٩ک و، جەخت دەکاتەوە، کە ئەو رووداوە لەو ساڵەدا روویداوە[٩٩].

بەڵام ئیبن ئەسیر هاوڕایە لەگەڵ ئەبو شامە، کە دەڵێن ئەو رووداوە لەساڵی ٦٣٠ک/١٢٣٣ز روویداوە، باس لەوە دەکات بەدرەدین لوئلوئە رووداوی مردنی موزەفەرەدین گۆکبری، کە دەکاتە باوکی دایکی و باپیرەی ئەو قۆستییەوەو لەو ساڵەدا بۆ ماوەی ١٣ رۆژ لەئاو و خواردنی قەدەغە کرد تا لە برسان و لە تێنوێتیان رەقبۆوە و مرد[١٠٠]. کەواتە دەگەڕێینەوە بۆ باسەکەمان گەر ئەوەی مێژوونووسەکان باسی لێوە دەکەن و ناسرەدین مەحموود لەساڵی ٦٢١ / ١٢٢٤ ز مردبێت، دەکرێ بڵێین ئەوە یەکێکە لەو هۆکارانەی، کە بووە هۆی ئەوەی سەرلەنوێ پەیوەندییەکانی نێوان هەولێر و موسڵ بشڵەژێت و تێک بچێت. چونکە ئەو رووداوە موزەفەرەدین گۆکبری هەژاند و وای لێکرد بیر لە رێگایەک بکاتەوە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە دوژمنەکەی، کە بەسەر دەسەڵاتی کچەکەیدا زاڵ بوو، کە هەندێ هیوای پێ هەبوو، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد دەسەڵاتی موسڵ بگرێتە دەست و لە رێگای ئەوەوە ئامانجەکانی بپێکێ ئەگەر هەرنا موسڵ بۆ هەولێر وەک پاڵپشتێک دەبێت.

دەستبەسەرداگرتنی بەدرەدین لوئلوئە بەسەر موسڵ، مانای لەدەستدانی دوا کارت دەگەیەنێت، کە فەرمانڕەوای هەولێر پەنای بۆ دەبرد. وێڕای ئەوە بەدرەدین لوئلوئە هەڕەشەشی لە میرنشینی هەولێر کرد، چونکە پشتی بەهاوپەیمانە بە هێزەکەی شا ئەشرەف ئەیوبی قایم بوو. بۆیە موزەفەرەدین گۆکبری بەدوای رێگایەکی دیکە دەگەڕا، بۆ ئەوەی بەدرەدین لوئلوئە و هاوپەیمانەکەی لاواز بکات. بڕیاری هاوپەیمانێتیان دا لەگەڵ هەردوو برای شا ئەشرەف عیسا فەرمانڕەوای دیمەشق و شا مزەفەر شەهابەدین غازی فەرمانڕەوای قەڵات. ئەو دووبرایە ناکۆک بوون لەگەڵ شا ئەشرەف و رووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵی لەنێوان لایەنە پەیوەندیدارەکان سەری هەڵدا[١٠١].

## ٢- پەیوەندی موزەفەرەدین گۆکبری بە ئەیوبییەکان

### أ- پەیوەندی لەگەڵ سەلاحەدین ئەیوبی

پاش ئەوەی موجاهیدین قایماز، موزەفەرەدین گۆکبری لە هەولێر دەرکرد، ئەویش پەنای بۆ موسڵ برد و ئەتابیگەی موسڵ سەیفەدین غازی دەسەڵاتی شاری حەرانی پێ بەخشی. بۆ ماوەی (٢٠) ساڵ لەژێر فەرمانڕەوایی ئەو ئەتابیگە کاری کرد. دیارترین چالاکی سەربازی، کە میر موزەفەرەدین گۆکبری ئەنجامی دا و سەرچاوەکان باسیان لێوە کردبێ سەرکردایەتی سوپای موسڵ بوو لە دژی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی.

لەبەهاری ساڵی ٥٧١ک/١١٧٦ز هەردوو لا رووبەڕووی یەک بوونەوە. دەرئەنجام سەلاحەدین سەرکەوتنی بەدەست هێنا. سەلاحەدین کاروباری گەرمی جەنگی هەڵدەسووڕاند و نوشوستی بەسوپای موسڵ هێنا.

پاش تێپەڕبوونی حەوت ساڵ موزەفەرەدین گۆکبری هەڵوێستی خۆی گۆڕی، دوای ئەوەی بۆی روون بۆوە، کە ناتوانێ بە بەردەوامی سەر بە موسڵ بێ، چونکە ناحەزی پێشووی موجاهیدودین قایماز جێگری ئەتابیگ بوو لە موسڵ، ئەوە بووە هۆی ئەوەی، کە هەڵوێستی خۆی بگۆڕێ[١٠٢]. دواتر زانی هاوسەنگی هێز بەلای سوڵتان ئەیوبییە. هەر چۆنی بوو پشتی دایەوە گەورەکانی پێشووتری. لە فورات پەڕییەوە و پەیوەندی بە ریزەکانی سوپای سەلاحەدینەوە کرد، لەساڵی ٥٧٨ک/١١٨٢ز[١٠٣].

لەو رێکەوتەوە موزەفەرەدین گۆکبری دەستی کرد بە کار تێکردن لە سەلاحەدینی ئەیوبی، وای لێ کرد بەرنامەکە بگۆڕێت، کە پەیوەندیدار بوو بە هەڵوێستی هێزە ئیسلامییەکان، بۆ ئەوەی زیاتر لە شوێنەکانی تر بایەخ بە موسڵ بدات[١٠٤]. مێژوونووس محەمەد کوڕی تەقیەدین عومەر ئەیوبی، کە ئەوسا هاوڕێیەتی سەلاحەدین ئەیوبی دەکرد دەگێڕێتەوە کە چۆن دیمانە لە نێوان موزەفەرەدین گۆکبری و سوڵتان ئەیوبی روویدا و دەڵێت: کاتێ ئەو میرە گەیشت بەتەنیا لەگەڵ سوڵتان کۆبۆوەو، ئاماژە بە پەڕینەوەی فورات و دەستبەسەرداگرتنی ئەو میرنشینانەش دەدات و پێی راگەیاندووە لە ژێر فەرمانی ئەودا دەبێت بۆ وەشاندنی گورز لە شاری موسڵ، چونکە دەسەڵاتدارەکانی بەڵێن و پەیمانەکانیان شکاندووە. پێویستە دەست بەسەر ئەو میرنشینەدا بگرێت تاوەکو میرنشینەکانی دیکەی ناوچەکەش بێنە ژێر باڵ و دەست بەسەر فەرمانڕەوایی ئەوانیش دابگیرێت. سوڵتان بە سوپاسەوە دەستی پێکردو، متمانەی پێکرد. پاشان داوای لێ کرد بگەڕێتەوە حەران[١٠٥]. پاش چەند رۆژێکیش پاداشتی بەشاری رەها[١٠٦] دایەوە.

موسڵ بووە هۆی ئەوەی، کە موزەفەرەدین گۆکبری پێی سەرقاڵ بێ دووبارە هانی سەلاحەدین ئەیوبی دەدا و داوای لێ دەکرد، کە ئەو شارە وڵاتگیر بکات. نێردراوی ناردە حەلەب بۆ ئەوەی لەسەر زاری خۆی پێی رابگەیەنێت، کە ئامادەیە سوپای سوڵتان بەهۆی پێداویستییەکانەوە لە خەرجی ئامادەکردن وەربگرێت، لەگەڵ( ٥٠ ) هەزار دینار هەر لەگەڵ گەیشتنی بۆ حەران لە رێگایەوە بۆ موسڵ[١٠٧].

سەلاحەدینی ئەیوبی شاری حەلەبی جێهێشت و بەرەو حەران کەوتە رێ. لەگەڵ گەیشتنی بۆی دەرکەوت، کە موزەفەرەدین گۆکبری لەسەر ئەو پەیمانە نەماوە، کە نێردراوی پێی راگەیاندووە. لەوە سەری سوڕماو کەوتە گومان. گومانی ئەوەی برد یان گۆڕاوە، یاخود دووبارە بۆ لای گەورەکانی پێشووی ئەتابیگەی موسڵ گەڕاوەتەوە و دوژمنەکەی بەڕاستییەکەی خۆی پیشان نەداوە. سەلاحەدینی ئەیوبی ویستی تۆڵەی لێ بستێنێتەوە. کاتێ موزەفەرەدین گۆکبری بەوەی زانی بەپەلە خۆی گەیاندە سەلاحەدین و دەستی کرد بە سوێندخواردن و پێی راگەیاند نەگۆڕاوە، بەڵکو نێردراوەکەی کە بۆ حەلەبی ناردبوو، زانیاری پێ نەبووە[١٠٨].

جا بۆ ئەوەی موزەفەرەدین گۆکبری نیاز پاکی خۆی بە سوڵتان رابگەیەنێت گوتی: ئامادەم وەکو هەر پاشایەک خزمەتت بکەم[١٠٩]. بەڵام لەگەڵ ئەوەش سەلاحەدینی ئەیوبی لای خۆی باوەڕی پێ نەبوو. بۆ لەبەرچاوگرتن بۆ ئەوەی نیاز پاکییەکەی بۆ روون ببێتەوە دەستگیری کرد، راوێژی بە هاوڕێیەکانی کرد، کە چی باشە بیکەن، هەندێکی دی بە پێچەوانەی ئەوەوە ئاماژەیان دا. لەدوماهیدا بڕیار درا ئازاد بکرێت و هەر دوو قەڵاتی حەران و رەهای لێ وەربگیرێتەوە. پاشان لە ساڵی ٥٨١ک/١١٨٦ز هەردوو قەڵاتی ناوبراو بۆی گەڕایەوە[١١٠]. ئیبن ئەسیر وای لێک دەدایەوە هۆکاری ئازاد کردنەکەی ئەوە بوو سەلاحەدین لەوە ترسا، گەر سزای بدات خەڵکی ئەو ناوچانە لێی هەڵبگەڕێنەوە[١١١].

موزەفەرەدین گۆکبری لە دوا گەمارۆی موسڵدا بەشداری کرد، کە رێخۆشکەرێک بوو بۆ بەستنی هاوپەیمانییەتییەکی ئاشتی و کۆتایی بە گۆڕینی ئەتابیگەی موسڵ هێناو لە ساڵی ٥٨١ک/١١٨٦ز بوو بە میرنشینێکی سەر بە دەوڵەتی سەلاحەدینی ئەیوبی[١١٢]. سوڵتان، موزەفەرەدینی بەسەرکردەی سوپا دامەزراند، کە بەرەو قەڵات رۆیشت،

پاش ئەوەی شا ئەرمەن لە هەمان ساڵدا کۆچی دوایی کرد، بۆ ئەوەی ئەو میرنشینەش بخاتە سەر دەوڵەتی ئەیوبی، بەڵام لە ئاکامدا نوشوستی هێنا(١١٣).

سەرچاوە:

١- الكامل ١٢/٥٧
٢- برای مێژوونووسی ناسراو عیزەددین عەلی کوڕی ئەسیر لە ساڵی ٦٠٦ک-١٢١٠ز کۆچی دوایی کردووە... سەرنجی ژیاننامەی بدە لە (الكامل ١٢/٢٨٨) و(وفيات الاعيان ٣/٢٨٩-٢٩١)
٣- نصیبین/ شارێکی ئاوەدانە لە وڵاتی جەزیرە - معجم البلدان ٥/٢٨٨.
٤- الكامل ١٢/١٠٠- الروضتين ٢/٢٢٦. مرأة الزمان ٨/٤٣٥- النجوم الزاهرة ٦/١٣٣.
٥- الكامل ١٢/١٠٠.
٦- ن، م، ص: ١٠١- الروضتين ٢/٢٢٧.
٧- هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە- الباهر ١٨٥. مرأة الزمان ٨/٤٣٥ مخرج الكروب ٣/١٧-١٨.
٨- لەساڵی ٥٨٩ک-١١٩٣ز تاساڵی ٦٠٠ک/١٢٠٤ز شتێ دەربارەی مێژوو نازانرێ بەهۆی کەمتەرخەمی مێژوونووسەکان.
٩- ابن العبري، تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، مجلة ٤٨لسنة ١٩٥٤ ح (٤-٥) ص ٤٢٤ حەمیددەدین محەمەد (میرخوند)، روضة الصفا ٤/٥٩٨.
١٠- لەوانەیە بزاوتەکانی موزەفەرەدین گۆکبری بەپێی گوێدانی شا عادل ئەیوبی بوبێت. چونکە گۆکبری و هەروەها قوتبەدین محەمەد فەرمانڕەوای شەنگال سەربە ئەو بوون.
١١- بەلەد/ شارێکی کۆنە لەسەر رووباری دیجلە و کەوتۆتە سەرووی موسڵ و نێوان هەر دووکیان حەوت فەرسەخە.
١٢- الكامل ١٢/٢٨٤، ابن واصل، مخرج الكروب٣/١٩١- ابن العبري، تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق مجلد ٣٨ لسنة ١٩٥٤ ى ٤٣١
**The chronography,v.I, p.365.**
عیزەدین محەمەد بن ابراهيم ابن شداد، مخطوط (الاخلاق الخطير في امراز الشام والجزيرة) قسم الجزيرة، ورقة(٥١أ). تاريخ ابن الفرات مجلد ٥ جـ ١ ص ٨٨. مير خوند، روضة الصفا ٤/٥٩٨.
١٣- الكامل ن.ص. مخطوط (الاخلاق الخطير) ن، و.
١٤- الكامل ١١٢/٢٨٥- الباهر ١٩٧. ابن القديم: زبد الحلب ٣/١٦٠ مخطوط (الاخلاق الخطيرة) ن، و- مخرج الكروب ٣/١٩٣.
١٥- الكامل ن. ص ٢٨٥. الاخلاق الخطيرة-٥٢ب- ابن العبري تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق ن، م، ص.
١٦- الكامل ١٩٧-زبدة الحلب ٣/١٦٠.
١٧- موزەفەرەدین گۆکبری (رەبیعە خاتوونی) هێناوە، کە دەکاتە خوشکی سەلاحەدینی ئەیوبی و شا عادل ئەیوبی.
١٨- الكامل ١٢/٢٨٦-مخرج الكروب ٣/١٩٤- الاخلاق الخطيرة ن.و -ابن العبري. التاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق ن. ع. ص- ابن الفرات، مجلد٥، جـ١، ص ٩٠.
١٩- الكامل ن، ص.
٢٠- ن، م، ص.
٢١- ن، م، ص - مخرج الكروب-ن، ى- الاخلاق الخطيرة ن، ى- التاريخ الدول السرياني، ن. ع. ى- ابن القرات ن، م، ص.
٢٢- الكامل ١٢/٢٨٥.
٢٣- الكامل ن، ى. مخرج الكروب ٣/١٩٣- تاريخ ابن القرات مجلد٥ جـ١ص ٩٠.
٢٤- الكامل ن، ص. مخرج الكروب ٣/١٩٣-ابن شداد- مخطوط (الاخلاق الخطيرة) ورقة (٥٢أ) - ابن القرات ن.م.ى.
٢٥- الكامل ن. ص- الباهر ١٩٧.
٢٦- الكامل ١٢/٢٧٦- الباهر ن.ى- ابوشامة، زيل الروضتين ٦٧ مخرج الكروب ٣/١٩٧- مخطوط (الاخلاق الخطيرة) ن.و. تاريخ ابن الفرات ن.م.ص ٩٤.
٢٧- الكامل ١٢/٢٧٦- الباهر: و زدة الحلب ٣/١٦١. مخرج الكروب ان ص. الاخلاق الخطيرة: ورقة ٥٣أ. ابن الفرات: ن.م.ص.
٢٨- هەمان سەرچاوەو لاپەڕە- بڕوانە ابن خلكان ٤/٢٩٥- ابن العبي، تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق لسنة ١٩٥٤ص ٤٣١.
٢٩- عقر الحميدية ص هامش ١.
٣٠- شوش بڕوانە ص ٥٥هامش ١.
٣١- الكامل ١٢/٢٩٣- ابن خلكان ٤/٢٩٥- ابو القداز، المختصر ٣/١٢١ابن خلدون ٥/٥٩٦- ابن القرات، مجلدة جـ١ ص ٥٦.
٣٢- تەمەنی عیزەدین مەسعوود ٧ساڵان بوو کاتێ دەسەڵاتی پێ سپێردرا، چونکە لە ساڵی ٥٠٩ک-١١٩٣ز لە دایکبوو بوو بڕوانە: وفيات الاعيان ٤/٢٩٥.
٣٣- الكامل ١٢/٢٩٣.
٣٤- الكامل ١٢/٣٣٤ وفيات الاعيان ٤/٢٩٦ ط ١٩٣٨. ابو القدوء النختصرفي اخبار البشر ٣/١١٨. ابن القوطي، مجمع الاداب في معجم الالقاب حـ ٤ ق ٢ ص ٧٢٦- ئيبن خەلدون بەهەڵەدا چووە، کە تەمەنی ٢٠ساڵ نووسیوە و بڕوانە: العبري ٥/١٩٥.
٣٥- ئەبو شامە دەڵێت: شا قاهیر عیزەدین

مەسعوود بە ژاراوی بوون مرد، بڕوانە زیل الروضتین ص ١١٤ هەروەها الزهني في العبر ٥/٥٥- ئیبن خەلەکان دەڵێت: کتوپڕ مرد. بڕوانە وفيات الاعيان ٤/٢٩٥-مێژوونووس بلات ئیبن ئەسیر دەڵێت: بە هۆی (تا) وە مرد بڕوانە الكامل ١٢/٣٣٣.

٣٦- الكامل ١٢/٣٣٤-٣٣٥ ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ص ٢٣٢- ابن العبري، تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق للسنة٤٨ ١٩٥٤، ص ٤٣٦- ابن الفرات، مجلد جـ ١ص ٢٥٥.

٣٧- ابن العبري، تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق- نفس المجلة ص ٤٣٦- بڕوانە سعيد الديوجي، الموصل في العهد الاستابكي ص ٣٨.

٣٨- سبط ابن الجوزي- مرأة الزمان ٨/٦٠١.

٣٩- سەرچاوەکان هیچ شتێک دەربارەی ئەو ڕێککەوتنە باس ناکەن کە پێش پێکدادانی نێوان هەردوو لا مۆرکراوە.

٤٠- هەکاری- شارۆچکە و ناحیەو گوندە لەسەرووی موسڵ لە وڵاتی جەزیرەی ئیبن عومەر و کوردەکان تیایدا نیشتەجێن و پێی دەڵێن هەکاری- معجم البلدان ٥/٤٠٨.

٤١-الزوزان/ ناحیەکی بەرفراوانە لە جەزیرەی ئیبن عومەر و کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی دیجلە. زۆر قەڵاتی باشی تێدایەو هەر هەموویان کوردەکانی بەشتویە و بەختییەی تیایدا نیشتەجێن. معجم البلدان ٣/١٥٨.

٤٢- الكامل ١٢/٣٣٦- ابن العديم، زبدة الحلب ٣/١٨٧ مخرجة الكروب ٤/٢١ - ابن العبري، تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق- نفس المجلة ص ٤٣٦.
ابن الكلدون، كتاب العبر ٥/٥٩٧- الغساني. المسجد المسبوك ٢٢٢- بڕوانە سەعید پاشا دیاربەکری. مراه العبر(تركي) مجلد ٢ جـ ٨ ی ١٧٣.

٤٣- سەوادی محەمەد ڕوەیشدی لە کتێبەکەیدا (امارە الموصل فی العهد بدرالدين لوئلوئه) وای دەبینێت یەکێک لە هۆکاردکانی هاتنی بەدرەدین لوئلوئە بۆ بڵاوبوونەوەی شیعە لە موسل بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە تاوەکو خۆشەویستی خەلیفە ناسر لیدینیللا بۆ خۆی ڕاکێشێ و پشتیوانی بکا لەو ململانێیەی کە لەگەڵ پاشماوەی ئەتابیگەی موسڵدا هەیەتی. ص٣٩-٤٠.

٤٤- ضياءالدين ابن الاثير- رسائل ابن الاثير ص ٦١.

٤٥- الكامل ١٢/٣٣٧ - ابن العبري، مختصر تاريخ الدول ص ٢٣٢- ابو الفداء، المختصر في اختبار البشر ٣/١٢١- ابن شداد - مخطوط (الاغلاق الخطيرة) ورقة ٥٣ب- الدياربكري- مراة العبر مجلة ٢ ج ص٨١٧٣.

٤٦- الكامل ن، ص- مخرجة المكروب ٤/٢٢.

٤٧- حكم مابين ٥٩٧-٦٣٧ك/ ١٢٠٠- ١٢٤٠ز بڕوانە زامباور، معجم الاسرات ی ٣٤٤- مرأة الزمان ٨/ ٧٣٠.

٤٨- ماردین قەڵاتێکی بەناوبانگە لەسەر لوتکەی چیایەک لە جەزیرە - معجم البلدان ٥/٣٩.

٤٩- حكم بين ٥٩٧-٦١٩ك/ ١٢٠٠- ١٢٢٢ز بڕوانە زامباور، ن، م، ێ هەروەها ابن تغري بردي النجوم ١٦. ٢٥.

٥٠- ئامەد گەورەترین شاری دیاربەکرە، معجم البلدان ١/٥٦.

٥١- قەڵاتی کیفا. شارۆچکەو قەڵاتێکە کەوتۆتە سەر کەناری ڕووباری دیجلە و لەنێوان ئامەد و جەزیرەی ئیبن عومەرە، معجم البلدان٢/٢٦٥.

٥٢- الكامل ١٢/٣٣٨.

٥٣- ابن خلكان- وفيات الاعيان جـ٤ی١٧٣ و ٤١٣.

٥٤- الكامل ن، ص، مخرج الكروب ٤/٢٤.

٥٥- الكامل ن، ص، مخرج الكروب ٤/٢٥- ابن العبري تاريخ مختصر الدول ٢٣٣.

٥٦- الكامل ٢/٣٣٩ - مخرج الكروب ن، ص- ابن العبري تاريخ مختصر الدول ٢٣٢.

٥٧- الفرسخ/ پێوەرێکەو نزیکە لە نێوان سێ تا شەش میل.

٥٨- الكامل ١٢/٣٣٩. ابن العديم، زصدة الحلب ٣/١٨٧- مخرج الكروب٢٦١٤. ابن العيري، تاريخ مختصر الدول٢٣٢- تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق- نفس المجلة ص ٤٣٩.

٥٩- الكامل ١٢/ ٣٤٠-٣٤١- ابن العيري، نفس المصدرين والصحفتين تاريخ ابن الفرات، مجلة جـ١ص ٢٥٨ز

٦٠- الكامل ١٢/٣٤١- مخرج الكروب ٤/٢٨- ابن العبري، تاريخ الدول ٢٣٢- تاريخ ابن الفرات مجلة ٥جـ١ص ٢٥٩.

٦١- کواشی- قەڵاتێکی قایمە لە ناوچە شاخاوییەکانی ڕۆژهەڵاتی موسڵ.

٦٢- الكامل ن، ص- ابن خلدون، تاريخ العبر ٥/٥٩٩- الديار البكري-مرأة العبر مجلة٢ جـ٨ ص ١٧٣.

٦٣- الكامل ن، ص مخرج الكروب ٣٤١٤- ابن العبري، تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، نفس العدد ص ٤٣٩- ابن الخلدون ٥/ ٦٠٠.

٦٤- بطرس شعري، ذةخيرة الاذهان جـ٢ص ٥٤.

٦٥- المقريان/ لەبنەڕەتدا ئارامییەو بەمانای بە بەر دێت و مەبەست لەوە پلەدارییەکی کلیسایە لەنێوان بەتریک و ئەسقەق (سوادی الروشدی)، امارە الموصل ص ٤٥هامش ٢.

٦٦- بەرتلە، گوندێکی گەورەیە وەک شار وایە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی دیجلە. هەروەها ئێستا بە ڕەسمی پێی

دەوترێت حەمدانیە.

٦٧- سوادي الروشدي، امارة الموصل ص ٤٧.

٦٨- انظر ترجمة في: وفيات الاعيان ٢/٤١٧-٤١٨/ ط١٩٤٨-الذهبي- العبر ٤/١٦٣- ابن الوردي ٢/٩٢- ٩٤ ابن العماد الحنبلي - شذرات الذهب ٤/١٧٩-١٨٠.

٦٩- ابن خلكان ٢/٤١٨.

٧٠- الكامل ١٢/٣٤٢- مخرج الكروب ٤/٢٢، ابن خلدون ٥/٦٠١- الغساني، المسجد المسبوك٢٢٧.

٧١- الكامل ١٢/٣٤٢- مخرجة الكروب ٤/٧١.

٧٢- المقرزي، السلوك١/٢١٤، ذيل المرأة الزمان٢/٢٢٤-٢٢٩، ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي ٢/١٩٩-٢٠٠، ابن القوطي، نلقص مجمع الاداب ج٤ ق٢ ص ٦٧٢ ٦٧٤، الغريزي السلوك١/ .١٦٩ انظر الكامل ١٢/٣٢٥، الكامل ١٢/٣٤٢، مخرجة الكروب ٤/٧٠.

٧٣- الكامل ١٢/٣٤٢- مخرجة الكروب ٤/٧٠.

٧٤- الكامل ١٢/٣٤٣.

٧٥- ابن الاثير- الكامل، م الاستقامة، القاهرة ٩/٣٨٢.

٧٦- الكامل ١٢/٣٤٤ مخرجة الكروب ٤/٧٥- ابو العذاء، المختصر في اخبار البشر ٣/١٢٥- تاريخ ابن الوردي ٢/٢٠٠.

٧٧- السلاميە، پێشتر گوندێکی گەورە بوو لە دەوروبەری موسڵ بەلای ڕۆژهەڵاتی دیجلە. معجم البلدان ٣/ .٢٣٤

٧٨- الكامل ١٢/٣٤٥- مخرجة الكروب ٤/٧٥ ابن العبري، تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق، نفس العدد ص ٤٤٢- ابن الخلدون، تاريخ العبر ٥ /٦٠٣.

٧٩- چیای چور ١/وەکو کلاوێکی گەورەیەی بە دیاریەکراوە نووساوە- معجم البلدان ٢/١٠٢.

٨٠- الكامل ١٢/٣٤٥- مخرج الكروب ٤/٧٥.

٨١- الكامل ١٢/٤١١، مخرجة الكروب٤/١١٥، رشيدالدين فضل الله الهمداني- جامع التواريخ جلد١ ص ٣٩٧ بالفارسية.

٨٢- وفيات الاعيان ٤/٢٩٦ ط ١٩٤٨.

٨٣- مەبدەئی ڕاگواستنی عیمادەدین زەنگی بۆ شارەزوور نازانرێت، بەڵام ئەوەی دیارە لەساڵی ٦٢٢ک-١٢٢٥ز حکومڕانی ئەو وڵاتەی کردووە.

٨٤- وفيات الاعيان ٤/٢٩٤.

٨٥- مەراغە/ شارۆچکەیەکی گەورەو بەناوبانگە لە وڵاتی ئازربایجان - معجم البلدان ٥/٩٣.

٨٦- الكامل ١٢/٣٧٨- الذهبي، العبر في خبر من غبر ٥/٦٥. مخطوط تاريخ الاسلام الورقة ١٣٣. ابن كثير، البداية والنهاية ١٣/ ٩٠.

٨٧- ابن العبري، تاريخ المختصر الدول ٢٤٩. الحوادث الجامعة ص ٥٢.

٨٨- ابن العبري، تاريخ الدول السرياني، مجلة المشرق للسنة٤٩ ستة ٩٥٥، ص ٧٣٩.

٨٩- الذهبي، العبر ٥/١٢٣.

٩٠- ابو شامة، زيل الروضتين ى ١١٤.

٩١- ن.م، ص ١٤٢.

٩٢- مرأة الزمان ٨/٦٣٣.

٩٣- ابو شامة ص ١٤٢.

٩٤- العبر ٥/١٢٣.

٩٥- النجوم والزاهرة ٦/٢٥٧.

٩٦- شذرات الذهب ٥/٩٤.

٩٧- المختصر من اخبار البشر ٣/١٣١.

٩٨- تاريخ ابن الوردي ٢/٢٠٦.

٩٩- مخرجة الكروب ٤/١١٤.

١٠٠- البداية والنهاية ١٣/١٣٦.

١٠١- بروانه ص١٤٧.

١٠٢- ابن خلكان ٣/٢٩٣، ط ١٩٤٨.

١٠٣- ابن شداد، النوادر سلفانية ٥٧- مخرجة الكروب٢/١١٦، وفيات الاعيان ٤/٢٩٣، محمد كرد علي، خطط الشام ٢/٥٦.

١٠٤- محمد بن تقي الدين عمر الايوبي، مغمار الحقائق و-الخلائق- ص ١٠٥، الكامل ١١/٤٨٢ - زبدة الحلب ٣/٥٧-الروضتين ٢/٣.

١٠٥- الايوبي، مغمار الحقائق، ص ١٠٢-١٠٣.

١٠٦- ن.م. ص ١٠٥، الكامل ١١/٤٨٤، زبدة الحلب٣/٨٥. الروضتين ٢/٣٢، مخرجة الكروب ٢/١١٧- وفيات الاعيان ٤/٢٩٣. ط ١٩٤٨، ابن شداد، مخطوط (الاخلاق الخطيرة) ورقة ٢٩ ب محمد كرد عملي، خطط شام ٢/٥٦.

١٠٧- الكامل ١١/٥١١، الروضتين ٢/٦١، ابن خلدون ٥/٣٧٥.

١٠٨- الايوبي، مغمار الحقائق ٢١٢-٢١٣، زبدة الحلب ٣/ ٨٠- الروضتين ٢/٦١. ابن خلدون ٥/٣٧٥.

١٠٩- الايوبي ٢١٣.

١١٠- الايوبي، مغمار الحقائق٢١٢-٢١٣، الكامل ١١/٥١١- الروضتين ٢/٦٧. ابن خلدون ٥/٣٧٥- الذهبي مخطوط تاريخ الاسلام مجلة ١ ورقة٢.

١١١- الكامل ١١/ .٥١١ الغساني، المسجد المسبوك ص ٢٥.

١١٢- الايوبي، مغمار الحقائق٢١٣- الكامل ٥١٧، الروضتين ٢/ .٦٤ مخرجة الكروب ٢/١٧٢- وفيات الاعيان٤/٢٩٥ ط ١٩٤٨ ستيفن وينتمان، تاريخ الحروب الصليبية ج٢ص ١٧٢.

١١٣- مغمار الحقائق ٢١٨. الكامل ١١/٥١٤. مرأة الزمان ٨/٣٨٣ الروضتين ٢/٦٣- وفيات الاعيان ٤/ ٢٩٤ ط ١٩٤٨-ابن شداد، مخطوط الخطيرة ورقة ١٠٦، ابن العبري، تاريخ الدول الرياني، مجلة المشرق للسنة ٤٧ لسنة ١٩٥٣ ص٤٤١ الغساني، المسجد المسبوك ٢٥.

# ڕێکخستنەکانی ئیداری و دارایی و قەزایی لە میرنشینی هەولێردا

دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن

لە ماوەی پێش سەردەمی ئەتابیکی، کاتێک هەولێر بووە بنکەیەک لە میرنشینی هەزبانییەکان و کاتێکیش بوو بە بەشێک لە دەوڵەتی سەلجووقی[1] لە ڕووی خۆ ڕێکخستنەوە بێبەش نەبووە، هەرچەندە ئەو دەوڵەتە لەڕووی هەڵسووڕاندنی کاروباری خۆی شێوازی لامەرکەزییەتی گرتبووە بەر. بەڵام ئەوسا دیاردەی ڕێکخستنەکانی ناوخۆیی(هەرێمی) کارێکی سروشتی بوو.

لە ماوەی پێش ساڵی ٥١٥ک/ ١١٢١ز لە هەولێر پۆستی وەزاری دەرکەوتن ئەوساڵەی کە عەمید فەخر ئەبو ئیسماعیل حوسێن کوڕی عەلی ناسراو بە تەغرایی[2]، کە پۆستی وەزارەتی هەولێری پێ سپێردرابوو کوژرا. ئەمەش ئیبن مستەوفی باسی لێوە دەکات[3]. هەر لەوماوەیەدا پلەی وەزیفی ڕاوەرگرتن دەرکەوت، هەروەک ئیبن شیعار دەڵێت: باپیری ئەبی بەرەکات ئەلمویاردک کوڕی مستەوفی گوازرایەوە بۆ هەولێر و لە ماوەی دەسەڵاتی میر ئەبی هیجا هەزبانی کوردی هەولێری[4] پلەی وەزیفی ڕاوەرگرتنی پێ سپێردرا. هەروەها پلەی وەزیفی ژمێریاریش دەرکەوت. ئیبن موحتەسەب، کە لە ماوەی موزەفەرەدین گۆگبری لە هەولێر لە دایک بووە و ژیاوە، باوکی و باپیری و براکانی و ژمارەیەک لە ئەندامانی خانەوادەکەی کاریان ژمێریاری بووە[5].

ئەگەری ئەوەش لە ئارادایە هەر لەو ماوەیەدا ڕێکخستنی دیکەش هاتبنە کایەوە، وەک قەزا کە هەرگیز هیچ میرنشینێک یان شارێکی ئیسلامی بێ ڕاپەڕاندنی کاروباری قەزایی نەبووە. لەوانەیە دیوانی دامەزراندن و دیوانی دیکەش هەر لەو ماوەیەدا دەرکەوتبن، ئەمەو ئەو ڕێکخستنانە لە سەردەمی ئەتابیکی بەردەوام بوون، بەو گوزارشتەی کە لە سەردەمی سەلجووقییەکان ئاوها بەردەوامبوونی لە ڕووی ڕێکخستنەوە بە خۆیەوە نەبینیوە[6].

بێگومان ئەمەش وامان لێدەکات ئاماژە بە مەسەلەیەکی زیندوو بدەین لە کاتێکدا ئێمە بەدوای ڕێکخستنەکاندا دەگەڕێین. جا ئەگەر باس لە هەندێ لەو ڕێکخستنانەی میرنشینی هەولێری ئەتابیکی نەکەین، ئەوا ئەوە ناگەیەنێت، کەوا ڕێکخستنیان نەبووە، بەڵکو ئەگەری ئەوە لە ئارادایە مێژوونووسەکان کەمتەرخەمییان کردبێ لە ناو هێنانیان لە کاتێکدا کە ئەوان سەرقاڵ بوون چرییان خستبووە سەر ڕووداوەکانی جەنگ و سیاسەت بۆ

نووسینەوەی مێژوو. یان لەوانەیە هەندێ لەو ڕێکخستنانە لە پێکهاتنی سەرەتایی بێن و شیاوی ئەوە نەبووە باسیان لێوە بکرێت. وێڕای ئەوە زۆر لە مێژوو نووسەکان هەواڵ و بەسەرهاتی ئەو میرنشینەیان نووسیوە و هاوچەرخی ڕووداوەکان نین تەنیا کەمێکیان نەبن، بۆیە زۆر ئەگەری ئەوە هەیە لە تۆمارکردنی ڕێکخستنەکانیان کەمتەرخەم بووبن، نەک هەر لەوە، بەڵکو لە هەندێ ڕووداوی سیاسیشدا.

بۆیە دەڵێین، نەبوونی نووسەری تایبەت کە بگەڕێت بە دوای سروشتی ڕێکخستنەکانی ئەو میرنشینە، وامان لێدەکات بە شێوەیەکی گشتی باس لەو ڕێکخستنانە بکەین. پاشان تیشک بخەینە سەر ژیاننامەی ئەو کەسانەی هەڵسووڕاندنی کاروباری ئەو میرنشینەیان پێ سپێردرابوو. جا بۆ هەڵوەستەکردن لەسەر شێوازی فەرمانڕەوایەتی ڕێکخستنەکانی ئەو میرنشینە، ئەوا پێویستە لە سەرکردایەتی میرنشین، واتە لە میری ئەتابیک دەست پێ بکەین، بۆ ئەوەی ئاشنا بین بە پلەو پایە و دەسەڵاتەکەی بە هەڵسووڕاندنی کاروباری فەرمانڕەواییدا.

### ١- میری هەولێر و دەسەڵاتەکەی

فەرمانڕەوای هەولێر لەسەرڕووی ئەو میرنشینانەوە دێت، کە خاوەنی دەسەڵاتی ڕەهاو بەرفراوانی هەبووە. بۆی هەبوو سەرپەرشتی کاروباری جۆربەجۆرەکانی وەک سەربازی و سیاسی و ئیداری... تاد بکات تاکە دەسەڵاتی باڵا بووە جاڕدانی جەنگ و وەستاندنی و، سەرکردایەتیکردنی سوپای میرنشین و مۆرکردنی پرۆتۆکۆڵەکان لەگەڵ هێزەکانی دیکە و ئاراستەکردنی سیاسەتی میرنشین. بۆ ئەو مەبەستەش دەستەیەک لە کارمەندان هاریکارییان کردووە. ئەو میرنشینە دراوێکی تایبەت بەخۆی هەبووە، کە لە سەردەمی موزەفەرەدین گۆکبری دەست پێدەکات و بەناوی ئەو لێدەدرا، وێڕای ئەوە ناوی خەلیفە یان سوڵتان یان پاشا لە پاڵ ناوی ئەو دەنووسرا. هەروەها باڵا دەست بووە لەو وتارانەی لە مزگەوتەکانی میرنشین دەخوێندرانەوە.

بێگومان ئەمەش دەلالەت لە سەر بەرفراوانی دەسەڵاتی میر موزەفەرەدین گۆکبری دەکات و تەواوی دەسەڵاتەکان لە ژێر کۆنترۆڵی ئەو بووە، ئەوانەی کاری سەرپەرشتیاریان لە دامودەزگاکان لە دەست بووە تەنیا کارمەند و فەرمانبەر بوونە و هەر کاتێ ویستبێتی لایان بدات لایداون. بەڵکو لەوانە زۆری کردوون بە پەند بۆ کەسانی دیکە لە پێناوی جۆراوجۆر بە دەست بەسەرداگرتنی سەروەت و سامانیان و دەستگیرکردنیان و ئەشکەنجەدانیان، وێڕای ئەوە تیایاندا هەبووە لە زیندان مردوون. بەڵام ئەوانەی کاریان لەگەڵدا کردووە و بەسەلامەتی دەرچوون و سزا نەدراون بە ژمارە کەم بوونە[٧]. ئەو پێناوەی گیرابووە بەر بوو بە نەریتێکی ئەو میرە، هەرچەندە زۆر کاری خێرخوازیشی دەکرد[٨].

لە ڕاستیدا ئاماژەدەرێک نییە، کە میر جێگیری هەبووبێت، ناشزانرێت ئەو کاتانەی، کە موزەفەرەدین گۆکبری لە هەولێر نەبووە کێ بە ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی میرنشین هەڵساوە، یاخود کێ سەرکردایەتی هەڵمەتەکانی سەربازی کردووە. لە کاتێکدا دەبینین سەرفەتکین زەینی جێگری دامەزرێنەری ئەتابیکی هەولێر یاریدەدەرێکی بۆ خۆی دانابوو، کاتێ لە هەولێر دەردەچوو یا بەجێی دەهێشت، جێگەی ئەوی دەگرتەوە[٩].

### ٢- وەزارەت

هەروەکو باسمان کرد وەزارەت بەر لە سەردەمی ئەتابیکی لە هەولێر هەبووە، واتە لە سەردەمی میرنشینی هەزبانییەکان. لەم بارەوە ئیبن خەلەکان لە ئیبن مستەوفی دەگوازێتەوە و دەڵێت: عەمید فەخر ئەبا ئیسماعیل حوسێن کوڕی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولڕەحمان ناوبانگی بە موئەیەدەدین ئەسبەهانی دەرکردبوو و ناسراو بە تەغرائی، بۆ ماوەیەک لە هەولێر پۆستی وەزارەتی پێ سپێردراوە[١٠]. هەروەک زانراویشە تەغرائی لە سنووری ساڵی ٥١٥ک / ١١٢١ز کوژراوە[١١]. واتە لە سەردەمی ئەبی هیجای هەزبانی وەزارەتی هەولێری پێ سپێردراوە، کە ئەبی هیجا تا دوایی ساڵی ٥٢٠ک / ١١٢٦ز فەرمانڕەوایی کردووە[١٢]. بەڵام سەرنج دەدەین ئەو پۆستەیە دوایی بوونی نەما، واتە لە سەردەمی ئەتابیکی بە ماوەیەک لە پێش حوکمڕانی موزەفەرەدین گۆکبریدا.

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە ئەو پۆستە وەزارییە لە سەردەمی ئەتابیکەکان، لە سەردەمی میر موزەفەرەدین گۆکبری بۆمان هاتووە، کە لە سەردەمی ئەودا میرنشینێ بەرەو پێشچوونێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی و تارادەیەک کاروبارەکان ئالۆزی تێ کەوت و لەتوانای ئەو میرەدا نەما، بەتەنیا کاروبارەکان هەڵسووڕێنێ. بۆیە بوو بە زەروورەت و پێویست وەک ئەو جۆرە پۆستانە بدۆزێتەوەو دابینێت، بۆ ئەوەی بارگرانی لەسەر خۆی سووک بکات و هەندێ لە کارەکانی هەڵسووڕاندنی میرنشین بەو کەسە بسپێرێ، کە ئەو پۆستەی پێ دەدرێت. وەک یاریدەدەرێکی میر لە هەڵسووڕاندنی کاروبار ئاراستە کردنی سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەی میرنشین، هەر وەک لە دەوڵەتی سەلجوقی پەیڕەو دەکرا[١٣]. ئەوسا وەزیر سەرۆکایەتی دامودەزگاکانی دەکردو، چاودێری چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کاروبارەکانی دەزگای فەرمانڕەوایشی دەکرد. هەروەها دیوانی راوەرگرتن و دیوانی دامەزراندن و.... هی دیکە ملکەچ بوون بۆی. بێگومان ئەوەش وای کرد پۆستی وەزیرایەتی ببێت بەیەکێ لە پۆستە گەورەیان و کێبرکێیەکی توندی لەسەر بێت و لەهەمان کاتدا پیلانگێڕیش زۆر بوون لە دەوری ئەو کەسانەی، کە بەکارەکە هەڵدەستن[١٤]. لەبەر ئەوەی ئەو پۆستە زۆر هەستیار بوو، دەبوا ئەو کەسەی ئەو پۆستە بالآیەی پێ دەسپێردرێت کارامە بێ و کۆمەڵێ سیفاتی تێدا بەدی بکرێت[١٥]. بۆیە ئەو کەسانە هەڵدەبژێران، کە ناسراو بوون بە رۆشنبیرییان، خووڕەوشت بەرزییان، ئەوانەی شارەزاییان لە یاساکان و رەوتی پاشایەتی هەبوو[١٦]، بەپیاوماقووڵی و ئایین پەروەرییەوە ناسراو بوون[١٧]. بەڵام نازانرێ تا چ ئەندازەیەک ئەو سیفاتانە لەسەر وەزیرەکانی هەولێر جێبەجێ بوون. چونکە دەقی تایبەت بە پلەو پایەو ئاستی رۆشنبیرییان لەبەر دەستدا نییە تەنیا مویارەکی ئیبن مستەوفی نەبێت لەدوا رۆژەکانی ئەو میرنشینە پۆستی وەزارەتی پێ سپێردرا.

هەروەها ئەوەش نازانرێ وەزیری هەولێر تا چەند دەسەڵاتی هەبووە. یاخود جۆری کارەکەی نەزانراوە، کە پێی هەڵساوە، بەوەی کە ئایا بە کردەکی مافی سەرپەرشتی هەبووە لەسەر دامودەزگاکان یان نا. بەڵگەی ئەوە لەبەر دەستدایە، کە موزەفەرەدین گۆکبری ماوەی بە هیچ کەسێک نەداوە کە لە دەسەڵاتەکەی ئەو بەشداربێ و بەڵکو لە زۆری کەسایەتییەکانیش تووڕە بووە. بۆیە بە دوور دەزانرێ وەزیرەکانی هەولێر تەنیا گەورە کاربەدەست بوونە و بەس، نەک بەشدارییان کردبێ لە فەرمانڕەوایی ئەو میرەدا، یاخود یاریدەدەری بووبن لە هەڵسووڕاندنی کاروباری میرنشین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە وەزارەتی هەولێر تەنیا جۆرێک بووە لە وەزارەتی جێبەجێ کردن[١٨]. واتە دەسەڵاتەکەی دیاریکراو بووە. بەڵام بارەگای وەزارەت و دامودەزگاکانی دیکە لە قەڵات بووە. ئیبن شعار لە ئیبن مستەوفی مێژوونووسی هەولێر دەگوازێتەوە کە هیبەتوڵڵا کوڕی ئەبی حەسەن میسری دەمنهوری، کە دیوانی بەرزکردنەوەی تایبەت بە هەولێری پێ سپێردرابوو - بوو بوو بە سەرپەرشتیاری دیوان لە قەڵات[١٩].

وادیارە بەپێی ئەو ئاماژەدەرانەی لەبەر دەستماندا هەن مەحمود کوڕی محەمەد کوڕی میقداد کوڕی فارس حەرانی، کە لە حەران هاوڕێیەتی موزەفەرەدینی کرد[٢٠]. بەیەکەم وەزیری هەولێر دادەنرێت کە بەپۆستی وەزیر دامەزرابێت. هەروەها کوڕەکەشی ئەبا عەبدوڵا محەمەد کە لە ساڵی ٦١٢ک/١٢١٥ز کۆچی دوایی کردووە دامەزراند بە هەڵسووڕێنەری دیوانی مەزالم دامەزراند[٢١]. بەڵام دووەم وەزیر ئەبو حەسەن عەلی کوڕی شەماس کوڕی هیبەتوڵڵا هەولێری بوو[٢٢]، کە لە نزیکەی ساڵی ٦٢٣ک/١٢٢٦ز پۆستەکەی پێ سپێردراوە.

لەلایەکی دیکە وەزیر شەرەفەدین ئیبراهیم، تاجەدین عەبدولعەزیز لە وەزارەتی هەولێر جێگیربوو. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت لەو میرنشینەدا جێگری وەزیریش هەبووە. موزەفەرەدین کەوکەبەری ئەو جێگرەی وەک نێردراو چەند جارێک بۆ بەغدای ناردووە. بونینی وەسفی ئەو جێگرە دەکات و دەڵێت: (سەرۆکێکی رەوشت بەرز و دەست پاک و رابردووی باشی هەبوو لە پۆستەکەی، زۆر لەسەرخۆ و نەرم و نیان بوو لە هەڵسوکەوت و مامەڵەکردنی)[٢٤]. وەزیر شەرەفەدین لەگەڵ کوڕەکەی

تاجەدین تا کۆتایی ساڵی ٦٢٨ک/١٢٣١ز هەر لە پۆستەکانیان مانەوە. پاشان ساحێبی هەولێر دەستگیری کردن[٢٥]. دوا کەسیش کەوا پۆستی وەزاری لەو میرنشینە پێ سپێردرا بێ ئەبو بەرەکات ئەلموبارەک ئیبن مستەوفی بووە. موزەفەرەددین کەوکەبەری پاش ئەوەی وەزیری پێشووی دەستگیرکرد، ئەبو موبارەکی ئازاد کردو دەسەڵاتی وەزارەتی پێبەخشی. هەر چەندە ئیبن مستەوفی بەو کارە تازەیە رازی نەبوو، هەر وەک ئیبن شعاری باسی لێوە دەکات کە قوتابی ئەو بووە[٢٦]. خەڵک زۆر دڵخۆش بوون بەوەی کە دووبارە گەڕایەوە بۆ دەسەڵات. بەڵام سەردەمی ئەو درێژ خایەن نەبوو، ساحێبی هەولێر لە ساڵی ٦٣٠ک/١٢٣٣ز کۆچی دوایی کردو ئیبن مستەوفیش رەتی کردەوە کە بەردەوام بێ لەو پۆستەی، هەر چەند میر بانکین کوری عەبدوڵای رۆمی[٢٧] زۆر پێداگرتنی لەسەر کرد، بەڵام ئەو هەر رازی نەبوو. میر بانکین خەلیفە موستەنسیر بە حاکمی هەولێری دامەزراند پاش ئەوەی لەلایەن سەربازانیەوە دەستی بەسەردا گیراو خرایە پاڵ میرنشینی بەغدا.

### ٣- پاسەوانی (دەرگاوانی):

پاسەوانی یەکێکە لەو کارانەی لەسەردەمی ئەتابیکی لە هەولێر پەیدا بوو، کاری پاسەوان پاراستنی دەرگای میر یان حاکم بووە، ئەو ماوەی بە خەڵک دەدا کە بچنە ژوورەوە بۆ لای[٢٨]. واتە کاریان داخستنی دەرگا بووە لە دوای ئەوان و کردنەوەشی بوو لەکاتی دیاریکراودا هەروەک ئیبن خەلدون باسی لێوە دەکات[٢٩]. ئەوەش لەترسی ئەوە بوو نەوەک دەستی خراپەکاری بگاتێ. هەروەک دەستی خراپە گەیشتە هەندێ لە خەلیفەکان و سوڵتانەکان.

لەلایەکی دیکە پاسەوان وەک ئەڵقەی گەیشتن وابوو لەنێوان میر و وەزیردا، جا گەر فەرمانی زارەکی لەمیر وەرگرتبا ئەویش دەیگەیاندە وەزیر[٣٠] و، لەسەر ئەویش پێویست بوو جێبەجێی بکات. هەندێ جاریش پاسەوان هەڵساوە بە رۆڵی باڵیۆز لەنێوان وڵاتەکەی و وڵاتێکی تردا لەرێگەی گەیاندنەکان کە ئەوسا کار راپەڕاندنی پێ ئەنجام دەدرا لەگەڵ دەرەوەدا[٣١].

نازانرێ سەردتای سەرهەڵدانی پاسەوانی لە هەولێر کەی بووە. تەنیا ئەوەندە نەبێت کە یەکەم دەق گەیشتبێتە دەستمان و پەیوەندار بێ بەوە، پاسەوان لە سەردەمی موزەفەرەددین کەوکەبەری دەرکەوتووە. ئیبن شەداد دەڵێت: شوجاعەدین هەولێری پاسەوانی ئەو میرە بووە، لەساڵی ٥٩٨ک/١٢٠١ز ناردوویەتی بۆ دیمەشق بە بری سێ هەزار دینار بۆ ئەوەی خەرجی بکات لە تەواو کردنی مزگەوتێک کە لە سەر چیای قاسیون دروست کرابوو[٣٢].

هەروەها ئەبو عەباس سەلاحەدین ئەحمەد کوری عەبد سەید کوری شەعبان کوری محەمەد کوری جابر هەولێری ئەویش لە هەولێر پاسەوانیەتی کردووە، هەر وەک ئیبن خەلەکان دەڵێت[٣٣] هەروەها ناوبراو دەڵێت ئەبو عەباس بۆ ماوەیەک لە سوپای هەولێر خزمەتی کردووە[٣٤]. دوای ئەوە بووە بە پاسەوانی میری وڵاتەکەی[٣٥]. پاشان موزەفەرەدین کەوکەبەری دەستگیری دەکات و دواتر لە ساڵی ٦٠٣ک/ ١٢٠٦ز ئازادی دەکات، ئەو شارە جێدەهێڵێ و بەرەو وڵاتی شام دەڕوا. بەڵام نازانرێ لەدوای ئەو پاسەوانە کێ پاسەوانیەتی ساحێبی هەلێری گرتۆتە دەست.

### ٤- دیوانی نووسینگە:

هەروەها دیوانی نامەکان یان نووسینگەشی پێدەوترێت[٣٧]. بەڵام ئەوەی کارەکەی پێ دەسپێدرا پێی دەوترا ساحێبی دیوان یان دەزگا یاخود نووسینگەی نهێنی[٣٨]. ئیش و کار راپەڕاندنەکەی بریتی بوو لە نووسین و بەدواداچوونی نامەکان و ئەو فەرمانە ردسمیانەی کە لە دیوانی پاشا وەڵام دەدرانەوە.

جا چ بە دەستنووسی خۆی یاخود بە دەستنووسی نووسەرانی دیوان بوایە[٣٩] کە ساحێبی دیوان متمانەی پێ هەبوون[٤٠].

بە تێروانین لەو گەورەیی پلەو پایەی دیوان هەروەک ئیبن خەلدون باسی لێوە دەکات و دەڵێت: ساحێبی دیوان ئەو کەسانەی کە جوامێر و لە سەرخۆ و هێمن بوون ئاستی زانستی و هونەریان زۆر بەرز بوو زمانزانی چاک بوون بۆ دیوان هەڵی دەبژاردن[٤١]. بە زۆری سەرۆکی دیوان یان یاریدەدەر دەڕۆیشتن بۆ لایەنەکان و باڵیۆزخانەکان و نامەشیان لا بووە، یاخود نوێنەرەکانیان بەکار

راپەڕاندنی ئەهێنی و سیاسی هەڵساون[٤٢]. دیوان دارشتن لە دەوڵەتی سەلجووقی پێی دەوترا دیوانی تەغرا[٤٣]. بەزۆری وا رێککەوتووە پەیوەندی نێوان دیوانەکان پتەو بووە.

سەرچاوەکان هیچ هەواڵی ئەوەمان پێڕانەگەیەنن کە کێ کاری دیوان دارشتنی پێ سپێردراوە هەر لە سەرەتایی دامەزراندنی میرنشینی بەکتیکی لە هەولێر. بەڵام لەگەڵ ئەوە پێدەچێ ئەبو حەفس غەرسەدین عومەر شەماس کوڕی هیبەتوڵا هەولێری یەکەم نووسەر بووبێ کە ئەرکی ئەو دیوانەی پێ سپێردرابێ. چونکە هەر لە زووەوە مردووە بەرواری مردنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٦٠٠ ک / ١٢٠٢ز[٤٤]. ئیبن قوتیش لە ئیبن مستەوفی بۆمان دەگوازێتەوە و دەڵێت: ئەبو حەفس غەرسەدین هاوڕێیەتی میر موجاهیدودین قایمازی کرد کاتێ هەولێری جێهێشت و گەڕایەوە بۆ موسڵ[٤٥]. لە ساڵی ٥٧١ ک / ١١٧٥ ز. بێگومان ئەو نووسەرە برای وەزیری هەولێر عەلی کوڕی شەماس کوڕی هیبەتوڵا هەولێری بووە.

هەر لەوانەی دیوانی نووسینگەیان، پێ سپێردراوە ئەبو حوسێن موسا کوڕی حوسێن موسای نووسەرە، کە بەوە ناسراوە هەر خەریکی زانستی نەحو(قەواعید) و هۆنینەوەی شیعر بووە. لەوانەیە پێسپاردنی ئەو پلەو پایە بە ئەو دوای ئەوە بێت کە نووسەری پێشوو غەرسەدین عومەر هەولێری جێهێشت. وا دیارە ئەبو حەسەن موسا لەو پۆستە مابێتەوە تا لە ساڵی ٦١٧ک/ ١١٢٠ز کۆچی دوایی کردووە[٤٦]. هەروەها ئیبن شعاریش دەڵێت: ئیبن مستەوفی موبارەک یەکێک بووە لەو کەسانەی ئەو پۆستەی پێ سپێردراوە[٤٧].

بەڵام گەورەترین کەسی کە ئەو پۆستەی لە دەوڵەتی موزەفەرەدین کەوکەبەری پێ سپێردراوە ئەبو مەجد بووە[٤٨]. واتە مەجدەدین ئەسعەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی حەسەن کوڕی عەلی شەیبانی شەشایی هەولێری یە. هەر لە هەرەتی لاوییەوە هەولێری جێهێشت و لە وڵاتی جەزیرە و شامیە دەگەڕا. پاشان لە ساڵی ٦١٥ک / ١٢١٨ز گەڕایەوە هەولێر بۆ ئەوەی سەرپەرشتیاری دیوانی نووسینگە بکات[٤٩]. پلەوپایەکەش بەرزتر بووە[٥٠]. بوو بە یەکێ لە هەرە نزیکەکانی موزەفەرەدین گۆکبری و لە ساڵی ٦٢٨ک/ ١٢٣٠ز هاوڕێتی کرد لە میانەی سەردانەکەی بۆ بەغدا[٥١]. تا ساڵی ٦٢٩ک/ ١٢٣١ز بەردەوام بوو لە سەر کارەکەی. کاتێ ساحێبی هەولێر لێی بەرق داچوو لە دیوان دەری کرد و پاشان دەستگیری کرد و دووری خستەوە و ناردنی بۆ زیندانی کەرخینی(کەرکووک) کە یەکێک بوو لە کاردکانی میرنشینی هەولێر، هەر لە زیندان مایەوە تا موزەفەرەدین کۆچی دوایی کرد و هێزەکانی خەلیفەی موستەتیر هەولێریان داگیرکرد و زیندانەکانیان ئازاد کرد کە یەکێک لەوانە مەجدەدین بوو و گەڕایەوە بۆ بەغدا و لەوێ زۆر لە پۆستەکانی وەرگرت[٥٢]. لە کۆتایی ساڵی ٦٥٧ ک/١٢٥٩ز کۆچی دوایی کرد[٥٣].

دوا کەسێ کە پۆستی ئەو دیوانەی لە هەولێر پێ سپێردرابێ ئەبو عەبدوڵا محەممەد کوڕی جەعفەر کوڕی محەمەدی کوڕی مەحمود کوڕی هەیبەتوڵا کوڕی قازی هەولێری ئەبی محەممەد کەخەرعزی هەولێری بووە. موزەفەرەدین کەوکەبەری دوای ئەوەی ساحێبی دیوانی پێشووی دەستگیر کرد، ئەو پۆستەی بەو سپارد[٥٤].

## ٥- فەرمانی تەغرا (هەڵگری خۆرەکانی پاشایەتی).

ئەو پۆستە لەو سەردەمەدا دەرکەوت و راسپێراوەکەی هەڵدەستا بە لێدانی مۆری هەڵکەندراو لەسەر ئەو نووسراوانەی کە بە میرنشین دەردەچوون[٥٥]، هەروەها لە سەر دراویش دەدرا[٥٦]. هەڵبەتە ئەو کارە بە کەسێک دەسپێردرا کە چەند سیفاتێکی تیادا بووایە لەوانە هەڵسووڕاندنی کاروبارەکان بە باشی، خاوەنی راو کەسایەتی خۆی بوایە، رۆشنبیر و دانا و ژیربوایە[٥٧]. بەندراوی لەو بارەیەوە دەڵێت: ئەو پۆستە لە دوای وەزارەت لە هەموویان گرنگتر بووە تەنیا لە پۆستی راوەرگرتن نەبێت[٥٨].

دەشێ بڵێین ئەو کارە تەواوکردنی کاری دیواننامە بووە[٥٩]. راسپێردراوی دیواننامە سەرپەرشتی لەسەر نووسراو و پێشوازیکردنی نووسراوەکانی پاشایەتی بووە، بەڵام تەغرایی هەڵدەستا بە مۆرکردنی ئەو فەرمانانەی لە میرەوە دەردەچوون بە

نەخشێكی تایبەت[٦٠].

ئەبو فازل هاشم كوڕی عەبدولسەلام كوڕی یوسف كوڕی عەمر كوڕی مەندو هەولێری ئەو پۆستەی لە هەولێر پێ سپێردراوە، بەڵام بەرواری پێسپاردنەكەی نەزانراوە، بەڵام پێدەچێ كە دواكاتەكان بووبێ، چونكە ساڵی لە دایكبوونی دەگەڕێتەوە بۆ ٥٨٣ك/١١٨٧ز[٦١]. هەروەها ئەوەش نازانرێ كێ لە پێش ئەو ئەو پۆستەی وەرگرتووە. تەنیا ئەوە نەبێت ئەو فازل تا كۆتایی هاتنی بەو میرنشینە لەسەر كارەكەی ماوەتەوە.

### ٦- پۆستی هەڵسووڕاندنی ئیداری

كاری ئەو پۆستە سەرپەرشتیكردن بووە لە سەر هەڵسووڕاندنی كاروباری وڵات و خانەوادەی میر. واتە كاری سەرەكی ئەو پۆستە بەڕێوەبردنی كاروباری چێشتخانەكان و ساردەمەنییەكان و، سەرپەرشتی كردنی دارو دەستە و لاوەكان بووە[٦٢]. هەروەها ئەو خواردنەی بۆ میر ئامادە دەكرا لە پێشا دەیچەشت(تامی دەكرد) نەوەك ژەهركراو بوایە[٦٣]. وێڕای ئەوە هەڵسووڕێنەری ئیداری دەسەڵاتی هێنانی سەرجەم ئەو پێداویستییانەی هەبوو لە خەرجیات و پۆشاك بۆ خانەوادەی میر[٦٤].

محەممەد كوڕی ئیستبقان كوڕی عەبدوڵا یەكێك بووە لەوانەی كە پۆستی هەڵسووڕانی ئیداری ساحێبی هەولێری پی سپێردراوە. بەپێی ئەوەی ئیبن شەعار لە ئیبن مستەوفی گواستیتەوە[٦٥].

### ٧- وەرگرتن و كۆكردنەوە

یەكێك لە پۆستە سەرەكییەكان و چاوی لە ئیداری كاروباری دەوڵەت بوو لە رووی دا راییەوە لە بەرزەفت و نووسین و زانینی رێساكانی دارایی و چۆنیەتی خەرجكردنی[٦٦]. لەم بارەوە ئیبن مەماتی كە لە ساڵی ٦٠٦ك/١٢٠٩ز كۆچی دوایی كردووە باس لە ئەركەكانی ماف وەرگر دەكات بەشتی لە پەلوپۆو وردەكارییەكان و دەڵێت: ماف وەرگر داوای لە كارگوزاران دەكرد كە ئەوەی لە سەریان پێویستە بیدەن لە كاتی خۆی بەرزی بكەنەوە. لە هەمان كاتدا هۆشداریشی دەدانێ كە پێویستە لە كاتی دیاریكراوی خۆی ئەوەی لە سەریانە لە پارەوپولەكانیان دەركەن. ماف وەرگر لەسەر لیستی داواكراوەكان كاری دەكرد. جار گەر بۆی دەركەوتبایە كە ئاگای لە شتێ نییە یان حسێبەكە بەرز نەكراوەتەوە، یاخود ئەوەی پێویستە بۆ دواجار پێشكەش بكرێت نەكرایە، یاخود لە بیركرایە كە پێویستە لێی دەركرێت، ئەوا لەسەری پێویست بوو بەم كارانەی ئاگادار بوایە[٦٧]. هەروەها ماف وەرگر بەرپرس بوو لە چاودێریكردنی حیساباتی دەوڵەت و نووسینی كەشفەكان بە دەستنووسی خۆیی و هەڵوەشاندنەوەی نووسراوەكان[٦٨]. هەروەها لەسەری پێویست بوو بە گەڕانی پشكنین هەڵبستێ بە مەبەستی بەسەركردنەوەی كاروباری حیساباتی دەوڵەت و[٦٩] كۆكردنەوەی داهاتەكان لە سەرچاوەكان و پاڵشتی دەرامەت و ئاژەڵ بە پۆلینكراوی جۆراوجۆر و هاوسەنگ و پێوانەیی و.... شتی تر[٧٠]. بۆیە گرینگی ئەو پۆستە لە دوای پۆستی وەزارەت دێت[٧١].

هەروەها پێویست بوو ژمارەیەك سیفەت لەو كەسە بێتەدی كە ئەو پۆستەی پێ دەسپێردرێت، ئەویش لەبەر پڕ بایەخی و گرینگی پۆستەكە. لەمبارەوە عەباس ئیقبال دەڵێت: ماف وەرگر دەبوا كەسێك بێت كە رایەكانی راست و دروست و تەواو بوایە و، ئایین زانێكی لێهاتووش بوایە. شارەزایەتی لە نهێنییەكانی چۆنیەتی مامەڵەكردن و بەرزەفتی ژمێریاری هەبوایە. شارەزا بایە لە رێساكان و لەهەمان كاتیدا لێهاتووش بوایە، چونكە قەڵەمەكەی فەرمانڕەوایی داد و گەواهی راستگۆ و جیاكەرەوەی نێوان هەق و ناهەق بوو. چونكە رەوایی بەرژەوەندییەكان و رێكخستنی كاروبارەكانی سوڵتان لەسەر قەڵەمی ئەو دەوەستا و، بە بوونی ئەو دارایی و گەنجینەوە دەپارێزرا[٧٢]. ئیبن خەلەكانیش لە بارەی كاری وەرگرتن و كۆكردنەوە لە هەولێر دەڵێت: پۆستی باڵا بوو هەولێر و لە دوای پۆستی وەزارەت دەهات[٧٣]. هەروەها ئەو پۆستە لە پێش سەردەمی ئەتابیكیش لە هەولێر هەبووە، واتە لەسەردەمی میرنشینی هەزبانییەكان[٧٤].

وادیارە ئەو پۆستە تەنیا بنەماڵەی ئیبن مستەوفی وەریانگرتووە. چونكە هیچ ئاماژە دەرێك نییە كە كەسانی تر غەیری ئەو بنەماڵەیە ئەو پۆستەیان

وەرگرتبێ. ئیبن شەعار دەڵێت: باپیرەی ئیبن مستەوفی سەربە نەوەی نوعمان کوڕی مونزیر کوڕی ماء سماء ئەللەخمی یە کە یەکێ: بووە لە شایەکانی حیرە. دوای ماوەی حکومڕانیەتی میر ئەبی هیجا حوسێن کوڕی موسا کوڕی جکو کوردی هەزبانی لەگەڵ منداڵەکانی گوازراوەتەوە بۆ هەولێر و، پۆستی وەرگرتن و کۆکردنەوەی ئەو میرەی پێ سپێردراوە[٧٥]. هەر ئەو مێژوونووسە دەڵێت: ئەو بنەماڵەیە بە ئیبن مستەوفی ناویان ناسرا، چونکە بە زۆری تاکەکانی ئەو بنەماڵەیە پۆستی وەرگرتن و کۆکردنەوەیان پێ سپێردرا لەوانە ئیبن مستەوفی و باپیری و باپیری باوکی مامەکەیی و براکانی و لە ئیبن مستەوفیشەوە کۆتایی بەسەرۆکایەتییەکەی هات[٧٦].

ئیبن خەلەکانیش دەڵێت: ئەوەی ئەو پۆستەیان لە هەولێر وەرگرت باوکی ئیبن مستەوفی و مامەکەی(سەفیەدین ئەبو حەسەن عەلی کوڕی موبارەک)[٧٧] بوو. بەڵام ئیبن مستەوفی لەبەر لێهاتوویی بە زانستی دیوان و بەرزەفتی یاساکان لەو پۆستەیە کاری کردووە و[٧٨]، بۆ ماوەی چل ساڵ بەبێ بەرامبەر خزمەتی وڵاتی مزەفەرییەی کردووە[٧٩]. شایانی ئاماژە پێکردنە ساحێبی هەولێر وا ناسراوە کە زۆربەی ئەو کەسانەی پۆستی دامودەزگاکانی دەوڵەتیان پێ سپێردراوە یان پیاوماقوڵانی دەوڵەتەکەی بوونە لە دەستگیرکردن[٨٠]، بەڵام لەگەڵ ئەوە ئیبن مستەوفی خۆی بە دەستەوە نەداوە، بۆیە موزەفەرەدین کەوکەبەری دەستگیری دەکات و پاشان کۆت و زنجیری دەکات و حەوت هەزار دیناری لێ دەستێنێت. دواتر لەساڵی ٦٢٩ک/١٢٣١ز ئازادی دەکات بۆ ئەوەی پۆستی وەزارەتی هەولێری پێ بسپێرێت[٨١].

### ٨- دیوانی ئەهرا (کۆگا)

سەرنج دەدەین بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لە پێش پەیدابوونی ئەتابیکە ئەو پۆستە ون دەبێ، بەڵام وا پێدەچێ تەنیا ناوەکەی ون بووبێ چونکە دیوانێک هەبووە بە هەمان کار هەڵساوە و ئەگەری ئەوە لە ئارادایە ناوی تری هەبووبێ.

ئیبن مەماتی ئەو پۆستە دەناسێنێت و دەڵێت: کۆگای گەورە بوون داهاتی دەسەڵاتیان تیایدا کۆدەکرایەوە و لەوە خەرجییەکانیان دەکرد[٨٢]. ئیبن شاهێن زاهیری[٨٣] و قەلقەشەندی[٨٤] هەمان پێناسەی بۆ دەکەن. دەشێ ئەوە بڵێین ئەو کۆگایانە لەرووی گرینگییەوە بە هەمان ئەو کۆگایانەی دانەوێڵە و بەروبوومەکان دەکات کە لەم سەردەمەدا پێی دەوترێت(سایلۆ).

پێشبینی دەکرێت ئەو ناوچانەی کە بەداهاتی دانەوێڵە ناسراوبوون ئەو کۆگایە بایەخی گرینگی خۆی هەبووبێت، کە سوپا زۆر پێویستی پێ هەبوو. چونکە ئەو میرنشینە بە تایبەت، هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە رووبەرووی سەربازی بۆتەوە. جا چ بەهۆی بەرکەوتنەکانی بێت لەگەڵ موسڵ یان بەهۆی هێرشە بەردەوامییەکانی مەغۆل بووبێت بۆسەر هە ولێر. دیوانی ئەهرا لەو میرنشینە ئیسحاق کوڕی مەعالی کوڕی شەماس کوڕی هیبتوڵلا کوڕی ئیبراهیم کوڕی شەماس کوڕی ئیبراهیم هەولێری برازای وەزیری هەولێر ئەبی حەسەن عەلی کوڕی شەماس، سەرپەرشتی کردووە، ئیسحاق زاناو شارەزابووە لە کاروباری ئەندازە و پزیشکی. بەڕەوشت بەرزی ناسرابوو. سەرەتای دەستبەکاربوونی نازانرێ، تەنیا ئەوە نەبێت پێش ساڵی ٦١٧ک/ ١٢٢٠ز لەو پۆستە ماوەتەوە. جا لەبەر ئەوەی موزەفەرەدین کەوکەبەری لێی تووڕەبوو داوای کرد لەو پۆستەی دوور بکەوێتەوە و، دەستگیری کرد و زیندانی کرد. جا هەر چەندە بە ساڵاچووش بوو ئازادی نەکرد و لە زیندان مایەوە تا لە هەمان ساڵدا مرد، لە کاتێکدا کە تەمەنی ئیسحاق لە ٦٠ ساڵ تێپەڕی نەکردبوو[٨٥].

شایانی ئاماژە پێکردنە ناشزانرێ لەدوای ئەو و پاش ئەوەی دەستگیر کرا کێ ئەو پۆستەی پێسپێردرا.

### ٩- دیوانی سەرکار (ارتفاع)

کاری ئەو دیوانە سەرپەرشتیکردنە لەسەر داهاتەکانی زەوی و ئەو بەروبوومانەی دەست دەکەون[٨٦]. ئەو پۆستە زۆر گرینگە و رەوشی وڵات لەرووی دارایی و بەهێزکردنی ئابووری لەسەری دەوەستێت، بۆیە وەزیر بە خودی خۆی سەرپەرشتی ئەو پۆستە دەکات[٨٧]. بەڵام پاش ئەوەی رێکخستنەکانی دەوڵەت زۆر بوون و ئاڵۆزاوی بەخۆوە

بینی و دامەزراندنی دیوانێکی تایبەت بەو کارەی خۆی فەرزکرد، سەرپەرشتیارەکە بۆ کەسێکی تر گوازرایەوەو داهاتەکان تەسلیم بەو سەرپەرشتیارە کرا لە بەروبووم(داهاتەکان) دراوە[88] و دەبوایە ئەوەی ئەو پۆستەی پێ سپێردرایە شارەزایی تەواوی لە یاساکانی سەرۆکایەتی هەبوایە و[89]، چاویشی بە کاروباری ژمێریاری و پتەوکردنی باجەکان بخشاندبایە[90] لەگەڵ چاوخشاندن بە باجگرتن و ئەو رێژە دیاری کراوەی کە لە هەر داهاتێک وەردەگیرا. بێگومان ئەمەش پاڵمان دەنێ کە بڵێین: ئەو دیوانە وەک دیوانی باج وەرگرتن وایە کە لە ماوەی ئەو میرنشینەدا ناوی نەهاتووە. ئەوەی سەرپەرشتیاری ئەو دیوانەی گرتە دەست ئەبو حامید محەممەد کوڕی عومەر کوڕی عەلی کوڕی سەعدوڵڵا کوڕی یوسف کوڕی ئیسماعیل بوو کە ناسراوە، بە ئیبن حەدیثی[91]. چونکە لە دایکبووی شاری(حەدیثە)ی موسڵ بوو[92]. بەڵام لە هەولێر گەورە بوو و فێربوو بوو. موزەفەرەدین کەوکەبەری سەرپەرشتی ئەو دیوانە و هەروەها سەرپەرشتیکردنی وەقفەکان و میراتی[93] پێ سپارد.

هەروەها سەرپەرشتیاری ئەو دیوانە بە ئەبو بەرەکات هیبەتوڵڵا کوڕی ئەبی حەسەن کوڕی ئەبی خەیر کوڕی پوترس نەسرانی میری دەمنهوری سپێردار، کە نەسرانی بوو لە دەوڵەتی شا ئەشرەف موسا کوڕی شا عادل سەردتا خزمەتکار بوو. دواتر شا داوای لێ کرد موسڵمان بێ ئەویش رەتی کردەوە، بۆیە ماوەیەک دەستگیری کرد، دواتر ئازادی کرد. لەو کاتەدا واتە میرنشینی هەولێر لە ساڵی ٦١١ک/١٢١٤ز لەلایەن ساحێبی هەولێر ئەو پۆستەی پێ سپێردرا لەبەر ئەوەی شارەزاییەکی تەواوی لە ژمێریاری دیوانەکان و یاساکانی باجگرتن هەبوو. ئەبو بەرەکات لەو پۆستە مایەوە تا لە ساڵی ٦٢١ک/١٢٢٤ ز کۆچی دوایی کرد[94].

### ١٠- قەزا

قەزا... شوێنی یەکلاییکەرەوەی کێشەکان و جێبەجێکردنی حوکمەکانی شەرعییە. بەرزترین پلەو پایەی ئایینە و بالاترین رێزی هەبوو[95] بۆیە دەبێ ژمارەیەک مەرجی سەرەکی لەو کەسە هاتبێتەدی کە ئەو پۆستەی پێ سپێردرابایە. لەوانە ژیری و شارەزایی هەبوون لە شەرع و رێساکان و دەرکردنی شتە زەرووردەکان، کەم ئەندامیش نەبووایە[96].

ئەو کارانەی کە قازی پێی هەڵدەستا چاوخشاندنەوە بوو بەو کاروبارانەی پەیوەندیدار بوون بە یەکلاییکردنەوەی کێشەکان و لابردنی ناکۆکی و ماف وەرگرتنەوە و کێشەکانی هاوسەرگیری و میرات و لێک جیابوونەوە و راسپاردە و دزی و داوێن پیسی... هتد[97].

لە گوندی کۆ عەزی[98] قەزای میرنشینی هەولێری لێ بوو. شێخ جەعفەر کوڕی هیبتوڵڵا کفر عەزی هەولێری سەرپەرشتی دەکرد. ئیبن مستەوفی لە ئیبن سەعید ئەندەلوسی دەگوازێتەوە کە ئەو پیاوە زانا بووە لە زانستەکان و شارەزاش بووە لە نەحو(قەواعید) و ئەندازە و ژمێریاری. ئەندەلوسی دەڵێت ژیاننامەی ئەو قازییە و تێکستە شیعرییەکانی لای شەرەف یەعقوب هەولێرین[99] و پیاوێکی هەست ناسک و خۆش مەشرەف و چاوی قازیەتی هەبووە، لە هەمان کاتدا وتار خوێنیش بووە لە هەولێر[100].

وادیارە لە ماوەی پێش ساڵی(٥٨٩ک/١١٩٣) ز پۆستی قازیایەتی پێ سپێردرابێ. بۆیە ئەگەری ئەوە لە ئارادایە کە شێخ جەعفەر یەکەم کەس بووبێ کە لەو میرنشینە پۆستی قەزایی بە ئەو سپێردرابێ هەر لەوانەی کە پۆستی قەزایان لە هەولێر وەرگرتبێ، ئەبو محەممەد جەعفەر کوڕی محەممەد کوڕی مەحمود کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی ئەحمەد کوڕی یوسف کفر عەزی هەولێریە. ئیبن سەعید[101]. باسی دەکات و دەڵێت: لە فیقهی شافیعی پێشەوا بووە و لە زانستەکانی فەرموودە و کۆنیشدا بەشداری هەبووە. ئیبن ساعیش دەڵێت: زانایەکی بە توانا بووە و شارەزایی لەژمارەیەک زانست هەبووە لەوانە شەریعەت و فەریزەکان و ژمێریاری و ئەندازە و ئەدەب و زانستەکانی قوورئان[102] لە ساڵی ٥٨٩ک/١١٩٣ز کاری قەزایی پێ سپێردراو بەردەوام بوو تا ساڵی ٦٠٤ک/١٢٠٧ز[103]کۆچی دوایی کرد. لەوانەیە پاش لابردنی قازی پێشوو ئەو پۆستە بەو سپێردرابێ.

ئەو قازییە، محەممەد کوڕی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی جارود ناسراو بە ئەبی عەبدوڵڵا مارانی کفر عەزی یاریدەدەری بوو. بەڵام دوای مردنی قازی پێشوو ئەو یاریدەدەری ئەو پۆستەی وەرگرت[١٠٤] مارانی لەسەر دەستی عەلی کوڕی ئەبی فەزل رەزیەدین یونس کوڕی محەممەد کوڕی مەنعە کوڕی مالیک هەولێری کە لە ساڵی ٥٧٦ک/ ١١٨٠ز کۆچی دوایی کردووە، پێگەیشت. مارانی بۆ ماوەی جارەگە سەدەیەک و تا ناوەڕاستی ساڵی ٦٢٩ک/١٢٣٢ز لە میرنشینی هەولێر بەردەوام بووە لە پیشەی قازیایەتی.

## ١١- دیوانی چاوخشاندنەوە بە ستەم لێکراوان

ئەو پۆستە بە یەکێ لە پۆستە گەورەکان لە وڵاتە ئیسلامییەکان دادەنرێت بەهۆی هەستیاری و پەیوەندیداری بە گەڕاندنەوەی هەق بۆ ستەم لێکراوان لە ڕێگەی دەستەیەک کە کاری لابردنی ترس و تۆقاندن بوو بەسزادانی ئەو کەسانە لە یاسا دەردەچوون و بە هەر چ جۆرە هۆکارێک بوایە. ئەو دەستەیە یەکێک سەرۆکایەتی دەکرد و پێی دەوترا چاودێری دیوان. دەبوا ئەو چاودێرییەش ژمارەیەک مەرجی تیایدا هاتبوا دی و لە توانایدا هەبووایە بەو کارە هەڵبستێ. لەوانە کەسێکی بە توانا بوایە، فرمانەکانی جێبەجێ بکردایە، خاوەن کەسایەتی بوایە، لەسەرخۆ و هێمن بوایە - چاوچنۆک نەبوایە و خواپەرست بوایە. چونکە ئەو لە یەک کاتدا بە پاراستن و چەسپاندنی قەزا هەڵدەستا[١٠٦]. هەروەها قودامە کوڕی جەعفەریش دەڵێت: دەبوا ئەو کەسە دادپەروەر و میهرەبانیش بوایە لە یەک کاتدا[١٠٧].

وا دیارە ئەو سیفەتانە لە محەممەد کوڕی مەحمود کوڕی محەممەد کوڕی میقداد کوڕی فارس حەرانی ناسراوە بە ئەبی عەبدوڵڵا ئیبن ئەنا، و کوڕی وەزیری هەولێر بووە، هاتۆتە دی.

میر موزەفەرەدین کەوکەبەری کاتێ لە حەران گەڕایەوە بۆهەولێر ئەو پیاوەی بە هاوڕێیەتی لەگەڵ خۆی هێنا. ئیبن شعار لەسەر زاری ئیبن مستەوفی باسی دەکات و دەڵێت: ئەبو عەبدوڵڵا پیاوێکی شکۆدار بوو خەڵک لێی دەترسان[١٠٨]. بەڵام ئەو مێژوونووسە باسی لەو ماوەیە نەکردووە کە ئەبا عەبدوڵڵا ئەو ویلایەتەی پێ سپێردراوە. بەڵام دەڵێت لە ساڵی ٦١٢ک/ ١٢١٥ ز لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە و هەر لە هەولێریش نێژراوە[١٠٩] بەڵام نازانرێ کێ لەدوای ئەو، ئەو چاودێرییەی پێ سپێردراوە.

## ١٢- پاراستن

ئەو پۆستە لەکاتێکدا دەرکەوت کە قازی لە توانایدا نەما چاو بە تەواوی کاروبارەکان بخشێنێ کە پەیوەندیدار بوون بە جێبەجێکردنی شەرع لە کۆمەڵگەی ئیسلامدا، ئەویش بەهۆی ئاڵۆزی کارەکەی، بۆیە بارەکە وا پێویستی پێکرد بۆکار ڕاپەڕاندنی و ساناکردنی کاری قازی پۆستی دیکە بێتەکایەوە، ئەوە بوو پۆستی پاراستن هاتە دامەزراندن و لە بنەچەشدا کارەکانی ئایینی بوو لە بابی فەرمانکردن بە چاکە و نەهیکردن لە خراپە[١١٠].

لە ڕاستیدا کاتێ شار بەرەو پێش چوو بازاڕەکانی بووژاندنەوە، وای کرد کە خاوەن پیشەکان ناوچەیەکی تایبەتییان بۆ تەرخان بکرێت ئەمە پاڵی بە دەوڵەت نا بۆ ڕێکخستنی کارەکانیان کار ڕاپەڕاندن یان سەرپەرشتیار لە سەر بازاڕەکان دابمەزرێنێت. پاراستن هاتە دامەزراندن و مەبەستیش لەوە سەرپەرشتی کردن بوو لەسەر کاروباری بازاڕەکان و پاراستنی بەکاربراوەکان[١١١] لەوەی کە زێدەڕۆیی لەسەر هەندێ فرۆشراو دەکرێت. ئەم دەزگایە لە سەرەتای دامەزراندنی شارە ئیسلامییەکان بوونی نەبوو، ئەویش لەبەر نەبوونی سادەیی شارەکان، بەڵام کاتێ بەرفراوان بوو، خۆی لە خۆیدا کاری پاراستن خۆی فەرزکرد. سەرپەرشتیار دەسەڵاتی بەرفراوانی هەبوو لەکاتی ئەنجامدانی کارەکانی لە بازاڕ و ڕێگەو بانەکان لایەنە خزمەتگوزارییەکانی دیکە وەک گەرماو و قوتابخانە و مزگەوتەکان... تد. بۆ گەڕان بەدوای ئەو کەسانەی یاری بە نرخەکان دەکەن، یاخود بە خراپی ڕەفتار دەکەن، بۆ ئەوەی لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکرێت بە تەمبێ بوونیان[١١٢].

پتەوکردنی پاراستن نێوەندێک بووە لە نێوان پتەوکردنی قەزاو پتەوکردنی ستەم لێکراوان. چونکە

پاراستن بۆ ترساندن بووە نەک بۆ بەکارهێنانی ڕق و هێز، کە زێدەڕۆیی و خروقات بکات. لە کاتێکدا قەزا کێشەکانی بەدادوەرانە یەکلایی دەکاتەوە[113] لەرووی گرینگییەوە، پتەوکردنی پاراستن لە دوای پتەوکردنی قەزاوە دێت. پاراستن لە پێناو خزمەتکردنی قەزا هاتە دامەزراندن[114].

ئیبن شعار دەڵێت: ئیبراهیم کوڕی عومەر کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی جاعم هەولێری کاری پاراستنی لە هەولێر گرتۆتە دەست. هەروەها باوکی و پاشان کوڕەکەیی و بەڵکو دەڵێن ژمارەیەک لە ئەندامانی بنەماڵەکەی ئیبن موحتەسەب هەولێری کاری ئەو پۆستەیان پێ سپێردراوە[115] هەرچەند هیچ شتێ دەربارەی ژیاننامەی هەر یەک لەوانە نازانرێ تەنیا ئیبن موحتەسەب نەبێ کە لە ساڵی ٥٩٢ک/١١٩٦ز لە هەولێر لە دایک بووە و کاری ئەو پۆستەی پێ سپێردراوە. وێڕای ئەوە وا پێدەچێ لە پێش سەردەمی ئەتابیکیش هەر هەبووبێ و نەوەکانی ئیبن موحتەسەب بەڕێوەیان بردبێ.

**دووەم: ڕێکخستنی سەربازی لە میرنشینی هەولێردا**

سەرەڕای ئەو چالاکییە سەربازییانەی کە هەردوو میر زەینەدین یوسف تبالتکین و موزەفەرەدین کەوکەبەری نواندنیان، زانیارییەکی وا لەسەر سوپای میرنشین و چۆنیەتی ڕێکخستنەکەی و ژمارەی فیرقەکان و ئەو بەشانەی کە لێی پێکهاتبوو لەبەردەستدا نییە. هیچ شتێکیش ئەو پلانانە نازانرێ کە میر دایڕشتبێ یاخود پەیڕەوی کردبێ لە بزاوتە سەربازییەکاندا. تەنیا ئەوە نەبێت کە هەولێر وەک میرنشینێک سەر بەخۆی - ئەوەندە پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی کە هەموو شتەکان وەک سیستەمی ئیداری و دارایی و قەزایی و تەواوی دامودەزگاکانی دیکە هەبوو، لە ڕاستیدا گەیشتبووە ئاسنێک هەر لە دەوڵەتێکی تەواوی دەکرد[116].

لەگەڵ ئەوەش ئاماژەدەری بچووک هەن لەسەر جەنگەکان کە میرەکان ئەنجامیانداوە و دەکرێ لە دەرەنجامی ئەو وە تەواوی سوپای میرنشین و توانا سەربازییەکەی و تەنانەت بگرە چۆنیەتی ڕێکخستنەکەشی تا ڕادەیەک دیاری بکەین. عیماد کە نووسەرێکی سوپای هەولێر بووە کاتێ گەیشتە فەلەستین بۆ ئەوەی لە ساڵی ٥٨٥ک/١١٨٩ز بەشداری لە جەنگی خاچپەرستەکان بکەن باسی دەکات و دەڵێت: (ساحێبی هەولێر بە خۆی و سوپاکەی وەک هەوری خێرە، دەرەنجامی خێری هێناو سەرکەوت). دەشێ بڵێین ئەو شێوە باسکردنە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو سوپایە زۆر گەورە بووە، هەرچەند پێدەچێ عیمادی نووسەر زێدەڕۆیی کردبێ.

لێرە پێویست بەوە ناکات باس لەو جەنگانە بکرێ کە موزەفەرەدین کەوکەبەری بەشداری کردن لە جەنگی خاچپەرستەکان، چونکە پاشان گەڕایەوە میرنشینی هەولێر. بەڵکو ئەوەی مەبەستمانە ئاماژە بەو بەرەنگاربوونەوانە بدرێ کە لە نێوان خۆیی و بەدرەدین ئۆلۆ لە ساڵی ٦١٥ک/١٢١٨ز ڕوویاندا.

شا ئەشرەف میر عیزەدین ئیبکی نارد بۆ پاڵپشتیکردنی هاوپەیمانەکەی بەدرەدین لوئلوئە. ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەو سەرکردە سەرکردایەتی سوپای موسڵی دەکرد و چەند بە تالیۆنێکی لە ئەستۆدا بوو، سوپای موزەفەرەدینیش، عیمادەدین زەنگی، کە زاوای بوو سەرکردایەتی سوپاکەی دەکرد. لە ئەنجامدا سوپای هەولێر بە سەر سوپای موسڵدا سەرکەوت، ئەم وەسفکردنە کورتە چۆنیەتی ڕێکخستنی سوپای ئەو میرنشینە لە خۆدەگرێت بەوەی لەرووی ڕێکخستنەوە وەک سوپای ئەتابیکەی موسڵ بڕشت بووە. ئەوەی بەلامانەوە گرینگە(بەتالیۆنە)، بەڵام ژمارەی بەتالیۆنەکان نازانرێ و، ناشزانرێ هەر بە تالیۆنێک لە چەند سەرباز پێکهاتبوو. یاخود ئایا ئەتابیکە هەمان ئەو ڕێکخستنەیان پەیڕەو دەکرد کە سەلجووقییەکان پەیڕەویان دەکرد و لە سەرەتا لە بازنەی بچووک بەندە دەستی پێدە کرد بە (٥٠) سەرباز، دواتر پەیتا پەیتا بەرفراوان دەبوو تا دەگەیشتە زۆرترین سەرباز و ئەوسا میر سەرپەرشتی (١٠٠٠) هەزار سەربازی دەکرد[118] و(١٠٠) سەد بەندەی لە خزمەتدا بوو. ئەگەری ئەوە لە ئارادایە موزەفەرەدین کتومت ڕێکخستنی وەک سەلجووقییەکانی بەکارهێنابێ. چونکە لە دەوڵەتی ئەیوبی بەو گوزارشتەی ڕێکخستنەکانی ئەتابیکەی هەولێری لەگەڵ ئەتابیکەکانی دیکە بەردەوام بوونە لەسەر سیستەمی

سەلجووقییەکان وەک ئەلقەی گەیاندن لە نێوان ئەوان و دەوڵەتی ئەیوبیدا[119] لەبەر ئەوەی بۆماوەیەک ئەو ئەتابیکیانە بەتایبەتی موزەفەرەددین کەوکەبەری و براکەی زەینەدین یوسف بەشداربوون بە چوونە پاڵ ریزەکانی سوپای سەلاحەدین ئەیوبی، بۆیە ئەگەری ئەوەی هەیە کە ئەوان هەندێ لە چۆنیەتی رێکخستنی سوپایان وەرگرتبێ و خستبیانە نێو رێکخستنی سوپای میرنشینەکەیان بەپێی پێویستی ئەو میرنشینە و توانایەکەی.

لەرووی قەوارەوە ئاماژەدەرێک بەدەستەوە نییە ئەو قەوارەیە ئاشکرا بکات بەڵام دەکرێ دەرەنجامی ئەو قەوارەیە بە بەراورد کردن لەگەڵ سوپای ئەتابیکەی موسڵ هەروەک ئیبن ئەثیر باسی دەکات دیاری بکەین و دەڵێت: بەپێی قسەکانی عیمادی نووسەر[120] سوپای سەلاحەدین لەم جەنگەدا لە شەش هەزار سەرباز تێپەری نەکردبێ[121]، ئەوا دەبێ ژمارەی سەربازانی سوپای ئەتابیکەی هەولێر زۆر لەوە کەمتر بووبێ. لەگەڵ ئەوەش ئێمە ناتوانین ژمارەی سەربازان بخەملێنین، بەڵام لەوانەیە لە سنووری (٢) هەزار سەرباز بووبێ. جگە لەوەش لەوانەیە جەنگاوەری هۆزەکانیش هەبووبن و لە ریزی سوپای میرنشینەوە بووبن، جا چ بۆ ئەوەی (مووچە) لە میر وەربگرن، یاخود خۆیان ئارەزوویان لەوە هەبووە کە تاڵان دەستکەوت وە دەست بێنن. وێرای ئەوانەش هەندێکیان بۆیە چوونەتە ریزەکانی سوپا بۆجیهاد کردن بە تایبەت کاتێ میرنشینەکەیان رووبەرووی هێرشی مەغۆلەکان بۆوە.

بەڵام لەرووی پێکهاتەی توخمەکانی سوپای هەولێر هیچ دەقێک بەدەستەوە نییە، تەنیا ئەوە نەبێت کە لە دوا چاخەکانی ئیسلامی باو بووە، ئەو بەندانەی لە ناوەراستی ئاسیا و وڵاتی قەیقاج[122]. دەیانهێنان بوون بە کۆڵەگەی دەوڵەتی سەلجووقی و ئەتابیکیەکان[123] هەروەها کورد و[124] عەرەبیشی[125] تیایدا بووە. بەڵام ئەو رێژەیە بەپێی جیاوازی میرنشینەکان و ئاراستە هەرێمییەکان و پێکهاتەی رەگەزەکەی، جیاواز بوونە. بەڵام سەبارەت بە میرنشینی هەولێر سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە کوردی شارەزووری بەشداری لە سوپاکەی کردووە. ئیبن عیبری دەڵێت: موزەفەرەددین کەوکەبەری دوای ئەوەی بەسەر بەدرەددین لوئلوئە لە ساڵی ٦١٥ک/١٢١٨ز سەرکەوتنی وەدەست هێنا فرمانی بەسەربازەکانی کرد بگەرێنەوە هەولێر پاش ئەوەی بۆ ماوەی سێ رۆژ لە سەربازگەی نەینەوا بوون.

لە کاتی گەرانەوەیاندا ژمارەیەک لە شارەزوورییەکان کە لە سوپای هەولێر بوون ون بوون[126]. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کورد بەشێک بووە لە پێکهاتەی سوپای ئەتابیکیەی هەولێر. لەلایەکی دیکە موزەفەرەددین کەوکەبەری بەشێکی زۆری لە داهاتی دارایی میرنشینەکەی بۆ خەرجی سوپا تەرخان کردبوو. رێژەکەش دەگەیشتە نزیکەی سێیەکی(ئەو داهاتە). لەم بارەوە ئەوەی ئیبن جەوزی دەڵێت: موزەفەرەددین کەوکەبەری لە ساڵی ٥٨٦ک/١١٩٠ز رۆژێ بەبۆنەی دووبارە گەرانەوەی بۆ دەسەڵاتی لە لیدوانێکدا گوتی: داهاتی میرنشین بۆ سێ بەش دابەش دەکرێت بەشێکیان بۆ کاری خێرخوازی. بەشی دووەمیان بۆ سەرباز و تایبەتمەندییەکانی. بەشی سێیەمیش بۆ دوژمن مەبەست میرنشینەکەی بووە[127]. لێرە سەرنج دەدەین هەردوو سێیەکی دوایی بۆ خەرجییەکانی سەربازی تەرخان کراوە.

### ئاڵای میرنشینی هەولێر

بوونی ئاڵا بە بوونی سەروەری گوزارشت دەکرێت و هێمایەکیشە بۆ سەربەخۆیی میرنشین یان دەوڵەت. گومان لەوەدا نییە کە ئەو میرنشینە ئاڵایەکی جیا و تایبەت بەخۆی هەبووە. لەوانەشە هەر لەو کاتەی لە ساڵی ٥٧٩ک/١١٨٩ز لە موسڵ جیابۆتەوە بوویێتە خاوەنی ئەو ئاڵایە. دەشێ شێوازی ئاڵای میرنشینی هەولێر لەو نامەیەدا کە نووسەر زیائەدین ئیبن ئەثیر خەری[128]، وەک وەڵامدانەوەیەک بۆ ئەو دیارییانەی کە موزەفەرەددین کەوکەبەری کاتێ سەردانی هەولێری کردبوو پێشکەش کردبوون وەدەست بێن و یەکێ لەو دیارییانە(هەڵۆ) یەک بووە. نووسەر لە نامەکەیدا سوپاس و ستایشی موزەفەرەددین کەوکەبەری دەکات و لە نامەکەیدا دەڵێت: شای چنگدار هات (مەبەستی هەڵۆ)یە، ئا لە دەستی

سپی كە خاوەنی بەهرەو دردوشایەوەیە[129]. لەوەوە دەزانین كە ئاڵای هەولێر ئەو باڵندە چنگدارە(هەڵۆ) لە ناوەڕاستەكەیدا هەبووە و بڕشت بووە وەك ئاڵای سەلاحەدین ئەیوبی و دەوڵەتی ئەیوبی.

زانیاری لەمەڕ ئەو جۆرە جلوبەرگانەش لەبەردەستدا نییە، كە سەربازانی ئەو میرنشینە چ جۆرە جل و بەرگێكیان پۆشیوە. ئایا میری هەولێر هەمان ئەو جلوبەرگانەی سەربازانی پۆشیوە، كە سەربازانی ئەتابیكەی موسڵ دەیانپۆشی[130]؟... یاخود ئایا لەگەڵ جلەكانیان هەندێ لە ئامێری جەنگیان هەڵدەگرت، كە سەربازانی زەینەدین عەلی كوچك دامەزرێنەری ئەتابیكەی هەولێر هەڵیان دەگرت[131] وەك چەقۆ و دەرفەش[132] و چەكوش و دەرزی و دەزوو مشاری بچووك[133] و تایبەتی لەكاتی جەنگدا هەر وەك ئیبن ئەثیر باسی لێوە دەكات.

ناشزانرێ چالاكییەكانی هەواڵگری موزەفەرەدین گۆگبری چەند بووە. چونكە بوونی دامودەزگای سەربازی مانای كاری سیخوڕی دەگەیەنێت بەسەر دوژمندا. بە تایبەت لە ماوەی ململانێی لەگەڵ بەدرەدین لوئلوئەدا. وا دیارە والی هەولێر ئەو هەڵوێستە سلبییەی بەدرەدین لوئلوئەی بەرامبەر بە كۆمەڵانی مەسیحی بە دەرفەت زانیوە و قۆستیتیەوە، كە بەهۆی ئەوەی دەسەڵاتداری موسڵ لە سەری فەرزكردن دەبێ پارە بدەن ستی كەوتە نێو ئەو كۆمەڵانەوە و، ئەوانەش هیچیان بەدەستەوە نەما تەنیا ئەوە نەبێت خۆیان بگەیەنن بە دوژمنەكەی[134]، بە تایبەت موزەفەرەدین گۆگبری. دەستیان كرد بە ئاڵوگۆڕكردنی نامە بۆ ئەوەی بەكارێكی هاوبەش هەڵبستن بەمەبەستی لاوازكردنی بەدرەدین لوئلوئە. زۆر ئەگەری ئەوە لە ئارادایە كە ئەو كۆمەڵانە زانیاری پەیوەندیدارییان بەڕەوشی سەربازی لە موسڵ گەیاند بێتە سوپای موزەفەرەدین كەوكەبەری، بۆ زەمینە خۆشكردن بۆ داگیركردنی[135] بۆ نموونە: یەكێك لەو نامانەی، كە شەمعون مویان[136]. بەرپرسی گوندی بەرتلە بۆ موزەفەرەدین كەوكەبەری ناردبووی كەوتە دەست بەدرەدین لوئلوئە و هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دەستگیری بكات و لەسەر دەرگاكە لە خاچی بدات[137]. وا پێدەچێ ئەوە یەكەم نامە بووبێت كە لەم بارەوە یەكێ لە سەركردەكانی نەسرانییەكان بۆ ساحێبی هەولێری ناردبێ.

### جبەخانە

سەرچاوەكان ئاماژە بە بوونی دەدەن لە میرنشینی هەولێر پێی دەوترا جبەخانەی خانا[138]. ئەبو مەحاسین ئەسعەد كوڕی ئەحمەد كوڕی موسا كوڕی مەنسور كوڕی عەلی كوڕی نەسر هەولێری سەرپەرشتی كردووە و تا دوا ساتەكانی ژیانیشی لەو پۆستە ماوەتەوە. كە لە مانگی موحەرەمی ساڵی ٦٢٣ك/ ١٢٢٦ز دوای ئەوەی تەمەنی لە ٨٠ ساڵ تێپەڕ كرد كۆچی دوایی كرد[139]. بەڵام بەرواری دامەزراندنی و كێ لەدوای ئەو، ئەو كارەی پێ سپێردرا نازانرێ. نویری باس لەو جبەخانەیە دەكات و دەڵێت: گەورەترین و گرنگترین خانە بوو. راستەوخۆ سەرجەم چەكەكانی تیایدا دەپارێزرا، ئەو چەكانەی لێی دەردەكرا تۆمار دەكرا[140]. هەموو جۆرە چەكێكی تێدا بوو، ئەو كەسانەی كە چەكەكانیان چاك دەكردەوە پاش ئەوەی بەكار دەهێنران، لەوێ نیشتەجێ بوون[141].

بەڵام سەركردایەتی سوپا، خودی ئەتابیك سەرپەرشتیاری دەكرد هەر وەك لە رووداو و پەیوەندییەكانی دەرەوە دەردەكەوێت. بەڵام لە قسەكانی ئیبن شعار وا دەردەكەوێت كە ئەتابیك یاریدەدەرێكی بۆ خۆی دامەزراندووە بۆ ئەوەی سەركردایەتی سوپای میرنشین بكات ئەویش(میر شەهابەدین قرتای كوڕی عەبدولا هەولێری) بوو، باوكی هەردوو محەمەد و ئەحمەد كوڕانی قرتایی كە ناویان بە زۆری لە(عقود الجمان) دێت. بەڵام نازانرێ ئاخۆ ساحێبی هەولێر ئەو میرەی وەك سەركردەی سوپا یان یاریدەدەری خۆی دامەزراندوە. یاخود تەنیا كارەكانی تایبەت بووە بە كاروباری رێكخستن و ئیداری و سوپا. سەر سوپا ئاسا لە نێو ئەو كەسانە هەڵدەبژێردرا كە بە ئازادی ناسرابوون، شارەزاییان لە نهێنییەكانی جەنگ و هونەری سوارچاكی میازی هەبوو. ئەوانەی شارەزاییان لە شەڕو كوشتار هەبوو[142] و پێیان دەوترا(پاسەوانی

سنوور) یان(پارێزراو)[١٤٣] ناسراوە کە میر قرتای هەواڵی ساحێبی هەولێر بوو، لە میرنشینەکەی پلەو پایەی بەرز کرایەوە تا لە ساڵی ٦١٤ک/١٢١٧ز [١٤٤] دەستگیری کرد و زیندانی کرد. هەر لە زیندان مایەوە تا کۆچی دوایی کرد[١٤٥]. هەروەها کوڕە گەورەکەی محەمەد کوڕی قرتای کە لە ساڵی ٦٠٦ک/١٢٠٩ز لە هەولێر لەدایک بووە میرێکی بە شان و بە شەوکەت بووە[١٤٦]. لەوانەیە لەو میرنشینە کارێکی گرینگی سەربازی پێ سپێردرابێ. هەروەها برا بچووکەکەشی ئەحمەد کوڕی قرتای کە سەفدی باسی لێوە دەکات و دەڵێت: هەواڵی سوڵتان موزەفەرەدین کەوکەبەری[١٤٧] بوو. ئەویش سەرکردایەتی سوپای هەولێری پێ سپێردرابێ.

وادیارە ئەو دوو میرە هەولێرییە بەشداربوون لە سەرکردایەتی ڕێکخستنەکانی بەرهەڵستکاری لەبەرامبەر هێزەکانی خەلیفە موستەنسر کاتێ بۆ ئەوە هات میرنشینی هەولێر بخاتە پاڵ میرنشینی بەغدا. هەروەها ئەوان هەولێریان بەجێهێشتووە و بەرەو حەلەب ڕۆیشتوون کە شا عەزیز یاسەدین فەرمانڕەوایی حەلەبی دەکرد و بەگەرمی پێشوازی لێ دەکردن[١٤٨].

## سێیەم: دراو و سیستەمی دراو لە میرنشین

سەرنج دەدەین دراوی میرنشینی هەولێر لە سەردەمی ئەتابیکی لە سەر یەک شێوە و یەک و کێش و یەک قەبارە جێگیر نەبووە. هەروەها لەسەر یەک پێوانەش جێگیرنەبووە. واتە لە رووی کێشی کانزایی گرانبەها لە پارچەکەدا بەنیسبەت کێشی هەمووی. دیارە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە رەوشی ئابووری جێگیر نەبووە بازاڕ لە شلەژاوی دابووە. لەوانەیە هەندێ لە هۆکارەکان بگەڕێنەوە بۆ هەندێ ئەو پەشۆکاویەی ناوچەکە تێیدا گوزەر کردووە بەهۆی جەنگی خاچپەرستەکان و دابەشبوونی شانشینی ئیسلامی بۆ چەند یەکەیەکی سیاسی، وێڕای ئەو پەشۆکاوییەی هێرشەکانی مەغۆل دروستیان کرد کە بووە هۆی زیاتر ئاڵۆز بوونی رەوشەکە و کەموکوڕی تێکەوتن لەداهاتی زێڕو زیو لە بازارەکاندا[١٤٩]. هەڵبەتە ئەم رووداوانە بوونەتە هۆی دیاردەی ناجێگیری دراو لەسەر یەک کێش و یەک قەوارە. بێگومان ئەمەش هەر لە میرنشینی هەولێر وانەبوو، بەڵکو رووداوەکان زۆر فراوان بوون تەنانەت بگرە تەواوی میرنشینەکانی دیکەی ئەتابیکەی گرتۆتەوە[١٥٠].

ئەوەی لەو میرنشینە بەدی دەکرێت سەرنج دەدەین هەر بەتەواوی دراوی زیو بوونی نەماوە. نە لە مۆزەخانەی عیراقی، نە لە کتێبەکانی دراو پارچەیەک نەدۆزرایەوە کە لەو کانزایە لێدرابێ. بەڵکو لە هەردوو کانزای دینار لە زێڕ و، درهەم و فلس لە مس لێدران[١٥١].

لە راستیدا نەگەیشتینە شرۆڤەیەکی تەواو بۆ ئەو دیاردەیە، بە تایبەت لە کاتێکدا کە زانرا وڵاتی فارس شوێنی کانزای زیوە[١٥٢] و لە ناوچەکەش دوور نییە. تەماشا دەکەین لێدانی درهەم لە کانزایی مس تەنیا لە میرنشینی هەولێر نەبووە، بەڵکو گشتگر بووە و لە تەواوی میرنشینەکانی دیکە و وڵاتان باو بووە[١٥٣].

قەلقەشەندی دەڵێت: بۆیە زیویان لە لێدانی دراو بەکارنەهێناوە تاوەکو ئەو کانزایە لە دروستکردنی زین و قاپ و قاچاخی ناو ماڵ بەکار بهێنن[١٥٤].

بەڵام بە نیسبەت بەهای درهەم بەرامبەر بە دینار هیچ شتێ لەبەر دەستدا نییە، بەتایبەت درهەمی هەولێر. تەنیا ئەوە نەبێت دەکرێ لە رووی بەهای درهەم پشت بە بەهای درهەمی میرنشینەکان و دەوڵەتانی ئەو سەردەم ببەستین بە تایبەت موسڵ. دانەری کتێبی (الحوادث الجامعة) دەڵێت: لەساڵی ٦٦٠ک/١٢٦٢ز[١٥٥] بەهای دینار لە وڵاتی موسڵ یەکسان بوو بە چل درهەمی رەش.

هەڵبەتە ئەو پارچانەش کە لە رووی کێش و قەبارە جیاواز بوونە. کەچی دیناری میرنشین کێشەکەی جیاواز بووە لەگەڵ کێشی دیناری ئیسلامی کە باو بووە. وێڕای ئەوە ئەوانەی لەسەر دراوی ئەتابیکەیان نووسیوە کێشی دیناریان دیاری نەکردووە.بەڵام لە رووی جیاوازی قەبارە، واباشە بگەڕێینەوە بۆ جیاوازی کێشەکانیان، کە کێشی دینارێکی هەولێر جیاوازی هەبووە لەگەڵ کێشی ئەو تاک دینارە شارەزووریەی دۆزراوەتەوە و ئەوسا

سەر بە میرنشینی هەولێر بووە و عیمادەدین زەنگی زاوای موزەفەرەدین کەوکەبەری حکومرانی دەکرد[156] ئەو دینارەی، کە لە هۆڵی سەراف دانراوە کێشەکەی(٣،٤) گرامە[157]. لە کاتێکدا دیناری شارەزوور(٤،٥٣٦) گرامە[158]. سەبارەت بە قەبارەی دینارەکانی میرنشینی هەولێر، یەکێ لەو دوو دینارەی کە لە مۆزەخانەی هەمایۆن لە ئەستەنبوڵ نمایش کراوە چێوەکەی دەگاتە(٢٦ملم)[159]. چێوەی ئەوی تریش دەگاتە(٢٨ملم)[160] بەهەمان شێوە ئەو دینارەی کە لە مۆزەخانەی عێراقیش نمایش کراوە[161]. لە کاتێکدا چێوەی دیناری شارەزوور تەنیا دەگاتە(٦،٢٥ملم)[163].

بەڵام ئەوەی پەیوەندارە بە رێکخستن و ئیداری لێدانی دراو پێویستە دیوانێک هەبووبێ و سەرپەرشتی کردبێ. خانەیەکی تایبەت بە لێدان هەبووە و کەسێک کە شارەزا بووە لە هونەریەکەی و پەیوەندار بەلێدان وەک مۆری دراو بە قالیەکانی لێدان و نیگار کردنی وێنە و نووسینی خەت لە قالیەکە و تاواندنەوەی کانزا و تێکەڵکردنی بە ئاسن و دیاریکردنی پێوانە و شتی تر تایبەت بە هونەری کار راپەڕاندن، سەرپەرشتی کردووە. شتێ نازانرێ دەربارەی ئەو کەسانەی سەرپەرشتی ئەو کارەیان گرتۆتە ئەستۆ. بەڵام ئیبن شعار ئاماژە بەوە دەدات کە عوسمان کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی سالم هەولێری کە لە ساڵی ٦٢٢ک/١٢٢٥ز کۆچی دوایی کردووە یەکێک بووە لەوانەی سەرپەرشتی کاروباری خانەی لێدانی دراوی کردووە لە میرنشینی هەولێردا[163].

بێگومان لێدانی دراو خۆی لە خۆیدا یەکێکە لەو دیاردانەی کە گوزارشت لە سەروەری دەوڵەت یان میرنشین یان سەربەخۆیی دەکات. هەر وەک ئیبن خەلدون بە(نیشانەی سوڵتان)[164] لە قەڵەمی دەدات. بەپێی ئەو زانیاری و ئاماژەدەرانەی لەبەر دەستدان موزەفەرەدین کەوکەبەری یەکەم کەس بووە کە لەو میرنشینە دراوی لێدابێت. هەر لە دەستپێکی گرتنە دەستی دەسەڵات بەزوویی دەستی کرد بە لێدانی دراو. پارچەیەکی مس لەو دراوانە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٥٨٧ک/١١٩١ز[165]. واتە ساڵێک دوای ئەوەی جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست.

سەبارەت بە وردەکاری ئەوەی لەسەری تۆمارکراوە، کە لە چەقی رووەکەی وێنەی کەسێکە بەلای چەپ دەڕوانی، لە پەراوێزەکەی ناوی سەلاحەدین ئەیوبی نووسراوە لە نزیک کوڕی عەلی. لە پشتەکەشی ناوی خەلیفەی عەباسی ناسر لدینیللا ئەمیر موئمنین نووسراوە[166]. میری هەولێر بۆیە ناوی خەلیفەی خستۆتە سەر دراوەکەی بەو گوزارشتەی، کە یەکێکە لە شوێنکەوتوانی. هەر چەند پەیوەندییەکان بە نەرێنی تا ساڵی ٦٠٦ک/١٢٠٩ز لەنێوان هەولێر و بەغدا بەردەوام بوو هەروەک لە پێشەوە باس کرا[167]. لە پارچەیەکی دیکە مس کە لە مۆزەخانەی ئەستەنبوڵە ناوی شا حوسامەدین یولق کوڕی ئیلغازی ئەرتەقی والی ماردین(٥٨٠-٥٩٧ک/١١٨٤-١٢٠٠ز) دیارە[168]. بەڵام مێژووی لێدانی نازانرێ. هەروەها ناشتوانین بڵێین ئەو پارچەیە لە هەولێر لێدراوە. یاخود بڵێین موزەفەرەدین گۆگبری ئەو کاتە لێی داوە، کە میری هەران و رەها بوو[169]. لەسەر ئەو پارچەیە وێنەی کەسێک دەردەکەوێت، کە لە سەر کورسی پاشایەتی دانیشتووە و گۆچانێکی لەدەستی چەپە و تاسە کڵاوێکی لەسەرە[170]. لە پەراوێزەکەی نووسراوە(حوسامەدین کوڕی یوسف ئیلغازی گۆگبری کوڕی عەلی). بەڵام لەپشتی ئەو دەستەواژەیە نووسراوە (الملك الناصر صلاح الدنيا والدين يوسف بن ايوب محيي الدولة امير المؤمنين)[171].

لە پارچەیەکی دیکە کە لە ساڵی ٥٩٠ ک/١١٩٤ز و دواتر لێدراوە ناوی هیچ شایەکی ئەیوبی لەسەر نەنووسراوە[172]. وادیارە موزەفەرەدین کەوکەبەری پەیوەندی لەگەڵ شا عەزیز عیمادەدین عوسمان باش نەبووە کە لە دوای سەلاحەدینی ئەیوبی باوکی کە لە ماوەی نێوان ساڵی ٥٨٩ک/١١٩٣ز حکومڕانی کردووە، باش نەبووە[173]. بۆیە لە دوای ئەوە ساحێبی هەولێر ناوی(شا عادل) ی(٥٩٦ک/٦١٥ک - ١١٩٦/١٢١٨ز) لەسەر دراوەکەی داناوە. بەهەمان شێوە لەسەر ئەو دراوانەی کە لە مۆزەخانەی هەمایۆن لە ئەستەنبوڵ[174] و مۆزەخانەی لەندەنن[175].

شیاوی باسه زۆرینەی دراوەکانی هەولێر وێنەی کەسێکی لەسەر تۆمار کراوە، دەستی راستی کردۆتەوە و سواری شێرێک بووە کە جۆش سەندنە، بەرەو لای چەپ. بەڵام کەسەکە بە دەستی چەپی گەردەنی شێرەکەی گرتووە[176].

سەرچاوە:
١- ابن واص، مفرج الكروب، ٩٧/١
٢- ياقوت المحوي، معجم البلدان ٥٢/٤
٣- ابن خلكان، ١٨٩/٢ ط بيروت - الحرش (ترجمات المتقدمين من الشعراء) ص٤٤
٤- ابن الشعار ج ٦ ورقة ١٧
٥- ن. م. ج ٥ ورقة ١١١
٦- محمد مصطفي زيادة، هامش السلوك، ج١ ق١ ص٢٣٩، حسن ابراهيم حسن، تأريخ الاسلام السياسي ص٣٦١ - نظير حسان سعداوي، التأريخ العربي المصري في عصر صلاح الدين ص٢- عمادالدين خليل - عمارالدين زنكي ١٩٦ - ابراهيم علي طرخان، النظم الاقطاعية ص٣٠
٧- احسان عباس، مقدمة (وفيات الاعيان) ط بيروت ١٩٧١ ج ٧ ص١٥
٨- سبط الدين الجوزي، مرأة الزمان ٦٨٣/٨
٩- ابن شعار، عقود المجان ج٩ ترجمه هارون بن عبدالحيسن بن كرجي
١٠- ابن خلكان١٨٩/٢ ط بيروت. بروانە (ترجمات المتقدمين من الشعراء) ص٤٤
١١- جیاوازی هەیە لە سەر مردنی تەغرائی، نووسەر ئەسفەهانی عیماد دەڵێت: لە ساڵی ٥١٣ ک کوژراوە (تأريخ الدولة ال سلجوقي - اختصار البنداري) ص١٢١ئیبن خەڵکانیش لە سەمعانی دەگوازێتەوە کە لە ساڵی ٥١٥ مردبێ (وفيات الاعيان) ٤٣٨/١. پاشان دەڵێت لە ساڵی ٥١٤ک، لە ساڵی ٥١٨ک (ت. م ٤٤١/١٠ - لە کاتێکدا یاقوت حەمەوی دەڵێت" لە ساڵی ٥١٥ ک کوژراوە (معجم الادباء ٥٢/٤ بەڵام ئیبن ئەثیر دەڵێت لە ساڵی ٥١٤ک کوژراوە (الكامل ٥٦٣/١٠).
١٢- الكامل ٦٣٨)١٠ - ئیبن ئەثیر باس لە چالاکییە سەربازییەکانی ئەبی هیجا دەکات، ساڵی ٥٢٠ک، لە دوای ئەو رێکەوتە بە دوو ساڵ، ئەتابیک عیمادەدین زەنگی دەستی بەسەر هەولێر داگرت، بەپێی ئەوەی، کە ئەبی شامە دەیگێڕێتەوە (الوضيتين)٣٠/١
١٣-( عبدالمنعم محمد حسنين، سلاجقة ابران والطراق ص١٥٨
١٤- ن. م.ص.١٦٠
١٥- الماردي، الاحكام السلطانية، ط القاهرة ١٩٦٠ ص٢٧
١٦- عباس اقبال، در وزارت ص٢٥ - حسين احسين، العراقي في العصر السلجوق ١٩٠
١٧- ابن الطقطقي، الفخري في الاداب السلطانية ص٢٩٧ - ٢٩٨ - النويري نهاية الارب
١٨- انظر عما تصنية وزارة التنفيذ: النويري، نهاية الارب ١٢٤/٦ - ١٢٨
١٩- ابن الشعار ج ٩ ورقة ١٢٢
٢٠- ابن الشعار ج٦ ورقة ١٨٧ - ساڵی مردنی ئەو وەزیرە دیاری نەکراوە
٢١- ن. م. ج
٢٢- ن. م. ٧ ترجمة ولك (محمد بن علي بن شماس
٢٣- اليونيني، ذيل مرأة الزمان ١١٢/١
٢٤- اليونيني، ٢٦٩/٢
٢٥- ابن الشعار، عقود المجان ج٤ ورقة (١)
٢٦- ابن الشعار، عقود المجان ج٦ ورقة (١٨)
٢٧- ن. ج
٢٨- القلقشندي، جح الأعشي ٢٧٣/٣
٢٩- ابن خلدون، المقدمة، طبعة بيروت ١٩٦١، ص٤٢٦
٣٠- البنداري، تأريخ دولة ال سلجوق ص ١٠٧
٣١- حسين أمين، تأريخ العراق في العصر السلجوقي ١٨٣
٣٢- ابن شداد، الاعلاق الخطيرة (تأريخ دمشق) ص٨٦
٣٣- ابن خلكان ١٨٤/١ ط بيروت
٣٤- ابن الشعار، ج١ ترجمة احمد بن عبدالسيد
٣٥- ابن خلكان ١٨٧/١ - الصفدي ٧٣/٧ - لابي عباس صلاح الدين احمد ترجمة في مرأة الزمان ٦٩٢/٧ - النجوم الزاهرة ٢٨٦/٦. (پێویست ناکات تەواوی چالاکییەکان باس بکرێت کە لەو ماوەیەدا لە دەرەوی شاری هەولێر ژیانی بەسەر بردووە).
٣٦- القلقشندي ٩٠/١
٣٧- المقريزي، الخطط، ج٢ ص٢٢٦ - عباس اقبال وزارت در عهد السلاطين ٢٩
٣٨- عبدالمنعم محمد حسنين، سلاجقية ايران و العراق ١٦٢
٣٩- المقريزي، الخطط ن. ص
٤٠- ابن شاهين الظاهري، زيدة كشف المماليك ص٩٩ عباس اقبال ن. م ص٣٠/
٤١- قدامة ابن جعفر، مخطوط (صقة الكتابة) ورقة ١١ - ابن خلدون المقدمة ص٤٣٨ - القلقشندي ١٠٣/١٣ - التويري: نهاية الارب ١٩١/٨ - ابن شاهين الظاهري ن. م. ص
٤٢- عباس اقبال ن. ص

٤٣- المقريزي ن. م. ص
٤٤- ابن القوطي، تلخيص مجمع الاداب ج٤ ق٤ ص ١١٥٩
٤٥- ن. م. ص
٤٦- النذري، التكملة لوقيات النقله: بالروينو ج١ ورقة ١٠٩٠
٤٧- ابن الشعار، عقود المجان، ج ٦ ترجمة المبارك ابن البركات
٤٨- ابو المجد في كافة المصادر و ابوالفضل و ابوسعد في: ابن القوطي، تلخيص مجمع الاداب، ط لاهور، ج ٥ ق٢ ص١٠٧
٤٩- اليونيني، ذيل مرآة الزمان ١١١/١
٥٠- ابن الشعار، عقود المجان، ج١ سيرة اسعد بن ابراهيم
٥١- اليونيني، ن، ص. لە کاتێکدا کتبی دەڵێت مزەفەرەدین کەوکەبەری بەوەفد ناردوویەتی بۆ بەغدا(فوات الوفيات) ١٧/١
٥٢- ابن الشعار ن.م اليونيني ١١٣/١
٥٣- اليونيني ن. ص ابن القوطي، تلخيص مجمع الاداب ج ٥ ف ٢ ص١٠٧
٥٤- ابن الشعار، عقود المجان، ج ٧ سيرة محمد بن جعفر بن محمد
٥٥- القلقشندي ١٣٢/٢
٥٦- ابن خلدون، المقدمة، ص٤٦٧
٥٧- البنداري، آل سلجوق ص٥٦
٥٨- ن. م. ص: ٩٢
٥٩- ن. م
٦٠- خدامة بن جعفر، مخطوط (صفة الكتابة) ورقة ٢١
٦١- ابن الشعار، عقود المجان ج٩ ورقة ٩٣
٦٢- القلقشندي ٤/ ٢٠ - المقريزي، الخطط ٢٢٢/٢
٦٣- بروانە صبغ الاعشي ٢١/٤ و ٤٦٠/٥
٦٤- القلقشندي ٤/ ٢٠ - المقريزي ن. م. ص
٦٥- ابن الشعار، عقود المجان ج ٦ ترجمة محمد بن احطيقان
٦٦- القلقشندي ٤/ ٣٠
٦٧- الاسعد بن مماتي، قوانين الدواوين ص٣٠١
٦٨- النويري، نهاية الارب ٣٠٢/٨
٦٩- د. حيسن امين، تاريخ العراق في العصر السلجوقي ١٩٧
٧٠- النويري ن. ص
٧١- البنداري، تأريخ ال سلجوق ص٩٢ - ابن خلكان ٢٩٧/٣ - ابن ابي عذيبة ص٣١٢ - عباس اقبال، وزارت در عهد ص٢٢
٧٢- عباس اقبال ص٢٦
٧٣- ابن الخلكان ٢٩٧/٣ - بروانە ابن ابي عذيبة ص٣١٢
٧٤- ابن الشعار، ج٦ ورقة ١٧
٧٥- ابن الشعار، عقود المجان ج٦ ورقة ١٧(دوای ئەو، ترجمە المبارک، ابن المستوفى)
٧٦- ن. م
٧٧- ابن خلكان ١٥١/٤ ط بيروت
٧٨- ن. م ١٤٧/٤ ط بيروت
٧٩- ابن الشعار ن. م
٨٠- ن. م ج٩ ورقة ٩٣
٨١- محەممەد مورتەزا زوبێدی دەربارەی ئەو دیوانە دەڵێت: ئە هراء کوری (هەری)یە، بە مانای خانەیەکی گەورە دێت و ئازووقەی سوڵتانی تیایدا کۆ دەکرایەوە (کۆگا). بەڵام ناوبراو دەڵێت: نازانین ئاخۆ ئەم وشەیە عەرەبییە یان بیانی - بروانە (تاج العروس) ٤١٠/١٠
٨٢- الاسعد بن مماتي، قوانين الدواوين، ص٣٥٠ بروانە النويري، نهاية الارب، ٢١٩/٨ - ٢٢٠
٨٣- ابن شاهين الظاهري، زبدة كشف الممالك ص١٢٢
٨٤- القلقشندي، ٣٣/٤
٨٥- ابن الشعار ج١ ورقة ٢٣
٨٦- ابن الطقطقي الفخري ص٣٠١
٨٧- ن. ص.
٨٨- النويري، نهاية الارب ٢٧٧/٨
٨٩- ابن الطقطقي ٣٠٤
٩٠- ابن الشعار، عقود المجان ج ٩ ورقة ١٢٢
٩١- ن. م ج٧ ترجمة محمد بن عمر بن علي
٩٢- حدیثە/ شارۆچکەیەکە لە سەر رووباری دیجلە بە لای رۆژهەڵات نزیک زێی گەورە. معجم البلدان ٢٣٠/٢
٩٣- ابن الشعار ن. و مەبەست لە حەشر (مردنة)- تاج العروس ١٤٣/٢ میراتی حەشرییەکان واتە ماڵی ئەو مردووانەی میراتگرێکی نزیکی نییە، یاخود ژنی نییە یاخود سەرپەرشتکاری نییە. بروانە القلقشندي، صبح الاعشى ٣/ ٤٦٠
٩٤- ابن الشعار ج٩ ورقة ١٢٢
٩٥- القلقشندي، صبح الاعشي ٣٥/٤
٩٦- الماردي: الاحكام السلطانية، ط القاهرة ١٩٦٠ ص٦٥ - ٦٦، النويري، نهاية الارب ٢٤٨/٦ - ٢٥٢
٩٧- الماردي ن. م ٧٠ -٧١، النويري ٢٥٥ - ٢٥٦
٩٨- كفر عەزا، ناوچەیەکە لە ناوچەکانی هەولێر بروانە: ابن سعيد الاندلسي: الغصون اليانعة ص٧٨... ياقوت حەمەوی دەڵێت: گوندێکە لە گوندەکانی هەولێر دەکەوێتە نێوان هەولێر و زێی بچووک قازی هەولێر ئەو گوندەیە - معجم البلدان ٢٧٠/٤

الاب (البیرابوون: دەڵێت: لە کۆندا چەقی هەرێمی حزە هەولێر بوو ئێستا بە تەواوی نازانرآ شوێنەکەی کەوتۆتە کوێ، بەڵام پێدەچێت گوندی(سەربس عەزیز)ی ئێستاکە بێت کە بە دووری (١٦ کم) لە باشووری رۆژئاوای هەولێر دوورە. بروانە الاب توما اسقف المرج (فی کتاب الرؤساء) ص١٢٦
٩٩- ناوی ئەبو عەبدوڵا حوسێن شەرەفەدین یەعقوبی هەزبانی

هەولێری کە لە (٦٥٦ک/١٢٥٨ز) کۆچی دوایی کردووە.
١٠٠- ابن سعيد الاندلسي، الغضون اليانعة ص٥٩
١٠١- اليانعة ١١٦
١٠٢- الجامع المختصر ٢٤٣/٩
١٠٣- الجامع المختصر ن. ص
١٠٤- ابن الشعار: عقود الجمان ج٧ ترجمة محمد بن علي محمد
١٠٥- حەمیدی بنەماڵەی(ئیبن مەنعە)ی هەولێرییە کە بە ناوبانگن.
١٠٦- الماوردي، الاحكام السلطانية ص٧٧ - النويري، نهاية الارب ٢٦٥/٦ - المقريزي، الخطط، ٢٠٧/٢
١٠٧- قدامة ابن جعفر، مخطوط (صفة الكتابة) ورقة ٤٤
١٠٨- بان الشعار، عقود الجمان ١٨٧١٦
١٠٩- ن. و
١١٠- الماوردي، الاحكام السلطانية ص٢٤٠ - النويري، نهاية الارب ٢٩١/٦ - ابن خلدون: مقدمة ٣٩٨ - القلقشندي رجع الاعشي ٣٧/٤
١١١- د. عبدالعزيز الدوري (نشؤ الاصنف و المرف في الاسلام(جملة كلية الاداب) - جامعة بغدا، العدد ١ لسنة ١٩٥٩ ص١٥٠
- دكتور حسام الدين السامرائي ص٣١٩
١١٢- شکاندنەوە، جۆرێکە لە پەروەرکردنی جا ج بە قسە بێت یان بە لێدانی(قامچی تایبەت) بێ کە ساحێبی ئەو پۆستە یان دوو کەس لەگەڵ دیاری دەکەن.. ئەو جۆرە سزادانە ناگاتە ناستی ناوزراندن - بروانە: الماروردی (الاحكام السلطانية ٢٣٦ - ٢٣٩)
١١٣- الماوردي، الاحكام السلطانية ٢٤٢ - النويري، نهاية الارب ٢٥٩/٦
١١٤- ابن خلدون، مقدمة ص٣٩٩
١١٥- ابن الشعار، عقود الجمان ١١١/٥
١١٦- لەم بارەیەوە بروانە (وفيات الاديان) ط ١٩٧١ بيروت ج٧ ص١٣، کە دکتۆر ئیحسان عەباس لە پێشەکیەکەیدا دەڵێت: لەسەردەمی گۆگبری لە هەولێر تەواوی دامودەزگاکان هەبوون، کە لە دەولەتێکی سەربەخۆدا بەرژەوەندییەکانی دەپارێزرێ.
١١٧- ئەتلاب کۆی (تەلەبە)یە، واتە ئەمیر کە لە گۆڕەپانی کوشتار سەرکردایەتی دوو سەد سوار چاک دەکات. هەروەها سەرکردەی دوو سەد و حەفتا سەربازیشی پێ دەوترێت. ئەو زاراوەیە بۆ یەکەم جار لە سەردەمی سوڵتان سەلاحەدین لە میسر و شام بەکارهێنرا. پاشان ناوەکە گۆڕانکاری بەسەر هێنرا بوو بە کەتیبە(بەتالیۆن لە BaH ilon ) بە سوپا. بروانە: السلوك ج١ ق ١ ص٢٤٨، پەراوێز.
الفتح القيسي: ط القاهره ١٩٦٥، ص٩٦ پەراوێز لە کاتێکدا سبط ابن جەوزی دەڵێت: هەر تەلەبێک (٥٠٠) سوار چاکی لەبن دەست بوو بروانە: مراة الزمان ٦٩٥/٨
١١٨- محمد مصطفي زيادة/ حاشية السلوك - للمقريزي ص ٢٣٩
١١٩- حسن ابراهيم حسن، السلام السياسي ج ع، ص٣٦٢، د. مسعودي تاريخ الحرب العصري ص٢
١٢٠- انظر البنداري (سنا البرق الشامي) ٢٠٠/١ تلخيص (البرق الشامي) للعماد الاصفهاني
١٢١- البنداري، سنا البرق الشامي ٢٠٠/١ الكامل ن. ص
١٢٢- ناوچەیەکە کەوتۆتە زنجیرە شاخەکانی نۆزال کە رووباری قۆڵگای پێدا دەڕوات - شمس الدين سامي - قاموس الاعلام (تركی) ج ٥ ص٣٥٩
١٢٣- ابن القلانسي: ذيل تاريخ دمشق ص٢٧٩. انظر السيرجب، صلاح الدين، دراسات في التاريخ الاسلامي ص١٥٩ - ١٧١ - الباز العريني، الشرق الادني في العصور الوسطي ص١٥٥ - ١٦٤ - ١٦٥، د. عمادالدين خليل، عيمادالدين زنكي ١٩٨
١٢٤- البنداري، ال سلجوق ٤٦ - ٤٧، ابو شامة، الروختين ١٧٣/١، جب صلاح الدين ١٧١ - ١٧٢ - الرويشدي، امارة موصل ص١١٢ - ١١٣ الباز العريني، ن. م ص١٦٥.
١٢٥- البنداري: ن.م.ص - جب: ن. م. ص١٧٢ - ١٧٣
١٢٦- ابن العبري، تأريخ الدول الرياني، مجلة المشرق/ جلد ٤٨ ص٤٣٩
١٢٧- سبط ابن الجوزي، مراة الزمان ٦٨١/٨
٨١٢- برای عەزەدین ئیبن ئەثیری مێژوونووسی بە ناوبانگە(٦٣٧ ک/١٢٣٩ ز)کۆچی دوایی کردووە.
١٢٩- مەبەست ئەو باڵندەیە کە لە سەر ئاڵای ساحێبی هەولێر نیگار کێشی بۆ کراوە.
١٣٠- دەربارەی پۆشاکی سەربازانی موسڵ بروانە: الديون حي، الموصل في العهد الاتابيكي ص٧٢. الجميلي، دولة الموصل، ص٢٥٨، سوادي الرويشدي، امارة الموصل ص١١٧
١٣١- الباهر ١٣٥
١٣٢- دەروەش وەک رێلە بروانە: ابن الخلق التبريزي، برهان ظاطع ص٤٨٢. بروانە: محمد موسي هنداوي، المعجم في اللغة الفارسية ص١٥١
١٣٣- بروانه هنداوي، المعجم في اللغة الفارسية ص١٥٦
١٣٤- سوادي الرويشدي، امارة الموصل ص٤٧
١٣٥- ن. م ص٤٨
١٣٦- مەفەردیان لە بنەچەدا ئارامییە(مەفریونو Mafryono) واتە بەر. مەبەست لەوە پایەی کلیسایە لە

نێوان بەتریک و ئەسقەف. بڕوانە: سوادي، امارة الموصل ص٤٥ پەراوێز(٢)

١٣٧- بطرس نصري، ذخيرة الاذهان. ج٢ ص ٥٤

١٣٨- النويري، نهاية الارب ٨/٢٢٧ - القلقشندي ٤/١١

١٣٩- ابن الشعار، عقود المجان ١/٢٥٩ ب

١٤٠- النويري، نهاية الادب ٨/٢٢٧

١٤١- القلقشندي ٤/١٢ - انظر ابن شاهين الظاهري، زبدة كشف الممالك ص١٢٢

١٤٢- د. حسين امين: العراق في العصر السلجوقي ٢٠٥

١٤٣- پارێزگار یان پاسەوانی سنوور بڕوانە: الرواندي: راحة الحدود واية السرور) النسخة الفارسية، تحقيق محمد اقبال ص١٠ من فهرست الكلمات و المصطلحات النادرة.

١٤٤- ابن خلكان ٣/٢٧٦

١٤٥- ابن الشعار ٥/٢٣٩ ز الصفدي، الوافي بالوفيات) ط دار صادرة بيروت ١٩٦٩ - ٧/٢٩٦

١٤٦- ابن الشعار، عقود المجان، ج ٧ ترجمة حياة محمد بن قرطاي - الصفدي، الوافي ٤/٣٥٣ ٧/٢٦٩

١٤٧- الصفدي ٧/٢٩٦

١٤٨- ابن الشعار: نفس الورقتين. الصفدي.

١٤٩- د. جعفر خصباك، العراق في العهد الاتابكي ص١٢٠

١٥٠- د. محمد باقر الحسيني، العملة الاسلامية في العهد الاتابيكي ص٧٢

١٥١- دانەری کتێبی دراو - پارە لێدراوەکانیان لە بە دەگمەن نەبێ درهەم و فلسیان لەکانزای مس جیانەکردۆتوە بەڵکو لە ژێرەوەیان نووسیوە (پارچەی مس) یاخود(باقر) واتە (مس) بە زمانی تورکی کە ئیسماعیل ئەدهەم غالب لە ل ١٣٨ بەکاری هێناوە. هەروەها لین پۆل بە هەمان شێوە بەکاری هێناوە.

**The Coins of turkman type v. 111, p.238**

١٥٢- انظر الاصطخري، المسايك و الممالك ط ١٩٦١، ص٩٨ - كي السترانج، بلدان الخلافة الشرقية ٣٥٤ و ٣٣٢ - عبدالرحمان فهمي، السكة العربية ص٣٤

١٥٣- القلقشندي، صبح الاعشي ٣/٤٦٣

١٥٤- القلقشندي ن. ص

١٥٥- الحوادث الجامعة ص٣٤٨

١٥٦- وڵاتی شارەزوور هەر لە ساڵی ٥٨٦ ک/ ١١٩٠ ز واتە هەر لەو کاتەی موزەفەرەدین کەوکەبەری گەڕایەوە هەولێر، کەوتە سەر ئەتابیکەی هەولێر و ئەو پێش ساڵی ٦٢٢ک/١٢٢٥ ز تەسلیم بە زاواکەی عیمادەدین زەنکی کرد بۆ ئەوەی لە بری ئەو حوکمڕانی بکات.

١٥٧ - ئەو دینارە لە ساڵی ٦٠٧ ک لێدراوە.

١٥٨- الحسيني، العملة الاسلامية ص٦٨ - ئەو دینارە لە مۆزەخانەی قاهیرەیە.

١٥٩- احمد ضياء، مسكوكات اسلامية تقويمي ص١٢٢. ئەو دینارە لە ساڵی ٩٥٠ ک و بە ژمارە ١٧٩٥ لێدراوە.

١٦٠- ن. م. ص. ئەو دینارە لە ساڵی ٦١٤ک بە ژمارە ١٧٩٦ لێدراوە.

١٦١- مجلة المسكوكات ص٦٤.

١٦٢- الحسيني: العملة الاسلامية ص٦٨.

١٦٣- الحقود المجان ج٤ ورقة ١٤٥.

١٦٤- ابن خلدون، القدمة ص٣٩٩.

**165- lane-pool, the coins of the Turkmen, v.111, p.232**

١٦٦- الحسيني: العملة الاسلامية ص١٣٧.

١٦٧- انظر موقوع العلاقة مع الخلافة العباسية.

١٦٨- زامباور، معجم الانسان و الاسرات المحاكمة ص٢٤٥.

١٦٩- عەباس عەزاوی وای بۆ دەچێت کە ئەو پەرچەیە لە شاری حەران لێدرابێ نەک لە هەولێر بڕوانە کتێبەکەی (النقود العراقية) ص١٩٥.

١٧٠- اسماعيل غالب، مسكوكات تركمانية متالوغي ص١٤٠.

١٧١- اسماعيل غالب ن. م. ص و في **caralogue desp.144**

١٧٢- احمد ضياء، مسكوكات اسلامية تقوعى. دنیاری ژمارە ١٧٩٥ ل ١٢٢ لە ساڵی ٩٥٠ ک لێدراوە.

١٧٣- الكامل ١٢/ ١٤٠

١٧٤- لە ساڵی ٦١٤ک/١٢١٧ز لێدراوە، بڕوانە: احمد ضياء، مسكوكات اسلامية تقوعى ص١٢٢، ديناري ژمارة ١٧٩٦.

١٧٥- ژمارە(**KK**/٦٥١)، (**II**/٦٥١) و(**PP**/٦٥١) - لين پول بە **Catalogue of oriental,v.p 311** باسی دەکات و دەڵێت لە ساڵەکانی(٦٠٩-٦١٠-٦١١ک) یەک لە دوای یەک لێدراون. پارچەیەکی تر لە مۆزەخانەی هەولێرە مێژووی لێدانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٥٩٧ک/ ١٢٠١ز، واتە ماوەی دەسەڵاتی شا عادل، هەرچەندە نەزانراوە پارچەکە بە تەواوی بناسرێتەوە.

١٧٦- پێویست ناکات ئەو پارانە بژمێردرێن، کە ئەو وێنەیان هەڵگرتووە لەبەر زۆرییان، حوسەینی دەڵێت: لەبەر ئەوەی بەستەرێک هەبووە لە نێوان وێنەی شێر و والی هەولێر و گۆگبری کە بە تورکی واتە(گورگی شین). پاشان حوسەینی دەڵێت: هیچ پەیوەندییەک لە نێوانیان بەدی ناکرێت، چونکە وێنەی شێر جیایە لەگەڵ وێنەی گورگ. بڕوانە کتێبەکەی (العملة الاسلامية ص١٤٠).

**و: مامۆستا فاتیح یاسین مودەریس**

# ڕۆڵی موجاهیدودین قایماز لە سیاسەت و ئیدارەی هەردوو میرنشینی هەولێرو موسڵ (لە ساڵی ٥٥٩ -٥٩٥ کۆچی)

پرۆفیسۆر دکتۆر ئارسن موسا ڕەشید
کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەدین

**دەستپێک**

ئەو لێکۆڵینەوەیە باس لە کەسایەتییەک دەکات، کە لەگۆڕەپانی سیاسی هەردوو میرنشینی هەولێرو موسڵ لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا دەرکەوت ئەویش موجاهیدودین قایمازە، کە ڕۆڵێکی زۆر گرینگی هەبووە لە ئیدارە و بەڕێوەبرنی سیاسەتی هەولێر و موسڵدا، لەوماوەیە میرنشینە ئیسلامییەکان لەلایەن خاچپەرستە داگیرکەرەکانەوە هەڕەشەیان لێ دەکرا، لە کاتێکدا کە دەوڵەتی عەباسییەکان دووچاری بێ هێزی و هەڵوەشانەوە ببوبوو، کێشەو ململانێ لە نێوان لایەنە دەسەڵاتدارەکان لە زیادبووندا بوو. یەکێ لەو میرنشینانەی کە لەدەوڵەتی عەباسییەکان جیا بووبۆوەو میرنشینێکی سەربەخۆی دامەزراند، دەوڵەتی ئەیووبی بوو (٥٧٠ ک - ٦٤٨ک). دواتر دەوڵەتی زەنکی بوو لە موسڵ و حەلەب، کە ڕۆڵی چالاکانەی هەبوو لە ڕووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستە داگیرکەرەکان کە لەڕۆژئاواوە هاتبوون. لە دووماهی ئەو سەدەیەدا خەلافەت بووژاندنەوەیەکی بەهێزی بەخۆوە بینی، بەتایبەت لە سەردەمی خەلیفە ناسر لیدینیللا، کە لەساڵی (٥٧٥ک -٦٢٢ک ) حکومڕانی کرد و ویستی بە هێزی سەربازی خەلافەتی عەباسی بگەڕێنێتەوەو دژی ناحەزانی بوەستێت.

موجاهیدودین قایماز کەسایەتییەکی سیاسی سەربازی چالاک بوو لە مێژووی عەرەبی ئیسلامیدا.

ئەم لێکۆڵینەوە ڕۆڵی گرینگی موجاهیدودین قایماز و چالاکییە سیاسی و ئیدارییەکانی و ڕۆڵ بینینی لە دامەزراندنی هەولێرو بەرگریکردن لە میرنشینی موسڵ لە خۆ دەگرێت.

هەروەها ئەم لێکۆڵینەوە تیشک دەخاتە سەر کاروانی موجاهیدودین قایمازو کەسایەتییەکەی، کە چۆن کاریگەری هەبووە لە کارە ئاوەدانکردنەوەییەکانی و بایەخدانی بەدامودەزگا ئایینییەکان.

هەمدیس ڕۆڵی موجاهیدودین قایماز دەردەخات لە کاریگەری بوونی لە هەردوو میرنشینی هەولێر و موسڵ، بەتایبەتی ڕۆڵ بینینی لە گۆڕینی میرەکان لە پۆستەکانیان و بەو کەسایەتییانەی کە خودی خۆی دەیویست. هەروەکو بەرامبەر موزەفەرەدین گوگبری کردی و لە میرنشینەکە لایداو براکەی زەینەدین یوسفی لە شوێن دانا. لە موسڵیش بەهەمان شێوە عیزەدین مەسعود

ئەتابەگی دانا لە شوێن سنجر شا کوڕی سەیفەدین غازی.

**ناو و نازناو و ژیانی:**

ناوی ئەیوب جەعفەر مەنسور قایماز کوڕی عەبدوڵلا زینی بە نازناوی موجاهیدودین خادم ناسراوە[١] مەبەست لە زینی زەینەدین عەلی کوچکە، باوکی موزەفەرەدین گوگبری میری (ساحیب) هەولێر، چونکە موجاهیدودین قایماز پێشتر بەندەی ئەو بوو[٢] بەڵام ئازادی کردبوو بە ئەتابکا[٣] بۆ منداڵەکانی موزەفەرەدین و یوسف[٤] نەژادی موجاهیدودین قایماز سیستانییە[٥] ئیبن خەلەکان دەڵێت: (بچووکێکی سپی پێستی لێ وەرگرت)[٦] بەڵام ئەو سەرچاوانەی لەبەر دەستدان ڕێکەوتی لە دایکبوونی موجاهیدودین قایمازیان دیاری نەکردووە، بەڵکو تەنیا ڕێکەوتی مردنیان نووسیوە. سەرچاوەکان باسیان لەوە کردووە، کە موجاهیدودین بە بچووکی لە گوندێک بە ناوی فورادی لە سجستان وەرگرتووە[٧] بەڵام ساڵی بەدیل گرتنەکەیان نەنووسیوە کە کردیانە بەندەو چۆن زەینەدین عەلی کوچک کڕیویەتی و لە چ کاتێک ئازادی کردووە؟ ئایا دەشێ بڵێین زەینەدین عەلی کوچک پاش ئەوەی ئازادی کرد، کە موجاهیدودین سیمای ژیری و پیاوەتی لێوە دەرکەوت، کە ئەوە بسەلمێنێت پیاوێکەو سیمای تایبەتی هەیەو ئایندەیەکی گەورە چاوەڕوانی دەکات. کەسایەتی موجاهیدودین قایماز

کەسایەتی دیکەی وەک ئەبوو مسک کافورمان بیر دێنێتەوە کاتێ بەدیل گیراو کرا بە بەندەو ئەخشیدی حاکمی میسر کڕی و کردی بە منداڵێک لە پاڵ منداڵەکانی و لە دوماهیدا بە ناوی منداڵەکانی ئەخشیدی حوکمی میری کرد[٨] کاتێ زەینەدین عەلی کوچک زانی موجاهیدودین قایماز سیمای تایبەتی هەیە هەروەکو پێشتر باسمان کرد و کردییە ئەتابەکەی منداڵەکانی و ئەویش لە خودی خۆی هەستی بەشتێ کرد و پاش ئەوە بەناوی منداڵەکانی زەینەدین عەلی کوچک بوو بە حاکمی هەولێر. موجاهیدودین لە سەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام پەروەردە کراو لەسەر مەزەبی ئەبی حەنیفە بوو، لەسەر ئەم مەزەبە پێگەیشت. ئەتابەکە بوو بە هی منداڵەکانی زەینەدین عەلی کوچک، تەماشا دەکەین ڕۆشنبیری ئایینی دەچاندوپابەندبوون بەپرێنسیپەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام. لە هەمان کاتدا خۆشەویستی خێرخوازی و چاکسازی لە نێو خەڵک دەچاند بەڵگەش لە سەر ئەوە لە کارەکانی موزەفەرەدین گۆگبری لەرووی خۆشەویستی خێرخوازی و جیهادکردن لە پێناو ئایینی خوا دەبیندرێت[١٠]. چاکترین بەڵگەش ئەوەیە کە موجاهیدودین قایماز بە باشترین شێوە پەروەردەی کردن کاتێ بوو بە ئەتابەگی بۆیان. موجاهیدودین قایماز خودی خۆی نموونەی خێرخوازی و چاکسازی بوو. هەر وەکو مێژوونووسان وەک ئیبن ئەسیرو ئیبن خەلەکان باسی دەکەن، کە پیاوێکی ئایینپەروەر بووە و بۆ خەڵکی هەولێر

و موسڵ حەزی لەخێرخوازی و چاکسازی بووە[١١]. هەروەها خۆشەویستی زۆری بۆ ئایینی ئیسلام بووە تا وای لێ کردووە بایەخ بە دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانە و بایەخدانی بەزاناو فەقیهەکان بدات[١٢] سروشتی کەسایەتییەکەی وابوو حەزی لە چاکەخوازی بوو هەرگیز حەزی لەشەڕ خوازی و ناکۆکی و جیاوازی نێو موسڵمان نەبوو. ئیبن ئەسیر باسی ئەو ئاژاوەیە دەکات، کە لە ساڵی (٥٨١ک) کەوتە نێوان کورد و تورکمانەکان، کە موجاهیدودین قایماز بە سیفە تی ئەوەی ئەوسا لەموسڵ جێگیری ئەتابەگ بوو هەوڵ و کۆششی خۆی خستەگەڕ لەپێناو کوژاندنەوەی ئەو ئاژاوەیە، کە کەوتبووە نێوان هەردوو لایەنی شەڕکەر بە پەیڕەوکردنی سیاسەتی ژیرانەی، تەنانەت بگرە لە پێناو ئەو کارەدا پارەیەکی یەکجار زۆری خەرج کرد[١٣]. بۆیە پێویستە باس لەرۆڵی موجاهیدودین بکەین لەپەیڕەوکردنی سیاسەتەکەی لە هەولێرو موسڵ، هەروەها کەسایەتی و ژیرییەکەی چۆن کاریگەری هەبووە لەسەر حوکمڕانییەکەیدا. بەڵام لەرووی ژیانی خێزانارییەوە ئیبن ئەسیر دەڵێت: موجاهیدودین قایماز نێرەمووک بووە، هەتا عیزەدین مەسعود ئەتابەگی موسڵ ماوەی پێداوە بچێتە ناو ماڵەکەی و تێکەڵ بەخێزانەکانی بێت[١٤] ئەوەی زیاتر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە موجاهیدودین نە ژن نە منداڵی نەبووە. هەروەها ئەبوشامەی مەقدیس دەڵێت: موجاهیدودین قایماز

کەنیزەیەک بەناوی (ئەقسرا) خێزانی بوو دراوسێی عیزەدین مەسعودیش بووە[15] گەر سەرنجی باسکردنی ئەبوشامەی مەقدیس بدەین لەگەڵ باسکردنی ئیبن ئەسیر یەک ناگرێتەوە، چونکە گەر نێرەمووک بوایە، ئەوا هەرگیز نەیدەتوانی ژن بێنێت. لەهەمان کاتدا پێدەچێ قسەکانی ئیبن ئەسیر دروستتر بێ لەبەر چەند هۆکارێک: یەکەم: گەر موجاهیدودین قایماز نێرەمووک نەبوایە ئەوا عیزەدین مەسعود ماوەی پێ نەدەدا بچێتە ناو ماڵەکەی و تێکەڵ بەخێزانەکانی بێت. دووەم: ئیبن ئەسیر زێتر موجاهیدودین قایمازی ناسیوە، لەوەی کە ئەبوشامە دەیناسی، چونکە ئیبن ئەسیر و براکەی محەمەد ئەبوسەعات هی یەک سەردەمن، لە کاتێکدا ئەبوشامە لە سەردەمی ئەو نەبووە و نەیدیوە و نەیبینیوە و هیچ شتێکی دەربارەی نەزانیوە تەنیا ئەوە نەبێت، کە لەرێگای کتێب و گێرانەوەکان پێی گەیشتووە. پێدەچێ ئەبوشامە بە وەهم داچووبێ کاتێ گوتوویەتی موجاهیدودین ئەقسەرای هێناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لەوانەیە عیزەدین مەسعود کەنیزەکەی پێشکەش کردبێ، وەک خزمەتکار یان راگری ماڵ، نەک خێزانی بێت. هەروەکو پێشتر باسمان کرد موجاهیدودین قایماز ئاینی پەروەرێکی توندبووە لەهەرساڵێک چوارمانگ بەرۆژوو بووە. ئیبن ئەسیر دەڵێت: چەند ویردێکی هەیەو لەهەموو شەوانێکدا زۆری دەخوێند، خێری زۆر دەکرد فیراسەی باشی هەبوو بۆ ئەو کەسانەی شایەنی ئەوەبن خێریان پێ دەچێت یان نا. هەژار و دەست کورتی دەناسی و بەخێر پێیانی دەبەخشی[16]. (سەرەرای ئەوەش ئەبوشامەی مەقدیس دەڵێت: مووچەی زۆری دەبەخشی، تەنانەت وای لێهاتبوو لە موسڵ ماڵێک نەمابوو هەژاربێ، هەمووەدەوڵەمەند بووبوون)[17]، ئەمەش دەلالەت لەسەر خێرخوازی و چاکەکاری ئەو دەکات لەگەڵ هەژار و دەست کورتاندا. موجاهیدودین قایماز ئاقڵ و هۆشمەند بوو، ئارەزووی وێژە و ئەدەبی دەکرد. ئیبن ئەسیر دەربارەی ئەو دەڵێت: نووسەرێکی بەتوانا و شارەزاییەکی باشی هەبوو، هەروەها (مێژووی دەخوێندەوە و هۆنراوە و چیرۆکی ئەزبەر دەکرد)[19] لەو روانگەیەوە دەردەکەوێ، کە کەسێکی رۆشنفکر و ئاقڵ و هۆشمەند بووە، بۆیە لە توانایدا بووە بە باشترین شێوە حوکمرانی هەردوو ئیدارەی هەولێرو موسڵ بکات. تەنانەت بگرە لەساڵی (٥٨٦ک) خەڵکی هەولێر ویستیان بۆجارێکی تر بیگەرێننەوە بۆ حوکم، بەڵام خۆی رەتی کردەوە[20].

### موجاهیدودین قایماز جێگری زەینەدین عەلی کوچک لە هەولێر لە ساڵی ٥٥٩ک - ٥٦٣ک

کاتێ زەینەدین عەلی کوچک بینی موجاهیدودین قایماز هۆشمەندەو کارەکان بە ژێری رادەپەرێنێت کردییە ئەتابەگەی منداڵەکانی لە شاری هەولێر. چونکە هەولێر بووبووە موڵکی زەینەدین عەلی کوچک پاش ئەوەی عیمادەدین زەنگی لە هەزبانییەکانی وەرگرتەوە(٢١) لە ساڵی ٥٢٦ک(٢٢) کەرتەکانی دایە زەینەدین عەلی کوچک[23] چونکە سەروەت و سامان و منداڵەکانی لای ئەو داناو لای کەسی تری دانەنا. بۆیە لێرەدا دەبینین کە زەینەدین، موجاهیدودین قایمازی هەڵبژاردووە، کە ئەتابەگەی منداڵەکانی پێ بسپێرێت، لەهەمان کاتدا جێگرێکی دیکەی زەینەدینیش هەبووە لە هەولێر ناوی سرفتکین ئەبو مەنسور کوری عەبدوڵلا بووە. هەروەکو دکتۆر موحسین حوسێن (دەشێ سرفتکین یەکەم کەس بووبێ کە زەینەدین بەجێگری خۆی لەهەولێر دایمەزراندبێ پاش ئەوەی بووە خاوەن کەرت)[24] سرفتکین تاساڵی ٥٥٩ک بەجێگر مایەوەو لە هەمان ساڵیشدا کۆچی دوایی کردووە[25]. پاش ئەوە زەینەدین عەلی کوچک جێگری هەولێری تەسلیم بە ئەتابەگی منداڵەکانی موجاهیدودین قایمازی کرد[26] کە تا ساڵی ٥٦٣ک بەردەوام بوو لە حوکمرانیکردنی هەولێر بەناوی زەینەدین عەلی کوچک. زەینەدین موسڵی جێهێشت و ئەوەی لەژێردەستی بوو لە میکانیزمەکان تەسلیمی کردەوەو گەرایەوە بۆ کەرتەکانی، هۆکارەکەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە زەینەدین عەلی کوچک پاش ئەوەی تەمەنی لە ١٠٠ساڵ تێپەر کرد کەر و کوێر بوو نەیتوانی کاروباری دەوڵەتی زەنگی هەڵبسوورێنێ. بریارەکەی ئەوەبوو بگەرێتەوە هەولێر بۆ ناوماڵ و منداڵ و خاوخێزانی خۆی[27]، وا دەردەکەوێ هۆکاری سەرەکی تەسلیم

کردنەوەی میرنشینەکان بۆ قوتبەدین مەودود ئەتابەگ لە موسڵ لەبەر گەورەیی تەمەنی بووە. دکتۆر عەبدولقادر ئەحمەد تلیمات هۆکارێکی دیکە دەخاتە ڕوو کە بوویێتە هۆی ئەوەی زەینەدین عەلی کوچک میرنشینەکان تەسلیم بەقوتبەدین مەودود بکات، ئەویش ئەوەیە هیچ کوڕی وای نەبووە دەست بدات، کە حوکمڕانی ئەو میرنشینانە بکات، چونکە تەنیا دوو کوری هەبووە، گەورەکەیان موزەفەرەدین گوگبری بووە، کە ئەوسا تەمەنی ١٤ساڵ بووە، هەڵبەتە کەسێک لەو تەمەنەدا ناتوانێ حوکمڕانی ئەو هەموو ویلایەتە زۆرانە بکات[٢٨]. گریمان ئەگەر کوڕەکانی زەینەدین عەلی کوچک لە تەمەنی باڵقبووندا بان، ئایا زەینەدین عەلی کوچک لەتوانایدا هەبوو ئەو میرنشین و کەرتانە نەگەڕێنێتەوە بۆ ئەتابەگی موسڵ؟ هەڵبەتە وەڵام بە نەخێر دەبێت، چونکە زەینەدین عەلی کوچک جێگریان بوو، جا کە ڕەتی کردبایەوە ئەو میرنشینانە بگەڕێنەوە، ئەوا ئەگەری ئەوە لە ئارادا بوو ئەتابەگی موسڵی بەهێز گەراندبایەوە. ئەگەر بەهێزیش نەیتوانیبایە وەری بگرێتەوە، ئەوا لەوانەیە پەنای بۆبراکەی نورەدین مەحمود ببردایە لە شام، کە هێزێکی زۆری هەبوو، لەتوانایدا هەبوو سەرجەم میرنشینەکان بگەڕێنێتەوە. دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین زەینەدین خۆی شاری هەولێری هەڵبژارد، چونکە عیمادەدین زەنگی پێی دابوو. بۆیەش زەینەدین ئەوشارەی هەڵبژارد تاوەکو ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانەکەی لێی دابنێ. جا ئەگەر هاتبوایە هەر جێگرێک لەنوێنەرانی ئەتابەگەی موسل چەند کەرت و میرنشینێکیان وەرگرتبایە، ئەوا بۆ ئەتابەگەی موسڵ هیچ نەدەمایەوە حوکمی تێدابکەن. هەتا لە هەولێریش ئەو کەرتانەی سەر بەمنداڵەکانی زەینەدین عەلی کوچک بوون، سەر بە ئەتابەگەی موسل بوون تا ئەوکاتەی زەینەدین یوسف میری هەولێر ڕایگەیاند، کە سەر بەسەلاحەدینە[٢٩]. بەهەرحاڵ زەینەدین عەلی کوچک لەهەولێر نیشتەجێ بوو، بەڵام زۆر تیایدا نەژیا، چونکە پاش ئەوەی لەمانگی زیلحەجەی ساڵی٥٦٣ک گەڕایەوە لە هەمان ساڵیش کۆچی دوایی کرد[٣٠].

### موجاهیدودین قایماز ڕاسپێردراو و حاکمی هەولێر لە ساڵی ٥٦٣ک - ٥٧١ک

لە پاش مردنی زەینەدین عەلی کوچک کوڕەکەی موزەفەرەدین جێی گرتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی منداڵ بوو تەمەنی چواردە ساڵ بوو، بۆیە ئەتابەک موجاهیدودین قایماز بوو بە ڕاسپێردراوی ئەو[٣١] لەوانەیە موجاهیدودین مامۆستای موزەفەرەدین بووبێ فێری خۆشەویستی زانست و چاندنی خۆشەویستی و سوارچاکی کردبێ. موزەفەرەدین لە گۆڕەپانی جەنگەکاندا بە بلیمەت و چاونەترس دەردەکەوت[٣٢]، بەڵام موزەفەرەدین نەبوو بە میری هەولێر و ڕاسپێردراوەکەی موجاهیدودین قایماز دەستڕۆ بوو لە حوکمڕانیداو کاروباری حوکمڕانی زۆر بە وردی بەڕێوە دەبرد و هەڵدەسووڕاند، موزەفەرەدین هیچ دەسەڵاتی نەبووە، ئەگەری ئەوەش هەیە موجاهیدودین قایماز ئەتابەگی موزەفەرەدین بووبێ. بۆیە لە موزەفەرەدین پێشبینی ئەوەی دەکرد ملکەچ بێ بۆ فەرمانەکانی و ڕاسپاردەکەی ڕەت نەکاتەوە و بەرهەڵستکاری نەکات. لەهەمان کاتدا پێدەچێ لێی هیوا براو بووبێ، موجاهیدودین قایماز موزەفەرەدینی لە میرنشین دوورخستەوە[٣٣] هەروەکو ئیبن خەلەکان دەڵێت: موجاهیدودین لێی توورە بوو مەحزەرێکی لەسەر نووسی کە ئەمە شایەنی میرایەتی نییە، بۆیە ڕاوێژی دیوانی خەلیفەی کرد تا لەرێگەی یاساوە لە میرایەتی دووری بخاتەوە[٣٤] کاتێ لەبەغدا ڕەزامەندی گەڕایەوە موجاهیدودین قایماز موزەفەرەدینی لاداو لە شوێنی ئەو براکەی خۆی زەینەدین یوسفی داناو موزەفەرەدینی دەستگیر کرد. بەڵام ئەو هۆکارانەی وای لە موجاهیدودین قایماز کرد موزەفەردین لە حوکمڕانی هەولێر دووربخاتەوە، مێژوو نووسەکان هیچ شتێکیان دەربارەی ئەو هۆکارانە نەخستۆتە ڕوو. بەڵام دکتۆر موحسین محەمەد دەڵێت: (گرنگترین هۆکار لەسەر ئەم ناکۆکییەی کەوتە نێوان هەردوو لاوە لەسەر ئەو بەرنامە بوو، کە پێویست بوو هەولێر بەرامبەر موسڵ بیگرتبایە بەر. ئەویش موزەفەرەدین گوگبری وای دەبینی، کەوا پێویست دەکات هەولێر سەربەخۆیی وەربگرێ و لە ئەتابەگەی موسڵ جیابکرێتەوە،

لەکاتێکدا موجاهیدودین قایماز پێچەوانەی گوێگری بوو، زۆرترین پارەو داهاتی هەولێریشی بۆ موسڵ دەنارد[٣٦] هەروەها دەشێ هۆکارێکی دیکەی زۆر گرینگ باس بکەین لەسەر ئەم ناکۆکییە، ئەویش موزەفەرددین وای لەخۆ ڕادەدیت، کە لەتوانایدا هەیە قورسایی حوکمڕانی بگرێتە ئەستۆ، دەیویست خودی خۆی ئیدارەی حوکمڕانییەکە بگرێتە دەست بەبێ ڕاسپاردەو خۆی ببێتە حاکمی میرنشینەکەی، موزەفەرددین هەرچەندە بچووک بوو، بەڵام کاتێ موجاهیدودین قایماز وەدەرێیی نا، شاری حەرانی لە ئەتابەگەی موسڵ وەرگرت جاگەر هاتبوا توانای حوکمڕانی نەبوایە، ئەوا هەرگیز نەیدەتوانی دەسەڵاتی ئەو شارە بگرێتە دەست، کە نزیک بووە لە خاچپەرستەکان. کەواتە ناکۆکییەکە لەسەر ئەوە بووە کێ حوکمڕانی هەولێر دەکات. جا پاش ئەوەی میرنشینی هەولێر کەوتە ژێر دەسەڵاتی موجاهیدودین قایماز، ڕەتی کردەوە، کە ملکەچ بێ بۆ موزەفەرەدین. لەلایەکی دیکە ئەگەری ئەوە لە ئارادا بوو، کە موزەفەرددین پیلان بگێڕێ بەمەبەستی وەدەرنان و لابردنی موجاهدودین، لەگەڵ ئەوەش لەبەرامبەری وەستا. پێشتر باسمان کرد کە موجاهیدودین لەسەر ئەو مەسەلەیە ڕای خەلیفەی عەباسی وەرگرت و لای میرەکانی هەولێرو موسڵیش ڕێزێکی گەورەی هەبوو، بۆیە موجاهیدودین قایماز لەسەر موزەفەرەدین بەپەسندتر دانرا. کاتێ ڕەوشەکە بۆ ئەو و زەینەدین یوسف ئارامی بەخۆوە بینی، موجاهیدودین قایماز موزەفەرەدینی لە زیندان ئازاد کردو لە هەولێر دەری کرد[٣٧] موزەفەرەدین هەڵسا چوو بۆ بەغدا، لەوێ لەلایەن بەرپرسانەوە سکاڵای پێشکەش کرد بەرامبەر ئەو دوژمنکارییەی موجاهیدودین دەرهەق مافە ڕەواکەی کردووە، بەڵام نەکەس گوێی لێ گرت و نەهیچیان بۆ کرد[٣٨] ئینجا موزەفەرەدین ڕووی لە موسڵ کرد بەو هیوایەی، کە دۆستەکەی سەیفەدین غازی کوڕی مەودود ڕێگەچارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە و گوێی لێ بگرێ و بەمەبەستی گەڕانەوەی بۆ هەولێر هاوکاری بکات. بەڵام سەیفەدین غازی ئومێدەکەی بەجێ نەگەیاند، تەنیا ئەوە نەبێت هەروەکو پێشتر باسمان کرد کەرتی شاری حەرانی دایەو گواستییەوە بۆ ئەوێ[٣٩]. زەینەدین یوسفیش بوو بەمیری هەولێر، بەڵام هیچ دەسەڵاتی نەبوو تەنیا ناو بوو، حوکمڕانی فەرمانەکان بەدەست موجاهیدودین قایماز بوو، مەسەلەی چارەسەری کێشەکان و پەیمان بەستن و سەرکردایەتی سوپا هەر بەدەستی ئەو بوو. هەروەکو ئیبن ئەسیر دەڵێت: وڵات بۆ زەینەدین تەنیا ناو بوو و هیچی تر، بەڵام بۆ موجاهیدودین ناوو هەموو شت بوو[٤٠] موجاهیدودین قایمازیش ئەوەی دەویست، بۆیە موزەفەرەدینی وەدەرناو براکەی زەینەدین یوسفی کردە میری بێ دەسەڵات.

## موجاهیدودین قایماز لەخزمەت سەیفەدین غازی ساحیب موسڵ و

## ڕۆڵ بینینی لە سیاسەت و ئیدارەی موسڵدا

دیارە موجاهیدودین پاش ئەوەی بەسەر موزەفەرددین زاڵ بوو ماوەیەکی زۆر لە هەولێر نەمایەوە، چونکە گوێزرایەوە بۆ موسڵ، کاتێ سەیفەدین غازی میری (ساحب موسڵ) لەساڵی ٥٧١ک بەدوایدا نارد[٤١] و فەرمانی بە موجاهیدودین قایماز کرد هەولێر جێ بهێڵێ و ببێتە پارێزگاری(دز دارا) لە قەڵاتی موسڵ و هەروەها جێگری ئەتابەگ سەیفەدین غازی بێت[٤٢] لێرە دەسەڵات بەکردەکی بە دەستی موجاهیدودین قایماز بوو، جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست لە تەواوی کارەکان، هەروەکو ئیبن ئەسیر باسی دەکات[٤٣] وا پێدەچێ موجاهیدودین دەسەڵاتی ڕۆیشتبێ بەسەر سەیفەدین غازیدا، تا وای لێهات فەرمانی دەستگیر کردنی وەزیرەکەی جەلالەدین محەمەد کوڕی عەلی دا بەهۆی ناکۆکی لە نێوانیاندا[٤٤] دیارە ئەو هۆکارە بووە هۆی ئەوەی سەیفەدین غازی مل بۆ موجاهیدودین قایماز کەچ بکات. لەم ساتەوکاتەدا دەسەڵاتداریەتی سەلاحەدین دەستی بەوەکرد کە هەڕەشە لە سەروەت و سامانی سەیفەدین غازی بکات، بەتایبەت لە شاری حەلەبدا. ئەمەو پاش ئەوەی زانی پەکی کەوتووە لەوەی کە بەتەنیا دژی سەلاحەدین بوەستێ، موجاهیدودین قایمازی کردە جێگری خۆی لە ڕاپەڕاندنی کاروباری دەوڵەتدا. زانراویشە کە موجاهیدودین قایماز پلانگێڕێکی باش بووە. سەیفەدین غازی باشی

دەزانی، کە موجاهیدودین قایماز ئەو کەسەیە کە لەتوانایدا هەیە کاروباری دەوڵەت هەڵبسوورێنی و هەڵوێستی خۆی بنوێنی لە دژی سەلاحەدیندا. هەروەها وادیارە موجاهیدودین لەم بارەوە سەیفەدین غازی هیوابڕ نەکردووە. چونکە لە ساڵی ٥٧١ک کاتێ سەیفەدین غازی لەلایەن سەلاحەدینەوە نوشووستی هێناو شاری حەلەبی جێهێشت، سەلاحەدین وا مەزەندەی برد کە تا موسڵ ڕاوەدوی دەنێت. ئەو ڕاوێژی بە وەزیرەکەی جەلالەدین و جێگرەکەی موجاهیدودین قایماز کرد، کە موسڵ جێ بهێڵن و لە قەڵاتی حەمیدیە بمێننەوە[٤٥] موجاهیدودین قایماز وەڵامی دایەوەو گوتی: گەر سەلاحەدین موسڵی لە تۆ وەرگرت لە تواناادا دەبێت بە هەندێک یەکەی سەربازی بەرهەڵستکاری بکەیت. سەیفەدین لە وەڵامدا گوتی نەخێر. جا موجاهیدودین هێنایەوە سەر خۆی و بەهێزی کردو وای لێ کرد دژی سەلاحەدین بودستێ ئەمە بووە هۆی ئەوەی سەیفەدین غای لە موسڵ جیا نەبێتەوە[٤٦] پاش ئەم مشتومڕە کەسایەتی موجاهیدودین بەرز ڕاگیرا و سەیفەدین غازی هەڵسووڕاندنی کاروباری سوپاکەی دایە دەست[٤٧] بەمەش موجاهیدودین قایماز ئیدارەی هەردوو دەسەڵاتی سیاسی و سەربازی لە یەک کاتدا گرتە دەست.

### ڕۆڵی موجاهیدودین قایماز لەکاتی وەرگرتنی عیزەدین مەسعود ئەتابەگی موسڵ

سەیفەدین غازی لە مانگی سەفەری ساڵی ٥٧٦ک مردووە[٤٨] ئەمە پێش مردنی بەنیاز بوو کوڕەکەی سنجر شا بکات بە ئەتابەگی موسڵ، بەڵام بەتەمەن بچووک بوو، لە دوانزە ساڵی تێ نەدەپەڕاند، ئەوە بوو براکەی عیزەدین مەسعود بەم کارە ڕازی نەبوو، چونکە دەیویست خۆی ببێ بە ئەتابەگی موسڵ نەک برازاکەی. جا موجاهیدودین قایماز و گەورە میرانی موسڵ لەگەڵ ڕاو بۆچوونی عیزەدین بوون[٤٩] لێرە ڕای موجاهیدودین قایماز کاریگەرییەکی زۆری لەسەر سەیفەدین غازی هەبوو و پێی ڕاگەیاند، کە عیزەدین بۆ ئەم کارە باشترە، چونکە کوا یەکێ بەتەمەن وەکو براکەی حوکمڕانی بکا یان منداڵێکی بچووک. نەوەی ئیبن جوزی ئەو قسانەمان بۆ دەگێڕنەوە، کە موجاهیدودین بە سەیفەدین غازی گوتووە: (زانیمان کە سەلاحەدین دەستی بەسەر وڵاتدا گرتووەو لە ئێمە نزیک بۆتەوە، بۆیە من لەگەڵ ئەوە نیم، کە سنجر شای منداڵ حوکمڕانی وەربگرێت، بەڵام عیزەدینی برات بەتەمەنەو خاوەنی ڕای خۆیەتی و ئازایە. ئەویش بەڵێنی پێداو کردییە ڕاسپاردەی منداڵەکانی[٥٠] لێرە ئەوە بەدیار دەکەوێت، کە موجاهیدودین قایماز سەیفەدینی ترساندبێ لە سەلاحەدین بەو قسەی کە پێی گوتووە: گەر تۆ کوڕە بچووکەکەت بکەی بە ئەتابەگی موسڵ، ئەوا بۆ سەلاحەدین زۆر سانا دەبێت دەست بەسەر موسڵدا بگرێت، بۆیە سەیفەدین ڕای خۆی گۆڕی و ڕای موجاهیدودین قایمازی پەسند کرد و عیزەدین مەسعودی براکەی کردە ئەتابەگی موسڵ. کە عیزەدین مەسعود بوو بە ئەتابەگی دەسەڵات کەوتە ژێر کۆنترۆڵی موجاهیدودین قایماز، بەمەش حوکمڕانی قایماز بەهێز بوو و دەسەڵاتی بەسەر هەموویاندا شکا. گومان لەوەدا نییە موجاهیدودین قایماز بەو ئاستە بەهێز بوو دەسەڵاتی وا ڕۆیشت، تا وای کرد عیزەدین مەسعود ملکەچی بێت و هەموو کارێک ئەنجام بدات لە پێناو بەجێگەیاندنی داواکارییەکانی موجاهیدودین. ئیبن ئەسیر بۆمان دەگێڕێتەوە، کە عیمادەدین کوڕی مەودود میری (ساحیب) سنجار داوای شاری حەلەبی لە براکەی عیزەدین مەسعود کرد کە لەبەرامبەر ئەوە دەستبەرداری شاری سنجار بێت، بەڵام عیزەدین ئەو داوایەی ڕەت کردەوە. موجاهیدودین قایماز عیزەدینی ناچار کرد، کە شاری حەلەب تەسلیم بە براکەی بکات، عیزەدینیش بۆی نەبوو سەرپێچی بکات[٥١]، وا دیارە ناچارکردنی عیزەدین مەسعود لەلایەن موجاهیدودین قایماز کە شاری حەلەب تەسلیم بە براکەی بکات لەبەرامبەر سنجاردا لەبەر چەند هۆکارێک بووە لەوانە: -

یەکەم: موجاهیدودین قایماز سیاسەتمەدار بووە دەیزانی عیمادەدین هەڕەشەی لێ کردووە، گەر بێتو براکەی داواکارییەکەی پەسند نەکات ئەوا شاری سنجار تەسلیم بە سەلاحەدین دەکات[٥٣]، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەوسا شاری موسڵ دەکەوتە بەر هەڕەشەی سەلاحەدین، چونکە سوپاکەی لێی نزیک بوو، جا

گەر ئەوە نەبوایە موجاهیدودین هەرگیز ئەوەی قەبوڵ نەدەکرد، لەهەمان کاتدا دەشیزانی کە عیزەدین مەسعود ئاگای لەمەترسی ڕەتکردنەوەی داوای براکەی نییە، بۆیە ناچاری کرد داواکەی پەسند بکات.

دووەم: میرەکانی حەلەب ملکەچ نەبوون بۆ موجاهیدودین قایماز، بۆیە ویستی لێیان دەرباز بێت و شاری حەلەب تەسلیم بە عیمادەدین بکات.

سێیەم: هەروەکو ئیبن ئەسیر بۆی گێڕاینەوە موجاهیدودین قایماز لە عیزەدین مەسعود دەترسا (چونکە خودی خۆی بەگەورە دەزانی و سوپاکەشی لە زیادبووندا بوو)[٥٤]. دەشێ بڵێین ئەوە هۆکاری سەرەکی بووە، کە وای لە موجاهیدودین قایماز کردبێ عیزەدین ناچار بکات حەلەب تەسلیم بکات تا دەسەڵاتی بشکێنێ و هەر ژێردەستەی ئەو بێ و هەرگیز میرەکانی حەلەب بەرهەڵستکاری نەکەن، چونکە ئەگەری ئەوە لە نارادا بوو، کە دەسەڵاتی موجاهیدودین قایماز لای عیزەدین مەسعود لاواز بوایە.

### موجاهیدودین قایماز و موزەفەرەدین گوگبری

دوای ئەوەی موزەفەرەدین گوگبری شاری حەرانی لە سەیفەدین غازی میری (ساحب) موسڵ وەرگرت گوگبری بووە سەر بە ئەو. پاش ئەوەی پێشتر باسمان کرد کە موجاهیدودین قایماز لە میرنشینەکەی لاداو براکەی زەینەدین یوسفی لە شوێن دانا و موجاهیدودین تا ساڵی ٥٧١ک بەکردەکی حوکمڕان بوو. پاشان بوو بە جێگرو سەرکردەی ئەتابەگی موسڵ. بەمەوە دەبینین کە موزەفەرەدین لەژێردەسەڵاتی موجاهیدودین هاتە دەرێ، بەڵام بۆجارێکی دیکە کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی ئەو کاتی موجاهیدودین قایماز هات خزمەتی سەیفەدین غازی میری (ساحب) موسڵ بکات. دکتۆر عەبدولقادر ئەحمەد تلیمات بەراورد لە نێوان دەسەڵاتی موزەفەرەدین دەکات کە پێشتر لە هەولێر بوو ئێستاش لە حەران و دەڵێت: (جیاوازییەکی زۆر لەنێوان دەسەڵاتی موزەفەرەدین هەبوو کاتێ لە هەولێر بوو پاشان لە حەران، چونکە موزەفەرەدین لە هەولێر میر بوو موجاهیدودین کارمەندێک بوو لە کارمەندانی میرنشینەکەی)[٥٥]. بەڵام ئێستا لە موسڵ، موجاهیدودین بەحوکمی ئەوەی جێگری میری (ساحب) موسڵە و موزەفەرەدین سەر بەمیری موسڵە، کەواتە سەر بە موجاهیدودینیشە[٥٦]. بۆیە ئەبوشامە دەڵێت: (موزەفەرەدین گوگبری میری (حەران) لە موجاهیدودین ترسا، بۆیە پەنای بۆ سەلاحەدین برد[٥٧] هۆکاری ترسی موزەفەرەدینیش لەوە دابوو، لەپێناو دەست بە سەرداگرتنی شاری حەلەب لە کاردا بوو. عیزەدین مەسعود ئۆردوگای حەلەبی) پێ دا. موزەفەرەدین ویستی دەست بەسەر قەڵاتەکەیدا بگرێت، بەڵام نەیتوانی و نیازەکەی ئاشکرابوو[٥٨]. بۆیە موزەفەرەدین لەوە ترسا، کە موجاهیدودین قایماز و عیزەدین مەسعود تۆڵەی لێ بسەننەوە، هەربۆیەش بوو بەناحەزی میری (ساحب) موسڵ. موزەفەرەدین بەوە نەوەستا کە پەیوەندی بە سەلاحەدینەوە کرد، بەڵکو هانی سوڵتان سەلاحەدینیشی دا دەست بەسەر موسڵ دابگرێت و بەڵێنی سەرکەوتنی پێداو هاوکات لە جەنگیشدا بەشداری بکات[٥٩] وادیارە موزەفەرەدین تۆڵە لە موجاهیدودین قایماز بکاتەوەو سەلاحەدین میرنشینی هەولێری بۆ بگێڕێتەوە، کە پێشتر موجاهیدودین قایماز دەری کردبوو[٦٠].

### ڕۆڵی موجاهیدودین قایماز لە بەرگریکردن لە موسڵ کاتێ لەلایەن سەلاحەدینەوە لە ساڵی ٥٧٨ک گەمارۆدرا

سوڵتان سەلاحەدین بەجیدی بیری لەوە کردەوە، کە موسڵ بگرێت و بیهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، لەلایەکی دیکە هاندانی موزەفەرەدین لەم ڕووەوە کاریگەری گەورەی لەسەری هەبوو، بۆیە سەلاحەدین میرو ڕاوێژکارەکانی کۆکردەوە لە چ ناوچەیەکەوە هێرش بەرن لە موسڵ یان لەسنجار یاخود لە دوورگەی ئیبن عومەر، ڕایەکان جیاوازبوون، بەڵام موزەفەرەدین زۆری لە سەلاحەدین دەکرد، کە پێش هەموو شتێک موسڵ بگرێت. ئیبن ئەسیر دەڵێت، موزەفەرەدین گوتی: (پێویست ناکات لەلایەکی دیکە دەست پێبکەین، چونکە موسڵ لەژێردەستی خۆمانە و هەتا ئەگەر هاتوو عیزەدین و موجاهیدین گوێبیستی ئەو کارەی ئێمە بوون ئەوا بەجێیان دەهێشت و ژمارەیەک قەڵاتی ناوچە شاخاوییەکانیان دەبوو.[٦١] لەم دەقەدا دەردەکەوێت کە موزەفەرەدین زۆری لە سەلاحەدین کردووە موسڵ

بگرێت، بەوەی گەر موجاهیدودین و عیزەدین گوێبیستی ئەوە بن کە سەلاحەدین بەڕێوەیە ئەوا هەردووکیان موسڵ جێدەهێڵن و ڕوو لە ناوچە شاخاوییەکان دەکەن. بەڵام وادیارە سەلاحەدین زۆر بەباشی موجاهیدودین قایمازی نەناسیوە، هەر ئەو بوو سەیفەدین غازی لەدژی سەلاحەدین وەستاندو نەیهێشت بۆقەڵاتی ناوچە شاخاوییەکان رابکات. هەروەها بەوەش ناسراو بوو، کە لەوانە نەبوو لە جەنگ بترسێ و لە کاتی گوێبیستنی رابکات. جاکاتێ ئەمەی زانی و گوێی لەموزەفەرەدین بوو بەقووڵی بیری کردەوە. چونکە هەروەکو پێشتر باسمان کرد موزەفەرەدین هیچ ئامانجێکی نەبوو لەوە، تەنیا تۆڵەسەندن نەبێت، بۆیە بەپاکی سەلاحەدینی ئاگادار نەکردەوە. بەهەرحاڵ کاتێ موجاهیدودین بیستی سوپای سەلاحەدین دەستی کرد بەبزاوت سوپاکەی لەموسڵ کۆکردەوە، ئەمەو مێژوونووسی سەردەم ئیبن ئەسیر باس لەپشت و هێزی موجاهیدودین قایماز دەکات لە موسڵ. عیزەدین میری (ساحیب) موسڵ و موجاهیدودینی جێگرەکەی لە شاری موسل دەستیان کرد بەکۆکردنەوەی سوپا بەسوارچاک و پیادەو دەرهێنانی چەک و ئامێر بەو ئاستەی چاو لێی سەرسام دەبوو، پارەوپولێکی زۆریان بەهاکرد، موجاهیدودین لەسامانی خۆی زۆر دەکرد و خودی خۆی سەرپەرشتی کارەکانی دەکردو باشترین پیلانگێڕ بوو[٦٢]. لەساڵی ٥٧٨ک سەلاحەدین بەرەو موسڵ بزاوتی کرد تا گەیشتە موسل، ئینجا بینی موجاهیدودین قایماز چی کردووە، لەوەی شارەکەی پڕکردووە لە سەربازو چەک و تۆپ و سوارچاک، بەو ئاستەی زەنی وای برد، کە موسل لە ئامادەباشیدایە بۆ بەرەنگاربوونەوەی. جا کاتێ جەنگ دەستی پێکرد بینی موجاهیدودین خۆی سەرپەرشتی جەنگەکە دەکات و خۆی هانی خەڵکەکە دەدا بۆ شەڕ، تەنانەت بگرە شەوێ لە شەوان سوپای سەلاحەدینی لەخشتە برد و فەرمانی بەسەربازەکانی کرد لەدەرگای قەڵات بچنە دەردوەو ئاگریان لە دەست بووە بۆ دیجلە شۆڕ بوونەتەوە، جا کاتێ سەربازەکانی سەلاحەدین ئەوەیان بینی گومانی ئەوەیان برد هێرش دەکەنە سەریان، بۆیە کەمێک لە شاری موسل دوورکەوتنەوە[٦٣]. پاش ئەوە سەلاحەدین زانی توانای شاری موسڵی نییە، بۆیە گەمارۆکەی لابردو لەگەڕانەوەیدا گەمارۆی سنجاری داو خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆی[٦٤].

### عیزەدین مەسعود، موجاهیدودین قایمازی دەستگیر کردو ئازادیشی کرد

موجاهیدودین قایماز هەڵسووڕێنەری کاروباری دەوڵەتی موسڵ و جێگری عیزەدین مەسعود بوو، بەڵام وادیارە لای موجاهیدودین ئەوە دروست بوویێ کە دەست بەسەر موسڵ دابگرێ، بۆیە هەندێ لە میرەکان ڕاوێژیان بەعیزەدین کرد کە موجاهیدودین قایماز بەند بکات. ئەمەو هەردوو میر مەحمود زلفندارو شەرەفەدین ئەحمەد کوڕی ئەبی خەیر لەدژی موجاهیدودین پیلانیان گێڕابوو[٦٥]. لەساڵی ٥٧٩ک عیزەدین مەسعود موجاهیدودینی بەفێڵێک دەستگیر کرد، کە عیزەدین خۆی بۆی دانابۆوە، چونکە هێزی موجاهیدودین ئەوەندە لەپلەدا بوو عیزەدین لەخۆی رانەدەدی بەئاشکرا دەستگیری بکات، بۆیە فێڵێکی بۆ دانایەوەو وای نیشان دا، کە نەخۆشەو لەتوانایدا نییە سواری ئەسپ بێت و ماوەیەکیش دەرنەکەوت، ئەمەش وای لە موجاهیدودین کرد، کە بەتەنیا سەردانی بکات[٦٦]. موجاهیدودین قایماز نێرەمووک بوو، بۆیە چووە لای عیزەدین مەسعود، کە لای خێزانەکانی بوو. جاکاتێ هاتە ژوورەوە فەرمانی دەرکرد کە دەستگیری بکەن و عیزەدین مەسعود دەستبەجێ سواری ئەسپەکەی بوو چووە قەڵات و لەوێ سەروەت و سامانی موجاهیدودین قایمازی هێناو[٦٧] عیزەدین مەسعود زلفنداری لەشوێن ئەو دانا، موجاهیدودین پارێزەری موسل و بیت زەنگی زیندانی کرا. جاکاتێ موجاهیدودین قایماز دەستگیر کرا کارەسات ڕووی لە عیزەدین مەسعود کرد، لەوانە میری هەولێر زەینەدین یوسف و میری (ساحب) جەزیرە کوڕی عومەر رازی نەبوون چیتر ملکەچی عیزەدین مەسعود بن[٦٨]. خەلیفەی عەباسی سوپایەکی بۆداقوق نارد (داقوق- ئێستا- تاووغە) ئەوەی سەروەتی عیزەدین مەسعود بوو لە جێگرەکەی سەندەوە[٦٩] سەرەڕای ئەوەش هەر هەمووی زەینەدین یوسف ساحیبی هەولێر و کوڕی عومەر ساحبی جەزیرە ملکەچی فەرمانڕەوای سەلاحەدین بوون، کە دوژمنی عیزەدین مەسعودە، هەروەکو ئیبن ئەسیر دەڵێت: (زۆر

زەرەرمەند بوون بۆ ساحێبی موسل)[٧٠] لێرە کارەساتێکی تریش هەیە ئەویش داوای ئاشتبوونەوەی لە سەلاحەدین کرد، بەڵام سەلاحەدین وەڵامی نەدایەوەو بیری لەگرتنی موسل کردەوە پاش ئەوەی زانی موجاهیدودین قایماز دەستگیر کراوە[٧١]. جا کاتێ عیزەدین وەخەبەرهات و بینی چەندین گرفت دووچاری بۆتەوە، کە بەهەژمار نایەت بەهۆی دەستگیرکردنی موجاهیدودین قایمازەوە، بۆیە سزای ئەوانەی دا کە بووبوونە هۆی ئەوەی موجاهیدودین قایماز دەستگیر بکرێ، کە هەردوو میر زلفندارو شەرەفەدین ئەحمەد بوون[٧٢]. ئەوەبوو ویستی بارەکە چاک بکاتەوە بە ئازادکردنی موجاهیدودین لەزیندان وادیارە یەکێ بەناوی شەمسەدین پەهلەوان ساحێبی هەمەدان و بیلادی جەبەل[٧٣] شەفاعەتی بۆ موجاهیدودین لای عیزەدین کردبوو. ئەگەری ئەوەش هەیە پەهلەوان شەفاعەتی بۆ موجاهیدودین کردبێ پاش ئەوەی گوێی لێ بووبوو، کە سەلاحەدین بە ئاشتبوونەوە رازی نەبوودو بەنیازە موسل بگرێت. پەهلەوانیش لە سەلاحەدین دەترسا و نەیدەویست موسل بگرێت یان دەسەڵاتەکەی بەرفراوان بکات، چونکە باری دەولەتەکەی دەکەوتە مەترسییەوە[٧٤]. دەشێ زانیبێتی توانای موجاهیدودین چەندە لەرۆڵی بەرگریکردن و پاراستنی موسل لە سەلاحەدین، بۆیە لای عیزەدین شەفاعەتی بۆکردووە لە زیندان ئازادی بکات. بەهەرحاڵ لەوانەبوو عیزەدین پاش ئەوەی دووچاری ئەو کارەساتانە بۆوە، کە پێشتر باس کران بەبێ شەفاعەتکردنیش بۆی ئازاد بکردایە. هەروەکو باسیشمان کرد، ئەوانەی بووبوونە هۆی زیندانیکردنی سزای دابوون. جاپاش ئەوەی لە ساڵی ٥٨٠ک موجاهیدودین قایماز لە زیندان دەرچوو هیچی وا بۆ موسل نەمابوو. عیزەدین مەسعود ناردی بۆلای پەهلەوان ساحێبی ئازربایجان، بۆئەوەی کۆمەکی بکات لەدژی زۆربوونی هێزی سەلاحەدین لەناوچەکە. هەروەکو باس کرا پەهلەوان دوژمنی سەلاحەدین بوو و لە هێزەکەی دەترسا نەوەک کاریگەری هەبێ بۆ سەر وڵاتەکەی بەتایبەت پاش ئەوەی هەولێر بووە سەر بە سەلاحەدین. کاتێ موجاهیدودین قایماز گەیشتە ئازربایجان چاوی بە قزل ئەرسەلانی برای پەهلەوان کەوت. قزل پێی راگەیاند وڵاتەکەیان لەتەواوی ئامادەباشیدایە بۆ دەستەبەرکردنی داواکەی عیزەدین مەسعود، پێویست بەبینینی پەهلەوان ناکات[٧٥] قزل ئەرسەلان بەسێ هەزار سوارچاک کۆمەکی موجاهیدودین قایمازی کرد، موجاهیدودین قایماز بەو سوارچاکانەوە بەرەو هەولێر هات، تا گەیشتە میرنشینی هەولێرو دەستیان کرد بە کاولکردن و بردنی ئافرەتان بەزۆری و سووتاندنی گوندەکان[٧٦] موجاهیدودین قایماز نەیتوانی قەدەغەیان بکات تا ئەو جۆرە کارانە ئەنجام نەدەن، چونکە بەرلەوەی هەولێر ئازاد بکەن دەستیان کرد بەتاڵان و کوشتن و دزی و کاولکردن. بەڵام هەرچۆنێ بوو موجاهیدودین هەوڵی لەگەڵ دان لەو جۆرە کارانەیان قەدەغە بکات، بەڵام گوێیان پێ نەدا. لە باشی بەختی هەولێر زەینەدین یوسف میرەکەیان فریایان کەوت، لەکاتێکدا ئەوان پارچە پارچە بوو بوون و لەدوای دزی و تاڵان بوون. زەینەدین دەرۆستیان هات کۆمەڵ بەکۆمەڵ شکستی پێهێنان و بەسەر داگیرکەراندا زاڵ بوو[٧٧] موجاهیدودین قایماز زۆر پەشیمان بۆوە، کە سەرکردایەتی ئەو لەخۆ دەرچوو و کاری تێکدەرانەی کرد، چونکە خۆی زۆر لەخوا ترس بوو، پێشتر جێگری هەولێر بوو. خەڵکی هەولێری خۆش دەویست دیتی چییان بەسەرهات، بۆیە گوتی: (زیاتر چاوەڕێی تۆڵەسەندنەوەی خودا دەکەم لەسەر ئەو کردەوە خراپانەی عەجەمەکان ئەنجامیان دا، ئەوەی من بینیم مەزەندەم بۆ نەدەکرد، کە موسڵمان دەرهەق بەموسڵمان بیکات. منیش پێیانم وتن، بەڵام گوێیان پێ نەدا، هەتا بەشکست هێنانەکەشیان)[٧٨].

### سیاسەتی موجاهیدودین قایماز پاش دەرچوونی لە زیندان لە ساڵی ٥٨٠ک تا ساڵی ٥٨٩ک

موجاهیدودین رۆڵی نەبوو لەدووەم گەمارۆدانی موسلدا هەروەکو گەمارۆی یەکەم، کە لەلایەن سەلاحەدینەوە ئەنجامدرا. سەبارەت بەگەمارۆی دووەم، کە لە ساڵی ٥٨١ک بوو مێژوونووسەکان هیچی وایان دەربارەی چالاکییەکانی باس نەکردووە، چونکە موجاهیدودین قایماز ئەو ساڵە لە دەرەوەی موسل بوو[٧٩] لە ئازربایجان دانوستانی لەگەڵ میر قزل ئەرسەلان سازدا بۆ داگیرکردنی هەولێر. بەڵام لەکاتی

گەمارۆدانەکەدا دەبینین عیزەددین مەسعود کەسێکی بێ توانا بووە لە هەڵسووڕاندنی کاروباری دەوڵەتدا، تەنانەت بگرە بێ توانا بوو لەوەرگرتنی هەڵوێستی ئازایانەش و هیچ شتێکیشی دەربارەی پلانی سەربازی نەزانیوە، بۆیە سەرنج دەدەین هەڵگری پلانەکانی موجاهیدودین بووە لە قایمکردنی موسل دا[٨٠] لێرە دەردەکەوێت کە پلانەکانی موجاهیدودین سەربازی بوونەو عیزەددین مەسعود جێبەجێی کردوون. جا کاتێ گەمارۆکە درێژەی خایاندووە سەلاحەدین پاشگەز بۆتەوە لەوەی شارەکە بگرێت[٨١] تەماشا دەکەین گەمارۆکە لانەچوو تا موجاهیدودین گەڕایەوە موسل و عیزەددینیش هەمان پلەوپایەی پێ بەخشییەوە و کردیەوە بەجێگری خۆی و هەڵسووڕێنەری کاروباری دەوڵەت، بەڵام ئەمجارە وەکو جاران دەسەڵاتی پێ نەدرایەوە، چونکە عیزەددین مەسعود یەکێ لە پیاوەکانی خۆی لەگەڵ دانا بۆ بەشداریکردن لە حوکمڕانیدا. ئەمەو ئیبن ئەسیر دەڵێت: (موجاهیدودین قایماز لە بەندیخانە دەرچوو جێنشینی خۆی پێ سپارد، بەڵام کەسێکی دیکەی لەگەڵ دانا بۆ ئەوەی لە حوکمڕانیتیدا بەشداری لەگەڵدا بکات)[٨٢] ئیبن ئەسیر باسی لە هۆکارەکە نەکردووە، بەڵام پێدەچێ عیزەددین نەیویستبێ دەسەڵات و هێز بە دەستی موجاهیدودین قایماز بێت، چونکە نەیدەویست موجاهیدودین لەوی باڵادەستتر بێت وەکو پێشتر بەرلەوەی زیندانی بکرێت. دەرەنجامی ئەو کارەی عیزەددین وای

لە موجاهیدودین قایماز کرد بەخۆیدا بچێتەوە و وردە وردە کەمتەرخەمی نواند لە کاروباری دەوڵەتداو گرینگی باشی پێ نەدەدا. کاتێ زەینەدین یوسف ساحێبی هەولێر لەساڵی ٥٨٦ک مرد، خەڵکی هەولێر و میرەکانی بەدوایاندا نارد بگەڕێتەوە و بۆ جاری دووەم جڵەوی حوکمڕانیەت بگرێتەوە دەست. بەڵام موجاهیدودین زانی بەتەنیا حوکمڕانی هەولێری پێ نادرێتەوە، بەڵکو کەسێکی تری لەگەڵدایە و لە حوکمڕانیدا بەشداری لەگەڵ دەکات، بۆیە داواکەی خەڵکی هەولێری ڕەت کردەوە. ئیبن ئەسیر دەڵێت: موجاهیدودین قایماز پاش ئەوەی داواکەی خەڵکی هەولێری ڕەت کردەوە لای ئەوەی متمانەی پێ بووە گوتوویەتی: (کارێک ناکەم، کە کەسێکی دیکە حوکمڕانی بکات و دەستی منی لەگەڵدا نەبێت)[٨٣] ئەمەش بووە هۆی ئەوەی موجاهیدودین قایماز دەرفەت لەبەردەم موزەفەرەدین والابکات بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە هەولێر و حوکمڕانییەکەی بگرێتە دەست پاش ئەوەی بۆ ماوەی زێتر لە ٢٣ ساڵ دەرکرابوو. شیاوی باسە گەر موجاهیدودین دەرفەتی نەڕەخساندبایە کە موزەفەرەدین بگەڕێتەوە هەرگیز لە توانایدا نەبوو بگەڕێتەوە، واتە گەڕانەوەی موزەفەرەدین بۆ هەولێر بۆ موجاهیدودین قایماز دەگەڕێتەوە. ئەوەبوو میرنشینی هەولێر لەژێر فەرمانڕەوایی ئەتابەگەی موسڵ دەرچوو. بەزوویی موزەفەرەدین گۆڕاو بوو بە (لقێک لە گەرووی ماڵی ئەتابەکی و نەیانتوانی چاکی

بکەنەوە) هەروەکو ئیبن ئەسیر وەسفی دەکات[٨٤] دوای ئەوەی دەسەڵاتی موجاهیدودین قایماز لە جاران کەمتر بوو راو و بۆچوونی خۆی نە دەخستە ڕوو و ڕێنومایی باشی عیزەددین مەسعودی ناکرد پێچەوانەی ئەوەی، کە پێشتر دەینواند. باشترین بەڵگەش ئەم ڕووداوەیە، کە ئیبن ئەسیر دەیگێڕێتەوە کاتێ سەلاحەدین لە ساڵی ٥٨٩ک کۆچی دوایی کرد، هەواڵەکە گەیشتە ئەتابەک عیزەددین مەسعود و ئەویش ڕاوێژکارانی کۆکردەوە، لەوانە موجاهیدودین قایماز بوو، کە گەورە ڕاوێژکاری دەوڵەت بوو، کە چی بکەن. بەڵام مەجدەددین ئەبوسەعاداتی برای ئیبن ئەسیر[٨٥] ئاماژەی بەوەدا، کە زەرروورە پەلە بکەین بۆ نەسیبییەکان و وەری بگرین پاشان دەست بە سەر شارەکانی جەزیرە دادەگرین، کە سەلاحەدین لە زەنکییەکانی وەرگرتبوو. لە هەمان کاتدا عیزەددین مەسعود نووسراوێکی بۆ میرەکانی دەوروبەر نووسی وەک موزەفەرەدین گوگبری ساحێبی هەولێر و سنجر شا و ساحێبی جەزیرەو ساحێبی سنجار و نەسیبەکان نیازی خۆت پێیان ڕادەگەینێ و داوای کۆمەکیان لێدەکەین لە دژی منداڵەکانی سەلاحەدین و براکەی شا عادل[٨٦]. لێرەدا دەبینین موجاهیدودین قایماز لە بری ئەوەی پشتگیری لەو بۆچوونە بکات بە پێچەوانەوە، بەڵکو پێی لەسەر ئەوە داگرت عیزەددین مەسعود داوا لە نووسینگەکانی بکات بۆچوونی میرەکانی دەوروبەر وەربگرێت دەربارەی پابەندبوونی عیزەددین لە دەست بەسەرداگرتنی سەروەت و

سامانی سەلاحەدیندا[87].
موجاهیدودین قایماز زۆرباش دەزانێ ئەو میرانە بە تایبەت وەک موزەفەرەدین و سنجر شا و عیمادەدین لە راستیدا میری سەلاحەدینن، بەڵکو لە میرە بە وەفاکانی ئەون، جا چۆن بەو رایەی عیزەدین رازی دەبن بە بۆچوونی موجاهیدودین قایماز. بۆیە سەرنج دەدەین میرەکانی دەوروبەر دەستبەجێ وەڵامیان نەدایەوە، بەڵکو چاودروانیان کرد[88] هەڵبەتە رازی نەبوون، موجاهیدودین قایماز لێرە دەرفەتێکی زێرینی لە دەست عیزەدین مەسعود دا لەوەی کە سەروەت و سامان لە دەست منداڵەکانی سەلاحەدین بگێرێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی. چونکە شا عادل ئامادەباشی وەرگرت لە دژی ئەتابەکەی موسڵدا. جا کاتێ عیزەدین مەسعود بڕیاری دا کارەکە ئەنجام بدا لەرێگا نەخۆش کەوت و گەڕایەوە موسڵ و لە هەمان ئەو ساڵەی سەلاحەدین کۆچی دوایی کرد، عیزەدینیش کۆچی دوایی کرد.
موجاهیدودین قایماز بەردەوام بوو لە خزمەتکردنی زەنگییەکان. کاتێ عیزەدین مەسعود لە ساڵی ٥٨١ک مرد، نورەدین ئەرسەلان شای کوڕی بووبە ئەتابەگەی موسڵ و موجاهیدودین قایماز کاروباری دەوڵەتەکەی هەڵدەسووڕاند[90] ئیبن ئەسیر بۆمان باس دەکات موجاهیدودین چۆن توانی هێزو دەسەڵاتی سیاسی وئیدارەی لە ماوەی حوکمڕانی نورەدین ئەرسەلان شادا بگێرێتەوە بۆخۆی، وادیارە ئەو ئاگای لە هەموو کاروبارەکان بووە پێش ئەوەی نورەدین شا لێی بە ئاگابێ. ئیبن ئەسیر ئەو رووداوە دەگێرێتەوە کە لە سەردەمی نورەدین ئەرسەلان شادا رووی دا. عیمادەدینی مامی ساحیبی نەسیبێن ژمارەیەک لە پیاوەکانی نارد بۆئەوەی دەست بەسەر ژمارەیەک گوندی سەربە موسل دابگرن. ئەو هەواڵە گەیشتە موجاهیدودین قایماز، بەڵام نورەدین شای لەو هەواڵە ئاگادار نەکردەوە، چونکە واباو بوو ئەم شایە ئارامی نییەو بەپەلە فەرمان دەدات، بۆیە موجاهیدودین سووربوو لە سەر ئەوەی ئاگادار نەکرێتەوە تا هەڵوێستەکە وا نەڕوات شەڕوکوشتار لە نێوان مام و برازا سەر هەڵنەدا. هەر بۆیە نێردراوێکی ناردە لای عیمادەدین لەو کارەی پاشگەز بێتەوەو بەپیاوەکانی ڕابگەیەنێ دەست لە گوندەکانی موسڵ هەڵگرن. کە عیمادەدین گرنگی بە ئاگادارکردنەوەکە نەدا، موجاهیدودین ناچار بوو نورەدین ئەرسەلان شا ئاگادار بکاتەوە[91] کە نورەدین بەمەی زانی سوپایەکی ئامادە کردو دەستی بەسەر نەسیبیەکان داگرت و لە عیمادەدینی مامی وەرگرتەوە[92].
لێرە دەبینین گەر عیمادەدین گوێی دابایە موجاهیدودین قایماز میرنشینەکەی لە دەست نەدەدا. هەروەکو پێشتر باسمان کرد ئەو رووداوە دەسەلمێنێت، کە لێزانینی موجاهیدودین قایماز چەند بووە لە سیاسەتمەداری و هەڵسووڕانی کاروباری دەوڵەت و پەرۆشبوونی لە یەکگرتنەوەی بنەماڵەی زەنکییەکاندا و لە هەمان کاتدا، لەوەش ترساوە پارچە پارچەبن. هەروەها ئەو رووداوە ئەوەش دەردەخات، کە موجاهیدودین قایماز ئاگای لە هەموو گەورەو بچووکێکی دەوڵەتی نورەدین ئەرسەلان شا بووە.

### مردنی موجاهیدودین قایماز

موجاهیدودین قایماز بە بەردەوامی خزمەتی نورەدین ئەرسەلان شا[93]ی کرد تا لەساڵی ٥٩٥ک کۆچی دوایی کرد، دیارە بەپێی گێڕانەوەی ئیبن ئەسیر و ئیبن خەلەکان مردنەکەی موجاهیدودین سروشتی بووبێت[94]. بەڵام ئەبوشامە بەشێوەیەکی تر دەیگێڕێتەوە کە نورەدین ئەرسەلان شا موجاهیدودینی زیندانی کردووە و لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا لە زیندان مردووە پاشان تەرمەکەیان بە پۆشاکێک داپۆشیوە، کاتێ تەرمەکە گەیێنراوەتە دەرگای شار دەرگەوانەکان نەیان هێشتووە ئەوانەی تەرمەکەیان هەڵگرتووە بێنە دەرەوە، بۆیە فڕێیان داوەتە سەر رێگا تا ماوەیان پێداون بینێژن[95]. بەپێی گێڕانەوەی ئەبوشامە لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا مردووە، ئەمەش پێچەوانەی گێڕانەوەی ئیبن ئەسیرە کە مێژوونووسی ئەو سەردەمەیە، موجاهیدودین قایماز و براکەی مەجدەدین لەو سەردەم ژیاون کە پیاو و گەورە نووسەری بوون. لێرە پرسیارێک دێتە ئاراوە بۆچی ئیبن ئەسیر و ئیبن خەلەکان بە دروستی باسی ئەو رووداوەیان نەکردووە. ئەبو شامەش باسی ئەوەی نەکردووە بۆچی نورەدین ئەرسەلان شا، موجاهیدودین قایمازی دەستگیرکرد، کە ئیبن ئەسیر دەڵێت: (ئەو بەباشترین شێوە کاروباری دەوڵەتی

هەڵدەسووڕاند)[٩٦]. کەواتە گێڕانەوەکەی ئەبوشامە ڕاست نییە، موجاهیدودین قایماز بە مردنی سروشتی کۆچی دوایی کردووە، شتێکی دیکەش هەیە کە ئەبوشامە باسی کردووە دروست نییە، ئەویش ساڵی مردنی موجاهیدودین قایمازە، کە لەبری ٥٩٥ک نووسیویەتی ٥٩٤ک. لێرە پێچەوانەی ئیبن ئەسیر و شا ئەشرەف غەسانی[٩٧] و ئەبا فیدا دانەری (المختصر في اخبار البشر)[٩٨] و ئیبن وەردیە[٩٩]. دەرکەوت ئەبوشامە زۆر گێڕانەوەی نادروستی دەربارەی موجاهیدودین قایماز وەرگرتووە، لەوانە خواستنی کەنیزەکەی، لە کاتێکدا کە نێرەمووک بووە و لەگەڵ چۆنیەتی مردنی و ساڵەکەی.

## کارەکانی موجاهیدودین قایماز، بیناسازی و دامەزراندنی دامودەزگای ئایینی و ڕۆشنبیری

موجاهیدودین قایماز لە ڕووی بیناسازی و دامەزراندنی دامودەزگای ئایینی بایەخێکی گەورەی پێداوە، لەم بارەوە مێژوونووسان دەڵێن: موجاهیدودین قایماز قوتابخانەو مزگەوت و زۆر شتی دیکەی لە کاری بیناسازی لە هەولێر و موسڵ دروست کردوون، بۆیە هەر میرنشینەو بەتەنیا باسی لێوە دەکەین و کارە بیناسازییەکانی دەخەینەڕوو لەوانە:

**١- هەولێر ٥٥٩ک - ٥٧١ک**

موجاهیدودین قایماز پیاوێکی ئایینپەروەرو زۆر خێرخوازو چاکساز بوو، بۆیە سەرنج دەدەینە کارە بیناسازەکانی لە ڕووی خێرخوازی و ئایینەوە کاری تێ کردووە. لەم میرنشینەدا دامو دەزگای ئایینی لە مزگەوت و ڕابیتە و قوتابخانە دروستی کردوون. هەروەها موجاهیدودین قوتابخانەیەکی بە ناوبانگی بەناوی قوتابخانەی (موجاهیدیە) لەو ماوەیەی لە هەولێر حوکمڕانی کرد دروستی کرد[١٠٠]. بەڵام دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن دەڵێت: ئەو قوتابخانەیە بەو ئاستە بەناوبانگ نەبوو، چونکە ئیبن خەلەکان و غەیری ئەو شوێن و ساڵی دامەزراندنیان ئاماژە پێنەداوە[١٠١] سەرەڕای ئەوە خانەقاشی دروست کردووە[١٠٢] وەک پەناگەیەک بۆ نەخۆش و نابیناکان و بۆ ئەو کەسانەی بێ کەس و هاوکات پارەیەکی زۆریشی لەسەر وەقف کرد[١٠٣] هەروەها خانەیەکی دروست کرد و ناوی نا خانەی موجاهیدی، ئیبن موستەوفی دەڵێت: زاناو فەقیهەکان گەر هاتبانە هەولێر لەو خانەیە دادەبەزین[١٠٤].

**٢- موسڵ ٥٧١ک -٥٩٥ک**

دەبینین پاش ئەوەی موجاهیدودین قایماز چووە موسڵ دەستی کرد بە کاری بیناسازی گرینگ لەو شارەدا. لەدوای ئەم ساڵە (٥٧٢ک) دەستی کرد بە دروستکردنی مزگەوتی گەورە لە دەرگای جسر لە موسڵ[١٠٥] لێرە ئیبن ئەسیر ستایشی دەکاو دەڵێت: باشترین مزگەوتە، کە لە موسڵ دروستی کردبێ و[١٠٦] (پارەیەکی باش و زۆریشی بۆ وەقف کرد)[١٠٧] ئیبن جەبیریش وەسفی دەکات و دەڵێت: (نەمدیت مزگەوتێک لەو جوانتر بێت، وەسفی دەکات بەرازاوەیی و ڕێکخستنەکەی و نەقش و نیگارەکەی و پەنجەرە ئاسنینەکانییەوە، کە بەسەر ڕووباری دیجلەیدا دەڕوانی، ئەمەو لەو شوێنە جوانتر و خۆشتر نەبووە)[١٠٨].

ئاشکرایە موجاهیدودین قایماز بڕە پارەیەکی زۆری بۆ دروستکردنی خەرج کردووە کە ماوەیەکی درێژی خایاندو نزیکەی (٤) ساڵ بوو[١٠٩] ئیبن ئەسیر دەڵێت: ئەو مزگەوتە یەکێکە لەو مزگەوتانەی موجاهیدودین قایماز لە موسڵ دروستی کردووە[١١٠]. باڵەخانەی تریشی دروست کردووە لە موسڵ، وەک خانە و قوتابخانە و نەخۆشخانە[١١١] ئیبن ئەسیر دەڵێت: ئەو باڵەخانانە لە ڕیز یەک بوونە[١١٢] ئەم باڵەخانانە بۆ کاری خێرخوازی بووە، بۆ نموونە نەخۆشخانە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکان و قوتابخانە بۆ فێربوون و خانە بۆ دابەزینی زاناو تەقواداران بووە، بۆئەوەی بەندایەتی خودای تێدا بکەن سەرەڕای ئەوە شوێنی حەوانەوەشیان هەبووە، گەر هاتبوا شوێنێکیان نەبوایە لێ بمێننەوە هەروەها بۆ ئەو شوێنانە وەقفێکی زۆر کراوە[١١٣] کارەکانی تەنیا بۆ کاروبار نەبووە، بەڵکو لایەنی تریشی گرتۆتەوە، چەند خانەیەکی بۆ حەوانەوەی گەشتیاران دروست کردووە[١١٤] هەروەها ئیبن خەلەکان دەڵێت: خانەیەک و نووسینگەیەکی بۆ بێ سەرپەرشتان دروست کرد، کە هەموویان پێویستییان پێدەبوو، کاتێ خەڵکەکە هەستی بەوە کرد کە تەنیا پردێکیان بەس نییە، پردێکی دیکەی دروست کرد بۆ ساناکردنی کاروباری خەڵک[١١٦] شیاوی ئاماژە پێکردنە لە میانەی کارە بیناسازییەکاندا

دەردەکەویت، کە حەزی بۆ خۆشگوزەرانی خەڵک و ئاوەدانکردنەوەی وڵات و دروستکردنی دامودەزگای ئایینی و تەندروستی کردووە، کە زەروور بووە بۆیان. جا گەر سەرنجی ئەو کارانە بدەین لەگەڵ کارەکانی موزەفەرەدین گوگبری، کە لەهەولێر ئەنجامی داون دەشێ ئەو دەرئەنجامە وەدەست بێنین، کە تا چەند موزەفەرەدین ورووژێنەر بووە بە موجاهیدودین کە بە پێیگەیاندووە[117].

### بایەخدانی موجاهیدودین قایماز بە زانا و فەقیە و شاعیرەکان

موجاهیدودین قایماز رۆشنبیرێکی گەورە و ئایینپەروەرێکی توند بوو، بۆیە لێرەوە دەبینین ئەو پیاوە تا چەند بایەخی بە زانا و فەقیهەکان داوە، زانایانی بە گەورە داناوەو بەرگری لێ کردوون. ئیبن موستەوفی ناوی ژمارەیەک لە فەقیە و زانایانی هێناوە، کە لە ماوەی حوکمڕانی موجاهیدودیندا هاتوونەتە هەولێر، لەوانە شێخ ئەحمەد کوری عودەی، کە زانایەکی گەورە بوو کاتێ رووبەرووی لێدان بۆوە دەبینین موجاهیدودین بەرگری لێ کردووە، ئەو کەسانەشی، کە لەشێخیان دابوو بەمەبەستی ئاقڵکردنیان دەسگیری کردن[118] هەروەها ئەبو فەزڵ تەبەری ٥١٥ک-٥٩٥ک یەکێکە لەو زانایانەی لەماوەی حوکمڕانیدا ناوی هاتووە و لە خانەقای موجاهیدودین قایماز دابەزیوە[119]. زانایی بەناوبانگ ئەبا ئەلمەعالی ئەسعەد کوری عەلی حەزیری، کتێبێکی کردە دیاری موجاهیدودین (کتاب الاعجاز في حل الاحاجي الالغاز برسم الامير مجاهدالدين قايماز)[120].

موجاهیدودین بەرامبەر بە شاعیرەکانیش رەزیلی نەکردووە، بەڵکو بە پارەو پول خەڵات و دەستی یارمەتی بۆ درێژکردوون. شاعیرەکان مەدحیان کردووە لەوانە، شاعیری دادوەر ئەبو قاسم هەولێری لەساڵی ٥٨٩ک مردووە و دەڵێت:

لما اكتبين حلل الجمال باسره
اضحي الفؤاد اسره في اسره
فاق الخلائق بالمحاسن مثلما فاق
المجاهد ذو العلاء بوفره[121]

هەروەها شاعیرانی بەغدا مەدحیان کردووە، موجاهیدودین حوکمڕانی هەولێری دەکرد لەو شاعیرانە سەبت کوری تەعاویزی[122] دەڵێت:

عليك الشوق فيك كي يصح
وسكران بحبك كيف يصحو
وبين القلب و السلوان قرب
وبين الجفن و العبرات صلح

ئیبن خەلەکان دەڵێت: سەبتی کوری تەعاویزی ئەم شیعرەی لە بەغداوە بۆ موجاهیدودین قایماز، کە ئەوسا لە هەولێر بووە ناردووە. موجاهیدودینیش خەڵاتی (سنیه)ی بۆ ناردووە[123].

هەروەها بەهائەدین ئەبو مەعالی ئەسعەد کوری یەحیا شنگالی بە تێکستێک مەدحی دەکات و تیایدا دەڵێت:[124]

ياقلب تبا لك من صاحب كان
البلاد منك ومن ناظري
لله ايامي علي رامة وطيب
اوقاتي علي حاجر

### هوامش البحث

(١) ابن خلكان: وفيات الاعيان، تحقيق د. احسان عباس، بيروت١٩٧٧ج٤ ص٨٢.
(٢) نفس المصدر السابق، ج٤ ص٨٤.
(٣) ئەتابەک ناوێکی تورکییە لە دوو پەیڤ پێکهاتووە (ئەتا) بە مانای باوک و (بەک) واتا دول الملوك تحقيق د.مصطفي زيادة، القاهرة ١٩٣٤ ج١ ق١ ص١٤٦
(٤) ابن خلكان: وفيات، ج٤ ص٨٢
(٥) سجستان: شارۆچکەیەکی گەورەو ویلایەتێکی فراوانە، نێوان ئەوێ (هراه) (١٠) رۆژە رێیە، ياقوت، معجم البلدان بيروت (بدون تاريخ) ج٣ ص.١٩٠ وتقع سجستان لە رۆژهەڵاتی ئێران و رۆژئاوای هەراتە، کە ئێستا کەوتۆتە ئەفغانستان.
(٦) ابن خلكان: وفيات ج٤ص٨٢.
(٧) ابن الاثير: التاريخ الباهرفي الدولة الاتابكية تحقيق عبدالقادر احمد طليمات القاهرة ١٩٦٣ ص١٩٣-١٩٤.
(٨) المقريزي: كتاب المواعظ والاعتبار بذكرالخطط والاثارالمعروف بالخطط المقريزية بيروت دار صادر(بدون تاريخ ج ١ ص٣٢٩ =٣٣٠ ابراهيم الابياري، ابو اطسك كافو(الدولة الاخشيدية) القاهرة ١٩٦٢ص١٢٤-١٢٩.
(٩) ابن خلكان: وفيات ج ٤ص٨٢، ابن الاثير: الكامل في التاريخ بيروت ١٩٧٨ ج ٩ ص٢٤٨.
(١٠) ابن الفرات: تاريخ ابن الفرات تحقيق د. حسن محمد الشملع، بصرة ١٩٦٧م،٤، ج١ ص٢٢١. د. محسن محمد حسين، اربيل في العهد الاتابكي، بغداد ١٩٧٦ ص١٣٤.
(١١) ابن الاثير: الكامل ج ٩ ص٢٤٨ ابن خلكان، وفيات، ج ٤ ص٨٢.

(١٢) ابن خلكان، وفيات، ج ٤ ص٨٢.
(١٣) ابن الاثير: ج ٩ ص١٧٠ - ١٧١.
(١٤) نفس المصدر السابق ص١٦٣.
(١٥) ابو شامة المقديسي: تراجم رجال القرنين السادس والسابع المعروف بالذيل علي الروضتين، تحقيق الشيخ محمد زاهد الكوثري، بيروت ١٩٧٤ ص١٤.
(١٦) السبكي: طبقات الشافعية الكبري، تحقيق عبدالفتاح محمد الحلو وحمود محمد الطناحي، القاهرة " ١٩ ج ٨ ص٣٦٧.
(١٧) ابوشامة المقدسي: تراجم ص١٤.
(١٨) ابن الاثير: الكامل ج ٩ ص٢٤٨.
(١٩) نفس المصدر السابق ص٢٤٨.
(٢٠) نفس المصدر السابق ص٢١٠.
(٢١) ابن واصل: مفرج الكروب في اخبار ملوك بني ايوب تحقيق جمال الدين الشيال القاهرة ١٩٣٥ ج ١ ص٩٧.
(٢٢) نفس المصدر السابق ص٩٧.
(٢٣) نفس المصدر السابق ج ١ ص٩٧ ود. محسن محمد حسين اربيل في العهد الاتابكي، بغداد١٩٧٦ ص٥٩.
(٢٤) د.محسن محمد حسين اربيل في العهد الاتابكي ص٦٠.
(٢٥) نفس المصدر السابق ص٦٠.
(٢٦) ابن خلكان، وفيات الاعيان ج ٤ ص١١٤.
(٢٧) ابن الاثير، الكامل ج ٩ ص٩٧.
(٢٨) د.عبدالقادراحمدطليمات مظفرالدين كوكبوري امير اربيل، سلسلة اعلام العرب ص٤٣.
(٢٩) ابن الاثير، الكلمل ج ٩ ص١٦٣.
(٣٠) نفس المصدر السابق ج ٩ ص٩٧ ابن تغري بردي النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة القاهرة (بدون التاريخ) ج ٨ ص٣٧٨.
(٣١) ابن خلكان، وفيات الاعيان ج ٤ ص١١٤.
(٣٢) د.عبدالقادر احمد طليمات، مظفرالدين كوكبوري ص٦٢.
(٣٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان ج ٤ ص١١٤.
(٣٤) نفس المصدر السابق ج ٤ ص١١٤.
(٣٥) نفس المصدر السابق ج ٤ ص١١٤ وابو شامه المقدس، الروضتين في اخبار الدولتين، بيروت (بدون التاريخ) ج١ ص١٥٢.
(٣٦) د. محسن محمد حسين، اربيل في معهد الاتابكي ص٦٤.
(٣٧) ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤ ص١١٤ وابو شامه المقدسي، الروضتين ج١ ص١٥٢.
(٣٨) ابن خلكان، وفيات الاعيان ج ٤ ص١١٤.
(٣٩) گەورەی بەناوبانگە لە جەزیرە، لەسەر ڕێگای موسڵ و شامة من ج٢ ص٢٣٥
(٤٠) ابن الاثير: الباهر في الدولة الاتابكية ص١٧٧.
(٤١) ابو شامة المقدسي: الروضتين ج ١ ص٢٦٠ ابن الاثير، الكامل ج ص١٣٨.
(٤٢) ابو شامه المقدسي، الروضتين ج١ ص٢٦٠ عبدالقادر احمد طليمات، مظفرالدين كوكبوري ص٦٠.
(٤٣) ابن الاثير الكامل ج٩ ص١٣٨.
(٤٤) نفس المصدر السابق ج٩ ص١٣٨-١٤٤.
(٤٥) قەلایەکی پتەوە لە جیاتی موسڵ، دانیشتوانەکەی کوردن و کەوتۆتە ڕۆژهەلاتی موسڵ، یاقوت: معجم البلدان ج٤ ص١٣٦.
(٤٦) ابن الاثير، الكامل ج٩ ص١٣٦.
(٤٧) نفس المصدر السابق ج٩ ص١٣٦.
(٤٨) ابن العماد الحنبلي، شذات الذهب بيروت (بدون التاريخ) ج٤ ص٢٥٦.
(٤٩) ابن الاثير، الكامل ج٩ ص١٥٠ والباهر ص١٨١.
(٥٠) سبط ابن الجوزي، مراة الزمان حيدر اباد ١٩٥٤ ج٨ ص٢٦٤.
(٥١) ابن الاثير، الكامل ج٩ ص١٥٠.
(٥٢) نفس المصدر السابق ج٩ ص١٥٤.
(٥٣) نفس المصدر السابق ج٩ ص١٥٤.
(٥٤) نفس المصدر السابق ج٩ ص١٥٤.
(٥٥) د. عبدالقادر احمد طليمات، مظفرالدين كوكبوري ص٧٥.
(٥٦) نفس المصدر السابق ص٧٦.
(٥٧) ابو شامة المقدسي الروضتين ج٢ ص٣٠.
(٥٨) نفس المصدر السابق ج٢ ص٣٠.
(٥٩) نفس المصدر السابق ج٢ ص٣٠ و د. رشيد الجليمي، دولة الاتابكية في الموصل بعد عمادالدين الزنكي ٥٤١-٦٤١ هـ بيروت ١٩٧٠ ص١٣٦.
(٦٠) رشيد الجميلي دولة الاتابكة في الموصل ص١٣٦.
(٦١) ابن الاثير، الكامل ج٩ ص١٥٧.
(٦٢) نفس المصدر السابق ج٩ ص١٥٧، احمد ابن ابراهيم الحنبلي، شفاء القلوب في مناقب بني ايوب تحقيق ناظم رشيد بغداد ١٩٧٨ ص١٠٠.
(٦٣) ابن الاثير الكامل ص١٥٨.
(٦٤) ابوشامة الروضتين ج ٢ ص٣٠.
(٦٥) ابن الاثير الكامل ج٩ ص١٦٣ وابن خلدون تاريخ ابن خلدون المسمي بكتاب العبر وديوان المبتدا والخبر، بيروت ١٩٧٩ ج٥ ص٢٦١.
(٦٦) ابن الاثير الكامل ج٩ ص١٦٣.
(٦٧) نفس الصدر السابق ج٩ ص١٦٣.
(٦٨) ابن خلدون تاريخ ابن خلدون، ج٥ ص٢٦١ وابن الاثير الكامل ج٩ ص١٦٣.
(٦٩) ابن الاثير الكامل ج ٩ ص١٦٣.
(٧٠) نفس المصدر السابق ج ٩ ص١٦٣.
(٧١) ابن خلدون تاريخ ابن خلدون ج ٥ ص٢٦٢.
(٧٢) نفس المصدر السابق ج ٥ ص٢٦٢.
(٧٣) نفس المصدر السابق ج٥ ص٢٦٢ و

د. حسام الدين نقشبندي، اذربيجان ٤٢٠-٦٥٤هـ/١٠٢٩-١٢٥٦ م دراسة في احوالها السياسة و الحضارية، رسالة دكتوراه مطبوعة على الالة الكاتبة مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة بغداد ١٩٨٤ ص٢٨٨.

(٧٤) د. حسام الدين نقشبندي اذربيجان ص٢٨٨.

(٧٥) ابن الاثير الكامل ج٩ ص٢٥٦ ومحمد بن تقي الدين عمر الايوبي مضمار الحقائق وسر الاخلاق تحقيق د.حسن حسين، القاهرة ١٩٦٨ ص٢١٤ وهاملتون جب، صلاح الدين الايوبي دراسات في التاريخ الاسلامي حررها يوسف انيس بيروت ١٩٧٣ ص١٤.

(٧٦) ابن الاثير الكامل ج٩ ص١٦٥.

(٧٧) ابن شداد النوار السلطانية في المحاسن اليوسفية تحقيق.

د. جمال الدين الشيال، مصر ١٩٦٤ ص٦٧.

د. حسام الدين نقشبندي اذربيجان ص٢٨٩.

د. محسن محمد حسين اربيل في العهد الاتابكي ص٧٥.

(٧٨) ابن الاثير الكامل ج٩ ص١٦٥.

(٧٩) نفس المصدر السابق ج ٩ ص١٦٨.

(٨٠) نفس المصدر السابق ج ٩ ص١٦٨.

(٨١) نفس المصدر السابق ج ٩ ص١٦٨.

(٨٢) نفس المصدر السابق ج ٩ ص٢١٠.

(٨٣) نفس المصدر السابق ج ٩ ص٢١٠ د.محسن محمد حسين اربيل في العهد الاتابكي ص٨٧.

(٨٤) ابن الاثير الكامل ج ٩ ص٢١٠.

(٨٥) محیّدین ئەبوو سەعات موبارەک محەمەد: برای ئیبن ئەسیری مێژوو نووسە، یەکێکە لە کەسە نزیکەکانی خاوەنی موسڵ، زۆر پلە و پایەی گەورەی لە دەوڵەتی ئەتابەگی لە موسڵ وەرگرتووە، هەروەها لەگەڵ موجاهیدودین قایماز کاری کردووە، ساڵی ٦٠٦ک کۆچی دوایی کردووە.

(٨٦) ابن الاثير الكامل ج ٨ ص٢٢٧.

(٨٧) نفس المصدر السابق ج ٨ ص٢٢٧.

(٨٨) نفس المصدر السابق ج ٨ ص٢٢٧.

(٨٩) ابن خلدون تاريخ ج ٥ ص٢٦٤.

(٩٠) نفس المصدر السابق ج ٥ ص٢٦٤.

(٩١) ابن الاثير، الكامل ج ٩ ص٢٤٠.

(٩٢) نس المصدر السابق ج ٩ ص٢٤٠.

(٩٣) نفس المصدر السابق ج ٩ ص٢٤٨.

(٩٤) نفس المصدر السابق ج ٩ ص٢٤٨ وابن خلكان، وفيات الاعيان ج ٤ ص٨٤.

(٩٥) ابوشامة المقدسي، تراجم، ص١٤.

(٩٦) ابن الاثير، الكامل ج ٩ ص٢٤٨.

(٩٧) الملك الاشرف الغساني، المسجد المسبوك، تحقيق شاكر محمد بغداد ١٩٧٥ ج١ ص٢٥٢.

(٩٨) ابو الفداء المختصر، في اخبار البشر، بيروت (بدون تاريخ) ج ٣ ص٩٧.

(٩٩) ابن الوردي تتمة المختصر، في اخبار البشر، تحقيق احمد رفعت بيروت ١٩٧٠ ج٢ ص١٧٢.

(١٠٠)د. محسن محمد حسين، اربيل العهد الاتابكي ص٢٤٩.

(١٠١) نفس المصدر السابق ص٢٤٩.

(١٠٢) ابن خلكان، وفيت الاعيان ج ٤ ص٨٢.

(١٠٣) د. محسن محمد حسين، اربيل العهد الاتابكي ص٢٤٩.

(١٠٤) ابن المستوفي، تاريخ اربل، تحقيق سامي السيد خماس العقار بغداد ١٩٨٠ ج ١ ص١٦٩.

(١٠٥) ابوشامة المقدسي، تراجم، ص١٤ وابن خلكان وفيات الاعيان، ج٤ ص٨٢ وسعيد ديوجي، تاريخ الموصل، الموصل ١٩٨٢ ج ١ ص٣٥٦.

(١٠٦) ابن الاثير الباهر ص١٨١ و الكامل ج ٩ ص٧٤٩.

(١٠٧) ابن الاثير الكامل ص٢٤٨.

(١٠٨) ابن جبير رحلة ابن جبير بيروت ١٩٨٠ ص١٨٨.

(١٠٩) سعيد ده يوجي تاريخ الموصل ج ١ ص٣٣٨.

(١١٠) ابن الاثير، الكامل ج ٠ ص٢٤٨.

(١١١) ابن جبير، رحلة ابن جبير ص١٨٨ وابوشامة المقدسي تراجم ص١٤.

(١١٢) ابن الاثير، الباهر ص١٨١.

(١١٣) ابن الفرات تاريخ ابن الفرات، بغداد حققة د. حسن محمد الشماع بصرة ١٩٦٩ ج٢ ص١٦٨، ابوشامة المقدسي تراج ص١٤.

(١١٤) ابن الاثير الكامل، ج ٩ ص٢٤٨.

(١١٥) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج ٤ ص٨٣.

(١١٦) نفس المصد السابق، ج ٤ ص٨٣ وسعيد الديوه جي.

بحث في تراث الموصل دراسة في المصادر التاريخية لتراث و خطط مدينة الموصل، ١٩٨٢ ص٦٤.

(١١٧) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج ٤ ص١١٦-١١٧.

(١١٨) ابن المستوفي، تاريخ اربل، ج ١ ص١١٧.

(١١٩) المصدر السابق، تاريخ اربل، ج ١ ص١٩١.

(١٢٠) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج ٤ ص٦٣.

(١٢١) ابن المستوفي. تاريخ اربل، ج ١ ص٧٦.

(١٢٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج ٤ ص٨٣.

(١٢٣) نفس المصدر السابق، ج ٤ ص٨٣.

(١٢٤) نفس المصدر السابق، ج ٤ ص٨٣.



# هەولێرو بنکەی لێدانی پارە لە سەردەمی سوڵتان موزەفەرەدین گۆگبری

**دکتۆر عەبدوڵڵا خورشید قادر**
**کۆلێژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەدین**

**دەستپێک:**

لە سەردەمی عەباسییەکاندا پارە لە ژمارەیەک لە شارەکانی کوردستان لێدرا، بە تایبەت لە ئامەد و موسڵ. هەولێریش یەکێک بوو لەو شارانەی، کە لەساڵی (٣٢٩ک) یەکەم درهەمی زیو لێدرا. ئەم ساڵە هاوبەش بوو لە نێوان هەردوو خەلیفەی عەباسی "رازی بیللا" (٣٢٢- ٣٢٩ک) و "موقتەزی بیللا" (٣٢٩- ٣٣٣ک)[(١)].

هەولێر کەوتۆتە نێوان هەردوو زێی گەورە و بچووک لە باکووری رۆژهەڵاتی عێراقدا، کە ئەمڕۆ پایتەختی هەرێمی کوردستانە[(٢)]. هەولێر یەکێک بوو لەو شارانەی پارەی زێرو زیوی لێدەدرا.

هەولێر رۆڵێکی باڵای بینی لە پارە لێدان لە سەردەمی ئەتابەکییەکاندا، واتە ئەتابەکەی مەمالیک عیمادەدین زەنکی(٥٣٩- ٦٣٠ک/ ١١٤٤- ١٢٣٢ز). ئەم دەوڵەتە زەینەدین عەلی بن بەکتکین دایمەزراندووە. یەکەم فەرمانڕەوا بووە کە حوکمی موسڵ و شەنگاڵ و حەران و تکریت و هەولێری کردووە(٣). بەڵام لەگەڵ ئەوەش دەستبەرداری هەموو شارەکانی بوو، تەنیا هەولێر نەبێت. پاش ئەو، هەر یەک لەزەینەدین یوسف(٥٦٣- ٥٨٦ک/ ١١٦٧- ١١٩٠ز) و موزەفەرەدین گوگبری(٥٨٦- ٦٣٠ک/ ١١٩٠- ١٢٣٢ز) بوون بەجێنشینی.

هەولێر بنکەیەکی سەرەکی بووە لە دەوڵەتی ئەتابەکی. هەر لە ساڵی (٥٨١ک/ ١١٨٥ز) ملکەچی دەوڵەتی ئەیوبی بووە، کە سەلاحەدینی ئەیوبی[(٤)] دەستی بەسەر موسڵ دا گرت، لەزەمەنی مەسعودی یەکەمدا. لەپاش کۆچی دوایی سەلاحەدین ئەیوبی، ساڵی (٥٨٩ک/ ١١٩٣ز) براکەی شای دادپەروەر (سەیفەدین ئەبوبەکر) بوو بەجێنشینی. لەساڵی (٥٩٦ک/ ١١٩٩ز) شای دادپەروەر بەسەر هەموو ناوچەکاندا زاڵ بوو، لەوانەش هەولێریش لەوانە بوو، کە لە ماوەی

حوكمڕانی میر موزەفەرەدین گوگبری دابوو، كە كوڕی میر زەینەدین ئەبی حەسەن عەلی، كوڕی بكتكین ئەبو سەعید شای گەورە، حاكمی هەولێر بوو. لەقەڵاتی موسڵ لەدایک بووە، لەپاش مردنی باوكی بوو بەوالی هەولێر و ماوەیەک تێیدا مایەوە، پاشان گوێزرایەوە بۆ موسڵ، دواتر چووە شام و لەوێ پەیوەندی بە شا ناسر سەلاحەدین كرد و ئەویش زۆر ڕێزی لێنا[٥]. خوشكی خۆی رابیعە خاتوونی كچی ئەیوبی پێیدا[٦]. موزەفەرەدین لەگەڵ سەلاحەدین ئەیوبی زۆر هەڵوێستی نواندووە. كاتێ براكەی زەینەدین یوسف لە شاری ناسرە، لەساڵی (٥٨٦ک/ ١١٩٠ز) كۆچی دوایی كرد. موزەفەرەدین لەلایەن سوڵتان سەلاحەدین ناردی بۆ حەران و ڕەها و سیمسات، ئەوەی لە هەولێر لەدەستی چووبوو، بۆی قەرەبوو كردەوە. دواتر شارەزووریشی خستە سەر و رووی لەوێ كرد. پاشان لەمانگی زیحەجەی ساڵی (٥٨٦/ ١١٩٠ز) هاتە هەولێر (٧). لەساڵی (٦٣٠ک/ ١٢٣٢ز) كۆچی دوایی كرد[٨].

### هەڵبژادرنی هەولێر وەک بنكەیەک بۆ لێدانی پارە

بێگومان هەڵبژاردنی هەولێر وەک بنكەیەک بۆ لێدانی پارە لەو كات و ساتدا، خۆی لەخۆیدا دەلالەت لەسەر گرنگی شاری هەولێر دەكات. چونكە هەڵبژاردنی شوێنێک بۆ لێدانی پارە خۆی لەخۆیدا جەختی لەسەر گرنگی و پڕ بایەخی شارەكە دەكردەوە لەرووی سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی. لە سەرەتادا پارەی قورقوشمی لێدرا كە لە نێو خۆدا مامەڵەی پێدەكرا. دواتر دیناری زێڕ لێدرا، كە ئەمەش زیاتر جەخت لەسەر بەهای شارەكە دەكاتەوە. بەمە هەولێر بوو بە بنكەیەكی سەردكی دەوڵەتی ئەتابەكی.

شایانی ئاماژە پێكردنە ئەو پارانەی لە هەولێر لێدەدران، ئێستا لە مۆزەخانەی هۆمایۆن لە (توركیا) پارێزراون، وەک فلوسی زەرد كە لەساڵی (٥٨٧ک/ ١١٩١ز) لە هەولێر لێدراوە. دەقەكەش بەم شێوەیە، تەماشای وێنە ژمارە[١] بكە.

**ڕوو:**

بنكە: وێنەی كەسێک لەسەر كورسی پاشایەتی دانیشتووە و گۆچانێكی بەدەستی چەپ گرتووە، تاسكلاوێكی لەسەرە.

**پەراوێز:** دەستەواژەی حیسامودین یولق بن ئیل غازی گوگبری بن عەلی نووسراوە[٩].

**پشت:** دەقێک بە (٣) خەت لەناو چوارگۆشەیەک نووسراوە.

لە امیر
المؤمنين | الملك الناصر<br>صلاح الدين<br>يوسف | محب دو
ابن ايوب[١٠]

كاریگەری لەسەر وێنە كێشراوەكە لەسەر رووی پارە لێدراوەكە لەرووی دانیشتن لەسەر كورسی پادشایەتی بەروونی دەردەكەوێت[١١]. كە پێشتر لە هونەری ئیسلامیدا باو بوو، بەسەر هونەری ساسانییەكاندا[١٢]. لە هونەری سۆمەری[١٣] و میسری و بوزی[١٤] دۆزرایەوە. ئەو جۆرە دانیشتنە لەسەر كورسی پادشایەتی بە ئاشكرا دیارە كە لە زۆر لە مۆزەخانەكان دەبیندرێ و بیندراوە[١٥] لەگەڵ هێڵكارییەكان[١٦]، هەروەها لەبانی كلیسای كابلا تینا بیندراوە، كە دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی سەدەی دوانزەهەمی زایینی[١٧] نیگاركێشی فاتیمییەكان كاری تێ كردوون[١٨]. وێڕای دانیشتن لەسەر كورسی پادشایەتی سەرنج دەدەین وێنەی شیعرێک لەسەر شێوەی پێشینیان لەسەر هەردوو لای رووی لای نزیک شانەكانی دەبیندرێ[١٩] كە كتومت بەپێشینیان دەچێت[٢٠] كە لەسەر وێنەی سامەر[٢١] هەیە دەبیندرێ. هەروەها لەسەر پەیكەری پارەی یۆنانییەكان ئەو جۆرە شیعرانە دەبیندرێ.

لە لایەكی دیكە گەر سەرنجی كەسی دانیشتوو بدەین دەبینین

نیگارکێشەکە تایبەتمەندییەکی داوەتێ و ئەمەش یەکێکە لە جیاکەرەوە گرنگەکانی قوتابخانە ئیسلامییەکان، تایبەت بەنیگار کێشان، کە ئاکارەکانی دەنوێنێت[٢٢]. وێنەی کەسی ناوبراو بەرەو روو دانیشتووە، ئەمەش بەئاکارێکی گشتی گوزارشت دەکرێت، کە زۆری وێنەی کەسایەتییەکان لەسەر هێلکارییەکانی موسڵ بەدەردەکەوێت[٢٣]. هەروەها لەسەر پەیکەرە فەخفوری[٢٤] و کانزاییەکانیش دەردەکەوێت[٢٥].

لەوانەیە لە رووی رێساکانی نیگارکێشییەوە، بگەرێتەوە بۆ هونەرکاری ساسانی بەپێی تێروانین لەو هونەرکارییە[٢٦]، بەڵام کەسایەتییەکان شێوەی ئێرانی دەنوێنن. هەمان ئەو کەسایەتییەش سەرنج دەدەین لە قوتابخانەی موسڵی لەسەر نیگارکێشە هێلکارییەکان[٢٧] و پەیکەرە کانزاییەکان[٢٨]. رووی وێنەکەش بازنەییە. ئەمەش سیمایەکی دیکەیە بەوێنەی رووی ئەو کەسانە دەچێت کە دەگەرێنەوە بۆ قوتابخانەی موسڵی. هەروەها وێنەکان لە کەسایەتییە میسرییەکانیش دەبیندرێ لەماوەی ئەیوبییەکانیشدا[٢٩]. لەسەر تاسکڵاوەکەی کەسی دانیشتووە، نیگارکێش کراوە، بەکاسکێت دەچێت و بەکانزایی جوان کراوە و بریسکەدارە. وێنەی کەسەکە ئامێری گیتار دەژەنێ. ئەو جۆرە لەسەر لێدانی پارەکانی موزەفەرەدین گوگبری کورت کرایەوە. لەوانەیە هۆکارەکەش بگەرێتەوە بۆ ئەو نەخش و نیگارەی سەرۆنییەکان کە بەجلوبەرگی میللی دروست کرابوون، کە لەو سەردەمەدا باو بوون جا چ ناوخۆیی بان یاخود لە ئێرانەوە هێنرابن[٣٠].

گەر تەماشای کورسی پادشایەتی بکەین، ئەو کەسەی لەسەری دانیشتووە، دەبینین بەشێوەی چوارگۆشەیی دانیشتووە و لە هەردوو لاوە کەمێ مەیلی لای خوارێ دەبێ، هەردوو گۆشە بەرزەکان لێی جیابوونەتەوە و لایەنەکانی بەنەخش و نیگاری ئەندازەیی لەسەر شێوەی هێڵکاری لارو کەوانەی بەیەکداچوو رازێندراوەتەوەو هەروەها لەهەردوو لای کورسییەکەش دەبیندرێت. لای هەندێ شارەزایان ئەو جۆرە کورسییە بەجۆری تورکی دادەنێن[٣١]. هەروەها بە بەرزترین سیمای قوتابخانەی موسڵ[٣٢] و قوتابخانەی بەغدا دادەندرێت، نەخوازەڵڵا ئەو وێنانەی زەقێندراون لەلایەن واسیتییەوە[٣٣]. لەنیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی کۆچی ئەو جۆرە کورسییەی پادشایەتی، کرا بە ئاکارێکی هونەری بۆ قوتابخانەکانی ناوخۆی عێراق لەو ماوەیەدا.

لەو پارانەی هەولێر کە ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانیا پارێزراون فلوسی زەرد[٣٤]، کە لەساڵی(٥٨٧ک/ ١١٩١ز) لە هەولێر لێدراوە و دەقەکانیش بەم شێوەیەیە:

**روو:**

**چەق:** نیوە وێنەی کەسێکی قژ لوول دراوە، بەرەو لای راست دەروانێ و پێدەچێ روخساری ئەو کەسە گەنج بێ و ریش و سمێڵی تاشی بێ.

**چەق:** مەلیک ناسر کوڕی یوسف کوڕی عەلی.

**چەقی پشتەوە:**

نصر
الله
الناصرلدين
أمير المؤمنين لمده
الدنيا والدين ابو
محمد

**چەق:** بەناوی خوا ئەو فلوسە لە ساڵی پێنج سەدو هەشتاو حەوت لە هەولێر لێدراوە.

هەر لە مۆزەخانەی بەریتانیا پارەی زەردی دیکەی لێیە، کە مێژووەکەی بۆ هەمان ساڵ دەگەرێتەوە، بەڵام لە قالبێکی دیکەدا دەقەکەش بەم شێوەیەیە:

**روو:**

**چەق:** وەکو پێشتر

**چەقی پشت:**

نصر

الله
الناصرلدين
امير المؤمنين
لمدة الدين ابو
محمد

**چەق وەکو پێشتر**

هەروەها مۆزەخانەی بەریتانیا لە لەندەن پارەی سێیەمی هەمان ساڵیشی لێیە. بەڵام ئەویش بەقالبێکی ترە.

**روو:**

**چەق:** رووی گەنجێک بەڵام بەلای چەپدا دەڕوانێ لەوەی کە بەلای راستدا بێت.

**چەقی پشت:**

الناصرلدين الله
امير المؤمنين لمدة
الدنيا والدين
ابو محمد

**چەق:** بەناوی خودا، ئەو فلوسە لەساڵی ٥٨٧ لە هەولێر لێدراوە[٣٥].

لە مۆزەخانەی ئەستەنبوڵ دراوێکی دیکە پارێزراوە، کە ئەویش لەساڵی ٥٨٧ک لە هەولێر لێدراوە و دەقەکەشی بەم شێوەیەیە:

**روو:**

**چەق:** لە شێوەی پێشتر دەچێت

**پەراوێز:** مەلیک ناسر یوسف بن ئەیوب گوگبری بن عەلی

**چەقی پشت:**

الله الناصرلدين
المؤمنين لمدة
الدنيا والدين
أمير أبو نصر

**پەراوێز:** بەناوی خودا ئەو فلوسە لە ساڵی پێنج سەدو هەشتاو حەوت لە هەولێر لێدراوە.

زیاتر لە قالبێک دراو (پارە) لە ماوەی یەک ساڵدا لە هەولێر لێدراوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت لە ماوەی ئەو ساڵەدا بە هەزاران پارە لێدراوە، لە هەمان کاتدا ئاماژەشە بۆ ژمارەی دانیشتوانی شاری هەولێر لەساڵی (٥٨٧ک/ ١١٩١ز). هەولێر گەورە بووە بۆ ئاڵوگۆڕ پێکردن، پێویستی بەپارەی زەرد بووە. شایانی باسە ئەمە خۆی لەخۆیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەوسا باری ئابووری زۆر باش بووە.

هەر لەو پارە زەردانەی لەساڵی(٥٩٠ک/ ١١٩٣ز) لە هەولێر لێدراون کۆمەڵێ پارەی تایبەتمەند بوون[٣٦] دەقەکانیان بەم شێوە بووە:

**روو:**

چەق: وێنەی مرۆڤێک لەپاڵ شێرێک[٣٧]

**پەراوێز:** لەلای راست (ساڵی نۆوەت) نووسراوە، لەلای چەپ (پێنج سەد)، لە ژێرەوە (لەهەولێر لێدراوە).

**پشت:** نووسینی ناوەندەکە بە شەش خەت نووسراوە ئەمەش دەقەکەیەتی:

الله محمد
الناصرلدين الله
أمير المؤمنين (عز)
الدنيا و (الدين)
ابو نصر (مطفر)
الدين (كوك)
ايسر (ى)

**پەراوێز:** نییەتی

وێنەی ئاژەڵێک لای وێنەی مرۆڤ لەسەر دراوە زەردەکان دەردەکەوێت، کە موزەفەرەدین گوگبری لێیداون وێنەکەش شێرێکە[٣٨]. نیشانەی خۆسازدان و بەرگری لەسەر دیارە وێڕای ئەوەی ئازاو بەتوانایە بەوەی، کە شێر گەورەی ئاژەڵانە.

بەڵام پەیوەندی نێوان وێنەی ئاژەڵ و ناوی مەلیک ئەتابەکی موزەفەرەدین، ناسراوە بە گوگبری کە ناوێکی تورکییە. بە واتای (گورگی شین)[٣٩] کەواتە هیچ پەیوەندییەک لەنێوان وێنەو ناودا نییە، کە لەسەر دراوەکان دەردەکەوێت. چونکە گوگبری واتای (گورگی شین) دەگەیەنێت. لە کاتێکدا ئەو وێنەی لەسەر پارەکەیە شێرە نەک گورگ[٤٠].

دیاردەی دەرکەوتنی مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵان، کە نیگارکێشەکە کێشاویەتی دیاردەیەکی کۆنەو، رەسەنایەتییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شارستانیەتی دۆڵی رافیدەین لە سەردەمی کۆنی بابلییەکاندا[٤١]. لە دابونەریتی ئاشوورییەکاندا بە

هێما خواوەند و ئاژەڵیان بەیەک دەبەستەوە و لەزۆر بواردا بە وەستان وێنەیان دەکێشان. بۆ نموونە وێنەی خواوەند" ئور" لەسەر پشتی گایەک بەوەستاوی کێشرابوو.[42] ئەم کاردش پێچەوانە دەبێتەوە لەگەڵ رەسەنایەتی هونەرکاری یاخود توخمەکانی هونەرکاری لە هونەرکاری ئیسلامیدا کە لەژێر چاودێری ئەتابەکییەکان لە نیگارکێشاندا لەسەر دراوی ئەتابەکی لە نەخش و نیگاردا رەنگی دایەوە. دەشێ هەندێ بەدواداچوون لە هەندێ توخمی هونەرکاری بکەین لە وێنەکاندا. روخسار گوزارشت ناکات. هەموو ئەو توخمانە لە شێواز و چاککردنی هونەری رەگوریشەی دەگەڕێتەوە بۆ هونەری ساسانی و هونەرکاری عێراقی لەپێش ئیسلامدا. توخمەکانی هونەرکاری ساسانی لە رێساکان لە هونەرکاری ئاشووری و بابلی چووە، کە ساسانییەکان لە رێگای ئەخمینییەکانەوە پێی گەیشتوون جا چ لە رێگای گواستنەوە یان سوود بینین بێ لە هونەر و شارستانەتییەکانی دۆڵی رافیدەین بووبێ و ئەو توخمانەیان تێکەڵ بە توخمەکانی یۆنانییەکان کردبێ لە قاڵبێکی ئیسلامی تازەدا، کە لە ئەسڵدا ئەو توخمانە تێکەڵ بەیەک کراون و لەژێر ئالای ئایینێکی تازە تواونەتەوەو پێکهاتووە[43].

لە مۆزەخانەی عێراقی کۆمەڵێ پارە لەژێر ژمارە (٥٨٠) کە هی هەمان ساڵی (٥٩٠ک/ ١١٩٣ز) لە قاڵبێکی تردا پارێزراون.

**روو:**

**چەق:** وەکو پێشوو

پشت: بەشەش خەت بەخەتی کوفی نووسینەکە نەخشێندراوە بەو دەقە:

محمد
الناصرلدين الله
امير مؤمنين عز
الدنيا والدين
ابو نصر مظفر
الدين كوكبري

**پەراوێز:** نییەتی

هادی فاروق فلوسی زەردی دیکەی هی هەمان ساڵ (٥٩٠ک/ ١١٩٣ز) پاراستووە، کە قاڵبێکی دیکە دەقەکەی بەم شێوەیەیە:

**روو:**

**چەق:** وەکو پێشتر

**پشت:** بەحەوت خەت و بەخەتی کوفی دەقەکە نووسراوە و نەخشێندراوە:

الله محمد
الناصرلدين الله
امير المؤمنين
ملك الامراء
مظفر الدين
كوكبري
علي

نووسین لەسەر رووی لای راست نەبووە.

**پەراوێز:** نییەتی.

دوای ئەوە گرنگی هەولێر لەوە دەردەکەوێت، کە لەو شارەدا پارەی دیناری زێڕ لێدراوە. ئەمەش جەخت لەسەر ئەو شارە دەکاتەوە، کە دیناری زێڕ لێ نەدەدرا گەر پایتەخت یان شارێکی گەورە و پڕ بایەخ نەبوایە.

لەو پارە دینارییانەی لە ساڵی ٦٠٩ک لە هەولێر لێدراون دەقەکەی بەم شێوەیەیە:[44]

**روو:**

**چەق:**

بن علي
لا اله الا الله
وحده شريك له
الناصرلدين الله
أمير المؤمنين

**پەراوێزی یەکەم:** بەناوی خودا ئەم دینارە لە ساڵی شەش سەدو نۆ لە هەولێر لێدراوە.

پەراوێزی دووەم: لله الأمر قبل ومن بعد ويومئذ يفرح المؤمنين بنصر الله

**چەقی پشت:**

العادل
محمد رسول الله
صلي الله عليه
وسلم ملك
الامراء كوكبري

**پەراوێز:** محمد رسول الله ارسله بالهدي ودين الحق ليظهره

علي الدين كله ولوكره المشركون.

سەرنج دەدەین دەقەکانی ئەم پارەیە[٤٥] نازناوی خەلیفەی عەباسی ئەلناسرلدینیللا ئەمیری ئیمانداران (٥٧٥- ٦٢٢ک) هەڵگرتووە، کە لە هەموو خەلیفەکانی عەباسی، ماوەی حوکمرانی درێژتر بووە. ماوەی خەلیفایەتییەکەی ٧٤ ساڵی خایاند. لە دەقەکانی پێشتردا نازناوی (الملک العادل) و سەرناوەکەی (ابو بکر) دەردەکەوێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ برای سەلاحەدین ئەیوبی، کە لەماوەی نێوان (٥٩٦- ٦١٥ک) شای میسر و سوریا بووە و نازناوی (الملک العادل) بووە. دەقەکانی ئەم دینارە نازناوی (ملک الامراء کوکبری) هەڵگرتووە، کە یەکێک بووە لە نازناوە تازەکانی، کە جەخت لەسەر گەورەیی مەکانەتی ئەو میرە لەو سەردەمەدا دەکاتەوە.

لە میانەی دەقەکانی ئەو دینارەدا سەرنج دەدەین ئەیوبییەکان باڵادەست بوونە بەسەر هەولێردا و لێدانی پارەی دیناری زێڕ لە هەولێر بەردەوام بوو. دینارێکی دیکەی زێڕ، کە لە ساڵی(٦١٢ک) لە هەولێر لێدرا دەقەکانی بەم شێوەیە بووە:

**روو:**

**چەق:**

عدة الدنيا والدين

لا اله الا الله

وحده لا شريك له

الناصرلدين الله

أمير المؤمنين

ابو نصر

**پەراوێزی یەکەم:** ئەم دینارە لە ساڵی شەس سەدو دوانزە لە هەولێر لێدراوە

**پەراوێزی دووەم:** لله الأمر من قبل ومن بعد ويومئذ يفرح المؤمنين بنصر الله.

**چەقی پشت:**

الملك- الكامل

محمد رسول الله

صلي الله عليه

وسلم ملك

الامراء كوكبري محمد

**پەراوێز:** محمد رسول الله ارسله بالهدي ودين الحق ليظهره علي الدين كله ولو كره المشركون.

ئەوەی لەپێشەوە باسمان لێکرد گرنگی و پێشکەوتنی شاری هەولێر دەردەخا، کە هەر لەساڵی ٥٨٧/ ١١٩١ز پارەکانی زەردو زێڕو زیوی تیادا لێدراوە. هەروەها جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لەو شارەدا خانەیەک بە تەواوی پێویستییەکانی پارە لێدان بۆ هەموو ئەو پارانە بەزەردو زێڕو زیوەوە هەبووە.

سەرچاوە و پەراوێزەکان:

١- ناهض عبدالرزاق القيسي: نقود اربل في (قلعة اربيل) عبر العصور، مؤتمر العلمي الأول لاعمار قلعة هەولێر (اربيل)، (اربيل: ٢٠٠٤م)، ص٩٢.

٢- كي لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة كوركيس عواد وبشير فرنسيس، مطبعة الرابطة (بغداد: ١٩٥٣م)، ص١٢٢.

٣- وقد اشار الي هذه الحقيقة.
Stephen Alboum Acheak list of Islamic Coins 1988 P. 25.
نقلا عن القيسي: المرجع السابق، ص٧١.

٤- يعتبر صلاح الدين الأيوبي مؤسس الدولة الايوبية ٥٦٤- ٦٥٠ھ/ ١١٦٩-١٢٥٢م والتي تعاقب علي حكمها تسعة حكام.
ولد صلاح الدين الأيوبي بتكريت من أبوين كرديين سنة ٥٣٢ھ/ ١١٣٧ وانتقل بصحبة والده الي مصر مع عمه شيركو. وقد خلفه من بعد وفاته علي حكم مصر سنة ٥٦٤ھ/ ١١٦٩م وتمكن صلاح الدين من تحقيق نصرا لها علي الصليبين ويحرر بيت المقدس في معركة حطين يوم ١٥/٧/١١٨٩م. للمزيد من المعلومات ينظر:
ابن شداد: سيرة صلاح الدين الأيوبي، مصر ١٣١٧، ص٥٧.

٥- الزركلي: الاعلام، ط٤ (بيروت: ١٩٧٩م)، ج٥، ص٢٣٧.

٦- ابن خلكان: وفيات الأعيان وانباء ابناء الزمان، تحقيق د.احسان عباس (بيروت: ١٩٦٨م)، ج٣، ص٢٠٧.

٧- المصدر نفسه، ج٤، ص١١٣.

٨- الحنبلي: شفاء القلوب في مناقب نبي ايوب، تحقيق ناظم رشيد (بغداد: ١٩٧٨م) ص١٠٠، حاشية ٢١٣.

٩- حسام الدين بن يولق: من ملوك الدولة الأرتقية الذين حكموا ماردين ٥٨٠- ٥٩٨ھ/ ١١٨٤- ١٢٠٠م) عاصر مظفر الدين كوكبري وكانت علاقته حسنه وهذه المسكوكه تؤكد العلاقة الطيبة. للمزيد ينظر زامباور: معجم الانساب والأسر الحاكمة في

التاريخ الاسلامي، ترجمة زكي محمد حسن وحسن أحمد محمود (القاهرة: ١٩٥١م)، ص ٢٤٥.
١٠- ان نقش اسم صلاح الدين على هذه المسكوكة- يؤكد ان اربل كانت قد دخلت ضمت تبعيته، ينظر ابن الاثير: الكامل في التاريخ (بيروت: ١٩٦٦م)، ج١٢، ص٥٦.
١١- م.س. ديماند: الفنون الاسلامية، ترجمة أحمد محمد عيسي، مراجعة وتصدير احمد فكري ط٢ (مصر: ١٩٥٨م) ص١٣٥.
١٢- ارثر كريستنس: ايران في عهد الساسانيين، ترجمة يحي الخشاب، مراجعة عبدالوهاب عزام (القاهرة: ١٩٥٧م)، ص١٦٦ لوحة ٨.
١٣- انطوان مورتكان: الفن في العراق القديم ترجمة وتعليق عيسي سلمان وسليم طه التكريتي (بغداد: ١٩٦٩م). ص ١٣٩ لوحات ١٠٥، ١٠٦، ١٠٧.
١٤- جيمس هنري برستيد: تطور الفكر والدين في القديمة، ترجمة زكي سوسن (القاهرة: ١٩٦١م) ص٤٣٦.
١٥- زكي محمد حسن: فنون الاسلام (بيروت: ١٩٨١م)، ص٢٦٥ شكل ١٨٩.
١٦- زكي محمد حسن: اطلس الفنون الزخرفية والتصاوير الاسلامية (بيروت: ١٩٨١م)، ص٣٠٧، ٣٠٨ شكل ٨٨٤، ٨٨٦.
١٧- محمد باقر الحسيني: دراسة تحليلية للعناصر الزخرفية علي النقود السلجوقية- مجلة سومر، مج٢٥ (بغداد: ١٩٦٥م)، ص٣٢.
١٨- حسن الباشا: التصدير الاسلامي في العصور الوسطي (القاهرة: ١٩٥٩م)، ص٨٣.
١٩- محمد باقر الحسيني: العملة الاسلامية في العهد الاتابكي (بغداد: ١٩٦٦م)، ص١٣٩، عبدالواحد الرمضاني: مسكوكات بني ارتق ذات الصور، رسالة ماجستر غير منشورة، كلية الاداب - جامعة القاهرة (القاهرة: ١٩٧٢م) ص١١١.
٢٠- السلافيات: هو الشعر السدل المفوف اسفل مستوي الأذن وأمامه.
٢١- حسن، فنون الاسلام، ص٢٦٥، شكل ١٨٩.
٢٢- الباشا: التصدير الاسلامي في العصور الوسطي، ص١٢٨، فن التصوير في مصر الأسلامية (القاهرة: ١٩٦٦م)، ص٩٧.
٢٣- عيسي سلمان: المدرسة العربية في التصوير الاسلامي (بغداد: ١٩٧٢م)، ص٨.
٢٤- طلعت الياور: دراسة للحباب الفخارية المكتشفة في موقع باشطابيا بالموصل (اداب الرافدين) مجلة كلية الاداب بجامعة الموصل، العدد الرابع (الموصل: ١٩٧٢م)، ص٨٢ شكل (١).
٢٥- صلاح حسين العبيدي: التحف المعدنية الموصلية في العصر العباسي (بغداد: ١٩٧٠م) ص١٧٢.
٢٦- ريستنس: المراجع السابق، ص١٨٣ لوحة ٤٠.
٢٧- سلمان: المرجع السابق، ص١٤٥.
٢٨- العبيدي: المرجع السابق، ص ١٧٥.
٢٩- الباشا: فن التصدير في مصر الأسلامية، ص٨٥.
٣٠- الحسيني: العملة الاسلامية في العهد الاتابكي، ص١٣٩.
٣١- عيسي سلمان: الواسطي يحيي بن محمود رسام وخطاط ومذهب مزخرف (بغداد: ١٩٧٢م) ص٢٩.
٣٢- سلمان: المدرسة العربية في التصوير الاسلامي، ص٨.
٣٣- سلمان: الواسطي، اللوحات ١١، ١٤، ١٥.

**34- Lane pe. Cotaf Orical Coins in B. M London Vol. III. P 232.**

**35- Ibid. P233**

٣٦- مجموعة خاصة للهادي فاروق شقلاوة- اربيل ينظر: عبدالله خورشيد قادر: الأصول الفنية لتصادير المسكوكات الاسلامية حتي سقوط بغداد ٦٥٦هـ/ ١٢٥٨م (نماذج مختارة) رسالة ماجستير غير منشورة كلية الاداب، جامعة صلاح الدين (اربيل: ٢٠٠٣م) ص١٥٦.
٣٧- هنالك نقد اخر مشابه تماما لهذا النقد محفوظ في المتحف الاسلامي بالقاهرة تحت رقم (١/ ١٧١٩٦). ينظر الحسيني: العملة الاسلامية في العهد الاتابكي، ص١٣٩-١٤٠.
٣٨- ممايؤكد ان صورة الحيوان علي هذه المسكوكة هي صورة أسد مانراه من الصفات المميزة لهذا الحيوان فالصورة من الشعر المحيط برأسه ومن شكل الذيل والاذنيين والمخالب تبدوا واضحة الا أنه معروفة في اربيل ب (طاسوار) أي راكب الثور وقد شاع استعمال هذه التسمية خطأ عند اهالي أربيل.
٣٩- ابن خلكان: المصدر السابق، ج٤، ص١٢١.
٤٠- الحسيني: العملة الاسلامية في العهد الاتابكي، ص١٤٠.
٤١- فلا خط دمية فخارية لفلاح محيتطي ظهر البقرة في بداية الألف الثانية قبل الميلاد. ينظر ثروت عكاشة: الفن العراقي القديم سومر وبابل و آشور (بيروت: ١٩٧١م) ص٥٤٠ لوحة ٤٣٥، اندرية بارو: سومر فنونها وحضارتها. ترجمة وتعليق عيسي سلمان وسليم طه التكريتي (بغداد: ١٩٧٧م) ص٣٤٩، لوحة ٣٦٠.
٤٢- عيسي سلمان: المسكوكات المصورة في مجموعة عبدالله شكر الصراف، مجلة المسكوكات العدد الثاني (بغداد: ١٩٦٩م) ص٢١.
٤٣- قادر: المرجع السابق، ص١٥٩.
٤٤- القيسي: المرجع السابق، ص٩٤.
٤٥- هذا الدينار محفوظ بالمتحف البريطاني بلندن نشره لين ثول، ج٩، ص٣١٠-٣١١. نقلا عن القيسي: المرجع نفسه، ص. ٩٥

# زانستە عەقلییەکان لە هەولێر لە سەردەمی هەزبانی و ئەتابەکیدا

دکتۆر ئومێد ئیبراهیم جوزەلی فەتاح
کۆلیژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین

**زانستی تاقیکردنەوە**

زانستی تاقیکردنەوە، یەکێکە لەو زانستانەی کە زانایانی هەولێر زۆر بایەخیان پێداوە. قورئانی پیرۆز، لەمیانی بیرکردنەوە لە خەلقکردنی ئاسمان و زەوی و هەبوونی دیاردەی زانستی و نهێنییەکانی، مرۆڤی هوشیار کردەوە، کە دەبوونە هۆی ئازادکردنی (عەقڵی مرۆڤ) لەبیری پووچ و خەیاڵی و بەندیی و گوڕ و قسەی پروپووچ، کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر ئاراستەکردنی موسڵمانان بەرەو خوێندنەوەی ئەو دیاردانە بە وردی، توانییان بە شێوەیەکی زانستییانە بەشداری لەو لایەنە جۆراوجۆرانە بکەن، زانستی بیرکاری و گەردوونی و کیمیا و پزیشکی، بە بایەخترین زانستی تاقیکردنەوە داندراوە، موسڵمانان بایەخی زۆریان بەو لایانانە داوە، لەکاتی لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوە و خوێندندا.

(ئەربل) دوور نەبوو لەو زانستانە، بەڵام بایەخەکەی کەمتر بوو بە بەراورد لەگەڵ زانستی شەرعی و زمانەوانی و ئەدەبیات. ئەو لایانانەی خوارەوە، بایەخترین زانستەکانی تاقیکردنەوەن لە ئەربلدا، کە بنەماکانی لە واقیعی ئەو سەردەمەی جیهانی ئیسلامی وەرگرتووە و پشتی پێ بەستووە.

**١- پزیشکی:**

(بیمارستان) جێگای سەرەکی بوو بۆ خوێندن و چارەسەرکردنی مرۆڤ، قوتابخانەکان بەشدارییەکی باشیان کرد لە پێشکەوتنی ئەو زانستە، چەند دەزگایەک لە ئەربل خزمەتی ئەو لایەنەی کردبوو، (بیمارستان) کە (سولتان موزەفەرەددین گۆگبری) دروستی کردبوو، کاریگەرییەکی زۆری هەبوو بەسەر پاراستنی تەندروستی گشتی، سولتان بەخۆی نەخۆشەکان و پەککەوتەکانی بەسەردەکردەوە و سەری لێدەدان و لە پێویستییەکانیانی دەپرسی، ئەوەش بەڵگەیەک بوو لەسەر بایەخدانی (سولتان موزەفەر) بە باری نەخۆشەکان، هەر لەو رادە رانەوەستا، بەڵکو پزیشکەکانی رادەسپارد بۆ ئەوەی شێخ: (ئەبو محەمەد عەبدوللەتیف ئیبن ئەبی ئەلنەجیب عەبدولقاهر ئیبن عەدوڵڵا ئیبن محەمەد ئەلسەهرەوەردی) چارەسەر بکەن، کە چەند نەخۆشییەکی هەبوو، کە لە ئەربل مایەوە و ساڵی (٦١٠ک/ ١٢١٣ز) کۆچی دوایی کرد.

ئەو هەواڵانە، بەڵگەیەکی باشە بۆ بەدیارخستنی رۆڵی پزیشکان، لە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان لەلایەک، لەلایەکی دیکە، گەشەکردن و پێشکەوتنی ئەو زانستە لە ئەربلدا، هەروەها مەسەلەی هەبوونی

پەیوەندییەکان و ئەوانەی دێنە ئەربیل، وەکو کەسایەتی پزیشکی و زانستی، لەوانەش: عەبدولرەحیم ئیبن عەلی ئیبن ئیسحاق بن شیت (الطبیب البیاتي) (٦٢٣ک/ ١٢٢٦ز)، کە زانایەکی ناسراو بوو لە پزیشکی و شیعر و نامەکان.

هەروەها لەوانەی کە ناسراو بوون وەکو پزیشک و هاتوون بۆ ئەربیل و لەوێ جێگیربوون بۆ کاتێکی باش: (ئیبراهیم ئیبن ئیسماعیل ئیبن محەمەد ئیبن عەبدوڵڵا ئەلحەرانی، ناسراو بە ئیبن ئەلنەقیب) (٦٢٢ک/ ١٢٢٥ز) کە ئەدیب و ئەخلاقێکی بەرزی هەبوو و تێکەڵاوی باشی هەبوو لەگەڵ خەڵکەکە، زانیاری باشی لەلایەنی (کلی چاو) هەبوو، بەمانای پزیشکی چاو بوو لە (بیمارستان)، هەروەها ئەم شارە چەندین پزیشکی دیکەی پێگەیاندوە، کە سەدا و دەنگیان هەبووە لەو زانستە: هەر وەکو: (ئەحمەد یوسف ئیبن جامع ئیبن ئەحمەد ئیبن ئەلحوسێن ئیبن ئەلحەسەن ئەلئەربلی) (٦١٥ک/ ١٢١٨ز)، کە سەرپەرشتی (کۆگای دەرمانەکان - صیدلیە)ی لە ئەربیل دەکرد.

لەمەشەوە بۆمان دەردەکەوێ کە لە ئەربیل پیشەسازی دەرمان (صیدلیە) هەبووە، هەروەها هەموو ئەو زانیاریانەی لەبارەی دەرمانەکان، ئەوەش بلیمەتی و زیرەکی پزیشکانی ئەربیل لە بەرهەمهێنانی دەرمانی پێویست بەدیاردەخا، کە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانیان بەکاریانهێناوە، هەروەها رۆڵ و چاکەی سوڵتان (موزەفەرەدین گۆکبری) بەدیاردەخا، کە خێرخوازێکی گەورە بووە، پارەی زۆر بۆ ئەو لایەنە تەرخان دەکرد، هەوڵێکی زۆری بۆ ئامادەکردنی مووچەی (پزیشکان) و (پەککەوتان) دەدا.

لەو زانایانەی ئەربیل، کە زانیارییەکی زۆری هەبوو لەو زانستە: (ئیسحاق ئیبن مەعالی ئیبن شەماس ئیبن هیبەتوڵڵا ئیبن ئیبراهیم ئەلئەربلی) (٦١٧ک/ ١٢٢٠ز) کە شەیدای خوێندنەوەی کتێبی پزیشکی بوو، زانیارییەکی باشی لە شیعری عەرەبی و مێژوویان هەبوو، زۆر شتی خوێندۆتەوە لەبارەی زانستی (ئەندازیاری و پزیشکی) هەروەها سەرپەرشتی (دیوانی ئەلئیهدائی) لە ئەربیل کردووە، ئەو زانایە، لەلایەن سوڵتان (موزەفەرەدین گۆکبری) دەستگیر کرا، پارەیەکی زۆری بەسەردا سەپاند، نەیتوانی بیدات، لە بەندیخانە کۆچی دوایی کرد.

هەروەها پزیشک: (عەلائەدین ئیبن عەلی ئیبن روکنەدین محەمەد ئیبن عیسا ئیبن مەسعود ئەربلی)، کە کاری پیشەسازی پزیشکی دەکرد و ناسراو بوو لەو لایەنە، نەخۆشەکانی خۆی زۆر بەسەردەکردەوە، سەرپەرشتی ناوەندەکانی پزیشکی دەکرد لە بەغدا.

ئەوەی شیاوی باسە لێرە، کە ئەو ژمارە کەمەی ئێستا لەدەستمانە و زانیاری هەیە دەربارەیان، بە رای خۆمان، گوزارشت لە ژمارەی تەواو و راستی ئەو پزیشکانەی لە ئەربیل بەدیار کەوتوون ناکات، بە تایبەتی ئەگەر بەراوردێک بکەین لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەی (ئەربیل) بەخۆیەوە بینی لەلایەنی پێشکەوتنی بزووتنەوەی زانستی. ئەوەش بایەخی ئەو زانستەمان بۆ بەدیاردەخا، بە تایبەتی ناوبانگی (ئەربیل) لە دەرمان و پیشەسازی دەرمان (صیدلیة)، بەتایبەتی پێشکەوتنی ئەو زانستەیە لەلایەک، لەلایەکی دیکەش خزمەتێکی زۆری بە کۆمەڵگا گەیاندوە.

واپێدەچێ، کە زانستی پزیشکی و سەرکەوتنی لەو کارەدا لە ئەربیل، هەر لەسەر زانایانی ئەو زانستە رانەوەستابوو، بەڵکو ئەدیبان و شاعیرانی ئەو سەردەمانەش بایەخێکی باشیان بەو زانستە داوە، بۆ نموونە: (تەها ئیبراهیم ئەبی بەکر ئەحمەد بەختیار جەمالەدین ئەلهەزبانی ئەربلی) (٦٧٧ک/ ١٢٧٨ز) کە ئەدیب و شاعیر بوو، هەندێ ئاماژە و هێمای زۆری هەبوو، کە بەڵگەیەک بوو لەسەر زانین و زانیارییەکی باشی هەبووە لەلایەنی (زانستی تاقیکردنەوە) لەوانەش زانستی (پزیشکی) بە تایبەتی لەو بەیتانەی خوارەوە:

**يقول لي الكحال عينيك قد هدت**
**فلا تشغلن قلبا وطن نعسا**
**ولي مدة يا شمس لم أركم بها**
**وآية برأي العين أن ينظر الشمسا**

لەو بەیتە شیعرییەدا، شاعیر دەڵێ: (کلچی پێمدەڵێ ئەگەر چاوت ماندووە، دڵت و عەقلت مەشغول

مەکە، چونکە پزیشک و دەرمان هەیە، لەلایەکی دیکە دەڵێ: (هەتاو) من ماوەیەکە ناتبینم بەهۆی ناتەواوی چاوەکانم ئینجا ئای بۆ چاوێکی ساغ.

**٢- حیساب (بیرکاری)**

حیساب، یەکێکە لە زانستی بیرکاری یان لقەکانی، کە جگە لە حیساب هەندێ زانستی دیکە دەگرتەوە، لەوانە: (ئەندازیاری و گەردوونی) هەتا مۆسیقا و پزیشکی، بایەخی ئەو زانستە لە ڕێککردنی ئاڵوگۆڕینەوە و چۆنیەتی خەزنکردنی پارە و پول و ڕێککردنی مەسەلەی قەرزەکان و دابەشکردنی (میرات) (ئیبن ئەلمستەوفی)، هەندێ شتمان بۆ دەسەلمێنێ، لەبارەی زانا: (ئەبی بەکر ئیبن غەریب ئەلئەربلی)، کە تێیدا دەڵێ: (ناسراوە بە دینداری تەواو و دادپەروەری لەلایەنی حیساب، زۆر بەحەق بووە، خەڵکانێکی زۆر سەردانیان دەکرد بۆ ئەوەی لێی فێربن، زانستی بیرکاری یەکێکە لەو زانستانەی کە زانایانی ئەربل بایەخەکی زۆریان پێداوە، بە تایبەتی زانستی (حیساب) کە زاڵ بوو بەسەر هەموو زانستی بیرکاری.

لە زانایانی ئەربل لەلایەنی حیسابدا: (عەبدوڵڵا ئیبن عومەر ئیبن جامع ئەبو محەمەد ئەلئەربلی) لە ساڵی (٥٧٦ک/ ١١٨٠ز) لە ئەربل لەدایک بووە، واپێدەچێ لە خێزانێکی ناسراو بێ، زانیارییەکانی هەر لە زانستی حیساب ڕانەوەستا بوو، بەڵکو زۆرینەی زانستەکانی گرتووە، ئیبن شەعار لەبارەی ئەو زانایە دەڵێ: لە نەوەی (حسیابچیەکانە) لە ئەربل، زانا بوو لەلایەنی (التصرف والحساب) و پێوەرکردن.

لەبەر ئەوەی ئەربل لە شارە ئابوورییە بایەخەکانە لە ناوچەکەدا و کەوتۆتە سەر ڕێگای سەرەکی ئابووری نێوان دەوڵەتانی ناوچەکەدا، کە ئەوەش وایکرد بازارەکانی زۆر چالاک و پڕ بێت لە ئاڵوگۆڕی ئابووری، هەر ئەوەش بووە هۆی گەشەکردنی زانستی حیساب، ئینجا چ لەلایەنی ئابووری یان کۆمەڵایەتی، کە ئەوەی دوایی بایەخی بەدابەشکردنی میرات و زەکات دەدات. زانستی حیساب ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە ئاسانکردنی ئەو مەسەلانە، ئەوەش بووە پاڵنەرێک بۆ بەدیارکەوتنی زانستی (الفرائض): سیستەمێکی حسیابییە، بایەخ بە چاککردن و ڕێکخستنی بەشەکانی میرات و تەریکات و چۆنیەتی دابەشکردنی دەدات، کە ئەوەش بەستراوە بە زانستی (الفقه)، لە وردەکاری میرات دەکۆڵێتەوە، هەروەها بڕیارەکانی و وەسیەتەکانی، لە ئەربل چەند زانایەک بەدیارکەوتن لەولایەنانە: (تەها ئیبن بەشیر ئیبن محەمەد ئیبن خەلیل ئەلئەربل) کە لە ساڵی (٥٥٧ک/ ١١٦١ز) کۆچی دوایی کردووە، کە فەقیهێکی شافعی بووە، جگە لەوەی زانایەکی زاهید و ئایین دۆست بووە، یەکێک بووە لەوانەی بە پۆلێنکردن لەلایەنی (الفرائض والحساب)، ئیمامێکی عابد و مامۆستا بووە لە قوتابخانەی (الربض)، دواتر ئەوێ بەجێدێڵێ لە جێگایەکی دیکە خەریکی مامۆستایەتی بووە، هەروەها زۆر نزیک بووە لە (حەرەمی شەریف)، لەوێ ئیمام و حاکم بووە، بۆ ماوەی (٧) ساڵ مامۆستا بووە لەوێ، لەدواییش گەڕایەوە بۆ ئەربل و لەوێ کۆچی دوایی کرد.

لە زانایانی ئەربل و ناسراوەکانی، فەقیهی شافعی: (ئەبو ئەلعەباس ئەلخضر ئیبن نەسر ئیبن عەقیل ئەلئەربلی) (٥٦٧ک/ ذز)، زانایەکی پایە بەرز و زۆر زانابووە لەلایەنی مەزهەب، لەبارەی ئەو زانایە قازی: (جەعفەر ئیبن محەمەد ئیبن مەحمود ئیبن هیبەتوڵڵا ئیبن ئەحمەد ئیبن یوسف ئەلکەفەرعەزی ئەلئەربلی) کە فەقیهێکی شافی بووە (٦٠٤ک/ ١٢٠٧ز) دەڵێ: (زانایەکی زۆر ورد بووە لە چەند زانستێک، لەوانە (الفرائض والحساب).

لە فەقیهەکانی مەزهەبی حەنەفی بووە لەوانەی کە زانیارییەکی باشی هەبووە لە (الفرائض) زانا: (محەمەد ئیبن محەمەد ئیبن ئەبی حەنیفە ئیبن ئەبی عەدوڵڵا) ناسراو بە (الفرضي الأربلي).

ئەو زانستە هەر لەسەر ئەو زانایانە ڕانەوەستا بوو، بەڵکو هەندێ زانای دیکە بەدیارکەوتن، کە بایەخەکی زۆریان بە خوێندنی ئەو زانستە داوە و زۆر سەرکەوتوو بوون لەو لایەنەدا، بۆ نموونە: (شەرەفەدین

ئەبو بەرەکـــات ئەلموبارەک ئیبن ئەلمستەوفی ئەلئەربلی) (٦٣٧ک/ ١٢٣٩ز) کە مێژوونوس و ئەدیب بووە و خاوەنی کتێبی (تاريخ اربل) بووە، خۆی و کوڕەکانی ئەرکی (الاستيفاء)یان خستە ئەستۆیان لە ئەربل، کە پەیوەندی هەیە بە داهات و حیساب، ئەوەش بەتوانایی ئەو خێزانە بەڕێزە بەدیاردەخا لەلایەنی زانستی حیساب و ڕێکخستنی یاساکانی، بەڵام زانستی (الفرائض) یەکێک لەو شێخانەی کە ناسراو بوو لەو لایەنە: (محەمەد ئیبن محەمەد ئەبی حەنیفە ئەلفەرزی ئەلبەغدادی) (٦٠٢ک/ ١٢٠٥ز) کە لەسەر دەستی ئەو زانستەی خوێند، (ئیبن ئەلشەعار) لەسەر زاری (ئیبن ئەلمستەوفی) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: **زانایەکی زۆر بە ئەخلاق و ڕەوشت بەرز بووە، (ئیبن ئەلمستەوفی) لە ساڵی (٦٣٤ک/ ١٢٣٦ز) بەرەو موسڵ ڕۆیی و لەوێ جێگیر بوو هەتا ڕۆژی کۆچی دوایی، بەهۆی هێرشی (مەغۆل) بەسەر ئەربل، ڕۆڵی گەورەی هەبوو بۆ ئەوەی خەڵکی موسڵ بایەخی بەو زانستە بدەن (مانای حیساب).**

نووسەرانی حیساب، جێگای ڕێز و بایەخی زۆر بوون لەلای زانایانی ئەربل، زانا و ئیمام: (ئەحمەد ئیبن ئەلحوسەین ئیبن ئەحمەد ئیبن ئەبی ئەلمەعالی ئیبن مەنسور)، بەم شێوەیە وەسفی زانا: (شەمسەدین ئیبن ئەلخەباز ئەلنەحەوی) کرد، کە لە زانایانی ئەربلە (٣٣٩ک/ ١٢٤١ز) دەڵێ: ئەو زاتە زانیارییەکی باشی هەبوو لەلایەنی (الفرائض و الحساب) لەسەردەستی شێخەکانی خوێندی، چەند کتێبی خوێندووە لەوانەش کتێبی (الفخري والحساب).

### ٣- زانستی ئەندازیاری و گەردوون

زانستی ئەندازیاری و گەردوون بە زانستی بیرکاری بەستراون، ئەو زانستانە بە یەکتری بەستراون و یەکتری خزمەت دەکەن، بەهۆی پێویستییەکی زۆر بۆ مەسەلەکانی حیسابی و بیرکاری، بۆ نموونە: زانستی ئەندازیاری: یەکێک لەو زانستانەیە، کە بایەخی بە پێوانەکردن و بڕەکان دەدات، وەکو: (هێڵ و ژمارەکان و شێوەکان و گۆشە و سووچ و پایەکان، بەڵام گەردوون: دەچێتە میانی زانستی چۆنیەتی، سەیری بزووتنەوەی هەسارە و ئەستێرەکان کە دەجوولێنەوە، ئەوەش پێویستی بە مەسەلەکانی حیسابییە، قورئانی پیرۆز یەکێک بوو لەهۆیەکانی یان هۆکاری یەکەم بۆ سەرنج ڕاکێشانی موسڵمانان بۆ مەسەلەی بیرکردنەوەی جدی و سەیرکردنی گەردوون، ئەو دنیایە گەورە و ئازادکردنی عەقلی خەڵکان لە بیری پووچ و خەیاڵی و ئەفسانەیی.

زانایانی ئەربل بایەخێکی باشیان بە خوێندنی هەردوو زانستی (گەردوون و ئەندازیاری) داوە، یەکێک لەوانەی کە ناسراو بوون: (محەمەد ئیبن یوسف ئیبن قائید موەفەق ئەلدین ئەربلی ئەلبەحرانی) ئەدیب و شاعیری ناسراو (٥٨٥ک/ ١١٨٩ز)، زانیاری باشی هەبوو لەبارەی (علم الأوائل) لەوانەی زانستی ئەندازیاری، کتێبی (ئەقلیدس) شی کردەوە، کە لەو کتێبانەیە کە بایەخی بە ئەندازیاری دەدات، بەڵام لەلایەنی گەردووندا هەوڵیدا بەشێک لە کتێبی (المجطي) شی بکاتەوە، لەدواییش وازی لێ هێنا و بەرەو زانستەکانی دیکە ڕۆیی، کە ئامانجی خۆی لەوێدا دەدۆزێتەوە، قازی فەقیهی شافعی: **(ئەبو محەمەد جەعفەر ئیبن مەحمود ئیبن هیبەتوڵڵا ئەحمەد ئیبن یوسف ئەلکەفەرعەزی ئەلئەربلی)** (٦٠٤ک/ ١٢٠٧ز) لە (الحساب والفرائض) زانایەکی ناسراو بوو و لە ئەندازیاریش زۆر باش بوو.

زانای گەورە: (ئیسحاق ئیبن مەعالی ئیبن شەماس ئیبن هیبەتوڵڵا ئیبن ئیبراهیم ئەبو ئیبراهیم ئەلئەربلی) (٦١٧ک/ ١٢٢٠ز) بەوە ناسراو بوو، زۆر خولیای خوێندنی ئەو کتێبانە بوو، کە پەیوەندییان هەبوو بەو لایەنە، شتێکی لەبارەی ئەندازیاری و پزیشکی خوێند.

مەسەلەی دابەشکردنی میرات و تەریکە لەگەڵا زەوییەکان و پێوەرکردنی ڕووبەر و پانتاییەکان، ڕۆڵێکی زۆری هەبوو بۆ دەرکەوتنی ئەو زانایانە کە زانیارییان هەیە لەبارەی زانستی ڕووپێوکردن، لەوانە، زانا: (عەبدوڵڵا ئیبن عومەر ئیبن سامح ئەبو محەمەد ئەلئەربلی) (٦٣٤ک/ ١٢٣٦ز)، کە ڕۆڵێکی

زۆری هەبوو لەبارەی پیشەسازی رووپێوکردن.

زانایانی ئەربل، هەڵسان بە جێبەجێ کردنی ئەندازیاری لەلایەنی تەلارسازی، وامان بۆ دەردەکەوێ کە ئەو شارە لەو سەردەمەدا پێشکەوتنێکی ئێکجار گەورەی بەخۆیەوە بینیوە و بایەخێکی زۆریان بەو زانستە داوە، بەتایبەتی لەسەردەمی (ئەتابەکییەکان)، ئەوەش لەو تەلار و دەزگا گەورانەی کە لە ئەربل هەبووە، بەجوانی بەدیار دەکەون، میرەکانی ئەربل رۆڵێکی گەورەیان هەبوو لەو لایەنە، لە هەموویان ناسراوتر: (سوڵتان موزەفەرەدین گۆکبری). هەروەها مەسەلەی هەبوونی بارودۆخی سیاسی جێگیر و هێمن، جگە لە پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی، کە پاڵپشتێکی باش بوو بۆ پێشکەوتنی لایەنی تەلارسازی و بنیادنانی ئەندازیی، ئەوەش بە جوانی دیارە لە کتێبی ئەوانەی نەخشەیان بۆ ئەو تەلارانە دانابوو، هەروەها لە هونەری نەخش و نیگار و ئارایشی ئیسلامی لە ئەربلدا، کە جوانییەکی پێ بەخشیوە.

ئەوەی دڵ خۆشکەرە، کە هەندێ شوێنەواری زۆر کۆنی ئەو شارە دێرینە بە سەلامەتی ماوەتەوە، دەتوانرێ وەکو بەڵگەیەکی روون، ئاماژەی پێبدرێ، باشترین نموونە بۆ ئەو مەسەلەیە: (منارەی مزەفەریە)یە، کە هەتا ئێستا هەر ماوە، نووسینێکی کۆن هەیە لەسەر پەنجەرەیەک، لەسەرەوەی منارەکە لەلای رۆژهەڵاتی منارەکە، تێیدا، ناوی ئەو کەسە نووسراوە، کە منارەی بنیادناوە، هەروەها رۆڵی (وەستاکانی) ئەربل بەدیار دەکەوێ.

لەو زانستانەی کە جێگای بایەخدانی زانایانی ئەربل بووە، زانستی گەردوون و ئەستێرەکان، کە بایەخ بە خەمڵاندن و نرخاندنی مەسەلەکانی حیسابی، لەبارەی: دووری و نزیکی و مەودا و درێژی دەدا، هەروەها لە زانستە پێویستەکانە بۆ دەستنیشان کردنی (قیبلە) و (کاتی نوێژەکان).

لە زانایانی ئەربل، کە ناسراو بوون بە بایەخدان بەو زانستە، لەوانە: (شەرەفەدین ئەبو ئەلبەرەکات بن موبارەک ئەلمستەوفی ئەلئەربلی) (٦٣٧ک/ ١٢٣٩ز)، خاوەن کتێبی مێژووی ئەربل، کە زۆر زیرەک و بلیمەت بووە لە زانستەکانی دیکە، کتێبی (سر الصنیعة)ی پۆلێن و رێک کرد، کە پەیوەندی هەیە بە مەسەلەی ئەحکامی ئەستێرەکان. هەروەها زانای دیکە هەیە، وەکو (ئەحمەد ئیبن قرتایا ئیبن عەبدوڵلا ئیبن ئەبو ئەلوەفا ئەلئەربلی) لە ساڵی (٥٩٨ک/ ١٢٠١ز) لە ناوچەی (دەربەند) لە گوندێک بە ناوی (رایەت) کە بەشێکە لە شاری ئەربل، زانیارییەکی باشی هەبوو لەبارەی ئەستێرەکان، گەشتێکی کرد بەرەو شاری (حەلەب) بۆ وەرگرتنی زانستی نوێ، لەدواییش بەرەو بەغدا رۆیی، هەر لەوێش لە ساڵی (٦٥٥ک/ ١٢٥٧ز) کۆچی دوایی کرد.

(ئیبن قوتی)، لەبارەی زانا: (ئەبو عەلی ئیبن ئەبی فەرح) ناسراو بە (ئیبن ئەلداعی ئەلئەسرائیلی ئەلئەربلی ئەلحەکیم) وا پێدەچێ لە ساڵی (٦٥٧ک/ ١٢٥٨ز) کۆچی دوایی کردبێ، دەڵێ: زانایەکی زۆر زیرەک بووە لە حیساب و رێکخستن و کۆکردنەوەی (مجمع الآداب في معجم الألقاب، ٥: ١/ ٢٢٨).

(تەها ئیبن ئیبراهیم ئیبن ئەبی بەکر ئیبن ئەحمەد ئیبن بەختیار جەمالەدین ئەلهەزبانی ئەلئەربلی) (٦٧٧ک/ ١٢٧٨ز)، فەقیهێکی شافعی بووە، هەروەها ئەدیب و شاعیر و زانیارییەکی باشی هەبووە لە زانستی ئەستێرەکان، لە شیعرەکانی هەندێ بەڵگەی تێدایە لەبارەی ئەو مەسەلەیە، هەروەها شیعرەکانی ستایشکردنی (ئەلمەلک ئەلسالح)ی تێدایە، کە لە قاهیرە بووە، لە شیعرەکانی باسی ئەحکامی ئەستێرەکان دەکات، لەو قەسیدانە:

**دع النجوم لطرقي يعيش بها**
**وبالعزيمة فأنهض أيها الملك**
**إن النبي وأصحاب النبي نهوا**
**عن النجوم وقد أبصرت ماملكوا**

لەو قەسیدەیەدا، باسی بایەخی ئەستێرەکان دەکات لە ژیانی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤی پایەبەرز و زانستدۆست، ئەستێرەی وەکو هێمای رووناکی و رێگاپێشاندەر پێشان دەدات.

زانستی (الأزياج) یەکێکە لەو زانستانەی کە لەلایەن بزووتنەوەی زانستی لە ئەربلدا بایەخی پێدراوە،

یەکێکە لە لقەکانی گەردوون، (ئیبن خەلدون) بە سیستەمێکی حیسابی دانابوو، ئەویش بەسەر یاساکانی ژمارەیی لەبارەی هەر هەسارەیەک، لە رێگای بزووتنەوەی، کە بارەکەی بەدیاردەخا، هەر لە پەلەکردن و لەسەرخۆیی و گەڕانەوە و مەسەلەکانی دیکە، ئەوەش بە جێ و شوێنی هەسارەکان لە گەردوونەکانیان پێناسە دەکرێ، کە لەلایەن ژمێریارانی بزووتنەوەکانی ئەو هەسارانە نیشان و حیساب کراوە، ئەو کار و سیستەمە یاسای تایبەتی خۆی هەیە، وەکو پێشەکی و بنچینە و سەرچاوەی بۆ زانینی (مانگەکان و رۆژەکان و مێژووی کۆن، هەندێ بنچینەی دیکە بۆ زانینی (جۆرەکانی بزووتنەوەکان و دەرهێنان و جیاوازکردنی لە یەکتریدا و لە خشتەیەکی رێکوپێک دابندرێ، بۆ ئەوەی ئاسان بێت، بۆ ئەوانەی فێردەبن، ئەوەش پێی دەڵێن (الأزیاج).

وا پێدەچێ، ئەو پەیوەندییەی هەیە لە نێوان زانستەکان، رۆڵێکی گەورەی هەبێ لە بەشداریکردنی لە پێشکەوتنی ئەو زانستە لە ئەربیل، لەوکاتەی، کە زانای گەورە: (موهەزەبەدین ئەلحاجب ئەلدیمەشقی) هاتە ئێرە و لەگەڵ (ئەبی ئەلشوجاع فەخرەدین محەمەد ئیبن عەلی ئیبن شوعەیب)، کە بە (ئیبن ئەلدەهان ئەلحاسب ئەلبەغدادی) (٥٩٠ک/ ١١٩٣ز) ناسراو بوو، هات بۆ ئەربیل، دەستی دایە فێرکردنی (موهەزەب ئەلدین ئەلدەهان) و زۆر شتی بۆ خوێندەوە، بەیەکەوە توانییان چەند مەسەلەیەک شیبکەنەوە، کە لەبارەی ئەو زانستەیە، لەدواییش (موهەزەبەدین)، ئەربلی بەجێهێشت و بەرەو دیمەشق رۆیی.

ئەو هەواڵەش، بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی بزانین هەتا چەند زانایان بایەخیان بەو زانستە داوە لە ئەربلدا و خوێندوویانە، هەر ئەوەش بەڵگەیەکە بۆ ئەوە بسەلمێنین، کە ئیبن دەهان ئەربلی رۆڵێکی گەورەی هەبووە، دوای ئەوەی زانا (موهەزەبەدین) لەسەردەستی خوێندوویەتی، هەتا ئەگەر بۆ کاتێکی کەمیش بێت، دەبێ ئەوە بزانین، کە ئەو زانایە، لە زانایە ناسراوەکان بوو لە چەند زانستێک، لەوانە: (الزیج، الفرائض، المسائل الریاضیة) هەروەها مێژووناس بوو لە پۆلینکردندا، لەوانەشە بەشدارییەکی باشی کردبێت بۆ خوێندنی ئەو زانستە لە ئەربلدا، لەگەڵ خەریکبوونی بە زانستی (الأزیاج).

شێخ: (ئەبو عومەر شیرەئەلدین ئەلموزەل ئەلئەبهەری)، کە خاوەنی (التعلیقة في الخلاف والزیج والتصانیف المشهورة)یە، هەر لەو زانایانەی کە لە شاری موسڵەوە هاتن بۆ ئەربیل، لەساڵی (٦٢٥ک/ ١٢٢٧ز)یەوە، لە (دار الحدیث) جێنشین بوو و ئەرکی مامۆستایەتی خستە ئەستۆی، پیاوێکی خواناس بووە، خەڵک و زانایەکی زۆر سوودیان لێ بینیوە، یەکێک لەوانەی، کە قوتابی خۆی بووە و لەسەردەستی خوێندوویەتی: قازی و مێژووناس (شەمسەدین ئەبو ئەلعەباس ئیبن خەلەکان ئەربلی) (٦٨١ک/ ١٢٨٢ز)، ئەوەش دەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە لەوانەیە ئەو زانایە وانەی (الزیج)ی لە قوتابخانەکانی ئەربیل دابێتەوە، هەروەها دوور نییە، مێژووناس (شەمسەدین ئیبن خەلەکان) زانیاری لەبارەی ئەو زانستە لێ وەرگرتبێ، ئەوەش بەڵگەیە بۆ سەلماندنی مەسەلەی بەشداریکردنی (دار الحدیث) لە ئەربلدا، لە خوێندنی ئەو جۆرە زانستە، (ئیبن خەلەکان) لەسەرزاری (ئیبن مستەوفی) لەبارەی ئەو زانایە دەڵێ "ئەو زانایە کە لە هەموو زانستەکان لە پێشەوەیە، لە زانستە یەکەمەکان وەکو: ئەندازیاری و مەنتیق، بە بەردەوامی ئاماژەی پێدەدرێ، هەروەکو کتێبی (أقلیدس) و (المجطي).

## ٤- کیمیا

زانستێکە، پەیوەندی بەمادەی: (زێڕ و زیو) و چۆنییەتی دروست کردنیەوە هەیە، ئەو کارە راڤەدەکات بۆ ئەوەی بگاتە پێکهاتەکانی ئەو مادەیە، دوای زانینی هێز و توانای، تا دەگاتە ئەو راستییەی، کە وای لێدەکات بگۆڕێ لە حاڵەتێک بۆ حاڵەتێکی دیکە، وەکو گۆڕینی کانزای: قسدیر و قورقوشم بۆ: زێڕ و زیو.

واپێدەچێ، ئەو زانستە لە ئەربل دۆزرابێتەوە، هەر لەسەردەمی (هەزبانییەکان)، بەڵگەش لەسەر

ئەوە: ئەلعەمید فەخر ئەبا ئەلکیتاب ئەبا ئیسماعیل ئەلحوسەین ئیبن عەلی ئیبن محەمەد ئیبن عەبدولرەحمان، ناسراو بە موئەیەدەدین ئەلئەسبەهانی، کە بۆ ماوەیەک بەرپرسی وەزیران بووە، زانا بووە لە مەسەلەی نووسیندا، بەتوانا بووە لە شیعردا، هەروەها پسپۆڕ بووە لە پیشەسازی کیمیا، توانی پۆلێنی بکات، وەلامی رایەکانی (ئیبن سینا)ی داوەتەوە، کە هەندێ گومانی هەبوو لەبارەی ئەو زانستە، لە پۆلێن کردنەکانی لەو لایەنە، کتێبی: (الجوهر النظير في صناعة الأكسير) و (جامع الأسرار) و (تراكيب الأنوار) و (مفاتيح الرحمة) و (مصابيح الحكمة) و (حقائق الإستشهادات في الكيمياء)، لەوانشە، کار و بەرپرسیەتییەکەی خۆی وەکو وەزیرێک قۆستبێتەوە بۆ بلاوکردنەوەی رۆشنبیری خۆی و زانستەکەی و بەشداری کردبێ لە پۆلێنکردنیان و بلاوکردنەوەی لە ئەربل.

واپێدەچێ، زانستی کیمیا لەلای خەلکی ئەربل رەواجێکی باشی هەبێ، هەروەها لەوانەیە، ئەو زانایانەی کە لە دەرەوەی ئەربل هاتوون، رۆلێکی باشیان هەبێ، سولتان (موزەفەرەدین گۆکبری) بایەخێکی زۆری دەدا بەو زانایانەی لە دەرەوەی ئەربل دەهاتن، یەکێک لەو زانایانەی لە دەرەوەی ئەربل هاتبوون: (محەمەد ئیبن عەلی ئیبن ئەحمەد ئەبو عەبدولّلا ئەلتەمیمی)، کە خەلکی حەلەبە، (ئیبن شەعار) لەسەرزاری (ئیبن مستەوفی) دەگێرێتەوە و دەلێ: (ئیمام و زانایەکی ناسراو بوو، لایەنگیری زانستە پیشەنگەکان بوو، وەکو (کیمیا) هیچ شتێکمان لەدەست نییە بۆ بەدواداچوونی ئەو زانستە لە ئەربلدا، جگە ئەوەی (ئیبن ئەلفوتی) باسی کردووە، لەسەرزاری (ئیبن مستەوفی)، کە دەلێ: (زانا، موختەسەدین ئەبو ئیسحاق ئیبراهیم، زانیارییەکی باشی لەو زانستە هەبوو).

### ٥- فەلسەفە و مەنتیق

فەلسەفە: لە وشەی فەیلەسوفی یۆنانی وەرگیراوە، کە مانای (خۆشەویستی حیکمەت)، بابەتەکەی ئەو دنیایە و چۆنیەتی پەیدابوونی و دەرکەوتنی و پێکهاتەکانی و ئەو پێشکەوتنانەی روویانداوە، واپێدەچێ، ئەو زانستە چەند زانستێک بگرێتەوە، لەوانە، (مەنتیق و سروشتییەکان و حیساب و ئەندازیاری و ئیلاهیات و هەتا مۆسیقاش)، بەلام ئەو زانستانە لەیەک جیاواز بووینەوە، بەوەش هەریەک لەوانە تایبەتمەندی خۆی هەیە، وەکو زانستێکی سەربەخۆ.

یەکێک لەوانەی کە لەو زانستەدا لەنێوان زانایانی ئەربل ناسراو بوو، ئەویش: (عزەدین ئیبن محەمەد ئیبن ئەحمەد ئەلزەریر ئەلئەربلی) (٦٦٠ک/ ١٢٦١ز)، واپێدەچێ لە چەند زانستێک زۆر زیرەک بێت، لەوانە: (ئەدەب، بەتایبەتی شیعر، هەروەها زانیاری باشی لە زانستە پێشەنگەکان هەبووە، لە زانستی فەلسەفەدا زۆر سەرکەوتوو بوو).

یەکێک لەو زانستانەی کە لە ئەربل دۆزرایەوە و بە زانستی فەلسەفە و (مەنتیق) بەستراوەتەوە، زانستێکە هۆش و عەقل لە هەلە و هەلەکردن دوور دەخاتەوە، بە مانای راست و ناڕاست و پاک لە گەندەلا جیابکاتەوە، بەتوانای فیکر و بەفیکر و بیرکردنەوەی خۆی بگاتە حەق، لەو زانایانەی کە زانیاری باشی لە زانستی فیقە هەبوو: ئەحمەد ئیبن محەمەد ئیبن ئەبی ئەلحەسەن ئەبو ئەلعەباس ئەلئەربلی، کە لە بنەچەدا (کورد)ە و خەلکی گوندی (هەریر)ە، کە سەر بە ئەربلە، پیاوێکی چاک بووە، ئیبن ئەلشعاری موسلی، لەبارەی ئەو زانایە دەلێ "فەقیهێکی حەنەفی بووە، فەقیە بووە بەسەر کۆمەلێک فەقیهانی حەنەفی، زانیارییەکی باشی لەبارەی زانستی (ئسول و لۆژیک و ئەخلاق) هەبووە.

### دووەم: زانستی مێژوو

مێژوو، زمانی پێناسەی کات و سەردەم و رووداوەکانە، بەلام لەسەر ئاستی (اصطلاحي)دا، زانستێکە لە ناوەرۆکی (هەوالی رۆژەکان و دەولەتان و روداوەکانی سەدەکانی کۆن دەکۆلێتەوە، بەلام لە ناوەرۆکدا: روانین و پشکنین و گەیشتنی بۆ دەرئەنجامەکان و راستییەکان، هەروەها زانینی راستی رووداوەکان و وردەکارییەکانیان، ئەوەی سوودێکی باش لەو ئەزموونانە و زانینی

گۆڕانکارییەکانی زەمەن بکرێ).

زانستی مێژوو، جێگای بزووتنەوەی زانستی بووە لە ئەربل، بەتایبەتی هەندێ لە زانایانی پۆلینی هەندێ زانیاری گرنگیان کردووە، دەبێ ئەوە بزانین کە زانایان لە زانستێکدا پسپۆڕ نەبوون، بەڵکو زانیارییان لە هەموو زانستەکان و زانستی مێژووش هەبوو.

فەقیە و زانا و موحەدیس: ئەبا ئەلفەزل جامع ئیبن عەلی ئەلئەربلی (٦٠١ک/ ١٢٠٤ز)، زانیارییەکان لەبارەی ئەو زانایە دەڵێن: زۆری دەنووسییەوە، پۆلینی زانستی مێژوو و زانستەکانی دیکەی کرد، واپێدەچێ کە هەندێ لە میرەکانی ئەربل رۆڵێکی زۆریان لە پێشکەوتن و پاڵپشتی ئەو زانستە هەبێ، لەو میرانەی کە بایەخیان بەو زانستە دابێ و لایەنگیرییان دەکرد، ئەویش: سوڵتان موزەفەرەدین گۆگبری (٦٣٠ک/ ١٢٣٢ز) کە بەشدارییەکی باشی کردبێ لە مەسەلەی پێشکەوتنی زانایەکانی ئەو شارە دێرینە، بە تایبەتی بایەخدان بە زانستی مێژوو، کە زانیارییەکی باشی هەبوو لەلایەن (ئیبن خەلەکان). ئەو سوڵتانە دەڵێ: "لایەنگیری زانستی مێژووی دەکرد و پشتگیری زانایەکانی ئەو زانستەی دەکرد، بەڵام هەوڵەکانی ئەو میرانە و بایەخدانیان، هەر لەسەر ئەو زانستە رانەوەستاوە، بەڵکو دەچوونە ناو وردەکارییەکانی لقەکانی ئەو زانستانە. بۆ نموونە، ئیبن ئەلفوتی لەبارەی ئەو مەسەلە دەڵێ: "هەبە ئەلدین ئەبو ئەلموزەفەر نەسر ئیبن عەبدولعەزیز ئیبن عەبدولرەحمان ئەلئەربلی، یەکێک بووە لە میرەکان و زانایان و موحەدیسەکان، زانیارییەکی باشی هەبووە لەبارەی (أنساب) و هونەرەکانی، هەر لە حوکم و مێژوو و ئەدەبیات، لە چەند کۆمەڵێکی نوسراودا کۆی کردنەوە.

مێژوو: لەلایەن زانایانی ئەربل جێگا و پایەیەکی زۆری هەبووە، ئەوەش لە زۆری پۆلێنکردنەکاندا دیارە و روونە، بە تایبەتی لەسەردەمی (ئەتابەکییەکان) بەهۆی ئەو پێشکەوتنە گەورەی، کە ئەربل بەخۆیەوە بینی، بۆ نموونە: زۆری ئەو کتێبانەی نووسراون لەبارەی ئەو جۆرە و ئاستی پێشکەوتنی ژیانی زانستی لە ئەربلدا، هەروەها پۆلێنکردنی ناوی میرەکان و کەسایەتی ناسراوی کۆمەڵگا و ئەوانەی بۆ ئەربل هاتوون.

(ئەبو لبەرەکات ئەلموبارەک ئیبن ئەحمەد ئیبن ئەبی ئەلبەرەکات ئەلموبارەک ئەبی ئەلمەوهوب ئیبن عەلی ئەللەخمی ئەلئەربلی، ناسراو بە ئیبن مستەوفی ئەلئەربلی، کە لە قەڵای هەولێر و لە ساڵی (٥٦٤ک/ ١١٦٨ز) لەدایک بووە، لەپێشەوەی مێژوونووسەکانی ئەربل بووە، ئیبن مستەوفی لە خێزانێکی ناسراو بووە، بە تایبەتی لەلایەنی رۆشنبیری و سەرۆکایەتی، (نصیحە الملوک) وەرگێڕا، کە لە نووسینی: ئەبی حامد ئەلغەزالیە (٥٠٥ک/ ذز) لە زمانی فارسی بۆ زمانی عەرەبی، ئیبن مستەوفی ئەرکی (الإستیفاء في أربل)ی خستە ئەستۆی و بەرێوەی برد، بە تایبەتی لەسەردەمی میرنشینی هەزبانییەکان، زانیارییەکانی و زانستەکانی لە گەورە شێخەکان و مامۆستایانی ئەو سەردەمە بایەخەدا وەرگرتووە، لە پێشەوەی هەمووان: ئیمام ئەبولموزەفەر ئەلموبارەک ئیبن زاهر بن ئەلموبارەک ئەلبەغدادی (٦٠٠ک/ ١٢٠٣ز) و ئەبو عەلی حەنبەل ئیبن عەبدوڵلا ئەلبەغدادی (٦٠٤ک/ ١٢٠٧ز)و ئەبو حەفس عومەر ئیبن محەمەد ئیبن ئەحمەد ئیبن ئەبی حەفس ئەلبەغدادی ئەلدارقزی (٦٠٧ک/ ١٢١٠ز)و ئەبو محەمەد عەبدوللەتیف ئیبن ئەبی ئەلنەجیب ئیبن عەبدولقەهار ئیبن عەبدوڵلا ئەلسەهروەردی (٦١٠ک/ ١٢١٣ز)و زۆری دیکە، لە کتێبەکەیدا ناوی چەندین زانا و شێخی پایە بەرزی هێناوە، کە زانیاری زۆری لێ وەرگرتوون، هەروەها توانی لە رێگایان ئیجازەی دەرس وتنەوە وەرگرێ، بە تایبەتی لەو زانایانەی لە دەرەوەی ئەو شارە هاتبوون، بەو شێوەیە بووە شێخێکی بە قەدر و پایەبەرز، زۆر گران و فەقیر دۆست بووە، خێرخواز بووە، زانایان و شێخەکانی ئەو شارەی بەسەر دەکردەوە و زانیارییەکی باشی هەبووە لە چەند زانستێک: لەوانە (فەرمووەدە و زانستەکانی و ئەدەب و هونەرەکانی و شیعرەکانی عەرەب و هەواڵەکانیان و رووداوەکان و حیکمەکانی).

(ئیبن مستەوفی) لەکاتی خۆی ئەرکی (إستیفاء)ی خستۆتە

ئەستۆی، لەو کارەش زۆر سەرکەوتوو بووە، جێگا و پایەی زۆر بەرز بووە لەسەردەمی سوڵتان موزەفەرەدین گۆگبری، بەڵام لەبەر کۆچی دوایی موزەفەرەدین گۆگبری ساڵی (٦٣٠ک/ ١١٢٣ز) نەیتوانی لەسەر ئەو وەزیفەیە بەردەوام بێت، بە تایبەتی دوای چوونە ژوورەوەی عەسکەرەکانی خەلیفە بۆ ناو ئەربیل، میر (شەمسەدین باتکین ئیبن عەبدوڵلا ئەلرومی) (٦٤٠ک/ ١٢٤٣ز) حوکمی لە ئەربیل وەرگرت، ئەو میرە تازەیە ناردییە دوای (ئیبن مستەوفی) بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لەسەر وەزیفەکەی (الوزارە) و ببێتە جێگری لە حوکمدا، بەڵام ئەو داوایەی رەتکردەوە و بریاری دا لە ژیانی سیاسی دوور بکەوێتەوە، لەناو ماڵی خۆی دانیشت.

(مەگۆلەکان) خوێنی خەڵکی (ئەربیل)یان حەڵاڵ کرد و دەستیان بە کوشتن و برین کرد، ساڵی (٦٣٤ک/ ١٢٣٧ز) چوونە ناو شارەکە و گەمارۆی قەلاکەیان دا، کە (ئیبن مستەوفی) یەکێک بووە لە یاخیبووەکانی ئەو شارە، دوای ئەوەی (مەگۆلەکان) ئەو شارەیان بەجێهێشت، مێژوونوسی شاری (ئەربیل)یش (ئیبن ئەلمستەوفی) ئەو شارەی بەجێهێشت و بەرەو شاری موسڵا رۆیی، لەوێش لەلایەن میری ئەو شارە (بەدرەدین لوئلوئە) پێشوازی لێکرا و رێزی لێنا و مووچەشی بۆ برییەوە، بۆ ماوەی (٣) ساڵ لەو شارە مایەوە و لە ساڵی (٦٣٧ک/ ١٢٤٠ک) کۆچی دوایی کرد و لە گۆرستانی (السابلة) شاردرایەوە.

(ئیبن مستەوفی) ناوبانگێکی زۆری هەبوو، بەوەی کە (مێژوونوسێکی شاری ئەربیل بووە) یەکێک لەو کتێبانەی ئەو زانایە، کە زۆر بەناوبانگە (تاریخ اربل)ە، کە لە چوار بەرگ پێکدێت، بە ناوی (نباهة البلد الخامل بمن ورده من الأماثل) ناسراو بووە، ئەو کتێبە لە شێوەی کتێبی (تاریخ بغداد)ی ئیبن ئەلخەتیب ئەلبەغدادی و (تاریخ دیمەشق)ی ئیبن عەساکر بووە، بە تایبەتی شێوە و کارەکانی ئیبن ئەلمستەوفی هەر بەو دوو کتێبە دەچوو، بەڵام زۆر بایەخە لەو کتێبەدا کە ناوی ئەو زانایانەی کە لە دەرەوەی ئەو شارە هاتوون، زۆر هاتووە و پانتاییەکی زۆری ئەو کتێبەیان گرتووە، جگە لە ناوی زانایانی ئەربیل و میرەکانی و پیاوانی دەوڵەت لەوکاتەدا، بەشی دووەمی ئەو کتێبە دۆزرایەوە، واپێدەچێ لە ساڵی (٦٣١ک/ ١٢٣٣ز) شێوەی کۆتایی کتێبێکی لێ دەرچووبێ، رێکخەرانی ئەو کتێبە دوای (٤) ساڵ لە کۆچی دوایی ئەو زانا و نووسەرە، لە رێکخستنی ئەو کتێبە تەواو بوون، بە ماناى لە ساڵی (٦٤١ک/ ١٢٤٣ز). ئەو کتێبە بایەخەی ئیبن مستەوفی، بە یەکێک لەسەرچاوەکانی مێژوو دادەنرێ. زۆرینەی زانایانی سەردەمی خۆی و هاوسەردەمانی و قوتابیانی خۆی، لەوانە (کەمالەدین ئەبولبەرەکات ئیبن ئەبی ئەلشەعار ئەلموسڵی - ٦٥٤ک/ ١١٥٦ز) کە ئەدیب و مێژوونووس بووە، پشتیان بەو کتێبە بەستووە، بە تایبەتی لەو کاتەی کە ئیبن ئەلشەعار لە ساڵی (٦٢٥ک/ ١٢٢٧ز) هاتووە بۆ ئەربیل، یەکسەر چووە ماڵی ئیبن مستەوفی و هەوڵیداوە زانیارییەکانی لێ وەرگرێ و سوودی لێ ببینێ، بە تایبەتی هونەری شیعر، یەکێک لەوانەی کە سوودیان لەو کتێبە گرنگە وەرگرتووە، مێژوونوسی ئەربیل قازی (شەمسەدین ئەبو ئەلعەباس ئیبن خەلەکان ئەلئەربلی) (٦٨١ک/ ١٢٨٢ز) ئەویش لە میانی نووسینی کتێبە بەناوبانگەکەی (وفیات الأعیان وأنباء ابناء الزمان) هەروەکو خۆی دەڵێ: "وقد أحلت علیه في هذا الکتاب في مواضع عدیدة".

هەر بەوەش رۆڵی ئەدیبان و شاعیران بەدیار دەکەوێ لە تۆمار کردنی رووداوەکانی مێژوو، وەکو هەندێ قەسیدە و بەیتی شیعری، ئەوەی: ئەبو ئەلحەفس عومەر ئیبن شەمسەدین ئیبن هیبەتوڵلا ئەلئەربلی (٦٠٠ک/ ١٢٠٣ز) هەزار قەسیدەی دوولایەنی درێژی دانا، تێیدا باسی مێژوو دەکات، هەر لەسەردەمی خەلیفەی عەباسی ئەلناسرلدین ئەڵلاوە (٦٢٢ک/ ١٢٢٥ز).

هەروەها شاعیری دیکە هەیە لە ئەربیل، ئەو رووداوانەی کە ئەو میرنشینە تووشی بووە، بە تایبەتی لە کاتەکانی (هێرشی مەگۆلیەکان) بۆ سەر ئەربلی تۆمار کردووە، لەوانەش لە دیوانی (گۆرگیس وەردا

ئەلئەربلی) کە شاعیرێکی (دیان) بووە، تێیدا ئاماژەی داوە بە گەمارۆدانی مەگۆلەکان بۆ ئەربل لە ساڵی (٦٥٧ک/ ١٢٥٨ز)، وەسفی کارە بەربەرییەکانی (مەگۆلەکان) دەکات، بە تایبەتی دژی قەڵای ئەربل و خەڵکەکەی، هەروەها لەو شاعیرانەی ئەربل، لەو لایەنەدا: مەجدەدین ئەبو ئەلمەجد ئەلنوشابی ئەلئەربلی (٦٥٧ک/ ١٢٥٨ز)، دیوانی ئەو شاعیرە رۆڵی ئەو شاعیرە روون دەکاتەوە لەلایەن بەو رووداوە بایەخانەی ئەربل، لەوانەش (هێرشەکانی مەگۆل) و کارە کاولکارییەکانیان لەو شارەدا، هەروەها لەبارەی مێژووی (ئەربل)ی سیاسی، بەڵکو لەسەر ئاستی خەلافەتی عەباسییەکاندا.

لە مێژوونووسانی ئەربل و ناسراوەکانی: شەمسەدین ئەبولعەباس ئەحمەد بن محەممەد ئیبن ئیبراهیم ئیبن ئەبی بەکر ئیبن خەلەکان ئەربلی، یەکێکە لە نەوەکانی خێزانی خەلەکانی لە ئەربل، خاوەن کتێبی (وفیات الأعیان وأنباء أبناء الزمان) بە پشت بەستن و بە گواستنەوە و گوێگرتن و ئەوانەی کە کەسایەتییە ناسراوەکان باسیان کردووە، ئیبن خەلەکان لە ساڵی (٦٠٨ک/ ١٢١١ز) لە قوتابخانەی موزەفەریە لە ئەربل لەدایک بووە، هەروەکو خۆی بە (کەمالەدین ئەلشەعار ئەلموسڵی) گوتووە، هەروەها لە کتێبەکەی ئەوە دەڵێ و باسی کردووە: "لە ئەربل لەدایک بووم، ئەویش لە قوتابخانەی سوڵتانەکەی (موزەفەرەدین گۆگبری)"، لەو شارە گەورە بووە، هەروەها هەر لەو شارە فێری زانست بووە، لەسەرەتای منداڵییەوە نزیک بووە لە زانستەکان و مێژوونووسی فەقیهێکی شافیعی بووە و لەسەردەستی باوکی: ئەبو عەبدوڵڵا محەممەد بەهائەدین ئیبن ئیبراهیم ئیبن ئەبی بەکر ئیبن خەلەکان ئەربلی فیقهی خوێندووە، ئەو شێخە مامۆستا بووە لە قوتابخانەی موزەفەریە، لە خۆشەویستانی زانست و زانایانە، لەبەر ئەوەش بەرەو رێگای زانست و خزمەتکردنی رۆیی، بۆیە ئیجازەی خوێندن و مامۆستایەتی وەرگرتووە لەلای زانا: ئوم ئەلمۆئەیەد بنت ئەلشەعری زەینەب ئیبن عەبدولرەحمان نیشابووری (٦١٥ک/ ١٢١٨ز) ئیجازەی وەرگرتووە، هەروەکو خۆی دەڵێ: "لنا منها إجازة كتبتها في شهور سنة عشر وست مائة"، دوای کۆچی دوایی باوکی، خۆی ئەرکی مامۆستایەتی لە قوتابخانەی موزەفەرییە وەرگرتووە، ئیبن خەلەکان ئامادەی دەرسەکانی فەقیە و شێخ: ئەبو فەزل شەرەفەدین ئیبن مەنعە ئەربلی بووە، هەروەها لەو شارەدا گوێی لە (صحيح البخاري) بووە، ئەویش لە رێگای شێخ ئەبی جەعفەر محەممەد ئیبن هیبەتوڵڵا ئیبن عەبدوڵڵا ئەلموکەرەم ئەلسوفی (٦٢١ک/ ١٢٢٤ز)، هەروەها لەسەردەستی شێخ ئەسیرەدین ئیبن ئەلفەزل لەئەبهەری، دەرسی (زانستی خیلافی) خوێندووە، کە خاوەن پۆلێنە ناسراوەکانە لەبارەی زانستی خیلاف و زانستی دیکە، کە لە ساڵی (٦٢٥ک/ ١٢٢٥ز) گەشتێکی بۆ ئەربل کردووە.

هەندێ کۆڕی زانستی لە ئەربل، توانییان بەشداری لە پێشکەوتنی رۆشنبیری و بەدیارکەوتنی چەند زانستێک بکەن، یەکێک لەوانە: کۆڕی مێژوونووس و ئەدیب: شەرەفەدین ئەبو بەرەکات ئەلموبارەک ئیبن ئەلمستەوفی (٦٣٧ک/ ١٢٣٩ز) کە لە پێشەوەی هەموو کۆڕەکانە، دەبێ ئەوە بزانین کە شەرەفەدین هەروەکو زانایانی ئەو شارە ئامانجەکانی لەو شارە نەگیرسایەوە، بەڵکو بۆ موسڵ گەشتی دەکرد، هەتا ئەو کاتەی ئەربلی بەجێهێشت بەرەو حەلەب و شام و چاوی بە زاناکانی کەوت، یەکێک لەوانە کە لە حەلەب بوو: قازی بەهائەدین یوسف، ناسراو بە ئیبن ئەلشەداد (٦٣٢ک/ ١٢٣٤ز) کە خاوەن کتێبی (النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية) بوو، ساڵی (٦٣٥ک/ ١٢٣٨ز)لە حەلەب بەرەو قاهیرە رۆیشت، لەوێش گەڕایەوە بۆ دیمەشق بۆ ئەوەی دەزگای قەزا بخاتە ئەستۆی خۆی، لەدواییش مامۆستا لە قوتابخانەی (ئەلنەجیبیە) هەتا ئەو رۆژەی لە ساڵی (٦٨١ک/ ١٢٨١ز) کۆچی دوایی کرد لە نزیک چیای قاسیون شاردراوە، کتێبی بەناوبانگی (وفيات الأعيان) پۆلێن کرد لە قاهیرە لە ساڵی (٦٥٤ک/ ١٢٥٦ز) کاری پێکرا، ئەویش دوای کۆکردنەوەی دەستنووسەکانی و پیتەکانی رێکخست، لەگەڵ ئەوەی

قـــــەزای بەرێوەدەبرد، بەڵام لە نووسینەکانی بەردەوام بوو، هەتا لە ساڵی (٩٧٣ک/ ١٢٧٤ز) تەواوی کرد، لەوانەشە ئەو کتێبە کورت کرابێتەوە، بەوەی باسی مێژوو دەکات بە شێوەیەکی دووروودرێژ، بەهۆی ئامانجی لە نووسینی کتابێکی گشتی لە مێژوودا.

یەکێک لە هۆیەکانی سەفەرکردنی، نووسینی ئەو کتێبەیە، بەهۆی خۆشەویستی بۆ ئەو زانستە و زانینی هەواڵی مەشایخەکانی و سەرچاوەکانی و چۆنیەتی کەڵک وەرگرتن، پاڵنەری دووەم، ئەویش کۆمەڵایەتییە، (ئیبن خەلەکان) شێوازی گواستنەوە و گوێگرتن و وەرگرتنی زانیارییەکانی وەرنەگرتووە، لەدواییش نووسینەوەی، بەڵکو شێوازی (الاتزان في الكلام) و بەراوردکردنی لەگەڵ یەکتریدا، لەدواییش چاککردنەوەی و نووسینەوەی بەکارهێناوە، (ئەلزەهەبی) بەو شێوەیە وەسفی کردووە، کە پیاوێکی زیرەک و زانایەکی گەورە بووە لە مێژوو و زانینی رووداوەکانی سەردەم، یەکێک لەو خاڵانەی کە لەسەری گیراوە، ئەویش باسنەکردنی ئەحواڵی هاوەڵان و تابیعەکانە ئاماژەی پێ نەداوە، بەڵام لەگەڵا ئەوەش بە یەکێک لە سەرچاوە سەرەکییەکانی زانست و مێژووییە، هیچ لێکۆڵەرێک ناتوانێ باسە ئەکادیمییەکانی بەبێ ئەو سەرچاوە بایەخە تەواو بکات، لەدواییش ناوی زانا و ئەدیبەکان و میر و مەلیکەکان و ناودارانی مێژوو لە کتێبێکدا کۆکردەوە، لەگەڵ ئاماژە کردن بە رووداوەکانی سیاسی، ئەوەی شیاوی باسە لێرە کە ئیبن خەلەکان کتێبێکی دیکەی هەیە، بەناوی (ترجمات المتقدمين من الشعراء)،

یەکێک لەوانەی کە ناسراو بوون لە بەشداریکردن لەو زانستەدا: محەمەد ئیبن ئەبی ئەلهەیجاری ئەلهەزبانی ئەلئەمیر عزەدین ئەلئەربلی (٧٠٠ک/ ١٣٠٠ز)، کە بەشدارییەکی باشی لە چەند زانستێکدا هەبوو، لە ئەدەب و شیعر لەگەڵ مێژوو، هەروەها لە مێژوونووسانی ئەربل لەو سەردەمەی باسەکەمان: ئەویش (بەدرەدین ئیبن عەبدولرەحمان ئیبن ئیبراهیم ئەبو محەمەد ئەلئەربلی (٧١٧ک/ ١٣١٧ز) کە ئەدیبێکی ناسراو بووە لە (بەلاغە) و (زانستی مێژوو)دا، کتێبی (خلاصة الذهب المسبوك في سيرة الملوك) داناوە هەروەها بە (تاریخ ئیبن قنینو) ناسراوە، ئەو کتێبەش کورتکراوەی مێژووی ئیبن ئەلساعیە بەناوی (الجامع المختصر)، تێیدا تەرکیزی لەسەر هەواڵ و رووداوی مێژووی خەلیفەکانی ئیسلام کردووە، لەوانە خەلافەتی: وەلید کوڕی عەبدولمەلیک (٦٥ - ٨٦ک/ ٦٨٥ - ٧٠٥ز) بە خەلافەتی (المعتصم بالله) کە دوا خەلیفەکانی عەباسییە (٦٤٠ - ٦٥٦ک/ ١٢٤٢ - ١٢٥٨ز) بە بەردەوامی بەدوای نووسینەوەی رووداوەکانی ئەو سەردەمە بوو لە خەلافەدا، لەدواییش پۆلێنکردنی رووداوەکان، لەوانەش نووسینی ناودارترین کەسایەتییەکانی لە ماوەی خەلافەی هەر خەلیفەیەک، بەڵام بە شێوەیەکی کورتکراو.

### سەرچاوەکان


١- غوستاف لوبون: حضارة العرب، القاهرة، ١٩٥٦، ٤٨٨.
٢- سەهرەوەردی: خۆدانەپاڵ سەهرەوەردە، کە شارۆچکەیەکی نزیکی زنجانی چیاکانە. إبن خلكان: وفيات الأعيان، ٣/ ٢٧٢.
٣- ياقوت الحموي: البلدان، ٣/ ٢٨٩.
٤- إبن المستوفي: تاريخ اربل، ١/ ١٧٢ - ١٧٣.
٥- يرجع (سامي الصفار) محقق كتاب إبن المستوفي.
٦- إبن المستوفي: ن. م، ١/ ٣١٤.
٧- إبن الشعار: عقود الجمان، ١/ ١٦ب - ١٧أ.
٨.- ن. م، ١٠/ ١٧٣ب.
٩- ديوان الاهراء: ئەو کۆگایانەیە کە زێڕ و شتی گرانبەهای سوڵتانی لێ هەڵدەگیرێت.
١٠- إبن الشعار: عقود الجمان، ١/ ٢٤٠أ ب، محسن محمد حسين: أربيل، ٣٢٢ - ٣٢٣.
١١- إبن الفوطي: تلخيص مجمع الآداب في معجم اللقاب، ٤: ٢/ ١٠٦٢ - ١٠٦٣، ناجي معروف: تاريخ علماء المستنصرية، ١/ ٢٨١، عبدالحميد العلوجي: تاريخ الطب العراقي، بغداد، ١٩٦٧، ٤٢٤، محمد مفيد آل ياسين: الحياة الفكرية في العراق، ١٥١.
١٢- اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ٣/ ٣٠٣.
١٣- سوتر: دائرة المعارف الإسلامية (مادة الحساب).

١٤- تاريخ أربل، ١/ ٣٧٥.
١٥- عقود الجمان، ٣/ ١٥٢أ ب.
١٦- إبن خلدون: الصليبية، حكمة نجيب: دراسات في تاريخ العلوم عند العرب، ٨٧.
١٧- إبن المستوفي: تاريخ أربل، ١/ ٣٦٧ - ٣٦٨.
١٨- بن عساكر: تهذيب تاريخ دمشق، ٥/ ١٦٨ - ١٦٩.
١٩- إبن الساعي: الخازن: الجامع المختصر، ٩/ ٢٤٣.
٢٠- إبن الشعار: عقود الجمان، ٧/ ٢٣٩ب.
٢١- الإستيفاء: كار و بەرپرسیارێتییە كە چاو لە كاروباری داری دەوڵەت دەكات.
٢٢- إبن الشعار: ن. م، ٦/ ٢٣ب، إبن خلكان: وفيات الأعيان، ٣/ ٢٩٤.
٢٣- عقود الجمان، ٦/ ٥١ب.
٢٤- إبن الشعار: ن. م، ١/ ١٥٤ - ١٥٥.
٢٥- رسائل إخوان الصفا.
٢٦- القرآن الكريم: سورة يس، الآيات (٣٧، ٣٨، ٣٩).
٢٧- الصفدي: الوافي بالوفيات، ٥/ ٢٥١.
٢٨- ئەقلیدس: نوقترسي و كوزي برنيقسة، حكمت نجيب: دراسات في تاريخ العلوم عند العرب، ١٤٦هـ (٣).
٢٩- المجطي: بەمانای مەزن و عەزیم دێت، ناوی كتێبێكە، كە بەتلیمۆسی زانای ناوداری فەلەك دایناوە.
٣٠- إبن خلكان: وفيات الأعيان.
٣١- إبن الساعي الخازن: الجامع المختصر، ٩/ ٢٤٣.
٣٢- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە پلانی هەولێر و دەزگا بیناسازییەكانی، بروانە: محسن محمد حسين: أربيل، ٢٢١ - ٢٥٥.
٣٣- د. حسام الدين النقشبندي: ن. م، ١٤١، بروانە: الملحق رقم (٢).
٣٤- إبن الشعار: عقود الجمان، ٦/ ١٢٢أ.
٣٥- الاصطرلاب: وشەیەكی یۆنانییە، مانای گرنگترین ئامێرە رەسەدی و رادارییە فەلەكیان دەبەخشێت.
٣٦- إبن الشعار: ن. م، ١/ ١٦٧أ ب، و هـ.
٣٧- تلخيص مجمع الآداب في معجم الألقاب، ٥: ١/ ٢٢٨.
٣٨- اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ٣/ ٣٠٣.
٣٩- إبن خلكان: وفيات الأعيان، ٤/ ١٠٥.
٤٠- إبن أبي أصيبعة: عيون الأنباء في طبقات الأطباء، ٦٥٩.
٤١- إبن خلكان: وفيات الأعيان، ٤/ ٣٩٧.
٤٢- وفيات الأعيان، ٤/ ٣٩٧.
٤٣- إبن خلدون: المقدمة، ٥٠٤.
٤٤- ياقوت الحموي: معجم الأدباء، ١٠/ ٥٧.
٤٥- إبن المستوفي: تاريخ أربل، ١/ ١٦٨ - ١٦٩.
٤٦- عقود الجمان، ٧/ ١٩٧.
٤٧- إبن النديم: الفهرست، ٢٤٦.
٤٨- بدري محمد فهد: تاريخ الفكر والعلوم العربية، ١١٨.
٤٩- الغزالي: احياء علوم الدين، بيروت، د. ت، ١/ ٢٢.
٥٠- أبو شامة: الذيل على روضتين، ٢١٦، محسن محمد حسين: العز الضرير الأربلي، ٤٣٩ - ٤٤٨.
٥١- إبن خلدون: المقدمة، ٤٧٨، ٤٨٩.
٥٢- عقود الجمان، ١/ ٢٢٧أ.
٥٣- إبن الكثير: البداية والنهاية، ١٣/ ٤٢، محسن محمد حسين: أربيل، ٢٩٠.
٥٤- المنذري: التكملة لوفيات النقلة، ٦/ ٣٢٤.
٥٥- ياقوت الحموي: البلدان، ١/ ١٣٨.
٥٦- إبن المستوفي: تاريخ اربل.
٥٧- المنذري: ن. م. ص، إبن خلكان: وفيات الأعيان، ٣/ ٢٩٧.
٥٨- إبن الفوطي: ن. م. ص، الرويشدي: امارة الموصل
٥٩- إبن خلكان: ن. م، ٣/ ٢٩٨.
٦٠- محسن محمد حسين: أربيل، ٢٧٧ - ٢٧٨.
٦١- إبن المستوفي: تاريخ أربل، ١/ ١١، ٢٣، ٤٦١.
٦٢- وفيات الأعيان، ٣/ ٢٩٤.
٦٣- ابو اسحق: تاريخ نصاري العراق، ٦٤.
٦٤- بۆ زیاتر زانیاری سەبارەت بەم قەسیدانە، بروانە: الديوان، ٦٢ - ٧٤، ٢٥٧ - ٢٦١، ٢٩٢ - ٢٩٣.
٦٥- محسن محمد حسين: أربيل، ٢٧٤ - ٢٧٥.
٦٦- وفيات الأعيان، ٢/ ٩٢.
٦٧- المنذري: التكملة لوفيات النقلة.
٦٨- ابن خلكان: ن. م. ص.
٦٩- ن. م، ٢/ ٣٩٢ - ٣٩٣.
٧٠- بروكلمان: دائرة المعارف الإسلامية.
٧١- خليل ابراهيم جاسم: منهج إبن خلكان، ٣٥ - ٤٢.
٧٢- الخوانساري: روضات الجنان، ١/ ٣٢٠.
٧٣- الصفدي: الوافي بالوفيات، ٥/ ١٧٠.
٧٤- إبن حجر العسقلاني: الدرر الكامنة، ٢/ ٤٢٨.
٧٥- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەمە، بروانە: عبدالرحمن بن قنينو الأربلي: خلاصة الذهب المسبوك.

و: نەجات خۆشناو



# زانستە شەرعییەکان لە هەولێر لە سەردەمی هەزبانی و ئەتابەکیدا

دکتۆر ئومێد ئیبراهیم جوزەلی فەتاح
کۆلێژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین

مەبەست لە زانستی شەرعی، ئەوەی پەیوەندیی هەیە بە کتێبی خوا و سونە، شەرعیەتی لە خوا و پێغەمبەر (د. خ) هەیە، خزمەت بە قورئان و فەرموودەی پیرۆز و کۆمەڵگای ئیسلامی دەگەیەنێ، بەوەی کە سەرچاوەی تەشریعی ئیسلامییە، ئەوەش کاریگەری هەبوو بەسەر پێشکەوتنی زانستەکانی دیکە، لەوانەش: زانستی زمانەوانی، بە مانای زانستی زمان و ئەدەبییەکانی، ئەو لێکۆڵینەوە زانستییە شەرعییە، بەرەو چەند زانستێکی دیکە ئاراستە دەکرێ، ئەوانەی خوارەوەش، دیارترین ئەو زانستانەن، کە لە ئەربل بەدیار کەوتن:

**یەکەم/ زانستی (فەرموودە و فیقە):**

بزووتنەوەی زانستی، بایەخی بە زانستی (فەرموودە) و (فیقە) داوە، نەک هەر لە ئەربل، بەڵکو لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا، یەکێک لە نیشانە دیارەکانی بایەخدان بە بزووتنەوەی زانستی، ئەویش بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی تەشریعی دووەم، دوای قورئانی پیرۆز، وەکو هەوڵدان بۆ دەرهێنانی ئەو ئەحکامە شەرعییانەی، کە سەیری هەموو ئەو کاروبارانەی کۆمەڵگا دەکات، ئەوەش هۆیەک بوو، بۆ ئەوەی بەرەو خوێندنەوەی زیاتر بچن و قووڵتر بایەخی زیاتر بدرێ بەو لایانە، بۆ وەڵامدانەوەی داوایەکانی خودای گەورە.... (وما كان المؤمنون ليفروا كافة، فلولا نفر من كل فرقة منهم ليتفهموا في الدين ولينذروا قومهم إذا رجعوا إليهم لعلهم يحذرون) یان فەرموودەی پێغەمبەر (د. خ)... (فقيه واحد أشد على الشيطان من الف عابد).

ئەو پەیوەندییە بەهێزەی لە نێوان (فەرموودە) و (فیقە) لەوە بەدیار دەکەوێ کە سەرچاوەی تەشریع و ئەحکامی شەرعییە، زانایانی ئەربل

ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لەو لایانە، بایەخێکی زۆریان پێ دا، هەموو فەقیهێک، زانایەک بووە لە فەرموودەدا، هەروەها زانیاریی هەبووە لەبارەی زانستەکانی دیکەی شەرعی، زانستی زمانەوانی.

بایەخدانی زانایان بە هەردوو زانستی (فیقە) و (فەرموودە)، ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو بەسەر میرنشینەکە، بەتایبەتی لەلایەنی ئایینی، ئەوە: (ئەبوخەیر ئەحمەدی کوڕی مەلیکشوا حزی ئەربلی) کە ساڵی (٥٤٨ک/ ١١٥٣ز) کۆچی دوایی کردووە، کە پێشتر (مەسیحی) بووە، لە دوایش بۆتە ئیسلام و بووە یەکێک لە زانایەکانی، لەلایەنی فەرموودە و خوێندنەوە بە وردی، بایەخێکی زۆری پێ داوە، یەکێک لە گەورەترین ئەو ئەرکانەی ئەو زانایە بە ئەنجامی گەیاند، ئەویش گوێگرتن بوو لە (ئەبی الفتح المقرئی) و کتێبەکەی بەناوی (فضائل رجب)، هەروەها ئەوانەی، کە پەیوەندییان هەیە بە نوێژەکان و دوعای چاک و سالح، ئەوەش بەڵگەیەکە، کە خەڵکی ئەو میرنشینە بایەخییەکی زۆریان بەو زانستە داوە، بەتایبەتی لەلایەنی ئایینی، ئارەزوویان لە خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە پەیوەندداربوون بەو زانستەوە بووە.

یەکێک لە ڕۆڵەکانی ئەو میرنشینە، لە زانستی (فیقە) و (فەرموودە)دا کە زۆر سەرکەوتوو بوو، ئەویش (ئەبو سەعید محەمەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی ئەحمەد کوڕی جابر جاوانی ئەربلی) بووە، کە (فەقیهێکی شافعی) بووە، توانی زانستی زمانەوانی و ئەدەبیاتی لەگەڵ زانستی شەرعی کۆ بکاتەوە، (السبکی) لە (کوڕی ئەلنەجار) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (ئەو زانایە لە ئەربل لەدایک بووە، لە ساڵی (٤٦٨ک/ ١٠٧٥ز)، کۆچی کرد و بەرەو شاری بەغدا ڕۆیشتووە، لەوێ توانی گوێ لە گەورە زانایانی ئەو شارە بگرێت، لەوانەش: (ئەبوئەلحەسەنی کوڕی محەمەدی کوڕی عەلی ئەلتەبەری، کە نازناوی "ئەلکەیا ئەلهەراسی" بووە، لە ساڵی (٥٠٤ک/ ١١١٠ز) کۆچی دوایی کردووە، هەروەها: ئیمام (ئەبوحامد محەمەد کوڕی محەمەد ئەلغەزالی، خاوەن کتێبی (احیاء علوم الدین)، کە لە ساڵی (٥٠٥ک/ ذز) کۆچی دوایی کرد، هەروەها: (ئەبوبەکر محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەلحوسەین کوڕی عومەری شافعی، کە بە (کوڕی ئەلشاشی) ناسرا بوو، ساڵی (٥٠٧ک/ ١١١٣ز) کۆچی دوایی کرد، توانی ببێتە یەکێک لە فەقیهەکان و فەرموودەکانی سەردەمی خۆی، لە دواییش گەڕایەوە بۆ ئەربل و دوای ماوەیەک بەرەو وڵاتی فارس ڕۆیشت، لەوانەشە بۆ وەرگرتنی زانستەکان ڕۆیشتن، دیسان گەڕایەوە ئەربل، لە (خەفتیان) کۆچی دوایی کرد و لە (بوازیج) شاردرایەوە، ئەو زانایە لە چەند زانستێک بلیمەت بوو، (ئەلسەیوتی) لەسەر زاری (ئیبن مستەوفی) و کتێبەکەی: (تاریخ ئەربل)دا دەڵێ: (ئیمام و زانایەک بووە لە (النحو) و (فیقە)، کتێبی هەبووە لەسەر لایەنی (فیقە) و (فەرموودە) وەکو کتێبی (الجام العوام للامام أبي حامد الغزالي) توانی سوودی باشی لێ وەربگرێت.

خوێندنی زانستی (فیقە) و (فەرموودە) لە ئەربل زۆر پێشکەوت، زۆرینەی زانایان لە قوتابخانەی (النظامیة) قوتابی بوون، ئەو قوتابخانەیە ڕۆڵێکی زۆری لەسەر ڕۆشنبیری زانایانی هەبوو، بەتایبەتی (فەقیهەکانی) پاڵپشتیان لەو جۆرە خوێندنە دەکرد، ئەمەش وای کرد هەندێ لە خێزانی زانستی لێ سەرهەڵبدا، کە بە پلەی یەک بایەخی زۆریان بە (فیقە) و (فەرموودە) داوە.

لەو زانا دیارانەی ئەربل لەو لایەنەدا: (ئەبولعەباس ئەلخور کوڕی نەسر کوڕی عەقیل کوڕی نەسر ئەربلی)، کە فەقیهێکی شافعی بووە، ساڵی (٤٧٨ک/ ١٠٨٥ز) لە ئەربل لەدایک بووە، هەر لەو شارەش گەورە بووە، زانستی (فیقهی) لە ئیمامەکانی ئەو شارە وەرگرتووە، لەوانە: فەقیە و ئیمام (محەمەد کوڕی عەلی کوڕی عەلی کوڕی جامع) بووە، کە لە نزیکەی سەدەی (شەشی ک/ دوانزەی ز) کۆچی دوایی کردووە، بەرەو بەغدا کۆچی کردووە، بۆ خوێندنی (فیقە) کۆچی کردووە، لە قوتابخانەی (النظامیة) خوێندوویەتی، لەسەر دەستی ئەو مامۆستایانە: (ئەلکەیا ئەلهەراسی) و (کوڕی ئەلشاشی) هەر لەوێش چاوی بە چەندین زانای ئەو شارە کەوت، لە دوایی گەڕایەوە وڵاتی خۆی و بۆتە مامۆستا و دەرسی لە قوتابخانەکانی، (الربض) و (القلعة

- العقلية) کە ئەبومەنسوور سەرفتکین ئەلزینی جێگری (زەینەدین عەلی کچک) لە ئەربل لە ساڵی (٥١٣ک/ ١١٣٨ز) بنیادی نابوو، ئەو زانایە و خێزانەکەی رۆڵێکی زۆریان هەبوو لە پێشکەوتنی لایەنی زانستی و رۆشنبیری ئەو میرنشینە، بە یەکەم کەس دادەنرێ لە ئەربل لە دەرس وتنەوە، جێگا و پایەکی زۆری لەو میرنشینە هەبوو، (ئیبن خەلەکان) لەبارەی ئەو زانایە دەڵێ: (پیاوێکی پایەبەرز و فەقیهێکی گەورە بوو و زانیارییەکی زۆری هەبوو لەبارەی: (مەزهەبەکانی ئەخلاق و فەرزەکانی ئیسلام)، بە توانا بوو لە تەفسیرکردن و قسەکردندا، توانی مەسەلەکانی (فیقە) و (تەفسیر) پۆلێن بکات، کتێبێکی ئامادە کرد، لە (٢٦) خوتبەی پێغەمبەری تێدا بوو، لەوانەش (خطبة الوداع).

(کوری عەساکر) دەڵێ: کتێبێکم لەبارەی (فضائل الصحابة) دانا و کۆکردەوە، تێیدا باسی هەندێ فەرموودە کراوە، کە پێشتر باس نەکراون، (ئەربل)ی جێ هێشت و بەرەو (دیمەشق) رۆیشت، لەوێ، لە (غار جبل الأسود) جێنشین بوو، لە دواییش گەڕایەوە بۆ شارەکەی و لە ساڵی (٥٦٧ک/ ١١٧١ز) کۆچی دوایی کردووە و لە قوتابخانەکەی، کە دەکەوێتە (ربض) و لە گونبەتێکی جیادا بە خاک سپێردرا.

بەوەش رۆڵی زانایانی (ئەربل)مان بۆ بەدیار دەکەوێ، کە چەند رۆڵێکی بایەخیان هەبووە، بەتایبەتی لە پێشکەوتنی زانستەکان بەگشتی، یەکێک لەو زانستە بایەخانە، زانستی (الفرائض و الخلاف)، بەڵام ئەوەش رێی لە زانا و مەشایخەکانی نەگرتبوو، بۆ ئەوەی رەو بکەن بۆ جێگای دیکە، بۆ ئەوەی زانیارییەکانی خۆیان دەوڵەمەند بکەن، بەتایبەتی لەلایەنی (فیقە) و (فەرموودە)، بۆ نموونە: (سلێمان داود کوری محەمەد ئەلحەسەن کوری ئەبی خالد ئەلئەربلی) کە بە (القاضي الخالد) ناسراو بوو، گەشتێکی بۆ (مرو، سەمەرقەند، بوخارا) بە ئامانجی وەرگرتنی زانستی نوێ کرد، هەروەها توانی مۆڵەتی مامۆستایەتی لە مەشایخەکانی وەرگرێ، هەندێ (فەرموودە)ی لە چەند ناوچە و شارێک پێشکەش کرد، لەوانەش: (دیمەشق)، لە دواییش بەرەو (مووسڵ) رۆیشت، لەوێ (فەرموودەی سەحیحی بوخاری) پێشکەش کرد، هەتا ئەو رۆژەی کۆچی دوایی کرد لەوێ مایەوە.

لە زانایانی ئەربل، کە بایەخیەکی زۆریان بە وتنەوەی (فەرموودەکانی پێغەمبەر (د. خ) داوە، بەتایبەتی (خوتبەکانی)، کە زۆر بایەخن، (ئەبو لحەسەن عەلی کوری محەمەد کوری مەحموود کوری هیبەتوڵڵا ئەلکەفەرعەزی، کە لەو شارە لەدایک بووە، لە ساڵی (٥٢٤ - ١١٢٩) و لە ساڵی (٦٠٠ک/ ١١٢٣ز) کۆچی دوایی کردووە، ئەو زانایە فەقیهێکی شافیعی بووە، زۆر باسی خوتبەکانی پێغەمبەر دەکات و وتەکەی: (یا معشر من آمن بلسانه).

لەگەڵ رۆڵی گەورەی ئەو زانایانە، لەلایەنی وتنەوەی (فەرموودەکان) لەگەڵ نووسینی (فەرموودە و فیقە)، بۆ نموونە (ئەبوفەزل ئەلیاسی کوری جامعی کوری عەلی ئەربلی)، کە لە ساڵی (٥٥١ک/ ١١٥٦ز) لە ئەربل لەدایک بووە، یەکێک بووە لە ئیمامەکانی (فەرموودە)، لە سەرەتای ژیانیدا، زانستەکانی لە ئەربل وەرگرتووە و لە دواییش بەرەو (بەغدا) رۆیشتووە، بە ئامانجی وەرگرتنی زانیارییەکی زۆر لەبارەی (فەرموودە و فیقە)، شتێکی زۆری لەبارەی مەشایخەکانی ئامادە کردووە، زۆریش گوێی لێ گرتوون، ماوەیەکی زۆر لەوێ ماوەتەوە، لە قوتابخانەی (النظامية) خوێندوویەتی، لەدواییش گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی، لەوێ خەریکی دەرس وتنەوە بووە، رۆڵێکی باشی هەبوو لە نووسینی (الشروط)، بەتایبەتی ئەدیبێکی گەورە بووە لەو لایەنە، کۆمەڵێکی زۆر لە ئەربل گوێیان لێ دەگرت، هەروەها وا پێ دەچێ زانایەکی گەورە بووە لە زانستی مێژوودا، توانی زانیاری مێژوویی پۆلێن بکات و رێکیان بکاتەوە بۆ خوێندن، (ئەبوفەزل) لە ساڵی (٦٠١ک/ ١٠٢٤ز) کۆچی دوایی کرد لە گۆڕستانێک شاردرایەوە، کە نزیک بوو لە گۆڕی (الزاهد: ئەحمەد زرزاری) لە رۆژهەڵاتی شارەکە.

دەبێ ئەوەش بزانین، کە زانایانی ئەربل رۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە خوێندنی هەموو زانستەکان و پێشکەوتنیان، زۆر لە زانا و مەشایخانی گەورەی لێ پەیدا بوو،

یەکێک لەوانە: فەقیهی گەورە (ئەبی عەمر عوسمانی کوڕی دەرباسی کوردی هەزبانی مارانی) (٦٠٢ک/ ١٢٠٥ز) کە یەکێک بووە لە زانا گەورەکانی (مەزهەبی شافیعی)، هەروەها زانایەکی گەورە بووە لە (فیقە)، لە تەمەنی منداڵیدا لەسەر دەستی فەقیهی گەورە (ئیبن عەباس خزری کوڕی نەسری کوڕی عوقەیلی ئەربلی) زانستی (فقه)ی خوێندووە، لە قوتابخانەی (القلعة - العقيلية) دەرچووە و بەرەو دیمەشق ڕۆیشتووە بۆ وەرگرتنی زانستی (فیقە) و (فەرمووده)، بایەخی زۆری داوە بە شرۆڤەکردنی (المذهب في الفقه الشافعي للامام أبي اسحق الشيرازي) هەروەها (الاستقصاء لمذاهب الفقهاء) کە لە (٢٠) کتێب پێک دەهات، لەدواییدا کتێبی (اللمح في اصول الفقة) لە میانی دوو کتێبدا شرۆڤە کرد، کتێبی (التنبيه)ی ئیمام ئەبی ئیسحاق، دواتر دیمەشقی جێ هێشت و بەرەو (میسر) ڕۆیشت، لەوێ دەزگای دادگای بەڕێوە دەبرد، ئەویش لە سەردەمی سوڵتان (سەلاحەدینی ئەیوبی)، لە هەمان کاتدا بۆ قوتابییەکانی وانەکانی خۆی دەدایەوە، هەتا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد و لە (المقطم) شاردرایەوە.

بەوەش دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەو شرۆڤەکردنەوە و کورتکردنەوەی بۆ ئەو کتێبە گەورە و بایەخانەی کە بایەخی بە زانستی (فەرمووده و فقە) دەدەن، شتێکی زۆر بایەخ و نیشانەیەکی روونە بۆ تەئکیدکردنی جێگا و پایەی زانایانی ئەربل، بەڵام لەبەر نەبوونی جێگیری لەو جێگایانەی، کە ئەو شرۆڤە و کورتکراوانەی تێدایە، هەتا ئێستا نەتوانراوە بگەنە ئەو شتە بایەخانە، لەگەڵ ئەوەش ئەو جۆرە نووسینانە، ئەوە روون دەکاتەوە، کە زانایانی ئەربل ڕۆڵێکی زۆر بایەخیان هەبوو، کە ئەوەش وای کرد ببێتە بابەتی خوێندن بۆ قوتابییانی زانست.

هەروەکو پێشتر گوتمان، لەو شارەدا هەندێ خێزانی زانستی سەریان هەڵدا، کە بایەخەکی زۆریان بە زانست دابوو، یەکێک لەو خێزانانە، خێزانی (متعة) بوو، کە سەدا و دەنگی زۆری هەبوو لە ناوچەکەدا، نەک هەر لە (ئەربل) و (مووسڵ)، کە ئەو شارەیان وەکو بارەگایەک بۆ خۆیان هەڵبژارد، بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو جیهانی ئیسلامیدا.

ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێ بدرێ، کە ئەو خێزانە بەستراون بە ڕۆشنبیری ئەربل و مێژووەکەی، وەکو خێزانە زانستییەکانی دیکەی ئەو شارە، توانییان ڕۆڵێکی گرنگ لە پێشکەوتنی ژیانی زانستی لە ئەربلدا ببینن.

یەکێک لەوانە: (محەممەدی کوڕی یونس کوڕی محەممەدی کوڕی مالک، شێخ ئەبی حامد عیمادەدین ئەربلی، کە فەقیهێکی ناودار بوو، (ئەبوحامد) لە ساڵی (٥٣٥ک/ ١١٤٠ز) لە قەڵای ئەربل لەدایک بووە، هەر لەوێ گەورە بوو تا ئەو ڕۆژەی بۆ زیادکردنی زانستی فیقە و گوێگرتن لە فەرمووده هەولێری بەجێ هێشت، لەسەر شێوەی ئەو زانایانەی لە پێش خۆی بوون لە ئەربلدا، رووی کردە (مووسڵ) و (بەغدا) تا بووە یەکێک لە گەورە زانایەکان لە سەردەمی خۆیدا، (کوڕی خەلەکان) کە خەڵکی یەک شار بوو لەگەڵ ئەو زانایە، لەبارەی ئەو زانایە دەڵێ: ئیمامێکی گەورە و ناوداری سەردەمی خۆی بوو لە (زانستی فیقە) و (اصول) و (فەرمووده)، هەروەها سەرکەتوو بوو لەلایەنی (فەتوادان)دا، (کوڕی مستەوفی) لەلایەن خۆیەوە دەڵێ: (ئەو ئیمامە زانا بوو لە زانستی شەریعە و موفتی بووە، گەورەی زانایان بووە، (عیمادەدین محەممەدی کوڕی یونس) ئەو زانایە نووسینی زۆر بووە لەلایەنی (المذهب والخلاف)، لەوانەش (المحيط في الجمع بين المهذب والوسيط) و شرۆڤەکردنی کتێبی (الوجيز)ی ئیمام حامد محەممەد غەزالی (٥٠٥ک/ ذز)، هەروەها پۆلێنی مشتومڕێکی کرد و ناوی لێنا (التحصيل)، هەروەها (عقيده وتعليقه في الخلاف)، وا پێ دەچوو، کە ئەو زانایە جێگا و پایەکی زۆری هەبووە لە میرنشینی مووسڵ، لە مزگەوتی (المجاهدی) وتارخوێن بووە و مامۆستاش بووە لە چەند قوتابخانەیەک، لەوانە (النورية، العزية، الزينبية، النقشية، العلائية) زانایەکی ناودار بووە لە (فقە)، توانی سەرۆکایەتی (أصحاب الشافعية) بکات لە مووسڵ، ئیمام و فەقیهێکی زۆر لەسەر دەستی دەرچوون و سەدای ناوی گەیشتە هەموو جیهانی ئیسلامی و حاکم

سوڵتانەکانی ئەو سەردەمە، ئەخلاق و هەڵسوکەوتی زۆر جوان بووە، توانایەکی باشی هەبوو لە (شیعر) و (حیکایەتەکان)، ساڵی (٦٠٨ک/ ١٢١١ز) لە مووسڵ کۆچی دوایی کرد.

بەڵام یەکێک لە دیارترین و ناسراوترین ئەو خێزانە زانستییەی، کە رۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە مێژووی رۆشنبیری شاری ئەربل، ئەویش ئەو زانایەیە: (ئەبو فەزل ئەحمەدی کوڕی شێخی عەلامە کەمالەدین ئەبی فەتح مووسای کوڕی شێخ رەزیەدین ئەبی فەزل یونس محەمەدی کوڕی مەنعە شەرەفەدین ئەربلی)، کە دەکاتە (برازای) فەقیهی گەورە (ئەبو حامد عیمادەدین)، کە پێشتر بە درێژی باسی لێ کرا، ئەو زانایە مامۆستا بوو لە قوتابخانەی سوڵتان (موزەفەرەدین گۆکبری) - قوتابخانەی المظفرية - لە جێگای فەقیە (بەهائەدین محەمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی خەلەکانی ئەربلی) (٦١٠ک/ ١٢١٣ز)، مێژوونوسی (ئەربل) فەقیە (شەمسەدینی کوڕی خەلەکان) (٦٨١ک/ ١٢٨٢ز) یەکێک لەوانە بوو، کە بە بەردەوامی گوێی لەو زانایە دەگرت، لەم بارەیە (شەمسەدین) دەڵێ: (کەسم نەدیوە وەک ئەو زانایە لەلایەن وانە وتنەوە بە توانا بێت)، ساڵی (٦١٧ک/ ١٢٢٠ز) ئەربلی بەجێ هێشت و بەرەو مووسڵ رۆیشت، لەوێ لە قوتابخانەی (القاهرية) مامۆستا بوو، دەڵێن بەڵکو ئەو ئەرکە بەسەریدا فەرز کرا، ساڵی



(٦٢٢ک/ ١٢٢٥ز) لە مووسڵ کۆچی دوایی کرد، بەڵام زۆر بایەخە لەبارەی ئەو زانایە بڵێین، کە زۆر بە توانا بوو لەلایەنی (مذهب) و لە لیستی فەقیهە ناسراوەکان پۆلین کرابوو، نووسینی هەبوو لەبارەی شرۆڤەکردنی کتێبی (التنبيه)، بەتایبەتی لە لقەکانی (الشافعية)ی شێخ ئەبی ئیسحاقی شیرازی (٤٧٦ک/ ١٠٨٣ز)، توانی زۆر بە وردی شرۆڤەی بکات، هەروەها کتێبی (أحياء علوم الدين)ی ئیمامی (ئەبی حامد محەمەد غەزالی) (٥٠٥ک/ ذز) کورت کردەوە بە دوو شێواز کورتی کردنەوە: یەکێکیان (گەورە بوو) و ئەوەی تریان (بچووک بوو)، زۆر لە زانیارییەکانی لەبەر کرد لەبەر ئەوەش زانیارییەکانی زۆر بوو.

هەروەها لە فەقیهە ناودارەکانی (ئەربل) لە زانستی (فیقە و فەرمووده) موفتی گشتی: (کەمالەدین ئەبو فەزائل سەلاری کوڕی حەسەنی کوڕی عومەری کوڕی سەعیدی ئەربلی - فەقیهی شافعی مەزهەب) لە سەرەتای سەدەی (٧)می کۆچی/ ١٣ی زایینی لە ئەربل لەدایک بووە، هەر لەوێ گەورە بوو و گوێ لە شێخ: (ئەلصالح ئەبی جەعفەر کوڕی محەمەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی مەکرەمی کوڕی عەبدوڵلای سۆفی) (٦٦١ک/ ١٢٢٤ز) دەگرت، لە دواییش، هەر وەکو ئەو زانایانەی پێش خۆی، (ئەربل)ی بەجێ هێشت بەرەو دیمەشق رۆیشت و لەوێ جێگیر بوو، لەسەر دەستی شێخەکانی ئەو شارە (فیقهی) خوێند، یەکێک لەو زانایانەی گوێی لێ دەگرت و سوودی زۆری لێ کرد: (تەقیەدینی کوڕی سەلامی شەهرەزووری)، تا وای لێ هات بووە یەکێک لە ناودارانی زانستی مەزهەب، لە دواییش بووە (موفتی گشتی شام و دیمەشق)، لەبەر زۆری زانیارییەکانی، (شێخ نەجمەدین باذرائی) بە مامۆستای لە قوتابخانەکەی خۆی کە لە دیمەشق بوو دامەزراند، زۆر لە ناودارانی مەشایخی ئەو سەردەمە گوێگر و قوتابی ئەو بوون، لەوانە (محیەدین تەواوی)، هەر لە دیمەشق مایەوە، وەکو (موفتی و مامۆستا) تا رۆژی کۆچی دوایی لە ساڵی (٦٧٠ک/ ١٢٧١ز)، ئەوەی زۆر زۆر بایەخە بیڵێین لەبارەی ئەو زانایە (یەکێک لە زانا گەورەکانی مەزهەبی ئیمامی شافعی بوو، هەروەها (یونینی) باسی دەکات و دەڵێ: (سینگێکی زۆر فراوانی هەبوو، لەبەر بەرزی ئەخلاقی و هەڵسوکەوتی، ئەو

مەسەلانەی کە پۆلینی کردبوون لەلایەنی (فیقە و فەرموودە)، کورتکردنەوەی (البحر الرویانی)، لە چەند کتێبێکدا ناوی لێ نابوو (مختصر روضة الحكام الرویاني) هەندێک لە زانایانی ئەربیل رۆڵی گەورەیان هەبوو لە وتنەوەی (فەرموودە) و بایەخی زۆریان پێ دا، یەکێک لەو زانایانە: (ئەمینەدین قاسمی کوڕی ئەبی بەکری کوڕی غەنیمە) (٦٨٠ک/ ١٢٨١ز)، یەکێک لە کارەکانی ئەو شێخە (راوي السند) بووە، گەشتێکی زۆری کرد بۆ گەڕان بەدوای زیادکردنی زانست و زانیارییەکانی و گوێگرتن لە فەرموودە، (صحیح المسلم)ی (المؤید الطوسي) کۆکردەوە و لە دیمەشق خوێندییەوە و زۆریش گوێیان لێ گرت.

خێزانی زانستی ناسراو (ئیبن خەلەکان) یەکێکە لە زانایانی گەورەی کورد، کە زۆر ناسراون لە ئاستی جیهانی ئیسلامی و شاری ئەربیل، بە تایبەتی لەلایەنی (فیقە و فەرموودە)، زانا و فەقێ و مامۆستای گەورە و فەرموودەزانی زۆر گەورە و بلیمەتی لێ پەیدا بوو، رۆڵێکی زۆر گەورەیان هەبوو لە ئەربیل، هەروەها لەلایەنی پێشکەوتنی رۆشنبیری، بەشدارییەکی زۆریان هەبوو لە مامۆستایەتی و مەشیخەتی لە زۆرینەی قوتابخانەکانی ئەربیل.

یەکێک لە ناودارانی ئەو خێزانە لەلایەنی (فیقە و فەرموودە)، کە بەشدارییەکی زۆریان هەیە لەلایەنی پۆلینکردن و نووسیندا، لەوانە: (ئەبو عەبدوڵلا حوسێنی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەبی بەکری کوڕی خەلەکان)، کە بە (روکنودین ئەربلی) ناسراو بوو، (ئیبن مستەوفی) باسی دەکات و دەڵێت: (شێخێکی سالم بووە، لەگەڵ ئەوەی "فەقیهە و زانایەکی گەورەیە" زانیارییەکی زۆری لەبارەی مەزهەب هەیە و زانستەکانی، هەروەها (قورئان خوێنێکی ناسراو بووە) بە سەنگ و پایە بەرز بووە، رۆڵێکی گەورەی هەبووە لە پێشکەوتنی رۆشنبیری و مامۆستایەتی لەو میرنشینەدا، مامۆستا بووە لە چەند قوتابخانەیەکی ئەربلدا، هەروەها گوێی لە چەند زانایەکی گەورە گرتووە، لەوانە: (شێخ حافز ئەبوعەبدوڵلا قاسمی کوڕی ئەبی فەرەج سەقەفی ئەسبەهانی)، کە لە ساڵی (٤٨٩ک/ ١٠٩٥ز) کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (الحجة في بیان الحجة) کۆ کردەوە و شرۆڤەی کتێبی (مذهب السلف) بۆ هەمان شێخ کرد، ئەوەی هەڵسا بە کۆکردنەوەی، الشیخ (قوام السنة أبي القاسم اسماعیل بن محمد بن الفضل علي الطلیحي الأصبهاني) کە لە ساڵی (٥٣٥ک/ ١١٤٠ز) کۆچی دوایی کردووە، لەو کتێبەدا باسی رای هاوەڵەکان و (تابعین)ی کردووە، ئەو شێخە گەورە لە ساڵی (٦٢٢ک/ ١٢٢٥ز) لە ئەربیل کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گشتی شاردرایەوە، کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی شارەکە.

هەروەها لە ئەندامانی ئەو خێزانە: (ئەبو عەبدوڵلا بەهائەدینی محەمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی بەکری کوڕی خەلەکان) بووە، کە فەقیهێکی شافیعی بووە، برای مێژوونووسی ناسراوی ئەربیل: (شەمسەدینی کوڕی خەلەکان) (٦٨١ک/ ١٢٨١ز)، ئەو شێخە گەورە (بەهائەدین) لە ساڵی (٦٠٣ک/ ١٢٠٣ز) لە ئەربیل لەدایک بووە، رووی کردە خوێندن و گوێگرتنی (فیقە و فەرموودە) گوێی لە (صحیح البخاري) گرت لەلای: (ئەبی جەعفەر محەمەد کوڕی هیبەتوڵلای کوڕی مەکرەمی ئەبی عەبدوڵلای سۆفی) (٦٢١ک/ ١٢٢٤ز)، پیاوێکی زۆر لەسەرخۆ و لەخۆبوردە بووە، بەم شێوەیە (یونینی) وەسفی دەکات: (پیاوێک بوو هیچ هاوتا و هاوشێوەی نەبوو لە ئەخلاق و هەڵسوکەوتیدا، پیاوێکی زۆر بە بەزەیی و بە سۆز بووە، لەبەر ئەوەش فرمێسک لە چاوی دەهاتە خوارەوە، زۆر نزیک بووە لە هەژاران و ساڵحەکان، هەتا پێی دەکرا یارمەتیی دەدان، (ئەربیل)ی بەجێ هێشت و بەرەو (بەعلەبەک) رۆیی، لەوێ بووە بەرپرسی دادگا و قەزا، هەتا رۆژی کۆچی دوایی لە ساڵی (٦٨٣ک/ ١٢٨٤ز) لە شوێنی (تربة الزاهد: عبدالله الیونیني) شاردرایەوە، کاتێک کۆچی دوایی کرد هیچی نەبوو بیخوات، یەک دیناری لە داوی خۆی بەجێ نەهێشت، بەڵکو دەڵێن، کاتێک کۆچی دوایی کرد، زۆر قەرزار بووە، کتێبێکی هەبوو بە ناوی (التاریخ الأكبر في طبقات العلماء وأخبارهم)، لە مەزهەبی شافیعی

بووە، هەروەکو زۆربەی زانایانی ئەو شارە، بە تایبەتی فەقیهەکانی، لەسەر مەزهەبی شافیعی بوون.

دەتوانین بڵێین: بایەخترین هۆکاری بڵاوبوونەوەی (مەزهەبی شافیعی) لە ئەربیلدا، بۆ مەسەلەی خوێندنیان دەگەڕێتەوە، کە زۆربەی زانایانی ئەو شارە بوون خوێندنیان لەسەر بنەمای ئەو مەزهەبە بووە، کە سەرچاوەکەی شێخەکانی لە دەرچووانی قوتابخانەی (النظامیة) بوون، قوتابخانەکانی ئەربیل (شافیعی) بوون، جگە لە قوتابخانەی (المظفریة)، هەردوو مەزهەبی لێ دەخوێندرا (شافیعی، حەنەفی)، هەرە زۆربەی ئەوانەی هاتن بۆ ئەو شارە، ئینجا چ بۆ خوێندن یان گوێگرتن لە فەرموودە، لە قوتابیانی ئیمامی (شافیعی) بوون، هەروەها لێرە دەبێ باس لە میرەکانی ئەو شارە بکەین، کە ڕۆڵێکی زۆریان هەبوو لە پێشکەوتنی ئەو میرنشینە، بۆ نموونە سوڵتان (موزەفەرەدین گۆکبری) (٦٣٠ک/ ١٢٣٦ز)، ئەو میرە خانوویەکی تایبەتی بۆ (فەرموودە) بنیاد نا و هەڵسا بە پۆلینکردنی (ناوی ئیمامەکانی فەرموودە)، کە لە ناسراوەکانی: (ئەبوعەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی فەرەجی بەغدادی) بوو (٦٠٤ک/ ١٢٠٧ز)، هەروەها (ئەبوحەفسی عومەری کوڕی محەمەدی کوڕی مەعمەری کوڕی تەبەرزدی بەغدادی) بوو (٦٠٧ک/ ١٢١٠ز)، ئەوەش بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئاستی بەشداریکردنی ئەو میرنشینە و زانایانی لەو لایەنەدا،



(ئیبن مستەوفی) دەڵێ: من زۆر پابەند بووم لەسەر گوێگرتن لە زانایان، لەلایەنی (فیقە و فەرموودە)، قوتابخانەی (المظفریة) بنیاد نا، دەتوانین بە بایەخترین قوتابخانەی دابنێین لە ئەربیلدا، (فەقیهەکان) بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بەسەر هەردوو قوتابخانەی (الشافعي والحنفي) پۆلین کرد، ئەو میرە زۆر نزیک بوو لە زانایانی ئەو شارە، لەبەر ئەوەش بە زۆری دەچووە ئەو قوتابخانەی و لەگەڵیان باسی لە گیروگرفتەکانیان دەکرد، ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ، کە ئەو کابرایە بایەخێکی زۆری بەو زانستانە دەدا و زانیارییەکی زۆری هەبوو لەبارەی ئەو زانستانە و بەشدارییەکی باشی لە پێشکەوتنی ئەو میرنشینە کرد.

یەکێک لەو زانایانەی کە بەشدارییان کرد لە خوێندن لە قوتابخانەی (المظفریة)، ئەویش فەقیە: (ئەحمەدی کوڕی عومەری کوڕی ئەحمەدی ئەبی شاکر ئەبو محەمەد کەفەرعەزی ئەربلی) بوو (٦٣٧ک/ ١٢٣٩ز) مەزهەبەکەشی (حەنەفی) بووە، پارێزگارییەکی باشی لەو (مەزهەبە) کرد، بەردەوام بوو لە مامۆستایەتی و وانە وتنەوە لەو قوتابخانەیە و مەزهەبە، هەتا ئەو ڕۆژەی (تەتارەکان - مەگۆلەکان) هێرشیان کردە سەر ئەربل ساڵی (٦٣٤ک/ ١٢٣٦ز)، کە ئەوەش وای کرد، ئەو شارە بەجێ بهێڵێ و بەرەو دیمەشق بڕوات، هەتا ڕۆژی کۆچی دوایی کردنی لە قوتابخانەکانی ئەوێ بووە مامۆستای ئەو (مەزهەبە).

شێخ و ئەدیبی ناسراو (مەجدەدینی کوڕی زەهیری ئەربلی) (٦٧٧ک/ ١٢٧٨ز) یەکێک بووە لە شێخەکانی ئەدەب، زانایەکی گەورە بووە لە مەزهەبی ئیمام (ئەبی حەنیفە)یە، لە پێشەوەی هەموان بوو لەلایەنی وانە وتنەوە لەبارەی ئەو مەزهەبە لە (دیمەشق) لە قوتابخانەی (القیماریة)، هەتا ڕۆژی کۆچی دوایی، چەندین زانا قوتابی بوون لەلای، بۆ نموونە: مێژوونووسی ناسراو (ئەبوعەبدوڵڵا محەمەد کوڕی عوسمانی زەهەبی) (٧٤٨ک/ ١٣٤٧ز)، توانی ئیجازەی وانە وتنەوە لەو زانایە وەرگرێ.

هەروەها یەکێک لە زانا و ڕۆڵەی ئەو میرنشینە، (ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) بووە، شێخێکی پایە بەرز و بلیمەت بووە، هەروەها زانا و ئیمامێکی گەورە بووە لە (مەزهەب)دا، یەکێکیش بوو لە ئیمامەکانی (مەزهەبی حەنبەلی) لە (الحرم الشریف) بەرەو (الکعبة).

**دووەم/ زانستی (القرآن):**

(قورئانی پیرۆز) و زانستەکانی، جێگای بایەخدانی هەموو بزووتنەوەکانی زانستی ئیسلامی بوو، (ئەحکامی شەرعی) لە پێشەوەی هەموو ئەو زانستانەیە، (زانستی قورئان) بۆ چەند بەشێک دابەش کراوە، لەوانە: (زانستی خوێندنەوە و تەفسیر و (الناسخ والمنسوخ)، هۆیەکانی دابەزین (النزول)، ئەو زانستە ئاسانکارییەکی زۆری پێشکەشی زانایەکانی کردووە، بۆ ئەوەی بتوانن ئەحکامەکان و ڕێبازەکانی (التشریع) بەجوانی دەربکەن و شی بکەنەوە، ئەوانەش بایەخترین ئەو زانستانەی کە دەربارەیان زانیاری هەیە لە ئەربلدا:

**١- زانستی تەفسیر:**

زانستێکە لە مانای سیستەم و ڕێبازی قورئان دەکۆڵێتەوە، بەپێی بنەما و ڕێزمانی عەرەبی و بنچینەی وتە و واتا و فیقە، بابەتە سەرەکییەکەی (وتەکانی خوای گەورە، ئامانجەکەی، گەیشتن بۆ تێگەیشتنی تەواوی قورئانی پیرۆز و توانایەکی باش بۆ دەرهێنانی ئەحکامی شەرعی).

لە ئەربل، زۆر بەکەمی ئیشارەت بە زانستی تەفسیر دراوە، بایەخییەکە زۆر کەم بووە، یەکێک لەو زانایانەی کە بایەخی دابێ بە زانستی شەرعی و ڕۆڵی هەبووە لەو لایەنە، زانای گەورە (ئەبوعەباس خدری کوڕی نەسری کوڕی عوقەیلی کوڕی نەسری ئەربلی) (٥٦٧ک/ ١١٧١ز) کە فەقیهێکی شافیعی بووە، کە یەکێکە لە ناودارترین زانایەکانی ئەربل، زانایەکی زۆر دیارە لەلایەنی (الفقه والأخلاق والفرائض) لە قوتابخانەکانی ئەربل مامۆستایەتی کردووە و وانەی گوتۆتەوە. یەکەم کەس کە وانەی وتەوە لە ئەربلدا، زۆر کەسیش سوودی لێ بینیوە زۆر شتی لە تەفسیر فیقهدا پۆلین کرد.

هەروەها لەو مەیدانەدا زانایەکی دیکە هەیە، ئەویش: (ئەبوفەزل جامع کوڕی عەلی ئەربلی) کە فقیە و فەرمووودەزان بووە (٦٠٠ک/ ١٢٠٤ز) یەکێک بووە لەوانەی کە بایەخیان بە زانستی شەرعی داوە، لەوانەش: زانستی قورئان: لە تەفسیر و هۆیەکانی دابەزین (النزول) و (الناسخ والمنسوخ).

**٢- زانستی خوێندنەوە:**

زانستێکە لە چۆنیەتیی خوێندنەوەی وتە و زاراوەکانی قورئان دەکۆڵێتەوە، لەلایەنی ئەو جیاوازییانەی دیار و نادیارن و دەستنیشانکردنیان، هەروەها ڕەگ و بنچینەی هەیە لە زانستی عەرەبی و کەڵکی زۆر هەیە بۆ ئایەتەکانی خوای گەورە، بەتایبەتی لە مەسەلەکانی گۆڕانکاری و گۆڕان و تەحریفکردن، خوێندنەوەکان یەکێکن لەو زانستانەی، کە جێگای بایەخ پێدان بوون لەلایەن زانایەکانی ئەربل، حەوت خوێندووەکان کە پشت بەخوێندنەوەی قورئانی پیرۆز دەبەستێت.

پێشکەوتنی لایەنی زانستی لە ئەربلدا، کاریگەرییەکی زۆری هەبوو بەسەر پێشکەوتنی زانستی خوێندنەوەکان، هەندێ لە زانایان خۆیان ئامادەکردبوو بۆ ئەوەی ببنە پسپۆڕ لەو زانستە لەگەڵ چالاکیی زانستی و ئایینی، کە ئەو میرنشینە بەخۆیەوە بینی، زانایان هەوڵێکی زۆریان دا بۆ بایەخدان بەو زانستە و حەزکردنیان بەو کتێبانەی، کە پەیوەندییان بەو زانستە هەیە، یەکێک لەو زانایانە: (بەرەکەی کوڕی عیسای ئەربلی) (٥٨١ک/ ١١٨٥ز)، ئەو زانایە هەموو کتێبی (الجامع في القراءات) خوێندەوە، کە ئەوەش نووسینی یەکێک لە زانا ناسراوەکانە، ئەویش ئیمام (ئەبی حەسەن کوڕی محەمەد کوڕی عەلی فارسی) ناسراو بە (الخیاط البغدادي)یە (٤٥٠ک/ ١٠٥٨ز).

یەکێک لە زانا گەورەکانی خوێندنەوەکان لە ئەربلدا: (ئەبوعەباسی کوڕی عوسمانی کوڕی ئەبی عەلی کوڕی مەهدی کوردی زرزرای ئەربلی) (٥٩١ک/ ١١١٤ز)، کە زانایەکی فەرموودەزان بووە، ئیمامێک بووە لە زانستی خوێندنەوەکان، (ئیبن مستەوفی) لەلایەن خۆیەوە باسی دەکات و دەڵێت: ئیمامێکی زانا و پاک و زاهید و زۆر نزیک بووە لە خوێندنەوە، بەتایبەتی ناوەڕۆکی ئایین و خوڕەوشتی تایبەکان، گەشتێکی زۆری بۆ زیادەکردنی زانستی (فەرموودە) کرد و گوێی لە زۆر شت گرت و زۆر شتیشی نووسی، پۆلینی لە خوێندنەوەکاندا



کرد، دوو کتێبی ئامادە کرد، یەکێکیان بەناوی (المؤنس) و ئەودی دیکە بەناوی (المنتخب)، کوڕی ئەلمستەوفی دەڵێ: (ئەو زانایە بەخۆی قورئانی پیرۆزی دەنووسییەوە، بەتایبەتی قورئانی ئەزبەر کردبوو، ئەوەش بەڵگەیەکە کە خۆی ئەو دوو کتێبەی نووسیوە، ئەو زانایە بەهۆی نەخۆشی کۆچی دوایی کرد، لە ئەربل و لە گۆڕستانی گشتی شاردرایەوە).

وا پێ دەچێ (خێزانی زرزاری) یەکێک بووە لەو خێزانانەی، کە رۆڵیان هەبووە لەلایەنی بزووتنەوەی زانستی لە ئەربلدا، یەکێک لەوانەی کە زۆر دیار بووە لەلایەنی خوێندنەوەدا: (محەمەد کوڕی عوسمانی کوڕی سلێمانی کوڕی عەلی کوڕی سلێمانی ئەبوعەبدوڵڵای کوڕی ئەبی عومەری کوردی زرزاری ئەربلی) لە دواییش (الرهاوي - ٦٨٨ک/ ١٢٨٩ز)، فەقیە و فەرمووده‌زان و (قاریٔ) بووە، لەسەر دەستی باوکی چووەتە ناو زانستی (فقە) و خوێندنەوە (أصول الفقە والحديث)، گەشتێکی درێژی کردووە بۆ وەدەستهێنانی زانست و خوێندنەوەی زیاتری قورئانی پیرۆز، وەکو (حەوت خوێندنەوەکە) و لە دیمەشق و قاهیرە و ئەسکەندەرییە گوێی لە مەشایخە گەورەکان گرتووە، (الذهبي) لەبارەی ئەو زانایە دەڵێ: (زۆر بە وردی لە حوجەکانی دەکۆڵییەوە، هەروەها زاهید و ئیمانداریکی دیار بوو، خێر و یارمەتی زۆری دەدایە خەڵکان).

بەوەش، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە زانایانی ئەربل، بایەخێکی زۆریان بەو زانستە داوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بایەخی ئەوان هەر لەسەر خوێندنەوە ڕانەوەستاوە، بەڵکو وانە وتنەوە و بایەخدان بە (فیقە و فەرموودە)، یەکێک لەوانە: (ئەلیاسی کوڕی عەلوانی کوڕی مەحموود)، کە بە (روکن و دینی ئەربلی)، ناسراو بوو، گەشتێکی زۆری بۆ هەموو ناوچەکانی عیراق و دیاربەکر و دیمەشق کرد و گوێی لە مەشایخەکانی گرت، لە دواییش بایەخی داوە بەفێربوونی زانستی قورئان داوە، بەتایبەتی بۆ قوتابییەکانی و ئەوانەی حەزیان لەو زانستە بووە.

زانا و فەقیهی گەورە (ئەبومحەمەد عەبدوڵڵای کوڕی حوسێنی کوڕی عەلی) نازناوی (مەجدەدین ئەربلی) (٦٧٧ک/ ١٢٧٨ز) کە کوردە و مەزهەبی شافعییە، یەکێک بوو لە مامۆستا و وانە وتانی (قورئان) لە شامدا، (الأستوی) لەبارەی ئەو زانایە دەڵێ: زانایەکی ناسراو بوو لە (مەزهەبی بصیر) هەروەها زانیارییەکی هەبوو لە زانستی (القراءات) وردی، زانایەکی دیندار و خێرخواز و ئەخلاقێکی گەورەی هەبوو، لەگەڵ چاکە و زانست بوو، بە تایبەتی قورئان و شەریعە.

هەروەها لە پیاوانی فەرموودە: (ئەمینەدین قاسم کوڕی ئەبی بەکر ئەربلی)، (٦٨٢ک/ ١٢٨١ز)، ئەو زانایە زۆر باسی (صحيح المسلم)ی دەکرد، لەسەر دەستی زانایانی ئەربل خوێندی و قوتابی بوو، شێخ (أبو عبدالله شعلة الموصلي) ناسراوترین زانایانی مووسڵ بوو لە (القراءات)، ئەوانە هەموویان لەسەر دەستی زانایانی ئەربل گەیشتنە جێگا و پایەی بەرز و بوونە (فەرمووده‌زان و فەقیە)، شێخی ئەو زانایە، کە ناوی (عەلی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی محەمەدی ئیمامی تەقیەدین ئەربلی) (٦٨٨ک/ ١٢٨٩ز) بووە، کتێبی

(الشمعة)ی نووسیوە، وا پێ دەچێ ئەو زانایە (تەقیەدین ئەربلی) کارەکانی لەسەر (القراءات) رانەوەستابی، شێخ (شەمسەدین ئەبوعەلا)، لەبارەی ئەو زانایە دەڵێ: (فەقیهێکی دادپەروەر بوو و زۆر لە خوا دەترسا).

وا پێ دەچێ زانایانی ئەربل هەر لێرە رانەوەستان، بەڵکو لە زانستی (القراءات) زانستی (تجوید) هەبوو، کە یەکێک بوو لەو زانستانەی، کە زانایانی ئەربل بایەخیان پێ دەدا، یەکێک لەو زانایانەی ئەربل کە زۆر بەتوانا بوو و بایەخی بەولایەنە دەدا: (محەمەدی کوری حەسەنی ئەبوعەبدوڵلای ئەربلی) کە قورئان خوێنێکی کوێر بوو و لە قاهیرە بوو (٧٠٠ک/ ١٣٠٠ز)، هەروەها (الذهبي)، کە لە مەجلیسەکانی ئەو زانایە ئامادە دەبوو، (ذهبي) دەڵێ: (لەگەڵی دانیشتووم و بۆم روون بۆوە کە زانیارییەکی زۆری لە هونەری تەجوید هەبوو و کەس نەبوو وەکو ئەو لایانە).

### سێیەم/ زانستی (سۆفیگەری):

ئەو زانستە، لە زانستەکانی شەرعییە، کە بایەخی زۆر بە (خواپەرستی و زوهد و دووری لە هەموو شتە دنیاییەکان، بنچینەکەی بۆ "قورئان و فەرمووده، گۆشەگیری و دوورکەوتنەوەی لە خۆشییەکانی دنیا، هەر تەنها خواپەرستی) و کرانەوەی تەواو بۆ خوای گەورە و نزیکبوونە لەو.

زانستی (سۆفیگەری) چالاکییەکی زۆری هەیە و زۆر پێشکەوتوو بوو لە (ئەربل)دا، بایەخێکی تایبەتی پێ دەدرا، یەکێک لە هۆیەکانی بڵاوبوونەوەی (سۆفیگەری)، دەگەرێتەوە بۆ کاریگەرییەکانی زانستی شەرعی و وەزعی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری، لەو سەردەمەدا، هەندێ زانا پەیدا بوون و بایەخێکی زۆریان بەو زانستە دا، لەوانەش: (ئەبوعەباس خدری کوری عەلی کوری محەمەد سەراجی ئەربلی) ناسراو بە (فەخرەدین)، دواتر ئەربلی بەجێ هێشت و بەرەو بەغدا رۆیشت بۆ ئەوەی گوێ بداتە زانا گەورەکانی، لەوێ لەگەڵ (سۆفیەکان تێکەڵ بوو و پەیوەندییەکی باشی لەگەڵیان بەست، لە دواییش بەرەو (مکة) رۆیی، لەوێ جێگیر بوو و بووە یەکێک لە زاناکانی سۆفیگەری، بەڵکو لە پێشەوەی هەموان بوو لەولایەنەدا، توانی لەوێ وانەی زانستی (سۆفیگەری) بۆ قوتابیانی و خەڵکەکە پێشکەش بکات، هەتا ئەو رۆژەی لە ساڵی (٦٠٨ک/ ١٢١١ز) کۆچی دوایی کرد، (کوری مستەوفی) دەڵێ: (سوڵتان موزەفەرەدین گۆکبری) هەموو ساڵێک، هەندێ شتی بۆ ئەو زانایە دەنارد، بۆ ئەوەی بەسەر خەڵکەکە دابەشی بکات لەوێ، ئەوەش دەبێتە بەڵگەیەک بۆ ئەوەی، کە (سوڵتان موزەفەرەدین گۆکبری)، بایەخێکی زۆری بەو زانستە داوە، هەر ئەوەش وای کرد لە ئەربلدا پێشکەوێ، بەتایبەتی ژیانی ئەو سوڵتانە، زۆر نزیک بوو لە ژیانی (سۆفیگەری) و (زاهیدەکان)، لە ئەربلدا خانەیەکی بۆ سۆفیەکان دروست کرد.

مەشیەخەی (رێبازی سۆفیگەری) دوای پەیدابوونی ئەو زانستە بەدیارکەوت، هەر شێخێک لەوانە دەتوانێ باسی لە هەموو (رێبازی سۆفیگەری) بکات، هەر شێخێک هاوپەیمان و دەرویشی خۆی هەیە لە شار و گوندەکاندا، مەشیەخەی گشتی نەبوو، بەڵکو هەر رێبازێک سەربەخۆیی خۆی هەبوو، یەکێک لەوانەی رێبازی سۆفیگەری بەرێوە دەبرد لە ئەربلدا،: (محەمەدی کوری ئیسماعیلی کوری موسلیمی کوری سلێمان ئەبوحەسەنی سۆفی ئەربلی) ناسراو بە (فەخرەدین)، کە زانایەکی فەرمووده‌زان بوو، هەروەها لە شێخە ناسراوەکانی ئەو کاتە: (ئەبونەجیب عەبدولقادری کوری عەبدوڵلای کوری محەمەدی کوری شەهرەوەردی)، کە فەقیهێکی شافیعی بوو (٥٦٣ک/ ١١٦٧ز)، هەروەها زاهید و واعز و زانایەکی بەتوانا بوو، (ئیبن مستەوفی) بەو شێوەیە وەسفی دەکات: (سۆفییەکی ناودار بوو، هەر لەگەڵ تەمەنی منداڵیدا، حەزی لە خێرکردن و پێشکەوتنی زانست بوو، لە ئەربلدا، خەڵکەکە گوێیان لێ دەگرت، یەکێک لەو زانایانەی کە گوێی لێ دەگرت لە ئەربل: (ئەبوعەبدوڵلای کوری) (٦٣٧ک/ ١٢٣٩ز)، لە ساڵی (٦١٨ک/ ١٢٢١ز) لە ئەربل کۆچی دوایی کرد.

هەروەها یەکێک لەو خێزانانەی کە دەنگ و سەدایان لەلایەنی زانستی (سۆفیگەری و زوهد)ەوە لە ئەربلدا هەبوو، رۆڵێکی باشیان

هەبوو لەلایەنی (سۆفیگەری)دا، ئەویش: (ئەبوحەسەنی کوڕی محەمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موسلیمی کوڕی سلێمان ئەربلی)، کە بە (القنور) ناسراو بوو (٦٢٢ک/ ١٢٣٥ز) ڕۆڵێکی باشی هەبوو لە ئەربل و کۆمەڵێکی باش گوێیان لێ دەگرت، لەوانەش: (ئەبوعەبدوڵلا محەمەدی کوڕی سەعیدی تەبیشی واسیتی) (٦٣٧ک/ ١٢٣٩ز).

لە دادوەرانی ئەربل لەو کاتانەدا، کە بایەخێکی باشی بەو زانستە دابوو، قازی (محەمەدی کوڕی عەلی کوڕی محەمەدی کوڕی جارودی ئەبوعەبدوڵلا مارانی کەفەرعەزی)، کە زانا و متەسەویف بووە، لە سەردەمی (سوڵتان موزەفەرەدین گۆکبر) دادگای لە ئەربلدا بەڕێوە برد، هەر لەو ئەرکە مایەوە تا ڕۆژی کۆچی دواییکردنی لە سالی (٦٢٩ک/ ١٢٣٠ز) تەمەنیشی لە (٨٠) ساڵ زیاتر بوو.

پێشکەوتنی زانستی سۆفیگەری لە ئەربلدا، ئەوە دەسەلمێنێ، کە خەڵکی ئەو شارە و زانایانی بایەخێکی زۆریان بەزانستی سۆفیگەری لە ئەربلدا داوە، تا گەیشتە ئەو حەدەی کە هەندێ جێگایان بۆ پێشوازیکردنی میوانان ئامادە دەکرد، بەتایبەتی ئەوانەی کە سۆفینە، لەوانەش جێگا و خانەقای زانا: (ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی محەمەدی کوڕی یوسفی کوڕی عەبدوڵلای ئەبومحەمەد خەزاعی ئەربلی)، کە تێیدا هەندێ دانیشتنی زانستی ئەنجام دەدرا، زانایەکی زۆر کۆ دەبۆوە، لەوانەش (سوڵتان



موزەفەرەدین گۆکبری)، کە هاتووچۆی ئەو جێگایەی دەکرد و لەگەڵ زانایەکانی کۆدەبۆوە، (ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی ئەبومحەمەد خەزاعی) (٦٣٤ک/ ١٢٣٦ز) یەکێک بوو لە زانا ناسراوەکانی ئەربل لەلایەنی سۆفیگەریدا.

هەندێ لە زانایانی ئەربل، هەندێ ڕێگا و شێوازیان بەکار هێنا بۆ ئەوەی لە دەسەڵاتداران نزیک ببنەوە، بۆ نموونە شاعیر: (حسامەدین عیسای کوڕی سەنجەری کوڕی بەهرامی کوڕی جبرائیل) ناسراو بە (حاجری) (٦٣٢ک/ ١٢٣٤ز) لە ساڵی (٦٢٦ک/ ١٢٢٨ز) لە قەڵای ئەربل زیندانی کرابوو، هەر لەو کاتەی کە لە زیندان ئازاد کرا، ڕێگای و تەریقەتی سۆفیگەرێتی بۆ خۆی هەڵبژارد و بووە (سۆفی) و پەیوەندیی کرد بە خزمەتی (سوڵتان موزەفەرەدین گۆکبری) لێی نزیک بۆوە و جلوبەرگی گۆڕی و بەتەواوی بوو بە (سۆفی).

ئەوەش بەڵگەیەکە، کە زانستی سۆفیگەریەتی هەر لەلایەن زانایان نەگیرسایەوە، بەڵکو هەندێکیان ئەدیب و شاعیر بوون، وەکو: (حوسێنی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حوسێنی کوڕی شەرەفەدینی هەزبانی کووراتی ئەربلی) (٦٥٦ک/ ١٢٥٨ز) کە لە مەزهەبی شافعی بوو، هەروەها لەوانە بوو، کە ڕێگای سۆفیگەریەتی و زاهیدی گرت، هەروەها لە زانا و شاعیر و ئەدیبانی ئەربل لەو کاتەدا کە ناسرابوو: (عەلی کوڕی عوسمانی کوڕی سلێمان ئەمینەدین سلێمانی ئەربلی) (٦٧٠ک/ ١٢٧١ز) لە ئەربل لەدایک بووە، لە سەرەتای تەمەنیدا سەرباز بوو، لە دواییش وازی لێ هێنا و بووە یەکێک لە مەشایخەکانی سۆفیگەری.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

إبن خلدون.

بۆ زیادکردنی زانیارییەکان لەبارەی فەرمووده و فیقه، بڕوانە: إبن خلدون: ن. م، ٤٤٠-٤٤٥، حاجي خليفه: كشف الظنون، ١٠/ ١١٠، ٦٣٥، عبدالمنعم ماجد: تاريخ الحضارة الإسلامية، ١٦٩، ١٧٤.

القرآن الكريم: سورة التوبة، ١٢١.

إبن ماجة: د. م، ١٩٥٤، ١/ ٨١.

أبو الفتح عبدالوهاب بن محمد إبن الحسن المقرئ، لە گوندەکانی عێراقە و دەکەوێتە سەر ئاوی فورات و ناوی مالکییە، کە لە ساڵی ٥٥٦ک/ ١١٦٠ز لە کتێبێکیدا کۆی کردۆتەوە، کە (٤٠) فەرموودە.

إبن المستوفي: ن. م، ١٠/ ٣٠٩.

جاوانی: بۆ هۆزێکی کورد دەگەڕێتەوە، کە لە شاری (حلە) جێنشین بوون، بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەو مەسەلەیە سەیری: د. مستەفا جەواد: جاوان هۆزێکی کوردی لەبیر کراوە، ناسراوەکانی هۆزی جاوانی، بەغدا، ١١٧٣/ ٩، ٤٤٠٩، جەمیل رۆژبەیانی: جاوان، وتارێکە لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ بلاو بۆتەوە، ژ ١١١، ساڵی ١٩٨٦، ٣٥، ٤٢.

الطبقات الشافعية الكبري: ٤٠/ ٨٨.

إبن خلكان: وفيات الأعيان، ٢/ ٤٤٨.

إبن خلكان: ن. م، ٣/ ٣٥٣ - ٣٥٥.

ن. م، ٣/ ٣٥٦ - ٣٥٧.

الصفدي: الواقي بالوقيات، ١٩٧٤، ٤/ ١٥٥، السبكي: طبقات الشافعية الكبرى، ٤/ ٨٨، الأسنوي: طبقات الشافعية، ١/ ٣٦٧.

خەفتیان: دوو قەڵای گەورەیە، لە کارەکانی ئەربلە، یەکێکیان لەسەر رێی (مراغ) پێی دەڵێن: خەفتیانی زرزاری لەسەر لێوی شاخێکە، زێی گەورە بە بنیدا دەڕوات، ئەوەی دیکە: خەفتیانی سدخاب کوری بەدر، لەسەر رێی شارەزوورە، بەڵام ئەوەیان گەورەترە.

ياقوت الحموي: البلدان، ٢/ ٣٨٠، إبن عبدالحق: مراصد الإطلاع، بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: د. حسام الدين النقشبندي: اذربيجان، ١١٧، أحمد عبد العزيز: الهذبانيون، ٣٦هـ، ٤٩هـ (٣).

السيوطي: بغية الرعاة، ١/ ١٨٣، محسن محمد حسين.

السيوطي: ن. م. ص.

السبكي: ن. م. ص.

غبن عساكر: تهذيب تاريخ دمشق، بيروت، ١٩٧٩، ١٦٩، إبن خلكان، وفيات الأعيان، ٢/ ١١، محسن محمد حسين: أربيل، ٢٨٦.

إبن خلكان: ن. م، ١٥/ ١٠.

إبن خلكان: ن. م. ص، الصفدي، الواقي بالوقيات، ١٣/ ٣٢٧، إبن العاد الحنبلي: شذرات الذهب، ٥/ ٨٦.

حاجي خليفة: كشف الظنون، ١/ ٧١٥، إسماعيل باشا البغدادي: إيضاح المكنون في الذيل علي كشف الظنون عن الكتب والظنون، استنبول، ١١١٢٧، ١/ ٤٣٠، هدية العارفين، ١/ ١١١، الزركلي: الإسلام، بيروت، ١٩٧٩، ٢/ ٣٠٧.

تهذيب تاريخ: دمشق الكبير، ٥/ ١٦٨.

إبن خلكان: وفيات الأعيان، ٢/ ١٠.

لەمەوبەر لەم لێکۆڵینەوەیە سەبارەت بەم زانستە قسەمان کردووە ٦٤/ ٦٥.

مرو: یەکێکە لە شارەکانی خراسان، ياقوت الحموي: ن. م، ٣/ ٢٤٦.

بخاری: یەکێکە لە شارەکانی دوای زێ، ياقوت الحموي: ن. م، ١٠/ ٣٥٣.

السمعاني: الأنساب، ١/ ٧٢، إبن الأثير، أسباب في تهذيب الأنساب، ١/ ٤٠، إبن المستوفي: تاريخ أربل، ١/ ٢٦٥ - ٢٦٧، الصفدي، الواقي بالوقيات، ١٣/ ٤٦٣، الأستوي: طبقات الشافعية، ١/ ١١٩.

إبن المستوفي: ن. م، ١/ ١٠ - ٩٤.

إبن الشعار: عقود الجمان، ١٥ /٣٠٩ب.

المنذري: التكملة لوقيات النقلة، ٣/ ١٣، إبن الشعار: ن. م. ص، الذهبي، المختصر المحتاج إليه، ١/ ٢٦٠، محسن محمد حسين: أربيل، ٢٨١/ ٢١٠.

إبن المستوفي: تاريخ أربل، ٢/ ٣١٥ - ٣١٦، المنذري: ن. م. ص، إبن الساعي

الخازن الأستوي: طبقات الشافعية، ١/ ١٢٥.

إبن الكثير: البداية والنهاية، ١٣/ ٤٢، كحالة: معجم المؤلفين، ١٩٥٧، ٨/ ٦٥.

إبن الشعار: ن. م. ص.

قەبری زاهید: أحمد زرزار بۆ شێخ ئەبوعەباس ئەحمەدی کوری عوسمانی کوری ئەبی عەلی کوری مەهدی کوردی زرزارە (ت ٥٩١هـ/ ١١٩٤م) دەگەڕێتەوە، ئەو قەبرە دەکەوێتە ناو شارۆچکەکە، کوری مستەوفی لە چەند بابەتێکدا باسی شاردنەوەی زاناکانی کردووە، تاريخ اربل، ١/ ٣٩، ٤٦، بروانە محسن محمد حسين، ن. م/ ٢٢٥، ٢٨٩، د. حسام الدين النقشبندي، اربل، ١٤٦.

مارانی: دەگەڕێتەوە بۆ خێزانی ماران، کوری خەلەکان لە (الوفيات) (٢/ ٤٠٧) باسی دەکات دەڵێ: ولاتیان لە مروج لە بن مووسڵە، بەڵام ئەوەی دیارە خێزانی ماران لە خێزانێکی زانستی ئەربیلە، کە ئەربیلیان بەجێ هێشت و بەرەو جێگای دیکە رۆیشتن بۆ وەرگرتنی زانست، إبن المستوفي، تاريخ، أربل، إبن الشعار: عقود الجمان، ئەوەی ئەوە تەئکید دەکاتەوە کە باوکی ئەو زانایە: ئەبا قاسم محەمەدی کوری عەبدولەلیکی کوری عیسای کوری درباس، لە ئەربل لەدایک بووە، بۆ هۆزێکی کوردی دەگەڕێنەوە، بەشێکن لە هەزبانییەکان، گوندی (کانی ماران) هەیە، کە دەکەوێتە قەزای رانیە/ هەولێر، ئەگەری ئەوە هەیە، کە ئەوانە خەڵکی ئەو گوندە بن، محمد أمين زكي: مشاهير الكورد، ٢/ ٦٠.

إبن خلكان: وفيات الأعيان، ٢/ ٤٠٦، السبكي: الطبقات الشافعية الكبري، مخطوط في مكتبة الدراسات العليا، جامعة بغداد، رقم ١٤١٠، السيوطي: حسن المحاضرة، ١/ ٤٠٨.

إبن خلكان: م. ن. م، ٢/ ١٠، الغساني: المسجد المسبوك، ٣٠٧، محمد

أمين زكي، محسن محمد حسين: أربيل، ٢٤٨.

ئەبو ئیسحاقی شیرازی: شێخ ئەبوئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی یوسفی شیرازی، کە بە (جەمالەدین) ناسراو بوو، لە ساڵی (٤٧٦ک/ ١٠٨٣ز)، لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە، إبن خلكان: ن. م، ١/ ٢٩ - ٣١.

إبن خلكان: ن. م، ٢/ ٤٠٧، إبن الفرات، تاريخ إبن الفرات.

ياقوت الحموي: البلدان، ٥/ ١٧٦، إبن عبدالحق: مراصد الاطلاع، ٣/ ١٢٩٩.

ئەو خێزانە دەگەڕێتەوە بۆ گوندێک بەناوی (القاضيه)، دەکەوێتە نێوان ئەربل و مووسڵ بە زمانی تورکمانی قسە دەکەن، بنەچەیان بۆ فەقیە: رضى الدين يونس بن محمد الاربلى دەگەڕێتەوە.

بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە بۆ محسن محمد حسين: أربيل.

المنذري: إبن خلكان: وفيات الأعيان، إبن القاضي: طبقات الشافعية، محسن محمد حسين: ن. م، ٢٨٢، ناجي معروف.

وفيات الأعيان: ٣٠/ ٣٨٥.

تاريخ أربل: ١/ ١١.

إبن خلكان: ن. م. ص.

إبن خلكان: ن. م. ص، إبن الورد.

إبن الأثير: الكامل، ١٢/ ٢١٨، محسن محمد حسين: أربيل، ٢٨٢.

إبن خلكان: ن. م، ٣/ ٣٨٦، أبوشامة، ذيل علي روضتين.

المنذري: التكملة لوفيات النقلة، إبن خلكان، وفيات الأعيان، محسن محمد حسين: أربيل، ٢٥١.

إبن خلكان: ن. م. ص.

الصفدي: الواقي بالوقيات، البسكي: طبقات الشافعية الكبري، محسن محمد حسين: ن. م، ٢٨٦.

الذهبي: دول الإسلام، ٢٥/ ١٧٣.

إبن خلكان: وفيات الأعيان، ٢/ ٣٩١ - ٣٩٣.

إبن المستوفي: تاريخ أربل.

إبن الغوطي: ن. م، ٥: ١/ ١٨٠.

ئەبو عەمرۆ کوڕی سەلاح بن عوسمان عەبدولڕەحمان ئەلکوردی ئەلشەرخانی ئەلشەهرەزووری.

إبن خلكان: ن. م، ٢/ ٤٠٨.

نجم الدين البـاذرائي: نەجمەدین ئەبومحەمەدی کوڕی ئەبی وەفای کوڕی عەبدوڵڵای عوسمان باذرائی بەغدایییە.

محي الدين النواوي.

اليونيني: ن. م، ٢/ ٤٧١.

الذهبي: دول الإسلام، ٢/ ١٧٣، طبقات الشافعية الكبري، ٥/ ٥٦.

إبن خلكان: وفيات الأعيان، ٢٥/ ٣٣١ - ٣١٣، الشيخ هبة الله بن المكرم الصوفي البغدادي.

إبن المستوفي: تاريخ أربل، ١/ ٤٥٢/ ٦١١.

ئەم خێزانە بۆ گوندێکی هەولێر دەگەڕێنەوە و بنەچەیان کوردە، بڕوانە: محسن محمد حسين: أربيل، ٢٧١، زبير بلال إسماعيل: إبن خلكان، بغداد، ١٩٧٩، ١٨ - ٢١.

تاريخ أربل: ١/ ٣٢١.

إبن المستوفي: م. ص، ينظر، ٢/ ٨٦هـ.

اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ٤/ ٢٣٤.

الذهبي: العبر في خبر، ٥/ ٣٤٥، إبن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ٥/ ٣٨٤.

بركلمان: دائرة المعارف الإسلامية (مادة بن خلكان) جرجي زيدان، تاريخ آداب اللغة العربية، محمد أمين زكي، مشاهير الكورد، محسن محمد حسين: ن. م. ص.

محسن محمد حسين: أربيل، ٢٥٥.

إبن المستوفي: تاريخ أربل، ١/ ١٥١، ١٦٢.

إبن المستوفي: ن. م، ١/ ١٢٦، ١٧٢، ١١٢.

إبن خلكان: وفيات الأعيان، ١/ ١٧٦.

الزركشي: ن. م، ١/ ١٢، حاجي خليفة، محمد أمين زكي، مشاهير الكورد، ١/ ٢٠٠.

السيوطي: الاتقان في علوم القرآن.

إبن المستوفي: تاريخ أربل، ١/ ٣٨١.

زرزاری هۆزێکی کوردین لە هەولێر نیشتەجێ بوون، کە لقێکن لە لقەکانی هەزبانی.

إبن المستوفي: ن. م، ١/ ٣٨.

إبن المستوفي: ن. م، ١/ ٣٨ - ٣٩.

الأستوي: طبقات الشافعية، ١/ ١٥٤، إبن العماد الحنبلي.

علم التجويد: هو علم باحث عن تحسين تلاوة القرآن.

إبن خلدون: المقدمة، ٤٦٧، حاجي خليفة.

إبن الغوطي: تلخيص مجمع الآداب.

إبن المستوفي: ن. م، ١/ ١٨٦.

سبط إبن الجوزي: مرآة الزمان، ٨/ ٦٨١.

جرجي زيدان: تاريخ المدن الإسلامي.

إبن الغوطي: تلخيص مجمع الآداب في معجم الألقاب.

إبن الدبيشي: ذيل تاريخ مدينة الإسلام.

إبن المستوفي: ن. م، ١٥/ ٢١٢ - ٢١٥.

إبن الشعار: عقود الجمان، ٧/ ٢٢.

إبن المستوفي: ن. م، ١/ ٢١٧.

إبن خلكان: وفيات الأعيان.

المقريزي: السلوك، ٢/ ٦٠٤، الجواشاري: روضات الجنان، إبن الشغري البردي: النجوم الزاهرة، محمد أمين زكي: مشاهير الكورد، ٢/ ٧٢.

■ و: نەجات خۆشناو

# هەولێر
# لە رووبەڕووبوونەوەی مەغۆڵەکاندا

**دکتور نەهلە شەهاب ئەحمەد**
**کۆلیژی ئاداب - زانکۆی موسڵ**

**ناو**

**(اربل):** بە (کەسرە) بوونی (ئەلف و با) و (ساکین) بوونی (رێ و لام) لەسەر کێشی (إثمد)، لە (اربل) هاتووە، کە جۆرە دارێکە. بۆچوونی تریش هەیە دەڵێت لە: (الربال) هاتووە، کە بەروەکێکی چڕو پڕو زۆر بەیەکداچوو و درێژ دەوترێت. جا لەبەر بەپیت و فەری خاکەکەی و بوونی روەکێکی زۆر لەوانەیە هەندێ لە خەڵکەکە بەو ناوەیان ناوبردووەو پابەند بوونە پێی، وێڕای ئەوەی بەدرێژایی رۆژگار گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە[1].

(ناوی ئوربل، ئوربللیوم، ئوربیللا، ئاربەئیللو، ناوێکی سۆمەرییە و لە هەزارەی سێیەمی پ.ز لە بەڵگە نووسراوەکان ناوی هاتووە. (ئ. هـ).

**هەولێر لە سەردەمی مەغۆلییەکاندا**

شاری هەولێر کەوتۆتە نێوان هەردوو زێی گەورەو بچووک[2]. (حەمەوی ٦٢٦ک/ ١٢٢٨ ز کۆچی دوایی کردووە) باس لە بابەتەکانی لێکۆڵینەوەکەمان دەکات و بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا باس لە شاری هەولێر دەکات، کە خۆی سەردانی کردووە، بەوەی شارێکی گەورەیەو زەوییەکەی بەرفراوانەو درێژییەکەی شەست و نۆ پلەو نیوە[*]، پانییەکەی سی و پێنج پلەو نیوە. قەڵاتێکی هەیە کەوتۆتە سەر گردێکی بەرزو لە خۆڵ دروست کراوە، لەدەوروبەری چاڵێکی قووڵ هەڵکەندراوەو بەبازاڕو خانوو ئاوەدان کراوەتەوە، مزگەوتی نوێژکردنی تێدایەو بەقەڵاتی حەلەب دەچێت. بەڵام لەو گەورەترو بەرفراوانترە. لەچێوەی ئەو قەڵاتە شارێکی گەورەو پان و بەرین کە بەشووره و خانووبەردو بازاڕ و قەیسەری نۆژەن کراوەتەوەو میر موزەفەرەدین گوگبری بنیاتی ناوە. مەبەستی موزەفەرەدین هەژارەکان بووە، کە زۆربەیان تیایدا نیشتەجێ بوون و تا وای لێ هات بوو بەشار. زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن و زۆر لەقەڵاتەکانی دەوروبەری هاتنە ئەو شارە. نە رووبار و نە دارستان لە دەوروبەری ئەو شارەدا نییە. زۆربەی جووتیارەکان پشت بەئاوی کاریزەکان دەبەستن. خەڵکەکەش ئاوی شیرین دەخۆنەوە، کە هیچ جیاوازییەک نییە لەنێوان ئاوی دیجلەو ئەو ئاوەی ئەوان بەکاری دەهێنن لەرووی شیرینی و سووکییەوە، میوەش لە ناوچە شاخاوییەکانی دەوروبەری بۆی دێت[3].

ژمارەیەک لە گەورە زانایانی زانست و فەرمووده ناسەکان خەڵکی ئەو شارەن، لەوانە ئەبو ئەحمەد ئەلقاسم کوڕی موزەفەری شارەزووری شەیبانی هەولێری و...هی تر[4].

**نەژاد و نیشتمانی مەغۆلییەکان**

هەروا سانا نییە کە بتوانین

نەژادی مەغۆلەکان دیار بکەین، هەندێ لە سەرچاوە ئیسلامییەکان دەڵێن ئەوانە لە تورکەکانن[٥]. دەشێ ئەوە بڵێین مەغۆلییەکان هۆزێک بوونە لەنێوەندی ژمارەیەک هۆزداو بەهەموویان وتراوە مەغۆل، هەروەها دەشێ تاکێ لەو هۆزانە دەسەڵاتی خۆی بەسەر تەواوی هۆزەکاندا سەپاندبێ[٦]. ئەمەو ئەو کۆمەڵە هۆزانە هەر هەموویان لە تورکەکانن[٧]. هەروەها بەتەتەریش ناسراون. لای یۆنانییە کۆنەکانیش بەناوی (سکیشیا) یان (سکونیا) ناسراو بوون[٨].

نیشتمانی رەسەنی مەغۆلەکان بانی مەنگۆلیایە کە لە ناوەراستی ئاسیا بۆ باشوور، لە دەشتی سیبیریا بۆ رۆژئاوا، لە مەنشوریاو باکووری بیابانی (کوی) و بەرزاییەکانی (تبت) بۆ رۆژهەلات لە تورکستان درێژ بۆتەوە[٩]. بەشێوەی رەوەند ژیانیان گوزەر کردووەو هاوکات خوێنیان بەیەکیانی بەستوونەتەوە، لەکاتی ئاشتیدا ژیانیان لەسەر راو و بەخێوکردنی مەرو مالات بووە، بەلام لەکاتی جەنگدا کاریان دزی و تالانکردن بووەو بەمەوە ژیانی خۆیان گوزەر کردووە[١٠].

هەروەها هەندێ جار وا رێکەوتووە کۆمەلێ لەو هۆزانە دەسەلاتیان بەسەر هەندێ هۆزی دیکەدا رۆیشتووە، یان هاوپەیمانییان لەگەڵ یەکدا بەستووە، مەبەستیان لەو کارە دزی و کۆنترۆلکردنی هۆزەکانی دیکەی جیا جیا بووە بۆ دەست بەسەرداگرتنی سەروەت و سامان و مەرو مالاتەکەیان. جا کاتێ هۆزەکان یەکتریان دەگرت یان هاوپەیمانییەتێکیان دەبەست یاخود یەکێ لە سەرۆک هۆزەکان هۆزەکانی دیکەی دەهێنا ژێر دەسەلاتی خۆی، ئەوسا چەکدارەکانی ئەو هۆزانە یەکیان دەگرت و رێکخستنێکی سەربازییان پێکدەهێناو لەژێر فەرمانی یەک سەرکردە کاریان دەکرد. هەروەکو جەنگیزخان تەواوی هۆزەکانی هێنایە ژێر دەسەلاتی خۆی، خودی خۆی سەرکردایەتی کردن[١١].

## سەرکوتکردن و داگیرکردنی مەغۆلییەکان

ولاتانی رۆژهەلاتی ئیسلامی لە سنووری سالی (٦١٥ک- ١٢١٨ ز) رووبەرووی هێرشی مەغۆلییەکان بوونەوە. لەلایەنی چین مەبەست ولاتی تورکستانە بۆی دەرچوون پاشان پەرینەوە بۆ میزۆپۆتامیا، هەندێ لە گروپەکانیان پەرینەوە بۆ خوراسان تا گەیشتنە رەی و هەمەدان و خستنیانە ژێر کۆنترۆلی خۆیان. دواتر بەسەرکەوتن بۆ ئازربایجان و لە سالی (٦١٨ک- ١٢٢١ز) دەوری (موراغە)ی پایتەختی هەرێمەکەیان دا و ئەوسا ئافرەتێک حوکمرانی دەکرد، کە لەقەلاتی (رواندز) نیشتەجێ بوو، مەغۆلییەکان گەمارۆیان دا و بۆسەیان لە دەوروبەری دانایەوە، دەستیان کرد بەبۆردومانکردنی، بەلام خەلکی شارەکە مەغۆلییەکان ملکەچ نەبوون بۆ، بەلکو بەمەبەستی بەرگریکردن لەشارەکەیان لەدژی مەغۆلییەکان جەنگان. شایانی باسە مەغۆلییەکان کە زانییان هیچیان بۆ ناکرێ بەرەو شارەکە کشان و موسلمانە دیلەکانیان کردە قەلغانی مرۆیی و لەپێشەوەیان دانان. ئەوە بوو پاش چەند رۆژێک بەسەر گەمارۆکەدا توانییان بەزۆر بچنە ناو شارەکە. ئینجا دەستیان کرد بەکوشتنی خەلکەکەو ئەوەی بەکەلک هات دزییان و ئەوەی مایەوەش سووتاندیان، لەوانەی کە خۆیان حەشاردابوو کەس رزگاریان نەبوو. چونکە مەغۆلییەکان ئەمجارە فێلێکی دیکەیان بەکارهێناو دیلە موسلمانەکانیان ناچار کرد، کە فێلێک بکەن، کە بلاویان کردەوە، کە مەغۆلییەکان شارەکەیان جێهێشت و گەرانەوە. جا دوای ئەوەی ئەوانەی خۆیان حەشاردا بوو دەرچوون، مەغۆلییەکان هەر هەموویان کوشتن[١٣].

دواتر دەولەتی خوارزمییەکان لەگەلیان کەوتنە جەنگ تا وای لێ هات سنوورەکەی بەزاندو باکووری دوورگەی فورات لەهەموو ناوچەکان زیاتر رووبەرووی هێرشەکان بووەوە، هەر بەهۆی ئەوەوە سامانی ئەیوبییەکانیش کەوتە مەترسییەوە[١٤].

هەولێر رووبەرووی ئەم هێرشە بۆوە، چونکە بەیەکێ لەو دەروازانە دادەنرا کە پارێزگاری لە دوورگەی

فورات بکات. لە سالّی (٨١٦ك- ١٢٢١ز) هەولێر نزیک بوو رووبەرووی هێرشەکانیان بێتەوە[١٥] تا گەیشتنە کرمانشان، کە نزیکە لە سنووری عێراق. ئەوە بوو بۆچوونی خۆیان بۆ ئەو هێرشبردنە گۆڕی، کە ئەوسا موزەفەرەدین گۆگبری حاکمی بوو چونکە بەتەواوی خۆیان ئامادە کردبوو بەرپەرچی هێرشەکانیان بدەنەوە. نووسراوێکی بۆ حاکمی موسڵ بەدرەدین لوئلوئە نارد فریای بکەوێت، ئەویش بەتەنگ داواکەی هات و هەڵبژاردەیەکی سەربازی بۆ نارد. موزەفەرەدین ئەو هەڵبژاردە سەربازییەی لەسەر ڕێگاو بانەکان بلاوە پێکرد بەمەبەستی پاراستن و لەهەمان کاتدا ئەو ڕێگایەی بۆ مەغۆلەکان خستە سەرپشت[١٦] وا دیارە مەغۆلەکان ڕای خۆیان بۆ ئەو هێرشبردنە گۆڕیوە بەهۆی سروشتی جوگرافی ناوچەکەو ئەستەمی ڕێگاوبانە شاخاوییەکانی[١٧].

خەلیفە ناسر لیدینیللا (٥٧٥- ٦٢٢ك/ ١١٨٠-١٢٢٥ز) نووسراوێکی بۆ هەموو میرەکان نارد، موزەفەرەدین گوگبری حاکمی هەولێرو بەدرەدین لوئلوئە حاکمی موسڵ و شا ئەشرەف موسا[١٨] حاکمی (خەلات) و (میافارقین) و وڵاتی ئەرمەن[١٩]، فەرمانی پێکردن لەگەڵ هێزەکانیان لەشاری (داقوقا) کە کەوتۆتە نزیکی هەولێر ئامادە بن بەمەبەستی بەرپەرچدانەوەی هێزەکانی مەغۆل بۆ عێراق. هەردوو حاکمی هەولێرو موسڵ بەهێزە سەربازییەکان و خۆ بەخشەکان گەیشتنە (داقوقا)[٢٠]، بەلام شا ئەشرەف پۆزشی هێنایەوە بەبیانووی ئەوەی سەرقاڵی ڕزگارکردنی براکەیەتی (کامل) کە حاکمی میسرەو فەرەنگییەکان لە شاری دمیات گەمارۆیان داون[٢١].

ژمارەیەک میر لەگەڵ (قشتمر) کە لە عێراق گەورەترین میر بووە و بەیاوەری (٨٠٠) هەشت سەد سوارچاک و لەپێشەوەیان حاکمی هەولێر موزەفەرەدین بوو کۆبوونەوە بۆ پێشوازیکردن لە خەلیفە، کە بۆ داقوقا دەهات. کاتێ موزەفەرەدین چاوی بەکەمی سەربازەکانی کەوت هێرشی نەبرد، لەو قسەیەدا جەخت دەکاتەوە: (کاتێ خەلیفە مەبەست لێرە تەتەرە ناردبوو رووبەرووی هێرشی مەغۆلەکان بێتەوە پێم گوتوون، دوژمن بەهێزەو ناتوانم بەو سەربازە کەمە رووبەروویان ببمەوە، دە هەزار سوارچاکی کۆکردەوەو بانگهێشتی جەنگ کراو ئەوەی لەوڵات بوو کۆکرایەوەو فەرمانی پێکردم ڕێگا بگرمە بەرو لەهەمان کاتدا بەڵێنیشی دا، کە سەربازەکان دەگەن. بەلام کە ڕۆیشتم لەو ٨٠٠ کەسە زیاتر کەسی تر نەگەیشت. بینیم ژیانی خۆم و موسڵمانەکان لە مەترسیدایە)[٢٢]. کاتێ مەغۆلییەکان گوێبیستی ئەوە بوون هێزی موسڵمانەکان لەئامادە باشیدان بەشکستی هێنان پاشەکشەیان کردو مەزەندەیان وا ڕۆیشت کە هێزی موسڵمانەکان دوایان دەکەوێت و پێیان دەگات. بەلام هێزی موسڵمانەکان کاتێ زانییان هێزی مەغۆلییەکان مەبەستیان ئەوان نییەو پاڵپشتی سەربازیش لەلایەن خەلیفەوە پێیان نەگەیشت، هەموویان بۆ وڵاتەکانیان گەڕانەوە[٢٣]. لەم بارەوە ئیبن خەلدون دەڵێت: (فخافوا عن لقاء التتر- وخاف التتر عن لقائهم وساروا الی همذان)[٢٤].

مەغۆلەکان لەساڵی ٦٢٨ك- ١٢٣١ ز لەپشت جەلالەدین خوارزم شاه، کە بەهۆی جەنگەوە هەلات بۆ دیاربەکر، هاتنە پێشەوە[٢٥]. دەرەنجامی هەلاتنەکەی و کوشتنی لەنیوەی مانگی شەوالی ساڵی ٦٢٨ك- ١٢٣١ز، کاریگەرییەکی زۆری هەبوو بۆ کردنەوەی دەرگا لەبەردەم مەغۆلییەکان و هاتنیان بەرەو وڵاتی جەزیرەو دەستگرتن بەسەر شارەکانیدا[٢٦]. لەوانە گروپێکیان روویان لە هەولێر کردو بەدرێژایی هاتنیان لە ڕێگا، سیاسەتی کوشتن و دزین و تالانکردن و کاولکردنیان گرتەبەر. بارەکە شڵەژاو ترس پەیدا بوو، تا وای لێ هات یەکێ لەدانیشتوانی گوندە کوردییەکان نەیانتوانی رووبەروویان ببنەوە. لەبەردەم ئەم ترسە حاکمی هەولێر موزەفەرەدین پەیوەندی بەحاکمی موسڵ بەدرەدین لوئلوئە کردو داوای لێ کرد فریای بکەوێ و بەرپەرچی

مەغۆلەکان بداتەوە، بەدرەدین بەتەنگ داواکەیەوە هات و بەخۆی و سوپاکەی بەرەو هەولێر هاتن و سوپاکەیان کردە یەک بۆ شەڕکردن لەدژی مەغۆلەکان. بەڵام مەغۆلەکان وەک پیشەیان کاتێ گوێبیستی ئەوە بوون موسڵمانەکان لەئامادە باشیدان لەدژیان شەڕ بکەن، پاشگەز بوونەوەو روویان لەئازربێجان کرد[٢٧].

لەساڵی ٦٢٩ک/ ١٢٣١ ز گروپێک لە مەغۆلەکان هاتنە پێشەوەو گەیشتنە شاری شارەزوور. لەو کاتەدا خەلیفە داوای لەحاکمی هەولێر موزەفەرەدین کردو سوپای خەلافەتەکەی بۆ نارد، ئەمەو هەردوو سوپاکە بەرێکەوتن بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ مەغۆلەکان بکەن، بەڵام مەغۆلەکان لەپێشیان هەڵاتن بەبێ ئەوەی شەڕ لەنێوانیاندا رووبدات. پاشان موزەفەرەدین نەخۆش کەوت هێزەکەی گەڕایەوە هەولێر، مەغۆلەکانیش گەڕانەوە وڵاتی خۆیان[٢٨].

حاکمی هەولێر موزەفەرەدین مردو هیچ کوڕێکی لەپاش بەجێ نەما خەلیفە موستەنسیر (٦٢٣-٦٤٠ک/ ١٢٢٦-١٢٤٢ ز) راسپارد، نوێنەری خۆی ناردو دەسەڵاتی هەولێری گرتە دەست و هەڵسووڕاندنی کارەکانی لەئەستۆ گرت[٢٩].

لەساڵی ٦٣٣ک- ١٢٣٥ز مەغۆلەکان بۆ جارێکی تر هێرشیان کردەوە سەر شارەکانی جەزیرەو ئەمجارە شاری هەولێریش بەرکەوت، بەڵام شاری هەولێر زۆر بەتوندی بەرپەچیان دایەوەو زیانێکی زۆری گیانییان بەکوژراو لە سوپای مەغۆل دا. پاشان روویان کردە موسڵ و لەگوندی (ترجەلا) و (کرملیس) دابەزین[٣٠]. یەکێ لەو شارانەی جەزیرە، کە بەر هێرشی مەغۆلەکان کەوت شاری شنگال بوو، کە والییەکەیان زەهرەدین کوڕی کەمالەدین موهاجیر لە دەروازەی شار کوشتیان و لەپاشان خوێن رشتن و کاولکارییەکی زۆریان بەخەڵکی شارەکەو شارەکە گەیاند[٣١].

لەساڵی ٦٣٤ک-١٢٣٦ ز مەغۆلەکان بە مەنجەنیق هەولێریان گەمارۆداو سوارچاکەکانیان بەزۆر هاتنە ناو شارو، پیاوەکانیان کوشت و دەستدرێژییان کردە سەر ئافرەت و منداڵەکانیان و خەڵکیش لە قەڵات مانیان گرت[٣٢] یەکێ لەوانە شەرەفەدین مستەوفی بووە، قەڵات بۆ ماوەی چل رۆژ گەمارۆدرا، لەو ماوەیەدا خەڵکێکی زۆر لە دانیشتوانەکەی بەهۆی برسێتی و بێ ئاوی و تەلەزمی مەنجەنیقەکان شەهید بوون[٣٣] خەڵکەکە ناچار بوون تەرمی مردووەکانیان بسوتێنن یان فڕێیان بدەنە ناو رووبار لەترسی ئەوەی نەوەکو خەندەقی چوار دەوری قەڵا پڕبێتەوە و سەرەنجام مەغۆلەکان بە ئاسانی بتوانن بێنە نێو قەڵاوە[٣٤]. لە ئەنجامدا مەغۆلەکان ئارامیان نەماو گەمارۆکەیان لەسەر قەڵات لاداو لەمانگی زیلحەجەی ساڵی ٦٣٤ک-١٢٣٦ ز لە هەولێر کشانەوە. سەرچاوەکان زۆر هۆکاریان دەربارەی هەڵوەشاندنەوەی ئەو ئابلۆقەو گەمارۆیە باس کردووە. یەک لەهۆکارەکان باری نالەباری کەش و هەواو هاتنی شەپۆلی سەرماو سۆڵی توند بووە لەوەرزی زستاندا. هۆکاری دووەم: ناردنی سوپایەکی گەورە بووە لەلایەن خەلیفە موستەنسیربیللا بۆ رووبەڕووبوونەوەیان[٣٥] سێیەمین هۆکاریش: کۆکردنەوەی پارەو پوولێکی زۆر بوو[٣٦]. بەڵام ئەو هۆکارەی کە نزیکە لەڕاستی باری سروشتی قەڵات و سەرەڕای ئەو بەرهەڵستکارییە گەورەیە بوو، کە چەکدارەکان بەسەرکردایەتی جێگری خەلیفە شەمسەدین باتکین بەرپرسی قەڵات ئەنجامیاندا[٣٧] و خەلیفەش پاڵپشتی کردن بەناردنی سوپا بۆ هەولێر بەسێ دەستە. دەستەی یەکەم بەسەرکردایەتی شەمسەدین ئەسلان لەگەڵ سێ هەزار خەباتگێڕ. دەستەی دووەم بەسەرکردایەتی موجاهیدودین ئیبک ئەلدویدار. دەستەی سێیەم بەسەرکردایەتی شەرەفەدین شەرابی.. فتوای زاناکان و فەقیهەکانیش، کە لەو ساڵەدا دەریانکرد جیهادیان واجب کردو بەسەر حەجکردنی ماڵی خوایاندا

فەرز كرد بۆ كوشتن و بەدەرنانی كافر و داگیركەران ئەمەش ترسی خستە ناخی مەغۆڵەكانەوە[٣٨].

بۆ جارێكی ترو سەرلەنوێ لەساڵی دواتر ٦٣٥ك- ١٢٣٧ ز مەغۆڵەكان گەڕانەوە بەهەولێ ئەوەی دەست بەسەر هەولێردا بگرن، بەڵام حاكمی هەولێر شەمسەدین باتكین بۆ رووبەڕووبوونەوەیان لەئامادەباشیدا بوو. سوپاكەی لە دەرەوەی شاری هەولێر بڵاوە پێكرد بەمەبەستی پاسەوانیكردن، كاتێ مەغۆڵەكان هەستیان بەوە كرد شارەكە پارێزراوە، لە هێرشبردنەكە رای خۆیان گۆڕی و روویان كردە شاری داقوقا[٣٩]. كە بەشێكی زۆری خەڵكەكە لەترسان شارەكەیان جێهێشت و روویان لە ناوچەكانی دیكە كرد، لەوانە هەندێكیان چوون بۆ شاری بەغدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی كرێی خانوو بەرز بێتەوە، خەلیفە بەمە بێزار بوو فەرمانی بەوتارخوێنی مزگەوتەكان كرد خەڵك هان بدەن بۆ جیهادكردن لەدژی داگیركەران. خەڵكەكەش بەتەنگ داواكە هاتن و ئەمەش بە خراپ بەسەر مەغۆڵەكاندا شكایەوە، بۆیە پاشەكشە كردنیان بەچاك زانی و روویان كردە ناوچەكانی زەنگاباد و سامەڕا[٤٠].

هێرشی مەغۆڵەكان بۆ سەر هەولێر وەستا، پاش ئەوەی هەوڵەكانیان نشوستیان هێنا، كە دەیانویست دەستی بەسەردابگرن، ئەم هێرش وەستانەش تاساڵی ٦٥٦ك- ١٢٥٨ز بەردەوام بوو. حاكمی هەولێر تاجەدین كوڕی سەلایا ئەو هەلەی قۆستەوەو دەستی كرد بەدووبارە نۆژەنكردنەوەی ئەو شوێنانەی مەغۆڵەكان تێكیان دابوو لە شوورەو خانووبەرە. (میر شەمسەدین باتكین)ی حاكمی قەڵاتیشی لادا و كركر ناسری لەشوێن دانا[٤١].

دوای ئەوەی مەغۆڵەكان بەسەركردایەتی هۆلاكۆ لە ساڵی ٦٥٦ك-١٢٥٨ز سەركەوتن و دەستیان بەسەر بەغدا گرت و خەلافەتی عەباسییان رووخاند، لە سیاسەتی داگیركردنی وڵاتی جەزیرەو باكووری شام بەردەوام بوون. هەولێریش وەكو شارەكانی دیكە كەوتە بەر شاڵاوی هێرشەكانیان. هۆلاكۆ سوپایەكی بەسەركردایەتی (ئەرمیتۆ نویان) بەمەبەستی داگیركردن نارد و بۆ ماوەی شەش مانگ گەمارۆی لەسەر دانا، بەڵام بەهۆی خۆڕاگری و بەرخودانی خەڵكەكەی و بەرگریكردنیان لێی نەیتوانی كۆنترۆڵی بكات، هەر چەندە حاكمەكەی كە شەمسەدینی كوڕی سەلایا بوو هەولی لەگەڵ خەباتگێڕە كوردەكان دەدا، كە قایلیان بكات بەوەی خۆیان بەدەستەوە بدەن، بەڵام رەتیان كردەوەو شەهید بوونیان بەباشتر زانی لەوەی كە خۆیان بەدەستەوە بدەن و زەلیل بن[٤٢]. سەركردەی مەغۆڵەكان ناچار بوو ئابلۆقەكە هەڵبگرێ. (بن سەلایا) ئەوەی بەدەرفەت زانی و فەرمانڕەوای هەولێری بۆ شەرەفەدین كوردی جێهێشت و پەیوەندی بەهۆلاكۆ كردو هۆلاكۆش كوشتی[٤٣].

وادیارە هۆكاری دەستبەرداری لە فەرمانڕەوای هەولێر لە دەرەنجامی ئەوە هاتووە هەستی بەبچووكی قەوارەی خۆی كردووەو، هەستی بەوە كردووە كە هەیبەتی خۆی لەبەردەم چاودێران و چەكدارە كوردەكان لەدەست داوە، بۆیە ئارەزووی كردووە خۆی تەسلیم بەمەغۆڵەكان بكات. لەگەڵ ئەوەش سەركردەی مەغۆڵەكان ئەرمیتۆنویان بێ ئومێد نەبوو لەوەی، كە دەست بەسەر هەولێرو قەڵاتەكەیدا بگرێت. بۆ ئەم مەبەستەو وەدیهێنانی ئەو ئامانجە راوێژی بە حاكمی موسڵ بەدرەدین لوئلوئەی كرد، كە پێشتر وەلای خۆی بۆ هۆلاكۆ پێشكەش كردبوو، هاوكات هێزەكانیشی بەشدارییان لە گەمارۆدانی شاری مەیافارقین كردبوو[٤٤]. ئەویش دوا ئامۆژگاری كردو پێی وت لەم ساتوكاتەدا ئەستەمە بتوانی دەستی بەسەردا بگرێت، چونكە برێكی زۆر لە چەك و تەقەمەنی و ئازووقەیان هەیە[٤٥].

جا پاش ئەوەی مەغۆڵەكان بێ ئومێد بوون لەوەی، كە بتوانن دەست بەسەر هەولێردا بگرن، ئەو كۆنترۆڵكردنەیان بۆ حاكمی موسڵ بەدرەدین لوئلوئە بەجێهێشت،

ئەویش شووروەکەی رووخاندو قەلاتی داگیر کردو جێگرەکەی خۆی لەوێ دانا. مەغۆلەکان خەلاتی حاکمی موسلیان بەحەفتا هەزار دینار کرد لەبەرامبەر ئەوەی قەلاتیان تەسلیم بکات[٤٦]. بەلام پاش ماوەیەکی کەم میر شەرەفەدین جەلالی، کە ئیبن خەلدون ناوی نابوو شەرەفەدین کوردی[٤٧] توانی لای هۆلاکۆ رەزامەندی وەربگرێ بەگەراندنەوەی قەلات بۆ ژێر دەسەلاتی خۆی و سەربازەکانی بەدرەدین لوئلوئەی وەدەرنا شەرەفەدین کوردی. لەبەرامبەر ئەو هەلوێستەی هۆلاکۆ بەلێنی دا کۆمەکی سوپای مەغۆلەکان بەزەخیرەو چەک بکات دژی برا کوردەکان لە ناوچەی جۆلەمێرگ[٤٨] لەماوەی نەبوونی شەرەفەدین لە هەولێرو بەشداربوونی لەگەل سوپای مەغۆلەکان حاکمی موسل بەدرەدین لوئلوئە توانی هەندێ لە بەکرێگیراوە کوردەکان بەپارەیەکی زۆر قایل بکات شەرەفەدین کوردی بکوژن، ئەوەبوو کاتێ لە خێوەتگاکەی نوستبوو هێرشیان کردە سەری و کوشتیان[٤٩].

لەپاش ئەو میر بەهائەدینی کوری فەرمانرەوای هەولێری گرتە دەست، کە لەسالی ٦٨٤ک-١٢٨٥ز لەشار دەرچوو بەمەبەستی بەرپەچدانەوەی ئەو هێرشانەی لەلایەن سوپایەک، کە لەکۆمەلێ رێگرو دز لەکوردو عارەب و تورک پێکهاتبوو دەکرایە سەر هەولێر. بەلام تێکشکاو بەرەو شار هەلات. ئەمەش ئەوەمان بۆ راقە دەکات، کە مەغۆلەکان لەدەوروبەری هەولێر هیچ هێزو پاراستنێکیان هەتا ئەو ساتوکات نەبووە[٥٠].

جێی باسە سەرچاوەکان تاسالی ٦٩٦-١٢٩٦ز باس لە هیچ زانیارییەک ناکەن سەبارەت بە رووبەرووبوونەوەی هەولێر لەگەل مەغۆلەکان. بەلام ئاماژەیان بەهەندێ کێشە داوە، کە لەهەولێر روویدا، لەوانە کێشەی نێوان نەسرانییەکان کە هاوکار بوون لەگەل مەغۆل و لەنێوان کوردە موسلمانەکان، بەلام بەزوویی ئاشت بوونەتەوە، دواتر کێشەکە لەسالی ٦٩٧ک-١٢٩٧ز سەری هەلداوەتەوە. پاش ئەو رێکەوتە هیچ سەرچاوەیەک ئاماژە بەهەولێر لەرەوشی سەردەمی مەغۆلییەکاندا نادات[٥١].

سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١- شهاب الدين بن ياقوت بن عبدالله الحموي، معجم البلدان، (بيروت، دار صادر ١٩٥٧)، ١/١٣٧.
٢- هەمان سەرچاوە: ١/١٣٧، زكريا بن محمد بن محمود، اثار البلاد واخبار العباد (بيروت دار صادر، ١٩٦٠) ص ٢٩٠.
* اهتم المنجمون في تحديد الطول والعرض فالدرجة قدرما نقطه الشمس في يوم وليلة من الفلك، وتنفسم الدرجة الي ستين دقيقة والدقيقة الي ستين ثانية. ينظر، الحموي معجم البلدان: ١/٣٩.
٣- معجم البلدان: ١/١٣٧، ١٣٨.
٤- هەمان سەرچاوە: ١/١٤٠.
٥- عزالدين ابن الحسن علي بن ابي الكرم بن الاثير، الكامل في التاريخ (بيروت، دار صادر، دار بيروت، ١٩٧٥): ٩/٢٣٠، رشيدالدين فضل الله الهمداني، جامع التواريخ، ترجمة محمد صادق نشأت واخرون (مصر، دار احياء الكتب العربية، ١٩٦٠) حج٢/ ج١/ ١/٢٠٤.
6- Lane- pool, S. Mne Muhammadan Dynasties, Karachi, Pakistan, 1969 P.187
٧- فاروق عمر نوزي، الخلافة العباسية (بغداد، دار الحكمة، ١٩٧٨)، ل ١١٩.
٨- حسن ابراهيم حسن، تاريخ الاسلام السياسي والديني والثقافي والأجتماعي (ط١/، القاهرة، مكتبة الهنضة المصرية، ١٩٧٠): ٤/١٣٠.
٩- فؤاد عبدالمعطي الصياد، المغول في التاريخ (دار القلم، مصر، ١٩٦٠)، ل ١٠.
10- The Encyclopaedia Britannica, Printed in U.S.A, 15 th, ed. 1979. vol. 12, p. 370
١١- بروانە: خليل ابراهيم السامرائي وآخرون، تاريخ الدولة العربية الأسلامية في العصر العباسي (الموصل، مطبعة الجامعة، ١٩٨٨) ل ٣٥٢، ٣٥٣.
١٢- ابن الأثير، الكامل، طبعة ١٩٦٦: ١٢/ ٣٥٩-٣٧٦.
١٣- هەمان سەرچاوە: ١٢/٣٧٧-٣٧٨، عبدالرحمن محمد بن خلدون، تاريخ العبر وديوان المتبدأ والخبر (بيروت،

مؤسسة جمال للطباعة، ١٩٧٩):
٥/١١٤الشرق الأدني في العصور الوسطى (الأيوبيون) (بيروت، مطبعة مينيست ١٩٦٧) ق١، ل١٢٧-١٢٨.
١٤- السيد الباز العريني
١٥- محمد صالح داود القزاز، الحياة السياسية في العراق في عهد السيطرة المغولية (النجف، مطبعة القضاء، ١٩٧٠) ل ٧٢-٧٣.
١٦- ابن الأثير، الكامل، طبعة ١٩٦٦: ٣٧٨/١٢، ابن خلدون، العبر: ١١٤/٥، القزاز، الحياة السياسية، ل ٧٣.
١٧- ابن الأثير، الكامل، طبعة ١٩٦٦: ٣٧٨/١٢.
١٨- هەمان سەرچاوە: ٣٧٨/١٢.
١٩- ابن كثير، البداية والنهاية: ٩١/٣.
٢٠- بن الأثير، الكامل، طبعة ١٩٦٦: ٣٧٩/١٢ن ابن خلدونن العبر: ١١٤/٤.
٢١- ابن الأثير، الكامل، طبعة ١٩٦٦: ٣٧٩/١٢، ابن كثير، البداية والنهاية: ٩١/١٣.
٢٢- ابن الأثير، الكامل، طبعة ١٩٦٦: ٣٧٩/١٢، بڕوانە: عبدالله العلياوي، كوردستان في عهد المغول ١٢٢٠-١٣٣٥ن دراسة في التاريخ السياسي (السليمانية: ٢٠٠٥) ل ١٢١.
٢٣- هەمان سەرچاوە: ٣٧٩/١٢.
٢٤- العبر: ١١٤/٥.
٢٥- ابن الأثير، الكامل، طبعة ١٩٦٦: ١٩٨/١٢، شمس الدين ابي المظفر يوسف بن قزا وعلي سبط بن الجوزي، مرآة الزمان في تاريخ الأعيان (حيدر آباد، الدكره، الهند، مطبعة دار المعارف العثمانية، ١٩٥٢): ٤٤٠/٨.
٢٦- جمال الدين محمد بن سالم بن واصل، مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، تحقيق: جمال الدين الشيال (القاهرة، مطبعة فذاد الأول: ١٩٥٣): ٣٢٤/٤، ابن اكثير، البداية والنهاية: ١٢٨/١٣، ١٢٩٢، ابن خلدون، العبر: ١٤٤/٥.
٢٧- ابن الأثير، الكامل، طبعة ١٩٦٦: ٥٠١/١٢-٥٠٢.
٢٨- ابن كثير، البداية والنهاية: ١٣٢/١٣.
٢٩- ابن خلدون، العبر: ٢٧٥/٥.
٣٠- غريغوس الملطي بن العبري، تاريخ مختصر الدول (بيروت، المطبعة الكاثوليكية، ١٩٥٨)، ل ٢٤٩.
٣١- كمال الدين ابن الفضل عبدالرزاق بن الغوطي البغدادي، الحوادث الجامعة والتجارب النافعة في المائة السابعة (المنسوب) تحقيق: مصطفي جواد، (بغداد، مطبعة الفرات، ١٩٣٢) ل ٨٤-٨٥.
٣٢- ابن كثير، البداية والنهاية: ١٤٥/١٣.
٣٣- ابن الفوطي الحوادث الجامعة، ل٩٩.
٣٤- علياوي، كوردستان في عهد المغول، ل ١٢٤.
٣٥- ابن كثير، البداية والنهاية: ١٤٥/١٣.
٣٦- ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ل ٢٥٠.
٣٧- ابن كثير، البداية والنهاية: ١٤٥/١٣، جمال الدين ابو المحاسن يوسف بن تغري بردي، النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة) (القاهرة: ١٩٣٦): ٢٩٧/٦.
٣٨٠- ابن الفوطي: الحوادث الجامعة، ل ٩٩، الصياد، المغول في التاريخ، ص ١١٧، علياوي، كوردستان من عهد المغول، ل ١٢٣.
٣٩- ابن الفوطي، الحوادث الجامعة، ص ١٠٩.
٤٠- هەمان سەرچاوە، ل ١٠٩، الصياد، المغول في التاريخ، ل ١١٧، علياوي، كوردستان في عهد المغول، ل ١٢٦.
٤١- ابن الفوطي، الحوادث الجامعة، ل ١١٠-١١١، علياوي، كوردستان في عهد المغول، ل ١٢٦.
٤٢- ابن خلدون، العبر: ٥٤٣/٥، علياوي، كوردستان في عهد المغول، ١٢٦.
٤٣- ابن خلدون، العبر: ٥٤٣/٥.
٤٤- هەمان سەرچاوە: ٥٤٣/٥.
٤٥- تقي الدين أحمد بن علي المقريزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، تصحيح وتعليق محمد مصطفي زيادة (ط٢، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، ١٩٥٦): ج١، ق١ ل ٤١، علياوي، كوردستان في عهد الغول، ل ١٢٩.
٤٦- عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين (بغداد، مطبعة بغداد، ١٩٣٥: ٢١٤/١، علياوي، كوردستان في عهد المغول، ل ١٢٩.
٤٧- العبر: ٥٤٣/٥.
٤٨- أبو العباس احمد بن علي القلقشندي، صحيح الأعشي في صناعة الأنشاء شرح وتحقيق: محمد حسين شمس الدين (ط١/، دار الفكر، ١٩٨٧): ٣٧٧/٤، علياوي، كوردستان في عهد المغول، ص ١٣٠.
٤٩- هەمان سەرچاوە، لا ١٣٠.
٥٠- هەمان سەرچاوە، لا ١٣١.
٥١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ص ١٣٢.

# هەولێر و هێرشەکانی مەغۆل ١٢٢١-١٢٩٧ز

دکتۆر عەبدوڵلا عەلیاوەیی*

هەولێر یەکێ لە شارەکانی سەربە موسڵە لە دوورگەی فوراتدا[١]، کەوتۆتە نێوان هەردوو زێی گەورە و بچووک[٢]. هەولێر شارێکی گەورەیە و خاکەکەی تەختاییەکی بەرفراوانە و هەر لەکۆنەوە دانیشتوانەکەی کوردن[٣] قەڵایەکی تێدایە، کە لەسەر گردێکی بەخۆڵ دروستکراو بنیات نراوە[٤] یەکێکە لەو شارە دەگمەنانەی تاکو ئێستاشی لەگەڵ دابێت ناوە کۆنەکەی خۆی پاراستووە[٥]. بەڵام وەکو زۆر شاری دیکەی کوردستان، لەبەرئەوەی بە دەروازەیەک دانراوە بۆ پاراستنی دوورگەی فورات، رووبەرووی هێرش و گوشاری مەغۆلەکان بۆتەوە. شایەنی ئاماژە پێکردنە هەر لەسەرەتاوە رووبەرووی هێرشەکانی مەغۆل بۆوە. لەساڵی (٦١٨ک/١٢٢١ز) مەغۆل بەرەو هەولێر هات[٦]، پاش ئەوەی دەستی بەسەر شاری مەراغە داگرت، بەڵام کاتێ سوڵتانی هەولێر، موزەفەرەددین گۆکبری بەم کارەی زانی، نووسراوێکی بۆ سوڵتانی موسڵ بەدرەدین لوئلوئە نارد، بۆئەوەی فریای بکەوێ[٧]. لوئلوئە بەتەنگ هاوارەکەی موزەفەرەددین هات و سوپایەکی بۆنارد بۆ بەرپەرچدانەوەی مەغۆلەکان. سوپاکە لەگەڵ هێزێکی پێویست لە دەوروبەری رێگاکان و ئەو رێگاو دەروازانەی بۆ ناوچە شاخاوییەکان دەچوون، بەمەبەستی بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی مەغۆلەکان دابەشیان کردن[٨]. کاتێ مەغۆلەکان هەستیان بەوە کرد، لە هێرشکردن پاشگەز بوونەوە و ئەو سوپا ئاپۆرەدارەی کۆیان کردبۆوە پاشەکشەیان پێکرد، لەبەرئەوەی زانیارییەکی کەمیان لەسەر سروشتی هاتوچۆو رێگاو بانی ناوچە شاخاوییەکان هەبوو.[٩] لەلایەکی دیکە خەلیفە ناسرەدینیلا چەند نامەیەکی بۆ میرەکان نارد، لەوانە موزەفەرەددین گۆکبری، سوڵتانی هەولێر و بەدرەدین لوئلوئە، سوڵتانی موسڵ و شائەشرەف موسا، سوڵتانی خەلات و میافارقین و گەورەی هەندێ شاری دیکەی دوورگەکە[١٠] بۆئەوەی سوپاکانیان بەرەو داقوق[١١] بەمەبەستی بەرپەرچدانەوەی بڵاوبوونەوەی مەغۆلەکان بەرەو عێراق بەرێ بخەن. هەردوو سوڵتانی موسڵ و هەولێر وەڵامیان دایەوە، بەڵام شا ئەشرەف پۆزشی هێنایەوە لەو بەشداریکردنە بەهۆی ئەوەی خۆی سازداوەو زۆر سەرقاڵە بەئازادکردنی براکەی شا کامل لەدژی ئەفرەنگەکان، کە لەشاری دمیات گەمارۆیان داوە[١٢]. لەو ساتەدا خەلیفە بەڵێنی دا، کە دە هەزار جەنگاوەر بنێرێت بۆ پاڵپشتی کردنی هەردوو سوپای موسڵ و هەولێر، کە لەژێر دەسەڵاتی موزەفەرەددین گۆکبری سوڵتانی هەولێردابن. بەڵام ژمارەی ناوبراوی نەنارد، بەڵکو تەنیا هەشت سەد سوارچاکی نارد، ئەمەش دڵەراوکێی لای گۆکبری دروست کرد، لەوەی بەرپەرچی هێرشی مەغۆلەکان بداتەوە و گوتوویەتی: "کاتێ بۆخەلیفەی نارد مەبەست تەتەرەکانە، گوتم: دوژمن بەهێزە، هێزێکی سەربازی وام نییە بتوانم رووبەروویان ببمەوە. گەر دە هەزار سوار چاک کۆبووبایەوە، ئەوەی وڵات پێویستی پێ هەبووایە جێبەجێم دەکرد. بەڵێنی دامێ هێزی سەربازی بگات. کاتێ ویستم بەرێ بکەوم ژمارەیەکی کەم، کە خۆی نەدەگەیشتە هەشت سەد کەس، بۆیە بیرم دەکردەوە، چۆن خۆم و موسڵمانەکان بخەمە مەترسییەوە)[١٣]. بەهۆی ئەوەوە هیچ شەڕو کوشتارێک لەنێوان هەردوو لادا رووی نەدا و سوپای

مەغۆل گەڕایەوە هەمەدان[١٤]، پاش ئەوەی زانیاریان پێگەیشت و زانییان كەوا هێزێكی ئیسلامی لەئامادەباشیدایە بۆ بەرپەرچدانەوەیان. لە ساڵی (٦٢٨ك-١٢٣٠ز) تایفەیەكی دیكەی مەغۆل لە هەرێمی ئازربایجان دەرچوون بۆ هەولێر و بەدرێژایی رێگا دەستیان كرد بەكوشتن و برین و تالانكردن و كاولكردنی ئەو گوندو دێهاتە كوردییانەی كەوتبوونە سەر رێگاكە. تا كارەكە وای لە موزەفەرەدین گۆكبری، سولتانی هەولێر كرد، بۆ جارێكی دیكە داوای خزمەتگوزاری لە بەدرەدین لوئلوئە بكات بۆ بەرپەرچدانەوەی مەغۆلەكان. ئەمجارەش سولتانی موسڵ داواكەی گیرا كرد و بەپەلە دەستیان بە یەكگرتنی سوپاكەیان بۆ بەرپەرچدانەوەی سوپای مەغۆل كرد. كاتێ مەغۆلەكان بەم كارەیان زانی دووبارە بەبێ ئەوەی شەڕوكوشتار لەنێوان هەردوولادا روویدات بەرەو ئازربایجان كشانەوە[١٥]. هۆكاری روونەدانی شەڕ و كشانەوەی سوپای مەغۆل بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە ژمارەی سەربازانی سوپاكەیان كەم بووە و لە توانایاندا نەبووە، بتوانن بەرەنگاری سوپای ئیسلام ببنەوە. جگە لەوە هۆكارێكی دیكەش هەیە، ئەویش ئەوەیە سوپای مەغۆل لەم كارەدا مەبەستیان شەڕ نەبوو، بەڵكو ئامانجەكەیان تەنیا شارەزابوون و كۆكردنەوەی زانیاری سەربازی بووە لە ناوچەكە.

لە ساڵی (٦٢٩ك-١٢٣١ز) سوپای سولتانی هەولێر بەیاوەری سوپای خەلیفەی بەغدا، بەمەبەستی شەڕكردن لەگەڵ مەغۆلەكان بەرەو ناوچەی شارەزوور بەرێكەوتن. كەچی دیسان شەڕەكە رووی نەدا، هۆكارەكەش نەخۆشكەوتنی سولتانی هەولێر بوو، بۆیە دووبارە سوپاكە گەڕایەوە هەولێر[١٦]. لە ساڵی (٦٣٣ك-١٢٣٥ز) سوپای مەغۆل هێرشی هێنایە سەر شاری هەولێر و سوپای هەولێریش بەتوندی رووبەڕوویان بوونەوە. جا پاش ئەوەی شەڕو كوشتارێكی توند لەنێواندا روویدا، ژمارەیەكی زۆر لە مەغۆلەكان كوژران، ئینجا بەرەو موسڵ كشان[١٧]. پاش ئەوەی ئەو زەرەروزیانە زۆرەیان لێ كەوت، لە شەنگال دابەزین و والییەكەیان كوشت. چی كاولكاری و خراپە بوو دەرهەق بە خەڵكی گوندو دێهاتەكانی كەوتبوونە سەر رێگا ئەنجامیان دا[١٨]. كاتێ خەلیفە موستەنسربیللا بەو كارەی زانی، تەواوی كارراپەراندن و پێداویستییەكانی شەڕو بەرگری ئامادە كرد، پارەو پوولێكی زۆری خەرج كرد[١٩] بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو ئاپۆرە مەغۆلییەی لەو ناوچانەدا بڵاویان كردبوونەوە.

لەمانگی شەوالی ساڵی (٦٣٤ك-١٢٣٦ز) هێزەكانی مەغۆل، بە سەركردایەتی (بجكتای)و سی هەزار جەنگاوەری مەغۆلی[٢٠]، هێرشیان بۆ سەر شاری هەولێر هێناو گەمارۆیان دا، مەنجەنیقیان دانایەوە، بەمە توانییان شارەكە داگیر بكەن، كەوتنە تاوانكردن و نانەوەی ترس[٢١] خەڵكی هەولێر خۆی بە قەڵا پاراست، لەوانە ئیبن مستەوفی[٢٢] لە ١٧ی شەوالی (٦٣٤ك-١٢٣٦ز) هەواڵی داگیركردنی هەولێری بەهۆی كۆتری نامەبەر گەیاندە بەغدا. خەلیفە موستەنسیر بیللا ئامادەباشی خۆی وەرگرت و پێداویستییەكانی ئامادە كرد، سێ دەستەی سەربازی بۆ هەولێر نارد[٢٣]، یەكەم بەسەركردایەتی میر شەمسەدین ئەسلان لەگەڵ سێ هەزار خەباتگێڕ. دەستەی دووەم بەسەركردایەتی میر موجاهیدودین ئەیبك دویدار. دەستەی سێیەم بە سەركردایەتی شەرەفەدین شەرابی. لەم ساڵەدا زاناكان فەتوایان دەركرد، كە جیهاد واجیبە و فەریزەی حەجیشیان فەرز كرد لەپێناو وەدەرنانی كافرانی بێ باوەڕدا.[٢٤] لە ولاتی ئیسلام. سوپای مەغۆل بەداگیركردنی هەولێر نەوەستا گەمارۆی قەڵاشی دا و مەنجەنیقی بۆ دانانەوە، لە ئەنجامدا بەهۆی بۆردومانی مەنجەنیقەكان و هەروەها بەهۆی برسیەتی قات و قڕی خەڵكێكی زۆر لە قەڵا شەهید بوون[٢٥]. خەڵكەكە مردووەكانیان دەسووتاند یان فڕێیان دەدانە ناو بیرەكان لەترسی ئەوەی نەوەك خەندەقی چواردەوری قەڵا پڕبێتەوەو كاری پەڕینەوەی سوپای مەغۆل بۆ قەڵا سانابێت. ئەمەش هەنگاوێكی سەربازی شیاو بووە، كە سروشتی شوێنەكە دۆزیویەتییەوە.

گەمارۆدانی قەڵا ماوەی چل رۆژ بەردەوام بوو[٢٦]، بەڵام لەكۆتاییدا مەغۆلەكان هەر نەیانتوانی دەست بەسەر قەڵادا بگرن لەبەر خۆڕاگری و بەرهەڵستكارییە بەهێزو توندەكەی،

کە مەلیکی خەلیفە شەمسەدین باتکین (ئیدکین) بەرپرسی قەڵا کردی[٢٧]. خەڵکەکە تونێل و ڕێگەی ژێرزەمینیان لە ژێر قەڵادا لێدا[٢٨]. هەروەها لێرە ڕاڤەی جیاجیا لەئارادایە دەربارەی ئەوەی سوپای مەغۆل، نەیتوانیوە دەست بەسەر قەڵادا بگرن. هەندێک دەڵێن لەبەر ساردیی زستان بووە، کە لە سوپای مەغۆلی دا[٢٩]. بۆچوونی دیکە ئەوەیە کە خەلیفە موستەنسیر بیللا سوپایەکی بۆ تێکشکاندنی گەمارۆی سەر هەولێر ڕەوانە کرد[٣٠]. ڕایەکی دیکە پێیوایە دوای دەسکەوتێکی زۆر کشانەوە[٣١]. بەڵام ڕاستترین هۆکار ئەوەیە کشانەوەیان بەهۆی خۆڕاگریی کورد لە قەڵا و ناردنی سوپای خەلیفە بوو. لەبەر ئەوەی مەغۆلەکان کاریان لەسەر توانای دژایەتی و پێوەستانی بەرامبەر دەکرد، ئەگەر لە سەرکەوتن دڵنیا بوایەن، شەڕ و موجازەفەیان دەکرد. وەک ئەوەی هۆلاکۆ بۆ ڕازیکردنی میرە کوردەکان لە ناوچەی کرماشان بەر لە گەمارۆدانی بەغدا کردی. هەموو ئەمانە وای کرد سوپای مەغۆلەکان لە مانگی (ذي الحجة) لە ساڵی(٦٣٤ک/١٢٣٦ز) لە هەولێر بکێشنەوە. بەڵام ساڵی داهاتوو هێرشیان بۆ سەر هەولێر کردەوە، شەمسەدین تاتکینی فەرمانڕەوای هەولێر، فەرمانی بەرێکخستنەوەی سوپادا پێشتر لە سەر پێی خۆی وەستا و سوپای لەدەرەوە شار بۆ پارێزگاری و چاوەدێری پێویست دابەش کرد.[٣٢] ئەم ئامادەکارییە ڕۆڵێکی مەزنی لە چاندنی ترس لە دڵ و دەروونی سەربازەکانی مەغۆڵدا بینی، بەوەی لەهێرشکردن بەرەو هەولێر پاشگەز ببنەوە و ڕوو لە (داقوقا) بکەن[٣٣]. دانیشتوانی داقوقا لێرە و لەوێ پەرش و بڵاویان تێ کەوت و بەشێکی زۆریان ڕوویان کردە بەغدا، ئەمەش بووە هۆی بەرز بوونەوەی کرێی خانوو، خەلیفەش لەمە بێزار بوو. وتار خوێنەکان خەڵکیان بۆ جیهاد لە پێناو خوا هاندا، ئەم هاندانە ڕۆڵێکی گەورەی کردە سەر ورەی خەڵک و بە دەم بانگەوازەکەوە چوون[٣٥]. ئەم بانگەوازەی بەرەو جیهاد کاریگەرییەکی زۆری لە تۆقاندنی مەغۆلەکاندا بینی، کەوا کشانەوە و گەڕانەوە بۆدواوەیان هەڵبژارد (بەرەو ناوچەی "زەنگاباز" و[٣٦] "سامەرا" ڕۆیشتن. لەمیانەی ئەم ڕووداوانەدا، تاجەدین کوڕی سەلایا کرا بە فەرمانڕەوای هەولێر(اربيل). دەستی دایە نۆێکردنەوەی شوورەکانی و چاکردنەوەی ئەوەی لە چواردەوری لە ساڵی (٦٣٤ک.١٢٣٦ز) بەهۆی هێرشی مەغۆلەکان ڕووخابوون. ئیبن سەلایا لە جێی میر شەمسەدین باتکین، کەرکەی ناسری لە قەڵادا دامەزراند(٣٧). لە دوای ساڵی (٦٣٤ ک/١٢٣٦ ز)، هەتا ساڵی (٦٥٦ک.١٢٥٨ز) لە شاری هەولێر هیچ ڕووداوێکی دیکەی ئەوتۆ ڕووی نەدا تا ئەو کاتەی هۆلاکۆ لە (٧٥٦-١٢٥٨ز) بەغدا داگیر دەکات و خەلافەتی عەباسی دەڕووخێنێ. بۆیە سوپایەکی بە سەرکردایەتی ئەرفیتۆنویان، بەمەبەستی داگیرکردنی هەولێر نارد[٣٨]. لەم کاتەدا تاجەدین بن سەلایا حاکمی ئەوسای هەولێر، هەوڵی دا چەکدارەکانی کورد لەقەڵا قایل بکات بەوەی خۆیان بەدەستەوە بدەن[٣٩]، بۆئەوەی هەر خۆی لە دەسەڵات بمێنێتەوە. بەڵام خەڵکی قەڵا ڕەتیان کردەوە و شەهیدبوونیان لە سەرشۆڕی بە بەرزتر ڕاگرت. بەڵێ سەرەڕای ئەوەی گەمارۆیەکی تونددرا و بەمەنجەنیقیش بۆردوومان کرا خەڵکی قەڵا بەشەو هێرشیان دەکردە سەر دوژمن و زیانی گەوردیان لێ دەدا[٤٠]. گەمارۆکە شەش مانگ بەردەوام بوو[٤١]. پاش ئەوەی سەرکردەی مەغۆل (ئەرفیتۆ) بێئومێد بوو لەوەی بتوانێ قەڵا داگیر بکات، بۆ چۆنێتی داگیرکردنی قەڵا ڕاوێژی بە بەدرەدین لوئلوئەی سوڵتانی موسڵ کرد، ئەویش ئامۆژگاری کرد و بۆی جەخت کردەوە، کە کوردەکان پیرۆزبایی دەکەن بەڕووخانی بەغدا و پاشان بۆی جەخت کردەوە و گوتی: ئەوە شەریف عیلوییە خۆی باسی لە خەلافەت کردووە، گەر خۆی بیەوێ خەڵک شوێنی دەکەوێ و ملکەچی فەرمانەکانی دەبن.[٥٤] لەپاش ڕووخانی بەغدا زانیارییەکی وا لەسەر هەولێر لە سەرچاوەکان لەئارادا نییە، کە شیاوی باسکردن بێ، تا ساڵی (٦٨٤ک-١٢٨٥ز) کاتێ شاری هەولێر لەلایەن سوپایەکەوە هێرشی کرایە سەر، کە لە کوردو عەرەب و تورک پێکهاتبوو، لەوڵاتی شامەوە هاتبوون و(سەرچاوەکان هیچ شتێکیان دەربارەی سەرکردەی سوپاکە باس نەکردووە)، واپێدەچێ ئەو سوپایە

دزو جەردە و ڕێگر بووبن. بەدزی و تالانکردنی گوندەکانی دەوروبەری شاری هەولێر هێرشیشیان کردە سەرشارەکە، بەلام میرەکەیان بەهائەدین کوردی بەتوندی بەرپەرچی دانەوە تاوەکو سنوورێک بۆ زێدەڕۆیی دەرەکییەکان دابنێت.[٥٥] بەلام نەیتوانی بەسەریاندا سەرکەوێ، بەلکو لەپێشیان هەلات و گەڕایەوە شار[٥٦]. ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەلگەیە لەسەر ئەوەی، کە مەغۆل هیچ ئۆردوگاو هێزێکیان لەدەوروبەری هەولێر نەبووە تا ئەو مێژووە. لە سالی (٦٩٦ک-١٢٧٠ز) کێشەو ململانێیەکی توند کەوتە نێوان نەسارەکانی هاوکاری مەغۆلەکانیان دەکرد، نێوان کوردە موسلمانەکان لەشاری هەولێر. بەلام بەتریق مار جبلاها چووە لای غازان خان (٦٩٤-٧٠٣ک/١٢٩٤-١٣٠٣ز) توانی ئەوەی مەبەستە بپێکێ و ئاشتەوایی بخاتە نێوان نەساراو موسلمانەکان.[٥٧]. لەسالی (٦٩٧ک-١٢٩٧ز) بۆ جارێکی تر شەڕە قسە لەنێوان سەربازانی نەسارا سازبوو، کە ناویان لەخۆ نابوو (کیساجی)[٥٨] لە قەلای هەولێر لەژێر سەرکردایەتی زەینەدین بالو، کە بۆ ماوەی سیانزە سال حوکمرانی هەولێری گرتە دەست، لەدژی سەربازگەی مەغۆلەکان لە دەوروبەری هەولێردا. جا پاش هەول و تەقەللایەکی بێوچان توانرا سەربازی مەغۆل لەو نەسارایانەی لە قەلای هەولێر دوور بکەنەوە.[٥٩].

لە ڕەوتی ئەو ڕووداوە دەگەینە ئەو ئەنجامە، کە مەغۆلەکان ئۆردوگای سەربازییان لە دەوروبەری هەولێر دانا پاش ڕووداوەکانی سالی (٦٨٤ک-١٢٨٥ز)، بەلام توێژەر سەرنجی ڕووداوەکانی پاش سالی(٦٩٧ک-١٢٩٧ز) نەداوە، کە شیاوی باسکردن بێ، لە سەردەمی مەغۆلەکان تا ڕووخانی ئیلخانییەکان سالی (٧٦٣ک-١٣٣٥ز).

### سەرچاوە و پەراوێزەکان:

١- یاقوت الحموي: معجم البلدان، ١٣٨/١، لسترنج: بلدان الخلافة، ص١٢١.
٢- القزويني: اثارالبلاد، ص٢٩٠، الانصاري: نخبة الدهر، ص١٩٠.
٣- القزويني: م.ن، ص٢٩٠، ابوالفداء: تقويم البلدان، ص٤١٣.
٤- ابوالفداء: م.ن، ص٤١٣.
٥- دروثي مكاي: مدن العراق القديم، ص١٤٧، طه باقر وفؤاد سفر: المرشد، ص٣.
٦- ابن الاثير: الكامل، ٣٧٦/١٢، ابن كثير، البداية والنهاية، ٢٩٠/١٣، الغساني: العسجد المسبوك، ٣٨٤/٢، ابن خلدون: العبر، ١١٤/٥، القزاز: الحياة السياسية، ص٣١١.د.ر.
٧- طليمات: مظفرالدين كوكبري، ص١٣٤.
٨- ابن خلدون: العبر، ١١٤/٥، عبدالقادر طليمات: مظفرالدين كوكبر، ص١٣٤.
٩- ابن الاثير: الكامل، ٣٧٨/١٢، مراة الجنان، ٣٧/٤، الغساني: العسجد المسبوك، ٣٨٤/٢.
١٠- الكامل: ٣٥٢/١٣.
١١- الكامل: ٣٧٨/١٢، ابن كثير: البداية والنهاية، ٩٠/١٣، العسجد المسبوك، ٣٨٤/٢، ابن خلدون: العبر، ١١٤/٥.
١٢- ابن كثير: البداية والنهاية، ٩٠/١٣.
١٣- الكامل، ٣٧٩/١٢.
١٤- مراة الجنان، ٣٧/٤، العبر، ٦٥/٥، الخضري: محاضرات، ص٤٧٣.
١٥- الكامل، ٥٠١/١٢، ابن خلدون، ١٤٥/٥، ٤٤، عبدالقادر طليمات، مظفرالدين كوكبري، ص١٣٧-١٣٨
١٦- شاكر الضابط: تاريخ الصداقة، ص٨٩.
١٧- ابن العبري: تاريخ مختصرالدول، ص٢٤٩، الذهبي: دول الاسلام، ١٤٩/٢، محمد أسعد طلس: عصر الانحدار، ص٩.
١٨- مراة الجنان، ١٤٨/٤، ابن الفوطي: الحوادث الجامعة، ص٨٤-٨٥.
١٩- مراة الجنان: ١٨٤/٤، الذهبي: م.ن، ١٣٧/١.
٢٠- محسن محمد: موضوعان من التاريخ الكردي، ص٦٢.
٢١- ابن كثير، ١٤٥/١٣، شذرات الذهب، ١٥٩/٥، تأريخ الخميس، ص٣٧١،
الذهبي: مخطوطة تأريخ البلدان، ص٢٣٨.
٢٢- ابن شعار: مخطوطة عقود الجمان، ص٢٠، وفيات الاعيان، ١٥١/٤.
٢٣- الحوادث الجامعة، ص٩٩.
٢٤- ن.م.ص.
٢٥- الحوادث الجامعة، ص٩٩.
٢٦- ابن العبري: تأريخ مختصرالدول، ص٢٥٠، ابن العبري: تأريخ الدول: ص٧٤١، العزاوي: تأريخ العراق، ١٣٧/١، الصدقي: تأريخ دول الاسلام، ٢٧٨/٢.
٢٧- ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٢٩٧/٦.
٢٨- سالی ١٩٧٤-١٩٧٥ لە کاتی دیوارکردنی دەوری، دوو کون دەرکەوت کە نێوانیان پازدە مەتر دەبوو، لە ڕۆژی ٢٠/٢/١٩٩٢ چوومەوە مۆزەخانەی هەولێر و پرسیاری ئەوەم کرد دەکرێ بچینە نێو ئەم کونانە، ئەندازیاری سەر

پەرشتكار كەنعان موفتی، گوتی نەختێر -لە بەر ئەوەی هەر كەس بچێتە ناو كونەكان ترس دایدەگرێ. لەبەر ئەوەی كونەكە درزی گەورەی تێدایە و وادێتە بەرچاو كە برووخێن. دواتر بەرێز موفتی گوتی: گەنجێک بەخۆبەخش چووە ناو یەكێ لە كونەكان و هەر زوو هاتەوە دەرەوە، ترسێكی زۆر دایگرتبوو. كاتێ لێمان پرسی چیت دیوە، گوتی: شوێنەواری مرۆڤ و ئێسک و پرووسكم دی، لەوانەیە داهاتوو، راستییەكان دەربخا.

٢٩- ابن كثير: البداية والنهاية، ١٤٥/١٣.

٣٠- الحوادث الجامعة، ص٢٢، العسجد المسبوك، ٤٧٨/٢، ئەبو شامە لەوان جیا دەبێتەوە، بە وەی دەڵێ: " سوپای خەلیفە بە سەر سوپای مەغۆلدا سەركەوت، بۆیە كشانەوە." (تراجم الرجال، ص١٦٥)

٣١- ابن العبري: تاريخ مختصر الدول، ص٢٥٠، طلس: عصر الانحدار، ص، الصدقي: تأريخ دول الاسلام، ٢٧٧/٢.

٣٢- العسجد المسبوك، ٤٧٩/٢، الحوادث الجامعة، ص١٠٩، زبير بلال: أربيل، ص١٩٨

٣٣- الحوادث الجامعة، ص١٠٩، العسجد المسبوك، ٤٧٩/٢، طلس: عصر الانحدار، ص٩.

٣٤- الحوادث الجامعة، ص١٠٩.

٣٥- زنكاباد: مازالت موجودة ولحد الان، وتقع في منطقة كرميان.

٣٦ - زەنگاباد: هەتا ئێستا ئەم شارە ماوە و دەكەوێتە گەرمیان.

٣٧- ابن خلدون: العبر، ٥٤٣/٥، عباس اقبال: تأريخ مفصل ايران، ص١٩١، العزاوي: تأريخ العراق، ٢١٣/١.

٣٨- جامع التواريخ، ٢٩٨/١/٢، العزاوي: م.ن، ٢١٣/١زبير بلال: اربيل، ص١٥٥، وحيدالدين: الاكراد، ص١٠٠.

٣٩- السلوك، ١/ق١/ ٤١٠، العزاوي: تأريخ العراق، ٢١٤/١وحيدالدين: الاكراد، ص١٠٠

٤٠- ابن خلدون: العبر، ٥٤٢/٥، زبير بلال: اربيل، ص١٣٩ ود.جعفر خەسباک دەڵێ: سوپای مەغۆل بۆ ماوەی ساڵێک گەمارۆی قەڵای دا. (الادارة لاخانية في العراق، مجلة كلية الاداب، جامعة بغداد، العدد الاول لسنة ١٩٥٩م، ص١٥)، و رای یەكەمیش راستترینیانە، وەک شاعیری كورد (ئەوڕەحمان بەگی بابان)، باسی ئازایەتی و خۆڕاگری دانیشتوانی قەڵا و دڕندایەتی مەغۆلەكان دەكات و دەڵێ:

**كاتێ گەیشتە بەردەمی هەولێر، سوپای مەغۆل دەوری حەساری دایەوە وەک گێژی گەردەلول "حاكم صلابە" گەردەنی تەسلیمی دانەوان سەرلەشكری قەڵا وتی: ئەنگە ئەلئەمان من كوردم لە میللەتی ناودار و بەرزی ماد ئەم لەشكری مەغۆلە بەجارێ ئەدەم بەباد فەرمانی دا بە لەشكریان رۆژی غیرەتە بۆ قەومی كورد ژیانی ئەسارەت فەلاكەتە**

ئاورەحمانی بابان: دیوان شیعر، ل(١٠٨-١٠٩)

٤٢- جامع التواريخ، ٢٩٩/١/٢، السلوك، ج١ ق١ ص٤١، العزاوي: تأريخ العراق، ٢١٤/١.

٤٣- ابن العبري: تاريخ الدول السرياني، ص١٣٤، عماد عبدالسلام: حكام العراق وموظفوه في عهد المغول الالخانيين، ٦٥٦-٧٣٨، مجلة المؤرخ العربي، العدد(١١)لسنة١٩٧٩م، ص١٥، سوادي عبدالحميد: امارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤة، ص٧٦.

٤٤- رشيدالدين: جامع التواريخ، ٢٩٩/١/٢، العزاوي: م.ن، ٢١٤/١، زبير بلال: اربيل، ص١٣٩، وحيد الدين: الاكراد، ص١٠١.

٤٥- لەبنەچەدا دەچێتەوە سەر گەلالی، ئەم ساڵە لەكتێبی ابن عبدالظاهر (الروض الزاهر، ص٨٨) جیاوازیشی لەنێوان جەلالی وگەلالیدا هەیە.

٤٦- لە سەرچاوەكان چۆنیەتی پێوەندی شەرەفەدین جەلال بە هۆلاكۆوەم نەبینیوە.

٤٧- ابن العبري: تأريخ الدول، ص١٣٤، حسین حزنی: ئاورێكی پاشەوە، ص٦٢.

٤٨- حسین حزنی: ئاورێكی پاشەوە، ص٦٤.

٤٩- صبح الاعشي: ٣٧٧/٤.

٥٠- ابن العبري: تأريخ الدول، ص١٣٤، حسين حزني: م.ن، ص٦٥.

٥١- الذهبي: دول الاسلام، ٢٢٦/٥.

٥٢- الكتبي: عيون التواريخ، ٢٠٤/٢، ذيل مراة الزمان، ٩١/١، محمد الشيخ: مؤيدالدين العلقمي، ص٣٢.

٥٣- السلوك، ج١ ق١ ص٤١٠، العمري: منية الادباء في تأريخ الموصل الحدباء، ص٦٥.

٥٤- الذهبي: تأريخ الاسلام، مخطوطة مايكروفلم مكتبة الدراسات العليا، بغداد، كلية الاداب، رقم (١٨٠٣)، ص٤٩٣.

٥٥- ابن العبري: تاريخ الدول، ص٣٨٦.

٥٦- د.مصطفي طه بدر: مغول ايران بين المسيحية و الاسلام، ص٥٧.

٥٧- ن.م.ص.

٥٨- كیاجی: پۆلێک سەربازی مەسیحی بوون لەنێو سوپای مەغۆلدا: زكي: خلاصة تأريخ الكرد وكردستان، ١٥٦/١.

٥٩- زكي: خلاصة، ١٦٨/١، زبير بلال: اربيل، ص٢٠٤

* ئەندام پەرلەمانی عێراق.

# هۆز و سەردارە كوردەكانی هەولێر لە چاخی ناوەڕاستدا

دكتۆر زرار سدیق تۆفیق
كۆلێژی ئاداب - زانكۆی دهۆك

**ئەرگی - ئەركی - هركی (هەركی):**

هۆزی "هەركی" لە هۆزە گەورەكانی پارێزگای هەولێر و شوێنانی ترە، لە چاخەكانی ناوەڕاست بە ئەرگی - ئەركی ناودەبران، گۆڕانكاری سووک بەسەر ناوی داهات و گۆڕینی دەنگەكان و پیتەكان و گۆڕینی ئاخاوتن و قسەكردن كارێكی بڵاوبوو لەنێو شێوە زارە هەمەجۆرەكانی كوردیدا، بەم شێوەیە گۆڕانكاری روودەدات لە نێوان پیتی (ه) و (ک)دا بۆ نموونە:

ئەینی - هەینی.
ئاسان - هاسان.
ئەژمار - هەژمار.

لە سەردەمی عەباسییەكاندا لە دەوروپشتی ئامێدی جێگیربوون و باوی ئەرگی لە پیاوەكانی أبی الهەیجا كوڕی عبداللە ی هەكاری بوو، باپیری (مشطوبی) هەكاری - میری قەڵاكانی ئامێدی هاوچەرخی عمادالدین زەنگی (٥٢١،٥٤١ ك/١١٢٧، ١١٤٦ز) ـ لە كاتی دەرچوونی (أبی الهەیجاء) لە قەڵای ئامێدی بەرەو موسڵ باوی ئەرگی كردە ئەمیری قەڵای ئاشب (الكامل، ٨/٣٤٣).

ئەركی لە هۆزەكانی لورستانی بچووكن لە بەرەی جنكرویی و شێوەزاریان لوریی بێ ئەوەی بێتە ژماردن لە هۆزەكانی لوری ڕەسەن (تاریخ گزیدە، ص٥٥٠)، ئەمەش هەمان ئەرگیە لە زۆربەی ئەگەرەكاندا، تا ئێستاش هەركی كۆمەڵا بە كۆمەڵا دەژین لە لیواكانی دیالە و بە ئەركی دەناسرێت (عباس العزاوي، عشائر العراق الكردية، ص١٣٥).

**بابەكری:**

لە هۆزەكانی دەوروپشتی هەولێر بوون، لە تیرەی هۆزی حەكەمیە بوون، بە ڕەچەڵەک ناسراون بە سەرۆكی یەكەمیان بابەكری كوڕی میكائیل، كە توانی شاری هەولێر لە (فضل و أبي علي) لە نەوەكانی میر (أبی الهەیجاء الهذبانی) ساڵی (٥١٧ ك/١١٢٢ز) بستێنێ و كوڕی برای خۆی بكاتە سەردار (گەورە)ی شارەكە، كە بۆ ماوەی سێ ساڵان لە ژێر حوكمی بابەكری مایەوە (الكامل، ٨/٣٢١)، حوكمی شارەكەیان بە زۆری بەڕێوە بردووە لە دەسەڵاتدا و باری ژیانی خەڵكەكەیان قورس كرد بە باج، خەڵكی شارەكەش ڕۆیشتوون بەرەو گوندی عیسی للان - منارە - سەر بە شارۆچكەی حبتون - خفتون لە شاری هەولێر (ابن المستوفي، تاريخ اربل، ١/٢٧٣).

**بالكان - باڵەكیان - باڵەک:**

باڵەكیان هۆزێكی بچووک بوو یان تیرەیەک بوو لە هۆزی زرزاری گەورە و بە ناوی گوندی باڵەكیان ناسراون، لە هیچ سەرچاوەیەكیش بەر لە سەردەمی مەغۆلەكان ناویان نەهاتووە، تەنها (العمری) باسی كردووە و دەڵێ: "باڵەكیان سەر بە زرزارییە و پیاویان كەمە و بە ناوی گوندی باڵەكیان ناوی

دەبەن" (مسالک الإبصار، ٣/ ١٣٠ -١٣١).

ژمارەی پیاوی باڵەکیان دەگاتە سێ سەد پیاو، دەستیان گرتووە بەسەر رێگای خانی شاخاوی و چاودێری کاروانی بازرگانی دەکەن، کە لە هەولێر بۆ ئازەربایجان دەڕۆن، میری باڵەکیانیش بە ناوی تەمۆ بەگ (؟) بوو لەگەڵ نەجمەدینی میری زرارییەکان بە دەستی مەغۆلەکان لە رووداوێکی نادیار کوژرا (مسالک الإبصار، ٣/ ١٣٠ - ١٣١، صبح الأعشی، ٤/٣٧٦ - ٣٧٧).

لە ناودارانی هۆزی باڵەکیان - باڵەک، زانای ئایینی عزەدینی کوڕی شەرەفی باڵەکی لە زانایانی سەدەی نۆیەمی کۆچی/ سەدەی پازدەهەمی زایینی، کە پەرتووکی (الموشح فی شرح الکافیه الحاجبیه) کۆپی کردووە.

کە ئەم پەرتووکەش شیکردنەوەی (راڤەکردنی) پەرتووکی (الكافية في النحوي ابن حاجب) (لە ساڵی ٦٤٦ ک/ ١٢٤٨ز) کۆچی دوایی کردووە. لە ساڵی( ٨٩٤ ک/ ١٤٨٩ز) لە قوتابخانەی قەجماسی لە شاری حەلەبدا خوێندوویەتی، ئەم قوتابخانە لە لایەن جێگری والی شام قەجماسی چەرکەسی دامەزراوە، کە لە ساڵی (٨٩٢ک/ ١٤٨٧ز) کۆچی دوایی کردووە (النعیمی، الدارس في تاريخ المدارس، ١/ ٤٣٤).

**جاک - جاکی (Chaki):**

جاک تیرەیەکە لە هۆزی خشنانی - خۆشناو لە ناوچەی هەولێر (مسالک الابصار، ٣/١٢٦) و جاکی هەروەها - خاکی لە شەرەفنامە لە هۆزە کوردییەکانی لوڕستانی گەورەیە، نەکراوە لە بارەی ئەو پەیوەندییەی نێوانیان بۆمان روون نەکراوە (تاریخ گزیده، ٥٤١).

لەبارەی ناوی جاکی، سەرچاوەکان دان دەنێن بە پیتی جیم - جاک وشەیەکە لە زمانی کوردی مانای نییە و لە هەندێ سەرچاوەکاندا گۆڕدراوە بە پیتی حارِ بۆ حاکی، بێگومان ناوە راستییەکەی چاکییە (chaki- chak) بە مانای پیاوچاک یان پیاوی بە تەمەن و لە پیاوچاکان شێخ جاکیری زاهدیە (لە ساڵی ٥٩٠ - ٥٩١ ک/ ١١٩٤ - ١١٩٥ز) کۆچی دوایی کردووە) لە پێناوی پیاوچاکانی عێراق لە زوهدی و تەقوا و وەرەع (خواناسی و لە خوا ترسان) (الشطنوفي، بهجة الأسرار، ص٦٢ - ٦٣، المناوي، الكواكب الدرية، ٢/٢٣٥)، ئەمەیش لە هۆزی نەرجسییە لە تیرەی جاوان، بێگومان چاکی پەیوەندی هەیە لەگەڵا زوهیدی، کە ئەمیش لە تیرەی جاوانە و لە رەچەڵەکی بنەماڵەی یەک لە میرەکانی جاکی هاتووە بە ناوی "زوهەیری جاکی" (ذيل مراة الزمان، ٣/ ٩٠).

لە لایەکی ترەوە جاک لە شوێنانی تر هەیە جگە لە هەولێر و لوڕستان، ئەمیر و زانا محەمەدی کوڕی دەرباسی کوڕی ئاساکی کوردی جاکی لە مامۆستایانی ئیمامی زەهەبی بوو، لە رۆژی عەرەفەی ساڵی(٦٢٧ ک/ ١٢٣٠ز) لە شاری روها - ئورفە لە دایک بووە، لە بنەماڵەیەکی پێشکەوتوو و قارەمانیش بوو (الذهبي، معجم الشيوخ، ٢/ ١٨٩، المقريزي، المقفى الكبير، ٥/٦٤٩) واتە دوو ساڵ پێش هاتنی هێرشی مەغۆلەکان، دەشێت باوکی دەرباس لە میرە ئەیوبییەکان بووبێت لە شاری ئورفە.

جاک لەو هۆزانەیە کە سەرچاوەکان ئاشکرایان کردووە لە سەردەمی مەملوکی پاش کۆچکردنی خێزانان و کۆمەڵی جاکی لە شوێنی خۆیان بەرەو وڵاتی شام و میسر و هەندێک لە پیاوانی پلە و پایەی کارگێڕی و سەربازی بەرزیان بەدەست هێناوە لە دامودەزگاکانی بەڕێوەبردنی ئەیوبییەکان و مەملوکییەکان، وەکو میر سەیفەدین ئیبراهیم کوڕی شیروە کوڕی عەلی کوڕی مەرزەبان کوڕی کلۆل جەکوی زوهەیری جاکی (٦٠٠ - ٦٧٣ ک/١٢٠٣ - ١٢٧٤ز)، کە پیاوێکی ئەمین و دەستپاک و بە شەرم و شکۆ و دەروونپاک و لەهجەیەکی (شێوەزار)، باشی هەبوو بە شێوەیەک هاوتای نەبوو، یەکێک بوو لە میرەکانی مەلیک ناسر یوسف میری حەلەب و دیمەشق و کوڕەکەی مەلیک عەزیز (ذيل مراة الزمان، ١/ ٤٥، ٣/ ٩٠، تاريخ الإسلام، حوادث (٦٧١ - ٦٨٠ ک)، ص١٢٤)، کوڕەکەی عەلائەدین ئەحمەدی جاکی کە لە شەڕی (شقحب) لەگەڵ مەغۆلەکان ساڵی (٧٠٢ ک/١٣٠٢ز) کوژرا (النجوم الزاهرة، ٨/ ٢٠٦) میر شەرەفەدین ئیبراهیم کوڕی عەلی جاکی مهمانداد و کوڕەکەی بەدرەدین جاکی و جەمالەدین جاکی و هیتر (الدرة

الزكـــيـــة، ص١٩١، الدر الفــاخـــر،ص٣٦٨ - ٣٦٩، الســلوك،١/٤٦١، ٤٨١، ٧٠١، ٧٤٣، الخطط المقــريزية، ٣/٨٣، عقد الجمان، ١/٣٣٤).

لە ناودارەكانی كوردی جاك لە ولاتی میسر، فەقیھ و زانا شەرەفەدین حوسێن كوڕی ئەلیاس كوڕی یەعقوبی جاكی (لە ساڵی ٧٣٦ك/١٣٣٥ز كۆچی دوایی كردووە) و شێخی زاهید حوسێن كوڕی ئیبراهیمی جاكی (لە ساڵی ٧٣٧ك/١٣٣٦ز كۆچی دوایی كردووە) كە ئەویش كوڕی میر شەرەفەدین ئیبراهیمی جاكی بوو، پیاوچاك بوو، ئامۆژگاری خەڵكی دەكرد و ڕێنمایی دەكردن بۆ كاری ڕاستی و چاكی و خەڵكان سەردانیان دەكرد (تاريخ الجزري، ٣/٩٠٢ - ١٠٠٤، الشعراني، طبقات الكبري، ٢/٢، الكواكب الدرية، ٣/٢٤) مەقریزیش لە بارەیەوە دەڵێت "شەرەفەدین ئیبراهیم ڕۆژی جەنازەی جاكی ڕۆژێكی گەورە بوو و خەڵكان ئامادە بوون و پاشان زیارەتی گۆڕەكەیان دەكرد و لەگەڵ خۆیان نەزریان دەكرد بۆ سەر گۆڕی و دەیانگوت ئەو نزایەی لەسەر گۆڕی بكرێ قەبوڵ دەكرێت، بەم شێوە شەیتان ڕێگای لێ گۆڕین و زۆربەی خەڵكان تا ئێستا لەسەر ئەوە بەردەوامن (الخطط المقــريزية، ٤/٣١٤).

لە شوێنەواری بیناسازی جاك، مزگەوتی جاكیە لە حەكر لە قاهیرە، میر بەدرەدین جاكی ساڵی (٧١٣ك/١٣١٣ز) نوێی كردەوە و فراوانی كرد و وتار خوێندنەوەی تایبەت كردبوو بە براكەی، كە ناوی شێخ حوسێن بوو و زاویەی جاكی، كە ئەویش هەر تایبەت بوو بە خۆی (الخطط المقــريزية، ٤/١١٩، ٣١٤، الكواكب الدرية، ٣/٢٤).

**حەسنانی (خۆشناو):**

لە سەرچاوەكانی سەردەمی عەباسییەكان، ناوی حەسنانی نەهاتووە، یەكەم جار لە سەردەمی مەغۆلەكان ناوی هاتووە، ئەویش تەنها (ابن فضل الله العمري) زانیاری پێشكەش كردووە لەسەریان، تێدەگەین كە نێوان هەولێر و شارەزوور و خەفتیان (ڕواندز) نیشتەجێ بوون، كە بە ولاتی كركار (؟) ناوی دەبەن و ئەم هۆزە دەبێتە سێ تیرە: تیرەی میر عیسای كوڕی شەهابەدین كە گەورەترین تیرەیانە و تیرەی میر عەبدوڵلای كوڕی شەهابەدین زەنكی و دەبێتە دوو بەش بەلی و جاكی، تیرەی فەخرەدین ئەمیر، ژمارەی چەكدارانی حەسەنی دەگاتە هەزار پیاو هەموویان "خاوەن دەروونێكی بە هێز بوون" (مسالك الإبصار، ٣/١٢٦ - ١٢٧).

**حەكەمی:**

لە هۆزە گەورەكانە و بە فراوانی بلاوبوونەتەوە لە ولاتی هەولێر و شارەزوور، هەروەك تێدەگەین لە گوتەی (مسعر بن مهلهل)، كە سەردانی شارەزووری كردووە لە دەوروبەری ساڵی (٣٤١ك/٩٥٢ز) (الرسالة الثانية، ص١٠، معجم البلدان،٣/٣٧٥) لە بارەی مێژووەكەشیان زۆر نەزانراوە، گوتراوە ئەم هۆزە دەچێتە سەر خەلیفە مەروانی كوڕی حەكەمی ئەمەوی، ئەویش تەنها بە پشت بەستن لە ڕووی وێكچوونی زاركی (ذيل مراة الزمان، ٢/٢٢٨) لە ڕاستیدا باپیرە گەورەی حەكەمی لە مەوالی مەروانی كوڕی حەكەم بوو، هەروەك مەقریزی ئەوەی باس كردووە (المقفي الكبير، ٣/٧٧١).

كاتێك دەوڵەتی ئەیوبی لە میسر و شام سەری هەڵدا، میرە حەكەمییەكان پێوەندییان كرد بە سوپای ئەیوبی و لە نێوانیاندا میر (ابو الهيجا السمين) (٥٩٥ك/١١٩٧ز كۆچی دوایی كردووە) لە دیارترین میرە كوردەكان بووە لە خزمەتی سوڵتان سەلاحەددین و لە میرە گەورە سەربازییەكانی بووە. ئەم میرە ڕۆڵی دیاری لە شەڕەكانی سوڵتان سەلاحەددیندا هەبووە بەتایبەتی لە شەڕە گەورەكەی شاری عەككا ساڵی (٥٨٥ك/١١٨٩ز) (الكامل، ٩/٢٠٢ - ٢٣٤ - ٢٣٧)، شاعیر و ئەدیب میر (ابو الطيب خشترين بن تليل بن ابي الهيجاء ابن افشين بن خشترين الكردي الحكمي الاربلي)، لە میسر ساڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ز) لە دایك بووە، ئەو كاتەی كە باوك و مامەكانی لە سوپای ئەیوبی خزمەتیان دەكرد، هەردوو میر (حسام الدين عيسى بن خوشترين) و (عماد الدين احمد بن سيف الدين المشطوب الهكاري)، لە هەولێر ساڵی (٦١٩ك/١٢٢٢ز) كۆچی دوایی كردووە (ذيل مرآة الزمان، ٢/٢٢٧

- ۲۲۹، المقفى الكبير، ۳/ ۷۷۰ - ۷۷۲).

**خەتێ (الخطية):**

هیچ هۆزێک بە ناوی خەتێ لە ناو سەرچاوە مێژووییەکان. نەدۆزراوەتەوە تەنها (ابن الاثیر) نەبێ، کە باسی (ابا الهیجا )ی قەڵەو دەکات - کە یەکێک لە گەورە سەرکردەکانی سوڵتان سەلاحەددینی گەورە بووە - کە کوردی خەتێیە، لە جێیەکی تر دەڵێت: لە کوردی حەکەمییە. (الكامل، ۹/۲۰۲، ۲۳۷).

دەشێت خەتێ تیرەیەک بێت لە هۆزی حەکەمی، کە هۆزێکی گەورە بووە لە هەولێر، خەتێ ئێستا ناوی گوندێکی ئاوەدانە، لە سەدەی نۆزدەهەمی زایینی زۆر بەناوبانگ بوو بە هۆی ئەو رۆڵەی کە (مەلا محەمەدی خەتێ) لە رووداوەکانی میرنشینی سۆران دەیگێڕا.

**رەوادی - راوەندی - رۆندی:**

رەوادی تیرەیەکە لە هۆزی گەورەی هەزبانی، یاخود تیرەیەکی کۆچەر (رەوەند) بێ لەم هۆزە (الكامل، ۹/۱۰۱، وفیات الأعیان، ۷/۱۳۹ - ۱٤۱)، ناوە راستییەکەی لە کوردیدا (رۆند)ە هەروەک لای بەدلیسی چەسپێندراوە (شرفنامە، ص۱۷۳) کە لە هۆزی کۆچەر بوون و گەرمیان و کوێستانیان دەکرد بۆ گەڕان بە دوای لەوەڕ و لەوەڕگە. تیرەکانی هەزبانی کۆچەر و نیمچە کۆچەر وەرزانە جێی خۆیان دەگۆڕی لە نێوان کوێستانان بۆ دەشتی هەولێری بەرین و ناوچەی نێوان هەردوو زێ و هاوینان بۆ چیاکانی ئازەربایجانی رۆژئاوا و ئاران و ئەرمینیا (صورة الأرض، ص۲۰۵، ۲۰٦).

لە لایەکی تر لە هەندێ گێڕانەوەی مێژوویی دەردەکەوێ کە رواد یاخود رەواد، ناوی کەسێتییەکی مێژوویە یاخود نازناوی هەڵگرتووە، ئەو باپیرە گەورەی میرەکانی رەوادی بوو خاوەنی ئازەربایجان، ئیبن حەوقل بەم شێوەیە لە نووسینەکانی دەرکەوتووە: "أبو الهیجاء بن رواد" و "أبو الهیجاء بن رواد" (صورة الأرض، ص۲۸۹ - ۳۰۳)، لای مسکویە (لە ٤۲۱ک/ ۱۰۳۰ز کۆچی دوایی کردووە) ناوی بە (حسین بن محمد بن الرواد) هاتووە (تجارب الأمم، ۲/ ۱۸۰)، وازانراوە کەوا ژیانیان لەو ماوە مێژووییەی کە میرنشینی رەوادی تێدا دەرکەوتووە بەسەر بردووە، بەڵام لە ناو گێڕانەوە مێژووییەکانی دوایین ناوەکەی بە (رەوادی) هاتووە (تاریخ الفارقي، ص۲۰۸ - ۲۰۹، الكامل، ۸/ ۲۷٤، وفیات الأعیان، ۷/۱۹۳).

داب و نەریت لای خەڵکی پێشینان وابوو بە پێی رای یەکێک لە مێژوووناسەکان ناوی باپیر بنووسرێت پاش ناوی کەسەکە لەجیاتی ناوی باب، لەم حاڵەتەشدا مەبەست لە (الرواد) ناوی کەسێک نییە، بەڵکو رەچەڵەکی دەچێتەوە سەر بنی الرواد (حسام الدین النقشبندي، اذربایجان، ص۱۳۵).

مینورسکی دەڵێت: (بنی الرواد) کوردن کە لەسەر شانۆی رووداوەکانی سەردەمی بویهی (دەوروبەری ساڵی ۳٤۳ک/۹٥٤ز) دەرکەوتوون لە نەوەکانی (بنی الرواد)ی عەرەبن لە هۆزی (الأزد)، حاکمەکانی هەندێ لە شارەکانی ئازەربایجان بوون، وەک: (ئورمیە، تەبریز....) لە رۆژگاری خەلیفەی عەباسی (المتوکل على اللـه) (۲۳۲ - ۲٤۷ک/۸٤۷ - ۸٦۲ز)، بەڵگەشی تەنها هاوشێوەی زارەکی بوو لە نێوان ناوی ئەم دوو خێزانە (دائرة المعارف الإسلامیة، مادة آذربایجان، ۱/۱۲۹)، بە بۆچوونی یەکێک لە توێژەران بە بەڵگەی مێژوویی هیچ پەیوەندی و هاوبەندییەک لە نێوان ئەم دوو خێزانەدا نییە (اذربایجان، ص۱۱٤ - ۱۲۷).

کورد بە شێوەیەکی پەرش و بڵاو دوور لە ناوچەکانی ئەرمینیا و قەفقاسیا لە سەردەمێکی زۆر نزیک پێش سەردەمی فتوحاتی ئیسلامی نیشتەجێ بوون، (باب الاکراد) لە شاری (بردعە) و رووباری کوردان (نهر الاکراد) لە ئەرمینیا رۆژئاوای دوبیل - دوین، هەروەها لە هەواڵەکانی فەتحکردنی ئەرمینیادا هاتووە، کە سەرکردەیەکی موسڵمان بە ناوی (حبیب بن مسلمە) لە ئەرجیش سەفەری کرد... لە رووباری کوردان (نهر الاکراد) دەرباز بوو لە مێرگی دوبیل گردبوەوە (فتوح البلدان، ص۲۰۳، معجم البلدان، ۱/ ۱٤٦).

چەندین دەستەی کورد هەبوون لە شارەکانی: بردعە، بیلقان، دوین و وڵاتی ئەرمەن لە سەردەمی عەباسیدا (الدینوري، الأخبار الطول، ص٤٠٥،

مسالك الممالك، ص١٠٩، المقدسي، أحسن التقاسيم، ص٢٨٩).

دەتوانین بڵێین زۆربەیان لە تیرە و تایەفەی رەوادی هەزبانی بوون، محەمەدی کوڕی شەدادی کوڕی کورتک لە سەرۆکەکانی رەوادی بوو، کە توانی میرنشینی شەدادی لە دەوروبەری ساڵی ٣٤٠ک/٩٥١ز دابمەزرێنێ، هەر لەو کاتەدا سەرۆکێکی تری رەوادی میرنشینی رەوادی لە هەرێمی ئازەربایجان دامەزراندووە (لە بارەیەوە بڕوانە: اذربايجان، ص١٣٢ - ١٧٦) رەچەڵەکی ئەیوبییەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ گوندی ئەجنداقان، کە دەکەوێتە سەر باب دوین لە ئەرمینیا، کەوا خەڵکەکەی کوردی رەوادی بوون (وفيات الأعيان، ٧/١٣٩ - ١٤١، سير أعلام النبلاء، ١٥/٤٣٤)، شادی، باپیری سەلاحەددین ئەیوبی لە پیاوانی دیوانی (ابن أبي الأسوار بن منوجهر الشدادي الروادي) بوو، پێش ئەوەی بۆ عیراق بێت لەلایەن برادەری وەفاداری (مجاهدالدين بهروز) کە رحنە (ئەو کەسەی هێمنی و ئاسایشی شاری پێ دەسپێردرا)ی بەغدا بوو بانگهێشت کرابوو (تاريخ الفارقي نشر امدروس صفحات منه في ذيل تاريخ دمشق للقلانسي، ص٣١٦).

چەندین دەستە و کۆمەڵە لە رەوادییە ئەیوبییەکان لەگەڵ نەوەکانی خۆی بەرەو عیراق کۆچیان کرد، هەروەها بۆ وڵاتی شام و میسر و یارمەتی خەڵکیان دەدا، لەوانە میر عومەر بن ئەبی بەکر باوکی فەقیه و زمانزانی بەناوبانگ ابن الحاجب (لە ٦٤٦ک/ ١٢٤٨ز کۆچی دوایی کردووە)، لە خزمەت و یارمەتی ئەسەدەدین شێرکۆ بوو و بەشداری کردبوو لە هەڵمەتەکانی شێرکۆ بۆ سەر میسر و رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو و چەندین سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە میسر و بووەتە حاجب لای میر عیزەدین موسەک بن جەکو کوڕی خاڵی سوڵتان سەلاحەددین (وفيات الأعيان، ٣/٢٤٨).

لە میرەکانی رەوادی لە نێو سوپای مەملوکی (فارس الدين الروادي) (لە ٧٠٦ک/ ١٣٠٦ز کۆچی دوایی کردووە)، میر سەیفەدین محەمەد ئەلرەوادی لە میرەکانی (طبردارية) و کوڕەکەی میر سەیفەدین ئەبو بەکر، کە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی سەربازانی حەلقە (بيبرس الدوادار، زبدة الفكرة، ص١٣٤ - ٢١٥، تاريخ الجزري، ٢/٩٧٩، البداية والنهاية، ١٤/٤٠٦).

لە کۆتاییدا وا پێشبینی کراوە مێژوونووسی بەناوبانگ (ابن حجر العسقلاني) (لە ٨٥٢ک/ ١٤٤٨ز کۆچی دوایی کردووە) خاوەنی دانراوی بە پێز لە بواری فەرمووده و فیقه و وەرگێران و مێژوو یەکێک بووە لە نەوەکانی (احمديل بن ابراهيم بن هسوذان الكردي الروادي) خاوەن و فەرمانڕەوای مەراغە کە لەسەر دەستی باطنیەکان لە بەغدا ساڵی (٥١٠ک/ ١١١٦ز) کوژرا، رەچەڵەکی (ابن حجر) دەگەڕێتەوە بۆ باپیری، کە ناوی (احمديل) بوو، کە دەستخەتی خۆی نووسیوەتەوە لە کۆتایی هەندێ کتێبەکانی (السخاوي، الجواهر و الدرر في ترجمة شيخ الإسلام ابن حجر، ١/١٠١، أنباء الغمر، ١/١٣ "مقدمة المحقق حسن حبشي").

**الـزرزاریـە (زرزاری) - زەرزا - زراری:**

ئەم هۆزە بە پلەی دووەم دێت لە رووی گەورەیی و بەناوبانگی لەنێو هۆزەکانی وڵاتی هەولێر دوای هۆزی هەزبانی، شوێنی نیشتەجێبوونیان چیاکان و بەرزاییەکانی رۆژهەڵاتی هەولێری لە بەشی باکووردا دەگرتەوە، هەروەها ناوچەی چیای ئاڵۆز بە درێژایی لە خەفتیان - رواندز تا ئەشنویە - شنۆ و زنجیرە چیای مرت (مامەروت؟) و جنجرین (کێلە شین) و دەسەڵاتی بەسەر بەشێک لە رێگای بازرگانی نێو دەوڵەتی هەولێر - مەراغە - تەبریز هەبوو (مسالک الإبصار، ٣/ ١٢٩ - ١٣٠، صبح الأعشى، ٤/٣٧٦ - ٣٧٧).

ئەوەی پێوەندی بە بنچینەی (ریشەی) ناوی زرزاری هەبێت، ئەو ناوە کوردییە، هەروەها لە دەستنووسی (مسالک الابصار، ٣/ ١٣٠)دا هاتووە، زرزاری وشەیەکی ئەعجەمییە، کە بە مانای کوڕی گورگ (ولد الذئب) دێت و راستییەکەی کوڕی زێڕە (ولد الذهب)، (ذئب) گورگ گۆڕین و هەڵکردنی نووسینی وشەی (ذهب)ە.

زر = ذهب. زێڕ

زار - زارو = طفل، ولد. منداڵ، کوڕ

"کاترمیر"ی رۆژهەڵاتناس ئاماژە

بەوە دەکــــات (دائرة المعـــــارف الإسلامیـة، مادة أشنه، ٢/٢٢٢).

کــۆمــــەڵێک لەو زرزاریـانـە لە سەردەمی پێش رۆژگاری ئەیوبییەکان، بەرەو وڵاتی شام و میـسـر کۆچیان کرد فـەقـیـه (دانا و شـارەزا لە بنەمـا و رێساکانی ئایین) (محمد بن علي بن رمـضـان الزرزاري) لە دیمەشق سـاڵی (٥٤٧ک/ ١١٥٢ز) لەدایک بووە و لە ساڵی (٦٢٩ک/ ١٢٣٢ز) کۆچی دوایی کـــــردووە (الذهبي، تاریخ الإسلام، ص٣٧٥).

لەگــەڵ ســەرهەڵدانی دەوڵەتی ئەیوبی لە مـیـسـر، پیـاوانی زرزاری پێـوەندیان بە سـوپا و سـەربازگـەی ئەیوبی کردووە، هەندێک لەو کەسانە پــلـــە و پـــایـــەی بـــەرزیـــان بـــە دەسـتکەوتووە، لەوانە (شـێـرکـۆ بن باخل زرزاري) و نەوشیروان ئەلزرزاری و جـەمـالەدین خـوشـتـرین ئەلزرزاری (ابن شــداد، النوادر السلطانیـــة، ص١٩٤، سـنـابـرق الشــــــــامـي، ص٢٠٣)و مـیـری گـەورە (شروین بن الحسن الزرزاري) کە لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوەڵانی لە رزگـارکـردنی قـودس (بیت المقــدس) ســاڵی ٥٨٣ ک/ ١١٨٧ز کـوژران (تاریخ الإســلام، حوادث، رووداوەکانی (٥٨١ - ٥٩٠ ک، ص١٥٢)، مـــیـــــر (بەدرەدین زرزاری) لە مـیـرەکـانی مـەلیک پاشا الناصـر یوسف مـیـری حـەلەب و دیمەشق، کە لە هەڵمەتی ئەیوبییـەکان بۆ سـەر مـیـسـر سـاڵی (٦٤٨ک/ ١٢٥٠ز) کـــــــوژرا (الـسـلـوک، ١/٣٧٥) و میر سەیفەدین زرزاری و چـەنـدانـی تـریـش (الـروض الـزاهـر، ص١٧٠).

هەروەها کۆمەڵێک لەو زرزاریانە لە سنجــار هەر لە ســەدەی (٦ک/ ١٢ز) نیـشـتـەجێ بوون، لە سـاڵی (٥٧٨ک/ ١١٨٢ز) کـــــــاتێ سەلاحەددین گەمارۆی شاری سنجاری دا، توانی دەست بەسـەر سـەربازگـەی ئەتابەگی موسڵ دابگرێت، یەکێک لە میـرەکانی زرزاری بە نهێنی پێـوەندی بە قەڵاکە کرد، ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ ئاسـانکردنی دەست بەسەر داگرتنی ئەم قـــەڵایـە (الکامل، ٩/١٥٨)، هەروەها قـــازی شـــافـــعی نـاســـراو بەدرەدین یوسف بن حـــســن بن علي السنجـــاري (لە ٦٦٣ک/ ١٢٦٥ز کۆچی دوایی کردووە) و براکەی قازی بورهانەدین خـــضـــر (لە ٦٨٦ک/ ١٢٨٧ز کـــۆچی دوایی کـــردووە) زرزارینە، کە دوو قازی گەورەی میسر بوون لە سـەردەمی ئەیوبیـیـــەکـان و دەرکـەوتنی سـەردەمی مـەملوکی، بەدرەدین (کە کەسایەتییەکی زۆرباش و بەناوبـانـگ و ســــەرکـــردە بوو) (الصـقـاعي تالي کـتـێب وفـیـات الأعیان، ص٦٩ - ١٦٨).

زرزاری کـــۆمــــەڵێک پیــــاوانی سیـاسی و زانا و زانیـار و فـەقـیـه و قازییان لێکەوتۆتەوە، لەوانە:

(ابو الحـسن علي بن السـلار) نازناوی (الملک العادل سیف الدین)، وەزیری خەلیفە (الظافري) فاتیـمی بووە بۆ مـاوەی پێنج ساڵان (٥٤٣ - ٥٤٨ک/ ١١٤٨ - ١١٥٣ز)، ئـیـبن خەلەکـان دەڵێت: "لە هەندێ مێـژووی میسر ئەوەم دیت، کە نووسراوە کوردی زرزاری بوو" (وفـیـات الأعـیـان، ٣/ ٤١٦ - ٤١٨).

خـــێـــزانی (خـــانەوادەی) ئیبن خەلەکان کە بەناوبانگترینیان قازی و مێژوونووس ئەبو عەباس شەمسەدین ئەحمەد بن مـحەمەد بن ئیبـراهیم بن ئەبی بەکـر بن خـــەلەکـــان (٦٠٨ - ٦٨١ک/ ١٢١١ - ١٢٨٢ز) خاوەنی کـتـێبی (وفیات الأعـیان)، ئیبن خـەلەکـان بە مـوسـای کـوڕی راگـــەیاند، کـــە ئەوان بە رەچەڵەک دەگەڕێنەوە بۆ هۆزی زرزاری و باوک و دایکی خـەڵکی شـاری (بەڵخ)ن، کە یەکـێکە لە ناوچەکـانی خـوراسـان (وفـیـات الأعـیـان، مـقـدمـة المحقق، ج٣، الصفحة ط).

ئیبن خـــەلەکـــان دوای ئەوەی ناوبانگی بەدەست هێنا، خۆی خستە ریزەکانی بەرمەکییەکان، ئەمـەشیان هەردەم وای لێکرد دەمـەقـاڵێ لەگـەڵ ناحـــەزانی بکات، هەروەها چەندین کەسـانی تر هەڕەشە و گورەشەیان لێ کرد لەوانەش خەڵکی دیمەشق، یونینی (لە ٧٢٦ک/ ١٣٢٦ز کـۆچی دوایی کـردووە) دەڵێت: "وا گـوێم لێ بووە کـەوا رەچەڵەکـیـان دەچێـتـەوە سـەر بەرمەکییەکانی ئەبو شامە و هەروەها دەســـتنووســێکم دەست کـەوت لە مــێــژووی هەولێــر (تاریخ أربل)ی "شـەرەفەدین ئیبن مسـتەوفی"یە، کە باسی مـردنی (ئامـۆزاکەی) (قـاضي القــضــاە) واتە "ئیبن خــەلەکــان" دەکـات، دەرکـەوتووە کـە رەچەڵەکی دەچێـتـەوە سـەر بەرمەکـییـەکـان پێش ئەوەی لە هەولێــر (اربل) دەربچێ، کەمالەدین - واتە ابن العدیم - باس

دەکات کە رەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر بەرمەکییەکان) (الوافي بالوفيات، ٢٠٤/٧). هەروەها لەو بەشەی مێژووی ئەربل (هەولێر) بۆ خاوەنی کتێبەکە لە ئیبن مستەوفی دەگەین و بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هەردوو ئامۆزای ئیبن خەلەکانن، ئەوانیش فەقیە عومەر بن خەلەکان (لە ٦٠٩ک/ ١٢١٢ز کۆچی دوایی کردووە) و حوسێن بن خەلەکان (لە ٦٢٢ک/ ١٢٢٥ز کۆچی دوایی کردووە) و کەوا بە هیچ شێوەیەک رەچەڵەکیان بۆ بەرمەکی ناگەڕێتەوە (تاريخ اربل، ١/ ٢٨٣، ٣٣٣)، بەڵکو لە وەرگێڕانی عومەر بن خەلەکان دەڵێت: "لە گوندێکی بەناوبانگ بووە، کە رێ و رەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ کورد" (تاريخ اربل، ٢٨٣/١)، لە وەرگێڕانی (ابن الشعار الموصلي) (لە ٦٥٥ک/ ١٢٥٧ز کۆچی دوایی کردووە) بۆ یەکێک لە خانەوادەی خەلەکان دەڵێت: "لە نەوەی کوردانە" (قلائد الجمان، ٤٧٧/١ نقلا من مقدمة احسان عباس لكتاب وفيات الأعيان، ج٧).

راگەیاندنی ئیبن خەلەکان کەوا دەچێتەوە سەر بەرمەکی فورس وای لە خەڵک کرد، کەوا بڵێن رەچەڵەکی زرزاری فورسە، عومەری دەڵێت: "زرزاری ئەو کوردانەن لە عەجەمی ملوکی - واتە بەرمەکی - " (مسالك الابصار، ٣/ ١٣٠، صبح الأعشى، ٣٧٦/٤).

خانەوادەی خەلەکان لە خێزانێکی کۆنی شاری هەولێرە، کە مێژووەکەی پێش سەردەمی قازی ئیبن خەلەکانە بە سێ سەدە بەلای کەمی، ئەبو ئەلقاسم بن عوبەیدوڵڵا بن خەلەکان لە هاوەڵانی نزیکی شاعیر ئەبی تەیب موتەنەبی (٣٠١ - ٣٥٤ک/ ٩١٣ - ٩٦٥ز)بووە و پەیوەندییان زۆر گەرم و گوڕ بووە و دیارییان بە یەکتری دەبەخشی، عوبەیدوڵڵا دیارییەکی پێشکەشی موتەنەبی کردووە، کە بریتی بوو لە ماسییەکی لە شەکر دروستکراو و باوی و هەنگوین، بۆیە موتەنەبی لەم چەند دێرە وتی:

**قد شغل الناس كثرة الأمل**
**وأنت بالمكرمات في شغل**
**تمثلوا حاتما ولو عقلوا**
**ولكنت في الجد غاية المثل**
**أهلا وسهلا بما بعثت به**
**أيهاً أبا قاسم وبالرچسچل**

هەروەها لە بۆنەیەکی تردا ئەبولقاسم دیارییەکی تری پێشکەشی کرد، کە بریتی بوو لە مەنجەڵێک حەلوا، ئەمیش لەسەر ئەم مەنجەڵە چەند دێرە شیعرێکی بۆ نارد:

**أقصر فالست بزائدي ودا**
**بلغ المدي وتجاوز الحدا**
**أرسلتها مملوءة كرما**
**فرددتها مملوءة حمداً**
**جاءتك تطفح وهي فارغة**
**مثني به وتظنها فردا**

- خێزانی بەنوو زرزاری، لە وانەش فەقیهی شافیعی ئەبو محەمەد ئیسماعیل بن سەعید بن ئیسماعیل زرزاری و ئەبو یەعقوب بن سەعید زرزاری و ئەبو حەفسە عومەر بن محەمەد بن سەعید بن ئیسماعیل زرزاری (تاريخ اربل، ١/ ٢٧١، ٢٧٥، ٢٧٦).

- ئیبراهیم بن عەلی زرزاری لە ساڵی (٧٤١ک/ ١٣٤٠ز) کۆچی دوایی کردووە (الدرر الكامنة، ١/ ٥٠).

- فەقیهی مالکی محەمەد زرزاری لە مانگی شەعبان لە ساڵی (٨٠٠ک/ ١٣٩٨ز) کۆچی دوایی کردووە (أنباء الغمر، ٢/ ٣٣).

سەرچاوەکانی مێژوویی (تاريخ اربل و تاريخ الإسلامي الذهبي والوافي بالوفيات والدرر الكامنة والضوء اللامع....) چەندین ناوی درەوشاوەی زرزاری تێدایە.

لەسەر ئاستی رامیاری، سەرۆکەکانی زرزاری هەڵساون بە دامەزراندنی هاوشێوەی میرنشینی بچووک سەر بە فەرمانڕەوایانی هەولێر، کە بنکەکەیان قەڵای خفتیانی شوورەدار بووە، بۆیە بە خفتیانی زرزاری بەناوبانگ بووە، یاخود خفتیانی ئەبی عەلی زرزاری ئاماژەیە بۆ (میر جەمالەدین ئەبی عەلی)، چاکتر (معجم البلدان، ٣٨٠/٢، وفيات الأعيان، ٥٠٥/٣، مسالك الابصار، ٣/ ١٣٠).

هەروەها شارەکانی ئەشنویە و سیدەکان و باڵەکان و مازکرت و.....هتد لە ژێر حوکمی زرزاری بوون، لە میرەکانی لە کۆتایی چاخی عەباسیدا حسامەدین داود خفتیانی لە میرەکان خەلیفەی ناسری عەباسی (٥٧٥ - ٦٢٢ک/ ١١٧٩ - ١٢٢٥ز) (معجم الالقاب، ٤٩٣/٤).

خەفتیان بۆ ئاسانی بێژە (لفظ)

سووک بووه له زمانی کوردی بۆ هاودیان، که شارۆچکەیەکی ئاوەدانه "که لەسەر لوتکەی چیایەکه له ژێرەوەشی رووبارێکی گەورەی پێدا تێپەڕ دەبێت و لەگەڵ بازارێک و دۆڵێکی گەورە" (معجم البلدان، ٢/ ٣٨٠)، که خانەی دادوەری و بەشەکانی تری میرنشینەکەی لێ بوو، له قازییەکانیش بەهائەدین عەبدولعەزیز بن محەمەد عومەری ناسراو به قازی خەفتیان، بەڵام کورەکەی نووسەر (الکاتب) مەجدەدین ئەبو محەمەد موسا ئەوەی که هاته لای ئیبن فوتی مێژوونووس له شاری مەراغه ساڵی (٦٦٥ک/ ١٢٦٦ز). نووسەرێکی به توانا بوو شارەزایی هەبوو له بواری ژمێریاری و کاروباری وڵاتەکان، شارەزاییەکی تەواوی هەبوو له بەڕێوەبردنی کاروبارەکان (معجم الالقاب، ٤/ ٥٤٢).

له ساڵی (٧٠٠ک) خاتون توتاکج کچی هۆلاکۆ قوتابخانەیەک و ریباتێکی له خەفتیان دروست کردووه (معجم الالقاب، ١/ ٢٤٦).

زرزاری که به زرزا ناسرا هەر مایەوه - زراری هۆزێکی گەورەیه که زۆر به هێز و به توانا بوو تا سەردەمی عوسمانییەکان، پارێزگاری له میرنشینەکەی خۆی کرد، که له ماوەی کۆتایی چاخی ناوەڕاست پێکهاتبوو لەو سنووره جوگرافیایەی، که ئێستا سنووری کارگێری شنۆ و لاهەیجان دەگرێتەوه، بەدلیسی بەشێکی له ناوەرۆکی شەرەفنامه بۆ میرنشینی زەرزا تەرخان کردبوو، بەڵام باسی مێژووەکەی نەکردووه کەوا دیاره زانیاری تەواوی لەسەر نەبووه.

بیر بوداق به دامەزرێنەری میرنشینی بابان، به هێز ناوچەی لاجان - لاهەیجانی له هۆزی زەرزا داپڕیوه و ئەویش له کۆتایی سەدەی پازدەهەمی زایینی بوو (شرفنامه، ص٤٧٤).

**شیروی - شیروینی - شیرویان:**

هۆزێکی گەورەیه له ویلایەتی (صاصۆن، حزو، عزو) له باسی کوردستانی باکوور له سەرەتاکانی سەدەی نۆیەمی کۆچی/ پانزدەیەمی زایینی ناوی هاتووه، میر حسن شیرویی هاوچەرخی میر شەمسەدینی دووەمی روزکی بووه، که میری بەدلیس بووه (شرفنامه، ص٣٧٣ - ٣٧٤ - ٦٢٧ - ٦٢٨).

بەدلیسی به دوو شێوه ناوی هێناون: شیروی و شیرویان، له یەکێ له نوسخەکانی دەستنووسی شەرەفنامەدا ناوی هاتووه به (شروین) (شرفنامه، ص٣٦٣، ٤٠٨)، هەروەها هۆزێکی تر هەیه به ناوی شیروا، که لەوانەیه له تیرەی شیروان بن له ویلایەتی (صاصۆن) - له رێچکه و لقەکانی بوختی - بۆتانی، که دانیشتووی ناحیەی (طنزه)ن، که سەر به جەزیرەی بۆتانه (شرفنامه، ص٢٧٤).

شیروان خێزانێکی دەسەڵاتدار بوون لەنێو دەیان خێزان و بنەماڵەی دەسەڵاتداری کورد، که شوێنی دانیشتنیان قەڵای کفرا بوو، که دەکەوێته باکووری شاری سعرت، خاوەندارییەکەی (زەوی و زارەکەی) قەڵای ئیروان، شبستان - کرنی دەگرتەوه، اویل (شرفنامه، ص٤٠٥ - ٤١٢)، هەروەکو شیروا له قەڵای دیاریەکر بووه (الأعلاق الخطيرة، ٣/ ٢٤٨).

شروه - شروین ناوێکی کوردی رەسەنه و ناوداره له مێژووی کورددا، چەند کەسایەتییەکی کوردی جۆراوجۆرمان هەیه له چاخی ناوەڕاست ناویان (شیروه) - (شیروین) بووه، وەکو (شیروه بن مم) له میرنشینی دۆستەکی - مەروانی، شیروەی باوکی میر بەدرەدین هەکاری و شیروین کەلالی له میرەکانی هەولێر له کاتی داگیرکاری مەغۆلەکان، شیروەی باوکی میر سەیفەدین ئیبراهیم کوردی جاکی (له ٦٧٣ک/ ١٢٧٤ز کۆچی دوایی کردووه) و (شیروین ئەمیر محەمەدیه) و چەندانی تر (تاريخ الفارقي، ص٧٥ - ٧٧، معجم البلدان، ١/ ٣٢٨، سنا البرق الشامي، ص٢٧٧، تاريخ الملك الظاهر، ص٣٣٣، ذيل مرآة الزمان، ٣/ ٨٩ - ٩٠، مسالك الأبصار، ٣/ ١٣٤).

هەروەها شێروان ناوی ناوچەیەکه پێی دەڵێن شێروان مازن، که سەر به قەزای مێرگەسۆره، مێژوونووسی کەنیسەی تۆما مەرجی (تۆماس مەرکه) خاوەنی پەرتووکی (الرؤساء) (سەدەی ٣ک/ ٩ز) له دێی (نحشون) له ناوچەی بیت شارونایا (شیروان) له دایک بووه، که سەر به هەرێمی حدیاب (هەولێر)ە (كتاب الرؤساء، مقدمة المعرب الأب البير أبونا، ص٣).

ئەوەی پەیوەندی بە رەچەڵەکی میرەکانی شیروان هەیە، کە خاوەنی قەڵای کفرا و دەوروبەرین، بەدلیسی بۆمان دەگێڕێتەوە کە: «باوک و باپیرانیان لە سەرەتادا لە وەزیرەکانی دەسەڵاتداری ئەیوبی بوون، کاتێ دەسەڵات لە هەردوو وڵاتی میسر و شام ساڵی (٦٦٢ک/ ١٢٦٣ز) لەو چینە سەنرایەوە، ئەو خێزانە ناودارە بەرێکەوتن لەگەڵ یەکێ لە نەوەکانیان، کە باپیرەی مەلیکەکانی (حصن کیفا) بوو کۆچیان کرد بۆ ئەم شوێنە، لە ریوایەتێکی تر رەچەڵەکی ئەوانە دەگەڕێتەوە سەر رەچەڵەکی مەلیک (شیروان) (شرفنامە، ص٤٠٥، بڕوانە ص٣١٥). لە مێژووی ئەیوبییەکان نەبیستراوە کە لە مەلیکەکانی بنەماڵەی ئەیوبی هیچ وەزارەتێکیان وەرگرتبێ ناوی وەزیرەکە شیروان - شروە بێ تەنها میر شروە - شروین مەهرانی نەبێت، کە ناسراوە بە (سبع مجانین) لە میرەکانی (الملك الاشرف بن الملك الكامل) (٦١٥ - ٦٣٥ك/ ١٢١٨ - ١٢٣٧ز) (ابن نظيف الحموي، التاريخ المنصوري، ص٩٠ - ١٦١) ئەوەی جێی متمانەیە، کە ئەو میرە (وەزیرە) لەنێو هۆزی شیروان ناوی هاتووە، ئەوە "نەجمەدین مەحموود - جەمالەدین" لە سەرچاوە فارسییەکاندا - (بن تاجەدین عەلی بن سروین شێروانی کوردی) بە "وەزیری بەغداد" ناسراوە، کە راسپێردرا بە وەرگرتنی وەزارەت لە حکومەتی مەغۆلە ئیلخانییەکان لە بەغدا ساڵی (٧٣٦ ک/ ١٣٣٥ز) لە لایەن عەلی پادشا فەرمانڕەوای دیاریەکر لە پاش وەرگرتنی دەسەڵات، موسا خان کوڕی عەلی کوڕی بایدو کرا خانی (حاکمی) بەغدا، کە لە نەوەی هۆلاکۆ بوو، وەزارەتیش درا بە نەجمەدین مەحموود شێروانی (خواند میر، حبيب السير، ٣/١/٢٢٥، دستور الوزراء، ص٣٣٢ - ٣٣٣، عبدالرزاق سمرقندي، مطلع سعدين، ١/ ١٣٠).

هەریەک لە عەلی پادشا و موسا خان لەناو جەرگەی توند و تیژییەکان لە نێوان هێزە جەنگاوەرەکان لەسەر بەدەست هێنانی عەرشی مەغۆلی هەردوو ساڵی (٧٣٧ - ٧٣٨ک/ ١٣٣٦ - ١٣٣٧ز) کوژران، وەزیر نەجمەدین پاش کوشتنی موسا خان هەڵات لە کۆتاییەکانی ساڵی(٧٣٧ک/ ١٣٣٧ز) لەگەڵ حەسانەدین حەسەن غوری، لە مانگی (صفر)ی (٧٣٨ ک/ ١٣٣٧ز) گەیشتە میسر، ناسر محەمەد پێشوازی گەیشتنی لێکردن و سەروەت و سامانێکی زۆری پێ بەخشی و پلەی (أمير طبلخانە)ی پێدا، لە سەرەتای ساڵی( ٧٤٢ک/ ١٣٤١ز) شا مەنسوری کوڕی ناسر بە وەرگرتنی وەزارەتی دیاری میسری رایسپارد و بەردەوام بوو لە پۆستەکەی مانگی رەجەبی ساڵی (٧٤٣ک/ ١٣٤٢ز) پاشان لە مانگی (ذي الحجة) بە وەزیری مایەوە تا مانگی ربيع الآخر ساڵی (٧٤٥ک/ ١٣٤٤ز) ئیتر بەجێی هێشت و لە شەڕی ساڵی (٧٤٨ک/ ١٣٤٧ز) کوژرا و گەڕاندیانەوە قاهرە "وەزیری بەغدا پێشوازی لێکرد" و لە درب ملوخيا نێژرا (البداية والنهاية، ١٤/ ١٧٧، الخطط المقريزية، ٣/ ٩٤، الدرر الكامنة، ٤/ ٢٠٢ - ٢٠٣).

وادیارە نەوەکانی (منداڵەکانی) لە پاش کوشتنی گەڕانەوە بۆ کوردستان لەگەڵ زانینی ئەوەی، کە تاجەدین عەلی شێروانی باوکی وەزیر نەجمەدین فەرمانڕەوا بووە لە هەندێک ویلایەتەکانی عەرەبستان بە گوێرەی دەربڕینی سەرچاوە فارسییەکانی دوایی و مەبەست لێرە هەردوو ویلایەتی دیاربەکر و دیار رەبیعەیە (دستور الوزراء، ص٣٣٢، مطلع سعدين، ١/ ١٣٠)، خوافی (لە ٨٤٩ک/ ١٤٤٥ز) کۆچی دوایی کردووە، ناسراوە بە ئەمیر مەحموود کوڕی ئەمیر عەلی سەروان دیاربەکری (مجمل فصيحى، ٣/ ٤٨).

**القرتاويە - کرتاوی - گەردی Gardi؟:**

لە هۆزەکانی وڵاتی هەولێر بوو لە ماوەی سەردەمی مەغۆلەکاندا، شوێنی نیشتەجێبوونیان لە ناوچەی بەست (بەستۆرە) دەستی پێدەکرد و درێژ دەبۆوە تاکو دەربەندی قەرابلی (قەرەبۆلی - دەربەندی گۆمەسپان)ی دەگرتەوە (؟) و گەلێک شوێنی تر و بۆ پاسەوانی دەربەندەکە پشتیان بەم هۆزە و هەروەها پارێزگاریان لە بازرگانان و گەشتیاران (رێبواران) دەکرد، لێکچوونی بێژەیی (لفظی) لە نێوان کرتاوی گەردی هەیە، هەرودکو هەردووکیان لە هۆزەکانی هەولێر بوون (مسالک الابصار، ٣/ ١٢٦ - ١٢٧).

**گەلالی - جەلالی - (Gallalli):**
جەلالی یا گەلالی یەکێکە لە گەورەترین هۆزەکانی شارەزوور و داقوق و کەرخینی (کەرکووک) و دێرین و رەسەنە، یەکەم هەواڵ لە بارەیەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٢٦٧ک/ ٨٨١ز) (الکامل، ٦/ ٣٦)، لە ساڵی (٣١٤ک/ ٩٢٦ز)، کوردە جەلالییەکان شۆڕشیان بەرامبەر (أبي الهێجاء عبدالله بن حمدان)ی والی موسڵ و شارەزوور کردووە (الکامل، ٦/ ١٨٣).

لە سەرچاوەکانی سەردەمی عەباسی، ناوی ئەم هۆزە بە (الجلالية - جەلالی) هاتووە، کە ئەمەش بە عەرەبکردنی ناوی (گەلالی)یە (التنبيه والإشراف، ص٩٤، مروج الذهب، ٢/ ١٢٤، الرسالة الثانية، ص١٠، الکامل، ٦/ ٣٦)، بەڵام لە سەرچاوەکانی سەردەمی مەغۆل و هەروەها لە سەرچاوەکانی مەمالیک جارێک ناوی بە گەلالی هاتووە، جارێکی تریش ناوی بە جەلالی هاتووە (تاريخ الملك الظاهر، ص٣٣٣، الروض الزاهر، ص٨٨، مسالك الأبصار، ٣/ ١٢٥ - ١٢٦، نهاية الأرب، ٢/ ٧ ٣٠)، بەڵام نەقشبەندی لەو بڕوایەدایە، کە گەلالی جیایە لە جەلالی، بەڵکو هۆزێکی تری سەربەخۆیە و پێوەندی بە جەلالی نییە و تا ئێستاش هەریەک لە جەلالی و گەلالی بە ناوی کۆنی خۆیان ماونەتەوە «الرسالة الثانية لمسعر بن مهلهل و شهرزور، مجلة جامعة السليمانية، العدد (٨) ص٢١٨»، بەڵام لە گوتەی مێژوو نووسەکاندا وامان بۆ دەردەکەوێت، کە جیاوازی ناکەن لە نێوان گەلالی و جەلالی، میر شەرەفەدین کوڕی سالار میری هەولێر و ئەشنۆیە لە کۆتاییەکانی چاخی عەباسی و لە سەروبەندی شالاوی مەغۆلەکان بە رەچەڵەک دەیگەڕێنێتەوە بۆ سەر گەلالی (تاريخ الملک الظاهر، ص٣٣٣، الروض الزاهر، ص٨٨) لە کاتێکدا هاوچەرخەکانی وەک فەقیە ئەبا حەسەن عەبدوڵلا کوڕی شروین دەیگەڕێنێتەوە بۆ جەلالی و ئەمەش لە خەڵکی گوندی بالکبای نزیک هەولێرە و لە هاوڕێیانی یاقوتی حەمەوی بوو (لە ٦٢٦ک/ ١٢٢٩ز کۆچی دوایی کردووە)، (معجم البلدان، ١/ ٣٢٨). هەروەها دیسان عزەدین عەبدولعەزیز (الکاتب الاربلي) رەچەڵەکیان دەگەڕێنێتەوە بۆ جەلالی (معجم الالقاب، ١/ ٢٣٦)، هەروەها هەموو لقەکانی جەلالی کە لە درتنک و کەرخینی و داقوق و هەولێر و ئەشنۆیە بلاو ببوونەوە لەو سەردەمەدا بە گەلالی ناسرا بوون (مسالک الابصار، ٣/ ١٢٥ - ١٢٦).

لە ناودارانی جەلالی لە ماوەی سەردەمی ئەتابەکی میر موجاهەددین بزان بن مامین کوردی (میری کوردان) (لە ٥٥٥ک/ ١١٦٠ز کۆچی دوایی کردووە)، خاوەنی (صرخد) و یەکێک لە پێشەنگەکانی سوپای نوری (نورەدین مەحموود کوڕی زەنکی) بوو لە دیمەشق و وڵاتی شام، کۆشش و دەستی چاکی وەشاند لە بەرەنگاری خاچپەرستەکاندا، قەلانسی هاوچەرخی لە بارەیەوە دەڵێت «...بە شەهامەت و ئازایەتی و رای باش بووە، ناوی دەرکردبوو لە هەڵوێستەکانی جەنگدا ناسرابووە.... بە ئازایەتی و زاتکردن و لێبووردەیی دەناسرا، کۆڵنەدەر بوو لە بارەی نوێژکردن و بەخشندە بوو، بەرامبەر نەداران و زەبوون و هەژاران....» (ذيل تاريخ دمشق، ص٣٠٦ - ٣٥٩، الروضتين، ١/ ٣٤٢ - ٣٤٣، الدارس في تاريخ المدارس، ١/ ٤٥٢).

میر موجاهەددین لە سەروەت و سامانی تایبەتی خۆی مزگەوتێکی لە دەوروبەری (باب الفراديس) لە دیمەشق دروست کرد و هەروەها قوتابخانەی (المجاهدية)، میر موجاهەددین لە ساڵی (٥٥٥ک/ ١١٦٠ز کۆچی دوایی کردووە) (ذيل تاريخ دمشق، ص٣٠٦، ص٣٥٩، الأعلاق الخطيرة، ١/ ٢٤٨، الدارس، ٢/ ٤٥١ - ٤٥٥).

لە ماوەی سەردەمی مەغۆلەکانیشدا گەلالی نیشتەجێی سێ شوێن بوون، چینێکیان لە دانترک نیشتەجێ بوون، (؟) و نەهاوەند تا نزیک شارەزوور، چینێکی تریان لە دەوروبەری داقوق و کەرکووک نیشتەجێ بوون، چینی سێیەم لە ئەشنۆیەی سەر بە هەرێمی ئازەربایجان (مسالک الابصار، ٣/ ١٢٥)، هەروەک لە ناوچەی هەولێر گەلالی دەبینن، مەلیک شەرەفەدین کوڕی سالار لە هۆزی گەلالی بوو. هەروەک باس کرا و کاتێ شەرەفەدین لە ساڵی ٦٥٨ک/ ١٢٦٠ز کوژرا،

ئەندامانی هۆزەکەی لە مەغۆل یاخی بوون و هەولێریان جێهێشت و کشان و چوون بۆ وڵاتی شام و پێوەندییان کرد بە مەمالیکەکان لە نێویاندا میر تاجەدین شەروان کوڕی حەمدان (راستییەکەی سالار) برای مەلیک شەرەفەدین و کوڕە خوشکەکەی میر روکنەدین و لە گەڵیاندا حەفتا سوارە (تاریخ الملك الظاهر، ص٣٣٣، مسالك الأبصار، ٣/ ١٢٥).

لە گەلاڵی ئەشنۆیە و هەولێر نووسەر و ئەدیب و پیاوانی کارگێڕی پێگەیشتوون، لەوانەش:

* فەقیه (دانا و شارەزا لە بنەما و رێساکانی ئایین) ئەبو حەسەن عەبدوڵڵا کوڕی شروین جەلالی (معجم البلدان، ١/ ٣٢٨).

* کاتب (نووسەر) عزەدین ئەبو مەجد عەبدولعەزیز عەلی کوڕی ئەبی هەیجای ئەربیلی جەلالی سەرپەرشتکاری کوفە (معجم الالقاب، ١/ ٢٣٦).

* ئەدیب عزەدین ئەبو عەلی حەسەن کوڕی عەلی ئەبی هەیجای ئەربیلی، برای عزەدین عەبدولعەزیز،کە شاعیر بوو ساڵی ٦٨٧ک/ ١٢٨٨ز چەند دێرە شیعرێکی بۆ (ابن الفوطي) وتووە (معجم الالقاب، ١/ ١٣٥).

ئێستا هۆزی گەلاڵی لە چەند ناوچەیەکی جیاجیای کوردستان بلاوبوونەتەوە (الرسالة الثانية و شهرزود، ص٢١٨ - ٢١٩).

**لەک:**

لەک، هۆزێکی گەورەیە، دەیان لق و تیرەی لەخۆ گرتووە، بێ ئەوەی لە لوڕی رەسەن بن، یەکێک لە مێژوونووسەکان ئەم هۆزە لەنێو هۆزەکانی لوڕ دادەنێت (منتخب التواريخ، ص٥٣)، لە پێشوو تا ئێستاش نیشتەجێن بە بەشێکی باکووری رۆژهەڵاتی لوڕستانی بچووک لە شارەکانی وەک کوهدەشت و هەرسین و نوراباد، دەڤەرەکەیان بە (لەکستان) ناسراوە، ئەوەی پێوەندی هەبێت بە بنچینەی ناوی ئەم هۆزە بە (لەک)کە لە فارسیدا بە واتای سەد هەزار دێت (محمد امين زكي، كورد و كوردستان، ١/ ٣٩٢)، راڤەی بلاو (باو) لە نێو هۆزی لەکدا لەبارەی بنچینەی ناوەکەیان ئەوەیە، کە ئەوان گەلێکن لە ناوەراستی نێوان لوڕ و کورد و پاشان ناوەکەیان پێکهاتووە لەکۆی لێکدراوی هەردوو پیتی یەکەمین لە هەردوو وشەی لوڕ و کورد (ل +ک).

لەک وەک هەموو هۆزەکانی لوڕستانی بچووک و کرماشان، چەند لقێکی لە شوێنانی تر هەیە، لەوانەش لەنێو هۆزە کوردییەکانی دەوروبەری موسڵ هەر لە سەرەتاکانی سەردەمی عوسمانی لە کەمترین خەمڵاندندا (كوردستان الجنوبية، ص١٧) و تا ئێستاش لق و تیرەی لەک لە هەردوو پارێزگای هەولێر و کەرکووک نیشتەجێن.

لە ناودارانی رەچەڵەکی لەک، پیاو چاک "ئیبراهیم لەک" لە زاهیدەکانی چاخی ئیسلامی دواین، کە گۆڕەکەی بووە خاک دوای ئەوەی گومەزێکیان لەسەر گۆڕەکەی دروست کرد خەڵک سەردانیان دەکرد بۆ پیرۆزی و موتفەرک، تەیمور لەنگ لە رێگای چوونی بۆ بەغدا ساڵی (٧٩٥ک/ ١٣٩٣ز) سەردانی کردووە (شامي، ظفر نامة، ص١٣٨ - ١٣٩، روضة الصفا، ٦/ ٢١٥، التأريخ الغياذي، ص١٨٥).

**هەزبانی - هزبانی - هۆزەبانی:**

هۆزێکی گەورەی رەسەن و ناسراوە هەر لەو کاتەوەی، کە مێژوونووسە موسڵمانەکان ئاشنایەتییان لەگەڵ مێژووی کورددا پەیدا کردووە، ئەم هۆزە لە سەرانسەری ناوچەیەکی پان و پۆڕ لە هەردوو هەرێمی جەزیرە و ئازربایجاندا نیشتەجێ و بڵاوبوون، دەتوانین بڵێین وڵات و شوێنی نیشتەجێبوونیان هەولێر و دەوروبەری دەگرتەوە، ناوچەی نێوان هەردوو زێی سەروو و خواروو، کە شوێنی هاتوچوویان بووە، ئاوزێلی (حەوز) رووباری خازر و مێرگی (سەوزایی) موسڵ، ناوچەکانی مەراغە و تەبریز و سەلماس و ئەشنویە (شنۆ) و (نریز) و ناوچەکانیان لە هەرێمی ئازەربایجان، تیرە و تایەفەی هەزبانی کۆچیان کردووە بەرەو باکوور بە ئاراستەی ئەرمینیا و قەفقاسیا بەدوای لەوەڕگا و پاشان لە شار و گوندە جیاجیاکان نیشتەجێ بوون، ئەمەش لای زۆربەی گەریدەکان ناسراوە بە رەوەند، کە بە واتای کۆچەر و موهاجیر دێت و لە سەرچاوەکانی عەرەبی بە رەوادی ناسراوە (بروانە رەوادی - الروادية).

مێژوونووسە کۆنەکان ناوی هۆزەکەیان بە دارشتن (دارێژ)ی

عەرەبی تۆمار کردووە بە (الهذباني)، بێ ئەوەی واتا و چەمکەکەی شی بکەنەوە، کە ئەمەش بواری بە گفتوگۆکار و لێکۆڵەرەکانی ئەمڕۆ داوە بۆ کاری لێکۆڵینەوە لە دۆزینەوەی بنچینەی ناوەکەی و ماناکەی، ڕۆژهەڵاتناس مینۆرسکی وای بۆ دەچێ، کە ئەو ناوە لە حەدیابەوە هاتووە، کە ئەوەش ناوێکی کۆنی وڵاتی هەولێر بووە لە چاخەکانی پێش مێژوو، هەروەها گوتراوە کە لە وشەی (هەزبەنی - ئەزبەنی) هاتووە، ئەو وشەیەش بەمانای (سەروەرم، گەورەم) دێت بە گوێرەی شێوەزاری کرمانجی ژووروو، یان لە وشەی (هیزان - الهیزانیة) دێت، یاخود لە هۆزەبان - هۆزەڤان هاتووە، کە بە واتای سەرۆک هۆز یان خاوەنی هۆز دێت، ئەو لێکدانەوەی دوایین لە هەموو بۆچوونەکانی تر نزیکترە لە ناوی ڕاستەقینەی هۆزەکە، ئەوەش وشەیەکی کوردی بە مانایە و زۆر ڕێکوپێکە بۆ بەناوکردنی هۆزێک، واتە ناوێکی شیاو و لەجێگای خۆیەتی، کە هۆزێک ناوی پێ لێبنرێ، ئەوەش لە دەستوور و ڕێزمانی کوردی کارپێکراوە زۆر جار بەم شێوەیە ناو بە کاردێت لە ناونانی هۆزەکان (بڕوانە: آذربیجان، ص١٠٩).

وا دەزانرا کە هەزبانییەکانی هەرێمی ئازەربایجان، لەو شوێنە نیشتەجێ بوون. کاتێک (أبو الهیجاء عبدالله الحمداني) میری موسڵ ساڵی (٢٩٣ک/ ٩٠٦ز) بە شوێنیان کەوت، کە ئەو میرە بە نیاز بوو سزای محەمەدی کوڕی بیلالی پێشڕەو و پێشەوای هەزبانییەکان بدات، لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵێک لەو شۆڕشگێڕە هەزبانییانە چوونە ئازەربایجان، بەڵام (ابن حوقل) وای بۆ دەچێ، بێگومان کە زۆر جێگا لە هەرێمی ئازەربایجان شوێنەواری ڕەسەنی هەزبانییەکانە (صورة الأرض، ص٢٨٩).

ئەوەی گومانی تێدا نییە کە هەزبانییەکان بەو قەوارە و پەرت بوونە بەتێپەڕبوونی کات و سەردەم و ساڵ و ڕۆژ بۆ چەند هۆز و خێڵێک و بنەماڵە جودا بوونەوە، کە تێیدا هۆزی گەورە و بچووک بەدی دەکرێت، ئەویش بە شێوازی جێگیر و نیمچە جێگیر و ڕەوەند، ئەوەی دەزانرێت و دیارە و بۆی دەچن کە ئەو هەزبانییانە تا ئێستا دوو ناوی سەرەکی هەیە بۆ ئەو هەموو لق و هۆز و کۆمەڵەکانی هەزبانی، ئەوانیش: مارانی کە لە سەوزایی خوار (بن) موسڵ جێگیربوون (بڕوانە مارانی) و ڕەوادی کە ڕەوەند چەند بنەماڵەیەک، لەوانە جێگیربوون، ئەوانەش بە ناوبانگترین تیرەی هەزبانین، مینۆرسکی دەڵێت زەرزارییەکان لەوانەیە لقێک بن لە هەزبانییە کۆنەکان (دائرة المعارف الاسلامیة، مادة اشنه، ٢/٢٢٢)، بەڵام ئەم بۆچوونە لاوازە و دوورە لە ڕاستی.

هەزبانییەکان چەند کەسانێکی ناوداریان لە ئاستی رامیاری و سەربازی هەیە، کە لەبەر زۆرییان بە ژمار نایەت، لە زۆر بواردا نازناویان دەرکردووە، یا لە بواری زانست و مەعریفەدا لە ماوەی سەردەمەکانی: عەباسییەکان و ئەیوبییەکان و مەملوکییەکان، سەرچاوەکانی مێژووی سیاسی و کتێبەکانی (الطبقات والتراجم والوفیات) باسی دەیانیان لەوانە کردووە، لەوانە، (مەحموود بن موسەک)، کە لە قوتابیانی حافزی سەلەفی بووە (سیر أعلام النبلاء، ١٥/٢٨٤) و حیسامەدین ئەبی عەلی هەزبانی میری یەکەم لە دەوڵەتی مەلیک ساڵح نەجمەدین ئەیوب کوڕی کامل (٦٣٧ - ٦٤٧ک/ ١٢٣٩ - ١٢٤٩ز)، شاعیر جەمالەدین بەختیار هەزبانی (کۆچی دوایی کردووە لە ٦٧٧ک/ ١٢٧٨ز) (تالی کتاب وفیات الأعیان، ص٥٥).

سۆفی ناسرەدین محەمەد کوڕی موسای هەزبانی موسڵی (٧٧٧ - ٨٦٠ک/ ١٣٧٥ - ١٤٥٦ز)، لە دیمەشق لە دایک بووە و پێگەیشتووە و هەر لە منداڵییەوە چووەتە ناو ریزی سۆفیگەری، بنەماکانی سۆفیگەری لە باپیری وەرگرتووە کە ناوی ئەبی بەکر موسڵی بووە و لە هی تریش و (خەرقە)ی لەبەر کردووە، ئەو سۆفییە چەند نووسراوێکی هەیە لە بارەی داب و دەستووری سۆفیگەری، هەروەها کتێبێکی هەیە بەناوی (فتوح الوهاب و دلائل الطلاب إلي منازل الأحباب) (الضوء اللامع، ١٠/٦٥، هدیة العارفین، ٢/٢٠٠).

میرە هەزبانییەکان میرنشینێکیان لە قەڵای هەولێر و دەوروبەری دامەزراندووە:

- میرنشینی هەزبانی:

**١- میر ئەبو هەیجانی یەکەم موسک (موسا - موصک) کوڕی جەکو - جەکویەی هەزبانی:**

بنەماڵە هەزبانییەکان کە فەرمانڕەوایی ئازەربایجان و ئەرمینیایان دەکرد، بەم جۆرە بوو (شەدادییەکان لە دوبیل و گەنجە و شەدادییەکانی دووەم لە ئانی و ڕەوادییەکان لە تەبریز و هەزبانییەکانی ئۆرمیە و ئەحمەدیلیە)، لەگەڵ ئەمانە میرە هەزبانییەکان میرنشینێکی تریان دروست کرد لە قەڵای هەولێر و دەوروبەری، کە هیچی کەم نەبوو لە میرنشینییەکانی تر، ئەوەیش لە نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەی زایینی، ئەوکات و سەردەمە، هەرێمەکانی کوردی لەلایەن میرنشینەکان و سەرۆکە خۆجێیەکان سەرپەرشتی دەکرا، میر ئەبولهەیجای موسەک کوڕی جەکوجەکویە، یەکەم میری ئەو هەرێمە بوو، کە کابرایەکی لێهاتوو دەستڕۆ بووە وای بۆ دەچن ئەو میرە دامەزرێنەر بووە، ئەوەی زانراوە لەسەر ئەم میرە پەیوەندی چاک و باشی لەگەڵ عوقەیلییە عەرەبەکانی خاوەنی موسڵ هەبووە لەلایەن فەرمانڕەوایی، و ملکەچی ئەوان بووە تەنانەت میر (المقلد بن المسیب العقیلي) (٣٨٦ - ٣٩١ک/ ٩٩٦ - ١٠٠٠ز) خوشکی ئەبو هەیجائی هێناوە، کە دەکاتە دایکی میر قەرواشی کوڕی ئەلمقەلەد (وفیات الأعیان، ٥/ ٢٦٤، مینۆرسکی، تاریخ قفقاز، ص١٩٧).

لە ساڵی (٣٨٧ک/ ٩٩٧ز) جوبرائیلی کوڕی محەمەد داوای یارمەتی لە ئەبو هەیجائی هەزبانی کرد بۆ گەڕاندنەوەی شاری داقوقا، کە لەلایەن (فخر الدولة البویهي) داگیر کرابوو، ئەو دوو کەسە توانییان دەست بەسەر شارەکەدا بگرنەوە کرێکاران و پیاوەکانی (فخر الدولة البویهي) دەربکەن (الکامل، ٧/ ١٨٧ - ١٨٨).

مێژوونووسان، زانیاری زیاتریان لەبارەی هەزبانییەکانی ئەربل (هەولێر) بۆ ماوەی نیو سەدە ٣٨٧ - ٤٣٧ک بە ئێمە نەداوە، مێژووی هەزبانییەکان وا پیشان دەدات، کە میرێکی تریان لەناو دەرکەوت، ئەویش هەر بەناوی ئەبو هەیجائی بووە، ئەمیش (ابن ربیب الدولة) و کوڕی خوشکی (میر وەهسوزان) کوڕی مەملانی ڕەوادی هەزبانی (٤١٦ - ٤٥١ک/ ١٠٢٥ - ١٠٥٩ز)، بەوە وەسف کراوە کە بە (خاوەن ئۆرمیە) ناسراوە، سنووری قەڵەمڕەوەکەی بەرەو ڕۆژئاوا تا دەگاتە قەڵای بەرگری کە دەکەوێتە باکووری دەریاچەی خەڵات - دەریاچەی وان کشاوە (الکامل، ٧/ ٣٣٩، ٨/ ٧)، ئەوەش بە دوور دەزانرێ، کە ئەبو هەیجائی موسک خاوەنی ئەربل (هەولێر) بێ.

**٢- میر عیسای کوڕی موسا - موسکی هەزبانی (؟ - ٤٣٧ک/ ١٠٤٥ز):**

مێژووی مردنی ئەبو هەیجائی موسک، لای مێژوونووسەکان نەچەسپاوە و لەدوای خۆی چەند منداڵێکی بەجێهێشت، ئەوانیش: عیسا و سلار (سالار) (ابو الحسن) و حەسەن (ابو علی)، دوای مردنی ئەبو هەیجا ناکۆکی کەوتە نێوان کوڕەکانی لەسەر میراتی باوکیان و دەستیان برد بۆ توندوتیژی، ئەمەش وایکرد ئاژاوە و پارچەبوون بکەوێتە ناو ئەو میرنشینە، بەڵام کۆتایی ئەو ململانێیە بۆ بەرژەوەندی میر عیسا بوو، بەمەش سلار (سالار) ناچار بوو هەولێر بەجێبهێڵێ و لای پوورزایەکی دابنیشێ، کە ناوی میر قرواش بن موقەلەد عوقەیلی بوو (٣٩١ - ٤٤٢ک/ ١٠٠١ - ١٠٥٠ز) کە میری موسڵ بوو (الکامل، ٨/ ٤٢).

هەرچەندە دوورکەوتنەوەی سلار (سالار) لە هەولێر نەبووە هۆی ئاشتی، بەڵکو زیاتر و توندتر بوو لە ناو بنەماڵەی موسک، زۆر جار چەکی تێدا بەکارهاتووە، دوو کەس لە برازاکانی میر عیسا کاتێک میر عیسا لە قەڵاتی هەولێر بۆ ڕاو دەچوو کوشتیان، ئەو دوو کەسە پاش کوشتنی میر عیسا، دەستیان بەسەر قەڵای هەولێر داگرت، کە بنکەی میرنشینەکە بوو، ئەو کارە وای لە میر قەرواشی عوقەیلی کرد کە میرنشینەکە داگیر بکات، کە خزمایەتی خاڵ و کوڕە خوشکیان تێدا هەبوو، خۆی حەزی دەکرد کە دەستێکی باڵای هەبێ لەو میرنشینە خۆی یەکێک بۆ سەرپەرشتی ئەو قەڵایە دابنێ، بۆیە سلاری لەگەڵ خۆ برد و قەڵای داگیر کرد و سلاری کرد بە میر (الکامل، ٨/ ٤٢).

**٣. میر أبو الحسن سلاری بن موسک (٤٣٧ - ٤٤٠ک/ ١٠٤٥ - ١٠٤٨ز)**

ئیبن ئەسیر کە مێژوونووسێکە، تەنها سەرچاوەیە بۆ گواستنەوەی هەواڵ و رووداوەکانی هەزبانییەکان لە سەرچاوە نادیار و گومکراوەکان، بەڵام ناو و نازناوی میرە هەزبانییەکانی جێگیر نەکردووە، بۆ نموونە ناوی میر موسک بە سێ شێواز لە باسەکانیدا هاتووە، وەک (موصک - موسک - موسی) هەندێک جار کە باسی میرەکان دەکات ناوی ئاشکرای خۆیان دێنێ، هەندێ جاری تر نازناویان باس دەکات، زۆربەی بۆچوون وایە، کە میر سلار (سالار) نازناوەکەی (أبي الحسن) بووە، لەسەر ئەو بنەمایە، دەتوانین بڵێین، کە سلار و (أبی الحسن) دوو ناون بۆ یەک کەس کە ئەویش کوڕێکی (أبي الهیجاء)ە و کوڕەکەی تری (الحسن) بووە کە نازناوەکەی (أبي علي) یە (تاریخ اربل، ١/٢٠٦، ٣٧١).

میر ئەبولحەسەن سلار بەوە ناسراوە، کە کەسێتییەکی لاواز و سەرکەوتوو نەبووە لە بواری رامیاری، نەیتوانیوە سیاسەتێکی روون و ئاشکرا پەیرەو بکات بەرامبەر نەیارەکەی بۆ بەڕێوەبردن و پارێزگاری کردنی میرنشینەکەی، هەرچەندە میرنشینی عوقەیلی راستەوخۆ پاڵپشتیان دەکرد، نەیتوانی هاوپەیمانی (الحمیدي الهذباني) بەهێز بکات، کە بەو ئامانجە پێکهاتبوو، میرنشینی ئەربل (هەولێر) لە ژێر دەست و پاشکۆیەتی عوقەیلییەکان دەربهێنێت و دانانی سنوورێک بۆ دەسەڵاتی فراوان و توانای عوقەیلییەکان کە راستەوخۆ تێکەڵی کاروباری ناوخۆی ئەو میرنشینە ببوو، بۆیە میر ئەبولحەسەن بن عیسکانی حەمیدی میری عەقەر و شوش یارمەتی و پشتگیری (أبي علي الحسن بن موسك) کرد، کە رکابەری برایەکەی دەکرد لەسەر وەرگرتنی سەرکردایەتی میرنشینەکە، کە تێیدا سلار لایەنگیری عوقەیلییەکان بوو، بۆیە أبو علي ئەو هەلەی قۆزتەوە کاتێک میر قەرواشی عوقەیلی سەرقاڵی کارێکی تر بوو لە موسڵ بەدوورکەوێت لە ساڵی (٤٤٠ک/ ١٠٤٨ز) ئەو دەرفەتە وای لە ئەبو عەلی کرد، کە دەست بەسەر هەولێر دابگرێ کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ لەلایەن ئەبی حەسەن ئەلحەمیدی پاڵپشتی دەکرا، لە ئەنجامدا سەرکەوتن و براکەی خۆی ئەبا حەسەن سلاری زیندانی کرد، ئەو دوو کەسە کە پەیوەندی و دۆستایەتییان هەبوو واتە ئەبی عەلی هەزبانی و ئەبی حەسەن حەمیدی بە هیچ شێوەیەک گوێڕایەڵی میر قەرواشی عوقەیلییان نەدەکرد بەرەنگاری هەموو کارێکیشیان دەکرد، کە میر قەرواش پەیڕەوی دەکرد بۆ گەڕاندنەوەی هەولێر.

**٤- میر ئەبو عەلی حەسەن بن موسک (٤٤٠ - دوای ٤٥٦ک/ ١٠٤٨ - ١٠٦٤ز):**

میر ئەبو عەلی حەسەن هەزبانی، پارێزگاری لە هەولێر کرد تاکو دوای ساڵی (٤٥٦ک/ ١٠٦٣ز)، پەیوەندییەکان بەرەو پێشچوونێکی باشی بەخۆیەوە بینی کاتێ میر قەرواشی کوڕی بەدرانی عوقەیلی (٤٤٣ - ٤٥٣ک/ ١٠٥١ - ١٠٦١ز) وەڵامی دایەوە بۆ وتارەکەی و هەڵگرتنی ئابڵوقەی سەر موسڵ دوای ئەوەی چوار مانگ درێژەی کێشا (الکامل، ٨/٨٢، مراه الزمان، ص١١٠، ١٠٤).

لە گرنگترین کارەکانی میر ئەبو عەلی حەسەن بەدەستهێنانی سەربەخۆیی میرنشینەکەی لە دەستی عوقەیلییەکان و رەزامەندی خەلیفەی عەباسی و سوڵتانی سەلجوقی بۆ میرنشینەکەی و دانانی بە راستی و شەرعی ئەم دەسەڵاتە بوو، لە ساڵی (٤٥٦ک/ ١٠٦٤ز) سەردانی بەغدای کرد بە یاوەری جار و هاوپەیمانەکەی میر ئەبی حەسەن بن عیسکانی حەمیدی چوونە ناو دیوانی خەلافەت بە مەبەستی بەدەستهێنانی رەزامەندی وەرگرتن لە خەلیفەی عەباسی (مراة الزمان، القسم الخاص بتاریخ السلاجقة، ص١١٠).

**٥- میر ئەبو هەیجای دووەم (حوسێن کوڕی ئەبی حەسەن کوڕی ئەبی هەیجای یەکەم):**

**موسک بن جەکو هەزبانی:**

نازانرێ کەی میر ئەبو هەیجا لە دوای باوکی میرنشینی هەولێری گرتۆتە دەست و بەڕێوەی بردووە چونکە سەرچاوەکانی مێژوویی بۆ ماوەی نزیکەی نیو سەدە مێژووی

هەزبانییەکانی هەولێریان تۆمار نەکردووە و بێگومان ئەوانە روویداوە لە ماوەی ساڵانی (٤٥٧ - ٤٧٧ک/ ١٠٦٥ - ١٠٨٤ز).

ئیبن شـعـار (لە ٦٥٤ک/ ١٢٥٦ز کۆچی دوایی کردووە) ناو و کونیەی ئەبی هەیجای چەسپاندووە، بەم شێوەیە: «أبو الهيجا الحسين بن موسي بن جكو الهذباني) (أربيل في العهد الاتابكي، ص٣٢١) و راستییەکەی ئەمەیە (أبو الهيجا الحسين بن الحسن بن موسى بن جكو الهذباني)، ابن المستوفي جێگەی گومانی نەهێشتۆتەوە، لەوەی کە ابا الهيجا الثاني الحسين نەوەی أبي الهيجا الاول موسي - موسک لە کوڕەکەی(أبي علي الحسن)، کە ناوە سیانییەکەی و نازناوەکەی و کونیەکەی لە بەڵگەنامە نووسراوەکانی ئەو سەردەمە دەرهێناوە (تاريخ اربل، ١/ ٢٠٦). (أبو الهيجا) الهذباني لە سەرەتای پێگەیشتنی لە بواری سیاسیدا پێوەندی بە خزمەتکردنی سوڵتان مەلیکشای سەلجوقی کردووە (٤٦٥ - ٤٨٥ک/ ١٠٧٣ - ١٠٩٢ز) لە دواییدا بووەتە جێگری باوکی و سوڵتانی سەلجوقی سەرۆکایەتی میرنشینەکەی داوەتە دەست و هێشتوویەتییەوە، ئەوەی لێی زانراوە لەو ماوەیەدا ئەوەیە، کە سوڵتان مەلیکشا نێردراوێکی ناردووە بۆ لای میر مەنسوری کوڕی نیزامەدین نەسرەدینی کوڕی نەسری دەولە ئەحمەدی کوڕی مەروانی کوردی (٤٧٢ - ٤٧٨ک/ ١٠٧٩ - ١٠٨٥ز)، خاوەنی (فەرمانرەوا، سەردار)ی دیاربەکر بۆ ئەوەی بڕی سێ هەزار دیناری لێ وەربگرێ، کە سوڵتان داوای لێ کردبوو، ئەبو هەیجا بۆ کوڕەکەی (فضل)ی دەگێڕێتەوە، کە چۆن میر مەروان پێشوازی کردووە بەو خزمەتگوزارییانەی کە پێشکەشی کردووە، بەو سیفەتەی کە لەلایەن سوڵتانەوە ناردراوە و چۆن بڕە پارەکەی ئامادە کردووە و هێناویەتی تاکو مەلیکشاه و سوپاکەی دوور بخاتەوە لەسەر دیاربەکر، بەوەش وڵاتەکەی لە شەڕ و ئاشاوەی سەلجوقییەکان دوور بخاتەوە (اسامة بن منقذ، الاعتبار، ص٨٩ - ٩٠).

لەگەڵ هاتنی سەدەی شەشەمی کۆچی/ دوانزەهەمی زایینی ئەبو هەیجای هەزبانی بووە حاکمی راستەقینەی شاری ئەربیل و میرنشینەکەی خەڵک هەستیان بە خۆشی کرد بە رزگاربوون لە دەوڵەتی سەلجوقی و دابەشبوونە ناوخۆییەکەی، کە ببووە هۆی بێهێز بوونی دەوڵەتی سەلجوقی و لێک جودابوونەوەی، لە ساڵی ٥٠٠ک/ ١١٠٦ز ئەبو هەیجا بۆ جگەرمشی نووسی، کە میری موسڵ بوو تا پێی رابگەیەنێ، کە سوڵتان محەممەد فەرمانی پێداوە، کە جاولی سەقا و نیازی هەیە بۆ دەست بەسەرداگرتنی موسڵ و ناوچەکانی دەوروبەری - و شارۆچکەی بوازیج و بەرەوپێش بچێت بەرەو هەولێر، جگەرمش هێزەکانی فراوان کرد کە کوردەکانی سەرکردایەتییان دەکرد بۆ رووبەڕووبوونەوەی جاولی سەقا و هەردوو هێزەکەی جگەرمش و جاولی سەقا لای گوندی باکلبای نزیک هەولێر بەرەنگاری یەکتر بوونەوە، کە لە ئاکامدا جگەرمش و کوڕەکانی ئەبی هەیجای هەزبانی دەستگیرکران (الكامل، ٨/ ٢٣٨ - ٢٣٩).

هەروەکو ئەبو هەیجا بە هێزەکانییەوە لەگەڵ سوڵتان محەممەدی سەلجوقی بەشداری کرد بۆ شاڵاوبردن بە مەبەستی گرتنی شاری موسڵ و دەوروبەری ساڵی (٥٠١ک/ ١١٠٨ز) بۆ گێڕانەوە و دوورخستنەوەی جاولی سەقا و ئەوانی دیکە (الكامل، ٥/ ٢٥٢).

هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا میرەکان و هاوەڵەکانی دەوروبەر کۆبوونەوەیان لە سنجار لە ساڵی (٥٠٥ک/ ذز) بە فەرمانی سوڵتان محەممەدی سەلجوقی بۆ مەبەستی کوشتاری خاچپەرستەکان کرد، سوڵتان محەممەد نامەی بۆ ئەبی هەیجا نووسی و داوای پێوەندیکردنی بە سوپای سوڵتانی لێ کرد، کە خۆی ئامادە کردبوو بۆ رۆیشتن بەرەو وڵاتی شام، ئەو هێزە زۆرە رۆیشت بەرەو رووی سەنگەرەکانی خاچ دروشمەکان و گەمارۆی روها و تل باشر و چەند شوێنێکی تر و چەند قەڵایەکی ژێر چنگی خاچ دروشمەکان ئازاد کرا (الكامل، ٨/ ٢٦٢ - ٢٦٣).

ئەبو هەیجائی هەزبانی لە کۆتایی سەردەمی خەریکی خزمەتی خەلافەتی عەباسییەکان بوو و کاروباری هەولێر و میرنشینی هەزبانی دایە دەست کوڕەکەی فەزل و ئەبی عەلی هەروەک (ابن الاثير) دەگێڕێتەوە، یەکێک لە سەرانی بابەکری - کە برازای میر بابەکری کوڕی میکائیل بوو - چاوی بڕیبووە هەولێر، لە پاش نەمانی ئەبی

هەیجا سالّی ٥١٧ک/ ١١٢٣ز هەولێری خستە سەر دەسەلاّتی خۆی ئەو شارە هەر لە ژێر دەستی بابەکری مایەوە هەتا عزەدین مەسعود کوڕی ئاقسنقەری بەرسقی سالّی (٥٢٠ک/ ١١٢٦ز)، بووە والی ویلایەتی موسلاً کە توانی بابەکری کوڕی میکائیل دەستگیر بکات و داوای کرد وا بکا برازاکەی ناچار بکات هەولێر بداتەوە خاوەنەکانی (الكامل، ٨/ ٣٢١).

لە هەردوو سالّی (٥٢٠ - ٥٢١ک/ ١١٢٦ - ١١٢٧ز) دووبەرەکی و جیاوازی روویدا لە نێوان خەلیفەی عەباسی (المسترشد بالله) و سولّتان مەحمودی سەلجوقی (٥١١ - ٥٢٥ک/ ١١١٧ - ١١٣١ز) بەهۆی کێشەیەک لە نێوان یرنقش زدکوی شوحنەی بەغداد لای سولّتان و جێگری خەلیفە، سولّتان سەربازەکانی بەرەو بەغدا برد بۆ کۆتایی هێنانی تەنگوچەلّەمەکە و شەڕکردن لەگەلّ سوپای خەلیفە، کە لەوبەری رۆژهەلاّتی رووباری دیجلە بوون، خەلیفە فەرمانی بە لێدانی خەندەق دا بۆ پاراستنی پایتەخت لە تورکە سەلجوقییەکان، رووبەرووبوونەوە و پێکدادان لە نێوان هەردوولادا روویدا تای تەرازوو لە بەرژەوەندی خەلیفەدا بوو، وەری دەدا سەربازەکانی تاکو سەربازەکانی سولّتان بۆلای خۆی کۆبکاتەوە هێندەی نەمابوو سەرفرازبن، ئەگەر ئەبو هەیجائی هەزبانی لە ریزی سەربازانی خەلیفە دەرنەچووبا، وەکو دەیەوێت خەلیفە لەناو ببات، پاشان پێوەندی کرد بە سەربازانی سولّتان (التاريخ الباهر، ص٣٠، الكامل، ٨/ ٣٢٢)، سەیر لەوەدایە، کە ئیبن جوزی کە ناسراوە بەوەی بە وردی رووداوەکان ناگێڕێتەوە، دەلّێت: ئەو میرەی کە لە سوپای خەلیفە جیابۆوە ئەوە ئەبو فەتحی کوڕی ورامی جاوانی (المنتظم، ١٠/ ٣)، بۆ زانین ئەبا فەتح لە سالّی(٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز) کۆچی دوایی کردووە.

دەتوانین بلّێین راپەڕینی (بووژاندنەوەی) هەولێر لە رووی رۆشنبیری و ئاوەدانکردنەوە لە ماوەی سەدەی شەشەمی کۆچی/ دوازدەهەمی زایینی بووە، کە کۆتایی سەردەمی ئەتابەکی بوو، سەرەتا هەر لە سەردەمی هەزبانی دەستی پێکرد تا گەیشتە ئەوپەڕی لە سەردەمی ئەتابەکی، بیناکردنی بنچینەکانی رۆشنبیری و زانستی و مەشخەلاّنی ئاوەدانکردنەوە لە بازاڕەکان و دوکانەکان و دەوری گفتوگۆ و شوێنەکانی نووسینی کتێب، مێژوونووسی هەولێری ئیبن مستەوفی باسی بەشێک لەو راپەڕینە (بووژاندنەوە)ی روون کردۆتەوە و وێنەی هەندێک رووی چالاکی ئاوەدانی و جوولاّنەوەی بازرگانی بۆ کێشاوین، هەروەک لە چەندین کتێب و بەلّگەنامە و حەواشی و تەعلیقات لە بارەی هەولێر، کە لەو سەردەم دانراون و نووسراونەتەوە لە ماوەی فەرمانڕەوایی ئەبی هەیجای هەزبانی، بۆ ئەو شارە بەرچاومان دەکەوێت (تاريخ اربل، ١/ ٧٠ - ٧٢، ٢٠٦، ٣٣٢ - ٣٣٣، ٣٧٠).

لە سەردەمی ئەودا بوو شاری هەولێر بوو بە بەشێک لە کارگێڕی ویلایەتی شادفیروز واتە حەلوان لە ماوەی سەدەکانی ئیسلامی یەکەم (المسالك والممالك، ص١٨)، بۆ شارێکی زیندگی و ئاوەدانی بەکەلّک و بەسوود بۆ چالاکی و جوولاّنەوە گۆڕا، و بووە مەلّبەندی زانست و زانیاری (زانین) و خەلّکی خاوەن قەلّەم و رۆشنبیر روویان تێ کرد بۆ داواکردن و فێربوونی زانست لە هەموو ناوچەکانی دەوروبەری، وەک ئەشنۆیە - شنۆ و کەرخین - کەرکووک و ولاّتی زرزاری و (حبتون) و چەندی تر (تاريخ اربل، ١/ ٧٠، ٢٧١ - ٢٧٥)، وەک فەقیهی شافعی ئەبوبکر محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی حوسێن ئەشنەوی کە هاتە شاری هەولێر و بووە وتاربێژ لە یەکێک لە گوندەکان، خەریکی حەدیس بووە، لەدوای خۆی پاشماوەی نووسینی بەجێهێشتووە، هەروەکو ئیبن مستەوفی باسی کردووە و کتێبی (التذكرة) لە فیقهی شافعی بۆ زانای بەرێزی ئەبی فەزل عەبدولعەزیز کوڕی عەلی ئەشنەهی (لە ٥٥٠ک/ ١١٥٥ز) کۆچی دوایی کردووە. نووسیوەتەوە و کتێبەکەی لە سالّی(٥٢٣ک/ ١٢٢٩ز) تەواو کردووە (تاريخ اربل، ١/ ٧٠).

ناوبانگی هەولێر لە سنووری ولاّتی کوردان تاکو هەرێمەکانی دەوروبەریشی گرتۆتەوە و ناوبانگی لە سەرانسەری رۆژهەلاّتی جیهانی ئیسلامی دەرکردووە و فەقیە و شاعیران و ئەدیبان و وتاربێژان و بازرگانان و خاوەن پیشە و کار

سەردانی ئەم شارەیان کردووە.

ئەوانەی سەردانی هەولێریان کردووە لە ڕۆژگاری میرئەبی هەیجای هەزبانی تەها غرائی شاعیر، موئەیەدەدین حوسێن عەلی ئەسفەهانی (لە ٥١٥ک/ ١١٢١ز کۆچی دوایی کردووە) (وفیات الاعیان، ٢/ ١٨٩) و ئەبو فتوح ئەحمەدی کوڕی محەمەدی غەزالی (لە ٥٢٠ک/ ١١٢٦ز کۆچی دوایی کردووە) برای ئیمام غەزالی، کوڕی وتاردان لە قەلای هەولێر دەبەسترا (تاریخ اربل، ١/ ٣٣ - ٣٣٤) و شێخ عەلی کوڕی هیتی (٤٤٤ - ٥٦٤ک/ ١٠٥٢ - ١١٦٨ز) (تاریخ اربل، ١/ ٥٣ - ٥٤).

**- دەست بەسەرداگرتنی هەولێر لەلایەن عیمادەدین زەنگی و کەوتنی میرنشینی هەزبانی:**

مێژوونووسەکان باس لەوە ناکەن کەی ئەبا هەیجا کۆچی دوایی کردووە و پاش مردنی چی بەسەر ئەو میرنشینە هاتووە، لەم بارە بیروڕای جیاوازیان هەیە، لەبارەی ئەو ساڵەی کە عیمادەدین زەنگی دەستی گرتووە بەسەر شاری هەولێر و بنەماڵەی هەزبانی فەرمانرەوا و چەند مێژوویەکی جیاجیان خستۆتە ڕوو لە نێوان (٥٢٠ - ٥٢٦ک/ ١١٢٦ - ١١٣٢ز) و ئەوەی ڕاستی بێت دەست بەسەرداگرتنی زەنگی بۆ سەر هەولێر، پێش دەست بەسەرداگرتنی داقوق ساڵی (٥٣١ک/ ١١٣٦ز) بووە، چونکە زەحمەتە وێنا بکرێت، کە شاری داقوق پێش هەولێر دەستی بەسەردا گیرابێت لەلایەن زەنگی بە لەبەرچاوگرتنی ئەو گرنگییە تەنهاییەی شوێنەکەی بۆ ئەو کەسەی، کە حوکمی موسڵ بکات، لەبەر ئەوەی هەولێر دەکەوێتە نێوان موسڵ و داقوق (اربيل في عهد الأتابكي، ص١٤).

ئەوەی زانراو بێت کە ئەبا هەیجای هەزبانی تا مانگی شەعبانی ساڵی (٥٢٥ک/ ١١٣١ز) لە ژیاندا ماوە.

**ئال موسکی هەزبانی خاوەنی هەولێر**



# ئەربل و شۆڕشی قیاجییەکان (٦٩٧-٧١٠ک / ١٢٩٧-١٣١٠ز)

دکتۆر عەلی عادل حوسێن
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

**١- سەرهەڵدانی شۆڕش:**
(قیاجییەکان) تیپێکی سەربازی (مەغۆلی) بوون، زۆرینەی سەربازەکانی لە کورد و تەتەری نەسرانییەکان پێکدەهات، کە لە دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکان بوون و هەتا دەگەیشتە ئەو ناوچانەی دەوروبەری ئەربل، بە تایبەتی باکووری رۆژهەڵاتی ناوچە شاخاوییەکان، لە نزیک ئەو رێگایەی، کە دەگاتە (مەراغە)، کە بە بەردەوام شوێنێکی گونجاو بووە بۆ هێزەکانی (مەغۆل)، بە تایبەتی لە وەرزی زستاندا.

(قیاجی) زاراوەیەکی تورکی (مەغۆلی)، بەواتای (بەرد شکێنەکان) بووە، واتە ئەوانەی کارو پیشەیان بەردشکاندن بووە. وەکو ئیشارەتێک بۆ دانیشتوانی شاخاوییەکان و بەرزاییەکان، مەبەستی شارێک یان ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراو نەبووە. ئەوانە کاتی خۆی بە پیشەی بەردشکێنەکان ناسرابوون، تەنیا یەک سەرچاوەیان هەیە لەبارەی شۆڕشەکەیان. هەروەها (ئیبن العبری) بە (القیاجیة) ئیشارەتیان پێی دەدات، واتە دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکان، (القاشانی) دەڵێ: قیاجییەکان یەکێک بوون لە تیپە سەربازەکان و سەر بە سەرکردایەتی مەغۆلەکان بوون، کە لە سەردەمی (ئەباقاخان)یەکان پێکهاتووە، جەنگاوەرەکانی لە کاتی شەڕ و هێرشکردندا بە هێز و بەرگر و خۆگر بوون، بە تایبەتی لە بەر ئەوەی زۆرینەی لە دانیشتوانی ئەشکەوت و ناوچە شاخاوییەکان بوون.

لە ساڵی (٦٩٧ ک / ١٢٩٧ ز) قیاجییەکان رووبەڕووی حکومەتی مەغۆلی مەرکەزی بوونەوە، لە دواییش شێوەی شۆڕشی چەکداری وەرگرت، بە تایبەتی ئەوان لە ناوچە شاخاوییەکان بەرەو ناوچەی دەشتاییەکانی ئەربل دابەزین و بە کاتێکی زۆر کورت داگیریان کرد، لە دواییش بووە بنکەیەک بۆ شۆڕشەکەیان، قەڵایەکەی کردە ناوەندی سەرکردایەتی و کۆنترۆڵکردنی کاروباری شۆڕش و شارەکە، بە سەرکردایەتی سەرۆکە ژیر و ئازایەکان: (زەینەدین بالو الکوردی)، کە هیچ زانیارییەکی ورد و زیاتر نییە لەبارەی

کەسایەتی ئەو سەرکردەیە. (العمری) و (ابن ناظر الجیش)، هەردووکیان دەڵێن: یەکێک بووە لەوانەی کە دەسەڵات و یاسای ڕێکخستبوو، خاوەن هێزو توانا و دەسەڵات بوو لە ناوچەکانی (شارەزوور و دەربەندی قەرابلی)، هەر وەکو لە کتێبی (مسالک الابصار)دا هاتووە و باسی کەسایەتییەکی تری کردووە، کە نازناوی (بالو)ی هەڵگرتبوو، ئەویش (العزیز بالو) بوو و برای میری کورد (ضیاء الدین بالو ابو الضوارس الرشکي) بوو، کە خاوەن دەسەڵات و زەبرو هێز بووە لە ناوچەی ماردین، بۆیە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی، کە (زەینەدین بالو) میرێکی کوردەو موسڵمانە و لە نەوەی خێزانی (بالو) بووە، کە زۆرینەی میرە کوردەکان دەسەڵاتدار بوون. ئەو کەسایەتییە دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو بە بەراورد لە گەڵ میرەکانی تر، بە تایبەتی ئەو (٣٠٠٠) سێ هەزار چەکدارەی لە گەڵ بوون و بە تەواوی لە بەر دەستی ئەو بوون. ئەوەش توانای ئەو سەرکردەیەی سەلماند لە مەسەلەی سەرکردایەتی شۆڕشەکە، توانی بە سەرکەوتوویی شۆڕشەکە بەرێوەببات بۆ ماوەی زیاتر لە یەک سەدە.

شۆڕشی (قیاجییەکان) بە توندوتیژترین شۆڕش دادەندرێ، کە دژی دەسەڵاتی ناوەندی لە سەردەمی (ئێلخانییەکان) بەرپا کراوە، بە یەکێک لە قۆناغە گرنگەکان دادەندرێ بە درێژایی مێژووی ئەربیل لەو سەردەمەدا، شۆڕشەکە (١٣)ساڵی خایاند، تێیدا شۆڕشگێران توانییان بەرگری تەواو لە پێگە و ناوچەکانی خۆیان بکەن، بەوەش ئازایی و توانای خۆیان سەلماند، بە بێ ئەوەی لە هەڵوێستی خۆیان پاشگەز بنەوە، هەر چەندەش زەحمەتییەکان و توندوتیژییەکان زیاتر دەبوون لە دژیان، ئەوانە داستانێکی گەورەیان تۆمار کرد، لە مەسەلەی ڕەتکردنەوەی هەموو جۆرەکانی ستەم و زوڵم، خۆڕاگرییان نواند و سەلماند، لە مەسەلەی بەرگریکردن لە کێشەکەیان و شۆڕشەکەیان، هەر لەبەرئەوەش پشتگیرییەکی تەواو کران لە لایەن دانیشتوانی ناوچەکە، ئەو پشتگیرییە هەر لە لایەن کوردەکانی ئەربیل و ناوچە شاخاوییەکانی نەبوو، بەڵکو مەسیحییەکانیش بە ژمارەیەکی زۆر چوونە ناو ریزەکانی شۆڕش، هەروەها هۆزەکانی کورد یارمەتییەکی زۆریان پێشکەش کرد، وەکو دژایەتیکردنی مەغۆلەکان، بەڵام لە ڕاستیدا شۆڕشی قیاجییەکان هیوا و ئامانجی هەموو ئەو گەلانە بوو، کە کەوتبوونە ژێر داگیرکەری مەغۆلی، کە تووشی زوڵم و ستەم و زۆرداری مەغۆلەکان ببوون.

هەر لە بەر ئەوەش، دەبێ یەکەم جار هۆی سەرەکی سەرهەڵدانی ئەو شۆڕشە دەستنیشان بکەین، بە تایبەتی بە کارهێنانی شێوازی توندوتیژی و هۆکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، دەکرێ بەو دوو هۆکارە سەرەکییە دەستنیشان بکرێ:

یەکەم: سیاسەتی ئایینی، کە بە شێوەیەکی سەرەکی گوزارشت لە سیاسەتی حکومەتی ئێلخانی ناوەندی دەکات، کە گۆڕانکاری بە سەردا هات لە کۆتایی سەدەی هەفتەمی کۆچیدا، بە تایبەتی دوای ئەوەی (خان غازان کوڕی ئەرغون خان کوڕی ئەباقاخان کوڕی هۆلاکۆخان) دەسەڵاتی لە دەوڵەت وەرگرت، کە سیاسەتێکی نوێی پەیڕەو دەکرد. بە تایبەتی پەیڕەوکردنی توندوتیژی بەرامبەر ئەو کەسانەی، کە لە ناو ئایینەکانی تر بوون، وەکو (مەسیحیی و جوولەکەکان)، (نەورۆز) کە وەزیرێکی گرنگ بوو لەو سەردەمەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەی زۆرینەی مافە تایبەتییەکانیان نەمابوو، کە لە سەردەمەکانی پێشتر هەیان بووە. هەروەکو وەرگرتنی پایە و ئەرکی گرنگ و باڵا لە دەوڵەتی ئێلخانیدا. ئەوەی لێرە شیاوی باسە، کە مەسیحییەکانی ئەربیل و دەوروبەری هەستیان بە ستەمی سیاسی دەکرد لە کۆتاییەکانی سەردەمی (الخان ارغون)، ئەویش لە ساڵی (٦٨٨ ک / ١٢٨٩ز)دا کاتێک (مەسعود البرقوگی) لە سەر حوکم لابردرا و حوکمی کوشتنی بەسەریدا جێبەجێ کرا، بە شێوەیەکی زۆر ناخۆش و بە ئازارێکی زۆر لە ئەربیل کوشتیان، هەروەها کەس و کاری و خزمانی تووشی ئازاردان و ستەم بوون،

(٣) لە بەر چاوترین كلێسەكانی مەسیحی تێكدران و كاولكران لەو شارەدا لە ساڵی (٦٩٤ ك / ١٢٩٥ ز)، هەروەها كوردەكانیش تووشی ستەم و زوڵمی مەغۆلەكان بوون بە شێوەیەكی راستەوخۆ لە ئەربل، بەتایبەتی لە كاتی گەمارۆدانی شارەكە و داگیركردنی و كوشتنی میر (شەرەفەدین كەلالی) لە دواییش میر (ئەبوبەكر كوردی) و دووركردنەوەی (موبارزەدین) لە حوكمی میرنشینەكە بە شێوەی زۆرەكی، كوشتنی میر (نەورۆز) لە رێگای كاری دووبەرەكی و فیتنەكاری لە لایەن دوژمنانی لە دەرباری ئیلخانی، كە بووە هۆی ئیستیفزاز كردنی كوردەكانی ئەربل و ناوچە شاخاوییەكان و وەرگرتنی هەڵوێستێكی تر دژی دەسەلاتی مەغۆلەكان. هەروەها پەیرەوكردنی سیاسەتێكی نارێك لە كاتی بەرێوەبردنی كاروباری میرنشینەكە و ناوچەكە بە شێوەیەكی گشتی، گومانمان لەوە نییە، كە ئەو رووداوانە بوونە جێگای داخ و تووڕەیی لە ناو ناخی خەڵكەكە دژی حكومەتی مەغۆلەكان، كە بە درێژایی ساڵانی رابردوو، بە سەریەك كۆببوونەوە، چاوەڕوانی ئەو دەرفەتەیان دەكرد، كە تێیدا بتوانن گوزارشت لەوەی لە ناو ناخیاندا شاردبوویانەوە.

دووەم: ئابووری كۆمەڵایەتی، ئەویش گوزارشت لە خراپی باری ئابووری بە شێوەیەكی گشتی دەكات بە تایبەتی دوای نەمانی زۆر لە مافە تایبەتییەكانیان. لەوانە: لە سەر ئاستی ئابووری بە پێی گۆڕانكاری بارودۆخی سیاسی و، ئەو سیاسەتە چەوتانەی حكومەتی مەغۆلی، بەتایبەتی زەبرو زەنگی وەزیر و میرەكانی ئەو دەوڵەتە، كە هاوكات بوون لە گەڵ كەمتەرخەمی حكومەتی مەغۆلی بۆ مەسەلەی بایەخدان بە پێشكەوتنی سامانەكان لە هەرێمەكانی دەوڵەت و چاككردنەوەی باری بژێوی دانیشتوانی شارو شارۆچكەكان و زیادكردنی باجەكان. ئەویش رەنگدانەوەی خراپی هەبوو بە سەر ژیان و گوزەرانی خەڵكەكە. ئەوەی شیاوی باسە لێرە، كە زۆر لە خێزانەكان لە ناو ئەو ئەشكەوتانە ژیانیان بە سەر دەبرد، كە لە ئەربل دوور كەوتبوونەوە. ئەویش بە هۆی هەژاری و خراپی باری ئابوورییان، ئەوانە بە (قیاجییەكان) ناسرابوون، هەروەكو پێشتر ئاماژەمان پێدا بوو، ئەوانە رۆڵێكی گەورەیان هەبوو لە بڵاوبوونەوە و هەڵگیرساندنی شۆڕشەكە و بەردەوامبوونی هێزەكەیان. ئەوەی شیاوی باسە كە ئەو باجە زۆرەی بە سەر خاوەن كارو ئابوورییەكان سەپاندراوە، لە رێگەی زەبرو شێوازی زۆرداری وەردەگیران، دەگەیشتە ئەو رادەی كە ئەركی خەڵكەكەیان گران دەكرد، بە تایبەتی كاتی زیاد كردنی رێژەكەی. بەڵام هۆی سەرەكی سەرهەڵدانی شۆڕشەكە، ئەویش لە كاتی دەركردنی فەرمانی دەستگیركردنی (زدینەدین بالو)یان دەركرد، بە هۆی گەیشتنی سكاڵا بۆ ئەنجوومەنی (ئەلخان غازان) دژی (زەینەدین بالۆ)، لە بەر ئەوەش فەرمانێك دەرچوو بۆ دەستگیركردنی و بكەوێتە بەندیخانە، كە ئەوە بووە هۆی سەرهەڵدانی دووبەرەكی لە نێوان میرە كوردەكان لە ناوچە شاخاوییەكان، هەروەكو لە چیرۆكی (ماریهبالاها) هاتووە، كاتێك (زەینەدین) بەو هەواڵەی زانی، خۆی و لایانگرانی كە ژمارەیان (٣٠٠٠) سێ هەزار چەكدار بوو بەرەو ناوچەی دەشتاییەكانی ئەربل رۆیشت و توانی قەڵایەكەی داگیر بكات، لە دواییش ئەو قەڵایە بووە پێگەیەكی سەرەكی بۆ شۆڕشەكەی، هەروەها بووە خاڵێكی ترسناك بۆ سەر حكومەتی مەغۆلەكان. ئەو دەرچوونەی (زەینەدین)، بووە رووبەرووبوونەوە و دەرچوونێك لە فەرمانی دەسەلاتی مەركەزی، لە بەر ئەوەش (غازان خان) ناچار بوو هێزێك بەسەركردایەتی میر (سووتی) حاكمی دیاربەكر بنێرێ، بۆ ئەوەی شۆڕشەكە لە ناو ببات، كە لەو كاتە دەنگ و سەدای بڵاو ببۆوە، میر (سووتی) سەربازگەی خۆی لە نزیك شارەكە و قەڵایەكە دانابوو، لە لای باشووری رۆژئاوای (موسڵ و كەركووك)، بە جۆرێك شەرەكە هەر لە رێگای (تیر و رم) تێگرتن بوو لەگەڵ ئەو شۆرشگێرانەی، كە لە ناو قەڵایەكە بوون، لەو ماوەیەدا هەوڵیاندا ئەو كێشەیە بە شێوەیەكی ئاشتییانە

کۆتایی پێ بێنن و واز لە شۆڕشەکەیان بێنن و بچنە ژێر چەتری دەسەڵات، لە بەر ئەوەش چەندین ناردراوە لە ڕێگەی نوێنەران ناردران، کە داواکارییەکانی ئەو هەڵدەگرت، (ئەلخان غازان)یش حەزی دەکرد بە ئاشتییانە کۆتایی پێ بێت، بارەکە وەکو خۆی بمێنێ، لەوانەش بوو مەسەلەی مافە تایبەتییەکانی مەسیحییەکان لە قەڵایەکە، حەزی دەکرد ئەو مەسەلەیە چارەسەر بکرێ، لەو ماوەیەدا هەوڵێکی زۆری دا لە ڕێگەی نوێنەری خۆی (قەشە دێڤید و ئیشو سواران و عەبد یوشع)، بۆ ئەوەی بگاتە چارەسەرێکی ئاشتییانە یان هەر شێوەیەکی ئاشتییانەی پێویست، لە گەڵ ئەوەش سەرنەکەوت لەو هەوڵەو نەیتوانی، بە هۆی هەڵوێستی توندو ڕەقی هەردوو لا، شۆڕشگێڕان لە لایەک و لە لایەکی تریش نوێنەرانی دەسەڵاتی ناوەندی، کە داوایان لێ کرابوو ئەو مەسەلەیە چارەسەر بکەن، کە لە هەولێر سەری هەڵداوە.

وامان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەرک و هەوڵدانی میر (سووتی) هەر بۆ لەناوبردنی ئەو شۆڕشە بوو و نەهێڵی زیاتر بڵاو ببێتەوە و بگاتە شارەکانی دەوروبەر، وەکو (موسڵ)، لەو لایانەوە سەرکەوتوو بوو، هەروەها وا پێدەچێ سوور نەبووە لە سەر هێرشکردن بۆ سەر قەڵای هەولێر، کە پێگەی سەرەکی شۆڕشگێڕان بووە، نابێ لێرە ئەوە لە بیر بکرێ، کە تووشی ڕووبەڕووبوونەوەیەکی توند بووە و ئەوەشی باش دەزانی، لە گەڵ ڕایەکانی (جاثلیق) کە پشتی پێی دەبەست، دوای ئەوەی توانی گەمارۆی شۆڕشەکە بدات لە ناوچەیەکی جوگرافی دیارکراو، واتە شۆڕشی قیاجییەکان بە شێوەیەکی گشتی ئەوەندە ترسناک نەبووە بۆ سەر دەسەڵاتی مەغۆلەکان، بە تایبەتی دوا گەمارۆدانی و لەناوبردنی شوێنەوارەکانی، لە گەڵ ئەوەی جێگەی نیگەرانی بەردەوام بووە، بە شێوەیەک هەموو میرەکانی مەغۆلی ماندووکرد و بۆ ماوەی بیست ساڵ بێ ئومێد بوون، لە گەڵ بارودۆخەکەی جیاوازی هەبوو لە ماوەیەک بۆ ماوەیەکی دیکە، ئەگەر جیاوازییەک هەبێ لە توندییەکەی لە ماوەیەک بۆ ماوەیەکی دیکە.

ئەوەی شیاوی باسە، کە (غازان خان) لە کاتی گەڕانەوەی لە هەڵمەتی سەربازی یەکەمیدا بۆ وڵاتی شام، لە ڕێگەی هەرێمی دوورگە (جەزیرە) گەیشتە شاری موسڵ لە ڕۆژی (١٥ جەمادی ئەلئاخر ساڵی ٦٩٩ ک / فیبرایەری ساڵی ١٣٠٠ ز)، بەرەو (مەراغە) ڕۆیی، بەڵام نەیتوانی لە ناوچە دەشتاییەکانی ئەربیل بچنە ئەو شارە، بەڵکو هەر نەیتوانی لەوێ نزیک بێتەوە، بەتایبەتی بە هۆی شۆڕشی قیاجییەکان و ئەو بارودۆخە خراپەی لەوێ هەبوو، لەگەڵ ئەوەی ڕێگای چەپ، کە نزیک بوو لە (مەراغە)، دەیتوانی لە ڕێگەی لەشکرە گەورەکەی هێرش بکاتە سەریان و شکست بە شۆڕشی قیاجییەکان بێنێ، بەڵام ئەو کارەی نەکرد، لە بەر ئەوەی بارودۆخەکەیان بەو ترسناکە نەبوو، کە بگاتە ئەوەی ناچار بێت هێرشەکەی ئەنجام بدات، هەروەها لەگەڵ هەبوونی دانووستاندنێک لە نێوان هەردوولا دا، ئەو ڕووبەڕووبوونەوەی بە شتێکی کاتی دانابوو و کاریگەرییەکەی زۆر کەمترە لەوەی باسی لێوە دەکرا، کاریگەرییەکەی بە سەر دەوڵەتی ئیلخانی و سەلامەتی و ئاسایشی سنووردارە و ئەوەندە ترسناک نییە، بەڵام لە هەڵمەتی دووەمدا و لە کاتی گەڕانەوەی لەگەڵ جاثلیق ماریهبالاها و میر (سووتی) لە ساڵی (٧٠٢ ک/ ١٣٠٢ ز) کە کوڕەکەی خۆی میر (گوغای) لەگەڵ بەشێک لەو هێزەی هەیبوو لە دەوروبەری هەولێر بەجێ هێشت، بۆ ئەوەی ئەو هێزە لە ژێر فەرمانی ئەو بێت، لەو کاتە و هەڵمەتەدا ڕێگای (هەولێر)ی گرت بۆ ئەوەی بۆ (مەراغە) بڕوات لە دواییش بۆ (ئوجان) - شای ئیسلام، (غازان خان) لە شوێنی (حدیقە) لە نزیک ئەربیل دابەزی بۆ ماوەیەکی کورت بۆ حەسانەوە لە (٢٠) ی مانگی ڕەمەزان، پێش ئەوەی بەردەوام بێت و بەرەو هەرێمی (ئازەربایجان) بڕوات، دوای ئەوەی لە چیای (کورد) تێپەڕ بێت، ئەوەش مانای ئەوەیە، کە شۆڕشەکە ئەو توندیی و زەبرییەی

نەماوە و کەم بۆتەوە، بەتایبەتی هەبوونی ڕێکەوتن لە سەر ئارامگرتن لە نێوان هەردوو لادا، لەوانەشە (سوڵتان) لەبەرئەوە ڕێگای (ئەربل)ی گرت، بۆ کورتکردنەوەی ڕێگایەکە و ماوەکەی، هەر لەبەرئەوەش لە نزیک ئەربل دابەزی و بە بێ ئەوەی بچێتە ناو شارەکە بۆ حەسانەوەی، بە تایبەتی تەندروستی تێکچوو بوو، ئەوەش مانای ئەوەیە کە سیاسەتی (غازان) جیاوازی هەبوو لە گەڵ سیاسەتی ئەوەی دوای خۆی (ئولجایتو)، دوای مردنی (غازان خان) لە ساڵی (٧٠٣ ک / ١٣٠٣ ز)، کوڕەکەی خۆی میر (محمد خدا بندە) دەسەڵاتی وەرگرت لە دەوڵەتی ئیلخانی، ئەو میرە نوێیە مکوڕ بوو لە سەر جێبەجێ کردنی ئارامی تەواو لە وڵاتەکەیدا، لەوانەش (ئەربل)، بە تایبەتی شۆڕشی قیاجییەکان و ڕووبەڕووبوونەوەیان هەر بەردەوام بووە لە دژی دەسەڵاتی ناوەندی، گرنگییەکی زۆری بە چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەو گرفتانە دا، بە تایبەتی میر (سووتی) کە ئەرکی لەناوبردنی ئەو شۆڕشەی پێ سپێردرابوو، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو و نەیتوانی جێبەجێبکات، ئەویش لە بەر دوو هۆی سەرەکی:

یەکەمیان: سەرقاڵ بوو بە کارە ئیداری و عەسکەرییەکان کە پێی سپاردرابوو لە ناوچەی (دیاربەکر) کە نزیکە لە سنووری وڵاتی شام، کە لەوێ دەسەڵاتی (مەمالیک) هەبوو و دژایەتی (مەغۆلەکانی) دەکرد.

دووەمیشیان: میر (سووتی) زۆر حەزی نەدەکرد ئەو مەسەلەیە لە ڕێگەی شەڕکردنێکی خوێناوی چارەسەر بکات، مەیل و حەزی بۆ لای دانی دەرفەتێکی زۆرتر بۆ دانوساندن و گفتوگۆ کردن، بە شێوەیەکی ئاشتییانە و بە بێ خوێن ڕشتن چارە سەر بکرێ، ئەو میرە نوێیە هیوایەکی زۆری هەبوو بە میر (جاثلیق) بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات، بە تایبەتی ژمارەی چەکدارانی شۆڕشەکە زۆر بوو لە قەڵایەکە. هەروەها هەندێ مەسەلەی تر هەبوو، کە (خان خودا بەندە) ناچار بکات، بۆ ئەوەی ئەو ئەرکە گرنگە بدرێتە کەسی دیکە، کە بە هێزو چاو نەترس بێ و بتوانێ ئەمجارەیان مکوڕ بێت لە سەر جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە هەتا کۆتایی، هەر لە بەر ئەوەش، داوا لە شەریف (عیمادەدین ناسر دەلقەندی) کرا بۆ ئەو ئەرکە، کە زۆر نزیک بوو لە خۆی و جێگای متمانەی ئەو بوو.

لە کۆتایی بڕیار درا میر (عیمادەدین) بەو ئەرکە گرنگە دەستنیشان بکات و (خان خودا بەندە)یش لە ژێر سەرکردایەتی ئەو داندرا، بۆ ئەوەی بەرەو ئەربل بڕۆن، بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی شۆڕشگێڕەکان و لە ناویان ببەن، کە بەڵێنی پێی درا بیکەنە میری ئەو میرنشینە دوای سەرکەوتنی، لەگەڵ هەندێ مافی تایبەتی گرنگ، هەر لە بەر ئەوەش بەگر کەوت و زۆر بە گەرمی بەرەو جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە ڕۆیشت، لەگەڵ ئەوەی شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەکە زۆر توند بوو، بۆیە ناچار بوو بچێتە پاڵ ئەو هێزە عەسکەرییەی، کە بە سەرکردایەتی میر(گوغا)ی بوو، هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئەوەی زۆر بچێتە پێشەوە، بۆ ئەوەی قەڵایەکە گەمارۆ بدات، توانی لە ماوەی چەند مانگێک کاریگەرییەکی زۆر بکاتە سەر شۆڕشگێڕان، (ابن عنبە) لەم بارەیەوە دەڵێ: (- الشریف الدلقندی - توانی بۆ ماوەیەکی زۆر گەمارۆی قەڵایەکە بدات، بەڵام بە بێ ئەوەي ماوەکەي دیار بکات، هەروەها (ابن عنبة) دەڵێ (میر ناسر توانی دوای گەمارۆدانێکی زۆر، قەڵای ئەربل بکاتەوە)، لە لایەکی تر (القاشانی) دەڵێ: (میر - ناسر دەلقەندی) - گەمارۆیەکی توندی سەپاندە سەر قەڵای ئەربل، ئەویش بۆ ماوەی زیاتر لە یەک ساڵ، دوای ئەوەی (قیاجییەکان) خۆ بە دەستدانیان ڕەت کردەوە، بەوەش گەیشتنە دەرئەنجامێک، کە ئەم ڕووداوە زۆرە و ئاڵۆزە، شەڕ و هێرش و ئەو دانوستاندنانەی نێوان هەردوو لا دا، دوو ساڵی خایاند، بەوەش دەگەینە ئەوەی، کە لەوانەیە داوا لە (میر - دەلقەندی - کرابێ، بۆ ئەوەی ئەربل داگیر بکاتەوە لە ساڵی ٧٠٧ ک / ١٣٠٧ ز).

### ب / لەناوبردنی شۆڕشی قیاجییەکان

دوای گەمارۆدان لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، بۆ ئەو شۆڕشگێڕانەی لە ناو قەلایەکە بوون، (ناسر دەلقەندی) توانی بگاتە دەرگا گەورەکەی قەلایەکە و بورجێکی داری لە سەر دیوارەکەی دروست کرد، بۆ ئەوەی بتوانن خۆیان لە تێگرتنەکانی دوژمن بپارێزن، هەروەها هۆیەک بوو بۆ ئەوەی سەربازەکان و زەخیرە و چەکەکان ببەنە ژوورەوە، بەلام بە شێوەیەکی نهێنی لە رێگەی بورجەکە، لە لایەکی تر، یاریدەدەرانی میر (گوغای) گەمارۆیەکەیان توندتر دەکرد لەگەل زیادکردنی لێدانی شۆڕشگێڕان، بەوەش بارودۆخی شۆڕشگێڕان تێکچوو و شلەژا لە ناو قەلایەکە، بە تایبەتی دوای ئەوەی (شەریف ناسر) توانی لە لایەکی تردا بچێتە ژوورەوە، هەر لە رێگەی ئەو بورجەوە، بەوەش سەربازانی هەردوولا رووبەرووی یەک بوونەوە لە ناو قەلایەکە، شەڕ کەوتە ناوەوەو دەرەوەی قەلایەکە، بۆیە ئەرکی شۆڕشگێڕان قورستر بوو، بەلام توانییان بگەنە ژێرەوەی ئەو بورجە و ئاگری تێ بەردەن، بەلام لەشکری میر ناسر لە قەلایەکە کشایەوە، دوای ئەوەی تووشی زەرەروزیانێکی زۆر بوو، لە بەر ئەوەش گەمارۆیەکی توندو بەهێزتری سەپاندە سەریان، لەگەل ئەو سەرکەوتنەی شۆڕشگێڕان بە دەستیان هێنا، کە لە رێگایەوە ورەیان بەرز بوو، بەلام لە بەر کەمی زەخیرە و خواردن و چەک و تێکچوونی بارودۆخیان لە ناوەوە، هەروەها توندکردنی گەمارۆیەکە، کە بووە هۆی نەگەیشتنی یارمەتییە نهێنییەکان لە دەرەوەی قەلایەکە، بارودۆخیان گەیشتە ئەوەی، کە لە رێگەی سەگەکان نامەکان بنێرن، بەلام یەکێک لەو نامانە کەوتە دەست ئەو سەربازانەی، کە گەمارۆی قەلایەکەیان دەدا، هەروەها هەندێ لەو یارمەتییانەی، کە بە نهێنی دەگەیشتە ئەوان، کەوتە دەست ئەو سەربازانە، لە بەر ئەو هۆیانە، گەمارۆیەکە زۆر هیلاکی کردن، بە تایبەتی ماوەیەکی زۆری خایاند، لە بەر ئەوەش میر (ناسر) لە ناکاو هێرشێکی فراوان دەکاتە سەر قەلایەکە، لە چەند لایەک و بە یارمەتی (۳) لە میرەکان، لە سەرووی هەمووان میر (گوغای) و میر (سادق بەگ)، تێیدا توانییان لە سەنگەری یەکەمی قەلایەکە دەرچن و چەند کیسێکی پڕ لە (قوم و بەرد) دابنێن بۆ پەرینەوەیان، چەند هێلێکی بەرگرییان تێکدا، لە دواییش چەند دەزگا و کۆلان و تەلاری سەرەکییان لە قەلایەکەیان کۆنترۆل کرد، زۆرینەیان تێکدران، جگە لە کلێسەکان و مالە مەسیحییەکان، ئەوانە تێک نەدران، بە تایبەتی ئەوانە لە لایەن (الجاثلیق ماریهبالاها) لە سالی (۱۲۰۵) دروست کرابوون، خۆ بەدەستەوەدانیان و فەرمانەکانی میر ناسر لەبارەی دەرچوونیان لە لایەکەوە ڕەت کردەوە، ئەوەش لە مانگی ئازاری سالی ۱۳۱۰ ز - ۷۰۹ ک رووی دا، داوایان لە شۆڕشگێڕانی قیاجییەکان دەکرد بۆ ئەوەی قەلایەکە چۆل بکەن، کە خەلکەکە لە کورد و مەسیحییەکان پێکدەهات، لە کۆتاییدا، کوردەکان گوێڕایەل و ملکەچی ئەو فەرمانانە بوون و لە قەلایەکە دەرچوون، بەلام مەسیحییەکان خۆیان لە کلێسەکە حەشار دا، کە پێشتر (الجاثلیق) لە قەلای ئەربل دروستی کردبوو، ئەوان چوونە دەرەوەیان ڕەت کردەوە.

میر (ناسر دەلقەندی) پێی داگرتبوو لە سەر ئەوەی دەبێ هەر هەموویان لە قەلایەکە بە پەلەو بە بێ دواکەوتن دەرچن، بۆ ئەوەی بتوانێ بە ئاسانی کۆنترۆلی قەلایەکە بکات و کاروبارەکەی رێک بخات، بە شێوەیەک لەگەل بارودۆخی نوێی بگونجێ، لەو کاتەدا، (جاثلیق) نوێنەرێکی خۆی بۆ میر (سووتی) و وەزیر (چوبان) کە دیاری لەگەل خۆی هەلگرتبوو، نوێنەرەکەش: (مەتران عەبد یوشع) بوو، ئەویش بە ئامانجی هێورکردنەوەی بارودۆخەکە و ڕێ بدەنە مەسیحییەکان بۆ ئەوەی لە قەلایەکە بمێننەوە، دوایی چەکەکانیان دادەنێن، هەولێکی زۆری دا بۆ جێبەجێکردنی، بەلام ئەوان تووشی ڕەتکردنەوەیەکی توند بوونەوە لە لایەن هەردوو میردکە: (ناسر و گوغای)، کە پێیان لە سەر هاتنە دەرەوەی

هەموویان لە قەڵایەکە داگرتبوو، بە بێ ئەوەی کەس لەوێ بمێنێ، لەوانەش مەسیحییەکان، وا پێدەچێ ئەو کوردانەی کە لە قەڵایەکە دەرچوون و لە دەشتایی ئەربیل نیشتەجێ ببوون، پشتگیرییان لە فەرمانەکانی هەردوو میرەکە دەکرد، لە بەر ئەوەی حەزیان دەکرد مەسیحییەکانیش لە قەڵایەکە دەرچن، چۆن چەکدارانی کورد و تەتەر پێشتر لەوێ دەرچووبوون، لێرەدا، سەنگەرەکەی میر (ناسر) توندتر بوو، لە ماوەی کە مشتومڕەکە توند ببوو بۆ ماوەی (٣) مانگ و گێردو کێشەی ئەوانەی لە ناوەوە مابوونەوە، لەو کاتەدا، میر (ناسر) هێرشێکی لە ناکاوی کردە سەر ئەوانەی لە ناو قەڵایەکە بوون، خەڵکێکی زۆر کوژرا، بە تایبەتی لە مەسیحییەکان، ئەو رووداوە کاریگەرییەکی زۆری هەبوو بە سەر (الجاثلیق)، لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و کۆششانەی، بەڵام لە کۆتایی توانی شەڕەکە ڕاگرێ، دوای ئەمەی بۆ زۆرینەی مەسیحییەکانی مسۆگەر کرد بەرامبەر ئەوەی لە کڵێسەکە دەرچن، هەروەها لە بورجەکە و ئەو ماڵانەی دەوروبەری، لە گەڵ رووداني هەندێ پێکداادان لە نێوان هەردوو لادا، لە کاتی چۆڵکردنەکەدا، لە کۆتاییدا چۆڵیان کرد، ئەوەی شیاوی باسە، کە (خان جایتو) فەرمانێکی ئێلخانی دەرکرد، بۆ ڕاگرتنی هێرشەکانی سەربازی بە شێوەیەکی رەسمی و دەست هەڵگرتن لە قەڵای ئەربیل لە (٢٤) نیسانی ١٣١٠ ز - ٢٦ ذی القعدە ی سالی ٧٠٩ ک، بۆ ئەوەی دەرفەتێکی باش بدرێ بۆ تەواوکردنی گفتوگۆیەکان و ڕاگرتنی کارەکانی توندوتیژی، ئەویش لە ڕێگای ناوبژیکەری لە لایان (الجاثلیق) و هەندێ لە میرەکان.

بەڵام میری شۆڕشەکە (زەینەدین بالۆ) و پیاوەکانی، زۆرینەی پیاوەکانی کوژران، لەگەڵ ئەوەی سەرچاوەکان باسی چارەنووسیان ناکات بە شێوەیەکی روون، بەڵام میر (بالۆ) لە ئەربیل دوورخرایەوە و بۆ ناوچەیەکی دیکە، دوای ئەوەی لە لایەن (خان جایتو) حوکمەکەی بە سەردا سەپێندرا.

بەو شێوەیە، شۆڕشی قیاجییەکان لە ناو بردرا و نەما، ئەو شۆڕشە چەکدارییە توند و بە هێزە بە هەموو کاریگەرییەکانی سیاسی، کە (ئوردو ئێلخانی) زۆر هەراسان و ماندوو کرد، زۆر لە وزە و هێزەکانی لە سەر ئاستی مەعنەوی و مادی لە ناوچوو، هەمووی لە پێناو لەناوبردنی ئەو شۆڕشە و سەرلەنوێ جێگیرکردنی دەسەڵاتی مەغۆلی لە ناوچەکە، لە پێشەوەیان (ئەربیل).

**ئەنجامەکانی شۆڕش:**

ئەو هەڵمەتە عەسکەرییە فراوانە، هەڵمەتی دووەم بوو بۆ سەر ئەربیل لە سەردەمی (ئێلخانی)، بەڵام مەغۆلەکان شکستیان هێنا لەو جارەدا، هەروەکو لە یەکەمیدا، توانییان یەکلایی بکەنەوە لە بەرامبەر خۆڕاگری خەڵکی ئەربیل و جێگیر بوونیان لە بەرگریدا، لە شارەکەیان و توند و بەهێزی قەڵاکەیان، بەڵام دەسەڵاتەکە پشتی بە خەڵکی دیکە بەستبوو، بۆ ئەوەی ئەرکەکەیان جێبەجێ بکەن و ئیرادەی ئازادی شۆڕشگێڕان بشکێنن، کە بەرگرییەکی باشیان کرد لە پێناو قەڵای ئەربیل و ڕەتکردنەوەی هەموو جۆرەکانی زوڵم و زۆرداری و ستەمکاری، کە مەترسییەکی گەورە بوون بۆ دەسەڵاتی مەغۆلی ئێلخانییەکان و جێگیر بوونیان لە ناوچەکەدا، کە ببوون بە دڕکێک لە جەستەیان بە درێژایی (١٣) ساڵدا، هەتا ئەو کاتەی هانایان بۆ (دەلقەندی) برد، بۆ ئەوەی ئەو شۆڕشە لە ناو ببەن و بۆ ژێر دەسەڵاتی مەغۆلییەکان بگەڕێننەوە، ئەوەی بە بەخشینی شەڕەفی حوکمی میرنشینەکە لە دوای بە ئەنجام گەیاندنی ئەو ئەرکە.

ئەو شۆڕشە و هێرشکردن بۆ سەر ئەربیل، ئەنجامی سیاسی گرنگی لێ دەرکەوت بۆ ئەو شارە، کە (دەلقەندی) میرێکی نیمچە ڕەهای ئەو شارە بووە، کە وای لێکرد ببێتە نیمچە شانشینێکی تایبەت بۆ خۆی و خێزانەکەی، ئەویش بە ڕەزامەندی حکومەتی مەغۆلی، ئەگەر ئەوەش مانای

ئەوەیە، کە ئەو شارە لە حوکمی ناوەندی دەربچێ، (ئەربل) ببووە ئەرکێکی زۆر قورس بەسەریان لە ماوەی تەمەنی شۆڕشەکە، دەسەڵات دەیویست ئەو شۆڕشە بە هەر ڕێگایەک بێت لە ناو ببات، بۆ ئەوەی پارێزگاری لە هەیبەت و پێگە و توانای سیاسی و سەربازی خۆیان بکەن، هەروەها شۆڕشەکە توانی بە شێوەیەکی راستەوخۆ کاریگەری بکات بە سەر دەسەڵاتی مەرکەزی و سیاسی (خان مەغۆلی) هەر لە گەڵ سەرهەڵدانی ئەو شۆڕشە، لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە سیاسییانەی، کە لە دوای سەرهەڵدانی شۆڕشەکە رووی دا.

بەوەش (ئەربل) سەردەمێکی سیاسی نوێی بینی، کە لە جێگیربوونی دەسەڵاتی خێزانەکە خۆی دۆزییەوە، کە دەسەڵاتێکی فراوانی هەبووە لە حوکمیدا، ئەو سەرکەوتنەی کە (شەریف دەلقەندی) بە دەستی هێنا، بووە میراتێک بۆ خۆی و بۆ خێزانەکەی، بە تایبەتی بۆ کۆنترۆڵکردنیان و ملکەچییان بۆ دەسەڵاتی مەغۆلەکان بە بێ رکابەرێک، ئەوەش مەسەلەی داگیرکردنی لە لایەن (بەدرەدین لولو)وە، دوای ئەوەی مەغۆلەکان نەیانتوانی ئەو شتە بکەن، (بەدرەدین) بە بەشێک لە ئەملاکی خۆی دانا، بەڵام ئەوە درێژەی نەکێشا، لەگەڵ ئەوەی حاڵەتی سیناریوی هێرش و داگیرکردنی لە هەر دوو حاڵەتدا، لەگەڵ ئەوەی داگیرکردنی یەکەم لە ساڵی (٦٥٧ ک / ١٢٥٩ ز) حوکمی مەغۆلی لە ئەربل جێگیر کرد، بەڵام ئەوەی تر لە ساڵی (٧١٠ ک / ١٢١٠ ز) حوکمی خێزانی دەسەڵاتداری نوێ توند کرد، کە حوکمی میرنشینەکەی لە دەست گرت، لەگەڵ ئەوەی مەسەلەکە بە دڵی کوردەکان نەبوو، کە چەند هێرشێکی ترسناکیان بۆ سەر ئەربل ئەنجامدا بوو، کە ئامانجەکەی قەڵایەکەی بوو، ئەویش بۆ داگیرکردنی و لەناوبردنی حوکمی (بنەماڵەی دەلقەندی)، یەکێک لەو هێرشانەی کە کوردە مازنجییەکان ئەنجامیان دا و هەندێ لە هۆزەکانی کورد چوونە ژێر فەرمانی کوردەکەی میر (مویارزەدین کک) لە مانگی موحەرەمی ساڵی ٧١٠ ک / ١٣١٠ز)، کە ئەو بارودۆخە خراپەی ئەو کاتەیان بۆ خۆیان قۆزتەوە، وەکو هەوڵێک بۆ هێنانەوە و داگیرکردنی ئەربل، کە پێشتر لە میانی دەسەڵاتی خۆیان بووە، لەبەرئەوەش تووشی رووبەڕووبوونەوەی توند بوون لە لایەن پاسەوانانی قەڵایەکە و شکستیان هێنا و گەڕانەوە، ئەوەش یەکێک بوو لە ئەنجامەکانی سەرەکی شۆڕشەکە لە سەر ئاستی سیاسی، کە پەیوەندی بە داهاتووی ئەربل لەو کاتانەدا هەبوو.

سەرچاوەکان:

١- ابن عنبة، جمال الدين احمد (ت ٨٢٨ ك / ١٤٢٥ ز).

٢- عمدة الطالب في الشاب علي بن ابي طالب، مط الديواني، بغداد ١٩٨٨.

٣- تثقيف التعريف، نسخة مصدرة محفوظة في مكتبة الدراسات العليا، جامعة بغداد.

٤- جامع التواريخ، مج ٣، ج١، ج ٢ / كە بەرێز محەمەد سادق وەریگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی.

٥- تاريخ غازان خان، الدار الثقافية / القاهرة.

٦- العمري، شهاب الدين بن يحيي (ت ٧٤٩ ك / ١٣٤٨ ز).

٧- التعريف بالمصطلح الشريف، دار الكتب، بيروت.

٨- حمد الله المستوفي، حمد الله بن ابي بكر المستوفي القزويني (ت ٧٥٠ ك / ١٣٤٩ ز).

٩- تاريخ گزيدة، موسسة انتشارات امير كبير، تهران، ١٣٣٩ ك.

١٠- القاشاني، ابوالقاسم عبدالله (ت ٧٣٨ ك / ١٣٣٨ ز).

١١- تاريخ اولجايتو، ضات نخست، تهران، ١٣٤٨، قصة ماريهبالاها.

١٢- قصة حياة الجاثيليق ماربيالاها، وليم دروكين، النمسا ١٨٨٩.

١٣- تاريخ الكنيسة الشرقية من عهد المغولي الي مطلع القرن التاسع عشر، دار المشرق، بيروت ١٩٩٢.

١٤- خصباك، جعفر حسن.

١٥- العراق في عهد المغول الايلخانيين، ط ١، جامعة بغداد ١٩٦١.

١٦ - خلاصة تاريخ الكرد و كردستان، ترجمة محمد علي عوني ط٢، ١٩٦١.

١٧- التتار و المغول، مؤسسة شباب الجامعة، الاسكندرية ٢٠٠٤.

١٨- الحياة السياسية في العراق في عهد السيطرة المغولية، النجف ١٩٧٠.

و. نەجات خۆشناو

# هەولێر لە سەردەمی قەرەقۆینلودا

**رابیعە فەتاح خۆشناو**
**کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین**

قەرەقۆینلو خێلێکی کۆچەری تورکمان بوون، لە تورکستانەوە هاتوونەتە باکووری کوردستان و لێی نیشتەجێ بوون و لە ناوەڕاستی سەدەی هەشتەمی کۆچی/چواردەی زایینیدا، توانییان فیدراسیۆنێکی خێلەکی گەورە پێک بهێنن و بەرەبەرە دەسەلاتیان فرەوان بکەن تا لەنێو شالاوەکانی تەیموری لەنگدا توانییان تەورێزی (پایتەخت) بگرن. هەرچەندە سەرەتا جەلائیرییەکان (جێگرەوەی ئیلخانییەکان) دانیان پێ نەهێنابوون، بەلام شالاوەکانی تەیموری لەنگ لە سەرەتای سەدەی نۆیەمی کۆچی/ پازدەی زایینی نەخشەی سیاسی ناوچەکەی گۆڕی، تا گەڕانەوەی قەرە یوسف (سەرداری قەرەقۆینلو) کە لەبەر مەترسی شالاوەکانی تەیموری لەنگ بۆ وڵاتی شام رایکردبوو، وایکرد تەورێز بەر قەرەقۆینلو بکەوێت و بەغداش بۆ جەلائیرییەکان بێت. بەم جۆرە زۆربەی کوردستان، بە تایبەتی مەڵبەندی میرنشینە کوردییەکان کەوتە ژێردەسەلاتی قەرەقۆینلو.[1]

بەر لەوەی تەیموری لەنگ شالاوەکانی دەست پێبکات، هەولێر (ئەربل) وەک یەکەیەکی ئیداری سەر بە دەوڵەتی جەلائیری بوو. سولتان ئووەیسی جەلائیری سنووری هەر لە خوزستانەوە لە باشوور، تاکو موسڵ و ئازەربایجان لە باکوورەوە دەکشا، توانی دەسەلاتی یاخیبووی قەرەقۆینلو لە موسڵ کپ بکاتەوە[2].

تەیموری لەنگ لە سەرەتای سەدەی پازدەی زایینی سێ شالاوی گەورەی بۆ کوردستان و ناوچەکە هێنا، لە شالاوی یەکەمدا لە ساڵی (٧٩٥ک/١٣٩٢ز)دا بەغدای داگیرکرد، بەر لەوەی روو لە هەرێمی دیاربەکر بکا، نامەی بۆ میرەکان نارد، کە بێنە ژێربار. بەرێگەی بەغدا بۆ کەرکوک و هەولێر (ئەربل) و موسڵدا هەڵکشا، شێخ عەلی ئەویرات (حاکمی هەولێر) و یار عەلی قەرەقۆینلو (حاکمی موسڵ) لە کاتی ئابلوقەی تکریت لەلای ئامادە بوون و دیاریی شایانیان بۆ برد. تەیموری لەنگ لە پاداشتی ئەمەدا یارعەلی بە حاکمی موسڵ داناوە و زەویوزارێکی زۆریشی لە کەرکوک داێ[3]. ئەمەش وایکرد هەولێر راستەوخۆ نەکەوێتە بەر تالانی هێرشی تەیموری، چونکە شالاوەکانی تەیموری لەنگ چەندان شار و قەلا و ناوچەی وێران کرد بە جۆرێ، نەک هەر کوردستان، بەڵکو تا شام کەوتنە بەر تالان و وێرانی تەیموری لەنگ.

لە شالاوی سێیەمیدا کە بە شالاوی حەوت ساڵە (٨٠١-٨٠٧ک/١٣٩٨-١٤٠٤ز) ناسراوە، تەیموری لەنگ دووبارە گەڕایەوە کوردستان و ناوچەکە تا دەسەلاتی یاسیبووەکانی جەلائیری و قەرەقۆینلو کپ بکاتەوە. لە ساڵی (٨٠٢ک/١٣٩٩ز)دا

هەرێمی ئەرمینیای وێران کرد و شاری مەلاتیەی داگیرکرد و رووی لە وڵاتی شام کرد. پاشان بە رێگەی موسڵ - هەولێر - پردێ (ئالتون کۆپری)، دوای ئابلوقەدانی لە ساڵی (٨٠٣ک/١٤٠٠ز)دا بەغدای داگیر کردەوە[٤]، بەم جۆرە دەسەڵاتدارانی جەلائیری و قەرەقۆینلو لە بەغدا و دیاربەکر وەدەرنا، کە هەولێریش لەم نێوەندەدا ببووە شا رێگای هێرشەکانی تەیموری بۆ بەغدا.

لە راستیدا لە سەرەتای سەدەی پازدەی زاینیدا ململانێ سیاسییەکان زیانی زۆری بە کوردستان گەیاندووە. دیارە هەولێریش لەم زیانە بێبەش نەبووە. لە کاتێکدا تەیموری لەنگ گەڕاوەتەوە مەڵبەندی خۆی، قەرە یوسفی قەرەقۆینلو توانی بەغدا داگیر بکاو بە تەواوی دەست بەسەر عێراقی عەجەمیدا بگرێت. دووبارە تەیموری لەنگ، میرزا ئەبوبەکری نەوەی بۆ بەغدا نارد و لە ساڵی (٨٠٦ک/١٤٠٣ز)دا قەرە یوسفی وەدەرنا و رێگای (دیاربەکر-موسڵ- هەولێر ی) بۆ ملکەچ کردنی گرتەبەر. وەک دیارە میر عەبدوڵڵای حاکمی هەولێر ویستی بەرپەرچی هێزەکانی تەیموری بداتەوەو لێیان یاخی بوو، بەڵام میرزا ئەبوبەکر دەستبەسەری کرد. ئەمەش وای کرد قەرەیوسف و سوڵتان ئەحمەدی جەلائیری لە ترسی تەیموری لەنگ پەنا بۆ مەمالیکەکان ببەن. دواجار تەیموری لەنگ خوراسان و ئازەربایجان و هەرێمی چیای بە میرانشای نەوەی بەخشی، بەم جۆرە هەولێر کەوتە ژێر دەسەڵاتی تەیموورییەکان.

پاش مردنی تەیموری لەنگ لە ساڵی (٨٠٧ک/١٤٠٥ ز)، قەرە یوسف و سوڵتان ئەحمەد توانییان ناوچە داگیرکراوەکانیان لە نەوەکانی تەیمور بسێننەوە. قەرە یوسف تەورێز و هەرێمی دیاربەکر و دەوروبەری کردە مەڵبەندی خۆی. سوڵتان ئەحمەدیش (٨٠٨ک/١٤٠٥ز) دەستی بەسەر عێراقی عەرەبی داگرتەوە. هەروەک لەگەڵ مەمالیکەکان لە سەر ئەو پەیمانە رێککەوتبوون. کاتێ سوڵتان ئەحمەد بەغدای گرتەوە، شێخ عەلی ئەویرات حاکمی هەولێر و محەمەد سارو تورکمان حوکمڕانی شارەزوور ملکەچییان بۆ نواند[٥]. بۆیە دەتوانین بڵێین دووبارە هەولێر کەوتەوە ژێر رکێفی جەلائیرییەکان و، ئەمەش دەیسەلمێنی کە حاکمی هەولێر لاگیری بۆ جەلائیرییەکان نواندووە، لە کاتێکدا ناوچەکە لە نێوان هەردوو هێزی جەلائیری و قەرەقۆینلو دابەش ببوو.

لە ساڵی (٨١١ک/١٤٠٨ز)دا کاتێ "عەلائودەولەی کوڕی سوڵتان ئەحمەد" لەبەر دڵنیا نەبوون لە باوکی، بەغدای جێهێشت و بەرێگای هەولێر - ئازەربایجان پەنای بردووە بۆ قەرە یوسف، بەڵام قەرە یوسف، زیندانی کرد.

سوڵتان ئەحمەد لە ساڵی (٨١٣ک/١٤١٠ز) دا لە کاتێکدا قەرە یوسف خەریکی کپکردنەوەی یاخیبوانی ئەرزنگان و قەرە یولوکی سەرداری خێڵی ئاق قۆینلو بوو، بە پێچەوانەی رێککەوتنامەی پێشوو بەرێگای شاری "خۆی"، تەورێزی داگیرکرد، ئەمەش وای لە قەرە یوسف کرد رووی لە تەورێز بکات و هێرش بۆ سوڵتان ئەحمەد ببا، لە ئەنجامدا تەورێزی گرتەوە و سوڵتان ئەحمەدیشی دەستگیر کرد. بەمەش دەسەڵاتی جەلائیرییەکان زۆر بچووک بۆوە و لە کوردستان کۆتاییان پێهات. بەم سەرکەوتنە "محەمەد سارو تورکمان" حوکمڕانی شارەزوورو هەندێ لە میرە تورکمانەکانی عێراق هاتنە لای قەرە یوسف و لاگیرییان بۆ نواند. پاشان قەرە یوسف، شا محەمەدی کوڕی دوای ئەوەی لە هەولێر پشووی دا، بەرێگای کەرکوک - بەعقوبە بەرەو بەغدا نارد بۆ ملکەچ کردنی، هەروەها دیلە جەلائیرییەکانی کە لە میری ئەویرات و سەرۆک خێڵە کورد و عەرەبەکان پێکهاتبوون، لەگەڵ شا محەمەد، رێکی خستن و رەوانەی عێراقی عەرەبی کردن، تا لە ساڵی (٨١٤ک/١٤١١ز)دا بەغدای داگیر کرد. بەم شێوەیە دەسەڵاتی جەلائیرییەکان کۆتایی پێهات. پاشان شا محەمەد هەولێر و موسڵی بە شا عەلی کوڕی بچووکی سپارد و حاکمی بۆ کەرکوک و داقوقا و ناوچەی تر

دانا[٦]، لەمەوە دەردەکەوێ قەرەقۆینلو سەرەتا بە سیاسەتێکی هێمنانە لەگەڵ هەولێر جوولابنەوە، دواتر لە خانەوادەی خۆیان حاکمیان بۆ دانابن.

لە راستیدا هەر لەو کاتەی قەرە یوسف توانیی دەسەڵاتی بسەپێنی، لەبەر ئەوەی سەرکردەیەکی بە دەسەڵات بوو، دەتوانین بڵێین زۆربەی ناوچەکانی کوردستان تارادەیەکی زۆر ئارام بوو. بۆیە هەولێریش لەو ماوەیەدا ئارامیی بەخۆوە دیوە، بەڵام بەمردنی قەرە یوسف سەرکردە قەرەقۆینلووەکان نەیانتوانی بەرگری لە رۆژهەڵاتی قەوارەکەیان بکەن. شاهرۆخی کوڕی تەیموری لەنگ رووی لە کوردستان کرد و بەشێکی زۆری داگیر کرد. لەو کاتەدا سەرکردە قەرەقۆینلووەکان مەیدانی جەنگیان جێ هێشت، زەینەڵی کوڕی یارعەلی گەڕایەوە هەولێر و میر بایەزید ئاینلوو رووی لە کوردستان کردووە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ سەرانی قەرەقۆینلوو هەرچەندە ناوچە گرنگەکانیان تەسلیم کردووە، کەچی رووبەڕووی شاهرۆخ بوونەتەوە و لەگەڵ ئاق قۆینلووی هاوپەیمانی شاهرۆخ لە کوردستان جەنگاون. لە دەوروبەری ساڵی (٨٢٤ک/١٤٢١ز) ئەسکەندەری کوڕی قەرە یوسف لە کەرکوکەوە خۆی تەیار کردەوە، رووی لە ئاق قۆینلووەکان کرد، هێزێکی کۆکردەوە لە زەینەڵ بەگی کوڕی یارعەلی (حوکمڕانی موسڵ)، میرزا عەلی برازای قەرە یوسف (حوکمڕانی هەولێر) و جەنگلوو حەسەن لە کەرکوک لەگەڵا ئەو تورکمانانەی لەدەوروبەری دابوون، لەئەنجامدا ئاق قۆینلووەکان گەلێک لە سەرکردەکانیان کوژران و قەرە یولوک بریندار بوو، عەلی بەگی کوڕی بەهانایەوە هات، بەڵام سوودی نەبوو، شکستیان خوارد و مەیدانی شەڕیان جێهێشت، و ئەسکەندەریش دەستی بەسەر شاری ماردین و قەڵاکەیدا گرتەوە[٧].

پاش مردنی قەرە یوسف سەرکردەیەکی وەک ئەو هەڵنەکەوت تا بتوانێ دەسەڵاتی بەسەر ناوچەکان بسەپێنێ، بۆیە کوڕ و نەوەکانی لە نێو خۆیاندا کەوتنە ململانێ، ئەسبەهان و شا محەمەد لە هەرێمی دیاربەکر و عێراقی عەرەبیدا کەوتنە ململانێ، لەساڵی (٨٣٣ک/١٤٢٩ز)دا ئەسبەهان کوڕی قەرە یوسف هێرشی کردە سەر شاری موسڵ و دەوروبەری و وێرانکارییەکی زۆری ئەنجامدا. هەروەها لەساڵی (٨٣٦ک/١٤٣٢ز)دا ئەسبەهان دەستی بەسەر بەغدادا گرت، شا محەمەد لەگەڵا کوڕ و هەندێ لە میرەکانی رایکرد بۆ موسڵا. لەوێ بەیارمەتی میری بنەماڵەی ئال فەزل توانی بە سەربەخۆیی حوکم بگێڕێ و شێخ حارسی بنەماڵەی فەزلی کردە حاکمی موسڵا و شاعەلی کوڕیشی کردە حاکمی هەولێر (ئەربل). وەک پێدەچێ تا سەر شا عەلی حوکمی هەولێری نەکردبێ، لە بەرئەوەی ساڵی (٨٣٨ک/١٤٣٤ز) دا شا عەلی کوڕی شا محەمەد لەو کاتەدا لە سەربازگەیەکی ناوچەکە بوو، توانای بەرگری کردنی نەبوو، ناچار خاو و خێزانەکەی کۆکردەوە، و رووی لە هەولێر کردەوە و میرزا عەلیی دەستگیر کرد، پاشان رووی لە کەرکوک کرد و داگیری کرد، پاشان ئەسبەهان لە بەغداوە رووی لێ کرد و شا عەلی بۆ تەورێز هەڵات[٨].

ئەسبەهان لەساڵی (٨٣٩ک/١٤٣٥ز)دا بۆ داگیرکردنی هەولێر کەوتە رێ، میرزا عەلی حاکمی ئەوێ، شارەکەی تاڵان کرد و سووتاندی، تاکو ئەسبەهان سوودی لێ وەرنەگرێ، خەڵکی شارەکە چوونەوە ناو قەڵا و بەرگرییان کرد، دوایی ئەسبەهان خۆی ئابڵوقەی هەولێری دا و چەندان شەڕی کرد، سەرەنجام نەیتوانی داگیری بکا و نزیکەی پێنج تا شەش مانگ پێوەی خەریک بوو، هەوڵە سەربازییەکانی شکستی هێنا، لەبەر سەختی قەڵاکە و بەرگری دانیشتوانەکەی لە دژی هەر هێزێکی دەرەکی، ئەگەر بواریان بۆ رەخسابێت، هەر وەک ئەو بەرگرییە بێهاوتایەی کە لە دژی مەغۆل کردیان، کە مەغۆلەکانیان ناچار کرد پەنا بۆ فرت و فێڵ ببەن. بۆیە ئەسبەهانیش رێگای دیکەی گرتە بەرو بەبێ ئەوەی کەس هەست بکا ژەهری لەنێو بیری ئاو خواردنەوە کرد و خەڵکێکی زۆری لێ کوشتن.

بەڵام نەیتــوانی ژەهر بخــاتە ناو بیــری میــرزا عــەلی، کــەچی بەم ڕێگایەش نەیتــوانی دەست بەســەر قــەڵای هەولێردا بگرێ، تا دواجــار پێکهــاتن و قــەڵاکــەی دایەوە و کچەکەی خواست و پاشان ڕووی لە مــوسڵ کــرد ســەرباری کــارەکــانی ئەســبــەهان دەبینین هەر لە ٨٣٩ تاعــون کــەوتە ویزەی خــەڵقی لە شــارەزوور و هەولێــر و کــەرکــووک گــەلێکی لێ کــوشــتــوون[٩]. دەیویست لەوێش هەر ئەو پلانە دووبارە بکاتەوە، بەڵام دەســتی بەسەر موسڵدا گرت و عیسا بەگی لەوێ کــردە حــاکم و گــەڕایەوە بــەغــــــــدا، لــە دەوروبــەری ســــــاڵی (٨٤١ک/١٤٣٨ز)دا ئەســبــەهان لە بەغــداوە بەهەمــان مەبەست ڕێگای هەولێر (ئەربل)ی گرتە بەرو مــاوەیەک لەوێ مــایەوە، پاشــان چووە دەوروبەری مــاردین لــەڕێــگــایــدا تــووشــی خــێــڵی(دبانلوو)ی ســەر بە ئاق قــۆینلووەکــان بوو، تالانی کــردن و گــەڕایەوە هەولێــر و پاشــان چووەوە بەغدا[١٠].

ئەڵوەندی کــوڕی ئەسکەندەری کــوڕی قــەرە یوسف کــە هەواڵی مــــردنی ئەســبــەهان و دانانی (فــــــولاز)ی پــێــگــەیشــت لــە دیاربەکــردەوە بەســوپاوە کــەرکــوک وهەولێر و موسڵی داگیر کرد، و عــیــسا بەگ ئامــۆژگــاری کــرد کــە ئارام بگرێ و بۆچوونە ناو بەغــدا پەلە نەکــات، بەڵام گوێی پێ نەدا. لەمەوە عیسا بەگ بۆلای جیهانشا ڕایکردو داوای لێ کــرد بەغـــدا بگرێ، ئەڵوەندیش هێـــرشی بۆ بەغــدا برد، و نەیتــوانی بیگرێ و بەناچاری بۆ کەرکوک گەڕایەوە.

پاش مـــــردنی شـــــاهروخ، جــیــهــانشــای کــوڕی قــەرە یوسف لەبەرئەوەی بە یاخیبوونی ئەڵوەندی کوڕی ئەسکەندەرەوە خەریک بوو، نەیتــوانی یەکــســەر ملمــلانێی نــەوەکــــــــانــی تــەیموری لــەنــگ بقۆزێتەوە، بەدوای ئەڵوەندی نارد، ئەویش بەددەم داواکــەیەوە نەچوو، ســــــاڵی (٨٥١ک/١٤٤٧ز) لە هەولێــر و مــوسڵ یاخــیــبــوونی ڕاگــەیاند، جــیــهــانشــا ســوپایەکی زۆری بــۆ کـــــپــکــردنەوەی نــارد، سەرەنجام ئەڵوەند لە شەڕێکدا دۆڕا و پەنای بۆ دیاربەکر بردxi.

پیــر بوداق لە بەغــداوە بە ســەربەخــۆیی حوکمی گێــڕاوە، ئەو ئەرکــانەی لە بەرامــبــەر تەوریزی پایتــەخت لە ســەر شــانی بوو جێبەجێ نەکرد و خۆی لە ئەرکە دارایــیــەکــان دزیــیــەوە، وەکــو ناڕەزایــیــــەک لە دژی باوکی لە ســـاڵی (٨٦٦ک/١٤٦١ز)وە بە تەواوی باج و خــەراجی لەســەر باوکی پچـــڕی و مـــــوڵـک و ســــامــــانێکی زۆری گلدایەوە، بەمــەش بەرەنگاری دەســەڵاتی تاکڕەوی جیهانشای کرد، بۆیە جــیــهــانشــا بڕیاریدا هێــرش ببــا و بەغدا لە پیر بوداق بسێنێتەوە. بۆ ئەم مـــەبەســـتــەش ســــاڵی (٨٦٩ک/١٤٦٤ز) گــــەلێ ڕێــو شوێنی گرتەبەر سەرەتا فەرمانی دا هەمــوو مــیــر و حــاکــمــەکــانی ژێر قــەڵەمــڕەوی بە ســوپاوە کــۆمــەکی بکەن، پاشــــان نوێنەری بۆ لای ئوزون حەسەن نارد و پەیمانی لەگەڵ بەست، کــە ڕێگا لە پیــر بوداق بگرێ و هیچ یارمەتییــەکی نەداو نەیەڵێ ئازووقــەی بۆ بچێ، گــەر ڕووشی تێکرد تەسلیمی بکاتەوە، لە بەرامبەر ئەمەدا موسڵ و هەولێر و شنگاری دەداتێ، ئوزون حەسەن بەمـــــە ڕازی بوو.[١٢] ئەمــــەش دەرفــەتێکی باش بوو بۆ ئوزون حەسەن بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتی و بەدەستهێنانی ناوچەی زیاتر لە هەرێمی دیاربەکر.

**ئەنجام**

یەکەم: لەبەر ئەوەی بارودۆخی ســیــاسی لە ســەردەمی خــێــڵی قەرەقۆینلو بە گشتی ئارام نەبووە، ئەمــە بە ســەر حــاکمــیــەتەکــانیش ڕەنگی داوەتەوە، بە تایبـــــەتی هەولێـــــر، کـــــە بارودۆخ لەو سەردەمەدا شڵەژانی بەخۆوەدیوە.

دووەم: زۆربــەی زۆری ئـــەو دەسەڵاتدارانەی هەولێریان داگیــر کــردووە کــوڕی خــۆیان لێ کــردۆتە حاکم. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ، کە هەولێــــر لەڕووی ســــیــــاسی و ئابووریــیــەوە پێگەیەکی گــرنگی هەبووە و کاری لە چالاکی سیاسی ئەوان کردووە، بۆیە ڕاستەوخۆ کوڕ یا نەوەکانی قەرەقۆینلو حوکمیان کردووە. قــەرە یوسف کــوڕی داناوە و ئەسبەهانیش کوڕەکەی پێشنیاز کــردووە و کــوڕی ئەسکــەندەر لە هەولێــر حــوکــمی گــێــڕاوە و هەتا تەیموورییــەکــانیش نەوەی خــۆیان بە حاکم داناوە.

سێیەم: هەولێر بۆ شوێنێک لەوێوە هێرش بۆ مەڵبەندەکانی دیکە براوە، جەلائیرییەکان لە هەولێرەوە هێرشیان بۆ تەوریز بردووە.

چوارەم: هەولێر هاوشانی شارەکانی دیکە بووە، بەتایبەتی موسڵ، کە بە درێژایی مێژوو گرنگی زۆری هەبووە، لەماوەی قەرەقۆینلۆدا هەولێر وەکو شارێک هاوشانی شارەکانی دیکە بووە.

پێنجەم: سەربازی ئەوەی سەرکردەکان لەو ماوەیەدا هەر بە رێگای هەولێرەوە بۆ بەغدا چوون و هێرشیان بردووە و لەو رێگایەوە زۆرترین هێرش بۆ بەغدا براوە.

شەشەم: بەو پێیەی لە ماوەی قەرەقۆینلو گرنگترین مەڵبەندی سیاسی بریتی بوون لە تەوریز و بەغدا و دیاربەکر، و چونکە هەولێر هەر سێ ناوچەی بەیەکەوە بەستۆتەوە، لەو ماوەیەدا وەکو رێگایەکی سەربازی بەکارهێنراوە. بۆ جێگەی ململانێی سەرانی قەرەقۆینلو پاش ئەو مەڵبەندە گرنگانە، هەولێر، شوێنێکی ستراتیجی هەبووە. بەجۆرێ کە وەکو کلیلی شارەکانی دیکە مامەڵەی لەگەڵ کراوە. حاکمەکانی بەغدا بەردەوام لە هەوڵی جدی دابوون تا هەولێر بۆ خۆیان زامن بکەن، چونکە زامنکردنی هەولێر ئارامی و ئاسایش بە بەغدا دەدات.

حەوتەم: لەبەر ئەوەی ململانێی سیاسی لەو ماوەیەدا زۆر بووە، حاکم و دەسەڵاتدارانی هەولێر بە گوێرەی لاگیری بۆ ئەو هێزانەی سەرکەوتوون یاخود دانانی لەلایەن ئەو دەسەڵاتداریەتییەی هەولێری داگیر کردووە، حوکمیان کردووە، زۆرتر بەرچاو دەکەوێت، کە دەسەڵاتداران کوڕ یا نەوەدیان لێ کردبێتە حاکم لەوەی حاکمی هەولێر لەکاتی گۆڕینی دەسەڵاتدار لاگیری نواندبێت.

هەشتەم: وەک دەردەکەوێ حاکمانی هەولێر لەو ماوەیەدا پابەند بوون بە دەسەڵاتدارانی پایتەختەوە، بۆیە ناسنامەی حاکمان بە خودی دەسەڵاتدارانەوە بەستراوەتەوە، نەک بە خەڵکانی هەولێرەوە.

**پەراوێز و سەرچاوە**

١- سەبارەت بە خێڵی قەرەقۆینلو بڕوانە فاروق سومر: قراقوينلوها، ت: وهاب لي، انتشارت علمي، (تهران: ١٣٦٩ه.ش).

٢- المهراني الكردي: الذيل علي العبر في خبرمن غبر، تحقيق: صالح مهدي، (بيروت: ١٩٨٩)، ق١، ص٣٨٦-٣٨٧. خواندمير: دستور الوزراء، تصحيح: سعيد نفيسي، (تهران: ١٣١٧هـ.ش)، ص٢٥٣، ٣٣٣، ٣٣٧. هتروتها ابراهيم خليل: اوضاع العراق السياسية في عهد السلطان احمد الجلائري، مجلة اداب الرافدين، جامعةالموصل، (الموصل: ١٩٧٧)،ع ٨، ص١٢٩.

٣- نظام الدين شامي: ظفرنامه، با اهتمام: فلكس تاور، المطبعة الامريكية، (بيروت: ١٩٣٧).ص١٤٢.

٤- غفاري: تاريخ نگارستان، تحقيق: اقا مرتضي مدرس گيلاني، (تهران: ١٣٨١ه.ش)، ص٢٥١.

٥- حافظ ابرو: زبدة التواريخ تصحيح: سيدكمال حاج سيد جوادي، سازمان چاپ و انتشارات وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامي، (تهران: ١٣٧٢ه.ش)، ج١، ص١٦٨-١٦٩.

٦- حافظ ابرو: م.ن، ج١، ص٤٠٤-٤٠٥.- حسن روملو: احسن التواريخ، به اهتمام: عبد الحسين نوائي، بنگاة ترجمة و نشري كتاب، (تهران: ١٣٤٩ه.ش)، ج١١، ص٦٧. خوافي: مجمل فصيحي، تصحيح: محمود فرخ، كتابفروشي باستان، چاپ ظوس، (مشهد: ١٣٣٩هـ.ش)، ج٣، ص٢٠٧.

٧- حافظ ابرو: م.ن، ج٢، ص٧٧٧. ابوبكر ظهراني: كتاب دياربكريه، تصحيح: نجاتي لوغال وفاروق سومر، كتابخانة ظهوري، (تهران: ١٣٥٦ه.ش)، ج١، ص٧٨.

٨- الغياثي: تاريخ الغياثي، تحقيق: طارق نافع الحمداني، مطبعة اسعد- بغداد، ١٩٧٥) ص ٢٥٥، ص٢٦٧. هتروتها عباس العزاوي: تأريخ العراق بين الاحتلالين، مطبعة النفيض الاهلية، (بغداد: ١٩٣٩ ج٣، ص٨٤ - ٨٨. ج٣، ص٩٠.

٩- ياسين العمري: منية الادباء في تاريخ موصل الحدباء، تحقيق: سعيد الديوجي، مطبعة الهدف (موصل: ١٩٥٥)

١٠- الغياثي: م.ن، ص٢٦٩. ابوبكر ظهراني: م.ن، ج١، ص١٣١.

١١- ابو بكرظهراني: م.ن ج١، ص١٧٨. الغياثي: م.ن، ص٣٠٥. غفاري: تاريخ جهان ارا، كتاب فروشي حافظ، (تهران: ١٣٤٣هـ.ش)، ص٢٤٩.

١٢- ابوبكر ظهراني: هەمان سەرچاوە، ج٢، ص٣٧١. الغياثي: هەمان سەرچاوە، ص ٣٢٠-٣٢١.

# هەولێر لە سەردەمی ئاق قۆینلودا

رابیعە فەتاح خۆشناو
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

"ئاق قۆینلۆ[١]" خێڵێکی کۆچەربی بوون، مەڵبەندی یەکێتی خێڵە تورکمانەکانیان پێکدەهێنا، ڕەنگە بە هۆی خزمایەتی یاخود بەرژەوەندی هاوبەش یا هەر هۆیەکی دیکە لە دەوری یەک کۆبوونەتەوە، لە ناوەڕاستی نیوەی دووەمی سەدەی نۆیەمی کۆچی / پازدەی زایینی پاش دەسەڵات وەرگرتنیان لە قەرەقۆینلو، خێڵی دیکەش هاتوونەتە پاڵیان.

"ئیبن بەتتوتە"ی گەڕیدە لە سالانی (٧٣٣ - ٧٣٥ ک / ١٣٣٣ - ١٣٣٤ ز)دا سەری لە ئەنادۆڵ داوە، باسی شاری ئەرزەرۆم دەکا، کە لە شەڕ و پێکدادانی دوو خێڵی تورکمان، زۆربەی شارەکە وێران بووە[٢]، ئەمەش دەیسەلمێنێ، کە لە خەلات و دیاربەکردا ململانێی سیاسی لە ئارابووە و دەسەلاتی مەرکەزی بە گوێرەی پێویست بەهێز نەبووە، هەر چۆنێک بێت بە پێی بۆچوونی فاروق سومەری توێژەر، پاش مردنی سوڵتان ئەبو سەعید ئیلخانی - دوا سوڵتانی مەغۆلی لە بنەماڵەی هۆلاکۆ - لە کاتی دەستپێکردنی ململانێی نێو خێزانی ئیلخانییەکان، گرنگی سیاسی قەرەقۆینلۆ و ئاق قۆینلۆ بەدیارکەوت، بە جۆرێ ئاق قۆینلۆ وەکو هێزێک لە خزمەتی میری ناوچەکان کاریان کردووە.

لە ڕاستیدا ئەگەر بمانەوێ باس لە هەولێر لە سەردەمی ئاق قۆینلۆ بکەین، دەبێ ئەوە بزانین، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆیەمی کۆچی / پازدەی زایینی بە هیچ جۆرێ ئاق قۆینلۆ نەگەیشتۆتە هەولێر.

قەرە قۆینلۆ فەرمانڕەوایی کوردستانی کردووە، لەو ماوەیەدا ئاق قۆینلۆ وەکو نەیارێکی قەرەقۆینلۆ لە ناوچەکانی باکووری کوردستان چالاک بوون.

دەتوانین ئەو هۆیانە دەستنیشان بکەین کە لەو ماوەیەدا ئاق قۆینلۆ نەگەیشتۆتە هەولێر:

یەکەم: ئاق قۆینلۆ ناوبەناو هێرشیان بردۆتە سەر میرنشینە کوردییەکانی باکووری کوردستان و ململانێ لەگەڵ ئەو میرنشینانە وای کردووە نەپەرژێتە سەر ناوچەکانی دیکە.

دووەم: هەولێر وەکو مەڵبەندێک لە تەورێزی پایتەخت دوور بووە، ئاق قۆینلۆ گرنگییان بەو ناوچەیە نەداوە.

سێیەم: سەنتەری هەولێر - قەلا - لەو ماوەیەدا میرنشینی لێ نەبووە، دەسەڵاتداری و فەرمانڕەوای شارەکە بەگوێرەی دەسەڵاتی مەرکەزی دەگۆڕا.

جێگەی ئاماژە پێکردنە (زرار سەدیق) پاش گەڕانەوەی قەرە یوسفی سەرداری قەرەقۆینلۆ لە وڵاتی شام لە ساڵی (٨٠٨ - ٨٠٩ک / ١٤٠٥ - ١٤٠٦ز)دا، باس لەوە دەکا، کە قەرەیولوکی

سەرداری ئاق قۆینلۆ توانیویەتی دیاربەکری خواروو داگیر بکا، بەتایبەتی هەردوو شاری موسڵ و شنگار[٣]، بۆ ئەم رایەشی پشتی بە (غیاسی) ( لەساڵی ٨٩١ک/ ١٤٨٦ز کۆچی دوایی کردووە) مێژوونووس بەستووە، کە لە باسی قەرە یولوکدا دەڵێ: "ئامەد و شار و شارۆچکەکانی تەختی بووە، پاشان دەستی بەسەر ماردیندا گرتووە، کە پێشتر هی یوسف بارانی - قەرە یوسفی سەرداری قەرەقۆینلۆ - بووە، بەهۆی مارەیی کچەکەی هەروەک سەرگوزشتەمان گێڕایەوە، دیاربەکری سەروو هەتا سنووری خاتوونیە لە شنگارەوە بۆ هەولێر و موسڵ، کە ئەمانە دیاربەکری خواروون موڵکی بوون[٤]" لێکۆڵەر پێیوایە کە نابێت هەولێر لە ژێردەستی قەرە یولوک بووبێت، چونکە خەوافی مێژوونووس (لە ساڵی ٨٤٩ک/ ١٤٤٥ز کۆچی دوایی کردووە) باس لەوە دەکات، کە هەولێر لەلایەن باوکییەوە - قەرە یوسف - دراوە بە شا محەممەد[٥]، هەرچی عەلا مەحمودی لێکۆڵەرە پێیوایە، قەرە یوسف (٨٠٨ک / ١٤٠٥ز)دا پاش چەندان شەڕ توانی موسڵ و شنگار لە قەرە یولوک بستێنێتەوە بۆ ئەم رایەشی پشتی بە (منجم باشی: و (القرماني، بەستووە[٦]، بۆیە لەم رووەوە پێویستە ئەم سەرنجانە بخەینە روو:

أ- لەو دەقەی (غەیاسی)دا بە هیچ جۆرێ ئاماژە بەو ساڵە نەکراوە، کە شنگار و هەولێر و موسڵ لە سنووری دەسەڵاتی قەرە یولوک بووبن، بە واتا کەی و لەدوای چ رووداوێک داگیری کردوون؟[١١] چونکە قەرە یولوک تا مردنی ململانێی هێزەکانی ناوخۆ و دەرەوەی سنووری دەسەڵاتی لە گۆڕانکاریدا بووە، رەنگە بشێ پاش ساڵی (٨١٢ک / ١٤٠٩ز) کە ماردین داگیر دەکا دەسەڵاتی بەم جۆرە کشابێ، بە گشتی دەسەڵاتی لە ئورفە تا ئەرزنگان سەپاندووە.

ب- (ئەبوبەکر تەهرانی لە پاش ٨٨٦ک/ ١٤٨١ز کۆچی دوایی کردووە) مێژوونووسی ئاق قۆینلۆکان، کاتێ باس لە گەڕانەوەی قەرە یوسف دەکات زستان لە موسڵ بەسەر دەبا، بە وردی باس لە گەڕانەوەی دەکا، کە لەگەڵ میرە کوردەکاندا کۆبۆتەوە، کەچی باس لەوە ناکات قەرە یولوک موسڵ و شنگاری لە ژێر دەسەڵاتدا بووبێ[٧]. هەروەها پاش مردنی قەرە یوسف تا کوشتنی قەرە یولوک موسڵ و دەوروبەری ناوچەی چالاکی ئەسکەندەر بووە و هێزی لێ کۆکردۆتەوە، سەیر لەوەدایە (ئەبوبەکر تەهرانی) باس لە بچووکترین ناوچەی گەرمیان و کوێستانی قەرە یولوک دەکا، کەچی باس لەوە ناکا شنگار و هەولێر و موسڵی گرتبێ.. بەهەمان شێوە (حەسەن روملو لەپاش ساڵی ٩٨٥ک/ ١٥٧٧ز کۆچی دوایی کردووە) لەوی وەرگرتووە و باس لەمە ناکا[٨].

ج- (خەوافی) لە رووداوەکانی ساڵی (٨١٤ک - ١٤١١ز) دەڵێ: "شا محەمەد - کوڕی قەرە یوسف - هەولێر و موسڵ، کە پێشتر بەفەرمانی باوکی لەژێر دەسەڵاتی دابوون، بە شا عەلی کوڕی و حەسەنی، ئەتابکی بەخشی"[٩]، ئەگەر ئەمە بۆ هەولێر ببێ بە بەڵگە کە لەژێر دەسەڵاتی ئاق قۆینلۆکان نەبووە، ئەی لەبەرچی بۆ موسڵ نابێ؟!

د- هەرچی (حافزئەبرو لە ساڵی ٨٣٤ک/ ١٤٣٠ز) کۆچی دوایی کردووە)یە بەهیچ جۆرێ ئاماژە بەو دەسەڵاتەی قەرە یولوک ناکا، تەنها لە ساڵی (٨١٢ک - ١٤٠٩ز)دا باس لەوە دەکا قەرە یولوک رووی لە ماردین کردووە.[١٠]

هـ- هەرچی سەرچاوە مەملوکییەکانن ئاماژە بەوە ناکەن کە بەر لە گەڕانەوەی قەرە یوسف، ئاق قۆینلۆکان موسڵیان گرتبێ، تەنها (ئیبن حەجەر لە (٨٥٢م/١٤٤٨ز کۆچی دوایی کردووە) دەڵێ: "لە ساڵی (٨٠٨ک - ١٤٠٥ز) دا قەرە یوسف دەستی بەسەر موسڵدا گرت[١١]، بەڵام باس لەوە ناکا کێ لە موسڵ بووە، هەروەها ئاق قۆینلۆکان توانیویانە لە ساڵی(٨١٤ک - ١٤١١ز) دا موسڵ و شنگار تاڵان کەن[١٢]..

و- گومان لەوەدا نییە پاش

کوشتنی حاکمی موسڵ یار عەلی -برای قەرە یوسف- لەساڵی (٨٠٦ک - ١٤٠٣ز) دا، بۆشایی سیاسی و ئیداری دروست بووە، کە تەیمور لەنگ نەخشەی سیاسی ناوچەکەی گۆڕیوە[١٣]، لەکاتێکدا (غەیاس) باس لەوە دەکات قەرە یولوک داگیری کردووە، کە ناوچەکە هی تەیمور لەنگ بووە، کەچی تەیمور لەنگ تەنها ئامەدی بە قەرە یولوک بەخشیوە، هەردوو مێژوونووسی (مونەجم باشی) و (ئەڵقرمانی) لەویان وەرگرتووە، کەچی (ئەبوبەکر تەهرانی) باس لەمە ناکا.

لە ساڵی (٨٢٤ک / ١٤٢١ز) پاش مردنی قەرە یوسف سەرداری قەرە قۆینلو، لەبەر هێرش و هەڵمەتی تەیموورییەکان، دەسەڵاتی قەرەقۆینلو کەوتە شڵەژان، ئەسکەندەری کوڕی قەرە یوسف لە کەرکوکەوە خۆی تەیار کردەوە، رووی لە ئاق قۆینلۆی هاوپەیمانی تەیموورییەکان کرد، هێزێکی کۆکردەوە لە زەینەڵ بەگی کوڕی یار عەلی (حوکمڕانی موسڵ)، میرزا عەلی برازای قەرە یوسف (حوکمڕانی هەولێر) و جەنگلو حەسەن لە کەرکوک لەگەڵ ئەو تورکمانانەی لە دەوروبەری دابوون، بەڕێگای موسڵ چووە جەزیرە، لەوێ میر مەجدەدین حوکمڕانی جەزیرە بەسێ هەزار سەربازەوە کۆمەکی کرد، بە ڕێگای نسێبیندا هاتە شێخ کەندی[١٤]، ئەوێ بووە مەیدانی شەڕ، لە ئەنجامدا ئاق قۆینلۆ گەلێک لە سەرکردەکانیان کوژران و قەرە یولوکی سەرداری ئاق قۆینلۆ بریندار بوو، عەلی بەگی کوڕی بەهانایەوە هات، بەڵام سوودی نەبوو، شکستیان خوارد و مەیدانی شەڕیان جێهێشت، ئەسکەندەریش دەستی بەسەر شاری ماردین و قەڵاکەی داگرتەوە[١٥] لەمەوە دەردەکەوێ هەولێر نەک هەر تەنها بێلایەن بووە، بگرە قەرە قۆینلو بۆ دژایەتی ئاق قۆینلۆ بەکاری هێناوە.

لە دەوروبەری ساڵی (٨٥٧ک / ١٤٥٢ز)دا جهانشای کوڕی قەرە یوسف سەرداری قەرەقۆینلو لەشکرکێشییەکی گەورەی بۆ سەر ئوزون حەسەنی ئاق قۆینلۆ دەستپێکرد، لەشکری قەرەقۆینلو پاش ئەوەی لە شالاوی موشەعشەعییەکانی باشووری عێراق گەڕانەوە، لە هەولێر سەربازگەیان دانا، دوایی لە ئاوی خازر تێپەڕین و گەیشتنە کەرمیلیس[١٦] لە موسڵ[١٧] و بۆ سنووری دەسەڵاتی ئوزون حەسەن کشان.

هەرچی نیوەی دووەمی سەدەی نۆیەمی کۆچی / پازدەی زایینییە ئاق قۆینلۆ لە نەیارەوە بوونە حوکمڕانی ئێران و کوردستان و عێراق و چەند ناوچەیەکی دیکەی دەوروبەری ئەو ناوچانە، ئەمەش وای کرد بۆ خۆی تارادەیەکی زۆر وەکو سەردەمی قەرەقۆینلو مامەڵە لەگەڵ شاری هەولێر بکەن، بۆیە بۆ ئەم مەبەستە یا ئەوەتا فەرمانڕەوای پێشوو ملکەچی نیشاندەدا و دەمایەوە یا لە فەرمانڕەوایەکی سەر بە ماوەی فەرمانڕەواییاندا لە شوێنی دادەنرا. کەچی لە تەواوی فەرمانڕەوای ئاق قۆینلۆ نەیانتوانی دەست بەسەر دەوروبەری هەولێر دابگرن، بگرە لە هەڵمەتەکانی بۆ سەر پاشماوەی زرزارییەکان و میرنشینی سۆران شکستی خوارد.

(جهانشا) لە ساڵی (٨٧١ک / ١٤٦٦ز)دا، بڕیاری دا لەشکرکێشییەکی بەرفراوان بۆ سەر ئاق قۆینلۆ بکا، لە شاری خوی رووی لە دیاربەکر کرد، سەرئەنجام ئاق قۆینلۆ جیهانشایان کوشت و دەوڵەتی قەرە قۆینلۆ رووی لە هەڵدێر کرد. بەم جۆرە ئوزون حەسەن دەرگای سەرزەمینی قەرە قۆینلوی بۆ واڵا بوو، سەرەتا رووی لە شاری بەغدا کرد، بەشێک لە سوپاکەی لەژێر سەرکردایەتی خەلیل تواجی کەوتە ڕێ، دوای ئەوەی فەتحنامەی سەرکەوتنی بۆ میر و حوکمڕانەکانی نووسی، سەرەتا هەندێ لە میرە کوردەکان لاگیرییان بۆ نیشاندا، هەروەها شا عەلی حاجیلوی قەرە قۆینلۆ حوکمڕانی هەولێر و شەنگار، ملکەچی بۆ ئوزون حەسەن نواند و هەولێری خستە بەردەستی خەلیل تواجی[١٨].

ساڵی(٨٧٣ک - ١٤٦٨ز) هەندێ لە سەرکردەکانی ئاق قۆینلۆکان درێژەیان بەشالاو و هەڵمەتەکانیاندا، ئوزون حەسەن

پاش سەرکەوتنەکانی لە پاڵ خەلیل تواجی، مەقسودی کوڕی بۆ داگیر کردنی دەوروبەری هەولێر و موسڵ و بەغدا نارد، سەرەتا خەلیل تواجی توانی (موسڵ و هەولێر وشەنگار و قەڵای فولاز) بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی[19]. دوای ئەمە ئاق قۆینلۆکان شا عەلی حاجیلویان لە موسڵ و هەولێر کردەوە حوکمڕان و سوودیان لە سوپاکەی وەرگرت، دواتر قەڵای (فرعون و کرکوش و تون)یان داگیر کرد، پاشان میرەکانی ئاق قۆینلۆ کۆبوونەوە[20]، بڕیاریاندا شازادە محەمەد بەگ و میر سەعادەتیار بە نزیکەی دوو هەزار سەربازەوە بۆ قەڵای (خفتیان - هاودیان) و دەوروبەری هێرش بکەن، میر رۆستەمی ئەورانی[11] توانی بەرگری بکا و سوپای ئاق قۆینلۆکان ناچار بە راکردن بکا، ئاق قۆینلۆکان لە گەڕانەوەیاندا هەرچی لە ناوچەی (خفتیان)دا هەبوو دەستی تاڵانیان بۆ برد و ماڵ و موڵکێکی زۆریان کۆ کردەوە، جێگەی ئاماژە پێکردنە مەقسودی کوڕی ئۆزون حەسەن خۆشی بەشداری کرد، بەڵام دەستکەوتیان تەنها تاڵانکردن بوو[21].

**سەرچاوە و پەراوێز:**

١- ئاق قۆینلۆ ناوێکی لێکدراوە لە سێ بەش پێکهاتووە، واژەی (ئاق) بەواتای سپی، هەروەها واژەی (قۆیون یا قۆین) بەواتای مەڕ، یانی (مەڕی سپی)، هەمووی بەسەریەکەوە واتای (خاوەن مەڕی سپی دەگەیەنێ). مالکولم: م. س، ج١، ل١٦١١. ایوار: مادة اق قویونلی، دائرة المعارف الاسلامية، ج٤، ل١٢٨.

٢- ابن بطوطة: رحلة ابن بطوطة، دار بيروت، (بيروت: ١٩٩٧)، ل٢٩٨.

٣- كردستان في القرن الثامن الهجري، مديسة موكرياني، (اربيل: ٢٠٠١)، ص ٢٥٩. ص ٢٥٩.

٤- تاريخ الغياني، تحقيق: طارق نافع الحمداني، مطبعة اسعد، (بغداد: ١٩٧٥)، ص ٣٧٢-٣٧٣.

٥- مجمل فصيحي، تصحيح: محمود فرخ، كتابفروشي باستان، چاپ گوسي، (مشهد: ١٣٣٩ ه.ش) ج٣، ل ٢٠٧.

٦- العراق في القرن التاسع الهجري، رسالة- دكتورا، كلية الاداب، جامعة الموصل، (الموصل: ١٩٩٣)، ل ١٥٧.

٧- دیاربكرية، تصحيح: نجاتي لوغال وفاروق سومر، كتابخانه گهوری، گهران: ٣٥٦) ه.ش، چ٢، ج١، ل ٧٦،٥٧-٧٩، ٩٥.

٨- احسن التواريخ، بة اهتمام: عبدالحسين نوائي، بنگاه ترجمة ونشري كتاب، (تهران: ١٣٤٩ه.ش)، ج١١، ل ٢٧.

٩- (م. س، ج٣، ل٢٠٧).

١٠- (زبدة، ج١، ل٣٥٧).

١١- ابناء الغمد، ج٢، ص ٤٨٣.

١٢- السخاوي: الضوء، ج٦، ل٢١٧).

١٣- (الغياثي: م. س، ل٢٠٩)

١٤- شێخ کەندی: دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای شنگار. فاروق سومر: قراقويلنوها، ج١، ل١٣٤.

١٥- حافظ ابرو: م. س، ج٢، ل٧٧٧. ابوبكر طهراني: م. س، ج١، ل٧٨. هەرچی حەسەن روملويە میری جەزیرە بە شەمسەدین ناو دەبات: (م. س، ج١١، ل١٢١ - ١٢٣).

١٦- کەرمیلیس: گوندێکی گەورەیە لە رۆژهەڵاتی دیجلە، سەر بە موسڵە، شوێنی بازرگانییە. یاقوت الحموی: معجم البلدان، دار صادر، بيروت ١٩٨٦،، ج٤، ل٤٥٦.

١٧- ابوبكر طهراني: م. س، ج١، ل٢٦٢.

١٨- ابوبكر طهراني: م. ن، ج٢، ل٤٥٧. الغياثي: م. س، ل ٣٣٠.

١٩- اسفزاري: سيد محمد كاظم، انتشارات دانلاه تهران، ١٣٣٨- روضات الجنات في اوصاف مدينة هرات، تصحيح: ، ج٢، ل٢٨٢. علي شاكر: دولة الاق قوينلو في الان ضول والعراق بحث مقبول بانشير في مجلة الموارخ العربي، ل٧.

٢٠- سفرازي م. ن، ج٢، ل٤٥٧.

٢١- ئەبو بەکر تەهرانی باس دەکا کە میرەکان بریتی بوون لە: میر زەنون دوگر، محەمەد سارەلو، مەقسودی کوڕی ئوزون حەسەن، خەلیل ئاغا تواجی و میر سەعادەتیار. م. س، ج٢، ل٤٥٨، ٥٣٧.

٢٢- رابیعە فەتاح شێخ ئەحمەد، کوردستان لە سەدەی ١٥ز/٩ک، وەزارەتی رۆشنبیری (هەولێر- ٢٠٠٥) ل ٣٣٠-٣٣١..

٢٣- ئەبو بەکر تەهرانی باس لەوە دەکا: کە سەربازی تایبەتی مەقسود هێرشیان کردووە، هەروەها هۆی شکستیان بۆ بارودۆخی جوگرافی و سەختی چیاکان دەگەڕێنێتەوە، جگە لەوەی کە لەسەردەای زستاندا هێرشیان بردووە، ئەم هۆکارانەش تەنها شاردنەوەی راستییەکانن، بەهیچ جۆرێ باس لە نەبەردی پیاوانی قەڵاکە ناکات: م. س، ج٢، ل٤٥٧ - ٤٥٨، ٥٣٧.

# هەولێر لە گەشتەكەی میتراقی زادە (٩٤١ك - ١٥٣٤ز)

دكتۆر عیماد عەبدولسەلام رەئوف
كۆلێژی ئاداب - زانكۆی سەلاحەددین

"میتراقی زادە"، ناوی تەواوی نەسوح ئەفەندی سیلاحی كوڕی عەبدوڵڵا قەرەقۆزە و ناوبانگی بە میتراقی زادە دەركردووە، مێژوونووس و گەڕیدە و وەرزشوان بووە، بەڕەگەز خەڵكی قەزای (فیسكۆف) بووە لە ویلایەتی (بۆسنە)، لە كاتێكدا كە ئەم ویلایەتە بەشێک بووە لە دەوڵەتی عوسمانی.

میتراقی زادە لە كاروباری سەربازی پێشكەوتنی بەدەست هێناوە و سوارچاكێكی بلیمەت بووە و هەروەها لە یارییە چەكییەكانیش زیرەكییەكی زۆری نواندووە تا نازناوی (المطراقی) بەدەست هێناوە.

میتراقی ئەو بەربەستە بەپێست رووپۆش كراوە بووە، كە لەلایەن سوارچاكەكان بەكاردەهێنرا لە جەنگەكانیاندا، لەبەر لێزانی لە هونەری نووسین و ژمێریاری و رۆشنبیرێكی مێژوویی و جوگرافی بلیمەت بوو، بۆیە لە دیوانی مەزنی پاشایەتی بە نووسەر دامەزرا و بەشدار بووە لە هەڵمەتەكەی (سوڵتان سەلیمی یەكەم) بۆ سەر (مەمالیكی میسر و شام) لە ساڵی (٩٢٦ - ٩٢٧ك/ ١٥١٦ - ١٥١٧ز)، هەروەها بەشدار بووە لە سەرجەم هەڵمەتە سەربازییەكانی سوڵتان سلێمانی قانوونی، لەوانە هەڵمەتەكەی بۆ سەر دەوڵەتی سەفەوی لە ئێران و هەڵمەتەكەی بۆ سەر (بەغدا - رۆمانیا)، هەروەها چەند هەڵمەتێكی دیكە.

لێهاتوویی ئەم گەڕیدەیە لەو سەردەمەدا لە نووسین و وێنەكێشان ناوبانگی دەركردووە تا راسپێردراوە بە كاری مێژوونووسی، تا ئەو راستییە مێژووییانە بچەسپێنێ كە لە كاتی هێرشە سەربازییەكانی ئەو سەردەمە روویداوە و خۆشی تێدا بەشدار بووە. رازاندنەوەی ئەو رووداوانە بە وێنەی هەمەجۆری ئەو شار و قەزا و ناحیانە كە سوپا پێیدا تێپەڕیوە یان داگیری كردووە.

لە راستیدا بەهرەكانی (نەسوح) جۆراوجۆر و سەرنجراكێش بوون، چونكە مێژوونووسێكی بە توانا و سوارچاكێكی بلیمەت و لە بواری جوگرافیاوە زانیارییەكی تەواوی هەبوو، هەروەها شاعیرێكی زمان پاراو و وەرگێڕێكی زانا و ئەندازیارێكی سەربازی لێوەشاوە و وەرزشوانێكی هەمەلایەن بوو.

مێژووی کۆچی دوایی ئەم کابرایە دیاری نەکراوە، بەڵام راستییە مێژووییەکان ئەمە دەسەلمێنن، کە ئەم پیاوە لە ساڵی ٩٦٨ک لە ژیاندا بووە.

لە گرنگترین و پلە بەرزترین نووسراوەکانیشی لەلایەنی هونەرییەوە کتێبی (منازل العراقیین للسطان سلیمان خان)، کە تۆمارێکی تێروتەسەلە بۆ راستییە مێژووییەکانی هەڵمەتەکەی سوڵتان سلێمان قانوونی بۆ سەر ئێران لە ماوەی ساڵەکانی (٩٤١ و ٩٤٢ک/ ١٥٣٤ و ١٥٣٥ز)، کە تێیدا وەسفێکی ورد و تێروتەسەل دەکات بۆ ئەو خانوانە یان ئەو قوناغەی، کە تیایدا بەو رێگایانەدا رۆیشتوون لە کاتی هەڵمەتەکە، هەر لە سەرەتای جێهێشتنی (ئەسکودار) لەبەری ئاسیای قوستەنتینیە، تا دەگاتە (تەبریز)ی پایتەختی ئێران لەو سەردەمەدا و لەوێشەوە بۆ (بەغدا و حەلەب)، دواییش بۆ دیاربەکر تا گەیشتن بۆ (ئەسکودار) بۆ دواجار، بەمەش بەتێروتەسەل باسی ئەو رێگایانەی کرد، کە شارە سەرەکییەکانیان پێکەوە دەبەستەوە لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی، ناوی دەیان قەزا و گوند و قەڵا و پرد و زێ و چیا و گرد و بیابانیشی تۆمار کردووە، کە دەکەوێتە سەر ئەو رێگایانە، ئەوەی، کە گرنگییەکی زیاتری بەخشی بە گەشتەکە لە ئامێز گرتنی ژمارەیەکی زۆر لە شار و قەزا و پەرژین و شوێنەوارە تێکدراوەکانە، ئەمانەش ئەو بەڵگە بە نرخانە دەنوێنێ، کە ناتوانرێ پشتگوێ بخرێ لە لێکۆڵینەوەکانی بنیاتنانەوەی ئیسلام لەو چاخەدا.

هەروەها گەشتەکە باسی ئەو رێگایانە دەکات، کە لە هەڵمەتەکەی سوڵتان پێیدا تێپەڕیوە هەر لە ئێرانەوە تا دەگاتە عیراق، کە بە کوردستاندا تێپەڕیوە بە چیاکان و شارەکان و قەزاکانەوە، هەڵوێستی میرە کوردەکانیش سەبارەت بەم هەڵمەتە.

هەروەها لەم گەشتەیدا لە هەمەدانەوە بۆ بەغدا تەنها ناوی شار و وێستگەی رێگاکانی هێناوە بەبێ پێشکەشکردنی وردەکاری، بەڵام لەم بەشەیدا لە گەشتەکەی بە ژمارەیەک لە وێنەی جۆراوجۆری ئەو شار و وێستگەی رێگایانە باسەکەی رەنگینتر دەکات، کە بە ریزە و یەک لەدوای یەک ئەمانە دەگرێتەوە: ئارمەند، قەزای (صەداوا)، تەنگەی (صەنقەر)، قەزای (دینور)، قەزای (دلاوەر)، مەزاری (وەیسی قەرەنی)، تا دەپەڕنەوە لە رووباری (رازور)، ماهیدەشت، قارا ملک، دارستانی بەڕوو یان رووباری (رخسان)، تەنگەی (عبر شمس علمدار)، (صوق بولاق)، تەنگەی کەلهوور یان پەلەوەرگەی (ئولوق)، قەڵای (شاهین)، کە دەکەوێتە سەر چیای حەمرین، قەڵای (بنی إمام صولی)، کۆشکی شیرین، قەزای خانکیە (خانەقین)، کە دەکەوێتە سەر سنووری عێراق، دەشتی (بردوت، رووباری (ناریس)، گوندی (شروین)، (ئەلوەندیە)، شێخ مەکارم، تا دەگاتە بەغداد).

لە رێی گەڕانەوەی سوڵتان (سلێمان) بۆ (ئەسکودار) میتراقی باسێکی ورد و بێ وێنەی ئەو کارە سەربازییەمان بۆ دەکات، کە بە سەرۆکایەتی سوڵتان بۆ ناوچەکانی کوردستان دەکات و دەڵێ، کە سوڵتان ناوچەی (کوک تەپە)ی هەڵبژارد، کە ببێتە مەڵبەندێک بۆ سەربازگەکەی، هەر لەو شوێنەدا نامەی بۆ میرەکانی نارد لە (موسل و حەسەن کێف و رەوزە - رەها -) و (بیرەجک و کاختە و کرکر)، کە تیایدا فەرمانیانی پێدا، کە لە (کوک تەپە) بەیەک بگەنەوە خۆیان و تیپە چەکدارییەکانیان، بەم شێوەیە هەمووویانی بەیەک گەیاندەوە و ئاڵاکانیان لەو شوێنە شەکایەوە بە جۆرێ، کە خەڵکەکە سەرسام بوون لە زۆری چەکەکان لە شمشێر و بەربەستی ئاسنی و قەڵغان و تیروکەوان.

لێرەدا میتراقی ئاماژە بە میری (ئەربل) دەکات لەسەردەمی هەڵمەتەکە، کە ناوی (ئەردەشێر بن شێر عەلی) بوو، بەگوێرەی باسکردنەکەشی: «یەکێک بوو لە

ناودارەکانی کورد و میری (ئوربیل)، کە ئەمەش ناوێکی دیکەیە بۆ (ئەربل)، پێ دەچێ کە مەبەستی میر (سوران عزالدین شیر بن سیدی بن شاه علی بک) بێ و (ئەربل)یش سەر بە ئیمارەتەکەی بوو لەو سەردەمەدا، کتێبی (الأسر الحاكمة في العراق في القرون المتأخرة، لا ٢٢٦). ئەو گەڕیدەیە وا نیشاندەدا، کە ئەو میرە ڕێز و سەردانەوانی خۆی پیشاندەدا بۆ وڵاتی عوسمانییەکان، لە کاتێکدا بە نهێنی هاریکاری لەگەڵ دوژمنەکانی عوسمانییەکان دەکرد، تا کاتێک کە سوڵتان (سلێمان) ڕووی کردە ئێران (میرە ناوبراوەکە لە دۆڵێک بۆسەی بۆی دانابۆوە بە نیازی زیان پێگەیاندن سوڵتان و سوارچاکەکانی دەوروبەری و چاوەڕێی هەلێکی دەکرد بۆ جێبەجێ کردنی مەبەستەکەی).

پێ دەچێ بەرەنگاریکردنی ئەو میرە شتێکی ئەستەم بوو، بۆیە سوڵتان (سلێمان) هەموو شالیارەکانی خۆی کۆکردەوە بۆ ئەوەی وتوویژ لەسەر چارەنووسی ئەو میرە بدەن، بەگوێرەی باسەکەی میتراقی (لە دەرەنجامەکانی وتوویژکردنەکە لەسەر ئەو میرە بڕیاریاندابوو، کە ڕووبەڕووی نەبنەوە بە شێوەیەکی چەکداری و وایان بەباش زانیبوو، کە حیلە و حەواڵە بەکاربهێنن بۆ لەناوبردنی، بۆیە بڕیاریاندا کە داوەتی بکەن بۆ مەڵبەندی سوڵتان بۆ پێشکەشکردنی دیاری لەو دیاریانەی، کە بۆی تەرخان کرابوو وەکو تەڵەیەک بۆ بەجێگەیاندنی مەبەستەکەیان، کە لەناوبردنی ئەو میرە بوو)، (بەم شێوەیە میرە کوردەکە کەوتە ناو بۆسەوە بە هاتنی بۆ مەڵبەندی سوڵتان بۆ نیشاندانی نیازپاکی خۆی، لە ئەنجامدا چارەنووسی خۆی و دوو یارمەتیدەرەکەی جیاکردنەوەی سەریان بوو لە لاشەیان).

لەدواییدا میتراقی دەڵێ: «بەم شێوەیە ئەو قەڵایانەی، کە لەژێر دەسەڵاتی ئەو میرە بوون، وەکو (ئالتوون کۆپری و ئەرویل و هەریر و شەقڵاوە) گەیەندران بەو قەڵا و سەربازگەیانەی کە سەر بە (علیە) بوون».

بەم شێوەیە گەشتەکە بە شێوەیەکی نایاب پانتایی ئیمارەتی سۆران و ئەو قەڵا و دۆڵانەی، کە سەر بەو ئیمارەتە بوون لەو سەردەمەدا ڕوون کردەوە.

بەهۆی چەند هۆکارێکی نهێنی سوڵتان (سلێمان) بڕیاردەدا، کە پێشڕەوی سوپاکەی بکات بۆ داگیرکردنی قەڵای (خفیات) و میتراقی مەبەستی (خفتیان)ە، کە یەکێک بوو لە قەڵا پتەو و کۆن و دێرینەکان (لیسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، لا ٢٢٩) ئەویش هەروەکو میتراقی دەڵێ: «کە قەڵایەکی بناغە بەهێز و پتەو بوو و لووتکەکانی گەیشتبوونە ئاسۆی ئاسمان». سەیریش لەوەدایە کە دەڵێ: «ئەم قەڵایەماڵی پاشا کۆنەکان بوو و داگیرکردنیشی زۆر ئەستەم بوو، هەرچەندە زۆر هەوڵی داگیرکردنیشی دراوە» بە جۆرێ کە «داگیرکردنی ئەم قەڵایە دەشوبهێنێ بە بەراوردکردنی تەیری (عەنقار)، کە زۆر ئەستەم بوو، هەروەها شوبهاندبووی بە قەڵای (ئەفلاک)، کە ئەمیش داگیرکردنی زۆر ئەستەم بوو».

لە باسەکەی میتراقی دەرکەوتووە ئەو هەوڵانەی، کە سوڵتانی عوسمانی دابووی بۆ داگیرکردنی ئەم قەڵایە بەڵگەیە لەسەر سەختی قەڵاکە و ئەستەم داگیرکردنی، بەجۆرێ سوڵتان سەربازگەکەی خۆی لەبەرامبەر ئەو قەڵایەدا دامەزراندبوو، لەتەک سەرچاوەی ئاوی (عین شمشاد)، و پاش حەسانەوەیان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ سوڵتان ئامادەباشی تەواوی دەربڕی بۆ هێرشکردنی بۆ سەر ئەو قەڵایە، تا هەواڵەکە بڵاوبۆوە لە ناوچەکە و پارێزگاری قەڵای ناوبراو خێرا هات (بە هاوەڵی کۆمەڵێک لە یارمەتیدەرانی و گەورە بەرپرسانی)، هەروەکو باسەکەی میتراقی نیشانی دەدا، کە ناوبراو بۆ پاراستنی خۆی و ئاسایشی بۆ خەڵکەکە سەردانەوایی خۆی بۆ سوڵتان پیشاندا و سوڵتان (سلێمان)یش ڕازی بوو لەسەر پێشنیازەکە و کلیلی قەڵاکەی پێشکەش کرا و

بەمەش کەوتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی.

پاش ئەوەی سوڵتان (سلێمان) شوێنەکەی بەجێهێشت بە سوپاکەیەوە بەرەو سەرچاوە ناسراوەکە چوو، کە ناسرابوو بە (ئەسکەندەر)، میتراقی دەڵێ: (دەکەوێتە پاشکۆی چیای "عمرو قدرین" و لەوێدا یەکێک لە میرە کوردەکان پێشوازی لێ کرد و ڕێزی خۆی و گەلەکەی بۆی دەرخست، ئەو میرەش ناوی "سهراب" بوو، بەڵام میتراقی پێناسەی سیهرابی بە وردی نەکردووە، بەڵام پێدەچێ مەبەستی میر (سرخاب کوڕی مەئمون بێک کوڕی مونزر کوڕی بابلو)ی میری ئەردەڵان بووبێ) (البدليسي: شرفنامه، ١٠٦ - ١١٥، و مذكرات مأمون بيك)، کە بۆ زمانی عەرەبی لەلایەن محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی و شوکور مستەفا، بەغداد، ١٩٨٠ وەرگێردراوە.

گەریدەکەمان ناوی ئەو قەڵایانە دەهێنێ، کە بەشێک بوو لە ئیمارەتی ئەردەڵان، کە ئەمڕۆ (هەولێر و سلێمانی) دەگرێتە خۆ، وەک (دەوران) کە پێ دەچێ (دودان) بێ (داوودە) کە دەکەوێتە نزیک (بەیات)، کە سەر بە (توزخورماتوو)ە، (حران)، (سەرجە) ئەمەش پێدەچێ (سەرچنار)بێ، (حەریر)، (شەمران)، (سروجک)، (نوی)، و (مەیسلە) پێدەچێ (مشیلمە)بێ، کە لەو قەڵا کۆنانە بێ، کە لە ناوچەکانی (جوانرۆ و ئورمان)ە، (ظالم - زلم)، (ولکی)، بەم شێوەیە دیاری خست، کە ئەم شوێنە جوگرافی و مێژووییانەی، کە سەر بەو ئیمارەتە بوون پێش ئەوەی سنووری عوسمانی و ئێران پارچەیان بکات لە سەدەی دوای ئەو.

لەدوای ئەوە میتراقی باسی ناوی ئەو شار و گوند و وێستگانەی ڕێگا دەکات کە دەکەونە نێوان (کوک تەپە) و (قەڵای کلکوم)، کە ئەویش هەر شارۆچکەی (قزلجە)یە، لە شوێنی دواییدا سوڵتان سلێمان پێشڕەوی سوپاکەی کرد بۆ قەڵای (صارم)، کە پێدەچێ (گارم)بێ بۆ لێدانی سوپای ئەو پاشایەی، کە قەڵا و دەوروبەرەکەی کردبووە شوێنی کۆبوونەوە و بەرەنگاربوونەوەی خۆی، لێرەدا سوڵتان سلێمان چوو بۆ هەمەدان و دوایی بۆ تەبریز و لەوێوە بۆ (أخلاط)، کە دەکەوێتە سەر دەریاچەی وان.

لەدوای ئەمەشدا سوڵتان پێشڕەوی سوپاکەی کرد بۆ (وان) و بەهۆی هاتنی وەرزی زستان و سەختی ڕێگا شاخاوییەکە گەیشتن بۆ ئەم ناوچەیە گەلێ ئەستەم بوو، بۆیە سوڵتان سلێمان وای پێ باشتر بوو، کە بگەڕێتەوە بۆ پایتەختی وڵاتەکەی لە ڕێگای دیاربەکر ئینجا حەلەب و لەوێوە بە خێرایی گەیشتنەوە ئەسکودار شوێنی یەکەم دەستپێکی هەڵمەتەکەی.

هەر بەم شێوەیەش گەشتەکەی میتراقی - کە خۆشی شایەتی ئەم ڕووداوانە بوو - لایەنێکی گرنگی مێژووی کوردستانمان بۆ دەردەخات بەو هەموو بارودۆخە نالەبارانەی، کە بەرەنگاربوونەوەی نێوان سوپای عوسمانی و ئێرانی لە ناوەندەکانی سەدەی دەیەمی کۆچی، کە دەکاتە سەدەی شانزەهەمی زایینی، هەروەها هێز و توانای سەربازی ئیمارەتە کوردییەکانی دەرخستووە، لەگەڵ سەختی کەش و هەوای سروشتی، کە وای لە سوڵتانی عوسمانی کردووە ناچاربێ، کە هەندێ جار پەنا بباتە بەر فێڵ و ترساندن بۆ سەردانەوانەوەی میرەکان بۆ دەسەڵاتی خۆی و پشت بەستن بە هەندێ لە میرەکان بۆ جەنگەکانی لە دژی دوژمنەکانی.

وێنەیەک لە گەشتەکەی میتراقی زادە لە کتێبخانەی کۆشکی (یەلدز)دا لە ئەستەنبوڵ هەیە، بڵاو کراوەتەوە بە وێنەوە لەلایەن دکتۆر حوسێن بوردایدن (ئەنقەرە، ١٩٧٦)، هەروەها دووبارە گەشتەکە نووسراوەتەوە بە پیتی لاتینی نوێ و وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی لەلایەن دکتۆر (صبحی ناظم)، و نووسەری ئەو دێرانە پێیدا چۆتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە، کۆمەڵەی ڕۆشنبیری لە (أبو ظبی) لە ساڵی ٢٠٠٣ چاپی کردووە.

# هەولێر لە کتێبی مەعجەمی بولدانی یاقوتی حەمەویدا

دکتۆر دلێر فەرحان ئیسماعیل
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

**یاقوتی حەمەوی:**
ئیمام شەهابەدین ئەبی عەبدوڵلا یاقوت بن عەبدوڵلای حەمەویی بەغدایی، یەکێکە لەدیارترین مێژوونووس و شارناسە موسڵمانەکان کە ساڵی (٥٧٥) کۆچی لەوڵاتی رۆم لەدایک بووە و لەبەغدا گەورە بووە. یاقوتی حەمەوی نووسەر و مێژوونووس و خەبەر نووس و شاعیر بووە[1]. لە ساڵی ٦٢٦ کۆچی[2] لەحەلەب کۆچی دوایی کردووە. دووجار سەردانی هەولێری کردووە، جاری یەکەم لەساڵی (٦١٣) کۆچی و جاری دووەمیش لەساڵی (٦١٧) کۆچی[3]. لەکتێبەکەیدا باسی هەولێر دەکات و ئاوڕ لەهەندێ لایەنی پەیوەندار بەشارەکە دەداتەوە، لەوانە:

## ١- وەسفکردنی شاری هەولێر

### أ- هەولێرو قەڵاکەی

دیارترین شوێنەواری مێژوویی لەهەولێردا قەڵایە، کە شێوەی خۆی پاراستووەو تا ئەمرۆش خەڵکی تێدا دەژی. رووبەری قەڵا (٦٠٠٠٠)م٢ و بەرزییەکەی دەگاتە (١٥٠) پێ و تیرەی (٤٠٠) یاردە[4]. یاقوتی حەمەوی بەم شێوەیە وەسفی شاری هەولێرو قەڵاکەی دەکات: "ئەربل قەڵایەکی قایمەو شارێکی گەورەیە لەناو فەزای زەویوزارێکی فراوانی تەختان، قەڵاکەی خەندەکێکی قووڵی هەیە، دەکەوێتە لایەکی شارەکە: لەم قەڵایەشدا بازاڕو خانووی نیشتەجێبوون بۆ هاووڵاتیان هەیە. لەگەڵ مزگەوت بۆ نوێژکردن"[5].

یاقوتی حەمەویٔ قەڵای هەولێر، بە قەڵایەکی قایم وەسف دەکات، هەروەها باس لەپشتێن و خەندەکەکەی دەکات، شوێنەواری ئەم خەندەکەو پشتێنەکانی شار تا سەردانی (ریچ) بۆ هەولێر لەساڵی ١٨٢٠ز هەر مابوون. ئەم گەشتناسەش رەشماڵی لەنزیک ئەمانە دامەزراند[6]. ئەمەش قایمی قەڵا دەردەخات، کە زۆر بەزەحمەت دەرگای بۆ پەلامارەدرانی کردۆتەوە.

رەنگە کۆنترین نیشانەش بۆ ئەم لەروو وەستانەی شاری هەولێریش، لەروو وەستان و خۆڕاگرتنی بەرانبەر ئەتابەک عیمادەدین زەنگی دامەزرێنەری ئەتابەکییەی موسڵ بێ، کە لەساڵی ٥٢٦ کۆچی گەمارۆی ئەم شارەی داوەو هەوڵی داگیرکردنی داوە، بۆ ئەوەی بیخاتە سەر ئیمارەتەکەی خۆی. هەروەها قایمی ئەم شارە وای لێ کردووە ببێت بەیەکێ لەو شارانەی بەرهەڵستی مەغۆلەکانی کردۆتەوە. هەمدیسان پتەوی قەڵای هەولێر وای کردووە نەهێڵێ سەربازەکانی بەغدا پێ بخەنە ناوی، کاتێ خەلیفە موستەنسیر ویستی ئەم ئیمارەتە بخاتە سەر مەملەکەتەکەی. لەپاش مردنی موزەفەرەدین گۆکبری ساڵی ٦٣٠ کۆچی، ئەم هێزە هەمدیسان تووشی بەرەنگاربوونەوەیەکی توند لەلایەن سەربازەکانی ئیمارەتەکە هاتن. بارودۆخەکە بەم جۆرە مایەوەو شاری هەولێر بەرانبەر مەغۆلەکان لەساڵی ٦٣٤ کۆچی وەستا[7]،

قەلاش بوو بەمەلبەندی پارێزگاری کردن کاتێ لەساڵی ١٧٣٢ز هەولێری پاش بەرگریکردنێکی ئازایانە داگیرکرد. هەروەها لەکاتی شالاوی نادر شا لەساڵی ١٧٣٤ز بۆ سەر هەولێر، کە ماوەی دوو ساڵ گەمارۆی دا ئینجا داگیری کرد[٨].

**ب- شوێنی جوگرافی شاری هەولێر:**

یاقوتی حەمەوی شوێنی جوگرافی شاری هەولێر لەنێوان هێڵی پانی و هێڵی درێژی و شوێنەکەی لەشاری موسڵ و بەغدا دیاری دەکات و دەڵێ:

"درێژایی ئەربل شەست و نۆ پلەو نیودو پانییەکەی سی و پێنج و نیو و ١/٣یەو، دەکەوێتە نێوان هەردوو زاب و سنووری پارێزگای موسڵ لەوێ کۆتایی دێت و دووری نێوانیشیان بەپێ دوو رۆژە" دووری لەبەغداش بەکاروان حەوت رۆژی پێ دەچێ" [٩] شایانی باسیشە هەولێر دەکەوێتە سەر هێڵی پانی ٣٦/١١ی باکوورو هێڵی درێژی ٢/٢ لەرۆژهەلات[١٠]. (٨٥)کم لەشاری موسڵ دوورە، لەبەغداش نزیکەی (٣٦٠) کم[١١]. لەهەردوو ئەو رووبارەیش کە ناویان زابە بەیەکسانی دوورە[١٢].

**پ- لایەنی ئابووری و کۆمەلایەتی:**

یاقوتی حەمەوی لەبارەی دانیشتوانی شاری هەولێر دەڵێ: "زۆربەی خەلکەکەی کوردن[١٣]. و بەکشتوکاڵ خەریکن. هەر لەکۆنیشەوە ئەم ناوچەیە بەبەرهەمی کشتوکالی ناسراوە، بەتایبەتی بەرهەمهێنانی دانەوێلەو پەمۆ، لەبنەڕەتیشدا بۆ ئاودانیان پشت بەئاوی باران دەبەسترێ. ئەمەش بۆ هۆی نەبوونی رووبار لەم ناوچەیە دەگەڕێتەوە، کە بۆتە هۆی ئەوەی بێستانی[١٤] تێدا نەبینرێ. لەم بارەیەوە یاقوتی حەمەوی دەڵێ: "لە دەوروبەریدا هیچ بێستانێک و هیچ رووبارێکی نزیک لە سەرووی زەوییەکەی نابینرێ[١٥]. بەلام دانیشتوانەکەی دەستیان بەهەلکەندنی جۆگەی ئاو- کە ناوی کارێزە کردووە، بۆ ئەوەی سوود لەئاوەکەی وەربگرن"[١٦]. یاقوت ستایشی ئاوی هەولێر بەم جۆرە دەکات، ئاوی خواردنەوەی لەبیرە ئاوە سازگارە بەتامەکانە، کە هیچ جیاوازی لەگەڵ ئاوی رووباری دیجلە لەرووی سازگاری و پاکییەوە نییە[١٧].

**ت- وەسفکردنی میر موزەفەرەدین گۆکبری:**

**١- رۆڵی لە بیناکردن و ئاوەدانکردنەوە:**

یاقوتی حەمەوی ئاوەدانی و پێشکەوتنی شاری هەولێر بۆ موزەفەرەدین گۆگبری دەگێڕێتەوە و دەڵێ: "شارێکی گەورە و پان و بەرینە و کە دروستکردنی بالەخانەو بیناکردنی شوورەکەی و دامەزراندنی بازاڕەکانی لەسەر دەستی میر موزەفەرەدین گۆگبری کوری زەینەدین کوچکعەلی[١٨] بەئەنجام گەیشتوون. میر موزەفەرەدین لەساڵی ٥٨٦ک- تا ٦٣٠ کۆچی حوکمی شاری هەولێری کردووەو لەسەر دەستی ئەو هەولێر لەهەموو بوارەکانی ئاوەدانکردنەوەو ئیداری گەشەی کردووەو بووە بەمەلبەندێ بۆ ئەوانەی لەهەموو ناوچەکان، وەک بەغداو جەزیرەو موسڵ روویان تێ کردووە[١٩]. هەروەها یاقوتی حەمەوی ئاماژە بەهێزو ئازایەتی میر موزەفەرەدین دەکات و دەڵێ: "بەرهەڵستی مەلیکەکانی کردووەو رووبەڕوویان بۆتەوە، بەو ئازایەتی و شارەزاییەی کە هەیبووە. تا ئەو کاتەی لێی ترساون، بەمەش چواردەوری خۆی پاراستووە"[٢٠].

**٢- وەسفکردنی سیاسەتەکەی:**

یاقوتی حەمەوی باس لە کارە خێرخوازییەکانی میر موزەفەرەدین دەکات و دەڵێ: "هەژاران لای لەپێشتر بوون و زۆری بەبیانییەکان دەبەخشی لەو پارە زۆرەی کە هەیبوو، بۆ ئەوەی دیلەکان لە دەستی کافرەکان رزگار بکات"[٢١]. زۆر لە لە مێژوونووسانیش راستی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنن، چونکە میر بەسیفاتی چاکەخوازی و کاری خێرخوازی و سەدەقەکردن دەناسرا. لەم بارەیەشەوە ئیبن خەلەکان دەڵێ: "لەدنیادا جگە لە سەدەقە کردن[٢٢] هیچ شتێکی تری هێندە خۆش نەدەویست" هەروەها "ئیبن کەثیر" لەبارەی میر موزەفەرەدین دەڵێ: "خاوەن شەهامەت و چاونەترس و بەزەبرو پالەوانێکی هۆشمەندو زانایەکی دادپەروەر بووە"[٢٣]. کەچی "یاقوت"

وا وەسفی میر موزەفەرەدین دەکات: "زۆر زاڵمــــەو بەناحــــەق پارە لەهاووڵاتیان وەردەگرێ".

یاقوتی حەمەوی، رەخنە لە میر موزەفــەرەدین دەگــرێت بەهۆی ئەو سیاسەتە زوڵم ئامێزەی لەخەڵکی دەکرد لەگەڵ کۆکردنەوەی پارەو پوول بەرێگای ناشــەرعی. لەم بارەیەوە کــۆمــەڵێ مــێــژوونووس ئەم رایە دەســـەلمێنن، بۆ نموونە ئیبن واسڵ بۆچوونی لەگەڵ یاقوتی حەمەوی یەک دەگــرێتــەوەو دەڵێ: "زۆر زاڵم بووە لەوەرگــرتنی پارە لە هاووڵاتیـــان". "ئەبی فــیــدار"، بوونێکی لەم جــۆرە دەردەبڕێ و دەڵێ: "میر موزەفەرەدین لەوەرگرتنی پارەو پوول زۆر توندو تیژ بووە"[25]. ئەوەی لەمیر موزەفەرەدین گۆگبری زانراوە ئەوەیە کە موسادەرەی سەروەت و سامانی خەڵکی کردووەو خاوەنەکانی بەند کردووە. هەروەها هەندێ لەو کەسانەی پایەی بەرزیان لەئیمارەتەکەی هەبوو تووشی گرتن هاتوون، بۆ نموونە وەلیــــەدین ئەبا ئەسەنای وەزیرو عەلی بن شەماسی بەندکــردووە، هەروەها ئەحـمــەد بن عــەبد سەید ئەربیلی و حــەمــەد بن ئەلوەزیری بەرپرسی دیوانی مەزاڵمی لەبەندیخانە پەستاوە. ئەمەو گەلێک لەوانە وەک بۆچوونی ئیبن جــۆزی پێیان وانییە، کە ئەم کەسانە پارەو پوولیان بەرێگای ناشەرعی لەخەڵک سەندووە.

بەڵام، کە ئەمیـــر ئەم پارانەی لەوانە مــوسادەرە کــردووە لەکــاری خــێــرخــوازی و ئاییــنی ســەرفی کــردۆتەوە. ئەگــەرچی ئەم هۆیە بۆ هەموو ئەو کەسانە وەک یەک نییە، کە لەلایەن مــیــرەوە ســامــانیــان موسادەرە کراوەو خۆشیان خراونەتە بەندیخانە[26].

## ج – کەسایەتییە زانستییەکان:

یاقــوتی حــەمــەوی کــەســایــەتیــیــە زانســتــیــیــەکــانیش لەشاری هەولێــر بەســەردەکــاتەوە. لەوانە باسی "ئیبن مستەوفیی ئەربیلی" خاوەنی کتێبی "مێژووی ئەربل" دەکات، کە لەساڵی ٥٦٤ کــۆچی[27] لەقــەڵای هەولێــر لەدایک بووەو لە مــوسڵ ساڵی ٦٣٧ کــۆچی دوایی کــردووە. یاقــوتی حەمەوی بۆبە ئاماژە بەئیبن مستەوفی دەکــات، چونکە ئەدەب و زانســتی خۆشــویســتــووە و رێزی لەوانە ناوە، کــەهاتوونەتە هەولێــر، کــاتێ دەڵێ: "چوومە ئەوێ، بەڵام تێیدا نەمبینی کەسێ چاکتر بێ لە ئەبی بەرەکاتی مــوبارەک بن ئەحــمــەد مــوبارەک بن موهوب ئیبن غەنیمە بن غالب کە بە مــســتــەوفی ناســراوە و لە ئەدەب دەکۆڵێتەوە و خزمەکانی خۆی خۆش دەوێ و ئەوانی لەخــەڵکی تر پێ باشــترە و خــاوەن ئایینە و پەیوەندی بەســوڵتــان هەیە، جــێگاکــەی لەوەزارەتێ دەچێ و زۆر شــتــی لەوانەی سەردانی ئەربیلیان کردووە، گوێ لێ بووە و کتێبێکی لەم بارەیەوە نووسیوە"[28].

هەروەها ناوی ئەبو ئەحــمــەد ئەلقــاسم بن مــوزەفــەرەدین عــەلی شــارەزووری دێنێ و دەڵێ: "زانست پەروەرو خــانەوادەیەکــە لە بنەمــاڵەی شارەزووری و ساڵی ٤٨٩ی کۆچی لە موسڵ کۆچی دوایی کردووە"[29].

### ســەرچاوەکان:

١- الذهبي- تاريخ الاسلام، طبعة ٦٣، ل٢٤٤-٢٤٥.
٢- ابن خلكان- وفيات الاعيان: ج٦، ل١٣٩.
٣- د.محسن محمد حسين، اربيل في العهد الاتابكي.
٤- زبير بلال اسماعيل- اربيل في ادوارها التاريخية، ل٤٥.
٥- ياقوت الحموي- معجم البلدان- ج١، ل١٣٨.
٦- اربيل في العهد الاتابكي، ل٢٢٩.
٧- هەمان سەرچاوە، ل١٣٠.
٨- زبير بلال اسماعيل، هەمان سەرچاوە، ل٤٢.
٩- معجم البلدان، ل١٣٨.
١٠- دائرة المعارف الاسلامية، مجلد٢، ل٥١٦.
١١- جمال بابان- اسماء المدن والمواقع العراقية. ج١. ل١٢.
١٢- دائرة المعارف، ل٥١٦.
١٣- معجم البلدان- ل١٣٨.
١٤- د.محسن محمد حسين، هەمان سەرچاوە ل٢٣٨.
١٥- معجم البلدان ل١٣٨.
١٦- د.محسن محمد حسين، هەمان سەرچاوە ل٢٣٩.
١٧- معجم البلدان ل١٣٨.
١٨- هەمان سەرچاوە ل١٣٨.
١٩- د.محسن محمد حسين، هەمان سەرچاوە ل٩٣.
٢٠- معجم البلدان، ل١٣٨.
٢١- هەمان سەرچاوە، ل١٣٨.
٢٢- وفيات الاعيان، ل١١٦.
٢٣- ابن كثير -البداية والنهاية- ج١٣- ص١٣٧.
٢٤- معجم البلدان، ل١٣٨.
٢٥- د.محسن محمد حسين، هەمان سەرچاوە ل١٩٨.
٢٦- هەمان سەرچاوە ل٢٠١.
٢٧- وفيات الاعيان -ج٤- ل١٥١.
٢٨- معجم البلدان- ل١٣٨.
٢٩- السمعاني الانسان، ج٧، ل٤١٩.

# کتێبی (مێژووی ئەربل)ی ئیبنولمستەوفی

کتێبی (مێژووی ئەربل)، کە لە نووسینی (ئیبن مستەوفی)یە، ئەو کتێبە بۆ ماوەیەکی زۆر بزر بوو و دیار نەما، هەتا ئەو رۆژەی کە رۆژهەلاتناسی ئینگلیزی (ئەربوی) بەشی دووەم لە دەستنووسی ئەو کتێبەی دۆزییەوە لە کتێبخانەی (جیستر بیتی) لە دوبلین، ئەو کتێبە لە ئەسلدا لە چوار بەرگ پێکدێت، دەستنووسەکە (۲۳۱) لاپەڕەیە و بە خەتی (نەسخی) نووسراوە، مێژووەکەشی: (مانگی شەوالی سالی ٦٤١ کۆچییە) بەرامبەر بە: (ئازاری سالی ١٢٤٤ ز) واتە: دوای چوار سال لە کۆچی دوایی نووسەرەکە، کە لە سالی (٦٣٧ ک) لە موسل کۆچی دوایی کردووە.

بەڕێز (سامی الصفار) کە یەکێکە لە دبلۆماتکارانی پێشووی عێراق، توانی ئەو دەستنووسە بکاتە کتێبێکی رێک و شتێکی لە سەر بنووسێ و، لە دواییشدا نامەیەکی ئەکادیمی لە سەر ئەو کتێبە لە زانکۆی (کمبریج) لە ئینگلتەرا نووسیوە. ئەو مامۆستایە لە پێناو ئەو کتێبە زۆر ماندوو بوو. کە لە دوو بەشدا چاپ کراوە، یەکەمیان: ئەویش (مێژووی ئەربل) بە ناوی (نباهة البلد الخامل بمن وردة من الاماثل)، کە لە دەقە چاپکراوەکە، یان ئەوەی تەواو کراوە لە لاپەڕەکانی: (۳۳-٤٦١)، هەروەها (پەراوێزەکان) و (تێبینییەکان) و پێداچوونەوە بۆ دەقەکان بە شێوەیەکی رێکوپێک، لەبەرئەوەی کتێبەکە و ناوەڕۆکەکەی تەئکید لە سەر ئەو ناونیشانە دەکات (سیرة و التراجم)، ئەو بەشە گرنگەش لە (۷۵۷) لاپەڕە پێکدێت. بەشی دووەمیش لە پەراوێزەکان و روون کردنەوە و پێداچوونەوە پێکدێت، بە شێوەیەکی رێکوپێک، بەپێریزی لاپەڕەکانی دەستنووسەکەی، هەروەها پێرستێکی رێک، کە ئەو تەوەرە گرنگانەی تێدایە: (ئایاتی قورئانی و حەدیسەکانی پێغەمبەر و بابەتەکانی جوگرافیا و خاوەن ئەعلام و قافییەکان و تەرجەمەکان، بەشەکەی دیکەش لە (۹۸۸) لاپەڕە پێکدێت، ئەو کتێبە بە هەردوو بەشییەوە لە لایەن وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندنەوە چاپ کراوە، ئەویش لە سالی ۱۹۸۰ز، ئەوەی شیاوی باسە لێرە، ئەو بەڕێزەی ئەو کتێبەی رێکخست و ئامادە کرد، نامەیەکی ئەکادیمی لەبارەی مێژووی (ئەربل) نووسی، بەلام هەتا ئێستاش چاپ نەکراوە.

نووسەری کتێبی: (مێژووی ئەربل) بە (ئیبنو لمستەوفی) ناسراوە، ناوی تەواوی: (شەرەفەدین ئەبی بەرەکات ئەلموبارەک ئیبن ئەحمەد ئەربلی)یە، کە لە سالی (٦٣٧ ک / ١٢٣٩ ز) کۆچی دوایی کردووە، کەسایەتییەکی ناسراو: (ئەدیبە و زمانەوانە و فەقیهە و مێژووناسێکی گەورە بووە، لە خێزانێکی گەورە و ناسراوە، ئەرکی (الاستیفاء) و بەرپرسی دارایی بووە لە ئەربل، مامی(مستوفي)، ناوي: (صفي الدين ابوالحسن علي بن مبارك) بووە، لە (ئەربل) لە دایک بووە، لەو شارەش گەورە بووە و فەرمووده و زانستەکانی و ئەنساب و ئەدەب و لقەکانی و شیعرەکانی عەرەبی و پەندەکانی خوێندووە، زۆر زیرەک بووە لە (علم الديوان) و حیسابەکانی و رێکخستنی

یاسایەکانی، ئەرکی (الاستیفار الوزارە)ی لە سەردەمی سولتان (موزەفەرەدین ئەبوو سەعید گۆگبری)، کە حاکمی ئەربل بووە لە نێوان (٥٦٨ - ٦٣٠ کۆچی) وەرگرتووە، کە دوایین میرەکانی (آل بکتکین) بووە، دوای مردنی (موزەفەرەدین)، کە لە ساڵی (٦٣٠ ک / ١٢٣٣ ز) کۆچی دوایی کرد، ئیبن مستەوفی لە وەزیفە و پایەکانی خۆی دوور خستەوە، لە ماڵی خۆی دانیشت، ئەو ماڵەی (مستەوفی) یانەیەکی رۆشنبیری گەورە بووە لە ئەربل، ئەویش دوای قوتابخانەی (المظفریة)، هەر دوای ئەو رووداوانە، (مەگۆلەکان) هێرشیان کردە سەر ئەربل. (ئیبن مستەوفی) (ئەربل)ی بەجێهێشت و لە ساڵی (٦٣٤ ک) بەرەو شاری موسل رۆیشت، (خەزانەکەی) و (کتێبەکانی) بۆ ئەو شارە گواستەوە و لە ساڵی (٦٣٧ ک) کۆچی دوایی کرد. ماڵی ئەو زانایە بۆ ئەو کەسانەی دەهاتن بۆ ئەو شارە کراوە بوو، (یاقوت الحموی) شاهید عەیانی ئەو رووداوانە بووە، لەبەرئەوەی یەکێک بووە لەوانەی، کە لە ساڵی (٦١٧ ک) بۆ ئەو شارە هاتوون، جێگا و پایەی ئەو زانایەی بۆ مێژوو بە دیار خست، هەروەها ئەو کەسایەتییانە: (ابن الشعار الموصلی - ٦٥٤ ک) لە کتێبەکەی (عقود الجمان) و ئیبن خەلەکان لە (وفیات الاعیان)لەو لایانە رۆڵێکی باشیان هەبووە.

ئەو هەواڵانەی کە لە (تاریخ اربل)دا هاتووە، ناوی کەسانی (ارابلە - اربلیین) دێنێ، کە ناسراو بوون لە: (زانست و تەقوا و ئایین و خواناسی، یان پایە و وەزیفەی گرنگیان هەبووە و موستەحەقی ئەو ئاماژە پێکردنە بوون، یەکێک لەوانەی زۆر گرنگییان پێدراوە لەو کتێبەدا و هەواڵیان نووسراوە (سولتان موزەفەرەدین) بووە، هەروەها ئەو کتێبە هەواڵی نووسینەکانی زانایەکان و فەقیهەکان و سۆفیگەران و شاعیران و ئەو کەسایەتییانەی هاتوون بۆ ئەربل و خزمەتی ئەو شارەیان کردووە) تێدا بووە و نووسراون، مێژووی ئەربل، سەرچاوەیەکی مێژوویی گرنگ بووە، بەتایبەتی مێژووناسە ناسراوەکانی، لەوانەش: (ئیبنی خەلەکان، دوایین ئیشارەت و نووسین لەو کتێبەدا، لە ساڵی (٦٣١ ک) بووە، ئەوەش دەبێتە بەڵگەیەک، کە ئەو کتێبە لەو ساڵەدا بە شێوەی کتێب ئامادە کراوە، لەگەڵ ئەوەی هەندێک دەڵێن دوای ئەو ساڵە بە چەند ساڵێک ئامادە کراوە، بەڵام ئەوەی گرنگە لێرە، ئەو کتێبە زانیارییەکی زۆری تێدایە لەبارەی دەزگا ئایینییەکان و رۆشنبیرییەکان و کۆمەڵایەتییەکان و تەلارسازی لە ئەربلدا، رۆشناتیی دەخاتە سەر ژیانی رۆشنبیری بە شێوەیەکی گشتی، ئەوەی زۆر گرنگ بێت و لەو کتێبە هاتبێت و نووسراو بێ، لەبارەی سەردەمی (ئەتابەکییەکانە) لە ئەربل، لە نێوان سالانی: (٥٢٢ - ٦٣٠) یان سەردەمی میرنشینی (آل بکتکین)، کە: (زەینەدین عەلی کوچک کوڕی بکتکین) ئەو میرنشینەی دامەزراندووە. بەڵام ئەو میرنشینە لە سەردەمی کوڕەکەی: (موزەفەرەدین) گەیشتە لووتکەی پێشکەوتنی بنیادنان و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی، هەر لەو سەردەمەی مێژووی ئەربل، زانیارییەکی زۆر و گرنگ هاتووە و نووسراوە، گرنگترینیان:

**یەکەم: قەڵای ئەربیل**، کە شوورەیەکی دیواربەندی بۆ کرابوو و کەندێک دەوری قەڵایەکەی گرتبوو، شارێکی تەواو بووە و دوو دەرگای هەبووە: یەکێکیان لە رۆژهەڵات و ئەوەی دیکە لە رۆژئاوا، جگە لە دەرگای سەرەکی و دەرگای (عەمکا)، کە لە بەرامبەری گوندی (عەنکاوە)ی ئێستا بووە.

**دووەم: شووورەی ئەربیل**، کە دەورووپشتی قەڵای گرتبوو و دەرگاکانی: دەرگای (چحامیە) و دەرگای (فرح) و (دەرگای موسل).

**سێیەم: (مزگەوتەکان)**

١- مزگەوتی (قەڵا) کە دەکەوێتە ناو قەڵای هەولێر
٢- مزگەوتی (الزینی) کە بۆ ناوی: (زەینەلعابدین عەلی کوچک) دەگەڕێتەوە، دەکەوتە خوارەوەی قەڵاکە.
٣- مزگەوتی (العتیق): لەوانەیە مەبەستیان: مزگەوتی (منارەی موزەفەریە) بێت، کە بۆ کۆتاییەکانی سەردەمی (ئەمەوی) یان سەرەتای (سەردەمی عەباسییەکان)

بگەڕێتەوە.
٤- مزگەوتی (الجامع)
٥- مزگەوتی (الخراطین)
٦- مزگەوتی (عمر الدوزیجانی)

**چوارەم: (مزگەوتەکانی پاشکۆی ئەربیل)**
١- مزگەوتی (کفر عزە) هەتا ئێستاش گوندی (عەزە) هەرماوە.
٢- مزگەوتی (منارە) لە (حبتون) چیایەکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئەربیل.
٣- مزگەوتی (قریة الصوامع)
٤- مزگەوتی (قریة المیراث)
٥- مزگەوتی (الجامع) لە باصیدا، ماڵی (ڕاوچی)، مەسیحییەکان تیایدا دەژیان، کە ئەمڕۆ گوندی (بنەسلاوە)ی ئێستایە.

**پێنجەم: (خانەقایەکان و ڕەباتەکان و تەکیەکان)**
١- خانەقای یان ڕەباتی (الجنینة)
٢- خانەقای (سۆفییەکان)
٣- خانەقای (قایماز) یان ڕەباتی (المجاهدین)، کە بۆ (موجاهیدەدین قایماز» جێگری (زەینەدین) دەگەڕێتەوە.
٤- خانەقای (بن عیسی لل) لە (حبتون)
٥- ڕەباتی (المنظرە)
٦- ڕەباتی (ئەحمەد الخراط)
٧- زاویە (اسحاق بن ابراهیم) لە نزیک ئەربیل
٨- زاویە (البستی)
٩- زاویە (الغرباء)
١٠- زاویە الشیخ محمد الکریدی (لەڕێگای منارە) وا پێدەچێ مەرقەدی (ئیمام محەمەد)ی ئێستا بێت.
١١- بە زاویەی (ابي بکر الاواني) ناسراوە.

**شەشەم: (قوتابخانەکان):**
١- قوتابخانەی (الخضر بن عقیل)، وا پێدەچێ کونترین قوتابخانە بێت لە ئەربیل.
٢- قوتابخانەی (قەڵا)
٣- قوتابخانەی (الربظ) لە خوارەوەی قەڵاکە
٤- قوتابخانەی (المجاهدیة)
٥- قوتابخانەی (الطین) یان قوتابخانەی (الفقیرة)
٦- قوتابخانەی (المظفریة): سوڵتان (موزەفەرەدین) دروستی کردبوو، کە فراوانترین قوتابخانەکانی ئەربیل بووە.

**حەوتەم: دار الحدیث المظفریة**
**هەشتەم: (دەزگا کۆمەڵایەتییەکان)**
١- بیمارستان (خەستەخانە)
٢- جێگای حاوانەوەی کەمئەندامەکان و نەخۆشییە درێژخایەنەکان، (موزەفەرەدین) چوار خانەقای بۆ کوێرو نابینایەکان و کەمئەندامان دامەزراند.

**نۆیەم: (گۆڕستانەکان)**
١- گۆڕستانی (زمنی)
٢- گۆڕستانی (تل زگی)
٣- گۆڕستانی مارستان)
٤- گۆڕستانی بازاڕی (بیاطرة)
٥- گۆڕستانی (شهد الکف) کە لە بەرامبەری گۆڕستانی مەرقەدی (پەنجە عەلی) و (بیش برماق) لە گەڕەکی مستەوفی ئێستایە.
٦- گۆڕستانی گشتی یان گۆڕستانی ڕۆژهەڵات، لەوانەیە (گۆڕستانی هەولێری گەورە بێت.) کە هەتا ئێستاش ماوە، ئیبن خەلەکان لە (الوفیات) باسی دەکات و دەڵێ: دەکەوێتە سەر (بەستێ).

**دەیەم: (دەزگایەکانی کار چاکی و خێرمەند و خواناسی)**
١- خانووی (المطیف) لە ئەربل
٢- قوبەی (ئەبی ئەلفەتح ئیبنی مەوبارەک (باوکی ئیبن مستەوفی)

**یانزەهەم: (خانەکان)**
هەندێ ئەوانەی دەهاتن بۆ هەولێر، لەو جێگایە دەخەوتن و دەحەوانەوە، وەکو، ئەو کاروانچیانەی، کە بەو شارەدا تێدەپەڕین.

**دوانزەهەم: (بازاڕەکان)**
١- بازاڕی قەیسەرییەکان، کە (موزەفەرەدین) بۆ یەکەم جار

لە ئەربیل دایمەزراندبوو.
٢- بازاڕی (سفرچییەکان)
٣- بازاڕی (بەیتەرییەکان)
٤- بازاڕی (خەراتەکان)

**سیانزەهەم: (گەڕەکەکان و جێگا ناسراوەکان و مەیدانەکان)**

١- مەیدانی (تل زگی)
٢- ڕێگای (منارە) گەڕەکێکە لە گەڕەکەکانی هەولێر.
٣- ئەلکچک: (ئەلکشک)، یان خانووی حەسانەوە.

**چواردەهەم: (کەناڵەکان و سەرچاوەکانی ئاو و کاریزەکان)**

١- کەناڵێک هەیە تێکدراوە، لە نزیک ئەربل ئەوەی شیاوی باسە، (یاقوتی حەمەوی) لەبارەی دوو کاریزی دیکە دەڵێ: یەکەمیان دەچێتە ناو خانووی (سوڵتان)، دووەمیش: بۆ ناو مزگەوتی (الجامع) یان (الربظ).

**پانزەهەم:** ئیبنولستەوفی باسی هەندێ ناوچە و ئەو گوندانە دەکات، کە سەر بە شاری (ئەربل)ن، وەکو: (جنتون، مشتکهر، منارە، گوندی عیسالل، خەلەکان، جبریلاباد، بشیران، میراث، الصوامع، کشاف، کوبران (لەوانەیە شاری گوێڕی ئێستا بێت، بنەسڵاوەی ئێستا، القطویە رەنگە (گوندی قەتەوی - ئێستا بێت)، حزە (ناوچەی عەزەو قونیانی)ی ئێستا بێت.

**شانزەهەم:** لەو کتێبەدا، زانیارییەکی مێژوویی زۆر هەیە، لەوانە لەبارەی دوایین حاکمەکانی هەزبانی (لە کوردە هەزبانییەکان کە حوکمی (ئەربیل) یان کردووە لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچی هەتا ساڵی ٥٢٢، ئەویش: (ابوالهیجاء الحسن بن الحسن بن الموسي الهذباني)، ئەوەش مانای ئەوەیە، کە حوکمی هەزبانییەکان هەبووە لە ساڵی (٥٢٥ ک)، هەروەها کتێبی (حکم - البابكرية) کە کۆمەڵێکی حاکمی دەسەڵاتدار و زاڵم بوون، کە لە ماوەکانی حوکمی هەزبانییەکان هەبووە، بە توندی و زاڵ بوون لە حوکمیان، ئەوەش بووە جێگای بێزاری و ناڕەزایی خەڵکەکە، هەروەها لەو کتێبەدا زانیاری دیکە هەبوو، لەبارەی: (زەینەدین کوچک) دامەزرێنەری میرنشینی (ئەتابەگییەکان) لە ئەربیل، هەروەها لەبارەی کوڕەکانی و جێگرەکانی لە سەر ئەربل، لە (موسڵ) دانیشتبوو و دەستێکی باڵای هەبوو لە ئەتابەکییەکانی موسڵ، دواییش ساڵی (٥٦٣ ک) گواستراوە بۆ ئەربل، هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد. لە وانەش: (سرفتکی بن عبدالله الزيني و مجاهد الدين قيماز و ابو ابراهيم الياس بن عبدالله، کە نازناوی (عزالدين) بووە.

**بنەچە و نەسڵی (ئیبن مستەوفی) و نەتەوەکەی:**

پێش ماوەیەک هەندێ پرسیارم لەبارەی بنەچەی (ئیبن ستەوفی) کرد بە بێ ئەوەی پشت بە بەڵگەی تەواو ببەستین. یەکێک لەو ڕایانە دەڵێ: (ئیبن مستەوفی) بە نەسڵ (عەرەبە)، بەوەی کە یەکێکە لە ئەندامانی هۆزێکی عەرەبی کۆن، ئەویش هۆزی (بني لخم)، بەڵام ئێمە دەزانین، کە هەندێ جار ئەسڵ و نەسەب بۆ نەتەوەیەک یان هۆزێک یان خێزانێک و لە حاڵاتی زۆر، لە بەر هەندێ هۆی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری ڕووی دەدا و بە دیار دەکەوت، لەوانەش: بۆ خۆ نزیککردنەوە لە (والي و میرە فاتیحەکان) یان بۆ پێویستی پاراستنی ژیان و گەورەکردنی پایە و وەزیفە، لە وانە وەرگرتنی نازناوی گەورە پیاوان و خێزانەکەیان، هەروەکو پێشتر باسکرا و ئیشارەت بە هەندێ ناودرا، وەکو: (سرفتکین زەینی) کە نەسەبی (زەینەدین عەلی کوچکە) یان حەز کردن بۆ ئینتساب کردن بۆ(میللەتێک) کەسایەتییەکی گەورەی وەکو پێغەمبەر محەمەد (د.خ) لێ پەیدا بووە و هاتووە بۆ ئەو دنیایە، یان ئینتیساب کردن بۆ زمانی عەرەبی، کە زمانی (قورئانی پیرۆزە) هەر بەو زمانەش دابەزیوە، هەروەها هۆیەکی دیکە هەیە: زانینی زمانی عەرەبی بە شێوەیەکی باش، کە وای دەکرد بە وردی لە ئایینی ئیسلام تێبگەی، لەوانەش لایەنی: تەشریع و ئەحکامەکانی تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆز) و زانیارییەکی باش لەبارەی قەواعیدی زمانی عەرەبی و خەزینێکی باش لە وشەکانی عەرەبی کۆنی پێش دیار بوونی ئایینی ئیسلام، ئێستاش زانایانی ئایینی ئیسلام لە کوردستان، زانستی ئیسلامی بە

زمانی عەرەبی دەخوێنن، لەبەرئەوەش بە باشی و بە جوانی زمانی عەرەبی دەزانن، بە تایبەتی ڕێزمانەکەی.

ئینتیساب کردن بۆ عەرەب یان بۆ خێزانێکی ناسراو، یان هەر نەسەبێک لە (چاخەکانی ناوەڕاست)، ئەوە دەبووە هۆیەک، بۆ چاککردن و بەرزکردنەوەی جێگا و پایەی کۆمەلایەتی ئەو کەسایەتییەی حەز لەو مەسەلە دەکات، هەروەها دەبێتە هۆی لادانی زۆر لە تەگەرەکانی ژیانی گشتی، لە سەردەمێک مەسەلەی (هەستی نەتەوایەتی) هیچ ڕۆڵێکی نەبووە و دیار نەبووە، چەمکەکانی نەتەوایەتی، ئەو بایەخەی ئێستای نەبووە، (یاقوت حەمەوی) لە: (معجم البلدان) لەبارەی خەڵکی ئەربیل، کە پێشتر لەساڵی (٦١٧ ک) سەردانی ئەو شارەی کردووە، دەڵێ: (زۆرینەی خەڵکی ئەربیل کوردن و بە عەرەب کراون)، بێگومان لێرەدا مەبەستی (یاقوت)، بوونی کاریگەرییەکی گەورەی ڕۆشنبیری نەتەوەی عەرەبی، بە تایبەتی ئەوان زمانی عەرەبییان بەکار دەهێنا لە کاتی خوێندن و نووسین و بەڕێوەبردنی (قەزا) و ئەرکەکانی ڕەسمی، ئەگەر ئەوەشیان نەکردبایە، ئەوە زۆرینەی خەڵکی ئەربیل (نەخوێندەوار) دەردەچوون و فێری خوێندن و نووسین نەدەبوون، بە تایبەتی زمانی زۆرینەی ئەو شارە (زمانی کوردی) بووە، شاعیری حافز و کوێر: (نەوشیروان بەغدادی)، کە بە(شیطان العراق) ناسراوە. لە قەسیدەیەکی شیعری (نوکتە و سوعبەت ئامێزدا) لەبارەی ئەربیل و خەڵکەکەی، کە (صفدی) لە (الوافي بالوفيات) باسی ئەو مەسەلە دەکات.

لەو سەردەمە نوێیەدا و، هەتا ئەو ڕۆژەی ئێمە، هەندێ لە خێزان و هۆزەکانی کوردستان پروپاگەندەی نەسەبی عەرەبی دەکات و دەڵێ ئێمە لە بنەچە عەرەبین، ئەو دابی خۆ بەعەرەب زانینە هەر ماوە، بەڕێز (عەباس عەزاوی) لە کتێبەکەی: (لە هۆزەکانی کوردی عێراق) دەڵێ: (هەندێ لە سەرۆک هۆزەکانی کورد، ئیدیعای ئەوە دەکەن، کە بنەچەیان (عەرەب)ە وەکو بنەچەی - خالیدی بۆ (خالید بن الوليد) یان بۆ هۆزی (بەنی خالید)ی ناسراو لە عیراق و شام و نەجد، هەندێکی تریش بۆ ئەوەی: (ابی بکر الصدیق، یان بۆ هاودلی پێغەمبەر(بەنی ضرار) کە بە (اخی خوله) ناسراو بووە، هەروەها، هەندێ خێزانی زانستی و نازانستی، ئیدیعای بنەچەی خەلیفە (عوسمانی کوڕی عەفان) یان بۆ (عومەری کوڕی خەتاب) دەکەن، هەندێکی دیکە بنەچەی (سەید) وەکو ڕەچەڵەک بۆ بنەماڵەی پێغەمبەر(د. خ) دەگێڕنەوە، سەیری کتێبی: (عشائر العراق الكوردية) بغداد ١٩٤٧، لاپەڕەکانی (٣١، ٩٥، ١٠٠، ١٠٢، ١٢٩، ١٣٧، ١٥٣، ١٩٣، ١٩٤) بکە.

یەکێک لە کوردکانی عەرەب لە بەغدا، ئەویش (کەلۆس)ە - دامەزرێنەری (میرنشینی سۆران)، کە لە ناوچەی (هاودیان) جێنشین بوو، کە سەر بە (اوان - سهران) بوو، سەرچاوەی پێشتر لاپەرە (١٥٦).

هەر ئەوەش وای لە (ناجی مەعروف) کرد لە کتێبەکەیدا بە ناوی: (عروبة المنسوبين الي البلدان الاعجمية)، کە بنەچەی هەندێ لە کەسایەتی و زانای کورد بۆ ڕەچەڵەکی عەرەبی بگەڕێنێتەوە و بە عەرەبیان دانێ، هەروەها هەندێ لە سەرکردە و میرەکانی میرنشینی کوردی لە باکووری عێراق و کوردستانی تورکیا بکاتە عەرەب. وەکو میرنشینی: هەکاری و شەمدینان و بادینان و مەروانی و شارەزووری و کلس)، هەروەها زۆر لە مەشاهیری زانایانی کورد و فارس لە ئێران و ئازەربێجان و ولاتی ڕۆم و شامییەکان و جەزیرە و شارەزوور و ئەرمینیا و شێروان، (عروبة العلماء المنسوبين في بلاد الروم والجزيرة وشهرزور وأذربيجان الي البلدان الاعجمية، ج ٣، بغداد ١٩٧٨).

(عبدالقادر احمد طليحات) هەر ئەو شێوازەی بەکارهێنا، کاتێک ئەمیری ئەربیل (موزەفەرەددین گۆگبری)، کە لە (آل بکتکینە) بە عەرەبی دانا و ڕەچەڵەکی کردە عەرەبی، بەوەش، ئەو هۆیانە ڕوون بوونەوە، بۆ گۆڕینی بنەچەی (ئیبن مستەوفی)، کە یەکێکە لە مەشاهیر و زانایانی مێژوو و ئەدەب، کە کورد و کوردستان شانازییان پێ دەکا، ناوبانگییان لە شاری ئەربل تێپەڕی و فراوانتر بوو، لە بەر ئەوەی یەکێکە لە کەسایەتییە ناسراوەکانی سەردەمی ئیسلامی.

**و. نەجات خۆشناو**

# فەقێیەتی
# (لە دەشتی هەولێر و دەوروبەری)

مەلا محەمەد عەلیاوەیی

منداڵ کە بەچاکی بیزانیایە تاکو ژمارە (٢٠) بزانێ - سیپارەیان بۆ دەکرد بە:

یا فـەتاح - یا رەزاق - یا ئەڵڵا - یا فـەتاح فـەتحم بدە، یا رەزاق رزقم بدە، یائەڵڵا تەوفیقم بدە.

ا ب ت ث ج ح خ د ذ ر ز س ش ص ض ط ظ ع غ ف ق ک ل م ن هـ و لا ی.

ئەم پیتانەیان چاک فێردەکرد و پێیان دەناساند، کەوا هەریەک لەم پیتانە ناوی چییە و شکڵی چۆنە و چەند نوختەی هەیە و لەسەرە یان لە ژێرە، کامەیان بێ نوختەیە؟ ئینجا فاتیحە و تەحیاتیان بۆدەنووسییەوە، حەرەکات و سەر و بەر و ژێریان بۆ دەکردن لەگەڵ شەددە و مەددە و هەڵکشاو داکشا. لە هەندێ ناوچە ئەمە پێی دەوترا سیپارە، لە هەندێ ناوچەی تریش پێی دەوترا: ئەلف و بێتکە. کە منداڵ دەستی دەکرد بە خوێندنی: الحمد و تەحیات، جاری یەکەم بە حنجەیی و جاری دووەم بە ڕەوانی منداڵ لەگەڵ مامۆستاکەی، هەریەکە و دەستی دەدا پوشکەیەکی زل و درێژ بۆ دیارکردنی پیتەکان و سەروبەر و ژێرەکانیان:

حنجەیی: بسم الله: بێ لە ژێر بی سین زدنە بیس، میم لە ژێرمی، بسم، لا مەل فەلا، هێ لە ژێر هی بسم الله.

تا بەم حاڵە سیپارەکەی کۆتا دەکرد بە: حنجەیی و ڕەوانی، پیتەکانی بە جولانەوە جوان فێردەبوو دەیناسین، ئەوجا دەستی دەکرد بە جزمی عەمە، ئەویش هەروا بە حنجەیی و ڕەوانی، لە پاشان جزو بە جزو، پێیدا دەچوو بە دەرس خوێندن، کە لە قورعان دەبۆوە مامۆستاکەی ختمەکی قورعانی لەگەڵ دەخوێند، بەمجۆرەیە چاک فێری قورعان دەبوو، دەوری دەکردەوە، هەر بۆیە ئەوەی بەمجۆرە قورعان فێرنەبێ، تا دەمرێ فێری قورعان نابێ و نازانێ بەباشی و ڕاستی بیخوێنێتەوە. بۆ زانین: هەندێ شوێن هەبوون لە: سیپارە و جزمی عەمە و قورعان دیارکرابوون، دەبوایە منداڵ کە گەیشتە هەر شوێنێک لەم شوێنانە شتێکی (دیاری) بدایە مامۆستاکەی.

لە سیپارە کە دەگەیشتە: (لامەل فەلایێ): دەوترا لامەل فەلایێ - سەرت بە کۆشی دایێ - بینە تەبەقەی مامۆستایێ.

لە جزمی عەمە کە دەگەیشتە: (ویمنعون الماعون)، دەوترا: بێنە قالبێک سابوونە، جلکی مامۆستای دژونە، کە دەگەیشتە وشەی: (فحدث): دەوترا: بێنە کاوڕێکی کوڕیس بۆ مامۆستای لەڕوسیس. کە دەگەیشتە وشەی (رویدا) دەوترا: بیگرە بە دیواری دادا هەتا شتێکی بە مامۆستای دەدا ؟، کە دەگەیشتە سورەتی (یس) دەبوایە زیافەتێک بکات، کە لە قورعان دەبۆوە دەبایە زیافەتێکی گەورە بکات و خەراتێکی مامۆستاکەش بکات، ئەمەش بە زۆری دەستێک جلوبەرگ بوو. کە منداڵ قورعانی ختم کرد دەبایە وردەوردە خەریکە نووسین بایە، کە ئەمەش پێی دەوترا (مەشق)، هەندێ مەرەکەبی مۆریان بۆ دەگرتەوە لەناو قوتییەک، قەڵەمێکی قامیشیان بۆ دادەدا، کە ئەوسا هەر قەڵەمی قامیش هەبوو، قامیشی تایبەتی قەڵەم جیابوو لەگەڵ قامیشی تر، کە بەمیان دەوت قامیشە ساغە، بەمەکەی تریان دەوت قامیشە پوکە، قاقەزیان بۆ ئامادە دەکرد، مامۆستا هەموو ڕۆژ لەسەری قاقەزەکە خەتێکی جوانی بۆ دەنووسی، کە بەمەیان دەوت: سەرمەشق. منداڵەکەش لاپەڕەیەکی لەسەر دەنووسی و ڕەش دەکردەوە بە نووسین و لاساکردنەوەی نووسینەکەی مامۆستاکەی. ئەو قەڵەمەی کە پێی دەنووسرا جیرەی

لێوەدەهات.

نوکتەیەک: منداڵێک هەبوو بە ڕۆژ مەشقی نووسینی دەکرد، شەو کە دەخەوت بیلامانێ بای لێ بەردەبوو، دایکی دەی وت: بە قوربانی کوڕە فەقێ جوانەکەم بم لە خەویشدا هەر جیرەی قەردمی دێت.

منداڵ لەپاش خوێندنی قورعان دەستی دەکرد بە خوێندنی هەندێ کتێبی فارسی و لەبەری دەکردن بە ماناوە، وەکو: ئیسماعیل نامە، ناگەهان، ئەی شودە، بیا داود، سەنگ تراش، نانو ماست، ئەمانە کتێبی هوردەلە بوون، لەدوای ئەمانە دەستی دەکرد بە: پەندی عەتار، گوڵستان، بەم کتێبانە زەینی زۆر روون دەبوو، دەکراوە. کە ئەمانەی دەخوێند دەستی دەکرد بە کتێبی ئەحمەدی٢ - کە وەکو لوغەت وایە - عەرەبی و ماناکەی بە کوردی. منداڵ ئەزبەری دەکرد، پێی فێری لوغەتی عەرەبی دەبوو تا ڕادەیێک. ئەمەش نموونەکەیەتی بە شێوەی کۆن: رأس - سەرە، عین - چاوە، بدن - قالب، إسم - ناوە، إمش - برۆ، تعال - وەرە، إبل - وشتر، حمار - کەرە...هتد.

نوکتەیەک: لەسەر کتێبی ئەحمەدی: (سەعید سەلیم) هەبوو لە گوندی دۆڵەبەکرەی سەر بە لیوای هەولێر. ئەم پیاوە تا بڵێی پیاوێکی عاقر و چازان و زیرەک و شایەر بوو، نەخوێندەواریش بوو. مەگەر عەلی بەردەشانی وا شایەر بێ، شیعرەکانی زۆر بە تام و بۆ بووە، لە خۆیەوە چۆنی هەوەس بایە دەستی پێ دەکرد، تاوەکو ساڵی (١٩٥٠یز) لە ژیاندابوو، بە داخەوە کورد بێکەس بووە، ئەگینا دەبایە شیعرەکانی ئەم پیاوە بە ئاڵتون بنووسرێ و هەڵبگیرێ. مامۆستا مەلا ئیبراهیم کە پیاوێکی بە دین و مەلا بووە لە گوندی دۆڵە بەکرە، وردەوردە کتێبی ئەحمەدی بە کوڕێکی خۆی دەڵێ بە دەرس، مام سەعید لای مامۆستا دادەنیشێ و لە دەرسەکە ورد دەبێتەوە. دەڵێ مامۆستا ئەم کتێبە چییە تۆ بە کوڕی خۆتی دەڵێی؟ مامۆستا دەست بە مەتح و سەنای ئەحمەدی دەکا و مام سەعید تێدەگەیەنێ، مام سەعیدیش دەڵێ: منیش دەتوانم ئەحمەدییەکی کوردی بۆ کوردی دابنێم بە نەزم (هۆنراوە)، گەلێ لەم ئەحمەدییە خۆشتربێ. مامۆستاش دەڵێ ناتوانی - دابزانم چۆن دەڵێی؟ مام سەعید دەڵێ مامۆستا گوێ بگرە بۆت بڵێم: هەلهەل، سەیرە - خەرتەل، تەیرە - کەم قۆر، (قوڵ) چارە - بیرمو، غەیرە - جەردە، دزە - عەوردت، قوزە - چەوری، رونە - دووبرە، قونە... هتد.

جا نزیکەی سەعاتێک بەسەردا دەڕوا، فەقێی ئەم ناوچەیە زۆربەی ئەحمەدییەکەی مام سەعیدیان لەبەر بوو، جارێک لە دیوەخانی حەمەدی پاشا، لە گوندی دەبێتە باسی زیرەکی و شایەری مام سەعید، یارم خوێندەوارێک لەوێ دەبێ و خەڵکی ئەو گوندەش نابێ، دەڵێت شیعرەکانی مام سەعید کەچن، شیعر پێویستە قافیەکانی پیتی عەین و غەین و سین و سادی تیابێ، هینەکانی مام سەعید وانییە. دەنێرنە دوای مام سەعید، ئەویش دێت و تێی دەگەیەنن، ئەمیش رووەدکاتە کابرا و دەڵێ: ئەگەر ئەو پیتانەی تیابێ تەواوە؟ کابراش بە ساڵاچوو بوو پرچ و سەری بەرەو سپییەتی دەچێت. دەڵێ: بەڵێ، مام سەعید دەست پێدەکات و دەڵێت:

**لەو جەنابی هات و بات**
**سەرت بۆزە و سپی پات**
**جاشکەک هات و ئەتو گات**
**عەین و غەین و سین و سات**

دەبێتە پێکەنین. کابرا دەڵێ مام سەعید تەسلیم، بەڕاستی شاعیری چاکی، جا ئاغا چا لێدەنێ بۆ مەجلیسەکە. لە چەرخی مام سەعید، تەها مامەر هەبوو، ئەویش شایەری چاک بوو تا نزیکەی ساڵانی ١٩٧٠ لە ژیاندا بوو، جارێک لاوێکی ڕالەخۆ، پێشمەرگە دەبێ و لە ساڵی ١٩٦٢ز مام تەها دەبینێ، مام تەها لێی دەپرسێ: بۆچ بوویە پێشمەرگە؟ ئەویش دەڵێ: تا حوکمی زاتی بۆ کورد وەربگرین، زۆری پێنەچوو، کابرای پێشمەرگە هاتەوە و بووە جاش پۆلیس. مام تەها چاوی پێکەوت و وتی: **ها فلان بە خۆت و بە تفەنگی دیموکراتی**
**دوو تڕ و نیوت تێوەرینا و هەلاتی**
**بەراستی وەرت گرت حوکمی زاتی،**

هەروەها عەولا عود هەبوو لە تیرەی سیان و مامەسێنی لە مام سەعید و مام تەها کەمتر نەبوو لە شایەری، بەداخەوە کورد بێ خاوەن بووە، ئەگینا شیعرەکانیان بنووسرابایەوە وەک زێڕ وابوو.

فەقێ بەر لە کتێبی ئەحمەدی یاخود پاش کتێبی ئەحمەدی - ئاقیدەی کوردیشی دەخوێند و ئەزبەری دەکرد، ئەمەش نموونەی ئاقیدەی کوردی بوو:

(اول ابتدا باسم الله پس حمد وثنا الحمد الله ئەوجا

صلاوات لەسەر مصطفی هەم آل واصحاب هەم تحت العبا)

**گوێ بدێرن بە عام چی موسڵمانن**
**ئەگەر بەڕاستی ساحب ئیمانن**
**هەرچی واجب بێ دەبێ بیزانن**
**گەر شەیتان بێڵێ زۆر زۆر ئاسانن**
**ئەوەل هەموو ناسینی خوایە**
**هەر چەند لە تاقەت عەقلی تۆدایە.**

**پێنج روکنی ئیسلام بابزانن چییە**
**باوەڕ پێ بکەین ئەمری رەبییە**
**دووەم پێنج فەرزە بە شەرت و ئەرکان**
**سێیەم سی رۆژی مانگی رەمەزان**
**مەحفوز لە (مفطر) هەم لە (غوبطلان)**
**چارەم زەکاتە دەگەڵ سەرفترە**
**پێنجەمین حەجە هەم دەگەڵ عومرە... هتد.**

### سەرەتای چوونە ناو فەقێیەتی کوڕە فەقێ

زۆربەی دێهاتەکانی کوردستان و شارەکان و قەزا و ناحیەکان. مەلا و مەدرەسە و مزگەوت و حوجرە و فەقێی لێبوو. لە دێهاتەکان گەورەی دێیەکە و فەلاحەکان خزمەتیان دەکردن و بەڕێوەیان دەبردن، لە شار و شارۆچکەکان دووکاندارەکان و حاڵدارەکان خزمەتیان دەکردن. کوڕە فەقێ پاش ختمی قورئان و کتێبە فارسییەکان و ئەحمەدی و ئاقیدەی کوردی دەچووە مەدرەسەیەک جێگای دەخواستەوە لەلای موستەعیدێک، دەهاتەوە ماڵێ خۆی رێک دەخست:

١. یاتاخێکی پێ خەوتن - جاجمێک و لبادێک و دووگردێک (بەرماڵ) و بالیفێک، ئەوساکە لێفە و بەتانی نەبوو.

٢. دەستە بوخچەیەکی رەنگاوڕەنگ و نەخشراو، کراس و دەرپێ و کتێبەکان و یەک دوو قالبە سابوون و دەرزی لەناو دەنا. ئەوساکە باول و جانتا و شت نەبوو، هەروەها لەگەڵ قوتووە مەرەکەب و قاقەز و چەند قەڵەمی قامیش.

٣. نەختێ پارە و پوڵ بۆ خەرجی. کورتەک و شەرواڵی لەبەر و پڕدێنێکی جوان لە پشتی و خەنجەرێکی بچووکی لە قەد و کوتەکەکەی دەستی دەدایە - واتە تۆیز، جەمەدانییەکی بە ریش و جەلەکراو، جۆتە قۆندەرەی خاوێن.

ئەشیاکانی لە گوێدرێژێک بار دەکرد و باوکی یان برایەکی رەگەڵ دەکەوت تاکو دەچووە شوێنەکەی جێگای لێ خواستۆتەوە، ئەوەی لەگەڵی چووە گوێدرێژەکەی دەهێناوە، ئەمیش لەوێ جێ دەما: بەناو "سوختە"، واتە دەبووە سوختە لەلای "موستەعدێک"، دەستی دەکرد بە خوێندن. بۆ زانین، فەقێ لە سەرەتاوە کە چووە ناو فەقێیان ماڵی لە چ دێیەک بایە بەو دێیە هەڵئەدرا و ناو ئەبرا و ئەناسرا، نەک بەناوی باوکی، جا لە پاشان ماڵیان لەم دێیەش باری بکردایە هەر بەناوی دێیەکەی پێشوو دەمایەوە.

نموونە/ با بڵێین کوڕە فەقێ ناوی: ئیسماعیلە و خەڵکی گوندی ئاکۆیە تا مردن هەر ئەوترا و بە: ئیسماعیل ئاکۆیی، فەقێ ئیسماعیل ئاکۆیی، مەلا ئیسماعیل ئاکۆیی ناودەبرا.

### ناوی قەدەغەکراو لە خوێندەوارانی ئایینی و فەقێیەتی

هەندێ ناو هەبوو دانەدەنرا بۆ فەقێیەتی، ئەگەر کوڕە فەقێ ناوەکەی یەکێ لەم ناوە قەدەغەکراوانە بایە لەناو فەقێیان ناوەکەیان دەگۆڕی و ناوێکی دیکەی پیرۆزیان لێ دەنا و هەڵیاندەدا بەم ناوە پیرۆزە، کەچی ناوە گۆڕاوەکەشی بەزۆری لەدوای ناوە پیرۆزەکەی دەوترا، واتە بە کۆتایی ناوە ناپەسەندەکەی لەسەر لانەدەچوو، ناوە قەدەغەکراوەکان ئەمانەن: (میکائیل، جوبرائیل، کانەبی، مەولود، ئۆمەر، رەمەزان، وسو، عوزێر، جومعە، بابە...هتد).

نموونە/ کوڕە فەقێ ناوی رەمەزان بوو، ناویان گۆڕی و کرا بە سەعید، هەتا مردن پێی دەوترا و هەڵدەدرا بە: فەقێ سەعیدی کۆنە رەمەزان، ئەگەر بەرەو رووشی وایان پێ نەگۆتایە پاش ملە هەروا دەگوترا، تاکو وانەگوترابایە نەدەناسرا.

### جۆرەکانی فەقێ

**١. سوختە:** کوڕە فەقێ لە سەرەتاوە، کە دەچووە ناو فەقێیان تاکو دەگەیشتە کتێبی جامی، پێی دەوترا سوختە. وشەی سوختە فارسییە، بەمانای سووتاوە، سوختە، جگە لە خوێندنەوەکەی هەر ئیشکەر و خزمەتگوزار و ماندوو

بوو، لەم ماوەیەدا، ناوی سوختایەتی هەر لەدوابوو، بەڵام کە دەستی دەکرد بە کتێبی "مەولانا جامی"، ناوەکەی سوختەی لەسەر لادەکەوت، ئیشی سوختە لە مەدرەسە جگە لە خوێندن ئەمانە بوو: چا لێنان، سۆتەنی پەیدا کردن، ئاو هێنان، جێی مامۆستاکەی رادەخست و قەد دەکرد، راتبە هێنان، گۆزە پڕ کردن بۆ مامۆستاکەی، ئاو بەدەست داکردنی. ئەگەر مەلای گەورە - مەلای گوند، کارێکی هەبوایە دەبوایە سوختە بیکات، لە هەندێ شوێن لەم گەرمیانە دەبوایە سوختە ئاو بۆ ماڵی مەلای گەورەش بێنێ، ندەبوو بخەوێ تاکو مامۆستاکەی دەخەوت و جێی پێدادەدا، زۆر جاریش وابوو دەبوایە جوان قاچ و پەنجەکانی مامۆستاکەی پشێلێ، نەدەبوو لە حوجرەی مامۆستاکەی قسە بەقایم بکات و پێبکەنێ بەدەنگ، ئەگەر دوو سوختە لە مەدرەسە لەگەڵ یەکتر شەڕیان بکردایە، هەردووکیان دەردەکران لە مەدرەسەکە. هەر سوختەیەک کوتەکی تایبەتی خۆی هەبوو (واتە تۆبز)، بە زۆری خەنجەریشیان هەبوو.

ئەگەر کابرایەک قسەی بە فەقێیەک بوتبایە، موستەعید دەیانگوت (یا الله سوختە)، هەر سوختە بوو دەستی دەدا کوتەکی (تۆبزی)، خۆی ئاگر بایە، دەبایە نەگەڕێتەوە، کابرایان مارکوژ دەکرد، چ دەبوو لە دواوە بێ منەت بوون. بە کورتی تا بڵێی کاری سوختە گران بوو، بەڵام کە دەبوونە "موستەعید" ئەوپەڕی خۆشی و خزمەت بوو، مەشور بوو لەناو فەقێیان: (من خدم خظرم)، هەر کەسێ خزمەت بکات، خزمەت دەکرێ. مەلا سەعیدێک هەبوو پاش سوختایەتی لە ناگزوری بووە خزمەتگاری ئاغان، ناودەبرا بە مەلا سەعیدی کۆنە رەمەزان، دەیگوت: فەقێ باوکی منیان بەگاندا - هەر دەیانگوت من خدم خدم. کەچی بەشی من هەر خدم بوو، قەت نەبوومە خدم، ئەوا ریشم سپی بوو هەر خزمەتکارم. کەواتە هەر لەبەر ئیش کردن و ماندوو بوون بووە - کە سوختە ناوبراوە بە: سوختە = سۆتاو، لەناو کار و عەزیەت، ئەو کتێبانەی سوختە دەیخوێند، ئەمانە بوون بە تەرتیب، دەبووایە ئەزبەریان بکات.

١. عەوامیلی جورجانی بە تەرکیب و ماناوە لە عیلمی نەحو
٢. سعدالله گچکە بە تەرکیب و ماناوە لە عیلمی نەحو
٣. ئونموزەج وە یا شرح موغنی بە تەرکیب و ماناوە لە عیلمی نەحو
٤. حەرفی شەرح المغنی بە تەرکیب و ماناوە لە عیلمی نەحو
٥. عوامیل پاش اظهار بە تەرکیب و ماناوە لە عیلمی نەحو
٦. عوامیلی کوبرا زۆرجاریش عەوامیلی بە تەرکیب و ماناوە لە عیلمی نەحو

مەلا موحسین دەخوێندرا

٧. مراح الارواح لە عیلمی صرف واشتقاق
٨. مەقصود لە عیلمی صرف واشتقاق
٩. بنا لە عیلمی صرف واشتقاق
١٠. اظهار البرکوی لە عیلمی نەحو
١١. سعدالله گەورە = الحدائق/مصغر ومنوب لە عیلمی نەحو
١٢. فعل سعدالله لە عیلمی نەحو
١٣. صمدیە لە عیلمی نەحو
١٤. سعدین لەگەڵ حاشییەی میصری لە عیلمی صرف
١٥. تصریف ملا علی لەگەڵ قزلجی و لە عیلمی صرف قەرەداغی
١٦. الاستعارە لە عیلمی بەیان و بەلاغە
١٧. وضع لە عیلمی وەضع

لە کاتی دەورکردنەوەی ئەم کتێبانە هەر سوختەیەک یاخود فەقێیەک رێچکۆڵەیەکی بچووکی بۆ خۆی تەرخان دەکرد و پیایدا هاتوچۆی دەکرد، کەسێ لە رێچکۆڵەی کەسی تر دەوری نەدەکردەوە. قەدەغە بوو، زۆرجار لەسەر رێچکۆڵەی دەور کردنەوە بەشەڕ دەهاتن - کە یەکێ تر لە رێچکۆڵەکەی ئەو دەوری بکردبایەوە.

**٢. موتەعەللیق:** وشەی موتەعەللیق، دەگونجێ (اسم فاعل) بێت، واتە ئەم جۆرە فەقێیانە پەیوەندییان بە موستەعیدەکانەوە هەیە. دەگونجێ (اسمی مفعول) بێ، واتە سوختە بچووکەکان پەیوەندییان بەوانەوە هەیە.

ئەم مەدرەسەی عومدە (بایە و گەورە بایە و موستەعیدی ئاخر ماددەی لێبایە، فەقێ کە گەیشتە کتێبی مەلا جامی یاخود سەعدوڵڵای گەورە و وەضع، (استعارة) فەقێی خوارتری لێبایە مەدرەسەکە. فەقێیەکانی جامی خوێن و سەعدوڵڵا خوێن لەلای موستەعیدەکانیان دەرس

دەخوێند و سوختەکانی خوارێش لەلای ئەوانیان دەرس دەخوێند. فەقێی جامی خوێنەکان راتبە و ئیشی ناو گوندیان نەدەکرد، بەس ئیشی حوجرەیان دەکرد لە: چا لێنان و شتی سووک و کارەکانی تر هەمووی لەسەر شانی سوختەکانی خواروو بوو. بە سوختە گەورەکانیان دەگوت: موتەعەللیق - واتە جامی خوێن و سەعدولڵاخوێن. پیاوێکی قسە خۆش هەبوو - زۆر هاموشۆی لای مەلا و فەقێ و مەدرەسەی دەکرد، هەموو جارێ دەیگوت: موستەعید موستەعیدە، سوختە سوختەیە، بەڵام موتەعەللیق ئەتو چی؟ بە وشەیەکی سەیری دەگوت و دەدا دەکرد.

**٣. ناسکە موستەعید:** پاش خوێندنی کتێبی مەولانا جامی فەقێ چیتر سوختایەتی نەدەکرد و دەچووە لای مەلایەکی یارم - لە گوندێکی تر دەبووە موستەعید و سوختەی بچووکی رادەگرت و خزمەتی خۆی و مەدرەسەکەی پێ دەکرد، بەم جۆرە موستەعیدە دەگوترا: ناسکە موستەعید. ئەم جۆرە موستەعیدە زۆر بە زەوق و کەیف بوو، قیت و قۆز، خاوێن و باوێن، بە زۆری وابوو کەوا و سەڵتەی لەبەر دەکرد و جەمەدانی دەبەست، بە ریش و گوڵینگ. بەم جۆرە فەقێیە تاکو دەگەیشتە کتێبی: شەرحە شەمسی/ لە عیلمی مەنتیق و فەلسەفە ئەم ناوەی هەر لەسەر بوو: ناسکە موستەعید = موقەدیمە خوێن، تا لە ناسکە موستەعیدایەتی دەردەچوو ئەم کتێبانەی دەخوێند و زۆربەی ئەزبەری دەکرد، یاخود مەتنەکانی لەبەر دەکرد:

١. فەنناری و قەولە حمد لە عیلمی فەلسەفە
٢. موغنی طلاب لە عیلمی فەلسەفە
٣. عبدالله یەزدی لە عیلمی فەلسەفە
٤. سوللەمی مەنتیق لە عیلمی فەلسەفە
٥. سیوطی و ئەبو طالب لە عیلمی نەحو و ئیعراب
٦. گەلنبەوی ئاداب و پێنجوێنی و قەرەداغی لە عیلمی ئاداب
٧. طاش کوبری لە عیلمی ئاداب
٨. رسالە حنفی و مینهر لە عیلمی ئاداب
٩. قوشە جی لە عیلمی وضع
١٠. عصام الدین لە عیلمی بەیان
١١. کمال الدین لە عیلمی صرف و اشتقاق یاخود سید عبدالله لە عیلمی صرف و اشتقاق واعلال.

لەگەڵ خوێندنی ئەم کتێبانە ناسکە موستەعید، کتێبی شەرع و حەدیسیشی دەخوێندەوە وەکو: (ارشاد العباد) و(ریاض الصالحین) لە حەدیس. (فتح المعین) و(منهاج الطالبین) لە فیقهی شافیعی، لەم ماوەیەدا سوختەی رادەگرت و دەرسی پێ دەوتن، بە تایبەتی ئەگەر زیرەک بایە هەردەم کۆڕی وانە گوتنەوەی پڕی سوختە بوو.

لە زۆر مەدرسە لە گەرمیان - بەتایبەتی لە دەشتایی - مامۆستا دەرسی بە ناسکە موستەعید نەدەوت، ئەگەر کەوا و سەڵتەی نەبایە، ئەوساکەش خەڵک زۆر هەژار و دەستکورت بوو، بە تایبەتی چینی فەقێ.

**٤. موستەعیدی ئاخر مادده:**

فەقێ کە دەستی دەکرد بە کتێبی: شرح شمسی - پێی دەگوترا: موستەعیدی ئاخیری مادە، لەوێڕا فەقێ عینوانی دەگۆڕا، بە ویقار دەبوو، خۆی بە مەلا دەزانی، نوێژی کەم وابوو بێ جەماعەت بێ، بە زۆری سیواکی بە کاردەهێنا، ردێنی نە دەتراشی، عەبای دەهاویشتە سەرشانی، بە تایبەتی لە شارەکان، لە زۆر شوێن هەبوو موستەعیدی بێ عەبا رانەدەگیرا. کەم موستەعید هەبوو خەنجەری نەبایە، بەم دواییە قلەقلە دەمانچەشیان هەبوو، من دیومە موستەعید تفەنگی هەبووە. تاکو خوێندنی کوتا دەکرد لە شەریعەت و حەدیس ئەم کتێبانەی خوارەوەی دەخوێند، ئەگەر بە تەواویش نەی خوێندبایە هەربەکە و هەندێکی لێ دەخوێند بۆ شارەزایی:

١. ئەنواری مەزن - لە فیقهی شافعی.
٢. شەرحە مەنهەج - لە فیقهی شافعی.
٣. فەرائیز - لە دابەشکردنی میرات.
٤. هەندێ باسی گرنگ لە ابن الحجر.
٥. بوخاری - لە حەدیس.
٦. بەیزاوی - لە تەفسیر.
٧. هەندێ لە مەداریک - لە تەفسیر.

لە چەرخی (١٣ک) کتێبی( محرر) -لە فیقهی شافعی لە دانانی ئیمامی رافعی کوردی دەخوێندرا، موستەعید تاکو دەبووە مەلا، ئەم کتێبانەی لە عیلم دەخوێند:

١. شرح شمسیە لەگەڵ حاشیەی سید عبدالحکیم - لە

عیلمی مەنتیق، فەلسەفە. مەتنەکەی کە: شەمسیە بوو لەبەری دەکرد.
٢. گەلنبەوی بورهان: گەلنبەوی مەنتیق و لەگەڵ حاشیەی پێنجوێنی و مینهر. گەلنبەوییەکەی لەبەر دەکرد.
٣. (شرح العقائد) لەگەڵ حاشیەکەی خەیالی، لە عیلمی کەلام مەتنەکەی لەبەر دەکرد: عەقائد.
٤. میر ابو الفتح - لە عیلمی ئاداب.
٥. (عصام الدین الوضع) - لە عیلمی (وضع).
٦. جلال الدین الدوانی - لەگەڵ تەعلیقاتی: خەلخالی و مەرجانی لە عیلمی کەلام و حیکمەت.
٧. (مطول) - لەگەڵ تەعلیقاتی سەید عبدالحکیم لە عیلمی بەلاغە، مەتنەکەی: تەخلیصە کە ئەزبەری دەکرد. کتێبی مختصری دەخوێند ئەمیش هەر شەرحی کورتکراودیە و کورتترە و سوکترە لە: (مطول).
٨. (جمع الجوامع) - لەگەڵ تەعلیقاتی: بەننانی - لە عیلمی (اصول الفقه)، مەتنەکەی ئەزبەر دەکرد.
٩. (تهذیب الکلام) - لە عیلمی کەلام.
قاضی لەگەڵ (تەعلیقاتی لاری) - لە عیلمی سروشت و حیکمەت و لاهوت.
١٠. تشریح - لەگەڵ مینهوەکانی - لە عیلمی (ریاضیات و فەلەکیات).
١١. (شرح چقمینی) - لە عیلمی (ریاضیات و فەلەکیات).
١٢. (خولاصة الحساب)= (رسالة الحساب) لە عیلمی حیساب و هەندەسە و ریاضیات و جەبر.
١٣. (الاسطرلاب) - لە عیلمی فەلەکیات و ئەستێرە ناسی.
١٤. (ربع المجیب و المقنطر) - بۆ زانینی شەو و ڕۆژ و کاتەکانی نوێژ - دوور و نزیکی مەسافەی زەوی.
١٥. (ئەشکال التأسیس) - لە عیلمی هەندەسە.
١٦. (شرح المطالع) - لە عیلمی مەنتیق و فەلسەفە، لەگەڵ تەعلیقاتی سەید شەریف.
١٧. (مختصر المنتهی) - لە عیلمی حیکمەت و (طبیعیات) و کەلام و فەلسەفە.
١٨. (شرح المواقف) - لە عیلمی کەلام و فەلسەفە و حیکمەت.
١٩. (شرح المقاصد) لە عیلمی کەلام.
٢٠. (شرح طوالع) لە عیلمی مەنتیق.
٢١. تلویح لە عیلمی کەلام.

فەقێ تا ئەم هەموو کتێبانەی نەخوێندبایە نەدەبووە مەلا - کەپێی بووترابایە مەلا - فەقێ لەو کاتەی، کە دەچووە ناو فەقێیان تاوەکو دەبووە مەلا، دەبایە نزیکەی (٢٥) ساڵی بخوێندبایە، ئەوجا دەبووە مەلا.

بیستومانە کەوا لە چەرخی (١٣ک) نزیکەی (٣٠) ساڵیان خوێندووە، ئەوجا بوونەتە مەلا، لەم دوایە ماوەی (٢٠) ساڵیان دەخوێند، بەڵام تاکو هات ماوەکە کورت بۆوە، بە زۆری (١٥) ساڵیان دەخوێند، ئەمەش هۆی ئەوە بوو عیلم بەرەو کزی و بێ ڕەغبەتی دەچوو، فەرقی مەلای چاک و خراپ زۆر نەبوو لەناو خەڵک، من یەکێک لە باری خۆم نزیکەی (٢١) ساڵم خوێند، داوێکی سپێم لە ردێنم دیت و دەرم هێنا و سوختەی خۆم لەگەڵم بوونە موستەعید، ئەگەرنا بە تەما بووم سێ چوار ساڵی تریش بخوێنم، بەداخەوە کە نەمخوێند؟!.

**ئەرێ بابەی فەقێیان**

وشەی: ئەرێ - ئامرازی بانگ کردنە - هەروەکو لە ڕێزماندایە، وشەی: بابە - بەمانا دەرگایە - محەمەدی مەزن (د.خ) فەرمویەتی: (أنا مدینة العلم وعلی بابها: من شاری زاست و زانینم و ئیمامی عەلی دەروازەیتی)، ئینجا فەقێ لە دەورکردنەوەی ئەزبەر ئەگەر هەڵوێستەکی بکردابایە و شتێکی بۆ نەهاتبایە و بەیاددا ئیستمداد و یارمەتی داوا دەکرد لە ئیمامی عەلی، گورج بە یادی دەهاتەوە، کەواتە مانای ئەرێ بابە: هۆ دەروازەی زانست و زانین وەرە ئیمدادم، نموونەی ئەرێ بابە بەدەورکردنەوەی فەقێ.

(علم البیان أصول وقواعد) ئەرێ بابە
(تتعلق باظهار المراد وبیان المعنی واحد) ئەرێ بابە،

ئینجا ئەگەر فەقێیەک دەنگی خۆش بووایە هەر زێنەت بوو بەشەوان، کە دەوری دەکردەوە - گوێی لێ رابگری، بەتایبەتی کە فەقێ دەوری: ئەلفیەی ابن مالکی دەکردەوە بەنزم و ئاوازی تایبەتی.

نموونەی ئەلفییە:
قال محمد هو ابن مالك احمد ربي الله خير مالك
مصليا على النبي مصطفى وآله المستكملين

الشرفا...هتد.

زۆر لە کچ و کاڵ، لە دێهات و شاران لەبەر دەنگ خۆشی و نەزم ڕێکی و تەئسیر/ شەیدای دەنگەکە دەبوون، کە گوێیان لێدەبوو - بەتایبەتی کە شەو ڕادەشکا دەنگی خۆش زۆر بە تەئسیر بوو لە دڵی خەڵک.

**نوکتەیەک**

لە دەوروبەری ساڵی (١٣٤٠ی ز) مامۆستا مەلا عوسمانی خورمەڵەیی - لە تیرەی گەردی، کە لە مەلا چاکەکانی کوردستان و مەشهور بوو، لە گوندی ماجیداوە - لە کندێناوە - دەشتی دزەیی لیوای هەولێر - خاوەن مەدەرسە بوو، چ کات لە (٢٥) فەقێی کەمتر لا نەبوو - تاوەکو وەفاتی کرد، گوندی ماجیداوەش - ماجیداوەی خورشید عالم دوو بەشی کورد و بەشێکی عەرەب بوو، مامۆستا مەلا قادری قەڵاتە سۆران ئەوکات موستەعید بوو لەوێ، تا بڵێی فەقێیەکی زیرەک و دەنگ خۆش بوو، کە نۆبەتی دەورکردنەوەی: ئەلفیەی دەبوو ئەو شەوە خەڵکی گوندی دوو بەش نەدەخەوت، گوێیان ڕادەگرت لەو دەنگە خۆشە. ژنە عەرەبێکی خنجیلانە مێردەکەی ناوی: (حنظل) بوو، لەسەر ڕووی خۆی هەڵداوێشت و دەیگوت: خوا دەکا دەمری (حنظل) ئەمن مێرد دەکەم بە مەلا غادر دەنگ گەورە.

فەقێ عەلی بنەسڵاوەیی: بنەسڵاوە گوندێکی گەورە بوو لە خۆرهەڵاتی شاری هەولێر، نزیکەی (١٥٠) ماڵ دەبوو، ئەوسا کە مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئاشۆکەیی لەوێ مەلا بوو، خاوەن مەدرەسە بوو، لە مەلا چاکەکانی کوردستان بوو، ژنێکی زۆر بەدین و خواناسی هەبوو، ئەم فەقێ عەلییە کە خەڵکی گوندەکە بوو، پیرە دایکێکی هەبوو ناوی ڕەحان بوو، فەقێ عەلی لە خوێندن زۆر دەستکورت بوو، چی وا فێرنەدەبوو، بەڵام بە شەوان چاوی لە فەقێیان دەکردەوە دەوری دەکرد، تا دەنگی تیا بوو دەیهاڕاند و دەیوت: ئەرێ بابە، دوو سێ کەلیمەش هەموو جار لەبەرە خۆی دەیوت، جاروبار بانگی دایکی دەکرد دەیوت: ڕەحان دایکت دەگێم گوێت لە دەنگ و ئاوازمە؟ پلکە ڕەحانیش دەیوت ئا گوێم لێتە عەلی هەی دایکت بە قوربانی دەنگ و ئاوازت بێ - عەلی کوڕم دەنگی دەڵێی قاز و قورینگە. ئەم فەقێ عەلییە بەم دواییە مەشهور بوو بە: فەقێ عەلی جومعانە، واتە لەبەر هەژاری زۆری جومعانە دەکرد.

جومعانە: ئەوەیە کە دەچێتە لای ئەو کەسانەی کە لێوەشاوە و خێرخوازن، داوای یارمەتییان لێدەکرێ، بەو یارمەتییە دەوترا: جومعانە و ئەوەی داوای لێدەکرا زۆری پێ خۆش بوو، داواکەرەکەش پێویستی خۆی پێ دروست دەکرد.

**گواستنەوەی فەقێ لە مەدرەسەیەک بۆ مەدرەسەیەکی تر**

فەقێ لە هەر مەدرەسەیەک بایە، بە ئازادی خۆی بوو، هەرکات دڵی بڕەنجابایە لەو مەدرەسەیە - دەیگواستەوە مەدرەسەیەکی تر، چ سوختەبایە چ موستەعیدبایە، ئەگەر سوختەبایە جێگای لەلای موستەعیدێک دەگرت و وڵاغەکی دەهێنا و ئەسبابەکانی لێ باردەکرد و دەڕۆیی، ئەگەر موستەعیدبایە جێگای لەلای مامۆستای گەورە دەخواستەوە سوختەکانی خۆی وڵاغیان دەبرد و ئەسبابەکانیان دەهێنا، زۆرجاریش وا دەبوو لە شوێنەکەی خۆی تکایان لێدەکرد و دەیانگێڕاوە، وڵاغەکەی دەبردەوە بەبەتاڵی، یاخود دەیناردەوە: هۆی گواستنەوەی فەقێ ئەم شتانە بوو:

١. دەرس خوێندنی خەراب بایە و بەدڵی نەبوایە.
٢. یان دەرس لەو مەدرەسە زۆر بەفیرۆ دەچوو، بەهۆی زۆر سەفەری مامۆستا و یاخود کەمتەرخەمی موستەعید.
٣. یان لەگەڵ فەقێیەکی تر شەڕی دەکرد و خەتابار بوو بەو هۆیە دەریان دەکرد لە مەدرەسەکە.
٤. یاخود بەکچی فێنکایەتی و هەوا خۆشی بەرەو ناو کێوان دەچوو.
٥. یان لە گەرمیان بەرەو کوێستان یاخود لە کوێستان بەرەو گەرمیان.

ئەوساکە بۆ فەقێ قەدەغە نەبوو لە کوردستانی عیراق بۆ کوردستانی ئیران، یاخود بەپێچەوانەوە.

مامۆستایەکی زۆر باش هەبوو لە کوردستانی عیراق پڕ لە عیلم مەشهور بوو بە: تووڕەیی لەگەڵ فەقێیان، زوو زوو فەقێکانی دەردەکرد، جارێک لێیان پرسی مامۆستا تۆ بۆچ فەقێ دەردەکەی؟ لە وەڵامدا فەرمووی من قەت فەقێم دەرنەکردووە! بەڵام ئیزنم داون، وتیان قوربان جیاوازی چییە لە نێوان فەقێ دەرکردن و ئیزن دان؟ فەرمووی دەرکردن ئەوەیە: بڵێی بەفەقێ: بڕۆ لێرە مەمێنێ،

ئیزندانیش ئەوەیە: لە ماڵێ بی و نەچیە حوجرەی فەقێیان، ئەوانیش چەند رۆژێک کە بێ دەرس بوون و ماموستاش هەر لە ماڵەوە بەئەنقەست ناچێتە لای فەقێ و دەرسی پێ ناڵێت. مەجبوور دەبن ئەوساکە برۆن - جا - من هەروام کردووە و قەت بە فەقێم نەوتووە برۆ.

**سەردانی فەقێ بۆ ماڵی باوکی**

ناوە ناوە ئەگەر فەقێ موحتاج بایە بە خەرجی یان لیباس، هەینێ دەهاتەوە ماڵی باوکی، چەند رۆژێکی کەم دەمایەوە کارەکانی خۆی جێبەجێ دەکرد و دەگەڕایەوە مەدرەسە، لە مانگی رەمەزانان کە خوێندن نەبوو - فەقێ ئەگەر مەلایەتی رەمەزانی نەبایە دەهاتەوە ماڵێ، ئەو مانگەی لە ماڵێ رادەبوارد.

جەژنی قوربان دەهاتەوە ماڵێ بۆ جەژن کردن، یان نەخۆش بکەوتبایە دەهاتەوە تاکو چاک دەبووەوە، یاخود لە ماڵەوە تازیەکیان هەبایە، یاخود برایەکی خزمەکی نزیکی ژنی بگواستبوایەوە دەیان هەنارده دوای دەهاتەوە بۆ سەر شایی.

فەقێ هەبوو جارێک سەردانی ماڵێی دەکرد، هەبوو لە دوو مانگ، هەبوو لە شەش مانگ... من دیومە فەقێ هەبووە لە سێ چوار ساڵ ئینجا جارێک سەردانی ماڵی باوکی کردووە، وەکو فەقێی گەرمیان کە لە ئێران بیخوێندبایە یاخود هی ئیران کە لە عیراق بیخوێندبایە، یان هی کوردستانی تورکیا ئەم قلە قلەی هەبوون دەهاتن بۆ خوێندن.

من یەک لە باری خۆم زۆرجار وا رێک کەوتووە، یەک ساڵ یا دوو ساڵ یا (٨) مانگ، ئینجا جارێک سەردانی ماڵەودم کردووە، خوا لە مردووی هەموو لا خۆشبی - دایکم زۆری خۆش دەویستم، کە دەگەڕامەوە بۆ خوێندن دەچووە سەر ئاغەبان تەماشای منی دەکرد تاکو لەبەرچاوی بزر دەبووم، لە هاتنەوەشم کەسێ خەبەری بدابایێ مزگێنی پێدەدا، بەڵام بەداخەوە هەزاران جار بەداخەوە نەگەیشتە بەروبوومی من کە خزمەتی بکەم، لە ماددەی کتێبی شەرحە شەمسیم دەخوێند وەفاتی کرد لە ساڵی (١٣٦٢ی ک، ١٩٤٣ی ز) ئەوکات من موستەعید بووم لە گوندی ماستاوە.

**مانگی رەمەزان**

ماموستاکانی لادێیەکانی مەدرەسەی لێبایە لە مانگی رەمەزان دەرسیان نەدەوتەوە، مەگەر چۆنەها نەبێت، ئەویش دەرسی حەدیس یان شەریعەت، یان تەفسیریان دەوتەوە، گوندەکەشی بە نۆبەت هەر شەوێک ماڵێک پارشێوی بۆ دروست دەکردن، پارشێوەکی بە لەزەت و پیاوانە، هێواری سوختەیەک دەچووە ماڵەکە و دەیوت ئیمشەو نۆبەتە پارشێوی ئێوەیە، بۆمان بکەن، ئەوانیش دەیانوت بەسەر چاوان - چەند کەسن؟ فەقێیەکەش دەیوت ئەوەندەینە. ئینجا یان پلاو و گۆشت یان ناسکە نان، یان ناوسێرکە = پەپکە سوورە... لەکاتی کەبارکردن فەقێیەک دەچوو بە خەبەری دەهێنان و لەکاتی حازریش دەچوون خواردنەکەیان دەهێنا. عادەتەن بەر لە رەمەزان بەیەک هەفتە مەدرەسە چۆڵ دەبوو، فەقێ قاژیان دەکرد. ئەوەی سوختەی بوو، بۆ ماڵی باوکی تا هەفتەیەک پاش رەمەزان دەهاتەوە ئەگەر موستەعیدبایە مەلایەتی رەمەزانی نەبایە ئەویش دەچووەوە ماڵێ، ئەوەی مەلایەتی رەمەزانی هەبایە لە شوێنێک - گوندێکی بچووک کە بێ مەلابانایە یان هۆبە رەشماڵێک لە کۆچەرایەتی، ئەوا دەچووە سەر مەلایەتییەکەی - بانگ و کەباری بۆ دەکردن و لەگەڵ جەماعەت و تەراویحیش، ئەوانیش سەریان پێ چاک دەکردەوە و سەرفترەیان دەدایێ، واش دەبوو یارمەتی تریشیان پێدەدا بەخێر، وەکو زەکات، لە جەژنی قوربانیش دەچووەوە لایان و نوێژی جەژنی بۆ دەکردن، ئەمانیش جەژنانەیان بۆ کۆدەکردەوە و دەیاندایێ. فەقێ لە مانگی رەمەزان هێزی خۆی دەدا خوێندنەوەی قورعان. هەر لە ١٠ ختم تاوەکو ١٥ ختمی دەکرد. واش دەبوو ختمی هەدیە دەکرد بۆ خەڵک بەپارە.

مەلایەتی مانگی رەمەزان شتێکی گرنگ بوو بۆ فەقێ، چونکە بۆ پێویستی خۆی بەکاردەهێنا لە بابەت: لیباس و کتێب کرین، بۆیە مەلایەتی رەمەزان بە ئاسانی بەر هەموو کەس نەدەکەوت، بەڵکو واسیتەی باشی دەویست لە پیاوێکی گەورە کەوا خاتردار بایە و شوێنەکەی بۆ فەقێیە بگرتایە و یارمەتیان باش بدایە، ئەمەش یان گەورە دێیەک یان شێخێکی ناودار یان کاربەدەستەکی دەوڵەت.

من بەباری خۆم لەکاتی موستەعیدایەتیم سێ ساڵ مەلایەتی رەمەزانم چنگ کەوت، دوو ساڵ لە گوندی سماق شیرین لە وڵاتی کۆیە و ساڵێک لە زێبارۆک ناوچەی

شەقلاوە گوندی کوێخا ئیسماعیل خەیلانی.

حاجی شێخ رەشیدی لۆلان، کە لە پیاوە ئایینییە بەرزەکانی کورد بوو، لە چەرخی (١٤ی ک) دەستێکی باڵای هەبوو بۆ دامەزراندنی فەقێ بە مەلایەتی رەمەزان، هەر بۆیە فەقێی کوردستان لە ئێران و عێراق بەر لە رەمەزان دەستە دەستە دەچوونە لای ئەم زاتە و ئەویش نامەی بۆ دەنووسین بۆ سەرۆکی هۆبەکانی کۆچەر و خاوەن دێیەکانی بچووکی بێ مەلا لە کوێستانان لە دێهاتەکانی عیراق و ئێران، وا دەبوو پیاوی خۆی لەگەڵ دەناردن تاکو دادەمەزران، وا دەبوو فەقێیەک درەنگ دەچووە لای شێخ - کە لەوکات شوێنەکان هەمووی گیرابوون، یاخۆ تاکو فەقێیەکە دەچووە شوێنەکە بۆ مەلایەتی و کاغەزی شێخی دەبرد شوێنەکە مەلایان گرتبوو، ئەم جۆرە فەقێیانە دەهاتنەوە لای شێخی پایە بەرز دەمانەوە تاکو جەژن، کە ئەوانی دامەزراون دەهاتنەوە جەژنانەی شێخ چەندیان چەنگ بکەوتبایە لە مەلایەتییەکە، جەنابی شێخ ئەوەندەی دەدا ئەمانەی لەلای مابوونەوە مەلایەتییان چەنگ نەکەوتبوو.

یاوەری تایبەتی شێخ لەو چەرخەدا سۆفییەکی خۆی بوو ناوی سۆفی هەینی بوو، پیاوێکی عاقڵ و تێگەیشتوو بوو، خەڵک پێویستی خۆی بەوی رادەگەیاند و ئەویش بەبێ زێدە و کەمی بەشێخی رادەگەیاند، شێخ بۆی جێبەجێ دەکرد، جگە لە رەمەزانیش هەر ناگزورێک، فەقێیەک، مەلایەک، لێقەوماوێک رووی لەم شێخە بکردبایە نائومێدی نەدەکرد، بە راستی وەفات کردنی ئەم جۆرە پیاوە خەسارەیەکی گەورە بوو لە کورد و کوردستان و ئایینی ئیسلام و لێقەوماوان، ئەگەرچی کورێکی چالاکیشی لە شوێنە ناوی بەرێزی (حاجی محەممەد)ە، خوا تەمەنی درێژ بکات و دووری بخات لە ناخۆشی و نەخۆشی.

### سەردانی مەدرەسەکان بۆ لای یەکدی

ئەو مەدرەسانە ناوە بەناوە بەتێکرایی سەردانی یەکدیان دەکرد لە رۆژی دووشەم پاش نیوەرۆ تاکو رۆژی سێشەم کە دەرس نەدەبوو ئەوجا دەهاتنەوە، زۆر جاریش وابووە سێ چوار مەدرەسە لە مەدرەسەیەک کۆبوونەوە بۆ سەردان یاخود لە رۆژی پێنج شەم تاکو پاش نیوەرۆی جومعە.

### هۆی ئەم سەردانانە

١. چاوپێکەوتنی یەکتر بۆ خۆشەویستی.
٢. خەم رەواندنەوە و زەوق پەیدا کردن بەهۆی مەقام و شایی و بەستە و چەپڵەرێزان و بەزم و کەیف.
٣. موناقەشە و موباحەسە و مونازەرە، تاقیکردنەوەی یەکتر خۆ بەخۆیی تاکو بزانرێ کام فەقێ باشە و زیرەکە و شتی زۆر لەبەرە و کێ نەزان و تەمبەڵە. چونکە ئەم جۆرە موناقەشەیە وەکو ئیمتیحان وابوو، وتراوە.

بالامتحان - یکرم المرء أو یهان
أو عند الامتحان - یکرم المرء أو یهان

تا بەیانی خەوتن نەبوو هەر موناقەشە بوو، سوختە لەگەڵ سوختە، موستەعید لەگەڵ موستەعید... ئەو جۆرە شتە سوودی ئەوەندە زۆر بوو ناژمێردرێ، شتێک بە موناقەشە بهاتبایە بیر - وارسوخی دەبەست تا مردن لە یاد نەدەچۆوە. زۆر فەقێی تەمبەڵیش هەبوو لەسەرشۆری و چ نەزانی تانی لەخۆی دەدا و دەستی دەکرد بە باش خوێندن تاکو لە ئەنجامدا دەبووە فەقێیەکی باش، وانەبێ موناقەشە بەس لە سەردان کرابا، بەڵکو لە کۆبوونەوەی ئیجازەش زۆر دەکرا لە شەوانی سێ شەم و جومعەش خۆبەخۆیی هەروابوو، بەڵام زۆرییەکەی لە سەردانی یەکتر دەکرا.

دەستووری ئەم جۆرە سەردانە: کە چینی میوان نزیک گوندەکە دەبوون - ریز دەبوون دەست دەکرا بە مەقام و چەپڵە رێزان، ئەوەی خانەخێشی بەم حاڵە بە پیلیانەوە دەچوون. کە دەگەیینە یەکتر چاک و خۆشی و موسافەحە کردن....

بۆ ئێوارەش لەناو دێیەکە ئەوەی لێی بودشابایەوە شیویان لێ بەرادان دەدا - پلاو و گۆشت، هێواری کۆدەکراوە بە هەموولا دەیان خوارد و ئەوەی بشمابایەوە بۆ ماڵی داپیریان دەبرد. پێخەفی شەویشیان ئامادە دەکرد، لە ماڵان کۆیان دەکردەوە، ئەگەرچی خەو زۆر کەم بوو لەبەر موناقەشە و بەزم و مەقام و چەپڵە. زۆر جاریش وابووە لە کوردستانی عیراق - لیوای هەولێر دە دوانزە، مەدرەسە رێک کەوتووینە و تفاقیان بردووە، لە کژی بەهار چووینە سوڵتان عەبدوڵڵا لە قەراج، کە چاکێکی مەشورە، لە هەر ناوچەیەک شوێنێکی وا هەبووە بچنێ.

شێخ وسو رەحمان لە شەقڵاوە - شێرە سوار لە خۆشناو - دۆڵی ئەسحابان، حەمامۆک لە کۆیە - مێگر و

بێخاڵ لە ڕەواندز - ساز و سێوەکە، گۆڕی خانزاد لەسەر کێوی سەفین - کانی وەکازە لە کێوی قەرەچووغ، حوسێنێ غازی.

**کێخوای فەقێیان**

ئەو مەدرەسەی گەورەبایە و فەقێی زۆربایە - لەناو چینی سوختە گەورەکان، یاخود لە چینی موتەعەللیق فەقیەکی لێهاتوو و زەبەلاحیان هەڵدەبژارد - یەکی موستەهەق چوار پەل ئەستوور، بۆ سەرپەرشتی هەموو فەقێیەکان لە ئیشی مەدرەسە - لە بابەت ڕاتبە و قاپ بزر نەبوون و ئاگرپەیداکردن و چالێ نان و فیقە هێنان و ئاو هێنان، بە هەڵبژێراوەکەیان دەوت: کێخوا، هەر ئیشێک لە مەدرەسە نوقسان بایە و کەم و کوڕی هەبایە موستەعیدەکان یەقەی کێخوایان دەگرت.

**ئیشوکاری کێخوا:**

١. دابەشی ڕاتبە لە نێوان سوختەکان بە عادیلانە.
٢. نۆبەتە ئیش و ئاگر و چالێنان.

کێخوا بۆ کارەکان جەدوەلی دەکرد و ناوی فەقێکانی بە دەوری جەدوەلەکەدا دەنووسی ئەقرەبەیەکی (میلێکی ساعەتی)ی پێوە دەکرد و ڕۆژەکانی هەفتەی دەنووسی.

نۆبەتی هەر سوختەیەک بایە لەهەر ئیشێک ئەو ڕۆژە ئەقرەبەکەی دێخستە سەر ناوی فەقێیەکە. کێخوا لەلای مەلای گەورە و موستەعیدەکان دەستووری درابوێ، هەرچی بکات، کێخوا دەیتوانی لەسەر ناهەقی و گێچەڵ لە سوختە بدات، تا ئەندازەیەک ئەیتوانی سوختە دەریش بکات.

**ڕووداوێک:**

لە ساڵی (١٣٥٥یک) (١٩٣٦ی ز) گوندی قەڵاسنجی ژوور و - لە پاڵ کێوی سەفین، لە خۆشناوەتی نزیکەی ١٢٠ ماڵ دەبوو، (مامۆستا مەلا محەمەد ئەمین حوسێن) لەوێ مەلای گەورە بوو. نزیکەی ٣٥ فەقێی لێ بوو. قەڵاسنج گوندی میرانی خورشید بێک بوو لە تیرەی: میر مەحمەری - لە بەگزادەی خۆشناو خورشید بێک تا بڵێی پیاوێکی عاقڵ و سەخی و لێهاتوو بوو، سێ کوڕی هەبوو: نورەدین، کەمال، ڕەشید. فەقێ محەمەدی سۆفی قادر - گۆسکەی هەڵبژارد و کرا بە کێخوا، سوبیانەیەک کاری فەقێیەکانی ئامادە دەکرد و ڕێکی دەخست سوختەیەکی بچووک کە ناوی سەید مەغدید بوو، لەبەردەمی کێخوا هەرچەرخییەوە، کێخواش شەقێکی لە بن گوێی دا، دارێکی ئەستووریش لەوێ بوو... کێخوا قەڵەم و کاغەزی لە دەست بوو غافر بوو... سەید مەغدید لە ناکاو دارە ئەستوورەکەی لە تەوقی سەری کێخوای دا، شەقی کرد و خوێن بە گوێ وەربوو، لە هۆشی خۆی چوو... سەید مەغدیدیش هەڵات. وەستا حەسەن هەبوو لەوێ، کوڵکە تەبیبیەکی دەزانی و بە (٣) درهەم سەری کێخوای تیمار کرد بە ماوەی (١٥) ڕۆژ چاک بۆوە. خورشید بێک پارەکەی دا.

**ڕاتبەی فەقێیان**

لە گوندان و لە دێهات ئەو ماڵەی حاڵدار و سەخی بایە ڕاتبەی دەدا، سوبینانیش دوو نان یانخۆ نانێکی دەدا. ڕاتبە لە عەرەبییەوە هاتووە، مانای موردەتەبات و پێویستی ژیانە، لە شار و شارۆچکەکان ئەوەی مەیلی دینی هەبایە ڕاتبەیدەدا. ڕاتبە بریتی بوو، کەوا ئێواران قاپێ شیو و نانێکی دەدا، سوبیانانیش دوو نان یاخود نانێکی دەدا، ئەگەر ئێواران شیو نەبایە هەر نانیان دەدا، کەچی ڕاتبەی شاران بەس نیودرۆیان شیویاندەدا، ئەگینا هەر نانێک بوو ڕاتبەکەیان، ئەو ماڵانەی ڕاتبەیان دەدا دیار بوون. ماڵی کێخوا و گەورەی دێ لەگەنی قاپی شیویان گەورەتر بوو لە هی خەڵکی تر، نانیشیان پتر دەدا، لە زۆر شوێن ماڵی گەورەی دێ چەند فەقێ بانایە ئەوەندە نانەیان دەدا، وەکو ماڵی قەرەنیاغەی پەسۆی، هەمزاغای جەڵدیان، عوبێد بەگی باشوور، ماڵی میرانی قادر بێگی شەقڵاوە... ئێوارەی جومعە بەزۆری گۆشت و پڵاویاندەدا، ناوە ناوەش بایی ژەمێک گۆشت و برنج و ڕونیان دەنارد بۆ فەقێیان بۆ خۆیان بکەنە شیو، حەماغەی کۆیە چەند مەدرەسە لە کۆیە هەبایە، هەر مەدرەسەیەک چەند فەقێی تیابایە، ڕۆژی هەر فەقێ و نانێ، هەموو ئێواران هەر مەدرەسە و مەنجەڵێک شیو ئێوارەی جومعەش پڵاو و گۆشت، ڕەشید بەگی بێتواتەش وابوو، مامەند ئاغای سەرکەپکان، مەعروفی حاجی پیرداود ئاغای دزەیی لە دوو گوند مەدرەسەی هەبوو، هەموو فەقێیەکانی نانددا، حاجی خدری باجەلان لە قەراج بە خۆی و سێ کوڕەکەی، جەنابی مەلا فەندی

هەولێر پێویستی مەدرەسە و فەقێ بە هەقی حەمامەوەش لەسەرشانی خۆی بوو، جگە لە هەر سێ جەمەکە، معاشێکی بچووکی دەدا بە موستەعیدەکانی، ئێوارەی جومعە و سێ شەممەش پلاو و گۆشت یا دۆلمە، مالی حاجی قادری هەولێریش تەقریبەن مەسرەفی فەقێیان بە خۆیان دەدا.

بۆیێ مەلا سەعید عەبدوللای مەلا کاغەی کە فەقێ بوو، شاعیریش بوو ئەمەی دەوت:

**غەرەز لە قەلعە پلاو دۆلمە خواردنە**
**ناچم بۆ گوندان نانە رەق و مردنە**

مەدرەسەی مەلا فەندی لە قەلات بوو لە شاری هەولێر، خانەقای زانای ناودار شێخ ئەبوبەکری هەولێر و خانەقای بیارە هەموو پێویستی مەدرەسە، لەسەر شانی مالی ئەم شێخە بەرزانە بوو، بەلام ئەوەی سەرپەرشتیان دەکرد زۆر راست و هەق نەبوون لە راست فەقێیان، واتە سەرکاری مالی شێخ. بۆیە فەقێ دەیان وت:

ئۆف لە دەست فەقێ حەمدی هەولێر، میرزا حەمدی بیارە، نانی فەقێیان دەخۆن لە پێخۆر و لە پارە، فەقێ ئەحمەد سەرکاری جەنابی شێخ ئەبو بەکر بوو، میرزا ئەحمەدی بیارە بوو. زۆر جار فەقێ شکاتیان لێ دەکردن، کەچی سیاسەتیش دەکران لە لایەن جەنابی شێخەکان هەر عاریان نەدەنا.

ئەوجا فەقێ ئەو نان و شیوەیان کۆدەکردەوە و دابەشیان دەکرد، ئەوەی بشمابایەوە بۆ مالی داپیریان ئەبرد، ئەگەر فەقێ لە خواردن شتی شلیان بخواردبایە بە نان وەکو: دۆشاو، ماست، ئەوەی تکێکی برشاندبایە ئەبوایە لە دەورەی حوجرە جارێک بسورێت، تا دەگەرایەوە ئەوانی تر خواردنەکەیان کۆتایی پێ دەکرد، ئەگەر موستەعید بیرشاندبایە سوختەیەکی خۆی لە جیاتی ئەو دەسورا بە دەوری حوجرە، راتبە لەسەر شانی سوختە بوو.

دەبێ بزانین کەوا سەگ دوژمنی فەقێ بوو لە کاتی نان و شیو وەرگرتن لە مالەکە. فەقێ هەبووە لە راتبە (٥) قاپ شیوی هەلدەگرت هەر باسکێکی دوو قاپ یەکیش لەسەر سەری، زۆر جار شیوەکەی بەسەردا دەرژا. ئوسلوبی راتبە: ئێوارە و سوبیانە فەقێ ئەچووە بەر قاپی مالەکەی راتبەی دەدا و تا دەنگی تیا بوو دەی وت: راتبە رەحمەتو لێ بی.

ئەوکات مالەکە گوێیان لێ دەبوو گورج یەکێک لە مالەکە نان و شیوەکەی بۆ دەهێنا، بە زۆری وابوو ژن یا کچ راتبەیان ئەهێنا، لە شاران فەقێ بانگی نەدەکرد: بەلکو بە قایم لە قاپی دەدا و مالەکە کە گوێیان لێ دەبوو - گورج راتبەیان بۆ دەهێنا.

### میوانی فەقێیان

ئەگەر مەدرەسە میوانی بهاتبایە - ئەگەر میوانەکە سوختە بایە - ئەوساکە وەکو فەقێیەکان دادەمەزرا لە خواردن، شەویش پێخەفێکیان بۆ دەهێنا لە مالێک. ئەگەر میوانەکە موستەعید بایە، ئەوسا دوو سوختە دەچوونە مالێک، کە لێوەشاوە بێت دەیانوت: میوانمان هەیە لەنگەرییەک (قاپێکی گەورە) پلاومان بۆ بکە. مالەکەش مریشکێکیان سەردەبری بە پلاو و ترش (شلە) بۆیان لێدەنان و ئێوارە دوو فەقێ دەچوون دەیانهێنا و میوانەکە لەگەل موستەعیدێکی خۆیان دەیانخوارد، ئەوەی بمابایەوەش سوختەکان دەیانخوارد. ئەگەر میوانەکان زۆربانایە و فەقێی مەدرەسەیەکی تر بۆ سەردان بهاتبایە، ئەوساکە لە چەند شوێن شیویان بەرادان دەدا و بە تێکرایی دەیانخوارد.

جارێک موستەعیدێک مالی لە گوندی بوو برادەرێکی خۆی هاتە میوانی، موستەعید، کە سوختەی بە گوندی یەخست بۆ بە راداندانی شیو، سوختەکان زۆر ماندوو بوون و کەس لە گوند بۆیان نەکردن. لە پاشان بە تەگبیری موستەعیدێکی تر سوختەکان چوونە مالی موستەعیدەکەی خاوەن میوان. ئێوارێ، کە شیو هات و زانی هی مالی خۆێتیان نەیخوارد و وتی: زگم دێشی، زۆریش پەست و دل کز بوو.

### دەقنە

دەقنە، لەناو کوردەواری ولاتی سۆران بۆ ئەو شوێنەی ئەرز کەوا سەرەکەی توند بێت بەکاردێت، بەلام بنی شل بێ و کە ئادەمیزاد یاخۆ ولاغ پێی لەسەر دانا و قاچی بچێتە خوارێ و شتل بێ تێیدا. ئەم شتە بە زۆر لە کەژی زستان و لە بەهاردا روو دەدا لەناو زەوی و زار، کە سالێکی بەباران بێ، یاخود ئەرزەکە زەنەکاوی بێت و شل بێ.

دەقنە لەناو فەقێیان بەكاردێت بۆ "ئەو دێیەی كە فەقێی زۆر بێت نانی راتبە بەشیان نەكات و بچنە دێیەكی تری نزیك راتبە و نانی لێ كۆبكەنەوە. یاخۆ لە كوێستان زستانان لەبەر بەفر و سەختی راتبە زەحمەت بوو، ئینجا سەری زستان لە دێیەكە تفاق و شتیان كۆدەكردەوە بۆ ئەم زستان و سەختییە بەخۆیان چێشت و شت دروست بكەن و لەناو گوند نەگەڕێن". لە شاری سلێمانیش ئەمە عادەت بوو، كە سەری زستان دەقنەیان دەكرد و تا دەبووە كەژی بەهار، دەقنە دوو جۆر بوو. یەكەم/ دەقنەی ناوخۆ، هەروەكو باسمان كرد لەبەر ساردی زستان لە دێیەك یاخود لە شارێك لە كوردستان. دووەم/ دەقنەی خارجی (دەرەكی): فەقێ دەچوونە دێیەكی تر نانیان كۆدەكردەوە جگە لە دێیەكەی خۆیان، من بەخۆم دەقنەم لەم شوێنانە دیوە لە كاتی فەقێیاتیم.

١. لە ساڵی (١٣٥٦ك - ١٩٣٧ز) لە گوندی قەڵاسنجی ژوورووی دەقنەی گوندی قەڵاسنجی ژێریان دەكرد.
٢. لە ساڵی (١٣٦٣ك - ١٩٤٣ز) فەقێی گوندی هێلەوە دەقنەی گوندی عەلیاوەیان دەكرد.
٣. لە ساڵی (١٣٦٧ك - ١٩٤٧ز) فەقێی گوندی چۆمەزەردەڵەی گەورە دەقنەی گوندی شێخەیی و چۆمەزەردەڵەی خواروویان دەكرد.
٤. لە ساڵی (١٣٥٥ك - ١٩٣٦ز) من لە گوندی قەڵاسنجم دەخوێند رۆژێ هەر فەقێیەك نان و كەرتێكی بەر دەكەوت؟ راتبەی هەردوو قەڵاسنجمان دەكرد.

مامۆستایان دەیان فەرموو لە رۆژانی گرانی (١٣٣٧ك - ١٩١٧ز) فەقێ رۆژێ كەرتە نانێكی بەردەكەوت.

**دستووری خواردنی نان و شیوی راتبان**

ئەو نان و شیوەی كۆیان دەكردەوە لە راتبە دابەشیان دەكرد بە:

١. بۆ سوختەكان
٢. بۆ موستەعیدەكان، یاخۆ چەند حوجرە بایە دابەش دەكرا، كە دابەش دەكرا دەیان لێدەكرد، یەكەمجار مەرە چینێكی هەڵدەگرت، ئەوجا پاش مەرە ئەوجا قرە.

مەشهور بوو شت بە دە لێ كردن حەرام نییە، گوایە ئەمە ئیمامی شافعی دایناوە بۆ فەقێ. نموونە: دوو پشكە گۆشت لە راتبە بهاتبایە بەریز دەیان لێدەكرد، مەرە و پاشا مەرە دەیانبرد و دەیانخوارد، ئەوانی تریش بێبەش. زۆرجار وا بووە لەبەر خواردنی بێ گۆشت شەو كوێر بوون - ماوەیەك هاتوونەوە ماڵێ تاكو چاك بوونەوە چارەسەریان كراوە، بەزۆر وابوو یەك دوو نانی گەنم هاتووە هی ماڵی ئاغا، تیلم تیلم كراوە و دابەش كراوە، ئەم تیلمانەیان لەناو نانی جۆ ناوە - كردوویانە بە پێخۆر.

**داپیری فەقێیان**

فەقێ لە مەدرەسە پێویستیان بەم شتانە هەیە: جل شوشتن، قاپ و قاچاخ شۆرین، ئاو گەرمكردن لە كاتی ساردی بۆ دەستنوێژ و غوسل كردن، دروومان و پینە و پەرۆ...هتد، بەڵام لەناو كێوان و كوێستانان لەبەر كانی و رووبار فەقێ پێویستیان بە ئاوگەرمكردن نەبوو، هەروەها لە شارانیش داپیراتی نەبوو. بەس داپیراتی لە دێهاتەكان هەبوون بۆ مەدرەسە، خەڵك زۆر هەژار بوو، بە تایبەتی چینی رەنجبەر، خەڵك مەمنون بوو پارچە نانێكی چەنگ بكەوێ و منداڵی بیخوات. ئینجا فەقێ لە گوندی دەگەڕان ماڵێكیان دەستنیشان دەكرد، كەوا ئەو ماڵە پاكژ و خاوێن و نوێژكەر بێ. ئینجا ئەو ماڵە ناودەبرا بە: داپیری فەقێیان - فەقێیەكانیش ئەم نان و شیوەی، كە زیاد بوو لەبەریان دەماوە لە راتبە - بۆ ماڵی داپیریان دەبرد و ئەویش لەگەڵ منداڵەكانی دەیانخوارد، لەناو كێوان بەزۆری ماڵی مەلای گەورە دەبوونە داپیر، چونكە مەلاكانی ناو كێوان زۆر دەست كورت و هەژار بوون، بەڵام لە دەشتایی مەگەر بەهەڵكەوت با، ئەگینا ماڵی مەلا نەدەبوونە داپیر.

**رابواردن و ئیدارە كردنی فەقێی مەدرەسە بەگشتی لە مەدرەسە**

هەروەكو فەقێ خواردنی لەسەر دێیەكە و گەورەی دێیەكە بوو، لە شاران لەسەر شانی خێرخوازان بوو، لە هەندێ مەدرەسە لەسەر ملی یەك كەس بوو، وەك: بیارە، مەدرەسەی كاك ئەحمەدی سلێمانی، مەلا فەندی هەولێر. خانەقای شێخ ئەبو بەكر، ماڵی حاجی قادر دەباغ... هاوینان كە خەرمان هەڵدەگیرا پیاوی گەورە دێ، فەقێی ئاگادار دەكرد، فەقێش دەچوونە سەر خەرمانەكە و دەیانوت: خەرمان بەرەكەت، خاوەنەكەشی دەیوت: خێر و

بەرەکەت، چەندی دڵی لێبایەوە ئەیدانێ، لە جۆ و گەنم، ئەوانیش کۆیان دەکردەوە و دەیانفرۆشت لە کاتی پێویستی بەکاریان دەهێنا، بەهارانیش جومعانەی ناو هۆبە و گوندانیان دەکرد، (جیسک و بزن) کاور و حەیوان، زەکاتیان کۆ دەکردەوە و دەیانفرۆشت، هەروەها لە کەژی هاوینان بەتێکڕایی لە دێهاتەکانی دەوراوپشت دەغڵ و دانیان کۆدەکردەوە، لەناو کێوانیش وا دەبوو: مەدرەسە وەقفی هەبوو، لە رەز و باخ و باخچە و گوێز بەسەپانیان دەدا و بەشەکەی خۆیان دەفرۆشت. شەوانی جومعەش لە کژی پایزڕا لە مالان سوختەکان دەگەڕان بۆ جومعانە و دەیانوت: بەتێکڕایی: جومعانەی فەقێیان بچنە بەهەشتێ، ئەوانیش لە دێهاتەکان ئەم شتانەیان دەدانێ: هێلکە، داندۆک، شەکر، چا، هەرکەس بەگوێرەی دەسەلاتی خۆی، لەناو کێوان: مێوژ، لەتکە هەنجیر، هەنار، هێلکە... لە شاران: بەزۆری پارە بوو، چەند دوکانداری پیاویش هەبوون بەرۆژی جومعە فەقێ ئەچوونە سەر دوکانەکەی پارەی دەدانێ - جومعانە، هەبوو مانگانەی دەدانێ بەپێی توانا.

فەقێ لە نامەنووسینێ بۆ ئەو پیاوە گەورەی کە میوان دەبوو لە دیوەخان سوودیان وەردەگرت، بۆ زانین: لە سالی (١٣٥٠ک) ١٩٣١ز گوندی گردی گۆم لە ناوچەی کەندیناوە شەش مالێ بوو، هەشت فەقێیان هەبوو لە مەدرەسە خزمەتێکی زۆر جوان و باشیان دەکردن، رۆژێک فەقێیەک دەبێتە هاوڕێی کابرایەکی گردی گۆمی، فەقێیەکە مەتحیان دەکات، کەوا بە (٦) مالێ (٨) فەقێ مەسرەف دەکەن، کابراش دەلێ: برا هەشت نۆ فەقێی گەواد چییە خەلک مەسرەفیان بکات، واتە مەسرەفیان ئاسانە. فەقێیەکەش دەلێ: راستە، بەلام شەش حەوت مالی گەوادیش چ نییە. ئەم قسەیە لەناو فەقێیان بووە پەند و دەگەڕاوە.

**چای فەقێیان لە مەدرەسە**

چا تاکو سالی (١٩٢٠ی) زایینی لە کوردستان هەر ناوی هەبوو، دەیانوت لەلایەن کاربەدەستە گەورەکانی عوسمانی هەیە، لە مالی عەیان و گەورەکانی شار هەیە، دەیانگێڕاوە لە دیوەخانێک گەورەکە دەلێتە کابرایەک ئەم سەماوەرە پڕ بکە، ئەویش هەر ئاوی تێدەکا و لەبنی دێتە خوارێ، چەندی دەکات بۆی پڕ ناکرێت، تومەز ئاو لە عەمباری ئاگری دەکات، کابرا دێتەوە و دەلێ: گەورەم سەماوەرەکە قونی کون بووە - ئاو راناگرێ، ئینجا دەزانن کە کابرا ئاوی لە جێگای ئاگر کردووە. لە دیواخانەیەکی تر چا لەپێش پیاوێک دادەنێن سەیری دەکا و نازانێ چۆنی بخواتەوە، وا دەزانی ملاکە چایەکەی هی پێخواردنەوەیە، وردە وردە خەریکی دەبێ بە ملاکەکە چا دەخواتەوە و تێیهەلدێنی و لە دەمی دەنێ، تا وای لێهات ملاک ئیشی نەکرد و پێی لە دەما بکات، بانگ دەکات و دەلێ: وەرن بەزیادی بکەن، واتە چیتر بۆم ناکرێ بیخۆمەوە، بەلام یەختیاران دەیانوت: شەکری قەند خەلک دەیکرد و وردی دەکرد بە کەرە - دەیخوارد (نوشک)، یان بە هەرمیشک و ناسکەنانیانەوە دەکرد یان لە ئاویان دەکرد دەیانکردە شەکراو بەنانیان دەخوارد.

من لە دەوروبەری سالی ١٩٤١ز دەمدیت لە تەکیەی شێخی عەلیاوە مەولود دەکرا، قەندە شەکریان لەناو تەشت و مەنجەل دەکرد، دەبووە شەکراو کە مەولودەکە کۆتا دەبوو - بە جامیلکە شەکراوەکەیان بەریز دەدا بە خەلک.

ناو و دەنگی چا هەبوو لە کوردستان لە سالانی ١٩٢٠، بەلام رەنگی نەدیترابوو لە دێهاتەکان، باوکم مەلا عەلی زایەر - گێڕایەوە وتی تەمەنم پانزە سالان بوو لەگەل خالم حاجی رەحمانی حەوێز - گەورەی تیرەی پووکەسەری چوومە هەولێر - لە قەیسەری لەسەر دوکانێک دانیشتین پێی دەوترا: مەلا سەلمان - دۆستی خالم بوو، چاوم بەچا پەست کەوت لەسەر دوکان - بیرم لێکرد و وتم: ئەوە لە مەسینەی ئاو دەکەن گچکەشن بەشی دەستنوێژ ناکەن، بە دزی بە خالم وت: ئەوانە چن؟ وتی واللە منیش نازانم، دوایی خالم لە مەلا سەلمانی پرسی، مەلا سەلمان وتی: حاجی رەحمان ئەوە چاپەستە نەختێکی بۆ خالم باسکرد، لە پاشان وتی لە مالە مەئمورەکان و عەیانەکان چا هەیە، لەم چاپەستانە لێدەنێن، باوکم وتی ئەوە نزیکەی بیست سال بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی بوو.

لەکاتی حوکمڕانی عوسمانییەکان شاری هەولێر قائمەقام نشین بوو، لەگەل (موستەنتق)ێکی عەسکەری - لێدادەنیشت (موتەسەریف) لە کەرکووک دادەنیشت، (والی) لە موسل دادەنیشت، لە جیاتی پۆلیس دەوترا: (جەندرمە)، لە جیاتی عەسکەر و جوندی دەوترا: (زەبتیە/زەفتیە).

لە پاش ساڵی (١٩٣٠ز) چا پەردەی بەست، فەقێش دەستیان بە چا لێنان کرد - دیشلەمە، ڕۆژانی سێشەممە و جومعە چایان لێدەنا، بەڵام تا هات و پەردەی بەست، بووە هەموو ڕۆژانێ وای لێهات بووە ڕۆژێ دوو جار - سێ جار. چا بۆ خەو نەهاتن سوودی زۆرە کەواتە یارمەتی فەقێ زۆر دەدا بۆ موتالەعە و خەو نەهاتن، بەڵام چۆنیان لێدەنا؟

١. لەناو کێوان و کوێستانان دار و کوڵکەیان ئاگر تێبەردەدا و حەقچۆش یان لەبەر رادەکرد تاکو دەکوڵا و دەیانکردە چا لەناو چاپەست، بەم دواییانە سەماوەر پەیدا بوو چایان پێ لێدەنا.

٢. لە شاران رەژوویان لەناو مەقولەکە دەکرد و چاپەستیان لەسەر دادەنا و باوەشێنەیان بە مەقەبا لێدەکرد - تاکو دەکوڵا و دەیانکردە چا، وای لێهات سەماوەری بەدەسک و بەندوک پەیدا بوو، لە تەنەکە دروست دەکرا، بە قش و جێی ئاگر و رەژووی کون کون بوو، وای لێهات سەماوەری راستی پەیدا بوو، لە تەنەکە و لە مەعدەن، لەم ئاخیرە بووە هیتەر و غاز.

٣. لە دێهات لەبن هەیوانی حوجرە شیشەیەکیان نەوی لە دیوار دەکوتا، (کتری) یان پڕ ئاو دەکرد و بە شیشەکەیان وەدەکرد، کوورە سەرگینێکیان لە ژێر کترییەکە دادەمەزراند و ئاگریان دەدایێ، تاکو کترییەکە دەکوڵا، لەناو چاپەست دەیانکردە چا، ئاگرەکەشیان لەناو سێلێک، یان پارچە تەنەکە دەکرد بۆ سارد نەبوونەوەی چایەکە، کەوا: کتری و چاپەستەکەیان لەبەر رادەکرد و دوو بەردیشیان دەدا لایەکی سێرەکە تاکو لایەکی بەرز نەبێتەوە، لە مەجلیسی دایان دەنا و چایەکەیان دەخواردەوە بەپیاڵە لە پاشان سۆبەی تەنەکەی نەوت پەیدا بوو چایان لەسەر لێدەنا، وای لێهات سۆبەی بەرمیل پەیدا بوو، بە پێچکە و قورفە چا لێنان ئاسان بوو، دیومە لە ماڵان چایان لێناوە، دەرمان و ئاویان تێکەڵاو دەکرد لەناو مەنجەڵۆکێک - شەکریشیان تێدەکرد، تاکو دەکوڵا دەبووە چایەکی سووک بە مەلاکی شیو = ئەسکۆ لەناو جام و شتیان دەکرد. فریان دەکرد، شەکر و چا هەرزان بوو، تاکو ساڵی ١٩٤٢ز قەندی شەکر بە ٤٠ فلس بوو، هۆقەی چا ١٠ پاکەت بە ١٥٠ فلس بوو، لە پاشان لە ساڵانی ١٩٤٢ز شەکری ورد پەیدا بوو - شەکرە خێ - هەبوو سپی، هەبوو سوور، بەڵام لە پاش ساڵی ١٩٤٢ز عیراق بووە تەموین، تاکو هات شەکر و چا بەرەو گران بوون چوو، کیلۆی شەکری ورد چووە ٢٥٠٠.١ فلس. کیلۆی چا چووە ٥ دینار، قەند بە سێ دینار بوو، چا بۆ فەقێی مەدرەسە بە زەحمەت کەوت، تاکو ساڵی (١٩٤٧ز) تەموین هەر بەردەوام بوو، بەڵام لە سەرەتای (١٩٤٨ز) تەموین و بیتاقە هەڵگیرا و چا زۆر بوو و شەکر و چا هەرزان بۆوە.

## غەدر کردن لە فەقێی مەدرەسە

زۆر غەدر لە فەقێیان دەکرا، بەتایبەتی لەچینی سوختە و موتەعەللیق، بەڵام لەبەر ئەوەی مەبەستی خوێندن بوو، کە ببێ بە مەلا و خزمەتی ئایین بکات هەموو جۆرە غەدرێکی قەبوڵ دەکرد، زۆر لە فەقێیان بە ناهەق لە مەدرەسە دەردەکران، جاری وا هەبوو بە کۆمەڵ دەرکراون لەسەر ناهەق، زۆر دەرسیان دەچوواندن بە ناهەق، منداڵی مامۆستاکان - لە راست هەموو منداڵێک کز و لێدراو بوون و باوکی زەقەی چاوی دەهات دەنگی نەدەکرد، کەچی منداڵە مەلا زۆربەی لە راست فەقێیان زمانیان لە خەنجەر تیژتر بوو، جاروبار شەڕیش هەبوو، دەبایە لە فەقێ بدات و فەقێ دەست نەکاتەوە... دایک و خوشکی فەقێیان وەقفی خانەقا بوو بۆ منداڵە مەلایەکان، زۆرجار تەعەدایان لە موستەعیدانیش دەکرد.

هەشیان بوو کە باش بوون، بەڵام ئەم جۆرانە کەم بوون، دروونەی شکارتە، جەنجەڕ کردن و سواری جەنجەڕ، کا کێشان ساوار کوتان، قورکاری ماڵی مامۆستا، باراش هارین، سەرفترە کۆ کردنەوە، سەفەر کردن، لە هەندێ شوێن ئاو کێشان بۆ ماڵی مەلا، ئەوانە هەمووی لەسەر ئەسۆتی فەقێ بوو، بەڵام چ غەدر وەکو (یەختە)ی مەلا نەبوو، بەرازێک بوو هەرکات لە پێش چاوان، زمان پیس، بوختانچی، درۆزن، زۆربەی فەقێ بە درۆ و بوختانی یەختە دەردەکران.

لە شاران دیومە: فەقێ نابێ بەهاوینان لەسەربان بخەون یاخود دەبایە ماڵ خەوتنان بچنە سەربان بۆ خەوتن بەبێ دەنگ و هەست - ئەوە چ بووە، ماڵی جیران کچ و شتیان هەبوو لەسەربان دادەنیشتن و دەخەوتن، کەچی کچەکانیش بە ڕۆژێ چێڵە بەکەڵ بوون لە کۆڵانان، خاوەنیان سەرشۆڕ و بێ دەنگ، مامۆستاش زەقەی چاوی دەهات و حوکمی بەم جۆرە لەسەر فەقێیەکان دەکرد بۆ ئەو

جیرانانە، نەکو لە مامۆستا دڵگیر بن... دیومە مەلا ئیجازەی داوە - جیران نەیانهێشتووە فەقێ لە حەوشی مزگەوت شایی بکەن، نەکو کچە جیران لەسەربان تەماشا بکەن، خاڵم کچی خۆی پێ بەرزەوت نەدەکرا، بەڵام دەبایە فەقێ شایی نەکەن بۆ ئیجازە، مامۆستاش دەیفەرموو بڕۆنە سەحرا و دەرەوەی شار شایی بکەن. رەز و باخچەی مەلا دەبایە فەقێ خزمەتی بکات، توتن بەداوەوە بکات، ترێش لە باخچە نەخوات. بەزۆری ئەم ئیشانەیان بە فەقێ دەکرد و جەمە نانیشی نەدەدرایێ، زۆر جار لە ئیشی مامۆستا دەهاتەوە نانی راتبەی بۆ نەدەمایەوە.

زانیم مەلایەک سوختەیەکی سێ سەعاتە رێ ناردە گوندێک دار جغارەیەکی لوورکی لەوێ بەجێ مابوو بۆی بێنێتەوە، کە بەدوو فلوس بوو. مەلایەک نۆ سەعات رێ فەقێیەکی نارد بۆ تەنەکە نەوتێک، دوو عانەشی نەدایە لەوێ خەرجی بکات. ئەمەش دەبێ بزانرێ، کە هەندێ مامۆستا هەبوو بێ غەدر و زوڵم منداڵیان پیاو و ئینسان، مەلا سەخی و بەرێز و پیاو ئەگەر بڵێی چەم بێ چەقەڵ نابێ، بەڵام نەک چەمێک و هەزار چەقەڵ، خوالێیان خۆشبێ و گەردەنیان ئازاد بێ، فەقێش لەسەر ئەم حاڵەتەدا زۆر بە هەوەس بوون لەسەر خوێندن زۆر رێک و خاوێن بوون، تا بەو رادەیەی ئەگەر یەکێک خاوێن و باوێن بایە دەیانوت: دەڵێی کوڕە فەقێیە.

**هەندێ لە گەمە و سوحبەت و سەیرانەکانی فەقێیان**

لە کەژی بەهار فەقێ ئەم یاریانەی دەکرد: تۆپێنی جغز، سێ باز، یەک باز، سێنگە باز، نانی تۆپی، تۆپی هەرستی، تۆپی بەسوار بوون، گورز گورزانێیان دەکرد.

بە شەوی سێشەم و جومعە - کە فەقێ دەرسیان نییە لەم دوو رۆژە تاکو فەسڵێکی شەو دەچوونە شایی و دیلانە و بەستە و چەپڵە و مقام بوو، ئەم جۆرە شاییانەیان دەکرد لەگەڵ مقام و چەپڵە: شایی سێ پێیی - کە بەلای راست دەسوڕان، شایی چۆپەیی - کە بەلای چۆپە دەسوڕان، شایی چۆپەیی دوو جۆری هەبوو.

أ. چۆپەیی عادەتی.

ب. چۆپەیی لانکانی، شایی سوسکەیی، کە بەلای راست دەسوڕان بە سووکی، شایی ئایی شۆکێ، کە نەختێ لە یەکتر جیابوون و سەری پەنجەی یەکتریان دەگرت و بەلای راستەوە دەسوڕان مەیلە و بەسووکی، شایی تەمبۆڵە (هەڵپەڕین) دبچە ئینجا جاحێڵی گوندی دەهاتن و بەشداری شاییەکەیان دەکرد و کچ و کاڵیش لەسەربانان و لە کۆڵانان لە دوورەوە گوێیان دەدا مقامەکان و تەماشای شاییەکەیان دەکرد، سەر دڵیان لێی دەدا و جاحێڵی گێلمە - گێلمەی نازانی... هەر جۆرە شاییەک جۆرە مقامێکی تایبەتی هەبوو، جۆری کردنی شاییەکەش تایبەتی بوو.

مقامی شایی سێ پێیی: یەکێک دەیوت و ئەوانی تر بە تێکڕایی دەیان گێڕاوە، وەک:

هەروا دەڕوا شۆڕە شۆڕە
کەوای بەری تاقەی سوورە
ماچەکماندێ خوا غەفورە...

ئەم جۆرە مقامە بۆ ساوار کوتانیش بەکار دەهات.

شێوەی مقامی چۆپەیی بە هەردوو جۆرەوە - فەقێیەک مقامەکەی دەوت و ئەوانی تر بەتێکڕایی دەیانگێڕایەوە:

فاتێ زاڵمێ کیستانم دیتێ دیتێ
فاتێ زاڵمێ چەند بە بەفر و جلیتێ
فاتێ زاڵمێ مەمکی کێژوران قیتێ... هتد

شێوەی مقامی سووسکەیی، مقامی ئەو شاییەیان بەنیو شیعرەکانی "ئەلفیە"ی (ابن مالیک) دەگەڕایەوە یاخود بەحروفەکانی هیجایی.

شیعرەکانی ئەلفیە، بە شێوەیەکی سووک دەوترا، بە نەزمێکی تایبەت، یەکێک دەیوت و ئەوانی تر بە تێکڕایی دەیانگێڕایەوە.

كلامنا لفظ مفيد كاستقم
واسم وفعل ثم حرف الكلم
هتد...

شێوەی حروفی هیجاشیان بۆ بەکار دەهێنا، یەکێک دەیوت و ئەوانی تر دەیانگێڕایەوە:

الفەکی ئەن ولا ئەئەن - ئەدلە موئەیو ئۆیەن
بێ یەکی بەن ولا بەبەن بەبلەم و بەیو بۆیەن
تێ یەکی تەن ولا تەتەن - تەتلەم و تەیو تۆیەن
سێ یەکی سەن ولا سەسەن سەسلەم و سەیو سۆیەن...
هتد

شێوەی مقامی ئایشۆکێ یەکێک دەیوت ئەوانی تر دەیان گێڕایەوە:

ئایشۆکێ وەیشێ وەیشێ
کیژۆرێ وەیشێ وەیشێ
ئایشۆک کیژێ وەنەوشێ
کێ دەرێ بەمن ناشێ
دەبێ جوانم لۆڕاکشێ هتد...

شێوەی مقامی تەمبولە "دەبچە"، بەڵام وشەی دەبچە، عارەب بەکاری دێنن، ئەگینا کردنی شاییەکە هەمووی وەک یەکە:

هەسا پێدە پێدە - تەمبۆلە پێدە
دەچمە بەعشوکێ بەعزانوک رێدە
چەمێ بەعشوکێ چەمەکی قۆرە
بەخۆم لێچاندیە شترە گندۆرە
ماچەکمان بدێ ناسکە کیژۆرە.. هتد.

شێوەی شایی دبچە: کردنی شایی کە وەکو تەمبۆلە، بەڵام مقامەکەی بە عەرەبییەکی جلفەیی دەوترێ، فەقێیەک دەیوت و ئەوانی تریش بە تێکڕایی سەربەندەکەیان دەگێڕایەوە بە دووپات کردنەوەی (یەهدیە - یەهدیە - یەهدیە - خشفن وارد علی المیە)، ئەو سەربەندە بەتێکڕایی دەیان گێڕاوە.

یەهدیە و طومی طولج - شوفینە و دەطع جولج -
دطن علی زردومج - عطرب وەزویلەل حبە
یەهدیە ولابس عران - نشافت مەی الغدران.. هتد

فەقێ هەر چوار فەسڵی ساڵ شەوی جومعە و سێشەم ئەم شایی و بەزمانەیان دەکرد، بەڵام بەزستان پاش شایی و بەزم لە حوجرە تاکو نیوە شەو چەند جۆرە گەمەی تر هەبوون دەیانکرد.

زۆرجار لە گەمەکانی شەو ماممۆستای گەورە و گەورەی دێیەکەش بەشدار دەبوون، جگە لەمە و زۆرجاریش خەڵکی لادێیەکەش دەهاتن، لەم یاریانە:

میر و گزیرانێ، تەڵە و ڕێویانێ، کارە مستانێ، تەقیلە لەسەر تەقیلە، فڕی فڕی قەل فڕی، قەل و پاشایانێ = قەل و مۆشێیانێ، مێش برینەوە، هەوێز ماڵین، دۆشاو فرۆشتن، ئەنگوستیلە شاردنەوە، پەلەپڤانێ - لەناو کێوان.

ئەم شتانە فۆلکلۆرە، نابێ گوم بێن، دوژمن زۆری پێ خۆشە کەوا کورد فۆلکلۆری باب و باپیرانیان لە یاد بچێتەوە و نەیزانن، بەڵام خەیاڵیان خاوە.. چونکە بای زانین هەردەمێنێن. بەداخەوە زۆر شتیش بە هەڵە وەردەگیرێ، پێویستە لە زانایان بپرسن - نابینی لەبەر نەپرسین لە زانایان چیرۆکی: لاس و خەزار بەناڕێکی و هەڵەیی بەکاردێت.

لاس کوڕی ئەحمەد بەگی شارەزوورە، کەچی دەڵێن لاس باڵەکییە خەزارە شۆڕی مەلا نەبی باڵەکییە، کەچی دەڵێن شارەزوورییە، خەزار بەمێرد درابوو - کەچی ئەو باسە هەرناکەن - بە فەقێی ناوچەی بادینان دەوترا: فەقێی ژێ، ئەمانە زۆر باشیان دەخوێند و زیرەک بوون، بەڵام ژمارەیان کەم بوو. لە سۆران، تێکەڵاوی گەمە و سوحبەتی فەقێ سۆرانییەکان نەدەبوون، زۆر هیشک و ڕەقەکار بوون، هەردەم مەیلە و سۆفیانی خۆیان هەڵدەخست، بەڵام لە زیرەکی ئازابوون، تەنانەت لەبن جێگای خەوتن دەوریان دەکردەوە، بە زۆری ئەم فەقێیانەی ناوچەی بادینان لە ناوچەی سۆران ژنیان دەهێنا و دادەمەزران و دەبوونە مەلا.

### کاتێ فەقێ خوێندنی تەواو کرد

فەقێ کە دەگەیشتە ئاخیری ماددە، چەند کتابێکی دەما بۆ تەواو کردنی (١٢) عیلم، دەچووە خزمەت مامۆستایەک لە مەلا چاک هەرەباش و ناودارەکان، جێگای دەخواستەوە بۆ خوێندنی ئەوەی کە ماویەتی و بۆ وەرگرتنی ئیجازە، لە خزمەت ئەو مامۆستایە دوو ساڵ دەماوە، یاخود ساڵێک و نیو دەرسی لە خزمەت دەخوێند، بەم ماوەیەش مامۆستا تێدەگەیشت ئایا ئەم فەقێیە لیاقەتی مەلایەتی هەیە یان نا؟

زیرەکی چۆنە؟ چونکە مەلایەتی زەحمەتە، ئەبێ بتوانی مەدرەسە و فەقێ ڕابگری، فتوا بزانی، سەری لە شەریعەت دەربچێ، ئەگینا ئەگەر مامۆستا ئیجازەی بداتێ ئۆباڵی لە ئەستۆی ئەوە، دەبایە بزانێ ئەم فەقێیە دەتوانێ ئیدارەی گوندەکە بکات و لەگەڵ خەڵک ڕێک بکەوێت.

### چەند ڕووداوێک لەم بابەتە

دێیەکی گەورە هەبووە مامۆستایەک لەوێ ئیمام و خەتیب بووە، دێیەکەش دوو گەڕەک بووە، گەورەی گەڕەکێک دوو برا بوون: هەمزە و عەباس، سەرۆکی گەڕەکەکەی تریش ناوی مام (باپیر) بووە، مامۆستا هەمووجار لە خوتبە دەیفەرموو (والحمزة والعباس) سەلامی

بۆ دەناردن لەدوای پێغەمبەر (د.خ)، چونکە هۆردووک مامی پێغەمبەر بوون (د.خ). مام باپیر ئەمەی لە دڵ گران بوو، گەڕەکەکەی خۆی خڕ کردەوە و وتی خزمینە دیارە مەلا، هەمزە و عەباسۆکی لە ئێمە خۆشتر دەوێ، لە هەموو جومعەیەک ناویان دەیەنێ، ئەمجارە ئەگەر مەلا وای کرد ئەوەی خزمی منە بە تێکڕای مزگەوت بەجێ بێڵێ و مەلا مەلای ئێمە نییە، کابرایەکی خێرخواز ئەم قسانەی بەمامۆستا ڕاگەیاند، چەندی مەلا وتی باوکم هەمزە و عەباس مامی خۆشەویستن، من دەگەڵ هەمزە و عەباسی گەڕەکم نییە، بەڵێ سوودی نەبوو.. ئینجا ئیشەکە گەورەبوو، بڕیاردرا ئەگەر لە خوتبە ناوی مام باپیر بێنێ (٣٠) بزنی بداتێ، ئەگینا مەلای ئەو گەڕەک نییە، ئیشەکە ماوە ڕۆژی هەینی. لە جومعە مام باپیر چووە بەردەمی توترکا چاودنواری خوتبەبوو، ئەز قەزا ئەو ڕۆژەش دوو فەقێی تێگەیشتوو لە مزگەوت میوان بوون، مەلا کەوتە ئەمری واقیع: ئەگەر باسی مام باپیر دەکا ئەم دوو فەقێیە تێدەگەن و حەیای دەچێ، ئەگەر باسیشی ناکا گەڕەکەکی گوندەکەی لە کیس دەچێ، ناچار لە خوتبە ڕووی کردە فەقێیەکان و وتی: أسكت أسكوتون ايها الفقهاؤن المعز ثلاثون لكم عشرة ولي عشرون.

ئینجا دەستی پێکرد و ڕووی لە مام باپیر کرد ووتی: أيها المام باپیر إنك لدب كبير مأواك جهنم وبئس المصير...

٢. فەقێیەکی زۆر زیرەک هەبوو، عیلمەکانی هەموو خوێندبوو، بەڵام نەختێ نەفام و نەزان بوو، داوای ئیجازەی لە مامۆستا کرد، مامۆستاش وتی: ڕاستە مەلای، بەڵام ئیدارە نازانی، ماوەیەک عیلمی ئیدارە بخوێنە... فەقێ تووڕە بوو و وتی: تۆ ئیجازەم بدێ قەیدی ئیدارە ناکات.. بەهەرحاڵ ئیجازەی وەرگرت و بەرەو ماڵ گەڕایەوە، لە ڕێگا لە دێیەک میوان بوو، ڕۆژی جومعەش بوو دێیەکەش مەلایەکیان هەبوو هەر ئەوەتە مەلا بوو نزیکەی (٣٠) ساڵ دەبوو مەلای دێیەکە بوو، بەڵام بۆدیەکی ڕێکی هەبوو، بەشان و عەبا ڕدێنێکی جوان... خوتبەی هەموو بە غەڵەت دەخوێندەوە لە ئایەت و حەدیس... مەلای میوانیش کە تازە ئیجازەی وەرگرتبوو لێی هەڵساوە، وتی: کوڕە مەلا هەمووت غەڵەتە ئایەت و حەدیسەکان، ئەمە جائز نییە، نوێژ لەدوات دروست نییە و هانی خەڵکەکەی دا، کە نوێژ خەلاس بوو مەلای دێیەکە وتیە خەڵکەکە قاپی مزگەوت داخەن ئیشم هەیە، ئینجا ڕووی لە خەڵکەکە کرد، وتی خزمینە ئەمە (٣٠) ساڵە من مەلای ئێوەم، کەس غەڵەتی لەمن گرتییە؟ ئەو میوانە بوختانم پێدەکات، یان بە دوعا مەلاتان نیم یان مارکوژی کەن ئەمە شەیتانە.. ئینجا خەڵکەکە کەوتنە گیان مەلای میوان مارکوژیان کرد و دەریان کرد، نانیشیان نەدایێ.

مەلا گەڕایەوە لای مامۆستاکەی دەستی ماچ کرد و وتی قوربان قسەی تۆیە من نەزانم لە عیلمی ئیدارە، ئینجا نزیکەی (٦) مانگ ماوە، عیلمی ئیدارەی خوێند، هەمسا گەڕایەوە گوندەکە، بەڵام بەرگی خۆی گۆڕیبوو، کەس نەیناسییەوە، دیسان کاتی خوتبەی جومعە بوو، مەلای میوان سەری لە بن گوێی ئەمەی لای ڕاستی ناو وتی: پیری تەریقەت هاتوویتە خەونم (چونکە دێیەکە عائیدی شێخێکی بەدین و باش بوو) فەرموویەتی: هەر کەسێ لە ڕۆژی جومعە موویێک لە ریشی مامۆستا بکاتەوە بەبێ پرسیار دەچێتە بحێشت (بەهەشت)، من بۆیە هاتوومە ئێرە دەشقە خوا ئەم خێرەم دەس دەخات، بەمەی لای چەپیشی هەر وای وت، هەتا خوتبە خەلاس بوو هەموو خەڵکەکە تێگەیشتن، لە دوای خوتبە بە تێکڕایی وتیان، نوری پاک حەبیبە سەلەوات، هەڵسان و مەلایان لە ئەرزدا، کەوتنە هەڵقەناندنی سەر و ریشی تاکو هەموویان هەڵکێشا و دەم و گیانی ببووە خڵتانی خوێن هاوار و ڕۆڕۆشی سوودی نەبوو: هەر دەیانوت حەبیبی عالەم ڕەسولە سەلاوات، ئەمری پیری تەریقەتە. مەلای میوانیش لە دوور ڕاوەستابوو پێدەکەنی و دەیوت: ئەوها تۆڵەت لێ دەسەنم.

## چۆنیەتی ئیجازە وەرگرتنی فەقێ

فەقێ بەر لە ئیجازە وەرگرتنی، بەخۆی دێیەکی دیاری دەکرد، کە لێی ببێتە مەلا - یاخود مامۆستاکەی دێی بۆ دیاری دەکرد، لە دێیەکە دوو حوجرە و هەیوانەکیان دروست دەکرد بۆ مەدرەسە و فەقێ، خانوویێک بۆ مەلا.

یەکێکیش یان خزمی خۆی، یاخود لە خێرەومەندێک کچێکی پێشکەش دەکرد بۆ مەلا ژنایەتی، ئەو کەسەی کە

بەخێـر و پیـاوەتی کـچی دەدا ئەو مـەلایە بە زۆری وابوو ژنەکە خەریووشە و نەتەچاو و ناشیرین بوو، هەر بۆیێ دەماندیت زۆربەی مەلا ژنەکان نەتەچاو بوون، مەشورە: کە شتێ بەخێر بدرێ نەتەچاوە. فەقێی هەژار نزیکەی (٢٠) ساڵی دەخوێند، جگە لە دەربەدەری و هەژاری و دەس کورتی ئینجا پێی دەوترا مەلا، کەچی ژنە - بەشەوێک پێی دەوترا مەلا ژن.

**سوودی مامۆستا لە ئیجازەدان**

١. خێری قیامەت.
٢. پێگەیاندنی ئەم فەقێیە بۆ مەلایەتی.
٣. بەو کۆبوونەوەیە شەوقێکی زۆر پەیدا دەبوو بۆ خوێندنی فەقێ.
٤. ناو و دەنگەکی زۆر بۆ مامۆستای ئیجازەدەر لەناو خەڵک و عەشایر.
٥. بەو کۆبوونەوەیە و بەزم و سوحبەتە، فەقێ زەوقیان زێدە دەبوو لەسەر خوێندن، هەودسیان بەخۆ دەهات.
٦. زۆر لە مامۆستاکانی ئیجازەدەر - دەس کورت بوون - بەهۆی ئیجازە ئەشیایان بۆ دەماوە و ئیدارەیان پێدەکرد.

**کۆبوونەوەی ئیجازە و**
**تەدارەکی ئیجازە و رەفتاری خەڵکەکە**

پاش رێکخستنی تەدارەکی ئیجازە لەلایەن مامۆستا. ئینجا دەست دەکرا بەنامە ناردن بۆ مەلا و فەقێ و گەورە پیاوان، نامەکان دەنووسرا و مامۆستا ئیمزای دەکرد و لەناو زەرف دەنرا و سوختەکانیش دابەشیان دەکرد لە شار و دێهاتەکان و مەدرەسەکان، شێوەی نامەکەش بەم جۆرە بوو.
بۆ جەناب ملا...... پاش ٩٠٠ عرج سلام و احترام - لفلان رۆژ.... بخوتو بفقییکان تشریفتان بفرمون بو ئیره بو دەعودت ئیجازە، بهاتنتان کیف خوش دبین.
والسلام امام ومدرس گوندی.......
شێوەی نووسینی کوردی جاران ئەوهابوو، بەم دواییە نیشانە و شت بۆ پیتەکان دانران، لە سەرەتای نامە ئوسولبو ٩٠٠ دەنووسرا لە جیاتی بسم الله، چونکە نامە و شت فرێ دەدرا و دەکەوتە ژێر پێیان، خەڵک گوناحبار دەبوو، ئینجا لە رۆژی میعاد هەر مامۆستا بوو لەگەڵ فەقێیەکانی خۆی بەرەو شوێنی حەفلەکە دەهاتن، ئەوساکە هەموو بەپێیان بوون، هەر چینێک کە دەگەیشتنە نزیک گوندەکە - رێز دەبوون و دەستیان دەکرد بە چەپڵە رێزان و مقام و قەسیدە، بەرەو پیلیان دەچوون کە دەگەیشتنە یەکتر دەس دەکرا بە ماندوونەبوونی یەکتر لەگەڵ موسافەحە کردن، هەموویان بەیەکەوە دەگەڕانەوە - کە دەگەیشتنە گوندەکە هەموویان دەستی مەلای گەورەیان ماچ دەکرد و دادەنیشتن چا و جغارەیان دەدرایێ - بەزۆری وابوو چینی مەلا و فەقێ و مەدرەسە بەشەو دەهاتن، یاخود سوبیانان بە فێنکی دەگەیشتنەجێ.

**کاتی سوحبەت و سەیران لە ئیجازە**

سوبیانان پاش نان خواردن دەست دەکرا بە: بەستەو حەیران و لاوک و ئەشعار و شایی - بەهەمە جۆرەکانی شایی کە دەبووە پاش کێشتان لە مزگەوت مەجریس دادەمەزرا ئەگەر بەهار بایە لە دەرەوە دادەمەزرا، یان لە حەوشی مزگەوت یان لەسەر جێگای جۆخینان، تەمسیلی پاشا دەکرا لەم شوێنانەی کە عادەت بوو دەکرا، نیوەڕۆ بەتاڵ دەکرا و دەس دەکرا بەنان خواردن، پاش نان و چا تاکو دەمی عەسر شایی و مقام و چەپڵە لێدان و بەستە و شیعر بوو، پاش عەسریش هەمسا تەمسیلی پاشا دادەمەزراوە، ئەگەر لەناو کێوان بایە - لەبن دار و گۆڕایی دادەمەزرا - سەعاتێک بەر لە خۆرئاوا هەموو لە هەموو بە پاشاوە بە چەپڵە رێزان و مقام و بەستە و قەسیدە لە دەورەی دێیەکە دەسوڕان، کە دەسوڕان پاشا و دکتۆر و وەزیران لە پێشوو، لە دوای ئەمان مەلاکان ئەوجا موستەعیدەکان ئینجا خەڵکی تر، خۆرئاوا دەبوو نوێژ دەکرا و نان ئامادە ئەبوو... (بەڵام لە شاران مەجریس و شت لە حەوشی مزگەوت بوو یان لەناو مزگەوت). پاش نان خواردنی ئێوارە، دیسان شایی و سوحبەت و چەپڵە و مقام و بەستە بوو، پاش نوێژی عیشا مەجریسی، مەجلیس) دەبەسترا - نۆبەتی گەمە و تەمسیل و سوحبەت کردن بوو تاکو دوو بەشی شەو دەڕۆیی. واش دەبوو دیسان پاشایان دادەمەزراندەوە، بۆ پاش نیوەشەو ئینجا هەندێک دەخەوتن، بەڵام زۆر وادەبوو چینی گەنج و سوختەکان خەوتنیان نەبوو.

# تەریقەتی قادری لە هەولێر

ئامادەکاران:
عەبدوڵڵا سەید محەمەد شێخ عەبدولکەریم دارەخورما،
محەمەد مستەفا هیرانی، سەعد نەجمەدین شێخ کاکە

**پێناسەی تەریقەت:**

کاتێک کە بمانەوێ پێناسەی تەریقەت بکەین پێناسەو لێکدانەوەی زۆر هەن، ئەمانەش لەبەر قووڵی و فراوانی و بێ بنی ئەم دەریایە پڕ لەدوڕو گەوهەرەیە. وشەی تەریقەت لەزمانی عەرەبیدا واتە (ڕێگا- ڕێباز، بەڵام لەڕووی زاراوە، واتە ڕێگای پیرۆزی ئیسلام و ڕێگای حەزرەتی ڕەسوڵ الله (د.خ) بەمەبەست ڕێگای خوداناسینە.

هەروەها هەندێک لەزانایان دەڵێن تەریقەت ئەم ڕێگایەیە کەداوای بێگەردکردنی دڵ دەکا لەجۆرەها نارێکی و نالەبارییەکانی کە لەبنەڕەتەوە لەگەڵ شەریعەت و ئایین ناگونجێن. هەروەها داوا دەکا، خودا بەیەک و بەتەنها بناسرێ، ئەوەش بەدووربوونەوە لەهەر کارێک کەببێتە هۆی نارەزایی خودای گەورە.

هەندێکی تر لەزانایان دەڵێن تەریقەت ئەم ڕێگایەیە، کەداوا لەسالک دەکات بەژیانێکی دوور لەخۆشییەکانی دنیا ڕازی بێت و بەرگەی ناخۆشی و ژان و شەونخوونی بگرێت.



**شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما**

مامۆستا سەعیدی نەوردسی، کە ناسراوە بە (بدیع الزمان) دەربارەی تەریقەت دەدوێ و دەڵێ: بریتییە لەچەند حەقیقەتی ڕەوحانی پیرۆز، کە پڕن لەتام و لەزەت و نووریان لێ دەدرەوشێتەوە.

ئەگەر تەماشای تەریقەت بکەین لەلایەن پراکتیک دەڵێین: تەریقەت ئەو ڕێگایەیە کە داوا دەکات دڵەکان خاوێن بکرێنەوە لە ژەنگ و ژاری گوناه و خوو خدە ناپەسندەکان، بەخوو وڕەوشتی جوان برازێندرێتەوە، مەبەست سوننەتی پێغەمبەرە (د.خ)، بەشێوەیەک ڕێڕەو (سالک) دەگاتە پایەیێ کرۆکی کاری هەق و ناهەقیان لا دیار و ئاشکرایە. هەست بەنهێنییەکانی ئایین و ڕووناکی و نووری کردەوەی چاک و تاریکی و ناشیرینی کاری حەرام و بیدعەت و کردەوەی ناپاک دەکەن، دڵیان ڕووناکەو بەچاوی دڵ گەلێ شتیان لا ئاشکرا دەبێت.

**تەریقەتی قادری**

تەریقەتی قادری لەژێر دروشم و ناوی شێخ عەبدولقادری گەیلانی زۆر پەردی سەندووە. ئەم تەریقەتە پێش شێخ عەبدولقادری گەیلانی هەبوود، بەڵام بەم ناوە نا. شێخ عەبدولقادری گەیلانی یەکەم کەسی پەیڕەوی تەریقەت نییە. دوای ئەوەی زاتی گەیلانی هاتە ناو بازنەی تەریقەت و تەمەسوکی لای شێخ (ئەبو سەعیدی موبارەکی مەخزومی) وەرگرت، بەهۆی ماندووبوون و شەونخوونی و خۆ تواندنەوەو قاڵبوونەوە لەدەفری خودا ناسی و گەیاندنی ئەم پەیامە بۆ دڵ و دەروونی ڕێڕەو (سالک)ی تەریقەتەکە بەناوی ئەو زاتە ناسراو ناوبانگی دەرکرد.

گەیلانی ناوی تەواوی (شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ موسا کوڕی شێخ عەبدوڵلا گەیلانییە) لەساڵی (٤٧٠)ی کۆچی لە نیقی سەر بەشاری گەیلان لەدایک بووە بە (الغوث الاعظم) و (الباز الاشهب) و (پیری گەیلانی) ناوی دەرکردووە. سیلسیلەی نەسەبی دایک و باوکی دەگەڕێتەوە سەر حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ).

دوای سەرهەڵدانی تەریقەتی قادری بەم ناوە نوێیەو پەیدابوونی مامۆستایەکی وەکو گەیلانی کە لەمەیدانی خودا پەرستی و خودا ناسین وێنەی نەبوو، شێخ عەبدولقادری گەیلانی مزگەوت و تەکیەو حوجرەی دەرس وتنەوەی دروستکرد، بەم شێوەیە چرای تەریقەتی قادری هەڵگیرساو پرشنگی بۆ هەموو لایەک دا.

بارەگای گەیلانی بووە شوێنی بلاوکردنەوەی تەریقەت و شەریعەت. لەهەموو لایەک بەرەو رووناکی مۆمی پرشنگداری ئەم زاتە دەهاتن و بەرەکەتیان وەردەگرت. بەسەدان هەزار گوناهبار لەسەر دەستی ئەم زاتە تۆبەو بەیعەتیان وەردەگرت و وازیان گوناه و سەرپێچی خودای گەورە دەهێناو بەرەو باوەشی ئیسلام دەگەڕانەوە. جوولەکەو گاورەکانیش لەهێزی بەرەکەتی ئەم زاتە بێبەش نەبوون و بەهەزارانیان لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بوون. تەریقەتی قادری تەنها پەل و پۆی بۆ وڵاتی موسڵمانان نەهاوێشت، بەڵکو پیاوانی تەریقەت بەرێگەی رێبواری و بازرگانی بەرەو ئەو شوێنانەش دەچوون، کەموسڵمان نەبوون، بانگەوازی موسڵمانەتیان لێ بلاودەکردەوە.

شاری بەغدا ئەو کاتە ببووە مەرکەزێک لەهەمووولایەک قوتابی زانست و عەودالانی رێگای خوداو شەیدایانی تەریقەت بەرەو رووی دەهاتن و لەبارەگای گەیلانی ئۆقرەیان دەگرت.

دەروێش و خەلیفە و خۆشەویستانی شێخ لەهەموو لایەک بلاوبوونەوە، بۆیە ئێستاش هەر شوێنێک موسڵمانی لێبێ ئەوا تەکیەو شوێنکەوتووانی تەریقەتی قادری لێیە.

تەریقەتی قادری بریتییە لەپەرستنی خوداو ناسینی بەتاکە پەرستراوو خۆشەویستی پێغەمبەر (د.خ). بەگوێرەی ئەم ئایەتە کەدەفەرمووێ: (من يطع الرسول فقد أطاع الله) شێخ عەبدولقادر دارو دەستەو دەروێشانی بەوە ئامۆژگاری دەکرد، دەیفەرموو (اعبدوا الله واستعينوا على عبادته بالكسب الحلال)، هەروەها داوای لێدەکردن، کە لەهەر شوێنێک بن زکرو فکری خودا بکەن و ئەمر بکەن بەچاکەو نەهی بکەن لەخراپە. شێخ عەبدولقادر ساڵی (١١٦١)ز لەشاری بەغدا کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەشی هەر لەو مزگەوتە نێژراوە، کە تێیدا تەریقەتی دەدا بەخەڵک و دەرسی تێدا دەوتەوە و ئێستاش مزگەوتەکە لە بەغدا ماوە و هەر بەو مزگەوتی گەیلانی بەناوبانگە.

**تەریقەتی قادری لە کوردستان**

دوای پەیدابوونی تەریقەتی قادری و گەیشتنی پەل و پۆو چڵی لەرێگەی کەڵەپیاوانی ئەم رێگایە بۆ هەموو شوێنێک، کەوەکو سەربازێکی نەناسراو، شەوو رۆژ، بەبێ هەست کردن بەماندووبوون، بەدڵسۆزی بۆ بەدەست هێنانی رەزامەندی خودای گەورە هەوڵیان دەدا. بۆیە تۆوی تەریقەتی قادری بەر هەموو خاکێک کەوت و کوردستانیش پشکی شێری بەرکەوت.

ئێمە ئەگەر بمانەوێ باسی پەیدابوونی تەریقەت بکەین دەبێ بگەڕێینەوە بۆ مێژووی هاتنی بنەماڵەی سەید زادەی نەوەی پێغەمبەر (د.خ)، ئەو کاتە لەبەر باری ناخۆشی دوورگەی عەرەبی و هەروەها بەمەبەستی زیاتر بلاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام نەوەکانی پێغەمبەر (د.خ) بلاوبوونەوە و هەر هەندێکیان بۆ شوێنێک چوون.

(شێخ یوسف-ی هەمەدان) یەکێکە لەنەوەکانی حەزرەتی حوسێنی کوڕی ئیمامی عەلی هاتۆتە هەمەدان، ئەم زاتە کوڕێکی هەبووە بەناوی شێخ بابا علی هەمەدانی. ئەم زاتەش سێ کوڕی هەبووە بەناوی (عیسا، موسی، محەمەد)، شێخ محەمەد چووە بۆ ئەفغان، شێخ عیساو شێخ موسی هاتوونەتە بەرزنجەو لەوێ ماونەتەوەو نیشتەجێ بوون. ئەم دوو زاتە تەریقەتیان بۆ یەکەم جار لەخاکی کوردستان بلاوکردۆتەوە، ئەو کاتە پێیان گوتووە تەریقەتی (نوربەخش).

بەشێکی زۆر لە میللەتی کورد بەهۆی موسڵمانێتی و خۆشەویستییان بۆ پێغەمبەر (د.خ)

و خانەوادەکەی دەستە دەستە بەرەو ئەم دوو زاتانە دەچوون و تەریقەتیان وەردەگرت، ئیدی تەریقەت لەکوردستان بڵاوبوویەوە.

لەلایەکی تر (شێخ محەمەد عەلی هەکاری) کە ناسراوە بە (الشیخ الاسلام) هاتووە بۆ کوردستان لەدەوروبەری شاری ئامێدی نیشتەجێ بووە، ئەم زاتە عاریف و خواناسێکی زۆر گەورە بووە، هەر خەریکی خوا پەرستی بووە.

لەم ناوچەیە گەڕاوەو ئامۆژگاری خەڵکی کردووەو تەریقەتی بڵاوکردۆتەوە، هەر لەوێ وەفات دەکات و لەناو چیا لەنزیک گوندی (دێر ئاش) نێژراوە. شێخ عەبدولقادری گەیلانی کە بەسەردانێک دێتە کوردستان دەچێتە زیارەتی مەزاری (شێخ محەمەد عەلی هەکاری).

هەروەها یەکێک لەکوڕەکانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی کەناوی (شێخ عەبدولعەزیز) بووە، پیاوێکی ئازاو بەجەرگ بووە، سەرکردەی لەشکری ئیسلام بووە لەکاتی سەلاحەدینی ئەیوبی، شاری عەسقەلانی لەدەستی خاچ پەرستەکان ڕزگار کردووە.

ئەم زاتە دوای گەڕانەوەی لەجەنگ دێتە کوردستان و لەشاری ئاکرێ نیشتەجێ دەبێت، تەریقەتی قادری بڵاوکردۆتەوە، خەڵک زۆر تەریقەتی وەرگرتووەو تەنانەت لەو کاتەدا (جوو)یێکی زۆریش کە لەو ناوچەیە بوون هەندێکیان بەهۆی بەرەکەتی ئەم زاتە موسڵمان بوون، ئەم زاتە کەرامەتی زۆر گەورەی نواندوە کە تاکو ئێستاش شوێنەواری دیارە. ئەم زاتە لەساڵی (٦٠٢ک) وەفاتی فەرمووەو مەرقەدی لەشاری ئاکرێیە.

هەروەها شێخ ئیسماعیل-ی ولیانی لەبەر بەرزی پلەی بەندایەتی و زۆر هەوڵدانی بۆ خوادای گەورە، ناسراوە بە (غوث الثانی). ئەم زاتەش لەکوردستان تەریقەتی قادری بڵاوکردۆتەوەو ئیرشادی کردووە، خەلیفەو دەروێشی لەهەموو لایەک هەبوون. مەزاری موبارەکی لەگوندی (روڤیا)یە لەنزیک ئاکرێ.

ئینجا لەدوای ئەمانە ئاڵای تەریقەتی قادری لەڕێگەی کوڕو نەوەو خەلیفەو دەروێشەکانی ئەم زاتانە لەئاسمانی کوردستان شەکاوەتەوەو بەردەوام بووە.

**تەریقەتی قادری لەشاری هەولێر**

کاتێک بمانەوێ باسی تەریقەتی قادری بکەین لەشاری هەولێر دەبێ بگەڕێینەوە سەر ئەو بنەماڵانەی کە سەر بەتەریقەتی قادرین و ئیرشادیان کردووەو تەریقەتیان بڵاوکردۆتەوە خاوەنی تەکیەو بارەگان. گرنگترین بنەماڵەکانیش ئەمانەن:

١- بنەماڵەی شێخ عەبدولکەریم-ی دارەخورما

شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ مصطفی کوڕی شێخ ئەحمەدی هەشەزینیی. ناسراو بوو بە (شێخ عەبدولکەریم-ی دارەخورما) یان (شێخ عەبدولکەریم-ی کەزی سۆر)، وەک دەگێڕنەوە سیلسیلەی ئەم زاتە دەگاتەوە پێغەمبەر (د.خ)ن لەسەیدەکانی بەرزنجەیە. دوای مردنی شێخ مستەفا-ی باوکی کەخەلیفەی کاک ئەحمەدی شێخ بووە، لەشوێنی باوکی دادەنیشێ، ئەمەسوکی تەریقەت لای شێخ حەسەن ی قەرەچێوار دەکات و ئیجازەی تەریقەت و ئیرشادی پێ دەدا.

ئەم زاتە دوای ماوەیەک خزمەتکردن لەگوندی دارەخورما لەساڵی (١٩٢٨)ز) ئەم گوندە جێ دەهێڵێ و دێتە شاری هەولێر خانوو و تەکیە دروست دەکات، دەیکاتە جێگەی دەروێشان و پەناگەی هەژارو لێقەوماوان. بەهەزاران کەس لەسەر دەستی ئەم زاتە پەروەردە بوون و چەند دڵی بێ کەڵکی روو لەدنیای خستە سەر ڕێگای خودا ناسی و خوداپەرستی و ئەدەب و ڕەوشت و فێرە خۆشەویستی پیاو چاکانی کردن. هەروەها خەڵکی ڕەش و رووت و برسی لەنان و ئاوی ئەم زاتە تێریان دەخوارد. ئەم زاتە زۆر لەخودا ترس بووە، بەشێوەیەک هەموو کات لەترسی خودا فرمێسک بەچاوانی هاتۆتە خوارێ، خاوەنی نەفەسێکی درێژو پشوویێکی فراوان بووە لە گەیاندنی ناوەڕۆکی تەریقەت بەخەڵکی، بۆیە بەم ڕەوحانیەتە پاکەوە هاتە مەیدان. خاوەنی فام و فیراسەت و ڕەوحانیەتێکی وابوو دەیتوانی دڵ و دەروونی موریدانی بەرەو ئاراستەی خوایی وەرچەرخێنێ. جووگاووریش هاتوونەتە خزمەتی و جێگەی باوەڕی ئەوانیش بوو هەندێکیان لەسەر دەستی ئەم زاتە موسڵمان بوون.

کاتێک بەرپرس و پیاوانی حکومەت دەهاتنە خزمەتی داوای لێدەکردن، کە لەگەڵ هەژاران باش بن و کارەکانیان بەدڵسۆزی ئەنجام بدەن،

هەمیشە پشتگیری ستەم لێکراوی دەکردو مافی لەستەم کار دەساند.

ئەم زاتە زۆر دۆستی شێخ مەحمودی مەلیک بووە، تەنانەت لەچەند شەڕێکیش لەدژی ئینگلیز شان بەشانی شێخ-ی مەلیک بەشداربووە.

ئەم زاتە خاوەنی کەشف و کەرامات و فیراسەتێکی بەهێز بوو، زۆر کاری لەعادەت بەدەر لەم زاتە دەگێڕنەوە.

لەماوەی ژیانیدا چەند جاران چۆتە مالّی خوا بۆ بەجێ هێنانی مەناسکی حەج. هەموو سالّ چەند جار چۆتە بارەگای گەیلانی و لەوێ ماوەتەوە، بەسەدان لەخەلّکانی پاکستان و هندستان و میسر و سودان و شوێنانی تر تەریقەتیان لای ئەم زاتە وەرگرتووە. ئەم زاتە لە ٢٦ی کانونی یەکەمی سالّی (١٩٦٢)ز وەفاتی کردوو هەر لەتەکیەکەی خۆی لەگەڕەکی خانەقا نێژراوە.

لەدوایی خۆی حەوت کوڕی جێهێشت (مستەفا ناسراو بەشێخ کاکە، سەید محەمەد، ئیسماعیل، مەعروف، محەمەد ئەمین، ئەحمەد، سەعید).

شێخ کاکە لەشوێنی باوکی دانیشت و عەبای خستە سەرشان. شێخ کاکە لەسالّی (١٩١٢ز) لەگوندی دارەخورما لەدایک بووە، هەر لەمندالّی دەچێتە بەر خوێندنی ئایینی. سەرەتا لای مەلا عەباسی دارەخورما قورئان ختم دەکاو چەند کتێبێکی ئایینی و گولستان دەخوێنێ. لەدواییدا ماوەیەک لای مەلا سەعیدی باغەمرە دەخوێنێ. ئەم زاتە چلەو ختمەیەکی زۆری بەنییەتی ئیعتیکاف کردووە. دوای ئەوەی گوندی دارەخورمای جێهێشت چووە "قەراج" لەگوندی "برایم باول"، خانوو و تەکیەی دروست کردو نیشتەجێ بوو، لەپالّ تەکیەی حوجرەی فەقێیانیشی دروست کرد، بە بەردەوامی فەقێی لێبوو. نانی پێدەدان و بەرگی دەکردن. لەدواییدا لەسالّی (١٩٥٨)ز هاتە شاری هەولێرو لەتەکیەی باوکی دادەنیشت. لەسالّی (١٩٦٨)ز لەگەڕەکی ئازادی خانوو و تەکیەی بۆ خۆی دروست کرد. پیاوێکی خواناس و قورئان خوێن و دەم تەڕ بە زکری خوداو سەخی تەبیعەت و بەتەوازوع بوو. دنیا لەلای ئەم هیچ نرخی نەبوو. دۆستی هەژاران و لێقەوماوان بوو. ئەم زاتە لە ٢٦/١١/٢٠٠٢ز کۆچی دوایی کردو بەرەو بارەگای خودای گەورە ئۆغری کرد، بەئامادەبوونی خەلّکانێکی یەکجار زۆر لەهەموو چین و توێژەکان لەتەکیەکەی خۆی لەگەڕەکی ئازادی بەخاک سپێردرا. ئەم زاتە پێنج کوڕی هەیە (نەجمەدین، نوردەدین، محێدین، رەشید، مەنسور).

شێخ رەشیدی کوڕی لەشوێنی باوکی دانیشتووە، شێخ رەشید لەسالّی (١٩٥٤)ز لەگوندی برایم باول لەدایک بووە. دەچێتە بەر خوێندن و هەموو قۆناغەکان دەبڕێت تا کولیژی یاسا لەبەغداد تەواو دەکات. بەفەرمانبەری میری دادەمەزرێت پلەی وەزیفی گەورە وەردەگرێت، هەر لەسەرەتاوە ناوبانگی چاکەو لەخودا ترسی و خوو ورەوشتی جوانی و لەسەرخۆیی و تەوازوعی ئەم زاتە دنیا پڕ دەکات.

دوای دانیشتنی لەشوێنی باوکی بەردەوامە لەسەر رێگای باوک و باپیرانی بەئیرشادو تەریقەت دان و ئامۆژگاری موریدان و ئاشتەوایی کردن و پەنادانی خەلّکی، هەروەها خوان و نانی بەردەوامەو خواردن بەمیوانان و هەژاران دەدرێت.

کۆڕو مەجلیسی حاجی شێخ رەشید کۆبوونەوەی رێبوارانی کاروانی تەریقەت و پیاوی چاک و زانایانی ئایینییە، بەردەوامە لەئامۆژگاری خەلّکی و موریدان بەدەست گرتن بەقورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ)و رۆیشتن لەسەر رێگای ئەولیاو دۆستانی خودا، دلّپاک کردنەوە لەهەوای شەیتان و چلّک و پیسایی گوناه. دەروێشانی ئەم زاتە بەردەوامن لەئامۆژگاری خەلّکی، سالّی چەند جار بەکۆمەلّ بەمەبەستی تەریقەت دان و بلاوکردنەوەی رێبازی گەیلانی، دەچن بۆ شارو دێهاتەکانی کوردستان

٢- بنەمالّەی شێخانی هیران و دەوروبەری

یەکێک لەو بنکەو شوێنە ناودارانەی دیکە کە ئەو رێگەیە یاخود ئەو تەریقەتەی لێ رێنومایی دەکرێ -هیران و دەوروبەری- لەهیران داب و نەریتی ئەو رێگەیە، پتر لە (٢٠٠) سالّ لەمەوبەر هۆکارو رێو شوێنی بۆ ئامادە کراوە. سەرەتای بلاوکردنەوەی تەریقەتەکەش بەرێکوپێکی و سازکردنی بارەگاو تەکیەو شوێنی ئیرشاد بۆ (شێخ سولەیمانی هیرانی) دەگەڕێتەوە.

هەر لەشێخ سولەیمانەوەش پشت بەپشت کوڕ لەباوکی رێگەی

تێگەیاندن و ئیرشادی گرتووە تا دەگاتە ئێستا.

ئەو بنەماڵەیە ناودارن بە (کاک)، واتە شێخی تەریقەت و گەورەی ئایینی. ناودارترین کەسایەتی ئەم بنەماڵەیە لەرووی کەسایەتی و شاعیری و ڕێگە نیشاندان شاعیری گەورەی کورد (صافی هیرانی)یە ١٨٧٣-١٩٤٢ز. ئەم زاتە بەسێ زمان کتێبی (دیوانی چاپکراوی) هەیە.

مەلا محەمەدی جەلی زادە لەبارەی (صافی)یەوە کەدەدوێ بە (المرشد الاکمل) ناوی دەهێنێ، هەروەها -الشیخ الأجل-.

ئێستا پۆست نشینی ئەو ڕێگەو تەریقەتە لە (هیران) کاک (مەلا سانی)یە، ئەویش کوڕی گەورەی (کاک عەلی) کاکی هیرانە ناسراو بە (حاجی مەلا کاکە) دەرویش و موریدانی ئەو ڕێگەیە لەچەندین وڵات و جێگاو شوێن دێن و سەردانی (کاک) و تەکیەی هیران دەکەن.

٣- بنەماڵەی شێخ محێدین شێخ سالح

یەکێکی دیکەو لەو بنەماڵە ئایینیانە کەرێگای تەریقەتی قادریان گرتووە بنەماڵەی (شێخ سالح) باوکی شێخ (محێدین)ە.

شێخ سالح لەزنجیرەی سەیدەکانی بەرزنجەیە، لەساڵی (١٨٩٢ز) لەهەولێر لەگەڕەکی (عەرەب) لەسەر پانتاییەکی گەورە تەکیەیەکیان دروست کردووە. لەدوای شێخ سالح شیخ (محێدین)ی کوڕی کاری ئیرشادی تاکۆچی دوایی لەساڵی (١٩٨١ز)کردووە. شێخ (محێدین) لەزۆر ڕووەوە ناودار بووە، پیاوێکی قسە خۆش و ڕووخۆش و ئاین پەروەر بووە، بەقەناعەت و دڵێکی فراوانەوە یارمەتی خەڵکانی هەژارو لێ قەوماوان و پیاوانی ئایینی داوە، لەسەر هەمان ڕێگەی (شیخ سالح)ی باوکی کە لەساڵی (١٩٦١)زکۆچی دوایی کردووە. هەردووکیان لەهەمان تەکیە لەژوورێکی تایبەت نێژراون. شێخ محێدین بەتوانابووە لەدڵدانەوەی لێ قەوماوان، لەزۆر سەرچاوەی مێژوویی و ئایینی وەک پیاوێکی کۆمەڵایەتی و پشت و پەنای خەڵکانی نەدار ناوی هاتووە.

٤- بنەماڵەی شێخ سالح-ی کاریتان

ئەم زاتە لەسەرەتادا لەکەرکوک دانیشتووە، پۆلیس بووە. سەر بەتەریقەتی ڕفاعی بووە. لەدوواییدا بەهۆی بوونی گیروگرفتێک ئەوێ جێ دەهێڵێ و دەچێتە قادر کەرەم لای شیخ حەسەن-ی قەرەچێوان، دوای ئەوەی تەریقەت وەردەگرێ لای ئەم زاتە ئەمری پێ دەکات، کەخلوە بکێشێ، سێ خلوەی لەسەر یەکتر پێ دەکێشێ، شێخ سالح بۆیە ناسراوە بە (شیخ سالح-ی ڕفاعی قادری) چونکە لەیەک کاتدا خاوەنی هەردوو تەریقەت بووە.

دوایی ئیجازەی پێ دەدات بۆ تەریقەت و ئیرشاد. ئەمری پێ دەکات کە بچێتە گوندی کاریتان سەر بەناحیەی دیبەگە، شێخ سالح لەوێ تەکیە دروست دەکات، تەریقەتی قادری لەم ناوچەیە بڵاودەکاتەوە. ئەم زاتە هەر لەوێ کۆچی دوایی دەکات و دەنێژرێ. ئەم زاتە کوڕی نەبوودو تەنها کیژ نەبێ ئەویش منداڵی لەدوا بەجێ نەماوە.

جگە لەو شوێنانەی باسمان کردن زۆر شوێن و جێگای دیکە هەن لەکوردستان تێیدا تەریقەتی قادری پەیرەوی دەکرێ، بەڵام بەپلەو توانایێکی کەمتر لەو سێ شوێنە لەهەولێر. لەوانە تەکیەی کاک مەلای مشارو تەکیەی شێخ عارف و تەکیەی شێخ شەریف و تەکیەی خەیلانی و تەکیەی ڕوفاعی و تەکیەی خەلیفە مەجید لەهەولێر هەروەها تەکیەی قادری لەگەڕەکی ئازادی لەهەولێر.

## سەرچاوەکان

١- کتاب الغنیة للشیخ عبدالقادر الگیلانی.
٢- بنەماڵەی زانیاران، دانانی مەلا عەبدولکەریم-ی مدرس.
٣- عەقیدەی مرضیە، دانانی سید عبدالرحیمی مەولەوی شەرح و لێکدانەوەی ماموستا مەلا عەبدولکەریم-ی مدرس.
٤- دیوانی صافی هیرانی -محەمەدی مەلا مصطفی هیرانی- چاپخانەی پەروەردە- هەولێر ٢٠٠٤ز، لاپەڕە ١٧.
٥- نامەی دکتۆرا لەشیعری ئایینی و سۆفیگەری- بەراوردی دکتۆر ابراهیم احمد حسین.
٦- المذاهب الصوفیة ومدارسها- عبدالکریم عبدالغني قاسم مکتبة متبولي- القاهرة ١٩٨٩ ص ١٦.
٧- النودهي وجهوده النحویة -الدکتور محەمەد صابر مصطفی، لاپەڕە ٤٣ چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر ٢٠٠٥.
٨- الاکلیل في محاسن الاربیل ص ٣٨٣- الملا عبدالله الفرهادي، مطبعة جامعة صلاح الدین ٢٠٠١.



# تەریقەتی نەقشبەندی

دكتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوانی
كۆلێژی زمان- زانكۆی سەلاحەددین

وشەی "نەقشبەندی" وشەیەكی ئیرانییە و لە دوو بەش پێكهاتووە، (نەقش) وێنەی ئەو مۆرەیە، كە لەسەر مۆم و شتی دیكە دەدرێ، (بەند) بە واتای چەسپان و نەكوژانەوەیە. كەواتە زاراوەكە واتا: یادی خوا لە دڵی سۆفی دەچەسپێ[1].

بە زۆری زانایەكان ئەم ڕێبازە بۆ سەر ئەبو بەكری سدیق (ر. خ) دەگێڕنەوە و ناویان لێناوە (صدیقیە) و گوایە ئەو دایمەزراندووە، هەروەها دەیگێڕنەوە سەر پێغەمبەر (د. خ)، چونكە ئەبو بەكر جێگری پێغەمبەر (د. خ) بووە، پێغەمبەریش فەرموویەتی ((ما صب الله في صدري شيئا إلا صبته في صدر أبي بكر))[2]. بێگومان ئەم خستنە دڵەش لایەنێكی واتاییە و زیاتر كەسێتی ئەبو بەكر دەچەسپێنێ، ئەم ڕێبازە هەر بە (صدیقیە) مایەوە تا سەردەمی ئەبو یەزیدی بەستامی (١٨٨ - ٢٦٤ك) ئینجا ناونرا (طیفوریة) تا سەردەمی عەبدولخالقی غەجدەوانی، لەمەوە ناونرا (نەقشبەندی)، بەڵام لەسەردەمی شێخ عەبدوڵڵا ئەحرار پێ دەگوترا (احراریة) تا پەیدابوونی ئیمامی ڕەبانی كە بە نوێكەرەوەی هەزارەی دووەمی كۆچی دانراوە و

رێبازەکە پێی دەگوترا (مجددية)، لە سەردەمی مەولانا خالیدی شارەزووری (١١٩٣ - ١٢٢٠ک) بە رێبازەکە دەگوترا (خالدية)[٣]، نابێ ئەوە لەیاد بکرێ کە لە سەردەمی شای نەقشبەندەوە تا ئێستا ناوە گشتییەکەی هەر نەقشبەندی بووە.

ئەم رێبازە لە چوارچێوەی شەریعەت نەچۆتە دەرەوە و هەموو دامەزرێنەرەکانی عەرەب نەبوون، تەنیا ئەبو یەزیدی بەستامی لە شەریعەت دەرچووە و سەر بەقوتابخانەی بێ ئاگاییە و بەرەو فەنا و یەکبوون چووە[٤].

شێخەکانی ئەم رێبازە سەید نین، جگە لە شەمزینییەکان، کە دەگەرێنەوە سەر شێخ عەبدولقادری گەیلانی، سەیدن و لە رێبازی قادرییەوە بەرەو نەقشبەندی چوونە.

رێبازی نەقشبەندی وەرزشی قورسی گیانی و جەستەیی تێدانییە، سۆفی بەجەزبە دەست پێدەکات، بۆیە پێی دەگوترێ (مجذوب سالک)، لەم بارەیەوە شاهی نەقشبەند گوتوویەتی (سەرەتای رێبازەکەمان کۆتایی رێبازەکانی دیکەیە)[٥].

زیکر لای نەقشبەندییەکان بریتییە لە (نەهێشتنی بێ ئاگایی، ئەمەش دوو جۆرە بەزمان و بەدڵ)، زیکری دڵیش کە تایبەتە بەم تەریقەتەوە دەبێتە دوو بەش:

١. زیکر بەناوی خودا (الله).

٢. زیکری بە ئەرێ و نەرێ (الإثبات والنفي) واتا: بە (لا إله إلا الله) لێرەدا (لا إله) نەرێیە و (إلا الله) ئەرێیە[٦].

**شێخی رابەر لای نەقشبەندییەکان**

نەقشبەندییەکان لەو باوەڕەن کە مرۆڤ لە خۆرسکەوە حەزی لە شەهوەت و دنیا پەرستییە ((زين للناس حب الشهوات))، بۆیە دەبێ هێزێک هەبێت، کە بەرەو ئیمانی بگێرێتەوە، ئەو هێزەش لە شێخی تەریقەتدا بەرجەستە دەبێ و شێخ دەتوانێ خۆشەویستی خوا بخاتە دڵی سۆفییەوە و خەدوو بە خوا بگرێ، کەواتە هەبوونی شێخ بۆ رێبوار زۆر گرنگە.

لە رووی زاراوەوە ئەو کەسەیە، کە گەیشتووەتە پایەی فەزڵ، ئەگەر منداڵیش بێت، ئەهلی فەزڵیش بریتییە لە کەڵەزاناکان، ئەوانەی کار بە زانینەکەیان دەکەن و پشتیان لە دنیا کردووە و شەریعەت و تەریقەت بەیەک دەزانن، خاوەنی ئاکاری محەمەدین و لە دەریای یەکتاییدا نقوم بوونە[٧].

**رێبازی نەقشبەندی لە کوردستاندا**

هەموو سەرچاوە کۆن و تازەکان لەسەر ئەوەن کە مەولانا خالیدی شارەزووریی ئەم رێبازەی لەسەر دەستی شێخ عەبدوڵڵای دەهلەوی لە هیند وەرگرتووە.

مەولانا بە رێگای ئێراندا لە ساڵی ١٨٠٥ دەچێتە هیند و شەش ساڵ لای شێخ عەبدوڵڵای دەهلەوی دەمێنێتەوە و ئیجازەی پێنج تەریقەتی لێ وەردەگرێ: (نەقشبەندی، قادری، سوورە وەردی، کوبرەوی، چەشتی)، لە ساڵی ١٨١١ دەگەرێتەوە سلێمانی و دەست بە بڵاوکردنەوەی رێبازی نەقشبەندی دەکات، پاشان لەبەر ناکۆکیی نێوان قادری و نەقشبەندی کوردستان بەجێدێڵێ و بەرەو شام دەروات، لە ساڵی ١٨٢٧ بە نەخۆشی گیانی دەسپێرێ و لەسەر چیای قاسیوون لە دیمەشق دەنێژرێت[٨].

**جێگرەکانی مەولانا خالید**

جێگرەکانی مەولانا خالید یەکجار زۆرن و ناتوانین هەموویان تۆمار بکەین، مەولانا پێش ئەوەی بڕواتە شام، شێخ عەبدوڵڵای هیردەویی کردە جێنشینی خۆی لە سلێمانی[٩].

لە ساڵی ١٢٢٨ک شێخ عوسمانی تەوێڵە (١١٩٥ - ١٢٨٣ک)بووە جێنشینی مەولانا، لە شاری سلێمانی و هەورامان بە رابەرایەتی خەریک بووە و تا ئێستاش نەوەکانی لە کوردستان و دەرەوەی کوردستان بە ئیرشادەوە خەریکن[١٠].

**خانەوادەکانی رێبازی نەقشبەندی لە کوردستان**

١. خانەوادەی شەمزینییەکان لە

باکووری کوردستان، کە مەرکەزەکەی لە (دزەتر گەودر)ە.
٢. خانەوادەی شێخ بورهان لە رۆژهەڵاتی کوردستان، لە گوندی خانەقای نزیک بۆکان.
٣. خانەوادەی شێخ عوبەیدوڵلا، کە مەرکەزەکەی لە (زینوێ شێخی) مەهابادە.
٤. خانەوادەی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی لە ناوچەی بارزانی سەر بە پارێزگای هەولێر.
٥. خانەوادەی شێخ مەلا قادری چەمپاراو لە نزیک بانە.
٦. خانەوادەی دۆزەخ دەرە لە سەرووی شاری سەقز.
٧. خانەوادەی سیرێ کە دێیەکە لە سیودیلی سەر بە کوردستانی عیراق[11].

هەروەها لەناو شاری هەولێر دوو بنەماڵەی دیکە هەن، کە خاوەنی خانەقا و مزگەوتن و لە هەردوو لایەنی شەریعەت و تەریقەت دەستێکی باڵایان هەبووە، ئەمانەش:

أ. بنەماڵەی شێخ هیدایەتوڵلای هەولێری: شێخ هیدایەتوڵلا خەلیفەی مەولانا خالید بووە و تەدریس و رابەریەتی کردووە، لە خوار قەڵای هەولێر مزگەوتی خانەقا شوێنی ئەم شێخە بووە و لە (١٢٥٢ک) وەفاتی کردووە لە بەغدا نێژراوە، مزگەوتی خانەقا لە (١٢٣٠ک) بنیات نراوە و لە ١٩٥٢ نوێ کراوەتەوە، لە دوای شێخ هیدایەتوڵلا کورەکەی شێخ محەمەد سەعید شوێنی گرتۆتەوە و شێخی چۆلی کوڕی پلکی بوو (محەمەد کوڕی مستەفا - شێخی چۆلی ١٣٠٨ھ) کۆچی دوایی کردووە، هەروەها مزگەوتەکەی تەنیشت مزگەوتی خانەقا لە چەند سەردەمێکدا سەر بەو بنەماڵەیە بووە و منداڵەکانی شێخ محەمەد سەعید رابەرێتییان کردووە، وانەیان تێدا گوتووەتەوە.

ب. بنەماڵەی هەرشەمییەکان: محەمەد کوڕی عەبدوڵلا هەرشەمی، خەڵکی گوندی هەرشەمە و ئەبو بەکری کوڕی هاتۆتە هەولێر، بۆ خوێندن چووەتە لای مەلا (عومەر خەیلانی) لە رەواندوز، پاشان چووەتە تەوێڵە لە هەورامان بۆ خزمەت شێخ عوسمانی تەوێڵە و دوای ئەوەی مۆڵەتی ئیرشادی لێ وەردەگرێ دەگەڕێتەوە هەرشەم و پاشان هاتە هەولێر و لە دووری شار مزگەوتێکی بچووکی دروست کرد (مزگەوتی شێخ مستەفا) بۆ تەدریس و رابەرایەتی کردنی سۆفییەکان، لە دوای ساڵی ١٢٢٩ک مزگەوتەکە فراوان کرا، لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانی چووەتە ئەستەنبوڵ و لەوێ رێبازی نەقشبەندی بڵاو کردۆتەوە و هەندێ لە وەزیرەکان هاتوونەتە ریزەوە، لە ساڵی ١٣٢٩ وەفاتی کردووە و لە مزگەوتەکەی نێژراوە.

ج. لە دوای شێخ ئەبو بەکر شێخ مستەفای کوڕی کە لە (١٣٠٥ک) لە هەرشەم لە دایکبووە، لە مزگەوتەکەدا خەریکی تەدریس و رابەرایەتی بووە(١٢). لە دوای خۆشی تاکە کوڕەکەی (د. عەبدوڵلا نەقشبەندی) جێگەی گرتەوە، بەڵام لە راستیدا شێخ عەبدوڵلا هەر لە ژیاندا بوو، کە کوڕەکەی خۆی (د. فائق نەقشبەندی)ی کردە جێگری باوکی و خەریکی رابەرایەتی کردنە و هێشتا لە ژیاندایە.

### پەراوێزەکان

١. الحديقة الندية في اداب النقشبندية، محمد بن سليمان، ص٢١.
٢. سەرچاوەی پێشوو، ل١٢.
٣. السعادة الأبدية فيما جاء به النقشبندية، عبدالمجيد النقشبندي، ص٢١.
٤. اللمع في التصوف، السراج الطوسي، ص٤٦١.
٥. الحديقة الندية، ص١٦.
٦. تنوير القلوب في معاملة علام الغيوب، محمدامين الكردي، ص٥١١.
٧. الطريقة النقشبندية وأعلامها، د.محمد أحمد، ١٩٨٧، ص٤٢ - ٤٣.
٨. تأريخ السليمانية وأنحائها، محمد أمين زكي، ص٢٢٥ - ٢٢٨.
٩. تأريخ تصوف در كردستان، محمد رؤوف توكلي، ص٢٥١.
١٠. سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٠ - ٢٦١.
١١. سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٩ - ٢٩٠.
١٢. علماء ومدارس في أربيل، زبير بلال اسماعيل، ١٩٨٤، ص٦٧ - ٧٨.

# میر سلێمانی سۆران و تەکیەی کاکی هیران

عەباس سلێمان سمایل

**ڕیشەی بنەماڵەی کاکی هیران**

بنەماڵەی کاکی هیران نەوەی (میر کەلۆس)ی فەرمانڕەوای ئیمارەتی سۆرانن، بەگزادەی دەشتە دیانە و بادلیان و بێلزیان و هاودیان و برادۆستییەکان - یش نەوەی میر کەلۆس - ن، بەڵام بنەماڵەی کاکی هیران لە میر سلێمانەوە تەریقەتی (قادر) یان لە سەید تەهای بەتلیسی وەرگرتووە و تا ساڵانی حەفتاکان تەریقەتیان دەدا خەڵک و بە هۆی خۆشەویستییان لە نێو خەڵک بە کاکی هیران ناسراون، جا کاتێک میر سلێمان بووە شێخ سلێمان وازی لە میرایەتی هێناو تەکیەیەکی لە هیران دروستکرد، ئەو کاتی بنەماڵەیەکی مەسیحی کە کوێخاکەیان ناوی یەعقوب بوو، هیرانی بەجێهێشت. تەنها بنەماڵەی موسڵمانەکان لەوێ مانەوە.

بەڕێز کاک عەبدوڵلا (شێخ سانی)، کە پۆستنشینی ئەم بنەماڵەیەیە وتی: ئێمە لە دوای حەفتاکانەوە تەریقەت نادەین، بەڵام لە حەفتەی ڕۆژێک زکر دەکەین و بڕوامان بە ئەفسانە نییە و نوشتەش بە خۆڕایی دەکەین، تاکو ئەمڕۆ پەیوەندیمان لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە بە ئیسلام و دیانەوە زۆر باشە و بەردەوامیش قەشە و مالوم هاتوچۆمان دەکەن.

**تەکیەی کاکی هیران**

مێژووی تەکیەی کاکی هیرانی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شێخ سلێمان و تەکیە کۆنەکە لە سەرەوەی تەکیەی ئەمڕۆکە دروست کرابوو، لە ساڵی (١٩٧٧) کەمێک تەکیەکەیان هێنا خوارتر و لە ساڵی (١٩٨٨) لە گەڵ هەموو خانووەکانی ئەم شارۆچکەیە لەگەڵ زەوی تەخت کرا، ئەم تەکیە فراوانەی ئەمڕۆش دوای ڕاپەڕین دروست کراوە و خەڵکەکە بە هەموو لایەک خزمەتی دەکەن و هەمیشە لەوێ کۆدەبنەوە.

ئەم تەکیەیە جگە لە زکر ساڵی سێ جاریش خەڵوەتی تیادەکرێت، خەڵوەتێکیان (دە) ڕۆژ لە مانگی ڕەجەبە، کە تەنیا پیازو قەسپی تیا دەخۆن، هەروەها (١٠) ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزان و نۆمینەی حاجییان دەچوونە خەڵوەتەوە، لەم تەکیە جیاوازی نێوان دەروێش و خەلیفە و شێخ نییە هەر هەموو بە یەکەوە دادەنیشن و نان دەخۆن، سۆفیگەریش بەم قۆناخانەدا تێدەپەڕێت:

### دەروێش خەلیفە شێخ

جاران هەموو کێشەیەکی دانیشتوانی ناوچەکە لە تەکیەی هیرانی بنبڕ دەکرا، پۆستنشین - یش هەمیشە سەرپەرشتی تەکیە دەکات.

وەک قوتابخانە وانەی ئایینی تیا دەخوێندراو لە کۆنا ئیجازەشیان بە مەلایان داوە، بەم دواییەش قوتابیان بۆ تەواوکردنی خوێندن دەچوونە هەولێرو لەوێ بڕوانامەیان وەردەگرت.

### شارۆچکەی هیران

شارۆچکەی هیران بنکەی ناحیەی خۆشناوەو بەر لە کاولکردنی لە لایەن حکومەتی عێراقەوە، دەوروبەری (٣٠٠) ماڵی تیا نیشتەجی بوو، بەڵام ئەمڕۆ نزیکەی (١٢٠) ماڵی تیا نیشتەجێیە، کە بریتین لەم بنەماڵانەی خوارەوە:

بنەماڵەی کاکی هیران، بنەماڵەی کەیان (کە لە بنەڕەتدا لە ئێران هاتوون)، بنەماڵەی پسمام (کە لە بنەڕەتدا لە خواکورک هاتوون)، ئەمڕۆ پێیان دەڵێن بنەماڵەی شێخ رۆستەمی.

بنەماڵەی شێخ خدر لە بنەڕەتدا جوولەکەن. بەرەبابی حەمی، ئەم بنەماڵەیە گەردینە و کاتی خۆی لە تورکیاوە هاتوونەتە شارۆچکەی هیران.

بنەماڵەی کەچەری: ئەم بنەماڵەیە کاتی خۆی مەسیحی بووینە، باپیرە گەورەیان ناوی (کۆیل) بووە. شارۆچکەی هیران بە گۆڕستانە گەورەکەی و شوێنەوارەکانی وا پێدەچێت زۆر کۆن بێت، بە تایبەتی گۆڕستانەکەی بە هەزاران گۆڕی تێدایە، دوور نییە کاتی خۆی گۆڕستانی مەسیحی، جوولەکە، زەردەشتیان بووبێت، هەندێک لە شێوەی گۆڕەکانیشی بە گۆڕی ئیسلامان ناچێت. ناوە کۆنەکەی ئەم شارۆچکەیە نەزانراوە. ناوی هیران[1] یش دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری (٥٠-٦٠) ساڵێک بەر لەوەی میر سلێمان تەریقەت وەربگرێت و ببێت بە شێخ سلێمان، دانیشتوانی هیران دەڵێن هەردوو گوندی ئاقوبان و هیران و نازەنین موڵکی مەسیحییەک بوو بە ناوی یەعقوب، ئەم پیاوە دوو کچی هەبووە بە ناوی (هیلان) و (نازەنین) و ناوی شارۆچکەی ئەمڕۆی هیران و گوندی نازەنین بە ناوی ئەم دوو کچەی کردووە، ئینجا هیلان لە سەر زمانی دانیشتوانی ناوچەکە دەبێتە هیران. هەندێکیش دەیانگوت کاتی خۆی پیاوێک لە ئێران هاتووە و ئەم دوو گوندەی ئاوەدان کردۆتەوە و بەناوی کچەکانی هیران و نازەنین ناوی لێناوە.

### گۆڕستانی هیران

گۆڕستانی هیران لەسەر گردێکی زۆر فراوان هەڵکەوتووە و کەوتۆتە خۆرهەڵاتی هیران، لەلای خۆرهەڵاتی گردەکە دوو ئەشکەوت هەیە، یەکێکیان لە خوارەوەیە زۆر گەورەیە، ئەوی دیکەش لەسەرەوە، کە لەناوەوە دەبێتە پێنج ئەشکەوت ئەشکەوتێکیان هیچ گۆڕێکی تێدا نییە و ئەشکەوتی پێشەوەشی حەوت شوێنی وەک دەلاقە لێ هەڵکەندراوە، بۆ ئەوەی دەروێشەکان تیای دابنیشن و خەڵوەت بکەن سێ، ئەشکەوتەکەی دیکەش گۆڕی پۆستنشینەکانی تیایە لە شێخ سلێمان تا دەگاتە سافی هیرانی و ژمارەیان (٧) گۆڕە، لە ئەشکەوتی لای چەپ گۆڕی (کاک مەلا عەلی) تێدایە، لای راست گۆڕی سافی هیرانی و گۆڕی کاک عەبدوڵڵای باوکی تێدایە، لە ئەشکەوتەکەی دوایی گۆڕی چوار پۆستنشینی تێدایە، کە بریتین لەمانە: گۆڕی شێخ سلێمانی گەورە، گۆڕی کاک عەبدوڵڵا، گۆڕی کاک عەلی، گۆڕی کاک مستەفا. لە رووی دەرەوەی ئەشکەوت قووڵاییەکی

گچکە لە بڵندی هەڵکەندراوە و خەڵک بۆ مراز لە خۆگرتن بەردی داوێن، بۆ ئەوەی بکەوتە ناو ئەو قوولاییەوەو لە تەنیشتیشەوە خەڵک بەرد بەدیوارەکە دادەخشێن ئەگەر بەردەکە پێوە بنووسێت، ئەوا مرازیان حاسڵ دەبێت[٢].

لەبەردەم ئەشکەوتەکەش ژمارەیەک گۆڕ هەیە، زۆربەیان گۆڕی بنەماڵەی کاکی هیران - ن، بە ژن و پیاوەوە، خوار ئەم ئەشکەوتەش دۆڵێکی پڕ لە دارو بارە. خەڵکی ناوچەکە بەردەوام نەخۆش دەهێننە ئەم ئەشکەوتە بە نیازی چاکبوونەوەیان.

### ناوە جوگرافییەکانی هیران و دەوروبەری

مزگەوتی خانزاد: مزگەوتی خانزاد کاتی خۆی خانزادی میری سۆران دروستی کردووە و چەند جارێک چاک کراوەتەوە، بەڵام لە رووداوەکانی دوای ساڵی ١٩٧٥ مزگەوتەکە رووخێنراو دوای راپەڕینیش حکومەتی هەرێمی کوردستان دروستی کردەوە.

بێلنگە: بێلنگە گوندێکی بچووکە، تا بەم دواییە دێرەکەی قەڵای بێلنگە هەر مابوو، کە لە نزیک گوندەکەوەیە.

مەندێر: مەن (مەند، مان) + دێر = دێری مەند، مانی دێر، دێری یەکێک بە ناوی مانی.

مەندێر ناوی کۆنە گوندێکە نزیک ناحیەی هیران هەڵکەوتووە، دەوروبەری (٦٠) شەست ساڵ لەمەوبەر پێنج ماڵی تیابووە، ئەم کاولە گوندە، ئاسەوارێکی زۆری تێدا بووە.

گرباپیرو بانەمێردان: ناوی دوو گردن، ئاسەواری خانووبەرەی زۆری تیایە، دەڵێن کاتی خۆی ئەم ناوە شاربووە.

گرمزگەفتۆرو گردی تۆمەر بەگی: ئەم دوو گردەش شوێنەواری خانووبەرەی تیاماوە.

گردی قەبرستان: ئەم گردە بەهەزاران گۆڕی تیایە و ئاسەواری زۆری تیایە و کەلوپەلی زۆریشی تیا دەرکەوتووە، بەرامبەر ئەم گردەش گردێک هەیە بە گردی کیسەڵ دەناسرێت، لە بەر ئەوەی شێوەی لە کیسەڵ دەکات.

ناوی کانییەکان: کانی شێخ سلێمان بەرامبەر ئەشکەوتەکەیە، کانی شێخ رەش، کانی مزگەوتی، کانی دەرماناو، کانی سمایلان.

لووتکە چیاکان: کۆیکی پلێنگ، کۆیکی قیبلەی، کەپکە قەل، کۆیکی قەراتۆک، کێلەک.

پەراوێزەکان

* ئەم بابەتە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە و سوود لە قسەی ژمارەیەک لە دانیشتوانی هیران وەرگیراوە لەوانە:

ا- کاک عەبدوڵلا (شێخ سانی) پۆستنشینی ئەمڕۆی تەکیەی هیران.

ب- بەڕێز عەبدولکەریم کوڕی شاعیر سافی هیرانی.

ج- بەڕێز سمایل مستەفا سەلیم، پیاوێکی بە تەمەن و دنیادیدەو وشیارە، لە ساڵی ١٩٢٣ لە هیران لە دایک بووە.

(١) لە هەرێمی دەرسیم هۆزێک هەیە بە ناوی هۆزی هیران، جا دەبێ کاتی خۆی ئەم هۆزە لە هیرانەوە نەچووبنە دەرسیمی؟

(٢) ئەم جۆرە مرازلەخۆگرتنە لە نێو مەسیحی و جوولەکەکانی کوردستان - یش هەبووە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر / ژمارە ١٥ ی هاوینی ساڵی ٢٠٠٢ وەرگیراوە

# چاکی بن عاردی

هاوار مورتکەیی - تاهیر عوسمان

یەکێک لە خەسڵەتە هەرە رەسەنەکانی خەڵکی ئەم شارە دێرینە، رێزگرتن بووە لە پیاو و کەسایەتییە ئاینییەکان، کە هەمیشە بەدرێژایی مێژوو، شوێن و پایەکی بەرزیان لەناو کۆمەڵدا هەبووە و لەم شارەدا ناسراو بوون و تەکیە و خانەقاکان ئاوەدان بووە و سەدان هەژار و دەستکورت و میوان و رێبوار روویان تێکردووە و تێیدا حەواونەتەوە، رێزی ئەو کەسایەتییانە لای دانیشتوانی شاری هەولێر ئەوەندە زۆر بووە کە لە ژیانیشدا نەماون و کۆچی دواییان کردووە، گڵکۆکانیان کراوەتە مەزار و خەڵک سەردانیان کردوون و بۆ بە پیرۆزکردن و دەربرینی رێز و حورمەت، گومەز و مزگەوتیان لەسەر رۆنراوە و بوونەتە مەعالمێکی دیار و بەرچاوی شاری هەولێر.

### شاری چاکە و پیاوەتی

کێ هەیە لە دانیشتوانی ئەم شارە چەندین جار سەردانی مەزاری شێخی چۆلی، سوڵتان موزەفەر، عوزێر پێغەمبەر، شێخ عەبدولکەریم، سەید قۆچان... هتد نەکردبێ و لە نزیک گڵکۆی ئەم پیاوچاک و زاتە پیرۆزانە دڵ و دەروونی خۆی پاک نەکردبێتەوە و بەخۆیدا نەچووبێتەوە، لە ژیان و کاری کردەوەکانی خۆی ورد نەبووبێتەوە، شاری هەولێری دێرین بە درێژایی مێژوو، شاری چاکە و پیاوەتی و یارمەتی دان و دەستگرتن و هاوکاری بووە، هەمیشە لە باوەشی قەڵا سەرکەشەکەی و گەڕەکەکانی دەوروبەریدا چەندین پیاوچاک بۆ بڵاوکردنەوەی خواپەرستی و داد و خۆشەویستی نێوان خەڵکی ئەم شارە تواونەتەوە، هەر بۆیەش خەڵکە دڵسۆز و بە ئەمەکەکەی هەولێر ئەمڕۆ و چەندین ساڵیش دەبێ مەزاری ئەو زاتانەیان کردۆتە جێی نزرگا و بە شوێنێکی بەرز و پیرۆزیان لە قەڵەم داوە.

### چاکی بن عاردی

یەکێک لەم چاک و زاتە بەرێزانەی خەڵکی هەولێر لەمێژەوە چاوی هیوا و هاتنەدی راز و خۆزگەکانیان تێ بڕیوە - چاکی بن عاردی ئەو پیاوچاکەی لە گۆڕێکدا نێژراوە، کە (٢٢) پلیکانە لەژێر زەوییە و مەزارەکەی دەکەوێتە تەنیشت وەزارەتی شارەوانی و گەشتوگوزار، خەڵکی شاری هەولێر سەربوردە و لێکدانەوەی جیاجیا دەربارەی ئەو پیاوچاکە دەگێڕنەوە، هەرچەندە گۆڕەکە هیچ ناوێک یا زانیارییەکی لەسەر تۆمار نەکرابوو، کە پشتی پێ ببەستین.

### سەربوردە و لێکدانەوەی ئەم چاکە

یەکێک لە سەربوردەکان دەڵێن: لە سەردەمێکی زوودا شێخێکی تەریقەت لە قەڵاتی هەولێردا دەژیا، ساڵێک وا رێکدەکەوێ شێخ بۆ حەجکردن سەردانی ماڵی خوا بکات و خزمەتکارێکیان لە ماڵەوە دەبێت، ژنی شێخەکە رۆژێک لەکاتی چێشت لێناندا لای خزمەتکارەکەی دەدرکێنێ، کە خۆزگەی ئەوە دەخوازێ

شێخ لەم خواردنەی بخواردبایە.
خزمەتکار داوای لێدەکات قاپێکی لەم خواردنە بۆ وەلاوە بنا بۆ شێخی بیات، بەلێ شێخ هەر ئەو رۆژە ئەو ژەمە خواردنە دەخوات، بەلام بۆ ئەوەی نهێنی ئەم گەشتەی ئاشکرانەکات خزمەتکار داوا لە شێخ، دەکات هەرکە لە حەجکردن گەڕایەوە نهێنییەکەی لای کەس نەدرکێنا، بەلام رێکەوت شێخ دەگەڕێتەوە دەبێتە حاجی، خەلکیش وەک نەریتی ئەم شارە دێنە لای و دەستی ماچ دەکەن، بەلام شێخ دەلێ دەستی من ماچ مەکەن دەستی ئەم خزمەتکارە ماچ بکەن، کە لەمن حاجی ترە، خزمەتکار لەبەر ئاشکرا بوونی نهێنییەکەی لەسەر قەلاتەوە بالی لێ دەڕوێت و لە شەقەی بالی دەدا و لەم شوێنە دەکەوێتەوە، کە ئێستا (لەژێر گۆڕەکەیە) و لەوساش بە چاکی بن عاردی ناسراوە، دوای پرسیارکردن لە چەند کەسی دیکە، پێیان راگەیاندین، کە هەولێرییە کۆنەکان بەم چاکە پیرۆزە (ئیمام)یشی دەلێن.

**بۆچی سەردانی دەکرێ**

ئەو رۆژەی گۆڤارەکەمان سەردانی مەزاری ئەم پیاوچاکەی کرد (چوارشەممە) بوو، ئافرەتێکی زۆر لەلای گۆڕەکە، واتە لەژێر زەوی و لە دەرەوە دانیشتبوون ژمارەیان لە (٥٠) ئافرەتی تەمەن جۆراوجۆر زیاتر دەبوو، بۆ ئەوەی زانیاری دەربارەی نەریتەکانی سەردان و هۆکارەکانی ئەم کۆبوونەوەی ئافرەتان وەربگرین، پرسیاری مجێوری مەزارگەکەمان کرد، بەلام مجێورەکە ئافرەتێکی بەساڵاچوو بوو، زۆر بە ئەستەم لێک حالی دەبووین، بۆ خوشکە (سامیە مەحموود) کە بەخۆی دەگوت مەلا و خوێندەوارییەکی باشیشی هەبوو لەبریتی مجێورەکە هاتە ئاخافتن و گوتی: لەبەر ئەوەی مجێوری ئەم نزرگایە تەنها رۆژانی چوارشەممە دەرگامان بۆ دەکاتەوە، ئێمە تەنها ئەو رۆژە سەردانی ئەم چاکە دەکەین و سەردانەکەش هەر بۆ ئافرەتان نییە، هەروەک ئافرەتێکی زۆر لێرە دەبینن پیاوانیش زۆر دێنە ئێرە و فاتیحە بۆ ئەم پیاوچاکە دەخوێنن، بەلام بەزۆری ئافرەت سەردانی دەکەن، لە وەلامی پرسیاری ئەو حالەتانە چین، کە ئافرەتان لەو پیاوچاکەی دەخوازن خوشکە سامیە گوتی: زۆرن، لەوانە خەلکێکی زۆر بۆ نەخۆشی، بەتایبەتی باداری و رۆماتیزم و ئیفلیجی سەردانی ئەو مەزارگەیە دەکەن، من بە چاوی خۆم بینیومە نەخۆشیان بە چواردەستە هەلگرتووە و پاشان بە تەواوی چاکبۆتەوە، جارێکیان ئافرەتێکیان کە ماوەیەک بوو بە دەست ژانەسەرەوە دەینالاند، پاش ئەوەی ئافرەتەکە بۆ ماوەیەک لە خوارەوە لەلای پیاوچاکەکە خەوت بە ئاگا هاتەوە و گوتی: لە خەونما یەکێک مستێکی سەرەوانده سەرم و ژانە سەرەکەی بە تەواوی چاکبۆوە.

**نهێنی دارتووەکە**

یەکێک لەو ئافرەتانەی بە بەردەوامی سەردانی ئەم چاکە دەکات، خوشکە (ئامینە عەبدوللا)یە، کە ئافرەتێکی بەساڵاچوو بوو دەیگوت: زۆر لەمێژە من هاتووچۆی ئەو پیاوچاکە دەکەم، چونکە خۆم شتم لێی بینیوە، کوڕێکم لە بازاڕ نەخۆش کەوت و لە رێگاوە بە دەماکەوت و پزیشکەکان گوتیان دلی بێهێزە، بەلام هاتمە لای ئەم چاکە و تەنها سێ دەنکە تووی ئەم دارەم بۆ برد (ئاماژەی بۆ دارتووە بەرزەکەی نزیک گلکۆیەکە کرد) دەم و دەست چاک بۆوە.

**بۆ چوونە هەندەرانیش سەردانی دەکەن**

خوشکە (فەوزیە رەشید) ئەویش پێیگوتین مەگەر کارێکی زۆر گرنگم هەبی یا نەساخ بم، ئەگینا هەموو چوارشەممەیەک سەردانی ئەو پیاوچاکە دەکەم. هەروەها گوتی: براژنەکەم چەندین ساڵ بوو شووی کردبوو منداڵیان نەدەبوو، بەلام چەندین جار سەردانی ئەم پیاوچاکەی کرد، سوپاس بۆ خوا ئێستا دوو کوڕی هەیە، بەلام لە هەموو حالەتەکان سەیرتر ئەوەبوو، کە خوشکە (مریەم عەباس) بۆی گێڕاینەوە و گوتی: کوڕەکەم نیازی هەندەرانی هەبوو، بەلام دووجار سنووورداش کرابۆوە، کەچی رۆژێک هاتە سەرمەزاری ئەو پیاوچاکە و پاڕایەوە، خواکردی جاری سێیەم رزگاری بوو ئێستا ئیقامەی وەرگرتووە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش) ژمارە (٦) وەرگیراوە.



لعمرك هذا العام قد شاب طفلنا من البرد والقر الذي فيه صابنا

وفي نصف كانون الثاني تواردت مع الزمهرير الصر حيث اصابنا

ودجلة اضحى فوقها الثلج راكما وزاد علينا البرد شتت حالنا

وصار لنا جسر لغاد ورائح عز عليه كالضعيف حمالنا

دعونا زوال البرد عند اضطرارنا فزال بفضل الله رفقا بحالنا

عسى ربنا يعفو ويلطف منه ويجمعنا من بعد شتت حالنا

اشار انسان لحال تاريخ بدا لقد اخذ البرد الكثيف مياهنا

سنة ١١٧٠

بدا ٧
لقد ١٣٤
اخذ ٤٨
البرد ٢٣٧
الكثيف ٦٤١
مياهنا ١٠٢
١١٧٠

ئەو دیکۆمێنتەی کە ساڵی گرانی نیشان دەدات، لەئەرشیفی خوالێخۆشبوو قازی رەشاد موفتی- هەولێر

# داگیرکرانی هەولێر لە لایەن عوسمانییەکانەوە (١٥٣٥-١٨٣٦ز)

دکتۆر خەلیل عەلی موراد
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی موسڵ

بەگشتی نووسین لەسەر مێژووی هەولێر لە سەردەمی عوسمانییەکان بۆ مێژوونووسان کارێکی وا ئاسان نییە. ئەویش لەبەر نەبوونی زانیاری تەواو لەسەر ئەو شارە. بەلام لەگەڵ ئەوەش هەوڵدەدەین لەڕێگای ئەم چەند لاپەڕە کەمەوە سەرنجە سەرەکییەکانی مێژووی سیاسی شاری هەولێر بدەین، لەمیانەی داگیرکرانی یەکەمی ئەو شارە لەساڵی (١٥٣٥ز) و داگیرکرانی دووەمی لەساڵی (١٨٣٦ز)، لە ڕەوتی هەڵمەتێکی سەربازی عوسمانییەکان دژی میری کوردی بەناوبانگ محەممەد پاشا ڕەواندزی.

لەسەرەتای سەدەی شانزدەیەمی زایینی هێزێکی نوێ و گرنگ لەڕۆژهەلاتی ئیسلامی سەری هەڵدا، کە ئەویش دەوڵەتی سەفەوییە شیعەکان بوو لەئێران. دامەزرێنەری ئەو دەوڵەتە شا ئیسماعیلی سەفەوی (١٥٠١-١٥٢٤ز)، توانی بەتەواوی بەسەر ئێراندا زاڵبێت. هەروەها باشووری ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵی لەنێوان هەردوو ساڵی (١٥٠٥-١٥٠٧ز) و زۆرینەی خاکی عێراقی لەساڵی ١٥٠٨ز داگیرکرد[1]. لەسەر ئەم بنەمایە زۆرینەی شار و شارۆچکەکانی کوردستان کەوتنە ژێر دەسەلاتی سەفەوییەکان لەبەر چەند هۆکارێک، بەلام بوار نییە لێرە باسیان لێوە بکرێ. دەوڵەتی عوسمانی بینی دەوڵەتی سەفەوی لەسەر سنووری ڕۆژهەلاتەکەیانەوە مەترسییەکی زۆری پەیدا کردووەو ناکرێ لێی بێدەنگ بن، بۆیە لە بەهاری ساڵی ١٥١٤ز سوڵتانی عوسمانی سەلیمی یەکەم (١٥١٢-١٥٢٠ز) بەسەرۆکایەتی هەڵمەتێکی سەربازی گەورە دژی دەوڵەتی سەفەوی وەستا. ئەوەبوو لەشەڕی چالدێران ڕۆژی ٢٣ی ئابی ١٥١٤ عوسمانییەکان سەرکەوتنێکی گەورەیان لەسەر سەفەوییەکان تۆمارکردو وەدەست هێنا. بەلام شا ئیسماعیل سەفەوی پاش ئەوەی سوپاکەی زەرەرو زیانێکی زۆری بێ شوماری پێکەوت، گۆڕەپانی جەنگی جێ هێشت و هەلات. لە ٥ی ئەیلوولی ١٥١٤ز سوڵتان سەلیمی یەکەم پێی نایە شاری تەورێزی پایتەختی دەوڵەتی سەفەوییەکان. پاش چەند ڕۆژێک پاشەکشەی کردو چووە شاری (ئەماسیە) لە ئەنادۆڵ و زستانی ساڵی ١٥١٤-١٥١٥ز لەوێ بەسەر برد[2].

شەڕی چالدێران ڕاستەوخۆ ڕەوشی سیاسی و سەربازی لەکوردستان وورووژاند. خۆ سازدانی سەفەوییەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەڵمەتە سەربازییەکەی سوڵتان سەلیمی یەکەم وای کرد، کە بەشێکی

سوپاکەیان لەناوچەکە پاشەکشە پێبکەن. ئەمەش کاری لەهێزی سەفەوییەکان لەناوچەکەدا کرد. لەلایەکی تر سولتان سەلیمی یەکەم بەو بیرۆکەیە قایل بوو، کە میرو سەرکردە کوردەکان بۆ لای دەوڵەتی عوسمانی رابکێشێ و هانیان بدا لە ناوچەکانیان دژی سەفەوییەکان بوەستن. ئەم کاردش پشتی بەکەسایەتییەکی کورد بە ناوی ئیدریس بەدلیسی بەست، کە نزیک بوو لێیان[٣]. ئەوە بوو لەدووماهیدا پاش ئەوەی گەشتێکی بەکوردستاندا کرد، لەکارەکەیدا سەرکەوتنی وەدەست هێناو لەو ماوەیەدا فەرمانڕەوایانی موکری و برادۆست و بابان و سۆران و ئامێدی و بۆتان و... هی تری هێنایە ریزی عوسمانییەکان و هانی دان، کە ناوچەکانیان لە سەفەوییەکان پاک بکەنەوە[٤] بەو مەرجەی، کە دەوڵەتی عوسمانی دەست لەکاروباری میرە کوردەکان وەرنادات و ئەوەندە بەسە بەنیسبەت ئەوان، کە وەلایان هەبەو کۆمەکی سەربازی دەکەن. جا لەسەر ئەوەی پێشتر لەسەری رێککەوتن ژمارەیەک لەمیرە کوردەکان لەناوچەکانیان دژی سەفەوییەکان وەستان. ئەوەی پەیوەندیارە بەهەولێر میری سۆران سەیدی کوڕی شا عەلی بەگ دژی سەفەوییەکان کەوتە بزاوت و لەرزگارکردنی هەردوو شاری کەرکووک و هەولێر سەرکەوتنی وەدەست هێناو جڵەوی دەسەڵات و هەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی خستە ئەستۆی خۆی. ئەمەش لەساڵی ٩٢٣ک-١٥١٦ز تا مردنی لەساڵی ٩٣٢-١٥٢٥ز جڵەوی حوکمڕانی میرنشینی سۆران و پاشگرەکەی بەدەستەوەبوو[٥]. پاڵپشت بەو هەڵکەوتە ناشێ ئەو گێڕانەوەیە بەڕاست وەربگرین، کە دەڵێت لەساڵی ١٥١٨ز کەرکووک و هەولێری لە سەفەوییەکان رزگارکردوو تەسلیم بەعوسمانییەکانی کرد[٦].

پاش سەیدی بن شا عەلی بەگ میر عیززەدین شێری کوڕی فەرمانڕەوای میرنشینی سۆرانی گرتە دەست، کە بەوە ناسراوە رێزی لەزاناو زانست گرتووەو ژمارەیەک مزگەوت و قوتابخانەی ئایینی لەهەردوو شاری کەرکووک و هەولێر دروست کردووە(٧) تا ساڵی ١٥٣٥ز لەحوکم گێڕان بەردەوام بوو. لەکۆتایی ساڵی ١٥٣٤ز سولتانی عوسمانی سلێمان قانوونی (١٥٢٠-١٥٦٦ز) شاری بەغدای فەتح کرد و بەیەکجارەکی کۆتایی بەحوکمی سەفەوییەکان لەو شارە داهێنا. پاش چەند مانگێک بەمەبەستی رێکخستنی ئیدارەی شارەکەو بەڕێوەبردنی ناوەڕاستی عێراق مایەوە، بەغدای جێهێشت و بەرەو وڵاتەکەی گەڕایەوە، کاتێ گەیشتە شوێنێک پێی دەوترا (گوک تەپە) بیستی کە شا تەهماسبی سەفەوی (١٥٤١-١٥٧٦ز) نامەیەکی بۆ میری سۆران عیززەدین شێر ناردووە، تیایدا هاتووە سولتانی عوسمانی گومانی لێ پەیدا کردووەو فەرمانی کوشتنی داوە[٨]. سولتان سلێمان قانوونی بەڵێنی دا فەرمانڕەوای هەولێر بداتە دەست میر ئێزیدی حوسێن بەگی داسنی. پاشان سولتانی عوسمانی میرنشینی سۆرانی بەتەواوی خستە سەر هەولێر، ئیدارەکەشی تەسلیم بەمیری ئێزدی ناوبراوەوە کرد[٩]. لەسەر ئەم بنەمایە ساڵی ١٥٣٥ز لە سەرەتاو بە یەکەم جاری داگیرکردنی هەولێر دێت لەلایەن عوسمانییەکانەوە.

هیچ یەکێک لەبنەماڵەی فەرمانڕەوای سۆران بەم بارە رازی نەبوون، یەکێ لەوانە، کە ناوی سەیفەدین کوڕی میر حوسێن کوڕی بوداق بوو هەوڵی گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی دا، بەڵام لەبەرامبەر حوسێن بەگی داسنیدا سەرنەکەوت. ناچاربوو پەنای بۆ ئەردەڵان بەگ بردو داوای هاوکاری لێ کرد، بەڵام هیچی لەو وەدەست نەهێناو گەڕایەوە سۆران و خەڵکەکە پاڵپشتییان کردو بەمەوە توانی نشوست بەمیر حوسێن بەگی داسنی بێنێ و هەولێر بگەڕێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی. چارەنووسی میری داسنی بەوە گەیشت لە ئەستەنبوڵەوە داواکراو میر سولتان سلێمان قانوونی، پاش ئەوەی لەبەرگریکردن نشوستی هێناو هەولێری گێڕایەوە دەست میر سەیفەدین، کوشتی[١٠]. جا گەر زانیمان، کە میر ئەردەڵان بەگ لەساڵی ٩٤٢ک-١٥٣٥-١٥٣٦ز کۆچی دوایی کردووە[١١] بۆمان دەردەکەوێت بزاوتی سۆرانییەکان لە گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی هەولێر لەژێر داگیرکردنی عوسمانییەکان بەماوەیەکی کورت بووە. سولتان سلێمان قانوونی، حاکمی ئامێدی و ژمارەیەک میری کوردی دیکەی راسپارد میر سەیفەدین بکوژن، بەڵام هەوڵەکانیان پووچەڵ کرایەوە.

سەیفەدین لە فەرمانڕەوایەتی بەردەوام بوو، پاشان هەولێی دا لەلایەن سوڵتانی عوسمانییەوە لێی ببووردرێت. ئەوە بوو لەدووماهیدا ئەو دەرفەتە قۆزرایەوەو لە ٤ی زیلحەجەی ٩٦٦ک-١٥٥٨ز فەرمانی کوشتنی درا[١٢]. پاشان میری عوسمانی بەڵێنی دا حوکمڕانی شاری هەولێر بداتە دەست میری ئامێدی سوڵتان حوسێن بەگ [١٣]، کە بەهۆی بەشداریکردنی لەهەڵمەتە سەربازییەکانی عوسمانی شەرەفمەندایەتییەکی گەورەی لای سوڵتانی عوسمانی هەبوو، کە لەدژی سەفەوییەکان ئەنجامدراو هەمیشە لاگیری ئەوانی دەکرد[١٤]. لێرەوە زانیاری زیاترمان بەدەستەوە نییە، دواتر کێ دەسەڵاتی هەولێری گرتە دەست لەو ماوەیەی، کە لەسەدەی شانزەیەمی زایینی مابوو. جگە لەچواریان نەبێ، کە تەنیا ناوی یەکەمیان لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا هاتووە، ئەوانیش بەکر بەگ، کە لەساڵی ٩٦٧ک-١٥٥٩ز، ئیسماعیل بەگ لەساڵی ٩٨٢-٩٨٥ک/ ١٥٧٤-١٥٧٧ز، محەمەد بەگ لەساڵی ٩٨٥ک-١٥٧٧-١٥٧٨ ز، ئەحمەد بەگ لەساڵی ٩٩١ک- ١٥٨٣ز دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست[١٥]. عوسمانییەکان لەشاری هەولێر بنکەیەکی لیوایان دامەزراند، کە سەر بەویلایەتی بەغدا بوو، بەدرێژایی ئەو سەدەیە، سەدەی شانزەیەمینی زایینی بەردەوامبوونی هەبووە[١٦]. لە سەدەی حەڤدەیەمی زایینی بوو، سەر بەویلایەتی شارەزوور، کە بنکەکەی لەشاری کەرکووک بوو[١٧]. شایانی باسە عوسمانییەکان هەولێریان بەبنکەیەکی سەربازی گرینگ لە ناوچەکە لەقەڵەم دا، بۆیە پارێزراوێکی بەهێز بوو بۆ هێزە (ئینکیشارییەکانی) عوسمانی[١٨].

دەرکەوتن و گەشەسەندنی هێزی میرنشینی بابانییەکان بوو لەماوەی بەکۆتاهاتنی سەدەی حەڤدەیەمی زایینیدا، لەساڵی ١٦٩٠ز حاکمی میرنشینی بابان سلێمان بابانی (١٦٦٩-١٦٩٩ز) کۆنترۆڵی شاری کەرکووکی کردو تا ساڵی ١٧٠١ز بەشێوەیەکی بەردەوام لەژێر کۆنترۆڵی بابانییەکان مایەوە[١٩]. ئەمەش وای لەعوسمانییەکان کرد هەر لەدەستپێکی سەدەی هەژدەیەمی زایینی ویلایەتی شارەزوور هەڵبوەشێننەوە[٢٠]. ئەو پاشگرە هەروەها ئەوانەی کەرکووک بوون گرتییەوە، لەوانە شاری هەولێر. هەولێر تادەیەی سێیەمی سەدەی نۆزدەیەمی زایینی سەر بەویلایەتی بەغدا مایەوە. لەساڵی ١٧٦٦ز گەڕۆکی دانیمارکی "کارستن نیبور" سەردانی شاری هەولێری کردووە: ئاماژەی بەوە داوە، کە هەولێر سەر بەویلایەتی بەغدا بووە، سەربازگەیەکی هێزەکانی ئینکیشاری لێ بووە[٢١]. ئەو سەرنجە گەڕۆکی فەرەنسی ئۆلیڤییە، کە لەدەیەی کۆتایی سەدەی هەژدەیەمی زایینی سەردانی هەولێری کردووە، جەختی لەسەر کردۆتەوە[٢٢]. هەروەها سەرچاوە مێژووییەکانیش ئاماژەیان بەو سەرنجە داوە. لەساڵی ١٢١٩ک-١٨٠٤ز حاکمی هەولێر سلێمان بەگ، خوارزای والی بەغدا عەلی پاشا ١٨٠٢-١٨٠٧ز) بوو[٢٣]. لەساڵی ١٢٣٦ک-١٨٢١ز والی بەغدا داود پاشا (١٨١٧-١٨٣١ز) براکەی خۆی ئەحمەد پاشای بەحاکم لە هەولێر دامەزراند[٢٤].

بەهەرحاڵ بەغدا بەشێوەیەکی بەردەوام دەسەڵاتی بەسەر هەولێردا شکاوە، هەندێ جاریش بەکردەنی بۆ دەسەڵاتدارێتی میرەکانی بابان ملکەچ بووە. ئەو راستییە "ولستید"ی گەڕۆک جەختی لەسەر کردۆتەوە، کە لەساڵی ١٨٣٠ز سەردانی بەغدای کردووەو لە نووسینێکیدا دەڵێت: "وێڕای بەرفراوانبوونی دەسەڵاتی ویلایەتی بەغدا بەفەرمی، لەباشووری بەسرە تا ماردین لەباکوور، لەڕۆژهەڵات لەسنووری کوردستان و فارس تا دەگاتە رۆژئاوا: سنووری سوریاو فەلەستین. خاکێکی دیکەی زۆر، کە کۆچەرە کوردەکان لەسەری دەژیان بەناو دانیان بە سوڵتان پاشا دادەنا، نەک بەڕاستی بەحاکمی خۆیانی دابنێن"[٢٥]. ولستید ئەو سەرنجەی لەکاتێکدا نووسیوە، کە محەمەد پاشای گەورە میری رەواندز بوو، خۆی سازدابوو هەولێر بێنێتە ژێر میرنشینی خۆی، کە لەممەودوا باسی لێوە دەکەین.

لە راستیدا زانیاری تەواومان بەدەستەوە نییە سەبارەت بە رووداوەکان، کە لەو ماوە مێژووییەدا

هەولێر بەخۆیەوە بینیبێ. تەنیا شتێ نەبێ لەوە لە(لونکریک) بەگوتەی خۆی ئاماژەی پێداوە: "شتێکمان بەدەستەوە نەما لەدۆسییەکان، کە بەڵگە بەدەستەوە بدەن لەسەر مێژووی بەشە نیشتەجێبووەکان و فەرمانڕەواکان لەویلایەتی شارەزووردا"[٢٦]. بەڵام کەمێ سوود لەو ڕێنماییە مێژووییانە لە ڕووداوەکان وەردەگرین، کە لەهەولێر لەو ماوەیەدا ڕوویانداوە:

- لەساڵی ١٦٢٣ز کاتێ سەفەوییەکان بەغداو موسڵیان داگیرکرد، میر ئەردەڵان خان ئەحمەد خان ئەو دەرفەتەی قۆستەوەو دەستی بەسەر کەرکووک و تەواوی ناوچەکانی شارەزووردا گرت[٢٧]. بەڵام خەسرۆ پاشا میری گەورەی عوسمانی لەنواندنی هەڵمەتێکی سەربازیدا، کە خۆی سەرکردایەتی کرد لەساڵی ١٦٢٩ز توانی بەغدا لە سەفەوییەکان وەربگرێتەوە و هەولێرو کەرکووک بگەڕێتەوەو بۆ ئەوەی[٢٨] ئاشکرایە هەڵمەتە سەربازییەکەی خەسرەو پاشا لە وەدەستهێنانی دوا ئامانج نشوستی هێنا، بۆیە سوڵتانی عوسمانی مورادی چوارەم (١٦٢٣-١٦٤٠ز) لەساڵی ١٦٣٨ز بەخودی خۆی سەرکردایەتی هەڵمەتێکی سەربازی کردو توانی بەغدا لە سەفەوییەکان وەربگرێتەوە. کوردیش لەمیانەی ئەو هەڵمەتەدا، لەوانە سەرۆکی خێڵە کوردییەکان لەموسڵ و هەولێرو کەرکووک و شارەزوور بەشداربیان کرد[٢٩].

- حەسەن پاشای والی بەغدا (١٧٠٤- ١٧٢٣ز) سەرکردایەتی دوو هەڵمەتی سەربازی کرد لەدژی هۆزەکانی کورد، لەوانە بلباس لەرۆژهەڵاتی هەولێردا. هەڵمەتی یەکەم لەساڵی ١١٢٣ک-١٧١١ز[٣٠]، هەڵمەتی دووەم لەساڵی ١١٢٦ک-١٧١٤ز[٣١].

- کاتێ شای ئێران نادر شای ئەفشار (١٧٣٦-١٧٤٧ز) لەهاوینی ساڵی ١١٥٦ک-١٧٤٣ز عێراقی داگیرکرد، هەولێر یەکێک بووە لەو شارانەی گەمارۆدراون کاتێ لەشکر بەرەو موسڵ بەرێگەوە بووە بۆ موسڵ، پاشان دەستی بەسەرداگرت (زۆربەی خەڵکەکەی کوشت، ئافرەت و منداڵەکانی فەسادکردن و شتی خراپ نەما نەیکات). وەک یاسین کوڕی خەیروڵڵا عەمەری مێژوونووس باسی دەکات[٣٢]. بەڵام ڕەسول حاوی کەرکووکی مێژوونووس، سەرەتا باس لە باشییەکانی نادر شا و هێزەکەی دەکات، دواتر باس لەدەست درێژیکردنی بۆ سەر خەڵک و ناموسیان و پارەو پوولیان دەکات... پاشان دەڵێت نادرشا هەولێری داگیرکرد: "ئەوەی بەسەر خەڵکی شاری کەرکووکیان هێنا، بەسەر خەڵکی شاری هەولێریشیان هێنا"[٣٣]. بەڵام سەرچاوەکان جیاوازییان هەیە سەبارەت بە ماوەی ئەو ئابلۆقەیەی نادر شا بەسەر هەولێری سەپاند، ئایا چەند کاتژمێرێک بووە یان چەند ڕۆژێک[٣٤]؟ ئەو داگیرکردنەی ئێران بۆ سەر شارەکان درێژەی نەکێشاو نادر شا سوپاکەی لەعێراق پاش چەند مانگێکی کەم کێشایەوە.

- لەساڵی ١١٦٤ک/ ١٧٥٠-١٧٥١ز سێ میری بابان سەلیم پاشاو عوسمان پاشاو قۆچ پاشا دژی والی بەغدا مەملوکی سلێمان پاشا ئەبو لەیلە (١٧٥٠-١٧٦٢ز) وەستان. وادیارە هەولێر هاو هەڵوێست بووە لەگەڵ بابانییەکان. سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: والی مەملوکی فەرمانێکی نووسی بۆ (شارەکانی بابان و کۆیە، هەریرو دورنەو هەولێرو زەنگەنە، داوای لەزاناو پیاوماقووڵان و میرو سەرۆکەکان و پیرو تەواوی خەڵکەکان کرد ملکەچی فەرمانەکانی بن....[٣٥]. لەپاش ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا لەنێوان هێزەکانی والی بەغداو هێزی میرەکانی بابان، کە ماوەی چەند ڕۆژێکی خایاند، سەلیم پاشا هەڵات و عوسمان پاشا کوژراو قۆچ پاشاش پەنای بۆ هەولێر هێناو لەوێ پاڵپشتی کرا. والی بەغدا بڕیاری دا هێرش بکاتە سەر هەولێر، پاشان بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک گەمارۆی قەڵاتی دا. دواتر توانی بچێتە ناو قەڵات، پاش ئەوەی ڕایگەیاند کەوا ژیانی خەڵکەکە دەپارێزێت، بۆ ئەوەی دەرگای قەڵاتی بۆ بکەنەوە. بەهەرحاڵ قۆچ پاشا بەدڵێرو ئازایەتی ناسرابوو، یەکێک بووە لەو بلیمەتانەی لەساڵی ١٧٤٣ز بەرگری لەشاری موسڵ کرد لەدژی نادر شادا[٣٦] خۆی بەدەستەوە نەداو لەدژی والی بەغدا ئازایانە جەنگا تا کوژرا[٣٧]. والی سلێمان پاشان ئەبو

لێلە گەڕایەوە بەغدا پاش ئەوەی سلێمان پاشای بابان، کە ئامۆزای سەلیم پاشا بوو، بەموتەسەریفی بابانی لەشوێن ئەو دامەزراند. بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان لەوەی لەم دواییە روویدا (والی میرنشینی بابان و کۆیەو هەریرو شاری هەولێرو کەرتەکانی کۆیری و قەرە حەسەن و زەنگابادو جەبسان، کە لەنێوان سالانی ١١٦٤-١١٧٤ک/ ١٧٥٠-١٧٦٠ز حوکمڕانی کرد بەبێ ئەوەی پێی نارەزا بن یان بەرهەلستکار بن[٣٨]. هەر چەندە هەندێ لەو ناوچانە لەوانە شاری هەولێر لەرووی ئیدارییەوە هەر وەکو باسمان کرد سەر بەشاری بەغدا بوو.

سەرەڕای ئەوەی شاری هەولێر بەهۆی ئەو رووداوانە بەرەوشێکی ئەستەم تێپەڕی، لەلایەکی تر بەهۆی گرانی و هەلاوسانی نرخ و بلاوبوونەوەی پەتاو نەخۆشی کاریگەری ئاشکرایان لەسەر هەولێرو دانیشتوانەکەی هەبووە. بۆ نموونە لە سالانی ٩٩٠ک - ١٥٨٢ ز، ١٠٨٨ک/ ١٦٧٧ - ١٦٧٨ ز، ١١٠٧ک، ١٦٩٥ - ١٦٩٦ ز، شەپۆلی گرانی و هەلاوسانی نرخ تەواوی ناوچەکانی گرتەوە. لەسالی ١١٨٦ک/ ١٧٧٢- ١٧٧٣ز پەتای تاعون هەولێرو کەرکووک و بەغداو چەند شارێکی دیکەی عێراقی گرتەوە[٣٩]. ئەمەش بەپێی ئەوەی مێژوونووس یاسین نوری خەیروللا عەمری باسی لێوە دەکات ئەو پەتایە کاریگەری زۆر توندی لەسەر هەولێر هەبوو: (تا وای لێ هات زۆرینەی خەلکەکەی کوشت و کەمێک لێی رزگار بوون)[٤٠].

ئەوەی لەپێشەوە باس کرا، کە هەولێر لەو قۆناغە مێژووییەدا بەخۆیەوە بینیوە، دانیشتوانەکەی بەپلەیەکی زۆر لەکەمی داوە، لەکاتێکدا ئۆلیڤیەی گەڕیدە ژمارەی دانیشتوانی ئەو شارە لەدوا دەیەی سەدەی هەژدەیەمی زاییینیدا تەنیا بە (٢٠٠٠) کەس دەخەملێنێت[٤١]. بێگومان ئەو ژمارەیە زۆر راست و ورد نییە، چونکە "جەیمس بکنغهام"ی گەڕیدە، کە لەسالی ١٨١٦ز بەهەولێردا تێپەڕیوە دەلێت: "پێیان گوتین ژمارەی دانیشتوانی ئەو شارە لەدە هەزار کەس زیاترە، کە لەوانەیە نیوەی ئەو ژمارەیە دروست و راست بێ"[٤٢]. واتە ژمارەی دانیشتوانی ئەو شارە بەنزیکەی (٥٠٠٠) کەس خەملێندراوە. بەبێ تێروانین لە وردی ئەو خەملاندنە.

هەر لەسالی ١٨٣٠ز شاری هەولێر پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆوە بینی و کەوتە سەر میرنشینی سۆران، کە ئەوسا بنکەکەی رەواندز بوو. یەکێ لەگەورە حاکمەکانی ئەو میرنشینە محەمەد پاشای رەواندزی توانی لەنێوان سالانی ١٨٢٦-١٨٣٦ز هێزو دەسەلات و سەروەری بۆ ئەو میرنشینە بگەڕێنێتەوە. هاوکات ژمارەیەک لەشارەکانی کوردستانیش لەخۆ بگرێت.. یەکێ لەو هۆکارانەی یاریدەدەری ئەو کارە بوون، سەرقالبوونی حکومەتی مەمالیکەکان بوو لەبەغدا لەدوا ویلایەتدا، کەداود پاشا بوو کەوتە کێشەو ململانێ لەگەل دەولەتی عوسمانی و هەلمەتێکی سەربازی بەسەرکردایەتی عەلی رەزا پاشا ئالدز لەسالی ١٨٣١ز کردە سەر شاری بەغداو بەسەر دەسەلاتی مەمالیکەکاندا زال بوو. محەمەد پاشای رەواندزیش توانی میرنشینە کوردییە بچووکەکان بێنێتە ژێر دەسەلاتی خۆی، وەک شێروان و برادۆست، پاشان هەردوو ناوچەی سورچی و خۆشناوی هێنایە سەر میرنشینەکەی. دەستی بەسەر هەریریش داگرت پاش ئەوەی حاکمە بابانییەکەی هەلات. دواتر بەهێزێکی سەربازی گەورە بەرەو هەولێر کشاو دوای ئەوەی ئابلوقەی لەسەر توندکردن دەستی بەسەردا گرت، پاشان چووە شارۆچکەی کۆیری و دەستی بەسەر داگرت. ئینجا کەوتە رێکخستنی کاروبارەکانی ولات[٤٣]. لە دووماهیدا توانی زێی بچووک بکاتە سنووری باشووری میرنشینەکەی. تا وای لێ هات والی بەغدا عەلی رەزا پاشا ئالدزی ناچارکرد بەهۆی هێزو تواناکەی دانی پێدابنێت. میر محەمەد پاشا هەر بەوە نەوەستا سنوورەکەی بەرفراوانتر کرد، بەوەی دەستی بەسەر شارەکانی ئاکرێ و ئامێدی و دهۆک و زاخۆش داگرت. دواتر کەوتە نامە گۆڕینەوە لەگەل محەمەد عەلی پاشای والی میسر (١٨٠٥-١٨٤٩ز) کە لەکۆتایی سالی ١٨٣١ز دا سوپاکەی دەستی کرد بەکشان بەرەو ولاتی شام لەپێناو هەماهەنگکردنی هەولەکانیان لەدژی دەولەتی

عوسمانیدا[٤٤].

ئەو بەرفراوانییەی میرنشینی ڕەواندز لەکاتێکدا هات، کە دەوڵەتی عوسمانی دەستی کرد بەکارنامەیەک لەپێناو گەڕاندنەوەو، سەپاندنی دەسەڵاتە ناوەندییەکان و نەهێشتنی هێزی ناوخۆ لە ویلایەتە عێراقییەکان و ویلایەتەکانی دیکەی عوسمانی. میرنشینە کوردییەکانیش یەکێک بوون لە بەرایی ئەو ئامانجە سیاسییەدا و لە دەستپێکدا میرنشینی ڕەواندز کەوا کۆمەکی عوسمانییەکانی کرد، کەدەست بەسەر ئەو میرنشینەدا بگرن، گرێبەستی ئەو هودنەیە بوو لەگەڵ محەمەد عەلی پاشا بەناوی هودنەی (کوتاهیە) لەساڵی ١٨٣٣دا. هەروەها زاڵبوونیان بەسەر بنەماڵەی جەلیلییەکان لەموسڵ لەساڵی ١٨٣٤ز. لەساڵی ١٨٣٦ز دەوڵەتی عوسمانی والی سیواس، ڕەشید پاشای ڕاسپارد سەرکردایەتی هەڵمەتە سەربازییەکانی عوسمانی بکات. هێزەکانی موسڵ و بەغداو دیاربەکرو موش و بەدلیس و ئەرزەرۆم بەمەبەستی زاڵبوون بەسەر محەمەد پاشا ڕەواندزیدا پاڵپشتی بکەن[٤٥]. یەکێ لەهێزەکان، کە والی بەغدا عەلی ڕەزا پاشا ئالدز سەرکردایەتی دەکرد، توانی دەست بەسەر کۆیێدا بگرێت، دواتر دەست بەسەر هەولێردا بگرێت پاش ئەوەی بۆ ماوەی سێ مانگ گەمارۆیان دا[٤٦]. شایانی باسە ئەمەیان جاری دووەمە، کە عوسمانییەکان دەست بەسەر ئەو شارەدا بگرن و هەولێر ڕاستەوخۆ بۆ ژێر ئیدارەی خۆیان ملکەچ بکەن، هەر لەو کاتییەوە تا هێزەکانی داگیرکەری بەریتانیا لەکۆتایی ساڵی ١٩١٨ز پێی نایە ناو شاری هەولێرو داگیری کرد، هەولێر لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوو.

**سەرچاوەکان:**

١- ستيفن هيمسلي لونكريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة جعفر خياط، ط٣ (بغداد- ١٩٦٢) ص ص١٧-١٨.

2-Roger M. Sauonry, "The conso lidation of Safawid power in Persia" Der Islam, No.41, 1965, PP. 75-77 Ibid, P.90.

٣- مەلا ئیدریسی بەدلیسی لە دەرباری سوڵتانەکانی دەوڵەتی ئاق قۆینلۆی تورکمانی لە تەوریز کاری کردووە، دوای ڕووخانی لە ساڵی (١٥٠١ز) لەسەر دەستی سەفەوییەکان، بەدلیسی دەچێتە ئەستەنبوڵ لە دەرباری سوڵتان بایەزیدی دووەم (١٤٨١- ١٥١٢ز) و چەندین کتێبی دیکەی لە زانستی ئایینی و ئەدەب هەیە. لە ساڵی (٩٢٧ک- ١٥٢٧ز) لە ئەستەنبوڵ کۆچی دوایی کردووە، هەر لەوێ نێژراوە. بۆ ئەمە بڕوانە: ، بروسە لی محمد طاهر، عثمانلی مؤلفری (اسطنبول- ١٣٤٢هـ) ج٣، ص ص٦-٧.

4- M.V. Bruinessen & H. Boeschoten, Euliya Gelebi in Diyar Bekir (Leiden- 1988) PP.14-15.

٥- الامير شرف خان البدليسي، شرفنامه، ترجمة: محمد جميل الملا احمد الروزبياني، ط٢ (اربيل- ٢٠٠١) ص٤٥٨، محمد أمين زكي، خلاصة تاريخ الكرد و كردستان، ترجمة: محمد علي عوني، ط٢ (بغداد- ٢٠٠٥) ق١، ص٢٤٣.

٦- انظر تلك الرواية في، يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ترجمة: عدنان محمود سلمان (استانبول- ١٩٨٨) ج١، ص٢٣٦، علي شاكر علي، ولاية الموصل في القرن السادس عشر، اطروحة دكتوراه، كلية الاداب- جامعة الموصل، ١٩٩٢، ص٥٧.

٧- البدليسي، المصدر السابق، ص٤٢٦، هـ٦.

٨- عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٤، (بغداد- ١٩٤٩) ص ص٤٠-٤١، کەچی لە شەرەفنامەدا هۆکارەکەی بەم جۆرە هاتووە: (لەوکاتانەدا کاری ناشرینی لە بەرامبەر دەربار و پێوەندی سوڵتانی لێ دیتراوە) سەرەنجام فەرمانی کوشتنەکەی جێبەجێ کرا) المصدر السابق، ص٤٥٩.

٩- البدليسي، المصدر السابق، ص ص٤٥٩-٤٦٠.

١٠- المصدر نفسة، ص٤٦١، العزاوي، المصدر السابق، ص٤٣.

١١- علي اكبر كردستاني، الحديقة الناصرية في تاريخ وجغرافيا كردستان، ترجمة جان دوست (اربيل- ٢٠٠٢) ص٩٦.

١٢- البدليسي، المصدر السابق، ص ص٤٦١-٤٦٢.

١٣- العزاوي، المصدر السابق، ص ص٦٥، ٢٥٢.

١٤- بۆ ئەم بەشداریکردنانە بڕوانە: محفوظ العباس، امارة بهدينان العباسية (الموصل- ١٩٦٩) ص ص٥٦-٥٧.

١٥- عماد عبدالسلام رؤوف، الاسر الحاكمة ورجال الادارة والقضاء في العراق في القرون المتأخرة (بغداد- ١٩٩٢) ص٢٧٤.

16-"Turkiye Dianet Vakfi, Islam

Ansiklopedisi, Cilt, II, (Istanbul-1995 (s.273 " هەروەها بڕوانە: لواء اربيل التابع الي بغداد" في النصف الثاني من القرن السادس عشر في، مؤكرات مأمون بك بن بيگه بك، ترجمة محمد جميل الروزبياني و شكور مصطفي (بغداد- ١٩٨٠) ص٥٤.

١٧- كاتب جلبي، مصطفى بن عبدالله حاجي خليفة، جهان نما كتابي (قسطنطينية- ١١٤٥هـ) ص ص٤٤٥-٤٤٨.

18- Islam Ansiklopedisi, cilt, II, s-273.

١٩- محمد أمين زكي، تاريخ السلمانية، ترجمة: ملا جميل الروزبياني (بغداد- ١٩٥١) ص ص٦٢-٦٣.

٢٠- عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث (القاهرة-١٩٦٨)، ص ص١١٢-١١٣.

٢١- كارستن نيبور، العراق في القرن الثامن عشر، ترجمة محمود حسن الامين (بغداد- ١٩٦٥) ص٩٠.

٢٢- ج. أ. اوليفييه، رحلة اوليفييه الي العراق ١٧٩٤-١٧٩٦، ترجمة يوسف حبي (بغداد- ١٩٨٨) ص٦٥.

٢٣- عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٦ (بغداد- ١٩٤٥) ص١٦٢.

٢٤- عثمان بن سند الوائلي البصري، مطالع السعود، تحقيق عماد عبدالسلام رؤوف وسهيلة عبدالمجيد القيسي (الموصل-١٩٩١)ص٣٢٩، سليمان فائق بك، تاريخ بغداد، ترجمة: موسى كاظم نورسي (بغداد- ١٩٦٢) ص١٢٢.

٢٥- جيمس ريموند ولستيد، رحلتي الى بغداد في عهد الوالي داود باشا، ترجمة: سليم طه التكريتي (بغداد- ١٩٨٤) ص٦٤.

٢٧- زكي، خلاصة تاريخ الكرد....، ق١، ص٢٨٠، رؤوف، المصدر السابق، ص٢٣٣.

٢٨- لونكريك، المصدر السابق، ص٦٥.

٢٩- زكي، خلاصة تاريخ الكرد...، ق١، ص٢٨٢.

٣٠- علي شاكر علي، تاريخ العراق العهد العثماني ١٦٣٨-١٧٥٠ (الموصل- ١٩٨٤) ص١١٠.

٣١- عبدالرحمن السويدي، تاريخ بغداد أو حديقة الزوراء في سيرة الوزراء، ج١، تحقيق الدكتور صفاء خلوصي (بغداد- ١٩٦٢) ص٦٣.

٣٢- ياسين بن خيرالله العمري، زبدة الاثار الجلية في الحوادث الارضية، تحقيق عماد عبدالسلام رؤوف (النجف- ١٩٧٤) ص١٠١.

٣٣- الشيخ رسول حاوي الكركوكلي، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء، ترجمة موسى كاظم نورسي (بيروت- د.ت) ص٥٠.

٣٤- راجع وقارن، العمري: المصدر السابق، ص١٠١، علي، المصدر السابق، ص١٩٧، سيار الجميل، حصار الموصل (الموصل- ١٩٩٠) ص ص١٤١-١٤٢، ١٨٠، بەلام ئینسکلۆپیدیا بۆچوونێکی سەیری دەڵێ: کەوا گەمارۆی نادرشا بۆ هەولێر (٦٠) ڕۆژی خایاندووە، ئەمەش بەهیچ شێوەیەک لە ڕاستی ناچێت، لەوانە مەبەستی لەوە ٦٠ ڕۆژ لەژێر کۆنترۆڵی ئێراندا بووە، بڕوانە:(دائرة المعارف الاسلامية) ترجمة: محمد ثابت الفندي وآخرون (طهران- د.ت) م١، ص٥٧٢.

٣٥- العزاوي، المصدر السابق، ج٦، ص٢٥.

٣٦- لە ساڵی ١٧٣٤ز، ٥٠٠ سواری کوردی لەگەڵ پاشا لە بەرگری کردن لە موسڵ بەشدارییان کرد، بەهۆی ئازایەتی و هەوڵکەوتوویان ناویان لە سەرچاوەکانی موسڵ بە (اسود عدابس) هاتووە. بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (١٣)، کە سەعید دیوەچی لە لێکۆڵینەوەی کتێبی (یاسین بن خیرالله الخطیب العمري) دایناوە، منية الادباء.

٣٧- العمري، زبدة الاثار الجلية، ص ص ١٠٧-١٠٨، سعدي عثمان حسين، امارة بابان في النصف الاول من القرن الثامن عشر (اربيل- ٢٠٠٠) ص٥٨.

٣٨- العزاوي، المصدر السابق، ج٦، ص٣٤.

٣٩- العمري، زبدة الاثار الجلية، ص ص ٧٦،٥٨، ١٣٧، ياسين بن خيرالله العمري، غاية المرام في تاريخ محاسن، بغداد دار السلام (بغداد- ١٩٦٧) ص ٣٢٠.

٤٠- العمري، زبدة الاثار الجلية، ص١٣٧

٤١- اوليفييه، المصدر السابق، ص ٦٥ ئەو گەڕیدەیە لە هەمان لاپەڕە تێبینییەکی کردووە، بەوەی هەولێر دووچاری هاتووە کشابێتەوە دواوە، وەک دەڵێت: "واپێدەچێ ئەم شارە لە رابردوو پانتاییەکی زیاتری لە دەشت داگیر کردبێت".

٤٢- جيمس بكنغهام، رحلتي الى العراق سنة ١٨٦١، ترجمة: سليم طه التكريتي، (بغداد- ١٩٦٨) ج١، ١٢٦.

٤٣- زكي، خلاصة تاريخ الكرد... ق٢، ص٣٢، كاميران عبدالصمد احمد الدوسكي، كوردستان العثمانية في النصف الاول من القرن التاسع عشر (دهوك- ٢٠٠٢) ص ١٠٠، هەروەها بڕوانە: تێبینی میجەرسۆن لە دەسەڵاتی راستەقینەی محەمەد پاشای ڕەواندزی لە (وڵاتی نێوان دوو زێ و هەولێر و کەرکوک) پەیڕەوی کردووە و ئەو دەسەڵاتە بەهێزەی کە ناوچەکە (سیستەمێکی زۆرباش باڵی بەسەردا بکێشێت) لە: میجر سون، رحلة متنكرة الى بلاد مابين النهرين و كردستان، ترجمة: فؤاد جميل، ج٢، (بغداد- ١٩٧١) ص١٤٨.

٤٤- الدوسكي، المصدر السابق، ص١٠٠.

٤٥- المصدر نفسة، ص١٠١.

٤٦- نوار، المصدر السابق، ص١٠٧.

# گرانییە گەورەکانی هەولێرو دەوروبەری

ئیحسان رەشاد موفتی

**سێ گرانی گەورەی هەولێر**
**١٧٥٦- ١٨٨٠- ١٩١٧**

بیرۆکەی نووسین دەربارەی ئەم بابەتە ماوەیەک بوو، خەریکی کردبووم. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئەم جۆرە ڕووداو و کارەساتانە بەشێکی لە گرنگیدان و بیرکردنەوەمی داگیر کردبوو. ئەو کتێبخانەیەی کە باسمان کرد، تەمەنی بۆ پتر لە پێنج سەدە دەگەڕێتەوە. کە لەنێو ڕەفەکانیدا چەندین چیرۆک و داستان و ڕووداو و دەستنووسی بەنرخی مێژوویی ئەوتۆی لەخۆوە گرتووە، ئەگەر زبانی گرتبا زۆر لە ڕووداو و پەندی ئەوتۆ کە لەناوچەکەدا ڕوویدابوو بۆی دەگێڕاینەوە.

زۆ رجار وا ڕێکدەکەوێت لەکاتی پێداچوونەوەو ڕێکخستنەوەی سالآنەی کتێبخانەکە، هەندێک لە نامە و دەستنووسم دەکەوێتە بەرچاو. ئەمجارەیان لەو پەراوێز و پەڕ و دەستنووسانەی کەوتە بەردەستم دوو دۆکیومێنتی بچووک بوون بەلآم گرنگ یەکەمیان بۆ سالّی ١٧٥٦ زایینی دەگەڕێتەوە کە پێش دووسەدو پەنجا سالّ پێش ئێستا نووسراوە، ئەوی دیکەیان بۆ سالّی ١٨٨٠ زایینی کە پێش ١٢٨ سالّ نووسراوە، هەردووکیان کە تیشک دەخەنە سەر ئەو گرانییە گەورەیەی کوردستان کە دوچاری ببوو، کە بەهەزاران کەسی فەوتاندووە و شیرازەی سەدان خێزانی تێکداوە ئەوەشمان لەبیرنەچێ کە کوردستان بێجگە لەم دوو گرانییە سالّی ١٩١٧ بەرەنگاری دووچاری بواری شەڕی جیهانی یەکەم بووە و باری ئابووری دەولّەتی عوسمانی زۆر خراپ بووە خەلّکی کوردستان دوچاری گرانییەکی گەورە بووە.

بەلآم سەرچاوەکان ئاماژە دەکەن کە لە سالّی ١٨٢٤ گرانییەک لەبەر کێشی هەوای ساردوو بەفر خەلّکی کوردستان نەیانتوانیوە بەروبوومیان بە دەست کەوێ، هەمان کات سەرچاوەکان ئاماژەی ئەوەش دەکەن، کە سالّی ١٩٠٧ -١٩٠٨ شاری هەولێر دووچاری گرانی بووە بەناوبانگە بە سالّی بەفر.

ئێمە لێرە لەبەر ئەوەی ئەم دوو دەستنووسە مێژووییە بلاو دەکەینەوە کە تیشک دەخاتە سەر ئەو سێ گرانییە سەرەکییە، هەرچەندە گرانی ئاسەواری بۆ کۆمەلّ وەک یەک بووە، لە تێکدانی باری خێزان و تێکچوونی شیرازەیان، هەروەک باسی لێوە دەکەین.

**بەرگی کتێبێکی سووتاو**
**گرانی سالّی ١٧٥٦ بەدیار دەخات**

لە نێو ئەم کتێبە بەنرخانەی کە پاراستوومە بەرگی کتێبێکە ئاسەواری دوو سەدو پەنجا سالّی بە خۆوە هەلّگرتووە، کە وات لێ بکا بیرکەیەوە تەنها ئەم بەرگە کتێبە ئەستوورە بۆچی ماوە دوای دوو سەدەو نیو، کە لە خواردوە ڕەش هەلّگەڕاوە بە هۆی سووتان کە جێگای ئەوەیە خەفەتی بۆ بخۆین کە بۆ زۆر لەو کتێبە بە نرخانەی کە فەوتان یان لە نەزانی خەلّک وە نەبوونی ڕۆشنبیریان، لەبەر دەربەدەری تێکچوون بە هۆی شەڕو کارەساتی وەک ئەو گرانیانەی دووچاری کوردستان بووە ئەم بەرگە کتێبە باس لەو کەشە ساردو سڕە دەکا، کە کوردستانی گرتبۆوەو سەرەنجام گرانییەکی گەورەی بەدوای

خۆیدا هێنا ئەم ساردییە بەرادەیەک کەشی هەوا سارد بووە زێی دیجلە بەستوویەتی، کە نزیکەی یەک مانگی خایاندووەو خەڵک بە وڵاغ و مەڕو ماڵاتیان بەسەر ئاوە بەستووەکەدا هاتوچۆیان کردووە. لەو ساتەدا ئەوەم هاتەوە یاد، کە باوکم لەیەک لە دانیشتنەکانیدا، کە ڕۆژانە ئەنجامی دەدا، پرسیارێکی ئاراستەی ئامادەبووان کرد وتی: ئایا لە باوک و باپیرانی خۆتان هیچ باسێکی ئەوتۆیان بۆ گێڕاونەتەوە، کە باس لە بەستنی ڕووباری (دیجلە) بکات بە ئەندازەیەک کاروان بەسەریدا پەڕیبێتەوە بێ ئەوەی پێویستی بەپردێک هەبێت، کە دوو جەمسەری ڕووبارەکەی بەیەکەوە بەستبێتەوە؟

### عەبد جاسم
### باسی گرانی گەورە دەکا

هەر هەموو ئامادەبووانی دانیشتنەکە بێ دەنگ بوون تەنیا (سەید عەبد جاسم) نەبێت،کە یەکێک لە ئامادەبووە هەمیشەییەکانی کۆڕ و دیوەخانی باوکم بوو، تەمەنی نزیکەی پتر لە نەوەد ساڵ بوو، ئەوسا مێشکێکی دەوڵەمەند بە یادەوەرییەکی زیندووی هەبوو. لەوەڵامدا وتی لە یەک لە پیرە بەتەمەنەکانی بیستووە، کە لە باوکییەوە بۆی گێردراوەتەوە، دۆخێکی لەم جۆرە بە کوردستاندا تێپەڕیوە، بەڵام هیچ وردەکارییەکی ئەوتۆی لەم بارەوە لا نەبوو، کە بیگێڕێتەوەو چۆنیەتی باسەکەمان بۆ ڕوون بکاتەوە. بەڵام وتی پێش گرانی شەڕی یەکەمی جیهانی لە کوردستان گرانی دی رووی داوە هەمان برسیەتی و ساردی کەشوهەوای لەگەڵ خۆی هێناوەتە سەر شارەکانی سەرووی شاری موسڵ. دەشیوت من لە شەڕی یەکەمی جیهانی گەنج بووم بە ڕێگای کەشتی بچووک کە پێیان دەوت "کەلەک " خەڵکمان دەگواستەوە لە موسڵ بۆ تکریت، خوالێخۆشبوو عەبد جاسم دەیوت: ئەو کات کە هاتمە کوردستان و بووم بە پۆلیس لە شاری کۆیێ لەگەڵ هاوڕێکەی مام " دەرمان" (کە دەکا باوکی مەتی دەرمان " مامۆستای زمانی ئینگلیزیم لە پۆلی شەشی ئامادەیی لە هەولێر) " لە بیستەکانی سەدەی رابردوو چەند جار لە شاری "هەولێر " لە حەسارەکەی شێخ جەمیل ئەفەندی کوڕی شێخ عەلی ئەفەندی کوڕی مەلا گچکەی هەولێری دەحەسانەوە، پیاوە پیرەکان ئەم گرانییە گەورەیەی پێش سی چل ساڵ لە هەولێر رووی دابوو ناویان دەنا بە ساڵی" لیرە" گوایە بەروبووم وەک گەنم وجۆ زۆر گران بووە، ماوەیەک گرانی وا قورس بووە یەک حۆقە گەنم بە لیرەیێک بووە، ئەم راستییە سەرچاوەکان پەسندی دەکەن.

خوالێ خۆشبوو عەبد جاسم بە رەگەز عەرەب بوو و ئامۆزای تاهیر یەحیای سەرۆک ئەنجوومەنی وەزیرانی حکومەتی عیراق بوو لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی پێشوو بەڵام لە شارۆچکەی کۆیسنجق نیشتەجێ دەبێ و تێکەڵی کۆمەڵگای کوردەواری دەبێ مام عەبد زمانی تورکی و کوردی وعەرەبی وعیبری و کلدانی دەزانی، ئەویش بە هۆی یاوەرەکانی، کە جوولەکە بوون یان برایانی مەسیحی فێر ببوو، پێش هەموو ئەندامانی دیوەخانی ئامادە دەبوو لە زستان خۆی لە کەوا خورییەکەی حەڵەبی رەنگ شین دەپێچاو دار جغارەو قوتییە ئاسنەکەی، کە پڕ بوو لە تووتنی کوردەواری، کە بەدەستی خۆی ئامادەی دەکرد بەردەوام یاوەری بوو.

ئیتر ئەوەبوو کە باوکمان دەستی بەگێڕانەوەی کارەساتی گرانی گەورەی ساڵی ١٧٥٦ زاینی کرد، وتیشی عەبد جاسم راست دەکا بێجگە لەو گرانییەی ساڵی ١٧٥٦ ز گرانییەکی دیکەش لە هەولێر رووی داوە ئەمەش لە لایەن موفتی هەولێری ئەو سەردەمە خوالێخۆشبوو شێخ عەلی ئەفەندی بووە نووسراوە، کە لە ساڵی ١٨٨٠ ز روویداوە. باوکم درێژەی بە قسەکانی سەر بەرگە کتێبەکەی دا و، بەرگی کتێبێکی کۆنی بەدەستەوە گرت. ئەم بەرگە کتێبەش بە ڕێکەوت لە ئاگرکەوتنەوەکەی کۆشکی مەلا ئەفەندی لە باداوە رزگاری ببوو[1].... لە توێی بەرگەکەیدا چەند دێڕە هۆنراوەیەک تۆمار کرابوو، کە کارەساتەکەی ئەو سەردەمەی دەگێڕایەوە و مێژووەکەی بەپێی پیتەکانی ئەبجەدی، کە لەلای هۆنراوەزانان ئاشکرایە، لەگەڵ ئەوەی، کە هەندێک لەدێڕە شیعرەکان هەڵەی رێزمانی تێ کەوتووە، بەڵام وەک خۆی تۆماری دەکەینەوە، کە بەزمانی عەرەبی نووسراوەو باس لەو کەشوهەوایە ساردە دەکات، کە خەڵکی کوردستانی شەپرزە کردووە ئەم چەند دێڕە شیعرەش ئەوەیە:

**حەفت دێڕە شیعرو گرانی ساڵی ١٧٥٦**

**لعمر بهذا العام قد شاب طفلنا**
**من البرد والقر الذي فيه اصابنا**
مانای: سوێند بەو ژیانە منداڵی بچووک پیر بوو
لەو سەرماو بەفرەی کە دووچاری بووین

**وفي نصف كانون الرياح تواردت**
**من الزمهرير الصرف حيث اصابنا**
لەناوەڕاستی مانگی کانوون ڕەشەبا ڕووی تێ کردین
لە ساردییەکەی وا بێ وێنە دووچاری بووین

**ودجلة اضحي فوقها الثلج راقما**
**وزاد علينا البرد وشتت حالناً**
دیجلە وای لێ هات بەفر لەسەری ڕاوەستێ
سەرماش قورستر دەبوو هەلا هەلای کردین

**وصار لنا جسر لغاد و رايح**
**تمر عليه كالصعيد حمالنا**
ڕووباری دیجلە بۆمان بووە پرد بۆ هاتن و ڕۆیشتن
وەک بیابان لەسەری دەڕۆیشت باری سەر وڵاغمان

**دعونا زوال البرد عند اظطرارنا**
**فزال بفضل الله رضقا بحالنا**
دوعامان کرد کە گەیشتینە تەنگانە
بە خوا بەسەرچوو، کە ڕەحمی خۆی پێ بەخشین

**عسي ربنا يعفوو يلطف منة**
**ويجمعنا بعد تشتيت حالنا**
ڕەنگە خوا لێمان خۆشبێ بە لوتفی خۆی
دووبارە کۆشمان کاتەوە دوای پەرتبوونمان

**اشار لسان الحال تأريخه بدا**
**لقد اجمد البرد الكثيف مياعنا**
زوبانی حاڵ مێژووەکەی دەسنیشان کرد
ئەو سەرمایە بەهێزە ئاودکانمانی بەست

چەند ڕاستییەک لەم حەفت دێڕە شیعرە بۆمان ڕوون دەبێتەوە:

١- ئەوەی نووسیویەتی ئەم شیعرە خاوەنی دیار نییە، بەڵام کە کتێبی دەستنووسی باو باپیرانمان هەیە، کە بەدەسخەتی خۆیان نووسیویانە مێژووی لە ماوەی گرانی کۆنترە، بۆیە هەر پارێزراوە لە کتێبخانەکەی باوکم.

٢- باسی چۆنیەتی بەستنی ڕووباری دیجلە دەکات و وەسفەکەی وا جوان هێناوە تاوەکو قورسایی سەرمایەکە بۆمان ڕوون ببێتەوە، ئەوەش ڕەشەوڵاغ بە خۆو بە بارەکەیەوە لەسەر زیێ بڕوا و نقوم نەبێ دەبێ ئەم ئاوە چۆن شەختەی بەستووبێ سەرمایەکەش چەند بە هێز بووبێ.

٣- هەمان کات شاعیر لەم چەند دێڕە شیعرەدا ئاماژە بەوە دەکات، کە لە سەرەتای کارەساتی گرانی لە مانگی کانوون بووە، لێرە مانگەکەی کە لە کۆتایی شیعرەکەیدا نەیتوانیوە دەسنیشان بکا، لە دێری یەکەم باسی کردووە، بەڵام لەبەر کێشی شیعری کام مانگ بووە کانونی یەکەم یان دووەم ئەمە سەرچاوەکان دەڵێن مانگی کانونی یەکەم بووە.

٤- شاعیر کە دەڵێ: (ویجمعنا بعد تشتيت حالنا) بە چەند وشەیک ڕوون دەکاتەوە، کە شیرازەی خێزان تێکچووە، بۆیە لە خوا دەپاڕێتەوە کە دووبارە دۆست و خزمانی کۆ کاتەوە.

٥- لە کۆتایی زۆر بە جوانی مێژووی گرانی و سەرمای ساڵی ١١٧٠ کۆچی، کە بەرامبەری ١٧٥٦ زاینە تۆمار دەکا، هەروەک لە خوارەوە باسی لێوە دەکەین.

لێرەدا خەریکی لێکۆڵینەوە لە کێش و سەروای ئەم دێڕە شیعرانە نین، بەڵکو مەبەستمان تیشک خستنە سەر ئەو ماوە مێژووییەیە، کە بەناوچەکە تێپەڕیوە.شاعیر لەدێری دواییدا ساڵی ڕوودانی ئەم کارەساتەی تۆمار کردووە بەم چەشنەی خوارەوە، کە دەڵێت: «بدا لقد اجمد البرد الكثيف مياهنا»[٢].

بڕوانە خشتەی ژمارە(١)

| بدا | لقد | اجمد | البرد | الكثيف | مياهنا |
|---|---|---|---|---|---|
| ٧ | ١٣٤ | ٤٨ | ٢٣٧ | ٦٤١ | ١٠٣ |

خشتەی ژمارە(١)

**شەپۆلی برسییەکان**
**لە دیاربەکرەوە گەیشتنە بەغدا**

ئەم شەپۆلە ساردییە لە ناوەڕاستی مانگی (کانونی یەکەم)ی ساڵی ١٧٥٦ز- ١١٧٠ک دەستی

پێکرد. کە بوو بە هۆکاری تەنگژە لەرووی باری ژیان و گوزەران و سەرەتای سەرهەڵدانی برسێتی بەهۆی ئەوەی، کە نەتوانرا ئەو ساڵ بەروبوومەکان بدوورێنەوە. سەرەڕای ئەم شەپۆلە ساردییە لەم ساڵەدا، لەساڵی دواتر شەپۆلێک، کە بەسەر ناوچەکەدا هات، کە لەبڕوای مرۆڤدا نەبوو هەروەکو باسی لێوە دەکرێت، ئەم برسێتییە سەرەتا لە (دیاربەکر) و شارەکانی دەوروبەری دەستی پێکرد. ئەو خەڵکەی کە پاروە نانێکیان دەست نەئەکەوت ناچار شوێنی نیشتەجێی خۆیان جێهێشت و ئیتر بەپیادە دەستیان بە کۆچکردن کرد بەرەو خوارووی کوردستان و شار و دێهاتەکانی. بەڵام دۆخەکە لەم شارانەو لە شارەکانی دیکە، کە لێوەی هاتبوون باشتر نەبوو. ئەوەبوو بەناچاری پتر بەرەو خواروو ڕۆیشتن، تاوەکو بە شاری (بەغدا) گەیشتن.

هەر لەم بوارەدا مێژوونووس (ستیڤن هیمسلی لونکریک) دانەری کتێبی (چوار سەدە لە مێژووی عێراقی نوێ) لەلاپەڕە ٢٠٦یدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات و باس لەو ماوەیە دەکات و دەڵێت: تینی برسێتییەکە لە زەوی دێمی و ولاتی ئاشوور زۆر سەخت و قورستر بوو. جووتیارەکان لە دوورینەوەی بەروبوومەکانیان بێ هیوا بوون. ئەویش نەک یەک جار بەڵکو بۆ دوو جار. ئەوەبوو کە چرنووکی برسێتی بەرەو خوارووکشایەوەو بەکەناری بەغدا گەیشت. بەهەزاران لە برسییەکان بەکۆڵێک لە هەژاری و بێ دەرەتانی بەسەر خوارووودا بارین.

«ریچارد کۆک» دانەری کتێبی (بەغدا شاری ئاشتی) لەبەشی (٨) لاپەڕە ٩٢دا باسی لەم ئێش و ئازارەو کاریگەرییەکەی لەسەر شاری بەغدا دەکات و دەڵێت: لە سەردەمی سلێمان پاشا یەک کارەسات روویدا ئەویش برسێتییەکەی ساڵی (١٧٥٦ز- ١١٧٠ک) بوو. شاری بەغدا بەشەپۆلی برسییەکان، کە لە باکوورەوە هاتبوون، بەسەریدا دابارین. ئەم نەهامەتییە دوو ساڵی تەواوی خایاند.

یەک لە جارەکان کەمی دانەوێڵە وای کرد، کە بەکارەسات و لەناوچوون هەڕەشە بکات و بڕیاری ئەوە درا، کە (فارس)ە نیشتەجێبووەکانی شارەکە جێبهێڵن بۆ ئەوەی زیانەکان کەم بێتەوە. بەڵام لەدواییدا بەپێویست نەزانرا، ئەمەش دوای ئەوەی لەپڕێکدا دۆخەکە بەرەو باشی چوو.

### رووباری دیجلە ٢٠ رۆژ دەبەستێ

لەلای خۆشییەوە عەبدولسەلام رەئووف دانەری کتێبی (موسڵ لە سەردەمی عوسمانییەکاندا) ئەم بەسەرهاتە بەدرێژی باس دەکات، هەر لەلاپەڕەی ٢٨١ەوە تا دوایی بابەتەکە، تەنها بەم چەند دێڕە کورتی دەکاتەوە: «هەرێمی جەزیرە بە شەپۆلێک لە ساردییەکی زۆر سەخت ناوچەکەی گرتەوە (دیاربەکر) و ماردین و حەڵەب و تەنانەت رووباری دیجلەش بەستبووی و بەدرێژایی ٢٠ رۆژ کاروان بەسەریدا تێدەپەڕی».

لێرەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە ئاماژە بۆ کردنەکەی عەبدولسەلام رەئوف بۆ بەستنی رووباری دیجلە لەگەڵ ئەو باسەی لەدێڕە شیعرەکاندا هاتووە یەک دەگرێتەوە، کە چۆن باسی شەپۆلە ساردییەکەی کردووە، کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردبوو.

دارمانی دۆخی ئابووری لە ئەنجامی ئەم شەپۆلەدا سەرەنجام و لەکۆتاییەکەیدا باری کۆمەڵایەتی وا تێکشکاند کاریگەریی لەسەر داب و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی تاکەکان جێهێشت. هەر لەسەرەتاوە کاری کردە سەر خەڵکەکە. ئەوەبوو ناچاربوون کەلوپەلەکانیان بفرۆشن. دواتریش پەنایان بردەبەر خواردنی گۆشتی ئاژەڵەکان، وەک پشیلە و سەگ و گوێدرێژ.. کە دواتر دۆخەکە سەختتر بووە بەناچاری پەنایان بۆ فرۆشتنی منداڵەکانیان دەبرد، ئەوەبوو پەیوەندی و شیرازەی خێزانداری لێ کداپچڕاند و باوکەکان منداڵەکانیان لێ دابڕا، بەتایبەتی خێزانە هەژار و نەدارەکان، کە بەناچاری لەپێناو پاروە نانێک دووچاری ئەم مەرگەساتە بوونەوە..

بێزاری و لەجڵەو دەرچوونی خەڵکەکە لەوپەڕیدا بوو. چینێک لە چەوسێنەران دروست بوون، کە بە بازرگانانی دانەوێڵە ناسرابوون. رۆژانە دزی و کاری دزێوتر بەردەوام بوو تا کار گەیشتە ئەو رادەیەی، کە مرۆڤ گۆشتی برای مرۆڤی خۆی دەخوارد.

هەر وەکو زانراوە جووتیارەکان لە ماڵەکانیاندا زەخیرەی ساڵێکی تەواو لەخۆراک و خواردەمەنی هەڵدەگرن تاوەکو دەگەنە وەرزی دروونەی ساڵی ئایندەیان.

### کلۆی بێ باڵ
#### لە دجلە بەرەو هەولێر پەڕییەوە

لە مەرگەساتی برسێتی گەورەی

ساڵی ١٧٥٦ ز جووتیارەکان بەتەواوەتی هیوابڕ بوون لەوەی، کە ساڵی داهاتوو دەنکە دانەوێڵەیەکیان چنگ کەوێت. ئەویش بەهۆی ئەو هێرشە چڕ و کلۆبارینە بوو، کە ناوچەکەی گرتەوە، بەشێوەیەک بەبیری کەسدا نەدەهات. عەبدولسەلام رەئوف درێژە بەقسەکانی دەدات و دەڵێت:

«سەرەتا رەوە کلۆکان کە بێ باڵ بوون لەسەر زەویدا دەخشین. هەر لەگەڵ گەیشتنیان بەهەر شوێنێک ئەوەی شینایی بوو قەلاچۆیان دەکرد... دواتر بەرەو رووباری (دیجلە) هاتن و ئیتر بەرەو ئاوەکەی کشان پۆل پۆل و یەک لەدوای یەکتر و لەسەر پشتی یەکتر تاوەکو لە شێوەی حەسیرێک دەچوون و لە رووباری (دیجلە) پەڕینەوە بۆ لای رۆژهەڵات (واتە بەرەو شاری هەولێر) هەرچی شینایی هەبوو بنبڕیان کرد و تەنیا کەمێکی زۆر کەم مایەوەو بەرەو رۆژهەڵات لەکشاندا بوون».

### والی موسڵ دەرگا لە رووی برسییەکان دا دەخا

ئەو کار و کاردانەوانەی کە لەشاری موسڵ ئەنجامدرا ئەوەبووە کە والی شاری موسڵ بڕیاری ئەوەیدا دەرگاکانی شوورەی شاری موسڵ دابخرێت بەمەبەستی ئەوەی رێگا لەو کەسانە بگیرێت، کە روودەکەنە ئەم شارە. بەهۆی ئەوەی، کە لەتوانایاندا نییە ئەم هەموو خەڵکە زۆر و زەوەندە لە باوەش بگرێت. دیمەنی دیتنی لاشەی مردووان لەنێوان شارەکاندا ئاسایی بوو..

لەکۆتایی ساڵی ١٧٥٧ز لەسەرەخۆ بووژانەوەیەک بەسەر لادێکاندا هات. (لۆنکریک)ی مێژوونووس لە کتێبەکەیدا دەڵێت: (ویلایەتی موسڵ زۆر بێهێز و کزبوو، بەڵام لە ساڵی ١٧٥٧ز جۆرێک لە بووژانەوەی بەخۆوە دیت».

مەبەست لە ویلایەتی موسڵ بەشێکی زۆر لە خوارووی کوردستانە، کە هەریەک لە هەولێر و کەرکووک و سلێمانی و دهۆک و ژەنگار... دەگرێتەوە و دواتر ئەم ناوانە گۆڕانکارییان بەسەردا هات...

### گرانی هەولێر ١٨٨٠ز
### لە دەستنووسێکی کتێبخانەی موفتی

لەکاتێکدا خەریکی ئەم باسە بووم دەستنووسێکم هاتە بەردەست کە هی زانای گەورە شێخ محەمەد عەلی موفتی هەولێری بوو، کە کوڕی مەلا ئەبوبەکر ناسراو بە (مەلا گچکە)یە. ئەو نووسراوەی، کە بەدەستی نووسەرەکەی حاجی خدر کوڕی حاجی عەلی نووسراوەتەوە. لەگەڵ ئەوەی، کە نووسراوە چەند هەڵەیەکی نووسینی تیایە، بەڵام نووسراوێکی نایابە و ناوەڕۆکەکەی لەبەشێکیدا باس لە برسێتییە گەورەکەی دووەم دەکات، کە کوردستانی گرتبۆوە لە ساڵەکانی (١٨٧٩ز- ١٨٨٠ز) رێکەوتی (١٢٧٩ک- ١٢٩٨ک) لەژێر ناونیشانی (مێژووی گرانییە گەورەکە).

سەرەتاو لە دەستپێکی نووسراوەکە وشەی (صجل) هاتووەو کە وشەیەکی نامۆیە و ئنجا دێتە سەر باسەکەو دەڵێت: خەڵکەکە وەک شەپۆلی دەریا مردووەکانیان دەخوارد و نرخەکان بەچەشنێک رووی لە هەوراز دەکرد. سەرەنجام کڕین و فرۆشتن کۆتایی پێ هات... لەم ساڵەدا بەفر لەنێوان موسڵ و ژەنگار باری و مەڕومالات قڕیان تێ کەوت.

لەکۆتایی ئەو بەشەی، کە تایبەت بە گرانییەکەیە نووسراوەو باس لەوە دەکات، کە کچ و بێوەژنەکان تەنها بەرامبەر بە ئەوەی خواردنیان مسۆگەر بکرێت بەشوو دەدران، خەڵکەکە هەروەکو مێگەلە مەڕێک ئەم شار و ئەوشاریان پێدەکراو، تەنانەت جەنابی موفتی بڕیاری ئەوەی دا، کە خواردنی گۆشتی بۆگەن دروستە.... هتد.

نووسەری بابەتەکە ئاماژە بۆ نرخی کەلوپەلەکانی خۆراک لەسەردەمی گرانییەکە دەکات، کە لێرەدا بە پێویستی دەزانین لەم خشتەیەی خوارەوە بەمەبەستی پتر روونکردنەوە بڵاوی بکەینەوە. ئەگەرچی نرخەکانمان لا روون نییە، کە ئایا پێش گرانییەکە چەند بووە. بەمەبەستی ئەوەی لەگەڵ ئەم نرخانە بەراوردیان پێ بکەین. بەڵام گومان لەوە دانییە، کە لە ١٠ جار بۆ ٥٠ جار، ئەگەر پتر نەبێت، گرانی بەسەردا هاتووە.

نەخشەی نرخی کەلوپەلەکانی خواردن لە رۆژانی گرانی گەورە ساڵی ١٢٩٧ کۆچی رێکەوتی ١٨٨٠ زایینی.بڕوانە خشتەی ژمارە(٢)

### سەرەتای گرانی لە کوردستان

دەربارەی ئەم برسێتییە (سلێمان ئەلسائغ ئەلموسڵی) لە کتێبەکەیدا (مێژووی موسڵ)، کە لە قاهیرە و لەساڵی ١٩٢٣ بەچاپ گەیاندراوە لە لاپەڕەکانی ٣١٤ و ٣١٥ لە بەشی

یەكەمیدا باسی ئەوەمان بۆ دەكات كە: (لەمانگەكانی كۆتایی ساڵی ١٨٧٩ز بارانێكی زۆر بەتین لەباكووری عێراق باری، كە بوو بەهۆی ئەوەی تەواوی خەڵكەكەی كەوتنە خۆشی و دڵیان بەوە گەشایەوە، كە بە هاتنی وەرزێكی نوێی باران بارین، نرخی كەلوپەلەكانی خۆراك روو لەدابەزین دەكات. بەڵام ئەم گەشبینییەی خەڵكەكە زۆری نەخایاند، هۆیەكەشی بۆ ئەو رەشەبا ژاراوییە سووتێنەرە دەگەڕێتەوە، كە تەواوی چاندراوەكانی لەناوبرد و گوڵی دار و باری وا پووچ كردەوە وەك ئەوەی دەنكە بەرێك بەخۆیانەوە نەگرن. دواتریش ساردی و سرییەكی ئەوتۆ باڵی بەسەر ناوچەكەدا كێشا، كە رووبارەكانی دووچاری بەستەڵۆكی كرد. ئەوەش سەرەتای گرانی و برسێتییەكە بوو.

**رۆڵی قونسلی فرەنسی**
**لە یارمەتیدانی خەڵكی برسی**

دكتۆر عەلی ئەلوەردیش لە بەشی سێیەمی كتێبەكەی (لمحات اجتماعیة من تأریخ العراق الحدیث) لە ساڵی ١٩٧٢ لە بەغدا، چاپكراوە لەلاپەرە ٣٦یدا دەڵێت:

ئەو بیانییانەی كە لە شاری موسڵ بوون، رۆڵێكی ئەوتۆیان هەبوو كە ناكرێت بەهەند هەڵنەگیرێت لەبواری یارمەتیدانیان بۆ هەژار و لێقەوماو و دەستكورتەكان. ئەوەبوو كە قونسوڵی فەرەنسا لە موسڵ (میسیۆ سیۆفی) نووسراوێكی بۆ حكومەتەكەی نووسی لە بەرواری

| ژ | ناوی بابەت | قەبارەی بابەتەكە | نرخەكەی |
|---|---|---|---|
| ١ | گەنم | ١ كێلە (وەزن) | ٢٠٠ قورشی ساغ |
| ٢ | برنج | ١ كێلە | ٢٠٠ قورش |
| ٣ | جۆ | ١كێلە | ١٠٠ قورش |
| ٤ | مێوژ | ١ مەنە | ٦٠ قورش |
| ٥ | خورما | ١ مەنە | ٢٠ قورش |
| ٦ | نان | ١ حۆقە | ٢٠ قورش |
| ٧ | گۆشت | ١حۆقە | ٦ قورش یان پتر |
| ٨ | روون | ١ حۆقە | ٣٠ قورش |
| ٩ | چەوەندەر | ١ حۆقە | ٣ قورش |
| ١٠ | شێلم | ١ حۆقە | ٢ قورش |
| ١١ | توور | ا حۆقە | ٢ قورش |
| ١٢ | گەنم لە تەلەعفەر | ١ قاپ ( گاسە) | ٣٠ قورش |
| ١٣ | جۆ لە تەلەعفەر | ا قاپ ( گاسە) | ٣٠ قورش |
| ١٤ | هێلكە | ١ (ژمارە) | نیو قورش |
| ١٥ | لۆبیا | ١ (وەزن) | ٧٠ قورش |
| ١٦ | نیسك | ١ (وەزن) | ٩٠ قورش |
| ١٧ | نۆك | ١ (وەزن) | ٩٠ قورش |
| ١٨ | پاقلە | ١ (وەزن) | ٦٠ قورش |
| ١٩ | گەزۆ | ١ (وەزن) | ٧٠ قورش |

خشتەی ژمارە(٢)

٢٣ی شوباتی سالی ١٨٨٠ بەم جۆرە باسی برسێتییەكە دەكات:
«وشكە سالییەكە بووە بە برسێتییەكی بەراستی قورساییەكەی رۆژ بەرۆژ قورستر دەبێت. ژمارەیەكی یەكجار زۆر لە دانیشتوانی لادێكان گوندەكانیان جێهێشتووەو روو لە شارەكەمان دەكەن و بەدوای لەتكە نانێك دەكەون دوای ئەوەی برسێتی زۆری بۆ هێناون و منالەكانیان تەنگیان پێهەلچنیون. بەسەدان لە دانیشتوانی ئەم شارە كە لە چینە زەحمەتكێشەكانی ئەم شارە دەژمێردرێن ئێستا چینی هەژار و سوالكەری ئەم شارە پێك دەهێنن. لەژێر قورسایی نەداری و برسێتی ژیان بەسەردەبەن و بێ كاری و ئەم هێرشە بێ ئامانەی دانیشتوانی لادێكان و پیشە دەستە بێ كارەكان كە هەر هەموویان برسین، هەر هەموو ئەمانە كاری خۆی هەیە لەسەر پتر بوونی ژمارەی برسییەكان كە هیچ سەرچاوەیەكی ژیان شك نابەن. لەماوەی تەنیا یەك مانگدا ژمارەی هەژاردەكانمان بۆ سێ هەند بەرز بۆوە. هەندێكیان لەژێر كاریگەری گری برسێتی پەنایان بۆ خواردنی لاشەی ئاژەلەكان بردووە»..

دیارە قونسولی فرەنسی لە هەر سێ ویلایەتەكانی عێراق رۆلی هەبووە. سەرچاوەكان ئاماژە دەكەن كە گۆرەپانێك هەیە لە شاری بەسرە بەناوبانگە بە "ساحە ام البروم " ئەو ناوەش لەوە هاتووە كە سالی ١٨٨٠ تیمی یارمەتی فرەنسا گەیشتۆتە بەسرەو لەم گۆرەپانە مەنجەلی گەورەیان داناوە بۆ ئەوەی شۆربا لەسەر خەلك دابەش كەن و وشەی " برم " یان " قدر " بەعەرەبی مانای مەنجەلی گەورە كاتی خۆی زۆربەی مالەكان هەیان بووەو ساواریان لێ كولاندووە.

### لە گرانی سالی "برسیمە" لە كەركووك رۆژانە ٣٠ كەس دەمردن

دەربارەی بارودۆخی شاری كەركوكیش دكتۆر عەلی ئەلوەردی لە بەشی سێیەمی كتێبەكەی (لمحات اجتماعیە من تأریخ العراق الحدیث) لە لاپەرە (٣٧)ی كتێبەكەی درێژە بە قسەكانی خۆی دەدات و دەلێت: «نەداری و هەژاری لە كەركووك لە چاو شاری موسل كاریگەر و قورستر بوو مەترانی كلدانی ئەم شارە بۆ بەتریاركەكەی نووسیوەو دەلێت رۆژانە لەم شارەدا (٣٠) كەس دووچاری مردن دەبنەوە». قونسولی بەریتانی لەم شارەدا یەكەم كەس بووە داوای یارمەتی كردووە لە لەندەن. ئەویش بەپێی ئەو بروسكەی كە بۆ حكومەتەكەی ناردووەو لە بروسكەیەكدا هاتووە «یارمەتی... یارمەتی... زۆر بەپەلە، مردنەكان گەلێ زۆرن، مندال دەكردرێ و دەفرۆشرێ، بۆ رۆژگار جێدەهێلدرێن، برسییەكان بەلێشاو لە گوندەكانەوە روو لە شار دەكەن).

ئەوەبوو كە لە ئەوروپاوە برێكی زۆر لە پارەو پول بۆ موسل نێردرا، مەنجەلی گەورە دامەزرا و چێشتی شۆربای تیادا ئامادەكراو برسییەكانی تێركرد و ژمارەیەكی زۆریان لە برسێتی و مردن رزگار كرد).

ئەم یارمەتییە مرۆییانە دەنگدانەوەیەكی زۆرباشی هەبوو لای كۆمەلانی خەلك كە رق و قینیان لەوپەری بێزاریدا بوو دژ بە دەسەلاتی عوسمانی، ئەوەبوو كە دەنگی نارەزاییان بێ هیچ ترس و سلەمینەوەیەك بەرامبەر بە دەولەتی عوسمانی دەردەبری. دەگێرنەوەو دەلێن كە قونسولی فەرەنساوی لەو شوێنەی كە بە (باب ئەلسەرای) ناسراوەو سەنتەری ئەو شارەیەو خەلكی شاری موسل كۆببوونەوە. ژنێك هاواری كردبوو و رووی لێ كردبوو وتبووی: (خودا بتپارێزێ، تۆ لە موسلمانەكان باشتری چونكە دلت بۆ هەژاران دەسووتێت).

### عەباس العزاوی: برسیاتی وای كرد كچ و مندال بفرۆشرێن

مێژوونووسی كۆچكردووەی عێراقی (عەباس ئەلعەزاوی) لە كتێبەكەی (تأریخ العراق بین الاحتلالین) بەشی هەشتەم دەربارەی قەوماوەكانی سالی ١٢٩٧ك دەلێت: گرانی و وشكەسالی و برسێتی دووچاری بەغدا و موسل بۆتەوە. لەسالی ١٢٩٧ك رێككەوتی ١٨٨٠ز سالێكی سەخت و پرژان بوو. پیاو دیمەنی زۆر بە ئازاری دەدیت لەرێگای لاشەی مردووان و فرۆشتنی كیژ و مندالان... هتد و چەندین دیمەنی دیكە.

(عەباس ئەلعەزاوی) پتر لەسەر بابەتی گرانی سالی ١٨٨٠ دەدوێت و دەلێت ئەم برسێتییە لەشاری موسل ناسراوە بە «سالی لیرە» چونكە كێلە (وەزن)ێكی گەنم ئەوسال بە لیرەیەك (٤) دەفرۆشرا لە كاتێكدا ئەوسا لیرە نرخێكی

زۆرگرانی هەبوو. لەشاری (بەغدا)ش ئەم برسێتییە بە (ساڵی برسیمە) ناسرابوو. هۆکاری ئەم نازناوە ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆر لە کوردان روویان لەشاری بەغدا کردبوو و لەبرسێتی رایانکردبوو کە گەیشتبوونە ئەم شارە هاواریان کردبوو (برسیمە! برسیمە!) ئەم وشـەیە لەم دۆخـەوە سـەری هەڵداوە.

**(عەلی الوردی):**
**با کوردەکان مێژووی خۆیان بنووسنەوە**

ئەوەی لەکتێبەکەی دکتۆر (عەلی ئەلوەردی) تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە باس لەو برسێتییەی کە کوردستانی گرتەوە لەساڵی ١٧٥٦ز ناکات، ئەوە لەبەشی یەکەمی ئەم وتارە ئاماژەمان بۆکردبوو، هەروەها بەهیچ شێوەیەک خۆی لە باسکردنی ئەو کارەساتانە نادات کـە کـورد رۆڵی تایبـەتییـان تیـادا هەبووە. هەر لە میـرنشـینە کـوردییـەکـان و ئەو رووداوە مـێـژوویـیـانەی کـە لەسـەردەمی عـوسـمـانـیـیـەکـان روویانداوە. لەکاتێکدا زۆر لە مێژوونووسەکان کە باس لەم سەردەمانە دەکەن بەدرێژی باس لە رۆڵی کورد دەکەن لەمێژووی نوێ و رۆڵیـان لە رێڕەوی رووداوە مـێـژوویـیـەکان وەک رۆڵی ئەوان لە پاڵپشتی والییەکان. بۆ نموونە (داود پاشـا) بەدرێژایی (چل) رۆژ پەنای بردووە بۆ میـری میـرنشـینی بابان و داواکـاری یارمـەتی بووەو هاتۆتە قەڵای هەولێر لای مەلا گچکە مێوان بووە داوای یارمـەتی بۆ فـەتوای دەربکا کە کوردەکان پشتگیری بکەن بۆ ئەوەی مـزبەتە بکەن بۆ هەروەکـو بەرێز «عـلاء مـوسی کاظم نورس» لە کـتـێـبـەکـەی (العـراق في عـصـر المـمـالـيك) (١٧٥٠ز- ١٨٣١ز) سـەرەڕای ئامـاژەکـردنی بۆ چەندین باسی دیکە کە پەیوەستن بەمـێژووی کـوردەوە لەم بارەیەوە دەگـێـڕنەوە کوردەکان لە بەغدا لە ساڵانی حەفتای سەدەی پێشو رەخنە لە دکتۆر عەلی ئەلوەردی دەگرن سەبارەت بەوەی کە لەم بارەیەوە، واتە مـێـژووی کـورد، وەک پێـویست باسی لێ نەکـردووە. لەوەڵامدا وتوویەتی «کوردان خۆیان مـێـژوونـووسـی خـۆیان هەیە، ئەرکی خـۆیانە مـێـژووی خـۆیان بەدەسـتی خۆیان تۆمار بکەن».

**گرانی شەڕی**
**یەکەمی جیهانی١٩١٧**

بۆ ئەوەی باسـی گـرانی دوای کـوردسـتـان بکەین و دوعـا بکەین گـرانی و دەربەدەری جـارەکی دی دوچاری میللەت نەبێتەوە، بیرمان لە خـزمـەتی هەژارە دەست کـورت و پارووی حەڵال بێت کارەساتی گرانی سـاڵی ١٩١٧ زۆر لە سـەرچاوەکـان باسیـان لێکراوە لە نێو باسەکـانیـان کـارەسـاتەکـانی شـەڕی یەکـەمی جـیـهـانی. ئەو گـرانیـیـە تەنهـا کوردستانی نەگرتبوو بەڵام گشت ئەو وڵاتـانەی گـرتبـۆوە کـە دەوڵـەتی عـوسـمـانی لە شـەڕدابوو لەگـەڵ بەریتـانیا و فـەرەنسـا لە دەوروبەری عـێـراق، هەر لە سـەرەتاوە عـێـراق گـۆڕەپانی شـەڕ بوو لە سـاڵی ١٩١٤ لە بەسرە دەستی پێکرد، و شـەڕ بەرەو باکووری عێراق هێدی هێدی بەسـەر دەکـەوت تا سـاڵی ١٩١٧ بەغـدا داگـیـرکـراو شـەڕ بەرەو کـوردسـتـان دەهات ئەوە بوو ساڵی مایسی ساڵی ١٩١٨ کەرکووک داگیرکرا و پاشان هەولێر، لە هەر هێرشێک دەوڵەتی عوسمانی لە سەرۆک عەشیرەتەکان داوایان دەکرد بەشداری شەڕ بکەن بە ناوی جیهاد دژ بە ئینگلیز لە کۆتایی سـەرباری ئابووری کـۆمـەڵانی کـوردسـتـان قـورس بوو جـوتیـار ئەو گەنمەی کە بۆ چاندن هەڵی گرتبوو یان سوپای عوسمانی کە باج لەسەر مەڕو مـاڵات چەند جـار زیادیان کـردبوو و هەرچی بهاتبایە ژێر دەستیان ئەیانبرد ئەوە باسی باشووری کـوردسـتـان لە لایەکی دیکەوە مـاڵ لە خـۆیی نەبو ئـینـجـا سـوپای روسی پێش دۆستەکانیان لە شەڕی ئینگلیز هاتنە ناو خـاکی کـوردسـتـان گـەیشـتنە رەواندز وەدەوروبەری ئامێـدی زۆر بە درندانە هەڵسوکەوتیان دەکرد منداڵی ناو بێشکەیان دەکوشت بەڵام شۆڕشی شوعیییەکان لە روسیا سەری هەڵدا و کـشـانەوە ئەوە هۆی گـرانی خـراپی ١٩١٧ و رووداوەکـانی هەندێکی باسی لێوە دەکەین.

**شێخ جەمیل ئەفەندی**
**(١٨٧٨- ١٩١٩)**
**کۆمەکی برسییانی شاری هەولێر دەکات**

شێخ جەمیل ئەفەندی کوڕی شێخ عەلی ئەفەندی کوڕی مەلا ئەبوبکری مـەلا گـچکەی هەولێـرە لە سـاڵی ١٩١٩ لە تەمـەنی چلویەک سـاڵی کـۆچی دوایی کـردووە لە شـاری هەولێر، پیاوێکی خوا ناس دۆستی هەژاران بووە زۆر لەسەرخۆ وە یەکێ بووە کە رێگای تەریقەتی نەقشبەندی گرتووە، شێخ حوسامەدین تەوێڵەیی نەقشبەندی لەبەر ئەوەی باوکی شێخ جەمیل زۆر دۆستی ئەو بووە، شێخ

جەمیل خوشکی شێخ حوسامەدین دەخوازێ دوای پاش مردنی ئەو کچی شێخ حوسامەدین نەقشبەندی دەخوازێ خاوەن بیست گوند بووە لە هەولێر کە کارەساتی گرانی لە هەولێر دوچاری شاری هەولێر دەبێ لە هەردوو گرانی ساڵی ١٩٠٧ - ١٩٠٨ و لە گرانی شەڕی یەکەمی جیهانی ١٩١٧ ڕۆڵێکی بێوچانی هەبووە بۆ رزگار کردنی خەڵکی شار و دەوروبەری شاری هەولێر و ئەوانەی روویان لە هەولێر کردووە گشت سامانی بن دەستی لە پارەو پول و ئەو چاڵانەی لە دەشتی هەولێر بۆ گەنم و جۆ پاراستبووی هێنایە دەرەوە، لە قەڵای هەولێر بە پشتگیری ئامۆزاکانی (مەلا ئەفەندی، محەمەد موفتی، ئەحمەد ئەفەندی) سێ مەنجەڵی گەورە کە پانی دوو مەتر کە بۆ کوڵاندنی گەنم هاوینان بەکار دێن بۆ دروستکردنی ساوار لەناوەڕاستی مزگەوتی گەورەی قەڵاو لە پێش ماڵی خۆی کە ئێستاش لە قەڵا ماوەو هەروەها لە خوار قەڵات لە حەسارەکەی خۆی کە ئێستاش جێ و شوێنی ماوە نزیک گۆڕەپانی کۆتری ئاشتییە دوو جەمە شۆربای بەسەر هەژاران و برسییەکانی شاری هەولێر دابەش کردووە، لەو دوو کارەساتە شێخ جەمیل ئەفەندی و ئامۆزاکانی لە مزگەوتی قەڵا رۆژێک دوای نوێژی هەینی بە ئامادەبووان دەڵێ کەی من برسی بووم مانای ئەوەیە روبە گەڤێک بۆ خۆم و خێزانەکەم نەماوە هەموو دانیشتوانی قەڵای هەولێر ئێوە وەک برای منن ئەوەی هەمە لە راهی خوا دابەشی دەکەم، ئەوەبوو قسەکانی هێنایە جێ و بەردەوام بوو، شێخ عەدنان نەقشبەندی کە حەفیدی شێخ حوسامەدین نەقشبەندییە، ڕۆڵی شێخ جەمیل ئەفەندی بەرز دەنرخێنێ، کە هەردەم لەناو خەڵک باس کراوە، شێخ جەمیل ئەفەندی کە گەنم و جۆی دابەش دەکرد، لەهەمان کات یارمەتی پارەی دەبەخشیە مامۆستایانی گوندەکانی شاری هەولێر تا ئەوان قورسایی نێو دانیشتوانی گوند کەم کەنەوە بەراستی پیاوی وەک شێخ جەمیل ئەفەندی وێنەی کەمە دەرگای قەڵای هەولێرییەکانی دانەخست لەبەردەم هەژاران وەک والی موسڵ. هیمەتی شێخ جەمیل ئەوەم بە بیر دێنێتەوە کە خەڵکی هەولێر لە ناو دەروونیان زۆربەیان نەفسی شێخ جەمیلیان تێدایە لەکارەساتی ئەنفالکردنی بارزانییەکان ساڵی ١٩٨٣ و لە کۆمەککردنی کۆمەڵگای جەژنیکان بێ وێنە بوون. دەگێڕنەوە کە شێخ جەمیل ئەفەندی کۆچی کرد تازیە لە هەر ماڵێک و تەکیە و خانەقا لە هەولێر و سلێمانی و تەوێڵە و کەرکوک دانرا بە دوای تەرمەکەی بە بابەڕۆ گشت هەژارنی ساڵانی برسی بەدوای کەوتبوون.

شێخ جەمیل یەک کچی دەبێ عیزەددین مەلا ئەفەندی دەیخوازێ کوڕ و کچێکی دەبێ.

## قەڵای هەولێرو چەند چیرۆکی ساڵانی گرانی

لە سەرەتای باسی رووداوەکانی کارەساتی ساڵانی گرانی ١٧٥٦ و ساڵی ١٨٨٠ وساڵی ١٩١٧ بێجگە لە وەی گرانی دیکەش رووی داوە لەو ماوەیەدا بەڵام بەو سەختییە نەبووە کە خەڵکی کوردستان جێگاو نیشتمانیان بە جێبهێڵن و لە باکوور کۆچ بکەن بەرەو کوردستانی باشوور و لەوێشەوە بەرەو خوارووی زنجیرە چیاکانی حەمرین بەرەو تخوبی شاری بەغداو دەورو بەری بێ گومان هەر بەسەرهاتێک یان شیعرێک کە باس لە رووداوێک دەکا ئەوە ئەو رووداوە لە لاپەڕەکانی مێژوو دەچەسپێنێت منیش هەندێ لەم چیرۆکانە لەسەر زاری باوکم بیستووە یان لە خەڵکی دی ئەوانیش یان بە چاوی خۆیان رووداوەکانیان دیوە وەیا بیستوویانە تا دەگاتە کاتی رووداوەکە لەوانە ئێمەش ئەیگێڕینەوە تا ون نەبێ و نەشێوێندرێ تا بۆ دوارۆژ بمێنێ.

### چیرۆکی یەکەم:
### مەلا زادەی شاری هەولێرو دوو دزی برسی

ئەو چیرۆکەم لە باوکم بیستووە ئەویش لەساڵانێ کە شاری هەولێر دوچاری یەک لەو گرانییانە دەبێتەوە، ئەوسا مزگەوتی قەڵای هەولێر قوتابخانەکەی نزیکەی ١٠٠ فەقێ لە بواری جیا جیای قۆناغی خوێندن (سوختە،مستعد) خۆیان ئامادە دەکرد بۆ ئیجازەی مەلایەتی دوانزە عیلم، مزگەوت پێداویستی خواردنی یەک ساڵی لە خانووی مامۆستایانی مزگەوتی قەڵای هەولێر دەپارێزرا، باوکم وتی: شەوێک مەلا ئەبوبەکری مەلا گچکەی هەولێر کە مفتی شاری هەولێر و مەرجعی فتوا بووە لە کوردستان (سێ کوڕی هەبووە حاجی عومەر ئەفەندی باوکی مەلا ئەفەندی، مەلا عوسمان باپیری باوکم حاکمی جەزا بووە لە شاری موسڵ و

شێخ عەلی موفتی خاوەنی یەکەم پەخشانی کوردی بووە لە کوردستانی باشوور) پێش بانگی بەیانی لە خەو هەڵدەستێ بۆ نوێژی بەیانی، سەیر دەکا دوو پیاو سەر سورماو لە گۆڕەپانی حەوشەی خانووەکەی راوەستاون و لە سەر شانیان کیسێک پڕ لە گەنم، بەڵام وەک بە تەمابن یەکێ وەڵامی سەرسورمانەکەیان بداتەوە، مەلا زادەی هەولێریش، لێیان دەپرسێ دەڵێ: پێم ناڵێن ئێوە چی دەکەن لێرە، ئەم کیسە پڕ گەنمە لەسەر شانتانە من دەمێکە سەیرتان دەکەم؟

دزی یەکەم دەڵێ: قوربان ئێمە دەزانین ئەمە خانووی بەڕێزتانە لای خەڵکی شاری هەولێر نزیکبوونەوەی حەرامە بەڵام قوربان برسیەتی وای لێ کردین، هەوڵبدەین ئەم کیسە گەنمە بدزین، منداڵ و خێزانمان برسین.

دزی دووەم: سەرمان سوڕ ماوە کە هاتینە ژوورێ کیسەی گەنمان لەسەر شان دادەنێین دەرگای خانوومان لێ بزر دەبوو و نەمان دەدۆزییەوە بچینە دەرەوە، کیسە گەنمان بەجێ دەهێشت رووممان لە دەرگا دەکرد کرایەتەوە، ئەوە چەندین جارە خۆمان تاقی کردۆتەوە دەرگای سەرەکی خانوو هەر داخراوە خانووەکەتان شوورەی بەرزە سەختە بمانتوانیایە بچینە دەرەوە، دوا جار دەرگا بەیەکجاری نەما سەرمان سوڕماوە چاوەڕوانین بمانبەخشی و ئەم سەرسوڕمانەی ئەو شەوەمان لۆ روون کەیەوە.

مەلا گچکە دەڵێ: ئەم گەنمە خواردنی فەقێیەکانی مزگەوتی قەڵای هەولێرە، ئەم فەقێیانە کاریان خوێندنی ئاینی ئیسلامە، ئەوان دوارۆژ رێگا نیشاندەری راستین بۆیە دەرگاتان نەدۆزیتەوە، بەڵام هەرچۆنی بێت هەر یەکە یەک روبە گەنم، بیبەن بۆ ماڵەوە خوداش عەفوتان دەکا دووبارەی نەکەنەوە.

کە دوو دزەکە روبە گەنمەکەیان لەسەر شان دادەنێن ئینجا مەلا گچکە بە پەنجەی دەستی ئیشارەت دەکا بۆ دەرگا دەڵێ: ئێستا بە حەڵاڵی گەنمەکە دەبەن بڕۆن ئەم جارە دەرگا بۆتان کراوەتەوە دانەخراوە.

ئەو دوو پیاوە کە بەیانی دەچنە نێو خەڵکی شاری هەولێر ئەم رووداوە دەگێڕنەوە بە نیشانەی پلە بەرزی پیاو چاکیی مەلا گچکەی دەیژمێرن کە یەک لە خەلیفەکانی مەولانا خالیدی نەقشەبەندی دەژمێردرێت.

مەلا گچکە بەم ناوە ناسراوە لەبەر ئەوە لە تەمەنی بیست و دوو ساڵی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە کە کەس لە کوردستان هاوتای نەبووە، دەستی کردووە بە دەرسدانی نێو مزگەوتی قەڵا کە مەلا ئەوکات لە ٣٠ سی ساڵ یان زیاتر توانیویانە ئیجازە وەربگرن بۆیە وتوویانە (کچوک ملا) مەلای گچکە.

من لە منداڵی خەڵکی شاری هەولێرم دەدیت دەهاتنە گۆڕستانی کۆنی شاری هەولێر (کە ئێستا کەوتۆتە نێوان دوو بازاڕی گەورەی ئەم دواییە کە بەناوی "نیشتیمان" ناسراوە) بەردێکی بچووکیان بە کێلی گۆڕی مەلا گچکە دەسوا گەر بیگرتبا دڵیان خۆش دەبوو کە وا مرازیان حاصڵ دەبێت. ئەم زاتە "مەلا گچکە" کە داود پاشای والی بەغدا دێتە قەڵای هەولێر پشتگیری ئەو داوا دەکا و هەمان کات خەلیفەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بووە کە داود پاشاش موریدی ئەم تەریقەتە بووە و چەندین رۆژ میوانی دەبێت و ئیجازەی خوێندنی بەشێک لە زانستە ئاینییەکانی لێ وەرگرتووە.

### چیرۆکی دووەم:
### شەهابە و هەڕەشەی کوشتنی

شەهابە ئەوناوەم بەدەیان جار بیستووە لە نێو باس و رووداوەکانی کۆنی قەڵای هەولێر، شەهابە وەک باوکم باسی دەکا یەک لەهەرە خۆشترین دەنگخۆشی کوردستان بووە، کاتی گرانی جیهانی یەکەم لاوێک بووە، لەگەڵ ئەو لێشاوە برسییانەی دەوروبەری شارەکانی هەولێر لە کوردستان روویان لە شار کردووە بۆ رزگار بوون لە مردن بە هۆی برسیاتی باپیرم (محمد موفتی) شەهابەی لە بەر دەنگخۆشی ژوورەکی بچووکی بۆ تەرخان دەکا لە مزگەوتی قەڵای هەولێر، ئەو بانگی دەدا لە سەر منارەی مزگەوتی قەڵا ئەوکات کارەبا نەبووە خەڵکی قەڵا و دانیشتوانی خوار قەڵا لە لای باشوور گوێیان لە دەنگی دەبوو، هەندێ کەس دەیانوت گەر شنەبا بەرەو رۆژهەڵات بوایە لە گوندی باداوان مەلا ئەفەندی گۆی لە دەنگی دەبوو، لە دوا گرانی شاری هەولێر رۆژێکیان دوای نوێژی عەسر شەهابە چێشت لە ماڵی باپیرم بۆ فەقێکانی مزگەوتی قەڵا دەبا لە رێگا دوو کەس نانەکەی لێ دەستێنن و هەمووی لێ دەخۆن ئەوجا ئەویش هەر چاوەڕوان دەکا

قاپەكانی وەرگرێتەوە بەڵام دوو رێگری زگ برسی یەكێكیان دەڵێ حەز دەكەم ئەو هەتیمە بكوژم، دەسبەجێ شەهابە دەڵێ، برا بۆ دەمكوژی، خواردنەكە پێی تێر نەبوون، ترشی كەم بوو یان بێ خێ بوو ؟ !!!!!! جا بەو وەڵامەی وازی لێ دێنن و دەگەڕێتەوە بە داپیرم دەڵێ كە خوشكی (كانی) شاعیر (عەبدولجەبار ئاغای دوغرەمەچی) شاری هەولێرە، ئەویش گومانی دەبێت لە چیرۆكەكەی و دەڵێ كوڕم گەر ئەوان بن یان تۆ، نۆشی گیانتان بی برسی بووینە ئەدی چێشت بۆ كێیە بۆ برسی نییە !!

**چیرۆكی سێیەم:**
**حاجی زولێخا جەندرمەی برسیی**

حاجی زولێخا لە خێزانیكی دیاری گوندی قۆریتان بووخوشكی مەلا ئادەمی قۆریتانە. لە ماڵی خوالێخۆشبوو زەید ئەحمەد عوسمان دەبێت پاشان لای ئێمە ژیا تا كۆچی دوایی ١٩٩٣ تەمەنی ٩٦ ساڵ دەبوو، چەند جارێک لە ماڵ بۆ نان خواردن دەماوە، یادی رۆژانی گرانی بۆ ئەحمەدی كوڕم دەگێڕاوە دەیوت: كچ بووم هێشتا مێردم نەكردبوو لە گوندی قۆریتان (١٠ كم لەباشووری شاری هەولێرە) لە "سەفەر بەلک " (ئەو وشەیە پێشان زۆر بەكاردەهات لە نێو خەڵكی هەولێر مەبەستیان شەڕی جیهانی یەكەمە هەروەک عوسمانییەكان ناویان نابو) پێش هاتنی ئینگلیز بە ساڵێک یا كەمتر گرانی دەستی پێكردووە جەندرمەی توركەكان دەهاتن پیاو و لاوی گوند راپێچ بكەن بۆ ئاگری شەڕ، ئەوانیش خۆیان دوور دەخستەوە نەوەک راپێچ بكرێن بۆ شەڕی ئینگلیز، هەمان كات ئازووقەو مەڕو ماڵاتیشیان دەبرد، كە گرانی باری قورس بوو، چاڵی گەنمان هەبوو هەڵمان دەكەند بۆ ئەوەی تۆی چاندنی ساڵی دابێ و ئازووقەی ساڵێكی لێ حەشار دەین و بیپارێزین، بەڵام لە گرانی، ئەو گەنمەی نێو چاڵەكە بە شەو چووین و دابەشمان كردە سەر شەش حەفت چاڵی بچووک دوور لە یەكتر، لە مەترسی ئاشكرا بوونی و ئێمەش ببینە سواڵكەر، جەندرمەی تورک دەسووڕانەوە لە گوندەكانی دەوروبەری شاری هەولێر و لە مزگەوتی قۆریتان دەخەوتن هاواریان دەكرد " ئەجەم " وە ئەكمەک " بە مەعنای "برسیمە" یەكەمیان و دووەمیان "نان " ئەو وێنەیەی كە حاجی زولێخا باسی دەكا ئەو ماوەیە كە ئینگلیز تا ئاڵتون كۆپری هاتبوون و شەر بەردەوام بوو ئینگلیز رۆژی ٧ ایار ١٩١٨ كەركووكیان داگیر كرد پاشان بێ شەڕ هاتنە نێو هەولێر، منیش ئەو كات ساڵی ١٩٨٩ لە ساڵی "برسیمە " م دەكۆڵییەوە و ئەم دوو دۆكیومێنتە مێژووییەی كە باسی گرانی دەكا كەوتبوونە بەر دەستم، ئەو وێنەیەی حاجی زولێخا كە بۆی باس دەكردین وەک فیلمێكی سینەمایی دەهاتە بەر چاوم چۆن كورد دەربەدەر بووە شیرازەی خێزانی تێكچووە بە شێوەیەک كە بەغدا ئەم ساڵە ناسراوە بە "برسیمە " هەمان شێوە حاجی زولێخا خوالێخۆشبێ ئەم دوو وشەیەی لە یاد مابوو " ئاچ " برسی، حاجی زولێخا دەیوت: بە شەو هەویرمان دەشێلا و ئەستوورکە نانمان دەكرد بە ژمار، ئەم توركانە كە دەهاتن یان خەڵكی برسی دەهات پارووە نانێكمان پێ دەبەخشین.

**چیرۆكی چوارەم:**
**مەلا حوسێن مەرگ هەڵدەبژێری**
**نەوەک سواڵكردن**

مەلا حوسێن یەكێ بووە لە خەڵكی شاری هەولێر، خێزاندار بووە خاوەن سێ منداڵ بووە. دوای ئیجازە وەرگرتنی مەلایەتی ژوورێكی بە كرێ دەبێ خۆ وخێزانەكەی، ئەم بەسەرهاتە لە دیوەخانەكەی باوكم بیستوومە بەڵام كام گرانی بووە نەزاندرایە رەنگە گرانی ساڵی ١٧٥٦ بووە، كە برسیاتی باری ئابووری خەڵكی شاری هەولێر دەوروبەری تێک دەدا رۆژ لە دوای رۆژ نان بەرەو كەمی دەڕوا مەلا حوسێن، زۆر نەفس بەرز بووە، چیرۆكی دی لێ دەگێڕنەوە یەک لەو چیرۆكانە: كە فەقێ دەبێ لە مزگەوت نانی ماڵی هیچ سەرمایەدارێک و تاجرێكی نەخواردووە نەوەک پارەكەی سەد لە سەد حەڵاڵ نەبێ، رۆژێک یەک لەو كەسانە كە مەلا حوسێن خۆی لێ دوور دەخستەوە گشت فەقێیەكان لەمزگەوت دەعوەتی ماڵی خۆی دەكا دەڵێ كێ ماوە نەهاتبێ دەڵێن مەلا حوسێن بەزۆرداری لە مزگەوت دەیهێنن بۆ دەعوەت چاو دەگێڕێ مەلا زادەی هەولێر (مەلا گچكە) هاتووە؟ دەڵێن نەخێر نەهاتووە، دەڵێ ئەوەش درۆیەک بوو هەڵیان خەڵەتاندم، بۆ هاتن، ناچار دەبێ دادەنیشێ، كە نان خواردن دەست پێ دەكا، مەلا حوسێن لە جۆرەكەی پشبێندی نان و خورما دەردەكا، هاوەڵەكانی دەست دەكەن بە پێكەنین، خاوەن ماڵ دەڵێ: مەلا

حوسێن نانم بۆ ناخۆی نانم حرامی تێدایە ؟!، دەست دەکا بە فشارکردن و رابواردن، خزمەتکاری ئاغاش پێی پێ دەکەنن، لێرە مەلا حوسێن لە گیانی کار دەکا دەڵێ: ئەرێ وەڵڵا نانەکەت پارووی حەرامی تێدایە حەقی هەتیو و چەوساوەو هەژاری تێدایە و خوێنی چەند کەسی تێدایە هاوار دەکا پڕ بە دەنگی دەڵێ: حەرامە.... حەرام.. مشتەک بە دەستی لە برنجی پێش خۆی هەڵدەگرێ دەگوشی و شلەک لیێ دەردێ وەک خوێن ئەوجا مەلا حوسێن شوێنەکە بەجێ دێڵێ.. ئەم حەکایەتە چەند راستەو چەند راست نییە ئێمە تەنها دەیگێڕینەوە کە لایەنێک لە خوڕەوشتی ئەو سەردەمە ئاشکرا بکا.

مەلا حوسێن لەخوارووی قەڵا خانو دەگرێ کە زۆر باری ئابووری خراپ دەبی و خێزانەکەی و منداڵەکانی نوتقی قسە کردنیان نامینێ لە بێ هێزی و کەمی نان خواردن وەک ئەو خەڵکانەی ئێستا خۆیان لە نانخواردن دەپارێزن بۆ ئەوەی پەیامێکی سیاسی بگەیننە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی. مەلا حوسێن لە بەر نەفس بەرزی سواڵ ناکاو کە دەچێتەوە ماڵ دەبینێ گشت ئەندامانی خێزانی توانای قسە کردنیان نەماوە لە برسیاتی، دێتە دەرەوەو ماڵئاوایی لە دۆست و دراوسێکانی دەکا دەڵێ (هەولێر بەجێ دێڵم و دەچمە شارەکانی دەوروبەری، مەلا حوسێن دێتە ماڵەوە) و دەرگای ژووری لە سەر خۆیی و منداڵەکانی خێزانەکەی دادەخا و چاوەڕوانی مەرگ دەکا نەک بچێ کچەکانی بفرۆشی و بە خۆشی سواڵ بکات.

ئەم چیرۆکەی مەلا حوسێنم چەند جار لە دیوەخان بیستووە، من لێرە ئاماژە ئەوەی دەکەم بەڕێز عەبدولغەنی علی یەحیا لە ساڵی ١٩٨٦- ١٩٨٩ ئەم سێ ساڵە خەریکی کتێبێک بوو بە ناوی (دیوەخانەی رەشاد ئەفەندی) کە چەندین بەسەرهات و رووداوی کوردستانی بەخۆوە گرتبوو نزیکەی ٦٠٠ لاپەڕەیە، گەر چاپ بکرێ بۆشاییەک پڕ دەکاتەوە لە ئەدەبیاتی کەلتووری کوردی.

**چیرۆکی پێنجەم**
**کارەساتی ساڵی ١٩٩١**

زۆر بە کورتی باسی کارەساتی کۆچڕەوی ساڵی ١٩٩١ دەکەم، ئەویش کەمتر نەبوو لە ساڵانی گرانی گەورەی کوردستان، هەمان کات کە قونسلیەی فرەنسی پێش سەد ساڵ لە گرانی گەورە هاتە هانای کوردستان لە کۆچڕەوی کوردان دیسانەوە ساڵی ١٩٩١ فەرەنسا دەسپێشخەری کرد بۆ ئەوەی ناوچەی کوردستان بپارێزرێ. ئەم کارە دڕندانەیەی کە دژ بە کورد کرا هەرچەندی لەسەر بنووسرێ هێشتا کەمە، بۆ ئەوەی خۆمان لەبیر نەکەین و لەیادمان بێت، رۆژێک لە رۆژان ئاوارە بووین ئەو رۆژە کە سوپای سەدام حوسێن هەولێری لە ٣١/ ٣/ ١٩٩١ داگیر کرد روومان لەو دەشتە کردو پشتمان کردە شار لە دەست دڕندەیی سوپای رژێمی بەعس، برسییەکانی گرانی ساڵانی پێشووش لەدەست نەبوونی شاریان بە جێ هێشت ئەو وێنەیەم قەت لەبیر ناچێ سەدان کەس شەڕیان بوو بۆ ئەو ئازووقانەی، کە سوپای ئێرانی نزیک سنوور دابەش دەکرد، بەڵام رۆڵی سەرەکی کە هەردەم لەبیرم ناچێ رۆڵی کوردی کوردستانی رۆژهەڵات بە تایبەتی خەڵکی خانە و مەهاباد و سنە و سەقز و شنۆ.

با ئەو رۆژانە هاندەری برایەتی بەزەیی هاتنەوەمان بێ بە ماڵە شەهیدو ئەنفالکراوەکان و بێ دەرامەتەکانی کوردستان.

**بانگەوازێک**
**لە گۆڕستانی گەورەی**
**کۆنی شاری هەولێر**

راستە ئەم بانگەوازەم لەگەڵ بابەتەکە ناگونجێ بەڵام دەمێکە لە هەر کۆڕو باسێک باسم کردووە، زۆرم رەخنە لە برادەرانی کاربەدەست گرتووە، من باسی گرانی دەکەم لە هەمان کاتیش دیارە گرانی واز لە گۆڕستانی کۆنی شاری هەولێر ناهێنێ.

لە شاری پاریس بووم مایسی ساڵی ٢٠٠٤ نزیک تاوەری ئیفل (برج ئیفل) گۆڕستانێکم دیت بۆیان باس کردم، کە تەمەنی پتر لە هەزار ساڵە، وەک بەهەشت وا رازابۆوە لە داری جوان و گوڵ و گوڵزار و پەیکەری ناودارەکانی گۆڕستان و ناونیشانی هەر یەکێکیان، خەڵک بۆ گەشتوگوزار سەردانی دەکەن، لە شاری قەڵاو منارەش حەیف، یەکێ بەم جۆرە بیر بکاتەوە ئەم گۆڕستانە تێک بدا، کە بەشێکە لە کەلتووری شار بە مەبەستی دروستکردنی باڵاخانەو بازاڕ، ئەم شوێنە، کە هێسکو پروسکی باوبابیرانمانن و

زانای وەک مەلا گچکەی هەولێری و حاجی عومەر ئەفەندی کە کاک ئەحمەدی شێخ ستایشی بۆ دەکا لە نامەکانی پێش ۱۳۰ ساڵ، شێخ عەلی ئەفەندی خاوەن یەکەم پەخشانی دەستنووسی کوردی لە باشووری کوردستان، کە لە قەڵای هەولێر نووسیویەتی، و عەبدولجەبار ئاغای (کانی) شاعیر، ئەحمەد ئەفەندی یەکەم موتەسەریفی شاری هەولێر، شێخ جەمیل ئەفەندی ئەوەی لە پێشدا باسمان کرد، بێجگە لە دەیان سەرۆکی بنەماڵەکانی هەولێر و پیاو ماقووڵانی شار کە ئەو گۆڕستانە لە باوەشی کردوون ڕۆژێک بێ پاش سێ چوار سەدە ئەنفال بکرێن، لێرە هەرچەند باس باسی گرانییە بەڵام خۆ گرانی زەوی و زار نییە چەند زۆرە دەشتی هەولێر زۆرە، لە وڵاتانی شارستانی بازاڕی گەورە لە دەرەوەی شار دەکرێ، هەوڵدەدرێ باڵەخانەی بەرز لەنێو شار نەکرێ بەتایبەتی قەڵات وەک شوێنەوار، پێش سی چل ساڵ دروستکردنی باڵەخانە قەدەغە بوو نەوەک کار بکاتە سەر سیمای دەوروبەری قەڵای هەولێر، بە ناوی خۆم و گشت خەڵکی شاری هەولێر داوا دەکەم ئەوەندە گۆڕەی پێش چەند ساڵ هەڵکەندرا، کە نەدەبا ڕوویدا، لەوەو دوا قەدەغە بکرێ بە پێی یاسا دەست نەدرێتە گۆڕی ئەم زانایانە، کە شانازی کوردستانن، نەک تەنها شاری هەولێر، پاشان ڕێگاتان لێ بزر دەبێ و دەرگا نادۆزنەوە گەر بگەنە گۆڕەکەی مەلای گچکە هەولێری!!!، تکام وایە پرۆژەیەک ئامادە بکرێ بۆ دروستکردنی هەشت نۆ پەیکەری ئەم کەڵە پیاوانەی شاری هەولێر لە بەردەم دەرگای گۆڕستان، بەرزی هەر یەکەکیان ۱۵ مەتر بێت تا ون نەبن لە ژێر بەرزایی بازاڕی نیشتمان، بە شێوەکی ئەندازەیی، بێجگە لە پلانی چاندنی داری بچووکی هەردەم سەوز و نووسینی ناوی بنەماڵەکان لە هەر بەشێک لەناو گۆڕستان....

تکام وایە لە خەڵکی شاری هەولێر ئەو گۆڕستانە بەشێکە لە کەلتووری شارەکەتان بەتایبەتی و کوردستان بە گشتی بەیەک دەنگتان بیپارێزن.

**پەراوێزەکان:**

۱- بەشێک لەم کتێبخانەیە لە کۆشکەکەی خوالێخۆشبوو زانای گەورە (مەلافەندی) (۱۸٦۱ز- ۱۹٤۳ز) کە لەباداوە لە ساڵی ۱۹۵۹ دووچاری سووتان بۆوە و بەشێکی هەرە زۆر لە پەرتووک و دەستنووسە دەگمەنەکان لەناوچوون. لەم بوارەدا کۆچکردوو شێخ محەمەد ئاغا لەبارەی ئەم ئاگر بەربوونە دەڵێت: ئەگەر ئەم ئاگرە نەکەوتبایەوە چەندین کتێب و سەرچاوەمان بەدەست دەگەیشت کە بەڕاستی گەنجینەیەکی پڕ بەهاو دەوڵەمەند بوو. ئەوەی شایانی باسە (شێخ محەمەدی خاڵ) یەک لە نیجازە وەرگرانی بەردەستی زانای گەورە (مەلافەندی) بووە.

۲- ڕێسای خوێندنەوەی ژمارەکان بەپێی پیتە ئەبجەدییەکان بەم جۆرەی خوارەوەیە:
بڕوانە خشتەی ژمارە(۳)

۳- دوای ئەوەی کە ئەحمەد پاشا والی بەغدا لە لەشکر کێشییەکەی بەسەر میرنشینی بابان بوو کۆچی دوایی کرد ئەو میرنشینەی کە (قەڵاچوڵان)ی کردبوو بە پایتەختی خۆی لەسەردەمی سەلیم پاشای کوڕی بەکر بەگی بابان.

٤- سلێمان پاشا والی بەغدا ناسراو بە (سلێمان ابو لیلە) لەساڵی ۱۷٤۹ز دەست بەکار بووە و ئەوسا سەردەتای دەسەڵاتدارێتی مەمالیکەکان بووە لە عێراقدا. تەمەنی حوکمڕانی ئەم والییە سیانزە ساڵ بووە. توانایی مەمالیکەکان لە سەردەمی (ابو لیلە) لە پۆپکەی تواناییاندا بووە. ئەو پۆڵە هەراشانەی کە لە بازاڕەکانی (تەفلیسی)یەوە دەهێنران رووی لە زیادی دەکرد. لەساڵی ۱۷٦۱ز سلێمان پاشا دووچاری نەخۆشی بوو و مرد. بەمردنی ئەو سەردتا ماوەیەکی لە بەرەڵایی دەستی پێکرد.

* کوردستان لەماوەی ساڵانی نێوان (۱۷۵٦ز- ۱۱۷۰ک) و (۱۷۵۷ز- ۱۱۷۱ک) گرتبۆوە. کە هۆکارەکەشی ئەو شەپۆڵە ساردە کوشندەیە بوو ناوچەکەی گرتبووە خۆی. سەرەنجام ئاوی رووباری (دیجلە) بەستبووی بەدرێژایی بیست ڕۆژ. کاروان بەسەریدا، بەبێ ئەوەی پێویستی بەپرد بێت، تێدەپەڕی.

| ا | ب | ج | د | ه | و | ز | ح | گ | ی | ك | ل | م | ن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ۱ | ۲ | ۳ | ٤ | ۵ | ٦ | ۷ | ۸ | ۹ | ۱۰ | ۲۰ | ۳۰ | ٤۰ | ۵۰ |
| س | ع | ف | ص | ق | ر | ش | ت | پ | خ | ژ | چ | ڤ | غ |
| ٦۰ | ۷۰ | ۸۰ | ۹۰ | ۱۰۰ | ۲۰۰ | ۳۰۰ | ٤۰۰ | ۵۰۰ | ٦۰۰ | ۷۰۰ | ۸۰۰ | ۹۰۰ | ۱۰۰۰ |

خشتەی ژمارە (۳)

# دەروازەیەک بۆ لێکۆڵینەوەی پەرەسەندنی شاری هەولێر (١٧٧٠ ـ ١٨٢٠ز)

دکتۆر عەبدوڵڵا محەمەد ئەحمەد حەداد

شاری هەولێر بەقوولایی شارستانییەتەکان و رەهەندی مێژوویی تێپەڕ بووە. تایبەتمەندییە مێژووییەکانی ئەو شارە نزیکە لەسیمای شارێکی نوێ. لەکاتێکدا کە ناخی رابردوو تێکەڵ بەئێستا دەبێت.

هەولێر زێتر لە چوار هەزار ساڵ و تا ئێستاش لەگەڵدا بێت هەر بە ئاوەدانی ماوەتەوە و بە زیندوویی و بەپێوە وەستاوە. هەولێر لە ماوەی ئەو کاروانە دوورو درێژەیدا بەزۆر کارەسات و جەنگ و قۆناغی جیا جیای بەدرێژایی چاخەکان بەخۆوە بینیوە.

هەولێر لەنیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەمدا کاتێ رووبەرووی هەڵمەت و هێرشی ئێرانی بۆوە زنجیرەیەک نەهامەتی و شەڕو جەنگی بەخۆوە دیت.

ژمارەیەک لە فاکتەری ئابووری- کۆمەڵایەتی- سیاسی کاریگەری بەسەر شارەکە هەبوو، کە ببێت بەدەروازەیەک بۆ بووژاندنەوەو بەرەوپێشچوونی و بوونی بە شارێکی تازەو نوێ.

ئەم شارە زۆر پێشکەوتنی بەتایبەت لەرووی نۆژەنکردنەوەدا بەسەردا تێپەڕی.

**بەشی یەکەم:**

**١- هەڵوەستەیەک لەسەر هەردوو سەدەی دوانزەو سێزدەدا:**

لەپێناو ئەوەی بتوانین وێنەیەکی شاری هەولێر لە چوارچێوەی ئەو لێکۆڵینەوەیە بخەینەڕوو، وا پێویست دەکات رۆشنایی بخەینە سەر پلاندانان و رەوشی ئەو شارە هەر لەسەدەی دوانزەهەمی زایینی تا ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمدا. یاقوت حەمەوی لە کتێبەکەیدا (معجم البلدان) باس لە شاری هەولێر لە دەستپێکی سەدەی سیانزەهەمی زایینی دەکات و دەڵێت: (هەولێر... قەڵایێکی قایم و شارێکی گەورەیە لە فەزایی زەمینداو بەرفراوان و سادەیە. قەڵاتەکەی خەندەکێکی گەورەو قووڵی لەدەورە دراوە. قەڵات لەسەر بەرزاییەکەو سەرەکەی تەختاییە. لەناو قەڵات بازاڕو خانووی چاودێری و مزگەوتی نوێژکردن هەیە. قەڵاتی هەولێر لەشێوە بەقەڵاتی حەڵەب دەچێت. سەبارەت بەخوارووی قەڵات حەمەوی دەڵێت: بازارێکی گەورەو قەیسەری و دیواری لێ دروست کراوە، کە میر موزەفەرەدین گوگبری

کوڕی زینەدین کوچک عەلی دروستی کردووە). دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن کە یەکێکە لە ڕۆڵەکانی ئەو شارە لەمیانەی لێکۆڵینەوەکەیدا بەناوی (اربیل فی العهد الاتابکی)خزمەتگوزارییەکی زۆری پێشکەش بەمێژووی شارەکەی کردووە.

دکتۆر حوسامەدین نەقشبەندی لەلای خۆیەوە لێتوێژینەوەیەکی لەسەر (هێلکاری هەولێر لە کتێبە مێژووەکەی هەولێری ئیبن مستەوفی) پێشکەش کردووە. هەولێر لە سەردەمی ئەتابیکە لە خۆشگوزەرانی ژیاوە و میرنشینێکی بەهێز بووە، لەڕووی بووژاندنەوەو بیناسازی و بازرگانی و رۆشنبیری پەرەی سەندووە.

**ب- سەرنجێک لەسەر شاری هەولێر لەنیوەی سەدەی سیانزە تا کۆتایی سەدەی شانزە:**

هەولێر لەناوەڕاستی سەدەی سیانزەی زایینی رووبەڕووی زنجیرە هێرشێک بووەو پاش بەرهەڵستکاری و بەرخودانێکی دوورو درێژ لەگەڵ مەگۆلەکاندا، لەدوماهیدا شکستی خواردو لەساڵی (١٢٥٧ز) کەوتە ژێر رکێفی داگیرکەران و لەئاکامدا رووبەڕووی کوشتن و تێکدان بۆوە. بەهەمان شێوە لایەنی خوارەوەی قەڵات رووبەڕووی وێرانکردن و تێکدان و تاڵانکردن بۆوە.

هەروەها لەپێناو هەڵوەستەیەک لەسەر رەوشی هەولێر لە سەدەی شانزەمینی زایینی، واتە پاش ئەوەی عوسمانییەکان دەسەڵاتیان بەسەردا شکا، بەشیاو دەزانین بەچەند نووسراوێک هەڵوەستەیەک لەسەر گەشتیاری دانیمارکی (راوولف لیونارد Rauwolf Leonhard) بکەین، کە لەساڵی ١٥٧٤ز گەشتێکی بۆ ناوچەکە کردووە، دەربارەی هەولێر دەڵێت: (لەکۆتایی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٥٧٤ لەدرێژەی گەشتەکەمدا بەزۆر کێڵگەی کشتوکاڵی تێپەڕین تا بەشەو گەیشتینە شاری (هاربیل Harbil) کە تارادەیەک شارێکی گەورەیە، بەڵام دامەزراندنەکەی زۆر هەژارانە بووە، دیوارێک لەدەوری بووە، زۆر بەسانایی دەتوانرا دەستی بەسەردا بگیرێ بەبێ ئەوەی پێویست بەهێز بکات یان زەرەرو زیانێکی گەورە بدرێت. رۆژی دواتریش هەر لەو شارە ماینەوەو رۆژەکەش شەممە بوو، ئەو رۆژە جەژنی سەری ساڵی تازە بوو).

مرۆڤ دەتوانێ لە سەرنجە هەروایییەکانی راوولفدا، لەبەشی خوارووی قەڵات دەتوانین ئەوە وەدەست بێنین، کە ئاوەدان بووە، هەر چەندە باڵەخانەو خانووەکانی زۆر باش نەبووە. راستە دیوارێکی هەبووە، بەڵام زۆر مەحکەم نەبووە. ئەوەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ژیان لەخوارووی قەڵات هەبووە ئەمەش گەورەیی شارەکەی نیشانداوە.

**ج- هەولێر- هەڵمەتەکانی نادر شا:**

هەولێر دووجار رووبەڕووی هەڵمەتەکانی نادر شا بۆوە، هەڵمەتی یەکەم لەساڵی ١٧٣٢ز هەڵمەتی دووەم لەساڵی ١٧٤٣ز. شاری هەولێر خۆڕاگرانە بۆ ماوەی نزیکەی دوو مانگ بەرگری کرد، وێڕای ئەوەی لەڕووی ئیمکاناتی سەربازیش لاواز بوو. هەڵمەتەکانی نادر شا بەکارەساتێکی گەورە ئەژمار دەکرێت بۆ سەر ناوچەکەو هەولێریش وەکو هەر ناوچەیەکی دیکە بەشێکی لە قوربانی و زەرەرو زیانی مادی بەتێکدان و کاولکردن بەرکەوت، کە دەستی نادر شای گەیشتبێتێ. قەشە (حەیش بن جومعە) ئاماژەی بە قەوارەی ئەو زەرەرو زیانە داوە، کە لەمیانەی هەڵمەتەکەی نادر شادا بەهەولێر کەوت و جەختیشی کردۆتەوە، کە شا گەمارۆی هەولێری داوەو (لەماوەی چەند رۆژێکی کەمدا شەڕو کوشتارێکی بێ وێنەی ئەنجامداوەو پاشان بەتۆپ سووتاندوویەتی تا وای لێ کردوون خۆیان بەدەستەوە بدەن).

**د- سەرنج و شرۆڤەکان**

هەڵمەتەکانی نادر شا کاریگەرییەکی خراپی بەسەر شاری هەولێردا هەبووە. بەڵام لەگەڵ ئەوە دەشێ ئەوە لەبەر چاوبگرین، کە دانیشتوانی شار لە قەڵات بۆ ماوەیەک بەپێی توانایان و ئەو توانایەی لەدەستیان بوو بەرگرییان لەزەوی و خەڵک و منداڵەکانیان کردووە. پێدەچێ لای خوارووی قەڵات رووبەڕووی سووتان و تاڵان و وێرانکردن بووبێتەوە. سنووری شاری هەولێر درێژ دەبۆوە ناوچەی سێتاقانیشی لەخۆ دەگرت، ئەوسا

بەناوچەی (گوڵ و گوڵزار) ناسراو بوو. هەروەها گەڕەکێک هەبوو بەناوی (جاجماوە) کەوتبووە ناوچەیەکی نێوان (مزگەوتی شێخەڵڵا) و ناوچەی (گوڵ و گوڵزار/ واتە سێتاقانی ئێستاکە). ئەو ناوچەیە بەچەند خانوویەکی ماڵنشین و ژمارەیەک دامودەزگاو قوتابخانەیەکی سەر بەمزگەوت ئاوەدان کرابۆوە کە یەکێ لەزانایانی (خانەوادەی حەیدەری) وانەی تیادا دەوتەوە. دوور نییە ئەو زانا ئاینییە (بابا حەیدەر) یان (حەیدەری دووەم) بووبێ، کە لەسالی ١١٢٧ک/١٧١٤ز ژیاوەو مەزارەکەی کەوتۆتە تەنیشت مزگەوتی (شێخەڵڵا) نزیک گۆڕستانی گەورە.

ئەوەی پەیوەندداره بە (شێخەڵڵا)، واتە شێخ عەبدوڵڵا کە نازناوەکەی (قوتب مەدار)بوو. گێڕانەوەی دژ بەیەک دەربارەی ئەو هەیە. هەندێ وا مەزندە دەکەن لە سەردەمی حەیدەری دووەم ژیابێ. بەڵام پێدەچێ لە سەردەمی (شێخی باڵەکان) ژیابێ، کە مەزارەکەی کەوتۆتە (حاجی ئۆمەران). شایانی ئاماژە پێکردنە، (شێخەڵڵا) لە ساڵی ١٢٥٩ک/١٨٤٤ز کۆچی دوایی کردووە.

بەر لەوەی پێ بنێینە بەشی دووەم گەر ئاماژە بەرووداوی ساڵی ١١٦٤ک/١٧٥١ز بدەین، کە (دوحە الوزراء) باسی کردووە. (قۆچ پاشا) برای عوسمان پاشای بابان لەگەڵ لاگیرانی پەنای بۆ قەڵاتی هەولێر هێناو خۆی تیایدا قایم کرد، جا ئەوەی شوێنی نەکەوت و ملکەچی فەرمانەکانی نەبوو وەددەرێی نان. بەمەش یاخیبوون و بەرهەڵستکار پەیدابوون. وەزیر (سلێمان پاشا) فەرمانی دا ئابڵووقەیان بخەنە سەر لەپێناو ئەوەی خۆیان بەدەستەوە بدەن، بەڵام قۆچ پاشا ئاوڕی لێ نەدایەوەو گوێی پێ نەدا، ئەوسا (وەزیر سلێمان) نۆ ڕۆژ گەمارۆی قەڵاتی داو پاشان دەستی بەسەرداگرت و ئەو خۆتێنرێژەی دەستگیر کردو سەری پەلدا لەگەڵ ئەو کەسانەی لاگیری بوون. بەمە هێمنی و ئارامی گەڕایەوە بۆ تەواوی کوردستان. موزەفەرەدین لە بەغدا گەڕایەوەو بەگەرمی پێشوازی لێ کرا.

هەڵبەتە ئەو ڕووداوە دراماتیکییە، کە بەسەر شاری هەولێردا هات کاریگەری خراپی بەسەر شارەکەوە هەبوو، دەتوانین بڵێین دانیشتوانی شار رووی لە کەمی کرد، چونکە کۆمەڵێکی زۆر لەوانە ناچار بوون کۆچ بکەن جا چ بەزۆری بێت یان بەڕەزامەندی خۆیان و گەڕانیان بەدوای شوێنێکی ئارام، ئەوە بوو هەندێکیان روویان لە گوندە دوورەکان کرد. هەندێکی دیکە بەرەو موسڵ چوون. لەگەڵ ئەوە پێدەچێ پاش ئەوەی ئارامی و سەقامگیری گەڕایەوە بۆ ناوچەکە خەڵکەکە بێنەوە شوێنی نیشتەجێبوونیان.

**بەشی دووەم:**

**هەولێر لە سنووری ساڵی ١٧٧٠زدا**

(نیبور) گەشتیاری دانیمارکی لەرۆژی ١٤ی مانگی ئازاری ساڵی ١٧٦٦ز لەبەغداوە بەقاسید بۆ موسڵ هات. بەڵام ڕێگەی کەرکوک-هەولێری هەڵبژارد، لەبەر ئەوەی سەفەرکردن لەو ڕێگەیە (سەلامەتەو پێویستی بەوە نەدەکرد چاوەڕوانی کاروانێکی گەورە بێت تا یاوەرییان بکات. گەشتیار ناچار نەبوو بەپەلە سەفەر بکات. ئەو ڕێگەیە هەر چەندە درێژ بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر لەشارەکان کەوتبوونە سەر ڕێگاکەی سەلامەت بوو). کاتێ گەیشتە هەولێر لەسەری نووسی و گوتی: (بێگومان ئەوە شاری (هەولێرە) کە بەجەنگی مێژوویی ناوبانگی دەرکردووە، کە لەنێوان ئەسکەندەری گەورەو دارا روویدا). وادیارە (نیبور) زانیاری لەسەر زۆر لایەنی مێژووی ئەو شارە هەبووەو بەخێرایی باس لە سەردەمی ئەتابیکە دەکات و دەڵێت: (هەولێر میرنشینێکی ئیسلامی بوو. میرنشینەکان پشتاوپشت حوکمڕانییان کردووە و بەرفراوان بوو، بەڵام ئەمڕۆ ساڵی ١٧٦٦ز هیچی نەماوەتەوە تەنیا قەڵات نەبێت. هەتا ئەو قەڵاتەش خۆش نەماوە). سەبارەت بەخوارووی قەڵاتیش دەڵێت: (لەخوارووی قەڵات چەند خانوویێکی خەراپ هەبوونە، کە هی ماڵە هەژارەکان بوو. هیچ شوێنەوارێک نەبووە تەنیا کەلاوەی مزگەوتێکی گەورە نەبێت، کە کەوتبووە ناوەڕاستی زەوییە کشتوکاڵییەکان و سوڵتان موزەفەر لەدووری قەڵات دروستی کردووە).

هەروەها گەشتیاری ناوبراو

ئاشکرای کردووە، کە هەولێر سەر بەویلایەتی بەغدا بووەو ئۆردووگایەکی بەهێزی سەر بە (یەنیچەریە)ی قوستەنتینییەی (ئەستەنبۆڵ)ی لێ بووە. هەروەها باسی لەوە کردووە کە هەولێرو ئاڵتون کۆپری بەر لەچەند ساڵێک سەر بەپاشالق (کۆیە) بوونە، بەڵام ئێستا والی بەغدا حاکمێکی خۆی بۆ هەولێر دەنێرێت، ئەویش لەلای خۆی (ئاغا) بۆ ئاڵتون کۆپری دەنێرێت.

## مێژووی هەولێر
## ١٧٨٥ز/ ١٢٠٠ک

یەکەم: یاسین خەیروڵلا عومەری خەتیبی موسڵ لە کتێبەکەیدا (غایە المرام فی تاریخ محاسن بغداد دارالسلام) باس لە سەرنج و تێبینییەکانی دەکات و جەخت لەسەر هەولێر دەکاتەوە، کە هەر لە ساڵی ١٢٠٠ک/ ١٧٨٥ز گۆڕانکارییەکی بەرچاوی بەخۆوە بینی لەرووی بازرگانی و کشتوکاڵی بووژایەوەو ئاستی گوزەرانی خەڵک رووی لەباشی کردو بوون بەخاوەنی (ماڵ و سامان و رەشەوڵاغ)، کە ئەمەش بووە فاکتەری سەرەکی بۆ بەشداریکردن لەچالاکی بزاوتی بازرگانی. گومان لەوەدا نییە کە خەڵکی هەولێر سوودێکی زۆریان لە شارەزایان و ئەزموونی بازرگانی موسڵ وەرگرتووە، هەروەها خەڵکی (موسڵ)یش سوودیان لەخەڵکی هەولێر وەرگرتووە. لەدوماهیدا ژمارەیەک گەورە بازرگانی زەنگین پەیدا بوون، کە خاوەنی سەروەت و سامانی زۆر بوون. رەشەوڵاغیان کری بۆ رێکخستنی کاروانە بازرگانەکانیان. چونکە ئەوسا رەشە وڵاغ وەک (کەر و هێستر) یەکێک لە هۆکاری گواستنەوەی کاروانە بازرگانییەکان بۆ ساناکردنی پرۆسەی بردن و هاوردن بوو.

هەر سەبارەت بە بووژاندنەوەی بازرگانی بایەخێکی یەکجار زۆر بەکشتوکاڵ درا، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەک پیشە بووژێنەوە، کە پەیوەندار بوون بە (دارتاشی و ئاسنگەری و...تاد). لەلایەکی دیکە ئەمە خۆی لەخۆیدا وای کرد پێویستییان بەشوێنی بازرگانی تازە بێت (خانە و دوکان). ئەمەش بووە هۆی ئەوەی شار بەرفراوان بێ و کاردەست بەگەڕ بخرێ.

لەلایەکی دیکە والی بەغدا (سلێمان پاشا) جۆرە شێوازێکی دەگمەنی لەگەڵ خەڵکی هەولێر بەکارهێنا کاتێ پەنایان بۆ برد لەژێر زوڵم و ستەمی (محەمەد ئاغا) رزگاریان بکات.

دووەم: جا بۆ زیاتر پێدانان لەسەر هێڵکارییە گشتییەکان بۆ بەرەوپێشبردنی شاری هەولێر لەپاش ساڵی ١٢٠٠ک/ ١٧٨٥ز وا پێویست دەکات رۆشنایی بخەینە سەر هەندێ لە سەرچاوەکان:

دیپلۆماتکاری فەرەنسی رۆسۆ (Rousseau) کتێبێکی لەسەر رەوشی عێراق لەرووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەوسا داناوە، کە تاساڵی ١٨٠١ز بەکاری سیاسی لەبەغدا مایەوەو لەپاریس لەساڵی ١٨٠٩ز چاپ کرا. رۆسۆ لە کتێبەکەیدا باس لەهەولێر دەکات و دەڵێت:

(بەدووری (١٠) فەرسەخ بەلای باکوور لەپردێوە دەگەینە هەولێر (Erbil) یان ئەربیلتس (Arbellets) رووبەرێکی بەرفراوانی هەیەو بەروبوومەکەی لەبەروبوومی ناوچەی کەرکووک دەچێت). شایانی ئاماژە پێکردنە پێدەچێ ئەو زانیارییانەی رۆسۆ باسیان لێوە دەکات بۆ سنووری ساڵی ١٨٠٠ز بگەڕێنەوە.

سێیەم: زۆری زانیارییەکان لەسەر هەولێر قەشەی دۆمنیکانی (کامپانیل) (P. Giasseppe Canpanile) تۆماری کردووە، کە لەماوەی (١٨٠٢-١٨١٥ز) لەموسڵ و ئامێدی مایەوە. باس لەباری ناوچەکە دەکات و کتێبێکی بەزمانی ئیتاڵی داناوە بەناوونیشانی (مێژووی کوردستان)، کە لەساڵی (١٨١٨ز) لە ناپۆلی چاپ کراوە. (پێدەچێ ئەو کتێبەی لەسنووری ساڵی (١٨٠٨-١٨٠٩ز) دانابێ). (کامپانیل) دەڵێت: (هەولێر شارێکی جوانە. بەرەفتار بەرزی جیا دەکرێنەوە. دابەش دەبێت بەسەر دوو بەش: قەڵات و دەشت. هەژاری و نەبوونی بەسەر قەڵاتەوە دیارە. لەشار ژمارەیەک زێرینگر هەبوون، بەڵام بەئاستێکی بەرز لێی کارزان نەبوون. هەر لەشار تیمێک لە کرێکاران کاری پێستە خۆشکردنیان دەکرد (دروستکردنی پێڵاو) بەبێ پاژنە. ژمارەیەک ئاشی لێ بوو. هەروەها ژمارەیەک دەوڵەمەندی لێ بوو،

لەگەڵ ژمارەیەک خاوەن دوکان و خانەی تایبەت بەچنینی پەمۆو دروستکردنی پیشەسازی دیکە.

هەولێر راستەوخۆ سەر بەوەزیری بەغدا بوو. ئەو بەشە لە کوردستان بە (سۆران) ناسراوە. بەڵام زمانی باو لەو شارە (هەولێر) کوردی و تورکی بوو).

چوارەم: لە ساڵی ١٨١٦ز گەشتیاری ئینگلیزی (جیمس بکغنهام) گەیشتە هەولێر، کە لە موسڵەوە هاتبوو. شەوێک لە عەنکاوە مایەوە بۆ بەیانییەکەی زوو هاتۆتە هەولێر. پاشان ئەمەی نووسیوە:

(هێشتا رۆژ دەرنەهاتبوو گوندی عەنکاوەمان بەجێهێشت و بەرەو باشوورو باشووری رۆژهەڵاتی هەولێر هاتین لەرێگا بەماوەی (٤) میل بەدەشتێکدا هاتین، کە هەندێ کشتوکاڵی تیادا چێندرابوو. تا لەگەڵ هاتنی تیشکی خۆر گەیشتینە شاری (ئوربێل) یان ئەربیل، کە دانیشتوانەکەی بەهەردوو زاراوە ناوی دەبەن. هەر لەو کاتەی موسڵمان جێهێشت گەورەترین شارە کە بیبینین، ژمارەی دانیشتوانەکەی لە دە هەزار کەس تێپەڕ ناکات. زۆربەی دانیشتوانەکەی موسڵمانن. دوو مزگەوتی گەورەمان بینی کە هەریەکەو منارەی هەبوو. بازاڕەکە هەر لەزووەوە پڕ لە خەڵک بوو. سەبارەت بە قەڵا بکگنهام دەڵێت: (گردێکی چوار گۆشەو بانەکەی تەختاییەو گومان لەوەدا نییە، کە بەدەستی مرۆڤ دروست کرابێ لەگەڵ ئەوەش لەرووی دەرەوە بەگردێکی سروشتی خۆی دەنوێنێت. دیوارەکانی ناو قەڵات بەخشت دروست کراون پڕە لەخانووی نیشتەجێ و بەشێکی گەورەی شارەکەش لەخوارووی قەڵات بەربلاو بوونەتەوە).

شایانی باسە بارەکە وا پێویست دەکات تیشکێک بخەینە سەر بازاڕەکانی هەولێر. تادەیەی یەکەمی سەدەی بیست ناوەندی بازرگانی شاری هەولێر کلاسیک بوو. بەڵام لەسنووری ساڵی ١٩٠٩ بزاوتێکی تازە دەست پێکراو، بازاڕێکی سەرگیراو دامەزراو پێی وترا قەیسەری و لەساڵی ١٩١١ کارەکان تەواو بوو. ئەو بازاڕە هەروەکو جاران لەسەر هەمان رێچکە مایەوە وەک بازاڕی دارتاشان بازاڕی میوەفرۆشان بازاڕی سەوزە فرۆشان و بازاڕەکانی لاله فرۆش و ئاسنگەرو گۆشت فرۆش و..تاد. لەپاش ساڵی ١٩٣٥ هەڵمەتێکی تازە بۆ شاری هەولێر دەستی پێکرد، بەتایبەتی پاش ئەوەی ئاسن و چەمەنتۆ هاتە هەولێر. ئیدی بەشێوازی نوێ دوکانە کۆنەکانیان تازە کردەوەو قەبەنگی تازەیان بۆ بەکارهێنا. ئەو بازاڕە بەشەو پاسەوانی هەبوو پێیان دەگوتن حەس حەس. کاریان بەشەوانە سەیری قوفڵەکانیان دەکرد بۆ ئەوەی بزانن ئاخۆ قوفڵدراوە یان نا.

پێنجەم: لەساڵی ١٨٢٠ز (مستەر کلودیوس جیمس ریچ) جێنشینی بەریتانی لەبەغدا سەردانی شاری هەولێری کرد لە رێی پردێیەوە هاتۆتە شار. پاشان بۆ ماوەی چەند مانگێک لەشاری سلێمانی مایەوە. (ریچ) وەسفێکی تەواوی ئەو رێگەیەی پیایدا رۆیشتووە لەبارەی کشتوکاڵ ئەو گوندانەی پێیدا تێپەڕ بوو کردووە. پاشان گەیشتۆتە قوشتەپەو ئاماژەی بەهۆزی (دزەیی) داوەو جەخت دەکاتەوە، کە هۆزێکی کوردە پێشتر سەر بەکۆیە بوون. دواتر پاشای بەغدا لەکۆیەو هەولێری جیاکردۆتەوەو راستەوخۆ خستوویەتییە ژێر دەسەڵاتی خۆی. ئەمەش وای کرد کە ئەو هۆزە بایەخ بە کەس نەدەن. بۆیە (ریچ) ناچار بوو گەشتەکەی دووبارە دەست پێبکاتەوە پاش ئەوەی (فارس ئاغا) سەرۆکی هۆزی دزەیی رەتی کردەوە میوانداری بکات. ئەمجارە بەلای باکووری رۆژهەڵات بە (دە پلە) هاتە هەولێر لەلایەن جێگری حاکمی هەولێر، کە سەرۆکایەتی پەنجا یان چل زاناو داواکراو پێشوازی لێ کرا. هەروەها جەختی کردۆتەوە کە لەلای کارێز خێوەتیان بۆ هەڵداون کە دەگەڕێتەوە بۆ (حاجی قاسم بەگ)، کە کەمێک لەباشووری رۆژئاوای شار دوور بووە.

لە ٢٧ی مانگی تشرینی یەکەم ساڵی ١٨٢٠ (ریچ) سەردانی منارەی کۆنی کردووە. پاشان باس لە منارەو پاشماوەی دیواری هەولێرو خەندەکەکەی کردووە، بەشەکانی دیوارەکە دیار بوونە بەتایبەت ئەوەی لای خێوەتەکانیان نزیک بووە. (ریچ) تا ئەو سنوورە جەخت دەکاتەوە، کە هەولێر لەرابردوو زۆر گەورەو فراوان بووە. پێدەچێ لەرووی

گەورەیی و بەرفراوانی (لەساڵی ١٨٢٠ز) بەقەد شاری بەغدا بووبێ. هەروەها (ریچ) جەخت دەکاتەوە، کە هەولێر کەوتووەتە پاڵ گوێسەبانەیەکی دروستکراو بەتایبەت لەلای باشووردا. یەک گەرماو و چەند خانەو بازاڕێکی لێ بووە. بەشێکی ئەو شارە کەوتۆتە سەر گوێسەبانەکە کەپێی دەوترێت قەڵا.

## کۆتایی:

لە کۆتاییدا دەشێ گەورەترین ئەو کارانە دیار بکەین کە لەبەشی خوارەوەی شاری هەولێردا بوون:

١- ژمارەیەکی زۆری دوکان و فرۆشگا (لە بازاڕەکان).
٢- ژمارەیەک لە خانەکان (لە بازاڕو شوێنە جیا جیاکان لە شاردا).
٣- شوێنی تایبەتمەند بۆ خوداپەرستن (مزگەوتەکان- جامعەکان- تەکییەکان).
٤- ژمارەیەکی زۆر لە خانووی نیشتەجێ و ماڵنشین.
٥- ژمارەیەکی زۆری حەسار.
٦- ژمارەیەکی زۆر لە گەرماو و قاوەخانەو شتی تر.

لە ساڵی ١٨٢٠ شێوازی بازاڕو گەڕەکە ماڵنشینەکان بەشێوەیەکی روون و ئاشکراو بەرچاو لە بەشی خواروی قەڵا بووژاندنەوەیەکی گەلێ بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، بەوەی لەپاڵ قەڵا شاری هەولێری پێکهێنا.

## المصادر:

أ- المصادر العربية او المترجمة الى العربية:

١- ابراهيم فصيح الحيدري (١٣٠٠هـ-١٨٨٣م) عنوان المنجد في اخبار بغداد والبصرة ونجد، بغداد.. بدون تأريخ.
٢- بكغنهام (جيمس). رحلتي الى العراق سنة ١٨١٦، ترجمة سليم طه التكريتي، جزءان، بغداد ١٩٦٨.
٣- د.حسام الدين النقشبندي. خطط اربيل في كتاب ابن المستوفي، تاريخ اربل المسمى: نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل، مجلة "ابحاث" مجلة جامعة صلاح الدين للعلوم الانسانية، العدد الاول، السنة الاولى ١٩٨٩، ص١٢٥-١٥٧.
٤- دائرة المعارف الاسلامية الطبعة العربية، مادة (اربيل).
٥- الشيخ رسول الكركوكي: دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد، ترجمة موسى كاظم نوري، بيروت (بدون تاريخ).
٦- ريج (كلوديوس جيمس) رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠ الجزء الاول، (نقلها الى العربية بهاءالدين نورسي) مطبعة السكك الحديدية، بغداد ١٩٥١.
٧- سالنامة وبلايت بغداد، بغداد ١٢٩٤هـ/ ١٨٧٦م.
٨- سهيل قاشا. حملات نادر شاه على العراق في وثائق سريانية، مجلة (كاروان) العدد (٧٥) اربيل ١٩٨٦. قسم الثاني.
٩- د.طارق نافع الحمداني، ملامح سياسية وحضارية في تاريخ العراق الحديث والمعاصر. بيروت ١٩٨٩.
١٠- عبدالباقي عبدالجبار الحيدري، التجديد الحضري لقلعة اربيل، مطابع جامعة الموصل ١٩٨٥.
١١- عبدالعزيز سليمان نوار، داود پاشا والي بغداد، القاهرة ١٣٨٨هـ/١٩٦٨م.
١٢- عبدالله محمد حداد. معلومات نادرة عن اربيل قبل قرن، مجلة "كاروان" العدد (٥)- اربيل ١٩٨٣، ص٩٥-٩٩.
١٣- عصام الدين عثمان بن علي بن مراد العمري، الروض النضر في ترجمة ادباء العصر (ثلاثة اجزاء) تحقيق الدكتور سليم النعيمي، مطبعة المجمع العلمي، بغداد ١٣٩٥ه/١٩٧٥م.
١٤- لونگريك (المستر ستيفن هيملي) اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة: جعفر الخياط، بغداد- الطبعة السادسة، ١٩٨٥.
١٥- مأمون بك بن بيكه بك، مذكرات مأمون بك بن بيكه بيك (نقلها الى العربية وعلق عليها (محمد جميل روژبياني و شكور مصطفى)، مطبعة المجمع العلمي، بغداد ١٩٨٠.
١٦- محسن محمد حسين، اربيل في العهد الاتابكي، مطبعة اسعد، بغداد ١٩٧٦.
١٧- محسن محمد حسين، موضوعان في التاريخ الكردي، بغداد ١٩٧٦.
١٨- نيبور، رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر، (ترجمه عن الالمانية الدكتور محمود حسين الامين وراجعه وعلق ووضع فهارسه سالم الالوسي). بغداد.
١٩- الدكتور هاشم خضر الجنابي، مدينة اربيل.. دراسة في جغرافية الحضر، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، ١٩٨٧.
٢٠- ياسين بن خيرالله العمري الخطيب الموصلي، غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد دار السلام، مطبعة دار البصري، بغداد ١٣٨٨ه/١٩٦٨م.
٢١- ياقوت الحموي (ابو عبدالله شهاب الدين ياقوت بن عبدالله الحموي الرومي) ٦٢٦هـ١٢٢٩/م. معجم البلدان، دار صادر، بيروت (١٩٥٥-١٩٥٧) خمسة اجزاء.

*

# چاکسازییەکانی "میر محەمەد" لە رووی ئابوورییەوە

ئاکۆ حەمەدەمین

**یەکەم:**
**لایەنی کشتوکاڵی**

دکتۆر (روس)ی ئینگلیزی، کە لە ساڵی (١٨٣٣ز) هاتۆتە کوردستان دەڵێ: خەڵکی سەر بەناوچەی پاشا هەر لە ناوچەی کەرکووکەوە مەشغوڵ بوون بە بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و بەخێو کردنی ئاژەڵ و مەڕومالات، هەموو ناوچەکان کێڵگە و رەز و باخ بووە بەپێچەوانەی شوێنەکانی تری ژێر دەستی عوسمانی[١].

لەمەوە دەردەکەوێت کە (میر محەمەد) بایەخێکی زۆری بە لایەنی کشتوکاڵ داوە و هەوڵی داوە لەم رووەوە پشت بەخۆی ببەستێت، کاتێک میر محەمەد دەستی بەسەر هەولێر و کۆیە و ئامێدیدا گرت، بایەخی زیاتری بە کشتوکاڵ دا، چونکە ئەم ناوچانە زۆر شیاو و بەپیت و بەرەکەت بوون بۆ کشتوکاڵ، هەروەها میر محەمەد بایەخی بە مەسەلەی ئاودێری و راکێشانی ئاو بۆ کێڵگەکان داوە[٢].

میر محەمەد هەندێک کەسی داناوە بۆ چاودێری کردنی ئەو جۆگانەی کە ئاویان پێدا دەڕۆیشت[٣]. لەمەوە بە دەردەکەوێ کە لەبەر زەبر و توندوتیژی میر محەمەد کەس نەیتوانیوە زیان بە کشتوکاڵ بگەیەنێ و بەردو نەمانی ببات، هەروەها میر محەمەد چەندین قەڵا و بنکەی چاودێری دروست کردبوو لە شوێنە گرنگەکان بۆ هێنانەوەی ئەمن و ئاسایش لە ژیانی کشتوکاڵ، بەم شێوەیە کشتوکاڵ گەشەی سەندووە و پێداویستییەکانی ناو میرنشینی دابین کردووە[٤].

لایەنی کشتوکاڵ کردن لە میرنشینی سۆران هەر لەسەر نەریتە کەونەکەی بەرێوە دەچوو، کە شێوازی پێکهاتەی کشتوکاڵی دەستی بوو، ئەوکاتی لە ناو کۆمەڵ سێ چین هەبوون، لاوازترینیان جووتیار و شوانکارەکان بوون، کە کشتوکاڵیان دەکرد و مەڕ و مالاتیان بەخێو دەکرد، چینی دووەم ئەوانە بوون کە لە شارەکان دەژیان، وەک شاری رەواندز، ئەمانەش ئەوانە بوون پیشەوەرەکان و ئەو کەسانە بوون، کە بە کاروباری کڕین و فرۆشتن خەریک بوون و ژیانیان لە چینی یەکەم باشتر و خۆشتر بوو، چینی سێیەم بریتی بوون لە بنەماڵەی میر و دەستەیەک لە زانا و سەرۆک خێڵەکان[٥].

زۆربەی زەویوزاری ئەم میرنشینە لە ژێر دەستی ئاغا و شێخ و بەگەکاندا بوو، چونکە سەرجەم دێهاتەکانی دەوروبەری شاری هەولێر پاشا بەکرێ دابوویە ئاغا و شێخ و بەگەکان[٦].

بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا کشتوکاڵ کردن لەناوچەکانی میرنشینی سۆران، لە بارودۆخێکی باش بووە، هەروەکو چۆن دکتۆر

(روس) باسی دەكات، كە هەموو پێداویستییەكانی كشتوكاڵ لەو سەردەمەدا لە ناوچەكانی میرنشینی سۆران بەرهەم هێنراون، بەرهەمەكە باشتر بووە لە پێداویستیی دانیشتوان، چونكە میری سۆران لە رووی ئابووری بەگشتی و كشتوكاڵی بەتایبەتی پێویستی بە بەرهەمی دەوڵەتی عوسمانی نەبوو، لەبەر ئەوەی میر محەمەد باشی زانیوە، كەوا دەوڵەتی عوسمانی بەهەر شێوەیەک لە شێوەكان بتوانێ دەسەڵاتی میر محەمەد لەناو دەبات، بۆیە میر محەمەد لەم بارەیەوە خۆی بەدوور گرتووە لە پەیوەندی ئابووری لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی[7].

(روس) بینیوویەتی زۆربەی دانیشتوان، كە جووتیارەكانن، كۆچیان كرد بۆ ناوچەكانی ژێر دەستی میرنشینی سۆران، بۆ ئەوەی لە ژیانێكی هێمن و ئاسوودەدا بژین لە ژێر سایەی ئەو رێكخستنەی، كە میر محەمەد دایناوبوو. هەروەها (فرایزەر) (١٨٣٤ز) سەردانی سلێمانی كردووە و دەڵێ: شاری سلێمانی پڕ بوو لە كوشت و بڕ و ناخۆشی كە لە ژێر دەستی میرنشینی بابان بوو، دەڵێ بۆیە جووتیارەكان كۆچیان كرد بۆ ناوچەكانی ژێر دەستی میر محەمەدی میری سۆران، ئەم ئارامی و هێمنییەی میرنشینی سۆران بۆتە هۆی پێشكەوتن لە رووی ئابووری، كە بۆتە هۆی كۆبوونەوەی سامانێكی زۆر لە رەواندز، كە میر محەمەد بەهۆیەوە توانی ئامانجەكانی بهێنێتەدی[8].

د. روس (١٨٣٣ز) بەغدا بەجێدەهێڵێ و بەرەو كوردستان دێت و تێروانینی خۆی بەم جۆرە دەردەبڕێ بەدرێژایی رێگای پردێ و هەولێر شینایی و كشتوكاڵی زۆری لێ كراوە، گوندی هەمەجۆری لێ بینراوە و دانیشتوانی زۆر بووە، بەپێچەوانەی ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی كە چۆڵ و كاول بوون، خەڵک خۆیان دەشاردەوە، كە كاربەدەستی میری نەبینێت[9].

هەر لەو سەردانەیدا د. روس باس لەوە دەكات، كە خەڵكی ناوچەی میرنشینی سۆران خەریكی بەرهەمهێنانی كشتوكاڵ و بەخێوكردنی ئاژەڵ و مەڕ و ماڵات بوون، هەروەها شوێنەكانیان زۆر ئاوەدان بووە و ژمارەی دانیشتوانیان روو لە زیادبوون بووە[10].

## دووەم: لایەنی بازرگانی

میر محەمەد لە رووی بازرگانیشەوە هەوڵی داوە پێشكەوێت و پشت بەخۆی ببەستێت، (د. كاوس قەفتان) باس لەوە دەكات، كە رەواندز شوێنێكی كاروانی بازرگانی بوو، ئەوەش لەسەرێكەوە دەسەڵاتی سیاسی دەدایە ناوچەكە و لەسەرێكی تریشەوە لە رێی باج و سەرانە سامانێكی زۆری بۆ دەهێنا، رۆژهەڵاتناس (میلینگن) ناوی گەنجینەی لێ دەنێ، كە سوڵتان تەماحی لێكردبوو بۆ خۆی بردبوو، لە رێگای ئەم سامانە زۆرە میری رەواندز توانی سوودی لێ وەربگرێت بۆ دروستكردنی قەڵا و پرد و تۆپ[11].

هەروەها میر پەیوەندییەكی باشی لەگەڵ (محەمەد عەلی پاشای میسر) هەبوو، ئەوەش خۆی پێشكەوتن و فراوان بوونی لایەنی بازرگانی میرنشینی سۆرانە لە سەردەمی میر محەمەد[12].

هەر لە بارەی بازرگانییەوە فرایزەر دەڵێ: كەسانێک بۆ بازرگانی كڕین و فرۆشتن بچووبایەنە میرنشینی سۆران، ئەوا لێپرسینەوەی نەبوو، كەس داوای پەسەپۆرت و پسوولەی رەزامەندی لێ نەدەكرد و سەربەست بوو بۆ هەركوێیەک بچووبایە و بە ئارەزووی خۆی ئاڵوگۆڕی دەكرد، دڵنیاش بوو بەقەد یەک فلس كەس زۆری لێ ناكات، ئەمەش بۆ ئەوە بوو، كە بازرگانی برەوی ببێ[13].

لە هەمان كاتدا ئەگەر خەڵكی تری بیانی بۆ گەشت یان بۆ مەبەستێكی تر بهاتبایەن، ئەمانەش لە ژێر چاودێری و لێپرسینەوە بوون، ئەگەر لە پێشدا رەزامەندی پاشای گەورەیان وەرنەگرتبا، ئەوا زۆر بە توندی مامەڵەیان لەگەڵ دەكرا و دەبووایە دەربكرێن، جاری واش هەبوو

ژیانیان جێی مەترسی بوو[١٤].

فرایزەر دەڵێ: بازرگان و دانیشتوانی وڵاتانی دراوسێکانی، ئازاد بوون بۆ هاتنە ناو میرنشینەکە بۆ بازرگانی کردن، تەنانەت بایەخ پێدانی (میر محەمەد) بە بازرگانی گەیشتە رادەیێ کە لە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی ئەندامێکی تەرخان کردبوو بۆ ئەوەی ببێتە سەرپەرشتیاری بازرگانی وەک نەقیبی بازرگانەکان، کە ئەمەش زیاتر یارمەتی گەشەسەندنی بازرگانی دەدا[١٥].

میرنشینی سۆران کەوتبووە سەر رێگای بازرگانی نێوان عیراق و ئێران و دەوڵەتی عوسمانی بەهۆی گرنگی شوێنەکە، کە چەندین سەدە بووە کاروانی بازرگانی پێدا تێپەڕ دەبوو، سەرەڕای ئەوەی کاتێک میرنشینی سۆران شاری جەزیرەی گرت، کە مەرکەزی میرنشینی بۆتان بوو، بووە بازاڕێکی گرنگ بۆ بازرگانەکان[١٦].

هەر لەبەر گرنگی شوێنەکەی، زۆر لە بازرگانەکان و بازرگانە بێگانەکانیش دەهاتنە ناو میرنشینەکە، کە لە موسڵ و حەلەب و دیمەشق و بەغدا و ئەستەنبوڵ...هتد، بۆ کڕینی مەڕ و ماڵات و خوری و تووتن و پیستە...هتد.

دوای ئەوەی بازرگانە ئەوروپییەکان دەستیان کرد بە بازرگانی کردن لەگەڵ رۆژئاوای کوردستان، ئەویش بە کڕینی مەڕ و ماڵات و خوری و تووتن و چەندین ماددەی تری سەرەتایی گواستیانەوە بۆ ئەوروپا لە سەرەتای سەدەی (١٩)دا، هەروەکو (بکنغهام)ی گەشتیار ئاماژەی بۆ کردووە، کە سەردانی عیراقی کردووە، دەڵێ: بازرگانیی زۆر زیادی کردووە، بەڵام خراپی کارگێڕی عوسمانییەکان و فارسەکان بە هۆی ئەو رەفتارە خراپەی والییەکان دژی جووتیارەکان بەکاریان دەهێنا، بووە هۆی لە دەستدانی ئەمن و ئاسایش و دواکەوتوویی خەڵک و خراپی باری ئابووری و بڵاوبوونەوەی هەژاری لە کوردستان[١٧].

هەموو مێژوونووس و سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە قایمی شوێنی رەواندز کە پایتەختی میرنشینەکە بوو، ئەمە وای کردووە کە وەک دیوارێک بێت لەبەردەم هەڕەشەی دەرەکی و بە گران و زەحمەت داگیرکردنی ناوچەکە، سەرەڕای ستراتیژی و پێویستی پێداڕۆیشتنی رێگای بازرگانی، کە ئەوەش بۆ دەوڵەمەندکردنی میرنشینەکە بوو، لە ئەنجامی سەپاندنی باج و سەرانە بەسەر کەلوپەلی بازرگانی[١٨].

## سێیەم:
## لایەنی پیشەسازی

میرنشینی سۆران وەک هەموو قەوارەیەکی سەربەخۆ و وەکو هەموو میرنشینە کوردییەکانی تر پێویستی بە بەرگریکردن لە دژی داگیرکەران هەبوو، ئەم بەرگرییەش پێویستی بە سوپایەکی زۆر و چەک و تەقەمەنی هەیە، میر محەمەد خۆی هەوڵیداوە ئامانجەکانی جێبەجێ بکات لەمەڕ دروستکردنی جبەخانەیەک لەناو شاری رەواندز، سروشتی ناوچەکەش ئاسانکاری بۆ کردبوو[١٩].

دۆزینەوەی کانی ئاسن لە چیاکانی رەواندز، هۆکاری یارمەتیدەری باش بوو بۆ میر، کە بتوانێ سوپایەکی بەهێز ئامادە بکات، میر محەمەد بەهۆی دۆزینەوەی ئەم کانە ئاسنە توانی جبەخانەیەک لەناو شاری رەواندز دروست بکات، ئینجا لە تەورێز وەستایەکی چەخماخسازی هێنابوو لە ماوەیەکی نزیکدا (٢٢٢) لوولە تۆپیان دروست کرد[٢٠]، چەند دانەیەک لەم لوولە تۆپانە بۆ مۆزەخانەی (باب ئەلوستانی) لە بەغدا بردرا، هەروەها سێ دانەش لەو لوولە تۆپانە لەبەر دەرکی قشڵەی رەواندز بۆ یادگاری میری سۆران دانرابوون[٢١].

موکریانی باس لەوە دەکات، کە لە سەردەمی میر محەمەد کەسێک هەبوو بەناوی (وەستا رەجەب) کە کوردێکی زیرەک و دانا بوو لە تۆپ دارشتن و گوللەشی دروست کردووە، ئەمەش دەستکەوتێکی گەورەیە کە تا ئەمڕۆش لوولە تۆپەکانی کە دایرشتبوون لەبەر

دەرگـای سـەرای ڕەواندز دانراون، جێی باسە میر محەمەد سوودی لە کـانی مس و ئاسن وەرگـرتووە بۆ چەک و تەقەمەنییەکەی[٢٢].

وەستا ڕەجەب پاش ئەوەی، کە ئەم لوولە تۆپانەی دروست کـرد، لەو کـاتانە بوو هەواڵی خۆشی بۆ میر محەمەد نارد، میر دەستبەجێ خـەڵاتی وەسـتـا ڕەجـەب و شاگردەکانی کرد، کە هەزار ریالی زێڕی بۆ وەسـتـا ڕەجـەب و هەر شـاگـردێکیش بڕی ١٠٠ ریالی پێدرا[٢٣].

پاش ئەوەی هەواڵە خۆشەکەیان بە میـر مـحـەمـەد گـەیاند، وەسـتا ڕەجەب ویستی خۆی سەردانی میر بکات، بەڵام میـر مـحـەمـەد خۆی چوو بۆلای وەستا ڕەجەب، وەستا ڕەجەب بە میـری گوت ئەو لوولە تۆپانەی کـە دروست کـراون و دوو قـەنتـار و چوار قـەنتـار و شـەش قـەنتـاریشـیـان هەبوو، لەسـەر هەرسێ جۆرە قەنتارەکانیش ناوی (محەمەد بەگ) نووسراوە[٢٤].

هەروەها باس لەوە دەکرێ، کـە لەدوای گـرتنی برادۆست لە سـاڵی ١٨١٥ز لەلایەن میر محەمەد لەو کـاتە دەسـتی بەسـەر چەندین کانگای مس و قوڕقوشم داگرت و سـوودی لێ وەرگـرتن بۆ دروسـتکردنی تفـەنگ و تۆپ و گوللە و فیشەکی ئەوکات[٢٥].

ئەوەش ئەوە دەردەخات، کە میر محەمەد لە رووی مـاددییەوە زۆر دەوڵەمـەند بوو بەهۆی دۆزینەوەی کـانی ئاسن و مس لە چیـاکـانی ڕەواندز، کە توانیبوویان چەکێکی زۆر بەرهەم بهێنێت[٢٦].

مـیـری گـەورە لە سـاڵی (١٨١٥ز) لە گـەڕەکی کـاولۆکـان کارخانەی شیر و خەنجەر و تفەنگ و لوولە تۆپ و گـوللەی دروست کردوون و داڕشتوون، تۆپ و گوللە داڕشتنەکانی خستە ژێر فەرمانی وەستا ڕەجەب و خەنجەر و تفەنگ و دەمانچە دروستکردنیشی خستە دەست (خان گیلدی) (٢٧).

**چوارەم:**
**لێـدانی دراو لەلایەن مـیـر محەمەد**

یەک لە کارە هەرە چاونەترس و سـەربەسـتـەکـانی میـر مـحـەمـەد لێدانی دراو بوو بەناوی خـۆیەوە، کـە ئەوەش سـەربەخـۆیی خـۆی دەگەیەنێت، (حوسێن حوزنی) باس لەوە دەکـات، کە دراوەکـانی میر محەمەد لە کانزای وەک زێڕ و زیو و هەندێـک کـانـزای تر دروست دەکـران، ژمـارەی دراوەکـانیش دەگـەیشـتنە حـەوت جـۆر کـە پێکهـاتوون لە ١- یوزلخ (١٥) قـروش بوو، ٢- ریال کـە (١١) قـروش بوو، ٣- قـروش (٧) غوریش بوو، ٤- تەنگـیـر (چوار قـروش بـوو)، ٥- جلق (سێ چارەگی قـروش) بوو، ٦- خـودا بەندە (چارەگـە قـروشـێـک) بوو، ٧- شـایی (نیـو قروش) بوو، کە سـەد قـروش لیـرەیەکی زێڕی عـوسمـانییـە و حوزنی دەڵێ: من خۆم تەنیا جلق و خودابەندی میری ڕەوانـدزم چـاوپـێـکـەوتـووە، تەنگیـریش زیو بوو پانییـەکـەی بەقـەدەر قـروشی تورک بوو، ئەم دراوانە بە خەتی فـارسی لەسەریان نووسـرابوو، لەلایەک نووسـرابوو (الأمـیـر المنصور مـحـمـد بەگ) لەلایەکـەی تر نووسـرابوو (ضـرب فی ڕەواندز)، بەڵام سـاڵەکـەیان بەتەواوی دیار نییە[٢٨].

هەروەها عـەبدولفـەتاح دەڵێ: لێـدانی دراو مـانای سـەربەخـۆیی دەگـەیـەنـێت، هەروەهـا ئەوەش دەڵێ: هەرچەندە زانیـاری زۆرمـان لە بارەی دراوی مـیـر مـحـەمـەدی مـیـری ڕەواندز لەبەر دەسـتـدا نییە[٢٩].

هەروەها (حـوسـێن حـوزنی) دەڵێ: مێژووی دەرچوونی دراوەکان نەمـابوو بەهۆی دەست بەدەست کردن، بەڵام (مەلیخا) دەڵێ ساڵی ١٨١٥ز بووە[٣٠].

عـەبدولفـەتاح عـەلی یەحـیـا دەڵێ: منیش لەگەڵ ڕای موکریانیم کە میر مـحـەمـەد پارەی تایبـەتی خۆی هەبێت[٣١].

بۆیە دەکـرێ خـاوەنی دراوی تایبـەتی خـۆی بێت، چونکە ئەو توانا ئابووری و سـەربازییـەی کـە مـیـرنشـینی سـۆران هەیبـوو، سەرەڕای ئەوەی میرنشینەکە تۆپ و چەندین جۆرە چەکی تری دروست کـردوون، لەبەر ئەوەی کـارێکی گران نییـە ئەگـەر مـیرنشـینەکـە پارەش لێبدات، بەتایبەتی لەوکات ئەستەمبوڵ ڕێگای بە والییـەکانی بەغدا داوە، کە پارە لێبدەن، وەک:

(سەعید پاشا و داود پاشا و عەلی ڕەزا پاشا)، کە هاوچەرخی میرنشینی سۆران بوون، سەرەڕای ئەوەی کە میری سۆران لەو کات پێشکەوتووتر و سەربەخۆتر بووە لە والییەکانی بەغدا، لەگەڵ ئەوەی کە میر محەمەد دژی دەوڵەتی ئێرانی و عوسمانی بووە، ئەمەش وای کردووە کە پارە لێبدات، موکریانی باس دەکات، کە پارەی میرنشینی سۆران زۆر بەپارەی والییەکانی بەغدا و پارەی عوسمانی لە ڕووی شێوە و ناو لێنان هەبووە[٣٢].

ئەو دراوەی کە میر محەمەد لێیداوە، لەسەر ڕوویەکی نووسراوە (الأمیر منصور محمد بەگ)، بەڵام ڕووەکەی تر دیمەنی شاری ڕەواندزی لێ کۆڵرابوو[٣٣].

واسیلی نیکتین لە کتێبی (کورد و کوردستان)دا کەیدا باس لەوە دەکات، کە میر محەمەد دراوی هەبوو بەناوی خۆیەوە، بەڵام باس لەوە نەکراوە، کە ئەو میرە بڕیاری دابێت، کە لە خوتبە ناوی بخوێندرێتەوە[٣٤]. بەڵام موکریانی دەڵێ لە خوتبەی ڕۆژانی هەینی ناوی خوێندراوەتەوە[٣٥].

### سەرچاوەکان

١- سوارە قەڵادزەیی: میرایەتی سۆران و چەمکی مەدەنیەت و شارستانی مێژووی ئەم میرایەتییە، گۆڤاری مەدەنیەت، ژ ٣، ١٩٩٩، ل٥٤.
٢- د. جەلیلی جەلیل: کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی لە ڕووسی د. کاوس قەفتان، بەغداد، ١٩٨٧، ل ١٣٣.
٣- ئەحمەد باوەڕ: میرنشینی سۆران و پەیوەندی نێوان هەردوو محەمەد پاشای کورد، گۆڤاری کاروان، خولی ڕاپەڕین، ژ ٨، ١٩٩٣، ل٨.
٤- عبدالفتاح علي يحيى: تنظيمات الأمير محمد باشا العسكرية والادارية و الاقتصادية في الامارة السورانية، القسم الثاني، گۆڤاری کاروان، ژ ٨٧، ١٩٩٠، ل١٥٦.
٥- سوارە قەڵادزەیی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٨.
٦- سوارە قەڵادزەیی: هەمان سەرچاوە، ل٥٥.
٧- عەبدولفەتاح عەلی یەحیا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٥.
٨- سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٤.
٩- گۆڤاری دەنگی مامۆستا، میری ڕەواندز، ژ ١، لقی سلێمانی، ١٩٧٠، ل٤٤.
١٠. جەوودەت ئاکرەیی: موحازەرە دەربارەی مێژووی گەلی کورد، ژ ١٢، ١٩٩٩، ل٥١.
١١- کاوس قەفتان: چەند لێکۆڵینەوەیەک لە مێژووی بابان - سۆران - بۆتان، چاپخانەی الحوادث، بەغداد، ١٩٨٥، ل٤٤.
١٢- کامەران جەمال بابان زادە: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٣.
١٣- جەوودەت ئاکرەیی: موحازەرە دەربارەی مێژووی گەلی کورد، ژ ١٢، ١٩٩٩، ل٥١.
١٤- سەرچاوەی پێشوو، ل٥١.
١٥- عەبدولفەتاح عەلی یەحیا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٥.
١٦- سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٥.
١٧- سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٥.
١٨- سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٤.
١٩- کامەران جەمال بابان زادە: سەرچاوەی پێشوو، ل١٢.
٢٠- سەلاحەدین حەفید: ئابووری کوردستان، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی سراتیژی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٥٩.
٢١- عەبدولرەحمان قاسملو: کورد و کوردستان، لێکۆڵینەوەیەکی ئابووری و سیاسی، و. عەبدوڵلا حەسەن زادە، بێ شوێنی چاپ، ١٩٧٣، ل٤٥.
٢٢- عەلائەدین سوجادی: مێژووی ڕاپەڕینی کورد، چاپی یەکەم، بەغداد، ١٩٥٩، ل٤٣.
٢٣- حوسێن حوزنی موکریانی، مێژووی میرانی سۆران، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦٢، ل ٢٩.
٢٤- سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١.
٢٥- عەلی سەیدۆ گۆرانی: لە عەممانەوە بۆ نامێدی گەشتێک بە کوردستانی باشووردا، و. تالیب بەرزنجی، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٦١.
٢٦- عادل شاسواری، پاشای کوێرە و نسکۆی میرنشین، گۆڤاری پەیامی ڕاستی، ژمارە (٦٠)، ل٣٤٦.
٢٧- حوسێن حوزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٨.
٢٨- سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٠.
٢٩- عەبدولفەتاح عەلی یەحیا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٧.
٣٠- حوسێن حوزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٠.
٣١- عەبدولفەتاح عەلی یەحیا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٧.
٣٢- سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٤.
٣٣- فەلاح محەمەد: کورتەیەک دەربارەی میرنشینە کوردییەکان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم، گۆڤاری کاروان، ژ ١٣٠، هەولێر، ١٩٩٩، ل٢٤.
٣٤- واسیلی نیکتین: کورد و کوردستان، و. خالید حسامی، هەولێر، ١٩٩٨، ل٥٤٣.
٣٥- حوسێن حوزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٠.

# فەرمانڕەوایانی سۆران

## مێر شەرەفخانی بەدلیسی

نێـــچـــیـــروانی لە بارزان و رازەوانی رازی بەرز و بێ پێپلیکەی تیشەشاخی لووس و هەڵچووی مێژووی دوور و بێ سنووری کــوردەواری، بە لەباری بۆمـــان چوونە دوڕ پـنـچـک و نـاو دەوەن و بـە بـەنـدەنـان هـەڵـگـەڕاون و ورد گـەڕاون و چەند بەرداوبەردیان کـردووە و زەرد و هەردیان پشکنیوە و زۆر و زەوەندیان نۆڕیوە و گەلێک قـۆناغـیان گۆڕیوە و لەلای زۆران لایانداوە و بەرەو سۆران روویان ناوە و ردەسەنیان خستۆتە داو و ئاوایان لەبەر راناوین کە زنجیرەی بنەچەکەی خانەدانی میری سۆران، دەگاتە سەر کەلۆس ناوێک کە عەرەبی بەغدا بووە! لە گەڕدانی گێژوگەڕی گەردوونی چەپگەردەوە وڵاتی خۆی جێ هێشتووە و گەردی دەردی لێ نیشتووە و ئاوارە بوونی چێشتووە و بەرەو ئەوان (؟)[1]- کە سەر بە ناوچەی سۆرانە- رۆیشتووە و لە گوندی هەودیان [1] دانیشتووە و بۆتە شوانی گوندییەکان و ددانی پێشەوەی نەبوون و بەو بۆنەوە چونکە بە زاراوەی ئەوان بە پیاوی کەل دەڵێن کەلۆس، ناوی پێشووی لادراوە و هەر بە کەلۆس ناوبراوە. کەلۆسی شوانی سێ کوڕی بوون: عیسا و ئیبراهیم و شێخ وەیس[2]. عیسا کوڕێکی هێژا و هەڵکەوتە و بەرچاوتێر و نێرەپیاو و دڵاوا و مەشرەفخۆش بووە، هەرچییەکی لە شەرتە شوانییەکەی دەست کەوتووە، دەرخواردی کوڕوکاڵی هەرزەکار و دەمڕووتی گوندی داوە و بە جوامێری، چاو بەرەژێری کردوون و هۆگری بوون و لە فەرمانی دەرنەچوون.

هەر لەو سەروبەندەشدا دوژمنێکی زۆر زەرندە رووی کردۆتە ئەو مەڵبەندە و فەرمانڕەوای وڵاتەکە خۆی بۆ شەڕی ئەو سازداوە.

مێر منداڵە و کوڕوکاڵی دەوری عیسا (هەر بۆ گاڵتە) ناوی میریان لە عیسا ناوە و کەوتوونەتە شوێنی و روویان کردۆتە لای باڵەکان[3] خەڵکی ئەوێش سەر و سیمای میر عیسایان بەسام دیوە و زۆریان بەدڵەوە نووساوە و بە مەرد و رەندیان ناسیوە و ئەوانیش بڕیاریان داوە کە ئیتر لەمە بەدواوە میر عیسا میری راستی بێ و لە راست فەرمانی ملکەچ بن و چی گوت لە گفتی دەرنەچن.

بەم جۆرە خەڵکێکی زۆری پێوە هەڵنیشت و هێز و پێزێکی بێدادی پەیداکرد و ڕەوانەی قەڵای ئەوان (رەوان) بوون و دەوریان لێدا. دەوروبەری دژەکە لە کەژەکە، کەڤر و بەری سۆری زۆر بوون. عیسا و دەوروبەرەکانی لەناو ئەو بەردە سوورانە دامەزرابوون و هێند چاوسوور و غلوور و لەسەر شەڕکردن سوور بوون، نەترەی دژدارانیان برد و بە کۆمەڵی بەردەسوران ناویان دەرکرد. بەردەسوران لەناو دەماندا زۆر بووە و وردە وردە بەردەکە هاوێژراوە و بێژەی تاق بۆتەوە و بەو ماڵە میرە گوتراوە[1].

سەرئەنجام عیسا قەڵای گرت و وەک عیسای مریەم، بە هاڵاوی بە ودمی دەمی، تەمی ماتەمی لەبەر خەمباران رەواند و دەردو ستەمی لەسەر تاراندن. ئەستێرەی بەختی لە ئاسۆی هاتدا تیشکی دایەوە و دەم لە شوێن، دەموکات لجەم کاتا دەگەشایەوە. بەمشوور خۆری و زانایی زۆری، ماوەیەکی زۆر بە کامەرانی و خۆشگوزەرانی، چاوێری و شوانی گەلی دلسۆزی کرد و کە رۆژی براو گۆچانی ئاکامی لەگەردن هاڵاو لەسەر تەختی رەوانەوە هاتە سەر تەختەی داربەست و رەوانەی گۆڕستان کرا، زۆر ناوی چاکە و تاکە کوڕێکی لەپاش بەجێ ما.

### شا عەلی بەگ

لە پاش بابی کرا بە میر و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی

جێگیر بوو. کاتێ کە مەرگ هاتە سەردانی و لەژیانی زویر کرد، چوار کوڕی بەناوی عیسا و میربداغ و میر حوسێن و میر سەیدی[٢] لەپاش بەجێمان.

باوک هەر بەزیندی سەری ولاتەکەی لەناو کوڕەکانی دابەشکرد، تا لەدوای ئەو پیلە بە یەکتری نەگرن. ناوچەی حەریری- کە پایتەخت بوو- بە میر عیسا بەخشی [٣] و لە دەورانی دەستەلاتیدا دەگەڵ پیربداغی فەرمانڕەوای باباندا بوو بە شەڕیان و لە مەیداندا کوژرا[١].

### پیربداغ[٢] کوڕی شا عەلی بەگ

لەپاش بابی بە سەر بەشەکەی خۆی رادەگەیشت و سۆماقلق[٣] (سۆما)شی لە هۆزی نیلخاسی[٤] سەر بە قزلباش رزگارکرد و خستیە بەر دەستی خۆیەوە و چەند ساڵێک فەرمانڕەوایی تێداکرد و ئەمجار مالاوایی لەژیانکرد و دوو کوڕی لەپاش بەجێمان: میر سەیفەدین و میر حوسێن.

### میر سەیفەدین

بوو بە جێنشینی بابی، بەلام زۆری نەخایاند کە پێمێردێ خودا بەرەو گۆڕستانی شاند و شوێنەکەی بۆ برای بەجێ ما[٥].

### میر حوسێن

لەجێگەی میر سەیفەدینی برای کرا بە میر و هێشتا دەستە جلکی لە میرایەتیدا نەدڕیبوو کە خوا رۆژی لەسەر دنیا بڕی و ئەویش حەوت کوڕی هەبوون، گەورەکەیان ناوی میر سەیفەدین بوو، ئەو لە جێگەی بابی کرا بە جێنشین و سۆماشی وەک باب و باپیرانی خستە بەر چنگەوە[٦].

### میر سەیدی کوڕی شاعەلی بەگ

ئەگەرچی کوڕی گچکەی شاعەلی بەگ بوو، بەلام بە پایە و ناوبانگ زۆر گەورە بوو. بۆ نان بدیی و بەخشین، وەک دەریای بێ کەنار وابوو. ئاوازەی دلاوایی بەدنیادا گەڕابوو، لەمەیدانی مەرداندا، لە رووی هێرشبەراندا، بەرانبەر بە هەزاران بوو، کوتالی مەردازایی بە بەژنی ئەو برابوو. لە پاش نەمانی بابی لە شەقاباد[١] دادەنیشت. تۆڵەی کوژرانی میر عیسای برای لە پیربداغی بابان ساندەوە و بەگژیدا هات و پیربداغی کوشت و داخی خۆی پێ رشت و ناوچەی براشی دەگەڵ بەشی خۆی تێکەڵ کردەوە و لەسەر مەلبەندی سۆران و ناوچەکانی سەر بەوێ، زۆر بە سەربەستی و ئازاد و ئازا فەرمانڕەوایی دەکرد و لە سەرئەنجامدا کە لەبەر مەرگ بەزی و خزیە گۆڕی بەرتەنگەوە، سێ کوڕی بەناوی میر سەیفەدین و میر عیزەدین شێر و سولەیمان لەدوو بەجێمان[٢]. میر سەیفەدین لە هەرەتی جوانی و جەنگەی بەهاری ژیانیدا لەسەر ئەسپ پەڕی و پەڕیوەی ئەو دنیا بوو[٣].

### میر عیززەدین شێر

میری هەولێرێ بوو، سالی ٩٤١ک- ١٥٣٤ز کە سولتان سولەیمانخان ئارامیگەی بەغدای گرت، زستانەکەی لە هەولێر گوزەراند[٤]. لەو بەینەدا عیززەدین شێر هێندێک کاری نارەوای دەربارەی نۆکەرانی ئاستانەی بەرزی سولتان کرد و بۆ کوشتنی فەرمانی بێ وچان دراو کوشتیان[١]!

هەولێریش درا بە حوسێن بەگی داسنی، کە لە مالە میرەکانی یەزیدی بوو. لەپاش کوژرانی عیززەدین شێر، سولەیمانی براشی خێر و خۆشی لە دنیا نەدی و لەپاش ماوەیەکی کەم رێی نەمانی بەدی کرد و بوو بە گۆڕنشین و سێ کوڕی بەناوی قولی بەگ و میر عیسا و میر سەیفەدین لە سەرزەمین بەجێ هێشت. سولتان سولەیمان خان هەموو ولاتی سۆرانی وەسەر هەولێر خست و کردیە بەخشش بۆ حوسێن بەگی داسنی. ئیتر حوکمداری سۆران بە یەکجارەکی لەدەست خاوەنانی هاتەدەر و بیانی پێ رادەگەیشت!

### میر سەیفەدین
### کوڕی میر حوسێن پیربداغ

وەک لەمەوبەر کە لەبەری تەرەزنی قەلەمەکەمان دەلاندی، میر سەیفەدین سوماقلق (سۆما)ی وەکوو باب و کالان لەدەستا بوو. لەوان سەردەماندا کە هەموو خاکی سۆران لەلایەن پادشاهی خەزاکەرەوە بە حوسێن بەگی داسنی بەخشرا[٢]، چەند جارێک لەنێوان میر سەیفەدین و حوسێن بەگدا شەڕ و لێکدان روویداو لە ئەنجامدا سەیفەدین خۆی لەبەر یەزیدیەکان نەگرت[٣] و پەنای بە بێگە بەگی حاکمی ئەردەلان برد، بێگە لە بەگ لە ترسی

تووڕەبوون و روو لێ وەرگێڕانی سولتان، نە رووی پێداو نە یاریدەیدا. میر سەیفەدین بە دڵساردی گەڕاوە و هاتەوە سۆران و كۆمەڵێكی لە خەڵكی ئەو ناوە لەخۆ هاڵاند و هەڵیكوتا سەر دوژمن و دژی هەولێری داگیر كرد.

پەڕاندنی ئەو لەمپەرە و سەركەوتنی وا سەمەرە، هومێدی وەبردو خستەوە و هەموو هۆز و تیرەی سۆران بە تێكڕایی بووژانەوە و هرووژان و هاتنە بەر ئاڵای میری خۆیانەوە. چۆن سەردەمێک ئەبوو موسلیم لەژێر دروشمی عەبباسیان خزمی یەزیدی قڕ كردن، میر سەیفەدین هەر بەو نیازە بەرەو یەزیدییەكان بزووت. حوسێن بەگ بە لەشكری یەزیدییەوە پێشی پێگرت و شەڕێكی زۆر خەست و خوێناوی لەناو سۆرانی و یەزیدی و روویداو ئەمجارە یەزیدی شكان و لەو شەڕەدا پێنسەد پیاوی سەرناسی داسنی كوژرا و بەرەی حوسێن سەركەوت؛ تالان و ماڵ و شمەكی زۆر و رەوەند وەگیر لاوانی سۆرانی و وەچەنگ میر سەیفەدین كەوت و میر سەیفەدین بۆوە بە میری سەربەخۆی سۆران. میر حوسێنی داسنی چەند جارێكی تر شەل و شكستە و گەجەر گوجەری یەزیدیانی كۆكردەوە و شەڕی خۆدڕێنی نایەوە و هەموو جاریش لەشكرەكەی دەشكایەوە و جار لە جار پتر دەپووچایەوە و سەركەوتن چووبووە لای سەیفەدین و داسی داسنیان نەیدەبڕی. حوسێن بەگی داسنی كە تێگەیشت ئاسنی سارد كوتانە و تەنگانەی بێ دەرەتانە، بە بۆڕدراوی و سەرشۆڕی بەرەو پاش گەڕایەوە. كاتێ باس و خواسی ئەو شكان و راونانە گەیشتە ئاستانە و بوو بە مقۆ مقۆ، ناردیان حوسێن بەگیان بردە ئەستەنبۆڵ و فەرمانی لە سەردانی لە سولتانەوە بۆ دەرچوو، بە هەزار ئەشكەنجە و ئازاردانەوە كوشتیان.

**كەسێ هاوكاری زۆرداران بوو پیشەی**
**دەسی زۆردار بەبیور دای لە ریشەی**
**كە تاژی راوی پێ نەكرا و شەكەت بوو**
**لە لای راوكەر لەژێردارا سەكەت بوو**
**كەوێک هاوخوێنی خۆی بێنێتە سەرداو**
**نە دوورە خێوی، خۆی لێنێ بە شۆرباو**

سولتانی خەزاكەر فەرمانی بە سولتان حوسێنی فەرمانڕەوای ئامێدی دا كە هەموو میرەكانی كوردستان دەگەڵ خۆ بەرێ و بچنە سەر میر سەیفەدین و خاكی سۆرانی لەدەست دەربێنن. بەڵام ئەو هەزار زیلەش هەرچی كردیان و كراندیان و مڕیان و مڕاندیان، چیان بۆ دەگەڵ نەكراو بە ئاوات نەگەیشتن و بە بۆڕاوی و دۆڕاوی گەڕانەوە. ئیتر لەوساوە میری سۆران حەساوە و بێ ترس و پرس و بە كامەرانی و ئازاد و سەربەخۆ گوزەرانی دەكرد و فەرمانی بەسەر هەموو وڵاتی سۆراندا دەڕۆیی. بەڵام وەک گوتوویانە:

**بەڵای عاسمان كە ویستی پێت بوستێ**
**دەپێشدا چاو و گوێ و زارت دەبەستێ**
**كە قۆرتی رێت نەدی و چاكەت نەبیسی**
**گلار بووی و لەناو چاڵدا قەتیسی**
**هەتا بزوا زوانت بۆ زیانە**
**بەڵای بێ ئاوەزی ئاهۆی ژیانە**

ئەویش خوا لێی گۆڕی و كەوتە ناو تۆڕەوە و یوسف بەگی برادۆست -كە نازناوی غازی قڕان بوو[1]- هەڵیفریواند و درۆی بۆ هەڵپڕیواندن كە ئەگەر دەگەڵ ئەودا بچێتە لای سولتانی خەزاكەر و پەنای پێ بەرێ و ئەویشی تكاكار بێ، هەرچی ئاواتییەتی بۆی دەچێتە سەرێ و لە دەریای بێ بنی بەزەی شاهانەوە هەموو گوناهی هەڵدەوەرێ و لێی دەبوورێ و بە دەستووری باب و باپیرانی وڵاتی سۆرانی دەگەڵ خەڵاتی زۆر پێ دەبەخشن و توورە و نیشانی بە سەنگەوە دەنەخشن[2]. میری وەدوی خۆیدا و دەگیری خست و تەواو پای نەخستبووە ناو ئاستانەوە میر غەزەبی بە پیرەوە هاتن و خستیان و بەستیان و دەستیان لێ هەڵنەگرت هەتا هەست و خوستیان لێ بڕی.

### قولی بەگ
### كوڕی سولەیان بەگ كوڕی میر سەیدی

لەو رۆژگارەدا كە وڵاتی سۆران بە دەست داسنییەكانەوە بوو، قولی بەگ چەند جارێكیان بەگژدا هات و هەموو جاریش لەبەریان دەشكا و هێزی پێ نەشكان و لەچاری ناچارەوە خۆی لە كوردستان ئاوارە كرد و رووی كردە دەرگانەی شاتۆماسب و پەنای بە ئێران برد.

سەبارەت بە دوژمنی و كینەی كۆن و لەمێژینەی هەوا خوایانی حوسێن و ئاشنایانی یەزیدی، داسنییەكان موسڵمانی سۆرانیان دەگیرهێنان و ملیان لێنان و دەمیان تێنان و كارێكی وایان دەگەڵ كردن كە هەموو كەس بە چاكەوە یادی حەججاجی یوسفی دەكردەوە و زوڵمی بێدادی

سەعدی کوڕی زیادیان لەبیر بردەوە[١]. کوردی سۆران کێردیان گەیشتە ئێسکان و لەگیان و ژیان وەڕەز ببوون، پیاویان نارده عەجەمستان و بە تکا و نزا و داوێن بادان قولی بەگیان هێنایەوە[٢].

ئەوسا ناردیانە ئاستانە و داوای پلەی باب و باپیرانی لە سوڵتان کرد. سوڵتان سولەیمان خانی خەزاکەر بڕوای بە قولی بەگ مەبوو، دڵی ئاوی نەخواردەوە کە بۆی بکا و بۆ ناوچەی خۆشی نەناردەوە، سەماواتی[٣] سەر بە سرای بە سنجەق پێ بەخشی.

لە پاش نەهێشتنی میر سەیفەدین و کوشتنی حوسێن بەگی داسنی و ڕووداوانەی ئەو ڕووداوانەی کە لێی دواین، لەسەر تکای سوڵتان حوسێن بەگی فەرمانڕەوای ئامێدی، لە سەماواتی بەسرەوە رایانگوێزت و لە مەڵبەندی سۆراندا ناوچەی حەریریان دایە[٤] و بیست ساڵێک لە وێندەرێ ماو مەزنایەتی کرد و لە ئەنجامدا پۆشاکی حەریری بە جاوی بێشۆ وەگۆڕێ و سەنیری خاکی وەبن سەردا و لەسەر بەردی گۆڕیچە، بۆ یەکجاری دەخەو راچوو، دوو کوڕی بوون: بداغ بەگ و سولەیمان بەگ.

## بداغ بەگ
### کوڕی قولی بەگ کوڕی سولەیمان بەگ

لە پاش نەمانی بابی، ئاڵای فەرمانڕەوایی لەسەر سەقاباد (شەقڵاوە) شەکاوە، بەڵام بە فیت و هۆی بەدگۆیان و لەرایەڵی بێ پۆیانەوە، کری سفتی برایەتی دوو براله هەڵوەشاو خۆشەویستی و هێمنی، بوو بە کێشە و دوژمنی و پرتەو بۆڵەی سەر زوان بوو بە تیری ناو کەوان و شیریان لەرووی یەکدی کێشاو رمبیان بۆ یەکتر هەژاند و میربداغ بەرکەی پەیاغی سولەیمانی نەگرت، مەیدانی بۆ چۆڵ کرد و پەنای بە سوڵتان حوسێن بەگی فەرمانڕەوای ئامێدی برد و چاونۆڕ بوو کە دەروویەکی لێ بکرێتەوە و کۆمەک و یاریدەی بدرێ و بێتەوە سەر جێ و ڕێی خۆی، کەچی ئەوەشی بۆ نەلوا، مەردن بەربینگی لێ گرت و عیزرایل پەلپی پێگرت و نەیانهێشت و لە عەقرەی سەر بە ئامێدی دەناخی هەردیان ڕاکرد و گلەوگازنی بردەلای خودا[١].

### میر سولەیمان بەگ کوڕی قولی بەگ

لە پاش مەرگی باب و برا، سولەیمان بەگ بووە فەرمانڕەوای سەربەخۆی هەموو وڵاتی سۆران، زۆر پیاوێکی بە هونەر و دادگەر و هەژار پەروەر بووە، لە هۆش و بیروڕا و تەگبیر و مشۆرخۆری و وەج و سەنگ و کارامەیی و زەبر و زەنگدا، لەناو هەموو سەرداران و سەروەرانی کوردستاندا زەق و زۆپتر دیاری داوە و بە تلی نیشان دراوە و نموونە و بەناوودەنگ بووە.

بنەماڵەی میری سۆران هەر لەمێژرا دوژمنی هۆزی زەرزا بوون[١] و گەلێک جاران وێککەوتبوون و لێکیان دابوو، هەمیشەش لێکتر دەخەفتان. جا کە دەوران ئەو دەورەی داو گەورەیی دەست سولەیمان کەوت، وەک سولەیمانی پێغەمبەر هەر کە خودای گەورە فەرموویە (سولەیمان لەشکری خۆی لە ساندا)، نزیکەی سێزدە هەزار پیادەو سواری دێو ئاکاری کۆکردەوە و هێرشی بردە سەر زەرزا. ئەو دێوانە لەو کێوانەوە بە تەندوورە لوورە بوونەوە و هاتنە جەستەی زەرزایان و هەتا ئەوان بە خۆیان زانی، هیچ دەرفەتیان بۆ نەماو میر لیوا و سێ سەد و پەنجا کەسیان لەسەر ناسان و ئاغایانی زەرزا کوشت و وردەو یەخسیریان بە تاڵان هێنان و هاتنەوە بۆ وڵاتی سۆران[٢]. چەند زەرزای شل و کوتکراو کە لەبەردەمی شێران بە بەرماو مابوونەوە- بەرەو ئەستەمبۆڵ خۆشین و بەشین و گابۆڕەوە ڕوویان کردە ئاستانەی سوڵتان مرادخان و داد و بێدادی خۆیان کرد. پادشای خوالێخۆشبوو بەدڵ لێ برا کە سولەیمانی بە پەندێک بەرێ، سەری هەموو سەرەڕەقێکی پێوە نەرم کا، کەچی هەر لەو گەرماو گەرمییەدا سولەیمان بەگ پەلاماری هەردی ئێرانی داو هێندێک لە وڵاتی قزلباشانی تاڵانکرد و زۆریشی لێ بەدیل گرتن و دیلەکان و ماڵ و سامانی زۆری بەر تاڵانیشی بە دیاری بۆ سوڵتانی خوابەخشیو نارد و بەو شیرینییە خەستە، پێڵوی پیلە دۆزینەوەی سوڵتان پێکەوەدنووسان و چاوی لە ڕاست گوناهی سولەیمان بەگ نوقاندو وەبەر بەخشین و چاوپۆشینی پادشاهانە کەوت[١]!

قوباد بەگ ناوێک بە سەر سنجەقی تەرەک[٢] رادەگەیشت و پسمامی میر سولەیمان بەگ بوو. ئەو کابرایە چەند کارێکی ناشایستی کردن و تەنانەت هەوای فەرمانڕەوایی سۆران لە مێشکیدا تریتانەی دەکرد و دوژمنایەتی میر سولەیمانی لە چیکلدانی دڵی خزاند و ئەوی لە سینەدا کەوی ببوو، چینە و پێ پرژەی لێدەکرد. سولەیمان بەگ لێی دەخەفتا هەتا ساڵی ٩٩٤ک- ١٥٨٥ز

لە ناکاوا هەڵیکوتایە سەر پسمامی بێ ئارامی و ئەو و چاردە خزم و پیاوی زۆر نزیکی وێکڕا کوشتن و داخی دڵی خۆی پێ ڕشتن. ئیتر لەو ساوە دنیا حەساوە و کێ دەیوێرا شان لە شانی میر سولەیماندا؟ بە سەربەستی و بێ بەرهەڵست ببووە میرێکی سەربەخۆ و لەو ناوەدا خاوەن پایە و خێوی شکۆ هەر بۆ خۆی بوو. بەرز و نزم و نامۆ و خزم و دوور و نزیک سەری لەبەر نزم دەکرد و میر و مەزنانی کوردستان هەموو بەدڵ لێی دەترسان و دەستەونەزەر لەبەر دەستی دەوێستان و لە راستەوی، رام و کەوی و لە ژێر پەنجەی زبری ئەودا، نەرم وەک مێوەژۆن وابوون. ئەگەرچی نەخوێندەواریش بوو، خوێندەواری خۆش دەویستن و دەیدواندن و لێی دەبیستن و ببووە پەیڕەوی پیران و زۆربەی دەمی بە نوێژان و زوان و دەمی بە نزاوە سەرگەرم بوو. دوا سەرئەنجام جیهانی دوا پووچ و تاڵی بەقاقڕ و کراڵزانی و بە هەشتیلەی گیانی پاکی، بەزەی خودای بەرز و تاکی لێ بوو بە باڵ و رکەی خاکی دایە دواوە و بەرەو پەریاوای لای خودا، لە شەقەی شابالانیداو بەهەشتی پەروەردەگاری کردەهێلانەی یەکجاری[1] و عەلی بەگی بە یادگار لێ بەجێ ما.

## عەلی بەگ کوڕی سولەیمان بەگ

لە دوای ئەوەی کە بابی لە ئارادا نەما، بە فەرمانی لەبان سەرانی سوڵتانی خوالێخۆشبووی بەهەشتەلان[1]، کرا بە میری وڵاتی سۆران و ئێستا کە مێژووی کۆچی هەزار و پێنجە، میرنشینی سەربەخۆی باب و باپیرانی لە دەستدایە[2].

**پەراوێزەکان:**

١- لە دوو دەستنووسدا ١٠ بەندە و بەندی ١١ و ١٢ نییە. (عەونی)

٢- دەبێ کەڵۆس نازناوی میرێکی ددان کەلی ماڵە میرانی لە مێژینەی رەواندوز بووبێ. ئیسماعیلی مەلا حوسێن لە مێژووی ئەردەڵاندا دەڵێ: سورخاب بەگی ئەردەڵان بارامی کوری خۆی بەسەر ئامێدییەوە دانابوو، کە ئێستاش نەوەکانی فەرمانڕەوای رواندز و کۆ و حەریرن. کتێبی الاربعە قرون الاخیرە للعراق لە پەراوێزی رووپەر ٤٨دا دەڵێ: (سورخاب کوری خۆی کردە حاکمی رەواندز و ئەو بنەماڵە سێسەد ساڵ هەر مان).

٣- ئەوان، لە وڵاتی سۆران نییە، هەر رەوانە گۆڕاوە و (ئە) لە جێ (ر) داندراوە. (دز) قەڵایە. رەواندز: قەڵای رەوان. رەواندز ناوێکی تازەیە و تەمەنی ناگەڕێتەوە بۆ پێش هەزاری کۆچی رەوان رەنگە لە رەواندنەوە هاتبێ بەناوی ئەو شارەوە کە راوەندی گەورە بنیاتی ناوە و بەگفتی معجم البلدان بە ئەیالەتی موسڵ ناسراوە. ئەوسا دەبێتە قەڵای راوەند. (عەونی)
وێشەدەچێ دزی رەوان بێ، رۆ، چۆمە و دز، دژە. واتای قەڵای چۆمان. (هەژار).

٤- گوندێکە لە دە کیلۆمەتری باکووری رۆژاوای رەواندز و بەقەد کێوی باڵەکیانەوەیە و لە پێشدا ناوی هەفتخوان بووە و خاوەنی الاعشی لە مسالک الابصارەوە بەناوی خەفتیانی راگوێزتووە. (جەمیل)

٥- ئەمین زەکی و حوسێن حوزنی بە (شێخ ئیدریس)یان نووسیوە. (جەمیل).

٦- گوندێکی قەوغایە و نزیکەی ٧ کیلۆمەتری باکووری رەواندز و لەسەر لکێکی زێی گەورە هەڵکەوتووە. هۆزی گەورەی باڵەکی کە ٦٠ گوندێکیان داگرتووە، ئەو ناوەیان وەرگرتووە. (جەمیل). سەرکردەیەکی لەشکری گەزەنەفۆن ناوی (بالک) بووە. (هەژار).

٧- وشەی (سنگ سرخ) لام وانییە بەردی سوور بێ. ناوی وڵاتی سۆران لە کتێبی مسالک الابصاردا هاتووە: کە دوو سەدە بەر لەو رۆژگارە نووسراوە. پێمولیە سنگ سوورە و لە سۆنگەی سینەبەندی سوورەوە ئەو ناوە رسکابێ. فریدریک میللنگن سەدەیەک لەمەوبەر بە کوردستاندا گەڕاوە و سەفەرنامەیەکی بەناوی ژیانی سەرەتایی ناو کوردان نووسیوە. دەوێدا دەڵێ: کورد رەنگی سووری گەلێک خۆشدەوێ. هەتا کوردێک دەبینم باسەکەی ناو کتێبی گەزەنەفۆنی سەرکردەی یۆنانیم بیر دەخاتەوە، کە پەسنی جلکە سوورەکانیان دەدا... هتد، وادیارە سنگی کورد لەکن فارسان بۆتە سەنگ. (جەمیل).

٨- ئەمین زەکی دەڵێ: لە کتێبی کوردلردا میر عەلی نووسراوە. حوسێن حوزنی دەڵێ: ناوی میرسەیدی عەلی بووەو رەنگە ئەمە راست بێ. (جەمیل).

٩- ئەمین زەکی و حوسێن حوزنی دەڵێن: (شا عەلی بەگ دەگەڵیدا چۆتە حەریر)، بەڵام باسی بەشی سێ کوڕەکانی تریان نەکردووە. زۆر وێدەچێ لە باڵەکیان و میر حوسێن لە رەواندز و میرسەیدی عەلی لە شەقڵاوە دامەزرێنرابن.

١٠- حوسێن حوزنیش هەروا دەڵێ، بەڵام ئەمین زەکی دەڵێ:

میربداغی برای کوشتویە. پێموایە بەهەڵە چووە. (جەمیل).
١١- لە دوو دەستنووسدا میربداغە. (عەونی).
دانەر لەباسی شاعەلی بەگیشدا میربداغی گوتووە. (هەژار).
١٢- لە دوو دەستنووسدا سوماقلوە (عەونی).
حوسێن حوزنی بە سۆمای نووسیوە، رەنگە سیماقولی بێ کە گوندێکە سەر بەکۆیە. (جەمیل).
سۆما ناوچەیەکی بەرفرەوانە و لە کوردستانی بەردەستی ئێرانە و سەر بە ئەنستانی ورمێیە. (هەژار).
١٣- رەنگە لە هۆزەکانی قزلباش بووبێ، پیربداغ راوی نان و دەورمێی پەستاوتن(جەمیل).
١٤- حوزنی دەڵێ: لە پاش مەرگی سەیفەدین، هۆزی نیلخاس سۆمایان گرتەوە (جەمیل).
١٥- حوسێن حوزنی دەڵێ: کە سۆمای لە نیلخاسان سەندەوە، دوایی نیلخاسیشی براندەوە (جەمیل).
١٦- شەقلاوە کەونە و مسالک الابصار باسی دەکا. رەنگە ناوەکە لە شەقڵ (دار و ناو) پەیدابووبێ؟ کە دەڵێن شاقولیاوایە بەلامەوە دوورە، چونکە شاقولی بەگ لە دواییدا لەسەری بووە. (جەمیل).
١٧- حوزنی موکریانی دەڵێ: میر سەیدی دەوری قەڵای هەولێری داو قزلباش چیر قەڵاییان کرد و بەدەستیانەوە نەدەدا، دەورددان شەش مانگی خایاند. میر لە خوار قەڵاوە مزگەوتێکی گەورەی دروستکرد و گەلێکی کورد هێنان و فەرمانیدا کە خانووان دروست کەن. بەمکارە شارۆکەیەک بەرهەم هات.
١٨- حوزنی دەڵێ: سێ مانگی میر بووە، لەسەر سواریەوە هەڵدێراوە و دەستەو لەجێ مردووە. (جەمیل).
١٩- حوسێن حوزنی دەڵێ: سوڵتان سولەیمانی قانوونی لە سەفەری تەورێزی تێ شکابوو. خۆی لە سەرمای زستانی تەورێز دزییەوە، هاتە گەرمیان و لە هەولێر دابەزی. عیززەدین پێشوازی شایانی لێکرد و هەموو زستانەکە میوانداری زۆرباشی لێکرد، بەڵام سوڵتان سولەیمان چونکە زۆر خوێڕی و نامەرد بوو، سزای سنماری داوە. سەرۆک هۆزی دنە دەدان لەمیر هەڵگەڕێنەوە و پیاوەکانی خۆی فێردەکرد ئاژاوە بنێنەوە و بەم ئاوایە پلانی بۆ رێکخست و لە شەوێکدا بردیە مۆڵگەی شاهانە و بەنهێنی خنکاندیان. ئەمجار بە شیر بەربوونە دۆستانی و گەلێک سەرکۆمار و سەرناسی شار و مەلای مەزنیان کوشت. گەنجینەی میریشی تالانکرد و هەرچی بەریەلی کەوت بردی. (جەمیل).
٢٠- حوزنی دەڵێ: میر عیززەدین کوڕی راوێژکەرانی لە مەلاچاکەکان پێکهێنابوو، بەبێ پرسی ئەوان هیچ کاری ئەنجام نەدەدا. زۆریشی ئاسەواری باش بەجێ هێشت. بۆ نموونە: گومبەزی یوونس پێغەمبەری لە مووسڵ نوێ کردەوە و زۆری دوکان و زەوی و زاری دەم دجلە دەقەبەڵ کرد. لە رۆژهەڵاتی هەولێر دوو مزگەوت و میوانخانەیەکی دروستکرد و مەوقووفەی زۆری بۆ بڕینەوە. شاری کەرکووکی قەوغاتر کرد و دەشتەکیەکانی لەشار دادەمەزراندن، سێ مزگەوت و فێرگەیەکی زانستی لێ بنیات نا. مەدرەسەی سۆرانی کە لە کەرکووکە لەوانەیە هی ئەوبێ. (جەمیل).
٢١- حوسێن حوزنی دەڵێ: کە سوڵتان سولەیمان هەولێری دابە حوسێن بەگی یەزیدی، خەڵک پێیان خۆش نەبوو، چونکە لە زێد و دینیان بێگانە بوو. سەرەڕای ئەوەش زۆر زاڵم بوو. تێکڕا گلی نامەیەکیان نووسی و بە چەند پیاوێکی گەورەدا بۆیان نارد. دوو لەوانە: مەولانا شێخ شەرەفەدینی نەقشبەندی و مەولانا سەیفەدینی سوهرەوەردی بوون، کە ئەوانە شێخی تەریقەت بوون. هەروەها چوار مەلای گەورەشیان دەگەڵ بوو. فەرمانیدا هەموویان کوشتن! (جەمیل).
٢٢- حوزنی دەڵێ: هۆی شەڕەکە ئەوەبوو: خەڵکی سۆران لە چنگ کابرای یەزیدی وەزاڵە هاتبوون. دەستەودامێنی میر بوون کە ئەو دلۆپایەیان لەکۆڵ کاتەوە. هێرشی بردەسەر و لە دەشتی حەریر پێکداهاتن و لەشکری حوسێن بەگ هەڵات و دایە چیاو چووە ناو قەڵای حەریرەوە و ناردی کە لەشکری بۆ بێ. بە فەرمانی سوڵتان لەشکری مووسڵی بۆ هات و بەگژیەکدا هاتنەوە و ئەوجار میر سەیفەدین شکا. (جەمیل).
٢٣- غازی قران کوڕی سوڵتان ئەحمەد و نەوەی میرەکانی حەسنەوییە بووە، کە هاتوون و لەو وڵاتە بوونە میر. (جەمیل)
٢٤- حوسێن حوزنی دەڵێ: بەوە فریو درا کە بچێ و پەیماننامە دەگەڵ سوڵتان ببەستێ و تیا بڕیار بدرێ کە: میر خۆ دە سنووری عوسمانی نەگەیەنێ و خەڵکیشی لێ هاندا و بازرگانییان لەناودا بێ و دەوڵەتی عوسمانی سەربەخۆیی سۆران بە رەسمی بناسێ و سوڵتان میرە کوردەکانی بۆ بنێرێ و دەگژ ئێران راچێ و تاوانباران بدەنەوە بە یەکتر و سەفیران ناڵ و گۆڕ بکەن و تا دە ساڵ ئەم پەیمانە دەگەڕا بێ. هەروەها باسی زۆر فێڵ و فەرەجی تریش دەکا کە بۆ چاو بەستنی خراوەتە گەڕەوە. (جەمیل).
میر سەیفەدین رۆژی چواری مانگی قوربانی ساڵی ٩٦٦ک-١٥٥٨ز کوژراوە. (جەمیل).
٢٥- سەعدی کوڕی زیاد سەرکردەیەکی لەشکری یەزیدی کوڕی

مەعاویە بوو کە شەڕی ئیمام حوسێنی کرد. (جەمیل)

٢٦- حوسێن حوزنی بە جۆرێکی تری دەگێڕێتەوە و دەڵێ: میر قولی بەگ وەختی خۆی چووبووە ئێران. عوسمانی ناردیان هێنایانەوە و چوار جاران لەشکریان دایە و لە مووسڵەوە ناردیانە سەر میر سەیفەدین و دەرۆستی نەهات و کە زانیان چی بۆ ناکرێ، ناردیانە سەماوە. دوای ئەوەی میر سەیفەدین حوسێن بەگی داسنی و هێزی هیمدادی تورکانیشی شکاند، میر قولی بەگ هەر نەهاتەوە کوردستان. (جەمیل).

٢٧- سەماوە ئێستا لەسەر ناستی دیوانیەیە و لە باشووری عیراقە. (جەمیل)

٢٨- حوزنی دەڵێ: ساڵی ٩٦٧ک- ١٥٥٩ز سەرەک هۆزەکانی سۆران و میرەکانی کوردستان و دەوڵەتی ئێران کە دەیانزانی سوڵتان سەری قاڵە ڕێگەی ڕاکردنیان بۆ میر قولی بەگ خۆشکرد و لە سەماوەڕا هەلات و ڕۆژی ٦ی مانگی مەولوود هاتەوە حەریر و زۆری خەڵک پێوە هەڵنیشت و بە کۆمەکی گەورە پیاوان قەڵاکەی قایم دابەستەوە، دانەر نەیگوتووە هیمدادی هێنا! دەڵێ چاوەنۆڕی کۆمەگ بوو. (هەژار).

٢٩- هۆزێکە لە کوردستانی بەردەستی ئێران و لەدۆڵی گادەر، لە دەشتی شنۆ نیشتەجێن. (جەمیل)

٣٠- حوزنی موکریانی دەڵێ: زەرزا ئاشنای سەفەویان بوون. سولەیمان بەگ دوو ساڵ بوو میریەتی دەکرد کە ئێرانی زەرزایان لێ ڕاست کردەوە و دەگژی ڕاچوون. لە پاشانیش عوسمانییەکان کە هەستیان کرد هۆزی زەرزا بۆ پواز باشن و بۆ دەکارهێنان دەست دەدەن، سوڵتان پیاوی ناردەلایان و زۆری دڵخۆشی دانەوە و ڕووی لەئێران بادانەوە و پارووە چەورەی کردە هی خۆی و ئەوسا هەمووی بەتەیاری پرچەک کردن و دە سولەیمان بەگی بەردان. سولەیمان بەگ بۆ ئەو شەڕە چاردەهەزار کەسی چەکداری ئامادەکرد و ڕوویە لەشکری زەرزا هات و لە گوندی سیدەکان تووشیان بوو، لەو دەمەدا کە شەرکەران چاوەنۆڕی فەرمانێ بوون، سولەیمان بەگ بەوتارێک تێی گەیاندن کە زەرزا چن و کێن و ئامانجیان لەو شەڕە چییە، چۆن بۆنە قوڵەچۆماغی دوژمنانی گەلی کورد و جار دەچنە لای عەجەمان و دەگەڵ هۆزی مەحموودیان هێرش دەبەنە سەر ورمێ و تالان و وێرانی دەکەن و هەلێک یار و هاریکاری یوسف غازی قرانن، تا بتوانێ میر سەیفەدین لەناوبەرێ. ئێستاش خۆیان بە عوسمانیان فرۆشتووە و هاتوون کوردی بۆ بکوژن و ئاسەوارمان ببرنەوە. جا لە چاوی منووکەوێ دەست هەڵێنن، ورەیان لێ بتارێنن، کەس بەزەیی بە زەرزەدا نەیەتەوە. ڕۆژ ڕۆژی کەڵەپیاوانە و ترس و قزەیی تاوانە و مردن بۆ تەپ و خاوانە. ئەوسا فەرمانی هێرشی داو شاڵاو برایە سەر زەرزا و شەرگە، چیای سیدەکان بوو. بە شیر و تیر بەربوونە یەک و شەڕێک لەو ناوەدا ڕوویدا، باب ئاگای لە کوڕ نەمابوو. دوو ڕۆژ لە بەرەبەیانڕا تا زەردەپەری هەنگۆڕێ شیرەوشان و خوێن ڕژان و مژی پژان و کوشت و کوشتار بوو. زەرزا تەواو شپرزە کران و لە مەیدانی شەڕ دەرکران و ڕاونران و بەرەو شنۆ هەڵاتن. لەو شەڕەدا ئەمیرلیوا کە تورکێکی عوسمانی بوو دەگەڵ پێنجسەد کەس لە زەرزا بەدیل گیران.

میر سولەیمان دوای ئەو شەڕە، لەشکری خۆی بلاونەکرد و مانگێکی پشوو پێدان و پاشان لەپڕ-ونەکاو، بەپانەوە هێرشی بردە سەر هۆزی نیلخاسی قزلباش و زۆربەی زۆری پیاوەکانی دەردەست کردن و لەناوی بردن و ئیتر تازە لە سندوس و نەغەدەدا کەس نەما خۆی لە قەرە بدا یا خۆی بێ فەرمانی بکا. ئەو شوێنانەی کە گرتیشنی پیاوی خۆی لەسەر دانابوون.

حوزنی پێدا دەڕوا و دەڵێ: سوڵتان مرادخانی سێهەم کاتێ دیتی کە بە زەرزا چی بۆ دەگەڵ میر سولەیمان بەگی نەکرا، ئەوجار ناردی قوباد بەگی کاربەدەستی تەرگەوەڕی بۆ شەڕی سولەیمان بەگ ڕاستکرد و لە هەمبەر ئامۆزایدا ڕاستی کردەوە و بەزەبری زێڕ، پسمامەتی و هاوسایەتی لەبیر بردەوە.

قوباد بەگ چوار هەزار شەڕکەری هەبوو، چاوەنۆڕ بوو لە ئەرزەڕۆمەوە هیمدادی تورکانی بۆ بێ. سولەیمان بەگ بەمەی زانی و یەک بەشیران و قوباد داوای شەڕ وێستانی کرد و سولەیمان بەگ گوێی نەدایە و گوتی: دەبێ بەبێ مەرج خۆیم بدا بەدەستەوە. قوباد بە شەو تێی تەقاند و سولەیمان بەگ کەوتە شوێنی تا دەقەڵای مەرگەوەڕی پەستاوتەوە. لەو شەڕەدا لە هەردووک لا چوارسەد کەسێک بەلادا هات. قوباد بەگ دوای ئەم شکانە هەژدە کەسی لەسەر ناسانی دەوروبەری خستە تەک خۆی و چوونە وان و بەسەرهاتیان لە بەردەمی والی دانا. ئەویش لە سۆنگەی شکان و جەنگ دۆڕاندن، قوباد و چەند کەسێکی کوشت و ئەوانی تری لە سووچی زیندان توند کرد. (جەمیل)

٣١- تاڕووتی: مەڵێ وام کرد یان وامە    چێشکەم بۆ بگرە پێت دەڵێم مامە! (هەژار)

٣٢- تەرگەوەڕ و مەرەوەڕ: نهۆ لە سەر کوردستانی بەردەستی ئێرانن و لەنزیک سنووری ئێستای تورکیا و عیراقن و لە ڕۆژاوای شنۆ و داوێنی چیای دالانپەڕدا هەڵکەوتوون. (هەژار).

٣٣- حوسێن حوزنی دەڵێ: هەتا ساڵی ٩٩٨ک- ١٥٨٩ز حوکمی

کردووە و ئەوسا عەلی بەگی کوڕی لەجێی خۆی داناوە و ساڵی ٩٩٩ک- ١٥٩٠ز مردووە و زۆریشی ئاسەواری باش لە پاش بەجێ ماوە. مزگەوتی گەورەی حەریر و ئەو قەڵایەی کە ئێستەش لەکن ئەشکەوتی خرواتان شوێنەواری ماوە، کردەوەی ئەون. خانزادە خاتوونی بەناوبانگ کە (قەراڵیچەی سۆران)یان پێ گوتووە، خوشکی بووە و کاروباری ناوخۆی راپەڕاندووە و لەزۆر کاراندا میر پرسی پێ کردووە. خوشکە پەروینی وێژەوانیش لە چیرۆکێکدا کە دەربارەی خانزادی سۆرانی نووسیوە و لەرووپەر ٩٠-٩٣ی ژمارە ٧و٨ی گۆڤاری گەلاوێژی ساڵی ١٩٤٢دا چاپکراوە. خانزادی بە خوشکی میر سولەیمان داناوە. بەڵام ئەمین زەکی لە مشاهیر الاکراددا دەڵێ: ژنی بووە و کچی حەسەن بەگە. (جەمیل)

٣٤- نیازی لە مرادخانی سێهەمە.

٣٥- شەرەفخان هەتا ئێرەی هێناوە و ئێمە لەسەر ژیننامەی بنەماڵەی سۆران دەڕۆین:

عەلی بەگ لە رۆژگاری بابیدا بەسەر جۆلەمێرگ رادەگەیشت، کاتێ کە بووە میری سۆران، پایتەختی بردە حەریر. ساڵی ١٠١٠ک- ١٦٠١ز پردێکی بەرینی بەردینی لەو دواوانی باڵەکیان و رەواندز، لەسەر زێ هەڵبەست و رێگەی گەلی بۆ کاروانە رێ خۆشکرد و لەوساوە بە گەلی عەلی بەگ ناسراوە، هەروەها قەڵا و سەنگەری لە زارگەڵیدا دروست کردن. عەلی گەلی بەگ پیاوێکی هێدی و هێمن و دوورەشەڕ بووە. بەڵام بابانەکان گەریان تێدەهاڵاند و تووشی شەڕیان دەکرد. نێوانی دەگەڵ تورک و ئێرانیان خۆش بوو، دەگەڵ میر حەیدەری کوڕی میرەپاشای میری موکریانیشدا دۆست بوو، کە میر حەیدەر و جەعفەر پاشای عوسمانی شەڕیان بوو، عەلی بەگ لەسەر میر حەیدەری کردەوە. جارجار بە ماڵەوە دەچووە دوێن و چەلی واش هەبوو لە خەلیفانی دۆڵی ئالانە دادەنیشت. قەڵاکانی سەر دەریا و سرێشمە و قەڵای کلاسووی چیای حەریریش هەر ئەو کردوونی. زۆری حەز لە خوێندەواران دەکرد، شێخ حەیدەری ماوەرانی بەناوبانگ و سەرۆکی زانایانی ئەو رۆژگارە، ئەو چاوەدێری کردووە. عەلی بەگ ساڵی ١٠٤٤ک- ١٦٣٤ز عەمری خوای کردووە و دوو کوڕی هەبووە: ئوغوز بەگ و میرە بەگ. ئوغوز بەگ بۆتە جێنشین.

**میر ئوغوز بەگی گەورە کوڕی عەلی بەگ**

لە پاش ئەمانی بابی هاتە سەر حوکم و نیازی لێگرت کە میرنشینەکەی هەراوتر بکاتەوە. سەردەمایەک بوو هۆزێکی بێگانە، رەواندزی لێ ساندبوون. نامەی بۆ ماقوولانی شار و سەرناسانی هەرسێک گەڕەکەکانی نارد و ئەوانیش وەرامیان بۆ نووسیەوە کە با بێ و هێرش بێنێ و ئێمەش بە هەموو توانا کۆمەکی دەکەین. بە دووسەد پیاوی زۆر ئازا و بەکارەوە هێرشی بردە سەر نەیارانی و رەواندزی لێ ساندن و ساڵی ١٠٥٣ک- ١٦٤٥ز حوکماتی خۆی بردەئەوێ و ساڵی ١١٠٧ک- ١٦٩٥ز مردووە.

ئەمین زەکی دەڵێ میر ئوغوزخان لەپاش بابی ساڵی ١٠٢١ک رەواندزی کردە پایتەختی خۆی و سیدەکان و هاودیان و دەشتە دیانیشی وەبەرخۆدا و هۆزە فەلەکانیشی هێنانە بەر فەرمان.

**میرە بەگ**

ئەمین زەکی لە تاریخ نعیمای راگوێزتووە دەڵێ: میرەبەگی سۆرانی بۆتە جێنشینی برای و ساڵی ١٠٢٩ک- ١٦١٩ز چاوی بە خوسرەو پاشا کەوتووە و لە رۆژگاری ئەودا خان ئەحمەدخانی ئەردەلان وڵاتی سۆرانی داگیرکردووە. گومان لەوەدانییە کە ئەو میرە بەگ (میران بەگە) برای ئوغوز بەگی گەورە بووە. بە داخەوە حوزنی باسی میران بەگی نەکردووە.

**میر ئەحمەد کوڕی ئوغوز بەگ**

کە باوکی مرد (دەبووایە بڵێ کە مامی مرد. هەژار) لە جێگەی ئەو چووە سەر تەخت و بانگەوازیان کرد و هەموو کەسیان کۆکردەوە و نان و خوانی بۆ رازاندەوە. لەوە بەدوا کەوتە هەراو کردنی میرنشینەکەی و دەرگەڵە و باڵەکان و وەرتی و سیدەکانی وەبەرخۆ داو زۆر دەگەڵ ژێردەستانی خۆیدا باش و دادگەر و دڵاوا بوو. ساڵی ١١٧٠ک- ١٧٥٦ز رۆژێک لەراوێ بە ئازاری دڵەکپێ مرد.

**میر ئوغوز بەگی بچووک کوڕی میر ئەحمەد**

بووە جێنشینی بابی و پیاوێکی ئاوەدانکەرەوە و چاندن دۆست و کاسبکار و دارودرەخت پەروەر بووە، رەزی بە خەڵک ناشتووە و دەسگیرۆیی وەرزێرانی کردووە و زۆریش دوورە شەڕ و بێ ئازار بووە و ساڵی ١١٨٢ک- ١٧٦٨ز مردووە و شەش کوڕی لەپاش بەجێ ماوە: مستەفا بەگ، تەمەرخان، یەحیا بەگ، بایز بەگ، ئەحمەد بەگ هەتا مابوو مستەفا بەگ جێنشین و هەڵسوڕێنی کاروباری رەواندزی پایتەخت بوو. تەمەر (تەیموور) بەسەر هاودیان و یەحیا بەسەر سیدەکان و بایز بەگ بەسەر باپشتیان رادەگەیشتن حەسەن و ئەحمەدیش یاریدەی مستەفا بەگیان دەدا.

**میر مستەفا بەگ کوڕی ئوغوز بەگ**

لەپاش بابی بوو بەجێنشین و براکانی بە زەبری زۆر هێنانە

بەرفەرمانەوە و لە رانیە و کۆیسنجاق و زینوێ شێخی و سیدەکان و برادۆست و حەریر و هەودیانی دامەزراندن. بەڵام برا دانەمەزران و لە پەستا کەتنیان دەگێرا و نیازیان وابوو بنکۆڵی کەن. هەموو جارێ دەچووە سەریان و سەری دەکوتان و تا ماوەیەک دایدەمرکاندنەوە.
ئاوا رابرا، هەتا ساڵی ۱۱۹۸ک- ۱۷۸٤ز براکانی لەدژی ئەو دەگەڵ بابان بوونە دۆست و دنەیان دان کە بێنە سەر مستەفا بەگ و وڵاتەکەی لێ داگیرکەن. بابانییەکان لەو شەڕەبرایە بەهرەیان برد و لەشکریان کرد و رانیە و کۆ و حەریریان لە سۆران دابڕی و خستیانە ژێردەستی خۆیان. لەولاشەوە تەیموورخان بەگ هەودیان و شەمزینانی کردنی خۆی و تا سنووری زەرزا و مەوکریان چوو. بایز بەگیش دەشتەکانی رەواندز و ناوچەی رۆست و جێگەی تری وەبەرخۆدا، تەنیا شاری رەواندز و دەوروبەری و سەرچیا و دۆڵی گەوەران و جۆڵەمێرگ بۆ مستەفا بەگ مایەوە. لەشکری بابانەکانیش هەروا بەرەو پێش دەهات و گەیشتە دەرەوەی دڵی گەوەران و گەیە نزیک گوندی ئەران کە لە پێشوودا شار بووە. میر مستەفا کاتێ زانی دەرۆست نایە، خۆی گەیاندە میر سولەیمان پاشای بابان و دەگەڵی رێککەوت و بابانەکان کشانەوە.
ئەمین زەکی دەڵێ: میرە بابانەکە مەحموود پاشا بووە و میر مستەفا دەگەڵی پێکهاتووە و فاتمەخانمی کچی لە حوسێن بەگی کوڕی مەحموود پاشا مارە کردووە.
میر مستەفا لەوە بەدوا هاتەوە سەر کاروباری دنیاداری خۆی، تا سەر لێی نەگەڕان. تەیموورخان و یەحیا بەگ دەستیان داوە نامەکاری و دنەی پاشای بابانیان دا کە بێتەوە و مەڵبەندی سۆران داگیر بکا.
سولەیمان پاشای بابانی ساڵی ۱۷۸۷ک- ۱۲۰۱ز بە لەشکری زۆرەوە لەرێی بالیسان و ئاکۆوە بۆی هات. میر مستەفا سپیلکی لێگرت و بەگژیاندا هات و بەرەو پاشی گێرانەوە و چەند پیاوێکی هەڵبژاردەی ناردە دەربەندی مێگری بێجان، بۆسەیان بۆ بابانەکان نایەوە. لەشکرەکە پێشایی گەیشتبووە کونەفیچ و دواییەکەی هاتە ناو دەربەند، پاڵەوانانی سۆرانی لێیان راپەڕین و زۆریان شپرزە و بێ سەروبەر کردن و هەموو گرانبار و ئازووقەیان بەتاڵانبردن و تازە بیرای بیرای بابانەکان بێنەوە سەری!
سێ ساڵی تریش مستەفا بەگ میرایەتی کرد و برایانی ستۆکورکیان بەر نەدەدا و ئاسایشتیان لێ هەڵگرت تا وای لێهات لە میرایەتی وەڕەز بوو. ساڵی ۱۲۲۳ک- ۱۸۰۸ز یان بە گفتی ئەمین زەکی ۱۲۲۵ک- ۱۸۱۰ز میر محەممەد بەگی کوڕی کە بە پاشای کوێرە بەناوبانگە لەجێگەی خۆی داناو لە دواییشدا چاوەکانی کوێر بوون و ماوەیەک هەر دەرمانی دەکرد هەتا عەمری خودای بەجێ هێنا. دکتۆر رووس لە ۱۹ی مایۆی ساڵی ۱۸۳۳ بۆ چاری چاوی چۆتە لای.
مستەفا بەگ چوار کوڕی بووە: محەممەد بەگ، رەسوول بەگ، سولەیمان بەگ و ئەحمەد بەگ. ئەمین زەکی دەڵێ پێنج بوون و پێنجەمیان تەیموورخان بووە.

**میر محەممەد (پاشای کوێرە)**

ساڵی ۱۱۸۹ک- ۱۷۷۵ز یان بە گفتی ئەمین زەکی ۱۱۹۸ک- ۱۷۸٤ز لە رەواندز لەدایک بووە، بووک شازەمانی داکی زۆر ژنێکی کەیخوداژن و تێگەیشتی بووە. میر محەممەد لە گوندی دێلێزی لە ناوچەی باڵەک لەلای مەلا ئەحمەدی نیبنوئادەمی خوێندووە و لە پاشان خەجیجی کچی بایز بەگی مامی خۆی خواستووە و جۆڵەمێرگ و دۆڵی گەوەران و دۆڵی هەرووتیان و سەرچیاو سرێشمە و بیاویان پێ سپاردووە کە بەسەری رابگا. ساڵی ۱۲۲۳ یان ۲۵، بابی (میر مستەفا بەگ) ئەو و رەسوڵ بەگ و سولەیمان بەگ و ئەحمەد بەگی برای بانگ کردوونە لای خۆی و لەلای هەمووان کردوویە بە جێنشینی خۆی و بۆ خۆی دەستی لەکار کێشاوەتەوە.
محەممەد پاشا کە بووەتە میر، نەرم و شلی و خاوەخاوی نەزانیوە، هەرکەس سەری بزاوتبا بزوتی دەچاو رادەکرد. تەیموورخان و یەحیا بەگی مامی گرتن و هەڵیواسین. ئەوسا پەری هەڵاویشت و کەوتە بیری ناو دەرکردن. پەلاماری هەولێری داو هەتا سەر زێی گچکە، گرتی و کەوشەنی نێوانی وڵاتی سۆران و بابان و پردێ و کۆیە و رانیەشی گرت و ساڵی ۱۲٤۹ک- ۱۸۳۲ز لەشکرێکی یەکجار زۆری بردەسەر ئاکرێ و ئامێدی و سەعید پاشای میسری بادینانی بەدیل گرت و هەڵیکوتا سەر بە عیشقا و میری یەزیدیانی گرت و لە رەواندز بەندی کرد و لەپاش دووساڵ کوشتی. بەرەو جزیرەشی ئاژۆت. ماردین و نوسەیبینی داگیر کرد.
عوسمانی زۆر ترسیان رێنیشت و لەدژی دەستیان بەکارکرد. سوڵتان مەحمودی عوسمانی لەشکرێکی بە لێشاوی بە سەرکردایەتی محەممەد رەشید پاشای سەدری ئەعزەم نارده شەڕی و فەرمانیش بۆ عەلی رەزا پاشای والی مووسڵ دەرچوو کە لەلایەکی تردوە بە لەشکرەوە بۆی بچێ. میر محەممەد پاشای کۆرەزانی کە لە دەشتدا شەڕی ئەو لەشکرە زۆرەی بۆ ناکرێ، بەرەو رەواندز هاتەوە و لە قەڵا قایمەکانی خۆیدا، خۆی قایمکرد و گەلی عەلی بەگیشی لەدوژمن گرت. لەشکری محەممەد پاشا لە دەشتەدیان بوو، عەلی رەزا پاشای تورکیش لە حەریر لەشکر بەزی کرد. سەدری ئەعزەم ناردیە لای و ئامۆژگاری کرد کە شەڕی خەلیفەی موسڵمانەکان نەکا. مەلاشی بە

هەموو لایەکدا ناردن کە فتواکەی مەلای خەتێ بەناو لەشکری میردا بلاوبکەنەوە. ئەو فتوایەی کە گوتبووی: هەرکەس لە فەرمانی خەلیفە دەرچێ تەلاقی دەکەوێ و خوێن و مالی بۆ موسلمانان حەلالە. لە پاشان بۆی دانا کە ئەگەر خۆی بدا بە دەستەوە، زیانی پێ ناگا. خۆی دایە دەست سەدری ئەعزەم و بردیە ئاستانە و سالی ١٢٥٣ک-١٨٣٧ز لە تەرابزوون کوژرا.

مێجەر فریدریک میلنگن باسی ئەو خۆ بەدەستەوەدانە لە رەسووڵ پاشای برای میرەوە بە جۆرێکی تر دەگێڕێتەوە کە بۆ ئەم پەراوێزە نابێ. کە دەیەوێ زۆرتری لێ بزانێ، با لە کتێبی میرانی سۆران و تاریخ الدول و الامارات الکردیە و مشاهیر الکرد و کوردستان و ژیانی سەرەتایی ناو کوردان و هتد، بروانێ.

تا ئێرە پەراوێزی مامۆستا جەمیل رۆژبەیانی بوو، بەلام چونکە تاریخی کورد و کوردستانی ئەمین زەکی بەگ لە هێندێک شوێن پێچەوانە و هێندێک جاریش پتری نووسیوە، من ئەویشم وەرگێڕایە سەر کوردی، ئەو دەڵێ: مستەفا بەگ سالی ١٢٤١ک- ١٨٢٦ز مرد و محەمەد بەگی کوڕی کە لە دوایی بە میری گەورە ناوی دەرکرد و بە سەربەستی دەستی بەکارکرد زۆر زیرەک و بەبڕشت و زیت و کڕ و دەبنەوەر بوو، هەرچی نیـــازی بووایە دەیکرد. بەر لەهەر شت میرنشین شیروان و برادۆستی رامالی و سالی ١٢٤٦ک- ١٨٣٠ز سەربەخۆیی راگەیاند و سورچیایەتی و خۆشناوەتیشی گرت و هاتە سەر هەولێر و ئەلقەی لێ وێک هێنا و گرتی و ئالتوون کۆپریشی بەر خۆداو قەلەمڕەوی زۆر رێکخستن و پیاوی خۆی لەسەر دانان. کۆ و رانیەشی لە بابان گرت و سنووری تا زێی بچووک هات.

عەلی رەزا پاشای والی بەغدا کە زانی بەشەڕ پێی ناوەستێ، خۆی کردە دۆستی و لە ناچاری حکومەتی میری بە رەسمیەت ناسی و پلەی ئاسایشی دایە. سالی ١٢٤٧ک- ١٨٣١ز هێرشی بردە سەر یەزیدیان. هۆش ئەوە بوو میـــری ئەوان عـــەلی ئاغـــای بالەتەیی کوشتبوو. مەلا یەحیای مزووری برازای عەلیاغا بوو هاتە لای میر و گازندەی خوێنی مامی کرد. میر لەشکری بۆ کرد و چووە سەر یەزیدیان و یەکجار زۆری لێ کوشتن و ئەوی ماشن خۆیان لە چیای جودی و تورعابدین و سنجاردا شاردەوە، هێندێکیشیان بەرەو موسل هەلاتن. والی موسل لە ترسی میر پردی بڕی و پەنابەران لەوبەرەوە مانەوە و پیاوانی میر هاتنە گیانیان و لە تل قویونجقدا چەند رۆژێک دەوریان دان و توانیان هەموویان بکوژن. لەپاش سالێک میر چووە سەر جزیرەی ئیبنوعومەر و وێرانی کرد و دەوری قەلای ئاروخی داو شەڕێکی زۆر خوێناوی کرد و بای دایەوە سەر یەزیدیان و فەرمانی قەلاچۆی دان و زۆربەی کوشتن. لەپاش سالێک چووە سەر ئاکرێ و سمایل پاشای لێ دەرکرد و ئەوجا رووی کردە زێبار، کە بەردەستی سەعید پاشای ئامێدی بوو. سەعید پاشاشی زۆر پیس شکاند و لە ولاتی دەرپەڕاند و مووسا پاشای خزمی و دوژمنی لەجێی ئەو دامەزراند.

پاشان گرتنی ئامێدی و دهۆک، زاخۆشی گرت. ئەوجار کەوتە رێکخستنی ولاتەکەی. قانوونی قورئان بوو، بێ پرسی مەلایان پەنجەی دەناو رانەدەکرد. کاروباریشی وەک میجەرلونگریک دەلێ لە هەموو کەس رێکتر بوو. لە زاخۆوە و چووە جزیرە و حەسەنکێف و مالە بەدرخانی شپرزە کرد و قەلای ماردین و نووسەیبینیش کەوتنە بەر مەترسییەوە.

چاخێ لەو لایانە گەراوە، بیستی کەوا خەلکی ئامێدی مووسا پاشاکەی ئەویان راوناوە و سەعید پاشایان هێناوەتەوە. لەشکری بەکن موسلدا هێنا، بەلام خۆی دەمووسل نەگەیاند. دەورەی ئامێدی داو لەپاش سێ مانگ گرتی و سەعید پاشای دەردەست کرد و خەلکێکی زۆریشی لێ کوشتن و ئەوسا رەسووڵ بەگی برای خۆی لەسەر دانان و ئامێدی خستە سەر رەواندز.

لەو ماوەدا محەمەد پاشای والی مووسل کە دەیدی میر سەری قالە و رەواندز بەتالە- ویستی بیگرێ. رەشید بەگی بریکاری بە لەشکرێکەوە نارد و رەشید بەگ ناچار کرا بداتە چیاو والی مووسل چی بۆ نەکرا.

هەر لەو سەروبەندانەدا حکومەتی عوسمانی بە رەشید پاشای والی سیواسی کە پێشوو سەدری ئەعزەم بوو ئەسپارد کە ولاتی بۆ ئارام کاتەوە. والی بەغدا و (متصرفی) مووسلیش دەنگدران کە یاریدەی بکەن. رەشید پاشا بۆ شەڕی میر خۆی تەیار کرد و بەرێی جزیرە و زاخۆوە هاتە موسل و لەوێش لەشکری نینجەبیراقدار نوغلی رەگەل کەوت و پێکەوە بەرەو رەواندز چوون و لەشکری بەغداش گەیشتن و لەدەشتی حەریر هەلیاندا. کوڕی (؟) محەمەد پاشا گەلی عەلی بەگی گرتبوو. تورک وزەی هێرشیان نەبوو، ناچار رەشید پاشا نامەی بۆ میر نووسی و داوای ئاشتی لێکرد و بەلێنی بەهێزی پێدا، کە دەیبەخشن و با چیدی خوێن نەرژێ و بچێتە لای سولتان و دەیکاتەوە میر. ئەویش چووە سوپاگەی عوسمانی و دەغالەتی کرد. دەلێن رۆژێکی هەینی مەلایەکی کوردی بەناوبانگ لەخودبەدا گوتی: دروست نییە شەڕی خەلیفەی موسلمانان بکرێ و هتد. ئەمە زۆر کاری کردەسەر شەڕکەران و محەمەد پاشای ناچارکرد کە سەر وەبەر باری خەلیفە بێنێ. ئەوەک زیان بە دیانەتی بگا!

نووسراوێک لە یاداشتەکانی ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی حاجی عومەر ئەفەندی زادەوە دەگێڕێتەوە کە باپیری ئەو بنەمالە ناوی

خەتی ئەفەندی بووە. قسەی لەسەر میر ڕۆیشتووە و ئەو ئامۆژگاری کردووە، کە سەر وەبەر باری تورکان بێنێ و هەر ئەویش سەعات شەشی شەوێ دەگەڵ خۆی بردووە و داویەتە دەست سەدری ئەعزەم. ڕەشید پاشا بە ڕێزگرتن ڕەوانەی ئاستانەی کرد و بەخشیان و ناردیانەوە بەرەو وڵات، بەڵام گەردوون کاری خۆی کرد. ڕەشید پاشای والی لەو بەینە مرد و بەڵێن هیچی لێ شین نەبوو. عەلی ڕەزا پاشای والی بەغدا زۆری ڕەشید دەدزا و بەخوێنی میریش تینی بوو. پیاوی نارده لای سوڵتان و وای تێگەیاند ئەگەر میر محەمەد بچێتەوە ڕەواندز ئاگری ئاژاوە هەڵدەکا و بەهیچ دانامرکێ. فەرمان دەرچوو کە بکوژرێ. میر لە ئاستانە دەرچووبوو بەرەو سیواس دەهات کە بێتەوە بۆ کوردستان، فەرمانیان نارده سیواس کە میر لەوێ میوان بوو دەست بەجێ کوشتیان.

تاریخی کورد و کوردستان، جزمی یەکەم، تەرجەمەی عەرەبی محەمەد عەلی عەونی، چاپی بەغدا، ١٩٦١، ڕووپەڕ ٢٢٨ هەتا ٢٣٣. (هەژار).

### میر ئەحمەد کوڕی مستەفا بەگ

لە زەمانی بابیدا بەسەر هێندێک جێگە ڕادەگەیشت. کاتێ میر محەمەد هاتەسەر حوکم و قەڵەمڕەوی خۆی گوشاد کردەوە، کردیە والی هەولێر. ساڵی ١٢٥٠ک- ١٨٣٣ز کە دکتۆر رووس بۆ چاری چاوی بابی هاتووە، چاوی پێ کەوتووە و میوانی بووە. کە میر محەمەد نەما، ئەو کرا بە میری سۆران. بەڵام لە دووساڵ پتر نەمایەوە و بەفیتی ئامۆزایانی بەکوشت چوو.

### سولەیمان بەگ کوڕی مستەفا بەگ

ڕۆژگاری بابی هێندێک شوێنی بە دەستەوە بوو، کە میر محەمەدیش هاتە سەر کار لێی نەستاندەوە، بەڵام لە پاشان ئەویش و تەیموری براشی گرتن و کۆت و زنجیری کردن و لە قەڵایەکی پێنج سەعاتە ڕێ لە ڕەواندزەوە دوور، خستنیە زیندانەوە. لەپاش کوژرانی میر ئەحمەدی برای، کرا بەمیر و لە شەش مانگ پتر نەمایەوە و لەسەر دەستەوستانی دەرکرا.

### ڕەسووڵ پاشا کوڕی مستەفا بەگ

دەورانی بابی هەر جارە بەسەر جێیەک ڕادەگەیشت، کە میر محەمەد حوکمی سۆرانی گرتە دەست، کردیە سەرداری لەشکر و دوایەش ئامێدی پێ سپارد. لەپاش نەمانی میر محەمەد و دوو برا جێنشینەکانی لەسەر داوا و تکای خەڵکی ڕەواندز حکومەت لەئامێدیەوە هێنایەوە ڕەواندز و چوار ساڵانی میرەتی کرد. لە ئەنجامدا خۆی لە باج و دەرامەتی دەوڵەت بوارد و عوسمانی لەشکریان ناردەسەر لە حەریر و خەلیفان بەگژیاندا هات و خۆی نەگرت و هاتەوە ڕەواندز و لەوێش تەنگیان پێ هەڵچنی و ڕایکرد و چووە شنۆیە و پێنج ساڵ لەوێندەرێ ماو ئەوسا دەگەڵ عوسمانیان ڕێککەوتەوە و هاتەوە، بەڵام لەو بەینەدا میرایەتی سۆران پەردەی داگیرکەرانی بەسەردا درا و خرایە ژێر دەستی فەرمانبەرانی تورک و تازە سەری هەڵنەدایەوە.

ڕسووڵ پاشا لە پاشانیش زۆر ژیا، کرا بە (متصرفی) بەغدا و کردیانە والی وان و مسترمیلنگنی گەڕیدە، لەوێ چاوی پێکەوتووە. دوایی کراوەتە والی ئەرزەڕۆم و ساڵی ١٣٠١ک- ١٨٨٤ز لەوێ مردووە و پێنج کوڕی بووە: ئەسعەد و فەتاح و ڕەشید و بارام و ئیحسان. ئەسعەد بەگ ساڵی ١٢٧٥ک- ١٨٥٩ز لە دیجلەدا خنکاوە. ئەوانی تریش کاروباری دیوانیان پێ سپێرا و کەسێک دەبەوێ زیاتری لێ بزانێ، با لەو پەراوێزە بڕوانێ کە حوزنی موکریانی بۆ کتێبەکەی فریدریک نووسیوە و لە گۆڤاری گەلاوێژ و دەنگی گێتی تازەدا چاپکراوە. (جەمیل)

دەمەو پاییزی ساڵی ١٩٧١ز نووسەری هێژا مامۆستا محەمەد مەولود مەم لە هەولێر دەربارەی زنجیرەی بنەماڵەی سۆران مەعلووماتی بەنرخی دامێ، کە ئەویش بە یارمەتی مامۆستا نوورەدین بەهائەدین ئەندامی دادگای تەمیزی عێراقی کۆکردۆتەوە، وا لەژێرەوە نووسیومن. (هەژار).

### بنج و بناوانی میرانی سۆران

یەکەم میر کەڵۆس بووە. سێ کوڕی هەبووە بەناوی میر عیسا شێخ وەیس و ئیبراهیم. لە وەچەی شێخ وەیس و ئیبراهیم شتێک نازانین، بەڵام میر عیسا شاعەلی بەگی بووە. ئەویش سێ کوڕی لێ کەوتۆتەوە: میر بداغ، میر حوسێن و میر سەیدی. میر بداغ دوو کوڕی بوون: میر حوسێن و میر سەیفەدین. میر سەیفەدین بێ کوڕ بووە. میر حوسێن کوڕێکی بووە بەناوی میر سەیفەدین و ئەویش بە گەنجی مردووە و بەرەی میر بداغ بڕاوەتەوە.

میر عیسا و میر حوسێنیش بێ کوڕ بوون، بەڵام برای چوارەم میر سەیدی سێ کوڕی بووە بەناوی میر سولەیمان، میر سەیفەدین و میر عیزەدین شێر. سەیفەدین وەجاخ کوێر بووە، میر عیزەدین خان ئاوەدلی هەبووە و ئەویش بێ کوڕ مردووە. میر سولەیمان سێ کوڕی بووە: شاقولی بەگ، میر عیسا و میر سەیفەدین. نازانین میر عیسا و میر سەیفەدین چیان بووە، بەڵام شاقولی بەگ میر بداغ و میر

سولەیمان بەگی لێ کەوتۆتەوە. ئەو میر سولەیمانە قارەمانی داستانی خانزاد و لەشکرییە. شاقولی بەگ شەقلاوەی ئاوەدان کردۆتەوە(؟). میر سولەیمان بە گزیکاری والی بەغدا لەناوبراوە و خانزادە خاتوونی بەناوبانگ حوکمڕانی سۆران کە پایتەختی حەریر بووە. تا ئێستاش شوێنەواری کۆشکی فەرمانداری خانزاد خاتوون لە حەریر هەرماوە. لە زەمانی ئەو شاژنەدا شەقلاوە زۆری گەشە کردووە و هاوینەهەواری قەراڵیچەی کوردەواری بووە. لەسەر لووتکەی چیای سەفین گۆڕەپانێک بەناوی خانزاد هەیە، وەک: دەڵێن هاوینان لەوێی هەڵداوە. خەڵکی ناوچەی حەریر خانزادی بە خوشکی میر سولەیمان دەزانن، کەچی هەندێک مێژوونووس لایان وایە کچی بووە. سولەیمان بەگ کوڕێکی بەناوی عەلی بەگ هەبووە ڕێگای گەلی ئەو خۆشی کردووە و بەناوی ئەوە. عەلی بەگ. میر ئۆغزی لێ کەوتۆتەوە، ئەویش دوو کوڕی بەناوی میر ئەحمەد و میر عیزەدین شێر بووە. میر ئەحمەد وەجاخ کوێر و میر عیزەدین کوڕێکی بەناوی خاناوەدل لەپاش بەجێماوە. ئەویش سوڵتان مەحموود و ئەویش ئەحمەد بەگی بەجێ هێشتووە. ئەحمەد بەگ، مەحموود بەگ و ئەمیش میر ئۆغزی لەپاش بەجێ ماوە، کە دەبێتە بابی مستەفا بەگ و باپیری میر محەمەد پاشای کۆرە. میر ئۆغز بەگ شەش کوڕی بووە. میر حەسەن، میر ئەحمەد، یەحیا بەگ، بایز بەگ، تەمەرخان بەگ و میر مستەفا بەگ.

لە نەوەکانی میر حەسەن و یەحیا بەگ و تەمەرخان بەگ ئاگادار نین، بەڵام ئەحمەد بەگ عەبدوڵلا بەگی بووە. ئەویش دوو کوڕی بەناوی عەلی سلاحشوور و حەمەد بەگ هەبووە. عەلی بەگی سلاحشوور کوڕێکی بەناوی سولەیمان بەگ سلاحشوور بووە، کە دەبێتە بابی ئەو عەلی حەیدەر سولەیمانەی وەزیر و سەفیری حکومەتی عیراق و برای شەمسەدین بەگە، کە ئەویش ئێستا لە هەولێر دەژی و هەروەها برا سێهەمیان بورهان بەگە و ئێستا لە بەغدا لە ئەمانەی عاسمە، حاکمە. ئەم سێ برایەش زۆریان لێ کەوتوونەتەوە.

حەمەد بەگ باوکی مەلا عەزیزی گوندی فەقیانە، کە ئەویش دوو کوڕی بوون: کاکیل ئاغا و عەبدوڵلا بەگ: کە ئێستاش عەبدوڵلا بەگ ماوە.

بایز بەگ ئۆغز بەگ کوڕێکی بەناوی بەکر بەگ بووە و ئەویش چوار کوڕی بوون: ساڵح بەگ، عەبدوڵلا پاشا، حەمەد بەگ و عەلی بەگ. ساڵح بەگ سێ کوڕی بووە: عەلی بەگ، سدیق بەگ و خورشید بەگ. نەوەی ئەوانە لە ناوچەی حەریر و هەولێرن. عەلی بەگ دوو کوڕی ماون، ناویان برایم بەگ و ساڵح بەگە. خورشید بەگ باوکی نوری بەگ و قاسم بەگ و برایم بەگە، کە هەرکەسێک ماون و قاسم لە دارایی هەولێر فەرمانبەرە. دوو کوڕی سدیق بەگیش ماون، ناویان حوسێن بەگ و ئەنوەر بەگە. عەبدوڵلا پاشا بابی سەعید بەگە، ئەمیش بابی سمایل بەگی ڕەواندزە، کە ئەندامی کۆڕی دامەزرێنەری عیراق بوو، ساڵی ١٩٣٢ز کوژرا و لەعلی خانی دایکی ژنێکی بەناوبانگ بوو لەم دواییانەدا مرد.

حەمەد بەگ دوو کوڕی بوون: مەجید بەگ/ شێخ سولەیمان بەگ. مەجید بەگ دوو کوڕی ماون: شێخ سولەیمان کە ئێستا لە هەولێر (ملاحیظ) حدودە و عەبدوڵلا فەرمانبەری دائیرەی توتنە. عەلی بەگ کوڕێکی بەناوی حوسێن بەگ هەموو دەگەڵ مەلا مستەفای بارزانیدا چووە ڕووسیا و لەوێ مرد و بێ منداڵیش بووز میر مستەفا بەگ کوڕی میر ئۆغز بەگ چوار کوڕی بوون: میر سولەیمان بەگ، میر ئەحمەد و ڕەسوول پاشا. تەقیەدین و وەسمان بەگ. حەمەد بەگیان دوو کوڕی بووە: مەجید بەگ و شێخە بەگ. مەجید بەگیش کوڕێکی بەناوی حەمەد بەگ هەبووە. سولەیمان بەگ باوکی عەلی بەگە کە ئەویش دوو کوڕی بەناوی حەسەن و حوسێن هەبووە. خورشید بەگ سێ کوڕی بووە: سدیق بەگ، میرۆ، حاجی سەعید بەگ، سدیق بەگ دوو کوڕی ماون، ناویان حاجی شەهاب و حاجی پاشایە. میرۆ ئەسعەد و تەوفیق ناوی بەجێ هێشتووە. حاجی سەعید بەگ لە گوندی ئالانە دادەنیشی و دوو کوڕی هەن: ئیسماعیل و محەمەد.

تەقیەدین بەگ سولەیمان بەگی بووە کە ئەویش کوڕێکی بەناوی تەقیەدین بووە و باوکی سولەیمان بەگ بووە. وەسمان بەگ تەنیا کوڕێکی بەناوی میر مەلا هەبووە.

کوڕی دووەمی میر مستەفا، ئەمیر مەنسوور محەمەد بەگ بووە، کە بە پاشا کۆرە یان میری گەورە بەناوبانگە و هیچ منداڵی نەبوون. سێهەمیان میر ئەحمەد بەگی لاڵ بووە. ئەویش کەسی لەپاش بەجێ نەماوە.

چوارەمیان ڕەسووڵ بەگە و پاشاشی پێ گوتراوە. پێنج کوڕی هەبووە: ١- ئەسعەد بەگ، باوکی عەبدوڵلا موخلیس بەگ باوکی زیانەدین بەگ و یەحیا بەگە. ئەمەیان لەم ساڵانەی دواییدا بێ فرزەند مرد و سەردەمێک لەناوچەی هەولێر قایمقام بوو. ٢- فەتاح بەگ دوو کوڕی بوو: خورشید بەگ و تەوفیق بەگ. ئەمەش بێ جێنشین مرد. ٣- ڕەشید بەگ دوو کوڕی هەبوو: عەبدوڵلا ئەدیب بەگ و عوسمان بەگ. عەبدوڵلا ئەدیب کوڕێکی لە تورکیا ماوە عوسمانیش زەکی هەیە، کە لە تورکیا دەژی. ٤- بارام بەگ. ٥- ئیحسان بەگ. ئەم دووانەش هەر لە تورکیا بوون و کوڕیشیان نەبوون. (لێرەدا مەعلووماتی مەم کۆتایی دێت).

*

# پرۆژەی میرنشینی سۆران بۆ سەربەخۆیی عیراق ١٨٣٢ زایینی

دکتۆر عیماد عەبدولسەلام رەئووف

سەردەمی حوکمرانی محەمەد پاشا واتا (پاشای گەورە)ی میرنشینی سۆران لە رەواندز لە سالانی ١٨١٣ - ١٨٣٨ قۆناغێکی پڕ تین و تاو و پڕ لە رووداوی گەورە بوو، لەم مێژووەدا، کە چارەگە سەدەیەکی خایاند، میرنشینی سۆران توانی پایتەختی کۆنی خۆی (هەریر) بەدەست بێنێتەوە، کە بابانییەکان خستبوویانە سەر میرنشینی خۆیان، میرنشینی سۆران دەسەلات و قەڵەمڕەوی خۆی فراوان کرد، شاری هەولێریشی گرتەوە. هەروەها شارەکانی کۆیێ و دەشتی موسڵ و ئاکرێ و زاخۆ و دهۆک و ئامێدی و نەسیبین و ماردین و شەنگاری گرتبووەخۆ. ئەم میرنشینە بووە دەوڵەتێکی سەربازی فراوانخوازی. ئەمەش لە کتێبی (الاسر الحاكمة في العراق في القرون المتأخرة)دا هاتووە.

حوسێن حوزنی موکریانی مێژوونووسی کۆچکردووی کورد دەڵێت: خۆی ئەو نامانەی بینیوە، کە لە نێوان میر محەمەد (پاشای گەورە)و محەمەد عەلی پاشا والی میسر گۆڕدراونەتەوە، لەمەدا دەردەکەوی، کە دوای ئەوەی (پاشای گەورە) دەسەلاتی گەیشتۆتە زاخۆ و ئامێدی و شەنگار، رێککەوتننامەیەکی لەگەلا محەمەد عەلی پاشادا مۆرکردووە، کە هەریەک هاریکاری ئەوی دیکە بکات، بەم پێیەش محەمەد عەلی پاشای میسر سەربازەکانی بەرەو سوریا بیات و لەوێشەوە بەرەو شاری ئەدەنەی بیات و لە بەرامبەردا (پاشای گەورە) رووەو ماردین و دیاربەکر هەنگاو بنێت، ئەم نامە گۆڕینەوەیە لە ساڵی ١٨٣٢دا بووە. پاشای گەورە لە مانگی ئەیاری ئەو ساڵەدا ئەو شوێنانەی دەستی بەسەردا گرتووە و هەردوو پاشا ئاگایان لە باری یەکتری بووە، ئەوکاتەی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشای والی میسر گەیشتۆتە شاری (حمص) لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٨٣٢دا، نامەیەکی بۆ (محەمەد پاشا) ناردووە، ئەوکات محەمەد پاشا لە دەوروبەری شاری موسڵ بووە.

ئەمە لە کتێبی (موجز تأريخ امراء سوران، ترجمة محمد الملا عبد الكريم، ص٥٤)دا هاتووە، ئەم راستییە مێژووییانە بۆتە جێگەی بایەخی چەندین مێژوونووس، هەندێکیان گومانیان لە راستی ئەم زانیارییانە لەبارەی نامە گۆڕینەوەکان کردووە، هەندێکیان بەشێک لەم زانیارییانەیان پێ راست بووە، بەو

پێیەی فراوانخوازی هەردوو پاشا لەیەک سەردەمدا بووە، کە ناکرێ بەرێکەوت دابنرێ، ئەمە جگە لەوەی تاوانێک خراوەتە ئەستۆی محەمەد عەلی پاشای میسر، کە ئەو لە پشتەوەی شۆڕشە کوردییەکان بووە لەو سەردەمەدا، بەرەو پێشچوونی سەربازیش، هەڵێک بووە بۆ (پاشای گەورە) و میرە کوردەکانی دیکە، کە بتوانن شۆڕش دژ بە عوسمانییەکان هەڵگیرسێنن، لەگەڵا ئەوەی هەموو ئەم تێڕوانینانە، لەسەر بنەمای بەراورد و گوماندایە، کە زۆربەی دەقی چەسپاویان نییە، بەڵام لەکاتی بوون و گوزەرانم لە شاری قاهیرەدا، لە ساڵی ١٩٧٢، توانیم لەنێو ئەرشیفی محەمەد عەلی پاشادا بگەڕێم و بپشکنم، کە لە دەزگای بەڵگەنامە نەتەوەییە مێژووییەکانە و لەنێو قەڵاتی محەمەد عەلی پاشایە لە قاهیرە، تاوەکو لەدوای بەڵگەنامەیەک بگەڕێم، کە پەیوەندی بەم مەسەلە گرنگەوە هەبێت، یان هەر مەسەلەیەکی دیکەی پەیوەست بە میرنشینی سۆران و پاشای گەورە، دوای ئەوەی ساڵێکم بەسەر برد لە گەڕان و خوێندنەوە لە قەڵاتی محەمەد عەلی پاشای میسر، کە ڕۆژانێک شوێنی نووستنی پاشای ناوبراو بووە، بۆم دەرکەوت و دڵنیا بووم هیچ بنەمایەک بۆ ئەم نامە و دەستنووسانە نییە، کە حوسێن حوزنی موکریانی باسی لێوە دەکات، بەڵام من بەڵگەنامەی دیکەم دەست کەوت، کە بەرپەرچی سیاسەتی میری سۆرانی دابووەوە و کەسیش تا ئێستا باسی لێوە نەکردووە، کە کاروبارەکانی میری سۆران مایەی بایەخی محەمەد عەلی پاشا بووە، پیاوانی هەواڵگری محەمەد عەلی پاشا، هەواڵەکانی میری سۆرانیان پەیتا پەیتا پێ دەگەیاند، کە لە ڕێگای ئیدارەی میسرییەوە لە وڵاتی شام، کە ئیبراهیم پاشای کوڕی ئەم کارەی ئەنجام دەدا. لەم بەڵگەنامانەدا دەرکەوتووە، کە پرۆژەی سیاسی میرنشینی سۆران، سنووری دەسەڵاتی خۆی (باشووری کوردستان) تێپەڕاندووە، هەوڵی یەکگرتنی بەشەکانی دیکەی کوردستانی داوە، ئەمەش بەرەنگاربوونەوەی حوکمڕانی عوسمانی ڕاستەوخۆی تێدا بوو، کە محەمەد عەلی پاشا هەوڵی تێپەڕاندنی دەسەڵاتی عوسمانی لە بەغدا دەدا، لەوەدا دەردەکەوێت، کە دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٨٣١ بەر لە ساڵێک لە پەیدابوونی پەیوەندی نێوان میرنشینی سۆران و میسر، لە دەسەڵاتی مەمالیکی لە بەغدادا و کۆتایی بە حوکمڕانی ئەوان هێنا، کە ماوەی ٨٠ ساڵ بەردەوام بوو، ئەم دەسەڵاتەی مەمالیک لە رووی سیاسییەوە سیستەمێکی نیمچە سەربەخۆیی لەنێو دەسەڵاتی عوسمانی دروست کردبوو.

لە رووی ئابوورییشەوە گەشەسەندنی خودی ئابووری عیراقی لەبەرچاو گرتبوو، لە رووی سەربازیشەوە توانی سوپایەکی بەهێز و گەورە دروست بکات، بەباشی پڕ چەکی بکات، لەمەدا گێڕانەوەی حوکمڕانی ڕاستەوخۆی عوسمانییەکان کە ئەوەی ماوەی ٨٠ ساڵ مەمالیکەکان بەدەستی هێنا بە ساڵێک کەوتە دەستی عوسمانییەکان، ئەو زوڵم و زۆردارییەی کە نزیکەکانی عەلی ڕەزا پاشا ئەنجامیاندا، کە ڕاسپێردرابوو سەرکردەی سەربازی چوونە نێو بەغدا بکا، و پاشماوەی مەمالیکەکانی دەست بەسەرداگرت. ئەم زۆردارییەش دەست بەسەراگرتنی سامان و سەپاندنی باج لەسەر دانیشتوان و چەوساندنەوەی بنەماڵە دەوڵەمەندەکان بوو، کە پێشتر هاوکاری مەمالیکەکانی کردبوو، لە بەرامبەر ئەم دۆخە پەشۆکاوەدا، لەگەڵ پەیدابوونی پاشاگەردانی و شێواوی، هەندێک لە سەرکردە مەملوکەکان و بەغداییەکان شارەکەیان جێهێشت و ڕوویان لە شوێنەکانی دیکەی عیراق کرد، لێرەدا بەڵگەنامەکانی محەمەد

عەلی پاشا بۆ یەکەم جار ئەوەی روون کردۆتەوە، کە ئەو سەرکردانەی بەغدایان جێهێشت، وایان بە باش زانی لەم دۆخە نالەبارەدا، بچنە ژێر سایەی میرنشینی سۆران لە رەواندز، نەک هەر تەنها وەک پەنابەری سیاسی، بەڵکو بۆ دروستکردنی هێزێکی سەربازی یەکگرتوو، لە بەغدایییەکان و میرنشینەکە، بۆ بەدیهێنانی پرۆژەیەکی گەورە، ئەویش لێدانی عوسمانییەکان بوو لە بەغدا و گێرانەوەی حوکمڕانی مەمالیکەکان.

لە راپۆرتە مێژوویییەکەدا هاتووە، کە لە رۆژی ٨ی بەهاری دوا دوایی ١٨٣٢دا، کە کوردەکانی (بەکردروس) واتە رەواندز، کە لەسەر سنووری نێوان وڵاتی عەجەم و بەغدان، شۆڕشیان بەرپا کردووە و کەرکووک و هەولێر و سلێمانی و (القنطرە) واتا (ئاڵتوون کوپری) (پردێ)یان لەژێر دەسەڵاتدایە، هەروەها موسڵیشیان بە پارەیەکی زۆر وەرگرتووە. هەروەها راپۆرتەکە دەڵێت: لەدوای ئەم هەواڵە دەستەواژەیەکی ترسناک هەیە دەڵێت: "هەواڵێک هەیە کە دەیانەوێت دەست بەسەر بەغداش بگرن"، پێشتریش هەواڵی وا لە نزیک پاشای گەورەوە هاتووە، ئاماژە بەوە دەکات، کە پرۆژەیەکی سۆرانی بۆ چوونە نێو بەغدا هەیە، ئەم راپۆرتەش راستی ئەم هەواڵە دەردەخات، هەر لە هەمان راپۆرتدا هاتووە، کە شۆڕش لەهەمان کاتدا لە بەغدا هەڵگیرساوە، کە گەڕەکی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بنکە و دەستپێکی بووە، شۆڕشگێڕەکان توانیویانە، دەست بەسەر نیوەی شارەکەدا بگرن، لە راپۆرتەکەدا دەڵێت: "هەموو ناوچەکانی نێوان بەغدا و حەلەب چاوەڕوانی سەربازانی سەرکەوتووی میسریین".

هەروەها راپۆرتێکی پێشتر لەهەمان ساڵدا ئاماژەی بەوە کردووە، کە پەیوەندی نێوان مەمالیکەکانی داود پاشا، کە دوا پاشای مەمالیکەکان بووە و خاوەنی پرۆژەی سەربەخۆیی تەواو بووە لە دەوڵەتی عوسمانی، پەیوەندی لەگەڵا سەرەک هۆزەکانی عیراق و پرۆژەی میرنشینی سۆران هەبووە.

لەوەدا دیارە کە پرۆژەکە هاوبەش بووە و مەبەستەکانیشی رزگارکردنی عیراق بووە لە چەپۆکی عوسمانییەکان، دامەزراندنی رژێمێکی دیکە، رژێمێک کە درێژەپێدەری مەمالیکەکان بێت، لەوانەشە سیستەمێکی تازە بووە لە هاوپەیمانییەتی هۆزە عەرەبەکان لەگەڵ حوکمڕانی سۆران پێکهاتووە. هەروەها لەگەڵ سەرکردایەتی مەملوکەکان، کە بەدوای هەڵدا دەگەڕا، لۆژیکی مەسەلەکان وای دەسەپاند، کە هەر سیستەمێک دەبێت هاوپەیمانی سەرکردایەتی میسری بێت لە شامدا، کە هاوکاری لە بەرەنگاربوونەوەی پرۆژەی عوسمانی دەکرد، کە دەیویست هەموو لایەن و هێزەکان پەکبخات و دەسەڵاتی راستەوخۆی خۆی بسەپێنێت، بەسەر عیراق و کوردستاندا، لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە هەندێک نامە لە بەغداوە بۆ بازرگانی وڵاتی شام ناردراوە، کە هەواڵی رێککەوتنی مەمالیکەکانی داود پاشای لەگەڵ هۆزەکان تێدایە و کۆبوونەوەیان لەگەڵدا کراوە، کە ژمارەیان دەگاتە ٣٠ هەزار پیاو. ئەمانە، توانیویانە دەست بەسەر شاری هەولێردا بگرن و هەروەها کەرکووکیش بگرن و بەرەو موسڵ دەخشێن، بۆیە والی موسڵ فەرمانی دا، کە ئەوکات (متسلم) حوکمی موسڵی دەگرت، واتە جێگری والی کە (محمد سعید آل یاسین المفتي) بوو کە پردی موسڵ بتەقێنێتەوە تاوەکو سوپاکە نەگاتە موسڵ، پاشان بەڵگەنامەکە زیاتر مەودای فراوانبوونی ئەم پرۆژەیە دەکات تاوەکو سەرتاسەری عیراق بگرێتەوە. تێیدا دەڵێت: "وا دیارە ئەم سوپایە دەیەوێت بەغدا

داگیربکات و بگاتە شاری بەسرەش، ئەم جوولانەوەیەش لاوەکی نییە، بەڵکو جوولانەوەیەکی مەودا فراوانە تەنها بە گشتی سوپای سوڵتان خامۆش دەکرێتەوە، بۆیە دەکرێ ئەم تێروانینەمان هەبێت، کە سوپایەکی ٣٠ هەزار کەسی جەنگاوەر، هێزێکی ئاسایی نییە، بە گوێرەی ئاماری سوپای ئەو سەردەم، بۆیەش تێکشکاندنی، پێویستی بە سوپای سەرۆکی دەوڵەتی مەرکەزی عوسمانییە، تاوەکو توانا و هێز و باش مەشق و چەکسازی بزانێت، بۆیە دەبێت ئەوە بڵێین، کە میرنشینی سۆران لەم سەردەمەدا پێشکەوتنی باشی لەبواری سەربازی بەخۆوە بینی، بە توانا و خۆماڵییەکان توانی ژمارەیەکی زۆر تۆپی قورس دروست بکات، ئەگەر ئەم میرنشینە لەگەڵا مەمالیک هاوپەیمانیەتی گرێدا، کە شارەزایی سەربازی کەڵەکەبوویان هەیە و لە جەنگی فەزایە فراوانەکان شارەزان هەروەها هێزی هۆزە عەرەبەکانیشیان لەگەڵ بێت، ئەم جۆرە هێزە زۆر باڵادەستی و مەترسی دەبێت.

لە ئەرشیفی ناوبراودا، چ بەڵگەنامەی دیکەمان نەدۆزییەوە، کە چارەنووسی ئەم پرۆژە گەورەیە روون بکاتەوە، بەلام دەزانین بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان، کە پرۆژەکە نەگەیشتە ئامانجەکانی بەهۆی زۆر هۆکار، کە هۆکاری ناوەکی و دەرەکی بوون، لەلایەک عەلی رەزا پاشا کە والی بەغدا بوو، توانی شۆرشی بەغدادییەکان کپ بکاتەوە بە توندوتیژی و تۆپی تێدا بەکارهێنا، بەمەش مۆڵگەی شۆرشگێرەکان خامۆش کرا، کە رێگە خۆشکەری هێزی هاوپەیمانی داهاتوو دەبوون، لەلایەکی دیکەوە دەوڵەتی عوسمانی توانی (متسلم) والی موسڵ کە بێ هێز بوو، یەکێکی دیکەی تەڵەکەبازی لە شوێن دابنێت، کە زیاتر بە توانا بوو ناوی (اینجە بیرقدار) بوو توانی دەسەڵاتی خۆی لەسەر ناوچەکانی جەزیرە بڵاو بکاتەوە، بەم چەشنە رێگای لە فراوانبوونی میرنشینی سۆران رووەو رۆژئاوا گرت، ئەمە جگە لەوەی مەسەلەیەکی دیکەی مەترسیدار، دەوڵەتی عوسمانی توانی حوکمڕانی محەمەد پاشا برووخێنن، ئەمەش بەهۆی سیاسی بوو، نەک سەربازی، هەروەها بەهۆی ئەم والییە تازەوە عوسمانییەکان بوونی سەربازییان لە هەولێر پتر کرد، لە بەڵگەنامەی بەهاری هەمان ساڵی ناوبراودا هاتووە، کە (سادق پاشا) کە سەرکردەیەکی عوسمانی بوو، لە هەولێر نیشتەجێ بوو لەگەڵ هەزار سەربازی غەیرە نیزامی بوو، بەمەش پرۆژەی ناوبراو، کە مەزەندەی بۆ دەکرا هەڵوەشێندرایەوە کە دەکرا گۆڕانکاری زۆر لە عیراقی ئەو کاتدا بکات، ئەمە جگە لەوەی پرۆژەی کوردی - عەرەبی - مەملوکی پووچەڵ کردەوە، کە دەیویست سیستەمێکی حوکمڕانی تازە لە عیراق دروست بکات.

تێبینی: نەبوونی (نامە) و (رێککەوتن)ەکانی نێوانی پاشای رەواندز و پاشای میسر (محەمەد عەلی پاشا) لەم شوێنەی بەرێز د. عیماد عەبدولسەلام رەئوف باسی دەکات. بەو مانایە نییە کە پەیوەندی سیاسی لەنێوان ئەم دوو پاشایەدا نەبووە، رووداوەکان و ئامانجەکانی ئەم پاشایانە زۆر روونە، ئەوەی پاشای رەواندز کردوویەتی رێک ئەوەیە کە ویستوویەتی کوردستانێکی سەربەخۆ دابمەزرێنێ و پاشای میسریش محەمەد عەلی خەریکی خۆ رزگارکردنی تەواو بووە لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان، ئەم ئامانجانە و زۆر هۆی تر ئەم دووانەی لێک نزیک کردووتەوە و پەیمان بەستنەکەشیان زۆر لە مێژوونووسان باسیان کردووە (ئ. هـ).

*

# میرنشینی سۆران لە سەدەی نۆیەمی کۆچی/ پازدەی زایینی

رابیعە فەتاح خۆشناو
کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

ئەگەر بمانەوێ لە سەدەی نۆیەمی کۆچی/ پازدەی زایینی باس لەو هێزە سیاسییە کوردییە بکەین، کە لە ناوچەی سۆران و دەوروبەری هەبووە، رووبەرووی گەلێ پرسیار دەبینەوە. چونکە لە سەدەی هەشتەمی کۆچی/ چواردەی زایینی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان باسیان لە میرنشینی زرزاری کردووە، کە وەکو میرنشینێکی بچووک لە چیاکانی رۆژهەڵاتی روانیویەتە هەرێمی ئازەربایجان. لەناوەڕاستی سەردەمی عەباسییەکاندا سەرۆک خێڵە زرزارییەکان ئەو میرنشینەیان دامەزراندووە و قەڵای خەفتیان- هاودیان- مەڵبەندیان بووە[1].

سەرباری ئەوە گەلێ قەڵای دیکەیان لەو ناوچەیەدا هەبووە، لەوانە بەرازگرو رستاق و ئاکریساو سونج و سیدەکان و ئاشنە -شنۆ- لەماوەی ژیانی (ئیبن فەزلوڵڵای عومەری)ی مێژوونووسی سەردەمی مەملوکی لە میسر نەجمەددین باشاک حوکمی گێڕاوە، دواتر (جیدە)ی کوڕی، ئینجا عەبدوڵڵای کوڕی جیدە حوکمی گێڕاوە، نەجمەددین باشاک قەڵاو دژەکانی لەنێوان کوڕو براو میرە نزیکەکانی دابەش کردووە[2].

هەرچی قەڵای خەفتیانە بەدەست تاجەددینی برای نەجمەددینەوە بووە، قەڵای سونجیش بەدەستی عیسای کوڕی باشاک و ئاکریسا بەدەست کوڕێکی دیکەی بووە، هەروەها بەرازگریش بەدەست بەهائەددین یوسف زرزاری و قەڵای سیدەکان بەدەست میر عەلی کوڕی حوسامەدین زرزاری و ئاشنە (شنۆ) بەدەست عەلی کوڕی زرزاری بووە[3]. هەروەها گوندی باڵەکانیش سەر بەمومتەلەکاتی میرنشینی زرزاری بوودو سێ سەد پیاویان هەبووە، کە پاسەوانییان لە خان کردووە[4]. لەمەوە روونە قەڵای خەفتیان و دەوروبەری بەتایبەتی بەڵای باکوورو رۆژهەڵاتییەوە بەدەست خێڵی زرزارییەوە بووە، دواجار بەخەفتیانی زرزاری ناسراوە[5]. ئەوەی لێرەدا پێویستە روون بکرێتەوە، ئەو ماوەیەیە کە تیایدا میرنشینی زرزاری وەکو هێزێکی سیاسی پووکاوەتەوەدو دواتر میرنشینی سۆران جێگەی گرتۆتەوە، بۆمان دەرکەوت لە سەدەی هەشتەمی کۆچی/ چواردەی زایینی بەهۆی بوونی میرنشینی

زرزاری هیچ میرنشینێکی دیکە لە ناوچەکەدا هەڵنەکەوتووە، کەچی لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆیەمی کۆچی/ پازدەی زایینیدا لەکاتێکدا کوردستان پڕ بووە لەململانێی هێزە سیاسییەکان، زۆر کەم باس لەمیرانی زرزاری کراوە، لەو کاتەدا تەواوی کوردستان بەململانێی تەیمور لەنگ و سوڵتانی جەلائیری و قەرەقۆینلۆ کاریگەر بوون(٦).

لەو بارەوە گرنگە باس لەقەڵەمڕەوی هەردوو میرنشینی زرزاری و میرنشینی سۆران بکەین، یا ئەوەتا سنووری قەڵەمڕەوەکەیان بزانین، بەو پێیەی ناوچەی قەڵەمڕەوی هەردووکیان یەکە، هەروەک باسمان لەقەڵەمڕەوی میرنشینی زرزاری کرد کە لەچیاکانی رۆژهەڵاتی هەولێر تا سنووری هەرێمی ئازەربایجان کشاوە. هەرچی قەڵەمڕەوی میرنشینی سۆرانە لەشەقڵاوە تا قەڵای خەفتیان و دەشتی ئەو دوو ناوچەیەو دەربەندی گەورە (گەلی عەلی بەگ)ی گرتۆتەوە(٧). لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ هەردوو میرنشین مەڵبەندی سەرەکییان لەلایەکەوە زۆر نزیک بووە، لە رووی زەمەنیشەوە روونە سەرەتا میرنشینی زرزاری لە ناوچەکە بالادەست بووە، کە لەسەردەمی عەباسییەکانەوە هاتۆتە کایەوە، دواتر لەماوەی ژیانی عومەریی مێژوونووس، واتا سەدەی هەشتەمی کۆچی/ چواردەی زایینی میرنشینی سۆران باسی لێوە کراوە وەکو دەرەبەگایەتییەک، کە ناوچەیان لەقەڵەمڕەودا هەبووە، سنووری زیاتر بەلای رۆژئاوادوەیە، واتا بەلای قەڵای هەولێردا کشاوە.

هەرچی شەرەفخانی بەدلیسییە بەجۆرێکی دیکە باس لەدامەزراندن و میرانی سۆران (سهران) دەکات، پێی وایە ئەو میرنشینە لەلایەن (کەلۆس)ەوە دامەزراوە، کە رەچەڵەکی بۆ گەورە پیاوێکی عەرەبی بەغدا دەگەڕێتەوە، تا دواجار لەهاودیان دانیشتووەو پاشان هەر سێ کوڕەکەی قەڵاکانیان خستۆتە ژێر رکێفی خۆیان، سەبارەت بەناوی سۆرانیش، شەرەفخان پێی وایە لەو کاتەی ئەو قەڵایەیان داگیرکردووە، کە بەردەکانی ژێری سوور بوون، پێیان گوتوون خەڵکی بەردە سوورەکان، تاپێیان گوتوون سوورییەکان، دواجار بۆتە سوورەکان یان سۆران(٨).

لەراستیدا ئەم سەرگوزشتەیەی شەرەفخان سەبارەت بەدامەزراندن و میرانی میرنشینی سۆران جێگەی هەڵوەستەی زۆرە، زرار سەدیق پێی وایە سەبارەت بە سەرهەڵدانی میرنشینی سۆران و دامەزرێنەرانی ناکرێ پشت بەو گێڕانەوەی شەرەفخان ببەسترێ(٩)، لەلایەکەوە شەرەفخان هەروەک چۆن رەچەڵەکی میرانی دیکە دەگەڕێنێتەوە بۆ سەر رەچەڵەکی عەرەب، بەهەمان شێوە میرانی سۆرانیش دەگەڕێنێتەوە سەر رەچەڵەکی عەرەبان، هەروەها دەبێ بزانین دیاریکردنی مێژووی سەرهەڵدانی میرنشینەکە نەکەوتۆتە چوارچێوەی رووداوە مێژووییەکان و ئەو سەرچاوانەی لەو سەردەمەدا هەبوون بەو جۆرە باسیان لەو رووداوانە نەکردووە.

گومان لەوەدا نییە بەر لەوەی میرانی سۆران لەگۆڕەپانی سیاسیدا وەکو میرنشینێکی سەربەخۆ دەربکەون، خێڵێکی گەورە بوون و لە ناوەڕاستی سەدەی هەشتەمی کۆچی/ چواردەی زایینی ناویان هاتووە(١٠)، بۆیە دوای ئەوەی رۆڵی سیاسیی زرزارییەکان لە ناوچەکەدا پاشەکشەی کردووە، سۆرانییەکان توانیویانە جێگەیان بگرنەوەو میرنشینێک دابمەزرێنن(١١)، لەمەوە مەبەست لەو پرسیارانەیە کە دێنە ئاراوە، لەوانە ئایا چ پەیوەندییەک لەنێوان میرانی زرزاری و سۆرانی هەیە؟ ئایا میرانی سۆران خودی پاشماوەی میرانی زرزارین؟ ئایا میرانی سۆران لە سەرکردە سەربازییەکانی زرزارییەکانن؟ ئایا بێ هیچ کێشە ئەو میرنشینە (سۆران) هاتۆتە کایەوە؟ ئایا میرنشینی زرزاری چۆن پاشەکشەی کرد؟ ئەو پرسیارانەو بگرە پرسیاری دیکەش هەن کە لەئەڵقەی نێوان زرزاری و سۆرانی ونن، بەتایبەتی لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆیەمی کۆچی/ پازدەی زایینیدا، لەلایەکی دیکەوە لەنێو مێژووی هێزە سەرەکییەکانی تەیمور لەنگ و جەلائیری و قەرەقۆینلۆ کە لەناوچەکەدا دەسەڵاتدار بوون، ناتوانین ئەو ئەڵقەیە روون بکەینەوە، چونکە ئاماژەیان پێ نەکراوە.

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆیەمی کۆچی/ پازدەی زایینی لەکاتێکدا خێڵی ئاق قۆینلو توانیویانە بەسەر قەرەقۆینلو سەرکەون و تەواوی کوردستان بخەنە ژێر رکێفیان، سیاسەتێکی توندیان دژی میرانی کورد گرتەبەر، دەستیان بەهێرش کرد بۆ سەر میرنشینەکان، چەندین میریان ئاوارەو دەربەدەر کردو چەندیان بەپلان کوشت. ئەو سەردەمە بۆ دەسەڵاتە کوردییەکان لەمێژووی ناوەڕاستدا، تاریکترین سەردەمە. لەساڵی (٨٧٣ک/١٤٦٨ز) ئوزون حەسەن سەرداری ئاق قۆینلو لەشکرێکی گەورەی نارده سەر قەڵای خەفتیان، میر رۆستەمی ئەوران حوکمڕانی قەڵاکە، بەرگرییەکی بێ وێنەی نواند، لەئەنجامدا لەشکری ئاق قوینلو شکستی خوارد[١٢] دەبێ ئەوەش بزانین ئوزون حەسەن توانی زۆربەی زۆری قەڵاو میرنشینە کوردییەکان بگرێ و میرانی کورد دەربەدەر بکا، تەنها لەقەڵای ئەوران و ئامێدی نەبێت شکستی خوارد. وەک دەردەکەوێ میر رۆستەمی ئەوران خاوەن هێزێک بووە، دەتوانین بەسیاسی ناوی ببەین، لەکاتێکدا لەپلەی میرایەتی بووە، بۆ خۆشی خەڵکی ئەورانە، کە شەرەفخان بەئەوان باسی ئەو ناوچەیەی کردووەو محەمەد عەلی عەونیش پێی وایە ئەوان نییە، رەوانە کە شاری رەواندزی ئێستایە[١٣].

بەو پێیەی لەشکری ئاق قۆینلو بەچەندین سەرکردە و هێزی زۆرەوە نەیتوانیوە قەڵاکە داگیر بکات. بۆیە دەردەکەوێ سوپای میر رۆستەمی ئەوران لەرووی رێکخستنەوە بەتوانا بووە، دیاریشە قەڵاکە زۆر سەخت بووەو ئاسان نەبووە، لەشکری ئاق قۆینلو تیایدا شەڕ بکات، بۆیە لەگەڵ ئەوەی نەبوبەکری تەهرانی لەو قەڵایە دواوە، بەهەمان شێوە شەرەفخانی بەدلیسی باسی لێوە کردووە، زۆر رێی تێدەچێ قەڵای ئەوران و ئەوان یەک قەڵابن، هەروەها میر رۆستەمی ئەوران وەکو میرێک لە ناوچەکەدا حوکمی گێڕاوە، بۆیە ئەمانە دەری دەخەن کە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆیەمی کۆچی/ پازدەی زایینی میرنشینی سۆرانی بەهێز ئامادەیی هەبوویێت[١٤].

سەرچاوە و پەراوێزەکان:

١- البغدادي: مراصد الاطلاع على اسماء الامكنة والبقاع، تحقيق وتعليق، علي محمد البجاوي، دار المعرفة، بيروت ١٩٥٥، ١/ ٤٧٥. د. زرار صديق توفيق، كردستان في القرن الثامن الهجري، مؤسسه موكرياني، هەولێر ٢٠٠١، ص١٦٨.
٢- ابن فضل الله العمري: مسالك الابصار في ممالك الامصار، مخطوطة مصورة بالمجمع العلمي العراقي عن نسخة دار الكتب المصرية رقم (٩٥٥) جزء ٣، ص١٢٩-١٣١. القلقشندي: صبح الاعشي في صناعة الانشاء، شرح وتعليق محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٨٧ جزء ٤ ص٣٧٦، جزء ٧، ص٣١٠.
٣- ابن ناظر الجيش: تثقيف التعريف نسخة مصورة على المايكرو فلم، رقم (١٧٩٧) مكتبة الدراسات العليا، كلية الاداب، جامعة بغداد. ص٣٧-٤٦، القلقشندي: صبح الاعشي، جزء ٧، ص٣١٠.
٤- العمري: مسالك الابصار جزء ٣، ص١٣٠، القلقشندي: صبح الاعشي، جزء ٤، ص٣٧٦.
٥- ياقوت الحموي: معجم البلدان، دار صادر، بيروت ١٩٧٧، جزء ٢، ص٣٨٠.
٦- بڕوانە: رابیعە فەتاح شێخ محەمەد: کوردستان لەسەدەی نۆیەمی کۆچی/ پازدەی زایینی، وەزارەتی رۆشنبیری، ٢٠٠٥.
٧- ابن فضل الله العمري: مسالك جزء ٣، ص١٢٩. زرار صديق، القبائل الكردية، مجلة گولان العربي، عدد ٦٢، قسم٤، ص٦٤.
٨- شرف خان البدليسي: شرفنامه، ت، محمد جميل الملا الروژبياني، مؤسسة موكرياني، اربيل، ٢٠٠١، ط٢، ص٤٥٣-٤٥٥.
٩- زرار صديق: كردستان في القرن الثامن الهجري، ص١٦٩.
١٠- ابن فضل الله العمري: مسالك ٣/ ص١٢٩-١٣٠، ابن فضل الله: التعريف بالمصطلح الشريف، ت، محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية، ١٩٨٨ ص١٤٩.
١١- رابیعە فەتاح شێخ محەمەد: ل٣٣٠.
١٢- ابوبكر طهراني: كتاب ديار بكر ب، تصحيح: نجاتي لوغال و فاروق سومر، كتابخانة طهوري، (تهران ١٣٥٦ ه.ش) ج٢، ٥٣٧.
١٣- شرف خان البدليسي: شرفنامه ص٤٥٣، رابیعە: س.پ. ل، ص٣٣٠.
١٤- رابیعة فەتاح: س. پ. ل، ٣٣٠-٣٣١.



# نامەیەکی محەمەد پاشای ڕەواندزی بۆ سوڵتان مەحموود

عەبدولڕەقیب یوسف

زستانی ١٩٩٥- ١٩٩٦ حەفتا و پێنج ڕۆژم لە بەیانییەوە تا ڕۆژئاوا لە مەڵبەندی بەڵگەنامەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە ئیستەمبۆل بەسەربرد، کە دوو سەد و پەنجا ملیۆن بەڵگەنامەی تێدایە. بەڵگەنامەیەکی زۆرم فۆتۆکۆپی کورد لە بارەی کوردەوە. لەوانە: دەوری پەنجا بەڵگەنامە لە بارەی محەمەد پاشای ڕەواندزی و شۆڕشەکەی، واتە ئەم نامەی محەمەد پاشا بوو، کە لە ڕۆژی ١٩٩٦/٢/٤دا فۆتۆکۆپیم کرد و لە هەموو بەڵگەنامەکانی دیکە پتر کەیفم پێ خۆش بوو. هەروەها ئەو بەڵگەنامەیەی فەرمانی سوڵتانی تێدایە بۆ خنکاندنی محەمەد پاشا لە دەریای ڕەشدا.

نەمزانیوە هیچ کوردێک

توانیبێتی ئەو بەڵگەنامانەی فۆتۆکۆپی کردبێ و بە دەستی خستبێ تەنیا یەکیان نەبێت: لەوانە (١٢٢) بەڵگەنامە لە بارەی بەدرخان و ئەدی شێردەوە بوون، کە لەم (١٢٢) بەڵگەنامەم دانەیەکی دووەم لەسەریان فۆتۆکۆپی کرد و دام بە بەڕێز مەلا عەبدوڵلا وارلی تا بۆمی وەرگێڕێ بۆ سەر زمانی کوردی، بەڵام مخابن لە مانگی نیسانی رابردوودا زانیم مەلا عەبدوڵلا هەموویانی داوەتە خەڵکێکی دیکە تا گەیشتوونەتە دیمەشق و دهۆکیش. ئەوەش بە پێچەوانەی ئەخلاق و ئەمانەتی زانستییە، بەڵام تا ئێستا نەمزانیوە بڵاویان کردبێتەوە، چونکە نەیانتوانیوە بیخوێننەوە و وەریگێڕن بۆ سەر زمانی کوردی و هەندێکیانیم ئاگاداریش کردەوە و قەناعەتیان کرد، کە بەڵگەنامەکانی منە، چونکە نیشانم کردوون.

ژمرەی ئەم نامەی محەمەد پاشا لە مەلبەندەکەدا لە ریز ئەم ژمرەیە دایە: (A/36188/H0H).

#### وێنەی نامەکە

نامەکە بە زمانی فارسی لەسەر کاغەزێکی ئەستوور بە قەبارەی (٤٢×٣٠سم) نووسراوە بەشی زۆری راستەوراست لە سەر رووی کاغەز نووسراوە و لە ژێرەکەی ئەم ئیمزایەی محەمەد پاشا هەیە: (بندە محمد میر رەواندز) و لە تەنیشت دەستە راستەکەی ئەم ئیمزایەی مستەفا بەگی باوکی هەیە (بەندە مصطفی میر دمدم (قبلا؟)لەسەر تەنیشتی راستی کاغەز پاشماوەی نامەکە نووسراوە بە شێوەی سەروبن، کە ئەو رێبازە بە شێوەیەکی جوانی ئەوکاتە دەژمێردرا، لە ژێر ئەم بەشە واتە لە کۆتایی نامەدا تەنیا ئیمزای محەمەد پاشا هەیە (بندە محەمەد میر رەواندز) و لەژێر ئیمزاش مۆری هەیە (١١×١١ملم) و هەمان مۆر لەسەر نامەیەکی دیکەی هەیە، کە بۆ سوڵتانی عوسمانی نووسیویەتی بە مێژووی ١٧ی رەمەزانی ساڵی ١٢٤٦ و چەند نامەیەکی دیکەی محەمەد پاشاشمان لەلا هەیە.

مێژووی نامەکە ١٢٣١ک (=١٨١٦ز)، کە ئەم مێژووە لەسەر پشتی نامەکە یان ئەو کاغەزەی لێ پێچرابوو هەیە. ئەوانەی شارەزاییان هەیە لە بواری بەڵگەنامەکاندا دەزانن زۆرجار مێژوو هەروەها ناوی ئەو کەسەی بۆی ناردراوە لەسەر پشتی بەڵگەنامە یان زەرفەکەی دەهاتە نووسین، کە ئەمە بە بزربوونی زەرفەکە، واتە ئەو کاغەزەی لێی دەپێچرا. مێژوو و ناوی ئەو کەسەی بۆی ناردراوە لە نێوچووە، ئەم رێبازە هەڵەیە بوتە هۆی پەیدابوونی ئەم کەموکورییە لە زۆر بەڵگەنامەدا و نرخێکی زۆریان لە دەست داوە.

مۆری سێزدە سەرۆک عەشیرەتی سەر بە میرنشینی سۆران لەسەر ئەم نامەیە هەیە. ئەمەش گرنگییەکی مێژوویی هەیە لە ناسینی ناوی ئەو سەرۆکانە، کە لە مۆرەکانیاندا نووسراوە، لە غەیری ئەمەش ئیمزاکردنیان دەبێتە هێزێک بۆ شکایەتی محەمەد پاشا لە دەستدرێژکرنەوەی ئێران بۆ سەر میرنشینی سۆران و عەشایرە کوردەکان و بۆ داخوازی کردنی پشتگیری کردنی دەوڵەتی عوسمانی، هەروەها ئیمزاکردنیان لە نرخی مێژوویی ئەم بەڵگەنامە بە نرخە زیاد دەکات و دەبێتە بەڵگەش بۆ ئەوەی میری سۆران بیروڕای پیاوە گەورەکانی میرنشینەکەی لە کەمەوە هەندآ جار وەری دەگرت و راوێژی پێیان دەکرد لەکاروباری گرنگدا، لەنامەکە دەزانرێت ئەم میرە کوردە، کە خەباتی کرد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی، بە چاوێکی فراوانتر لە میرنشینەکەی خۆی تەماشای کوردستانی کردووە لە دەستدرێژکردنی ئێراندا، کە باسی کەرکووک و زەهاو و قەڵاچۆڵان و سورداش و بازیان و قەرەداغ و ناوچەکانی عەشیرەتی جاف (لە پێنجوینەوە تا شاخی حەمرین) و کۆی (کۆیسنجەق)، هەروەها هەولێر و مەردین (ماردین) و دیاربەکر و موسڵ و تا سنووری بەغدا، کە ناوچەکانی خانەقین و بەلەدرووز و مەندلی دەگرێتەوە. بێگومان ئەمە خاڵی نییە لەبیرکردنەوە فراوانەی

محەمەد پاشا و ئامانجی دوارۆژی، ئەمەش لە هەمان کاتدا بەرگرییەکی ئەوە لە کوردستان دژی کوشتن و برین و وێرانکردن و تالانکردن و دیلکردنی ژن و منداڵی کورد لە لایەن ئێرانەوە، ئەمەش نرخێکی گەورە دەبەخشێ بەم بەڵگەنامە گرنگە.

**ئیمزاکان**

ئیمزای ئەو سەرۆک عەشیرەتانە بریتییە لەنێو رستەی (رئیس عەشیرت...) و مۆرەکەی واتە مۆر (ختم) لێرەدا بەشێکە لە ئیمزا، چونکە سەرۆکی عەشیرەت ناوی خۆی بەجیا لەوەی لەسەر مۆرەکە هەڵکەنراوە، دەنا ئیمزا (امضاء) و مۆر (ختم) لە یەکتر جیان لە هونەری ئیمزا و مۆر و (طغراء) (توقیع) و (توشیح)دا، وەک ئاماژەم پێکردوون لە وتارەکەمدا: "مۆرە بچکۆلە و توغرای شەرەفخانی بدلیسی) لە ژمارە (٦٥) (رامان)دا ساڵی ٢٠٠١."

لێرەدا ناوی سەرۆکەکانم لە مۆرەکانیان وەرگرتووە و نووسینەکانی سەر مۆرەکانیش دەنووسم، بەڵام ئێستا دڵنیانیم لە خوێندنەوەی هەندێ لە نووسینەکانی سەر سێ لەو مۆرانە تا کاتێکی دیکە لەگەڵیان هەوڵ دەدەم بە تایبەتی کاتی بەڵگەنامەکانی سەبارەت بە محەمەد پاشا دەکەم بە کتێبێکی سەربەخۆ.

١- سەرۆکی عەشیرەتی باڵەک مستەفا (رئیس عشیرت بالک مصطفی) نووسینی مۆرەکە (مصطفی ١٢٢٥؟).

٢- سەرۆکی عەشیرەتی شێروانی حەسەن بەگ کوڕی محەمەد (رئیس عشیرت شیروان حسن بیک ابن محمد) مۆرەکەی (الله محمد حسن بیك ابن).

٣- سەرۆکی عەشیرەتی برادۆست عومەر کوڕی محەمەد (رئیس عشیرت برادوست عمر ابن محمد). مۆرەکەی «ابنده خدا عمر ابن محمد».

٤- سەرۆکی عەشیرەتی رەوەندۆک و پیرە سنی مستەفا (رئیس عشیرت روندوک و پیرە سنی مصطفی ابن خالد). مۆرەکەی «بنده خدا مصطفی ابن خالد».

٥- سەرۆکی عەشیرەتی خۆشناو حەسەن؟ کوڕی مستەفا (رئیس عشیرت خوشناو حسن؟ ابن مصطفی) مۆرەکەی «عبد خدا ام؟ حسن؟ ابن مصطفی».

٦- سەرۆکی عەشیرەتی ئاکۆ (رئیس عشیرت اکو...).

٧- سەرۆکی عەشیرەتی سوورچی عوسمان (رئیس عشیرت سوورجی عثمان) مۆرەکەی «بنده منان عثمان».

٨- سەرۆکی عەشیرەتی زراری داود (رئیس عشیرت زراری داود) مۆرەکەی «نظر لطف الهی داود».

٩- سەرۆکی عەشیرەتی گەردی و کوڕێ حەسەن (رئیس عشیرت کردی و کوری حسن).

١٠- سەرۆکی عەشیرەتی سلانە سلێمان (رئیس عشیرت سلانە سلیمان) مۆرەکەی «بنده منان عبده سلیمان».

١١- سەرۆکی عەشیرەتی بلباس باپیر (رئیس عشیرت بلباس باپیر) مۆرەکەی «نظر لطف الهی باپیر».

١٢- سەرۆکی عەشیرەتی مزوری (مزوری ژووری) باپیر (رئیس عەشیرت مزوری باپیر) مۆرەکەی «عبده باپیر ١٢٣٠».

١٣- سەرۆکی عەشیرەتی زێباری ئەحمەد (رئیس عەشیرت زیباری احمد) مۆرەکەی «بنده خدا (ی عالم؟)احمد».

شایانی باسە دەوری شەش حەوت ساڵ لەمەوبەر، دانەی ئەم نامەیەم دایە بەڕێز دکتۆر (نەجمەدین سنەیی) تا وەری گێڕێ بۆ سەر زمانی کوردی، بەڵام تەواوی نەکرد و چوو بۆ دەرەوە و مانگی حوزەیرانی ئیمساڵەی (٢٠٠٥)یش دامە بەڕێز مامۆستا (کیۆمەرس عەبدولغەفور)، کە هەردوو زۆر شارەزای فارسین، بەڵام لەبەر سەختی شێوەی نووسینی نامەکە هەندێ وشە بۆ هەردووان نەهاتووتە خوێندن لەبەر ئەمە وەرگێڕانەکەشی تەواو نییە و ماوەی مامۆستا (کیومرث)یش نەبوو زۆرتر

خۆی پێوە ماندوو بکات.

ئەم ڕۆژانە من دەقەکەیم نووسی و ناردم بۆ بەڕێزان کاکە حەسەن عەبدولکەریم محمد و کاکە کۆسار فەتاحی مەریوانی ئەوانەش هەندێ هەڵەیان تێدا دۆزییەوە، بەڵام هەمووومان دڵنیا نەبووین لە خوێندنەوەی هەندێ وشە و نەهاتە زانین، کە نیشانەی (؟) لە تەنیشتی ئەوانەم داناوە و ڕەنگیشە هەندێ وشە، هەیە بە ئەسل بە هەڵە نووسرابن و لاوازی زمانەوانی لەلای نووسەرەکەیەوە بەدی دەکرێت و هەندێ تەعبیری کوردیشی تێ خستووە، وەک (شەڕوشۆڕ) و (ماڵ و منال).

### ناوەڕۆکی نامە

میری سۆران محەمەد پاشای ڕەواندزی لە ساڵی سێیەم لە دەسەڵاتی خۆیدا ئەم نامەیەی نووسیوە بۆ سوڵتانی عوسمانی مەحموودی دووەم (١٨٣٩/٨/١٨) تێدا نووسیویەتی، عەباس میرزای کوڕی شای قاجار (فتحعلی شا) و حاکمی ئازەربایجان، پەلاماری میرنشینەکەی داوە و هەندێکی لێ داگیر کردووە. براکەی (حوسێن عەلی خان)، حاکمی کرمانشا و عێراقی عەجەم، نزیکەی سێ ساڵ، یەک لە دوای یەک لەشکری زۆر دەنێری بۆ سەر هەرێمی بەغدا و داگیری دەکات و دەیسووتێنێ و هەمووو ئەو ناوچانەی تاڵان و وێران دەکات و هەموو جارێ پێنج سەد کەسی لە گەورە و بچووک لە ژن و منالّ ئەسیر دەکات. و بەرەو پایتەختەکەی دەبات وەک ناوچەی زەهاو و قەڵاچوالان و قەرەداغ و سورداش و بازیان و ناوچەی عەشیرەتی جاف و دەوروبەری بەغدا و کەرکوک و ئەو جێگایانەی خەڵکەکە چۆڵیان کردووە، لە ترسی ئەم تاقمە خوانەناسە و هەموو ساڵ وەک ساڵانی پێشوو ماڵباتێکی فراوان و باج و خەراجێکی زۆر بۆ شازادە (حوسێن عەلی خان) ڕەوانە دەکرێت لە لایەن لەشکرەکەیەوە، لەم لاشەوە عەباس میرزا لە حەسادەت و ڕقەبەرایەتی براکەی، کە خۆی لە شاری تەورێز دادەنیشێ، دەیەوێ دەست بەسەر ئەم ناوچانەدا بگرێ، وەک موسڵ و هەولێر و ماردین و دیاربەکر و شوێنەکانی دیکەی ئەو سنوورانە و هێزێکی زۆری پێکهێناوە و هێرشی هێناوەتە سەر عەشیرەتی بلّباس، کە نزیکەی بیست سی هەزار ماڵ و مەڕوماڵاتیانی تاڵان کردووە و خەڵکێکی زۆریشی لێیان ئەسیر کردووە و ئێستا جەنگ کەوتووەتە نزیک هەرێمەکەم ڕەواندز، کە شوێنی باو و باپیرانمە و لەسەر سنووری ڕۆم و عەجەمە و بەوپەڕی سەربەرزییەوە بەرامبەریان وەستاوە.

مەبەستی سەرەکی ئەو تاقمە (واتە عەباس میرزا، ئێران) ئەوەیە، خراپی بکەن و ئەنجام بە دڵی ئەوانە بێت، کە هەر کاتێ ڕەواندز بکەوێتە دەستیان داگیرکردنی جێگاکانی دیکە بۆیان ئاسانتر دەبێت، ڕەواندزیش ئەوپەڕی قاییم و سەختە. ساڵی پار دوو سێ لە فەرماندەکانی ئازەربایجان سوپاو خەڵکێکی زۆریان هێنایە سەرم و بە هەموو توانا و هێزەوە بەرامبەریان شەڕم کرد و وەستام، بەڵام نیوەی ناوچەکەم کەوتە بەردەستیان و سووتاندیان و قەڵای (تبر؟) یان داگیرکرد و بە سەرباز و تفەنگچی و بە تۆپ و خۆراکەوە تێدا دامەزران. کاتی زستان بە فرسەتمان زانی و هێرشمان کردە سەریان و توانیمان قەڵاتەکە داگیر بکەین، ئێستا پڕوپاگەندەی شازادە ئەوەیە لە وەرزی بەهاردا هێرشێکی تر بکاتە سەرمان.

ئێستا جەماوەری عولەما و فوقەها و ساداتی هەرێمەکە هەموو بە یەک دەنگ ئامادە بوون و هاتوونە لام تا شکات و سکاڵای خۆیان سەبارەت بەم هێرشە و دەستدرێژکردنانەیان بۆ سەر ژن و منداڵیان ڕاگەیەنن و لەبەر ئەمە دەڵێن شکات و سکاڵامان دەبەینە لای پادشای ئیسلام و خۆتان دەزانن زەبت و ڕەبتی ئەم هەرێمە و ئیدارەی سنوور و پاراستنی عەشیرەتەکان بە من و بنەماڵەمان لە لاتانەوە ڕاسپێردراوە و خەڵکیش ئامادەن فەرمانەکانتان جێبەجێ بکەن و

گیانی خۆیان لەم ڕێگایەدا ببەخشن و منیش لە هاتوچۆی عولەما و سادات بۆ خزمەتی جەنابتان بەرم گرت و باشترم زانی عەرز و حاڵەکەیان ڕەوانەی خزمەتتان بکەم، لەگەڵ (حاج الحرمین الشریفین حاجی حەسەن) تا پاش گەیاندنی ئەو ڕووداوانە بە جەنابتان دەستوور و فەرمانەکانی پێویست سادر بکەن و ئەم شەڕە لەسەر خەڵکی ئەم هەرێمە لابەرن کە ئەمە دەبێتە هۆی ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەر و ڕزگار کردنی ئێمە. پادشای گەورە هەر کەسێک بەپێچەوانەی ئەمە زانیاری بگەیەنێ پێتان، ئەوە بە تەواوی درۆ و نیفاقە.

هەرچی ئێوە ئەمر بفەرموون، ئەمر ئەمری ئێوەیە و ئێمە ملکەچی فەرمانتانین.

**دەقی نامەکە:**

هو الله المستعان وعلیه التكلان

عرضه داشت كمترین فدویان بموقف عرض باریافتگان قرب حضور فیض گنجور سكندرشان دارا دیوان خسرو پاسبان حضرت ولی النعمی مد ظله العالی میرساند، الهی تامدید زمان و تجدید دوران تاج فخر و كمال و كلاء عظمت واجلال بفرق همایونش رواج كرد و دائما خون عباكون[٢] اناری منحوس و دماء اهل بوادی منكوس غاره، شمشیر ئابدار و سنان جوشن كذارباد برب العباد بعدها یمكن سامعه افروز مقربان باركاء كیوان اشتباه شده باشد، كه یكنفر شهرزاده شاه ایران والي عراق عجم است در بلده كرمانشاهان حاكم است، مقارن به سه سنویبهء متواتره لشكر و قشون وافره برداشته متوجه الكای دارالسلام بغداد گردیده هر ساله تعلقات و حوالی ان مملكتها را تاخت و اتش زده، همهء ولایت هاي ان حدود بتعرض تاراج و نابودي در ؟ورده است علاء بر ان در هربار موازي پانصد نفر از بزرگ و كوچك و ذكور و اناپ را اسیر ساخته بوده عودت به پاي تخت خود شوده است. خلاصه ؟نكه امثال ولایت ژهاب و (قلعه چوالان) و(قرة داغ) و (سورداش) و (بازیان) و (محال جاف) با سایر اطراف و اكناف و كوي تا حدود بغداد و كركوك و باقي جایهاي متروك از خوف و هراس ان طایفه خدا نشناس طوق خدمت گذاري و انقیاد به گردن خود بسته هر سال بعنوان سالیان مالیهء موفور و خراجي از حد و حساب دور انقیاد سركار شهرزادهء مزبور خواهند نمود و از اینطرف تر یكنفر شهرزاده عباس میرزا والي الكاي اذربایجان است و در بلدهء تبریز (شقیه؟).

كشاي شوكت ولایت میباشد و بنا بحسد و حقد برادر عراق، ان هم ضبط و تسخیراینطرفها كه امپال موصل و اربیل و مردین و دیاربكر و سایر انحدودهارا مقرر وجاي كر ساخته و در پاین این، دیار و سنور عجم احشام بلباس كه معادل بیست سي هزار خانوار احشام وایل بوده پي در پي لشكر و قشونها را بر سر ایشان تعین و روانه نموده و انهارا تاخت و تاراج كرده و اسراي موفور و تاراج نامحصور برده از میان برداشتند و نابود ساختند و برباد گردانیدند و سر عداوت و نزاع وابسته ولایت كمترین گریده چه زیرا ره واندز كه جاي اصلی ایندودمان فدوي اركان واز سرحد روم و عجم مكان و اسكان است، جاي است در غایت متانت و استحكام و مقصود كلي انطائفه و خاتمیت فرجام ان است كه، بروقتي رةواندز بقبضه و تسخیر در امده دیگر جاهارا باقتیاد (كه؟) و جاهاي غیره سهل الكار انكارند و در موسم تابستان پارسال دوسه نفر از خوانین ؟ذربایجان قشون و جمعیتي شایان بر سر اینفدوي اركان نمود از یمن تفضلات جانب رب الارباب و از همت القاس پادشاه اسلام پناه بقدر مقدور و میسور دست و پاي زده و بمقابله و مجادله پرداخته، نصفي از ولایت ابن فدوي نشان را (تیر؟) تاخت و ؟تش زده و احراق و قلعه (تبر)[٣] بدست ؟وردي سرباز نفنكفیان باطوب و ازوقة دران گذاشتي در (دبنالة؟) بموسم زمستان فرصت راغنمیت دانستة برسر قلعة مزبور رفته باز بتصرف خود در اوردیم و حال ادعاي توجه شهرزاده بدینطرف موقوف فصل بهار و اعتدال هواست و جمهور علما و فقها و سادات ولایت متفق الكلمه خاطر نمود فدوي اركان شدند كه شكواي حال و ظهور عجز و اضمحلال مال و منال خودرا به نزد پادشاه ظل الله اسلام پناه

خواهیم برد که ضون کمترین اوازه شوکت و طمطراق حضرت ولي النعمي اند گوشزد سامعه، شده بود که کویا حضرت ظل اللهي نظر به کمال استعداد و جوهر قابلیت مادر زاد که از ضنین صداقت این ایشان معاینه شاهد کرد است از وفور مراحم اصفیانه امور مملکت (راهنیامان؟) و تمشیت مهام هر سنور در تقدیم مهمات نزدیك و دور بحضرت ولي النعمي مرفوع و مفوض فرموده اند و ظبط و ربط مملکت و استجلاب احشام و ایلات بادیه نشین و دفع و قلعي مفسدین و طاغیان شقاوت (اکین؟) وابسته، کار و اثار اطوار اسفندیار روزگار گردانیده است و ظاهر است که حصر والي النعمي اند بر کمر بندگي و عبودیت و عباد و خلایق هر بلاد میان بسته از انقیاد اوامر و نواهي واجب التعظیم حضرت ظل اللهي صرف جان و بذل نقدینه روان میفرمایند از حمایت سکان و (صیانت؟) قطان و لمحهء از خود به تغافل راضي نخواهند کشت لازمهء ابتدار تام بظهور رسانند.

بناء علیه مانع رفتن و ذهاب علما و سادات گردیدم که معروضات خود را بعتبهء علیهء حضرت ولي النعمي معروض خواهیم ورزید، فلهذا حاجي الحرمین الشریفین حاجي حسن، بجهت ایصال عریضه و عرض مراتبات و واقعات راهي و روانه حضور مکرمت دستور گردانیدم (لفیکه؟) از استماع اینمعني در توسعه احوال رعایا و برایا مساعي مشکور بخیر صدور مي اورند و بمراسیم (تقویمه؟) کار و مساعدهء خلایق ایندیار و دفع شر و زور انطایفهء صلالت اطوار مدارند که بموجب رضاي جناب باري و خوشنود رسول روز هول رستگاري مي گردد خدیوا کامگارا از هر طرف اگر احدي بغیر درینکه معروض راي عالي است و سفارش و توصیهء مرابه است بمقام عرض در آورده باشند، مطلقا دروغ بلا فروغ گفتهاند و عین نفاق و شلتاق بظهور رسانیده اند اگر چنانچة عین عاطفت (دربار؟) خواست و چشمداري ولایت برهم نهاده و (اکفاجه؟) اغراض و غنود اورند در روز یوم العرصات دهست شکوه و شکات بدامنهء ذات قدسي صفات در اوبخته (قدوم؟) (...) و بر عرض کرد زیر هرضه امر و مقرر گردد منقادیم.

**بنده**

**محمد**

**میر رەواندز**

**پەراوێزەکان**

١- لە ساڵی ١٢٣٠ک (=١٨١٥ز)دا محمد پاشا شەڕی لەگەڵ حەسەن بەگی شێروانی کرد و لە قەڵای (کەکلە)دا ئەسیری کرد کە موکریانی لە (امارە سوران ل٣٧) دا نووسیویەتی، بەڵام نەینووسیوە محەمەد پاشا کوشتوویەتی، ئیتر دیارە بەرەڵای کردووە و کردوویەتی بە سەرۆکی عەشیرەتی شێروان و ئیمزای لەسەر ئەم نامەیەیە، بەڕێز تەحسین شێروانی، کە مودەڕسە لە هەولێر و ئێستا خەریکی دانانی کتێبێکە لە بارەی عەشیرەتی شێروانییەوە، بەمنی وت پاش نەمانی محەمەد پاشای رەواندز و میرنشینی سۆران، حەسەن بەگ شەڕی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی کرد و لەسەر شاخە بەرزی (سەری حەسەن بەگ) لەلای تورکەوە گیرا و لە شاخیانەوە فڕێیان دا و بەم شێوەیە کوشتیان و لەو کاتەوە ئەو شاخە بەرزە لە باکووری رۆژهەڵاتی دیانا بە ناوی (سەری حەسەن بەگ) ناوی دەرکرد.

٢- مەخسەد بە (عباگون اناری) قزڵباشە عەبا سوورە، واتە شیعە - ئێران.

٣- پرسیمان ناوی قەڵاتەکە بۆمان نەهاتە زانین و شوێنەکەش نەهاتە زانین، بەڵام تا ئێستا خەڵکی دێی رۆستێ لە باڵەک و دەوروبەری دەڵێن لە کاتی محەمەد پاشادا، ئێران هێرشی هێنا بۆ قەڵاتی میر سادق لە رۆستێ باڵەک، بەڵام نەیانتوانیوە داگیری بکەن، وەک بەڕێز کاک (موسڵیح هەمزە ئاغا) وەلزی برای شێخ محەمەدی باڵەک بۆ منی وت، کە داوام لێ کردبوو ناو و شوێنی قەڵاتی نێو نامەی محەمەد پاشا لە خەڵکی بپرسێ جا دوورنییە ئەو هێرشەی ئێران هەر ئەوە بێ، کە لە نامەکەدا هاتووە و دوورنییە هێرشەکەی لە رێگای خانێ- حاجی ئۆمەرانەوە هێنابن بۆ سەر میرنشینی سۆران، چونکە وا بزانم هەر ئەو رێگایە هەیە بۆ هێنانەوەی تۆپ.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە ٥ ساڵی یەکەم ٢٠٠٥ وەرگیراوە.**

# سۆرانە پێشینەکان
# لێکۆڵینەوە لە بەڵگەنامە عوسمانییەکان

دکتۆر عیماد عەبدولسەلام ڕەئوف
کۆلێژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین

مێژووی میرنشینی سۆران، شوێنێکی گرنگی لە مێژووی کورددا هەیە، هەر لەکاتی دروستبوونی ئەم میرنشینە، کە دامەزرێنەرەکەی (کالۆس)ە لە سەدەی نۆزدەهەمی زایینیدا، ئەم میرنشینە زۆر دەسکەوتی هەبوو، لەسەر دەستی میرە پشتاوپشتەکانی، کە نەوەی دامەزرێنەری ناوبراو بوون، توانییان دەسەڵاتی خۆیان لە ناوچەیەکی فراوان سەقامگیرکەن، بەرگرییان لە هەرێشەی میرنشینەکانی دیکەش کرد، ئەمە جگە لە هێزی دەرەکی لەوەی لە هەندێک کاتدا سنووری میرنشینەکەیان فراوان کرد و بوون بە هێزێکی سەرەکی، کە ڕۆڵیان هەبوو لە هاوسەنگییە سیاسی و سەربازییە گرنگەکاندا، لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، ئەگەر ئێمە هەندێک زانیاری لەبارەی ئەم میرنشینەوە دەزانین، لەدوا سەردەمی خۆیدا، بەتایبەتی لە سەردەمی میر محەمەد (پاشای گەورە)، بۆیە هەست بە کەموکورییەکی زۆر لە زانیارییە مێژووییەکانماندا دەربارەی سەردەمەکانی دیکەی میرنشینی ناوبراو دەکەین. لەگەڵ ئەوەی مێژوونووسی کورد (شەرەفخانی بەتلیسی) کورتەیەک لە مێژووی دروستبوونی میرنشینەکە باس دەکات و باس لە دەیەی یەکەمی ئەم دەوڵەتە دەکات، تاوەکو سەدەی دەیەمی کۆچی، بەڵام زۆر وردەکاری هەیە لە مێژووی ئەم قۆناغە گرنگەی دروستبوونی، کە پێویست دەکات زیاتر ڕوون بکرێتەوە، هەر کەموکورییەک لە ڕووداوەکانی ئەم سەردەمەدا و پەیوەندی و ناوی میرەکانی و زۆر زانیاریمان لەلا نییە، بۆیە ئەم قۆناغە لە هەموو ڕوویێکەوە، نەناسراوە تەنانەت لەلای مێژوونووسە هاوچەرخەکانیش، کە هەوڵی نووسینەوەی مێژووی ئەم میرنشینەیان داوە، کە دەقی ئەملاوئەولایان پێکەوە گرێداوە و بەڵگەنامەی خۆماڵییان پەیدا کردووە، لەم بارەوە ئەرشیفی عوسمانی گەنجینەیەکی شاراوەیە، کە زۆر لە بەڵگەنامەی فەرمی تێیدا، کە تیشک دەخاتە سەر ڕاستییە شاراوەکان، لە مێژووی سەرەتاکانی میرنشینی سۆران، زۆرتریش لەم بەڵگەنامانە باس لە پەیوەندی میرنشینی سۆران بە میرنشینەکانی دیکەوە دەکات، بەتایبەتی میرنشینی عەباسی لە ئامێدی و بابانییەکان لە دارەشمانە و هەریر و شوێنەکانی دیکە، هەندێک لەو بەڵگەنامانە تیشک دەخەنە سەر ناسنامە و ڕەگەزی میرنشینەکانی و کاروبار و توانا داراییەکانیان، هەندێک بەڵگەنامەی دیکەش ڕۆڵی ئەم میرانە ئاشکرا دەکات لە ڕووی سەربازی لە جەنگی نێوان عوسمانییەکان و ئێرانییەکان و پەیوەندییان بە دەوڵەتی عوسمانییەوە و بە والییەکانی

بەغــدا و جگە لە زۆر کــاروباری گرنگی دیکە.

ئەوەی سەرنج رادەکێشێت کە بەڵگەنامەی عوسمانییەکان بە میرنشینی سۆران کە نەوەکانی (کـالۆس) دایانمەزراند، ناویان نابات، بەڵکو ناوی دیکەی وەک (حوکمڕانی ئامێدی) و (حکومەتی بابان)، بەڵکو هەریەکە و ناوێک وەک (فلان سۆرانی) کە ئاماژەیە بۆ میرنشینەکەی، ئەمەش سەرنج بۆ خۆی رادەکێشێت، ئەمە بێهێزی و بچووکی میرنشینەکە ناگەیەنێت، چونکە بەڵگەنامەکان خۆیان ئاماژە بە ئەرکە بەرگری و داراییەکانی میرنشینە کوردییەکان دەکەن، ئەمە جگە لەلایەنی پرۆتۆکۆڵی کە چۆن سوڵتانی عوسمانی گوتاری رەسمی خۆی بەرامبەر میرەکانی دەخاتە روو.

کۆنترین بەڵگەنامەی باس لە میری سۆران دەکات کە لەم ئەرشیفە دەوڵەمەندەدا هەڵمانبژاردووە، لە ساڵی(١٥٧٣)دا نووسراوە، کە دوای سەدەیەک لە دروستبوونی میرنشینەکە دەرچووە، ئەمەش نەوەی شەشەمی دامەزرێنەری میرنشینی سۆران دەدوێنێت، دەکرێت ئێمە سەدەیەکی دیکە لە تەمەنی دروستبوونی میرنشینەکە زیاد بکەین، وەک گریمانەیەک بەم شێوەیە نەوەی شەشەمی دامەزرێنەری میرنشینەکە دەدوێنێت، هۆی ئەم ئاگادارکردنەوەیەی نێو بەڵگەنامە عوسمانییەکان مەبەست لەو ململانێیەیە، کە لە نێوان سلێمان بەگ و میرەکانی عوسمانیدا دروست بیوو، یان باس لەو میرانە دەکات، کە دەوڵەتی عوسمانی داینابوون، لە لیواکەیان، واتە سەنجەق حوکم بکەن، کە سەر بە ویلایەتی شارەزوور بوون، بەپێی سیستەمی سەربازی دەرەبەگایەتی عوسمانی، کە بە (تیمار) ناسرابوو، هەروەها لە بەڵگەنامەی نووسراوی ٣ی جومادی یەکەمی(٩٨١)ی کۆچی - (١٥٧٣ی زایینی) (دفتر مهمة ٣٥ ص ٦١) حوکمێک ئاراستەی میری میرانی شارەزوور کرابوو ئەمەش پەیوەستە بە (ململانێی نێوان سۆهرانی سلێمان بەگ و میری لیوای ئەونین میر زەینەڵ و میری میرانی لاجان عومەر)، ئەم حوکمە لە دەقەکەیدا هاتووە و دەڵێت: "پێویستە کار لە پێناوی لابردنی هۆکارەکانی کێشە و ململانێکان بکرێت بەتایبەتی لەم کاتەدا، کە دەوڵەتی عوسمانی جەنگی لەگەڵ ئێراندا هەیە"، هیچ ناوێکی میرانی سۆرانمان بەدی نەکرد لەم مێژووەدا تەنها ناوی (سلێمان بەگ) نەبێت، کە کوڕی قولی بەگی کوڕی سلێمان بەگی کوڕی سەیدی بەگی کوڕی عەلی بەگی کوڕی عیسای کوڕی کالۆسە، ئەمە پرسێکە دەکرێت چاوبخشێنینەوە بەوەی کە مێژوونووس ئەمین زەکی بەگ باسی لێوە کردووە، کە دەڵێت: (دوای مردنی باوکی لە ساڵی ١٥٧٦ جێی گرتۆتەوە)، دوورە لەوەی کە مەبەستی سلێمان بەگی باپیری بێت، چونکە ئەم حوکمە بەر لە ساڵی(٩٦٥)ی کۆچییە، کە هاوسەردەمی بەڵگەنامەکان نییە و باس لە قوباد بەگی میری بادینان دەکات، کە حوکمەکەی لە ساڵی (٩٨٤ک) دەستی پێکردووە، ناوبراو زۆر توانا و باڵادەستی هەبووە، بۆیەش دەوڵەت لە کێشە و ململانێکانی بێ دەنگ بووە، تاوەکو لە جەنگی لەگەلا ئێراندا تەواودەبێت، دەوڵەتی عوسمانی ئەوکات خۆی بۆ جەنگێکی سەرتاسەری ئامادە دەکرد، بەتایبەتی لە ناوچەکانی ئازەربایجان، (یلماز اوزتونا: تاريخ الدولة العثمانية ج ٢ص ٣٩٣) لە بەڵگەنامەی نووسراوی ١٥ی مانگی شەوالی ٩٨٤ی کۆچیدا هاتووە باس لە هەندێک لایەنی ململانێی نێوان میری سۆران و میری لیوای لاجان دەکات، کە فەرمانێکی ئاراستە کراوە بۆ میر (سۆهرانی سلێمان بەگ)، تێدا هاتووە کە میری لاجان عومەر پاساوێکی شەرعی لەدەستە، لەلایەن سوڵتان سلێمان خان پێی دراوە و دەقەکەی کە لاجان لە رێگەی منداڵەکانییەوە بۆ لای بچێت پاشان بۆ منداڵەکانی و نەوەکانی وەچە دوای وەچە بێت، بۆی نییە دەست بخاتە نێو هەربەشێک لە

بەشەکانی، ئەگەر وەلامیشی هەبێت، دەبێت ئاگاداری ئەستەمبوڵ بکاتەوە، وادیارە کە سلێمانی ناوبراو لە هەوڵەکانی لەدەست تێوەردانی ئەم ویلایەتە هەوڵی فراوانبوونی میرنشینەکەی دەدا، سوودیشی لە دۆخی ململانێی نێوان عوسمانییەکان و ئێرانییەکان وەرگرتووە، بەڵگەنامەکە ئاماژە بەوە دەکات، کە لە ساڵی ١٥٧٦دا نووسراوە، کە حوکمێک بۆ چەندین میر و کاربەدەستی ئەوکات دەرچووە، کە میری میرانی شارەزوور و بەغدا و دیاربەکر و حاکمی جزیرێ و محەممەد و سەهرانی سلێمان بەگ و حاکمی ئامێدی و قوباد بەگ بوون، حوکمەکەش پەیوەستە بەو نووسراوەی کە بۆ سوڵتان نارداوە، تێدا هاتووە، کە براکەی بەهرام و چەند برای دیکەی گەندەلاً لەوانە عەلی و حەمزە، سەرپێچی دەکەن و واز لە هاندانی خەڵک بۆ یاخیبوون ناهێنن، حوکمەکە وا نووسراوە، کە دەستگیر بکرێن و بەپێی شەرع و بە ڕێکەوتن و یەکگرتن لە نێوان خۆیاندا سزابدرێن، لێرەدا دەبینین سلێمان بەگ بە یەکێ لە میرە دانراو و جێگرەوەی عوسمانییەکان دانراوە، پێش میری بادینان خۆی لەگەڵ ئەوەی ناوبراو نووسەری نووسراوەکەیە، کە بەهۆیەوە پێویستی کردووە حوکمی ناوبراو دەرچێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەو بایەخەی کە میرانی سۆران هەیان بووە، ئەوەی مایەی سەرنج لێدانە دواندنی سوڵتانی عوسمانی بۆ میری سۆران بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بووە، بەهۆی کەسێکی نێوەندەوە نەبووە، هەردەم ئەرکی سەقامگیری و سەربازی بە میری سۆران ڕادەسپێردرا، کە ئەرکەکانی وەک ڕاوەدوونانی لادەران لە یاسا و وەک بەردنگاربوونەوەی کاری تێکدەری، کە دز و چەتەکان دەیانکرد، هەروەها بەڵگەنامە مێژووییەکە، کە لە ساڵی ١٥٧٨ دەرچووە، تێیدا هاتووە: "گومانی تێدا نییە ئەو ڕۆڵانەی دەبێتە هۆی پتەوبوونی پێگەی میرنشینەکە لەلای دەوڵەتی عوسمانیدا، لە مەودای چالاکییە سەربازییەکانیشی لە کوردستاندا زیاد دەکات، لەلایەکی دیکەوە بەڵگەنامەی نووسراوی ساڵی ١٥٧٦ لە مانگی ڕەبیعی یەکەم دەرچووە، باس لە هەندێک لە سامانی میرە سۆرانییە پێشینەکان دەکات، کە وابەستەی باجی کشتوکاڵی بوونە لە کەرتەکانی بەنێوی (خواص همایون) لە کەرکووک و باجی ئەم شوێنانە، کە تایبەت بووە بەپێی سیستەمی سەربازی دەرەبەگی عوسمانی بۆ سوڵتان خۆی بووە، چونکە پارەیەکی زۆری لێ هاتۆتە بەرهەم کە بڕەکەی دەگەیشتە سەد هەزار ئاقچە (پارەیەکی زیوینی عوسمانی) بووە، کە بۆ سوڵتان خۆی بوو، ئەمەش پارەیەکی زۆرە ئەگەر بە باجی بەشەکانی دیکە بەراورد بکرێت، بۆ نموونە لەم بەڵگەنامەیە دەخوێنینەوە، کە حوکمێکی میری میرانی شارەزوور، پەیوەستە بەوەرگرتنی پارەی میرایەتی لەلای سەهرانی حوسێن بەگ، لە حوکمەکەدا هاتووە، کە تەواو پارەکەی وەرگرتووە و بەرپرسیاریەتی خۆی لە بەرامبەر هەندێک لە جووتیارانی ناوچەی کەرکووک نیشان بدات، میرنشینی سۆران وەک لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە، ڕۆڵی دیاریان لە جەنگی عوسمانی ئێرانی هەبووە، هەر ئەو ڕۆڵەش بوو، یارمەتیدەر بوو بۆ توندبوونی پێگە و سەربەخۆیی لە کاروبارەکانی ناوخۆییدا لە بڕیاردەری عوسمانیدا. ئەم ڕۆڵە لەوەدا دەبینین کە میرنشینی سۆران خواردنی بۆ سوپاکانی عوسمانی دابین کردووە، کە بە سەرکردایەتی سەردار (سەرکردەی گشتی) سینان پاشا بووە، کە ڕاسپێردرابوو تاوەکو کۆنترۆڵی ناوچەکانی باکووری ئێران بکات، لە بەڵگەنامەی ٢٠ی ذوالقعدة ساڵی ١٥٧٧ی زایینیدا هاتووە، حوکمێک ئاراستەی چەندین بەرپرس کراوە، لەوانە میری لیوای هەولێر و فەرمانڕەوای ئامێدی و قوباد بەگ و میری میرانی بەغدا و میری لیوای موسڵ و میری ئاسکی موسڵ و سەهرانی سلێمان بەگ و میری لیوای بابان و قەنبەر بەگ و سەهرانی حوسێن بەگ و چەندانی دیکە، حوکمەکە

پەیوەندی بە دابینکردنی چەک و تفاقی سەربازانی عوسمانی بووە، کە بەسەرکردایەتی سەرداری وەزیری سینان پاشا بووە، لێرەدا دەکرێ سەرنجی مەسەلەکە بدەین، کەوا سەهرانی سلێمان بەگ نییە تەنها، بەڵکو پەیوەست بووە بە میری سۆران خۆشی، کە سەهرانی حوسێن بەگ بووە، هیچ کام لە بەڵگەنامە عوسمانییەکان ناسنامەی حوسێن بەگ ئاشکرا ناکەن، پەیوەندی چی بووە بە بنەماڵەی سۆرانییەکان، ئەوەی دەیبینین، کە میر حوسێن بەگ کوڕی بیر بوداق کوڕی شاە عەلی بەگ کوڕی عیسای کوڕی کالۆس، کتێبی شەرەفنامەش ئاماژەیەکی لاوەکی پێکردووە، کە تێدا باسی کردووە ناوبراو بەشێک لە میرنشینەکەی باوکی حوکمڕانی کردووە، لە کاتێکدا لە بەڵگەنامەی ناوبراو وا تێدەگەین، گرنگییەکی وای تێیدا، کە سوڵتانی عوسمانی خۆی قسەی بۆ کردووە، کە لە ئاستێکی دیکە بووە سەبارەت بە میر و بەگزادەکانی دیکە. رۆڵی میرانی سۆران هەر تەنها دابینکردنی خۆراک نەبووە بۆ سوپای عوسمانی، بەڵکو بەشدارییان لە جەنگ کردووە. لە بەڵگەنامەی ۲۷ی (ذوالحجـة)ی ساڵی ۱۵۷۷دا هاتووە، فەرمانێک بۆ میری میرانی بەغدا دەرچووە، دەربارەی سەرپێچی شای ئێرانە لە پەیماننامەی بەستراوی نێوانیان لە جەنگی پێشوودا، کە چەند رێنماییەکی بۆ میری بەغدا تێیدا، کە ناوەڕۆکی ئەم حوکمە بگەیەنێتە هەموو میرەکانی شارەزوور و وەیسی بەگ و سەهرانی سلێمان بەگ و میری لاجان و موکریان، بۆیە لەسەر میری سۆران بوو، کە لەتەک میرەکانی کوردی دیکە بجەنگێ، هەموو گرفتەکانی خۆشی بنێتە لاوە. رۆڵی سەربازی میر سلێمان بەگ سەرکردە عوسمانییەکانی تووشی سەرسوڕمان کردبوو. لەو بەڵگەنامەیە، کە لە ۲۱ی جمادی الآخرە ساڵی ۱۵۷۷ی زایینی دەرچوو، فەرمانێکی ئاراستەی کراوە (إلى سهراني دام عزه) لەسەر داواکاری میری میرانی شارەزوور مەحموود پاشا و بە لەبەرچاوگرتنی بەشداربوونی (کە لە جەنگی... خوانەناسە دۆڕاوە ئێرانییەکان لە نزیک قزڵجە کردووە) تێیدا زۆر بوێر و قارەمان بووە. چەندین کەسی لەناوبردووە، فەرمانەکە واهاتووە، کە خزمەتەکانی میری ناوبراو زۆر جێی بایەخی سوڵتانە و چاودێری دەکات، بۆیە شتێکی پڕ بەهامان بۆ نارد وەک رێزلێنانێک لە خزمەتی بۆ ئایینی پیرۆز و دەوڵەتی باڵا، لەگەڵا فراوانبوونی کردە سەربازییەکانی عوسمانی لە ئێراندا، بەرەی رووبەڕوو بوونەوەی سەربازی بەسەر دوو قۆڵدا دابەش کرا، باکوور بە سەرکردایەتی لالا پاشا بوو، باشووریش بە سەرکردایەتی سینان پاشا بوو. کە بارەگاکەی بەغدا بوو. فەرمانیش دەرچوو بۆ میری سۆران، کە خۆی بگەیەنێتە سەرکردایەتی باشوور لە شاری بەغدا، لە هەردوو لاپەڕەی ۲ - ۳ ی دەفتەری ئەرک لیستێک هەیە و نووسراوە لە ۲۰ی مانگی موحەرەمی ۹۸۷ی کۆچی، کە ناوی میر و سەرکردەکانی تێیدا، کە داواکراون بچنە بەغدا، تاوەکو لەژێر سەرکردایەتی میری میرانی بەغدابن هەندێک لە هێز و جەنگاوەرانیشیان لەگەڵدابێ، لەوانە میری شارەزوور مەحموود پاشا، میری میرانی (ذوالقدریە) مستەفا پاشا، میری میرانی حەڵەب ئەحمەد پاشا، حاکمی ئامێدی قوباد بەگ، سەهرانی سلێمان بەگ و چەندانی دیکە، بەهۆی ئەوەی شوێنی جوگرافی میرنشینەکە و پەیوەندی بە ناوچەی شارەزوورەوە، لە مێژووی ساڵی ۹۸۷ی کۆچی فەرمانێک دەرچووە، کە لەگەڵ میری میرانی شارەزوور کاربکرێت، وەک چۆن ئەو دەیەوێت و هەڵسوکەوت دەکات، پەیوەندییەکانی میرنشینی سۆران، لەگەڵا میرنشینەکانی دراوسێی لەسەریەک رێچکە نەبوون، بەڵکو کات هەبوو پەیوەندییەکان توند بوو. کاتیش هەبوو لاواز بوو. یەکێ لەو هۆیانە نیازی سۆرانییەکان بوو لە فراوانکردنی میرنشینەکەیان لەسەر حیسابی میرنشینەکانی دیکە،

ئەمە جگە لەوەی میری لاجان، بە پشتاوپشت حوکمی ناوچەکەی دەکرد لەسەر فەرمانی سولتان سلێمان قانوونی عوسمانی، گردبوونەوەی هەموو میرەکان لەیەک بەرەی سەربازیدا بەس نەبوو بۆ نەمانی کێشەکانی نێوانیان، بەڵکو ململانێکان ماوە ماوە بەدیار دەکەوتن، بۆ نموونە لە بەڵگەنامەی نووسراوی ٢٠ی مانگی ذی القعدە ساڵی ٩٨٧ی کۆچیدا هاتووە، کە حوکمێک ئاراستەی فەرمانڕەوای ئامێدی کراوە، کە قوباد بەگ بووە، پەیوەستە بەوەی کە ناوبراو نامەیەکی بۆ سولتان نارد و گلەیی لە میری سەهرانی سلێمان بەگ دەکات، لە گلەییەکەدا دەڵێت: کاتێک کە فەرمانڕەوای لاجان عومەر خۆی بۆ دیدەنی ئامادە دەکرد، سەهرانی سلێمان بەگ هێرشی لە ناکاو دەکاتە سەری، چونکە دوژمنایەتییەکی کۆنیان هەبووە، تێیدا سەد کەس لە پیاوانی دەکوژێت و سامانی تالان دەکات، بۆیە پێویستە ململانێی نێوانیان چارەسەر بکەین، لە حوکمەکەدا هاتووە، بەرلەوە دەبێت مەسەلەکان لەگەڵ ئێرانییەکان یەکلا بکرێنەوە و کۆتایی بە جەنگ بێت، دوای ئەوە خەڵکی گەندەڵ و تاوانبار حوکمیان بەسەردا دەدرێت و سزا دەدرێن.

ئەوەی لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە بە سزادان رازیکردنی میری لاجان و میری بادینانە، لە بەڵگەنامەکانی دیکەدا هیچ ئاماژەیەک نەبووە بۆ سزادانی هیچ کام لە میرانی سۆران، دابەشکردنی میرنشینی سۆران لەنێو میرەکان خۆیاندا، بووە هۆی گرفت و دووبەرەکی لە نێوان نەوەکاندا، کاتێک دەسەڵاتیان کەوتە دەست، بەتایبەت دوای ئەوەی کە کوڕەکان حوکمیان لە باوکیانەوە بۆ دەمایەوە، زۆر لەو گرفت و کێشانە دەکەوتە بەرگوێی میرەکانی دەوروپشتی میرانی سۆران تاوەکو هەواڵەکە دەگەیشتە سولتانی عوسمانی لە بەڵگەنامەی نووسراوی ساڵی(٩٨٨)ی کۆچیدا دەڵێت: ململانێ کەوتۆتە نێوان میری لیوای کۆیێ و قوباد بەگ میری پێشووی ئەم ناوچەیە، میر سەیفەدین، ئەوەی راپۆرتەکەی نووسیوە، میری ئامێدی بووە، کە پێشتر سکاڵای کردبوو، ناوبراو ئەم گرفتەی بە هەل زانیوە بۆ دەستێوەردان، یان سەپاندنی توانای خۆی لەسەر بنەماڵەی حوکمڕانی سۆرانی، لە بەڵگەنامەی ناوبراودا هاتووە، کە حوکمێک ئاراستەی میری میرانی بەغدا کراوە، کەوا ململانێیەک لە نێوان قوباد بەگ میری لیوای کۆیێ و میر سەیفەدین میری لیوای ناوبراو، سولتان حوکمی ئاراستەی هەریەک لە میری میرانی شارەزوور وحاکمی ئامێدی کردووە، دەربارەی لێکۆڵینەوە لەم مەسەلەیە، کە بە نهێنی پرسیاریان دەربارە بکرێت لە خەڵک و پاشان کامیان بۆ میرایەتی چاکن ئەو دیاری بکرێت و بە سولتانیش نیشان بدرێت، حوکمەکە باس لە هاریکاری لەگەڵ سولتان دەکات بۆ جێبەجێکردنی، حوکمەکە باس لە ناسنامەی هەردوو میرە بەشەرهاتووەکان ناکات، بەپێی شەرەفنامە قوبادی ناوبراو کوڕە مامی سلێمان بەگی میری سۆرانە، کە حوکمی کۆیێ وەرگرتبوو زۆر سەرپێچی کردبوو، تەنانەت چاوی بڕیبووە حکومەتی - سەهران - سۆران، دەیویست دوژمنایەتی سلێمان بەگیش بکات، لەم حاڵەتە، مایەوە تاوەکو مانگەکانی ساڵی(١٥٨٥)دا پاشان سلێمان بەگ بەسەری دادا و لەناوی برد، بەڵام میر سەیفەدین، ئەو میر سەیفەدینە کوڕی حوسێنە و کوڕی بیربۆداقە و کوڕی شاە عەلی بەگە، لەدوای باوکییەوە حوکمی کەوتە دەست، هەوڵی فراوانکردنی میرنشینەکەی خۆی دابوو، بەڵام لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە نازانرێ، کە دەبوو میری ئامێدی ئەنجام بدات و هەروەها میری میرانی شارەزوور دەربارەی، کە کامیان شیاون بۆ حوکمڕانی شاری کۆیە لە هەردوو میرەکەدا بەڵام مەسەلەکە لە بەرژەوەندی میر سەیفەدین شکایەوە، چونکە بەڵگەنامەی داهاتوو لە ساڵی ٩٩٠ی کۆچی ئاماژە بەو دەکات بە میری کۆییێ دادەنێت، بەڵام قوباد دەکوژرێت، لەم بەڵگەنامەدا ئاماژەی ئەوەی تێیدا، کە فەرمانێک دەرچووە بۆ

میری میرانی شارەزوور، کە پەیوەندی بەو نامەیە هەیە سوڵتان بۆ میری میرانی هەولێر میر ئەحمەدی ناردووە، تێیدا هاتووە، کە میری کۆیێی سۆرانی سەیفەدین برایەکی هەیە ناوی کولابیە، رووی لە هەڵسوکەوتی سەرەرۆیی و گەندەڵی کردووە و پێنج ژنی هەیە و زۆر دز و چەتەی هەیە و دەستدرێژی بۆ سەر گیان وماڵی خەڵک دەکات لە شاری هەولێر و کۆیێ، بۆیە فەرمانێک لە سوڵتانەوە دەرچووە، کەوا دەبێت لەناو ببردرێت و گرووپەکەی دەستگیر کرێت و سزا بدرێت بەپێی شەرع.

هەروەها حوکمەکە باس لە لێکۆڵینەوە و دادگایی کردنی بە وردی و دوور لە هەر مەبەستێک، ئەم سکاڵایانە چ کاریگەرییان لەسەر متمانەی عوسمانییەکان بە میرانی سۆران نەکرد، لێرەدا دەبینین لە بەڵگەنامەیەک، کە لە ساڵی ٩٩٩ی کۆچی دەرچووە، کە فەرمانێک بۆ میری میرانی شارەزوور و میری سۆران دەرچووە، پەیوەستە بەو نامەیەی کە میری میرانی بەغدا بۆ سوڵتانی ناردووە، تێدا باس لەوە دەکات کوردەکانی بابان لە شارەزوور، کە یاخی بووە، باجەکانی سەریان نادەن، دەڵێت میری سۆران لێیان نزیکە و دەزانێت باریان چۆنە و دەتوانێ کاریان تێ بکات و ناچاریان بکات باجەکانی سەریان بدەن، لە حوکمەکەدا هاتووە، کە میری سۆرانی بەم کارە راسپێردراوە و یارمەتی پێویست دەستەبەر بکات لە دەستکەوتنی باج و خەراج لە کوردەکانی بابان، میری بادینان هەوڵی داوە لە گرفتی لەگەڵ بەهرام بەگی برای، هۆیەک بێت بۆ جێبەجێکردنی دوو ئامانج، یەکەمیان: لەناوبردنی بەهرام خۆی و دووەمیان: لەناوبردنی رکابەرەکەی، کە میری سۆران بووە هاریکاری برای ناوبراوە، بۆیە لە بەڵگەنامەی ناوبراودا دەخوێنینەوە، کە لە ساڵی ٩٩١ی کۆچی دەرچووە، کەوا فەرمانرەوای ئامێدی قوباد بەگ نامەیەکی بۆ سوڵتان ناردووە، تێیدا هاتووە:"کەوا براکەی بەهرام بەگ هەڵیکوتاوەتە سەر شاری ئامێدی و هەلی ئامادە نەبوونی قۆستۆتەوە، چونکە لە جەنگی سەربازی بووە دژ بە ئێران و هاوکاری لە چەتە و رێگرەکان وەرگرتووە" هەروەها تێدا هاتووە: "کەوا کۆمەک و پاڵپشتی لە زەینەل بەگی هەکاری و سۆرانی سلێمان بەگ وەرگرتووە، بۆیە داوای یارمەتی دەکات تاوەکو بەرەنگاریان بێتەوە، چونکە دواخستنی ئەم مەسەلەیە دەبێتە هۆی یاخیبوونی سەرجەم کوردەکان، دەرچوون لە رێنماییەکانی دەوڵەتی عوسمانی" لەگەڵ ئەوەشدا سوڵتان لە جەنگی لەگەڵ ئێران سەرقاڵ بوو، نەیتوانی دەستپێشخەری هاوکاری میری بادینان بکات، پاشان تێدا هاتووە: "دەقی حوکمەکە کاتی جەنگە و لەگەڵ دوژمنی دەرەکیدا و زاڵبوون بەسەر چەتە و لە یاسادەرچووان کارێکی ئاسانترە دەکرێ بۆ دوای جەنگ دوابخرێ" جارێکی دیکە لە بەڵگەنامەکان نابینین، کە بەڵگە بێت لەوەی سوڵتان جدی بووبێت لە قسەکانیدا بۆ لەناوبردنی لەرێ لادەرەکان، بەڵام مەسەلە بە پێچەوانەوەیە چونکە ئێمە سەرنج دەدەین دوای تەنها چەند مانگێک لەم کارە پشت بە میری سۆران دەبەستێت، لەگەڵ هەریەک لە میری میرانی شارەزوور و حوکمرانی شاری بانە، کە ئەوکات شاری بانە بەشێک لە کوردستانی عوسمانی بوو، لە کردەیەکی سەربازیدا هێزەکانی بەغدا بەشدارییان لە کپکردنەوەی یاخیبوونی (تەیموور خانی حاکمی دیناوەر) کرد، ناوبراو لە سایەی حوکمی عوسمانی بوو پاشان دژیان وەستا و یاخی بوو، لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە، کە لە بەهاری ٩٩٣ی کۆچیدا دەرچووە، حوکمی شەریف دژ بە میری میرانی شارەزوور و حاکمی بانە و سۆرانی سلێمان بەگ، دەربارەی ئەو هەنگاوانەی دەبێت بهاوێژرێ، کە هەڵوێستی لە بەرامبەر (تەیموور خان) وەرگرت، ئەگەر وازی هێنا لە یاخیبوونەکەی و قەڵای خۆی بەجێهێشت و دای بە میری میرانی شارەزوور، ئەوا بەرێزەوە ببردرێتە لای وەزیری شکۆدار، بەڵام ئەگەر

سوور بوو لەسەر یاخیبوونی خۆی، ئەوا دەبێت لەناوببردرێت بە هاوکاری کردن، دەقی حوکمەکە ئەوەیە کە دەبێت هێزی سەربازی لە بەغداوە بۆ میری میرانی شارەزوور بنێردرێت و لەژێر سەرکردایەتی ئەو بێت هەڵمەتێکی سەربازی ئەنجام بدرێت بۆ لەناوبردنی تەیموور خان، هەروەها فەرمان بۆ (سۆرانی سلێمان بەگ) دەرکرابوو، لە ١٠ی رەمەزانی ١٥٨٢ زایینی، تێدا هاتووە "میری میرانی بەغدا کە پێشڕەوی لەبەردەوامی دابێت، کە نامەیەکی بۆ بنێرێ یاخود پیاوێکی بۆ رەوانە بکات، کە داوای لێ بکات پێکەوە کار بۆ هێنانەدی هەندێک خزمەتی گرنگ بکەن، داواکارییەکی بەپەلە جێبەجێ بکرێت و لەگەڵ پیاوەکانی ئەودا یەکگرن و کار بۆ رێککەوتن و یەک دەنگی بکەن". پاشان رووداوی گێلەوێژەی بەکر سوباشی لە بەغدا لە ساڵی ١٦٢٢ زایینی، روویدا کە جەخت لەسەر رۆڵی میرنشینی سۆران بکاتەوە، لە کردە سەربازییە گەورەکاندا، کە دەوڵەتی عوسمانی لە دژی یاخیبوواندا ئەنجامی دەدا.

کە گەیشتبوونە حوکمڕانی بەغدا بە شێوەیەکی ناڕەوا، بوونیان مەترسییەکی گەورەی دەست تێوەردانی ئێرانی لەدواوە بوو، لەم ساڵەدا مستەفا بەگ میری سۆران بە سوپاکەی گەیشتە کەرکووک، تاکو لەگەڵ سوپای عوسمانی بەیەک بگەن، کە روویان لە بەغدا کرد، لەوێدا سەرکردایەتی عوسمانی، هێزەکانی میری شارەزووری خستە ژێر سەرکردایەتی خۆی، جێگرێکی بۆ خۆی بە نێوی (عەبداڵ کوڕی عیزەدین شێری سۆرانی) دانا، ئەم ناوبراوەش رووەو بەغدا رۆیی، شەڕێک لەگەڵ سوباشی لە دەوروبەری بەغدا هەڵگیرسا، ئەم هێزە نەگەڕایەوە شوێن خۆی، هەتاوەکو دەوڵەتی عوسمانی رازی کرا بە دانانی سوباشی وەک والی بەغدا، لێرەوە سەردەمێکی دیکەی مێژووی یاخیبوون دەستی پێکرد، لە بەغدا و لە شارەکانی دیکە، تاوەکو (سوڵتان مورادی چوارەم) لە ساڵی ١٦٨٣ جارێکی دیکە گرتییەوە.

بەڵگەنامە عوسمانییەکان ئەوە ئاشکرا دەکەن، لە سەدەی دەیەمی کۆچی، واتە (١٦)ی زایینی، گۆڕانێکی گرنگ لەلایەنی پرۆتۆکۆڵی روویدا لە رووی پەیوەندی دەوڵەتی عوسمانی بە میرنشینی سۆرانەوە، ئەو لە گوتارەکانیدا زۆر باسی سۆرانی دەکرد، لە بری ئەوەی بڵێ (میری سۆران) دەیگوت: (حکومەتی سۆران)، یاخود (حاکمی سۆران) ئەوەی پەیوەستیش بوو بە گرفتە داراییەکان، کە لە ئەنجامی کۆچی وەرزی هۆزە سۆرانییەکان دروست ببوو بۆ شوێنەکانی دەورپشتی، بەڵگەنامەی نووسراوی ساڵی ١٦٤٤ی زایینی دەڵێت:

(فەرمانێک دەرچووە بۆ میری میرانی شارەزوور تێدا هاتووە، حاکمی سۆرانی ئەحمەد، نووسراوێکی بۆ سوڵتان ناردووە، کە باس لە میللەتەکەی دەکات کە دووچاری دەستدرێژی و زورداری دەبنەوە بەهۆی ئەوەی کە داوای دانی باجیان لێ دەکەن)، واتە میرەکانی لیوای هەولێر داوایان لێ دەکەن، کە ناوچەکانی شەمامک و باجوان و ئاڵتوون کۆپری، کە وەرزی زستان لە شوێنەکانی خۆیان بەسەر دەبەن، دەقی حوکمەکە باس لەو رێوڕەسمە دەکات، کە پێشتر بەرێوەچووە" دادوەری هەریر مەولانا حەسەن، لە هەمان رۆژدا نووسراویەتی لە هەمان ساڵیشدایە، بۆ سوڵتانی ناردووە، باس لەوە دەکات: "دەستدرێژی لەلایەن میر ساریلۆ حەیدەر کراوەتە سەریان، کە بۆ سەر خەڵکی ناوچەکە بووە، خەڵک کوژراوە و ماڵ و سامانیان تالآن کراوە و سێ هەزار سەر مەڕیشیان لێ دزراوە" حوکمە نووسراوەکە دەڵێت:"دەبێ لێکۆڵینەوەی پێویست لەم مەسەلەیە بکرێت و دەبێت سزاش بەپێی شەرعی پیرۆز بێت" و ئەستەمبوڵیش لە ئاکامی لێکۆڵینەوەکە ئاگادار بکرێتەوە، لەوەوە دیارە کە بەڵگە نامە عوسمانییەکان وردەکاری گرنگی تێدایە و زۆریشی تا ئێستا، سەبارەت بە مێژوویی میرنشینی سۆران، کە سەرچاوە تازەکان لێی بێدەنگ بوون لێی ئاگادارنین.




# ئیدارەی هەولێر لەدوا سەردەمی عوسمانییەکاندا ١٨٣٦-١٩١٨

**دکتۆر خەلیل عەلی موراد**
**کۆلیژی پەروەردە زانکۆی موسڵ**

دوا سەردەمی عوسمانییەکان کە نزیکەی هەشت دەیەی لەمێژووی هەولێر بەڕێ کرد، هەر لە دەستپێکی دووەم جاری داگیرکردنی شارەکە لەلایەن عوسمانییەکان لەساڵی (١٨٣٦ز)[١] لەماوەی هێرشە بەرفراوانەکەی عوسمانییەکان کردیانە سەر میرنشینی محەمەدپاشای ڕەواندزی تا کۆتاییەکەی بەوە هات هێزەکانی داگیرکەری بەریتانی پێیان نایە شاری هەولێر لە ١٠ی تشرینی دووەمی ١٩١٨دا[٢]، ئەو سەردەمە لەمێژووی هەولێر تا رادەیەک ئارامی و سەقامگیری بەخۆیەوە بینی. سەرەڕای بەستنەوەی ئابووری عێراق بەبازاڕی سەرمایەداری و گەشەسەندنی بازرگانی تیایدا. بەتایبەت لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا[٣]. وەک ژمارەیەک لەشارەکانی دیکەی عێراق، هەولێر وروژاندنی، لە لایەک بەهۆی ئەو هەڵمەتە بەرفراوانەی لەرووی بیناسازی بەخۆیەوە بینی، لە لایەکی دیکە بەهۆی ئەو چڕە دانیشتوانەی بەکۆ بەخۆیەوە بینی. ئەمەو بەپێی سەرچاوەکانی عوسمانی ژمارەی خانووە

ماڵنشینەکان لەشار لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و دەستپێکی سەدەی بیست گەیشتە ١٨٢٢ خانوو. لەوانە نزیکەی ٨٠٠ خانوو لەقەلات و ئەوی تر لە بەشی خوارەوەو دەشتەکەیدا کە بۆ باشووری قەلات درێژ دەبۆوە[٤]. بەلام بازاڕی شار بریتی بوو لە ٦٣٧ دوکان و شوێنی بازرگانی و ٦ خانەو ٢٣ کۆگاو (ئەمبار) و، هەروا دوو جامع و ١٠ مزگەوت و ٤ تەکیەو خەنەقاو ٣ گەرماو و ١١ چایخانەی لێ بووە. جگە لەوە بارەگای قایمقامیەت (حکومەتی قۆناغی) و سەربازگەیەک (قشلە)و بنکەیەکی بەرزخنکار واتە پۆلیس (پەردغولخانە)ی لێ بووە. بەلام سەبارەت بەدامودەزگاکانی خوێندن ٦ قوتابخانەی بەرایی و قوتابخانەیەکی ناوەندی (رەشیدیە) و ١١ قوتابخانەی ئایینی لێ بوو[٥] بێگومان قوتابخانە ئاینییەکان سەر بەجامیع و مزگەوتەکان بوونەو بەپێی سالنامەی (نظارة المعارف العمومیة العثمانیة) سالی ١٣١٨ک/ ١٩٠٠- ١٩٠١ ز) ژمارەی قوتابییەکان کەم بووەو خۆی لە ٢٠٦ قوتابی داوە[٦]. بەلام سەبارەت بەژمارەی دانیشتوان لەماوەی هەمان ماوەدا نزیک بووە لە (١٠٠٠٠) کەس[٧]. هەولێر لە بەشێکی زۆری دوا سەردەمی عوسمانیدا لەڕووی ئیدارییەوە سەر بەویلایەتی بەغدا بووە. ئەمەش پشتگیری لەوە دەکات کە دەوڵەتی عوسمانی ئەکرەم عومەر پاشا بکاتە سەردار کە یەکێک بووە لە بلیمەتەکانی جەنگی قرم (١٨٥٣-١٨٥٦ز) دامەزراند بەوالی عێراق لەسالی (١٢٧٤ک/ ١٨٥٨)ز کە دیاربەکر و موسڵ و کەرکوک و هەولێر و گوندەکان کە لە دەوروبەری بوون، لەگەڵ شاری بەغداو بەسرە لەژێر دەسەلاتی بوون[٨]. کاتێ مەدحەت پاشا دامەزرا رەوشەکە گۆڕانکاری بەسەردا نەهات، کە یەکێک بووە لە چاکسازیخوازە ناسراوەکانی لەدەولەتی عوسمانیدا لەنێوان سالانی (١٨٦٩- ١٨٧٢ز)د والی بەغدا بووە. ویلایەتی بەغدا بەسەر (١٠) سەنجق (لیوا) دابەش کرابوو بەپێی)رۆژنامەی زەورای بەغدادیە) ژمارە ٢ کە لە ١٢ی رەبیعی یەکەم (١٢٨٦ک/ ١٨٦٩ز) دەرچووە. ئەو سەنجقانەش بریتی بوون لە بەغداو شارەزوور: کەرکوک[٩] سلێمانی و موسڵ و دلێم و کەربەلاو دیوانیەو بەسرەو عیمارە و مەنتفک[١٠]. واتە هەر لیوایەکی عێراقی لەڕووی ئیدارییەوە سەر بە ویلایەتی بەغدا بووە. بەلام نەهاتنی ناوی هەولێر لەنێو ئەو لیوایانەدا ئەوە دەگەیەنێت کە هەولێر لیوا نەبووە، بەلکو سەر بەقایمقامیە بووە، واتە قەزا. لەسالی (١٨٧٩ز) موسڵ بوو بەویلایەتێکی سەربەخۆ[١١] تا لەتشرینی دووەمی ١٩١٨ز لەلایەن داگیرکەری بەریتانیا دەستی بەسەرداگیرا سەربەخۆییەکەی بەردەوام بوو. ویلایەتی موسڵ سێ سەنجقی لەخۆ گرتبوو، موسڵ- کەرکوک- سلێمانی، ناوی هەولێر لەنێو دابەشکراوە ئیدارییەکان هاتووە بەسەر ئەو ویلایەتانەدا بەوەی کە قەزایەکە لەڕووی ئیدارییەوە سەر بەسەنجق یان لیوای کەرکوکن[١٢].

سنووری ئیدارەی تازەی قەزای هەولێر، قەزاکانی کۆیەو رانیە لەباشووری رۆژهەلات، ناحیەی کۆپری (ئالتون کۆپری) لەباشووری رۆژئاوا، لە باکوور قەزای رەواندز کە رووباری بەستۆرە هێڵی جیاکەرەوەی نێوانیان بوو، لەرۆژئاواش زێی گەورە کە بووبووە هێڵی جیاکەرەوە لەنێوان قەزای هەولێرو لیوای موسڵ دا[١٣] هەروەها هەردوو ناحیەی سولتانیەو دزەیی (قوشتەپە) بەقەزای هەولێر بەسترابوونەوە[١٤] پاشان ناحیەی سێیەمیشی خرایە سەر، ئەویش ناحیەی شەمامک بوو، بەپێی سالنامەی ویلایەتی موسڵ سالی ١٣٣ک/ ١٩١١- ١٩٢٣ز[١٥].

سەبارەت بەژمارەی گوندەکانیش کە سەر بەقەزای هەولێر بوون گەیشتە ٣٠٠ گوند[١٦].

شایانی ئاماژە پێکردنە زۆری زانیارییەکانمان لەسەر ئیدارەی هەولێر لەدوا دەیەکانی سەردەمی عوسمانی پشت بە سالنامەکانی عوسمانی تایبەت بە ویلایەتی موسڵ دەبەستێ. سەرەڕای پشت بەستن بەسیستەم و یاساکانی عوسمانی کە باس لەدەسەلات و تایبەتمەندی فەرمانگە ئیداری و دارایی و دادوەرییەکان و شتی دیکە دەکات. زۆری ئەو سیستەم و یاسایانەش لەرەوتی بزووتنەوەی چاکسازی عوسمانی ناسراو بە (رێکخستن) هاتووە کە لە سالی ١٨٣٩ز دەستی پێکرد.

قایمقام لەسەرووی دەزگای ئیدارییەوە دێت لەقەزا، لەلایەن حکومەتی ناوەند لە ئەستەمبوڵ دادەمەزرا. بەرپرسی کاروباری شارو دارایی و ئەمن و ئاسایش و دامودەزگاکان بوو کە لە قەزا بوون. هەروەها جێبەجێکاری تەواوی فەرمانەکانی دەولەت و کارنامەکان بوو لەرێی راستەوخۆی (کە موتەسەریفی کەرکوک) پێی دەگەیشت. سەرەڕای جێبەجێکردنی ئەو حوکمانەی لەدادگاکانی قەزا دەردەچوون کە دەسەلاتی ئەو بوون. بەلام ئەوەی

دەکەوتە دەرەوەی سنووری دەسەڵاتەکەی بەکردەکی مۆڵەتی لە موتەسەریفی ناوبراو وەردەگرت بۆ جێبەجێکردنی[17]. هەروەها لەچوارچێوەی کارەکانیدا سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی ئیدارەی قەزای دەکردن بەڕێوەبەری ناحیەکانی سەر بەقەزاکەی دەپاڵاوت. فەرمانگەی ناحیەکانی دەپشکنی[18]. کاتێ قەزای هەولێر بوو بەقەزای پلە (٢) بەپێی ساڵنامەی موسڵ ساڵی ١٣٢٥ک/ ١٩٠٧- ١٩٠٨ز[19] مووچەی مانگانەی قایمقامی هەولێر ١٧٥٠ قرش بووە، کە بەرامبەر ١٧/٥ لیرە بووە[20] لەهەندێ لە سەرچاوەکان ناوی ژمارەیەک قایمقامی هەولێر هاتووە. لەوانە: ئەحمەد بەگ. پاشان حاجی بەکر ئاغا ساڵی ١٢٩٥ک/ ١٨٧٨ز، عەبدوڵلا پاشا لەنێوان ١٣٠٧- ١٣١٣ک/ ١٨٨٩- ١٨٩٥ز، مستەفا سەبری پاشا لەساڵی ١٣٢٣ک/ ١٩٠٥- ١٩٠٦زن نیهاد بەگ لەساڵی ١٣٢٥ک/ ١٩٠٧- ١٩٠٨ز، محەمەد عەلی بەگ ساڵی ١٣٣٠ک/ ١٩١١- ١٩١٢ز[21].

دوای قایمقام چوار کارمەندی سەرەکی دێن لە قەزا، هەر یەک لە قازی کە نازناوی (نائب) بووە، موفتی و بەڕێوەبەری دارایی و نووسەری نووسینگەکان- واتە (نووسینگە فەرمییەکان)[22]. هەر لەناوەکە دیارە بەڕێوەبەری دارایی، ئیداریی کاروباری دارایی لە قەزا بەڕێوە بردووە و حساباتی فەرمی (داهات و خەرجیەکان) لەمیانەی جێبەجێکردنی کار راپەڕاندنەکان و سیستەمی دارایی پەیوەندار بەکاروباری قەزا. لەگەڵ ئەو رێنماییانەی لەلایەن ژمێریاری لیوا پێیگەیشتوون یەکلایی کردۆتەوە. ئەمەو بەڕێوەبەری دارایی بەپێی سیستەمی عوسمانییەکان لەلایەن والی ویلایە دادەمەزرا. بەڵام بەڕێوەبەری نووسینەکی (کاتب التحریر) کارەکەی خۆی پوختەکردنی کاروباری نووسینگە فەرمییەکانی قەزا. پاراستنی ئەوراق و دۆسێیە تایبەتییەکانیان، وردبینی لە فرمان و کارنامەو رێنماییەکان کە لە سەرۆکە راستەوخۆکەی کە قایمقام بوو، بۆی دەردەکرا دەبینییەوە[23].

ئەو چوار کارمەندە ئەندامی سروشتی ئەنجوومەنی ئیدارەی قەزای هەولێر بوون کە قایمقام سەرۆکایەتی دەکرد. ئەو ئەنجوومەنە چوار ئەندامی هەڵبژێردراوی لەخۆ دەگرت، لە نێوانیاندا پیاو ماقوولانی شار. ئەو ئەنجوومەنە لەو کاروبارانەی تایبەت بوون بەقەزای دەڕوانی. ئەنجوومەنیش ساڵێ چوار جار کۆ دەبۆوە. دەسەڵاتەکەی تەنیا راوێژکاری بوو[24]. ئەم خشتەی خوارەوە ئەندامانی ئیدارەی ئەنجوومەنی قەزای هەولێر بەپێی ساڵنامەی عوسمانی تایبەت بە ویلایەتی موسڵ دیار دەکات[25].

بڕوانە خشتەی ژمارە (١)

لەناوەندی قەزای هەولێر ژمارەیەک مەئمور (کارمەند)و نووسەر کە هەر یەک تایبەت بوو بۆ کارێکی دیاریکراوی دارایی یان ئیداری هەبوون. ساڵنامەکان باس لەو مەئمورو نووسەرانە دەکات و هەر ناوی یەکەمیان دێنێت. لە بەدواداچوونی ساڵنامەی ویلایەتی موسڵی عوسمانی وادیارە گۆڕانکاری بەسەر میلاکی ئیدارەی عوسمانی لە هەولێردا هاتووە و رووی لەبەرفراوانی کردووە. لە ساڵنامەی ١٣٠٨ک/ ١٨٩٠- ١٨٩١ز هاتووە ئەمینداری سندووقی قەزا (قەزای سەندووق ئەمینی)، نووسەری باجەکان، مەئموری نفوس، مەئموری کۆگا، مەئموری تەلەگراف (تەلەگراف مەئموری)، بەخستنە سەر بەڕێوەبەرو مامۆستایانی ناوەندی (قوتابخانەی رەشیدیە) لە هەولێر[26]. بەڵام لە ساڵنامەی ١٣١٠ک/ ١٨٩٢- ١٨٩٣ز سەرنج دەدەین کاری نووسەری نفوس کەوتە پاڵ مەئموری نفوس، کاری ئەوانەش ئەوەبوو کە ئەمڕۆ فەرمانگەی کاروباری شارستانی ئەنجامی دەدەن. هەروەها ساڵنامە ئاماژە بەنووسەری تاپۆ دەدات تایبەت بووە بەتۆمارکردنی خانووبەرەو هەر لەناوەکەش روون و ئاشکرایە. هەروا باس لەکاری نووسەری باجی دزەیی دەکات کە لەگەڵێ نووسەری دووەمیش هەبووە[27]. تەماشا دەکەین گۆڕانکارییەکی سووک لە ساڵنامەی ١٣١٢ک/ ١٨٩٤- ١٨٩٥ز کراوە، هەندێ شت هاتۆتە سەری بۆ نموونە بەڕێوەبەری پۆستەو بروسکە، دابەشکردنی بروسکەکان بریکاری ئەوقاف ئەم ساڵنامەیە باس لەکاری نووسەری باجی دزەیی ناکات، بەڵکو باس لەنووسەری باجی دەرەکی دەکات[28]. بەڵام ساڵنامە ١٣٢٥ک/ ١٩٠٦- ١٩٠٧ز دوا کاری باس کردووە لەگەڵ نووسەری باجی دزەیی. میلاکی ئیدارەی دارایی خستۆتە سەر پشکنەری وەرگری باج ٦ وەرگری باج، ٤ لەوانە سوار سواری (تەحسیلداری) و (٢)ی دیکە[29] واپێدەچێ سوارەکان کاریان کۆکردنەوەی باجەکان و رسومات بوو بێت لە ناحیە و گوندەکانی سەر بەقەزای هەولێر. هەر ئەم ساڵنامەیە ئاماژە بەزیادبوونی میلاکی قوتابخانەی

| ساڵ | سەرۆکی ئەنجومەن | ئەندامە ئاساییەکان | ئەندامە هەڵبژێردراوەکان |
|---|---|---|---|
| ١٢٠٨ك(١٨٩٠- ١٨٩١)ز | عەبدوڵڵا پاشا | قازی (شاغر)، موفتی عەبدولرەحمان ئەفەندی، بەڕێوەبەری دارایی وەلی ئەفەندی و نووسەر سەفوەت ئەفەندی | محەممەد سەعید ئاغا، خدر ئاغا نووری ئەفەندی، حننا ئاغا |
| ١٢١٠ك (١٨٩٢- ١٨٩٤ز) | عەبدوڵڵا پاشا | قازی سەید ئەحمەد ئەفەندی، موفتی و بەڕێوەبەری دارایی و نووسەر کە لەسەرەوە ناویان هاتووە | سەید عەبدوڵڵا ئاغا، خدر ئاغا، نووری ئەفەندی، حننا ئەفەندی |
| ١٢١٢ك (١٨٩٥- ١٨٩٤ز) | عەبدوڵڵا پاشا | قازی سەید خەلیل ئەفەندی، موفتی عەبدولرەحمان ئەفەندی، بەڕێوەبەریدارایی زەینەل ئەفەندی نووسەر: سەفوەت ئەفەندی | حاجی خدر ئاغا، سەید عەبدوڵڵا ئاغا خواجە ئەنتوان ئەفەندی، خواجە نووری ئەفەندی |
| ١٢٢٥ك (١٩٠٨- ١٩٠٧ز) | نیهاد بەگ | قازی سەید سالم ئەفەندی، موفتی عەبدولڕەحمان ئەفەندی، بەڕێوەبەری دارایی مەحموود جەلالەدین ئەفەندی ، نووسەر: محەمەد سەلیم ئەفەندی | خدر ئاغا عەلی ئاغا، سەید عەبدوڵڵائاغا، خواجە یوسف |
| ١٢٢٠ك(١٩١١- ١٩١٢ز) | محەممەد عەلی بەگ | قازی سلێمان بەگ، موفتی عەبدوڵڵا فازل ئەفەندی، بەڕێوەبەری دارایی مەحموود جەلالەدین ئەفەندی، نووسەر: محەمەد سەلیم ئەفەندی | سەید عەبدوڵڵائاغا، حاجی خدر ئاغا، شابۆ ئاغا، یوسف نووری ئەفەندی |

خشتەی ژمارە (١) وا دیارە لە ساڵنامەدا هەڵەی چاپی تێ کەوتووە، ئەگەرنا دواتر ناوی بە "ئەفەندی" هاتووە.

ناوەندی لە هەولێر دەدات بەبەڕێوەبەرو دوو مامۆستا. مەئمور تەلەفۆنیشی دەخاتە سەر[٣٠].

سالنامەی ١٣١٢ک/ ١٨٩٤-١٨٩٥ز ئاماژە بەبوونی هۆبەی بانکی کشتوکاڵی لەهەولێر دەدات کە میلاکی ئەو هۆبەیە لەسەرۆک و نووسەری ژمێریاری تەحسیلداری دارایی دەدات، سەرەڕای چوار ئەندامی دیکە لەدانیشتوانی ناوخۆ کە واپێدەچێ ئەوانە بووبن تەها ئاغاو سالح ئەفەندی و موختار ئەفەندی و حەسەن ئەفەندی.[٣١] لقێکی ئەو بانکە لە ویلایەتی موسڵ بوو لەساڵی ١٨٨٣ز کرایەوە بەپێی ئەوەی ریشتاردر جێگری قونسولخانەی بەریتانیا لەموسڵ باسی کردووە[٣٢]. هەروا ئەو هۆبەیە لە سەناجیەکانی ویلایەتی موسڵ و قەزاکانی لەوانە هەولێر کرایەوە. لە راستیدا کتومت بەو مانایەی وشەکە بانک نەبووە، بەڵکو سەندووقێک بووە بۆ دەس قەرزی جوتیاران. ئامانج لە دامەزراندنی ئەو هۆبەیە رزگارکردنی جوتیارەکان بووە لەو سوودە زۆرەی بازرگانانی شار دەیان خستە سەر ئەو قەرزەی پێیانیان دەدا. ئەو بانکە قەرزی دەدایە ئەوانەی پێویستییان پێ هەیە بەسوودی ڕێژەی ١٪ مانگانە لەگەڵ زامینکردنی زەوی کە بەرامبەر دوو هەندی نرخی قەرزەکەبوو. ماوەی قەرزەکە ساڵێکی تێپەڕ نەدەکرد[٣٣]. زانیاریش بەدەستەوە نییە لەسەر چالاکی هۆبەی ئەو بانکە لە هەولێر. چونکە سالنامەکانی دواتر هیچ شتێکی لەسەر باس ناکات، تەنیا ئاماژە بەبریکاری نووسەری سایک دەکات کە لەسالنامەی ١٣٢٥ک هاتووە[٣٤].

وێڕای ئەوەی لەپێشەوە باسکران کاری تریش هەبوون کە سەر بەئیداراتی تایبەت بوون و پەیوەندییان بەوەزارەتەکانی عوسمانییەوە نەبوو. سوڵتانی عوسمانی عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦- ١٩٠٩ز) رووبەرێکی بەرفراوانی لەزەوی کشتوکاڵی هەبوو لە عێراق ناسراو بوو بە (خاکی سەنیە)، بەشێک لەوە کەوتبووە، نزیک ئاوەڕۆی خوارووی رووباری زێی گەورەو بچووک[٣٥] واتە لەچوارچێوەی سنووری قەزای هەولێر. ئەو زەویانە لەلایەن فەرمانگەی (خاکی سەنیە) یان کە (میلاکی همایونیە) پێی دەوترا هەڵدەسووڕێندرا. داهاتەکەی دەچووە گەنجینەی تایبەت سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم. فەرمانگەی خاکی سەنیە هۆبەیەکی لە شەمامک بوو کە لە مەئمورو دوو نووسەرو ئەمینداری سەندووق و تەحسیلدار پێکهاتبوو. مەئموری ناوبراو یاریدەدەرێک و نووسەرێکی هەبووە. بەڵام لەناوەندی قەزای هەولێر مەئمورێکی زەوییەکانی سەنیەو دوو نووسەر هەبوون[٣٦]. لەپاش لاچوونی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە ١٩٠٩زدا سامانەکەی بۆ دەوڵەت گوێزرایەوەو لەسەر حیسابی وەزارەتی دارایی عوسمانی تۆمارکرا[٣٧].

بەڵام کارە وەزیفییەکانی دیکە کە پەیوەندیدار بوون بەئیدارە تایبەتییەکان مەئموری قەرزە گشتییەکان و نووسەرەکەی بوو[٣٨]. هەردووکیان بەدواداچوونی ئیدارەی قەرزەکانی گشتی عوسمانییان دەکرد کە لەساڵی ١٨٨١ز دامەزرا. کە هەڵگری بەشەکان و قەواڵەکانی قەرزی عوسمانی بوو. ئەو ئیدارە رێ پێدرابوو بەدەسەڵاتی جبایەی ژمارەیەک میرانە لەدەوڵەتی عوسمانیدا بۆ بەرژەوەندی دانەوەی پارەکان و سوودەکانی قەرزە خڕبووەکان لە ئەستۆی دەوڵەتی عوسمانیدا. زۆرینەی قەرزەکانیش هی دامودەزگاکانی دارایی و حکومەتە ئەوروپییەکان بوو[٣٩] ئەو میرانەش بریتی بوون لەمیرانەی قۆرخکردنی خوێ و میرانەی پول و شەراب و حەریرو داهاتی ماسی (بەشێک) و میرانەی تووتن و داهاتی دیکە[٤٠]. ئیدارەی گشتی قەرزی عوسمانی مافی جبایەی میرانەی تووتنی لەساڵی ١٨٨٣ز گواستەوە بۆ کۆمپانیایەکی بیانی (کۆمپانیای پەنگخواردنی تووتن لە ئیمپراتیۆریەتی عوسمانیدا) بەناوە کورتکراوەکەی (ریجی- RegiE)[٤١] ئەو کۆمپانیایە مەئمورێکی هەبوو لە قەزای هەولێردا ئەوەی کە زۆربەی سالنامەکانی ویلایەتی موسڵی عوسمانی ئاماژەیان پێداوە[٤٢].

هەروەها کاروباری قەزایی و دادوەری لەقەزای هەولێر کەوتبووە ژێر پسپۆریەتی دوو دادگا. یەکەم دادگای شەرعی کە بەکێشەکانی شارستانیەتی کەسێتی دادەچۆوە، لەسەر بنەماو بەپێی حوکمە شەرعییەکانی ئیسلامی. میلاکەکەی بەپێی سالنامەی ١٣٣٠ک لەجێگری شەرع (واتە قازی) سلێمان بەگ و سەرۆکی نووسەران (باشکاتب) و نووسەری دووەم لەگەڵ ئامادەکار پێکهاتبوو[٤٣]. کاری ئامادەکار گەیاندنی راگەیاندراوەکان قازی بوو، بۆ لایەنی داواکارییەکان، بۆ ئامادەبوون لەدانیشتنەکانی دادگادا. بەڵام دادگای دووەم دادگای بەرایی بووە لەهەولێر. ئەو دادگایە چاوی بەسەرجەم کێشە مافە رەواکانی نێوان خەڵک دەخشێنێتەوە،

تەنیا کێشە شەرعییەکان نەبێت، چونکە دەچووە خانەی پسپۆریەتی دادگا شەرعییەکان[٤٤]. حوکمەکانی ئەو دادگایە لەدادگای بەرایی لە سەنجق دەست پێدەکرایەوە[٤٥]. واتە لەدادگای بەرایی کەرکوک. میلاکی دادگای بەرایی لە هەولێر بەپێی ساڵنامەی ١٣٠٨ک لە قازی و نووسەری یەکەم و نووسەری دووەم، و یاریدەدەری لێکۆڵینەوەو دوو ئەندام عەلی ئەفەندی و عومەر عەمران ئەفەندی و، دوو مەئموری جێبەجێکار پێکهاتبوو. ئەو میلاکە لەساڵنامەی ١٣١٠ک دووبارە بۆتەوە[٤٦]. بەڵام ساڵنامەی ١٣١٢ک فەرمانبەرێکی دیکەی خستۆتە سەر میلاکەکە لەدادگای هەولێر نووسەری گرێبەستەکانە[٤٧]. لەکاتێکدا ساڵنامەی ١٣٢٥ک هەمان میلاکی دووپات کردۆتەوە، لەگەڵ باسکردنی وەزیفەی لێکۆڵینەوەو یاریدەدەری لێکۆڵینەوە[٤٨]. بەڵام لە ساڵنامەی ١٣٣٠ک تەنیا یاریدەدەری لێکۆڵینەوە هاتووە[٤٩].

کارەکانی جێبەجێکردنی حوکمەکان و سزاکان کە دادگاکانی سەرەوە دەری دەکەن دەکەونە ئەستۆی (بەرزەفتکار) کە وەک هێزەکانی پۆلیسی ئێستاکەبوو. هەر لەهاتنە ناوەوەی کارەکانی پاراستنی ئاسایش و بەرزەفتی تاوانباران و هێنانی تاوانباران بووە. وێڕای پاراستنی گەشتیاران لەرێگران و هەڵسان بەکاری دیکە[٥٠]. ساڵنامەکانی ١٣١٢ک و ١٣٢٥ک ناوی هەندێ ئەفسەری (بەرزەفتکار)یان هێناوە، کە سەر بەفەوجی بەرزەفتکاری کەرکوک بوونە[٥١]. هەروەها ئاماژە بەبوونی فەوجێک دەکەن لەتیپی موسڵ لەهێزەکانی یەدەگ لەقەزای هەولێردا. ئەو فەوجە بۆ چوار سریە یان کەتیبە دابەش دەبوو، ئەمەش ساڵنامەی ساڵی ١٣٣٠ک ناوی لە میلاکەی ئەفسەرا هێناوە[٥٢].

لە هەولێر، وەکو بنکەی قەزاکانی دیکە لەعێراق کاری ئەنجوومەنی شارەوانی چاودێریکردنی بازاڕەکان و پاکژی شەقامەکان و کۆڵانەکان و کاروباری تر بووە(٥٣). ئەنجوومەنی شارەوانی لە هەولێر لە سەرۆکی ئەنجوومەن و ژمارەیەک لەئەندامان، کە لە ئەندامێک تا چوار ئەندام پێکهاتبوو، وێڕای نووسەر، ئەنجوومەن و ئەمینداری سەندووق. هەروەک لەو خشتەیەدا کە پشت بەساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵی عوسمانی دەبەستێت روون دەکاتەوە[٥٤].

بڕوانە خشتەی ژمارە(٢)

بەڵام سەبارەت بەهەردوو ناحیەی دزەیی و سوڵتانیە کە سەر بەقەزای هەولێرن، میلاکی ئیدارییان لەبەڕێوەبەری ناحیەو نووسەرێک پێکهاتبوو. ساڵنامەی ١٣١٢ک نووسەری باجی بۆ میلاکی ناحیەی دزەیی زیادکردووە. لەساڵنامەی ١٣٣٠ک ئاماژەی بەبوونی جێگری بەڕێوەبەری ناحیە کردووە بۆ هەر ناحیەیەک لە هەردوو ناحیەی ناوبراودا[٥٥]. هاوکات لە هاتنە ناوی کارەکانی بەڕێوەبەری ناحیە بلاوکردنەوەی یاساکان و سیستەمی دەوڵەت و جاڕدانی فرمانەکان بووە لەناحیەکەیدا. دەبوا ئاگاداری قایمقام بکاتەوە کە سەر بەو قەزایە بووە لەو زانیاریانەی موختاری گوندەکان لە منداڵبوون و مردن و کێشەی میرات و داوا تۆمارکردن لەسەر زەویوزار و ژمارەیەک کاری دیکە، کە بەبەڕێوەبەری ناحیەی گەیاندبوو[٥٦].

**پەراوێزەکان:**

١- عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث (القاهرة- ١٩٦٨م) ص١٠٧.

٢- عبدالجبار قادر غفور، "أربيل في السالنامات العثمانية" مجلة كاروان، العدد ٩١، السنة التاسعة- كانون الاول ١٩٩٠، ص١١٩.

٣- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، محمد سلمان حسن، التطور الاقتصادي في العراق: التجارة الخارجية والتطور الاقتصادي ١٨٦٤- ١٩٥٨، ج١ (بيروت- ١٩٦٥).

٤- دائرة المعارف الاسلامية، ترجمة محمد ثابت الفندي واخرون (طهران- د.ت) م١، ص٥٧٤.

٥- بۆ نموونە بڕوانە، سالنامە ولايت موصل، ١٣٠٨ھ، ص١٤٣، سالنامە ولايت موصل، ١٣٣٠ھ، ص١٧٨. لە پەراوێزەکانیدا هاتوودا بۆ ساڵنامە ویلایەی موسڵ (س.و.م) دەنووسین.

٦- ساڵنامە ویلایە موسڵ ساڵی ١٣٣٠ک ژمارەی قوتابخانەکان دادەنێت، عوسمانییەکان ناوی (مدرسە) بۆ قوتابخانە ئاینییەکان دادەنێن، بەڵام بۆ قوتابخانە فەرمییەکان (مەکتەب). کەچی ساڵنامەی (االمعارف العمومي العثمانية)ی ساڵی ١٣١٨ک ناوی حەوت

| مێژووی ساڵنامە | سەرۆکی ئەنجوومەنی شارەوانی | ئەندامانی ئەنجوومەن | نووسەری ئەنجوومەن | ئەمینداری سەندووق |
|---|---|---|---|---|
| ١٣٠٨ك | ئەحمەد ئاغا | دەروێش ئاغا، مەحمود ئەفەندی، وەلی ئەفەندی | یوسف ئەفەندی | ---- |
| ١٣١٠ك | حاجی ئەحمەد ئاغا | مەحمود ئەفەندی | تاهیر ئەفەندی | تاهیر ئەفەندی |
| ١٣١٢ك | حاجی ئەحمەد ئاغا | محەمەد ئەفەندی، حوسێن ئەفەندی، مەلا مەحمود، خواجە ئەلیاهو | تاهیر ئەفەندی | باروخ ئەفەندی |
| ١٣٢٥ك | عەبدولرەزاق ئاغا | حاجی اسماعیل ئەفەندی، خدر ئەفەندی | یوسف زیا ئەفەندی | --- |
| ١٣٣٠ك | عەلی سامی ئەفەندی | ----- | یوسف زیا ئەفەندی | عەبدوڵلاّ ئەفەندی |

خشتەی ژمارە(٢)

مەدرەسەی ئایینی دەبات، ئەوانیش ئەبووبەکر، فاتمەخان، خانەقا، جامعجول، جامعەی اسحاق، حاجیە ئامینە، عەبدادشادری، کەمترین ژمارەی قوتابیانیش لە قوتابخانەی (ئامینە)ن کە شەش قوتابین، بەڵام زۆرترینیان لە مەدرەسەی فاتمەخانە، کە (٢٠ قوتابین). هەر هەموشیان لە هەر حەوت مەدرەسەی دەگاتە ٨٣ قوتابی.

سالنامە نظارت معارف عمومیة، ١٣١٨د (دار الخلافة العلیة- ١٣١٨د) ص ص ١٥٨٤- ١٥٨٥د.

٧- ژمارەی سەر ژمێری دانیشتوانی هەولێر بە دەستەوە نییە، بەڵکو سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ژمارەی نێر لە قەزای گشتی دەکەن، چونکە باری کۆمەلایەتی رێگر بووە لەبەردەم سەرژمێری ژنان و مێ و ناونووس کردنیان ئەو وەسیقەیەی سەبارەت بە موسڵ و کەرکوک لە نێوان ساڵەکانی٧ ١٥٢٥- ١٩١٩م ز دەسکەوتووە، کە واژەی دانیشتوانی هەولێر١١٦٣٧،کەسە١٠٦٧٧ موسڵمان، و ٣٤٠ مەسیحی کاتۆلیکی و ٦٢٠ یەهودی. لە هەشتاکان ١٣٣٠ ک قەزایە گشتی بە ١٤١٨١کەس دادەنێ، لە کاتێکدا ئەم ساڵنامە دان بەوە دادەنێ، کە ئەم سەر ژمێرە عەشیرەتە کۆچەرییەکان ناگرێتەوە. بەڵام ئێمە ژمارەی دانیشتوانی هەولێر بە نزیکەی ١٠٠٠٠ کەس دادەنێین کە پشت بە ژمارەی خانووەکانی شار دەبەستێت (١٨٢٢ماڵ). بە رەچاوکردنی تێوەندی ژمارەی خێزانی لەنێوان (٥- ٦) کەس. سەبارەت بە ژمارەکانی سەرەوە، بڕوانە: س.و.م.، ١٣٣٠هـ، ص ص ٣٣٠- ٣٣١، و

T.C.Bas Bakanlik Devlet Arsivleri Genel Mudur lugu Osmanli Arsivi Daire Baskanligi, Mosul- Kerkuk i- ilgili Arsiv Belgeleri 1525-1919 (Ankara- 1993) s.12.

٨- دائرة المعارف الاسلامیة، م١، ص ٥٧٢، عباس العزاوي، تاریخ العراق بین احتلالین، ج٧ (بغداد- ١٩٥٥) ص ص ١١٦- ١١٧.

٩- سنجقی کەرکوک بە فەرمی هەت دەرچوونی فەرمانی لە ٢٦ شەعبانی ١٣١٠ک، ١٨٩٣ز لە لایەن سوڵتانی عوسمانی کرا بە کەرکوک، هەر بە شارەزوور دەناسرا. حتي صدور امر من السلطان العثماني في ٢٦ شعبان ١٣١٠د/ ١٨٩٣م باستخدام تسمیة کرکوك بدلا من شهرزور رسمیا. انظر مختارات من کتاب الموصل وکرکوك في الوثائق العثمانیة، ترجمة وتعلیق خلیل علي مراد (السلیمانیة- ٢٠٠٥) ص٦٩.

١٠- جميل موسي النجار، الادارة العثمانية في ولاية بغداد ١٨٦٩-١٩١٧، ط٢ (بغداد- ٢٠٠١) ص١١٧.

١١- ستيفن هيمسلي لونكريك، أربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة جعفر خياط، ط٣ (بغداد- ١٩٦٢) ص٣١٨.

١٢- س.و.م. ١٣٠٨ه، ص١٤٢.

١٣- هەمان سەرچاوە، س.و.م. ١٣١٢ه، ص٣١٩.

١٤- بۆ نموونە بروانە، س.و.م، ١٣١٢ه، ص١٦٩.

١٥- س.و.م، ١٣٣٠ه، ص٢١٨، فەیسەڵ دەباغ، کوردستان لە چاپکراوە عوسمانلییەکاندا (هەولێر- ٢٠٠٤) ص١٨.

١٦- س.و.م، ١٣٣٠ه، ص٢٨١، بينما تذكر مصادر أخري ان عدد القري ضمن حود قضاء اربيل كان ٣٣٠ قرية. انظر،

Turkiye Diganet Ualfi, Islam Ansiklopedisi,Cilt, II, (Istabul-1995).

١٧- الدستور، مجموعة التنظيمات العثمانية، ترجمة نوفل نعمة الله نوفل، م١ (بيروت- ١٣٠١) ص ص٣٨٩-٣٩٠.

١٨- هەمان سەرچاوە، ص٤٠٧.

١٩- س.و.م، ١٣٢٥ه، ص٢١٨.

٢٠- النجار، سەرچاوەی پێشوو، ص١٩٤.

٢١- س.و.م، ١٣٠٨ه، ص١٣٠، س.و.م، ١٣١٢ه، ص١٦٧، س.و.م، ١٣٢٥ه، ص٢١٨، س.و.م، ص٢٧٤، عماد عبدالسلام رؤوف، الاسر الحاكمة ورجال الادارة والقضاء في العراق في القرون المتأخرة (بغداد- ١٩٩٢) ص٢٧٥.

٢٢- بۆ نموونە، س.و.م، ١٣١٠ه، ص١٨٨، س.و.م، ١٣٣٠ه، ص٢٧٤.

٢٣- الدستور، م١، ص٤٠٧، النجار، سەرچاوەی پێشوو، ص١٩٥، غانم محمد علي، النظام المالي العثماني في العراق ١٨٣٩-١٩١٤، رسالة ماجستير، كلية الاداب- جامعة الموصل، ١٩٨٩، ص٥٦.

24- British Admirality, A Hand book of Mesopotamia vol. I ,2 nd p.142.(November- 1919)edition

٢٥- س.و.م، ١٣٠٨ ه، ص١٣١، س.و.م، ١٣١٠ه، ص١٨٨، س.و.م، ١٣١٢ه، ١٦٧، س.و.م، ١٣٢٥ه، ص٢١٨، س.و.م، ١٣٣٠ه، ص٢٧٤.

٢٦- س.و.م، ١٣٠٨ه، ص١٣١.

٢٧- س.و.م، ١٣١٠ه، ص١٨٩.

٢٨- س.و.م، ١٣١٢ه، ص ص ١٦٧- ١٦٨.

٢٩- س.و.م، ١٣٢٥ه، ص٢١٨.

٣٠- هەمان سەرچاوە.

٣١- س.و.م، ١٣١٢ه، ص١٦٨.

٣٢- شارل عيساوي، التاريخ الاقتصادي للهلال الخصيب ١٨٠٠-١٩١٤، ترجمة رؤوف عباس حامد (بيروت- ١٩٩٠) ص١٩٥.

٣٣- هەمان سەرچاوە

٣٤- س.و.م، ١٣٢٥ه، ص٢١٩.

35- A Handbook of Mesopotamia, p. 149.

٣٦- س.و.م، ١٣١٠ه، ص ص ٩١-١٨٩.

37- A Handbook of Mesopdtamia, p.150

٣٨- بۆ نموونە، س.و.م، ١٣٣٠ه، ص٢٧٦.

٣٩- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەم قەرزانە و بەم لایەنانەی قەرزیان داوەتە دەوڵەتی عوسمانی بروانە: خليل علي مراد، "تغلغل الرأسمال الاجنبي في الدولة العثمانية" دراسات تركية (جامعة الموصل) العدد ٢، السنة الاولي، كانون الاول- ١٩٩١، ص ص١٣٣- ١٦٤.

٤٠- علي، سەرچاوەی پێشوو، ص ص٦٧- ٦٨، فلاديمير لوتسكي، تاريخ الاقطار العربية الحديث، ترجمة عفيفة البستاني (موسكو- ١٩٧١) ص ص ٣٨٤- ٣٨٥.

٤١- علي، سەرچاوەی پێشوو، ص٦٩.

٤٢- بۆ نموونە، س.و.م، ١٣١٠ه، ص١٨٩، س.و.م، ١٣٢٥ه، ص٢١٩، س.و.م، ١٣٣٠ه، ص٢٧٦.

٤٣- س.و.م، ١٣٣٠ه، ص٢٧٤.

٤٤- عبدالرحمن عبدالله محمد الصراف، النظام القضائي في الموصل في العهد العثماني الاخير ١٨٣٤- ١٩١٨، رسالة ماجستير، معهد التاريخ العربي والتراث العلمي للدراسات العليا، بغداد- ٢٠٠٠، ص٨٩.

٤٥- نسيبة عبدالعزيز ماجستير، كلية الاداب- جامعة الموصل، ٢٠٠٢، ص٢١٢.

٤٦- س.و.م، ١٣٠٨ه، ص١٣١، س.و.م، ١٣١٠ه، ص١٨٨.

٤٧- س.و.م، ١٣١٢ه، ١٦٧.

٤٨- س.و.م، ١٣٢٥ه، ص٢١٨.

٤٩- س.و.م، ١٣٣٠ه، ص٢٧٥.

٥٠- علاوی، سەرچاوەی پێشوو، ص١٠٢.

٥١- س.و.م، ١٣١٢ه، ص ص ١٤٣- ١٤٤، ١٦٨، س.و.م، ١٣١٢٥ه، ص٢١٨.

٥٢- س.و.م، ١٣٣٠ه، ص ص ١٨١- ١٨٢.

٥٣- غفور، سەرچاوەی پێشوو، ص١٢١.

٥٤- س.و.م، ١٣٠٨ه، ص١٣١، س.و.م، ١٣١٠ه، ص١٨٨، س.و.م، ١٣١٢ه، ١٦٢، س.و.م، ١٣٢٥ه، ص٢١٨، س.و.م، ١٣٣٠ه، ص٢٧٥.

٥٥- س.و.م، ١٣٠٨ه، ص١٣١، س.و.م، ١٣١٢، ص١٨٩، س.و.م، ١٣١٢ه، ص١٦٩، س.و.م، ١٣٣٠ه، ص٢٧٦.

٥٦- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەم بابەتە، بروانە: ، الدستور، م١، ص ص ٤٠٨- ٤٠٩.

# هەولێر لە کۆتایی سەردەمی عوسمانیدا

دکتۆر ئیسماعیل شوکر رەسول*

لە سەردەمی عوسمانیدا شاری هەولێر زۆر لایەنی ناوداریی خۆی لەدەست دا، بوو بە قەزایەکی بچووکی لەبیرکراو، لەگەڵ ئەوەی ئەوانەی تورک بوون، ببوون بە موسڵمانی زۆر چاک لە وڵاتی تازەیان ئەنادۆڵ بەهۆی رۆڵی زانایانی بەغدا و هەولێر، کە دەهاتن لێیانەوە فێری رێنمایی و زانیاری ئایینی و شەرعی دەبوون، بەپێی گەواهی پرۆفیسۆر (کردلیفیسکی)، دەسەڵاتدارانی عوسمانی بایەخیان تەنها بە (کۆکردنەوەی باج و خەراج) دەدا لە دانیشتوانی شارەکە و دەست بەسەرداگرتنی زەوییە بەپیت و باشەکان و دەیانخستە سەر (موڵکداری هەمایۆنی)، کە بەناوی سوڵتانەوە تۆمار کرابوو، بەڵام باشەکانی شارستانی و شوێنی جوگرافی و شوێنی دیاری لەسەر ئاستی عیراقدا، ئەوەیان بۆ هەولێر مەیسەر کردبوو. هەولێر لە سەردەمی عوسمانییەکاندا لە رووی شوێن و کاتدا، (لە ساڵنامەکانی عوسمانیدا) ناوی زۆر هاتووە دەڵێت:" کە لە دەیەی هەشتەمی سەدەی نۆزدە قەزایەک بووە سەر بە ویلایەتی موسڵ"، سێ سەد گوند دەوری داوە (٤٨) لەم گوندانە لە رووی کارگێرییەوە سەر بە سوڵتان بوون، کە (٧٠٪) دەکەوێتە دەوروبەری هەولێر، بەڵام ناوچەی شەمامک بە (موڵکداریەتی سوڵتانی هەمایۆنی) ناسرابوو. ئەم زاراوەیە بۆ موڵکداریەتی سوڵتان بەکاردێت. دانیشتوانی شارەکە لە ساڵی ١٨٩١دا ٣٧٦٢ کەس بووە، کەواتە سەرجەمی دانیشتوانی شار (٨) هەزار کەس بوون. لە ١٨٢٢ ماڵ نیشتەجێ بوون، بەکاری بازرگانی و کاری دەستی خەریک بوون. لە شار ٦٣٧ دوکان و ١١ چایخانە هەبوو، سێ گەرماوی تێدابووە، ژمارەی مزگەوتەکانی شار (١٢) مزگەوت بووە، (١١) قوتابخانەی ئایینی تێدابووە، ماڵەکانی قەڵا بەسەر دوو بەشدا دابەش کراوە: بەشی یەکەم خانووەکانی قەڵای هەولێر بووە، کە لە سێ گەڕەک پێکهاتبوو (تۆپخانە، سەرای، تەکیە) دانیشتوانەکانی لە ئاغاکان و بازرگانان (چەلەبی) و موڵکدارەکان پێکهاتبوون، کە ئۆرستۆکراتیەتی شارەکەیان پێکدەهێنا، بەڵام بەشی خوارەوەی قەڵا ناوی (کورتەک محەلە) بووە بەسەر چەند گەڕەکێک دابەش دەبوو لەوانە:

**١- گەڕەکی عارەبان: (کۆڵانی عارەبان):**

شوێنی ئەم گەڕەکە دەکەوێتە پشت باڵەخانەی پارێزگای کۆن هەر لە مزگەوتی شێخی چۆڵییەوە، تاوەکو بازاڕی کۆنی هەولێر، بۆیەش بە گەڕەکی عارەبان ناونراوە، چونکە کاتی خۆی چەند ماڵە عارەبێک هاتوونەتە ئەوێ و خانوویان تێدا دروست کردووە، زۆربەیان نانەوای بەتوانا بوون، لەسەردەمی عوسمانیدا خەڵکی بەناوبانگیان هەبوو هەروەها لەسەردەمی پاشایەتیدا زۆر کەسایەتی وەک: (محەمەد حوسێن حەلاوی) و (عومەر وادی) و (شەشاو) و (بلباو) و چەندانی دیکەی لێ هەڵکەوتووە.

**٢- گەڕەکی تەعجیلی جوولەکان:**

نزیک گەڕەکی عارەبان بووە نزیک گۆڕەپانی ئاشتی و دۆڵی هەولێر بووە، زۆربەی دانیشتوانی کاتی خۆی جوولەکە بوون، خەریکی کاری بازرگانی و کاری دەستی وەک زێرینگەری و دوورمان بوون. پەرستگایەکی تایبەت بەخۆیان هەبوو.

**٣- گەڕەکی تەعجیلی موسڵمانان:**

بەگەڕەکی تەعجیلەوە نووسابوو، لە نزیک شەقامی سەرەکی نزیک فەرمانگەی کارەبا کۆتایی دەهات.

**٤- گەڕەکی خانەقا:**

سەرەتاکەی لە چێشتخانەی تاجریانەوە دەست پێدەکات، تاوەکو کۆشکی عەتائوڵلاغا نزیک ئوتێلی فەرید، ئەم کۆشکە دوورترین شوێنی

شاری هەولێر بوو ئەوکات، لەلای ڕۆژهەڵاتەوە، هەروەها مزگەوتی شێخ ئەبوبەکر دوورترین خاڵی لای باکوور بوو، منارەی شێخی چۆڵی لە دەرەوەی شار بوو، لەلای ڕۆژئاواوە، گردی قالیج ئاغا نزیک باڵەخانەی شارەوانی بووە، دووریش بوو لە هەولێر خەڵکی هەولێر ئەوکات بۆ سەیران سەردانی ئەوێیان دەکرد.

خەڵکی قەڵا لە ئاغاکان و موڵکدارەکان و بازرگانان و دەوڵەمەندەکان پێکهاتبوون، بەڵام دانیشتوانی خوارەوەی قەڵا لە کرێکار و کاسبکار و خاوەن پیشە دەستییەکان و وەرزێران پێکهاتبوون و لە دەوروبەری شاری، کاری کشتوکاڵییان دەکرد. بە شێوەیەکی گشتی خەڵکی هەولێر، دابەش دەکران بۆ، ئۆرستۆکراتیەتی شارەکە لە ئاغا و گەورە بازرگانان و موڵکدارەکان و لە چینی ناوەڕاست، کە فەرمانبەری حکومەت و پیاوانی ئایینی و ڕۆشنبیر پێکدەهات، زۆر لەو ڕۆشنبیرانە نازناوی (ئەفەندی)یان پێدەدرا، کە ڕۆڵیان لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی لەنێو شارەکەدا هەبوو، بەڵام کاسبکاران و کرێکاران و خاوەن پیشە دەستییەکان و ئەوەی توێژە کۆمەڵایەتییەکانی خوارەوە، زۆرینەی دانیشتوانی شاریان، پێکدەهێنا ژیانێکی کولەمەرگی دەژیان و وەک ڕەنجدەرانی شاری عوسمانییەکان بوون لە ناوچەکەدا.

بەهۆی جۆراوجۆرەوە لە سەرەتادا هۆیەکان زۆر بوون، وەک کەمیی خزمەتگوزارییە گشتییەکان، کە نزمترین ئاستی چاودێری نەبوو، لەلایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە، کە باری شارەکە بە باج و خەراج قورس کرابوو، بۆیە ڕەوتی پێشکەوتن زۆر سست بوو لە شارەکەدا، لەبەرئەوە نەتوانرا بەدرێژایی ئەم مێژووە دوور و درێژە، خاڵی وەرچەرخان تۆمار بکرێت، بۆ نموونە دانیشتوانی هەولێر لە ساڵی ١٩٠٧ کەمی کرد بە بەراورد لەگەڵ ساڵی ١٨٩١، بەپێی زانیارییەکانی کە لە ساڵنامەی عوسمانییەوە بڵاوکراوەتەوە، نەدەتوانرا کەمترین ئاستی خزمەتگوزاری بۆ مانەوە لە ژیان دابین بکرێت، بۆیە بوومەلەرزەی ساڵی ١٩٠٥ لەبیری زۆر خەڵک مایەوە، کە چ کارەسات وماڵوێرانی بەسەر شارەکەدا هێنا، کە ژێرخانێکی لاوازی هەبوو، کارگێڕانی شارەکە بێ توانا بوون لە ڕووبەڕوو بوونەوەی هەر بارێکی نائاسایی، کە ئەمە سیمایەکی گشتی سەرجەم شارەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی بوو.

ئەم کارگێڕانەی شار لە (قایمقام) و (موفتی شار) و (بەڕێوەبەری دارایی) و (بەڕێوەبەری تۆمارکردن) پێکهاتبوون، کە ئەنجومەنێکیان لێ پێکدەهات بەسەرۆکایەتی (قایمقام)، چەندین فەرمانبەریشیان لەبەردەستدا بوو، ئەگەر لایەنی باج وەرگرتنی لێ دەرکەین، گرنگی شاری هەولێر لەم دەمەدا ئەڵقەی پێکەوە گرێدانی بەغدا و ئەستەمبوڵ بوو، هەر لەسەر لەنوێ پێکهێنانی ویلایەتی موسڵ لە ساڵی ١٨٧٩ باری کارگێڕی هەولێر سەقامگیر بوو، بەوەی قەزایەکی سەر بە کەرکووک بوو، وەک کۆیێ و ڕەواندز و ڕانیە حسابی بۆ دەکرا، ئەمەش ئاماژەیە بەوەی پاشەکشەیە سەبارەت بە قورسایی ئەم شارە لە مێژوودا، کە ڕۆڵی گرنگی هەبووە، لە ڕووی زانستی و کارگێڕی. زۆر بنەماڵەی هەولێری ناسراوی تێدابوو لە سەرانسەری ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا، تەنانەت لە ئەستەمبوڵیش، لەوانە (ئیبراهیم حەیدەری) لە ساڵی ١٨٦٤ لە هەولێر لەدایک بووە، لەم پێناوەدا شەهید کراوە و زۆر پلە و پایەی گەورەی پێدراوە، لەوانە سەرۆکی دادگای بازرگانی لە شاری (جەدە) داواکاری گشتی بووە لە موسڵ، ئەندامی ئەنجومەنی مەعاریفی گەورە بووە لە ئەستەمبوڵ، سەرۆکی لیژنەی ماڵی خێرخوازی بووە لە ساڵی ١٨٩٨، قازی دیاربەکر بووە لە ساڵی ١٩٠٦ و پاشان سەرۆکی کاروباری شەرعی بووە لە دەزگای دەفتەری خاقانی لە ئەستەمبوڵ، ئەندامی خانەی ئیسلامی بوو لە کاتی دامەزراندنی لە ساڵی ١٩١٥، پاشان شێخی موسڵمانان بووە لەگەڵ تەواو بوونی جەنگ. لە بارە گشتییەکەدا نەوەکو تایبەتی، کوردەکانی هەولێر و دەوروبەری حەساوە و بەختەوەر نەبوون لەژێر سایەی فەرمانڕەوایی عوسمانیدا، کە داکشانی ئابووری هەبوو، سستی کۆمەڵایەتی و واقیعێکی کارگێری گەندەڵ هەبوو، بەووە بارێکی قورس لەسەر شانی خەڵک، ئەوکات نە میکانیزم و نە هۆکار هەبوو بۆ گۆڕینی ئەم بارە نالەبارە، تەنها بە قسە لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی

مزگەوت و چایخانە و بازاڕەکان قسەی لەبارەوە دەکرا، ناوی هەولێر بەستراوە بوو بەناوی هۆزەکانی، کە چەندین ڕاپەڕینی تێدا کرا لەکۆتایی حوکمی عوسمانیدا، وەک شۆڕشی (شێخ عەبدولسەلامی بارزانی) لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانی، هەروەها مستەفا هەولێری سەرکردەی هێزەکانی شێخ بوو، بۆیە عوسمانییەکان ناچار بوون هێز لە دژیان کۆبکەنەوە تاوەکو شۆڕشەکە خامۆش کرایەوە، هەروەها ئاماژە بەوە کراوە، کە هۆزی دزەیی لەم شۆڕشە بەشداربوونە و هاوسۆزی بوون.

بەرلەم مێژووە بە ماوەیەک هەولێر کاریگەر بوو بە ڕووداوەکانی کوردستان، وەک ململانێی بابانییەکان لەسەر دەسەلات هەروەها ڕووداوەکانی میرنشینی سۆران، لە دەیەی سێیەم و چوارەمی سەدەی نۆزدەهەم هەولێر بەشێک بوو لە میرنشینی ناوبراو، محەمەد پاشای ڕەواندز یەکێ لە خزمەکانی بۆ فەرمانداەی هەولێر دانا، ئەم کاریگەرییە زیاتر بوو، وەک ئەنجامێکی سروشتی گۆڕانکارییەکان، کە ناوچەکە تیایدا دەژیا دوای ئەوەی بەستراوە بە بازاڕی سەرمایەداری جیهانی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، ئەم مەسەلەیە زیاتر ئاکامی کۆمەلایەتی و ئابووری لێ کەوتەوە، تاوەکو کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم لە گەشەدا بوو، لەگەلا هاتنی سەدەی بیستەم شۆڕشی ئیتحادییەکان لە سالی ۱۹۰۸ بەرپا بوو لەگەلا ئەنجامە گرنگەکەی لەسەر ئاستی دەولەتی عوسمانی بۆ ئەوەی ببێتە سەرەتایەکی سادە، کە گۆڕانکاری چۆنایەتی کە گونجاو بوو لەگەل ئاکامە فرەلایەنەکانی گەشەسەندنی هۆشیاری سیاسی کوردی لەسەر بنەمای دروشمی تازە و دامەزراندنی ڕێکخستن و گرووپی سەربەخۆ یەکێ لە دیاردە گرنگەکانی ئەم وەرچەرخانە چۆنایەتییانە بوون، کە کاریگەری گەیشتە شاری هەولێر و شارەکانی دیکەی باشووری کوردستان.

دوای ئەوەی ئیتیحادییەکان لە پاشەکشەدا بوون لە بەلێنەکانیان و پەیمانەکانیان ڕوویان لە ڕەوتێکی شۆڤینی کرد، بووە هۆی سست بوونی دیاردە تازەکان و بلاونەبوونەوەیان. بە تایبەتی سیستەمی تازە و ولاتی تووشی گرفت و جەنگی خوێناوی کرد، ڕێگەی خۆش کرد بۆ چوونە نێو جەنگی یەکەمی جیهانی. چوار سالەکەی دوایی حوکمی عوسمانی هاوکات بوو لەگەلا چەندین گۆڕانکاری گەورە، کە ئاکامی خراپی هەبوو لەسەر خەلکی ناوچەکە، برسییەتی و هەژاری و نیگەرانی تووشی خەلکی هەولێر بوو، ڕاکردن لە سەربازی لە زیادبووندا بوو، ڕێژەیەکی زۆر کەم ڕوویان لە سەربازی دەکرد، بەر لەوەی جەنگ کۆتایی بێت. شاری هەولێر بوو بە گۆڕەپانی کردەی سەربازی لەنێو هێزە شەڕکەرەکان ڕەواندز یەکێ لە بەرەی شەڕەکان بوو، کە هێزەکانی ڕووسیای قەیسەری لە سالی ۱۹۱٦دا گەیشتنە ئەوێ، کە دژ بە هێزی دەولەتی عوسمانی، ئەم هێزە ڕووسییەی لە دەربەندی ڕایاتەوە هاتبوون چەند هەفتەیەک لە ناوچەکە مانەوە، عوسمانییەکان پاشان شوێنەکانیان داگیر کردەوە، لە سەرەتادا هۆزەکانی هەولێر هاوکاری عوسمانییەکانیان نەدەکرد لە دەرکردنی ڕووسەکان، بەلام ئەم هەلە و تاوانانەی، کە ڕووس و ئەرمەنە هاوپەیمانەکانی کردبوویان، وای کرد بە ناچاری هۆزەکانی ناوچەکە هەلوێستی خۆیان بگۆڕن و بووە هۆی هاریکاری عوسمانییەکان، دوای ئەوەی هێزەکانی بەریتانیا لە یانزەی ئاداری سالی ۱۹۱۷ بەغدایان داگیرکرد، قۆناغێکی تازە لە گۆڕەپانی جەنگ هاتە ئاراوە، کە ململانێی توند بوو لەنێوان لایەنە بەشەڕ هاتووەکان، سوپای بەریتانی زۆر شوێنەکانی گرت، لەوانە توزخورماتو و کەرکووک و ئالتوون کۆپری (پردێ) تاوەکو گەیشتە دەروازەی شاری هەولێر، لەگەلا ئەوەی هێزەکانی بەریتانیا لەو ناوچانە لە کۆتاییەکانی جەنگدا کشابووەوە.

پاشان لە (۳۰)ی مانگی تشرینی یەکەمی ۱۹۱۸ دانوستانی (مۆدرۆس) بەسترا، کە کۆتایی بە جەنگی نێوان عوسمانییەکان و هاوپەیمانان هێنا، لەوکاتەوە سەردتای قۆناغێکی تازە لە مێژوودا لە ناوچەکەدا دەستی پێکرد، هەروەها شاری هەولێر و دەوروبەری وەک بەشەکانی دیکەی کوردستانی باشوور و عیراق کەوتە ژێر دەسەلاتی داگیرکاری بەریتانیا پاشان قۆناغی ئینتیدابی بەریتانی دەستی پێکرد.

**٭ ئەندام پەلەمانی عێراق**

# هەولێر لە ساڵانی داگیرکاری و ئینتیدابدا

دکتۆر ئیسماعیل شوکر رەسول*

بەندەکانی پەیماننامەی (مۆدۆرۆس) عوسمانییەکانی پابەند کرد،، کە هەموو شوێنەکانی ژێر دەسەڵاتیان بە سەرکردەیەکی هاوپەیمانان بدەن، مافی داگیرکەر هەموو خاڵێکی ستراتیژییە، نابێت ئاشتییان لەژێر هەڕەشەدا بێت، بەریتانییەکان ئەمەیان کردە بیانوو بۆ داگیرکردنی ویلایەتی موسڵ، لەوانە، لەماوەی چەند هەفتەیەکدا دوای کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی هەولێریان داگیرکرد.

بەریتانییەکان لە (١٠)ی مانگی تشرینی دووەمی ١٩١٨ گەیشتنە ناو هەولێر، کاپتنێکی ئینگلیز گەیشتە هەولێر، هەولێری بەناوی حکومەتی بەریتانیا لە عوسمانییەکان وەرگرت،، کە دەسپێکی قۆناغی داگیرکاری بەریتانی بوو، ئەوکات هەولێر قەزایەکی سەر بە موسڵ بوو، تاوەکو ساڵی ١٩١٩ وەها مایەوە، تاوەکو بوو بە لیوا و هەردوو قەزای ڕەواندز و کۆیێ سەر بە ئەو بوون، کاپتن(سێر ئەرنۆڵد لویس) ئینگلیزی بوو بە حاکمی سیاسی ئەم لیوا تازەیە، کاپتن دەڵێت: "حاکمی مەدەنی سیاسی عیراق بە وەکالەت لەکاتی داگیرکردندا پیاوێکی بلیمەت و زیرەکی سیاسی بوو"، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە کوردەکانەوە هەبوو و یارمەتیدەرێکی خۆی لە کۆتاییەکانی جەنگ لە شاری مەندەلی دانا.

(مێجەر سۆن)، کە زۆر بەناوبانگ بوو، ئەویش پاشان بوو بە حاکمی سیاسی بەریتانی، واتا لەژێر فەرمانی شارەزاترین پسپۆر لە کاروباری کوردەکان دانراوە، بەر لەوەی ببێت بە حاکمی سیاسی لە هەولێر، کارگێڕی داگیرکاری لە (ئاڵتون کۆپری) و (کۆیێ) و (رانیە) و (پشدەر) دانا، ئەو حاکمە سیاسییە تاوەکو کۆتایی ساڵی ١٩٢٠ مایەوە، پاشان بۆ فەرمانگەی سیاسی حکومەتی بەریتانیا لە هیندستان گواسترایەوە، دوای ئەوەی سەرکەوتنی دیاری بەدەست هێنا، چونکە پەیوەندی توندی لەگەڵ پیاوە دیارەکان و سەرەک هۆزەکانی ناو شاری هەولێر و دەوروبەری بەستبوو. ئەو مامەڵەی زیرەکانەی لەگەڵ کەسایەتییەکانی هەولێر دەکرد، بۆیە متمانە و دۆستایەتی ئەوانی بۆ خۆی دەستەبەرکرد. دوای ئەوەی لە شاری هەولێر دەرچوو، گوتبووی "بە شێوەیەکی گشتی ئەوان باشترین خەڵکن کە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتدا بینیومن".

هەر لە سەرەتاوە بەریتانییەکان سەرنجی توانا مادی و ئابوورییەکانی هەولێریان دا، حاکمی مەدەنی بەریتانی بریکار دەڵێت: "دوای ئەوەی دانوستانمان لەگەڵ تورکیا کرد، ئێمە کەرکووکمان جارێکی دیکە گرتەوە وەک ئاڵتوون کۆپری، پاشان دوای چەند ڕۆژێک هەولێرمان گرت تاوەکو هێنانی کەلوپەل و پێویستییەکان وەک، دانەوێڵە و سووتەمەنی دەستەبەر بکەین".

سیاسەتی بەریتانیا زیاتر جەختی لەسەر کارکردن بۆ دابینکردنی سەقامگیری لە هەولێر و دەوروبەری بوو، بۆ ئەوەی متمانە و دۆستایەتی سەرەک هۆز و کەسایەتییەکان بەدەست بێنن و دابینی

بەرژەوەندییەکانیان بکەن، لەسەر حیسابی بەرژەوەندی گشتی جووتیاران و وەرزێرەکان، بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم سیاسەتە لەم راپۆرتەدا هاتووە: کە لە ساڵی ١٩١٩دا حاکمی سیاسی هەولێر لەبارەی ململانێی زەوی لە یەکێ لە گوندەکانی ناوچەکە و چۆنیەتی مامەڵەکردنی بەریتانییەکان لەم مەسەلەیەدا نووسیویەتی، لە راپۆرتەکەدا هاتووە: "جەنگی مێژوویی لە گوندی پیران روویدا. مەبەستی "پیرزینە" لەنێوان هۆزەکانی گەردی و دزەیی، لە ساڵانی دواییدا زۆر دادگایی لەسەر مەسەلەی زەوی لەم گوندەدا، هەبووە: بەڵام سێ ئاغا مافی مولکداریەتی زەوییەکانیان بەهۆی پیلانی موختارەکان وەرگرتووە. ئەم ئاغایانە کێشمەکێشمیان لەگەڵ خەڵکی گوندەکەش هەیە کە زەوییەکانیان بردووە. باشترین چارەسەر دەرکردنی ئەم سێ ئاغایەیە و خەڵکی گوندەکەش قەرەبوو بکرێنەوە لەبری نرخی سەرەکی زەوییەکە، کە هیچ نەبووە. ئەمەش پێشهاتێکی ترسناکە، هەر تەنها ئاگادارکردنەوە، ترس و تۆقاندن لە دەروونی پیاو ماقوولانی هەولێر دروست دەکات، بۆیە دەستەیەک سەردانی ئەم گوندەی کردووە و زەوییەکەی بەسەر هەر سێ ئاغاکە دابەش کردووە".

بەریتانییەکان لەسەر شێوازی خۆیان لە ماوەی ساڵانی ئینتیداب لە عێراقدا بەردەوام بوون، هەر لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ وە تاوەکو تشرینی یەکەمی ١٩٣٢. راپۆرتێکی بەریتانی تایبەت بە پێشنیازی لەندەن، لە کانونی دووەمی ١٩٢٠ کە بارێکی کارگێری تایبەت دانەندرێ بۆی و لە شاری سلێمانی لەژێر سایەی ئینتداب تیایدا هاتووە: "ئێمە ئەگەر ئینتدابمان قەبووڵ کرد، لە وڵاتی نێوان دوو رووبارەکە، لەسەرمانە، کە پابەندی سیستەمی تایبەتی ناوچە دیاریکراوەکانی، وەک لیوای هەولێر و لیوای سلێمانی بین. شێوازی حکومەتیش، کە لەو ناوچانە دادەمەزرێ ئەمە پەیوەندی بەکاروباری ناوخۆ هەیە، بۆیە دەوڵەتی ئینتداب چاوی پێدا دەخشێنێ و سوود لە ئەزموون وەردەگرێ".

دوای راگەیاندنی ئینتدابی بەریتانی لە عێراق لە ماوەیەکی کەمدا گۆڕانی کارگێری لە هەولێر روویدا، دوای ئەوەی وابەستەیی لە ساڵی ١٩٢١ لە موسڵەوە بە کەرکووک کرا، ئەم حاڵەتە تاوەکو ساڵی ١٩٢٣ مایەوە، پاشان کرا بە ناوەندی لیوایەکی سەربەخۆ، (ئەحمەد عوسمان)،، کە پیاو ماقووڵێکی هەولێرە، یەکەم موتەسەریفی هەولێر بوو، بەڵام پشکنەری کارگێری بۆ هەردوو لیوای هەولێر و کەرکووک دانرا، کە یەک کەس بوو لە کەرکووک دادەنیشت، هەولێر و دەوروبەری لە سەرجەم بوارەکاندا لە ساڵانی داگیرکردن و ئینتدابی بەریتانی زۆر رووداوی گۆڕانکاری تووش بوو. ئەمەش بەهۆی چەندین هۆکارەوە: لەوانە ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتی عوسمانی بۆ دەسەڵاتی بەریتانی، کە کارگێرییەکی دواکەوتوو بوو، لامەرکەزیەتی تێدا بوو، تەنها بایەخی بە کۆکردنەوەی باج دەدا، پاشان بووە سیستەمێکی سەرمایەداری پێشکەوتوو،، کە کارگێری ناوەندی بوو لە حوکمڕانیدا بەرژەوەندییەکانی وا خواست، کە چەند هۆکارێکی شارستانی تازە بێنێتە ئاراوە، ئەم گەشەسەندنە رێژەییە دیار بوو لە بوارەکانی خوێندن و خزمەتگوزاری تەندروستی و دروستکردنی باڵەخانە و دروستکردنی رێگاوبان و رێکخستنی هاتوچۆ، ئەمە جگە لە چەندین دیاردەی کۆمەڵایەتی و ئابووری، زانیارییەکانی راپۆرتە مانگانەکان: کە موتەسەریفیەت بەرزی دەکردەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ لەسەر بەڕێوەچوونی کاروبارەکانی لیوا. هەندێکیان لێ بڵاو دەکەینەوە بۆ روونکردنەوە، ئەم راپۆرتە مانگانە تایبەتییەی ساڵی ١٩٢٥ وا باس دەکات:

"سوپاس بۆ خودا، هەموو قوتابخانەکان، کە هەن لەم لیوایەدا بەرەو گەشەسەندن دەچن، بەشێوەیەک، کە پێویست بەستایش دەکەن، بۆیە هیواداریـن لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٥ دروستبوونی قوتابخانەی تازە تەواو بێت، فەرمانگەی کار لەسەر کارە مەزنەکانی بەردەوامە". راپۆرتێکی دیکە هەواڵی کردنەوەی قوتابخانەیەکی نوێیە لە شاری هەولێر لە رێکەوتی ٢٠ی مانگی ئەیلولی ١٩٢٥. کە تێیدا هاتووە:، قوتابییەکان بە رێکوپێکی، بە چالاکی و سۆزەوە دەوامی خۆیان دەکەن، ژمارەی قوتابییان لە بەرز بوونەوەدایە، سێ قوتابی زیادی کردووە، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەش (رەشید ئەفەندی) پیاوێکی زیرەکە

بە بەڵگە سەلماندی توانای بەڕێوەبردنی کاروباری قوتابخانەی هەیە.

دەربارەی بەرەو پێشەوەچوونی خەڵکی هەولێر بۆ خوێندن لە دەقی خوارەوەدا،، کە دوا راپۆرتی کارگێرییە دەربارەی بەڕێوەچوونی کارگێڕی لیوایەکە لە ساڵی ١٩٢٥دا هاتووە: "خەڵک وای دەردەخەن،، کە ئارەزووی خوێندنیان هەیە، مامۆستاکان لە گەشەپێدانی رۆشنبیری ماندوو دەبن" لە مەبەست خاڵی نییە ئەگەر بڵێین قوتابیانی ئەم قوتابخانەیە و مامۆستاکانی لە ساڵی ١٩٣٠ شانۆگەرییەکیان پێشکەش کردووە بە نێوی "سەلاحەدینی ئەیوبی"، کە پاڵەوانی شانۆگەرییەکە کورد بووە، جیهانی ئیسلامی لە خاچپەرستەکان رزگار کرد.

لەسەر ئەم رێچکەیەدا شاری هەولێر چەند پێشکەوتنێکی لە بواری تەندروستی بەخۆوە بینی، پێشتر، کە خزمەتگوزاری تەندروستی لە سەردەمی عوسمانییدا نالەبار بوو، بەریتانییەکان چەندین پزیشک و فەرمانبەری تەندروستییان بۆ شارەکە هێنا، لەوانە دکتۆری بەریتانی (ریج جۆنسن)، لە ناوەڕاستی ساڵانی بیست، کە سەرۆکی تەندروستی لیوایەکە بوو، هەروەها دکتۆری هیندی (محەمەد خان) و چەندانی دیکە لەکاتی سەردانیان بۆ هەولێر، شا فەیسەڵی یەکەم خۆی بەردی بناغەی نەخۆشخانەی تازەی شارەکەی دانا. بەهۆی ئەوەوە نەخۆشخانەکە توانی (٧٦) هەزار نەخۆش لە ساڵی (١٩٢٩)دا پێشوازی لێ بکات، لەوانە (٣٩٨)یان نەخۆشی ناوەخۆ بوون. سەرەتای قۆناغێکی بزاوتی بیناسازی دەست پێکرد،، کە بەدرێژایی سەردەمی عوسمانی ئەم بزاوتەی بەخۆیەوە نەبینیبوو، قوتابخانەکان تازە کرانەوە و نەخۆشخانە لە ساڵی (١٩٢٩)دا دروست کرا. ساختومانی سەرای هەولێر لە ناوەڕاستی شار دروست کرا، لەم پێوادانگەدا کۆمەڵێک هێڵی رێگای هاتوچۆ لە سەرتاسەری کوردستاندا بە زۆر پاڵنەر دروست کران، بایەخی تایبەتی هەبوو، چونکە یارمەتیدەر بوو بۆ توندکردنی پەیوەندی ئابووری و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری، لە نێوان شارە کوردییەکان و لەگەڵ گوندە کوردییەکاندا هەروەها پەیوەندی پایتەخت بەغدا، کە بووە نێوەندێکی شارستانی سەبارەت بە عێراق، بۆ روونکردنەوەی ئەم بارە ئاماژە دەکەین، بەوەی تاوەکو ساڵی (١٩٢٧) ئۆتۆمبێل لە نێوان سلێمانی و هەڵەبجە بەکار نەدەهات، بەڵام لەم ساڵەدا (١٥٠) گەشت لە نێوان ئەم دوو شوێنەدا هەبووە، پاشان ژمارەکە لە ساڵی (١٩٢٨)دا بووە (٦٠٢) گەشتی ئۆتۆمبێل، بەڵام ژمارەی گەشتەکانی نێوان کەرکووک و سلێمانی لە ساڵی (١٩٢٦)دا گەیشتە (٣٠٠) گەشت، (١٣٣٤) گەشت لە ساڵی (١٩٢٧) و پاشان بوو بە (٤٤١٤) گەشت لە ساڵی (١٩٢٨)دا. دۆخی هەولێر لەم بارەوە، باشتر بوو بە حوکمی سروشتی ناوچەکە لە نێوان هەولێر و کەرکووک، هەولێر و موسڵ و هەولێر و رەواندز، رایات، کە ناسراوە بە رێگای (هاملتۆن). ئەوەی دیارە هەولێر بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٩١٥)دا یەکەم ئۆتۆمبێلی تێدا بەکارهات، کە سەربازە ئەڵمانەکان بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان بەکاریان دێنا، بەڵام یەکەم ئۆتۆمبێلی مەدەنی لە ساڵی (١٩٢٠) بوو، هۆی گواستنەوەی هاوچەرخ هاندەر بوو بۆ ئاسانکاری گواستنەوەی بەروبوومی کشتوکاڵی ناوچەی هەولێر، بەمەش رادەی بەروبوومە گواستراوەکان بۆ بەغدا زیادی کرد و بۆ بەسراش دەنێردرا. گرنگترین دەسکەوت، کە لە سەردەمی ئینگلیز بەدەست هات، پەیوەندی راستەوخۆی بە گۆڕانکارییە باسکراوەکان هەیە بەیەکگەیاندنی هەولێر و شارەکانی دیکەی باشووری کوردستان بوو، ئەم پرۆسەیە ئاکامی رۆشنبیری لە چوارچێوەی گەشەکردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی لە عێراق هەبوو، کە لە قۆناغی تازەدا رەهەندێکی چۆنایەتی تایبەتی بەخۆیەوە بینی بەهۆی هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی بەریتانی و نێوەندی پاشایەتی فەرمانڕەوایی لە مەبەستە نەتەوەییە رەواکانی کورد، هەولێر لە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورددا رۆڵی مێژوویی خۆی بینی، هەروەها لە بزووتنەوەی نیشتمانی عێراقی بەگشتی رۆڵی خۆی هەبوو، لە ساڵانی داگیرکاری و ئینتیدابدا ئەمە بە شێوەیەکی روون لە زۆر لە رووداوە دیاردە دیارەکان بەرجەستە بوو، کە لە وڵاتدا روویاندا: بۆ نموونە کاریگەربوونی شارەکە بە رووداوەکانی شۆڕشی ساڵی بیست. بەر لە هەمووشیان رووداوەکانی شارۆچکەی تەلەعفەر لە ساڵی

(١٩٢٠)، كە باری بەریتانییەكانی شێواند لە شاری هەولێر، بە زیادبوونی چالاكی دژ بە ئینگلیز، كە بە ئاشكرا بانگەشەی شۆڕشیان دەكرد لە گۆڕەپان و چایخانەكاندا، دوای كڵپە سەندنی ئاگری شۆڕشی بیست لە فوراتی ناوەڕاست زۆر كۆبوونەوە لە شاری هەولێر بەسترا، زۆر هەوڵی كوشتنی حاكمی سیاسی هەولێردرا. هەوڵی پاشەكشە درا لە شارەكە حاكمی مەدەنی، (ویلسۆن) ناچاربوو، گەشت بكات و سەردانی هەولێر بكات بە فڕۆكە تایبەتییەكەی خۆی، لە هەشتی مانگی ئەیلولی (١٩٢٠) لە شاری هەولێر كۆبوونەوەی بە بەرپرسەكان و پیاوماقووڵانی شار كرد، كە وتارێكی لەبەردەمیان خوێندەوە. بەریتانیا داوای هاوكاری لە سەرەك هۆزەكان كرد، كە سەر بە ئەو بوون، دوای ئەوەی، كە بارودۆخ شڵەژا لە ناوچەكانی هەولێر، بەڵام باری ناو شاری هەولێر ناسەقامگیر بوو، پاشان دوو هێزی بەریتانی روویان تێ كرد، یەكێ لە موسڵەوە و ئەوی دیكە لە كەركوكەوە هاتن.

ناوی هەولێر لە زۆر لە بەیانەكانی سەربازی ئەواندا هاتووە، كە سەركردایەتی گشتی بەریتانی لەماوەی شۆڕشی (٢٠)دا دەری دەكرد، هەڵوێستە نەتەوەییەكانی خەڵكی هەولێر و دەوروبەری كۆمەڵێك رووداوی لێ كەوتەوە لەكاتی ریفراندۆمی دەسەڵاتدارانی بەریتانیا لە ساڵی (١٩٢١) كردیان دەربارەی كاندیدكردنی شا فەیسەڵ بۆ پاشایەتی لە عیراق لە ساڵی (١٩٢١)، لیوای هەولێر مەرجی ئەوەی دانا لە هەڵبژاردنی (فەراهەمكردنی مافی كەمایەتییەكان لە دروستكردنی كارگێڕییەكان، كە بەڵێنیان پێدابوون لە پەیماننامەی سیڤەر)، راپەڕینە كوردییەكان لە ساڵانی داگیركاری بە تایبەتی لە سلێمانی و بارزان، دەنگدانەوەی گەورەی هەبوو لەنێو نیشتمان پەروەرانی هەولێر و دەوروبەری لە كارتێكردنی لایەنە كوردییەكان، كە نیگەرانی بەریتانییەكانی زیادكرد، ئەم مەسەلەیە لەوەدا روونە، كە پێشتر باسی لێوەكراوە لەلایەن (ئەرنۆڵد ویلسۆن)ی حاكمی مەدەنی گشتی بەوەكالەت بوو، دوای كپكردنەوەی راپەڕین و شۆڕشی شێخ مەحموود لە ساڵی (١٩١٩)دا و تێكچوونی دۆخ لە رەواندز،، كە لە رووی ئیدارییەوە سەر بە هەولێر بوو، ئەمە دەقی لێدوانەكەی ناوبراو بووە لەم بارەیەوە: "لە رەواندز كشاینەوە، هەرچی بێ دوابڕیارمان، ئێمە ناتوانین سلێمانی جێبێڵین، چونكە كەسە ئاژاوەگێڕەكان توانایان هەیە لەسەر كۆنترۆڵكردنی و پێویستیمان بەهێزی گەورە هەیە لە كەركووك و كفری و هەولێر لەوەی ئێستا زیاتر پێویستیمان بە هێز هەیە". ئەمە جگە لەبەرچاوگرتنی ئەم شێوازەی گوزارشت لە دانپیانانی یەكیەتی چارەنووسی كورد دەكات: چ وەك خاك و چ وەك رووداو، تێكهەڵقژانی رووداوە كوردستانییەكان، لە ساڵانی ئینتیدابی بەریتانی پتەوتر بوو. ناوی هەولێر وابەستە بوو بە خەباتی رزگاریخوازی، كە شێخ مەحمود هەڵی گیرساندبوو. بەر لە هەموو شتێ شێخ خۆی پلانی ئەوەی دادەنا، كە هەولێر بخاتە سەر حكومەتە راگەیەنراوەكەی، كە لە ساڵی (١٩٢٢) بانگی بۆ دەركرد. ناوی لەدوای ناوی كەركوكەوە دەهات، بەر لە هەموو شارەكانی زاخۆ و ئاكرێ و ئامێدی و دهۆك و كفری و خانەقین و شوێنەكانی دیكەی كوردستان لە دەقی بەیاننامەیەكی تایبەتدا، كە پەیوەندی بەم مەسەلەوە هەیە لە رۆژنامەی بانگی كوردستان بڵاوكراوەتەوە، كە ئۆرگانی حكومەتی شێخ مەحموود بوو. لەلایەكی دیكەوە ناوی شێخ مەحموود و بزووتنەوەكەی و رووداوەكانی سلێمانی و كاریگەری لە راپۆرتە مانگانەكەی، كە موتەسەریفی لیوای هەولێر بۆ وەزیری ناوخۆ بەرزی كردۆتەوە لەم قۆناغەدا، بە تایبەتی لە ساڵی (١٩٢٣)دا، كە ملململانێی نێوان شێخ مەحموود و بەریتانییەكان تا رادەیەكی زۆر پەرەی سەند، لە راپۆرتە مانگانەكەدا هاتووە، لە مانگی ئەیلوولی ساڵی (١٩٢٣)دا، "بۆردومانی سلێمانی بە فڕۆكەی بەریتانی یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی، ئاستێك بۆ پروپاگەندەكانی شێخ مەحموود دابنرێت لەنێو سنووری لیوای هەولێر. "هەولێر و دەوروبەری، هەمان رۆڵیان هەبوو لە جۆشدانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی كوردی، كە لە كۆتایی بیستەكان و سییەكان پەرەی سەندبوو، لەگەڵ سێ ساڵی كۆتایی ئینتیدابی بەریتانی لە عیراقدا، لێرەدا بە پوختی باس لە وەبیرهێنانی هەندێك نموونە، دەكەین، كە ئاماژەبوونە بۆ بووژانەوەی هەستی نەتەوایەتی كوردی هەروەها كارلێكردن و

تێکۆشان کار بۆ زامنکردنی مافە نەتەوایەتییە رەواکانی کورد دەکرد، دوو ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی، کە خۆی شەش ئەندامی کورد بوون، کە لە چواری نیسانی سالی (١٩٢٧) بیرخەرەوەیەکیان خستە بەردەم سەرەک وەزیران سەبارەت بە داواکارییەکانی کورد، کە نوێنەرایەتی هەولێر بوون، ئەوان هەریەک لە (ئیسماعیل رەواندزی و جەمال بابان) بوون، یەکەمیان نەوەی پاشای کوێرەی رەواندز بوو، کە بزوێنەری ئەم پێشنیازە بوو، زۆریش گەرموگوڕ بوو لەم مەسەلەیە. بەپێی ئەوەی، کە لە بەلگەنامە بەریتانییەکاندا هاتووە، کاردانەوەی نیشتمانپەروەرانی هەولێر زۆر توند بوو لە دژی رەخنەگرانی بیرخەرەوەکە، هەولێر هاتە نێو بزووتنەوەی نارەزایی فراوان، کە سەرتاسەری کوردستانی عێراقی گرتەوە لە سالی (١٩٣٠) بوو، بەهۆی پشتگوێ خستنی پەیماننامەی عیراقی بەریتانی تازە بۆ مافەکانی کورد، ئەنجومەنی وەزیرانی ناچارکرد، کە جێگری سەرەک وەزیران (جەعفەر عەسکەری) و جێگری (مەندوبی سامی) (مێجەر یۆنگ) بەیاوەری وەزیری ناوەخۆ (جەمیل مەدفەعی) و وەزیری داد (جەمال بابان) گەرانێکیان بۆ ناو کەرکووک و هەولێر و سلێمانی کرد، ئەم شاندە ناودار و پیاوە ناسراوەکانی هەولێریان بینی، (جەعفەر عەسکەری) بەیانێکی بەناوی حکومەتی عێراقی خوێندەوە. پاشان (مێجەر یۆنگ) بەیانێکی بە زمانی ئینگلیزی خوێندەوە وەرگێردرایە سەر زمانی کوردی.

ئەوەمان لا گرنگە، کە چی لە هەولێر روویدا لەکاتی ئەم سەردانەدا لە سالی ١٩٣٠ شاندەکە گەشتی بۆ کەرکووک کرد، پاشان روویان لە هەولێر کرد پاشان چوونە سلێمانی، کۆبوونەوەیەکیان لە بارەگای موتەسەریفی هەولێر سازکرد، زۆربەی پیاوماقوولان و سەرەک هۆزەکان تیایدا ئامادە بوون، دوای ئەوەی (جەعفەر عەسکەری) و (مێجەر یۆنگ) بەیانی خۆیان خستەروو، بەناوی هەولێر (ئەحمەد عوسمان) دووجار داوای کرد وەلامی داواکاری کورد بدەنەوە، دوای ئەحمەد عوسمان، (خدر بەگ)ی کوری ئەحمەد پاشای دزەیی بە نوێنەرایەتی هۆزەکانی هەولێر وتەیەکی پێشکەش کرد: "ئێمە هۆزەکان رێککەوتووین لەسەر ئەوەی، کە پشتگیری داواکاری خەلکی سلێمانی بکەین، ئێمە دەژین و دەمرین لەگەل سلێمانی، ئێمە یەک میللەتین، بۆیە حەرامی دەکەین، کە جیاوازی لەنێوان هەرسێ لیوای هەولێر و سلێمانی و کەرکووک بکرێت"، دوای ئەوان (ئیسماعیل رەواندزی) بە گورەوە قسەی کرد، داوای کرد، کە بریارەکانی کۆمەلەی گەلانی تایبەت بە کورد جێبەجێ بکرێت، گوتی: "دەبێت لیوای دهۆک دامەزرێ، میللەتێک داوای ئەوە دەکات" پاشان (مەعرووف جیاووک) وتی و رەخنەی لە هەلوێستی رۆژنامەکانی دژ بە کورد گرت، وەلامی ئەوانەشی دایەوە، کە وایان بلاو کردبۆوە، کە ئینگلیز هانی کوردەکان دەدەن بۆ داواکردنی مافەکانیان لەم بارەوە دواوە: "دەبێت نوێنەری سامی بەرێز ئەوە بزانێت، هەروەها (جەعفەر پاشا) ئەوە بزانێت، کە من کوردم و هەر کوردێکی وەک من، نەکەوتۆتە ژێر هیچ کارتێکردنێک، میللەتی کورد بە ویژدانی خۆی بریاردەدا بۆ قسەکردن و داوای مافەکانی خۆی دەکات"، ئەوەشی بیر دێنێتەوە، کە وتەکانی (مەعرووف جیاووک) و رەخنەکەی، جەعفەر عەسکەری نیگەران کرد و بە هەلچوونەوە وەلامی دایەوە، بەلام جیاووک لە قسەکردن نەوەستا، گوتی رێزگرتنی بۆ عەرەب کەمتر نییە لە رێزگرتنی بۆ میللەتانی دیکە، راپەرینی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ی شاری سلێمانی و سەرکوتکردنی ئەم راپەرینە، هەروەها شۆرشی شێخ مەحموود لە سالی ١٩٣١، و شۆرشی بارزان لە سالی ١٩٣٢، کاردانەوەی فراوانی لە نێو خەلکی لیوای هەولێر هەبوو، لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بکەین، کە نامەگۆرینەوەی رەسمی زۆر کرا، سەبارەت بە بلاوبوونەوەی رۆلی بارزانییەکان لە هەولێر و دەوروبەری، لێرەدا یەکێ لەم نامانە بلاو دەکەینەوە لە موتەسەریفی هەولێر بۆ پشکێنەری کارگێری بەریتانی لە کەرکووک لە رێکەوتی ١٨ی ئایاری سالی ١٩٣١ ناردوویەتی:

موتەسەریفییەی لیوای هەولێر
قەلەمی نووسینەکان/ نهێنی
ژمارە ١٧/ س
هەولێر لە ١٨/٥/١٩٣١

**بۆ پشکێنەری کارگێری لیوای کەرکووک**

**بابەت/ قەلەمرەوی شێخی بارزانییەکان**

ئاماژە بە نووسراوەکەتان ژمارە ۱۷۷، لە ڕێکەوتی ۵/۵/۱۹۳۱ من پشتگیری ئەوە دەکەم، کە لە راپۆرتەکەتاندا هاتووە دەربارەی قەڵەمڕەوی شێخی بارزانییەکان لە ناوچەی ڕەواندز، ئەم توانایەی لەم ڕووەوە نەبووە، یان ئەم ساڵە بەڵکو ۳ - ٤ ساڵ دەبێت، من لەگەڵ گەڕانم لەوێدا لە ڕێکەوتی ۱۱/٦/۱۹۳۰ زانیم، کە ئەم توانایەی دژ بە قائیمقامیەتی بەڕێز (تەها ئەفەندی) بووە، شەڕێکی بەردەوام هەبووە لە نێوان کڵاوی بەڕێز تەها و جەمەدانی سووری ئەو، ئەمەش نیشانەی پیاوی بارزانییە، بەڵام سەرکەوتن هەردەم بۆ بارزانی بووە، بۆیە دەکرێ پشتگیری پێداچوونەوە کۆلۆنێل (بریسکۆت) بکەین، کە ئاکامی نووسراو ناردن بوو لە نێوانماندا، بە شێوەیەکی سەرزارەکی بە وەزیری ناوخۆم گەیاندووە، کە شێوازی پێویست بۆ ڕاگرتنی ئەم ڕەوتە بدۆزینەوە، من لەوە دەترسم، کە خەڵکی پیرەنی بچنە نێو پیاوانی شێخی بارزانی، لە پێناو رزگاربوون لە زوڵمی پیاوانی سەید تەها، کە بە ناڕەوایی چوونەتە ئەم گوندەوە، ئەمەش دەستەواژەی (۳٦)ە، کە لە لیستەکەدا دیارە.

**ئیمزا**

**موتەسەریفی لیوای هەولێر**

وێنەیەکی بۆ وەزارەتی ناوخۆی بەغداد بە ئاماژە کردن لەو قسانە لەسەر زارەکی کردوومن.

لە باسکردنی هەڵوێستە نیشتمانییەکاندا دەبێت ئاماژە بە هەولێر بکەین، نەوەک بەغدای پایتەخت، یەکەم شار بوو، کە دژ بە گرانبوونی نرخی کارەبا مانیان گرت، لەکاتی سەردانی (نووری سەعید)ی سەرەک وەزیران بۆ شاری هەولێر لە ۱٦ی ئابی ۱۹۳۱، نووسراوێکیان دایە دەست نووری سەعید، کە واژوو و مۆری چەندین کەس و خاوەن پیشەکانی شاری هەولێری تێدابوو، کە ۳۸۰ مۆر و ٦۸ واژوو بوو، کە سکاڵایان لە بەرزبوونەوەی نرخی کارەبا هەبوو، کە سەرجەم کاسبکاران لەم پێناوە یەکدەنگ بوون، خەڵک کڕین و فرۆشتنی ڕاگرتبوو، وەک ئەوەی لە دەقی بەڵگەنامەی فەرمیدا هاتووە پاشان مانگرتن لەلایەن (حاجی شەریف)ی عەتارەوە ڕێکخراوە، هەروەها (مەلا ئەمین) بەقال قوماش فرۆشەکان (یاسین حاجی ئەلیاس و حاجی محەمەد قەدۆ و حاجی یونسی ئاسنگەر)، مانگرتووان داوایان کردبوو، کە نرخی کارەبا دابەزێت لە دە (ئەنات)ەوە بۆ چوار (ئەنات) یان ڕێگەیان پێبدرێت ئامێری دابینکردنی کارەبا بێت (مولیدە)، کە شارەوانی هەولێر بەمە هەڵبستێت، دوای کەمتر لە هەفتەیەک خەڵکی هەولێر داواکارییەکی هاوشێوەیان دا بە وەزیری ناوخۆ، ئەمجارەیان (۵۰۵) مۆر و واژۆی لەسەر بوو، گرنگی ئەم بزاوتە لەوەدا بوو، کە یەکەم ناڕەزایی بوو لەو شێوەیە لە عیراقدا، بەر لەوەش پێش دوو ساڵ و نیو لەم مێژووە خەڵکی بەغدا ناڕەزاییان لە کارەبا دەربڕیبوو، هەولێر تاکە شاری کوردی بوو، کە بەشداری لە مانگرتندا کردبوو، کە لە بەغدا کرابوو هەروەها چەندین شاری دیکە مانگرتن کرابوو دژ بە یاسای رسومی شارەوانییەکان، کە لەلایەن حکومەت لە ۲ی حوزەیرانی ساڵی ۱۹۳۱ دەرچوو بوو، لە بەدواداچوونێک دەربارەی بەشداری هەولێر لە مانگرتندا مێژوونووس حەسەنی دەڵێت: "ئەوەی گرنگە دەبێت باسی بکەین، کە ناوچەی باکوور، لەم مانگرتنەدا بەشدار نەبوو، نەبووە هاوبەشی ئەوەی، کە لە ناوەڕاست و باشوور ڕوویدا، ئەگەر بیرخەرەوەی خەڵکی هەولێر نەبوایە، کە بۆ وەزارەتی ناوخۆ بەرزیان کردبۆوە، کە سکاڵای نەهامەتی ئابووریان تێدا کردبوو، لە شارەکەیاندا و کەمی قازانجی کاسبکاران، ئەوکات دەمانگوت کەس لە باکوور بەشداری مانگرتنی نەکردووە".

ڕەهەندی دیمەنەکە چ نەگۆڕا، دوای کۆتایی هاتنی ئینتیدابی بەریتانی لە عێراق و وەرگرتنی عێراق لە کۆمەڵەی گەلان لە ۳ی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۳۲، بەڵکو هەندێک دیاردەی نەرێی سەبارەت بە کورد کەڵەکەی کرد، بە تایبەت دوای مردنی شا فەیسەڵی یەکەم لە مانگی ئەیلوولی ساڵێ دوای ئەو، کە سەرەتای قۆناغێکی شڵەژاو دەستی پێکرد، کە دەرەنجامەکانی بووە هۆی ئاڵۆزکردنی مەسەلەی کورد لەلایەک و بووژانەوەی وشیاری نەتەوەیی و گۆڕانکاری میکانیزمەکانی دەربڕین لەلایەک و ئەمە لەنێو گەردی ڕووداو و گۆڕانکارییەکان بوو، کە هەولێر بە بەردەوامی تیایدا لایەنێکی چەسپاو بوو.

* ئەندام پەرلەمانی عێراق

# مێژووی هەولێر

**نووسینی: زوبێر بیلال ئسماعیل**
**وەرگێڕانی: عەبدولخالق هورمزیار**

**هەولێر:** دەکەوێتە نێوان هەردوو زێی گەورەو بچووک. لە باکووریدا تورکیا و بەشێک لە شاری موسڵە، لە باشووریدا شاری کەرکووکە. لە ڕۆژهەڵات ئێران و، بەشێک لە شاری سلێمانی، لە ڕۆژئاواشی شاری موسڵە.

ڕووبەرەکەی (١٦/٦٠٠کم٢) بەپێی بۆچوونی داوسن، بەڵام بەپێی بۆچوونی بەڕێوەبەرایەتی ڕووپێوی گشتی (١٦/٤٨٦کم٢)، کەچی د. ئەحمەد سوسە بە (١٥/٨٧٠ کم٢) مەزندەی دەکات.

هەولێر دەکەوێتە سەر هێڵی پانی درێژییەکەی(٣٦/١١) و لەسەر هێڵی درێژی (٤٢/٢) بەرەو ڕۆژهەڵات، کەوتۆتە ناوچەیەکی بەپیت و بەرەکەت لەسەر بانێکی تەختایی ڕاست، کە نێوەندی بەرزاییەکەی (١٣٠٠) پێیە. بەڵام ئەو دەشتەی نزیک بە قەڵاکەیە بەرزییەکەی (١٣٣٢) پێیە لەسەر ڕووی دەریاوە. ئەو بانە هێڵی دابەشی ئاو، لە نێوان هەردوو زێیەکە.

دەشتی هەولێر چەند چیایەکی، کە هێندە بەرز نین لێوەی نزیکن.

دەشتەکە لەشێوەی سێگۆشەیی بەدرێژبوونەوەیەک هەتا کەرکووک. پێچەوانەیەکی، کە هەندێ خڵت و قوڕو لیتە و بەردی تیادا کۆبۆتەوە.

ئەو دەشتەی هەندێک جۆگە پاکی دەکاتەوە، کە ئاوەکانیان بەرەو هەردوو زێ دەچێت. لەسەر ئەم دەشتەی لەلای باشووری ڕۆژئاوای چەند گوندێکی کشتوکاڵی بەپیتی لێیە، دەشتی کەندێناوە یە پانییەکەی (١٠) میل و درێژییەکەی لە (٥٠) میلە ئاوەکانیان دەچێتە هەردوو زێیەکە بەهۆی ئەو جۆگەلانەی کەندێناوە. چیای قەرەچوغ نزمە لەکاتی دابەشبوونی ئاوەکە لەبەر ئەو هۆبەش ڕێگای دیبەگە- مەخموور ڕێگایەکی خۆش و ئاسانە، ئەو پارێزگایە نزیکەی (٤٠٠٠) کم٢ ڕووبەری کشتوکاڵی بەرهەم دێنێ، واتە (٢٥٪) هەموو ڕووبەری پارێزگاکە، زۆربەی تۆکردنەکەی ساڵانەیە بۆیە هەرتاکێک لەخەڵکی گوند نزیکەی (٨) مەشایری بەردەکەوێت، واتە ئەگەر خێزانێک لە (٥) کەس پێک هاتبێت (٤٠) مەشایری بەر دەکەوێت، زۆربەی ئەو زەویانەی بە ئاوی باران ئاو دەدرێت.

**باران:** هەولێر دەکەوێتە ناوچەیەکی نیمچە چیایی لەعێراق کە پشت بە ئاوی باران دەبەستێت. وەرزەکانی کشتوکاڵیش لە هەولێر ئەوەندە پشت بە چەندیەتی ئەو بارانە نابەستێت ئەوەندەی پشت بە کاتەکانی باران بارین دەبەستێت. واتە ئەو بارانەی دەبارێت گرنگ ئەوەیە لە کاتی پێویست ببارێت. وەرزە باران لە هەولێر و باکووری عێراق بەگشتی لەناوەڕاستی مانگی تشرینی یەکەم تاکو مانگی مایس، بەلای کەمەوە ئەو بارانەی کە زۆرە لە مانگی کانوونی دووەم یا شوباتە. بەڵام هەندێ جار جیاوازی هەیە، بەڵام ئەو بارانە، کە دەبارێت لە نێوان مانگی مایس و تشرینی یەکەم بارانێکی ئەوها نییە لە کەش و هەوایەکی بێ هەورە. دەتوانین ڕۆژەکانی باران بارین لە هەولێر مەزندە بکەین لەنێوان (٥٥- ٦٥) ڕۆژ لە ساڵێکدا. بارانە بەهاری ناوچەکە زۆر زیاترە لە باشووری عێراق، بۆیە لەبەر ئەو ڕاستییە

ناوچەکە گرنگییەکەی لە کشتوکاڵی دێمییە.

**بەروبومە کشتوکاڵییەکان:** گرنگترین بەروبوومە کشتوکاڵییەکان لەناوچەکە گەنم و جۆیە، ساڵانە بەرهەمەکەی نزیکەی دەگاتە (١٠٠) هەزار تەن، لەپاش ئەو بەرهەمانە تووتن دێت، کە بەرهەمێکی هاوینەیە، ئەو ڕووبەرەی کە دەچێنرێت نزیکەی (١٠) هەزار دۆنمە، ئەمەش دەگاتە چارەکی ئەو ڕووبەرەی کە لە ڕێگا دەچێنرێت، لەپاش تووتن برنج و پەمۆ دێت، ئەمانەش بەروبوومێکی هاوینەن ڕووبەرێکی دیاریکراویان هەیە لە چاندن، بەڵام بەروبوومەکانی تر کە لە ناوچەکە دەچێنرێت، بریتییە لە (کونجی، نیسک، ماش، نۆک) هەروەها لە چیاکان (گوێز و باوی، فستق و سماق و ترێ و هەنجیرو سێو) هەیە.

بەخێوکردنی مەڕو ماڵات لەتەک کشتوکاڵ، کە لەناوچەکە ڕانە مەڕێکی گەورە لە مەڕو بزن لە نێو دۆڵ و چیاکان و دەشتەکان تا ڕادەیەکی چاک هەیە. ژمارەی مەڕ و بزن بە (٣٠٠/٠٠٠) سەر مەزەندە دەکرێت، ژمارەی چێڵ نزیکەی (٣٠) هەزار سەر دەبێت، بەخێوکردنی مێش هەنگوین گرنگییەکی تایبەتی هەیە ئەو ڕووپێوەی ساڵی ١٩٥٣ کراوە کە نزیکەی ٤٥٠٠ شانەی هەنگوین لە پارێزگاکە هەیە، بەرهەمێکی کشتوکاڵی و گیاداری دەنێرێتە ناوچەکانی تری عیراق، وەکو ماست و پەنیر و پیستە و خوری و هەنگوین و دار.

چیاکانی هەولێر بەشێکی ناوچەی چیاکانی عیراق لە باکوور و باکووری ڕۆژهەلاتی پێک دەهێنێت بەشێک لە دارستان پێک دەهێنێ، کە ڕووبەرەکەی (٥٠٠٠کم٢) دەبێت، ئەمەش ناوی ئەو چیایانەیە لەگەڵ بەرزاییەکەیان لە ناوچەکە:

حەساڕۆست: بەرزاییەکەی (٣٦٠٧) مەترە، کە بەرزترین چیایە لە عیراق.

هەواره چووکە: بەرزاییەکەی (٣٥٨١) مەترە.

کێوە ڕەش: بەرزاییەکەی (٣٥٧٦) مەترە.

قەندیل: بەرزاییەکەی (٣٤٥١) مەترە.

هەندرێن: بەرزاییەکەی (٢٥٩٦) مەترە.

شیرین: بەرزاییەکەی (٢٣٧٨) مەترە.

برادۆست: بەرزاییەکەی (٢٠٦٨) مەترە.

سەفین: بەرزاییەکەی (١٤٧٥) مەترە.

پیرمام: بەرزاییەکەی (١٠٩٠) مەترە.

حەریر: بەرزاییەکەی (١٤٤١) مەترە.

ئەوەی جێی ئاماژە کردنە، کە چیاکانی هەولێر بە جۆرەها بەردی مەڕ مەڕ دەوڵەمەندن، لە هەندێ لاوە لە مەڕ مەڕی ئیتاڵی باشترە ئەمەش بە چەندەها ڕەنگ لە گەلێک شوێن هەیە لەوانە:

بەردی مەڕ مەڕی سماقی لە گوندی دەربەند لە ڕێگای ڕایات.

بەردی مەڕ مەڕی سپی لە گەلاڵە.

بەردی مەڕ مەڕی ڕەش لە ڕایات.

بەردی مەڕ مەڕی سوور لە حاجی ئۆمەران.

**هاوینەهەوارەکانی هەولێر:** ئەو هاوینە هەوارانە دەکەونە سەر ڕێگای گشتی لە نێوان هەولێر تا حاجی ئۆمەران، کە یەکەمیان (هاوینەهەواری سەلاحەددین)، کە دەکەوێتە سەر لوتکەی چیای پیرمام بەرزاییەکەی (١٠٩٠) مەترە، لە هەولێرەوە (٣٢) کم دوورە. لە پاش هاوینەهەواری شەقلاوەیە کە بەرزییەکەی (١٦٦) مەترە، لە سەلاحەددین (٢١) کم دوورە، شەقلاوە دەکەوێتە سەر چیای سەفین لەبەری باکووریدا. لە پاش گەلی عەلی بەگ دێت ئەو ڕێڕەوەی کە بەرەو ڕەواندز دەچێت (٦٠) کم لە شەقلاوە دوورە.

لە کۆتایی ڕێگا لەنێوان سنووری عیراق و ئێران هاوینەهەواری (حاجی ئۆمەران) دێت، کە بەرزاییەکەی (١٧٨٠) مەترە لەگەڵ ئەوەی، کە ئەو هاوینەهەوارە (١٣٠) کم لە شەقلاوە دوورە، بە خۆشترین و جوانترین هاوینەهەواری کوردستانی عیراق دادەنرێت، کە ئاوێکی ئێجگار خۆش و ئاو و هەوایەکی سارد و وشکی هەیە، کە دەکەوێتە بەر کاریگەری ئەو بەفرەی هەمیشە لوتکەی چیاکانی دەورووپشتی دادەپۆشێت. لە هەموو ئەو هاوینەهەوارانە ئوتێل و خواردنگای

مۆدێرن هەیە.

**سەرچاوەکانی ئاو:** هەولێر بۆ کشتوکاڵکردن پشت بە ئاوی باران دەبەستێ. تا رادەیەک بە ئاوی ژێر زەوی. کە چەندەها بیری ئیرتیوازی لێدراوە بۆ ئاودانی باخ و بێستانەکان، ئاوی ژێر زەوی گرنگییەکی زۆری هەیە لەسەر ژیانی خەڵکی ناوچەکە، لەبەرئەوەی شاری هەولێر دوورە لە هەردوو زێ. ئاوی ئەو بیرانەش تا رادەیەک بەشی پێویستەکانی خەڵکەکە دەکات، رێژەی خوێ لەو ئاوانە کەمە بۆ خواردنەوە و بۆ ئاودان دەشێت، ئەو بیرانە نزیکن لەسەر رووی زەوی، کە قووڵاییان لە نێوان (٥٠- ١٠٠) دەبێت، لەبەر ئەوەی ئێستا شارەکە زۆر گەورە بووە و خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری روویان لە شارەکە کردووە. بۆیە تا رادەیەک ئاوی کەمەو ئاو لە زێی گەورە بەبۆری گەورە بۆی راکێشراوە. کە ئەو زێیەش (٣٢) کم لە هەولێر دوورە، خەڵکەکانی کە لە زووەوە لە هەولێر ژیاون، ئەوانیش لە دابینکردنی ئاو بۆ شارەکە درێخییان نەکردووە. نووسینەکانی ئاشووری ئاماژە بەوە دەکەن، کە هەوڵیان داوە سەرکەوتووش بووینە لە دابینکردنی ئاو بۆ شارەکە، پاشای ئاشووری (سەنحاریب) پرۆژەیەکی گەورەی بۆ ئەو مەبەستە ئەنجامدا، ئەو لێکۆڵینەوانەی، کە لە لایەن بەرێوەبەرایەتی شوێنەوارەکانی عێراق ئەنجام دراوە لەو پرۆژەیەی سەنحاریب ئەو زانیارییە بە کەڵکانەی تێدایە، نزیک گوندی (قەڵەمورتک)، کە (٢٠) کم لە هەولێر دوورە، بەندە ئاودەکەی لێیە کە لە بەردی چوارگۆشە دروست کراوە لە ناوەراستەکەی کونی ئەو ئاوەی لێیە، کە بەرەو باشوور دەروات، واتە بۆ هەولێر لەسەر یەکێک لە بەردەکانی بە خەتی بزماری نووسراوە (من سەنحاریبم پاشای جیهان و پاشای وڵاتی ئاشوور، سێ بیرم لێداوە لە چیای خانێ، کە چیای بەرزی هەولێرن، کە لە هەردوو لای بەنداوەکە ئاوی کانییەکان دەرژێتە جۆگەکە، لەپاشا ئەو جۆگەیە دەچێتە ناوەراستی شاری هەولێر شوێنی ختووی شکۆدار خوای عەشتار، ئاوەرۆکەم راست بردووە بۆ شاری هەولێر)، لە بەرزاییەکانی شارەکە چیای (سەفین و سەلاحەددین) سەرچاوەی ئاوی رووباری بەستۆرەی لێ هەڵدەقوڵێت. لە دۆڵەکانی ئەو چیایە چەند رووبارێک دەرژێتە بەستۆرە، کە کۆدەبنەوە لە نزیک گوندەکانی (سوسێ، زیارەت، قیرژە)، بەڵام چوکی ئاوی زۆرە لەناوچەکە، ئەو رووبارو سەرچاوانە ئاویان زۆرە، ئێستا کێڵگەیە و بەرایەکی فراوان تا دەگاتە گوندی دنجیزاوە ئاو دەدەن، ئەو ئاوەی دەمێنێتەوە هاوینان بڵاودەبێتەوە لە بەستۆرە دووبارە لەسەر زەوی بەدیار ناکەوێت تا دەگاتە نزیک گوندی (قەڵەمورتک) لە رۆژئاوا لەبەرئەوەی کونی جۆگەکە لە ئاستێکی تەسکی بەستۆرە بووە لە قوڵایی نزیکەی (٢٠) پێ لەسەر رووی زەوی بۆیە وا دەچێتە بیرەوە ئەو پرۆژەی ئاوە لە کارێز چووبێت، کە بەکارهێنانی لەو ماوەی دوابیدا لە هەولێر بڵاو بووبوو، بەڵام پرۆژەی سەنحاریب جیاوازی هەبووە لەگەڵ کارێز، چونکە پرۆژەکەی سەنحاریب ئاوەکەی لە سەرچاوەی چیاکانەوە بوو، کەچی ئاوی کارێز بریتییە لە کۆمەڵێک ئاوی بیری هەڵکەندراو. لەنەخشەی هەولێر وا بەدیاردەکەوێت کە سەرچاوەی جۆگەکە بەرە بەرە لێژدەبێتەوە بەرەو باشوور و هەروەها بەرەو رۆژئاوای گوندی (مورتکە) لە ئاستی ئەو دەشتاییەی نزیک هەولێر بەرزترە، نزیکەی (١٥٠) پێ، ئەو نزماییەش بەسە بۆ داخزانی ئاو لە جۆگەکەوە بۆ هەولێر. لەوانەیە کە جۆگە دیاردەیەکی سەر رووی زەوی بێت، لە نشێوەکان بۆتە بەربەستی درێژبوونەوەی بۆ هەولێر و نزیکبوونەوە لێی. لە باشووری رۆژهەڵاتی گوندی (بەحرکە) لە نێوان (هەولێر قەلەمورتک) پاشماوەکانی هەندێ جۆگە بەدیار دەکەوێت، پانی (٩) مەترە لەوانەیە بەشێک بووبێت لە پرۆژەی سەنحاریب. کونی جۆگەکە پڕە لە بەرد، بەستۆرە رادەماڵی لە وەرزەکانی باران بارین، شێوەکەی چوارگۆشەیە بەرزییەکەی (١٢٠) سم پانییەکەی (١١٢) سم، دیوارەکەی بە بەرد هەروەها ژێرەکەشی بەهەمان بەرد دروست کراوە.

**بنچینەی دانیشتوانەکەی:**

زۆربەی دانیشتوانی پارێزگاکە لەبنچینەدا دەگەرێتەوە سەر وەچەیەکی سەرپان و لەشێکی گەورە و کەپوویێکی چەماوەی ئەستوور، کورد دەچنەوە سەر ئەو وەچەیە. ئەو وەچەیە رەسەنایەتی و زمان و

مرۆڤایەتی خۆیان لە ناوچەی چیاکانی پارێزگاکە پاراستووە، هەندێک کاریگەری ئەنترۆپۆلۆژی تایبەت بە ناوچەکە کاری لێ کردوون، واتە عەرەبەکانی وەچەی دەریای سپی ناوەڕاست، مینۆرسکی وای دەبینێت، کە کورد نەتەوەیەکی ئێرانین لە فارس و قەوقازو تورکیا و عیراق دەژین، دۆخی کوردەکان دەباتەوە گەڵ گەلانی ئیسلامی بۆ زمان و مێژوو، لەوانەیە کە گەلی کورد لەبنەڕەتدا لە رۆژهەلاتەوە (رۆژهەلاتی ئێران) کۆچی کردبێت و بۆ رۆژئاوا (کوردستانی ئێستا) تیایدا ژیاوە، هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە ئەو بارودۆخەش نابێتە لەمپەر پێش ئەوەی ئەو گەلە بێت لە کوردستانی ناوەڕاست نەتەوەی جیا جیا ژیابن لە ژێر هەمان ناوی لەوچوو، وەک (کاردۆ) لەگەڵ کوردی ئێران چووبنە پاڵ ئەو گەلە پاش تێکەڵبوونیان لەگەڵ یەکتر بوونە نەتەوەیەکی یەکگرتوو بەدرێژایی رۆژگار و دۆخەکە.

رۆژهەلاتناس (دریو دابخن Thareau) لە کەفی ئاشوورییەکان ناوچەیەکی دۆزییەوە بەناوی (کار- دا- کا)، ئەو ناوچەیەش نزیک بەخەلکی (سو) و (سو) دەکەوێتە باشووری دەریاچەی وان، هەروەک (درایڤەر Driver) دەڵێت. بدلیسی لە شەرەفنامەدا دەڵێت: قەلایەکی کۆن هەیە بەناوی (سوی) هەرێمی بدلیس. پاش ئەوە بە هەزار ساڵ (تجلات بلاسر ۱۰۹۸- ۱۰٦۸) پێش زایین جەنگێکی کردە سەر گەلێک بەناوی (کورتی) لە جیاتی (ئازو) درایڤەر کردیی (خرو) ئێستا (صاصون)ە.

هیرودوت لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین ئاماژە بە ناوێکی لەو جۆرە ناکا، بەلام دەڵێت هەرێمی سێزدەمی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی لکاوە بە ئەرمینیە و ناوی (بوختە بوخە)، هەندێک لە رۆژهەلاتناسان بەناوی بوختان (بوهتان) مەزەندەی دەکەن.

(جزینیفون Xenophon) (٤٠١- ٤٠٠) پێش زایین ناوی گەلێک دەبات (کردوک)، کە دەژین لە رۆژهەلاتی (گنتریس - بوختان - بوهتان)، پاش ئەوە ئەو ناوە زۆر باس کراوە لەو هەرێمەی نێوان لای چەپی رۆخی دجلەو چیای (جودی)، کە مێژوو نووسەکان ناویان لێ ناوە (کوردئین)، ئەو هەرێمە بە ئارامی پێی دەڵێن (حەوزی کاردۆ).

ئەو ناوەیان (گازارتای کاردۆ) خستۆتە سەر دەریاچەی ئیبن عومەری ئێستا، لە کۆنەوە ئەرمەنییەکان ئەو ناوچەیان بە (کور دوز) ناسیوە.

یاقوتی حەمەوی کە لە ئیبن ئەسیر دەگێڕێتەوە: ولاتی (بەقردا) بەشێکە لە جەزیرەی ئیبن عومەر، ناوی (بەقردا) نەما کە لە سەردەمی یەکەمی ئیسلامی بەو هەرێمە دەگوترا، لە سەرچاوە عەرەبییەکان بوو بە ناوی جەزیرەی ئیبن عومەر یا بوهتان.

گومانی تێدا نییە، کە (کاردشو) لە کۆن پێگەی گەلی کاردۆ ناوەندی پێگەی راستەقینەی گەلی کوردە ئێستا. ئەگەر ئەوە سەلماندرا ئەوە وشەی (کارد شوی - کرد) هاومانان.

ئەو بۆچوونەش گەلێک ئاماژەیان پێکردووە، پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ورد، کە مینۆرسکی بۆ لێکۆڵینەوەی زمان، کە چەند شارەزایەک پێی هەڵساون لەوە ئەمەیان هێناوەتە ئاراوە، لەسەردەمی ئەو جەنگانەی عەرەب وشەکە تاک (کورد) بووە و کۆیەکەی (کوردەکان)ە.

(سیدنی سمیث sidny smith) وای دەبینێ بۆچوونی شارەزایەکان لەسەردەمی نوێدا بەرامبەر بەزمانی کوردی گۆڕاوە، هەندێک وای بۆ دەچن، کە زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیە پێکهاتوو نییە لە فارسی و زۆر کۆنترە لە زمانی فارسی، کە نەخشەکانی (دارا) ی پێ نووسراوە.

ئەمین زەکی دەڵێت: (کوردستان پێگەی یەکەمی وەچەی مرۆڤایەتی دووەم بووە، لەوێوە پەلی هاویشتووە بۆ شوێنەکانی تر بەپێی رووداوەکانی مێژوو. لەپێش بەرەبەیانی مێژوو گەلەکانی چیای زاگرۆس تیایدا ژیاون) ئەمانەش (لولو) (گوتی) (کاشی) (خالدی - کالدی) و سەبارو - هوری - خوری.

ئیسلامییەکان لە خوارووی رۆژهەلاتی باشووری نیشتەجێ بوون. هەموو ئەو گەلانە تەنها ئیسلامییەکان نەبێت بنچینەی کۆنی گەلی کوردە.

هەروەها زیاتر ئامادە دەکات (جیاوازی لەسەر ناوەکانی گەلی کورد لە سەردەمەکانی کۆن سوودی نییە لە چەندیەتی هۆز و گەلەکان ئەو جیاوازییە بەپێی سروشتی گۆڕانی بارودۆخەکە بووە. ئەوەش پشت بە

گۆتەی (سپایزر) دەبەستێت، کە دەڵێ (ناوی ڕاگەیاندراوی گەلان دەکرێت لەلایەن گەلانی ترەوە گۆڕانی بەسەر دابێت.

کاشییەکان بە درێژایی سەردەم پێیان دەگوتن: (کاسای، کاسی، کاشتو، کوش) ئەمان هەمووی یەک ناون بۆ گەلی کاسی. هەروەها گەلی لوللو (لوللومی، نوللو) ئاواش بەچەندەها ناو گەلی کورد دەکرا نەتەوە دێرینەکان کوردیان بەو ناوانەی دەناسی:

گوتی. جوتی. جودی: لەلای سۆمەرییەکان گوتی. کوتن. کارتی. کورتی. کاردوو. گاروگا. کاردان. کارکتان. کارداک: لەلای ئاشوورییەکان و ئارامییەکان کورتیوی. سیرتی. کوردراها: لەلای ئێرانییەکان کاردواسوی. کاردوخوی. کاردوک. کردۆک. کردوکی. کردوخی. کاردویکای: لەلای یونان و ڕۆمان کوردئین. کورچیخ. کورتیخ. کرخی. کورخی: لەلای ئەرمەنەکان کردی.کاردوی. کارتاویە. جوردی. جودی: لەلای عەرەبەکان

**هۆزە کوردەکان لە هەولێر:**

مێژوونووسە موسڵمانەکان لە لێکۆڵینەوەکانیان دەربارەی کورد بە گشتی لە گەلێک بۆنەی مێژوویی و جوگرافی ئەوهایان باس کردووە، مەسعودی ساڵی (٣٣٢ک- ٩٤٣ز) ئەستەخری (٣٤٠ک- ٩٥١ز) زانیاری زۆر نایابیان داوە، بەڵام ئیبن حەوقەل (لەسەدەی دەیەی زایینی) دەڵێت: لە نێوان هەردوو زێدا پاوانێکی بەفراوان هەیە، بەڵام بەهۆی ئەو شەڕو شۆڕەی، کە تووشی ناوچەکە هاتووە، هەمووی بەفیڕۆ چووە و کەسی تیا نەماوە، ئەوە لە زستاندا شوێنی کوردەکانی هەزبانی بووە هاوینگەی شیبانییەکان بووە. هۆزی هەزبانی لە ئازەربایجان دەژیان، میرنشینێکی بەهێزیان هەبوو، بەڵام لە زستان هاتوونەتە نێوان هەردوو زێ، قەڵای هەولێر ناوەندیان بووە، ئیبن حەوقەل ئاماژە بەو جەنگ و ئاژاوە کاولکارییانە، کە لە نێوان ڕۆمانییەکان و ساسانییەکان دەدات، کە لە پێش هاتنی ئیسلام ڕوویداوە، هەولێریش چەقی ئەو پێکدانانە بووە و بۆتە هۆی کوشتن و ماڵوێرانی خەڵکێکی زۆر. هەزبانییەکان لەگەڵ دەوڵەتی عەباسی ساڵی (٢٩٣) کۆچی لەسەردەمی خەلیفە (مکتفی بالله) بەسەرۆکایەتی محەمەد کوڕی بیلال پێکیان داداوە، هەروەها هێرشیان کردە سەر نەینەوا.

خاوەنی کتێبی (صبح الاعشی) و خاوەنی (مسالک الابصار) لەسەدەی هەشتەمی کۆچی لەسەر کورد قسە دەکەن بیست بابەت ئاماژە پێ دەکەن لە ناوچەی چیاکان لە چیای هەمەدان و شەهرەزوور دەست پێ دەکەن کۆتایی بە (قلاع) دێن لە هەر هۆزێک لە کورد نموونە دێن و لێرە ئاماژە بە هەندێک دەکەین، کە بۆ لێکۆڵینەوەکەمان گرنگە.

١- ئالبستر: هەر لەگەڵ کارەکانی (ئەربل- ئەربیل) بوو، کە هۆزی قرتاویە (کرتاویە) تیایدا نیشتەجێ بوون، هەولێر و هەندێ جێگای تریان بە دەستەوە بوو لە (صبح الأعشى) دەڵێت: (نەتەوەیەک بوون ژمارەیان ژمارەیان زیاتر لە چوار هەزار کەسە، میرێکی تایبەتی خۆیان هەبوو.

٢- وڵاتی کەرکار: هۆزی حەسناوی (خشناو) لێی نیشتەجێ بوون، سێ تایفە بوون، تایفەکیان عیسا شەهابەدین، تەلیە، تایفەی جاکیە (صبح الأعشى) دەڵێت: هەموویان ١٠٠٠ پیاو بوون، بەڵام تایفەکیان میرێکی تایبەتیان هەبوو (دائیرەی معارفی ئیسلامی) وای دەبینێ، کە ئەو هۆزە (خۆشناو)ن، کە سێ تیرە بوونە، یەکێکیان لە وڵاتی (کارتاوی و دەرمەندی قەرەبویلی) (هوفمان) وای دەبینێ، کە دەکەوێتە چیای ڕۆخی ڕووباری زێی بچووک.

٣- دەربەندی قەرایلی: پێگەی تیرەی (قەریاوی) بووە، خاوەنەکەی لە دەرگای سوڵتانی نووسییە لە میسر.

٤- نێوان دوو چیا لە کارەکانی ئەربل: کوردی لێ نیشتەجێ بوو، کە لایەنگری میسر بوون، ژمارەیان هەندەی ژمارەی کەلالییەکان بوو، میرێکی تایبەتیان هەبوو. میرەکەیان تاجەدین خضر کوڕی سولێمان.

٥- مازنجان، بیروە، بێخمە (بخمە) وڵاتی سەهرانییان، مازنجانییەکان لێی نیشتەجێ بوون، کە سوارچاکی زۆر لێهاتوو بوون.

٦- وڵاتی سەهریە: وڵاتی سقلاوە (شەقلاوە) و ئەبی عەلی، کە بە (خفتیانی بچووک) دەناسرێن لە نێوان ئەو دەشت و دەربەندە گەورە، تیرەی سەهری (سەهران- سۆران) تیا نیشتەجێ بوو (صبح الأعشى) دەڵێت: (نەتەوەیەک بوون ژمارەیان

نەدەگەیشتە هەزار کەس، چیاکانیان زۆر سەخت بوو، دەربەندەکەیان لە نێوان دوو چیای بەرز بوو، زێی گەورەیان ئاو دەدا. مەسالیک ئەبصار دەڵێت: دەربەندەکە سێ پردی لێ بوو دووانیان بە بەرد و قوڕ دروست کرا بوو، ناوەندەکەیان لە دار حەسیر، بەرزیان کردبۆوە لەرووی ئاوەوە ۱۰۰ پێ لە هەوا. درێژییەکەیان لەنێوان هەر دوو چیا ٥۰ پار بوو، کە رووبار بەسەریا دەڕۆیشت، بڵند و نەوی دەبوو ئێشکیان لێ دەگرت، خەڵکێک بوون غەدریان دەکرد و میرێکی تایبەتیان هەبوو و پەیوەندی لەگەڵ سوڵتانی میسر هەبوو.

۷- وڵاتی دینار: کوردی دیناری تیایدا نیشتەجێ بوون لە (صبح الأعشی) دەڵێت: (وڵاتی کردی جولەمێرگ تیرەی کوردی لێ بوو پێیان دەگوتن (دیناریە)، ژمارەیان ٥۰۰ کەس بوو بازاڕ و شاریان هەبوو، دوو میریان هەبوو، یەکێکیان ئەمیر ئیبراهیم کوری میر موحەمەد سەنگایی هەبوو لای خەلیفەکان دووەمیان شەهاب کوری بەدرەدین باوکی مرد گەورەکەیان جێگای گرتەوە لەگەڵ مازنجانییەکان لە شەڕدا بوون.

مێجەر رولسۆن دەڵێت کە هۆزەکانی کوردی شنۆ و رەواندز دەخاتە روو لە ماوەی دیراسەکردنی پایتەختی میدیا لەو گەشتەی، کە ساڵێکی پێ چوو کرد ساڵی ۱۸۳٦ زاینی.

هۆزی بلباس لە ناوچەی (شنۆ و- رەواندز- رانیە) دەکرێن بە سێ بەشی گەورە ئەوانەش: (پیران، مەنگوڕ، مامەش) بەشەکانی ئەو سێ تیرە ئەوەیە:

۱- پیران: لقەکانی (موخانە- بەرچەم- سووریک- یوسف خەلیکە- سێتا بەسەر- پێوە).

۲- مەنگوڕ: لقەکانی (قادر وەیسی- زوری- باسکەیی).

۳- مامەش: لقەکانی (هەمزە ئاغایی- جۆخۆر- بلاوەند).

ئەوەی جێی ئاماژە کردنە ئەحمەد پاشای والی بەغدا لەگەڵ ئەم تیرەیە شەڕی کرد ساڵی ۱۷۳٦ بە هۆی ئەوەی ئەمن و نیزامیان شێواندبوو رێگایان دەگرت و تاڵانیان دەکرد. پاشا بە سوارەکانی و پیاوەکانی هێرشی کردە سەریان، بەڵام بە توندی لە قەڵا و شوێنەکانیان بەرپەرچی هێرشی والییان دایەوە، هەردوولا یەکتریان گولە باران دەکرد ژنانی هۆزەکە لەتەک پیاوەکانیان چەکیان هەڵگرتبوو، بە سەربازەکانی دوژمنیان وەدەنا، پاش شەڕەکە رەزامەندییان دەربڕی کە خۆیان بەدەستەوە بدەن و فەرمانی والی جێبەجێ بکەن، نیبو لەو گەشتەی ساڵی ۱۷٦٦ بۆ عێراق کردی باس لەو هۆزە دەکات بەناوی پاشای کوێنجق (لەو گوندانە ناسیم، کە دەکەوێتە ناوچەی (پاشای کۆیە) گوندی (روش) گوندی (موران) و گوندی (دوین) لە پاشا بلباس کە گوندێکی گەورەیە دەکەوێتە سەر چیایەکی بڵند، بلباس ناوی هۆزێکی گەڕۆکە گەلێک تیرەی لێ دەبێتەوە لە وڵاتی فارس و سوریە. ساڵی ۱۸۰۲ عەلی پاشا والی بەغدا شەڕی لەگەڵیان کرد، بەهۆی ئەوەی کە هەڵساون بۆ سەر سابڵاغ و مەراغە و ئورمیە. وای لە حکومەتی ئێران کرد داوا لە دەوڵەتی عوسمانی بکات، کە لێیان بدەن وەزیر بۆ والی بەغدا ئیبراهیم پاشای بابانی نووسی، کە کاردانەوەیەک لە دژیان بکات، بەڵام ئەوانەی هاتبوونە گوندەکانی دەوروبەری هەولێر، وەزیر لە ژێر فەرماندەی خۆی هەڵمەتێکی سەربازی کردە سەریان، کاتێک گەیشتە ئاڵتون کۆپری بلباسەکان هەڵاتن بەرەو جێگاکانیان لێ چیاکان لە هەڵمەتەکەی توانی دەست بەسەر مەڕومالات و کەلوپەلەکانیان بگرن، ئیبراهیم پاشا توانی لە دەوروبەری کوێسنجەق وەدەریان بنێت هەتا گەیشتە هەولێر سڵاوی بۆ وەزیر نارد کەلوپەلەکانیان کەوتە دەست هێزی وەزیر، کە بریتی بوو لە ٦۰ هەزار سەر مەڕو بزن هەزار سەر مانگا، چەندەهای تر، کە لە رێگا لەناوچوون، وەزیر ئەوانەی دابەش کرد بەسەر خەڵکانی هەولێر و کۆپری و کەرکوک خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری لەجیاتی ئەو زیانەی لێیان کەوتبوو.

رێش لەو سەردانەی، کە بۆ سولەیمانی و هەولێر کردبووی زانیاری گرنگی لەسەر هۆزی بلباس باس کردووە، کە دەڵێت: (بلباس لەو هۆزانە پێک دێت:

۱- کابایز: ئەو بنەماڵەیە فەرمانڕەوایی دەکەن، کە ۱۰۰ کەس دەبن.

۲- مەنزوور.

٣- مامەش.
٤- بێران.
٥- ڕەمک.
٦- سنو تاخا کە یەک هۆزن. بە سەرۆک هۆزیش دەڵێن (مەزن)

هەر سەرۆکێک چەند دزێکی هەیە، کە دزی بۆ دەکەن ئەندامانی هۆزەکە دیاری بۆ دەبەن بەدەستی خۆیان، ئەمەش دەستکەوتی سەرۆکە یاسا لەنێویاندا بەشێوەیەکی عەشائری سەرۆک هۆز جێبەجێی دەکات لەمەش ئەنجومەنی پیران هۆز یارمەتی دەدەن سزای لە سێدارەدان تەنها ئەو کەسانە دەگرێتەوە، کە زینا دەکەن، بڵباسەکان لەبارەی ژن هێنان و شووکردن کچیان نادەنە بێگانە تەنها دەبێ لە هۆزەکەی خۆیان بێت، دەمەتەقێ لە ژیانی کۆمەڵایەتییان هەیە، هەڵاتنی دوو خۆشەویست بە قەسدی هاوسەر پێکهێنان لەنێویاندا باوە، ئەگەر سەرۆک هۆز مرد ئەوە باشترین و ئازاترین پیاوی هۆزەکە شوێنی دەگرێتەوە، ئەگەر کوڕە گەورەکەی ئەو توانایەی تێدا نەبوو جێگای باوکی بگرێتەوە ئەوە برایەکی تر، کە بەتوانا بێت جێگای دەگرێتەوە.

ئەگەر یەکێک سەرۆک داینێ، ئەوا کەس بۆی نییە لای ببات، بەڵام کە هاتنە ناوچەی قەرەچوغ وازیان لەوە هێناوە چەندەها ساڵە هەندێک مەڕ سەرانە دەدەنە پاشا، زۆر حەزیان لە چەک هەڵگرتنە، زۆربەیان لە گەورەکانیان تەواوی کەلوپەلی چەکیان هەیە.

مستەر ریچ دەڵێت: (هەر یەکێک لە هۆزی بڵباس) پێگەی هەرچی بێت لەناو هۆزەکە هەقی ئەوەی هەیە لە کاروباری گشتی هۆزەکە بیروڕای خۆی بدات.

ریچ ئەوەشی بە گەورە دانا، کە پایەی ژن لەنێو بڵباسەکاندا زۆر گرنگ بووە، دەڵێن: (پایەی ئافرەت لە کوردستان زۆر باشترە لە پایەی ئافرەتی تورک و ئێرانی لەلایەن پیاوەکانیانەوە، بە یەکسانی مامەڵەیان دەگەڵدا دەکەن). ریچ دەربارەی هۆزەکانی (خۆشناو) دەڵێت: سێ تیرەن میر مەحمەلی، ببر یوسفی، پشدەری) لەنێو دوو تیرەی یەکەمدا دوژمنایەتییەکی کۆن لە نێوانیاندا هەیە، بۆیە هەمیشە لە شەڕ بوون لەگەڵ یەکتردا ئەوەش بە قازانجی پاشای بابان دەشکێتەوە، کە بەو هۆیە هەمیشە بەسەریاندا زاڵ بوو هەروەها تورک و ئێرانییەکان بەتەواوی لەژێر چەپۆکیاندا بوون و ئەو ناکۆکییەی نێوانیان قۆزتبووەوە. ڕووبارێکی بچووک لێکیان جیا دەکردنەوە، مزگەوتێکی هاوبەشیان هەبوو، کە ڕۆژانی هەینی نوێژیان تیا دەکرد، لە پاشا لە یەکتر جیا دەبوونەوە، بڵباسەکان لە جل و بەرگیان لە کوردەکانی ئامێدی دەچوون، دیالێکتیان بابانی و بەهدینانی بوو، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە هۆزەکانی (ڕەواندز) هەیە ریچ ئاماژەی پێ دەکات: (ڕەواندوز قەڵای یەکێک لە هۆزە سەربەخۆیەکانە میرەکەیان مستەفا بەگە. ڕەواندوز کەوتۆتە سەر لووتکەی چیایەکی زۆر بەرز لە چیاکانی زاگرۆس، ڕواندوزییەکان تیر هاوێژی کارامەن (عەباس میرزا) پێش چەند ساڵێک لەشکرێکی ناردە سەریان بۆ ڕکابەرایەتییان، بەڵام بەناچاری گەڕایەوە، تۆپەکانی لەپاش خۆی بەجێ هێشت، ئەو تۆپانە ئێستا لەنێو قەڵاکەی ڕەواندوزە، هۆزەکانی ڕەواندوز لە جل و بەرگیان لە خەڵکی ئامێدی دەچن، بەڵام شێوەی قسەکردنیان نزیکە لە کۆییەکان).

بەڵام ڕولسۆن ساڵی ١٨٣٦ دەربارەی هۆزەکانی ڕەواندز دەڵێت (ئەو شوێنانەی کەوتبووە نێوان شنۆ و زێی بچووک لە سەردەمی محەمەد پاشا دوا میری ڕەواندوز لەژێر دەستی ئەو میرە بوو، کە خۆی سۆرانی بوو. ئەو هۆزە بەسەرۆکایەتی یەکێک لە میرە بەتواناکانیان ڕەواندوزیان گرت، چەند سەدەیەک دەبوو ژمارەی خێزانەکانی ڕەواندوز لە بنەڕەتدا (٨٠٠) خێزان بوو، زۆربەی خەڵکی ڕەواندوز سەر بەهۆزی (ڕواندی) یان (ڕەواندوز) بوون، ژمارەی هۆزی (ڕەواندوز) گەورە (١٢٠٠) خێزان بوو، هەموویان لەژێر فەرماندەی میرەکانی سهران- سۆران بوون، قەڵای (ڕوان) یا (ڕەواندوز) بە درێژایی فەرمانڕەوایی سهرانی پێگەیەکی قایم بوو بۆیان)، ئاماژەی زیاتر بە هۆزەکانی ڕەواندوز دەکات و دەڵێت: (١٢ بەشن، وەک: مام گرد، مام ساڵ، مام خاڵ، مام باڵ، مام ویس، مامویی، مەمکەکال، مام سکی، پیربال، کەلو، مامە سام) هەندێک هۆزی تر جگە لە هۆزی ڕەواندزی لەگەڵیان تێکەڵاون، وەکو: (شێخ ئاب، ماڵ یاس، تورک، هەناری،

خەیلانی، کاسان، شێخ مەحمودی) ناوچەی (سیدک- سیدەکان) کە چیاییە نزیکەی ٤٠ گوندی بچووکی لێیە ژمارەی خانووەکان ١٠٠٠ خانووە، هۆزەکانی سەر بە (رواندک، بیروسوی، شێروانی)ن.

دەربارەی هۆزی باڵەک دەڵێت: (بەهێزترین هۆز لەوانە هۆزی (باڵەک)ە کە ژمارەی خانوو و خێزانەکانیان ١٠ هەزار ماڵە).

ئەو هۆزە شوێنەکانیان دەکەوێتە ناوچەیەکی چیای زۆر سەخت، لەبەر ئەوەی دەکەوێتە پشت چیای قەندیل و سنووری شنۆ و لاهیجان، ناوەندەکەیان شارۆچکەی (رایاتە)، میری سۆران ئەوانەی خستبووە ژێر رکێفی خۆی، لە هەر ماڵێک یەکیانی کردبووە سەربازی سوپاکەی لە دوای نەمانی میرنشینی سۆران ئەو هۆزە بەسەربەخۆیی ماوە، سەرۆک هۆزەکە ئێستا (عەزیز بەگە) ریچ لەو گەشتەی کە ساڵی ١٨٢٠ بۆ هەولێری کردووە، دەربارەی هۆزی دزەیی دەڵێت: گەیشتمە چادرە گەورەکەی فارس ئاغا سەرۆکی هۆزی دزەیی لە گوندی (قوشتەپە)، کە بەناوی گردێکەوە ناونراوە، هۆزی دزەیی کوردن، پێشتر سەر بە کۆیسنجق بوو پاشای بەغدا جیای کردەوە لە کۆیسنجق و هەولێر، خستیە ژێر کۆنترۆڵی خۆی و ئەمەش وای لە هۆزەکە کرد، کە گوێ نەدەنە کەس.

کابتن های روونکردنەوەی گرنگ دەربارەی هۆزی کورد لە لیوای هەولێر دەخاتە روو:

١- هۆزی دزەیی: سێ بەشن (پیران، مامان، کونتولا) ٦٠٠٠ هەزار کەسن، لە دەوروبەری چیای قەرەچووغ و کەندێناوە لە قەزای مەخموور لە لیوای هەولێر دەژین، زەوییەکانیان زۆر بە پیتە، لە گوزەرانێکی خۆشدا دەژین و دەوڵەمەندن تا دەگاتە رۆخی رووباری دیجلە، کە هۆزە عەرەبەکانی ناچار کردووە لەرووبارەکە بپەڕنەوە بۆ رۆژئاوای، دزەییەکان لەو پەڕی چالاکیدان.

٢- گەردی: ٦٠٠ کەسن نیوەیان گەڕۆکن، لە باکووری هەولێر و هەندێکیان لە کۆیسنجاق دەژین، لە هاوینان دەچنە وزنە هۆزێکی گەورەن لە باکووری هەولێر ١٥ گوندیان هەیە.

٣- گۆران: نیشتەجێن لە هەندێ گوندی رۆژئاوای شەقلاوە.

٤- خۆشناو: ٢٠٠٠ خێزانن بەکاری کشتوکاڵی خەریکن لە ٢٠٠ گوندی ناحیەی شەقڵاوەن لقەکانی تری هۆزەکە لە کۆیە و رانیەن.

٥- پیران: ٦٠٠ خێزانن لە هۆزی (رانیە) لە باکووری ئەو شارە دەژین دەگەڕێنەوە سەر (بلباس)، لەگەڵ ئەوەی ژمارەیان کەمە، بەڵام ئازان.

٦- ئاکۆ: ١٠٠٠ خێزانن، نیشتەجێن و لە باکووری رانیە دەژین، ئەوانە چەند تیرەیەکن ٤٠- ٥٠ گوندیان هەیە لە چیای رانیە و باکووری قەڵادزە.

٧- زراری: ٣٠٠ خێزان نیشتەجێن لە باکووری بەستۆرە لە ١٢ گوند.

٨- سورچی: ٣٠٠٠ خێزانن، نیشتەجێن و بڵاون لەنێوان رۆخی باکووری رووباری زێی گەورە و رەواندوز ٥٠ گوندیان هەیە لەگەڵیان هەندێک لە هۆزی مامەکانی دەژین.

٩- باڵەک: ١٢٠٠ خێزانن، نیشتەجێن لە باکووری رووباری رەواندوز لە ٦٠ گوندن.

١٠- شێروان و برادۆست: ١٥٠٠ خێزانن نیشتەجێن لە سەرووی قەزای رەواندوز و شێروان، بەهێزترن لە برادۆست، بەڵام ژمارەیان لە ٨ هەزار کەس تێ ناپەڕێت.

١١- هەرکی: ٥٠٠٠ خێزانن هۆزێکی زۆر بەهێزن، هەندێکیان لە چیاکانی سەر سنوور دەژین، بەشێکیان لە دەوروبەری ئاکرێ، ٨ هەزاریان لەناوچەی رەواندوزن، لە بەستۆرەش هەندێک لەو هۆزە هەیە، نزیکەی ٢٠ هەزار کەسن، بەشێکیش لە ئەرزەرووم و وان دەژین.

١٢- خەیلانی: ٢٠٠ خێزانن، نیشتەجێن لە چیاکانی باکووری باڵەکایەتی، هەندێکیان لە دەوروبەری هەولێرن، ژمارەیان ١٠٠ کەسە.

١٣- بۆلی: ١٥٠ خێزانن، لە باشووری باڵەکایەتی لە زستان بەرەو قەزای کۆیە دەچن، لە هۆزی خەیلانی کەمترن.

١٤- بەراوری باڵا: ٧٠٠ خێزانن، نیشتەجێن لە باکووری رووباری گارە بە کشتوکاڵ و بازرگانی خەریکن.

١٥- بارزانی: ٢٧٥٠ خێزانن، نیشتەجێن لە باکووری زێی گەورە لە قەزای زێبار، گوندەکەیان بەناوی هۆزەکەیانە ناو ناوە بە کشتوکاڵ و

بەخێوکردنی مێش هەنگوین خەریکن، لەو پەڕی ئازایەتی و نەبەردیدان.

١٦- زێباری: ١٢٠٠ خێزانن، لەنێوان ئاکرێ و زێی گەورە و دەوروبەری پیرە کەپرە دەژین بە جووتیاری و چاندنی میوە خەریکن.

**هۆزەکانی هەولێری ئیمڕۆ**

ئەو هۆزانەی کە لە لیوای هەولێر نیشتەجێن و شوێنی دانیشتنیان و ژمارەیان لە هەر تیرەیەک بەپێی یەکەی ئیداری کە ئەو هۆزانەی تیایدا دەژین بۆ زانین هەندێک لە هۆزەکان لەشوێنێک زیاتر نیشتەجێن.

هۆزی دزەیی، کە ناوەندی هەولێر و قەزای مەخموور و ناحیەکانی دەژین.

**أ- ناوەندی ناحیەی هەولێر:**

١- دزەیی: ١١٠٠٠ کەسن، ناوەندەکەیان گوندی قوشتەپەیە.

٢- گەردی: ژمارەیان ٢٩٦٠ کەسە، ناوەندەکەیان گوندی بەحرکەیە.

٣- شێخ بزێنی: ٦٠٠ کەسن ناوەندەکەیان گوندی کەورگۆسکە.

٤- هەرکی: ژمارەیان ٥٣٨ کەسە.

٥- شەمەر: لە هۆزی شمر لەناوچەی جەزیرە لە لیوای موسڵ نیشتەجێن، ژمارەیان لەناوەندی هەولێر ٥٢ کەسە.

**ب- ناوەندی هەریر: هۆزی خۆشناو و هۆزانی تر**

١- خۆشناو: ژمارەیان ٦٥٠ کەسە لە باشووری ناوەندی ناحیەکە، ناحیەکەش بەشێکە لە خۆشناو لە قەزای شەقلاوە نیشتەجێن.

٢- حەیدەری: ٣٠٠ کەسە، ناوەندەکەیان باشووری رۆژئاوای ناحیەی خۆشناوە.

٣- هەروتی: ٣٥٠ کەسە ژمارەیان، ناوەندەکەیان ناحیەکەیە و لەگوندەکانیان (نەردان و باوان) لەرۆژئاوای ناحیەکە.

٤- زراری: ژمارەیان ٣٠٠ کەسە، لەرۆژئاوای ناحیەی خۆشناو هەروەها لە گوندەکانی ناحیەی سەلاحەددین نیشتەجێن.

٥- ئاسووری: ژمارەیان ٤٣٥ کەسە، لە ناحیەکە و گوندەکانی (باتاس، هەنارە، دیرشیروک) نیشتەجێن.

**ج- ناوەندی سەلاحەددین: هۆزی خۆشناو و هۆزانی تر**

١- خۆشناو: ژمارەیان ٢٠٠٠ کەسە، زۆربەیان لە ناحیەی خۆشناو و هەندێکیان لە ناحیەی سەلاحەددین و حەریر نیشتەجێن.

٢- گەردی: ژمارەیان ٢٨ کەسە، بەشێکن لە هۆزێکی گەورە، کە لە باکووری هەولێر و کوێسنجق دەژین.

٣- زراری: ژمارەیان ١٥٠٠ کەسە، لە ناحیەی حەریر و سەلاحەددین نیشتەجێن.

٤- ماوەرانی: ژمارەیان ١٥٠٠، کەسە لە گوندەکانی دەوروبەری سەلاحەددین نیشتەجێن.

٥- میران بەگی: ژمارەیان ١٥٠ کەسە نیشتەجێن لە گوندەکانی (ئیفراز، گردمامک) لەسەر زێی گەورە.

٦- هەرکی: ژمارەیان ٣٥٣٦ کەسە، لە هۆزە کۆچەرەکانن، هاوین بەرەو کوێستانی چیاکانی سەر سنووری عێراق و ئێران دەچن لە زستانیش لە دەشتەکانی باکووری هەولێر و حەریر و باتاس دەچن، هەرکی لەناوچەی هەولێر دوو لقن هەرکی سەرهات و هەرکی سەیدان، ئێستا بلاون لە هەولێر و سەلاحەدین.

**د. قەزای مەخموور: هۆزی (دزەیی) و هۆزانی تر**

١- دزەیی بەرەبابی فارس: ژمارەیان (٩٥) کەسە، ناوەندەکەی گوندی (باقرتە).

٢- دزەیی بەرەبابی مام خولە: ژمارەیان (٤١٨) کەسە، لە گوندی (گەرەسورن عەین ئەیوب) نیشتەجێن.

٣- دزەیی بەرەبابی بایزی: ژمارەیان (١٢٣٤) کەسە بلاون لە ناوەندی قەزاکە و گوندەکانی.

٤- بندیان: ژمارەیان (١٨٠) کەسە، لە گوندی ئازیکەند نیشتەجێن.

٥- مامەسێنی: ژمارەیان (١٢٨) کەسە، لە گوندی (دوسەرە، بیر مەهێدی) نیشتەجێن.

٦- سیان: ژمارەیان (٣١٠) کەسە، لە (دوسەرە، گردەپۆر، گردەچاڵ) نیشتەجێن.

٧- ئاری کوتکی: ژمارەیان (٢٩٤) کەسە، لە گوندەکانی (خەزنە کرول، کەندی باریکە) نیشتەجێن.

٨- ئۆمەربل: ژمارەیان (٣٣٥) کەسە، لە گوندی (گردەپان، محسناوە) نیشتەجێن.

٩- پالانی: ژمارەیان (٣٤١) کەسە لە گوندەکانی (پالانی، گردی

گۆمێ، حەسارۆک، حوشترالورک) نیشتەجێن.
١٠- سارمەمی: ژمارەیان (٢٢٢) کەسە، لە گوندی (وادی غراب) و هەندێ گوندی تر نیشتەجێن.
١١- باجەڵان: ژمارەیان (١٢٠) کەسە، لە گوندی (گردی قوشتەپە، کەلەشخان) نیشتەجێن.
١٢- ئەبو هەمەدان: ژمارەیان (١٤٢) کەسە، هۆزێکی عەرەبن لە گوندی (سارتک، خازر، عنبر) نیشتەجێن.
١٣- شەلیلە: ژمارەیان (١١٤٩) کەسە، لە گوندی (بەهانە، کیروک، عەین شەهاب، خالدیە) نیشتەجێن.
١٤- لهێب: ژمارەیان (٣٧٨) کەسە، لە گوندی (جەدیدە، خەرابە جاراللە) نیشتەجێن.
١٥- سمبس: ژمارەیان (٣٤٨) کەسە، لە گوندی (خەریانی، رواڵە، خەربە مەحمود) نیشتەجێن.

**ناوەندی ناحیەی گوێڕ و: هۆزەکانی عەرەب و هۆزەکانی دزەیی و هی تر**

١- سمبس: ژمارەیان (٢٠٦) کەسە، لە ناوەندی ناحیەی گوێڕ نیشتەجێن.
٢- ئەلحەرب: ژمارەیان (٣٣٨) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٣- ئەلعەلینە: ژمارەیان (١٧٤) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٤- فەقێ مولکی: ژمارەیان (٤٤٤) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٥- جەبور: ژمارەیان (٢٠٩) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٦- شێخان: ژمارەیان (٩٤٥) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٧- کاکەیی: ژمارەیان (٤٢٤) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٨- مەرزانی: ژمارەیان (١٤٣) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٩- شێخ مەمووندی: ژمارەیان (٣٨٢) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
١٠- ساداتی بەرزنجە: ژمارەیان (١١٥) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
١١- گەردی: ژمارەیان (٩٤٧) کەسە لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن هەندێ کەسی تر لەهۆزەکانی تر لەگەڵیاندان.
١٢- دزەیی: ژمارەیان (١٥٩٥) کەسە، ئەوانە لەهۆزی دزەیین.
١٣- نعێمی- سادات: ژمارەیان (٤٤٤) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە و دەوروبەری نیشتەجێن.
١٤- طه ی: ژمارەیان (٥٧٧) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە و هەندێ گوندی دەوروبەری نیشتەجێن.

**و- ناوەندی ناحیەی کەندێناوە: هۆزی دزەیی و هۆزانی تر**

١- بەرەی پاشای: ژمارەیان (١٠٠٥) کەسە، لە گوندی (عبداللە گوجلان، چەلتوک، مەلەک ئاغا) نیشتەجێن.
٢- بەرەی فارس ئاغا: ژمارەیان (١٠٠٣) کەسە، لە گوندی (شۆڕە زەردکە، خورمەڵە، خەزنە، بەرزەوار) نیشتەجێن.
٣- بەرەی باییز ئاغا: ژمارەیان (١٥١٨) کەسە، لە گوندی (جانە، گردی گومێ، کەندارەقەل، پەلکانە) نیشتەجێن.
٤- مامەخولە: ژمارەیان (١١٩٥) کەسە، لە گوندی (دیبەگە، کاریتان، شۆریجە، سۆفی سمایل) نیشتەجێن.
٥- سیان و سومال: ژمارەیان (٩٤٠) کەسە، لە گوندی (سەربەشاخ، رەشید سارەلو) نیشتەجێن.
٦- سیان: ژمارەیان (٩١) کەسە، ناوەندەکەیان گوندی شەناغەیە.
٧- مامەسێنی: ژمارەیان (٥٠٦) کەسە، لە گوندی (سەرگەڕان، داودگورگە، کەندارەقەل) نیشتەجێن.
٨- شێروانی: ژمارەیان (٥٨٧) کەسە، لە گوندی (دارەخورما، حەسەن بلباس) نیشتەجێن.
٩- ئاری کوتکی: ژمارەیان (٤٣٥) کەسە، لە گوندی (کەندارەقەل، یارمجە، گاوەرە) نیشتەجێن.
١٠- ساڵەیی: ژمارەیان (٧٥٧) کەسە، لە گوندی (مەلاقەرە، ماجد، شێخ لاس، رەش حەسەن) نیشتەجێن.
١١- لەک: ژمارەیان (١١٦) کەسە، لە گوندی (دوشیوان).
١٢- هۆرمزیار: ژمارەیان (٢٣٥) کەسە، لە گوندی (سمایلاوە،

هێلەوە، شێخ شێروان) نیشتەجێن.
١٣- بەرزنجە: ژمارەیان (٢١١) کەسە، لە گوندی (یەدی قو، حەسارۆک) نیشتەجێن.
١٤- بەنی تەیم: ژمارەیان (٨٠) کەسە و عەرەبن، لە گوندی (درگەی گەورە) نیشتەجێن.

**ز- هۆزەکانی قەزای کۆیە**

١- غەندری: ژمارەیان (٤٣٠٠) کەسە، لە گوندەکانی (نازەنین سماقولی، کروژ، گومە شێخان، داربڕ) نیشتەجێن، سەرۆک هۆزەکە لە کۆیە دادەنیشێ.
٢- حەویزی: ژمارەیان (٣٠٠٠) کەسە، لە گوندی (بارەمێش، تۆبزاوە، هەواوان، سناوە) نیشتەجێن، سەرۆک هۆزەکە لە کۆیە دادەنیشێ.
٣- خۆشناو: ژمارەیان (٤٣٠٠) کەسە، لە گوندی (سکتان، وونکە، بالیسان، بێداوە، سوسێ) نیشتەجێن ناوەندەکەیان بالیسانە.
٤- گەردی: ژمارەیان (١٢٠٠) کەسە، لە گوندی (کانی کەوان، پەلکەڕەش، ئاریان، ئەشکەوسەقا، تەرگێنە، حاجی وسو) نیشتەجێن. گوندی ئەشکەوسەقا ناوەندی هۆزەکەیە.
٥- سارات: ژمارەیان (١٥٠٠) کەسە، لە گوندی (چنارۆک، جەلی، ئاخورە، تەشقە) نیشتەجێن.
٦- کورک داران: ژمارەیان (٢٥٠٠) کەسە، لە گوندی (بانە قەرات، کانی سوسکە، ڕەسول بسکۆل، تەکەور، گۆیتەپە) نیشتەجێن.

**ح- ناوەندی تەق تەق**

١- زەندی: ژمارەیان (١٤٠٠) کەسە، لە گوندی (تەق تەق، سێگردکان، ناسرئاغا) نیشتەجێن.
٢- غەفوری: ژمارەیان (١٠٠٠) کەسە، لە گوندەکانی (خەرابە، کاولان، کانی سور، کاریز) نیشتەجێن.
٣- شێخ بزێنی: ژمارەیان (٢٠٠) کەسە، لە گوندەکانی (گۆمەشینی، سەوتک) نیشتەجێن.
٤- هۆرمزیار: ژمارەیان (١٥٠٠) کەسە، لە گوندی (ساتوقەڵا) نیشتەجێن.
٥- لەک: ژمارەیان (١٠٠٠) کەسە، لە گوندی (بەردەسپی) نیشتەجێن.
٦- تالەبان: ژمارەیان (٥٠) کەسە، ناوەندەکەیان گوندی (قزلو)ە.
٧- گۆران: ژمارەیان (٢٠٠) کەسە، لە چەند گوندێک نیشتەجێن.
٨- شێخانی: ژمارەیان (١٧٥٠) کەسە، لە گوندەکانیان (نێرەگێن، بانەمورد، باییزئاغا، بانی ماران، کانی کوردە، شیواشوک) گوندی (بانەمورد) ناوەندی هۆزەکەیە.
٩- جافە ڕەشکە: ژمارەیان (١٢١) کەسە، ناوەندەکەیان گوندی کلیسەیە.

**گ- هۆزەکانی ناحیەی باڵەک**

١- مەلا شەرەفی: ژمارەیان (١٩٥٠) کەسە، ناوەندەکەیان ناحیەی باڵەکە.
٢- شیوەزوری: ژمارەیان (٤٤٤٩) کەسە، لە ناحیەی بەشێک لە باڵەک نیشتەجێن.
٣- سەکرانی: ژمارەیان (٢٩٢) کەسە، لە ناحیەکە نیشتەجێن.

**ی- هۆزەکانی ناحیەی برادۆست**

١- برادۆست: ژمارەیان (٩٠٠) کەسە، لەناوچەی برادۆست لە سێگۆشەی سنووری عێراق و ئێران و تورکیا نیشتەجێن.
٢- زەوەندۆک: (٨٥٠) کەسن.
٣- برەش: (٨٠٠ کەسن.
٤- خواکورک: (٥٠٠) کەسن.
٥- مهاجر: (٣٥٠) کەسن.
٦- کەردید: (٤٢٠) کەسن.

لەناوچەی برادۆست نیشتەجێن، نزیکەی (٥٠) گوندن، خانووەکانیان (١٠٠٠) ماڵە.

**ک- هۆزەکانی ناحیەی مێرگەسۆر**

١- شێروانی: ژمارەیان (٤٢٠٩) کەسە، لە گوندی (مێرگەسۆر، شێروان) نیشتەجێن.

**بەشی دووەم**

**گرنگترین شوێنەوارە کۆنەکانی هەولێر**

**قەڵای هەولێر:** لە هەولێر بەگرنگترین شوێنەوارە مێژووییەکان دەژمێردرێت، کە شێوەی خۆی پاراستووە، تاکو ئێستا پڕ لە خەڵکە، کە ئاشوورییەکان هەولێریان بە کۆنترین شاری زیندوو لە جیهان داناوە. بەشێک لە شارەکە ئیمڕۆ لەسەر گردی(قەڵایە)، کە ڕووبەرەکەی (٦٠/٠٠٠) کم٢، بەرزییەکەی (١٥٠) پێیە تیرەکەی

(٤٠٠) یاردەیە لەوانەیە قەڵات زۆر بەرز بووبێت لەپێشوو، کە قارقالا (CARACALLA) ئیمپراتۆری رۆمانی، کە هەولێری داگیرکرد پاش گەڕانەوەی لە هێرشەکەی بۆ سەر تەیسفون ساڵی (٢١٦) زاینی ئەو بەرزاییەی ڕماند و ئەو گۆڕانەی دەرهێنا فورسەکان جێی دڵدانەوە بوو. دەڵێن داریوش پاش دۆڕاندنی شەڕەکەی لەبەرامبەر ئەسکەندەر ساڵی (٣٣٠) پ.ز بەرەو هەولێر هات، گەنجینەیەکی زۆری لە قەڵا بەجێ هێشت، لەپاش هەڵاتن لەلایەن چەند لایەنگری کۆچی هەزبانییەکان لە هەولێر لەگەڵ دەستەڕۆی دەوڵەتی عەباسی ڕووبەڕوو بوونەوە ئیمارەتەکەی خۆیان (هەولێر) پاراستیان، قەڵاکەیان کردە پێگەی حوکمڕانی، بە درێژایی کۆنترۆڵکردنی بویهییەکان لەسەر ڕێگاوبانەکان (٣٣٤) کۆچی تا (٤٤٧). کەڵکیان لەو سەربەخۆییە وەرگرت تا ڕادەیەک لە سەردەمی سەلجووقییەکان لەپاش سەردەمی بویهییەکان لەعیراق.

یاقوت حەمەوی لە پێناسەکردنی قەڵات دەڵێت: (قەڵات شوێنێکی قایمی هەیە و شارێکی گەورەیەو لەو بەرزاییەی سەرزەوی لەقەڵاکە خەرەندێکی قووڵ هەیە، هەروەها بازاڕو مزگەوت و خانووی تێدا هەیە. ناتوانرێت بەسەر بکەویت بۆ قەڵات تەنها لە دوو پلیکانی کۆن نەبێت، لە پلیکانی سێیەم گومەزەکیان کردووە نزیکەی (٤٠) ساڵ، لەدەرگای سەرەکی قەڵات کۆشکێکی گەورە هەبوو، کە ماوەیەک خانووی حکومەت و قوتابخانەو مستەوسەف بوو، قەڵات تەنها پاشماوەی شارێکی گرنگی ئاشووری بوو، کە بەناوی (ئەربا- ئیلۆ) دەناسرا لەسەر گردێکی کۆن دروست کرابوو، وا دەگێڕنەوە کە گردەکە قەبرستان بووە.

قەڵات لە سەردەمی ئیسلامییەکان کۆڵەکەیەک بوو و ناوەندێکی نیشتەجێ بووە، پەرژینێک بوو بۆ بەرگریکردن لەشارەکە، کە لەسەر ئەو گردە دروست کرابوو، مەگۆلەکان چەندەها هێرشیان کردە سەر قەڵات، نەیانتوانی شارەکە بگرن لەبەرئەوەی شوێنێکی سەختی هەبوو هەروەها نادر شا ساڵی ١٧٣٢ نەیتوانی بیگرێت پاش ئەو بەرگرییە قارەمانەی، کە کردیان هەروەها لە هێرشی دووەمی نادر شا ساڵی ١٧٤٣ چوار دەورەی قەڵای دا بۆ ماوەی (٦٠) ڕۆژ پاشان چووە ناو قەڵاتەکە ئینجا بەرەو موسڵ ڕۆیشت پاش ماوەیەک گەڕۆکێکی بێگانە بە هەولێردا تێدەپەڕێت هیچ نابینێت، لەو دیوار و پەرژینانەی کە قەڵایان دەپاراست، کە دەڵێت: "چەند خانووەکی لێیە نەخوازا لەڕۆخی گردەکە بەشێوەیەکی لەیەکتر نزیک کەس ناتوانێ بچێتە قەڵاکە تەنها لە دەرگای ئێستای نەبێت" پرسیارێکی گرنگ هەیە چۆن؟ کەی قەڵات دروست کراوە. وەڵامی ئەو پرسیارە شارەزا (ئیدوارد کشیر) دەیداتەوە، دەڵێت: "ئێستا لە عیراق چەند شارێک هەیە، کە پڕە لە خەڵک و لەسەر نیشتەجێی کۆن دروست کراوە، لەوانە شاری هەولێر و شاری کەرکوک، بەڵام یەکەمیان مرۆڤ پێچاوپێچ سەردەکەوێت پێش ئەوەی بگاتە سەر گردەکە، کە شارەکەی لێ دروست کراوە. شوورە بەرزەکانی وای لێ کردووە، کە خاکە نەرمەکەی لەدارمان بپارێزێت زەرەر بەشارەکە نەگەینێ، کە لەدەشتاییە، لەبەر ئەوەی گردەکە لە دۆخێکی باش ماوەتەوە سەدەها ساڵ، دەڵێت ئەوەی لەسەر گردەکە بڕوات دەورێکی تری شارستانی لەمێژووی ئەو گردە دەبینێت، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فارسەکان (نموونە) ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە ئەوە هەموو شتێک لەو سەردەمە بسڕێتەوە. مرۆڤ هەر چەندە بە قووڵی لێ بکۆڵێتەوە کۆنی شارەکە دەردەکەوێت، لەڕۆژهەڵات خەڵک وریا دەبێ لەو خانووانەی لەو زەوییە ڕاستایەی دروستی کردووە لە ترسی لافاو، لەبەر ئەوە گردی بچووک دروست دەکەن لە قوڕ، کەلوپەلەکانی لەو بەرزاییە دابنێ، کە تۆزێک لە زەوییەکە بەرزترە، خانووەکان لەقوڕ دروست دەکرێن و بە قوڕ سواقی دەدەن بەداری بارێک سەری دەگرن، بە قوڕێکی تەنک بۆ ئەوەی لەبەر باران بارین بیپارێزێت. هەموو ساڵێک لەدوای وەرزی باران بارین دووبارە سواقی دەدەنەوە ئەوەش شتێکی سروشتییە تەمەنی ئەو خانووانە کورتە، پاش ماوەیەک دیوارەکانی کونی دەکەونێ، چاکردنەوەی زیاتری تێ دەچێت لە تێکدانی و دووبارە دروستکردنەوەی لە هەمان شوێندا، لەبەر ئەوە خانووی نوێی دروستکراو لەسەر کەلاوەکە بەرزتر دەبێت، لە ماوەی ئەو گۆڕانە سروشتییە ئاستی شەقامەکە بە پلە

بەرز دەبێت، سووتانێک گڕ بگرێت لە گەڕەکێک لەشارەکە خاپووری دەکات ئەوە رووبدات دوژمن شوێنێک خاپوور بکات خەڵکەکەی ڕاگوازێت لە پاش ساڵێک دووبارە دروستی دەکەنەوە یاخود پاش چەند ساڵێک خەڵکانی تر لە هەمان رەگەزی خەڵکە رەسەنەکە تیایدا نیشتەجێ دەبن، ئاستی بەرزی شارەکە ئەو خانووەی کە نیشتەجێبووە نوێیەکان دروستی دەکەن ئاستی بەرزی شارەکە بەو رێگایە بە بەردەوام دەمێنێتەوە، هەندێ جار قەرەباڵغی تەنگ بە خەڵکی سەر قەڵا هەڵدەچنێت لە ئەنجامی زۆربوونی خەڵک ئەو کاتە خەڵکەکە دێنە خوارەوە دەست بە دروست کردنی خانوو نوێ دەکەن لەو دەشتەی خوار قەڵا.

تاکو ئێستا هیچ پشکنین و هەڵکەندنی رێکوپێک لە قەڵا ئەنجام نەدراوە، لەگەڵ ئەوەش چەندەها پاشماوە دۆزراوەتەوە لەوانە لەوحەیەک لە نووسراوی ئاشوور پانیپال، کوتەڵەیەکی برۆنزی خوای ئاشوور و پاشای ئاشوورییەکان (ئاشووردانی سێیەم ٧٧٣-٧٥٤پ.ز) گومانی تێدا نییە ئەو پشکنینە زانستییانەی لەدوارۆژ دەکرێت لە قەڵای هەولێر بۆمان بەدیار دەخات، کە ناوچەکە چەندەها شارستانیەتی یەک لەدوا یەکی بەخۆیەوە بینیوە.

**منارەی هەولێر یا منارەی موزەفەرییە:**

ئەو منارەیە دەکەوێتە رۆژئاوای باشووری شارەکە، کە بە منارەی موزەفەرییە ناسراوە، ئەوەش بۆ (سوڵتان) حاکمی هەولێر موزەفەرەددین گۆگبری دەگەڕێتەوە کە لەساڵی (١١٣٢) ز کۆچی دوایی کردووە، ئەو بەشەی کە ماوە لە منارەکە بەرزییەکەی (٣٧) مەترە لە بنەرەتدا بەرزییەکەی زیاترە. زۆر لە گەڕۆک و گەڕیدەکان لە عەرەب و بیانییان باسی ئەو منارەیان کردووە، نیپور لە گەشتەکەی بۆ هەولێر ساڵی ١٧٦٦ دەڵێت: لە هەولێر شوێنێک کە بەرچاو بێت پاشماوەی ئەو مزگەوتە گەورەیە، کە لە قەڵاوە دوورە و کەوتۆتە نێو کێڵگەیەکی فراوان، ئەوەش لە پاشماوەی سوڵتان موزەفەرە، منارەکە بە تەنیشت مزگەوتەکەوەیە، زۆر بە پوختی دروست کراوە بە کەرپووچ، دوو دەرگای هەیە زۆر بە ئاسانی دەتوانی سەر بکەویتە سەر منارەکە هەر دوو دەرگای منارەکە بەرامبەر یەکترین، لەیەک کاتدا دوو کەس دەتوانن بە پەیژەکانی سەر بکەون، بەبێ ئەوەی یەکتر ببینن، تا دەگەنە سەر منارەکە، بەڵام مستەر ریچ کە ساڵی (١٨٢٠) سەردانی هەولێری کردووە دەربارەی مزگەوتەکەی منارە دەڵێت: (کەلاوەیە) بناغەی هەمووی خاپوور کراوە، بەرزی منارەکە (١٢١) پێیە تیرەکەی (٢١) پێیە لەسەر قاعیدەیەکی تۆکمە دروست کراوە هەر لایەکی ٩ پێیە و ١١ گرێیە بەرزاییەکەی خۆی دەدا لە نێوان ٣٠ تا ٤٠ پێ. منارەکە هەر وەک منارەکەی (داقوق) دروست کراوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی میرەکانی هەولێر، کەلاوەکانی بەدەورەی هەیە. کۆمەڵێک لە پاشماوەی رووخاو، کە لە پاشماوەکانی بەغدای کۆن دەچێت.

پاشماوەکانی مزگەوتەکە کە نیپور بینیویەتی ئەو کەلاوەی بەدەوری منارەکەوە هەیە، کە ریچ بینیویەتی هیچی نەماون مزگەوتەکە شوێنەوارەکەی تاکو ئێستا بەرچاوە.

منارەکە لە گەچ و خشتی سوور دروست کراوە لەو منارەی شەنگار و موسڵ (داقوق)ی کەرکووک دەچێت، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی نێوان (٥٤٣- ٥٨٦) کۆچی، هەر وەک سارە و هوتسفیلد لە گەشتەکانی ئاماژەی پێ کردووە.

**پێناسەی منارەکە:** چێوەی تیرەی منارەکە (٢١) پێیە لەسەر بناغەیەکی پتەوی بە بەرد دروست کراوە، درێژی هەر لایەکی ٩ پێ و ١١ گرێیە بەرزی لە نێوان (٣٠ تا ٤٠) پێیە دوو لای منارەکە بەرەو دیواری مزگەوتەکە چووە، بەشێوەیەکی سێگۆشە، لە نێو تیرەکەی دوو پایەی لوولەیی هەیە بۆ پەیوەندی لە نێوانیان زۆر بەئاسانی خەڵک دەتوانی بچێتە سەر منارەکە، هەر دوو دەرگای منارەکە بەرامبەر یەکترین دوو کەس دەتوانن لە یەک کاتدا سەرکەون بۆ سەری منارەکە بەبێ ئەوەی یەکتری ببینن، بەڵام ئەو دوو پایەی کۆن بووینە دەرگایان بەشێوەیەکی کاتی داخراوە، لە بناغەی منارەکە کونێک دەرچووە، ئەوەش پاش نۆژەنکردنەوەی ساڵی ١٩٦٠ لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارە کۆنەکان پڕ کراوەتەوە.

باشترین پێناسەی منارەکە

لەلایەن شارەزای ئەڵمانی هرتسفیلدە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، کە کردوویەتی نەخشەی منارەکە کە کردوویەتی، باشترین نەخشە کە تایبەتە بەو منارە پشت بەو نەخشەیە دەبەستێن لە پێناسە کردنی نەخش و ڕازاندنەوەکانی کە هەیە لە منارەکە.

هەموو نەخشەکانی منارەکە لە خشتی سوور دروست کراوە، زۆربەی نەخش و نیگارەکانی منارەکە خاپوور کراون.

**سەعداوە:**

گردی سەعداوە دەکەوێتە سەر ڕێگایەکی قیرتاو نەکراو، (٢٥) کم لەرۆژئاوای باشووری شاری هەولێرە، شارێکی ئاشوورییەکان بووە و زۆر ڕێزی ئەو شارەیان دەگرت. پاشایەکانیان بە کۆمەڵی گەورە سەردانی ئەو شوێنەیان دەکرد، زێڕ و شتە جوانەکانی خۆیان لەبەر دەکردەوە لەسەر گۆڕە مێژووییەکانی خۆیان لەو شوێنە پیرۆزە دادەنا.

نێردراوێکی ئیتاڵی بەسەرۆکایەتی (ڕۆژهەڵاتناس) G. Fuwanie بۆ ماوەیەکی کورت چەند هەڵکۆڵینێکی ساڵی ١٩٣٣ ئەنجام داوە، پاشماوەکانی ئاشووریان دۆزیوەتەوە لەگەڵ گۆڕستانی سەردەمی فارسەکان، خشتی سووریان دۆزیوەتەوە مۆری بە ناوی پاشا سەنحاریب و ناوی شوێنەکە سەعداوە، کە ئەو پاشایە شوێنێکی قایمی تیادا دروست کردووە، ئەوەی ئاشکرایە ئەو ڕێگایەی لەهەولێرەوە بۆ ناحیەی گوێڕ دەچێت لەو بەرەی ڕێگاکە چەندەها گردی پاشماوەی شوێنەواری بەرچاو دەکەوێت، کە بریتییە لە گۆزەگەری (بەناوی گۆزەگەری موسڵ) چینی پێنجەم لە سەرەتای هەزاری سێیەم پ.ز. سەعداوە شارێکی گرنگی ئاشوورییەکان بووە لە سەردەمی ئاشوور ناسر بالی دووەم، کە گرنگییەکەی کەمتر نەبووە لە شارەکانی تری ئاشووری.

**هەڵکۆڵینەکانی سەر چیای هەریر:**

ڕێگایەک لە شەقڵاوە بەنێو دەشتایی و بەرزاییەوە دەڕوات بەرەو گوندێکی ناودیار بە ناوی هەریر، کە کەوتۆتە دەشتێکی بە پیت و ئاوێکی زۆر، ئەویش دەشتی هەریر و باتاسە، کە لەلای ڕۆژهەڵاتەوە زنجیرە چیاکانی هەریرە، لەو دەشتایە شوێنەواری چەند گردێکی چەندەها سەردەمی پێشوو بە دیار دەکەوێت پاش ٤٠ کم ڕێگاکە دەگاتە سەنتەری ناحیەی هەریر، لە هەریر ڕێگایەکی کۆن بەرەو لووتکەی چیای هەریر دەڕوات پاش ٢ کم لە هەریر ڕێبوار بەلای دەستی ڕاستەوە لە چیاکە دەبینیت، کە وێنەی مرۆڤێکیان داتاشیوە لەسەر چیاکە بە بەرزی ٥٠م درێژی ٥ر٢م ئەو کەسەی وێنەکەی کراوە پیاوێکە بە پێوە ڕاوەستاوە کڵاوێکی لەسەر دایە جل و بەرگێکی لەبەردایە لە شەرواڵ دەچێت، لە تەنیشتەوە ڕمێکی بەدەستەوەیە، دەستی ڕاستی بۆ پێشەوە درێژ کردووە، نازاندرێت ئەو وێنەیە بە تەواوی بۆ چی کاتێک دەگەڕێتەوە لەوانەیە بۆ سەردەمی فارسەکان بگەڕێتەوە، ئەویش بەهۆی جۆری ئەو جل و بەرگەی لەبەر کەسەکەیە و جۆری هەڵکۆڵینەکەی سەر چیاکە.

**ئەشکەوتی شانەدەر:**

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە پسپۆڕەکانی بواری شوێنەوارەکان ئەنجامیان داوە لەناوچەی چیاکانی هەولێر وا بە دیار دەخات، کە مرۆڤ زۆر لە مێژە لەو ناوچەیە ژیاوە، ئەشکەوتی شانەدەر، کە دەکەوێتە چیای برادۆست کۆنترین ئەشکەوتە لە عێراق لە چەرخی بەردینی کۆن. ئەشکەوتەکە بەرزاییەکەی (٢١٠٠) پێ بەرزە لە ئاستی دەریاوە (٤٥) کم لە خەلیفانەوە دوورە نیو میل لە زێی گەورە دوورە. بەلای چەپیدا دەتوانرێت بە پێ ڕۆیشتن یا بە سواری وڵاغ بچیتە ئەشکەوتەکە لە بنکەی پۆلیسی شانەدەرەوە، کە دەکەوێتە گوندی شانەدەر میل و نیوێک دەبێت دوورییەکەی ئەگەر بەسەر بکەویت بۆ ئەشکەوتەکە ٤٠ دەقیقە دەبێت.

پاشان دەگەینە ئەشکەوتەکە بە بەرزی ٩٠٠ پێ لە ڕێگاوە کونی ئەشکەوتەکە بەرەو باشوورە، کە تیشکی ڕۆژ بۆ ماوەیەکی زۆر لێی دەدا بەتایبەتی لە زستان، بۆیە وای کردووە ئەشکەوت باشترین پەناگەی مرۆڤ بێت هەر لەسەردەمی چاخی بەردینی کۆن تاکو ئیمڕۆ باشییەکەی ئەو ئەشکەوتە لەوەدایە، کە لە نزیک سەرچاوەی ئاو بووە ئەشکەوتی شانەدەر فراوانترین ئەشکەوتە لە کوردستانی عێراق لە شێوەی سێگۆشەدایە پانی کونەکەی ٨٢ پێیە

و بەرزییەکەی ٢٦ پێیە لە ناوەوە پانییەکەی فراوان دەبێت دەگاتە ١٧٥ پێ بنمیچی ئەشکەوتەکە لە ناوەڕاست ٤٥ پێیە لە کونەکەوە ئەوەش قوولییەکەیەتی لەو پشکنینانەی کە ساڵی ١٩٦٠ ئەنجام دراوە لە کۆتایی ئەشکەوتەکە کونێکی داخراو هەیە بۆ ئەشکەوتێکی تر دەچێت تاکو ئێستا پشکنینی بۆ نەکراوە.

**زاوی جەمی:**

لەڕۆخی زێی گەورە لە نزیک ئەشکەوتی شانەدەر شوێنەوارێک هەیە بەناوی (زاوی جەمی) ئەو پشکنین و لێکۆڵینەوانەی ئەنجام دراوە لێیدا ئەوە دەسەلمێنن، کە کۆنترین چاخی بەردینی نوێی لێ بووە، ئەوەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ، کە کۆنترین گوندی کشتوکاڵی لە کاتێکدا کە مرۆڤ کشتوکاڵی زانیوە گیانەوەرانی ڕاماڵی کردووە.

ئەو گوندە نموونەیەکە بۆ ئێمە، کە یەکەم گۆڕانکاری گەورە لە ژیانی مرۆڤ ڕووی دا گۆڕانی لە ژیانی کۆکردنەوەی خۆراک و ناو ئەشکەوتە بۆ دروستکردنی خۆراک و چاندنی کشتوکاڵ لە کێڵگە و بەخێوکردنی مەڕوماڵات. لەو کاتە هیچ گۆزەگەری نەدۆزراوەتەوە، ئەمەش ئەوە بەدیار دەخات مرۆڤ گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، چەندەها ئێسک و پروسکی جۆرەها گیانەوەر دۆزراوەتەوە کە لەو کاتەدا مرۆڤ بەخێوی کردووە، ئەو پشکنینانە ئەوە بەدیار دەخات، کە عێراقییە کۆنەکان یەکەم مەڕوماڵات کە بەخێویان کردووە بزن بووە.

**ئەشکەوتی هاودیان:**

هاودیان: ١٣ کم لە خەلیفانەوە دوورە پاش پەڕینەوە لە گەلی عەلی بەگ، ڕێگایەک بەرەو لای چەپ دەچێتە گوندی باپشتیان بەرەو باکووری ڕۆژئاوا دەڕواتە مێرگەسۆر ناوەندی بارزان پاشان بە ماوەیەکی کورت دەچێتە گوندی هاودیان ئەشکەوتێکی گەورەی لێیە، کە بەناوی گوندەکەیە ئەمەش لە زستاندا شوێنی شوانەکانی ئەو ناوچەیە.

**ئەشکەوتی دیان و بێستوون:**

لە چیای برادۆست پاش ڕۆیشتن بۆ ماوەی چوار سەعات بە وڵاغ دوو ئەشکەوت لەو چیایە هەیە بەناوی (دیان) و (بێستوون)، کە دەکەونە ناوەندی چیایەکە، کە پاشماوەی کۆنی چاخی بەردینی نوێ و گەلێکی تری پێش مێژووی لێ دۆزراوەتەوە لە ئەنجامی ئەو پشکنینانەی، کە (هنری فیلد) ساڵی ١٩٥١ ئەنجامی داوە. لە بنی هەر یەک لەوانە کەلەنێکی زۆر قووڵ هەیە ئاوەکەی دەڕژێتە قووڵاییەک، کە دیار نییە هەروەها گەلێک دیاردەی سروشتی هەیە، لەوانە پاشماوەکانی بەردی کلس، کە بە ئەستلکتایت و ناسراوە.

**ئەشکەوتی بێخاڵ:**

ئەشکەوتێکی تر هەیە لەباکووری هاودیان بەناوی بێخاڵ، کە ساڵی ١٩٥٥ لیژنەیەک لە نێردراوی زانکۆی شیکاگۆ لەو شوێنە پشکنینیان ئەنجام داوە، بۆیان دەرکەوتووە پاشماوەی نیشتەنی لە دوو نهۆم کۆنترینیان سەردەمی مستیرییە پێش ٥٠ هەزار ساڵ لەسەرەوەی نهۆمێکی سەردەمی زرزی پێش ١٢ هەزار ساڵ دۆزراوەتەوە.

**ئەستوونە شوێنەوارەکانی تۆپزاوە و کێلەشین**

ئەو دوو ئەستوونە دەکەونە سووچێکی باکووری ڕۆژهەڵاتی ناوچەی برادۆست بە خەتی بزماری لێی نووسراوە و بە هەر دوو زمانی ئاشووری و ئاراراتی، کە زمانی ناوچەکە بوو تاکو دەریاچەی وان، کە وڵاتی ئارارات کە ئێستا بەشێکی وڵاتی ئەرمینیای ئێستایە. ئەو دوو ستوونە لەسەر ڕێگای هاتوچۆیە دەچێتە (ئەرمینیا و وان)، کە ئیمرۆ پێی دەڵێن ئازربایجان لە پاشان بەرەو وڵاتی ئارارات، کە دەکەوێتە باکووری دەریاچەی وان و ڕۆژئاوای وڵاتی ئاشوور ئەو ڕێگایەیان بەکار دەهێنا. کاروانە بازرگانییەکان بەو ڕێگایە کانزای خاو و ئاسن و شتەکانی تری پێویستی چەک دروستکردن هەروەها کەلوپەلەکانی وەکو پێستە و قوماش و دار دەبرد بەو ڕێگایە بۆ دەستەبەرکردنی ئەو کەلوپەلانە ئاشوورییەکان هەوڵیان دەدا، کە ئەو ڕێگایە هەمیشە پارێزراو بێت، بەڵام لەوەدا سەرنەکەوتن وڵاتی نوێ دروست بوو لەنێو چیاکانی ئارارات ئەویش دەوڵەتی خلدییە، کە ئاشوورییەکانی شپرزە کردبوو هێزی سەربازی بێ هێز کردبوو بەدرێژایی یەک سەدە وای لێ هاتبوو توانای بەریەچدانەوەی هیچ هێرشێکی دەرەوەی نەبوو لە کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زایینی

لەبەرامبەر میدییەکان و بابلییەکان چۆکی دا.

**شوێنەوارەکەی تۆپزاوە:**

دەکەوێتە گوندی سیدەکان پاش ئەوەی ٢٠ دەقیقە دەڕۆیت لە لای ڕاستی ئەو ڕێگایەی دەچێتە کێلەشین و لۆلان. ئەو بەردە لە زەوییەکی پان و بەرین دانراوە و دەڕوانێتە دۆڵێکی پان و چڕ و پڕ لە دارستان. ئەو گەڕیدەیە دەگێڕێتەوە، کە گوندێک بە هەمان ناو هەیە لە نزیک ئەو بەردە لە سەدەی نۆزدەمی زایینی سەرەتای سەدەی بیستەم. ئەم گوندە ئیمڕۆ ناوی نییە.

بەردەکە شێوەیەکی سێ گۆشەیی هەیە لەسەر بنمیچێکی لە بەردی سێگۆشە دروستکراو دانراوە درێژییەکەی (٣٣) سم درێژی بنکەی (١١٦) سم پانییەکەی (٩٢) سم ئەستووری (٣٣) سم خەڵکی ناوچەکە پێی دەڵێن (کێلی گاوری) واتە کێلی کافر. ئەو بەردە لەسەر ڕێگای گشتییە، کە سیدەکان بە کێلەشین دەگەیێنێت، هەمان ڕێگەیە، کە خلدییەکان هاتوچۆیان پیادا دەکرد لەنێو وڵاتی خۆیان و وڵاتی مەساسیر (ڕواندوز)

**شوێنەواری گردەکانی مەخموور:**

لەناوچەی مەخموور لەو دەشتە کشتوکاڵییە هەندێک شوێنەواری گردی هەیە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارە کۆنەکانساڵی ١٩٤٩ دۆزیویەتەوە، لەوانە گردی (ئیبراهیم باییز) (کاوان کانداری) شوێنی نیشتەجێ بوونی ئاشوورییەکانی لێیە لە چەرخەکانی پێش مێژوو.

**ساتو قەڵا:** شوێنەوارێک بە ناوی ساتو قەڵا لەسەر زێی بچووک باکووری تەق تەق هەیە هەندێ نووسینی تیا واژۆ کراوە بە خەتی بزماری بەشێوەی (ئاری)، کە ناوی پاشا و ئەو قەسرەی دروستی کردووە لەگەڵ ناوی ناوچەی ئەو پاشایە، کە حوکمی کردووە و کۆیسنجق سەر بەو ناوچەیە بووە.

**ساتو قەڵا:**

لە پاشماوەیەکی مێژوویی بەناوی ساتو قەڵا لەسەر زێی زاب لە باکووری شاری تەق تەق هەندێ پارچە بەرد دۆزرانەوە بەخەتی بزماری نووسرابوون، کە باس لە شوێنێکی دێرین دەکات بە ناوی ئاری و ناوی پادشایەک تیایدا کۆشکێکی دروست کردووە هەروەها ناوی هەرێمی ئەو شانشینە. ڕەنگە شاری کۆیە سەر بەو هەرێمە بێت کە لەتاشە بەردە نووسراوەکان دا هاتووە.

**گردی قالینج ئاغا:**

ئەم گردە دەکەوێتە باشووری شاری هەولێر لە نزیک یاریگای هەولێری نێودەوڵەتی بە نزیکەی ٧م لەسەر شەقامەکەوە بەرزە. ئەو گەڕان و پرۆسەی پشکنینانەی کە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری کۆن لەوەتەی ساڵی ١٩٦٥ وە ئەنجامی داون کۆمەڵێک شوێنەواری گرنگی ئاشکرا کردووە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەو گردە لە ماوەی هەزارەی پێنجەم و چوارەمی پێش زایینیدا خەڵکی تێدا ژیاوە (حەلف و عبید و ورکاء) لە سەردەمەکانی پێش مێژوو، لەوانەیە شوێنەکە لە سەرەتاکانی هەزارەی سێیەمی پێش زایین کە بە تەواوەتی چۆڵ کرابێت و خەڵکی تێدا نەمابێ. شەش چین و توێژی یەک لە دوای یەک لە خانووەکانی ورکا ئاشکرا کران، هەروەها بڕێکی زۆر لە تاتە قوڕی سوور کراوە و مۆری پان و تەخت و زێڕ و خشڵی بەکارهاتوو بۆ جوانکاری دۆزرانەوە، لەوانە بەردی بە نرخی وەک ئەڵماسی شین واتە [لازەوەرد] شیلان (عقیق) و نقێم (پیرۆزە) گۆڕە هەڵکەندراوەکانی ژێر زەوی ملوانکە و خشڵ و زێڕ و پەیکەری بچووکی لە قوڕ دروستکراو لە خۆوە گرتبوو لەسەر شێوەی ئافرەتی دوو گیان و لەسەر شێوەی دانیشتن. دەرکەوت خەڵکی نیشتەجێی گردەکە منداڵە مردووەکانیان لە گۆزەی شێوە خڕی دەمداری گەورە دەناشت. لە نێو شوێنەوارە دۆزراوەکاندا دەیان وێنەی ئاژەڵان و سەدان ئامێری چنینی لە قوڕ دروستکراو بە شێوەی قووچەکی دۆزرانەوە، هەروەها جل و بەرگی ئافرەتان و منداڵان کە بە چەندین داو و بەردی بە نرخ و مورووی بریقەدار ڕازاندرابووەوە، هەروەها چەندین کەللە سەری گۆلک دۆزرانەوە کە لە قوڕ دروست کرابوون و دوو قۆچی بچووکیان بۆ کرابوو، باوەڕ وایە خەڵکەکە گامێشیان یان گوێرەکەیان پەرستبێ، ڕەنگە گرنگترین ئەو شتەی دۆزرابێتەوە پاشماوەی تەلار سازی ئاوەدان بە خەڵک بێت،

ناوچەکە دابەش کرابوو بۆ دوو گەڕەکی فرەوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بە نێوانیاندا شەقامێکی سەرەکی تێپەڕ بووە درێژییەکەی پتر لە ٦٠ مەتر و پانییەکەی تا ٢مەتر بووە، شەقامەکەش بە کووچە و کۆڵانێکی فرەوان کۆتایی دێت کە لە لاکانیدا تەندور و نانەواخانە بڵاو بۆتەوە، هەروەک لە ناوەڕاستی ئەو شەقامەدا دوو ڕێگای لێ جیا دەبنەوە بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە لە شەقامە سەرەکییەکە کورتترن ڕێگاکەش بە وردە بەرد و چەوی نەرم تەخت کرابوو، پەرستگاکەش بە یەکێک لە جوانترین و دیارترین بیناکانی ناوچەی ڕۆژهەڵات دادەنرێت. پەرستگاکە بریتی بووە لە ژوورێکی درێژ لە هەردوو لایاندا چەندین ژووری لەو بچووکتر هەبوون، دوو ژوور لە هەر لایەک. دەرگاکانیشیان بەرەو ژوورێکی گەورە دەچوون کە کەوتبووە ناوەڕاستی پەرستگاکە و شوێنی نوێژ کردن بوو. لایەکانی پەرستگاکە و گۆشەکانی لە دەرەوە بە کۆڵەگە و دینگەی هەمان کەرەستەی بەکارهاتوو لە دروستکردنی پەرستگاکە بوو تاوەکو شێوازێکی ئەندازیی جوانی پێ ببەخشێت سەرباری زیادکردنی هێز و توانای دامەزراوەکە، ئەوەی پەرستگاکە جوانتر دەکات ئەوەیە دیوارەکانی ناوەوەی پەرستگاکەیان بە بۆیە و ڕەنگی سپی ڕازاندبۆوە لە ژێرەوەی دیوارەکان خشتی نەخشکراو هەبوو کە بەڕەنگی سوور و ڕەش بۆیە کرابوون.

**بەشی سێیەم**

**هەولێر لە سەردەمە مێژووییە کۆنەکاندا:**

لە سەردەمی ئەکەدییەوە تا ڕووخانی نەینەوا ساڵی ٦١٢- پ.ز ناوەکە:

ناوی هەولێر کۆنە بە زۆری لە نووسینە مێژووییەکاندا هاتووە لە سەردەمە جیاجیاکانەوە ڕەنگە هەولێر تاکە شاری ئاشووری بێت، کە هێشتا ئاوەدانە و خەڵکی تێدا نیشتەجێیە و تا ڕۆژگاری ئەوڕۆشمان ناوە کۆنەکەی خۆی هێشتۆتەوە، ئەوەی بە پەسند دەزانرێت ئەوەیە کۆنترین ناوهێنان و باسکردنی لە نووسینەکانی شای سۆمەری شولکی داهاتووە نزیکەی ٢٠٠٠ پ.ز بە شێوازی (اوربیلم) هەروا بە شێوازی (اربیلم) وە گوایە کەوتبووە نێو چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی بنەماڵەی سێیەمی ئوور.

هەروەها لە نووسینە بابلی و ئاشوورییەکاندا باس کراوە بە ناوی (اربائیلو) کە مانای چوار خوداوەند دەگەیەنێت بەوە ناوبانگی دەرکرد کە یەکێک بووە لە مەڵبەندە بەناوبانگەکانی پەرستنی خوداوەند عەشتار کە ناوەکەی داوەتە پاڵ شارەکە و بە [عەشتار- اربیلا] ناوبانگی دەرکرد. ناوی پەرستگاکەشی لە نووسینە بزمارییەکانیدا هاتووە بە شێوازی (ئی- کشان- کلاما) ماناکەشی ماڵی خانمی هەرێم و مەڵبەندێک بوو بۆ خۆشبەختی بە شێوازی پشکنینی جگەر هەروەک پەرستگایەکیشی تێدا بوو بۆ پەرستنی خوداوەند ئاشوور.

شاری هەولێر کە دەکەوێتە دوورییەکی نزیکەی یەکسان لە هەردوو ڕووبار کە هەر یەکێکیان بە ناوی زاب دەناسرێت لە دێر زەمانەوە شارۆچکەی ئەو هەرێمەیە کە لای باکوور و باشوورەوە ئەو دوو ڕووبارە دەورەیان داوە. لە کۆنەوە ئەو هەرێمە بە ناوی پایتەختەوە ناو دەبرێت پێی دەگوترا (ئەربلیتس- Arbeetis) یان بە ناوی هەردوو ڕووبارەکانەوە، ئەم دوو ڕووبارەش پێیان دەوترا (ئەدیبابین) حەدیاب لای خەڵکی وڵاتی شام، ڕەنگە لە وشەی (زابین)ەوە زابین وەرگیرابێت، چونکە زاب لە زمانی ئارامیی بە شێوەی (ذب) دەردەبڕدرێت بەو شێوەیە واتای (حەدیاب و ئەدیابینا) دەبێتە هەرێمی هەردوو ڕووبارەکە. هەرێمی ئەدیابیش لە ڕووی جوگرافییەوە لە بەشی هەرە گەورەکەی وڵاتی ئاشووری کۆن دەچێت تەنانەت هەندێک جار بەناوێکی هاوواتا ناونراوە ئەویش (ئاشوریا)یە وڵاتی ئاشوور. نووسینە فارسییەکانیش کە بەخەتی بزماری نووسراون بەناوی (ئەربیرا) باسیان کردووە، سەرچاوە یۆنانییە کۆنەکانیش بە (ئەربیلا) ناویان هێناوە. سەرچاوە عەرەبییەکان و جوگرافی ناسە عەرەبەکان بە (ئەربل) یان (خرە) ناویان هێناوە کە ڕەنگە بە کورتکردنەوەیەک لە حەدیاب وەرگیراوە، کوردەکانیش شارەکەیان بە (هەولێر) ناو دەبەن و دەگوترێ، وشەکە بەو شێوەیە وەرگیراوە:[ئەربیلا- ئەربیل- ئەرویل- ئەوریل- هەوریل- هەولێر].

**بەشی سێیەم**

خەڵکیش ئەمڕۆکە بە (ئەربیل- ئەرویل- ئەولێر- هەولێر) ناو دەبەن ئەم سێ ناوەی دواییەشی بە گوێرەی دەربڕینی تاکەکانە بۆ ناوەکەی.

**مێژووە کۆنەکەی:**

ڕەنگە یەکەم ناوهێنان و باسکردنی هەولێر لە سەردەمی ئەکەدییەوە پێمان دەگات تا ساڵی (2350- ٢١٥٠پ.ز) دەوڵەتی ئەکەدیش لەسەر کەلاوە و پاشماوەی دەوڵەتۆکەکانی شارە سۆمەرییەکان دامەزرا، (٣٠٠٠ پ.ز) کە لە سەردەمی بەر بەبانگی بنەماڵەکاندا گەشەی سەند دوا سەردەمیش کۆتایی هات بە دەرکەوتنی یەکێک لە پادشا سۆمەرییە بەناوبانگەکان ئەویش (لۆکال زاگیی) بوو کە دوای لە ناوبردنی بنەماڵەی شاری (لەکش)ی دراوسێی شاری ئوما سەرکەوت لە یەکخستنی دەوڵەتۆکەکانی شارەکان لە یەک شانشیندا، بەڵام ئەوە کاتێکی زۆری نەخایاند چونکە لە وڵاتدا سەرکردەیەک لە سامییەکان دەرکەوت ئەویش [سەرجۆنی ئەکەدی] بوو کە لە عێراق شانشینێکی یەکگرتووی پێکهێناو دوای ئەوەی لۆکال زاگینی لەناو برد و خۆی بە شای سۆمەر و ئەکەد ناوزەد کرد، دەسەڵاتی ئەو شانشینە تەنها تایبەت نەبوو بە عێراق بەڵکو زۆربەی بەشەکانی ڕۆژهەڵاتی دووریشی گرتەوە. لە ئەنجامی وڵاتگیرییە دەرەکییەکانی سەرجۆن و جێنشینەکانی. دەردەکەوێت وڵاتگیرییەکانی سەرجۆنی ئەکەدی گەیشتبێتە هەولێر بە مەبەستی داگیرکردنی ڕێگای دەرامەت و سەرچاوەکانی کە لە ڕێی باکوورەوە بۆ ناوەڕاست و باشوور دەهات (نرام سین)ی نەوەکەشی لەسەر ڕێبازی وڵاتگیری و فراوانخوازییەکەی ئەو بەردەوام بوو، ئەوەتا (پەیکەری سەرکەوتن)ی بۆ جێهێشتووین و تیایدا نەرام سین پادشا لە سەرەوەی سوپا سەرکەوتووەکەی دەردەکەوێت لە ناوچەیەکی شاخاویدا لە باکووری ڕۆژهەڵاتی عیراق دا. فراوانخوازی و وڵاتگیرییەکانی ئەکەدی بە پلەی یەکەم ئامانجەکەی دەستگرتن بوو بەسەر ناوچە دەوڵەمەندەکان بە کەرەستە و سەرچاوە سەرەتاییەکانی وەک کانزا و بەرد و دار و تەختە لەبەر ئەوەی دەستکەوتنی ئەو دەرامەتە پێویست و گرنگانە بۆ شارستانیەتی عیراق هەردەم مسۆگەر نەبوو لە ڕێگەی بازرگانی و ئاڵوێرکردن هەروەک لە سەردەمی پێشوودا هەبوو واتە سەردەمی دەوڵەتۆکەکانی شارە سۆمەرییەکان کە هەمیشە لە نێوان خۆیاندا لە ناکۆکی و ململانێدا بوون بەو شێوەیە فرەوانخوازی و لایەنگیری ئەکەدی بە شێوەیەکی گشتی دەبێتە یەکەمین سیستەمی ئیمپراتۆریەت لە مێژووی سیاسی مرۆڤایەتی و سەرەتا و دەسپێکی داگیرکاری ئابووری. ئەم وڵاتگیری و فراوانخوازیانەش خێر و بێری زۆری بۆ پادشاکانی ئەکەدییەکان هێنا، شوێنەوارەکانی لە ڕازاندنەوەی پەرستگا و کۆشک و تەلارەکان لە شارەکانی عیراقی کۆندا ڕەنگی دایەوە و بەکارهێنانی ئەو خێر و بێرانەش فراوانبوونی بەرهەمهێنانی کاغەزی پیشەسازی لێ کەوتەوە.

**سەردەمی گوتییەکان (٢١٥٠- ٢٠٥٠پ.ز)**

لە کۆتایی سەردەمی ئەکەدی نائارامی و پشێوی شانشینەکەی گرتەوە و هەندێ هۆزی چیایی لە باکوور و ڕۆژهەڵاتی عێراق دا، سستی و لاوازی دوا پادشا ئەکەدییەکانیان قۆستەوە، ئەوە بوو وڵاتەکەیان داگیر کرد و یەکێتییە سیاسییەکەیان تێکدا و بەشێکی زۆریشیان لێی داگیر کرد، خەڵک و دانیشتوانی وڵاتەکەش ئەو خەڵکە پەلاماردەرانەیان بە گوتییەکان ناو برد یان بە مارەکانی چیا، هەروەک سۆمەرییەکان پێیان دەگوتن (ئەوانەی ئافرەت لە مێردەکەی و منداڵان لە باوکەکانیان و پادشایەتی لە وڵاتی سۆمەر زەوت دەکەن و بۆ چیا دوورەکانیان دەبەن. ئەم و هەولێر و کەرکوکیش یەکێک بوون لە پێگە و بنکە سەردکییەکانی ئەوان. حوکمڕانی گوتییەکان لە عێراقدا نزیکەی یەک سەدەی خایاند، گوتییەکان بیست و یەک ساڵ پادشایان هەبوو ئێمە تەنها ناوەکانیان دەزانین وەک [لاسیراب] کە گۆچانێکی جەنگی هەبوو ناوی خۆی لەسەر نووسیبوو و پێشکەش بە دوو لە خوداوندەکانی گوتییەکانی کرد ئەوانیش (عەشتار) و (سین)ن، ئەوەی پەسندیشە ئەوان دەسەڵاتی خۆیان بە شێوەیەکی بەهێز تەنها لەسەر بەشێکی وڵاتەکەدا سەپاند

نەخاسمە بەشی باکووری، ڕەنگە ئەوان کەرکووک (ئەرەبخای کۆن)یان کردبێتە مەڵبەندێکی خۆیان. بەو پێیە حوکمڕانیەکەیان سەردەمێکی تاریک بوو پیاوانی ئایینی سۆمەری لاواندنەوەی ئایینیان دانا لەسەر ئەو بارودۆخەی وڵاتەکەیان پێی گەیشت، گووتییەکانیش دوژمنانی خوداوەند و هەروەک دەقە بزماریيە سۆمەرییە کۆنەکان ناویان دەهێنن). دەستیان دایە چەوساندنەوەی شارەکانی عیراق لە دوا ڕۆژگارەکانی حوکمڕانی خۆیان ئەوە بوو شاری وەرکا بە سەرۆکایەتی میردەکەی کە ناوی (تریقان) بوو لە دژیان ڕاپەڕی و هێزە زۆرەکەی لەناو برد.

(ئۆتۆحکال)یش بنەماڵەیەکی لە ورکا دامەزراند ئەویش بنەماڵەی پێنجەمینەکەیەتی و خۆشی بە شای سۆمەر و ئەکەد ناو لێنا و ماوەی حەوت ساڵان حوکمڕانی کرد. بەڵام فەرمانڕەوایەتیەکەی زۆری نەخایاند بەهۆی شۆڕشێک کە فەرمانڕەوای شاری (ئوور) پێی هەڵسا کە سەر بە ئەو بوو شۆڕشەکەش بەوە کۆتایی حوکمڕانی بۆ ئەو شارە گوێزرایەوە و بنەماڵەیەکی لێ پێک هات کە بە بنەماڵەی ئووری سێیەم بەوە دەناسرێت سەردەمەکەشی بە ڕۆژگار و چەرخێکی پیرۆز دادەنرێت و دوا سەردەمیشە لە ژیانی سیاسی سۆمەرییەکاندا.

### خانەوادەی ئووری سێیەم (٢٠٥٠- ١٩٥٠پ.ز):

ئەم پێنج پادشایەی [ئورنامو- شولکی- ئەمارسن- شوستین- حمیلسین- ابی سین) توانیان ئیمپراتۆریەتێکی فراوان دووبارە دروست بکەنەوە لەسەر شێوەی ئیمپراتۆریەتی ئەکەدی کە بەشێکی گەورەی ڕۆژ هەڵاتی نزیکی دەگرتەوە لەوانە عیلام و وڵاتی ئاشوور و چەند بەشێکی گرنگی وڵاتی شام بۆ حەمص و دیمەشق و دۆڵی خابوور و بەلیخ و بەحرێن و بۆ ئاسیای بچووک. ئەم وڵاتە هێرشی سەربازی بۆ سەر هەندێ بەشە بچووکەکانی کوردستان کرد کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دیجلە وەک ناوچەی (سیمورو) کەوا دیارە ئەم ناوچەی (ئاڵتون کۆپری) ئێستایە و هەردوو ناوچەی (ئەللبو) مەبەستم (ساسرو) ناوچەی (ئوبلیوم) مەبەستم هەولێرە. وا دیارە لەوێ یەکەیەک نەبوو کە دانیشتوان کۆ بکاتەوە لەو ناوچانەدا، هەرچەندە ئەوان لە کورانی یەک نەتەوە بوون. ئەوەی دیارە کە (باتیسی لکش- پاشا لکش) لە سەردەمی پاشا (حمیلسین) فەرمانڕەوایەکی لەسەر ئوربیللوم دامەزراند. کە ئەمەش ناوچەی (ئوربیلا) بوو لە هەرێمی سوبارتو و ناوی ئەم باتیسیە (ئاراد- نانا) بوو ئەمە ناخۆشییەکی زۆری بەخۆوە دی بۆ دەست بەسەر داگرتنی ئەم ناوچەیە کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دیجلە و ئەویش لە شاری لکاشی نیشتەجێ بوو کە دەکەوێتە ناوەڕاستی پاشانشینی سۆمەر لە خواروو، سەرکەوتوو نەبوو خانەوادەی ئوری سێیەم کۆتایی ژیانی سۆمەرییەکان ئەوان وەک چینی فەرمانڕەوا لەوان هیچ خانەوادەیەکی فەرمانڕەوا دروست نەبوو دوای پاشای خانەوادەی ئووری سێیەم سۆمەرییەکان بەڵام لەگەڵ سامییەکان تێکەڵ بوون، سەرەڕای مردنی سیاسی سۆمەرییەکان، بەڵام زمان و خووڕەوشتیان کاریگەری دەکردە سەر عیراقی نوێ. لە پشت وڵاتی سۆمەرییەکان وڵاتی نوێ هەبووە کە ژیارەکانی نوێ ناسەرەکی دەگرتەوە کە ژیاری بابلییەکان و ئاشورییەکان بوو. ئەم ژیارانە دەستیان بە گەشە کرد لە سەردەمی ئەکەدی چونکە ئەو کات نەتەوەکان کە ئەم دوو ژیارەیان لە سۆمەرییەکان فێردەبوو لە دەرفەت دەگەڕا بۆ ئەوەی دەست بگرن بەسەر دەستەڵاتی ژیاری (دایک).

### سەردەمی بابلی کۆن نزیکەی (١٩٩٨- ١٨٥٠)پ.ز:

بنەماڵەی ئووری سێیەم بەو هێرش و پەلامارە دوو سەرە کۆتایی هات کە ئەمورییەکان لەناوچەی فوراتی ناوەڕاست و عیلامییەکان لەڕۆژهەڵاتی عیراقەوە ئەنجامیاندا لەئاکامی ئەوەدا دوو بنەماڵەی هاوزەمان لە باشووری عیراق دروست بوون ئەوانیش بنەماڵەی (ئیسن) لەباشووری عەفەک بە نزیکەی (١٤)میل، دووەمیشیان (لاری) لەباکووری ڕۆژئاوای ناسریە بەنزیکەی ٧٠ کم، ئەوەی دواییشیان کەوتبووە ژێر ڕکێفی عیلامییەکان. بەو شێوەیە وڵات دوای کۆتایی (ئوور) گەڕایەوە سەر سیستەمی دەوڵەتۆکەی شارەکان. سەرباری ئەو دوو بنەماڵەیەو دەوڵەتی ئاشووری لەو چاخ و سەردەمەدا چەند

پادشایەک سەربەخۆییان وەرگرت کە حوکمرانی شانشینی ئەپنونایان دەکرد لە ناوچەی دیالە. لە شاری بابلدا دوای ماوەیەک بنەماڵەیەک بەناوی بنەماڵەی یەکەمی بابل دروست بوو.

نزیکەی سێ سەدە (٣٠٠ ساڵ) حوکمڕانییان کردو لە سەردەمی شەشەمین پادشاکانی ئەو بنەماڵەیە کە ئەویش حامۆرابی خاوەن شارستانیەتی بێ هاوتایە بنەماڵەی بابل توانی خۆی لە دەستەڵاتی عیلامییەکان رزگار بکات پاشان وڵات یەک بخات دوای لەناوبردنی بنەماڵەکانی دیکە و هەڵمەت و شاڵاوی وڵاتگیرییەکانی خۆی گەیاندە باکووری عیراق و ناوچە و لایەکانی دیکەی کەوانەی بە پیت و خێروبێر.

**الهلال الخصيب:** نەخاسمە لە وڵاتی شام، ئەوە بوو وڵاتی ئاشوورییەکانی خستە ژێر رکێفی خۆی و هەروەها ناوچە شاخاوییەکانی رۆژهەڵات و باکووریش، دوای حامۆرابی پێنج پادشا هاتن بۆ میراتگری ئیمپراتۆریەتێکی فرەوان، بەڵام کاروبار و دۆخەکانی وڵات لەسەردەمی دوایین پادشاکانیان روویان لە شڵەژان و تێکچوون کرد، لە سەردەمی دوا پادشایان حیسییەکان پەلاماری عیراقیان دا. بابلیان تاڵان کرد و کاولیان کرد، بەڵام ئەوان ماوەیەکی زۆر لە وڵات دا نەمانەوە، بەڵکو پاشەکشەیان کرد دوای بردنی دەستکەوت و سامان لەوانەش پەیکەری خوداوەند (مەردۆخ). رەنگە کاشییەکانیش ئەوانەی لە دەورو ئەو ماوە و رۆژگارەدا هاتنە عیراق ئەوان بن کە حیسییەکانیان دەرکرد و بنەماڵەیەکی نوێیان بەناوی (بنەماڵەی سێیەمی بابل) دامەزراند. مەبەستیش لە بنەماڵەی یەکەمی بابل: بنەماڵەی حامۆرابی - دووەمیش لە کۆی چەند پادشایەک پێکهات مەزەندە دەکرێت بنەچەیان لە سۆمەرییەکان بێت لە رۆژگار و سەردەمی کوڕی حامۆرابی و جێنشینەکەی دا راپەڕین و لە ناوچەکانی دەوروبەری کەنداو سەربەخۆیان وەرگرت بۆیە پادشاکانی (هەرێمی دەریا) ناوبانگیان دەرکرد.

### کاشییەکان (١٦٠٠(أو ١٨٥٠)- ١١٦٠ پ.ز):

سەبارەت بە بنەچەی کاشییەکان مێژوو نووسان راو بۆچوونی جیاوازیان هەیە ئەوەی کە باویشە ئەوەیە کاشییەکان سەر بە هۆزی شاخاوین لەو ناوچانەی کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی دیجلە و باکووری رۆژهەڵاتی، ئەوان لقێکن لە نەتەوەی هیند و ئەورووپی، ناوی کاشییەکان لە خەمی نەتەوەیی وەرگیراوە هەروەک هەندێ مێژووناسان بە پەسندی دەزانن. کاشییەکان بەڵگە و تۆماری مێژوویی نووسراویان بە زمانی نەتەوەیی خۆیان بۆ ئێمە جێ نەهێشتووە بەڵکو زمانی بنەڕەتی وڵاتەکەیان بەکارهێناوە، واتە زمانی بابلی هەروەها زمانی سۆمەریشیان بەکارهێناوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ لەو وشە و پەیڤانەی کە فەرهەنگە بابلییەکان تۆماریان کردووە، هەروەها لە ناوی پادشا و ناوەکانی کەسایەتییەکانیان کە لەو سەردەمەدا بەکار هێنراون ئاماژە و بەڵگەن بۆ ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت زمانی کاشییەکان دەگەڕێتەوە بۆ خێزانی زمانەکانی هیند و ئەورووپی بە دووریش نازانرێت ئەوان لە هۆزە دێرینەکانی کورد بن دامەزرێنەری دەستەڵاتداریەتی کاشییەکان شا [کنداشە]، لە ناوەڕاستی سەردەمەکەیان کە ماوەی ٥ سەدەی خایاند لە پایتەختی بابلەوە چوون بۆ شارێکی نوێی گەورە تاکو بیکەنە پایتەختێک بۆ خۆیان، کە بەناوی دامەزرێنەرەکەی شا (کوریکالزو) ناسرا پێی دەوترا (دورکوریکالزو) واتە شاری یان

قەڵای کوریکالزو. سەرهەڵدانی بنەماڵەی کاشییەکان هاوکات بوو لەگەڵ گەشەسەندنی شانشینی ئاشووری لە بەشی باکووری عیراق دا، لە نێوان هەردوو شانشینەکەدا پەیوەندگەلێکی جەنگی و ئاشتییانە دروست بوو لە سەرەتادا کاشییەکان باڵادەست بوون نەخاسمەش لە ململانێی سەر سنوورەکاندا لە نێوان هەردوو وڵات تەنانەت لە سەرەتادا دەستەڵات و باڵادەستی خۆیان لەسەر شانشینی ئاشووریدا سەپاند، دەوڵەتی ئاشووری زۆر دەیناڵاند تا وای لێهات میتانییەکان رۆڵێکی گرنگیان هەبێت لە مێژووی ناوچەی باکووری عیراق دا لە نێوان میسرییەکان و کاشییەکان و ئاشوورییەکان حیسییەکان و میتانییەکان پەیوەندی گەلێکی

نێـــودەوڵەتی دروست بـوو کـــە لە مـێـژووی مـرۆڤـایەتیـدا بەیەکـەمین پەیوەندی نێودەوڵەتی لە جۆری خۆیدا دەژمێردرێت.

**سـەردەمی میتانی سـەدەی ١٥-١٤ پ.ز**

لەگـــەڵ بەردەوامـــبـــوونی فـەرمـانڕەوایی کـاشیـیـەکـان لە بابل هێـزێکی نوێ لە باکـووری عـیـراق سەری هەڵدا و دەیویست بەربەرەکانی ئاشوورییەکان و کاشییەکان بکات، بۆ ئەوەی دەست بەسەر ئەو ناوچەیەدا بگرێت کە ئەم هێزە نوێیەش دەوڵەتی میتانی بوو. لە هەردوو سەدەی نۆزدە و هەژدە پ.ز نیـشـانەی هەندێک بزووتنەوە و هەستانەوەی نەتەوەیی لە نێـوان نـەتەوەکـانی ئاسـیـای بچـووک سەری هەڵدا کە کاریگەرییەکی زۆر دیاری لەســـەر هەمـــوو گـــەلان و نـەتـەوەکـــانی هـیـندی و ئـەورووپی ئاریەکاندا هەبوو، کە دەستیان بەسەر حـیـســیـیـەکـان، ئەوانەی کـە بە دڵنیاییەوە زمانەکەیان لە زمانی لقی سنتیوم یان لە لقەکانی لاتین دەچوو داگرت و هێرشیان کردە سەر سوریا و بابل لە سـەردەمی پادشـاکـەیان کـە ناوی (مـرشلی الاول) بوو تـالانیـان کـرد هەروەکـو پێشـتـر باسـمـان لێـوە کـرد. هەروەها نەتەوەیەک پێـیـان دەوت (ئـوممان مـــانـد) ئـەوانـەش جـیـابوونەوە لە مـیـدیـیـەکـان و سیشیەکان کە لە ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەش نیـشـتـەجێ بوون و تیـرەیەکی بچووکـیـان لەگەڵ خۆ هێنا لە توخمی هیـنـد و ئەورووپی و دوایی هـاتـنـە ڕۆژئاوای کــوردســـتـــان و لەوێدا نیـشـتـەجێ بوون، هەتا خـانەوادەی پادشـایی لەوانە بوو کـە پێی دەوترا میـتانی. حکومـەتێکیـان بە ناوی ئەو دامـەزراند کـە بنکەیەک بوو لەسـەر خابوور. هەر لەگەڵ دەسپێکردنی ئەم مـــێـــژووە بەشی ڕۆژئاوا لە بەشی ڕۆژهەڵات جـیـــابوونەوە و لە وڵاتی سـۆمـەری و ناوی نرا (خـوری) کـە زمـــانێـکی باوی هەبوو، دووبارە هەندێک پێـشـکەوتن لە نێـــوان کـاشـیـیـەکـان لە کۆتایی سنووری ڕۆژهەڵات ڕوویدا و توانیـان سنووری حـیـســیـیـەکـان ببڕن و هەندێک لە پیـاوەکـانی توانیـیـان حکومـەتێکی سـەربەخۆ لە وڵاتی بابل دامـەزرێنن. بەم جـۆرە ناوی مـیـتـانیـیـەکـان لە وڵاتێکی فرەوان ڕاگەیەنرا کە کەوتۆتە نێـوان چیـاکـانی زاگـرۆس و دەریای ناوەڕاست و نێـــوان دەریای وان تا دەگاتە دەریای ئاشوور و ئەربەخە واتە [کەرکووک].

لە ســـەدەی شـــانزدەهەمی پ.ز: بنەماڵەی میـتانیـیـەکان توانیـویانە بۆ مـــاوەیەک فـــەرمـــانڕەوایی بکەن و هەمـوو وڵاتی کوردسـتـان و ئاشوور و دەشـتی هەولێـر لە ژێر فـەرمـانڕەوایی ئەو وڵاتە دابێت، لەگەڵ پێگەیشـتنی ئەم وڵاتە بەســـامـــە توانی دەست بـگرێت بەســـەر وڵاتی ئاشـــووری لە ســـەدەی پانزدەهەم پ.ز ئەمـــەش سەدەیەکی خایاند، لە دواییدا وڵاتی ئـاشـــوور خـــۆی لە ژێر دەســـەڵاتی میدییەکان ڕزگار کرد.

ئاشــوورییــەکـــان ســـوودیان لە هاوسەنگی هێزە نێودەوڵەتیەکانی ئەو سەردەمە بینی، چونکە حیـسییـەکان بە نیـاز بوون شانشینی میتانی لەناو ببـەن و بیـــخـــەنە چوار چێـــوەی ئیـمـپـراتۆریەتی خۆیان لە مـیـانەی ململانێـیـان دا لەگـەڵ مـیـسـریەکـان حیسییەکان دەستیان کرد بە دەست تێـــوەردان و خـــۆهەڵقـــورتاندن لە کاروباری ئەم شانشینەدا لە سەردەمی پادشای ئاشووری (ئاشوور ئۆبالگی یەکـەم) ١٣٦٢- ١٣٣٧ پ.ز کـە دەرفـــــەتی قـــۆزتەوە و دژ بە مـیـتـانیـیـەکان جەنگا لە سەردەمی پادشـــاکـــەیان (ئەرتامـــای دووەم) (١٣٥٩- پ.ز) و تـــوانـــی وڵاتـــی ئاشووری بە تەواوی ڕزگار بکات و سەردەم و ڕۆژگـارێک بێنێـتە کـایەوە تیایدا شانشینی ئاشووری بووژایەوە، ڕەنگە ئەم پادشـا ئاشـوورییـە لەگـەڵ حـیـســیـیـەکـان هاوکاری یەکـتـرییـان کردبێ لە سڕینەوە و لابردنی دەوڵەتی مـیـتـــانی بەوەی کـە بەشـێکی ئەو شانشینەی دەسکەوێت.

**سەردەمی ئاشووری**

هەروەکو گوتمان: لە سەرەتاکانی ســـەدەی چواردەهەمی پ.ز شـــەڕلە نێـوان هەردوو دەوڵەتی مـیـتـــانی و حـیـســیـیـەکـان هەڵگـیـرسـا لەسـەر داگیرکردنی سوریا، ئەمەش بووە هۆی زیادبوونی هێـــز و باڵا دەســـــتی ئاشوورییەکان بەرامبەر میتانییەکان کە توانیـیـان دەست بەسـەر بەشـێکی کـوردســـتـــان واتە ناوچەی باشـووری ڕۆژهەڵات دابگرن کە پادشای کاشیە بابلیـیـەکان دەیانویست داگیری بکەن و وابکەن ملکەچی پادشاکانیان بن.

نیشتمانی ئاشووریەکان پێکهاتبوو لەو زەویانەی کە کەوتبوونە لێواری زێی دیجلە نزیک هێڵی پانی سی و حەوتی باکوور تا سەر رووباری عوزێم لە باشوورەکەی، وڵاتی ئاشووریەکان لە باکوور و رۆژهەڵاتی چیا بەرزەکان بوو، هیچ سنوورێکی سروشتیش لە نێوان خۆیان و باشووردا نەبوو بەڵکو سنوورەکان دەگۆڕان بەهۆی هێزی سیاسەتی ئاشووریەکان، هەروەها لە باشووریش بە هەمان شێوە هیچ سنوورێکی سروشتی لە خوراتەوە تا خابوور نەبوو. ئاشووریەکان زۆر لە کۆنەوە لەو ناوچانەدا ژیاون، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی چاخە کۆنەکانی مێژوویی و شارستانیەتیان کە تێکەڵ بە شارستانیەتی سۆمەرییەکان بووە و لەکاتی هەزارەی دووەمی پ.ز، شەڕ و رووداوەکان وای کردووە کە هێدی هێدی ببێ بە دەوڵەتێکی سەربازی تا وای لێهاتووە، ببێت بە ئیمپراتۆریەتێکی گەورە کە دەستەڵاتی بەسەر هەموو باشووری رۆژهەڵاتدا بگرێت. ناوی ئاشووری لە دوو وشەی ئاشوور پێکهاتووە کە دەگەڕێتەوە بۆ خودای ئاشووریەکان و ناوی کۆنترین شارە بەناوی ئاشوور. کە ئێستاش کەلاوەکەی ماوە لە قەڵای شەرگات. ئاشووریەکان لقێکن لە هێزەکانی سامی کە لە دوورگەی عەرەبەوە کۆچیان کردووە هەروەکو کۆمەڵێک توێژەرەوە دەڵێن کە لە باشووری بابلەوە بەرەو باکووری عیراق هاتوون لە سەردەمی ئەکەدییەکان.

زمانەکەشیان هەروەک زمانی بابلییە و لە خێزانی زمانی سامییەکانە. لە رووی سیاسەتی شارستانیەوە قەوارەیەکی سیاسی بەهێز و سەربەخۆ نەبووینە کە جیابینەوە لە باشوور تا کاتی ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پ.ز. بەڵام لە پێش ئەو ماوەیەدا چەند شار و ویلایەتیان هەبووە، وەکو سەردەمی گووتی و سەردەمی ڕەچەڵەکایەتی (ابیسن) و (لارسا). پاڵە پەستۆی دەرەوە کاریگەری بە سەریاندا هەبووە، سەرەڕای کاریگەری وڵاتەکانی باشوورەکە.

لە هێزە توندڕەوەکان پێکهاتبوون کە لە چیاکانی دەوروبەریاندا هەبووە و تووشی کۆچکردنی کردوون لەوانە ئەرمەنییەکان کە لە ناوچەکانی ئارات و وان هاوسێ بوونە. وڵاتی بەهێز لە هاوسێکانیان دروست بووە کە توانیویانە لە ناویان بەن هەروەکو حیثیەکان و میتانییەکان. ئاشووریەکانیش لە دوای میتانییەکان لە ماوەی سەدەی دووەمی پ.ز کەوتوونەتە ژێر پاڵەپەستۆی ئارامییەکان.

**سەردەمی ئاشووری نوێ:**

سەردەمی پادشای ئاشووری (ئأداد- نداری)ی دووەم سالی (٩١١- ٨٩٠پ.ز) کە کوڕی پادشای ئاشووری [ئاشوور- دان]ە لە مێژووی ئاشووریەکان دا بە کۆتایی سەدەی ناوەند و سەرەتای سەردەمێکی نوێ دادەنرێت، ئەمەش تا کۆتایی ئاشووری سیاسی خایاندووە سالی (٦١٢پ.ز) کە ئەو سالەیە نەینەوا رووخا ئەمەش سێ سالی خایاند. ئاشووریەکان هێزێکی سەربازی بە توانایان هەبوو کە توانییان بە درێژایی ئەو سەدانە دەست بەسەر ژیانی رۆژهەڵاتدا بگرن. هەروەها توانی وڵاتەکانی ئارامی لەناو بیات و بیانخاتە سەر شانشینەکەیان و لە سەدەی نۆیەمیشدا هەموو ئەو نەتەوە و زەوییانە بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە کە لە باکوور و رۆژهەڵاتەوە هەڕ و گیفیان لێ دەکرد. دوای (ئاداد- نداری) دووەم کوڕەکەی کە ناوی (توکلیتی- نتورتا)ی دووەم بوو سالی (٨٨٩- ٨٨٤ پ.ز) شوێنی گرتەوە، ئەمیش توانی سەروەری ئاشووری بەسەر وڵاتەکانی رۆژهەڵات بچەسپێنێ و سەرکەوتوو بێ کە هەموو هۆزەکانی چیایی لە باکوور و رۆژهەڵات ملکەچ بن و بۆ ئەوەی سەلامەتی ئیمپراتۆر بپارێزرێت. دوای ئەویش (ئاشوور ناسر بال)ی دووەم سالی [٨٨٤- ٨٥٩]پ.ز شوێنی گرتەوە کە کوڕی ئەو بوو لەسەر تەخت دانیشت. لەسەردەمی ئەودا هەولێر یەکێک بوو لە شارە گرنگەکان و پلە و پایەکی گەورەی بە دەست هێناوە. ئەم پادشایە لە پایتەختەکەی (کلخو) نەمرود توانی هێرش بەرێتە سەر وڵاتی خولد بۆ ئەوەی لەناوی ببات، بۆیە لە زابی گەورە پەڕیوەتەوە بەرەو هەولێر و لە دواییدا بۆ زابی بچووک و ئینجا زنجیرە چیای قەرەداغی بڕیوە کە پێیان دەگوت زنجیرەی (بابیت) (بازیان)، ئینجا بۆ

سلێمانی و شیوەکەڵ. ئینجا بۆ بانە و سەقز و لە دواییشدا بۆ (ساوجبلاق) و دەریای ورمێ. هەولێر زۆر کاریگەری هەبووە بەسەر ئەو پادشایە هەر بۆیە ناوی ناوە شارەکەی خۆی. دەوڵەتی خولدیەکان (الاراراتیه) لە سەدەی نۆیەم دروست بووە و یەکەمین پادشای ناوی (سەردۆری یەکەم) بووە. کە توانی چوار دەوری پادشای ئاشووری [ئاشوور ناسر بال] بگرێت و تشایای لێ بستێنێت و بیکا بە پایتەختی خۆی کە مەبەست شاری وانە. ئەم وڵاتە لە ڕۆژانی بێ هێزی ئاشووریەکان سەربەخۆ بووە و زۆر جاریش کەوتۆتە ژێر دەستەڵاتی میدیەکان. زۆر جاریش توانیویەتی بەسەر سوپای ئاشووریەکاندا تێپەڕێت و بە شاری هەولێردا بڕوات بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو شۆڕشانە لەناو ببات کە لە وڵاتی عیلام سەرهەڵدەدەن، ئەو کاتە هەولێر وەک بازاڕێکی ئاشووریەکان دادەنرا و سەرەڕای مەڵبەندێکی خوداپەرستی عەشتار بووە کە خودای شەڕو سەرکەوتن بووە. پادشا (شەمس ئاداد)ی پێنجەم لە دوای خۆی کوڕە بچووکەکەی (ئاداد- نداری) سێیەم بوو بە جێنشینی و دایکیشی بوو بە شاژن و لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت لە سالی (٨١١-٨٠٨پ.ز). ئەم شاژنەش بە دەقێکی ئەغریقی بەناوی (سمیر امیس) ناوبانگی دەرکرد بوو کە لەلایەن ئاشووریەکان بە [سمیر امیس] ناسراو بوو، ئەمەش کە ناوە ئاشووریەکەی (سمو- رمات) یان (سمیر- ام). دوای پادشا [ئاداد- نراری] سێیەم (شلیمە نسەری) چوارەم لە سالی (٧٨٢- ٧٧٣ پ.ز) بوو بە جێنشینی و لە سەردەمی ئەودا زیاتر ئەو شانشینە دارمانی بەخۆوە بینی و بابلیەکان توانییان سەربەخۆیی خۆیان بە دەست بێنن و هۆزەکانی ئارامیش توانییان جەخت بکەنە سەر سنووری باکووری شانشینی ئاشووری، شانشینی ئاشووریش هەڵوێستی پارێزگاریکردنی خۆی گرتەبەر. بێ دەستەڵاتی و نارێکی شاژن کاریگەری زۆری کردە ئەو پادشایەی کە دوای ئەویش هاتووە کە (ئاشوور- دان)ی سێیەم بوو لە سالی (٧٧٢-٧٥٤پ.ز). ئەمەش بووە هۆی زیاتر دروستبوونی تەنگژەی بارەکان و بلاوبوونەوەی نەخۆشی و تاعون و هۆی شپرزەکردنی دانیشتوانەکەی شاژن. لەو پەیکەرە برۆنزیەی کە لە قەڵاتی هەولێر دۆزراوەتەوە نووسینێکی تیایدا هاتووە کە باس لە خودای عەشتار و شانشینی ئاشوور و پادشای ئاشووری سێیەم دەکات. دوای (شلما نسەری پێنجەم) سەرجۆن هاتە سەر تەختی دەستەڵات کە بە دامەزرێنەری وەچەی سەرجۆنییەکان دەژمێردرێت ئەگەرچی شتێکی ئەوەهای لە بارەیەوە نەزانراوە کە لە دوای مردنی پادشای ناوبراو هاتووە، لەوە دەچێت کە پادشایەکی ستەمکار بووبێت و بۆ ماوەی ١٨ ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە. هەروەکو سەرتاپای فەرمانڕەواییەکەی لەناو شەڕ و کردە سەربازیەکانی دەرەوە بەسەر بردووە، پاشان بابل بووە بە بنکەی شۆڕشگێڕەکان پاش بێ هێز بوونی ئاشووریەکان لە کۆتایی ڕۆژەکانی شلما نسەری پێنجەم، یەکێک لەو ئامانجانەی کەوا سەرجۆن نیگەرانی بووە، لە سالی ٧٢١ پ.ز (مردوخ- بلادان)ی کلدانی توانی دەست بەسەر فەرمانڕەوایی بابل دا بگری هەر ئەمساڵەش بوو کەوا سەرجۆن بوو بە شانشین، سەرجۆن خودی خۆی هەڵسا بە سەرکردایەتی کردنی کردەیەکی ڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەڵ عیلامیەکاندا کە هاتبوون بۆ یارمەتیدانی شۆڕشگێڕەکان، ئەنجامی شەڕەکەش یەکلاکەرەوە نەبوو لەبەر چەند هۆیەک سەرجۆن بە ملی داهات کە بە ناچاری پاشەکشێ بکات. دوای ئەوە بە ١٠ ساڵ سەرجۆن توانی زاڵ ببێت بەسەر (مردوخ بلادان) کە ئەمیش یارمەتی عیلامیەکانی بەدەست هێنابوو، هەروەها سەرجۆن لێی بووری و کردی بە فەرمانڕەوای یەکێک لە فەرمانڕەواییەکانی. سەرجۆن خۆشی بوو بە پادشای بابل.

**پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی خولدیەکان:**

سەرجۆن زیاتر سەرقاڵ بوو بە کاروباری هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵات. لەو کاتەدا کە لە ئەرمینیا پادشایەکی ستەمکاری ئاراراتی بە ناوی (ڕوسا) فەرمانڕەوایی دەکرد، جا بۆ ئەوەی لە شەڕی ئاشووریەکان بە دوور بێ و

تێکەڵاوی نەبن هەڵسا بە جۆشدانی ئەو هۆزەی کە لە ئاشووریەکان جیا ببۆوە بە هەڵگیرسانی شۆرشێک لە دژی ئاشووریەکان بەمەش ئەوەی گەرەکمانە ئەو هۆزانەن کەوا فەرمانڕەواییان لەسەر وڵاتی نائیری دەکرد.

هەروەکو پێدەچێت سەرجۆن توانیوبەتی ئەو هەرێمانە ڕایی بکات و شەڕێک لە دژی ئەرمەنیەکان دا بکات لە ئەنجامدا شکست بە کۆمەڵەکەیان بهێنێ و کاریش بەوە بگات کە زۆرێک لە سەرکردەکانیان بە زیندوویی کەوڵ بکات، سەرباری ئەم لێدانە توندەش وڵاتی ئەرمەن (ئاراراتو) چۆکی دانەداو لە شکستێکی یەکجارەکی کە دووبارە شەڕێکی تر لە نێوان ئەم و ئاشووریەکان هەڵگیرسایەوە کە پێنج ساڵی خایاند و بە لەناو چوونی (ڕوسا)ی پادشا کۆتایی پێهات. هەروەها سەرجۆن تیرە فەرەنجییەکانیشی خستە ژێر دەستەڵاتی خۆی کە لەسەر سنووری کلیکیەی ڕۆژئاوا بوون بۆی هەیە ئەمیش پادشای دوورگەی قوبرس بوو بێت. لە ساڵی ٧٢١ پ.ز سەرجۆن شاری سامەرای ڕزگار کرد هەروەکو باسی دەکەن دوای ئەمەش هەستا بە لەناوبردنی وڵاتەکانی ڕۆژئاوای وڵاتی شام کە لەلایەن میسریەکانەوە پاڵپشتیان لێ دەکرا، هەروەها سەرکەوت بەسەر ئەو سوپایەی کەوا پادشای میسر بۆ یارمەتیدانی پاشای غەزە ڕەوانی کرد بوو. هەروەها تیرەکانی عەرەبی بیابانی شامی خستە ژێر دەستەڵاتی خۆی و هەستا بە جێگۆڕکێ لە چەند پایتەختێکی ئاشووری کە لە نێوانیاندا نەینەوای کرد بە پایتەختی وڵاتەکەی خۆی کە دەکاتە ساڵی نۆیەمی فەمانڕەواییەکەی ساڵی ٧١٣ پ.ز کە هەڵسا بە دامەزراندنی پایتەختێکی نوێ کە ناوی نا (دورشروکین) یان شاری سەرجۆن لە باکووری ڕۆژهەڵاتی نەینەوا کە دەکاتە خرسیادی ئێستاکە کەوا ١٦ کیلۆمەتر لە باکووری نەینەواوە دوورە. هەولێر گرنگترین و سەختترین شوێنی ئاشووریەکان بووە بەهەر سێ شاریەوە [کالح- نەینەوا- هەولێر]، نێوان فەرمانڕەوایەتی هەموو پادشاکانی ئاشووری شاری هەولێر پایتەختی هەموو پادشایەکان بووە، هەولێر هەردەم پایتەختی ئایین بووە. لە وڵاتی ئاشووردا پادشا گەورەترین قەشە بووە لە ڕووی ئایینەوە بەبێ هیچ کێبڕکێیەک، لەوە دەچێت کەوا عەشتار پەرستگاکەی خۆی گوازتبێتەوە بۆ باکوور لەو کاتەی وڵاتی ئاشوور جیا بۆوە. بۆیە هەولێر هەڵبژێردرا بە [ئەربائیلۆ] بۆی هەیە ئەمەش مەزارگەیەکی پەرستن بووبێت هەر لەو کاتەوە هەولێر بە ئەربائیلۆ ناسراوە کە بە مانای چوار خودا دێت یان کورسی دووەمی خودای عەشتارە کەوا بە (عەشتار- ئەربیلا) ناسراوە کەوا تاکە ڕێگای سەرکەوتن بووە لە شەڕەکانداو وەک هێمایەک لە قۆڵی شەرکەرەکانیان دەبەستا. هەروەکو باسی دەکەن کەوا عەشتار ڕۆڵێکی گرنگی مێژوویی لە ئاسیای ڕۆژئاوا گێڕاوە و چەندان پەرستگای لەلایەن هەموو نەتەوەکانەوە بۆ دروستکراوە، شکۆمەندی خۆی لەسەر هەسارەی زوهرە پاراستووە کە هەردەم بۆ ئەوان هێمایەک بووە، سروشتیش لەلای ئاشووریەکان جووتەیی بووە پەرستگایەک لە هەولێر و ئەوی تریشیان لە نەینەوا بووە. عەشتاری نەینەوا لە بنەڕەتدا بە خودای خۆشەویستی و خۆشگوزەرانی هاتووە کەوا فەرمانڕەوایی لەسەر ئەستێرەی زوهرە دا دەکات، بەڵام عەشتاری هەولێر سەرچاوەی سەرکەوتن بوو لەشەڕ کە هەروەکو باسمان کرد. سەرجۆن پاش خۆی ساڵی (٧٠٥- ٦٨١ پ.ز) (سەنحاریب)ی کوری بۆ فەرمانڕەوایی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ نەینەوا و کۆشک و تەلارەکانی دووبارە بنیات ناوە و کردوویەتی بە قیبلەی ڕۆژهەڵاتی کۆن، ئاوێکی سازگاری لە سەرچاوەیەکی نزیکەوە بە ناوی [الكومل] بە ڕێڕەوێک دا لە چیای (بافیان) بۆ کێشاوە، کە هەڵساوە بە دروستکردنی جۆگەیەکی بەردڕێژکراوی بە درێژی ٥٠ میل کە ئاوی پێ گەیاندۆتە نەینەوا، هەروەکو لە لێکۆڵینەوەکەمان بە درێژی باسی پڕۆژەی سەنحاریبمان کردووە. هەروەک ئەم جۆگەیەی کە بە هەمان شێوە ئاوی پیادا گەیەنرایە شاری هەولێر. ئینجا گەڕایەوە بۆ ڕزگارکردنی وڵاتی شام کەوا دەستیان دابووە ستەمکاری. سەنحاریب ساڵی ٦٩٢ پ.ز بۆ حەجکردن هاتۆتە شاری هەولێر و بۆ ئەوەی نوێژ بکات

بۆ خودای عەشتار و سەرکەوتوو بێ لەو کردە شایستەیەی کە هەڵدەکوتێتە سەر بەرامبەرەکەی کە بابلیەکانە. ئەوەی جێگای وەبیر هێنانەوەیە بابل بۆ تۆڵە کردنەوەی بە سەرکردایەتی شۆڕشگێری بابلی مردۆخ بلادان کەوا سەرجۆنی باوکی لێی بووریبوو لە کاتێکدا کە ڕێکەوتنامەیەکی لە دژی ئەو لەگەڵ عیلامیەکان و هۆزە عەرەبیەکان مۆر کرد بوو، بەڵام ئەم شۆڕشگێرە ڕایکرد کاتێک کە نەخشەی ڕوو بەڕوو بوونەوەی سەنحاریبی بینی. سەرباری ئەوەش نەکەوتە ژێر ڕکێفی ئەو، ئەو کارەی پاڵی بە سەنحاریب وەنا کە بۆ ماوەی ساڵێک ئابلۆقەی بدات و لە پڕێکا ساڵی ٦٥٩ پ.ز ئابلۆقەکەی تێکشکاند و شوورەی قەڵاکانی وێران کرد و ئاوی خوراتیشی بەردایە سەر پاشماوەکەی. بەڵام لە دواییدا سەنحاریب بە دەستی یەکێک لە نەوەکانی تیرۆر کرا و کوڕە جێنشینەکەی کە ناوی [ئەسرحەدون] بوو زۆر بە ئاسایی توانی ئەم شۆڕشە دامرکێنێتەوە و وا بکات بەشی هەرێمی ڕۆژهەڵاتی ئاشووریەکان و زۆربەی هەرە زۆری پادشاکانی خوراسان بە هۆی کردە سەربازیەکانی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی. هەروەها بۆ بەرژەوەندی بابلیەکان هەڵسا بە دروستکردنەوەی دووبارەی شاری بابل بەمەش بابلیەکان ڕەزامەند بوون.

(ئەسرحەدون) لە چیای باکوور دەگێڕێتەوە لە شەڕەکانی کەوا پەیوەندی بە خودای عەشتار و چەند نامەیەکی پاڵپشتیی و دڵنەوایی و سەرکەوتنی ڕوونی لە پەرستگاکانی هەولێر بەدەست گەیشتووە، لە دواییدا نزیکەی میسری بە تەواوی داگیر کرد و هێزە سەربازیەکەی تێکشکاند، بەڵام بۆ بەرهەڵستی جاری دووەمیان هێرشی سێیەمی کردە سەریان بەڵام پێش ئەوەی دەڵتا ببڕێ گەڕایەوە بە هۆی نەخۆش کەوتنی کتوپڕی پادشا. لە دوای ئەویش ئاشوور پانیباڵی کوڕی سێیەمی هاتە شوێنی ساڵی (٦٦٩-٦٢٦پ.ز) ئەمیشیان شەیدای ئەدەب و زانست و کۆکردنەوەی کەلەپوور و کتێبی زانستی بوو و گەڕایەوە و لە هەموو لایەکی وڵاتدا ئەم کتێبانەی کۆکردۆتەوە و لە (دار الکتب) ماڵی کتێب لە نێو کۆشکی خۆی داناوە.

ئاشوور پانیپال دەستی کرد بە فەرمانڕەوایی کرداری تەمێکردنی بچووک لە ناوچەی کاشیەکان لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە لەمەشیان سەرکەوتوو بوو، دووبارە هەڵسایەوە بە داگیر کردنی میسر لە ساڵی ٦٦٧پ.ز لە دواییدا براکانی [شمشو- شوم- اوکن] لە بابل لە دژی هەڵسانەوە کە پشتگیریەکی پتەویان لە لایەن بابلیەکان و سەرکردەی کلدانیەکان و میسریەکان بەدەست هێنا، پاش ئەو حەسانەوەی دوای شەڕەکانی لە عیلام.

(تی ئامان)ی عیلامی هێرشی کردە سەر باشووری وڵاتی میزوپۆتامیا و دەستی بەسەر داگرت، ئەمەش بوو بە جێگای هەڕەشەی نەتەوەی ئاشووریەکان دوای ئەوەی ڕێکەوتنامەکیان لەگەڵ بابلیەکان بەست. ئاشوور پانیپال هەنگاوی بەرەو شەڕکردن ناو گەیشتە هەولێر و لە پەرستگای خودای عەشتاردا مایەوە و لەوێدا نوست. هەروەکو دەرکەوت لە خەودا پێیان گوت کەوا هەنگاو بنێیت بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی دوژمن بەتیروکەوانەکەی، لە ئەنجامدا پادشای ئاشووریەکان بەسەر شۆڕشگێرە عیلامیەکاندا زاڵبوو، بەڵام سەری سورما بە شۆڕشی برانا و براوەکەی لە بابل کە بۆ ماوەی دوو ساڵ گەمارۆی داو وای کرد بە برسیەتی و گەمارۆی ئابووری بە دەستی سوپا سەرکەوتووەکەی ئاشووری شارەکەی برووخێت. (شم شوکین) لە نێوان ئاگرێکی بە تین دا کە لە کۆشک و تەلارەکەی بەربوو کۆتایی هات بەو کارەسات و ململانێیەی نێوان برایەکان لە ساڵی ٦٤٨ پ.ز. دوای ئەمەش ئاشوور پانیپال ئارەزووی کرد و هەنگاوی نا بۆ لەناوبردنی شاری عیلامیەکان کە پایتەختەکەی سوسە بوو لەمەشیان سەرکەوتوو بوو، ئینجا هەڵسا بە دەرهێنانی ئێسکی مردووەکان و بە تایبەتی ئێسکی پادشایەکان و فەرماندە بەرزەکانی عیلامی و ناردی بۆ نەینەوا. بەڵام (تی - ئامان) بە فەرمانی پادشای ئاشووری سەری خۆی تاشی لە هەولێر و چەندان دیلی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ هەولێر و هەر بە زیندوویی کەوڵیان کردن. ئاشوور پانیپال و خێزانەکەی خۆی ئامادە

کردبوو بۆ بینینی ئەم کارانە لە هەولێر کە خەریکی ئاهەنگی جەژن بوو لە جەژنی خودای عەشتار هەرودکو باسی دەکەن، (تی ئامان) هەڵسا بە ناوبژبوانی لەلای پادشای ئاشوور و بۆ دۆزینەوەی رێگا چارەیەک، بەڵام پادشا ئەمەی رەت کردەوە و بەمەش ژیانی وڵاتی عیلام کۆتایی پێهات. ئاشوور پانیپال تا ساڵی ٦٢٤پ.ز فەرمانڕەوایی گێڕاوە، بەڵام کاتێ هەواڵی فەرمی لە ئێمە برا پێش ئەمەش بە ١٠ ساڵ و دیاردەی کردەکانیش گشتیان وا دەسەلمێنن کەوا ئیمپراتۆریەت لە هەموو بەشەکانی جێگیر و سەردار بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئاشوور بە خۆی پێمان رادەگەیەنێ کەوا [رۆژانی رەش چوار دەورەی وڵاتەکەی گرتووە و ئەمەیش لە نێو ئازار و ئەشکەنجەیەکی جەستەیی و گیانی دەیناڵاند و سەبر و ئارامیان نەهێشتووە ).

**رووخانی دەوڵەتی ئاشووری:**

دوای مردنی ئاشوور پانیپال کوڕەکەی (ئاشوور- اگل- ایلانی) شوێنی گرتەوە و ئەوەی لەسەری پێویست بوو دەبوایە شەڕ لەگەڵ ئەوانەدا بکات کە چاوی بریبووە تەختەکەی، بابلیەکان ئەم هەلەیان قۆزتەوە و لە ژێر سەرکردایەتی کلدانیەکان [بنو بلاسر] لە ئیمپراتۆریەتی ئاشووریەکان جیا بوونەوە ساڵی ٦٢٥ پ.ز فەلەستین و بابل زۆرێک لە شارەکانی سوریایان داگیر کرد.

مادیەکان یەکیەتیەکیان دروست کردو وەک هێزێکی بە توانا لە ژێر سەرکردایەتی پادشاکەیان (کی ئەخسار) سەریان هەڵداو لەگەڵ پادشای کلدانیەکان رێکەوتن بۆ ئەوەی شانشینی ئاشووری بگەرێتەوە و دابەشی بکەن. دوای ئەوە [بسماتیک]ی پادشای میسر چووە پاڵ ئاشووریەکان، هەروەها پادشای ئاشووری هاورێیەتی کردنی هۆزەکانی سیشیەکان و ئەسکیشیەکانی بەدەست هێنا کە ناسراو بوون بە بەربەری و زمانی هیند و ئەوروپی قسەیان دەکرد و لە باشووری روسیا و هەرێمەکانی دوای ئۆرال نیشتەجێ بوون، هەندێک لە مێژوونووسان دەستنیشانی ئەم هۆزانە بە یاجوج و ماجوج ناو زەد دەکەن هەرودکو ناویان لە تەورات و قورئان دا هاتووە، بەڵام ئەوانە هیچ سوودێکیان بۆی نەبوو هەڵوێستیان بەرامبەر دوژمنەکانی وەرنەگرت، بەڵکو قورەکە خەستتر بوو کاتێ سیشیەکان چوونە تەک مادی و کلدانیەکان لە دوا هێرشیاندا بۆ سەر نەینەوا لە ساڵی ٦١٢ پ.ز کە بووە هۆی رووخان و وێرانبوونی ئەم شارەی ئاشووریەکان و مردنی پادشاکەیان لە ناوەندی ئەو ئاگرەی کە لە باڵاخانەکەی بەردرا، پاشماوە ئاشووریەکانیش لە ژێر سەرکردایەتی پادشایەک بە ناوی [أشور اوبالط] کردبوویان بە پادشای خۆیان رایان کرد بۆ شاری حەران. بەڵام هێزەکەی دوژمن بە دوایان کەوتن و ساڵی ٦١٠ پ.ز شەڕ لەوێ دروست بوو و کۆتایی شەڕیش بە لەناو چوونی دوا پاشماوەی ئاشووریەکان هات.

**هەندێک لایەنی شارستانیەتی میتانییەکان:**

لێکۆڵەرەوەکان و شوێنکەوتووەکان تیر بوونە لە مێژووی رێگای کۆنی شارستانیەتی میزۆپۆتامیا لە باکوورەوە تا باشووری و وانەیەکی بەسوود بوو بۆیان، تا زۆر لایەنی گرنگی ئەو شارستانیەتیەیان بۆ روون بێتەوە بە هۆ و جیاوازیەکانیەوە هەر لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە بگرە تا دەگاتە کۆتایی سیاسەتی ئاشووریەکان و پێکهێنانی دەوڵەتی کلدانی بابل. شارستانیەتی میزۆپۆتامیا کۆمەڵێک یاسا و رێسای ئایینی و بیرو باوەڕ و هونەری هاوبەش کۆی کردوونەتەوە لەگەڵ بوونی کاریگەری ئەم بەشانە لە زۆر کاتدا وای کردووە کە ئەم نەتەوەیە کە خۆیان فەرمانڕەوایی بکەن و شوێن پەنجەیان بە هەموو لایەنەکانی ژیانی رۆژانەوە لە عیراقی کۆندا بەجێ بمێنێ. میتانیەکان فەرمانڕەوایی ناوچەیەکی فرەوانیان کردووە لە نێوان سەدەی (١٥- ١٤پ.ز) کە لە دەریای ناوەڕاستەوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە چیای زاگرۆس بە هەولێریشەوە کە لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەم نەتەوەیەدا بووە. بۆیە پێویستە هەندێک خوو و رەوشتی ئەو نەتەوەیە بزانین کە فەرمانڕەوایی هەموو کوردستانی کردووە. ئەوەی دەشیزانین لە شارستانیەتی ئەو نەتەوەیە کە لە رێگای هەڵکۆڵین و شوێنەوارە مێژوویەکانەوەیە کە لە چوار دەورەی

دەوڵەتی میتانیدا ماوەتەوە. بۆیە کۆمەڵێک دیزە و گۆزەی سوورەوە کراوی ڕەنگا و ڕەنگان پێگەیشتووە کە لە هەمووی ئەو ناوچانەی سوڵتانی میتانیەکان فەرمانڕەواییان تیایدا کردووە، ئەم کەلوپەلانەش لە مادەی گڵێکی زەردی ڕەنگا و ڕەنگەوە دروست کراوە کە هێڵێکی ڕەشی پانی تیایدا نەخشکراوە. لەسەر ئەم هێڵە پانانەش لە شێوەی ڕووەکی ڕەنگا و ڕەنگ و سپی نەخش کراوە، ئەم جۆرەش بە زۆری لە شاری نوزی دا هەبووە کە کەوتۆتە نزیک تەرکەلانی ئێستا لە نزیک کەرکووک، هەروەها لە ئاشوور و نەینەوا و [تل حلف] لەسەر زێی خابوور (الالاخ)ی کە لە نزیک شاری ئەنتاکیەی ئێستاکەدا هەبووە. میتانیەکان گڵی شووشەییان بەکار هێناوە لە جیاتی بەردی لازەوەرد [شین] بۆ جوانکاری و ڕازاندنەوە و دروستکردنی مۆری لوولەیی. بەڵام دەربارەی هونەری بیناسازی و نموونەکانی کە لە شاری نوزی و (آلالاخ) بۆمان هاتووە. ساڵی (١٩٢٥- ١٩٢٦) لێژنەیەکی هاوبەش لە مۆزەخانەی عێراقی و قوتابخانەیەکی لێکۆڵینەوەی ئەمریکی ڕۆژهەڵاتی (٥٥٠) تابلۆی دروستکراویان دۆزییەوە، جارێکی تریش لە ساڵی (١٩٢٧- ١٩٣١) زانکۆی [هارفارد]ی ئەمریکی لە پشکنینێک کە پاشماوەی شوێنێکی نیشتەجێبوونە لە دەرەوەی گردی (یۆرغان تەپە)ی نزیک تەرکەلان کۆشک و پەرستگایان دۆزییەوە.

جگە لە چەند ژمارەیەک کە لە قوڕ دروست کراوە و بە شێوەی بزماری میتانی لە سەری نووسراوە کە لە زمانی ئاشووری دەچێت. لە نێو ئەم ژمارانەدا چەند نامەیەک هەن کە بە دەست نووسراون و لە نێوان میرەکانی میتانی پاشاکانی کامتین و حیثیەکان و میسریەکان و ئاشووریەکاندا هەن کە کاتی گۆڕدراوەتەوە. هەروەها لەگەڵ دۆزینەوەی ژمارەیەکی زۆر لە بەڵگەنامە کە پەیوەستن بە دابەشکردنی زەوی و پارچەکردن و نووسینی نەخشەکە لەسەر تابلۆی قوڕی دروست کراون. ئەم نەخشانەش ناوی چەندین ناوچەی میتانی لە خۆوە گرتووە. هەروەکو لە لێکۆڵینەوەکاندا دەرکەوتووە کە ئەو شێوە نەخشانەی کە لەسەر کۆشک و تەلارەکانی نوزیدا بەکار هاتوون زۆر لەو نەخشانە دەچێت کە لە ناوچەی باکووری میزۆپۆتامیا بەکارهاتوون، ئەمەش کاریگەری حیثیەکان و وڵاتی ئاراراتوی پێوە دیارە کە لە هونەری بیناسازیدا بەکار هاتوون. نموونەی ئەمەش دوو کۆشکن یەکێکیان لە نوزیە و بریتییە لە خانوویەک لەو میرنشینە، دووەمیشیان لە (الالاخ)ە کە دەگەڕێتەوە بۆ خانووی پادشای ئەو شارە، کە بە شێوەیەکی ئەندازیاری دروست کراون بریتییە لە ژوورێک کە بە شێوەی لاکێشە دروست کراوە و لە لایەک لە لاکانی شوێنی ئاگردانی پێوە دیارە لەگەڵ ژوورێکی تر کە لەسەر شێوەی ژوورەکەی تر دروست کراوە. هەروەها

لەگەڵ دەرگایەکی سەرەکی لاکێشەیی کە بە ڕێڕەوێک بەستراوەتەوە بە دەرگای چوونە ژوورەوەی سەرەکی ئەم کۆشکە. بەڵام لە ڕووی هەڵکۆڵینەوە دوو هەڵکۆڵینمان هەیە لە ئەشکەوتێک بەناوی (کندک) کە دەکەوێتە نێوان ئاکرێ یان عەقرە و شوش لە باکووری ڕۆژهەڵاتی موسڵ، ئەم هەڵکۆڵینانەش یەکێکیان لە دەرگای سەرەکی ئەم ئەشکەوتە بەلای دەستە چەپ هەڵکەنراوە. کە مستەر (لایارد) لەپێش سەدە و نیوێک دۆزییەوە کە لەسەر دیواری لای چەپی ئەم ئەشکەوتە ئەم هەڵکۆڵینە هەیە، هەروەکو دکتۆر [مەحمود ئەمین] لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧ دۆزییەوە، هەر لەسەر ڕووی دەرەوەشی وێنەیەک هەڵکەنراوە کە بریتییە لە ڕاوچییەک کە ڕاوی کێوییەکی چیایی دەکا لەگەڵ ئاهەنگێک کە بە خواردن و خواردنەوە ڕازاوەتەوە، دووەمیشیان بریتییە لە نمایشێکی ئایینی. ئەم دوو هەڵکۆڵینەش لەوە دەچێت بەرهەمی هونەری میتانیەکان - خوریەکان بێت. لە بواری ئایین و بیر و باوەڕیشەوە ئایین لەلای میتانیەکان بەشێکی گرنگی شارستانیەتەکەیان بوو. ئاینەکەیان پوختە و تەواو و بێگەرد نەبوو چونکە ئەوان دراوسێی نەتەوە و هۆز گەلێکی لەوان دێرینتر بوون لە شارستانیەتدا، بۆیە زۆرێک لە بیر و باوەڕەکانی خۆیان لەوان وەرگرتبوو وەک بیر و باوەڕی سۆمەریەکان و ئەکەدیەکان و بابلیەکان و تەنانەت

حیثیەکان. ئایینەکەیان سەرباری ئەوەش لە مالی خوری- میتانی هاتووە کە کەسێکی بالا دەست بووە و لە رەگەزێکی هیند و ئەلمانی بووە. میتانیەکان دەقەکانی نوشتە و پارانەوەی ئایینی و نوشتەی بابلیەکانیان وەرگێرایە سەر زمانی خۆیان، هەروەها داستانی گلگامێشی ئایینییان وەرگێرا سەبارەت بە خوداوەندەکانی میتانیەکان، ئێمە دوو خوداوەندی سەرەکیمان لێ ناسیون: خوداوەند (تیشۆب Tesup) (خوداوەندی بروسک و هەورە تریشقە و باران) خوداوەند [خیثات hepat]ی خێزانی، میتانیەکان باوەڕ هێنان بەو دوو خوداوەندەیان چەقاند لەنێو ئایینی دانیشتوانی سوریا و بیر و باوەڕە حینەکان. هەروەها کاریان کردە سەر بیر و باوەڕەکانی باکووری دۆلی نێوان دوو رووبار [وادی الرافدین] و باکووری عیراق بە تایبەتیش بیر و باوەڕەکانی ئاشووری. بیر و باوەڕی میتانیەکان لەسەر مۆرە شێوە لوولەییەکانی خۆیان هەلکەندرابوو کە لە گردی نوزی دۆزرانەوە وەک باوەڕهێنانیان بە ژیانی دووەم و بوونی هێزێکی دیکەی خوداوەندی کە کۆنترۆلی چارەنووسی ئادەمیزاد دەکا. ئەم مۆرانە خوداوەندی دەوڵەمەندمان بۆ وێنە دەکات لە دیمەنی نوێژ کردن و سرووت و ئاهەنگە ئایینەکان و دیمەنەکانی خوداوەندەکە، ئاهەنگەکانی هاوسەرگیری لای خوداوەندەکان دەنوێنێ، وە ئەوەی دەبێتە بەلگەش لەسەر ئەوەی کە خاوەنداری میتانی و خوری لە بنەچەیەکی هیندیەوە دێت. بوونی ژمارەیەک لە خوداوەندی هیندیە کە میر و ناودارانی بنەماڵەی خاوەنداری میتانی سوێندیان پێ دەخواردن، لەوانەش خوداوەند [میترا] و (لاندرا) و (فارونا) و [نسایتا]، ئەو خوداوەندانەش هەمان ئەو خوداوەندانەن لە بیر و باوەڕەکانی خەڵکی ولاتی هیند و هەندێ نەتەوەی هیند و نەتەوەی ئەورووپی بوونیان هەیە لە ولاتانی رۆژهەلاتی نزیک.

**بەشی چوارەم**

**هەولێر لە چاخە کۆنەکانی مێژوودا**

**لە سەردەمی میدییەکانەوە تا رزگارکردنی ئیسلامی**

ناوی ئێرانیەکان بۆ یەکەم جار لە دەقەکانی پادشای ئاشووری (شەلمانسەری سێیەم) هاتووە، ئەمەش لە سالی (٨٤٤ پ.ز) دا بووە کاتێک رێگەیان لە هێرشی ئاشوورییەکان گرتووە کە ویستوویانە روو بکەنە ناوچەکانی چیای زاگرۆس، هەر وەکو لەم هێرشەدا ئاشووریەکان ناوی فارسیان بردووە و خستوویانەتە سەر پرسوای پایتەختەکەیان، هەروەها ناوی میدیاش لە هێرشی ئاشوورییەکان هاتووە کە کردوویانەتە سەر ولاتی میدییەکان سالی (٨٣٦ پ.ز) ئاشوورییەکانیش بە مادای ناویان بردوون و شوێنی پێگە جوگرافیەکانی فارسیان دیاری کردووە و وتوویانە ولاتەکەیان دەکەوێتە خوارووی رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ و ولاتی میدییەکانیش دەکەوێتە خوارووی رۆژهەلاتی هەمان شوێن، واتە ئەو ناوچانەی کە هاوسێ بوون لەگەل شاری هەمەدانی ئێستاکە، ئەم هۆزانە لە سەدەی (٩ پ.ز) لە شوێنە دوورەکانەوە هاتبوون لەم ناوچانەدا نیشتەجێ بوون. شەپۆلێکی تری ئەم هۆزانە بە ناوی (زکرتو Zikirtu) لە رۆژهەلاتی ئێرانەوە نیشتەجێبوون و بلاو بوونەوە بە تەورێز و سنووری شانشینی ئارارات و بارتیەکانیش لە باشووری دەریای قەزوین نیشتەجێ بوون. سالی (٨٢٣ - ٨١٠ پ.ز) (شەمس ئاداد)ی پێنجەم لەو ناوچانەی کە دەکەوێتە باکووری دەریای ورمێ زال بووە بە سەر سەرۆکێکی ئێرانی و دەستی بە سەر (١٢٠٠) شار و گوندی ئەواندا گرتووە. فارسەکان نەیانتوانیوە بۆ ماوەیەکی زۆر لە باکووری خۆرئاوای ئێران بمێننەوە و نیشتەجێ ببن لە بەر هێرشی ئاشوورییەکان و جەختی ئاراراتییەکان کە ناچاری کردوون لەو ناوچانەدا نیشتەجێ ببن کە کەوتۆتە نزیک چیای بەختیاری کە پێی دەگوترا پەرسوا لە سەدەی (٧و٨ پ.ز) کە دەکەوێتە رۆژهەلاتی شاری شۆشتری ئێستاکە.

لە سەدەی (١٢ پ.ز) ئاراراتییەکان یارمەتی پاشای نائیریان داوە دژ بە پادشاکانی ئاشووری کە شەریان لەگەلدا کردوون، بەم دەرفەتەشیان لاوازی ئاشووریەکانیان قۆزتۆتەوە و سنووری ولاتەکەیان درێژ کردۆتەوە هەر لە

سەرچاوەکانی فورات و ناوچەی وانەوە بگرە تا دەگاتە زنجیرەی زێی خالس لە ناوەڕاستی ئاسیای بچووک. بە فرەوانبوونی ئەم ناوچەیەش فارسەکان لە سەر سنووری ئەو وڵاتە تازەیەی ئارارات نیشتەجێ بوون و هەموو خەڵک و دانیشتوانی باکووری خوارووی ئێران کەوتنە ژێر دەستەڵاتی ئاراراتییەکان. بەم جۆرە ئاشوورییەکانیش لە کۆتایی سەدەی نۆیەم و نیوەی یەکەمی سەدەی هەشتەمی پ.ز شکستیان خواردو تووشی بێ هێزی بوون. هەروەکو پێشتر باسی کێشە تاڵ و ناخۆشەکانی نێوان ئاشووری و ئاراراتییەکان و میلی کێڵەشین و تۆبزاوەمان کرد بەڵام ئەو ماوەیە نازانین کە فارسەکان لە ژێر فەرمانڕەوایی ئاراراتییەکاندا ماونەتەوە. سنووری ئاراراتییەکانیش بەرەو باشور و باکوور هێندە بەربڵاو و فراوان بووە کە توانیویانە هەر یەک لە (اشسبو ئینی و منیواس) بخەنە سەر وڵاتەکەیان بە شێوەیەک کە بەرفراوانیەکەی لە دەوڵەتی ئاشوورییەکان کەمتر نەبووە. بەڵام پادشای ئاشوورییەکان (تەجلات بلا سەری سێیەم) بە یارمەتی هێزێکی (سەردۆری دووەم) ی پادشای ئاراراتییەکان توانی هێرشێک بکاتە ناوچە نزیکەکانی وڵاتی ئاشوورییەکان و ئەو ناوچانە بە دەست بێنێتەوە کە کەوتبوونە نێوان فورات و دەریای ناوەڕاست و زەرەر و زیانێکی زۆریان لێ بدات و چوار دەوری پایتەختەکەیان بگرێت کە شاری وان بوو.

هەروەها پادشای ئاشووری هەر خۆی هەستا بە چەند هێرشێکی تر کە کەوتبوونە چیای زاگرۆس لەو هێرشانەشدا سەرکەوتوو بووە و توانیویەتی مادییەکان بێهێز بکات و دیلێکی زۆریان لێ بگرێت و بەرەو عێراق پەل بەستیان بکات و لە ناوچەی دیالە نیشتەجێیان بکات.

سەرجۆنی دووەمی پادشای ئاشووری بەوە جیا دەکرێتەوە کە زنجیرەیەک هەڵمەتی ڕزگارکردنی دژی وڵاتی شام (عیلام) ئەنجام داوە و توانیویەتی لە هەموو لایەکەوە بەرگری بکات و وڵاتی میدیا بکات بە ئامانجی سەرەکی خۆی.

هەروەها هەستاوە بە ئەنجامدانی هێرشێکی سەربازی بۆ سەر شاری پرسوا کە بە قەڵایەکی گرنگی میدییەکان دادەنرا و توانیویەتی وێرانی بکات و (٢٨) سەرۆکی ئەوان بگرێت و ملکەچیان بکات. هەر ساڵی (٧١٥ پ.ز) پادشای ئاراراتییەکان هێرشێکی کردە سەر ئەو ناوچانەی کە کەوتبوونە باشووری دەریای وان کە توانی داگیریان بکان لە ترسی ئەوە نەبادا ملکەچی ئاشوورییەکان بن، هەروەها سەرجۆن لە ساڵی (٧١٦- ٧١٣ پ.ز) هێرشێکی تری سەربازی ئەنجام داوە و توانیویەتی وا بکات (٤٢) سەرۆک لە میدییەکان ملکەچ بکات و ئەو ناوچانە داگیر بکات کە کەوتبوونە پشتی هەورامان. بەم جۆرە میدییەکان سەرنەکەوتن لە دروستکردنی دەوڵەتێکی ئێرانی تا لە سەردەمی پادشا (خشتاتریتا - Khshatrita) کە بە هیرۆدۆت (فرائۆرتیس) ناو دەبرا ئەم خەونەیان هاتە دی هەروەکو لە نووسینەکانی داریۆش و هەڵکۆڵینەکانی بەهستۆن هاتووە. سەرجۆن لە شەڕکردنی لەگەڵ میدییەکان نەوەستا و چەندین هێرشی سەربازی کردە سەر وڵاتی میدییەکان کە بە ناوبانگترینیان هەشتەم بووە. لە بەر ئەوە وڵاتی میدییەکان هەستانەوەی بەخۆیەوە نەبینیەوە تەنها لە سەردەمی سەنحاریبی کورددا ساڵی (٧٠٥- ٦٨١ پ.ز) ئەویش لە بەر سەرقاڵ بوونی لە بابل و عیلام و شانشینی یەهودا و میسر. میدییەکان توانییان یەکێتییەک دروست بکەن و لە چواردەوری ماڵی دیاکۆی مادەکان (خشتاتریتا) کۆ ببنەوە بیکەن بە سەرکردەی خۆیان، هەروەها توانییان هۆزەکانی ئێرانیش کۆ بکەنەوە و بیانکەن بە یەک، ئەم پەیمانەش وا دەرکەوتووە کە بووەتە هۆی بێ هێزی ئاشوورییەکان.

لە ڕاستیدا خشتاتریتا هەر بە کۆکردنەوەی وشەی میدییەکان نەوەستاوە بەڵکو هەستاوە بە یەکخستنی هەموو ئێرانییەکان.

ئەسکیشی یەکانیش کە لە بەرزاییەکانی قەفقاسەوە بەرەو دەشتاییەکانی ئێران هاتوون و دەستیان کردووە بە بەربەرەکانی لەگەڵ ئاشووریەکان و ئاراراتیەکان لە دەوروبەری دەریای ئورمێ، تا ئەسکیشییەکان لە ئازەربایجان کەم بوونەوە و نەبوونە هۆی سەرهەڵدانی

دەوڵەتێکی میدی، بەڵام خشتاتریتا توانی دەوڵەتێک دروست بکات کە لە هەمەدانەوە درێژ دەبێتەوە بۆ رۆژهەڵاتی نەهاوەند و تا دەگاتە باشووری ئێران.

هەروەها دەستیشی بە سەر فارسدا گرت. دوای ئەوە بریاری دا هێرش بکاتە سەر نەینەوا بەڵام ئەو بریارە بریارێکی ترسناک بوو لە بەر ئەوەی ئەسکیشییەکان بە سەرکردایەتی پادشاکەیان کە ناوی (بارتگو ابن مادیس) بوو خیانەتیان لێ کرد و لە هێڵی پشتەوە بە سەریان دادان و هاوپەیمانی ئاشوورییەکان توانییان هێزەکەیان لە ناو ببەن و پادشای مادەکان بکوژن لە ساڵی (٦٥٣ پ.ز) ئەسکیشییەکان دەستیان بە سەر ولاتی میدییەکان داگرت و تا ساڵی ٦٢٥ پ.ز میدییەکان لە ژێر دەستی ئەواندا مانەوە.

خشتاتریتا کورێکی لە دوای خۆی دانا بە ناوی کەی ئەخسار (کەی خسرەو) کە بە هیرۆدۆت ناوی دەبەن، ئەویش چەند ساڵێک لە ژێر دەستی ئەسکیشییەکان بە سەر دەبات و پادشای میدییەکان دان بە دەستەڵاتی ئەوان دادەنێت کە لە بەرژەوەندی ئەواندا دەبێت و رێخۆشکەر دەبێت بۆ پێکهێنەوەی هێزەکانی سەربازییان. کەی ئەخسار سوپایەکی بەهێز پێک دەهێنێت لە هێزی پیادە و تیرهاوێژ کە لە سەر شێوازی مەشقی ئەسکیشییەکان بە تایبەتی ئەسپ سواری بۆ شەڕ ساز و ئامادەیان دەکات. تا لە ئەنجامی شەڕێکی گەورەدا توانی هەندێک لە ناوچەکانی چواردەوری خۆی بە دەریای ئورمێ شەوە بگەرێنێتەوە سەر ولاتەکەی، ئەسکیشیەکانیش لەم شەڕەدا دەشکێن و ناچار دەبن کە واز لە ولاتی میدییەکان و فارسەکان بهێنن و شاری ئەکبەتان واتە هەمەدانی ئێستا بکەنە پایتەختی ولاتێکی نوێ و یەکگرتوو. ئینجا شەڕی خۆی بە ئاشوورییەکان دەفرۆشێ و هێرش دەکاتە سەر شاری (خرِ خرِ) کە دەکەوێتە سەر زێی دیالە و دەستی بە سەردا دەگرێت و رێگایەک بەرەو نەینەوا دەکاتەوە، بەلام بە تەنیا ناتوانێ ئەم هێرشە بۆ سەر ولاتی ئاشووریەکان ئەنجام بدات لە بەر بوونی هاوپەیمانیەتی نێوان ئاشووریەکان و میسرییەکان و بوونی هێزی ئەسکیشییەکان کە سەر بە ئاشووریەکان بوون و لە چیا و ناوچەکانی باکووری رۆژهەلاتی ولاتی ئاشوور بلاو بوبوونەوە، لە بەر ئەوە هەولی دا بابلییەکان بۆ لای خۆی رابکێشێ و هەستا بە هاندانی (بنو بلاسەر) ی جێگری پادشای بابلییەکان بە شۆڕشکردن و دەرچوونی لە دژی ئاشووریەکان هەروەک چۆن نەیویست ئاوای بۆ هاتە دی. (بنو بلاسەر) هێرشی کردە سەر شاری ئاشوور، بەڵام میسری یەکان خۆیان لەم شەڕە هەلقورتاند و وایانکرد کە بۆ دواوە بکشێنەوە. ساڵی (٦١٥ پ.ز) کەی ئەخسار هێرشێکی کردە سەر شاری نەینەوا و لەبەردەم شوورە بەهێزەکەی ئاشوور تیکشکا، بەڵام کاتێ هێزەکانی بەنو بەلاسەر فریای کەوت و توانی شاری ئاشوور داگیربکات. بەم جۆرە میدیەکان و بابلیەکان رێککەوتنێک گرێ دەدەن بۆ بەهێز کردنی ئەم رێکەوتنەش کچی کوری کەی ئەخسار کە ناوی ئەمتیس **Amytis** دەبێت دەدەن بە پادشا نەبو خوزنەسەر. لە دواییدا ئەسکیشییەکان هێرشیان کردۆتە سەر دواوەی سوپای میدییەکان و لە بەر دەم شوورەی نەینەوا بۆ ماوەیەکی کەم تووشی پاشەکشێ بوون. هەر لە ساڵی (٦١٢ پ.ز) میدییەکان و بابلیەکان هەڵدەستن بە ئەنجامدانی هێرشێکی تر بۆ سەر پایتەختی نەینەوا و هێزی ئەسکیشییەکان دەشکێن. لەگەڵ ئەم شکانەشیان پایتەختی ئاشووریەکانیش خۆی بۆ ناگیرێ و دەرووخێ. ئاشووریەکانیش ناتوانن بەرگری بکەن و رزگاری بکەن، بەم جۆرە نەینەوا وێران دەبێت و کۆشک و تەلارەکانیشی دەسووتێن، تا یەکێک لە میدییەکانی بنەماڵەی ئەم پادشایە بە ناوی (ئاشوور ئەبلەتی دووەم) هەڵدەستێ بە کۆکردنەوەی پاشماوەی هێزە تێکشاوەکەیان و بەرەو باکوری سوریا هەڵدێت شاری حەرا دەگرێت و دەیکات بە پایتەختی خۆیان. چونکە ئەو پێی وا بوو بە یارمەتی میسرییەکان نەینەوای پایتەختی بگەرێنێتەوە، بەڵام ئاشووریەکان هەر بەتەنیا خۆیان شەرێکی سەختیان لە دژی هاوپەیمانەکان گێرا کە بوون بە هۆی ونبوونی دەوڵەتی ئاشووری لە ساڵی (٦٠٦ پ.ز) شاری

هەولێریش بە دەستی میدیەکان شکا و بەڵام لە وێرانبوون سەلامەت دەرچوو. هێزەکانی کەی ئەخسار بەرەو رۆژئاوا چوونە پێش و هێرشیان کرد سەر شانشینی لیدیا کە ئەو کاتە بنکەیەکی بازرگانی جیهانی بوو بۆ ماوەی پێنج ساڵ شەڕی لەگەڵیان کرد و بێ سوود بوو، کە لە دواییدا ڕێکەوتنێکی ئاشتییانە لە نێوانیاندا گرێ درا و (ئەستیاکیس Astyages) کە کوڕی ئەخسار کچێکی پادشای لیدیەکانی خواست. لە ساڵی (٥٨٤ پ.ز) فەرمانڕەوایی میدییەکانی کەوتە دەست (ئەستیاکیس) و هەردوو وڵاتی میدی و لیدییەکان لە سەر ئەوە ڕێک کەوتن کەوا ڕووباری خالس ببێتە سنووری نێوان هەردووکیان، سەرباری لیدیا ئاسیای بچووک و ئیمپراتۆریەتی ئاشووری لە نێوان میدیەکان و بابلیەکان بەش کرا، میدییەکان بەشی باکووریان بەر کەوت کە وڵاتی ئاشووریشی گرتبووە خۆ و بابلیەکانیش بەشێکی سوریا و فەلەستین و باشووری نێوان میزۆپۆتامیا و وڵاتی عیلامیان بەرکەوت.

لەو کاتیدا دەوڵەتی میدییەکان زۆر بەهێز بوون، بۆیە بابلییەکان بە سەرکردایەتی نەبو خوزنەسر بەندەرێکی گەورەیان دروست کرد و چاکسازییەکی گەورەی بە درێژایی سنووری باکووری شاری بابلەوە واتە لە شاری (ئۆپیس- Opes) تاکو سپار لە دیجلەوە بۆ فورات ئەنجامدا، کە ئەمەش بە بەندەری میدییەکان ناسراو بوو بۆ لادانی هەر هێرشێک بوو کەوا میدیەکان ڕووبەڕووی بابلییەکانی بکەنەوە. ئەستیاکیس پادشای میدییەکان زۆر ئارەزووی لە گرتنی شاری حەلان هەبوو کە بنکەیەکی خودا پەرستی خودای مانگ بووە لە لایەن بابلیەکانەوە، بۆیە لەگەڵ (بوناهیدی) پادشای بابلییەکان تووشی پێکدادان بوو کە دەیویست لەم شارەدا بکات لە بەر چەند هۆیەک لەوانە: بنکەیەکی بازرگانی و سەرەڕێگایەکی گرنگی بازرگانی و ڕێگەی چوون بوو بۆ دەریای ناوەڕاست چونکە خۆشیان بە دایکێکی سەرەکی قەشەی پەرستگای خوای مانگ دادەنا لە حەرا. یەکێک لەم هۆیەش ئەوە بوو (بوناهید) هاوپەیمانیەکی لەگەڵ کورشی دووەمی پادشای فارس گرێ دابوو کە دەیویست ئەو ڕێگا سەرەکیە کە لە هەمەدانەوە تێپەڕ دەبوو داگیری بکات، بەم هاوپەیمانێتیەش دەوڵەتێکی تازە لە ژێر فەرمانی سەرکردەی کورشی دووەم لە سەر شانۆی سیاسی جیهاندا بە دەرکەوت کە سەلماندی ئەویان لە چاکترین سەرکردە ڕزگارکەرەکانە لە مێژووی جیهانی کۆندا.

**دەوڵەتی ئەخمینی**

زانیارییەکی تەواومان لە سەر عیلامییەکان لە بەردەستدا نییە، بە تایبەتی ئەو ماوەیەی نێوان سەدەی دوازدەهەم و نیوەی سەدەی هەشتەمی پێش زایین، هەموو ئەو زانیارییانەی کە دەشیزانین تەنها دەنگوباسی ئەو شەڕ و پێک دادانەیە کە تۆمار کراوە لە نێوان ئەوان و ئاشوورییەکان ئەمەش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کەمی ئەو زانیارییانەی کە لە سەر وڵاتی عیلامییە، بە تایبەتی لە ناوچوونە کتوپڕەکانەوە هەیە، سەرباری ئەوەی پەیوەندی بە لادانێکی کتوپڕ هەیە،بە نیشتەجێبوونی فارس و هۆزە ئارامییەکان لە بەری ڕۆژهەڵاتی زێی دیجلە، وا دەگەیەنێ کەوا عیلامییەکان زۆر بێ هێز بوون دەوڵەتەکەیان ڕووخاو بێت. پێکهاتەی وڵاتی فارسەکان لە نزیکی سەدەکانی حەوتەمی پێش زایین دەستی پێ کردبێت. لە دواییدا کۆمەڵەکەیان بە چیای بەختیاریدا پەرت بوون تا گەیشتە ڕۆژهەڵاتی شوشتر کە دەکەوێتە پێچی ئاوی کارون. ئەم هۆزانە دانیان ناوە بە فەرمانڕەوایی عیلامییەکان، بەڵام سەرکەوتوو بوون لە دروست کردنی دەوڵەتێک بە سەرکردایەتی ئەخمینییەکان لە شاری پرسوا ئەگەر چی دەوڵەتێکی بچووک بوو، بەڵام بەرگرییەکی بنەڕەتی تێدا بەدی دەکرا بۆ ئەوەی لە داوڕۆژدا ببێت بە دەوڵەتێکی گەورە.

هەروەها لە ساڵی (٦٩٢ پ.ز) دەوڵەتی ئاشووری دەستی کرد بە لە ناوبردنی عیلامییەکان کاتێکیشی وەک پشوو دا بە دەوڵەتە بچووکەکەی فارس کە لە ژێر سەرکردایەتی بیت ئەخمینی پادشا (تایسپیس Teispes) وڵاتەکەی فردوان بکات لە ساڵی (٦٧٥- ٦٤٠ پ.ز) هەر لە سەردەمی ئەو پادشایەدا هەموو ئەو

ناوچانەی کە کەوتبوونە باکووری ڕۆژئاوای پرسوا بە شاری (انشان)یشەوە بە وڵاتی فارسەوە لکاند و لە دوای ڕزگار کردنی نازناوی پادشای (انشان) ی پێ دەدرێت، بەڵام ناچار بوو کە دان بە بوونی سوڵتانی میدیەکانەوە بنێت لە سەردەمی پادشا (خشتلریتا)، ئەم پادشایەی میدییەکان ساڵی (٦٥٣پ.ز) کۆچی دوایی کردووە. ئەسکیشیەکان میدییەکانیان داگیر کردو بۆ ماوەی ٢٨ ساڵ فەرمانڕەواییان کردووە. هەر بۆیە ئەخمینیەکان ئەم هەلەیان قۆزتەوە و توانیویانە خۆیان لە ژێر دەستەڵاتی میدییەکان ڕزگار بکەن و وڵاتەکەیان فرەوان بکەن و فەرمانڕەوایی خۆیان بکەن کە ئەمڕۆ بە وڵاتی فارس ناسراوە. لە کاتێکدا پێش ئەوەی پاشا تاسپیس بمرێت تەواوی وڵاتەکەی لە پرسوا انشان بە سەر هەردوو کوڕەکانی دابەش کرد کە یەکێکیان ناوی (اریامنیس ٦٤٠-٥٩٠ پ.ز) بوو کە ناوی لە خۆی نابوو پاشای پاشایان و فەرمانڕەوایی پارسای دەکرد، کوڕەکەی دووەمیشی بە ناوی کورشی یەکەم (٦٤٠-٦٠٠ پ.ز) کە پارسوماشی بە دەست هێنا و لەو ماوەیەشدا ئەخمینیەکان و ئاشوورییەکان ڕووخۆش بوون لەگەڵ یەکتر کاتێک هێزی میدییەکان تا دەهات زیادی دەکرد و فەرمانڕەوایی کەی ئەخساری سوڵتان فرەوانتر دەبوو هەروەکو لە پێشوودا باسمان لێوە کرد تا ڕووخانی نەینەوا ساڵی (٦١٢ پ.ز) لەلایەن میدییەکان و بابلییەکانەوە، هەروەها ڕووخانی عیلام کە پایتەختەکەی سوسە بوو کە کەوتە ژێر دەستەڵاتی بابلیەکان و لە دوای مردنی (ارزاینس Arsanes) (اریارمینس) تەختی پادشایەکی گرتە دەست. وا دەردەکەوێت ارزانیس فەرمانڕەوایی وڵاتی فارسی کردبێت لە ڕۆژانی دوای مردنی باوکی و، قەمبیزی یەکەم ناچاری کردبێت واز لە تەختی پاشایەتی بهێنێ. هێرۆدۆت پێمان دەڵێت کە کوڕەکەی (ارزانیس) (هیستاسپیش Hystaspes) فەرمانڕەوایی فارس بوو لە سەردەتای فەرمانڕەوایی کورشدا.

قەمبیزی یەکەم پاشای (پرسوماس) و (انشان) کچی (استیاکیس) پاشای میدیای هێنا، کاتێک (استیاکیس) ویستی حەران داگیر بکات هەردوو پاشا یارمەتی یەکتریان دا و هەوڵیان دا وڵاتەکەیان یەکگرتوو بکەن لە ژێر یەک تاجدا و لەو یەکگرتنەش کورشی گەورە لە دایک بوو کە پایتەختەکەی دروست کرد لە (پزار کادە Pasargadeo).

کاتێک (استیاکس) ویستی حەران داگیر بکات نبو ناهید پادشای بابل داوای یارمەتی لە کورش کرد بەرامبەر ئەوەی ڕێگای بدات تا بتوانی دەستەڵاتەکەی فرەوان بکات لە سەر حیسابی میدییەکان. ئاستیاکس هەستی بەوە کرد ویستی کورش لە ناو ببات کە لە ئەکبەتانا خۆی گرتبوو لە گوێڕایەڵی دەرچوو بوو، ئەم دوو لایە شەڕێکی بەهێز و دەستە و یەخەیان کرد کە شەڕەکەش بە سەرکەوتنی کورش کۆتایی هات و ئەوی بە دیل گرت و ڕێزیشی لێنا، لەو کاتیدا کورش ئەکبەتانای کردە پایتەختی خۆی و بەم سەرکەوتنەی چەرخێکی نوێ دەستی پێکرد و ئێرانییەکان و میدییەکان یەکیان گرت لە نیو سەدەی (٧- ٢ پ.ز) ئەخمینیەکان پێشکەوتنێکی گەورەیان بە دەست هێنا لە ڕێگەی هێزی سەربازی، بەڵام سەرهەڵدانی ئەم ئیمپراتۆریەتە کەوتنیشی وەک خەونێکی کتوپڕ بوو. دەوڵەتەکەیان چەندین میرنشینی فرەوانی لە خۆ گرتبوو کە پێشکەوتوو بوون لە شارستانیەت وەک میزۆپۆتامیا و میسر و ئاسیای بچووک و شارەکانی یۆنانی و دوورگەکانی دەریای ئیجە و بەشێک لە هیندیش، ئەم وڵاتە کۆششێکی زۆری کرد کە لە ژێر دەستەڵاتی ئەخمینیەکان بمێنێتەوە، کورش لە ساڵی (٥٥٩- ٥٣٠ پ.ز) بابلی لە ساڵی (٥٣٨ پ.ز) داگیر کرد و کۆتایی بە فەرمانڕەوایی کلدانییەکان هێنا، بەڵام بابلییەکان باش بوون و مامەڵەیان بە نەرمی دەکرد.

کورش هەستا بە داگیرکردنی ناوچەکانی باکووری عیراق و لە پێش ئەو ماوەیەشدا بە سەر وڵاتی ئاشوور و دیجلە تێپەڕیوە بۆ داگیرکردنی وڵاتی لیدییەکان و شارەکانی یۆنانی. کورش لە ساڵی (٥٢٩- ٥٣٠ پ.ز) کوژراوە لە ئەنجامی بریندار بوونی لە شەڕێکدا لەگەڵ ئەو هۆزانەی کە لە باکووری ئێراندا نیشتەجێ بوون، دوای ئەویش

قەمبیزی کوڕی سالی (٥٢٩- ٥٢١ پ.ز) شوێنی دەگرێتەوە سالی (٥٢٥ پ.ز) میسر داگیر دەکات، دوای گەڕانەوەشی بۆ ئێران و لە ئەنجامی دروستبوونی شۆڕشێکی ناپێنی کە گوماتە (Qaumarta) ی فالچی بانگەوازی بۆ کردووە و خۆی کردووە بە پاشای وڵاتی ئێران کۆچی دوایی کردووە. بەڵام داریوشی دەستەڵاتداری شاری (پارتسا-

[illegible]) توانییەتی بەرەنەتی خەڵکەکە بدات و خۆی بکات بە پاشای ئێران و بەدەر شۆڕشە ناپێنییەکەش لە ناو بیات کە گوماتە سەرکردایەتی کردبوو. داریوش یەکێک لە پاشا بچووکەکانی بە [illegible] هەمووئێرە [illegible] لە ئەنجامی پاخبوونی داریوشی کوڕی پاشا هیستاسپس توانی یاخیبوونەکانی لە ناوبات و کۆتاییان پێ بهێنێت [illegible] فەرمانی دا کە ڕێنەیەکی خۆی و دوژمنەکانی لە سەر بەردێک بکێشرێت و هەڵبکۆڵرێت کە دەکەوێتە سەر ڕێگای هەمەدان و کرمانشا. هەروەها توانیویەتی شۆڕشەکانی وڵاتی عیلام تێکبشکێنێت و [illegible] بەڵام لە وڵاتی بەرسیبیاش شۆڕشێکی گەورە و کوێر [illegible] و بەکەسێک بە ناوی [illegible] بانگەشەی بۆ خۆی دەکرد [illegible] لە نەوەکانی کەی تەختەکەیە و خۆی کردبوو بە پاشای وڵاتی میدیا، بە کاتێکدا کە داریوش خەریک بوو بە [illegible] وڵاتی [illegible]

داریوش بە سەر ئەوەشیاندا سەرکەوتووە و توانیویەتی شۆڕشەکەی لە ناوببات، بەڵام شۆڕشگێڕێکی تر خۆی لە وڵاتی میدیا نیشان داوە ئەویشی بە دەردی ئەوانی پێشوو بردووە. ئەوەی جێگای باسکردنە کورش نۆزدە شەڕی لە دژی نۆ پادشا ئەنجامداوە توانیویەتی هەر هەموویان بشکێنێ و لە ناویان بیات.

**داریوش ناوبانگی بە ڕێکخستنی**

کارگێڕی و سیپادا دەرکردووە و وڵاتی ئەخمینییەکانی بۆ (٢٠) بەش دابەش کردووە و کرێکاری فارسی بۆ دامەزراندووە و پارێزگاری بۆ داناون. [illegible] بۆ ئەم مەبەستە گرنگ لە دارایییەکانی خەڵک بکرێ. بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیش لە نێوان بەشەکانی ئەم ئیمپراتۆریەتە هەستاوە بە دروستکردنی تۆڕێکی پەیوەندی فەرمان لە ڕێگای بازگە تاکو ئێستا هەندێک لەو شوێنەوارانە ماون. ئەم ڕێگایەش لە سوسەوە درێژ بۆتەوە تا [illegible] دیجلەی بڕیوە و گەیشتۆتە شاری هەولێر و حەران و کۆتاییشی لە شاری ساردیسی پایتەختی لیدییەکان هاتووە. درێژی ئەم ڕێگایە نزیکەی (١٦٧٦) میل بووە و (١١١) وێستگەی وەستانی هەبووە ئەسپ و ئاو و خواردن و عارەبانەی بۆ دابین کردوون. داریوش سالی (٤٨٦ پ.ز) کۆچی دوایی کردووە و کە بە [illegible] و دادپەروەری و خۆشەویستی و چاکە ناسراوە. دوای داریوش کوڕێکی بە ناوی (اخشایرشا سالی ٤٨٦- ٤٦٥ پ.ز) فەرمانڕەوایی [illegible] و لە کاتی نیشتنی توانیویەتی

شۆڕشی میسر لە ناو بیات، ئینجا بابلی وێران کردووە و لەگەڵ زەویدا تەختی کردووە هۆکارەکەشی ئەوەبووە بە شۆڕشێک هەستاون دژی فارسەکان، هەروەها ویستوویەتی تۆڵە لە یۆنانییەکان بکاتەوە چونکە کاتی خۆی باوکی لە بەردەمیان شکستی خواردووە، هەڵاتنەوە ولاتەکەی خۆیان دوای ئەوەی لە شەڕی وشکانی بە سەریاندا سەرکەوت، بەڵام لە کاتێکدا کەشتی گەلی یۆنانییەکان سەلامەت بوون [illegible] وای بەباش زانی کە بکشێتەوە دوای ئەوەی سوپایەکی بە سەرۆکایەتی (مردۆنیوس) بەجێ هێشت کە لە داگیرکردنی هەندێ شاری یۆنانی سەرکەوتنی بە دەست هێنابوو بەڵام لە جەنگدا کوژرا.

دوای ئەویش کوڕێکی بە ناوی (ارتا اخشابرشا الاول) سالی (٤٦٥- ٤٢٤ پ.ز) دەستەڵات دەگرێتە دەست و لەگەڵ یۆنانییەکان دەکەوێتە شەڕ و بە سەریاندا سەردەکەوێت، بەڵام بە ناچاری ڕێکەوتنێکی ئاشتیانە لەگەڵیاندا مۆر دەکات کە زۆر پێویست بووە.

لە کاتی ئەوشدا پەیوەندی ڕۆشنبیری لە نێوان وڵاتی فارس و یۆنانییەکان لە گەشەسەندندا بووە. دوای ئەویش (داریوشی دووەم ٤٢٤- ٤٠٤ پ.ز) دەستەڵات دەگرێتە دەست و لە سەردەمی خۆیدا ڕێکەوتنێک لە نێوان [illegible] وڵاتی فارسدا مۆر دەکرێت بۆ شەڕکردن لە دژی ئەسینا کە خۆی بە دەستی ئەوان دابوو [illegible]

ژیانی شۆڕش هەموو لایەکی ولاتەکەی گرتەوە، دوای ئەویش دەسەلات دەکەوێتە دەست (ارتا اخشایرت الثانی (٤٠٤- ٣٥٩ پ.ز) کە کوڕی دووەمی بووە و بەلام لە کاتی ئاهەنگی تاج لە سەر نانی برا بچووکەکەی هەوڵی تیرۆر کردنی داوە ئەگەر چی رزگاری بووە و لە دوایشدا دایکی دەکەوێتە نێوانیان و لێی دەبووری و دەیکا بە والی لە ئاسیای بچووک. بەلام دوای ماوەیەکی کورت لە گوێڕایەڵی دەردەچێت و سەرکردایەتی سوپایەکی چڵکاوخۆری یۆنانی دەکات و لەگەڵ براکەی (ارتا اخشا یرشا الثانی) دەکەوێتە شەڕەوە. لە نێو ئەم سوپایەش زینەفۆنی بە ناوبانگ و خاوەنی دە هەزار سەربازی ئەغریقی هەبووە، لە شەڕێکدا بە ناوی کوناکسا لەگەڵ براکەی ڕوو بەڕووی یەکتر دەبنەوە. هەروەکو زینەفۆن لە کتێبەکەیدا بە ناوی (انا بازیز Anabaziz) (سەرکەوتن) ناوی بردووە و باسی ئەو دە هەزار سەربازە دەکات کە لە دوایدا سەرکردایەتی کردووە گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتی یۆنان.

لەم شەڕەشدا کورش دەکوژرێت دوای ئەوەی براکەی (ارتا خشایرشا الثانی) واز دەهێنێ و سوپاکەی تێک دەشکێ. کاتێک پاشای فارسەکان کوێی لە گەڕانەوەی ئەغریقیەکان دەبێت، بۆ وڵاتەکەیان و ڕێگایەک دەگرنە بەر کە ئەو ڕێگایە نابێت کە کورش گرتبویەبەر، بەلای دیجلە و ئەگەر گرف تێدەبەڕن و (سور ملادی) بش جێ دەهێڵن کە ئەبو خوزنەسر چاکی کردبوو، لە دیجلە دەپەڕنەوە و بەرەو باکور دەڕۆن تا دەگەنە زێی عوزێم کە زەینەفون بە فسکوسی ناوبردووە. لەم سوورانەشدا سەرکردەی ئەغریقیەکان دەکوژرێت و یۆنانیەکان زەینەفۆن بە سەرکردەی خۆیان هەڵدەبژێرن، لە دەشتی نەینەوا بە تەنیشت ئاشوور و نەینەوا تێدەپەڕن، بەلام هیچ هەواڵێکیان نابێت سەرەڕای ئەمەش کە دوو سەدە بەر لە تێکشکانیان تێناپەڕێ، ئینجا باسی پەڕینەوەیان لە زێی گەورە دەکات و بەرەو مرسل ڕۆیشتوون کە بە ناوی (مپسیلا) ناویان بردووە و ناوی نەینەوایان نەهێناوە.

کاتێک گەیشتنە زنجیرە هۆزەکانی کوردوش بە ئازا باسی کردوون، ئەوان هێرشیان دەکردە سەر ئۆردوگاکانیان و خۆشیان لە جێگاکاندا دەژیان و گوێڕایەڵی پادشایان نەدەکرد لەوانەیە ئەوان کورد بوونە، پاشان بۆ ئاسیای بچووک ڕۆیشتوون و تا گەیشتنە دەریای ڕەش و لەوێشەوە لە خۆتیبان هاواریان دەکرد.

**شەڕی ئەربیلا و کۆتایی دەوڵەتی ئەخمینی:**

ئەسکەندەر ساڵی ٣٥٦ پ.ز لە دایک بووە لە دوای مردنی باوکی ساڵی ٣٣٦ پ.ز بووە بە پادشا، ساڵی ٣٣٤ پ.ز سەرکردایەتی هێرشێکی بە ناوبانگی بۆ ڕۆژهەڵات ئەنجامداوە لە سەر ڕووباری ئیسوس (Issas) لە باکووری سوریا لەگەڵ داریوشی سێیەم ڕووبەڕووی یەکتر بوونەتەوە و پادشای فارسەکان هەڵدێت و کەس و کار و خێزان و کچەکانی لە دوای خۆی جێ دەهێڵێ بە دیلی دەکەونە دەست ئەسکەندەر بەلام ئەو لەوان باشتر دەبێت و هەڵسوکەوتی باشیان لەگەڵدا دەکەن، هەڵدەستێت بە داگیرکردنی سوریا و میسر و بە دەستی خۆی نەخشەی دروستکردنی ئەسکەندەریەی ئێستا دەکێشێت.

**شاری ئەسکەندەریە یەکێکە لەو** شارانەی کە ئەسکەندەر بە ناوی خۆیەوە لە عیراق و هیند و ئێران و ئەفغانستان دروستی کردوون. ئینجا ڕووی کردۆتە عیراق و دیجلە و فوراتی بڕیوە و دارا هیچ بەرگرییەکی لەم زێیانە نەکردووە. ئەسکەندەر لە دیر الزورەوە هاتۆتە ناو عیراق و ڕووی کردۆتە دەشتی نەینەوا لەگەڵ داریوش لە شەڕی (گوگمیلە) ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، ئەم ناوەڕەدانی ئەو شوێنەش کە ئەم شەڕە بەناوبانگەی تێ ڕوویداوە ڕووباری خازر بوو بێت کە بە شەڕی ئەربیلا ناوبراوە کە لە ساڵی ٣٣٠ پ.ز بووە دەکەوێتە ئەو دەشتاییە بەرفراوانەی کە لە پشت بەرتلەوە درێژ دەبێتەوە.

بە گوێرەی ڕای بۆچوونی خۆی کە ئەو شوێنە لە سەر ئەو شتە جێبەجێ دەکرێ کە مێژوو نووسان گێڕاویانەتەوە کە داریوش کە براق و حوولەی سوار چاکەکانی لە شەڕی ئیسوس بێ ئاکام بوو سوپاکەی بەکارهێنا کە ژمارەی حەفت سەد هەزار سەرباز بوو بۆ ئەوەی زەوی تەخت بکات و بەرزی و نزمیی دەشتییەکانیشی لابەرێت بۆ ئەوەی

هیچ شتێک نەمێنێتەوە ببێتە ڕێگر لە بەردەم ڕۆیشتنی سوپا و گالیسکەکانی ئینجا بەردەوام دەبێت و دەڵێت: گوگمیلەی کۆن دەکەوێتە شوێنی بەرتلەی ئێستاکە.

داریوش لە شوێنێکی نزیک بەیەکگەیشتنی ڕووباری خازر و ڕووباری گەورە رای کرد، لە سەر پردێک کە ئەو کاتە لەو شوێنەدا هەبوو لە بەر بوونی گاشە بەرد و دامەزراوەیەکی گەورە لە سەر شێوەی پاشماوەی خانووی ڕووخاو کە لەلای ڕاستی ڕووباری گەورەوە چاوی پێ کەوت ڕووی کردە لایەکانی هەولێر کە ناوی خۆی بەخشییە ئەو جەنگە، شارێکی بەناوبانگی ئاشووریەکان بوو بەبەڵگەی ناوهێنان و باسکردنی نووسین هەڵکۆڵینە بزمارییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی داریۆشی کە تێیدا گەنجینە و کەلوپەلە بەنرخەکانی خۆی و کەرەستە و تفاقی پێویست بۆ لەشکرێکی گەورە کۆکردەوە کە بۆ پەڕینەوەی لە ڕووباری زێی گەورە، وا پێویستی کرد بۆ ماوەی پێنج ڕۆژی بەردەوام لە سەر پردەکەیدا بڕوات، داریوش بەرەو هەولێر هەڵات کە تیایدا گەنجینە و کەلوپەلە بە نرخەکانی خۆی تێدا جێ هێشت. پاشان هەڵات و پەنای بردە بەر فەرمانڕەوایی ناوچەی (بکتریا)، ئەسکەندەر کە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لە هەولێر مایەوە پاشان بەرەو بابل کەوتە ڕێ و بێ هیچ جۆرە بەرگرییەک داگیری کرد پاشان بە ڕێ کەوت بەرەو سوسە و ترسی پۆلیس دانیشتوانی ناوچەی شاخاوی ئێرانیشی خستە ژێر دەستەڵاتی خۆی و کەوتە دوای فەرمانڕەوایی بکتریا کە هەستی بەوەکرد خۆی و داریوشی پێکەوە رایان کرد.

فەرمانڕەوایی بکتریا پادشا داریوشی کوشت. کاتێک تەرمەکەی کەوتە بەر دەست و دیدی ئەسکەندەر عەباکەی سەرشانی خۆی خستە سەر تەرمەکەی ڕەوانەی کرد بۆ لای دایکی لە شاری سوسە.

## سەردەمی سەلوقی:

دوای کۆچی دوایی ئەسکەندەر ساڵی ٣٢٣ پ.ز لە شاری بابل، عیراق و ئێران و سوریا بوونە بەشی یەکێک لە سەرکردەکانی کە ناوی (سلوقس) بووە و پایتەختێکی بە ناوی سلوقیە لە سەر دیجلە دروست کردووە کە کەوتۆتە نزیک مەدائن، لەوە دەچێت بۆ دیاریکردنی ناوی کەرکووک لە سەرچاوە ئارامییەکانەوە بە (کرخا - د- یان (بیت سلوخ) هاتبێ یان شاری سلوقیەکان، بە شێوازێکی تر (کرخ سلوخ) بە گەشانەوەی عیراق دێت و سلوقیەکان ساڵی (٣١٢- ١٣٥ پ.ز) چونکە دەزگایەکیان تایبەت بە وەچەی سلوقیەکان دروست کردووە و لەگەڵ چەند باڵەخانەیەک کردوونی بە مەڵبەندی هەرێمەکە و خستوویەتیە سەر وڵاتەکەی. سلوقیەکان دەستەڵاتێکی تەواویان بە سەر هەرێمی حەدیاب دا هەبووە دوای ئەوەش فارسەکانی ناچار کرد کە لە پێناویدا بجەنگن. سلوقیەکان دوو پایتەختیان هەبوو یەکێکیان لە سوریا و ئەوی تریان (انطاکیە) بوو پایتەختی بەشی ڕۆژئاوای ئەم ئیمپراتۆریە بوو دووەمیشیان لە عیراق بوو کە ناونرابوو سلوقیە شوێنەکەشی لەلای ئەو گردانەوە بووە کە ئێستا بە تل عمر ناوی دەبەن و کەوتۆتە بەرامبەر کۆشکی کیسرا. وڵات لە ژێر سایەی سلوقیەکان گەشاوەتەوە بەرەو شارستانیەت چووە و شارێکی زۆریان لە ئێران و عیراق و سوریا دروست کردووە، سلوقیەکان لە ڕۆژەکانی کۆتاییاندا بێ هێز بوون و فەرمانڕەواییان لە ئێران بەردەوام نەبووە بەهۆی پچڕانی بەشی باکوری ئێران کە بریتی بووە لە هەرێمی خوراسان کە شوێنی هۆزەکانی فارس بووە و ناوبانگییان بە فرث دەرکردبوو، هەر ئەمانەش توانییان سلوقیەکان ساڵی (١٤٠- ١٣٥ پ.ز) لە عیراق دەربکەن و فەرمانڕەوایی بکەن. بۆیە دەزگا نوێیەکەی وەچەش بووە بە دەزگای وەچەی ئەرشاقییەکان کە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی (ارشاق) کە دامەزرێنەرەکەی بووە

## سەردەمی فارسەکان (١٤٨- پ.ز- ٢٢٦ز)

فارسەکان یان (الاشکانیون) لە هەرێمی پارسا کە خەڵکی باکوری ئێران بوون توانیویانە پەروەردەیەکی سەربازی ئەخمینیەکان بکەن بۆ ئەوەی دەست بە سەر پارسا بگرن، ئەم وڵاتەش ڕەنگێکی تایبەت بە خۆی هەبووە دوای ئەوەی وڵاتی ئێرانی یەکگرتوویان دروست کردووە.

**بە هاتنی ئەشکانیەکان فەرمانڕەوایی گویزرایەوە لە رۆژئاواوە بۆ هەرێمەکانی باکور کە زۆربەی لایەنەکان پارێزگاریبان لە** هەڵوکەوتی ئێرانی خۆیان دەکرد، بەم جۆرە سەرەڕای دیاردەی ئەغریقی لە ناو پەرتیەکان زیاتر ئێرانی بوو نەوەک ئەخمینی. هەروەها دامغان (هیکاتوسلوس) بۆ ماوەی دوو سەدە دەکەن بە پایتەختی خۆیان پێش ئەوەی ئەدانن لە سەر زێ ی دیجلە بکەن بە پایتەختی خۆیان. هەروەها ئەو ناوچەیە لە نێوان سلوقیەکان و فارسەکان کێشەیەکی زۆری لە سەر هەبوو تا ئەو کاتەی فارسەکان بە تەنیا فەرمانڕەوایی عیراقیان کرد لە ساڵی (١٣٩پ.ز) و لە سەردەمی پاشاکەیان کە ناوی (متراداتس الاول) بووە.

ئیتر میرنشینی فارسەکان دابەش دەکرێ بە سەر چەند هەرێمێک یان وەک میرنشینی بچووک کە هەر یەکێک سەربەخۆ دەبێ لەویتر. هەر یەکێک لەو هەرێمانە پادشایەکی دەبێ فەرمانڕەوایی دەکا و ملکەچی ئیرشاق (پاشای گەورەی فارس دەبێت) شانشینە بە ناوبانگەکانی ئەمانەن: میرنشینی رەها (اورفا)، میرنشینی تەدمر لە بیابانی شام، میرنشینی حطرا (الحضر) کە لە شاری تکریتەوە نزیکە، میرنشینی (میشان) کە لە بەسرەی ئێستا نزیکە، میرنشینی سنجار لە موسڵ و میرنشینی حەدیاب (ادیابین)، حەدیاب ناوێکی ئارامییە و بەرامبەر بە ناوی (ادیابین) ە کە لە سەرچاوە کلاسیکیەوە هاتووە، لە بەرئەوەی **ناوێکی تێکەڵاوە و لە وشەی (زابن) واتە دوو زێ هاتووە، بە مانای حەدیابی هەرێمی دووزێ کە لە** هەندێ کاتدا فەرمانڕەوایی دەگەیشتە فورات لە رۆژئاوا و نەسیبین لە باکوور. هەرێمی حەدیاب لە رووی جوگرافیەوە لەگەڵ بەشێکی گەورەی وڵاتی ئاشووری کۆن دەگونجێت و زۆر جاریش بە ناوێکی تری وەک (اشوریا) یانی وڵاتی ئاشوور ناوی دەبەن. ئەو میرنشینانەی کە ناومان بردن بە شێوەیەکی گشتی دووڵ بوونە کە سەر بە فارسەکان بووینە و گەلێک جاریش کەوتوونەتە ژێر دەستەڵاتی رۆمانیەکان. ئەو میرنشینانەی کە پێش لەدایکبوون دروست بوون تا دوای چەند نەوەیەکیش دوای زایینی ماون و ژیاون. سیاسەتی دابەشکردنی وڵاتیش بە سەر چەند میرنشینێکی بچووک شتێکی ناسراو بووە بەلای ئیغریقییەکانەوە هەر لە سەردەمی ئەسکەندەرەوە بگرە کە خودی خۆی هەولی داوە بە دابەشکردنی وڵاتی فارس بۆ سەر چەند میرنشینی بچووک دانانی میری فارسی بۆیان، بۆ ئەوەی ململانێ لە نێوانیاندا روویدات و یۆنانیەکانیش لە مەترسیەکان پارێزراو بن. هەولێر یەکێک بووە لە شارە گرنگەکانی حەدیاب، بێ ئەوەی ناوی ئەو پادشایانە بزانرێ کە یەک لە دوای یەک هاتوون و فەرمانڕەواییان تیادا کردووە، یوسیفوسی مێژوونووسی یەهودی ناوی یەکێک لەم پادشایانەی **حەدیاب دەبات کە ناوی (ایزاگ) بووە، کە لە سەردەمی یەکەمی زایینی فەرمانڕەوایی کردووە و هەر لە سەردەمی ئەویشدا بووە کە** (ئەرتبار الثالث) پادشای فارسەکان نسیبینی خستۆتە سەر میرنشینی حەدیاب و لە ژێر دەستەڵاتی (ایزاگ) دا بووە.

(دیکران الاول) پادشای ئەرمینیا هێرشی کردۆتە سەر ئەدیابین و ئەربیلا و لە ساڵی (٨٣١ پ.ز) داگیری کردووە و بۆ ماوەی ١٠ ساڵ فەرمانڕەوایی تیادا گێڕاوە، بەلام پادشای فارس ئەرمەنەکان دەردەکەن و دوای ئەوەی هاوپەیمانی لەگەڵ رۆمانەکان دەبەستن، ئەگەرچی ئەو هاوپەیمانەتیە زۆر درێژە ناخایەنێ و رۆمانەکان چاویان لەو ناوچەیە دەبڕن. لە ساڵی ٦٢ز حەدیاب (دیکرانی پێنجەم) ئەو پاشایەی کە ئیمپراتۆر سیوروٚنی رۆمانی دایمەزراندبوو لە سەر شانشینی ئەرمینیا بەکەڵک وەرگرتن لە دیار نەبوونی (والکاسوس) پادشای یەکەمی فارس (الپارثی) کە بێ سنوور تەنگی بە خەڵکەکە هەلچنیبوو، گلەییان بۆ وەلکاسوس نووسی و بارودۆخەکەیان تێگەیاند و ئەگەر بێت و لە چنگ ئەم ستەمکارە رزگاریان نەکات دەچنە ریزی رۆمانەکانەوە، والکاسوس بە خێرایی وەڵامی گلەییەکەی دانەوە و شەڕی لە دژی ئەرمەن و رۆمانەکان راگەیاند مان و بازیشی بە سەرکردەی ئەدیابینەکان دامەزراند و (دیکران ی دەرکرد و وڵاتی ئەرمینیای پاک کردەوە. لە سەدەی یەکەمی زایینی

(ایزاگ) ی پادشای ئەدیابین کە پادشایەکی نموونەیی دەبێت لە ناو فارسەکان و تاجی گەورەی زێڕی لە سەر ناو و مافی ئەوەی هەبوو کە لە سەر تەختی زێڕ بخەوێت، ئەم دوو پلەیەش سیفەتی پادشای فارسی گەورە بوو کە (ارتبان الثالث) دایناپوو کە وەک پاداشتێک بۆ ئەو کەسانەی کە یارمەتی پادشا (ایزاگ) یان دابوو بۆ هاتنە سەر تەخت. رۆمانەکان چاویان بڕیبووە حەدیاب و ئەم چاو تێبڕینەش نەدەوەستا و سنووری نەبوو، دەیانویست بڕۆن بۆ شانشینی ئارومیا چونکە نزیک بوو لە حەدیاب بۆ ئەوەی ئاژاوەی لێ دروست بکەن و داگیری بکەن، بەڵام کاتێک ئەم هۆکارە سوودی نەبوو ،رۆمانیەکانیش خۆیان لەم کارە هەڵقورتاند،. کەواتە (تراجان) پاشای رۆمانی لە ساڵی ١١٥ ز لە رێگەی چوونی بۆ مەدائن شانشینی حەدیابی داگیر کرد و تەختی زێڕینی (طیسفون) ی پادشای لە پایتەختی فارسنەکان کەوتە دەست، بەڵام (هدریان) ی جێنشینەکەی وازی لە هەرێمی حەدیاب هێنا. کاتێک رۆمانەکان لە کۆتایی سەدەی دووەمی زایینی لە سەردەمی (سبتیموس سویرس) ی پاشاکەیان ئەم هەرێمەیان داگیر کرد دووبارە شەڕ لە نێوان رۆمانەکان و فارسەکان دەستی پێکردەوە. هەروەکو لە (مشیحازخا)دا هاتووە کە کتێبێکی مێژووییە لە سەر هەولێر و ئایین بە زمانی سریانی نووسراوە کە ناوی هەندێک لە دوا پاشاکانی حەدیابی تیادا نووسراوە لەوانە (شراط و نرسای). ئەم پادشایەش تا سەرەتای سەدەی سێیەمی زایینی فەرمانڕەوایی کردووە، لە کاتی فەرمانڕەوایی ئەویشدا شەڕ لە نێوان (اولخاش الرابع) سالی (١٩١- ٢٠٨) و پاشای فارسەکان لە خوراسان هەڵگیرساوە، لەم شەڕەشدا فارسەکان شکاون و تۆڵەیان لێ کراوەتەوە، ئینجا (اولخاش الرابع) هێزەکانی خۆی کۆ دەکاتەوە و دووبارە هێرشیان بۆ دەکاتەوە تا دەریای قەزوین ڕاویان دەنێت و خەڵکێکی زۆریان لێ دەکوژرێت لە بەر دواکەوتنی نرسای لە هاورێیەتی کردنی و بەشداری نەکردنی لەم هێرشەدا لەگەڵ فارسەکان، ئەمەش تووڕەیان دەکات و کاتێک بە سەرکەوتوویی دەگەڕێنەوە هێرش دەکەنە سەر حەدیاب و تالان و وێرانی دەکەن و نرسای لە زابی گەورەدا نقوم دەکات. رۆمانییەکان وازیان لە داگیرکردن و فەرمانڕەوایی حەدیاب نەدەهێنا تا لە کاتی (نزاکلا) ی پاشاکەیان و بە سەرکردایەتی ئەو حەدیابیان داگیر کرد دوای گەڕانەوەی هێزەکانیشی بۆ سەر طیسفون لە ساڵی (٢١٦)ز هەستا بە دەرهێنانی تەرمی ئەو پادشا فارسانەی کە بە پیرۆز دەزانران و رێزیان بۆ دادەنرا لە هەولێر.

دوای تێپەڕ بوونی دە ساڵ بە سەر ئەو رووداوە نەوەی ساسانە فارسەکان لە سەر دەستی ئەردەشێری دامەزرێنەرەکەیان لە ساڵی (٢٢٦ز) رۆمانیەکانیان لە هەرێمی هەولێر دەرکردووە.

**وڵاتی ساسانی:**

یەکەم سەدەی سێیەمی زایینی گێرەوکێشە باڵی بە سەر هەرێمی فارسدا کێشا ئەوەش نیشانەی بەدیارکەوتنی بێ هێزی فارسەکان بوو لەو کاتیدا.

بۆیە لە سەر (اولخاشی چوارەم) پێویست بوو کە ئەم شۆڕشە ترسناکە دامرکێنێتەوە لە ناو فارسەکان لە ساڵی ١٩٦ز هەر یەکێ لەو وڵاتانەی کە کەمێک گرنگیان هەبوو نیمچە پادشایەکیان هەبوو یەکێک لە گرنگترین میرنشینەکان میرنشینی شاری (اصطخر) بوو کە پایتەختی میرە کۆنەکانی فارس بوو لەو کاتەدا (جوتجهر Gotchinr) یەکێک لە بنەماڵە بەرزنجیەکان بوو، ڕەنگە ئەوەش یەکێک بووبێت لە نەوەکانی جوتجهر لە سەدەی یەکەمی زایینیدا ژیابێت، ساسانەکان ئەو پیاوەیان دامەزراندبوو کە لە بنەماڵەیەکی خانەدان بووە هەروەکو تەبەری دەڵێت: خێزانەکەی ناوی (رام و فەهشت) (Ramya aicht) و لە بنەماڵەی بەرزنجیەکانی گەورەمان اناهید (اناهیتا) بووە لە شاری اصطخر.

(بابک) ی کوری سوودی لەو پلەو پایەیە وەرگرت کە پەیوەند بوو بە بنەماڵەی بەرزنجیەکانەوە و یەکێک لە کورە بچووکەکانی دامەزراند کە ئەردەشێر بوو لە پلەیەکی سەربازی گەورە لە شاری (داربجرد). لە سەرەتای ساڵی (٢١٢) یان لە دەوروبەری ئەو مێژووەدا ئەردەشێر بوو بە گەورەی

زۆرێک لە شارەکانی هەرێمەکەیان بە سەرکەوتن بە سەر فەرمانڕەواکانیان یان کوشتنیان، بەڵام پاپک تۆڵەی خۆی لە شا جوتچهر کردۆتەوە و پاشان لە کۆشکەکەی خۆیدا کوشتوویەتی و لە ناوی بردووە و جێگاکەی گرتۆتەوە.

ئەوەی دیار و روونیشە ئەردەشێر چاوی بڕیبووە وەدەستهێنانی تەختی حوکمڕانی وڵاتی فارس، لەوانەشە پابکی حورەمی بۆ لای پادشا ئەرتبانی پێنجەمی نووسیوە داوای ڕێپێدانی لێ دەکات بەوەی تاجی جوتچهر بخاتە سەر سەری کوڕە گەورەکەی خۆی کە ناوی سابور بووە، بۆ ئەوەی نەخشەو پلانەکانی ئەردەشێری کوڕە ئازا و زیرەک و ئاواتەخواز بخاتە بەر دەستی، شای گەورە بەوە وەڵامی داوەتەوە کە ئەو پابک و هەروا ئەردەشێری کوڕی بە شۆڕشگێڕ دادەنێت و دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم پابک کۆچی دوایی کرد سابوری کوڕی لە سەر تەختی وڵاتی فارس دانیشت و جەنگ لە نێوان خۆی و ئەردەشێری برایدا هەڵگیرسا بەڵام سابور کتوپڕ کۆچی دوایی کرد، هەرچی براکانی دیکەشی ئەردەشێر ئەوە تاجی پاشایەتییان پێ بەخشی ئەویش پەسندی کرد بەڵام دوای ئەوە هەموویانی کوشت لە ترسی ئەوەی ناپاکی لەگەڵدا بکەن.

مێژوونووسی یۆنانی سترابۆن دەڵێت: ئەردەشێر سەربازێکی زۆری کۆکردەوە و لایەنگرانی بیرو ڕای مادیەت و پاشاکانی وڵاتەکانی تری بۆ لای خۆی ڕاکێشا لەوانەش (سوهرات) پاشای حەدیاب و دومیتیانای پاشای کرخ سلوخ واتە کەرکووک، ئەرتەبانی چوارەمی فارسی ڕووبەڕوویان وەستا، بەڵام لە بەرامبەریاندا شکا ئەوەبوو ئەردەشێر خۆی وەک پادشایەک ڕاگەیاند و لە ئەنجومەنێکدا کە لە باختەرا واتە بەکتریا هاتە گرێدان ناوی شاهەنشای لە خۆ نا لە ساڵی ٢٢٤ز.

ئەردەشێر بە سەرکەوتووانە چووە ناو مەدائن و خۆی بە میراتگری فارسەکان دانا و بابلیشی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، پادشاکەی ئەو کاتە ولجاشی پێنجەم بوو کە ئەرتەبانی براکەی بەر لە چەند ساڵێک دووری خستبۆوە لە جڵەوی دەستەڵات ئەوەبوو دوای مردنی براکەی گەڕاندرایەوە سەر تەختی پادشایەتی، گێڕانەوە مێژووییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەردەشێر ئافرەتێکی لە فارسەکان خواست ئەویش کچی ئەرتەبان و کچە مامی خۆی یان کچی خوشکی فروخانی کوڕی ئەرتەبان بووە. لە ساڵانی دواییدا ئەردەشێر (میدیا) و هەمەدانی خستە ژێر دەستەڵاتی خۆی، پاشان گەمارۆی حەزەری دا کە نەیتوانی بە سەریدا زاڵ بێت. ناچار بوو هێرش بکاتە سەر ئازەربایجان و ئەرمینیا لەوێش تووشی ئاستەنگی زۆر هات، دەستەڵاتی خۆی درێژ کردەوە بە سەر هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات، موڵکەکەی خۆی کە ئێرانی ئێستایە فراوان کرد و ئەفغانسان و بلوجستان و هەرێمی (مرو) و (خیوە) و باکوری جیحون و بابل و عیراقیش لە ڕۆژئاوا هەمووی خستە سەر وڵاتەکەی.

ئیتر شاری اصطخر بووە شارێکی پیرۆز لە لای ساسانییەکان، پادشای گەورە جار جارە لە شاری فەیرۆز ئاباد دادەنیشت کە دەکەوێتە لای خواروی شاری ساسانیەکان درێژ کەرەوەی شاری فارسەکانە لە هەمان کاتیشدا نوێبوونەوەیەک بوو بۆی، هەرێمی فارس کە پایتەختەکەی اصطخر بوو بەکەڵک نیشتەجێبوونی پادشای پاشایان نەدەهات کە بووە وڵاتی میزۆپۆتامیا بوو ماوەیەکی کەم میزۆپۆتامیا بووە بنکەیەکی سەرەکی بۆ ئیمپراتۆریەتی ڕۆژهەڵات بە پێی پێداویستی گۆڕانکاری و مێژوویی ڕۆڵی سیاسی بابل گواستراوە بۆ (سلوقیە - طیسفون)

ساسانییەکان دابەشکردنە کۆنەکەی دەوڵەتیان هێشتەوە کە دەیکاتە چوار ویلایەت، لە سەدەی پێنجەمەوە فەرمانڕەوایی هەر ویلایەت پێی دەگوترا مەرزەبان لە چینی بنەماڵەی شەهرداران بوون، ئەم بنەماڵەیەش لە چینی دەوڵەتی ساسانی بوو نازناوی شایان هەڵدەگرت، ئەوەش بووە ڕێگا خۆشکەر بۆ ئەوەی نازناوی شای ئێران ببێتە پادشای پادشایان یان شاهەنشا ئەم چینەش ئەو میر و فەرمانڕەوایانە دەگرێتە خۆی کە سەر بە ئێران بوون و ئەوانەی کە شای ئێران ئەو فەرمانڕەوایەتیەی بۆ دابین کردبوون و لەگەڵ هاوشێوەکانی دوای ئەوان، هەروەها لەگەڵ پابەند بوون و هەڵسوکەوتی هێزە شەرکەرەکانیان، کە پاداشتێکی دیاریکراویان هەبوو،

**هەردوو براکانی شابوری یەکەم ئەردەشێر و فەیرۆز والی شارەکانی کرمان و کۆشان بوون بەهرەمی سێیەمیش فەرمانڕەوایی سیستان و** ئازناوی صغانشاه بوو بەر لە هاتنیان بۆ سەر تەختی پادشایەتی ئێران سابوری یەکەم و هرمزی یەکەم و بەهرامی یەکەم و دووەم فەرمانڕەوایی خوراسان و پادشای کۆشان بوونە. ئەردەشێری دووەمیش میری میرنشینی ئەدیابین (حەدیاب) بووە.

لە مێژووی هەولێردا هاتووە کەوا سابور لە سالی یەکەمی فەرمانڕەوایەتیەکەی دا شەڕی لە دژی خوارزمیەکان و پاشانیش میدییە چیاییەکانی لە (ئازەربایجان) کردووە لە شەڕێکی گەرمدا بە سەریاندا زاڵ بوون و لەوێشەوە ڕۆیشت بۆ بەدەستهێنانی هەردوو چیای دیالە و هەرقانین و دانیشتوانی جورجان کەوا لە چیاکانی تەنیشت دەریای قەزوین نیشتەجێ بوون.

ئەو هەرێمە چیاییەی کە لە سەرووی ڕۆژهەلاتی دەریای رەش و ئاوڕێژگەی ناوەندی دیجلە (لە نێوانیشیاندا هەولێر) کە سنوورێکی سروشتی نییە هەردوو دەوڵەتی گەورەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا لە یەکتر جیا بکاتەوە ئەگەر چی ئەرمینیا بەهێز بوو بە شێوەیەک کە بتوانێت سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ لە دەستدرێژی هەردوو دەوڵەتدا بتوانێت لەو نێوەندەدا خۆی بۆ رابگرێ، بەلام زۆر بێ هێز بوو ئەو پادشایانەی کە فەرمانڕەوایەتیان دەکرد دوور بە دوور دەگەیشتنەوە **سەر فارسەکان، بەلام بارودۆخیان جێگیر نەبوو. بەلام بالا دەستان و دەوڵەمەندەکان هەردەم ئامادەبوون بۆ جێبەجێ کردنی فەرمان لەو کاتەی** دەستەلاتی رۆمان زاڵ بوون بە سەر دەستەلاتی ئێرانی.

ئەردەشێر دەستی بە سەر ئەو ناوچانەدا گرت کە لە ژێر دەستی کۆرسی ئەخمینی دابوو تووشی شەڕێک بوو لەگەڵ رۆمانەکان لە سەردەمی پادشاکەیان کە ناوی (سویرس) بوو بە سەریاندا سەرکەوت و دەستی بە سەر شارەکانی (کرخ سلوخ) کەرکووک و حەدیاب هەموو ناوچەکانی نێوان میزۆپۆتامیادا گرت. بەلام حەزەری شانشینی عەرەبی بچووک لە بیابانی باشووری نەینەوا زۆر بە توندی بەرهەڵستی کرد و نەکەوتە ژێر دەستیان تەنها لەرۆژانی سابوری یەکەمدا نەبێت. کە لە دواییدا وڵاتەکەیان هەڵگەڕانەوە ئەو کاتە (غوردیانی) پاشای رۆمانی توانی کوڕی ئەردەشێری شابوری یەکەم گەمارۆ بدا و سالی (٢٤١-٢٧٢ز) هەموو ناوچەکانی میزۆپۆتامیا داگیر بکات.

فلیبسی پادشای رۆمانی ئەو ناوچانەی گەڕاندەوە بۆ سابوری یەکەم و ئاگربەست و هاوپەیمانی ئاشتییان بەست لە سالی (٢٤٤ز) لە دەقەکەشدا هاتووە دەبێت فلیبسی ئەرمینیا بۆ ئێرانییەکان جێبهێڵێ.

بەلام ڤالریان پادشای رۆمانی هێرشی کردەوە سەر میزۆپۆتامیا و سابور لە سالی (٢٦٠ز) بە سەریدا زاڵ بوو ئەو پادشا رۆمانییەی بە دیل **گرت کە بە خۆی سەرپەرشتی هێرشەکانی دەکرد لە دژی ئێرانییەکان، سەرکەوتنی سابور بە سەر ڤالیریاندا بە زیندوویی مایەوە** لە زۆر شوێنەوار و نیگاری گەورەدا، لە نیگارەکانیشدا دەردەکەوێت کە سابور بە شکۆوە بە سەر سەری ئیمپراتۆری رووخاودا راوەستاوەو ئەویش لە بەردەمیدا بە چۆکدا هاتووە. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بەهرامی دووەم (٢٧٦- ٢٩٣ز) فەرمانڕەوایی حەدیاب کە ناوی (کویراشنسب) بوو شۆڕشی هەڵکرد و لە گوێڕایەڵی پادشا دەرچوو قەلایەکی بۆ خۆی دروست کرد لە چیاو نزیکەی (٥٦٠) پیاو بە گەڵی کەوتن و دەستیان کرد بە رێگری تالانکردنی کاروانچیان و وێرانکردنی دێهاتێکی زۆر، بەهرام سەربازی خۆی بۆ ناردن بۆ لە ناوبردنیان بەلام بێ هیوا گەڕایەوە لە دواییدا پادشا هەندێک سەربازی بە سەرکردایەتی زرهەسپ بۆ رەوانە کرد و ئەو سەرکردە ئەو فەرمانڕەوایەی گرت بەرەو مەدائینی برد و پێستیشی داماڵی و کەوڵی کرد.

فەرمانڕەوایی بەهرامی دووەم کۆتایی هات لە سەر دەستی نرسی کوڕی سابوری یەکەمی مامی لەگەڵ رۆمانەکاندا چووە ناو شەڕەکە و سەرکەوتوو نەبوو، پادشای ئەرمینیا یەزداتی دەرکرد بە تەختی پادشایی قەرزداری ئیمپراتۆر بوو، بەلام گالیریوس سەرکردایەتی سوپای رۆمانیای کردو بۆیە نرسی ناچار بوو کە دەست لە پارچە بچووکەکانی

**ئەرمینیا هەڵگرێ.. ئینجا بارودۆخەکە ئارام بۆوە و ئاشتی بەردەوام بوو لە نێوان ئێران و ڕۆما و نزیکەی چل ساڵی خایاند، پاشان** هرمزدی دووەمی کوڕی نرسی (۳۰۲- ۳۰۹ز) کە بە دادوەری بەناوبانگ بوو هات دوای ئەو (ازر- نرسی) یەکێک لە کوڕەکانی هرمزدی دووەم کە لە ژنی یەکەمی بووە هات و بەڵام لە بەر ئەوەی خۆشەویست نەبوو لەلای دەستەڵاتداران لە بەر ئەوە دوای چەند مانگێک لابرا، یەکێک لە براکانی دەستەڵاتی گرتە دەست، یەکێکیشیان کە ناوی هرمزد بوو خرایە زیندان و بەڵام هەڵات و پەنای بردە بەر ڕۆما.

دەستەڵاتداران یەکێکی تر لە کوڕەکانی هرمزدی دووەم کە لە ژنێکی تری بوو بە پادشا دای نەمەزراند کە میر سابور ئەو کاتە منداڵ بوو.

سابوری دووەم (۳۰۹- ۳۷۹ز) حەفتا ساڵ بە دوای یەکدا فەرمانڕەوایی کرد و شەڕێکی تۆڵە ئەستێنی لە دژی ڕۆمەکان کرد کە نازناوی (خاوەن شان) بوو لە بەر ئەوەی گێڕانەوەکان وا باسی دەکەن لە شەڕە توندەکانی لەگەڵ عەرەبدا شانی دیلەکانی هەڵدەکۆڵی و دوای ئەوەی سابور دەستەڵاتی بە دەستەوە گرت کەوتە شەڕی ڕۆمەکان و ڕووداوی گرنگ لە ناو دەستەڵاتی ڕۆمانییەکاندا ڕوویدا، وەک جۆین کۆسترتینی گەورە بۆ ناو ئایینی مەسیحی، لە ئەنجامی هاتنی ئایینی بۆ ئەرمینیا پەیوەندییەکانی نێوان **ئەرمینیا و ڕۆما پتەو بوو، بەڵام ئەوەبوو ئیمپراتۆر جولیان لە مەسیحیەت هەڵگەڕایەوە و کەوتە دژایەتیکردنیان، بەڵام درێژەی** نەکێشا، ئەرمینیا هەموو کاتێک لە نێوان خانەدانەکاندا تووشی پارچە پارچە کردن دەهات ئەمەش وای دەکرد کە ڕۆمانەکان و ئێرانییەکان دەست لە کاروباریان وەربدەن. ئەو وڵاتە بەردەوام جێگای ململانێ و شەڕی نێوان ئێران و ڕۆمان بوو، شاپور لە جەزیرەدا ڕووبەڕووی ڕۆمانەکان بووەوە دوای چوونە ناو ئەرمینیا کە دەیویست بەو جەنگە هەرێمە لە دەست چووەکانی سەردەمی نرسی بگەڕێنێتەوە.

نسێبینیەکانیش خۆیان لە بەرامبەر هێرشی فارسەکان ڕاگرت و لە شەڕی شەنگال دا سەرکەوتن.

پادشای ڕۆمانی (قسطنطین) ی گەورە لە کاتێکدا مرد کە ڕووبەڕووی شابور دەبۆوە لە ساڵی (۳۳۷ز)، دوای ئەویش قوستەنتینی دووەم شەڕەکەی بەڕێوەبرد، بەڵام سەرکەوتنی ڕۆمانەکان لە شەنگال زۆر دوڕانی بە دواداهات دوای ئەوەش شەڕەکە لە سنووری ڕۆما و چەند ساڵی خایاند و سابوری دووەم دەستی کرد بە چەوسانەوەی مەسیحیەکان و لایەنگرەکانیان. هەر لە ساڵی (۳۳۹- ۳۷۹ز) کاری چەوساندنەوەی مەسیحیەکان دەستی پێکرد و کە ٤٠ ساڵی خایاند و ئەوەش ساڵی مردنی بوو، پیاوانی ئایینی ئاگر پەرست هەستان بە چەوساندنەوەیەکی بەرفراوان لە **وڵاتدا کە دەستەڵاتی ئاینیان بە دەستەوە بوو (موبز) کە فتوادەری ڕۆحی لایەنە ئاینیەکان بوو کە دەستەی دادوەری لێکۆڵینەوەی** ناوچەکان بوو هەروەها بەشداری دەکرد لە دژی دوژمنانی ئایینی ئاگرپەرستەکان، موبز سەرۆکی بوونەوەری ئاگرپەرستەکان و ڕاوێژکاری پاشای فارس بوو لە هەموو کاروبارەکانی کەوا پەیوەندی بە ئایینەوە بوو، پیاوانی ئایینی ئاگرپەرست مافی دادوەریان هەبوو کە دەوڵەت ڕێگەی پێدابوون. لە ساڵی (۳٤۳) چەوسانەوە لە ویلایەتەکانی (کرمای) کەرکووک و حەدیاب دەستی پێکرد. شابور لەوێ دژایەتی ڕۆم و ئەردەشێری براکەشی پادشای حەدیاب بوو سەرپەرشتیاری سەربازەکان بوو لە ناوچەکەدا، لەم دوو ویلایەتەشدا مەسیحیەکی یەکجار زۆر کوژرا لە کۆی ئەم کوژراوانەش (کوشنازاد) ی لەگەڵدا بوو، لەساڵانی دوایی ۳٤٤ ز (مایوحنا) قەشەی هەولێر کوژرا کە یەکێک بوو لە بوونەوەرەکان لە سەر دەستی (پیرۆز طمشابور) کە پیاوێکی ئایینی مەسیحی بوو، لە سەردەمی موبز (اذورثره) کە جێنشینی (پیرۆز گمشابور) بوو ۳٤٥ز کە قەشە ئەبراهامی کوشت کە قەشەی هەولێر بوو، هەر لە ساڵی دواییشدا (مارخنیا) کوژرا کە پیاوێکی عەلمانی بوو لە شاری هەولێر لە سەر دەستی (اذوریشا) زۆر ناومان لە بەردەستدایە کە پیاوانی ئایینی ئاگر پەرست کەوا

سەرکردایەتی چەوساندنەوەی کردووە لە حەدیاب، لەوانیش نرسا طمشابور ساڵی (٣٤٧ز)، شابور طمشابور ساڵی (٣٥٥ز) کورکیشدا ساڵی (٣٥٥- ٣٧٨ز)، زەردەشت ٣٧٨ز لە ساڵی (٣٥٦ز) پرۆژەی ئاشتبوونەوە لە نێوان فارس و رۆمادا سەرکەوتوو نەبوو لە سنووری ئەو ماوەیەدا (٣٥٩ز) قەرداغ دانرا بە فەرمانڕەوایی حەدیاب کە دەستەڵاتی درێژ دەبۆوە لە رووباری دیالەوە تاکو شاری نسێبین، پەرستگا ئاتەش گردەکانی تێکدا لە جێگای ئەوان کلێسای دامەزراند، ئەوە بە شاپور ڕاگەیەنرا، قەرەداغ خۆی لە قەڵای (ملقا) Milqa کە نزیکی هەولێر قایم کرد و کردی بە بارەگای خۆی شاب نووسراوێکی نارد بۆ (اکوشنازداد) و (دینکوشناسپ) کە هەردووکیان فەرمانڕەوا بوون لەو وڵاتەی کە قەرداغ تیادا باڵادەست بوو بۆ ئەوەی بیهێننەوە سەر ئایینی ئاگر پەرستەکان، قەرداغ یاخی بوو لە قەڵاکەی (بورز مهیر) ی سەرکردەش دەورەی ئەم قەڵایەی داوە بێ هوودە، لە دواییدا قەرداغ هاتە دەرەوە و خۆی دا دەست و لە ساڵی (٣٥٩ز) بەردبارانیان کرد و کوشتیان.

لەوکاتیدا جارێکی تر شەڕ لە نێوان ئێران و رۆمانەکان هەڵگیرسایەوە. سابور دەستی دایە هێرشکردن بۆ سەر قەڵاتی ئامەد دیار بەکری نوێ و دوای پارێزگاریەکی زۆر لە ساڵی (٣٥٩ز) داگیری کرد. دوای دوو ساڵیش پاشای رۆمانی مرد و قوستەنتینۆس فسار جولیان بوو بە ئیمپراتۆری رۆمان و هەر خۆی سەرکردایەتی سوپای رۆمانی و شەڕی ئێرانیەکانی دەکرد.

ساڵی (٣٦٣ز) لە شەڕێکدا جولیان کوژراو سوپاکەی وەستا، دوای ئەویش جوفیان هات سوپاکەی رۆمانی بۆ دواوەی سنوور کێشایەوە، بەو کارەش ئێرانیەکانی ڕاکێشا بۆ ئەو ئاشتەواییەی کە بە پەلە هاتە دی و بۆ ماوەی ٣٠ ساڵ نسێبین و شەنگال و بەشەکانی ئەرمینیایان کەوتە ژێر دەست.

ساڵی (٣٨٨- ٣٩٩ز) لە سەرەتای ساڵەکانی فەرمانڕەوایی بەهرامی چوارەم ئێران و رۆما دابەش بوو، پادشای ئەرمینیا چووە ناو بەشی رۆژهەڵات و لە ژێر چاودێری ئێراندا بوو، بەشی رۆژئاواشی لە ژێر دەستی رۆمانەکاندا بوو. لە سەردەمی هرمزدی چوارەم لە ساڵی (٥٨١ز) شەڕ لە نوێ دەستی پێکردەوە بەڵام سەرکردە ئێرانیەکان تیایدا سەرکەوتوو نەبوون، بەهرام جوبین ئاڵای شۆڕشی لە دژی هرمزدی چوارەم بەرزکردەوە و هرمزدی چوارەم کوژراو کوڕی دووەمی کیسرا هاتە شوێنی کە نازناوی پەروێزی سەرکەوتوو بوو بەڵام دانی بە بەهرامدا نەنا، لە کاتی ململانێیاندا بەهرام سەرکەوت کە لە ژێر ناوی بەهرامی شەشەم کرا بە پادشا، کیسرا هەڵات پەنای بردە بەر ئیمپراتۆری رۆمانی (موریق) کە ئیمپراتۆر یارمەتیەکی جەنگی بۆ رەوانەکرد بەو مەرجەی کیسرا دەست لە سەر هەردوو شاری (دارا و میافارقین) هەڵبگرێت کە رۆمانەکان لە شەڕدا دەستیان بە سەردا گرتبوو.

ساڵی ٥٨٩ز سوپای رۆمانەکان لە هەولێرەوە چوو بۆ رەواندز و یارمەتیدانی کیسرا، بەڵام کیسرا لەگەڵ ئەم سوپایەدا پاشەکشەی کرد و بەرەو هەمەدان رۆیشت سوپای رۆمانەکانیش لە ژێر سەرکردایەتی نرسس دابوون، لە کۆتاییدا هێزەکەی بەهرام شکا و هەڵات بەرەو ئازەربایجان و کوژرا. بەم شێوەیەش کیسراش بۆ سەر تەختی پاشایەتی خۆی گەڕایەوە. بە مردنی موریقی ئیمپراتۆر شەڕ لە نێوان ئێران و (بیزنتە) نوێ بووەوە، سەرکردەکانی فارس هێرشیان برد بۆ سەر بەشەکانی ئاسیای بچووک و رەها و ئەنطاکیەو دیمەشق و قودس و ئەسکەندەریە و چەند شوێنێکی تریان لە میسر داگیر کرد.

لەوکاتیدا واتە ساڵی (٦١٥ز) هێزەکانی کیسرا لە ترۆپکەدابوو بەڵام هەرقەل دواجار لەشکرکێشی ئێرانی ڕاگرت و ئاسایی بچووکی گەڕاندەوەو هەولێر و نەینەواو کەرکووک و دەوروبەری داگیر کرد.

ساڵی ٦٢٥ز/٤٤ک دەستەڵاتی رۆمانی لەو شوێنانەدا زۆر بەهێز بوو، بەڵام فارسەکان بەم داگیرکردنە رازی نەبوون و ساڵی ٦٢٨ز ناوچەکە تووشی چەند شەڕێکی گەورە و وێرانکەر هات. هەرقەل دەستی بە سەر بارەگای (دست گرد) ی پادشای فارسدا گرت و ئامادەبوو بۆ گەمارۆدانی مەدائن.

دوای سی و حەوت ساڵ کیسرای دووەم بەو چارەنووسە گەیشت کە

باوکی کاتی خۆی هەولی بۆ دا، دوای ئەوەش لە (دست گرد) هەلات و گەڕاوە بۆ بارەگاکەی خۆی لە مەدائن. ئەو ئاشتیەی ڕەت کردەوە کە هەرقەل نیشانی دا.

ئینجا کیسرا نەخۆش دەکەویت و (شیرویە) ی کوڕی دەبیتە پادشا و هەرقەل دانوستانی لەگەڵدا دەکات ئامادەیی خۆی بۆ ئاشتی لەگەڵ فارسەکان نیشاندا، دوای ئەوەی کیسرا لە بەندیخانە دەکرێت و پێنج ڕۆژ بە برسێتی دەمێنێتەوە ئینجا بە تیر دەیکوژن. قەبازی دووەم (شیرویە) دوای شەش مانگ فەرمانڕەوایی ژاراوی دەکرێت و دەمرێت و سێیەمین کوڕی (ئەردەشێری سێیەم) کە ئەو منداڵ دەبێت و لە شوێنی دادەنرێت هەرقەلی پادشای ڕۆم لەگەڵ سەرکردەی بالاّدا ڕێکەوتن هێرش بکەنە سەر مەدائن و پادشای بچووک دەکوژن کە تەنها ساڵ و نیوێک فەرمانڕەوایی کرد.

پاشان سەرۆکەکە خۆی کردە پادشا لە سەر فارسەکان پاش کوژرانی کیسرای سێیەم مویایەعەت کرا، کوڕی میر قمباز برای کیسرای دووەم بووە پاشا لە بەشی ڕۆهەلات لە شاری مەدائینیش تاجیان خستە سەر بورانی کچی کیسرای پەرویز، شارەزوور لە ژێر فەرمانڕەوایی ڕۆمانەکاندا مایەوە، لە بەر ئەوەی کە هەرقەل ڕاوی پەرویز دەکا لە ڕێگای ئەم هەرێمەوە مانگی شوباتی لە شارەزوور بەڕێ کرد. لەو کاتیشدا موسڵمانەکان هێدی هێدی بەرەو پێش دەچوون بۆ ڕزگارکردنی عیراق و دوای ئەوەی سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوەیان لە کۆتایی ١٦ک بە دەست هێنا و ئینجا مەدائینیان ڕزگار کردو یەزدگردی پاشای سێیەم هەلات و بۆ ئێران ڕۆیشت. پادشای فارسەکان لە هەولێکی کۆتاییدا هەستا بە کۆکردنەوەی سوپایەک کە لە هەموو بەشەکانی شانشین پێکهاتبوو لە سەرۆکێکی پیر کە ناوی پیروزان بوو کرد سەرۆکی سوپاکەی لە (٦٤٢ز) /٥٢٢ک لە نەهاوەند لەگەڵ موسڵمانەکان لە شەڕێکی توند و تیژدا فارسەکان تێک دەشکێن، هیچ سوپایەکی پادشا نەمایەوە بۆ پارێزگاری کردن لە هەرێمەکانی مەرزەبان و والییەکانی ناوەخۆ.

پاشان هەمەدان و ڕەی و ئازەربایجان و ئەرمینیا لەلایەن موسڵمانەکانەوە ڕزگار کران، یەزدگرد گەڕایەوە بۆ ئەسفەهان و کاتێک عەرەبەکانیش چوونە ناو ئەو شارە پادشاکەیان هەلات و تەنها پادشایەکی بێ نازناو نەبێت ئەویشیان لە نزیک (مرو) کوژرا، هەروەها دەڵێن لە کاتی چوونی ئەو پادشایە بۆ مرو چوار هەزار کەسی فارسیان لەگەڵدا بووە و هیچ شەڕکەرێکیان لەگەڵدا نەبووە، ئەوانی تریش بریتی بووینە لە خزمەتکار و چێشت لێنەر و ژن و منداڵ و پیر لەگەڵ خێزانی پادشاکە، بۆیە پادشاکە هیچ شتێکی بۆ نەمایەوە کە بتوانێ ئەو خەزانە زۆرەی پێ بژێنێ و سیستەمی جبایەی باج سەندنیش سیستەمێکی نارێکی پێوە دیار بوو، ئاشەوانەکە کوشتی کە پێشتر پاشا هانای بردۆتە بەر ئاشەکەی.

**ئایینی فارسی:**

هەروەکو لە نووسینەکانی داریۆشدا هاتووە کە لە بهستۆن و سوسە و نیگارەکانی ڕۆستەمدا کێشراون بەلای ئەخمینیەکانەوە ئەهورومەزدا گەورەترین خوایە و هەر ئەو ئاسمان و زەوی و مرۆڤی دروست کردووە و خۆشی پێ بەخشیوە بۆ ئەوەی بە شادی لە سەر زەویدا بژیت، هەر ئەویش ئەو پلە و پایەی بە داریوش بەخشیوە کە ببێت بە پادشایەکی گەورە و شانشینێکی بەرفراوان. لە تەک ئەهورەمەزدا فارسەکان چەند خودایەکی تریشیان پەرستووە هەروەکو خودای ڕۆژ **Mira** خودای ئاو **Mah** خودای مانگ - خودای زام **Zam** -خودای ئاتار **Atar** - خودای ئاگر. فارسەکان خوداوەندەکانیان دەپەرست لە ڕێگەی پێشکەش کردنی قوربانی و نوێژ و دوعایان بۆ دەکرد کە بوونەوەرەکان هەڵدەستان کە پێیان دەگوترا ئاگرپەرست ئەویش لە وشەی **Magi** یان ماجیکەوە **Magic** واتە جادوو. لەوە دەچێت ئەو مەراسیمە ئایینییەی کە ئاگرپەرستەکان ئەنجامیانداوە لە بنەڕەتدا بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەخمینییەکان، ئەم مەراسیمە ئاینییەش لە سەردەمی ئەخمینییەکاندا ئەرکێک بوو لە سەرشانی ئاگر پەرستەکان. بۆیە لە کاتی ئەنجامدانی ئەو مەراسیمە سویا هاوڕێیەتی ئاگر پەرستەکانی کردووە.

**هەروەها چەند ئەرکێکی تریش لە سەر شانی ئاگر پەرستەکان بوو هەروەکوو لێکدانەوەی خەون و بەشداریکردنیان لە ئاهەنگی تاج لە** سەر نانی پادشا نوێیەکان. هێرۆدۆت دەڵێت:

فارسەکان هیچ پەرستگا و پەیکەری خودایان نەبووە ئەوەی هەشبووە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی وڵاتی یۆنانییەکان. فارسەکان تەنها سێ پەرستگایان هەبووە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەخمینی یەکەم، ئەوانیش یەکێکیان لە شاری (بزارکەدە) و دووەمیشیان نیگارەکانی رۆستەمە کە لە بەردەم گۆڕی داریوش پاشا، سێیەمیش لە سوسە بووە، ئەم سێ پەرستگایەش بریتییە لە تاوەرێکی شەش پاڵوو کە بریتی بوو لە ژوورێک و لەوێوە بە پلیکانەیەک بەسترابۆوە کە ئاگر پەرست لە سەری دەوەستا و پاریزگاری لە ئاگرەکە دەکرد بۆ ئەوەی بە داگیرساوی بمێنێتەوە، کەچی ئاهەنگی ئاینییەکانیان لەچۆڵەوانی ئەنجامداوە.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەخمینییەکاندا ئایینی زەردەشتی پەیدا بووە کە زەردەشت هێناویەتی و لە هەموو وڵاتی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینیەکاندا بڵاوی کردۆتەوە، بەڵام ئەو کاتە دیار نییە کە زەردەشت تیایدا دەرکەوتووە.

بەڵام لەوە دەچێت کورێک بێت لە میدیەکان و ناچار کرابێت وڵاتی خۆی جێ بهێڵێت و رووی کردبێتە رۆژهەڵاتی ئێران و لەوێدا ئەم ئاینە **نوێیەی بڵاو کردۆتەوە و خەڵکێکی زۆر باوەڕیان پێ هێناوە و لەوانیش میر (هیستاسپیس) بووە کە داریوش بوویێت.**

ئایینی زەردەشتی پێی وابووە کە هەموو جیهان دوو هێزی سەرەکی فەرمانڕەوایی دەکات، ئەوانیش خێر و شەڕن، هێزی خێر خۆی لە ئەهورومەزدا دەبینێتەوە هێزی شەڕیش لە (ئەهرمان).

هەر پشت بەستن بەم بیر و رایە مرۆڤی بەهێز داوای چاکە دەکات و مرۆڤی شەڕاویش کە لە بنەڕەتدا شەڕاوی دروست بووە، هەر بۆیە مرۆڤی چاکەخواز باوەڕی بە خودای ئەهورومەزدا هەیە، مرۆڤی شەڕاویش باوەڕی بە خوای شەڕ واتە: (ئەهرمان). هەر بڕوای زەردەشتیەکان مرۆڤی چاکەخواز دەچێتە بەهەشت و مرۆڤی شەڕاویش لە دواییدا سزا دەدرێت و ئەم سزایەش کۆتایی نایە.

خودا پەرستی و نوێژەکان لەلای ئەوان بە پێی رێنماییەکانی نەگۆڕ و دەستوورەکان دەکرا و نەدەبوو بگۆڕدرێن، ئایینی زەردەشتی قوربانی و کوشتنەوەی مالاتی چوار پێی حەرام کردووە بۆ قوربانی. لە بەر ئەوە بە پێی بیر و باوەڕی زەردەشتیەکان رێگە پێدراو نەبوو

لە بەر ئەوەی مرۆڤ بۆ ژیانی رۆژانەی سوودی لێ وەردەگرتن و بۆیە پێیان وابوو نابێ بکوژرێتەوە، لە ئایینی زەردەشتیەکان ناشتنی مردی و مۆمیاکردنی و سووتاندنی حەرام بووە، لە بەر ئەوەی دەبێتە هۆی پیس بوونی هەرسێ توخمی بنەڕەتی **پێویستیەکانی وەک (خۆڵ، ئاگر، ئاو) بۆیە فەرمانی کردووە بە خستنە رووی لاشەی مردووەکان لە سەر چیا یان لە سەر تاوەرە بەرزەکان تا هەر** بەخۆی لە شوێنی خۆی بتوێتەوە و باڵندە گۆشت خۆرەکان بیخۆن، لە دواییشدا ئێسکەکانی کۆ دەکرێتەوە لە ناو گۆڕێکدا دەنێژرێت کە بۆ ئەم مەبەستە ئامادە کراوە یان قوڕتێک کە لە ناو بەردا هەڵدەکۆڵدرا، ئایینی زەردەشتی زۆر بەردەوام نەبوو لە بەر ئەوەی ئایینی چینە بەرزەکان بووە. بۆ خودای خێر واتە ئەهورمەزدا هێمای ئاگریان داناوە و بۆ (ئەهرمان) خودای شەڕ تاریکی هەر بۆیە فارسەکان لە ناو پەرستگاکانیان بە شێوەیەکی بەردەوام ئاگر دادەگیرسێنن، ئەم دابونەریتانەش لە کتێبی زەردەشت (ئاڤێستا) دا بۆمان گوازراوەتەوە و ئەم کتێبەش لە رووی ئاینییەوە بە کتێبێکی پیرۆز دادەنرێت، ئەوەی جێگای بیرهێنانەوەیە هەموو ساڵێک لە هەولێر لە مانگی ئایاردا ئاهەنگی ئاگر دەگیردرێت. رێنماییەکانی زەردەشتی نەدەبوو تیشکی رۆژ بگاتە ئەم ئاگرە پیرۆزە. بۆیە بەشێوەیەکی نوێ ئاگردانیان لە نێو ژوورێکی زۆر زۆر تاریک دروست دەکرد.

لە کاتی ساسانیەکاندا ئەم ئاگرە هێمای یەکێتی ئایینی و پاشایەتی هێز بووە بەهۆی هاوپەیمانیەتی پیاوانی ئاینییەوە. رۆژەکانی جەژن لای ساسانیەکان جەژنی (آزر جشن الاول) جەژنی ئاگر بووە کە هەموو ساڵێک لە مانگی ئابار ئەم جەژنە

یاد دەکەنەوە ئەم ڕۆژەش جەژنی ئاگرە لە هەموو مانگێکدا کراوەتەوە کە لە چوار دەوری خواردن دادەنیشن و ئاهەنگ دەگێڕن. دیارە ئەم ڕۆژەش لە هەموو شوێنێکدا جەژن نییە تەنیا لە هەندێک ویلایەتەکانی ئێراندا نەبێت.

نەوروز جەژنێکی گەورەی جەماوەرییە کە سەری ساڵە و جەژنی بەهارە، دیارە لە ڕۆژی نەوروز باجی خۆشەویستی پێشکەش بە پاشا کراوە هەر لەم ڕۆژەشدا پادشاکان دەگۆڕدرێن و پارەی نوێ لێ دەدرێت یان دروست دەکرێت.

ئەم جەژنە شەش ڕۆژ دەخایەنێ و لەم ڕۆژانە پادشای ساسانیەکان دادەنیشن و پێشوازی لەگەورە پیاوان دەکەن، لە ڕۆژی شەشەمیشدا پادشا خۆی ئاهەنگێک لە سەر تایبەتمەندییەکانی جەژن دەگێڕێ. ڕۆژی یەکەم و شەشەمی نەوروز ئاهەنگ دەگێڕدرێ کە هەموو دیمەن و ڕواڵەتەکانی جەماوەری دەگرێتەخۆ.

بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت:

ئەوەی دەیزانین دەربارەی دەستپێکردنی ئایینی مەسیحی وڵاتی (الشرث) زۆر زۆر کەمە. لە سەدەی یەکەمی زایینی ئایینی مەسیحی لە ڕێگای شام و ئاسیای بچووکەوە بڵاوبۆوە. کە نزیکەی ساڵی ١٠٠ی زایینی بوو لەوێشدا چەندین کۆمەڵی مەسیحی لە پشت دیجلەوە لە هەولێر هەبوون، بەڵام هیچ زانیارییەکی ڕاستیمان لە بەردەستدا نییە کە تایبەت بێت بە مژدەکانی ئەو ئایینە لە ڕۆژهەڵات.

وا پێدەچێت (کرخا) (بیت سلوخ) واتە کەرکووک لە دوای هەولێرەوە یەکەم بارەگای سەرهەڵدانی مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵاتی هەولێر بووبێت، لە ڕۆژانی فەرمانڕەوایی فارسەکان گاورەکان هیچ ڕۆڵێکیان نەبینیوە، لە سەردەمی ساسانیەکاندا مەسیحیەت گەشەی سەندووە لەگەڵ ئەوەی هەندێک لە پاشاکانیان شەڕی ئەو ئایینەیان کردووە و ڕۆڵێکی بڵاو و گرنگیان لە سیاسەتی دەوڵەتدا هەبووە، کۆمەڵێک نووسەری گاوریش لە هەولێردا ژیاون ئەوەش مێژووی یەکێکیانە بە ناوی (میسخازخا) ناسراوە کە دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی هەولێر و ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی زایینی کە تاوتوێی ئایینی لە ویلایەتی هەولێردا کردووە، ئەمەش سەرەتای سەدەی دووەمە هەتاکو دەوروبەری ساڵی ٥٥٠ ز هەروەکو گومانیش دەکرێ لەو سەرچاوەیەکی کە پاپا (پول پیترس) دەڵێ. بە فیدای دانەری ئەو کتێبە واتە مەتران بەقیدا دەڵێ بووە مترۆپۆلیت لە هەولێر ساڵی ٩٦- ١١٤ز ئەو دانەرە باسی ناوی هەموو ئەو قەشانە و هاتنە سەر تەختی مەترانیەت دەکا کە ئەدا (مارادی) یەکێک بووە لە قوتابیەکانی سەید مەسیح کە موژدەی ئینجیل لە حەدیاب و دەوروبەری بڵاوکردۆتەوە، ئەوەی شایانی باسە ماری کە ئەدی قوتابی لە سلوقیەوە کە مەڵبەندی سەرەکی گاورەکان بووە لە عیراق ڕەوان کردووە بۆ ئەدیسا و ڕەها و ئورفە کە مەڵبەندێکی گرنگی دووەم بووە، لەوێشدا تووشی تەنگ و چەڵەمەی زۆر بووە و بۆیە بۆ ئەو کەسەی نووسیوەتەوە کە ڕەوانەی کردووە پێی دەڵێ لێرەدا دانیشتوان خۆیان لە (عبده الاوثان) ن سوودی نییە لەگەڵیان دێمەوە و دەچم بۆ شوێنێکی تر. فەرمانی کرد بە کێلان و کشتوکاڵ کردن لەو گردانە تا بەرهەمی ببێ لە ڕاهی خودا.

هەتا توانی هەولیدا بۆ ئەوەی فراوانتری بکات تا دەگاتە حەدیاب، لە ئەنجامیشدا کۆششەکەی بە سەرکەوتوویی کۆتایی هات، زۆر کەس سەرکەوتن بە یارمەتی ئەو سەرکەوتن بە تایبەتی لە شاری هەولێر پایتەختی حەدیاب، هەروەها ئەدیسا منەتێکی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ئینجیل لە وڵاتی فارس و دەوروبەری، زۆربەی دانیشتوانی حەدیاب بوونە گاور و خەڵکێکی زۆریش بە ڕەچەڵەک دەهاتنە سەر فارسەکان سەرەڕای ئارامییەکانیش. لە سێ سەدەی یەکەمدا گاورەکان کلێسایەکی زۆریان لە حەدیاب و کرخ سلوخ و فورات و میسان کە لە نزیک شاری بەسرەی ئێستایە بنیاتنا و زۆر جێگای تریش، هەروەها قوتابخانەشیان لە تەکدا دامەزراندوون.، هەروەکو دەزانین یەکێک لە سەرۆکەکانی مەسیحیەت لە ناوەڕاستی سەدەی سێیەم (٢٥٣ز) لە شاری هەولێر قەشە (شحلوفا) بووە کە بە ڕەچەڵەک لە نەوەی (ارمایی) بووە کە وانەی گوتۆتەوە و زۆر قوتابخانەی لە دەوروبەری وڵات دامەزراندووە، بەڵام هیچ لە

دانراوەکانیمان بە دەست نەگەیشتووە. هەروەکو باس کراوە لە ساڵی (٣٠٠ز) هەولێر بەرزکراوەتەوە بۆ بنکەی مەترانی (الجاپلیق - فافا) فوسلیش قەشەیەکی سەر بەوی بووە. بە سەرکەوتنی قسطنطین پاشای رۆمانی چەوسانەوەی مەسیحیەت لە وڵات کۆتایی پێ هات وەبە فەرمی مەسیحیەتی کردە ئایینی دەوڵەت لە سەردەمی شاپوری دووەم (٣٠٩-٣٧٩ز) کاتێک کە دوژمنکاری لە نێوان ئەم دوو دەوڵەتە ئاشکرا بوو ساسانییەکان مەسیحییەکانیان لە وڵاتی فارس بە گشتی بە لایەنگر و سیخوڕی رۆمانییەکان دانا، کەواتە مەبەست لەوەدا چەوساندنەوەی سیاسی بوو، لە پلەی یەکەم، ئینجا هۆکاری ئایینی. کۆمەڵێک پێشێلکاری بە سەرکردایەتی ئەردەشێر فەرمانڕەوای حەدیاب ئەنجامدراون کە زۆرترین شەهیدی گرتۆتە خۆ و نۆ رەبەن و سەت و پانزە مالی بە یەکجار تێدا کوژراوە و هەموویان بەجارێک خراونەتە ناو بیرێکی تاریک، تا ئافرەتێکی هەولێری بە ناوی یەزدان دوخت هەوڵی دابوو لە شەودا ئەوانە دەربێنێ تاکو لەگەڵ رۆژهەڵات بیانشارێتەوە بەلام بێ هوودە بووە. ساڵی (٣٧٩-٣٨٣ز) ئەردەشێری دووەم جێنشینی شاپور لای گەورەکان خۆشەویست نەبوو، بەر لەوەی ببێتە فەرمانڕەوا هەروەکو ئاماژەمان بە کردەوەکانی دا لە رۆژانی شاپوری دووەم و بەر لەوەی ئەردەشێر ببێتە فەرمانڕەوا قەشە (عبد يشوع) ی تاوانبار کرد بە وەی کە کوڕی برای ئەو قەشەیە نامە بۆ ئیمپراتۆری رۆمانی دەنێرێ و نهێنییەکانی پادشا ئاشکرا دەکات.

ئەردەشێر خۆی سەرپەرشتی دادگاییکردنەکەی کردووە و (الموبدان موبذ) پیش سەرۆکی دادگای ئاگرپەرستەکان بووە بەلام ئەو پادشایانەی دوای ئەو هاتن لەوانە شاپوری سێیەم (٣٨٣-٣٨٨ز) و بارامی چوارەم (٣٨٨-٣٩٩ز) هەوڵی سیاسەتی نزیکبوونەوەیان دا لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لەگەڵ فەرمانڕەوایی یەزدگردی یەکەم (٣٩٩-٤٢١ز) مەسیحیەت پێی نایە قۆناغێکی نوێوە بە شێوەیەک کە سەرچاوەی سریانی ئەو سەردەمە ئاماژەی پێ دەکا کە یەزدگردی مەسیحی پیرۆز پاشایەکی چاک و میهرەبان بووە و یەکێک بووە لەو پادشایانەی کە هەموو رۆژێک لەگەڵ هەژاران کۆبۆتەوە و خواردنی پێ بەخشیون هەولێر بووتە سەنتەری مەترانیەت و ملکەجی سلوقیە بووە کە قەشەی گەورە تێدا دادەنیشت هەروەک باس کرا، مەڵبەندی سەرەکی کڵێسای رۆژهەڵات لە مدینە (اربل) بوو هەر شارێ کە سلوقیی یۆنانی دروستی کردبوو و پایتەختی ئەشکانی ئەکسری رۆژئاوای وڵاتی میزۆپۆتامیا بوو لە دوای هەڵوەشانەوەی رەهای هێزی ئەوبکی درێژخایەنی ساسانییەکان سەنتەری مەترانیەت گوازرایەوە بۆ حەدیاب، لەو ماوەیەشدا مەترانیەتی حەدیاب گەیشتە ئازەربایجان و خاکی ئەنێوا کە درێژ دەبۆوە بۆ سەر زێی بچووکی خابوور و سنووری لێوارەکانیشی ئەرمینیا بۆ دیجلە و بنکەی سەرەکی شاری هەولێر کە نۆزدە قەشەی لە ژێر دەستدا بوو، هەر لەو قەشانەی کە سەر بە حەدیاب بوون قەشەی ئازەربایجان بووە و زەوانگەی ئاشووری بووە و گاوەرکانی رەواندز و دەوروبەری و ئەرمینیا هەن ئەمڕۆش قسەی پێ دەکەن. سەرەڕای ئەو گرنگییەی دەست کەوت و مەترانیەتی حەدیابی کردە دوو بەش ئەوانیش مەترانیەتی موسڵ بوو کە یەکتریان گرت و پێی دەوترا مەترانیەتی حەدیاب و ئاشوور بە دوایدا کۆمەڵێ زانای گاوریش لە حەدیاب پێ گەیشتن کە یەکێک لەوان (ابراهیم النتفری) بووە کە لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمدا ژیاوە و زۆر قوتابخانەی دامەزراندووە و کۆمەڵێک نووسراوی داناوە دوای ئەویش (پولص المدرس) قوتابخانەی لە حەدیاب دامەزراندووە و ماوەی ٣٠ ساڵ لە هەولێر زانستی بڵاو کردۆتەوە و ئینجا لە سەر داوای پادشای رۆمانی (یوستینانوس) چووە بۆ بێزەنتە ساڵی (٥٣٢ز) بۆ گوتنەوەی وتاری فەلسەفی لە کتێبی پیرۆز بۆ وەزیرەکانی کە لە کتێبی کۆنگدا بڵاو کراوەتەوە. هەر یەکێک لەوانەی کە لە قوتابخانەکانی هەولێر خوێندبێتی گرنگیەکی گەورەی بووە

کسکری دەکەوێتە نزیک واست لە سەر زێی دیجلە لە نێوان هەردوو شاری بەغدا و بەسرە،، مەتران نسێبین لە ٦١٢ز مردووە، ئەویش لە مەدائین پێگەیشتووە لە حزە (هەولێر) ١١ ساڵ خوێندوویەتی، دانراوی لە سەر مێژووی تایبەتی هەیە، بەر لەوەی ببێت بە مەتران ساڵی ٥٩٦ز قوتابخانەیەکی فرەوانی لە دەوروبەری شارەکەی (کسکر) کردۆتەوە. قوتابخانەکانی هەولێر بە وانە بێژەکانی بەناوبانگ بووە و زۆر قوتابی لێ دەرچووە لەوانیش (مارداد یشوع) کە ساڵی (٦٠٤ز) کۆچی دوایی کردووە و لە ماڵی (ارمایی) لە دایک بووە لە دەوروبەری ساڵی (٥٢٩ز) لە قوتابخانەی نسێبین خوێندوویەتی لە دواییدا گەڕاوەتەوە بۆ حەدیاب و ڕێگای ڕەبەنی گرتۆتە بەر کاتێ کە لە ڕۆژهەڵاتەوە لە نوێوە هەواڵی ئیبراهیم کسکری ڕەبەنی داناوە و دوای مردنی مامۆستاکەشی کە کسکری بووە خۆی سەرپەرشتی دێرەکەی کردووە. لە کۆتایی سەردەمی ساسانییەکان و داگیرکارییەکانی هەرقەلی ئیمپراتۆر لە سەر خاکی ئێران کاردانەوەیەکی لەسەر گاورەکان ڕوویدا کاتێک کە کیسرا سوێندی خوارد کە لەو شەڕانە سەرکەوت نابێ یەک زەنگوڵ لە کلێساکاندا بمێنێت و گاورەکانی بە توندی چەوساندنەوە و سزای دان.

هەندێک لە پیاوە نزیکەکانی پادشا کوژران و موڵک و ماڵیان بە تالان چوو، لە ڕووی دانیشتوانەوەش بەشێکی زۆری خەڵکی حەدیاب ڕەنگە ئارامی بووبن و زمانی قسە کردنی بەشێکی زۆریش لە ئاسیا و وڵاتی شام و جەزیرە و عیراق و ئاشوور و دەوروبەری زمانی ئارامی بووبێت، هەروەکو لە دیوانەکانی ئەخمینیدا بەکارهاتیە، لە بەرئەوەی نووسینی بزماری لە ڕووی کردەییەوە گونجاو نەبوو جگە لە بەکارهێنانی بۆ نووسین ئەوەبوو نووسینی ئارامی بەکارهات تەنانەت لە بەڵگە و دیکۆمێنتە نووسراوەکان بە زمانی فارسی ئەوەش بناغەی نووسینی پەهلەوی و نەریتی بەکارهێنانی وشەی ئارامی بوو لە دەقە پەهلەرییەکاندا، نووسینی ئارامی بەکار هاتووە تەنانەت لە بەڵگەنامە نووسراوەکانی زمانی فارسدا، ئەوەش نووسینی ڕەسەنی پەهلەوی بووە لە دەقەکانی پەهلەویدا بە ئاسایی وشەی ئارامی بەکار هاتووە. لەو سەردەمی ساسانیەکانیشدا زمانی ئەدەبی ئەو مەسیحیانە بووە کە لە ڕەچەڵەکدا سامین، زمانی ئەوانەی کە لە سەر خاکی ئێراندا دەژیان سریانیە کە لە ڕەسەندا هی شاری ئەدیسانە، پیتەکانی هیجائیش لەگەڵ بڵاوبوونەوەی زمانی ئارامی بڵاوبۆتەوە و جێگای نووسینی بزماری گرانی گرتۆتەوە کە زۆر لە گەلان ئەو نووسینەیان وەرگرتووە، لەوانەش عیبرییەکان و عەرەبەکانی باکوور. هەروەها ئارامییەکانیش نووسینەکانیان لە ئارامییەوە وەرگرتووە، فارس و هیندیش.

(نووسینی پەهلەوی سانسکریتی) بوزیەکانیش نووسینی سانسکریتیان لە هیندەوە گوازتەوە بۆ چین و بۆ کۆریا بەم شێوەیە ڕەچەڵەکی خەت و نووسینی هیجائی لە نیوەی گۆی ڕۆژهەڵاتی دەگەڕێتەوە بۆ نووسینی ئارامی، زمانی ئارامی بە خۆڕاگری ماوەتەوە تەنانەت دوای ئەوەی فارسەکان دەستیان بە سەر میسر و ئاسیای بچووک و سوریادا گرت و لە باکووری دوورگەی عەرەبی و سنووری حیجاز بڵاوبۆوە، ئەمەش لە سەدەی یەکەمی زایینیدا بووە، زمانی ئارامی زمانێکی باو بووە لە لێوارەکانی ناوەڕاستی تۆڕۆس و کەنداوی عەرەبی و حەدیاب، عەرەب بە ئارامییەکانیان دەگوت (النبط). زمانی عەرەبی زمانی ئارامی ڕەت کردەوە لە سەدەی حەوتەمی زایینی و لە سەردەمی پانزەهەمی زایینی بە تەواوی لە ناوی برد، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زمانە هەر نەمرد، بەڵکو تا ئەمڕۆش ماوە و هەندێک لە گەلانی گاوری، کە لە عیراق و کوردستان و سوریا و فارسدا هەن قسەی پێ دەکەن، ئەوانە ئەمڕۆ گاورەکانی کوردستان هەولێر و سلێمانی و کۆیە و سنە و ئەرمینیا و گوندە گەورەکانی باکووری موسڵن. دکتۆر منجانا دەڵێت: زۆربەی زۆری دانیشتوانی حەدیاب، کە گاور بوون لە ڕەچەڵەکدا فارسن نەک ڕەچەڵەکی ئارامی.

*

# کرۆنۆلۆژیای هەولێر

دکتۆر عەبدوڵڵا حەداد

**أ- مێژووی کۆن و سەردەمی ئیسلامی:**

- دەوروبەری (٦٠٠٠) شەش هەزار ساڵ بەر لە زایین، یەکەمین کۆمەڵگای کشتوکاڵی لە شوێنی (قەڵا)دا کراوەتەوە.

- هەولێر شارێکی سۆمەری، ئاشووری، بابلی، فارسی (ئەخمینی یا هەخامنشینی)، یۆنانی (گریکی) و فرتی (پارتی) و (ساسانی) بووە کە یەک لەدوای بۆ ماوەی شەش هەزار ساڵ حوکمیان کردووە. تا دەوروبەری ساڵی (٢٢ک ٦٤٢ز).

- لەبەر گرنگی و پیرۆزیی شاری هەولێر، بەو پێیەی کە پەرستگای عەشتار (ئەشتار ئەربیلا)ی لێ بووە، "سەنحاریب"، شای ئاشوورییەکان کە لەنێوان ساڵانی (٧٠٥- ٦٨١)ی پێش زایینیدا حوکمی کردووە، لە (بەستۆرە)وە ئاوی بۆ هەولێر ڕاکێشاوە (کە درێژییەکەی نزیکەی بیست کیلۆ مەترە).

- (٣٣١) بەر لە زایین، لە ناوچەی (کوگمیلا) لە شەڕی (ئەربێلا)دا، لەشکری (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بەسەر لەشکری (دارای هەخامنشینی/ ئەخمینی)دا سەرکەوت. ئەو ڕووداوە گرنگە لەمێژوودا بەیەکەمین سەرکەوتنی ڕۆژئاوا بەسەر ڕۆژهەڵات دەژمێردرێ، بەهۆی ئەم شەڕەوە، هەولێر لەسەر ئاستێکی جیهانیدا ناوبانگی دەرکرد.

- دەوروبەری (٢٢)ی کۆچی (٦٤٢ز): هەولێر بوو بە بەشێک لەخاکی خەلافەتی ئیسلامی.

- (١١٩٣ز): سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی کۆچی دوایی کردووە.

- سەدەی پێنجی کۆچی (یانزدەهەمی زایینی): میرنشینی هەزبانیی کوردی لە هەولێر دامەزراوە. دیارترین میرەکانیان بەزایین بن موسا، سەلار بن موسا، ئەبولحەسەن بن موسک.

میر ئەبولهەیجای هەزبانی (حسێن بن حەسەن بن موسا) لەسەردەمی سەلجووقییان ناوبانگی دەرکرد، ڕۆڵی بەرچاوی لەململانێی نێوان خەلیفەکانی عەباسی و سوڵتانەکانی سەلجووقیدا هەبووە و لەنێوان ساڵانی (١١٧٠- ١١٢٦ز) پاشان دەنگوباسی نەماوە.

- (٥٢٢- ٦٣٠هـ)- (١١٢٨- ١٢٣٢ز):میرنشینی بەکتەکینی ئەتابەکی لە هەولێر دروست بووە، بەناودارترین حاکمیان (ئەبو سەعید موزەفەرەدین) گۆگبوری مێردی (ڕابیعە خاتوونی) خوشکی سوڵتان سەلاحەدین بووە، بە شاهی خاوەن شکۆ موزەفەرەدین گوگبری ((الملک المعظم مظفر الدین گوگبری) ناسرا بوو.

لە سەردەمی ئەودا، هەولێر بوو بەپایتەختی میرنشینێکی ناوداری گەورە، لەهەموو بوارێکی سەربازی و ئیداری و بازرگانی و زانستی و ئاوەدانکردنەوەدا هەنگاوی گەورەی بەرەو پێشەوە ناوە. موزەفەرەدین ڕۆڵێکی سیاسی و سەربازی بەرچاوی هەبوو. لەو سەردەمەدا، ئەم شارە ببوو بەقیبلەگای زاناو شاعیرو مێژوونووس و بەهرەدارانی هەموو جیهانی ئیسلامی. (سوڵتان موزەفەر) یەکەمین حاکمی ئیسلامە، کە ئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەری بەشێوەیەکی ڕەسمی داهێناوە پاشان تێکڕای حاکم و سوڵتانەکان لاساییان کردۆتەوە.

- (٦٣٠ک) - (١٢٣٢ز): سوڵتان موزەفەرەدین کۆگبوری کۆچی دوایی دەکات، میرنشینی ئەتابەکی بەگتەکینی کۆتایی پێ دێت. دوای بەرگرییەکی سەخت

هەولێر دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی خەلیفەی عەبباسی بەغدا تا ساڵی (١٢٥٧ز).

- ٦٣٠ك/ ١٢٣٢ز: شاعیری ناوداری هەولێر (زایین بن سەنجەر) کە بە (حاجری ئەربیلی) ناسراوە لەئەنجامی برینێکی سەختدا کۆچی دوایی دەکات.

- (٦٣٧ك)- (١٢٣٨ز): زاناو مێژوونووس و شاعیرو وەزیری هەرە ناوداری هەولێر (ابن المستوفی) خاوەنی کتێبی (تاریخ اربل) و چەندین دانراوی تر وەفاتی کردووە.

**ب- (١٢٥٧ز) تا (١٥٣٤).**

- (٦٥٦ ك/ ١٢٥٧): دوای بەرگرییەکی دلێرانەو قارەمانانە، هەولێر کەوتۆتە ژێر رکێفی مەغۆلەکان. بەشی خوارەوەی سووتێنراوە و تەواو خاپوور بووە، قەڵاش ویران بووە.

- (٦٧٧ ك/ ١٢٧٨ز): وەفاتی زاناو شاعیری گەورە (ابن الظهیر الاربلی).

- (٦٨٠ ك/ ١٢٨١ز): وەفاتی مێژوو نووسی گەورە (ابن خلكان الاربلي) خاوەنی کتێبی (وفیات الأعیان فی أبناء الزمان).

- لەنێوان ساڵانی (١٢٥٧- ١٤١٠ز) هەولێر کەوتبووە ژێر رکێفی مەغۆلییە ئیلخانییەکان، ئینجا جەلائیرییەکان. لە سەردەمی (جەلائیرییەکان)دا (١٣٣٧- ١٤١٠ز) عەشیرەتی مازنجانی کوردی فەرمانڕەوای هەولێر بوون. دوو بنەماڵەی ئەو عەشیرەتە حوکمیان کردووە، یەکەم بنەماڵەی (مویاریزەدین کاک) و پاشان بنەماڵەی دلقەندی، تا ساڵی (١٣٧٢ز) حوکمیان بەردەوام بوو.

- لەنێوان ساڵانی (١٤١٠- ١٥٠٨ز) عەشیرەتەکانی (قەرەقۆینلو) و (ئاق قۆینلو) حوکمی هەولێریان کردووە، لەساڵی (١٤٣٥ز)دا قەڵای هەولێر بەتوندی ڕووبەڕووی (ئەسپانی کوڕی قەرە یوسف)ی (قەرەقۆینلۆ) بۆتەوە، (ئەسپان) بەفرو فێڵ و ژەهراویکردنی بیرەکانی ئاوی قەڵا توانیویەتی هەولێر داگیر بکات.- ١٥٠٨ز: سەفەوییە قزڵ باشەکانی ئێران هەولێریان داگیر کردووە (تا ساڵی ١٥٣٤ز).

**ج- سەردەمی عوسمانی تا ساڵی (١٩٠٠ز):**

- (١٥٣٤ ز): هەولێر دەکەوێتە ژێر حوکمی عوسمانییەکانەوە (تا ساڵی ١٩١٨) حوکمیان کردووە.

- (٩٨٥ك/ ١٥٧٧ز): زانای گەورەی موسڵمانان مەلا حەیدەر بن محەمەد پیرەدین (باپیرە گەورەی حەیدەرییەکان) لە شارۆچکەی (هەریر) وەفات دەکات.

- (١٧٣٢) و (١٧٤٣).: دوو جاران هەولێر دووچاری هێرشی نادر شای ئەفشاری (قولی خان) دەبێ. قەڵا ئازایانە بۆ ماوەی دوو مانگ لەبەردەم تۆپەکانی نادر شادا خۆی ڕادەگرێ.

- دوای (١١٢٧ك/ ١٧١٤ز): حەیدەری دووەم کوڕی ئەحمەد کوڕی حەیدەری یەکەم، لە هەولێر کۆچی دوایی دەکات، ئەم زاتە بە (باباحەیدەر) ناسراوە.

- (١١٦٤ك/١٧٥١ز): قوچ پاشا (برای عوسمان پاشا) دژی لەشکری (والی) بەغدا لە قەڵای هەولێر خۆی قایم دەکات، بۆ ماوەی (٩) نۆ ڕۆژ بەرگری دەکات.

- (١١٦٥ك/١٧٥١ز): زاناو شاعیری گەورە (شیخ عبدالله الأصم الأربلي) وەفات دەکات.

- لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمەوە تانیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم: (هەولێر) (موتەسەلیمە) بووە، ڕاستەوخۆ سەر بە (والی) بەغدا بووە. (والی) بەگێکی بەناوی (موتەسەلیم) (واتە: بریکاری والی) ڕەوانەی هەولێر دەکرد.

- (١١٨٠ك/١٧٦٦ز): گەڕۆکی ئەورووپی (نێیبهور) سەری لە هەولێر داوە، سەرنج و تێبینییەکانی تۆمار کردووە.

- دەوروبەری (١١٧٨ك/ ١٧٧٣ز) سەبغەتوڵڵای گەورەی حەیدەری زادە (صبغة الله الكبیر) کۆچی دوایی دەکات.

- (١٢٠٠ك/ ١٧٨٥ز): هەولێر بووژانەوەیەکی گەورەی بەخۆوە بینیوە، لەهەموو ڕوویەکی بازرگانی و ئابووری و کشتوکاڵی و عیمرانییەوە پێش دەکەوێ، بەشی خوارەوە دووبارە ئاوەدان دەبێتەوە، لەو قۆناغەدا بازاڕو چەند گەڕەکێکی نوێ هاتوونەتە کایەوە.

- (١٢٠١ك/١٧٨٦ز): (حەمامی بچووک) و (حەمامی گەورە) لە گەڕەکی خانەقا دروست دەبێ.

- (١٢٠٠- ١٢١٥ك)- (١٧٨٥- ١٨٠٠ز): پەرەسەندنی هەولێر لەڕووی بازرگانی و کشتوکاڵی و پیشەسازییەوە بەردەوام دەبێ و چەندین خان و

کاروانسەراو حەسارو دوکان و خانووبەرە لە دەوروبەری (مزگەوتی حاجی داود) دروست دەبێ، گەڕەکی (تەعجیل) و گەڕەکی دەوروبەر گەشە دەکەن.

- (١٢٠٦ک/١٧٩١ز): زاناو شاعیری گەورەی هەولێری (مەلا جەرجیس ئەفەندی ئەربیلی) کۆچی دوایی دەکات. ئەم زاتە باپیرە گەورەی خوالێخۆشبوو عزەدین فەیزی و حاجی حەیدەر عوسمانە.

- (١٢١٢- ١٧٩٧ز): بەهەشتی (حاجی مەلا داود) مزگەوتێکی گەورە لە بازاڕ بنیات ناوە، تا ئەمڕۆش ئەم مزگەوتە ئاوەدانە. ناوبراو لەپاڵ ئەو مزگەوتەدا چەندین کاروانسەراو حەسارو دوکان و قاوەخانەو نانەواخانە دروست دەکات.

- (١٢١٦ک/١٨٠١): والی بەغدا داهاتی هەولێری بە (محەمەد ئاغای بابان) پێشکەش کردووەو کردوویە بە موتەسەلیم، چونکە محەمەد ئاغا دژی (میری میرانی) سلێمانی وەستابوو. خەڵکی هەولێر دژی زوڵم و ستەمی محەمەد ئاغا ڕادەپەڕن و لەشار وەدەری دەنێن. شاندێکی هەولێر ڕوو لەبەغدا دەکات، سلێمان پاشای (والی) بەغدا شاندی هەولێر بۆ (بەسرە) نەفی دەکا!.

- (١٢١٩ک/١٨٠٤ز): (ئادەم ئەفەندی ئەربیلی) زانای گەورەو ناوداری ئەو کاتە، کۆچی دوایی دەکات.

- (١٢٢٠ک/١٨٠٥ز): قاسم ئاغای کوڕی عەبدوڵلا ئاغای بەیان (باوکی یاقووب ئاغا) موتەسەلیمی هەولێر بووە. تا دەوروبەری ساڵی (١٨٢٢ز) لە فەرمانەکەی بەردەوام بووە، لەو ماوەیەدا حەمامی گەورەی قەڵا نۆژەن کراوەتەوە. وەستا (ئەحمەد جەبەل)، کە بەردی لە چیاکان گواستۆتەوە سەرپەرشتی نۆژەنکردنەوەی حەمامەکەی کردووە (ئەو ئەحمەد جەبەلە باپیرە گەورەی خوالێخۆشبوو شاعیر جەرجیس باغچەچی کوڕی عەلی کوڕی پاشایە).

- (١٢٣٢ک/١٨١٦ز): بیکگنهام، سەری لە هەولێر داوە، کۆمەڵێک سەرنجی وردی لەبارەی تۆمار کردووە.

- (١٢٣٤ک/١٨١٨ز): قەشەی دۆمەنیکانی کامپانێل (کە لەساڵانی ١٨٠٢ تا ١٨١٥ز) لەموسڵ و ئامێدیدا ژیاوە و لەرۆما کتێبێکی بەناوی (مێژووی کوردستان) بەچاپ گەیاندووە. لەو کتێبەدا وەسفی هەولێری کردووە و ژمارەی دانیشتوانی هەولێری بە (٢٠٠٠٠) بیست هەزار کەس مەزندە کردووە.

- دەوروبەری (١٢٣٣ک/١٨١٧ز): مزگەوتی (تەکیەی) نەقشبەندی خالیدی لەگەڕەکی (خانەقا) بنیات نراوە. مەولانا خالید (ضیاءالدين) نەقشبەندی لەئاهەنگی کردنەوەیدا ئامادە دەبێت. بەهەشتی شێخ هیدایەتوڵلای هەولێر (ئەربیلی) نەقشبەندی دەکاتە (خەلیفە)ی خۆی.

- (١٨٢٠ز): (مستەر ریچ) هاتۆتە هەولێر، کۆمەڵێک زانیاری لەسەر هەولێر تۆمار دەکات، دیمەنی (قەلا) و (منارە)ی هەولێر زۆر بەجوانی دەکێشی.

- (١٢٣٦ک/١٨٢١): جێبەجێکردنی پرۆژەی (ئاوی میری).

- (١٢٣٨ک/١٨٢٢ز: شێخ عەبدولکەریمی رفاعی کۆچی دوایی کردووە.

- (١٢٤٢ک/١٨٢٧): نوێکەرەوەی تەریقەتی نەقشبەندی مەولانا (چیاءالدین) خالید نەقشبەندی لە شام کۆچی دوایی کردووە. مێژووی وەفاتی بەحیسابی ئەبجەد لە وشەی (مغرب)دا کۆ کراوەتەوە.

- دەوروبەری (١٢٤٤ک/١٨٢٨ز): هەولێر وەلائی خۆی بۆ محەمەد پاشا نیشان داوە و"ئەحمەد بەگ"، برای میر محەمەد بەحاکمی هەولێر دامەزراوە. ئەم ئەحمەد بەگە باپیری خوالێخۆشبوو حاجی هیدایەت "هیدۆش"ی ئاسنگەرە. پێدەچێ بۆ ماوەیەک خدر بەگی بایز بەگیش حاکمی هەولێر بووە لەدەوروبەری ساڵی (١٨٣٤ز) لەشکری میر محەمەد دەکشێتەوە، (عەلی رەزا پاشای) والی بەغدا قەڵا داگیر دەکا، یاقووب ئاغا کوڕی قاسم ئاغا دەگەڕێتەوەو پۆستی "موتەسەلیم"ی پێ دەدرێ.

- (١٢٥٠ک/١٨٣٤ز): شێخ ئەحمەد خەتیبی هەولێری نەقشبەندی خەلیفەی (مەولانا خالید) لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتە باوکی شێخ عەولای هەولێرییە، کە مزگەوتی "دوو دەرگای" لەگەڕەکی "دەرگەزێن" لەشاری سلێمانی دروست کردووە.

- (١٢٥٢ک/١٨٣٦): شێخ هیدایەتوڵلای نەقشبەندی ئەربیلی، خەلیفەی مەولانا خالید، لە شاری بەغدا کۆچی دوایی دەکات.

- (١٢٥٣ک/١٨٣٧): میرنشینی سۆران کۆتایی پێ دێت و میر محەمەد پاشای رەواندزی لە بارودۆخێکی تەم و مژاویدا دەکوژرێ.

- (١٢٥٥ك/١٨٣٩ز): شێخ عەبدوڵلا کوڕی مەلا مەولود خاوەنی تەکیەی گەڕەکی (تەکیە) لەقەڵا (نزیک مزگەوتی گەورەی قەڵا) کۆچی دوایی کردووە، ئەم زاتە باپیرە گەورەی خانەوادەی (موئەزین زادە)یە. گەڕەکی تەکیە لەقەڵا بەناوی ئەو تەکیەیە ناونراوە.

- (١٢٥٥ك/١٨٣٩ز) شێخ عەبدوڵلای رفاعی (؟) وەفاتی کردووە.

- (١٢٥٩ك/١٨٤٤ز): شێخ عەبدوڵلای قوتبی مەدار ناودار بە (شێخ ئەڵلا) شێخی تەریقەتی قادری وەفات دەکات. یاقوت ئاغا بەهۆنراوەیەک لاواندوویەتییەوەو (بەحیسابی ئەبجەد) مێژووی وەفاتی تۆمار کردووە.

- (١٢٦١/ ١٨٤٥) نەجیب پاشای گۆزلگلی و والی بەغدا سەر لە هەولێر دەدات و مزگەوتی گەورەی قەڵا (مزگەوتی کچک مەلا) نۆژەن دەکاتەوەو رووبەرەکەی فراوانتر دەکات و منارەیەکی بۆ دروست دەکات.

- (١٢٦١ك/١٨٤٧ز): مزگەوتی (دێرە برووشە) لە گەڕەکی تەعجیل، لەلایەن ئافرەتێکی خێرخواز بەناوی (ئامینەخان)ەوە دروست دەکرێ.

- (١٢٧٦ك/١٨٥٩ز): شێخ ئیبراهیم شێخ زادە پۆستنشینی تەکیەی (خان ئەحمەد/ کە پاشان بەتەکیەی شێخ شەریف دەناسرا) لە گەڕەکی سەرای لە قەڵا، کۆچی دوایی دەکات.

- (١٢٨١ك/١٨٦٤ز): مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا رەسوول کوڕی مەلا عومەری گڕاوی، ناسراو بە (واعیز) و مامۆستای مەدرەسەی ئەحمەدییە/ مەدرەسەی مەلا رەسوول ئەفەندی، لە قەڵا (کە جێگەکەی لە شوێنی حەوزی قەڵادا بووە) کۆچی دوایی دەکات.

- (١٢٨٣ك/١٨٦٦ز): خان ئەحمەد پۆستنشینی تەکیەی (خان ئەحمەد) کۆچی دوایی دەکات.

- (١٢٨٦ك/١٨٦٩ز) تێلگراف گەیشتۆتە شاری هەولێر. بەم بۆنەیەوە، چەند شاعیرێک بەهۆنراوە مێژووی هاتنی ئەو ئامێرەیان بە (حیسابی ئەبجەد) تۆمار کردووە.

- (١٢٨٧ك/١٨٧٠ز): بەپێی سیستەمی ئیدارەی تازە، هەولێر (اربیل) کراوە بە (قەزایەک) لە سنجەقی شارەزوور (کەرکووک) لەویلایەتی مووسڵ، لەلایەن قائیمقامێکەوە بەڕێوە چووە. لەو ماوەیەدا چەندین دامودەزگای نوێ هاتوونەتە کایەوە، لەوانە: شارەوانی (بەلەدییە)، کە لەلایەن ئەنجومەنێکەوە بەڕێوە چووە. لەساڵی (١٨٧٦) قادر ئاغا سەرۆکی ئەنجومەنی شارەوانی بووە، "سلێمان ئاغا" ئەندامی ئەو ئەنجومەنە بووە. لەهەمان کاتدا مەکتەبی روشدییە کراوەتەوە.

- (١٢٩٤ك/١٨٧٦ز): لەو ساڵەدا بەپێی "ساڵنامەی ویلایەتی بەغدا" ئەحمەد بەگ: قائیمقامی هەولێر بووە، محەمەد ئەمین ئەفەندی: نائیبی شەرع. ئەحمەد ئەفەندی بەڕێوەبەری دارایی (مدیری مالی) و "لوتفوڵلا ئەفەندی" باپیری کەسایەتی ناودارو پرۆفیسۆر ئیحسان شێرزاد، کاتبی تەحریرات بووە. (٢٥) قوتابی لە "مەکتەبی روشدیە" خوێندوویانە، خدر ئەفەندی و محەمەد ئاغا مامۆستای مەکتەبەکە بوونە.

- (١٢٩٢ك/١٨٧٥ز): موتەسەلیمی پێشووی هەولێر، شاعیری ناودار یەعقوب ئاغای کوڕی قاسم ئاغا کۆچی دوایی دەکات لە گۆڕستانی گەورەی شاردا تەرمەکەی بەخاک دەسپێردرێ.

- (١٢٩٧ك/١٨٧٩ز): کەسایەتی ناوداری هەولێر حاجی مەلا هیدایەت کوڕی حاجی مەلا داود (خاوەنی مزگەوتی حاجی داود) لە رێگای حەج لەناو پاپۆڕدا کۆچی دوایی کردووە.

- (١٢٩٧ك/١٨٧٩ز): مەلا عوسمانی کوڕی مەلا ئەبوبەکری (مەلا گچکە) کوڕی مەلا عوسمان، کۆچی دوایی دەکات، تەرمەکەی لەگۆڕستانی گەورەدا بەخاک دەسپێردرێ.

- (١٣٠٠ك/١٨٨٢ز): مزگەوتی پاشا لەگەڕەکی (عارەبانی ئێستا) لەلایەن خوالێخۆشبوو (سەید مەحمود سەید محەمەد سەید ئەحمەد)ی (سەید ئەحمەد زادە) بنیات نراوە.

- (١٣٠١ك/١٨٨٣ز): فراوانکردن و نۆژەنکردنەوەی مزگەوتی بەهەشتی شێخ ئەبوبەکر ئەفەندی نەقشبەندی هەرشەمی/ هەولێری (غیاث الدین) لەرۆژهەڵاتی شاردا. ئەم زاتە زانایەکی گەورەی موسڵمانان و مورشیدی تەریقەی نەقشبەندی بووە. خەلیفەی شێخ عوسمان سیراجەدینی (تەوێڵە) بووە، لەگەڵ بەهەشتی (شێخ محەمەدی چۆلی) هاوڕێیدا بەیەکەوە ئیجازەی ئیرشادیان وەرگرتووە. بەپێی هەندێ سەرچاوەی زارەکی

شێخ ئەبوبەکر، بەر لەوەی لەمزگەوتی خۆی دانیشێ، بۆ ماوەیەک لەمزگەوتی حاجی داود دانیشتووە، لەگەڵ خوالێخۆشبووان: مەلا محەممەدی هەولێری و قازی داود ئەفەندی کوڕی حاجی مەلا هیدایەتی حاجی داود زادەو چەند زاتێکی تر، لە حەرەمی مزگەوت حەلەقەی زیکری تایبەتی بەتەریقەتی نەقشبەندی سازادەوە، لەکاتی ئیعتیکاف و زیکردا دەرگای حەرەمیان داختسووەو کەس نزیکیان نەکەوتۆتەوە.

- (١٣٠١ک/١٨٨٣ز): مزگەوتی (شێخی چۆلی) لەرۆژئاوای شاردا لەلایەن بەهەشتی (شێخ محەممەدی کوڕی مستەفا کوڕی حاجی عومەری نەقشبەندی هەولێر) بنیات نراوە. پێشتر شێخی چۆلی بۆ ماوەیەک لەمزگەوتی (دێرە برووشە) ئیرشادی کردووە.

- (١٣١٠ک/١٨٩٢ز): بەپێی (ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ) لەو ساڵەدا واتە (١٣٠٨ رۆمی) عەبدوڵلا پاشای بەپلەی (میری میران) قائیمقامی هەولێر بووە. ئەو زاتە نزیکەی دە ساڵ لەو پۆستە دابووە، شێخ رەزای تاڵەبانی (١٨٣٥- ١٩١٠) مەدحی کردووە، لەهەمان ساڵدا سەید ئەحمەد ئەفەندی (نائیبی شەرع) و عەبدولڕەحمان ئەفەندی (کوڕی مەلا ئیسحاق) مفتی و وەلی ئەفەندی بەڕێوەبەری دارایی و سەفوەت ئەفەندی کوڕی (لوتفوڵلا ئەفەندی) نووسەری تەحریرات بووە. هەر لەو ساڵەدا دادگای بیدایەت و ئەنجوومەنی (دەعاوا) لەشاری هەولێر هەبووە، حاجی ئەحمەد ئاغاش سەرۆکی ئەنجوومەنی شارەوانی بووە.

- (١٣٠٢ک/١٨٨٤ز): (شێخ محەممەد سەعید)ی کوڕی شێخ هیدایەتوڵلای نەقشبەندی هەولێری کۆچی دوایی کردووە.

- (١٣٠٨ک/١٨٩٠ز): مورشیدی تەریقەتی نەقشبەندی (شێخ محەممەدی چۆلی) کۆچی دوایی کردووە.

- (١٣١٢ک/١٨٩٤ز): تەکیەی (شێخ محەممەد سالح) باوکی خوالێخۆشبوو شێخ محێدین لەگەڕەکی عارەبانی ئێستا دروست کراوە، شێخ محەممەد ساڵح لەساڵی ١٩١٦ وەفات دەکات و شێخ محێدین لە ١٩٨١/٧/٢ وەفات دەکات.

- (١٣١٢ک/١٨٩٤): مەلا رەسووڵ ئەفەندی کوڕی مەلا ئەحمەدی (واعیز) گراوی لەقەڵای هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

- (١٣١٦- ١٨٩٨): سلێمان ئەفەندی کوڕی حاجی مەلا هیدایەتی حاجی داوود زادە لەرەواندز کۆچی دوایی کردووە، ئەو زاتە زاوای یەعقوب ئاغا بووە، تیلگرافخانەو بانکی کشتوکاڵی لەهەولێردا دامەزراندووە.

- (١٣١٤ک/١٨٩٦): لەلایەن خوالێخۆشبوو حاجی عەبدولقادر سەعید دەباغ و قازی داود ئەفەندی (حەمامی حاجی قادر) لەبازاڕ دروست کراوە. ئێستا شوێنی حەمامەکە باڵەخانەیە.

- لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا هەندێ مزگەوت و تەکیە لەهەولێر دروست کراون، وەکو مزگەوتی مفتی (مزگەوتی مەلا ئیسحاق) لەگەڕەکی تەعجیل و مزگەوتی (ئاڵتی بەرماق/ شەش پل) لەبازاڕ.

- (١٣١٥ک/١٨٩٧ز: وەفاتی (شێخ عبدالقادر ابن محی الدین الاربلی) خاوەنی کتێبی (حجة الذكرين ورد المنكرين) کە لەساڵی (١٢٩٩ک/١٨٨١ز): لە میسر (ئەسکەندریە) لەچاپ دراوە. هەروەها خاوەنی کتێبی (مناقب تاج الأولياء و برهان الاصفياء القطب الرباني والغوث الصمداني السيد عبدالقادر الگيلاني قدس سره) هەر لەمیسر لەساڵی (١٣٠٠ک/١٨٨٢ز) لەچاپدراوە. ناوبراو خزمی خان ئەحمەدە.

- (١٣١٧ک/١٨٩٩ز): تەکیەی یا مەسجدی (یەگەن/ خوارزا) لەقەڵا لەلایەن ئافرەتێکی خێرخوازەوە تۆمار دەکرێ، مەلا ساڵحی یەگەن لێی دادەنیشێ.

## د- ١٩٠٠- ١٩٥٨:

- دەوروبەری ١٩٠٠ مزگەوتی خوالێخۆشبوو حاجی مەولود مەلا فەتاح بەقاڵ، کە بەمزگەوتی خوالێخۆشبوو شێخ محەممەدی (رەشکە) ناودارە، لەگەڕەکی خانەقا بنیات دەنرێ.

- (١٣٢٠ک/١٩٠٢ز) مزگەوتی خوالێخۆشبوو حاجی عەبدولقادر دەباغ لەبازاڕ (نزیک دەباغخانەی کۆن) دروست بووە.

- (١٣٢٠ک/١٩٠٢ز) قازی داود ئەفەندی کوڕی حاجی هیدایەتی حاجی داود زادەی هەولێر وەفات دەکات، ناوبراو لەساڵانی (١٨٧٧- ١٨٧٨) لەسلێمانی قازی بووە، زاوای شێخ عەولای هەولێری نەقشبەندی خاوەنی مزگەوتی دوو دەرگا لە سلێمانی لەچەند شوێنێکی تری

کوردستاندا قازیەتی کردووە، زاناو مرۆڤێکی لێهاتووی سەردەمی خۆی بووە، لەپاڵ پۆستی قازییەتی بەدەرس وتنەوەو ئیرشادەوە خەریک بووە.

- (١٣٢٤ك/١٩٠٦ز): مزگەوتی مەلا نەبی (مزگەوتی کورەچییەکان) لەگەڕەکی کورەچییەکان بنیات نراوە.

- (١٣٢٦- یا ١٣٢٩ك)- (١٩٠٧- ١٩١٠ز): زانای ناودار شێخ ئەبوبەکری نەقشبەندی هەرشەمی (غیاث الدین) کۆچی دوایی دەکات.

- (١٩٠٩- ١٩١٠ز) قەیسەرییەکانی بازاڕی هەولێر بەتەرزێکی نوێ دروست کراوە.

- ١٩١٠: عەبدوڵڵا ئەفەندی کوڕی سەبغەتوڵڵای حەیدەری زادە قازی جەزیرو بۆتان لە شاری جەزیرە کۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتە باوکی شاعیرو ڕەچەڵەکناس خوالێخۆشبوو (ناسیح حەیدەرییە).

- (١٩١٢ز): ئەفسەری شەهید (خەیروڵڵا عەبدولکەریم) لە قەڵا سەرکەشەکەی هەولێر لەدایک بووە. لەشۆڕشی بارزان (ساڵی ١٩٤٥) بەشداری کردووە، لەڕۆژی ١٩٤٧/٦/١٩ لەگەڵ ئەفسەران محەمەد قودسی و مستەفا خۆشناو عزەت عەبدولکەریم لەبەغدا ئیعدام دەکرێن.

- (١٣٣١ك/١٩١٢ز): مزگەوتی (مەلا عابید) لەگەڕەکی تەعجیل بنیات نراوە.

- (١٤/١٢/١١٤) یا (کانوونی دووەمی/ ١٩١٥): خوالێخۆشبوو شێخ عەبدولسەلامی دووەم (برا گەورەی مەلا مستەفا) و پۆستنشینی تەکیەی بارزان، لەتەمەنی (٣٥) ساڵیدا لەلایەن تاقمی (ئیتیحادو تەرەقی)یەوە لە موسڵ لەسێدارە دراوە.

- (١٣٣٦ك/١٩١٧ز): خوالێخۆشبوو (ئیسماعیل/ مەلا قۆجە) کۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتە خەلیفەی شێخ محەمەد چۆڵی بووە، کۆمەڵێ شیعری دەسنووسی هەیە، تەخەلوسی (حەزین)ە.

- (١٩١٦- ١٩١٨ز): قات و قڕی و گرانی تەواو تەنگ بەدانیشتوانی هەولێرو دەوروبەری هەڵدەچنێ، دەسەڵاتدارانی عوسمانی دەست بەسەر ئازووقەی ماڵاندا دەگرن، چەندین گەنج و لاو بەتۆمەتی فیرارکردن لە عەسکەری لەسێدارە دەدرێن، بارودۆخی ئابووری و زانستی و کۆمەڵایەتی هەولێر تێکدەچێ.

- (١٩١٧/١١/١٩ز): کۆمەڵەی تەعالی کوردستان لە ئەستەمبووڵ لەلایەن دەستەیەک لە گەورە پیاو و ڕووناکبیرانی کورد پێک دێت، خوالێخۆشبوو مەلا عەلی کوڕی حاجی حەوێزی مامەی هەولێری، ناسراو بەخۆجە عەلی نیازی ئەفەندی، ئەندامی دەستەی کارگێڕی بووە.

- (١٩١٨/١١/١٠): لەشکرو ئیدارەی عوسمانی لە هەولێر دەکشێنەوە و حوکمی عوسمانی کۆتایی پێدێت، ئینگلیزەکان هەولێریان داگیرکرد.

- (١٣٣٧ك/١٩١٨ز): شێخ جەمیل ئەفەندی کوڕی شێخ عەلی ئەفەندی (نەقشبەندی) مەلا گچکە زادە کۆچی دوایی دەکات. ئەم زاتە کتێبی (سراج الطالبین)ی باوکی لەساڵی (١٣٣١ك/ ١٩١٣ز) بەچاپ گەیاندووە.

- (١٩١٩/١١/١): هەولێر بووە بەمەرکەزی لیوای هەولێر (واتە: پارێزگای هەولێر دروست بووە، پاشان خوالێخۆشبوو ئەحمەد ئەفەندی عوسمان بەیەکەم موتەسەریفی هەولێر دادەمەزرێ.

- (١٣٣٩ك/ ١٩٢٠): خوالێخۆشبوو (شێخ عەبدولکەریمی دارە خورما) لە هەولێر نیشتەجێ دەبێت و لە گەڕەکی (خانەقا) دەست دەکا بەئیرشاد.

- (١٩١٩- ١٩٢٠) لە شوباتی ساڵی (١٩٢٠ز) بۆ ماوەی یانزە ڕۆژ لە هەولێر بەفر باریوە.

لەنێو خەڵک ئەم ساڵە بە (ساڵی بەفری گەورە) ناسراوە.

- (١٣٣٩ك/ ١٩٢٠ز):تەکیەی حاجی مەلا خدر تەلەعفەری لە قەڵا دادەمەزرێ، خوالێخۆشبوو باوکی ڕەحمەتی (شێخ عەبدولکەریمی تەلەعفەرییە).

- (١٩٢٢ز): ڕاپەڕینی شێخ ئەحمەدی بارزانی دژی سیاسەتی ئینگلیز.

- ١٩٢٦ یەکەمین قوتابخانەی کچان لە قەڵای هەولێر بەشێوەیەکی ڕەسمی کراوەتەوە لەهەمان ساڵدا زمانی کوردی لەقوتابخانەی یەکەمی هەولێر بەکار هاتووە.

- (١٩٢٦- ١٩٢٨ز): داود ئاغای سەعید ئاغای یەعقوبی سەرۆکی شارەوانی هەولێر بووە.

- (١٩٢٨ز): یانەی فەرمانبەران لەهەولێر دامەزراوە.

- (١٩٢٨ز): لەبناری قەڵای (خواروی ڕۆژئاوای شار) ڕیزێک دوکان لەلایەن خوالێخۆشبوو ئەحمەد ئەفەندی

عوسمانەوە دروست دەکرێ.
- (١٩٢٨- ١٩٥٨ز): موحسین ئاغا کوڕی محەمەد ئاغا سەرۆکی شارەوانی بووە.
- (١٩٣٠ز): مزگەوت (یا تەکیە)ی شێخ نورەدین بریفکانی لەلایەن یەکێک لە موریدەکانی لەگەڕەکی (تەعجیل) بنیات نراوە.
- (١٩٣١ز): هێزی چەکداری ئینگلیز ئاگریان لە ماڵی شێخ ئەحمەد لە بارزان بەرداوە.
- (٢/١/١٩٣١): شێخ ئەسعەد نەقشبەندی ئەربیلی لەزیندان وەفات دەکات، ڕۆژی دواتر (شێخ عەلی) کوڕەکەی لە ئەستەمبۆڵ لەسێدارە دەدرێ.
-(٢/١/١٩٣١):خوالێخۆشبوو "ئیبراهیم حەقی ئەفەندی حەیدەری زادە" (شێخ الاسلامی) پێشوو و (سەرۆکی یانەی سەرکەوتنی کوردان) لەبەغدا کۆچی دوایی دەکات.
- (١٣٥٠ک١٩٣١ز): مەلا عەبدولفەتاحی مەلا ئەحمەدی شێخ عەبدوڵلای (موئەزین زادە) کۆچی دوایی کردووە، ئەم زاتە باوکی "مەلا ئیبراهیم" و مەلا ئەمینە، باپیری شاعیری جوانەمەرگ محەمەد شەریف (میهری) کوڕی مەلا ئیبراهیمە.
- ١٩٣٢ عەبدولرەزاق ئاغای عوزێری شاعیرو سەرۆکی پێشووی شارەوانی هەولێر کۆچی دوایی کردووە.
- (١٣٥١ک/١٩٣٢ز): شێخ حاجی مەلا خدری کوڕی شێخ عەلی تەلەعفەری کۆچی دوایی کردووە.
- ٢١/٤/١٩٣٣: لەماڵی شاعیرو نووسەرو نیشتمانپەروەر مەلا سەلیم سەیدۆک لە قەڵا ئاهەنگی نەورۆز (بەشێوەی مەولود) ساز دەکرێت.
- (تا ساڵی ١٩٣٣): سێ قوتابخانەی سەرەتایی و قوتابخانەیەکی ناوەندی لە هەولێر هەبوو، لە سەرەتای چلەکاندا قوتابخانەی دواناوەندیش دامەزراوە.
- (٦/٦/١٩٣١): مەلیک فەیسەلی یەکەم سەری لە هەولێر داوە.
- (١٣٢٥ک/١٩٣٣ز): مەلا ئەحمەدی کوڕی حاجی مەلا هیدایەتی حاجی داود زادە متەوەلی مزگەوتی "حاجی داود" کۆچی دوایی کردووە.
- (١٩٣٥): مزگەوتی شێخ مەلا رەشید لە گەڕەکی ئیبن مستەوفی لەلایەن خوالێخۆشبوو عەبدولفەتاح حاجی قادر دەباغەوە بنیات نراوە.
- (٢٤/١٠/١٩٣٥ز) هەفتەنامەی "ڕووناکی"، لە هەولێر دەردەچێ. حوسێن حوزنی موکریانی هەڵسووڕێنەری بووە، پارێزەر "شیت مستەفا چەلەبی" بەڕێوەبەرو لێپرسراوی بووە، لە ١٦/٥/١٩٣٦ ڕاگیراوە.
- (١٩٣٦ز): زانای گەورە مەلا ئیبراهیم دۆغرەمەچی وەفاتی کردووە.
- (١٩٣٧ز): "مەلا عەلی ئەفەندی هەولێری کوڕی حاجی حەوێزی مامە" لە ئەستەمبوڵ کۆچی دوایی دەکات، ناوبراو لەساڵی (١٢٩٠ک/١٨٧٣ز) لەهەولێر هاتۆتە دنیاوە، لەهەولێرو شوێنەکانی تری کوردستان و بەغدا خوێندوویەتی، دوای ساڵی (١٩١٢ز) لەچەند ناوچەیەکی کوردستاندا بووە بە "قازی" لەساڵی ١٩١٧ کە "کۆمەڵەی تەعالی کوردستان" لەئەستەمبوڵ پێک دێت، یەکێک بووە لەدەستەی کارگێڕی، بەخۆجە (Hoca) واتە مامۆستا عەلی نیازی ئەفەندی ناسراوە. پاشان بووە بەعەمیدی فاکولتەی ئیلاهیات "واتە عەمیدی کۆلێژی شەریعە" لە ئەستەمبوڵ. ئەم زاتە برای بچووکی مەلا محەمەد حاجی حەوێزی مامەیە (١٨٧٠- ١٩٣٤).
- (١٩٣٨): کەسایەتی هەولێری، محەمەد حمادی کوڕی لوتفوڵلا ئەفەندی، موختاری گەڕەکی سەرای کۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتە باوکی پرۆفیسۆر ئیحسان شێرزاد ئەندازیارو وەزیرو سەرۆکی پێشووی کۆری زانیاری کوردە.
- (١٩٣٨): شەهابەی مەقامزان و دەنگخۆش وەفاتی کردووە.
- (١٩٣٩): حیزبی (هیوا) دامەزراوە، ئەویش بەهۆی گۆڕینی ناوی ڕێکخراوی (دارکەر) کە لەساڵی ١٩٣٧ دامەزرابوو، لەساڵی (١٩٤٤) حزبی شیوعی کوردستان، کە بە (شۆڕش) ناو دەبرا دامەزراوە، حزبی (رزگاریش) کە بە (بەرەی یەکگرتوو) ناو دەبرا (الجبهة الموحدة) لە ساڵی ١٩٤٥دا دامەزراوە.
- (١٩٣٩): مزگەوتی حاجی مەجید قەردار لە گەڕەکی (تەیراوە) بنیات دەنرێ.
- (١٩٣٩): کەسایەتی ناوداری هەولێر حاجی رەشید ئاغا کوڕی وەیسی ئاغا کۆچی دوایی کردووە. ئەو زاتە هەم لە سەردەمی (عوسمانییەکان) هەم لە سەردەمی ئینگلیزەکاندا ماوەیەک سەرۆکی شارەوانی هەولێر بووە،

مرۆڤێکی خاوەن هەڵوێست بووە، لەپێناوی هەڵوێستی نیشتیمانپەروەریدا بەتایبەتی لە سەردەمی داگیرکاری ئینگلیزدا دووچاری چەندان کێشەو گێچەڵ بووە.

- (١٩٣٩): مزگەوتی (قیبلە خوار) لەنزیک سەرای لەلایەن کچەکانی خوالێخۆشبوو (حاجی سالح دەباغ زادە)وە بنیات نراوە.

- (١٩٤٠): زانا مەلا محەمەد ئەمین محەمەد داود (ئالی مودەریس) مامۆستاو ئیمامی مزگەوتی (حاجی قادر دەباغ) کۆچی دوایی کردووە. خوالێخۆشبوو مەلا عەبدوڵڵای کوڕی، لەشوێنی دادەنیشێ تا لە ساڵی ١٩٦١ وەفاتی کردووە. ئەمەیان باوکی خوالێخۆشبووان مەلا فایزو مەلا عەلییە.

- (نیسانی ١٩٤١): لەسەرچاوەی ئاوی مفتاح ئاهەنگی نەورۆز سازدراوە، خوالێخۆشبووان: ئەحمەد حەمەد ئاغای دزەیی، پارێزەر عەونی یوسف، م. عومەر ساقی، مەلا سەلیم سەیدۆک، (شێخ محەمەد/ شێخەشەل) و عاسم حەیدەری، عەبدولوەهاب ئاغا، عزەدین فەیزی، مەلا شەریف، بەشیر چیچۆ، هتد.. بەشدارییان تێدا کردووە.

- (مایس/ حوزەیران/ ١٩٤١): مەلیک فەیسەلی دووەم (کە ئەوساکە لە تەمەنی شەش ساڵیدا بووە) لەگەڵ خانەوادەی شاهانەی عێراق، لەکاتی حەرەکاتی رەشید عالی گەیلانیدا لە قەسری مەلا ئەفەندی لە باداوە میوان دەبن، تا بارودۆخی بەغدا ئارام دەبێتەوە.

- (شوبات ١٩٤٢): قوتابیانی دواناوەندی هەولێر خۆپیشاندان لەبەر دەرکی سەرا سازدەدەن بۆ ئازادکردنی خوالێخۆشبوو (عەونی یوسف).

- (١٩٤٢/١١/٧): وەفاتی مەلا شەریف میهری شاعیر.

- (١٩٤٢/١٢/٣١) کەسایەتی و زانای گەورەو ناودارو مامۆستاو خوتبەبێژی مزگەوتی قەڵا خوالێخۆشبوو (مەلا ئەفەندی) کۆچی دوایی دەکات.

- (١٩٤٣): مەلا مستەفای بارزانی کە لە سلێمانی دەستبەسەر بووە، بەنهێنی خۆی گەیاندۆتە (بارزان) راپەڕینێکی نوێی بەرپا کردووە.

- (١٩٤٤): وەستا فەتاح کارێزچی و بیناسازی ناوداری هەولێر کۆچی دوایی دەکات.

- (١٩٤٥/١٠/٢٧) مەلا محەمەد ئەفەندی مفتی کوڕی مەلا عوسمان کوڕی ئەبوبەکر (کچک مەلا)ی شاعیرو زاناو مامۆستاو خوتبەبێژی مزگەوتی گەورەی قەڵا کۆچی دوایی دەکات. ئەم زاتە باوکی زاناو شاعیرو قازی (رەشاد مفتی)یە (١٩١٥- ١٩٩٢).

- (١٩٤٦/١/٢٢ز): (قازی محەمەد) کۆماری مەهابادی راگەیاندووە، تکا لە مەلا مستەفای بارزانی دەکا بچێتە ئێران و مەلا مستەفا پلەی ژەنەراڵی پێ دەدرێ و دەبێتە سەرۆکی گشتیی هێزە چەکدارەکانی کۆماری دیموکراتی کوردستان.

- (١٩٤٦/٨/١٦ز): پارتی دیموکراتی کورد (کوردستان) بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی دامەزراوە.

- (١٩٤٦): کەسایەتی ناوداری هەولێر ئەحمەد ئەفەندی عوسمان (مەلا گچکە زادە) یەکەمین موتەسەریفی هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

- (١٩٤٦): محەمەد شێرزاد (خوالێخۆشبوو زەید ئەحمەد عوسمان، نامیلکەیەکی لە قاهیرە بە ناونیشانی"نضال الاكراد" خەباتی کوردی چاپ کردووە.

- (١٩٤٧/٦/١٩): چوار ئەفسەری کورد: خەیروڵڵا عبدولکەریم"هەولێری"و عیزەت عەبدولکەریم و محەمەد قودسی و مستەفا خۆشناو لەشاری بەغدا ئیعدام کران.

- (١٩٤٧/٩/٢٠ز): سەید حسێن حوزنی موکریانی لەبەغدا وەفات دەکات و تەرمەکەی لە هەولێر (لە گۆڕستانی ئیمام محەمەد) دەنێژرێ.

-(١٩٤٨/٩/١١):ڕۆژنامەیەک بەناوی (هتاو) واتە (هەتاو) لەهەولێر دەرچووە، ئەمین رەواندزی خاوەنی بووە. (محامی ناجی) مودیری مەسئولی بووە. پێدەچێ تەنیا تاکە ژمارەیەکی لێ دەرچووبێ.

- (١٩٥٠): **مامۆستا عەبدوڵڵا ئەفەندی کوڕی مەلا عەبدوڕەحمان مفتی کوڕی مەلا ئیسحاق، مامۆستای مزگەوتی (مفتی) لە گەڕەکی تەعجیل کۆچی دوایی** دەکات. ناوبراو ماوەیەک سەرۆکی شارەوانی و ماوەیەک نائیب و ماوەیەکیش قازی بووە.

- (١٩٥٠/١٢/١٦): ژمارە (یەکی) ڕۆژنامەی (هەولێر/ اربیل) بەکوردی و بەعەرەبی لەلایەن کۆمەڵەی مامۆستایانی هەولێر دەرچوو، تا ڕۆژی ١٩٥٣/١/٢٨

بەردەوام بووە، (١٤٠) ژمارەی لێ دەرچووە، ئەم زاتانە سەرپەرشتییان کردووە: (م. جەمیل رەشید (مەسئوولی)، م. جومعە محەمەد سەفار (بەڕێوەبەری ئیدارە)، مامۆستایان: (عەبدولمەجید حەسەن، عیزەدین فەیزی، ئەستێر سەعید) دەستەی نووسەرانی بوون، هەروا مامۆستا شێخ یەحیاو مامۆستا جەمال جەمیل، م. نافع دەباغ و حوسێن رەشوانی، م. عەلی چوکل بەرپیە و پیربالْ مەحموودی شاعیر بەرهەمی زۆریان تیادا بلاو کردۆتەوە.

- (١٩٥٠): شێخ محەمەد مەزهەر کوڕی شێخ یەحیا نەقشبەندی متەوەلی مزگەوتی (تەکیەی) خالیدی (خانەقا) کۆچی دوایی دەکات، ناوبراو باوکی پارێزەر شێخ محەمەد سائیب و ئەندازیار (شێخ نەجات)ە.

- (١٩٥١/٧/٨): وەفاتی شێخ محەمەدی (قازی) کوڕی شێخ ئەسعەدی نەقشبەندی ئەربلی.

- (١٣٧٢ک/١٩٥٢ز): مزگەوتی خوالێخۆشبوو (حاجی مەحموود عەللاف- دێرەیی) لە گەڕەکی عەرەبی (موزەفەرییە) دروست کراوە.

- (١٩٥٢): مزگەوتی شێخ عومەری بالیسانی لە گەڕەکی سێتاقان دروست کراوە.

- (١٩٥٣): قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی هەولێر گوێزرایەوە بۆ ساختمانی نوێ، کە ئێستا شوێنەکەی بۆتە بەشێک لە ئەنجوومەنی وەزیران. قوتابخانەی (ثانیە) واتە (موزەفەرییە)ی سەرەتایی هاتە جێگای ئەو. پاشان (١٩٦٣) ئەو شوێنە بوو بەپۆلیسخانەو دوا بەدوا بوو بە بەشێک لە دیوانی پارێزگا.

- (١٩٥٤/٤/١ز): هەفتەنامەیەکی ئەدەبی بەناوی (هەتاو) لە هەولێر دەرچووە، خاوەنی ئیمتیازی گیوی موکریانی بووە، پێشتر پارێزەر (ئیبراهیم عەزیز ئاغا دزەیی) بەڕێوەبەرو بەرپرسیاری بووە پاشان پارێزەر مامۆستا (محەمەد شەهابەدین دەباغ "چەلەبی") و دوای ئەویش (خوالێخۆشبوو "جەلال قادر" (کە ئەفسەرێکی پلەدارو باوکی مامۆستا جەنگی و جەنینە) بەرپرسیاری بوون. (١٨٨) ژمارەی لێ دەرچووە، دوا ژمارەی لەرێکەوتی (١٩٦٠/١/٣٠)دا دەرچوودو ئیتر وەستاوە.

- (١٩٥٤): سەید عزەدین کوڕی سەید خەنجەری نعێمی و برای سەید محێدین سەید سالح (لە شێخەکانی رفاعی لەگەڕەکی عارەبان) کۆچی دوایی دەکات.

- ١٩٥٤: حاجی عەبدولقادر سەلیم حەماو (باوکی حاکم رەشید) کۆچی دوایی دەکات.

- (١٩٥٤/٧/٢٠): حەیدەر ئەفەندی کوڕی عاصم حەیدەری زادە کۆچی دوایی دەکات. ئەم زاتە باوکی جەمال حەیدەری و موهیب حەیدەری و سالح حەیدەری و مومتاز حەیدەری و د. جەمشید حەیدەرییە.

- (١٩٥٥): مزگەوتی شێخ محەمەد (بالیسانی) لەگەڕەکی تەیراوە بنیات نراوە.

- (١٩٥٦): غەفوور چەلەبی خاوەنی کتێبخانەی قەیسەری کۆچی دوایی دەکات.

- (١٩٥٦): رووخاندنی دەرگا مێژووییەکەی قەلای هەولێر لەلایەن شارەوانییەوە.

- (١٩٥٦): مامۆستای مەقام و تەجوید سەید مەردان کوڕی سەید محەمەد سدیق کۆچی دوایی کردووە.

- ١٩٥٧/٣/١٩: خوالێخۆشبوو محەمەد شەریف قادری سدیقی (پۆستنشینی تەکیەی خان ئەحمەد) لەگەڕەکی سەرای لەقەلا کۆچی دوایی دەکات، ئەو زاتە خەلیفەی شێخ عەلی کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی تالەبانی بووە، دوای خۆی خوالێخۆشبوو عەبدولقادری کوڕی لە شوێنی دادەنیشێ تا لەرۆژی ١٦/ ١٩٧٤/١٠ ئەویش وەفات دەکات، ئێستا شێخ فوئاد لە مەقامیان دانیشتووە.

- (١٩٥٧/٥/١١): شاعیری ناودار (عەبدولجەبار ئاغا کانی دۆغرەمەچی) کۆچی دوایی دەکات. (ئەو زاتە لەساڵی ١٨٩٧ لەدایک بووە).

- ١٩٥٧: مزگەوتی سەید غەریب سەید فەرەج بەرزنجی لەگەڕەکی سێتاقان بنیات نراوە.

- ١٩٥٧: وەفاتی شاعیری کورد مەلا خدری دەشتی.

- ١٩٥٨: مزگەوتی خورشید عالیم لەلایەن خوالێخۆشبوو حاکم حەیدەر ئاغاوە لەگەڕەکی زانیاری دروست کراوە.

- ١٩٥٨/١/٢٣: پارێزەرو سیاسەتمەدارو رووناکبیرو نووسەری کورد مەعروف جیاوک وەفاتی کردووە، ئەو زاتە (لەساڵی ١٨٨٥ لەبەغدا لەدایک بووە) لەساڵی ١٩٣٨ لە ئەنجوومەنی نواب نوێنەری هەولێر بووە، دامەزرێنەری (یانەی سەرکەوتنی کوردانە)، خاوەنی کتێبی (هەزار پەندو بێژی کوردی) و (مأساة بارزان المظلومة)یە.

- (١٩٥٨/٧/١٤ز): شۆرشی چواردەی تەمووز

بەرپابوو، رژێمی پاشایەتی (مەلەکیەت) کۆتایی پێ هات، کۆماری عێراقی راگەیەنرا، عەبدولکەریم قاسم بوو بەسەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران، لەهەمان ساڵدا مەلا مستەفا لەمەنفا گەڕایەوە.

- ۱۹۵۸/۷/۲۰: ئەحمەد ناجی ئەفەندی کوڕی حاجی سۆفی بەقال کۆچی دوایی دەکات. ئەم زاتە لەساڵی (۱۸۹٦) لەشاری هەولێر چاوی بەژیان هەڵهێناوە. لەساڵی ۱۹۱۹ خانەی مامۆستایانی موسڵی تەواو کردووە، پتر لە (۳۳) ساڵ خزمەتی کاروانی پەروەردەو خوێندنی کردووە، لەساڵی ۱۹۵۲ بەڕێوەبەری قوتابخانەی دووەم (المدرسة الثانية) بووە، باوکی کەسایەتی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی دیاری هەولێر خوالێخۆشبوو (جەوەدت ئەحمەد ناجی)یە. (۱۹۲۸- ۲۰۰۱/۱۲/۲۰).

*** تێبینی:**

سەبارەت بارزانییەکان و حزبی هیواو حزبەکانی تری کوردستانییەوە، لە ئامادەکردنی ئەم کرۆنۆلۆژیایەدا سوودمان لە سەرنجە وردەکانی کاک (فەیسەڵ دەباغ) وەرگرتووە (بڕوانە پەراوێزەکانی کاک فەیسەڵ دەباغ سەبارەت بەوتاری (بارزانییەکان لە زانستنامەی دنیای ئیسلامیدا) گۆڤاری (هەولێر) ژمارە (۷) هاوینی ۲۰۰۰- ل۲۱- ۲٦.

هەروا سوود لەم سەرچاوانەی خوارەوەش بینراوە:

- دائرة المعارف الاسلامية -المجلد الاول- (نقلها الى العربية محمد ثابت الفندي، احمد الشنتاوي، ابراهيم زكي خورشيد عبد الحميد يونس) جمادي الثانية ۱۳۵۲/ اكتوبر ۱۹۳۳). (مادة اربيل)- ص (٥٦٩ و ما بعدها).
- (د.) محسن محمد حسين: اربيل في العهد الاتابكي. مطبعة اسعد- بغداد- ۱۹۷٦.
- (د.) محسن محمد حسين: موضوعات في التاريخ الكردي. بغداد ۱۹۷٦.
- ياقوت الحموي: معجم البلدان- دار صادر- بيروت (۱۹۵۵- ۱۹۵۷) خمسة اجزاء.
- (نيبهور): رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر (ترجمه عن الالمانية الدكتور محمد حسين الامين)، (راجعه وعلق عليه ووضع فهارسه سالم الالوسي)- بغداد (۱۳۸۵ك/ ۱۹٦۵م).
- جيمس بكغنهام: رحلتي الى العراق سنة ۱۸۱٦ (ترجمة سليم طه التكريتي) مطبعة اسعد- بغداد- ۱۹٦۸.
- ريج: رحلة ريج في العراق عام ۱۸۲۰ (نقلها الى العربية بهاءالدين نوري) بغداد ۱۹۵۱.
- فريزر: رحلة فريزر الى بغداد في عام ۱۸۳٤. (ترجمة وتعليق جعفر الخياط- مطبعة المعارف- بغداد ۱۹٦٤.
- ابو الثناء الالوسي: نشوة الشمول في السفر الى اسلامبول- بغداد (۱۲۹۱ك/ ۱۸۷٤).
- ابو الثناء الالوسي: نشوة المرام في العودة الى مدينة السلام، مطبعة الولاية- بغداد (۱۲۹۳ك/ ۱۸۷۸م).
- ياسين العمري الموصلي: غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد دار السلام- بغداد- (۱۳۸۸ك/۱۹٦۸م).
- محمد القزلجي: (التعريف بمساجد السليمانية ومدارسها الدينية مطبعة النجاح- بغداد (۱۳۵٦ك/۱۹۳۸م).
- هادی چاوشلی: هەولێر لەگەڵ کاروانەی فەلەک، بغداد- ۱۹۸۷.
- زبير بلال اسماعيل: علماء ومدارس اربيل- الموصل- ۱۹۸٤.
- مەولود قادر بێخاڵی: هەولێرم وا دیوەو بیستووە (بەرگی دووەم) هەولێر- ۱۹۹۷.
- چەند ژمارەیەک لە ساڵنامەی ویلایەتی بەغداو ویلایەتی موسڵ.
- عمر شێخ لەتیف بەرزنجی: گەشتێک بەناو مزگەوت و تەکیەکانی شاری هەولێر- ۲۰۰۱.
- عبدالله فرهادي: الاكليل في محاسن اربيل- اربيل ۲۰۰۱.
- ژمارەکانی (۱- ۱۳): گۆڤاری هەولێر: (وەرزە گۆڤارێکی رۆشنبیری سەربەخۆیە) فرەنسۆ هەریری (خاوەنی ئیمتیازیەتی)، فەیسەڵ دەباغ (سەرنووسەریەتی)، فوئاد سدیق (بەڕێوەبەری نووسینیەتی).
- مەحموود زامدار: رۆژنامەی هەولێر، حیکایەتی سەرهەڵدان و کۆتایی (۱۹۵۰- ۱۹۵۳)- هەولێر ۱۹۸۸.
- نزار جرجيس علي: صحافة اربيل- بغداد- ۱۹۸۸.
- د. عبدالله حداد مدخل لدراسة تطور مدينة اربيل للفترة من (۱۷۷۰- ۱۸۲۰) مجلة كاروان الاكاديمي- العدد الاول- اربيل ۱۹۹۷.
- د. عەبدالله حەداد: راستکردنەوەی هەندێ هەڵەی باو لەبارەی هەولێرەوە- گۆڤاری زانکۆ بۆ زانستی مرۆڤایەتی، ژمارە (۱) ۱۹۹۷.
- طارق ابراهيم شريف: شخصيات تتذكر- ۱۹۹۱.

هەروا سوودێکی گشتی لەهەر سێ بەرگی لێکۆڵینەوە زانستییەکانی پرۆفیسۆر (حنا بطاطو) وەرگیراوە کە بەناونیشانی:

**Hanna Batatu, The Old Social Claesses and.**

**The Revolutionary Momehewts of Iraq.**

**Princeton University Prees, 1978.**

هەر سێ بەرگەکە لەلایەن (عفیف الرزاز) تەرجەمەی عەرەبی کراون و لەساڵی ۱۹۹۲ لە بەیروت بڵاوکراوەتەوە.

# هەولێر لە ساڵنامەکانی (ویلایەتی موسڵ)دا

فەیسەڵ دەباغ

هەولێر سەر بە سنجەقی شارەزوور و ئەویش سەر بە ویلایەتی موسڵ بووە، سەردرای شارەزووریش ئەم ویلایەتە دوو سەنجەقی دیکەی هەبووە کە یەکێکیان سنجەقی موسڵ و ئەوی تریان سنجەقی سلێمانی بوون.

سنجەقی شارەزوور بێجگە لە قەزای هەولێر، پێنج قەزای تریشی هەبووە: قەزای کەرکووک (کە مەڵبەندی سنجەقەکە بووە)، قەزای سەلاحیە (واتە کفری)، قەزای کۆیسنجەق، قەزای رانیە، قەزای رەواندز.

بە پێی ساڵنامەی ساڵی (١٣٠٨ک / ١٨٩٠ز) و ساڵنامەی ساڵی(١٣١٠ ک/١٨٩٢ز)دا بەم شێوەیە باس لە قەزای هەولێر کراوە:"قەزای هەولێر دەکەوێتە رۆژئاوای مەڵبەندی لیوا، درێژییەکەی ٤٠ سەعاتەرێ و پانییەکەشی ٢٠ سەعاتە رێ دەبێ، لە باشووری رۆژهەڵاتەوە بە قەزای کۆیە و رانیە و لە رۆژئاواوە بە سنجەقی موسڵ و لە باکوورەوەش بە قەزای رەواندز دەوردراوە، رووباری زاب لە موسڵ جیای دەکاتەوە و لە قەزای رەواندزیشەوە دۆڵی بەستۆرە.

ژمارەی دانیشتوانی قەزا ٣٧٦٣ کەسە، لەوانە ٣٢٦٦ موسڵمان و ٤٧٩ غەیرە موسڵمانن. شارۆچکەکە ١٨٢٢ خانوو و ٦٣٧ دوکان و مەغازە و ٣ حەمام و ٢ مزگەوتی گەورە و ١٠ مزگەوتی گچکە و ١١ قاوەخانە و ٦ قوتابخانە و ٥ مەکاتیبی منداڵان و ١ قشڵە و ١ حەپسخانە و ٥ باغ و ٣باخچە و ١٥٤٦ تر لە (ئەو زەوییەی کە خۆڵەکەی جۆرێکە بۆ چاندنی برنج نەبێ بۆ هیچی تر بە کەڵک نایێ" و ٥٠٤٤٣ پارچە زەوی چاندراو و نەچاندراوی هەیە.

بە دووری ١٦ سەعاتە رێ و لە رۆژئاوای هەولێر زەوی و زاری هەمایۆن لە شەمامک و نزیک مەرقەدی سوڵتان عەبدوڵڵا خرابەیی شارۆچکەیەک و قەڵاتێک هەیە.

بە دووری ١٠ دەقیقە رێش خرابەی مزگەوتێکی گەورە هەیە، کە کاتی خۆی سوڵتان موزەفەرەدین دروستی کردووە و بەرزایی منارەکەشی ٨٠ مەترە. لە قەزای هەولێر مەرقەدی چەند پیاو چاکێک هەیە، وەک: عوزێر پێغەمبەر، ئیمام محەمەد تەعجیل، شێخ محەمەد واسیتی، شێخ محەمەد مەعسوم، شێخ محەمەد خۆراسانی، شێخ عەبدوڵڵا، شێخ حەیدەر، شێخ عومەر، شێخ محەمەد گەزنە، شێخ محمەد تەنووری، شێخ محمەد شێروان، شێخ خالد، شێخ جامی، شێخ محەمەد، شێخ محەمەد عوریان، شێخ عەبدولعەزیز و سوڵتان عەبدوڵڵا.

بە پێی ساڵنامەی ساڵی (١٣١٢ک/ ١٨٩٤ - ١٨٩٥ی ز)و ساڵنامەی ساڵی (١٣٢٥ک/ ١٩٠٦ز)دا بەم شێوەیە باس لە قەزای هەولێر دەکرێ:"دەکەوێتە رۆژئاوای لیوا، درێژییەکەی ٤٠ سەعاتە رێ و پانییەکەشی ٢٠ سەعاتە رێ دەبێ، لە باشووری

ڕۆژهەڵاتەوە بە قەزای كۆیە و ڕانیە و لە ڕۆژئاواوە بە زابی گەورە و لە باكووری ڕۆژهەڵاتەوە بە ناحیەی پردێ و لە باكوورەوەش بە قەزای ڕەواندز دەورەدراوە، خەڵكی قەڵات زۆربەیان بە توركی قسە دەكەن و دەوروبەریشی كورد و عەرەبن. ژمارەی دانیشتوانی شارۆچكەی هەولێر ٧٥٩٠ كەس دەبێ، كە قەڵاتێک و سەرایەک و ١٨٢٠ خانوو و ٦٣٧ دوكان و ٣ حەمام و ٦ مزگەوتی گەورە و ٢ مزگەوتی گچكە و ١١ قوتابخانە و ٦ مەكاتیبی مناڵان ١ مەكتەبی روشدییە و ١ حەپسخانەی تێدایە.

ئەم شارۆچكەیە لە دوو بەش پێكهاتووە، بەشێكی (قەڵات)ی پێ دەگوترێ و بەشەكەی تریشی (كورتەک)، ژمارەیەک جووشی تێدایە، لەناو قەزاشدا دیان تەنیا لە گوندی (عەنكاوە) دان.

لە نزیک شارۆچكەدا منارەیەكی كۆن هەیە، كە مەلیک موزەفەرەدین دروستی كردووە و قەبرەكەشی لە دەرەوەی شارۆچكەكەدایە.

لە دێر زەمانەوە شەڕێكی گەورە لەو ناوەدا بەرپا بووە لە نێوان ئەسكەندەری مەكدۆنی و دارای شاهی عەجەمدا.

لە دەرەوەی قەڵاتی هەولێریش مەقامی حەزرەتی عوزێر پێغەمبەر هەیە، ئەمە بێجگە لە قەبری چەند عالیم و ئەولیا، لەوانە دانەری كتێبی (وەفیات ئەلئەعیان) ئەحمەد كوڕی محەمەد كوڕی ئیبراهیم كوڕی ئەبی بەكر كوڕی خەلەكانی بەرمەكی، كە لە ساڵی ٦٠٨ی كۆچیدا لە شارۆچكەی هەولێر هاتۆتە دنیاوە.

لەناو قەزادا كورد و عەرەبی چادرنشین هەن و ئاو و هەواكەشی زۆر خۆشە. بەپێی ساڵنامەی ساڵی ١٣٣٠ی كۆچی (١٩١٢ی ز)یشدا بەم شێوەیە باس لە قەزای هەولێر دەكرێ:

دوو زنجیرە چیای تێدایە، یەكەمیان لە زابی گچكە كۆتایی پێدێت، لە ناوەكانیان چالوق و زورگەزراون، دووەمیشیان لە ڕووباری (دیجلە)وە دەست پێدەكات و لە زابی گچكە كۆتایی پێدێت كە بە ناوبانگترینیان قەرەچووغە.

هەولێر دوو ناحیە و شوعبەكی لێیە، دوو ناحیەكە (بەڕانی) و (دزەیی)یە و شوعبەكەش شوعبەی زەوی و زاری ئەمیری شەمامكە. زۆربەی زۆری دانیشتوانی قەزاكە عەشایری كوردن و بەشێكیشی عەشایری عەرەبن و ناو شارۆچكەكەش بە توركی قسە دەكەن و دانیشتوانی گوندی (عەنكاوە)ش كلدانین.

لە ناحیەی (بەڕانی)دا عەشیرەتی گەردی و نانەكەلی و شێخانی و مەمووندی و بزێنی دەژین و لە ناحیەی سوڵتانییەشدا بێجگە لە عەشایری كورد عەشایری عەرەبی هەن، وەک: تەی و سادات و حەرب و لەهێب و لەم ناحیەشدا عەشیرەتی دزەیی باڵا دەستن.

لە بەروبوومەكانی ئەم قەزایە: گەنم، جۆ، برنج، نیسک، ماش، پەمۆ و...تاد. گەنمەكەشی بۆ بەغدا و موسڵ ڕەوانە دەكرێ.

**ژمارەی گوند و ناحیەكانی هەولێریش بەم شێوەیەن**

| گوند | ناحیە و شوعبە |
|---|---|
| ٧٠ | گوندەكانی دەوروبەری شارۆچكەكە |
| ٤٨ | ١ ناحیەی سوڵتانیە |
| ٦٠ | ١ ناحیەی دزەیی |
| ١٢٢ | ١ شوعبەی ئەملاكی ئەمیرییەی شەمامک |
| ٣٠٠ | ٣ |

**ژمارەی دانیشتوانی قەزاش بەم شێوەیە بووە:**

| | |
|---|---|
| ئیسلام | ١٢٥٧٩ كەس |
| كلدانی كاتۆلیک | ٦٢٠ كەس |
| سریانی كاتۆلیک | --- |
| سریانی كۆن | --- |
| پرۆتستان | --- |
| ئەرمەن | --- |
| جوو | ١٠٥٦ كەس |
| كۆ | ١٤٢٥٥ كەس |

ئەمەیش ناوی قائیمقام و جێگری قائیمقام و موفتی و بەڕێوەبەری ماڵی و ئەندامانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی قەزا

و ئەندامانی دادگا و شارەوانی و فەرمانبەرەكانی گشت فەرمانگەكانی قەزان بەپێی سالّی دەرچوونی سالّنامەكان

١- هەولێر لە سالّنامەی (١٣٠٨ ك/ ١٨٩٠ز):

**قەزای هەولێر:**

قائیمقام: عەبدوڵلا پاشا (میری میران)
جێگر: - - - - -
موفتی: عەبدولرەحمان ئەفەندی
بەڕێوەبەری مالّی: وەلیەدین ئەفەندی
كاتبی تەحریرات: سەفوەت ئەفەندی

*** ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی قەزا**

سەرۆك: قائیمقام
ئەندامە سروشتییەكان: جێگر
موفتی
بەڕێوەبەری مالّی
كاتبی تەحریرات
ئەندامە هەلّبژێردراوەكان: محەمەد سەعید ئاغا
خدر ئاغا
نوری ئەفەندی
حەنا ئەفەندی

*** دادگای بیدایەت**

كاتبی یەكەم: داود ئەفەندی
یاریدەدەری لێكۆڵەرەوە: ئیسماعیل ئەفەندی
كاتبی دووەم: خورشید ئەفەندی
كاتبی دووەم: عەلی ئەفەندی
كاتبی دووەم: عومەر عومران ئەفەندی
جێبەجێكەر: حاجی ئەمین ئەفەندی
جێبەجێكەر: ئەحمەد ئاغا

*** ئەنجومەنی شارەوانیی**

سەرۆكی شارەوانیی: ئەحمەد ئاغا
ئەندامەكان: دەروێش ئاغا
مەحموود ئەفەندی
وەلی ئەفەندی
كاتب: یووسف ئەفەندی

ئەمینی سندووقی قەزا: عەبدوڵلا ئەفەندی
كاتبەكەی: سەید ئەمین ئەفەندی
مەئموری نفوس: رەشید ئەفەندی
مەئموری باج: تەقیەدین ئەفەندی
مەئموری تەلیگراف: وەحید ئەفەندی

*** ناحیەی سولتانیە**

بەڕێوەبەر: عەبدولڕەحمان ئەفەندی
كاتبەكەی:حوسێن ئەفەندی

*** ناحیەی دزەیی**

بەڕێوەبەر: محەمەد ئاغا
كاتبەكەی: عومەر ئەفەندی

*** مەكتەبی روشدییە**

موعەلیمی یەكەم: عەبدولحەكیم ئەفەندی
موعەلیمی دووەم: عەبدولقادر ئەفەندی

تێبینی: لە سالّی ١٣٠٨ی كۆچی ٣٪ دانیشتووانی شارۆچكەی هەولێر خوێندەوار بوون.

٢- هەولێر لە سالّنامەی (١٣١٠ ك/ ١٨٩٢ز)

*** قەزای هەولێر**

قائیمقام: عەبدوڵلا پاشا
جێگر: سەید ئەحمەد ئەفەندی
موفتی: عەبدولڕەحمان ئەفەندی
بەڕێوەبەری دارایی: وەلی ئەفەندی
كاتبی تەحریرات: سەفوەت ئەفەندی

*** ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی قەزا**

سەرۆك: قائیمقام
ئەندامە سروشتییەكان: جێگر
موفتی
كاتبی تەحریرات
ئەندامە هەلّبژێردراوەكان: سەید عەبدوڵلائاغا

خدر ئاغا
نوری ئەفەندی
حەنا ئەفەندی

*** دادگای بیدایەت**
کاتبی یەکەم: داود ئەفەندی
یاریدەدەری لێکۆڵەرەوە: ئیسماعیل ئەفەندی
کاتبی دووەم: خورشید ئەفەندی
ئەندامەکان: عەبدولڕەحمان ئەفەندی،
عەبدولڕەزاق ئاغا
جێبەجێکەر: سەعید ئاغا
جێبەجێکەر: ئەحمەد بەگ

*** ئەنجومەنی شارەوانی**
سەرۆک: حاجی ئەسعەد ئاغا
کاتب و ئەمینی سندوق: تاهیر ئەفەندی
ئەندام: مەحمود ئەفەندی

**مەئمورەکانی دیکە:**
ئەمینی سندووقی قەزا: عەبدوڵڵا ئەفەندی
کاتبی باج: حافز ئەفەندی
کاتبی باجی ناحیەی دزەیی: محەمەد موخلیس ئەفەندی
کاتبی باجی ناحیەی سوڵتانییە: ڕەشید ئەفەندی
مەئموری تەلیگراف: قەدری ئەفەندی
کاتبی تاپۆ: محەمەد موختار ئەفەندی
مەئموری نفوس: ڕەشید ئاغا
کاتبی نفوس: حەسەن ئەفەندی
مەئموری ئەنبار: سەعید ئەفەندی
مەئموری قەرزی گشتی: حەمادی ئەفەندی
مەئموری ئینحیسار: ئەحمەد بەگ

*** ناحیەی سوڵتانی**
بەڕێوەبەر: فارس ئاغا
کاتب: شاکر ئەفەندی

*** ناحیەی دزەیی**
بەڕێوەبەر: محەمەد ئاغا

*** مەکتەبی روشدییە**
موعەلیمی یەکەم: عەبدلحەکیم ئەفەندی
موعەلیمی دووەم: عەبدولقادر ئەفەندی
کاتب: نەوردس ئەفەندی

**مەئموری زەوی و زاری سەنیە:** لوتفی بەگ
کاتب: ڕەشید ئەفەندی
کاتب: ئەنوەر ئەفەندی

٣- هەولێر لە ساڵنامەی (١٣١٢ک/ ١٨٩٤ی ز)
*** قەزای هەولێر**
قائیمقام: عەبدوڵڵا پاشا
جێگر: سەید خەلیل ئەفەندی
موفتی: عەبدولڕەحمان ئەفەندی
بەڕێوەبەری دارایی: زەینەل ئەفەندی
کاتبی تەحریرات: سەفوەت ئەفەندی
*** ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی قەزا**
سەرۆک: قائیمقام
ئەندامە سروشتییەکان: جێگر
موفتی
بەڕێوەبەری ماڵی
کاتبی تەحریرات
حاجی خدر ئاغا
ئەندامە هەڵبژێردراوەکان: سەید عەبدوڵڵائاغا
خواجە ئەنتوان ئەفەندی
خواجە نوری ئەفەندی

*** دادگای بیدایەت**
سەرۆک: جێگر
ئەندامەکان: عەبدولڕەحمان ئەفەندی
حاجی ڕەشید ئاغا

یاریدەدەری لێکۆڵەرەوە: ئیسماعیل ئەفەندی
باشکاتب: داود موخلیس ئەفەندی
کاتبی دووەم: عەبدوڵلا ئەفەندی
موحەریر مقاوەلات: رەحمەتوڵلا ئەفەندی

*** قەڵەمی نفوس**
مەئموری نفوس: حاجی رەشید ئەفەندی
کاتب: حەسەن ئەفەندی

**مەئمورەکانی دیکە:**
بەڕێوەبەری پۆستە و تەلیگراف: نەشئەت ئەفەندی
ئەمینی سندوق: هیدایەت ئەفەندی
مەئموری قەرزی گشتی: حەمادی ئەفەندی
کاتبی باج: توفیق ئەفەندی
دابەشکەری تەلیگراف: سوڵتان ئاغا
کاتبی تاپۆ: موختار ئەفەندی
مەئموری ئەنبار: عەبدوڵلا ئەفەندی
مەئموری ئینحیسار: سەعید ئاغا
کاتبی باجی بەڕانی: رەشید ئەفەندی
وەکیلی ئەوقاف: سلێمان ئەفەندی

*** ئەنجومەنی شارەوانی**
سەرۆک: حاجی ئەحمەد ئاغا
ئەندامەکان: محەمەد ئەفەندی
حوسێن ئەفەندی
مەلا مەحموود
خواجە ئیلیاهوو
کاتب: تاهیر ئەفەندی
ئەمینی سندوق: باروخ ئەفەندی

*** بانکی کشتوکاڵ:**
سەرۆک: سلێمان ئەفەندی
ئەندامەکان: تەها ئاغا
ساڵح ئەفەندی
موختار ئەفەندی

حەسەن ئەفەندی
کاتبی ژمێریاری: مستەفا ئەفەندی
تەحسیلدار: ئیسماعیل ئەفەندی
مەئموری زابیتە: بلۆک ئاغاسی بەکر ئاغا

*** ناحیەی دزەیی (قوشتەپە)**
بەڕێوەبەر: محەمەد ئاغا
کاتب: حەسەن ئەفەندی
کاتبی باج: توفیق ئەفەندی

*** ناحیەی سوڵتانییە**
بەڕێوەبەر: سلێمان ئەفەندی
کاتب: عەبدولفەتاح ئەفەندی

*** مەکتەبی روشدییە**
موعەلیمی یەکەم: عەبدلحەکیم ئەفەندی
موعەلیمی دووەم: عەبدولقادر ئەفەندی
ژمارەی قوتابیان: ١٨

٤- هەولێر لە ساڵنامەی (١٣٢٥ک/ ١٩٠٦ز)
*** قەزای هەولێر**
پلە: دوو
قائیمقام: نیهاد بەگ
جێگر: سەید ساڵح ئەفەندی
موفتی: عەبدولڕەحمان ئەفەندی
بەڕێوەبەری ماڵی: عەباس عاسم ئەفەندی
کاتبی تەحریرات: محەمەد سەلیم ئەفەندی

*** ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی قەزا**
سەرۆک: قائیمقام
ئەندامە سروشتییەکان: جێگر
موفتی
بەڕێوەبەری ماڵی
کاتبی تەحریرات
ئەندامە هەڵبژێردراوەکان: خدر ئاغا

عەلی ئاغا
سەید ئەفەندی
خواجە یوسف

*** لیژنەی دادگا**
سەرۆک: جێگر (سەید سالح ئەفەندی)
ئەندام و لێکۆڵەرەوە: ئەمجەد ئەفەندی
ئەندام: سبی ئەفەندی
باشکاتبی دادگا: سلێمان سامی ئەفەندی
یاریدەدەری لێکۆڵەرەوە: عەبدولعەزیز ئەفەندی
جێبەجێکەران: سەعید ئاغا، عوربان ئاغا

*** لیژنەی دارایی**
بەڕێوەبەری ماڵی: عەباس عاسم ئەفەندی
کاتبی باجی شارۆچکە: عەبدوڵلا ئەفەندی
کاتبی باجی بەرانی: عەبدولغەنی بەگ
کاتبی باجی دزەیی: عەلی سائب ئەفەندی
ئەمینی سندوق: رەشید ئەفەندی
پشکێنەری تەحسیلات: ئەمین ئەفەندی
ژمارەی سوارەی تەحسیلدار: ٤
ژمارەی پیادەی تەحسیلدار: ٢
دائیرەی شارەوانی
سەرۆک: عەبدولرەزاق ئاغا
ئەندامەکان: ئیسماعیل ئەفەندی، حاجی ئیسماعیل ئەفەندی، خدر ئەفەندی، یوسف ئەفەندی

*** مەئمورەکانی دیکە**
بەڕێوەبەری پۆستە و تەلیگراف: حاجی عەباس ئەفەندی
مەئموری موخابەرە: سامی ئەفەندی
مەئموری قەرزی گشتی: فەرحان ئەفەندی
مەئموری زابیتە: سەید رەفیق ئەفەندی
مەئموری نفوس: ساڵح ئەفەندی
کاتبی نفوس: عەبدولقادر ئەفەندی
مەئموری ئینحیسار: عەدولحافز ئەفەندی

کاتبی تاپۆ: موختار ئەفەندی
وەکیلی کاتبی بانق: سەید ئیسماعیل ئەفەندی
موعەلیمی مەکتەبی روشدییە: عەبدولکەریم ئەفەندی
موعەلیمی مەکتەبی روشدییە: محەمەد ئەفەندی
موعەلیمی مەکتەبی روشدییە: رەئوف ئەفەندی

*** ناحیەی دزەیی**
بەڕێوەبەر: سالح ئەفەندی
کاتب: عەبدولمەجید ئەفەندی

*** ناحیەی سولتانییە**
بەڕێوەبەر: محەمەد عەلی ئەفەندی
کاتب: نوری ئەفەندی

٥- هەولێر لە ساڵنامەی (١٣٣٠ک/ ١٩١٢ز)
*** قەزای هەولێر**
قائیمقام: محەمەد عەلی بەگ
جێگر: سلێمان بەگ
موفتی: عەبدوڵلا فازل ئەفەندی
بەڕێوەبەری ماڵی: مەحموود جەلالەدین ئەفەندی
کاتبی تەحریرات: محەمەد سەلیم ئەفەندی

*** ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی قەزا**
سەرۆک: قائیمقام
ئەندامە سروشتییەکان: جێگر
موفتی
بەڕێوەبەری ماڵی
کاتبی تەحریرات
ئەندامە هەڵبژێردراوەکان: سەید ئاه ئاغا
حاجی خدر ئاغا
شابۆ ئاغا
یوسف نوری ئەفەندی

*** دادگای شەرعی**
جێگری شەرع: سلێمان بەگ

باشکاتب: داود ئەفەندی
کاتبی دووەم: فەیزی ئەفەندی

*** دائیرەی نفوس**
مەئمور: ساڵح ئەفەندی
کاتب: بەکر ئەفەندی

*** قەڵەمی ماڵی**
بەڕێوەبەری ماڵی: مەحموود جەلالەدین ئەفەندی
جێگر: مستەفا ئەفەندی
کاتبی دێیەکان: محەمەد رەئوف ئەفەندی
کاتبی موفرەدات: نوری ئەفەندی
مەئموری تەحسیلات: عەلی بەگ
ئەمین سندووق: رەشید ئەفەندی

*** دادگای بیدایەت**
باشکاتب: سلێمان ئەفەندی
ئەندام:حاجی رەشید ئاغا
جێگری لێکۆڵەرەوە: عەزیز ئەفەندی
مەنسور ئەفەندی
موحەریری مقاوەلات: ئەحمەد جەمیل ئەفەندی
کاتبی دووەم: سەبری ئەفەندی

*** دائیرەی شارەوانی**
سەرۆک: عەلی سامی ئەفەندی
کاتب: یوسف زیا ئەفەندی
ئەمینی سندوق: عەبد ئاە ئەفەندی

*** مەکتەبی روشدییە**
موعەلیم: عەبدولقادر ئەفەندی
ژمارەی قوتابیان: ٢٩
موعەلیمی یەکەمی سەرەتایی: مەولود ئەفەندی
موعەلیمی دووەمی سەرەتایی: عەبدولکەریم ئەفەندی
ژمارەی قوتابیان: ٨٦
مەکتەبی قەڵاتی سەرەتایی
موعەلیمی یەکەم: رەئوف ئەفەندی
موعەلیمی دووەم: مستەفا ئەفەندی
ژمارەی قوتابیان: ٦٩

**مەئمورەکانی دیکە**
بەڕێوەبەری تەلیگراف: وەحید ئەفەندی
مەئمور: ئەسعەد ئەفەندی
مەئمور: عیزەت ئەفەندی
مودەریس: محەمەد ئەفەندی
مەئموری قەرزی گشتی: عەلی ئەفەندی
کاتبەکەی: جۆرجی ئەفەندی
مەئموری ئینحیسار: عەلی رەزا ئەفەندی
کاتبی تاپۆ: فەتح ئاە ئەفەندی

*** ناحیەی سوڵتانییە**
بەڕێوەبەر: محەمەد عەلی ئەفەندی
جێگر: مستەفا فەوزی ئەفەندی
کاتبی ناحیە: مەحمود فەهمی ئەفەندی

*** ناحیەی دزەیی**
بەڕێوەبەر: ساڵح ئەفەندی
جێگر: نائب ئەفەندی
کاتب: مەجید زوهدی ئەفەندی

سەرچاوەکان:
١- ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٠٨ی ک.
٢- ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠ی ک.
٣- ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٢ی ک.
٤- ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٢٥ی ک.
٥- ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠ی ک.

**ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٥)، زستانی (٢٠٠٠) بلاوبۆتەوە.**

# کۆیە لە ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵدا

## فەیسەڵ دەباغ

کۆیە سەر بە سنجەقی شارەزوور و ئەویش سەر بە ویلایەتی موسڵ بووە، سەرەڕای شارەزووریش ئەم ویلایەتە دوو سنجەقی دیکەی هەبووە، کە یەکێکیان سنجەقی موسڵ و ئەویتریان سنجەقی سلێمانی بووە. سنجەقی شارەزوور بێجگە لە قەزای کۆیە، پێنج قەزای تریشی هەبووە، قەزای کەرکووک (کە مەڵبەندی سنجەقەکە بوو)، قەزای سەلاحیە (واتە کفری)، قەزای هەولێر، قەزای رانیە، قەزای رەواندز.

بەپێی ساڵنامەی ساڵی ۱۳۰۸ی کۆچی (۱۸۹۰ز)و ساڵنامەی ساڵی ۱۳۱۰ی کۆچی (۱۸۹۲ی ز)و ساڵنامەی ساڵی ۱۳۱۲ی کۆچی (۱۸۹٤- ۱۸۹٥ی)و ساڵنامەی ساڵی ۱۳۲٥ی کۆچی (۱۹۰٦ز) دا بەم شێوەیە باس لە قەزای کۆیە کراوە: (دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی مەڵبەندی سنجەقەکە و ۱۸ سەعاتەڕێ لێی دوورە، دوو ناحیەی هەیە کە یەکێکیان شەقڵاوەیە و ئەویتریان (بالیسان)ە.

گشت دانیشتوانی قەزاکە کوردن، تەنها گوندی (ئارمودە) نەبێ، کە نیو سەعاتەڕێ لە مەڵبەندی قەزاکە دوورەو ۱۰ خانووی کلدانیانی تێدایە، قەزای کۆیە بە چاندنی تووتن بەناوبانگە و شارۆچکەکەی کۆیەش دەکەوێتە رۆژئاوای دامێنی چیای "ئەیوب سوڵتان" و ئاوی زۆرە و ژمارەی دانیشتووانیشی ٤۲۰۰ کەسە.

شارۆچکەکەش ۱ بینایەی حکومەت و ۱ قشڵەی هومایۆنی و ۱رەدیفی دەبوەی[1] و ۱ مزگەوتی (جامع) و ۱۰ مزگەوتی گچکە و ٦ مەکتەبی منداڵان و ۲ مەدرەسە و ۳ تەکیە و ۱٤۲۰ خانوو و ۳٤۰ دوکان و ٥ قاوەخانە و ۸ ئاش و ۳ حەمام و ۱ فرن و ۱ دائیرەی رەژی[2] تێدایە.

بەپێی ساڵنامەی ساڵی ۱۳۳۰ی کۆچی (۱۹۱۲ی زایینی)یش بەم شێوەیە باس لە قەزاکە دەکرێ: "قەزای کۆیە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی مەڵبەندی سنجەقی شارەزوور، خاکەکەی شاخاوییە و بێجگە لە ژمارەیەک گوند دوو ناحیەشی هەیە، مەڵبەندی قەزا ۱۸ سەعاتەڕێ لە مەڵبەندی سنجەقەکە دوورە و دەکەوێتە داوێنی چیای ئەیوب سوڵتانەوە. شارۆچکەیەکی فراوانە و ئاوێکی زۆری هەیە و باغ و باغاتیشی لە ژمارە نایەن، دانیشتووانی بەگشتی کوردن و بە زمانی کوردی قسە دەکەن، تەنها چەند بەرپرسێکی دەوڵەتی نەبێ، کە بە تورکی قسە دەکەن، کۆیە بە بازرگانی تووتن خەریکە و چەند پیشەیەکی میللیشی تێدایە. ئەمەش خشتەیەکە بە ژمارەی دانیشتووانی قەزاکە و ژمارەی بینایەی گشتی و تایبەتییەکانی:

**بینایە گشتییەکان**

۱۱جامع و مزگەوت (۱جامع + ۱۰ مزگەوت)، ۳ تەکیە، ٦ مەکتەبی منداڵان، ۳ مەدرەسە، ۱ بینایەی حکومەت، ۱ قشڵە، ۱ رەدیفی دەبوەی.

**شوێنە تایبەتییەکان**

۱٤۲۰ خانوو، ۲ خان، ۳٤۰ دوکان، ٥ قاوەخانە، ۳ حەمام، ۱ فرن، ۸ ئاش.

هەروەکو گوتمان قەزای کۆیە دوو ناحیەی هەبوو: شەقڵاوە و بالیسان، ئەم دوو ناحیەش خاوەنی ۲٥۲ گوند بوون و لە شەقڵاوەش ژمارەیەک کلدانی و ئیسرائیلی تێدایە.

ئەمەیش ناوی قائیمقام و جێگیری قائیمقام و موفتی و مودیری ماڵ و ئەندامانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی قەزا و ئەندامانی دادگا و شارەوانی و فەرمانبەرەکانی گشت فەرمانگەکانی قەزاکەن بە پێی ساڵی دەرچوونی ساڵنامەکان:

### ١- کۆیە لە ساڵنامەی ١٣٠٨ی کۆچی ١٨٩٠ی زاینیدا:

قایمقام: نەشئەت ئەفەندی، جێگری قایمقام: ئەحمەد ئەفەندی، موفتی: ساڵح ئەفەندی، مودیری مال: محەمەد ئەفەندی، کاتبی تەحریرات: سەلیم ئەفەندی، ئەنجوومەنی ئیدارەی قەزا، سەرۆکی ئەنجوومەن: قائیمقام.

**ئەندامە ئاساییەکان:**
جێگر، مودیری مال، کاتبی تەحریرات.

**ئەندامە هەڵبژێردراوەکان:**
محەمەد ئەمین ئەفەندی، حەسەن ئەفەندی، جەرجیس ئەفەندی.

**دادگای بیدایەت**
کاتبی یەکەم: سدقی ئەفەندی، یاریدەدەری موستەنتیق:[٣] عارف ئەفەندی، کاتبی دووەم: عەلی ئەفەندی، ئەندامەکان: مەلا ئەحمەد ئەفەندی، شێخ یەحیا ئەفەندی، ئیجرای موباشر[٤]: محەمەد سەعید ئاغا، غەریب ئاغا.

**ئەنجومەنی شارەوانی**
سەرۆکی شارەوانی: عەبدوڵلا ئاغا، ئەندامەکان: زەن ئەفەندی، مستەفا ئەفەندی، کاتب: ئەمین ئەفەندی، ئەمینی سندوق: خورشید ئەفەندی، کاتبی باج: عەبدوڵلا عارف ئەفەندی، مەئموری نفوس: مەحمود ئەفەندی.

**ناحیەی داقوق**
مودیری ناحیە: سادق
کاتب: ئەمین ئەفەندی

### ٢- کۆیە لە ساڵنامەی ١٣١٠ی کۆچی ١٨٩٢ی زاینیدا:

قایمقام: عەباس ئەفەندی، جێگری قائیمقام: ئەحمەد ئەفەندی، موفتی: سالم ئەفەندی، مودیری مال: عەبدولرەزاق ئەفەندی، کاتبی تەحریرات: سەلیم ئەفەندی.

**ئەنجوومەنی ئیدارەی قەزا**
سەرۆک: قائیمقام

**ئەندامە ئاساییەکان:**
جێگر، موفتی، مودیری مال، کاتبی تەحریرات.

**ئەندامە هەڵبژێردراوەکان:**
حاجی عەبدوڵلا ئەفەندی، حەسەن ئەفەندی، ئیبراهیم ئەفەندی

**دادگای بیدایەت**
باشکاتب: سەید عەبدوڵلا ئەفەندی، یاریدەدەری موستەنتیق: عارف ئەفەندی، کاتبی دووەم: عەلی ئەفەندی، ئەندامەکان: شێخ یەحیا ئەفەندی، تەها چەلەبی، ئیجرای موباشر: محەمەد سەعید ئاغا، غەریب ئاغا.

**ئەنجومەنی شارەوانی**
سەرۆکی شارەوانی: عەبدوڵلا ئاغا، ئەندامەکان: ئەمین ئەفەندی، تەها ئەفەندی، مستەفا ئەفەندی، کاتب: عەبدوڵلا ئەفەندی

**مەئمورەکانی تر**
کاتبی باج: خورشید ئەفەندی، مەئموری نفوس: مەحمود ئەفەندی، مەئموری دیون عمومیە[٥]: عومەر ئەفەندی، کاتبی تاپۆ: عەلی ئەفەندی، ئەمینی سندوق: عەلی ئەفەندی

**فەرمانگەی رژی**
بەڕێوەبەر: شەفیق ئەفەندی (سێیەم)، کاتب: خدر ئەفەندی، یاریدەدەری کاتب: عەزیز ئەفەندی.

### ٣- کۆیە لە ساڵنامەی ١٣١٢ی کۆچی) ١٨٩٤/ ١٨٩٥ی(زاینیدا:

قایقام: عەباس ئەفەندی (چوارەم)، جێگری قائیمقام: ئەحمەد عزەت ئەفەندی، موفتی: محەمەد ساڵح ئەفەندی، مودیری مال: عەبدولرەزاق ئەفەندی، کاتبی تەحریرات: سەلیم ئەفەندی.

**ئەنجومەنی ئیدارەی قەزا**
سەرۆک: قائیمقام.

**ئەندامە سروشتییەکان:**
جێگر، موفتی، مودیری مال، کاتبی تەحریرات.

**ئەندامە هەڵبژێردراوەکان:**
رەسول ئاغا، حاجی عەبدوڵلا ئاغا، حەسەن ئەفەندی، موسا ئەفەندی.

**دادگای بیدایەت**

سەرۆک: جێگری قایمقام، ئەندامەکان: تەها ئەفەندی، شێخ یەحیا ئەفەندی، باشکاتب: سەید عەبدوڵلا ئەفەندی، کاتبی دووەم: عەبدوڵلا ئەفەندی، یاریدەری موستەنتیق: محەمەد عارف ئەفەندی.

**قەڵەمی نفوس**

مەئموری نفوس: مەحمود نەدیم ئەفەندی،کاتب: محەمەد سەعید ئەفەندی.

**مەئمورەکانی دیکە**

ئەمین سندوق: عەلی نەزهەت ئەفەندی، مەئموری پۆستە و تەلەگراف: تاهیر ئەفەندی، مەئموری قەرزی گشتی: عومەر ئەفەندی، کاتبی باج: محەمەد خورشید ئەفەندی، کاتبی تاپۆ: عەلی یاوز ئەفەندی، مەئموری زابیتە: سەعید ئاغا.

**دائیرەی شارەوانی**

سەرۆک: سادق ئەفەندی، کاتب: محەمەد ئەسعەد ئەفەندی.

**ئەندامانی شارەوانی**

دەروێش ئەفەندی، حاجی محەمەد ئەفەندی، حەوێز ئەفەندی، ساڵح ئاغا، خواجە یەلدا.

**ناحیەی شەقلاوە**

بەڕێوەبەری ناحیە: شەوقی ئەفەندی، کاتب: حاجی ئەمین ئەفەندی.

**ئیدارەی رەژی**

بەڕێوەبەری: عەلی ئاگا ئەفەندی، باشکاتب: یوسف ئەفەندی، کاتبی دووەم: عەزیز بەگ، مەئموری سەیار[٦]: ئەمین ئەفەندی.

**٤- کورتە لە سالنامەی) ١٣٢٥ی کۆچی ١٩٠٦ ی(زاینیدا:**

سنف: ٣، قایمقام: عەبدولسەتار ئەفەندی (سێیەم م٤)، جێگر: قوتب زادە ئەحمەد ئەفەندی (مودەریس)، موفتی: حاجی محەمەد ساڵح ئەفەندی، مودیری مال: سەید محەمەد ئەمین ئەفەندی، کاتبی تەحریرات: عومەر فەوزی ئەفەندی.

**ئەنجوومەنی ئیدارەی قەزا**

سەرۆک: قایمقام.

**ئەندامە سروشتییەکان:**

جێگر، موفتی، مودیری مال، کاتبی تەحریرات.

**ئەندامە هەڵبژێردراوەکان:**

حەوێزی زادە عەبدوڵلا ئاغا، غەفوری زادە مەلا دەروێش ئەفەندی، عەبدولکەریم ئەفەندی، موسا ئەفەندی.

**دادگای بیدایەت**

سەرۆک: جێگر (قوتب زادە ئەحمەد ئەفەندی)، باشکاتب: خدر ئەفەندی، یاریدەری موستەنتیق: مەجید ئەفەندی، ئەندامەکان: تەها تاهیر ئەفەندی، حاجی مەحمود ئەفەندی

**هەیئەت دارایی**

مودیری مال: سەید محەمەد ئەمین ئەفەندی، یاریدەدەر: سەید ئەمین ئەفەندی، ئەمینی سندوق: عەلی نەزهەت ئەفەندی، کاتبی باج: سەید ئەمین ئەفەندی، موفەتیشی تەحسیلات: عەبدولهادی ئەفەندی، تەحسیلداری سوارە: ٢ کەس، تەحسیلداری پیادە: ١ کەس.

**دائیرەی شارەوانی**

سەرۆک: غەفوری زادە سادق ئاغا، کاتب: عومەر ئەفەندی، ئەندامەکان: حەوێز ئاغا، حاجی محەمەد ئەفەندی، محەمەد مستەفا ئاغا، محەمەد ئاغا.

**دائیرەی نفوس**

مەئمور: مەحمود ئەفەندی، کاتب: شوکر ئەفەندی.

**دائیرەی رەژی**

بەڕێوەبەر: عەبدوللەتیف ئەفەندی، باشکاتب: محەمەد حەمدی ئەفەندی، کاتبی دووەم: محەمەد شاکر ئەفەندی.

**مەئمورەکانی تر**

بەڕێوەبەری تەلەگراف: زەینەل ئەفەندی، مەئموری قەرزی گشتی: جەعفەر ئەفەندی، مەئموری زابیتە: مولازمی یەکەم داود ئەفەندی، کاتبی تاپۆ: عەبدوڵلا رەشاد ئەفەندی، مامۆستای مەکتەبی سەرەتایی: حوسێن حوسنی ئەفەندی، تەحسیلداری بانق: حاجی ئەمین ئەفەندی.

### ناحیەی شەقلاوە
وەکیلی بەڕێوەبەری: بایەزید بەگ، کاتب: سەید ئیبراهیم ئەفەندی.

### ٥- کۆیە لە سالنامەی (١٣٣٠ی کۆچی ١٩١٢ ی) زاینیدا:
قائیمقام: حاجی حەسەن ئەفەندی، جێگری قائیمقام: سابیر ئەفەندی، موفتی: سالح ئەفەندی، مودیری مال: زەینەل ئەفەندی، کاتبی تەحریرات: سلێمان بەگ.

### ئەنجوومەنی ئیدارەی قەزا
سەرۆک: قائمقام ئەفەندی.

### ئەندامە سروشتییەکان:
جێگر، موفتی، مودیری مال، کاتبی تەحریرات.

### ئەندامە هەڵبژێردراوەکان:
حاجی عەبدوڵلا ئەفەندی، عەبدولکەریم ئەفەندی، مەلا ئەحمەد ئەفەندی، عەزیز ئەفەندی.

### دادگای شەرعی
جێگر شەرع: سابیر ئەفەندی، باشکاتب: تۆفیق ئەفەندی، کاتبی دووەم: حەقی ئەفەندی.

### دائیرەی نفوس
مەئمور: قادر ئەفەندی، کاتب: رەئوف ئەفەندی.

### قەڵەمی دارایی
مودیری مال: زەینەل ئەفەندی، یاریدەدەر: موخلیس ئەفەندی، کاتبی موفرەدات: شاکر ئەفەندی، ئەمینی سندوق: عەلی نەزهەت ئەفەندی، تەحسیلداری پیادە: حاجی ئەحمەد ئەفەندی، مەئموری تەحسیل: ئەحمەد بەگ، سوارەی تەحسیلدار: عەبدوڵلا ئەفەندی، سوارەی تەحسیلدار: سالح ئەفەندی، سوارەی تەحسیلدار: فەتحوڵلا ئەفەندی.

### دادگای بیدایەت
باشکاتب: خضر ئەفەندی، کاتبی دووەم: یونس ئەفەندی، یاریدەری موستەنتیق: تۆفیق ئەفەندی، ئەندامەکان: مەلا دەرویش ئەفەندی، تاهیر ئەفەندی، ئیجرای موباشیری: محەممەد ئاغا، عەلی ئاغا.

### دائیرەی رەژی
بەڕێوەبەر: محیەددین ئەفەندی، باشکاتب: - - - - - - - - - -، کاتبی دووەم: - - - - - - - - - -.

### مەئمورەکانی دیکەی قەزا
کاتبی تاپۆ: عەبدوڵلا رەشاد ئەفەندی، بەڕێوەبەری تەلەگراف: نائل ئەفەندی، موعەلیمی مەکتەبی سەرەتایی: حوسێن حوسنی ئەفەندی، مودەریس: خدر ئەفەندی، یاریدەدەری: عەبدولعەزیز ئەفەندی، ژمارەی قوتابیان: ١٢٧.

### ناحیەی شەقلاوە
بەڕێوەبەر: رەمزی بەگ، کاتب: سەعید ئەفەندی.

### پەراوێزەکان
١- رەدیفی دەبوەی: رەدیف هێزێکی یەدەگە و پاش هێزی نیزامی دێ، (دەبوەی)ش وشەیەکی فەرەنسییە، کە بە واتای ئەنباری چەک و جل و بەرگی سەربازی دێ.
٢- رەژی: واتە (دائیرەی ئینحیسار).
٣- موستەنتیق: وشەیەکی عەرەبییە (مستنطق)ە لە تورکی کۆندا بە واتای (تحقیق)ی عەرەبی بەکار دەهات، واتە لێکۆڵینەوە لەگەڵ تاوانباردا.
٤- ئیجرای موباشیر: وشەیەکی عەرەبییە و ئێستا بە واتای (تنفیذ) دێ.
٥- دیونی عمومیە: وشەیەکی عەرەبییە و بە واتای قەرزی گشتی یان قەرزی دەوڵەت دێ.
٦- مەئموری سەیار: واتە مەئموری گەڕۆک.

### سەرچاوەکان
١- سالنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٠٨ی کۆچی.
٢- سالنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠ی کۆچی.
٣- سالنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٢ی کۆچی.
٤- سالنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٢٥ی کۆچی.
٥- سالنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠ی کۆچی.

# شەڕی تورک و ئینگلیز لە دەشتی کۆیە

تاهیر ئەحمەد حەوێزی

کە ئینگلیزەکان لە شەڕی دەربەندی رانیە شکان و گەڕانەوە کۆیە، لە "بیتوێن" زۆریان لە قوڕ و ئاوی برنجی عاسێ بوون[٢]. ئینگلیزەکانی کە لە کۆیە بوون، هەندێکیان لەسەر گردی "شێخ مستەفا"ش هەڵیاندابوو. مەنجەڵی چێشتیان لەسەر ئاگری بوو و دەیانڕشت، بە پەلە باریان کرد و کۆیەیان بەجێهێشت، گەڕانەوە هەولێر.

ئینگلیزەکان لەبەر دەرکی مزگەوتی گەورە راوەستان. ئەوەی لە نوێژی دەهاتە دەر دەیانگرتن. لەجیاتی ولاغ، جەنازەی کوژراوەکانیان و بریندارەکانیان بە بێگار پێ هەڵدەگرتن. دارەبەستیان بۆ دەکردن، هەر بە چوار کەسان یەکێکیان هەڵدەگرت، هەتا "تەقتەق"یان دەبردن. زۆر پیاوی بە شان و عەبایان بەم چەشنە پێش خۆیان دا. هەندێ ئەفسەری ئینگلیزی هیچیشیان نەبوو. لە ترسان خۆیان نەخۆش و شەل کردبوو، تا بە پێیان نەڕۆن، دەچوونە کۆڵی ئەو زەلامانە!

لەو شەڕەدا، کوردەکان خۆیان بە کوشت دەدا. کەچی چەند پەڕاگەندەیەکی تورک، هونەرەکەیان کردبووە ئی خۆیان. تورکیا بەو ناوەی کە "ویلایەتی موسڵ" بە شەڕ نەگیراوە، سوودی لێ ببینێ.

لەپاش شەڕی دەربەندی رانیە[٣]، دەشتی "بیتوێن"ی مەیتێکی زۆری لەشکری "ئینگلیزی" لێ کەوتبوو. کێخوا "حەوێز"ی "شاخە پیسکە" دەیگوت: ("سیک و بانی" ئێوە لە کوێ؟ چەقەڵی "بیتوێن" ئێوە لەکوێن؟!")[٤].

کە ئینگلیزەکان رۆیشتن، "جەمیل ئاغا" و "عەولا ئاغا" - کە پیاوی زۆر بە دەم بوون - لە سەرایە کۆبۆنەوە. "جەمیل ئاغا" گوتی: "با جەنابی "مەلا محەمەد"یش بانگ بکەین." "عەبدوڵڵا ئاغا" قیت دەبێتەوە و دەڵێ: "ئەو مەلا و دەست و پێ سپییە، حەقی بەسەر ئیشی واوە چییە؟" لەگەڵ ئەمەش مەجلیسێکی نیشتمانی بۆ ئیدارەی شارەکە دادەنێن و جەنابی مەلای دەکەنە سەرۆکی مەجلیسەکە و وەزیفەی قازییەتیشی هەر هەبێ، "جەمیل ئاغا" و "کەریم ئاغا"ی "حەوێزی" و "رەسول ئاغا" و مەلا حەوێز ئاغای غەفووریش ئەندام بوون. لە مزگەوتی گەورە کۆدەبنەوە و سوێند دەخۆن، کە خیانەت لە واجبات نەکەن[٥].

"عەبدوڵڵا ئاغا" ویستی ببێتە قایمقام، رەئیس مەجلیس لایەنگیری "جەمیل ئاغا" بوو.

ناخۆشی کەوتە بەینی ئەندامەکان، "مەلا حەویز ئاغا"ش ئیستفادەی لێ کرد.
"شێخ عەزیز"ی "شێخ مەعرووف"ی بە (٣٠ - ٤٠) سواری ویستی مالی باربکا و بچێتە "هەڵەبجە". "جەمیل ئاغا" موافەقەتی کرد.
ئەوجا چوون تورکەکانیان لە دیوی "رانیە" هێنا. "کەریم ئاغای حەویزی" سەرکردەی سوارەی "حەویزی"یان، "مەلا حەویز ئاغا"ش سەرکردەی سوارەی غەفووربیەکان، ئەمانە هەتا لای "سەرخمە"ی چوون. پیاوانی تری کۆییش هەتا بن گونبەتی "هەیبەت سولتانی" چوون.
"رەمزی بەگ" بووە میوانی "مەلا ئەحمەد ئاغا"ی "مام سلێمانی" غەفووری، خۆی کردە قایمقام. "ناجی"ش کاروباری عەسکەری بە دەستەوە گرت، "حاجی ئاورەحمان ئاغا"ی مام سلێمانی بووە "مەئمور"ی "مەرکەز". قادری سولتانی، تۆفیقی خالیدی، عەزیزی مستەفا ئاغای رەسولی جەلیل ئاغای بوونە جەندرمە. "حەمەد"ی "مام خدر"ی چاکەتێکی عەسکەری لەبەرکرد و مەترەقێکی بەدەستەوە گرت و خۆی کردە قانوون[٦].
تورکەکانیش "عەبدولفەتاح ئاغای عەبدوللاتاغا"یان کردە بەرێوەبەری ناحیەی تەقتەق.
تورکەکان لەسەر قولغەکانی قشلەی چەلەگەی داری درێژیان دانابوو تا تەیارە بە لوولە تۆپی تێبگا. قەشەیان لە حەوشی سەرایە، "مالم"ی جوولەکانیشیان لە حەوشی قشلەی بەستبۆوە. دەیان گوت: "ئەوانەش کافرن لەبەر ئەمانە "ئینگلیز" ئەو جێیانە بۆردومان ناکا. بەڵام دیانەکان مراجعەیان بە "سالح ئاغا"ی "غەفوری" کرد و قەشەیان بەردا.

پەراوێزەکان

١- هەندێک دەڵێن: "ئینگلیز پیلانی شەڕی دەربەندی داناوە، تا ناوچەی "پشدەر" چۆڵ بکا و چەک و ئەسلەحەی بخاتە دەست عەشیرەتەکانی ئەو ناوە".
٢- تەماشای کتێبی مستەر ئەدمۆنس "کورد و تورک و عەرەب" بکە.
٣- کە پێشان بە دەربەندی "رەمکان" ناسراوە.
٤- ئینگلیزەکان ولاغێکیان دابووە "حاجی کاک ئەسعەد" سەری رادەکێشا، "مەلا رەشیدی عەیشانێ" دەڵێ: "کو دەبی ئەتوو ولاغی رابکێشی، بیدە من"، ولاغەکەی لێ وەردەگری، کە دەزانن هیچی پێ نییە، ئەوجا مردووەکی بە کوڵی حاجی کاک ئەسعەد دادەدەن. هەتا تەقتەق، ئەوجا لە "مەلا رەشید"ی توورە ببوو، هەموو جارێ قسەی پێدەگوت.
٥- کە "جەمیل ئاغا" دەگەرێتەوە مال، بە حەوشی مزگەوتی گەورەدا دەڕوا، کە ئەوسا دەرگەی سەرایە بەرامبەر مزگەوتی گەورە دەبی، مەلای گەورەش لە حەوشی مزگەوتەکە هاتوچۆی دەکا و بە "جەمیل ئاغا"ی دەڵێ: "جەمیل ئاغا ئەوە چ بوو؟" - توومەز قسەکەی بیستبۆوە - "مادام ئەمن حەقم نەبی، پرسیشم پێ مەکەن". "جەمیل ئاغا"ش دەڵێ: "چ نەبووە، چ نەبووە".
٦- ئێستا (١٩٨٢) زۆر کەس ماون، کە ئەو دەورەیان بە باش و بە دوورودرێژی دیوە و لەبیرماوە، بەڵکو تێیدا بەشداریش بوون.

* ئەم بابەتە لە کتێبی "مێژووی کۆیە"ی، تاهیر ئەحمەد حەویزی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، ١٩٨٤ وەرگیراوە.

*

# ڕەواندز لەپاش ڕووخانی میرنشینی سۆران

ئەحمەد حەمەدەمین ئۆمەر
کۆلێژی ئاداب-زانکۆی سەلاحەددین

**دەسپێک:**

شاری ڕەواندز دەکەوێتە نزیک بە سێ گۆشەی سنووری)عێراق- ئێران -تورکیاوە(، لە سەر هێڵی پانی (٣٧) و هێڵی درێژی (٤٤) بە نزیکەی ١٠٠٥مەتر بەرزی لە سەر ئاستی ڕووی دەریاوە، کە لە باشووری ڕۆژهەڵاتییەوە شاری ورمێ و شنۆیە، لە ڕۆژهەڵاتیشی شاری مەهابادەو، لە باکووری ڕۆژئاوای شاری هەولێرە. ڕەواندز لە هەر چوار لایەوە بە زنجیرە شاخ دەورەدراوە کە لە باکوورییەوە زنجیرە چیای "زۆزگ" و "حەسەن بەگ"و برادۆست"ە، لەڕۆژهەڵاتییەوە چیای "هندرێن"و "دۆڵی باڵەکیان"ە، لە ڕۆژئاواشیدا "گردێنە" و "باپیشتیان"و گۆرەز"و چیای "باڵەکیان"و لە باشووریشدا چیای "کۆڕەک" و ئارموشەو بێجانە.

شیاوی باسە ڕەواندز پێشینەیەکی مێژوویی گرنگی هەیە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و کارگێڕی و ئابووری و سیاسییەوە، بە تایبەت دوای بوونی بە پایتەختی میرنشینی سۆران و بەتایبەتتر لە سەردەمی فەرمانڕەوای میر محەمەدی گەورە(١٨١٣- ١٨٣٦)[١] کاتێک ئەو پێشکەوتنە گەورەی بە خۆیەوە بینی لە گشت بوارەکاندا، کە هەندێکیان کاریگەرییان لە دواتریش هەر بەسەریەوە دیار بوو، بەڵام ڕەنگە باسکردنیان بەسەر یەکەوە سانا نەبێت. بۆیە لێرەدا ئێمە باس لە کورتەیەک لە ڕەوشی کۆمەڵایەتی و کارگێڕی و ئابووری ڕەواندز دەکەین لە دوای ڕووخانی میرنشینی سۆران تا سەرهەڵدانی جەنگی یەکەمی جیهانی کە قۆناغێکە لە قۆناغی بەر لە خۆیی و دوای خۆیدا جیاوازە.

ئەڵبەتە بۆ بەرهەمهێنانی ئەو باسە پشتمان بە ژمارەیەک سەرچاوە بەستووە، وەکو دەستنووسی مێژووی سۆرانی مەلا ئەسعەدی خەیلانی، مێژووی میرانی سۆرانی حوسێن حوزنی موکریانی لەگەڵ ژمارەیەک ساڵنامەی ویلایەتی مووسڵ، کە وەک چاپکراوی فەرمی لە هەندێ کات زانیارییەکانی پشتڕاست کردۆتەوە. ئیتر ئەمانەو ژمارەیەک سەرچاوەی تر سوودی لێ وەرگیراوە، کە لە ڕیزبەندی سەرچاوەکان ئاماژی پێکراوە.

دیارە ئەو باسەش لە هەڵەو کەموکورتی بە دوور نییە، بۆیە دەخوازم بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە سەیر بکرێت تا لە ئایندەدا بتوانرێت باشتر بکرێت. سەرکەوتن و سەرفرازی لە خواوەوەیە[٢].

## ڕەوشی کۆمەڵایەتی و کارگێڕی و ئابووری ڕەواندز

سروشتی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ڕەواندز بەدەر نییە لە سروشتی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردەواری، کە لە سەردەمانی کۆنەوە لە سەر بناغەی پاشماوەی بە هێزی

هۆزەکی دامەزرابوو، ئەو پەیوەندییە هۆزەکییەش نەک تەنیا دەستی بە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی کۆچەرەکان و نیمچە کۆچەرەکان داگرتبوو، بەڵکو دەستی بە سەر ژیانی کۆمەڵگا نیشتەجێبووەکانیش گرتبوو[٣].

سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بۆ ژمارەیەکی جیاواز لەو هۆزانە دەکەن کە لە ڕەواندزو ناوچەکانی سەر بە ڕەواندز هەبووە[٤]. بەڵام "ڕۆلنسۆن" هۆزی ڕەوادی بە گەورەترین هۆز لە هۆزەکانی ڕەواندز دەداتە قەڵەم، کە ئەمانیش دابەش دەکرێن بە سەر دوانزە بەرە: ماگیر، مام سام، مام ساڵ، مام باڵ، مامەکاڵ، مام سیل، مام لیس، مام سەکی، مامەخاڵ، مامویی، پیرباڵ، کەلو[٥]، هەروەها دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، جگە لەوەی کە دانیشتوانی ڕەواندز کوردن و موسڵمانن، بەڵکو لە تەک ئەمانیشدا هەندێ لە کەمایەتی مەسیحی و جوولەکەش هەن[٦].

شیاوی باسە ئەو پەرەسەندنەی کە ڕەواندز بە خۆیەوەی بینی، بە تایبەت لە سەردەمی فەرمانڕەوایی میر محەمەد پاشای ڕەواندزی (١٨١٣-١٨٣٦)، لە دواتریشدا کاریگەری بە سەریەوە هەر دیاربوو. ڕەنگە بەشداریکردنی ژمارەیەکی بەرچاوی خەڵکی ڕەواندز لە ڕۆژنامەی "زەورا"[٧] کە بە زمانی عەرەبی و تورکی لە بەغدا دەردەچوو لە ساڵی ١٨٧٧ بە یازدە کەس و ساڵی دواتریش بە بیست و نۆ کەس شایەتحاڵی ئەوەبن، کە ئاستی کۆمەڵایەتی ڕۆشنبیری ڕەواندز لەو سەردەمە بەرز بووە[٨]. ئەوە لە لایەک، کەچی لە لایەکی تردا بەستنەوەی هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی بە دەسەڵاتی ناوەندی جا چ لە ڕێگای پیاوەکانیانەوە بێت، یاخود لە ڕێگای سەرۆک هۆزەکانەوە بێت کاریگەری کردۆتە سەر دواکەوتوویی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری ڕەواندز لە ڕێگای چەوساندنەوەو سەندنی باج و کاری بە زۆرە ملێ پێیان، چونکە بە گوێرەی قسەی شارەزایەکی کۆمەڵگای کوردەواری، لە سەر وەختی زاڵبوونی تورکان بەسەر ناوچەکانی میریدا، ئاغاکانیان کردە نێوەندی پەیوەندی گرتنی نێوان خۆیان و دانیشتووان. ئاکامی سروشتی ئەو کارەش خزمەتی بە سەقامگیری و بەرزبوونەوەی پایەی ئاغاو خانەدانەکان کرد. ئیدی ئەو ئاغایە، دەسەڵاتی بە شێوەیەکی تایبەت وردە وردە بە سەر دانیشتووانی ناوچەکەیدا هەڵکشاوە. قسەی ئەو لە هەموو کاروبارێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیی دانیشتووواندا ڕەها بووە. مسکێنیش لە بەر گەلێک هۆی تایبەتی و گشتی نەیتوانیوە حسێب بۆ دەسەڵاتی ئاغاو پیاوەکانی نەکات[٩].

دوا بە دوای کۆتایی هێنان بە فەرمانڕەوایی میر محەمەد پاشای ڕەواندزی لە ساڵی ١٨٣٦، ڕەسووڵ پاشای برای دەسەڵاتی ناوچەکەی بەڕێوە دەبرد[١٠]، بەڵام هەر زوو دەسەڵاتدارانی عوسمانی ڕەسووڵ پاشایان لە ڕەواندز لاداو موتەسەریفێکی تورکیان لە شوێن دامەزراند[١١]. لە پاشاندا بارودۆخەکە گۆڕانکاری تێ کەوت دوای ئەوەی مووسڵ لە ساڵی ١٨٧٩ بوو بە ویلایەتێکی سەربەخۆ، ڕەواندزیش وەکو شارۆچکەیەک کەوتە سنووری بازنەی قەڵەمڕەوی ئەو ویلایەتەوە لە سەنجەقی شارەزوور، کە مەڵبەندەکەی لە کەرکوک بوو[١٢].

پاش ئەوەی ڕەواندز لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە بوو بە قائیمقامنشین ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی دە هەزار کەس دەبوو، هەروەها هەریەک لە ناحیەکانی دێرە (هەریر)، باڵەک، برادۆست و شێروانی لە خۆ گرتبوو، کە ئەمانیش هەر یەکەیان لە لایەن بەڕێوەبەری ناحیە بەڕێوە دەبردران و ژمارەیەکیش گوندیان لە ڕووی کارگێڕییەوە لە ناو بازنەی دەسەڵاتدا بوو[١٣].

سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بۆ ناوی ئەو قائیمقامانە دەکەن، کە فەرمانڕەوایی ڕەواندزیان کردووە، لە وانە حوسێن حوزنی موکریانی، ناوی بیست و یەک قائیمقامی هێناوە[١٤]، بەڵام ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ساڵنامەکانی ویلایەتی مووسڵ ئەوە زانیاری پێچەوانەو کەموکوڕی لێ بەدی دەکرێ، لەوانە ئاماژە بۆ ناوی عارف حیکمەت بەگ ئالوسی دەکات گوایە لە ساڵی (١٣٠٨- ١٣٠٩) کۆچی کە دەکاتە (١٨٩٠-١٨٩١)ی زایینی لە ڕەواندز قائیمقام بووە، کەچی ساڵنامەی ویلایەتی مووسڵ لەو ساڵەدا ئاماژە بۆ ناوی ئیبراهیم ئەفەندی دەکات کە

لە ڕەواندزێ قائیمقام بووە[١٥]، بەڵام دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، کە ئەو عارف ناوەی حوزنی ناوی دەبات لە ساڵی ١٨٩٢ لە ڕەواندز لەو پلەیەدا بووە[١٦]. هەروەها حوزنی باس لە بوونی قائیمقامیەتی عەبدوڵلا موخلیس بەگ(١٧)و نیهاد بەگ ناکات، کە یەکەمیان لە ساڵی ١٩٠٦ و دووەمیان لە ساڵی ١٩١٢ لە ڕەواندز قائیمقام بووینە[١٨]. بۆیە لێرەدا دەتوانرێ بووترێ، زانیارییەکانی نێو ساڵنامەکانی ویلایەتی مووسڵ زیاتر پشتی پێ دەبەسترێ، لە بەر ئەوەی هاوسەردەمن لە لایەک و، لە لایەکی دیکەش تایبەتمەندن بە نووسینەوەی ڕەوشی کارگێڕی ویلایەتەکە[١٩].

لە ڕووی ئابوورییەوەش هۆزە کوردییەکان پشتیان بە بەرهەمهێنانی بەروبوومی کشتوکاڵی و بەخێوکردنی ئاژەڵداری بەستووە، کە تارادەیەک پێداویستییە ناوخۆییەکانی پڕ دەکردەوە. بەڵام لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بە هۆی سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێرانی(قاجاری) لە لایەک، لە لایەکی دیکەش پێشکەوتنی بواری ئابووری جیهانی کاریگەری کردە سەر ڕەوشی کۆمەڵایەتی ئەو هۆزانە، ئیتر بەرە بەرە هەنگاویان بەرەو نیشتەجێبوون نا[٢٠]. ڕەواندزیش لە لایەک بە هۆی ئەوەی لە زووەوە بۆ بازرگانی ڕووی تێ کراوە، لە لایەکی دیکەوەش بەروبوومی تووتن و مێوەجاتی لێ بەرهەم هێنراوە گرنگی و بایەخی لە ڕووی ئابوورییەوە هەبووە[٢١]. ئەوە سەرەڕای بوونی هەندێ کارو پیشەی دەستی، کە بۆ دەست ڕەنگینی دانیشتوانی دەڤەرەکە دەگەڕایەوە، وەک شاڵوشەپکی کوردەواری، هەروەها شەڕ کە سەروچاوەکەی بۆ سەردەمی فەرمانڕەوایی میر محەمەد دەگەڕایەوە[٢٢]. ئەوەتە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە زۆربەی ئەو هەشتا تۆپەی کە والی مووسڵ هەیبوو لە دەستکردی کرێکارانی ڕەواندز بوون، ئەو تۆپانەش لە دەورو پشتی ڕەواندز دەردەهێنران[٢٣].

ماوە بڵێین بوونی ژمارەیەکی بەر چاو لە خانوو، دوکان، مزگەوت، قاوەخانە، فڕن، حەمام و خان لە ڕەواندز لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم ڕادەی پێشکەوتنی ڕەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووری پێشان دەدات[٢٤]. هەر بۆیە زاری کرمانجی لە وەسفی ڕەواندز نووسیویەتی:" مەخلوق لە شەرق و غەربەوە بۆ کرپارو تیجارەت دەهاتنە (ڕەواندزێ)" مەرکەزی عیلم و سنعەت و فەن و تیجارەت بوو، مازو گلوان، سنجکە، تووتن، گەزۆ، ڕوون، خوری، مێوژ، هەنگوین، لە مێوەجاتی ترێ، خۆخ شفتالو [مەبەستی خۆخە - توێژەر]، هەنجیر، هەنار، سێو، گێوژ، بەڵاڵوک، قەیسی و ئەنواعی مێوەجاتی بە لەزەتو لەتیف و چاک و ئەرزان ئەوەند زۆربوون نە دەهاتە فرۆتن"[٢٥].

ئەمانەی ئاماژەمان بۆ کرد ڕادەی گرنگی و پڕ بایەخی ڕەواندز بوو لە ڕووی کۆمەڵایەتی و کارگێڕی و ئابووری لە دوای ڕووخانی میرنشینی سۆران تا سەرهەڵدانی جەنگی یەکەمی جیهانی.

**ئەنجام:**

١- شوێنگەی ڕەواندز گرنگی و بایەخی مێژوویی خۆی هەبووە لە کۆنەوە بەگشتی بە تایبەت دوای ئەو پەرەسەندنەی کە لە سەردەمی میر محەمەدی گەورە بە خۆیەوەی بینی کە ڕەنگی دایەوە لە سەر قۆناغەکانی دوای ئەویشدا.

٢- لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە خەڵکی ناوچەکە بەسەر دوو چین دابەش ببوون، چینی یەکەمیان پێشکەتوو و ئاگادار لە گۆڕانکارییەکان. چینی دووەمیان بێ ئاگا لە گۆڕانکارییەکان و ملکەچ بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی دەسەڵات.

٣- لە ڕووی کارگێڕییەوە دوای ڕووخانی میرنشینی سۆران گرنگی و پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینیوە کاتێک بۆتە لیوا، بەڵام ئەو لیوایە درێژەی نەکێشاوە کاتێک جارێکی تر کراوەتەوە بە شارۆچکە لە ڕووی کارگێڕییەوە.

٤- گرنگی ناوچەکە وەکو سەرە ڕێگای بازرگانی لە لایەک و بوونی بەروبوومی کشتوکاڵی و پیشەسازی تیایدا لە لایەکی دی. بایەخی بە لایەنی ئابووری داوە بۆ ئەوەی گەشەکردنی پێویست بە خۆیەوە ببینێت.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

### پەراوێزەکان:

١- بۆ زیاتر زانیاری لەمەڕ فەرمانڕەوایی میر محەمەدی گەورە بڕوانە: جمال نەبەز، الأمیر الکردی میر محمد الرواندزی الملقب ب((میری کۆرە))، ترجمە:فخری شمس الدین سیلاحشۆر، دار ئاراس للطباعة و النشر، مطبعة وزارة التربیة، اربیل، ٢٠٠٣.

٢- محمد أمین زکي، خلاصة تاریخ الکرد و کردستان من اقدم العصور التاریخیة حتی ألان، ترجمة: محمد علي عوني، مطبعة السعادة، مصر، ١٩٣٩، ص٢٩٠؛ د. شاکر خصباك، العراق الشمالي دراسة لنواحیه الطبیعیة و البشریة، الطبعة الاولی، مطبعة شفیق، بغداد، ١٩٧٣، ص١٥٠؛ جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی: د.کاوس قەفتان، بغداد، ١٩٨٧، ل ٢٧.

٣- عباس العزاوي، عشائر العراق، الجزء الثاني (عشائر الکردیة)، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٤٧، ص١٤٢-١٥٠؛ نیکیتن، مادة رواندیز روینديز، دائرة المعارف الإسلامیة، المجلد العاشر، ص٢٠٠.

٤- جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ل ٣٤.

٥- موصل ولایتی سالنامە رسمیسدر، ١٣٢٥ه، موصل، (مطبعة سند طبع اولنشدر) ص٢١٧؛ کامەران بابان زادە، میرنشینی سۆران لێکۆڵینەوەیەکە لە سەر مێژووی سیاسی میرنشینی سۆران سەرەتای سەدەی یازدەهەم- ١٨٣٦، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٧، ل ١١.

٦- ڕۆژنامەی (الزوراء) ڕۆژنامەیەکی فەرمی بوو لە بەغدا ساڵی ١٨٦٩ بە هەر دوو زمانی عەرەبی و تورکی دەردەچووو، بەردەوام بوو تا داگیرکردنی بەغدا لە لایەن بریتانییەکان. منیر بکر التکریتي، الصحافة العراقیة و اتجاهاتها السیاسیة والاجتماعیة و الثقافیة من (١٨٦٩-١٩٢١م)، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٦٧، ص٥٢.

٧- "زوراء" العدد(٧٦٣)، ٧جمادي الاخرة ١٢٩٥هـ، ٨ حزیران، ١٨٧٨. لە: د.کمال مظهر أحمد، رأي للمناقشة- الإطار الزمني لتاریخ العراق الحدیث و المعاصر، مجلة الحکمة، العدد الخامس، بغداد، تشرین الثاني- کانون الاول، ١٩٩٨، ص٣٦. وەرگیراوە.

٨- سیسل جۆن ئیدمۆندس، کورد تورک عەرەب، وەرگێڕانی: حامید گەوهەری، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەوەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٢٧٤.

٩- بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ سەردەمی فەرمانڕەوایی ڕەسووڵ پاشا، بڕوانە: حسێن حزنی موکریانی، مێژووی میرانی سۆران، چاپی دووەمین، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦٢، ل ل ٩٢- ٩٣.

١٠- مەلا ئەسعەد خەیلانی، دەستنووسی مێژووی سۆران، ل ٤٢؛ حسێن حزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو،ل ٩٨.

تێبینی: لێرەدا کاتێک ئەو دوو سەرچاوەیە کە تایبەتن بە مێژووی سۆران و باس لە دانانی دەسەڵاتی موتەسەریفی تورک دەکەن لە ڕەواندز، دەبنە پاڵپشت بۆ ئەو مەزبەتەیەی کە سلێمان بەگی سیلاحشۆر (١٨٧٥- ١٩٣٦) لە دوای دروستبوونی حوکمەتی عێراقی داوای ئەوەی کردووە کە ڕەواندز بکرێتەوە بە لیوا، لە بەر ئەوەی ناوبراو ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ڕەواندز لە ساڵی ١٢٦٠ کۆچی کە دەکاتە ١٨٤٤ ی زایینی واتە دوای نەمانی میرنشینی سۆران لیوا بووە. بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ ناوەرۆکی مەزبەتەکە بڕوانە: ئەحمەد حەمەدئەمین ئۆمەر، ڕەواندز، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی- سیاسییە (١٩١٨- ١٩٣٩) نامەی زانکۆیی بلاونەکراوە، پێشکەش بە ئەنجومەنی کولێژی ئەدەبیات زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێری کراوە، ٢٠٠٥، ل ١٠١.

١٢- د.فاضل حسێن، کێشەی ویلایەتی مووسڵ لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی دبلۆماسیەتی عێراق- بەریتانیا- تورکیاو ڕای گشتی، وەرگێڕانی: محەمەد شاکەلی، چاپی یەکەم، چاپخانەی خاک، سلێمانی،١٩٩٩، ل ١٠٧؛ د.ئازاد نەقشبەندی، کێشەی ویلایەتی موسڵ یان کێشەی نەوت؟، گۆڤاری مەتین، ژمارە (٥٧)، تشرینی یەکەم، ١٩٩٦، ل٥.

١٣- لە سەرەتا ڕەواندز کە بوو بە مەڵبەندی شارۆچکە هەر سێ ناحیەی دێرە، باڵەک، برادۆستی لە خۆ گرتبوو، بەڵام دواتر فراوان بوو و شێروانیشی کەوتە سەر. فەیسەڵ دەباغ، کوردستان لە چاپکراوەکانی عوسمانلییەکاندا، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٤، ل٣٢، ٣٧، ٣٩، ٨٢؛

عبدالرزاق الحسني، رحلة في العراق او خاطرات الحسني، الطبعة الثالثة، المطبعة العصرية، بغداد، ١٩٢٥، ص١٤٨؛ فيصل محمد الارحيم، تطور العراق تحت حكم الاتحاديين ١٩٠٨- ١٩١٤، مطبعة الجمهور، موصل، ١٩٧٥،ص٤٧.

١٤- حسین حزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٠.

١٥- سالنامەی ولایت موصل، ١٣٠٨هـ،ص١٢٨.

١٦- سالنامەی ولایت موصل، ١٣١٠هـ، ص١٨٥.

١٧- عەبدوڵلا موخلیس بەگ کوڕی ئەسعەد بەگ کوڕی ڕەسوڵ پاشایە لە ساڵی ١٨٥٩ لە بەغدا لە دایک بووە و لای مامۆستای تایبەتی خوێندوویەتی. لە دوای کۆچی دوایی باوکی ماڵەکەی دەباتە کەرکوک و لە قەڵەمی تەحریرات دادەمەزرێت تا دەبێتە بەڕێوەبەر. ساڵی ١٨٨٩ بە ناو مەئموریەتی لێکۆڵینەوە دەچێتە کۆیە و ڕەواندز و لە پاشانیش لە چەند شوێنێک دەبێتە قائیمقام، لە وانە ١٩٠٦ لە ڕەواندز. لە ساڵی ١٩٢٤ دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی دامەزراندن و لە ١٩٢٥ بە نوێنەری هەولێر لە ئەنجومەنی نوێنەران ئیتر ماڵەکەی دەباتەوە بەغدا تا لە ساڵی١٩٤١ لەوێدا کۆچی دوایی دەکات. حسین حزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٠٥- ١٠٦.

١٨- موصل ولایتی، سالنامە رسمیسدر موصل، ١٣٢٥هـ، ص٢١٦: سالنامە ولایت موصل، ١٣٣٠هـ، ص٢٥٢.

١٩- ئەحمەد حەمەدئەمین ئۆمەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢.

٢٠- د. عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد، وەرگێرانی: عبداللە حسن زادە، بێ شوێنی چاپ، ١٥١؛ د. عەزیز شەمزینی، جووڵانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان، وەرگێرانی فەرید ئەسەسەرد، چاپی سێیەم، بڵاوکردنەوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٤٥.

٢١- فەیسەڵ دەباغ، شار و شارۆچکەکانی پارێزگای هەولێر (لە قاموسی ئەعلام)ی (شەمسەدین سامی) دا، گۆڤاری هەولێر، ژمارە(١)، هەولێر، ١٩٩٨، ل ٩٩: لیژەک ژیگیل، گەڕیدە پۆلۆنییەکان لە ساڵانی ١٨٠٠دەکاندا لە کوردستان، وەرگێرانی لە سویدییەوە: ئەمجەد شاکەلی، (WWW.DENGEKAN.COM/04-06Amjad 14.pdf) لە ئینتەرنێتەوە.

٢٢- ا.م. مینتیشاشڤیلی، کورد کورتەی پێوەندیی کۆمەلایەتی- ئابووری رۆشنبیری و گوزەران، وەرگێرانی، د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ٥٧: عەلی باویل ئاغا، بیرەوەرییەکانی عەلی باویل ئاغا، دیمانەیەکی تۆمارکراو لە سەر کاسێت لەگەڵ عەبدولڕەقیب یوسف بە مێژووی ٢٩ی تەمووزی ١٩٨٢، ڕەواندز.

٢٣- أنور المائي، الاكراد في بهدينان، موصل، ١٩٦٠، ص٣؛ د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چینی کرێکارانی عێراق دروستبوون و سەرەتای بزووتنەوەی، وەرگێرانی: فوئاد مەجید میسری، چاپخانەی دار الشؤون الثقافة العامة، بغدا، ١٩٨٥، ل ل ٢٥٦- ٢٥٧.

٢٤- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سالنامە ولایت موصل، موصل ولایتی، ١٣١٢ هـ، ص٣١٨؛ موصل ولایتی سالنامە رسمیسدر، ١٣٢٥، ص٢١٧.

٢٥- د. کوردستان موکریانی، زاری کرمانجی ٢٥/٥/١٩٢٦- ٢٣/٧/١٩٣٢ یەکەمین گۆڤاری کوردی شاری ڕەواندز، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، زاری کرمانجی، ژمارە (٢)، ساڵی، یەکەم، ١٩٢٦، ل٢.

**سەرچاوەکان:**

**یەکەم- دەستنووس:**

* مەلا ئەسعەد خەیلانی، دەستنووسی مێژووی سۆران.

**دووەم- چاپکراوە فەرمییەکان:**

* سالنامەی ولایت موصل، ١٣٠٨.
* سالنامە ولایت موصل، ١٣١٠.
* سالنامە ولایت موصل، موصل ولایتی، ١٣١٢.
* سالنامە ولایت موصل، ١٣٣٠.
* موصل ولایتی سالنامە رسمیسدر، ١٣٢٥.

**سێیەم- کاسێتی تۆمارکراو:**

* عەلی باویل ئاغا، بیرەوەرییەکانی عەلی باویل ئاغا، دیمانەیەکی تۆمارکراو لە سەر کاسێت لەگەڵ عەبدولڕەقیب یوسف بە مێژووی ٢٩ی تەمووزی١٩٨٢، ڕەواندز.

**چوارەم- نامەی زانکۆیی:**

* ئەحمەد حەمەدئەمین ئۆمەر، ڕەواندز، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی- سیاسییە (١٩١٨- ١٩٣٩) نامەی زانکۆیی بڵاونەکراوە، پێشکەش بە ئەنجومەنی

کۆلێژی ئەدەبیات زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر کراوە، ٢٠٠٥.

**پێنجەم- کتێب:**

١- بەزمانی کوردی:

* ا.م. مینتیشاشڤیلی، کورد کورتەی پێوەندیی کۆمەڵایەتی- ئابووری رۆشنبیری و گوزەران، وەرگێڕانی، د.عیزەدین مستەفا رەسووڵ، سلێمانی، ١٩٩٩.
* جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێرانی: د.کاوس قەفتان، بغداد، ١٩٨٧.
* حسێن حزنی موکریانی، مێژووی میرانی سۆران، چاپی دووەمین، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦٢.
* سیسل جۆن ئیدمۆندس، کورد تورک عەرەب، وەرگێرانی: حامید گەوهەری، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەوەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.
* د. عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد، وەرگێرانی: عبدالله حسن زادە، بێ شوێنی چاپ، ١٩٧٣.
* د. عەزیز شەمزینی، جوولانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان، وەرگێرانی فەرید ئەسەسەرد، چاپی سێیەم، بلاوکردنەوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨.
* د. فاضل حسێن، کێشەی ویلایەتی مووسڵ لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی دبلۆماسیەتی عێراق- بەریتانیا- تورکیاو رای گشتی، وەرگێرانی: محەمەد شاکەلی، چاپی یەکەم، چاپخانەی خاک، سلێمانی،١٩٩٩.
* فەیسەڵ دەباغ، کوردستان لە چاپکراوەکانی عوسمانییەکاندا، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.
* کامەران بابان زادە، میرنشینی سۆران لێکۆڵینەوەیەکە لە سەر مێژووی سیاسی میرنشینی سۆران سەرەتای سەدەی یازدەهەم- ١٨٣٦، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٧.
* د. کوردستان موکریانی، زاری کرمانجی ١٩٣٢/٧/٢٣ -١٩٢٦/٥/٢٥ یەکەمین گۆڤاری کوردی شاری رەواندز،چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢.
* د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چینی کرێکارانی عێراق دروستبوون و سەرەتای بزووتنەوەی، وەرگێرانی: فوئاد مەجید میسری، چاپخانەی دار الشوون الثقافة، العامة، بەغدا، ١٩٨٥.

٢- بەزمانی عەرەبی:

* أنور المائي، الاكراد في بهدينان، موصل، ١٩٦٠.
* د. شاكر خصباك، العراق الشمالي دراسة لنواحيه الطبيعية و البشرية، الطبعة الاولى، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٣.
* عباس العزاوي، عشائر العراق، الجزء الثاني(عشائر الكردية)، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٤٧.
* عبدالرزاق الحسني، رحلة في العراق او خاطرات الحسني، الطبعة الثالثة، المطبعة العصرية، بغداد، ١٩٢٥.
* فيصل محمد الارحيم، تطور العراق تحت حكم الاتحاديين ١٩٠٨- ١٩١٤، مطبعة الجمهور، موصل، ١٩٧٥.
* محمد امين زكي، خلاصة تاريخ الكرد و كردستان من اقدم العصور التاريخية حتى ألان، ترجمة: محمد علي عوني، مطبعة السعادة، مصر، ١٩٣٠.
* منير بكر التكريتي، الصحافة العراقية واتجاهاتها السياسية والاجتماعية والثقافية من (١٨٦٩- ١٩٢١م)، مطبعة الارشاد، بغدد، ١٩٦٧.

**شەشەم- گۆڤارەکان:**

**١- بەزمانی کوردی:**

* د.ئازاد نەقشبەندی، کێشەی ویلایەتی موسڵ یان کێشەی نەوت؟، گۆڤاری مەتین، ژمارە (٥٧)، تشرینی یەکەم، ١٩٩٦.
* فەیسەڵ دەباغ، شار و شارۆچکەکانی پارێزگای هەولێر(لە قاموسی ئەعلام)ی (شەمسەدین سامی)دا، گۆڤاری هەولێر، ژمارە(١)، هەولێر، ١٩٩٨.

**٢- بەزمانی عەرەبی**

* د.كمال مظهر أحمد، رأي للمناقشة- الإطار الزمني لتاريخ العراق الحديث و المعاصر، مجلة الحكمة، العدد الخامس، بغداد، تشرين الثاني- كانون الاول، ١٩٩٨.

**حەوتەم- ئینسلۆکۆپیدیا:**

* نیکیتن، مادة رواندیز رویندیز، دائرة المعارف الإسلامية، المجلد العاشر.

**هەشتەم- ئینتەرنێت:**

* لیژەک ژێگیل، گەریدە پۆلۆنییەکان لە سالانی ١٨٠٠دکاندا لە کوردستان، وەرگێرانی لە سوێدییەوە: ئەمجەد شاکەلی،(WWW.DENGEKAN.COM/04-06Amjad140.pdf) لە ئینتەرنێتەوە.

*

# رەواندز لە ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵدا

فەیسەڵ دەباغ

رەواندز سەر بە سنجەقی شارەزوور و ئەویش سەر بە ویلایەتی موسڵ بووە، سەرەڕای رەواندزیش ئەم ویلایەتە دوو سنجەقی دیکەی هەبووە، کە یەکێکیان سنجەقی موسڵ و ئەویتریان سنجەقی سلێمانی بووە. سنجەقی شارەزوور بێجگە لە قەزای رەواندز، پێنج قەزای تریشی هەبووە: قەزای کەرکوک (کە مەڵبەندی سنجەقی شارەزوور بووە)، قەزای سەلاحیە (واتە کفری)، قەزای هەولێر، قەزای رانیە، قەزای کۆیە. بەپێی ساڵنامەی ساڵی)١٣١٢ی(کۆچی (١٨٩٤- ١٨٩٥)ی زایینی بەم شێوەیە باس لە قەزای رەواندز کراوە: "شارۆچکەی رەواندز ٤٢ سەعاتە رێ لە مەڵبەندی لیوا دوورە و (٣) ناحیەی هەیە بە ناوی (باڵەک، برادۆست، دێرە) کە گشتیان (٢٨٢) گوندیان هەیە. رووبەری قەزاکە زۆر فراوانە و ژمارەی دانیشتووانیشی ٣٥٥٠٠ کەسە. قەزای رەواندز ٨٠٠ خانوو، ١ جامع، ٢ مزگەوت، ١ مەکتەبی روشدیە، ٣ مەکتەبی منداڵان، ١٧٠ دوکان، ١ قاوەخانە، ٤ فرن، ١ حەمام، ٢ خانی تێدایە، گشت دانیشتووانی قەزاکە کوردن و لە یەک دوو گوندی ناحیەی برادۆستیش هەندێ کلدانی و جوو هەن".

بە پێی ساڵنامەی ساڵی)١٣٢٥ی(کۆچیش (١٩٠٦)ی زایینی بەم شێوەیە باس لە قەزای رەواندز کراوە: "قەزای رەواندز دەکەوێتە باکووری لیوا و رێک لەسەر سنووری ئێران، ئەم قەزایە چوار ناحیەی هەیە بە ناوی (باڵەک، برادۆست، دێرەو هەریر، شێروان و مزووری باڵا)، هەر چوار ناحیەکە ئاوەدانن و دانیشتووانیشی خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕ و ماڵاتن و باری گوزەرانیشیان باشە. قەزای رەواندز ٨٠٠ خانوو، ٢ جامع، ٢ مزگەوت، ١ مەکتەبی روشدیە، ٢ مەکتەبی منداڵان، ١٧٠ دوکان، ٢ قاوەخانە، ٤ فرن، ١ حەمام، ٢ خانی تێدایە، گشت دانیشتووانی قەزاکە کوردن و لە یەک دوو گوندی ناحیەی برادۆستیش هەندێ کلدانی و لە ناو شارۆچکەش هەندێ جوو هەن".

بە پێی ساڵنامەی ساڵی)١٣٣٠ی(کۆچیش (١٩١٢)ی زایینی بەم شێوەیە باس لە شوێنە گشتی و تایبەتییەکانی قەزاکە کراوە:

### شوێنە گشتییەکان

٥ جامع و مزگەوت، ٣ تەکیە، ١ قوتابخانە، ١ مەکتەبی روشدیە، ٢ مەکتەبی منداڵان، ١ حاورە، ١ قشلە، ١ تەلگرافخانە، ١ بینایەی حکومەت.

### شوێنە تایبەتییەکان

٨٣١ خانوو، ١٧٠ دوکان، ٣ خان، ١ حەمام، ٢ قاوەخانە، ٤ فرن، ٨ ئاش، ٣٩٢ باغ و باخچە، ٤٢١ تەلار.

### مولحەقاتی گشتی قەزا

| گوند | ناحیە |
|---|---|
| ١١٩ | گوندەکانی مەڵبەندی قەزا |
| ٤٠ | دێرەو هەریر |
| ٦٠ | باڵەک |
| ٦٤ | برادۆست |
| ١٠٨ | شێروان لەگەڵا مزووری باڵا |

### ژمارەی دانیشتووانی

کۆی گشتی: ١٥٩٣٨ نێر
٢٩٥ مێ

لە وانە ٥٠٩ نێری موسەوی و ١١٢ نێری کلدانی کاسۆلیک و ١٠ مێی کلدانی کاسۆلیک و ١٥٣١٧ نێری موسڵمان و ١٨٩ مێی موسڵمانن. گشت دانیشتووانی قەزاکە کوردن و سەر بە مەزهەبی شافیعین، تەنها لە یەک دوو گوند نەبێ کە هەندێ کلدانی و جوویان تێدایە. ئەمەش ناوی قائیمقام و جێگری قائیمقام و موفتی و مودیری مال و ئەندامانی ئەنجومەنی ئیدارەی قەزا و ئەندامانی دادگا و فەرمانبەرەکانی گشت فەرمانگەکانی قەزاکەن بەپێی ساڵی دەرچوونی ساڵنامەکان:

### ١- رەواندز لە ساڵنامەی ١٣٠٨ی کۆچی ١٨٩٠ی زاینیدا:

قایمقام: ئیبراهیم ئەفەندی (سێیەم)
جێگر: سوبغەتوڵلا ئەفەندی
موفتی: - - - - -
مودیری مال: عەلی عارف ئەفەندی
کاتبی تەحریرات: عەلی ئەفەندی

### ئەنجومەنی ئیدارە

سەرۆک: قایمقام
ئەندامە سروشتییەکان: جێگر: سوبغە توڵلا ئەفەندی
موفتی: - - - - - -
مودیری مال: عەلی عارف ئەفەندی
ئەندامە هەڵبژێردراوەکان: ئەحمەد ئەفەندی، مستەفا ئەفەندی، فەتاح ئەفەندی، موعەلیم موشی.

### دادگای بیدایەت

کاتبی یەکەم: لوتفی ئەفەندی
کاتبی دووەم: عینایەت ئەفەندی
یاریدەری موستەنتیق:[1] زەینەل ئەفەندی
ئەندام: جەمیل ئەفەندی
ئەندام: ئیسماعیل ئەفەندی
(ئوگەچی)[2]: مەحموود ئەفەندی
ئیجرای موباشیر: حوسێن ئاغا
ئیجرای موباشیر: محەمەد ئاغا

### مەکتەبی روشدیە

موعەلیمی مەکتەبی روشدیە: سەعید ئەفەندی
(یازو خواجەسی): محەمەد ئەمین ئەفەندی
دەرگەوان: نەبی ئاغا
مەئمورەکان (قرانتە)[3]
دکتور: غەوس ئەفەندی
کاتب: حەلیم ئەفەندی
(غاردیان)[4]: مەحموود ئاغا
(غاردیان): ئەمین ئاغا

### مەئمورەکانی دیکەی قەزا

مەئموری تەلگراف و پۆستە: کافی ئەفەندی
مەئموری نفوس: ئەحمەد زەکی ئەفەندی
کاتبی نفوس: محەمەد عەلی ئەفەندی
کاتبی باج (ویرگۆ): حافز ئەفەندی
ئەمینی سندوق: عەبدوڵلا ئەفەندی
مەئموری ئەنبار: عەبدوڵلا ئەفەندی
مەئموری (رەژی)[5]: ئیسماعیل ئەفەندی

### ناحیەکانی قەزا

١- مودیری ناحیەی دێرە: مەحموود نەدیم ئەفەندی
کاتب: محەمەد ئەفەندی
٢- مودیری ناحیەی باڵەک: عەبدولرەحمان ئەفەندی
کاتب: سدیق ئەفەندی
٣- مودیری ناحیەی برادۆست: ئیبراهیم ئەفەندی
کاتب: رەسول ئەفەندی

### دائیرەی عەسکەری

بیکباشی[6]: شەبیب ئاغا
قول ئاغاسی: ئیسماعیل بەگ٧ (ع ٥ م٥)
دکتۆر قول ئاغاسی: ئاگوب ئەفەندی
کاتب: عەبدولقادر ئەفەندی
ئیمام: محەمەد سەعید ئەفەندی
یوزباشی[8]: نوری ئەفەندی
: حوسێن ئاغا
: یونس ئاغا
: محەمەد ئاغا
مولازمی یەکەم: ئەحمەد ئاغا
: جەبار ئاغا
: ئەمین ئاغا

مولازمی دووەم: ئەحمەد ئەفەندی
: مستەفا ئەفەندی
: قادر ئەفەندی
: ساڵح ئەفەندی
مولازمی سێیەم: مستەفا ئەفەندی
دەرمانساز: نیشان ئەفەندی
جەراح: مستەفا ئەفەندی

**٢- رەواندز لە ساڵنامەی ١٣١٠ی کۆچی ١٨٩٢ی زایینیدا:**
قائیمقام: عارف ئەفەندی (سێیەم)
جێگر: فەتاح ئەفەندی
موفتی: - - - - -
کاتبی تەحریرات: عەلی ئەفەندی
کاتبی فارسی: عەبدوڵلا ئەفەندی
ئەمینی سندوق: عەبدولرەحمان ئەفەندی (سێیەم)

**ئەنجوومەنی ئیدارە**
سەرۆک: قائیمقام
ئەندامە سروشتییەکان:
جێگر
مودیری مال
کاتبی تەحریرات
ئەندامە هەڵبژێردراوەکان
مستەفا ئەفەندی
جەمیل ئەفەندی
فەتاح ئەفەندی
موشی ئەفەندی

**دادگای بیدایەت**
باشکاتب: لوتفی ئەفەندی
کاتبی دووەم: عینایەت ئەفەندی
یاریدەری موستەنتیق: زەینەڵ ئەفەندی
ئەندام: نەورەس ئەفەندی
ئەندام: ئیسماعیل ئەفەندی
(ئوگەچی): مەحموود ئەفەندی
ئیجرای موباشیر[٩]: عەریان ئەفەندی
ئیجرای موباشیر: حوسێن ئاغا

**مەکتەبی روشدیە**
موعەلیم: ئەسعەد ئەفەندی
دەرگەوان: نەبی ئاغا

**مەئمورەکانی دیکەی قەزا**
مەئموری تەلگراف و پۆستە: کافی ئەفەندی
مەئموری ئینحسار (رەژی): بەکر ئەفەندی
مەئموری نفوس: ئەحمەد ئەفەندی
(غاردیان): مەحموود ئاغا
کاتب: حەلیم ئەفەندی
کاتبی ویرگۆ: عەبدوڵلا ئەفەندی
مەئموری رسومات: عەبدوللەتیف ئەفەندی
کاتبی ژمێریاری بانق: مەجید ئەفەندی

**ناحیەکانی قەزا**
١- مودیری ناحیەی دێرە: سادق ئەفەندی
٢- وەکیلی مودیری ناحیەی باڵەک: مەعروف ئاغا
٣- مودیری ناحیەی برادۆست: حاجی مەحمود ئەفەندی
کاتبی رسومات:
سالم ئەفەندی
ئەمین ئەفەندی
رەسول ئەفەندی

**دائیرەی عەسکەری**
بیکباشی: شەبیب ئاغا
قول ئاغاسی: ئیسماعیل بەگ
دکتۆر قول ئاغاسی: ئاگوب ئەفەندی
یوزباشی: نوری ئەفەندی
= : حەسەن ئاغا
= : محەمەد ئاغا
مولازمی دووەم: ئەحمەد ئەفەندی
= : مستەفا ئەفەندی
= : قادر ئاغا
= : ساڵح ئەفەندی
کاتب: عەبدولقادر ئەفەندی
ئیمام: محەمەد سەعید ئەفەندی
مولازمی یەکەم: ئەحمەد ئاغا
= : جەبار ئاغا

= : ئەمین ئاغا
مولازمی سێیەم: مستەفا ئەفەندی
مولازمی سێیەم: ئەحمەد ئەفەندی
دەرمانساز: نەشئەت ئەفەندی
جەراح: مستەفا ئەفەندی

**٣- ڕەواندز لە ساڵنامەی ١٣١٢ی کۆچی (١٨٩٤ - ١٨٩٥)ی زایینیدا:**
قائیمقام: عەبدوڵڵا بەگ
جێگر: مستەفا ئەفەندی
موفتی: ئەسعەد ئەفەندی
مودیری ماڵ: عەلی عارف ئەفەندی
کاتبی تەحریرات: عەلی ئەفەندی

**ئەنجوومەنی ئیدارە**
سەرۆک: قائیمقام
ئەندامە سروشتییەکان:
جێگر
موفتی
مودیری ماڵ
کاتبی تەحریرات

ئەندامە هەڵبژێردراوەکان:
حاجی جەمیل ئەفەندی
محەمەد ساڵح بەگ
تۆفیق ئەفەندی
موشی ئاغا

**دادگای بیدایەت**
سەرۆک: جێگری قائیمقام
ئەندام: عەبدولفەتاح ئەفەندی
ئەندام: سەعید ئەفەندی
باشکاتب: لوتفی ئەفەندی
کاتبی دووەم: حوسێن ئەفەندی
یاریدەری موستەنتیق: خورشید ئەفەندی

**قەڵەمی نفوس**
مەئمور: ئەحمەد زەکی ئەفەندی

کاتب: عەبدولقادر ئەفەندی

**مەئمورەکانی دیکە**
کاتبی فارسی: عەبدوڵڵا ئەفەندی
ئەمینی سندوق: نەورەس ئەفەندی
مودیری رسومات: عەبدوللەتیف ئەفەندی
یوزباشی زابیتە[١٠]: خدر ئەفەندی
مەئموری تەلگراف و پۆستە: ئیبراهیم ئەفەندی
مەئموری قەرزی گشتی: محەمەد ئەمین ئەفەندی
کاتبی (ویرگۆ): عەبدوڵڵا ئەفەندی
مەئموری ڕژی: ئیسماعیل ئەفەندی
موعەلیمی مەکتەبی روشدیە: سەید عەلی ئەفەندی

**ناحیەکانی قەزا**
**١- ناحیەی برادۆست:**
مودیری ناحیە: مەحمود حاجی ئەفەندی
کاتب: ڕەسول ئەفەندی
کاتبی باج: بەکر سدقی ئەفەندی
**٢- ناحیەی دێرە و هەریر:**
مودیری ناحیە: فارس ئەفەندی
کاتب: عەبدوڵڵا ئەفەندی
مەئموری ئەنبار: عەبدولقادر ئەفەندی
**٣- ناحیەی باڵەک:**
مودیری ناحیە: مەعروف ئاغا
کاتب: ئەمین ئەفەندی
کاتبی باج: عەبدولغەنی بەگ

**٤- ڕەواندز لە ساڵنامەی ١٣٢٥ی کۆچی (١٩٠٦)ی زایینیدا:**
وەکیلی قائیمقام: عەبدوڵڵا موخلیس بەگ (دووەم)
جێگر: مەعروف ئەفەندی
موفتی: - - - - - - - -
مودیری ماڵ: - - - - - - - - -
کاتبی تەحریرات: تاهیر ئەفەندی

**ئەنجوومەنی ئیدارە**
سەرۆک: وەکیلی قائیمقام
ئەندامە سروشتییەکان:

جێگر
موفتی
مودیری مال
کاتبی تەحریرات
ئەندامە هەڵبژێردراوەکان
ساڵح بەگ
حاجی فەتاح ئەفەندی
حاجی ئیسماعیل ئاغا
موشی ئەفەندی

**دادگای بیدایەت**
سەرۆک: جێگری قائیمقام (مەعروف ئەفەندی)
باشکاتبی دادگا: عەبدوڵلا ئەفەندی
موستەنتیق: سەعید ئەفەندی

**دائیرەی نفوس**
مەئموری نفوس: عومەر ئەفەندی
کاتب: عەبدوڵلا ئەفەندی

**مەئمورەکانی دیکەی قەزا**
مودیری تەلگراف و پۆستە: ئیبراهیم جەمیل ئەفەندی
باشکاتبی رسومات: سەید عەبدولرەحمان ئەفەندی
مەئموری (قرانتە): ئەمین ئەفەندی
مەئموری قەرزی گشتی: مەجید ئەفەندی
مەئموری زابیتە: مولازم حوسێن ئەفەندی
کاتبی فارسی: عەبدوڵلا ئەفەندی
ئەمینی سندوق: محەممەد عەلی ئەفەندی
موعەلیمی یەکەمی مەکتەب: ئەمین ئەفەندی
موعەلیمی دووەم: تاهیر ئەفەندی

**ناحیەکانی قەزا**
**١- ناحیەی دێرە و هەریر:**
مودیری ناحیە: ئەحمەد ئەفەندی
کاتب: عەبدوڵلا ئەفەندی
کاتبی باج: رەشید ئەفەندی
**٢- ناحیەی باڵەک:**
مودیری ناحیە: عەبدی ئاغا
کاتب: حاجی وەیسی ئەفەندی
کاتبی باج: حاجی ئەلیاس ئەفەندی
کاتبی باج: تۆفیق ئەفەندی
**٣- ناحیەی برادۆست:**
مودیری ناحیە: - - - - - - - - -
کاتب: جەمیل ئەفەندی
کاتبی باج: بەکر ئەفەندی
**٤- ناحیەی شێروان و مزووری باڵا:**
مودیری ناحیە: عوسمان ئەفەندی
وەکیلی کاتب: تۆفیق ئەفەندی

**٥- رەواندز لە ساڵنامەی ١٣٣٠ی کۆچی (١٩١٢)ی زایینیدا:**
قائیمقام: نیهاد بەگ
جێگر: عەبدولرەزاق ئەفەندی
مودیری مال: موسا کازم ئەفەندی
کاتبی تەحریرات: عومەر ئەفەندی

**ئەنجومەنی ئیدارە**
سەرۆک: قائیمقام
ئەندامە سروشتییەکان:
جێگر
موفتی
مودیری ماڵ
کاتبی تەحریرات
ئەندامە هەڵبژێردراوەکان:
سەعید بەگ
حاجی نەورەس ئەفەندی
رەسول ئاغا
موسا ئەفەندی

**دادگای شەرعی**
جێگری شەرع: عەبدولرەزاق ئەفەندی
باشکاتب: سەعید ئەفەندی
کاتبی دووەم: تۆفیق ئەفەندی
ئاگادار کەرەوە: مستەفا ئاغا

**قەڵەمی دارایی**
مودیری ماڵ: موسا کازم ئەفەندی

یاریدەدەری: سالح ئەفەندی
ئەمینی سندوق: رەزا ئەفەندی
مەئموری تەحسیل، عەبدولهادی ئەفەندی
کاتبی موفرەدات[11]: ئەحمەد ئەفەندی
تەحسیلداری شارۆچکە: مستەفا ئەفەندی
تەحسیلداری سوارە: رەسول ئەفەندی
تەحسیلداری سوارە: سەید عەبدوللا ئەفەندی

**دادگای بیدایەت**

باشکاتب: خدر ئەفەندی
ئەندام: حاجی ئەلیاس ئەفەندی
ئەندام: ئەمین ئەفەندی
موستەنتیقی یاسایی: سەید خدر ئەفەندی
کاتبی دووەم: عەبدولکەریم ئەفەندی
موباشیر: عەلی ئاغا

**دائیرەی نفوس**

مەئموری نفوس: شەفیق ئەفەندی
کاتب: عەبدوللا ئەفەندی

**مەکتەبی روشدیە**

موعەلیم: عەبدوللا ئەفەندی
ژمارەی قوتابیان: ٣٠

**مەئمورەکانی دیکەی قەزا**

کاتبی تاپۆ: خالد ئەفەندی
مودیری تەلگراف: ئەدیب ئەفەندی
مەئموری قەرزی گشتی: - - - - - - - - - - -

**ناحیەکانی قەزا**

**١- ناحیەی دێرە و هەریر:**

مودیری ناحیە: شەوکەت بەگ
جێگر: محەمەد ئەفەندی
کاتب: عەبدولعەزیز ئەفەندی
تەحسیلداری هەریر: بەکر ئەفەندی
تەحسیلداری دێرە: خەلیل ئەفەندی

**٢- ناحیەی باڵەک:**

مودیری ناحیە: عەبدی ئاغا
کاتب: حاجی وەیسی ئەفەندی
تەحسیلداری: حیسامەددین ئەفەندی

**٣- ناحیەی برادۆست:**

مودیری ناحیە: حەسەن رەزا ئەفەندی
کاتب: محەمەد ئەفەندی
تەحسیلدار: حەسەن ئەفەندی

**١- ناحیەی شێروان:**

مودیری ناحیە: سەعید ئەفەندی
کاتب: عەبدوللا ئەفەندی

**پەراوێزەکان**

١- موستەنتیق: وشەیەکی عەرەبییە و لە تورکی کۆندا بە واتای (محقق)ی عەرەبی بەکاردەهات، واتە لێکۆڵەرەوە لەگەڵ تاوانباردا.
٢- ئوگهچی: فەراش.
٣- قرانتە: حەپسخانە لە نەخۆشییەکانی باو.
٤- غاردیان: قۆلچی، نۆبەتچی.
٥- رەژی: ئینحسار.
٦- بیکباشی: پلەیەکی عەسکەرییە، بەرپرسی ١٠٠٠ کەس.
٧- قول ئاغاسی: یاریدەدەری (بیکباشی)، ئەفسەری قۆلێکی تابور.
٨- یوزباشی: پلەیەکی عەسکەرییە، بەرپرسی ١٠٠ کەس.
٩- ئیجرای موباشیر: وشەیەکی عەرەبییە و ئێستا بە واتای (تنفیذ) دێ.
١٠- زابیتە: ئاسایش.
١١- کاتبی موفرەدات: تۆمارکەری بابەتی وەرگیراو.

**سەرچاوەکان**

١- ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٠٨ی کۆچی.
٢- ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٠ی کۆچی.
٣- ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣١٢ی کۆچی.
٤- ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٢٥ی کۆچی.
٥- ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٣٣٠ی کۆچی.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٩)، زستانی (٢٠٠١) بڵاوبۆتەوە.